# فەرهەنگی رامان

(ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردی)

بەرگی 2

**Raman Dictionary of kurdish etymology**

ئەمەگ رامان (د. عەبدوڵڵا ئیبراهیم زادە)

**Emeg Raman (Dr. A. Ibrahimsade)**

ئەم پەرتووکە لە دوو بەرگدا بەشێوەی ئێلێکترۆنیکی (ebook) بڵاو دەبێتەوە. بەرگی یەکەم شەوی سەری ساڵ بڵاو کرایەوە و ئێستاش بەرگی دووەم دەخرێتە بەر دیدی خوێنەران و بە بۆنەی جێژنی ساڵرۆژی دامەزرانی کۆماری کوردستان دەکرێتە دیاری بۆ هۆگرانی زمانی کوردی.



نووسەر حەز دەکا روونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە هەر دوو بەرگەکە و بە تایبەتی بەرگی یەکەم بداتە خوێنەرانی بەرێز. وەک لە پێشەکییەکەدا باس کراوە، سەرەرای سێ جار پێداهاتنەوە، لەبەر قورسی کارەکە و بەرتەنگ بوونی کات بەداخەوە نەتوانرا هەموو هەڵەکان بسردرێنەوە. وشەکانی ناو فەرهەنگەکە زۆرجار لە چەندین شوێنی جیاجیا و لە پێوەندی لەگەڵ گەلێک وشەی دیکەدا هاتوونە بەر باس و لێکدانەوە. لەوانەیە لەم یان لەو شوێندا لێکدانەوەی وشەیەک جیا بێ لەوەی کە لەژێر خودی وشەکەدا هاتووە. ئەو لێکدانەوەیە کە لەژێر هەر وشەیەکدا هاتووە، بەگشتی زۆرترین و دروستترین زانیاری بە دەستەوە دەدا.

وەک لە پێشەکییەکەدا هاتووە، ئەم فەرهەنگە چەندین پاشکۆ لە خۆ دەگرێ، کە ئەوانیش بەم زووانە بڵاو دەکرێنەوە.

## کورتەهێماکان

| | |
|---|---|
| (Afg.) | (ئەفغانی) |
| (Akd.) | (ئەکەدی) |
| (Aram.) | (ئارامی) |
| (Arb.) | (عەڕەبی) |
| (Arm.) | (ئەرمەنی) |
| (Asr.) | (ئاسۆری) |
| (Av./ Aw.) | (ئاڤێستا) |
| (Bab.) | (بابلی) |
| (Chek.) | (چێکی) |
| (Den.) | (دانمارکی) |
| (E.) | (ئینگلیزی) |
| (Fr.) | (فەرانسەیی) |
| (Fris.) | (فریزی) |
| (G.) | (ئەڵمانی) |
| (Gal.) | (گالی) |
| (Geo.) | (گورجی) |
| (Gr.) | (یۆنانی) |
| (Gm./ Grm.) | (ژێرمەنی) |
| (Gt./ Got.) | (گۆتی) |
| (Hibr.) | (عیبری) |
| (I./ Iran.) | (ئێرانی) |
| (IE.) | (هیندوئەورووپی) |
| (Ind.) | (هیندی) |
| (Ir.) | (ئیرلەندی) |
| (Is.) | (ئیسلەندی) |
| (It.) | (ئیتالیایی) |
| (K.P.) | (ئاڵتێرناتیو بۆ "زمانە ئێرانییەکان") |
| (Kroat.) | (کرۆواتی) |
| (Kymr.) | (کیمری) |
| (Let.) | (لێتۆنی) |
| (Lit.) | (لیتوانی) |
| (N./ Nor.) | (نۆڕدی) |
| (Nl.) | (هولەندی) |
| (Nor.) | (نۆردی) |

(Norv.) (نۆروێژی)
(Pl./ pahl.) (پەهلەوی)
(Pol.) (پۆلۆنی/ لێهستانی)
(Preus.) (پرۆسی)
(Rom.) (ڕۆمی)
(Rus.) (رووسی)
(S.) (ساکسۆنی)
(Serb.) (سێربی)
(Sl./ Slav.) (سلاڤی)
(Sp.) (ئیسپانیایی)
(Sum.) (سۆمێری)
(Sw.) (سوێدی)
(Syr.) (سوریانی)
(T./ Tr.) (تورکی)

کورتەهێمای هەر زمانێک (M) بکەوێتە پێشەوەی، شێوەی ناوین و (O) بکەێتە پێشەوەی، شێوی کۆنی زمانەکە نیشان دەدا، بۆ وێنە (MG.) دەبێتە ئەڵمانی ناوین، (OE.) ئینگلیزی کۆن، (OIn.) هیندی کۆن (سانسکریت) و هتد.

# غ (Ġ)

**غار1 ġar** *[ ġār ]* - غار دان واتا "را کردن، هەڵاتن": خزمە دەگەڵ ↑گرگر gırgır "بەپەلەپەل". دە فارسیدا دەگوترێ گروگر gorogor (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- harry (E.)، her(ġ)ian (OE.)، herion (OG.)، herja (ON.) "پەلە کردن". ئەم وشانە دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئینگلیزی Oxford دا دەگەڵ karias (Lit.) "لەشکر، سوپا" و koiranos (Gr.) "رایەداری لەشکری" بە خزم داندراون. وشە لیتوانییەکە دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی Duden ئەڵمانیدا دەگەڵ ئەم وشانە بە خزم دانراوە: Heer (G.)، heri (OG.)، here (OE.)، här (Sw.) "سوپا، هێزی شەڕکەر"، karas (Lit.) "شەڕ" و kara (OP.) "هێزی شەڕکەر" و کارزار karzar (P.)، سەر بە ریشەی **< (IE.) *koro-s** "شەڕ".

2- ↑خێرا *xera*.

**غار2 ġar** *[ ġār ]* - "سوور بوونەوەی سواڵەت لە ئاگردا": خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت". دە بنەڕەتدا مەبەست سەخت بوون و رەق بوونی سواڵەت بەهۆی سوور کردنەوە دە ئاگر دایە.

**غار3 ġar** *[ ġār ]* - "ئەشکەفت": غار ġār (P.). خزمە دەگەڵ hohl (G.)، hole (E.)، hol (OG.)، hol (OE.)، holr (OIs.) "کون"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *kel-** "لێهاڵان".

**غز ġız** - "سەررێژ کردنی هەویر و ماستی ترشاو": خزمە دەگەڵ ↑ئاخێز a-xez [خیز xīz (P.)] "هەستان (ی بە نهێم)" و ↑هەستان hestan.

**غلتە ġılte** *[ ġılta ]* - "ورِاوە": هەروەها غلتاندن ġıltandın هەیە بە مانای "وراوە کردن، ورێنە کردن، قسە پەڕاندن": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گالین galîn "1-گۆرانی خوێندن 2- ناڵین"، ↑گاڵ gal [گرِ و گاڵ gır û gal]، ↑گاڵتە galte و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *ghel-** یان **< (IE.) *gal-** "هەرا کردن، بانگ کردن، قیژاندن" [ ئەم دوو ریشەیە دەشێ پێکەوە خزم بن، واتا یەکیان لەوەی دیکەوە پەرەی گرتووە]. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەندین وشە دەبردرێنەوە سەر ریشەی یەکەم، وەک gellen (G.)، gellan (OG.)، gillen (Nl.)، yell (E.)، gälla (Sw.) "هەرا کردن، قیژاندن"، galan (OG.) "خوێندن، گۆرانی خوێندن، جادوو کردن (قسەی جادووکەرانە بەسەردا خوێندن)"، Nachtigall (G.) "بولبول، بلبل" [دە بنەڕەتدا: (مەلی) "شەوخوێن"، gelt (G.) [هەروەها galt (G.)] "ئاژەڵی شیرنەدەر" [دە بنەڕەتدا: جادووکراو، جادوو بەسەردا خوێندراو].

**غلفۆش ġılfoş** *[ ġılfoš ]* - "تڵتەی نیشتوو": بە فارسی وەک "تەنشین" مانا کراوەتەوە. دەشێ لە دوو کەرتی غلف + ئۆش ġılf + oş پێک هاتبێ. کەرتی یەکەم دەبێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑غور(ر)اب ġur(r)ab دا شی کراونەوە و پێوەندییان بە چەمکی "قووڵ، قووڵایی"یەوە هەیە. ئەگەر سەیری مانا فارسییەکە بکەین، لەوێشدا "تە" ئاماژە بە "خوارەوە، قووڵایی" دەکا. کەرتی دووەمی وشەکە واتا ئۆش oş- لەوانەیە پاشگر و شێوەیەکی دیکە لە پاشگری ↑ئۆز oz بێ.

**غللور ġıllûr** *[ ġıllūr ]* - "1- گای زۆر قەڵەو و بزۆز 2- بادیهەوا، لەخۆفش": خزمە دەگەڵ ↑کروور kırûr [کلوور kıl(l)ur] "ئێکجار زۆر" و لەوانەشە ↑*هەراو heraw*.

[تێبینی: مانای "لەخۆ فشین" پێوەندی هەیە بە چەمکی خۆ هەڵمساندن و خۆ زل کردنەوە. "فشین" دەگەڵ *فش* "هەراو" و *بۆش* "زۆر" و بووغە "گای غللور" سەر بە یەک ریشەن].

غور(ڕ)اب **ġur(r)ab** [ *ġur(r)āb* ] - زۆرتر دەگەڵ خەو xew دێ [لە غورڕابی خەو ġur(r)abî xew دا واتا لە خەوی قووڵدا، لە قووڵایی خەودا]. خزمە دەگەڵ graben (G.)، graban (OG.)، grave (E.)، gräva (Sw.) هەڵکەندن، هەڵکۆڵین"، Grab (G.)، graf (Nl.)، gra f (OE.) قەبر، گۆڕ"، grabu (OE.) "غار، ئەشکەوت"، grof (OIs.) "قەبر، قووڵکە"، grebu (Rus.) "هەڵکەنە، شەنە لێ بدە، سەوڵ لێ بدە"، grob (Rus.) "تابووت"، Grube (G.) "قووڵایی، قووڵکە"، Gruft (G.) "نەقەب، غاری ژێر هەرد". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *ghrebh-, *ghrobh-** ***(IE.)*** "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، داڕووشاندن". بەم جۆرە لە مانای "هەڵکەندن، قووڵ کردن"ەوە مانای "قووڵ و قووڵایی" پەیدا بووە و مەبەست لە غورڕابی خەو هەمان قووڵایی خەوە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑خەرابە xerabe و ↑کەلاوە kelawe. خەرابە یان کەلاوە ئەو شوێنەیە کە بە هۆی وێران بوون و تێکرووخانەوە وەک غار و ئەشکەوتی لێ هاتووە یان ئەوە کە شوێنێکی غارئاسایە کە لە قووڵاییەکدا هەڵکەوتووە. هەر لەدرێژەی ئەم باسەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە وشەی ↑خراب xerab [خەراب xerab، خراپ xerap] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. "خەراب کردن" دە ئەسڵدا بەمانای هەڵکەندن، هەڵکۆڵین و داڕووشاندنی شتێک بەکار هاتووە کە لە ئەنجامیدا شتەکە لە کەلک کەوتووە. هەروەها وشەی ↑خەرفان xerfan "خەراب بوونی مێشک" لەم پێوەندییەدا جێ دەگرێ. ↑گوربک gurbık و گوربە gurbe "خەڵێف، کونی مێشەنگوین" و ↑کەرەفتوو kereftu "ناوی ئەشکەوتێکی بەناو بانگ لە کوردستان" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: لەباری ماناوە بەراوردی خەرفاو xerfaw (غورفی ġurfî) بکە دەگەڵ وشەی خنگ xeng (P.) "حۆل، بێ مێشک، کەللەپووک" و قانگ qang "پووک، هەڵۆڵ، ناوبەتاڵ". ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ کەندن kendın (هەڵکەندن helkendın). وەک دەردەکەوێ لێرەشدا چەمکەکانی پووکی، بۆشایی، هەڵۆڵ بوون و قووڵ بوون پێوەندی بەیەکەوە پەیدا دەکەن].

غورابی **ġurabî** [ *ġurabī* ] - "شیرنییەکە بە ئارد و شەکر ساز دەکرێ": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑لاباشە labaşe "نانی تەنکی ساج"دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەی **<** ***kloibho-*** ***(IE.)*** "نانی سوورکراوە لە تاوەدا".

غورفی **ġurfî** [ *ġurfī* ] - "خەرفاو": شێوەیەکی دیکە لە خەرفاو xerfaw. بڕوانە ↑غور(ڕ)اب ġur(r)ab.

غولە **ġûle** [ *ġūla* ] - "چین، چینی پرچ": مانای ئەسڵی وشەکە "مەوج، پێل"ە و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک خول xul و ↑خولانەوە *xulanewe* و هتد.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Welle (G.) "مەوج، *پێل*" هەم بۆ پێلی ئاو و هەمیش بۆ پێلی مووی سەر بەکار دێ. وشەکە خزمە دەگەڵ "پێل"ی کوردمادی].

غووشە **ġûşe** - "1- هێشوو 2- گوڵەدەغڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑هێشوو hêşû و خزمە دەگەڵ ↑قۆش qoş و ↑گیشە *gîşe* "باقە" و چەند وشەیەکی دیکە.

غوول **ġûl** [ *ġūl* ] - "دێوەزمە": ئەم وشەیە دە زمانی ئینگلیزیشدا بەکار دێ و دەگوترێ ghoul (E.). دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئینگلیزیدا ریشەی وشەکە بردراوەتەوە سەر ġūl (Arb.). بەڵام ئەم وشە عەرەبییە خۆی دەبێ لە هەیوولا heyula [هیولا hayūlā (P.)] وەرگیرابێ کە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بەکار دێ. ریشە؟

غەرغەرە **ġerġere** [ *ġarġara* ] - "دارۆکەیەکی چەرخئاسا دەزووی لەسەر هەڵ دەوێزنن": ↑قرقرە qırqıre و گەرگەرە gergere ش دەگوترێ.

غەرە **ġere** - "چەسپ، سرێشی دارتاشان": وشەیەکی کۆنی کوردمادییە بە مانای "چەسپ، چریش"، خزمە دەگەڵ Klebe (.G) "چەسپ" سەر بە کرداری kleben (.G)، kliban (.OG)، clifan (.OE) "چەسپاندن، پێوەنووساندن"، سەر بە ریشەی **< -glei * (.IE)** "پێکەوەنووسان، چەسپان". خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک ↑گڵ gıl، ↑گلوو gılu، ↑هەڕی herî و هتد.

غەریبۆک **ġerîbok** [ *ġarībok* ] - "جۆرێک هەرمێ": بە داخەوە لەناو فەرهەنگدا دیار نەکراوە کە ئەم جۆرە هەرمێیە چ جۆرێکە. لەوە دەچێ جۆرێکی نەرم و ناسک نەبێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قرپۆک qırpok "ئەیاخ، زبڵ و زاڵ، مێوژی وشک هەڵاتوو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ grob (.G)، g(e)rob (.OG)، grof (.Nl) "نەناسک" [هەروەها بە مانای "رەق و تەق، قورس، قەبە]، سەر بە ریشەی **< -kreup* (.IE)** "قرتماغە".

[تێبینی: ئەم ریشەیە بە باوەڕی من دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **< - ker* (.IE)** "سەخت، رەق" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*خار* "سەخت، رەق". دە تیوان دوو چەمکی "رەق، سەخت" و "قرتماخە، سارێژ، پترۆکە"دا پێوەندی هەیە. ئەم پێوەندییە لەوەڕا هاتووە کە شوێتێکی بریندار کاتی چاک بوونەوە پێست و گۆشتەکەی دووبارە رەق و سفت دەبێتەوە، واتا خۆی دەگرێتەوە، بە پێچەوانەی برین کە دۆخێکی خۆێناوی، لەختەیی و دەڵەمەیی هەیە. ئەگەر سەرنجی وشەکانی "پترۆک" [پەترۆکە]، "سارێژ" و "کەپرۆکە" بدەین، (ئەوانیش بە مانای "قرتماغە" دێن) دەردەکەوێ کە لەو ریشانەوە هاتوون کە مانای "رەق، سەخت" دەبەخشن].

غەرین **ġerîn** - "هەڵە کردن": غەراندن ġerandın مانای "بە هەڵە بردن" دەبەخشێ. خزمە دەگەڵ irr(e) (.G)، irrī (.OG)، aīrzeis (.Gt)، ierre (.OE) "بە هەڵەچوو، تێکەڵ کردوو، ئاگا لەخۆ نەماو"، هەروەها errare (.L) "هەڵە کردن"، سەر بە ریشەی **< -er(e)s* (.IE)** "توند و بێ مەبەست خۆ جووڵاندن". لەوانەیە خزمە دەگەڵ ↑هەڵە hele "غەڵەت، ناڕاست".

غەزرین **ġezrîn** - "قەلس و توورە بوون": خەزرین xezrîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*ئازار* *azar* و ↑ئاژر ajır "توورە، قەڵس".

غەڵبە **ġelbe** [ *ġalba* ] - "دەنگی تێکەڵاوی حەشیمەت، دەنگی شڵۆقی": [غەڵبەغەڵب ġelbeġelb]. خزمە دەگەڵ klappen (.G) "1- وەرگەڕاندن، وەرسووڕاندن 2- دەنگ و هەرا پەیدا بوون، تەقە و زرمە لێ هەستان" (لەکاتی وێککەوتن و پێکدادانی دووشتدا، وەک دەنگی پێکدادانی دەرگا، دەنگی هەنگاو لەسەر هەرد، دەنگی پێکدادانی سەرەقابڵەمە و هتد)، klappen (.MG) "چەپڵە لێدان، دەنگ لێ هەستان، چەنەدرێژی کردن، چەقەچەق کردن [دەنگی دەم پێکدادان]"، klapfen (.MG)، clap (.E)، klappa (.Sw) "لێکدان، پێکدادان"، klopfen (.G)، kloppen (.Nl)، clopfōn (.OG) "لێدان، دەنگ لێ هەستاندن" (وەک بە دەست یان قامک لە دەرگا دان). دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Klappe (.G) بە جۆرە دەلاقەیەک دەگوترێ کە لە کاتی تێپەڕ بوونی هەوا یان تراو پێیدا پارچەکانی وێک دەکەون یان لێک دەدرێن و دەنگی لێ هەڵدەستێ، وەک دەلاقەکانی دڵ. دە زمانی ئاخاوتنی ئەڵمانیدا بە کەسێک کە زۆر چەقەچەق بکا، دەڵێن halt die Klappe "دەمت داخە" [دە بنەڕەتدا: دەلاقە (ی دەمت) بوەستێنە]. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ وشەگەلێک کە بۆ هێندێک دەنگی تایبەتی بەکار دێن، وەک klaffen (.G) "دران، درز لێ پەیدا بوون، تەقین" (وەک تەقینی کاڵەک و شووتی)، kläffen (.G) "وەڕین، حەپاندن"، klippen (.G) "پێکدادران و دەنگ لێ هەستان"، klipp und klar ی ئەڵمانی ماناکەی بە کوردمادی دەبێتە "*رەق و دۆغری*". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑قریوە qrîwe

هەیە [قریوەقریو] کە ئەویش خزمە دەگەڵ ئەم وشانە [غریو ġarīv (P.) "دەنگ و هەرای بڵیند"]، هەروەها ↑قەڵبەزە qelbeze "1- شەپۆل 2- تاقگە". هەر لەم پێوەندییەدا وشەیەکی دیکە سەرنج رادەکیشێ کە ئەویش ↑قلّپ qılıp ە بە هەر دوو مانای "1- دەنگی جۆشان یان رژانی ئاو 2- سەرنخوون، وەرگەڕان". ئەگەر لە سەرسەرەوە سەیری وشەی ئەڵمانی klappen (G.) بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیەش هەم مانای "دەنگ و هەرا لێ هەستان" و هەمیش مانای "وەرگەڕان" دەبەخشێ. رەنگە پێوەندی ئەو دوو مانایە لەوەدا بێ کە هەم دەنگ و سەدا لێ هەستان و هەم قلّپ و نخوون بوونەوە دە ئەنجامی زەبرێک [لێدان، لێکدان پێکدادان] بەدی دێ. [شیاوی باسە کە دەزمانی ئەڵمانیدا schlagen "لێدان" و umschlagen "وەرگەڕاندن، قلّپ کردنەوە" مانا دەدا]. زمانی عەرەبی ئەم وشە کوردمادییەی وەرگرتووە و گۆڕیویەتی بۆ قلب qalb (Arb.) و چەندین وشەی وەک تقلب و منقلب و هتد.

غەڵدی **ġeldî** [ *ġaldī* ] - "سەگی بچکۆڵەی راو بۆ چوونە ناو کون و هەڵفڕاندنی مەل": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کە ئاماژە بە "خزین، خلیسکان، خوشین" دەکەن، وەک ↑خلّیسکان xılîskan، ↑گلۆر gılor، ↑خەڵتان xeltan، ↑گلان gılan و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ gleiten (G.) "خلیسکان، خزین"، سەر بە ریشەی **< *ghleidh-** *(IE.)* "خزین، خلیسکان". ئەمەش خۆی لە ریشەیەکی کۆنترەوە پەرەی گرتووە کە دەبێتە **< *ghel-** *(IE.)* "بریقانەوە". ئەم جۆرە سەگە لەبەر ئەوەی *دەخوشێتە* ناو کون و کەلێنانەوە، ئەم ناوەی پێدراوە.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "بریقانەوە" و "ساف و لووس، تاس و لووس" بە یەکەو ئاشکرایە. هەر بۆیە وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەیە. لەم بارەوە دەتوانین دە زمانی کوردمادیدا ئاماژە بە وشەکانی خوارەوە بکەین: *تاس* "ساف و لووس"، *تەمسین* "خلیسکان" و *تەیسین* "بریقانەوە"].

غەنە **ġene** [ *ġana* ] - "گۆ لە مەیدان دەرکردن": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *gono-** *(IE.)* "لێدان" و دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn.

غەوارە **ġeware** [ *ġawāra* ] - "بێگانە": دەبێ هەمان↑ ئاوارە aware بێ و رەنگە لە ژێر کارتێکەری وشەی غەریب [غەریبە]دا بووبێتە غەوارە.

غەور1 **ġewır 1** [ *ġawır* ] - "1- تەم و مژ 2- لێڵ 3- ژەنگی ئاوێنە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەور hewır. وشەی غبار ġubar (Arb.) "تۆز، تەم" دەشێ لەم وشانە وەرگیرابێ.

غەور2 **ġewır 2** [ *ġawır* ] - "قووپان و رۆچوونی زەوی": خزمە دەگەڵ ↑گۆڕ gor "قەبر، قەور" [دە بنەڕەتدا: گابار gabar]، ↑گەوڕ gewır، ↑کووڕ kur و ↑قووڵ qul و دواجار ↑*کون kun*.

غوژ **ġuj** - "داماو، کزۆڵکە": خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn "چەمانەوە".

غیژ **ġîj** [ *ġīž* ] - "لوور": [غیژ کرن واتا لوور بوونەوە، بە نهێم بەرەو خوار هاتن]. ↑گژ[5] gıj یش دەگوترێ.

## ف ( F )

**فاچەڵ فیچ façelfîç** [ *fāčalfeč* ] - "قیلەوقاج": [دە بنەڕەتدا: پێچەڵ پێچ]. فاچ faç شێوەیەکی دیکەیە لە ↑واژی wajî [بەرەواژی]، فیچ fîç دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە↑پێچ peç [↑پێچان(ەوە) peçan(ewe)، بە فارسی "پیچیدن"].

[تێبینی: دە وشەی "قیلەوقاج"یشدا "قیل" پێوەندی بە "خێڵ" و "قاج" پێوەندی بە "خێچ" (خوار) ەوە هەیە].

**فات[1] fat** [ *fāt* ] - "رەنگی کاڵ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑باو[4] baw ["رەشباو" یان "سوورباو"]، سەر بەریشەیەک بە مانای "رووناکی، تیشک".

**فات[2] fat** [ *fāt* ] - "قومری": دەشێ بچێتەوە سەر phāsianós (Gr.) "ناوی پەلەوەرێک کە لە رەخی چەمی phasis لە ناوچەی دەریای سپی دەژی".

**فارای faray** [ *fārāy* ] - "گۆڕان": وارای waray یش دەگوترێ. هەروەها فاڕ و گۆڕ far u gor هەیە بە مانای"ئاڵوگۆڕ". بنجی فاڕ far- یان وار war- شێوەیەکی کونترە لە گۆڕ gor-، واتا ئەسڵی وشەی "گۆڕان" سەرەتا بە فۆتیمی w [یان v] دەست پێ کراوە و پاشان ئەم فۆتیمە گۆڕدراوە بە g. [بڕوانە ↑گۆڕان goran].

**فافۆن fafon** [ *fāfon* ] - "ئالۆمینیۆم": ↑بافۆن bafon یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی ئەورووپی وەک wippen (G.) "هەڵبەزین"، Wippe (G.) "جۆلانە"، Weib (G.) "ژنی بە شوو" [خزمە دەگەڵ ↑بووک buk]، vibrare (L.) "لەرینەوە"، vifa (OIs.) "لێهاڵان"، weibon (OG.) "بەلادا هاتن، خوار بوونەوە، راوەستاو و خۆراگر نەبوون"، viebt (Lett.) "سووڕان، بادران" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *uei-b- , *uei-p- (IE.)** "سووڕان، با دران، لێهاڵان". ئەم ریشەیە خۆی ریشەیەکی پەرەگرتوویە لە **uei- * (IE.)** "چەمانەوە، با دران، سووڕان". وشەی Weide (G.) "دارەبی" [↑بی bî] و چەند وشەیەکی دیکە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. فافۆن یان بافۆن لەبەر نەرم بوون و توانای خوار بوون و با درانی بەم جۆرە ناوزەد کراوە. وشەی فافۆن دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بابۆلە babole [نانی پێچراوە] و↑بابڕ babır [سمێڵ بابڕ دە بنەڕەتدا واتا سمێڵ بادراو]، بافتن bāftan (P.) "چنین" و هێندێک وشەی دیکە.

**فاق1 faq** [ *fāq* ] - فاق دان هەم بەمانای چەمانەوە و هەم بە مانای لاواز بوون دێ. خزمە دەگەڵ weak (E.)، wāc (OE.) "لاواز، بێهێز"، weich (G.)، vek (Sw.) "نەرم، شلک". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی **wiq-* (Grm.) "نەرم، خوار بوون، دەرچوون لە ژێر فشار" و لەوێشەوە دەچنەوە سەر ریشەی **< *uei- (IE.)** "چەماندنەوە، سووڕاندن، با دان". خزمە دەگەڵ ↑فێق feq "لاواز، ژار"، ↑فیسماڵک fîsmlalk "کشانەوە و بۆی دەرچون"، ↑فەکەهان fekehan "لەجێ چوونی ئێسک"، ↑فیس fîs "قووپان، رۆچوون" و دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑بی bî [دارەبی]، ↑با *ba دان*، ↑بابۆلە babole و هتد.

**فاق2 faq** [ *fāq* ] - "1- جورێک داو بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی رەش بۆ چارشێوی ژنان": دەشێ بەرهەڤی بکەین دەگەڵ ریشەی **< *pak- , *pag- (IE.)** "بەستن، تێکخستن، چنین، تەنین". دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک pangere (L.) "توند کردن، pactum (L.) "قەرار، پەیمان" [Pakt (G.) "هەوالبەندی"]، fah (OG.) "دیوار"، Fach

"بەند" (Rus.) paz "بەش(ەدیوار)"، (OE.) fa c "مەودا، بەش بەش کردن(ی کات و شوێن)"، (G.) "بەش(ەدیوار)"، [جومگە و شتی دیکە]، (G.) fügen "تیکخستن"، (OE.) fa gr "جوان، باش" [دە بنەڕەتدا واتا شتێک کە لە ناو کۆبەندەکەیدا باش جێی خۆی گرتووە و بە باشی دەگەڵی ڕێک دەکەوێ، گونجاو]، (Gt.) fagr "گونجاو، پەسەند" و (OE.) fa c "مەودای کات" [دە بنەڕەتدا: تەنینەوەی کات]. وێ دەچێ وشەی ↑پەسەند pesend پێوەندی بەم ریزە وشەیەوە هەبێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە دە زمانی ئینگلیزی کۆن و زمانی گۆتیدا بە مانای "جوان، گونجاو، پەسەند". چەند وشەیەکی دیکەش هەر لەم پێوەندییەدا جێی شیرۆڤە کردنن، وەک ↑پەشت peşt "بەن یا دەزووی بادراو، گشتەک"، ↑پشت[2] pışt [پشتەکەوا]، ↑پەس پەسکەرە pespeskere "جاڵجاڵووکە، جۆڵاتەنە"، ↑بازە baze "جۆرە کووتاڵێکی ئەستوور" و ↑بزگوڕ bızgur "کوتەپەڕۆ".لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑باقە baqe شەوە هەبێ.

**فاق faq3** [ *fāq* ] - "لک(ی دار)، فەرع": دوو فاق واتا دوو لک. پێوەستە بە فاق2 faq 2. وەک لە سەرەوە باس کرا، وشەکە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "بەش، بەشکراو، فەرع" دەدا، بۆ وێنە Fach (G.) هەم بە مانای"بەشێک، خانەیەک لە ناو دیوارێک یان سەندووقێکی بەشبەشکراو" [خانەخانە کراو] بەکار دێ و هەم بە مانای "فەرع و لک"، وەک لقەکانی زانست یان زانکۆ و هیتر. وشەکە دە زمانی ئاڵمانیدا هەروەها مانای "پسپۆڕ لە لقێک یان بەشێک" دەدا، بۆ وێنە دەگوترێ Facharbeiter "کرێکاری پسپۆڕ" یان Facharzt "پزیشکی پسپۆڕ". مەبەست لەم وشانە ئاماژە کردن بە پسپۆڕیی لە لقێکی تایبەتیدایە.

**فاک fak** [ *fāk* ] - "گزی، فێڵ": هەروەها دەگەڵ ↑فیک fîk دێ [فاک و فیک fak u fîk بە مانای خەیالاتی پووچ]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە fingere (L.) "فریو دان، نەخشە بۆ کێشان". لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑فەند fend [فەند و فێڵ]. ئەم وشە لاتینییە خۆی پێوەندی هەیە بە fictio (L.) "دروست کردن، دەرهێنان، خەیاڵ کردن" و fictus (L.) "درۆ، فریو، داستانی خەیاڵی".

**فاڵ fal 1** [ *fāl* ] - "بەخت خوێندنەوە":

[بەرلەوەی بچینە سەر وشەی فاڵ، پێویستە چاوێک بە دوو وشەی دیکەدا بخشێنین. وشەی شانس şans [شانس و بەخت] کە دە زمانی کوردمادی و فارسی و زمانە ئەورووپییەکاندا باوە، ریشەکەی بۆ cadere (L.) دەگەڕێتەوە بە مانای "کەوتن". قدر qadar (Arb.) "چارەنووس" دەبێ لەم وشە لاتینییە وەرگیرابێ. پێوەندی دوو چەمکی شانس و کەوتن لە گەمەی جگین و مۆرە هەڵاویشتنەوە سەرچاوەی گرتووە، واتا کەوتنی جگێ یان مۆرە بە باری باشدا بە شانس داندراوە. جگە لەمە وشەیەکی دیکە کە بۆ cadere ی لاتینی دەگەڕێتەوە، وشەی casus (L.) ە کە دە زمانە ئەورووپییەکاندا بەکارد ێ، بۆ وێنە case (E.) "حاڵ و باڵ، بار و دۆخ، بەسەرهات"] بگەڕێینەوە سەر وشەی "فاڵ". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئەو وشەی بە مانای "کەوتن" بەکاردێ زۆر نیزیکە لە "فاڵ"، بۆ وێنە fallen (G.)، fall (E.)، falla (Sw.)، vallen (Nl.) و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Fall کە بۆ کرداری fallen دەگەڕێتەوە، بەرانبەری case (E.) دەوەستی و مانای "حاڵ و باڵ، بار و دۆخ" دەدا. بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین وای بۆ بچین کە وشەی "فاڵ"ی کوردمادی پێوەندی بەو کردارە ژێرمەنییانەوە هەبێ. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە وا دەردەخەن دە زمانی کوردمادیشدا سەردەمێک وشەیەکی وەک fallen بە مانای کەوتن هەبووبێ، وەک ↑بەر ber [بەر بوونەوە]، ↑بار bar [بار ودۆخ، مەورید]، ↑باڵ bal [حاڵ و باڵ]، هەروەها ↑وەرین werîn [دە بنەڕەتدا بە مانای

بەربوونەوە، کەوتنەخوار] و↑فەلشین felşîn "رووخان، کەوتنەخوار". بەم پێیە "فاڵ"ی کوردمادی دەشێ دە بنەڕەتدا هەروەک Fall ی ئەڵمانی و case ی بە رەچەڵەک لاتینی بە مانای حاڵ و *باڵ*، بار، رێکەوت، رووداو بە کار هاتبێ و مەبەستیش لە فاڵ گرتنەوە، خوێندنەوەی حاڵ و باڵی مرۆڤ و ئەو رووداوانە بێ کە کە*وتوونە* یان *دەکەونە* ژیانی مرۆڤ و بە وتەیەکی دیکە خوێندنەوەی رێکەوت و هەڵکەوتەکانی ژیان بووبێ. هەروەها دەتوانین وشەکانی farg (Pl.) "بەخت، شانس" و frōtītan (Pl.) "هاتنەخوار، رۆچوون" و فرود forūd (P.) "هاتنە خوار" دەگەڵ وشەکانی سەرەوە بەرهەڤ بکەین.

**فال2 fal** *[ fāl ]* - "ئارەزووی جینسی لای مێیینەی یەکسم": [ماکەری بە فاڵ]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ phílo (Gr.) "یار، خۆشەویست، خۆشەویستی" و philein (Gr.) "خۆش ویستن، حەز کردن". دە زمانی عەرەبیدا وشەکە بووەتە فحل feḥl (Arb.) "ئاژەلی تیری بە ئارەزوو".

[لە باری ماناوە وشەکە هەڵسەنگینە دەگەڵ "کەڵ" دە وشەی "بەکەڵ" [مانگا بەکەڵ]دا. کەڵ دە وشەی کەڵکەڵە kelkele شدا دەبیندرێ بە مانای "حەز، خۆشەویستی، مەیل و خولیا"].

**فانۆس fanos** *[ fānos ]* - "جۆرێک چرا": فانوس fanūs (P.). دەچێتەوە سەر phanos (Gr.) "فانۆس". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑فەنەر fener "لەنتەر".

**فانیلە fanle** *[ fānīla ]* - "ژێرکراس": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Fahne (G.)، fana (OE.)، fani (OIs.) "ئاڵا" [دە بنەڕەتدا: پەڕۆ، پارچە]، Halsfano (OG.) "شاڵگەردن"، pannus (L.) "پەڕۆ"، pēnos (Gr.) "چنراو، تەنراو"، سەر بە ریشەی **< *pan-*** ***(IE.)*** "چنراو، تەنراو، بافت، تەون". دە زمانی ئەڵمانیدا Fähnchen (G.) بەکار دێ بە مانای "جلوبەرگی هەرزان و تەنک".

**فایزەن fayzen** *[ fāyzan ]* - "وڵاخێک کە پاشوان لێک دەدا": فای + زەن fay + zen. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پێ pe "لاق". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn "لێدان".

**فت1 fıt** - "سوتوو فرێ دانی سەبیلە بە فوو": خزمە دەگەڵ ↑فوو fu.

**فت2 fıt** - فت بوون واتا دوران و تیداچوون دە گەمەدا. خزمە دەگەڵ ↑فچ fıç و ↑*فس fıs* خواردن بە مانای "بەزین، دۆڕان".

**فت3 fıt** - دەگەڵ "فراوان" دێ [فت و فراوان fıt û fırawan].

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ weit (G.)، wīt (OG.)، wijd (Nl.)، wide (E.)، vid (Sw.) "دوور، گوشاد، هەراو"، سەر بە ریشەی **< *ui-itós*** ***(IE.)*** "لەبەریەک ترازاو، لێکەوە جودا بوو". ئەم ریشەیە خۆی لە دوو کەرت پێک هاتووە، ریشەی **< *ui-*** ***(IE.)*** "لێک جودا" و **itós*** کە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ei-*** ***(IE.)*** "رۆیشتن". iénai (Gr.) و itti (Rus.) "رۆیشتن" و eilen (G.) "پەلە کردن" لەم ریشەوە هاتوون. هەروەها ↑هاتن hatın لەم ریشەوە هاتووە.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑فش fış [فش و فۆڵ].

**فتران fıtran** *[ fıtrān ]* - "رووانین، تەماشا کردن": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *weid-*** ***(IE.)*** ****ueid-,*** "دیتن، زانین، تێگەیشتن، دوزینەوە [*دیتنەوە*]" و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی بۆ وێنە ↑*ویژدان wîjdan* و پیتۆڵ pîtol.

**فتلین fıtlîn** *[ fıtlīn ]* - "1- پێچ دران، باد دران 2- ئاوڕ دانەوە": هەروەها فتلاندن fıtlandın هەیە بە مانای "پێچ دان، با دان". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*باد bad* "پێچ، لۆ" و ↑با3 ba "سوور، خول". "با دان" دە بنەرەتدا "باد دان" بووە. ئەم وشەینە دەشێ چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە.

**فته fıte** [ *fıta* ] - "پچه، سرته": هەروەک ↑پچه pıçe خزمە دەگەڵ ↑فوو fu و گەلێک وشەی دیکە کە ئاماژە بە دەنگی دەرچوونی و رەت بوونی هەوا دەکەن. وشەکە هەروەها بە مانای "دەنگی بەتاڵ کردنی سەبیلە بە پف" و هەروەها بە مانای "بۆن بە عەرزەوە کردنی سەگ" بە کار دێ.

**فتیله fıtîle** [ *fıtīla* ] - "بەندێک کە دەخرێتە ناو چرای نەوتی و هەڵ دەکرێ": پلێته pılîte ش دەگوترێ [جێگۆڕکێی t و l]. فتیله fetīle (P.).

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑فتلین fıtlîn "1- پێچ دران، باد دران"ەوە هەبێ و ئاماژە بە با درانی تاڵەدەزووەکان کرابێ، وەک گشتەک "بەنی بادراو".

2- لەوانەیە وشەکە پێک هاتبێ لە دوو کەرتی فت + ئیله fıt + île. کەرتی یەکەم لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پەت pet "بەن، بەند، ریس" و کەرتی دووەم پاشگر بێ. لەم تێڕوانینەوە ماناکە دەبێتە "پەتی چکۆڵە، پەتیله".

3- بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی (ل. 198) وشەکە دەچێتەوە سەر petīlā (Arc.).

**فجووز fıcûz** [ *fıjūz* ] - "ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوە، تەرەبوون": فج + ئووز fıc + uz. کەرتی یەکەمی وشەکە واتا فج -fıc شێوەیەکی دیکەیە لە بنەوشەی باز -baz یان واز -waz کە لەو وشانەی خوارەوەدا باس لە دوور بوونەوە، ڕۆیشتن و ون بوون دەکا، وەک ↑پەرەوازە perewaze، ↑لانەواز lanewaz [لانە جێ هێشتوو، بێ ماڵ و حاڵ]، ↑بازره bazre "تەرە"، ↑بزر bızır "ون" و هتد. کەرتی دووەم -uz پاشگری جەخت کردنە. خزمە دەگەڵ ↑فجووک fıcuk "پەلەوەری ئامادەی فڕین".

**فجووک fıcûk** [ *fıjūk* ] - "پەلەوەری ئامادەی فڕین": خزمە دەگەڵ ↑فجووز fıcûz "ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوە، تەرە بوون".

**فچ fıç** [ *fıč* ] - وشەیەکە بە مرۆڤی دۆڕاوی دەڵێن. خزمە دەگەڵ↑فت fıt بوون واتا دۆڕان و تیداچوون دە گەمەدا و هەروەها خزمە دەگەڵ ↑فس fıs خواردن بە مانای "بەزین، دۆڕان".

**فچک fıçık** [ *fıčık* ] - "1- حینچکە، کوت 2- دەنگی دەزگای جۆڵا لە کارکردندا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پسان pısan، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان".

**فچۆز fıçoz** [ *fıčoz* ] - "دەنگی کەو لە دیتنی مار و ڕێوی، سیرە، چیرە": خزمە دەگەڵ ↑فوو *fu* "با، هەوا، هەناسە" و گەلێک وشە کە ئاماژە بە دەنگی دەرچوونی و رەت بوونی هەوا دەکەن، بۆ وێنە ↑فشقە fışqe.

**فچۆق fıçoq** [ *fıčoq* ] - "دەنگی فڕینی کەو": فجووق fıcuq یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە" و گەلێک وشەی دیکە کە ئاماژە بە دەنگی دەرچوونی و رەت بوونی هەوا دەکەن. لێرەدا دەتوانێ مەبەست دەنگی دەرچوونی هەوا لە کاتی دەرپەڕینی کەودا بێ.

2- لەوانەشە مەبەست دە بنەڕەتدا نەک دەنگی فڕین، بەڵکوو خودی "فڕین و دەرپەڕین"ی کەو بێ و ببێتە خزم دەگەڵ ↑فجووک fıcûk "پەلەوەری ئامادەی فڕین".

**فڕ fır 1** [ *fır* ] - "لوول، لوولی موو": خزمە دەگەڵ ↑وڕ wır "گێژ"، ↑فرفرە fırfıre "لەیستۆکێک کە بە با دەسووڕێ"، ↑وەردێنە werdene، ↑وەرانین weranîn و ژمارەیەک وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەی < -*wer (IE.) "سووڕان، با دران".

**فڕ fır 2** [ *fır* ] - دەگەڵ "فیشاڵ" دێ [فڕ و فیشاڵ fır û fîşal واتا خۆهەڵکێشان، خۆ زل کردنەوە]. خزمە دەگەڵ ↑فۆڵ fol [فش و فۆڵ]، ↑فرە fıre و چەند وشەیەکی دیکە کە مانای

"زۆری، پڕی، هەراوی" دەگەیەنن. مەبەست لە فڕ و فیشاڵ کردن، با دەخۆ کردن، خۆ هەڵمساندن، خۆ زل کردنەوەیە.

**فڕ3 fır** [ *fır* ] - "پێوەندی": [فڕ بەسەر شتێکەوە هەبوون یا نەبوون واتا پێوەندی بەو شتەوە هەبوون یان نەبوون]. خزمە دەگەڵ ↑بیر bîr [کۆنتر: ویر wîr]. وشەکە دە بنەڕەتدا بەومانایە هاتووە کە مرۆڤ بیر و هۆشی بە سەر شتێکەوە هەیە یان نییە، بە وتەیەکی دیکە ئاگای لەو شتە هەیە یان نا. بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ فڵانەکەس فڕی بە دونیاوە نییە، مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە بیر و هۆشی لە دونیا بڕاوە، واتا ئاگای لە دونیا نییە. مانای وشەکە دواتر لە "پێوەندی زەینی" مرۆڤ بە شتێکەوە پەرەی سەندووە و بەگشتی بووەتە "پێوەندی" و ئیتر بۆ ئەو شتانەش بەکار دێ کە زەین و بیریان نەبێ. بۆ وێنە دەگوترێ: ئەم قسەیە فڕی بە باسەکەی ئێمەوە نییە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑فێر fer.

**فڕ4 fır** [ *fır* ] - فڕ کردن واتا هەڵقوڕاندن. خزمە دەگەڵ گەلێک دەنگەوشە کە پێوەندییان بە ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە"وە هەیە. بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑فیرە fîre [فیڕاندن واتا زگچوون].

**فراخ fırax** [ *fırāx* ] - " ئامان، قاب و قاچاخ": فراق fıraq یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ↑فێل fel "دەفری دەم پان". هەروەها خزمە دەگەڵ Flasche (G.)، flaska (OG.)، flesch (Nl.)، flask (E.)، flaska (Sw.) "بوتڵ". بەگوێرەی بۆچوونێک ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *plak- , *plag- (IE.)** "پەل، پان و بڵاو بوون". ئەم وشە ژێرمەنییانەی خوارەوە هەر لەم ریشەوە دێن: flach (G.)، flah (OG.)، vlak (Nl.) "پەل، نە قووڵ"، flaka (OSächs.) "بەری پێ، بنی پێڵاو"، flak (Norw.) "سواپ، سەفحە، تەختەسەهۆڵ". هەموو ئەو وشانە دەبنە خزم دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑پەل pel "نەقووڵ". ئەم ریشەیەی سەرەوە خوێ شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی **< *pla- , *pel- (IE.)** "پان و بڵاو کردن [دە بنەڕەتدا پان کردنەوە، کوتان و تەخت کردن].

**فراز¹ fıraz** [ *fırāz* ] - "1- بڵیند 2- ناوێکی کوڕانە": فراز farāz (P.) "هەوراز". خزمە یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هەوراز hewraz.

**فراز² fıraz** [ *fırāz* ] - "گوشاد": خزمە دەگەڵ↑ فرە fıre و ↑فرەوان fırewan.

**فراژی fırajî** [ *fırāžī* ] - "بووژاوە، بەخوداهاتوو، گەشەکردوو":

1- لە لایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ frisch (G.)، frisc (OG.)، vers (Nl.)، fresh (E.) "تەڕ و تازە، بووژاوە". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک خزمە دەگەڵ priscus (L.) "کۆن، پێشان، لەگۆڕ رەوشی بەرێ". frash kereti (Pl.) "تازە کردنەوە" دەبێ پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "گەڕانەوە بۆ سەر دۆخی پێشوو، وەک رەوشی بەرێ لێ هاتنەوە، تازە بوونەوە" بووبێ. ئەم وشە لاتینییە پێوەندی بە وشەی ↑بەر ber "پێش"ەوە هەیە.

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ وشەکە دەگەڵ چەند وشەیەک بەرهەڤ بکەین وەک ↑فراز fıraz "ناوی کوڕانە"، ↑هەوراز hewraz، ↑فراشین fıraşîn "بەرزایی چیا"، ↑راسان rasan "هەستان، راست بوونەوە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەرز بوون، بەرز بوونەوە". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "بەرز بوونەوە و هەڵدان".

**فراڤین fıravîn** [ *fırāvīn* ] - "نانی نیوەڕۆ": بەگوێرەی فەرهەنگا کوردی- ئینگلیزی ( ل. 196 ) خزمە دەگەڵ فراوان faravan (P.) "فرە، زۆر" و دەچێتەوە سەر fra + pīθwa + na (OIra.)* و

(Av.) ra - piθβīn "دەمی نیوەڕۆ". نانی نیوەڕۆ لەبەر ئەوەی جەمێکی فرە و تێر و تەسەلە، بەم جۆرە ناوزەد کراوە.

**فرت fırt** - دەگەڵ "فرەوان" دێ [فرت و فرەوان fırt û fırawan]. خزمە دەگەڵ fortis (L.) "بەهێز" [دەبنەڕەتدا: زەلام، بەرز] و هەروەها ↑بەرز berz.

**فرتک fırtık** - "کونە لووت": فرمک fırmık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پرمە pırme و دواجار دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فرتوونە(ک) fırtûne(k)** [ *firtūna(k)* ] - "تۆفان(ی دەریا)": فرتینە fırtêne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فەرتەنە fertene "بشێوی، ئاژاوە، شێواوی". هەروەها فرت و هۆڕ fırt û hor هەیە بە مانای "بزوان و چوون و هاتنی بێ ئۆقرە".

**فرتۆڵ fırtol** - "جتێوێکە بە ژن دەدرا": مامۆستا هەژار ئەم وشەیەی وەک "گوشاد" مانا کردۆتەوە. لەوە ناچێ ئەم وشەیە پێوەندی بە "فرت" [فرت و فرەوان]ەوە هەبێ، چونکوو "فرتۆڵ" جتێوێک بوو کە تەنانەت باوکێک بە کچێکی چکۆڵەی خۆی دەدا. لەوە ناچێ باوک بە کچۆڵەی خۆی بڵێ "گوشاد"! بۆیە ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑فرتوونە(ک) fırtûne(k) "تۆفان(ی دەریا)"، ↑فەرتەنە fertene "بشێوی، ئاژاوە، شێواوی" و فرت و هۆڕ fırt û hor "بزوان و چوون و هاتنی بێئۆقرە". مەبەست لە "فرتۆڵ" دەبێ شتێکی وەک "شلۆق، بزۆز" یان "بەڕەڵڵا" بووبێ.

**فرتە fırte** [ *firta* ] - دە زمانی کوردمادیدا هەروەها لینگەفرتە lîngefırte و جرت و فرت cırt u fırt هەیە و ئەمانە خزمایەتیان هەیە دەگەڵ flattern (G.)، flittern (G.) و flackern (G.). ئەم وشانە بە مانای "پەڕ و باڵ لێکدانی توند، بزوان و لەرانەوەی خێرا، خۆ کوتانی زۆر بە دەوروبەری شتێکدا بەکاردێن، وەک باڵ لێکدانی پەپوولە بە دەوری ئاگر، یان شەکانەوەی ئاڵا و هەڵبەز و دابەز و خۆ بەم لا وئەو لادادانی گڕی ئاگر و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Flagge (G.) بە مانای "ئاڵا" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشە ئەڵمانییە دەگەڵ ↑فرکە fırka بەرهەڤ بکە [فرکەفرک واتا جم و جۆڵی خێرا]. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا چەند وشەیەکی دیکە هەن کە سەر بەم خێزانەن، وەک ↑پرتە pırte، [پرتەپرت کردنی گڕی چرا و ئاگر و هەروەها پرتەپرت کردنی مرۆڤ واتا زۆر دەم پێکدادانی]، پلکیدن pelakīdan (P.) "پەڕ و باڵ کوتان بە دوری شتێکدا"، ↑پەپوولە pepule. وشە ژێرمەنییەکان دواجار دەبردرێنەوە سەر ریشەی ***p(e)l-* (IE.) <** "زۆر، پڕ". [دیارە دە هەموو ئەو وشانەی سەرەوەدا لێکدان و هەڵبەزدابەز و بزوانی زۆر دەبیندرێ].

**فرتی1 fırtî** [ *firtī* ] - "هەڵگەڕانی شیر": دەچێتەوە سەر ریشەی ***wer-* (IE.) <** "سووڕان". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑فڕ fır "لوول"، ↑فەرتەنە fertene "بشێوی"، ↑فرفرە fırfıre و هتد.

[تێبینی: دە پلەیەکی هەرە دووردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پێل pel "شەپۆل"].

**فرتی2 fırtî** [ *firtī* ] - "ورتکە نان": ↑ورد wırd.

**فرچک fırçık** [ *firčik* ] - "ژەک": فرسک fırsık یش دەگوترێ.

1- کەرتی چک/ سک sık / çık دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑ژەک jek. کەرتی فر- fır دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەر ber و مەبەست لێرەدا "ژەکی بەرایی" واتا یەکەم بەشی ژەک بووبێ.

2- لەلایەکی دیکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑فرۆ fıro کە ئەمیش هەر مانای " ژەک" دەبەخشێ و دیسان پێوەندی بە بەر ber "پێش، سەرەتا"ەوە هەیە.

فرچه **fırçe** [ *fırča* ] - "برۆس، فڵچه": شێوه‌ی کۆنتری ↑فڵچه fılçe.

فرچیل **fırçel** [ *fırčel* ] - "دانه‌وێڵه‌ی نیوه‌کوڵاو": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فرۆ fıro "ژه‌ك" [شیری به‌رایی، پێش شیر]. "فرچیل" ئه‌و دانه‌وێڵه‌یه که هێشتا ماوه بکوڵێ و بگاتێ [پێش کوڵ، به‌رکوڵ].

فردقی **fırdıqî** [ *fırdıqī* ] - "فه‌رعانه، خۆشی پاش ته‌نگانه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فره fıre و ↑فره‌وان fırewan [فرت و فره‌وان fırt û fırawan] "گوشاد، هه‌راو، کراوه".

فردك **fırdık** [ *fırdık* ] - "ورکه‌نان بۆ تیکوشین": شێوه‌یه‌کی دیکه له ↑ور(د)که wır(d)ke.

فرز **fırz** [ *fırz* ] - "خێرا، به‌جموجۆڵ": فرز ferz (.P). خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فرکه fırke "جم و جۆڵی به‌په‌له".

فرزند **fırzend** [ *fırzand* ] - "رۆڵه، منداڵ": فرزند farzand (.P). ده‌شێ پێک هاتبێ له دوو که‌رتی فر + زند fır + zend. که‌رتی دووه‌می وشه‌که خزمه ده‌گه‌ڵ Kind (.G)، kind (.Nl) "زارۆك" و kind (.E) "جنیس، ره‌گه‌ز، جۆر" و kundr (.OIs) "کوڕ، خزم". ئه‌م ریزه‌وشه‌یه خزمن ده‌گه‌ڵ ↑زان zan. که‌رتی یه‌که‌می وشه‌که جێی لێکۆڵینه‌وه‌یه.

فرژین **fırjîn** [ *fıržīn* ] - "پرماندن": بنه‌وشه‌ی فرژ -fırj هه‌روه‌ك ↑پرمه pırme و گه‌لێك ده‌نگه‌وشه‌ی دیکه خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فوو fu "با، هه‌وا، هه‌ناسه".

فرشته **fırışte** [ *fırışta* ] - "بوونه‌وه‌ری جوانی ئاسمانی": فریشته fırîşte ش ده‌گوترێ. فرشته fereşte (.P) " فرشته"، فریسته‌ك fristak (.Pl) "ناردراو، په‌یامهێنه‌ر"، fraēšta (.Av). ئه‌م وشه‌یه ده‌شێ پێوه‌ندی هه‌بێ به کرداری فرستادن ferestaden (.P) و frīstātan (.Pl) "ناردن، شاندن". به‌م پێیه "فرشته" ده بنه‌ڕه‌تدا واتا "ناردراو".

فرغه **fırġe** [ *fırġa* ] - "زیپك گۆیی، ئیرادگیری": خزمه ده‌گه‌ڵ fluchen (.G)، vloeken (.Nl) "تووك و نزا لێکردن، به له‌عنه‌ت کردن"، flōkan (.Gt) "گله‌یی کردن، سکاڵا کردن"، plangere (.L) "لێدان، ماته‌مبار بوون" [له سینگی خۆ دان]. ئه‌م وشه ئه‌ورووپییانه دواجار خزمن ده‌گه‌ڵ ↑پلۆسین *pılosîn* "لێدان" و ↑فه‌لاقه felaqe و هتد.

فرفره **fırfıre** [ *fırfıra* ] - "له‌یستۆکی بسووڕ": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فڕ fır "لوول" و ↑وڕ wır "گێژ" و گه‌لێك وشه‌ی دیکه که ده‌چنه‌وه سه‌ر ریشه‌ی ***wer* - > (.IE)** "سووڕان".

فرفینكَ **fırfîng** [ *fırfīng* ] - خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فوو fu "با، هه‌وا، هه‌ناسه". هه‌روه‌ها هه‌ڵی سه‌نگینه ده‌گه‌ڵ ↑فینگه finge "ده‌نگی گریان" [ده بنه‌ڕه‌تدا لووت هه‌ڵکیشان؟] و ↑فرمك fırmık "کونه لووت" و ↑فرمێسك fırmesk.

فرقات **fırqat** [ *fırqāt* ] - "کوڵی گریانی قه‌تیس ماو": خزمه ده‌گه‌ڵ ئه‌و ده‌نگه‌وشانه‌ی پێوه‌ندییان به ↑فوو fu هوه هه‌یه. هه‌روه‌ها هه‌ڵی سه‌نگینه ده‌گه‌ڵ ↑فرمێسك fırmesk.

فرك **fırk** - "بێچوو هێنان": (تایبه‌تی بۆ ماین). هه‌ڵی سه‌نگینه ده‌گه‌ڵ ئه‌و وشانه‌ی له‌ژێر ↑فرووچ fıruc "جووجکه مریشك"دا باس کراون.

فرك(ه) **fırk(e) 1** - "1 - بزوان یان راکردنی به په‌له 2- باز بردنی بڵیند": [فرکه‌فرك] پێوه‌ندی هه‌یه به ↑فرین fırîn، ↑فرته fırte و له‌وانه‌شه ↑په‌ڕین perîn "بزوانی خێرا".

فرك **fırk 2** - "قومێك": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑فڕ fır [4] کردن "هه‌ڵقوراندن".

فرکاندن **fırkandın** [ *fırkāndın* ] - "گڵۆفین": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑پریواندن prîwandın [پرواندن pırwandın].

فرمك **fırmık** - "کونه لووت": ده‌شێ خزم بێ ده‌گه‌ڵ ↑پرمین pırmîn [پرماندن].

**فرمێسک fırmesk** [ *fırmesk* ] - "ئەسرین، رۆندک": فرێشک fırêşk یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە دوو کەرتی فر(م) + ئێسک/ ئێشک fır(m) + esk / êşk. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ هێندێک دەنگەوشەی وەک ↑فکە fıke، ↑فینگە fînge، ↑پرمە pırme و ↑فرژە fırje و هتد. ئەم دەنگانە دواجارخزمن دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ پێوەندی تێوان "هەناسە" و "هەنیسک"]. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا ئێسک/ ئێشک -esk / -êşk خزمە دەگەڵ اشك ašk (P.) "فرمێسک" و دواجار دەگەڵ ↑ئەسر(ین) esır.

**فرن fırın** - "تەندووری بڵێند": < (L.) *furnus* "وەجاغ، ئاگردان". دەشێ وشە لاتینییەکە دواجار دەگەڵ ↑پەنگر pengır و ↑پۆلوو polu ی کوردمادی هاوریشە بێ.

**فرووج fıruc** [ *fırūj* ] - "جووجکەمریشک": فەرووج feruc یش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە فەر + ئووچ **fer + *uç*. کەرتی دووەم دەبێ پاشگری گچکاندن بێ. فەر- fer خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بار bar، ↑باریک barîk، ↑فەریک ferîk، ↑بەرخ berıx و هیتر. گشتیان دە ئەسڵدا بە مانای "چکۆڵە، بێچوو".

**فروزی fırûzî** [ *fırūzī* ] - "زۆر وردیلە": خزمە دەگەڵ ↑فرووج fıruc "جووجکە مریشک". وێدەچێ ↑پرووش pırûş "کەم هێز بوونی چاو، کەم بوونەوەی بینایی"یش پێوەندی بەم خێزانەوشەوە هەبێ. ریشەی ئەم وشانە مانای "کەم، چکۆڵە" دەبەخشێ. پرووش بوونی چاو دەبێ یان بە مانای خۆ چکۆڵە کردنەوەی چاو (بۆ دیتنی باشتر) یان بە مانای لە کەمی دانی (هێزی) چاو بێ. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم وشانە هەروەها بڕوانە ↑پوور *pur*.

**فرۆ fıro** - "ژەک، هەوەڵ شیری دوای زان": خزمە دەگەڵ ↑بەر ber "زوو، پێش" و مەبەست شیرێکە کە لە بەراییدا واتا دوابەدوای زان دێتە دەر [بەرەشیر]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ هێندێک وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا وەک früh (G.)، fruoi (OG.) "زوو"، prōí (Gr.) "زوو"، prōios (Gr.) "بەیانییانە" و prā-tár (OIn.) "زوو".

**فرۆشتن fıroştın** [ *fıroštın* ] - فرۆتن fırotın یش دەگوترێ.

1- جێی بەراورد کردنە دەگەڵ feil (G.) "هەرزان، فرۆشتنی"، feili (OG.)، fal (Sw.) "بەرفرۆش"، pōleīn (Gr.) "فرۆشتن" و pelnas (Lit.) "دەسکەوت"، polon (Rus.) "دەسکەوتی راو"، سەر بە ریشەی **< *pel-** **(IE.)** "فرۆشتن، بەدەست هێنان، دەرهێنان (ی داهات)". هەروەها وشەی پێڵەور pelewer "چەرچی، فرۆشەری گچکە" دەشێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑پار(ە) par(e) "تیکە، لەت، بەش"، سەر بە ریشەی **< *per-** **(IE.)** "دابەش کردن، *فرۆشتن*".

**فرە fıre** [ *fıra* ] - "زۆر": خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەژی، زۆر، زاف".

**فرەز fırez** [ *fıraz* ] - "پارچەیەکی جوانی تووکنە دەکرێتە پشتەکەوای ژنانە": خزمە دەگەڵ فەرەجی ferecî [↑فەرەنجی ferencî] و ↑فەراجە ferace.

**فرەقین fıreqîn** [ *fıraqīn* ] - "لەبەریەک چوون، پەرتین": بنەوشەی فرە -fıre لێرەدا دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پار(ە) pare "پارچە، لەت". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ دە بنەڕەتدا **پارەکین/ *پەرەکین* بووبێ بە مانای "پارە پارە بوون".

[تێبینی: ناوگری ک k دە کردارە کوردمادییەکاندا ئاماژە بە دۆخی جەخت کردن دەکا، وەک خلیسکان، ئاڵۆزکان، بزرکان، دامرکان، پەشۆکان و هتد. ئەم ناوگرە هێندێک جار دەبێتە ق q یان ژ j].

فرەوان **fırewan** *[ fırawān ]* - "هەراو، گوشاد": فراوان farāwān (P.) "فرە، زۆر". خزمە دەگەڵ ↑فرە fıre.

[تێبیی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "زۆری" لە لایەك و "هەراوی و "فرەوانی" لە لایەکی دیکەوە، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "زۆر" کە دە بنەڕەتدا دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "لەبەر یەك کشانەوە، هەراو بوونەوە"].

فریا(د) **fırya(d)** *[ fıryā(d) ]* - "هاوار": فریاد faryād (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ورتە wırte و چەندین وشە کە ئاماژە بە دەنگ و دەنگ هەڵبڕین دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *uer- , *wer-*** "گوتن، قسەکردن".

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیك دەتوانین دەگەڵ ئەم دوو وشە خزمەی خوارەوە هەڵی سەنگێنین: *وار* "ماڵ، حەوش" و *وریا*. جێی سەرنجە کە ئەم دوو وشەیەش دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوشێوە، بەڵام بەمانا جیاواز، واتا ریشەی *(IE.) *uer- , *wer-* "دەورگرتن و پاراستن و ئاگا لێبوونی شوێنێك بە دارو دیوار"].

فڕین **fırîn** *[ fırīn ]* - "بزوان دە هەوادا": پریدن parīdan (P.). [وشە فارسییەکە هەم بە مانای "فڕین" و هەمیش بە مانای "پەڕین" بەکار دێ].

1- لە لایەکەوە دەتوانین بیبەستینەوە بە ↑پەڕین perîn [دەرپەڕین] "بزوانی خێرا"، سەر بە ریشەی ***< (IE.) *preu-***.

2- لە لایەکی دیکەوە دەشێ بەراوردی بکەین دەگەڵ fliegen (G.)، fly (E.)، vliegen (Nl.)، flyga (Sw.). ئەم وشە ژێرمەنییانە پێوەند دەدرێنەوە بە plakti (Lit.) "مەلە کردن" و دەبردرێنەوە سەر ریشەی ***< (IE.) * pleu(k)-*** "مەلەکردن، فڕین، جووڵانەوەی خێرا" و دوورتر سەر بە ریشەی ***< (IE.) *p(e)l-*** "زۆر، فرە".

[تێبینی: پێ دەچێ ئەم دوو ریشەیەی سەرەوە، واتا - *pleu(k)** و *preu-** پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و یەکیان لەوەی دیکەوە پەیدا بووبێ. ئەم بۆچوونە بۆ وێنە دەتوانین سەبارەت بە دوو ریشەی *wel-** و *wer-** یش بێنینە گۆڕێ کە دە زمانە هیندوئەورووپییەکان و لەوانەش زمانی کوردمادیدا بە دەیان وشەیان لێ کەوتۆتەوە کە مانای "سووڕان" دەبەخشن].

فریو **fırîw** *[ fırīw ]* - "خاپاندن، هەڵخەڵەتاندن": هەروەها fırîw(y)an و fırîb(y)an هەن بە مانای "فریو خواردن" و (هەڵ)فریواندن (hel)fırîwandın "فریو دان". فریب farīb (P.) و فریفتن farīftan (P.) "فریو دان". دەبێ خزم بێ دەگەڵ werben (G.) "حەول دان، دەست خستن"، hwerban (OG.) "سووڕان، تەقەلا کردن"، hwaírban (Gt.) "گۆڕین"، hweorfan (OE.)، hverfa (OIs.) "با دان(ەوە)". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ Wirbel (G.) "چەرخین، سووڕان" [هەروەها ئاژاوە، شێواوی] و Wirbelsäule (G.) "تیغەرەی پشت" [ئەستوونی وەرسووڕان (ی لەش)] و karpós (Gr.) "مەچەکی دەست" [شوێنی وەرسووڕانی دەست]. بە گوێرەی بۆچوونێك ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***< (IE.) *kuerp-*** "سووڕان". ئێستا بزانین چۆن دە زمانی کوردمادی و فارسیدا مانای "فریو" دروست بووە. وەك لە ژێر وشەی "گۆڕین"دا دەیبینین، ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی werden "بوون بە" [لە دۆخێکەوە بوونە دۆخێکی دیکە، گۆڕان لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە" [بە فارسی: "شدن"]. ئەم وشانەی دوایی دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *uer* بە مانای "سووڕان، با دران". وێ دەچێ ئەو ریشەی سەرتر شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ هەر لەم ریشەیە. ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەوەیە کە چەمکی "گۆڕین" پێوەندی بە چەمکی "سووڕان"ەوە هەیە. لە لایەکی دیکەوە چەمکی "فریو، تەڵەکە" پێوەندی بە چەمکی

"گۆڕین"ەوە پەیدا دەکا، چونکوو فریو دان دە بنەڕەتدا بریتییە لە "لێ گۆڕین" واتا گۆڕینی مەبەستیکی خراپ دە ڕوواڵەتدا و نیشان دانی وەک شتیکی باش. ئەم پێوەندییە دە دوو وشەی ئەڵمانی tauschen "گۆڕینەوە" و täuschen "فریو دان، بە لارێ بردن"دا بەباشی دەردەکەوێ. ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ "تەشقەڵە"ی کوردمادی. دە کوردەواریدا هەروەها "دەست با دان" بە مانای "فریو دان و فێڵ کردن" بەکار دێ.

[تێبینی: ئەگەر ریشەی *kuerp- (IE.) شێوەیەکی پەرەگرتووی ریشەی *uer (IE.) بە مانای "سووڕان، با دران" بێ، ئەوا وشەی "فریو" [فریوان، فریواندن] دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پریواندن pırîwandın].

**فرێ fıre** [*fıre*] - فرێ دان یان فرە دان fıre dan واتا هاویشتن. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑فرین fırîn [هەر وەک چۆن "پرت" کردن بە مانای فرێ دان پێوەندی بە "پەڕین"ەوە هەیە (دەرپەڕین) و ئاماژە بە براوتیکی خێرا دەکا].

2- werfen (G.) "هاویشتن، فرێ دان"، سەر بە ریشەی **< *wer-, *uer- (IE.)** "سووڕان، با دران، چەمانەوە". ئەم مانایە لەمەوە پەیدا بووە کە لە کاتی هاویشتندا شتیان بە دەست هەڵسووڕاندووە و هاویشتوویانە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وڕ *wır* "گێژ، سەرسوڕماو" و ↑فڕ fır [مووی فڕ، واتا لوول]. دە شێوەزارەکانی کوردمادیدا وارۆ واینە waro wayne بە مانای "فرێ دان" هەیە. لەوە دەچێ وارۆ waro شێوەیەکی دیکە لە "فرێ" بێ. سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "سووڕان" و "فرێ دان" هەروەها بڕوانەی وشەی "هاویشتن".

**فرێت fırêt** [ *fıret* ] - "پۆ": [تان و پۆ]. پێوەندی هەیە بە ریشەی **< *ple-, *pla- (IE.)** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ وشەگەلێکی وەک ↑پەل pel "پان و بەرین"، ↑فێل fel "دەفری دەم پان"، ↑فراخ fırax "ئامان، قاب و قاچاخ"، ↑ولات wılat [وەڵات welat] "پانتایی زەوی" [Feld (G.) "مەزرا، زەوی و زار"] و هتد.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکی"پۆ" دەگەڵ "لەبەر یەک کشانەوە" دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە بەرهەڤی بکە: وشەی پۆ po ["پود" بە فارسی] خزمە دەگەڵ "پان" و لەوانەشە "پەت"، سەر بە ریشەی *pet- (IE.) "پان و بڵاو کردنەوە". وشەی "تان" (تان و پۆ) خزمە دەگەڵ "تەنین" و ئەمانیش دەچنەوە سەر ریشەی *ten- (IE.) "تەنینەوە، درێژ بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە". هەروەها "داو" (دەزوو، ریس) خزمە دەگەڵ "تەون"، سەر بە ریشەی *te(m)p- (IE.) "تەنین، لەبەر یەک کێشانەوە". ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری *ten- (IE.)].

**فزدووک fızduk** - "زیپکەی باڵغ بوون": فزدەڵە fızdele ش دەگوترێ. کەرتی دووەم لە هەر دوو وشەکەدا پاشگرە. بنەوشەی -fız دەگەڵ ↑پزان pızan [هەڵپزان] بە مانای "ماسین، هەڵمسان". بەم جۆرە وشەکە مانای "هەڵمساوی چکۆڵە" دەدا. هەروەها خزمە دەگەڵ چەندین وشە لە ژێر ↑باژەڵە bajele و ↑پووچ *puç* "بۆش، بەتاڵ، بێ ناوەرۆک"دا باس کراون.

**فزە fıze** [ *fıza* ] - "جووڵە، بزاڤ [یکی کەم]": خزمە دەگەڵ کرداری ↑بزووتن bızutın.

**فز(ز)ە fız(z)e** [ *fız(z)a* ] - "1- هەناسە 2- دەنگی لووتی گیراو": خزمە دەگەڵ ↑پشوو pışû "هەناسە".

**فژوو fıju** [ *fıžū* ] - "1- پیسایی 2- پیس و پۆخڵ": خزمە دەگەڵ ↑پیس pîs.

**فس fıs 1** - "1- بای سك 2- دەنگی پشیلە دەركردن": خزمە دەگەڵ ↑فوو fu. مانای دووەمی وشەكە پێوەندی هەیە بە وشەی ↑پشی pışî و ↑پشیلە pışle. دە شێوەزاری كوردمادی سەروودا بە پشیلە دەگوترێ ↑پسیك pısîk.

**فس fıs 2** - [فس خواردن]. ئەسڵی وشەكە بە مانای "داهاتنەوە، چەمانەوە"یە، بۆ وێنە كاتێك مریشك فس دەخوا بۆ كەڵەباب، یان كاتێك دەڵێن فڵانی لە شەڕدا فسی خوارد. لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە فڵانی خۆڕاگری پێ نەكرا و لەبەرانبەر نەیاردا چەماوە، دانەویا و خوار بۆوە. كرداری ↑بەزین² bezîn لە شەڕ یان لە پێشبڕكێدا دە ئەسڵدا هەر ئەو مانایەی هەبووە و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە چەمانەوە و دانەوین واتا "دۆڕان" لەكاتی شەر و زۆرەوانیدا بووە. پاشان مانایەكی بەربڵاوتری وەرگرتووە و بە گشتی بە مانای "دۆران" بەكار هێنراوە. دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ↑فسۆس fısos هەیە بە مانای مرۆڤی ترسەنۆك كە زوو ورە بەر دەدا و دەبەزێ و هەروەها فسفس پاڵەوان fısfıspalewan "خۆهەڵكێشێ خوێڕی". جگە لەمە وشەكانی ↑فچ fıç و ↑فت fıt [فت بوون واتا دۆڕان] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑داپسكان dapıskan "1- بەكزی كرۆشمە كردن 2- فس خواردنی مریشك بۆ كەڵەشێر" [دەبنەڕەتدا: داهاتنەوە، چەمانەوە، خواربوونەوە]، ↑فیزانەوە fîzanewe، و دواتر دەگەڵ ↑بازنە bazne و ↑*باسك bask* و ژمارەیەك وشەی دیكە.

**فسار fısar** *[ fısār ]* - شێوەیەكی دیكە لە ↑هەوسار hewsar "جلەو" [افسار afsār (.P)].

**فستقان fıstıqan** *[ fistıqān ]* - "لە بەر لووسی لە دەست خزین": هەروەها فستك fıstık یان فستەك fıstek هەیە بە مانای "رەت بردن، خلیسكان". دەشێ پێوەندی بە هێندێك وشەوە هەبێ وەك ↑*بزووتن bızûtın* و ↑بازد bazd و هتد.

**فسقل fısqıl** - "گزگل، بەرێكی دارمازوو": خزمە دەگەڵ ↑فسقلی fesqelī "چكۆڵە، وردیلە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بچووك bıçûk [بچكۆڵە bıçkole] و هەروەها ↑بێچوو beçu. هەروەها فسقە fısqe هەیە بە مانای "خسكە، پیوازی وردیلە بۆ چاندن" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ بەچكە beçke]. ئەم بەرهەمانە لەبەر وردیلە بوونیان ئەم ناوانەیان وەرگرتووە. شیاوی باسە كە وشەكانی "گزگل" و "خسكە"ش مانای "ورد و چكۆڵە" دەبەخشن و خزمن دەگەڵ "كچ" [كیژ] ی كوردمادی و "كوچك"ی فارسی.

**فسۆس1 fısos** - "جانەوەرێکە بۆتیکی پیسی لێ دێ": فس + ئۆس fıs + os. لەوە ناچێ ئەم وشەیە پێوەندی بە "فس" و با لێبوونەوە هەبێ کە وەک سیفەتی ئەو ئاژەڵە دیاری کراوە. بەڵکوو دەشێ خزم بێ دەگەڵ وشەکانی Wiesel (G.)، wisula (OG.)، wezel (Nl.)، weasel (E.)، vessla (Sw.). ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە یەکلا نەکراوەتەوە. بەپێی بۆچۆتیک دەچێتەوە *(IE.) *ueis-* "توانەوە و جاری بوون (بەتایبەتی بۆ گژ و گیای رزیو و تراوی بۆگەن)" و دە بنەڕەتدا مەبەست لەم وشەیە ئاژەڵی "بۆگەن" بووە. ↑وەشەکێ weşeg "جانەوەرێک لە تیرەی دەڵەک و رێوی" لەم ریشەوە هاتووە. وێ دەچێ "وەشەکێ" و "فسۆس" دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بووبن. وشە ژێرمەنییەکەی سەرەوە دە وشەنامەی فارسیدا وەک "راسو" مانا کراوەتەوە و راسوش وەک ئاژەڵێک ناسێنراوە کە کە کاتی رووبەرووو بوونەوە لەگەڵ دوژمندا بۆتیکی پیس بڵاو دەکاتەوە. هەر بۆیە فسۆس یان وەشەکێ دە زمانی کوردمادیدا دەبێ دوو ناوی کۆن بن و ئەم ناوە دە فارسیدا نەماوە و وشەی "راسو" لە جێی داندراوە.

**فسۆس2 fısos** - "کەسێک کە دە شەر و کیشەدا دەترسێ و زوو دەبەزێ": فس + ئۆس fıs + os. بنجی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑فس2 fıs خواردن واتا "بەزین و دۆڕاندن". هەروەها فسەک fısek یش دەگوترێ بە مانای "نەوێر، ترسنۆک". کەرتی دووەم پاشگرە، دۆخی جەخت کردن دروست دەکا.

**فسە fıse** - "پچە": شێوەیەکی دیکە لە ↑پچە piçe.

**فسین¹ fısîn** [ *fısīn* ] - "با لێ بوونەوە": ↑فس1 fıs.

**فسین² fısîn** [ *fısīn* ] - "پەڕینی پەڵەوەر" [پێدافسین]: بنەوشەی فس -fıs لێرەدا پێوەندی هەیە بە هێندێک وشەی وەک ↑بەزین bezîn [هەڵبەزین] و ↑بازد bazd و مەبەست دە بنەڕەتدا ئەوەیە کە پەلەوەری نێر بازد دەداتە یاخود هەڵدەبەزێتە سەر پەلەوەری مێ.

[تێبینی: لە باری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ کرداری پەڕین perîn کە ئەویش هەم بە مانای "بازد دان" و هەم بە مانای "خۆ هاویشتنە سەر مێینە" (بۆ ئاژەڵ) بەکار دێ].

**فش1 fış** [ *fiš* ] - "گوشاد، هەراو، ئاوەڵا": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "فراوانی، زۆری، هەراوی" دەبەخشن، وەک ↑بۆش boş، ↑بەس *bes*، ↑بەش¹ beş [بەش ناکا واتا بەس نییە]، ↑بێشە bêşe و هتد.

**فش2 fış** [ *fiš* ] - "چڵم": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پشکەڵ pışkel و ئەو وشانەی لەوێدا هاتوون.

**فشفشە fışfışe** [ *fišfiša* ] - "فیشەکەشێتە": فشفشە fešfeše (P.). خزمە دەگەڵ ↑فیشەک fîşek "گوللە".

**فشقە fışqe** [ *fišqa* ] - "جۆرێک دەنگی گیانەوەر لە کاتی دەرپەڕیندا 2- دەنگی فیچقە کردنی ئاو": خزمە دەگەڵ ↑فوو fu. کردارەکەی دەبێتە فشقاندن fışqandın.

**فشکین fışkîn** [ *fiškīn* ] - "پشمین، پنژین": خزمە دەگەڵ ↑پشمین pışmîn و ئەمەش دەچێتەوە سەر دەنگەوشەی پشمە pışme [پژمە pıjme] و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فشە fışe** [ *fiša* ] - "شۆخی، جەفەنگ": ئەم وشەیە دەبێ پێوەندی هەبێ بەم ریزەوشانە کە باس لە "با کران، هەڵمسان، زۆری، هەراوی" دەکەن وەک ↑فیس fîs، یاخود ئەو دەنگانەی لە کاتی دەرچوون و رەت بوونی با [هەوا] پەیدا دەبن، وەک ↑فسە fıse، ↑وژژە wıjje، ↑فشقە fışqe و هتد. ئەوەی کە لە باری ماناوە پێوەندی فشە بەم وشانەوە، چوناوچۆنە، جێی لێکۆڵینەوەیە.

بەڵام دوو بەڵگە ئەم پێوەندییە زۆرتر پشتراست دەکەن کە یەکەمیان وشەی فشقیات fışqîyat ە بەمانای فشە، گاڵتە و گەپ [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑فشقە fışqe]. دووەمیان وشەی posse (.L) "فشە، گاڵتە"، دە بنچینەدا بە مانای "هەڵمسان"ە. رەنگە ئەم وشە لاتینییە بێ ئەوەی پێوەندییەکی راستەوخۆی بە وشە کوردمادییەکەوە هەبێ، دە ریشەدا خزم بێ. فشە هەروەها بە مانایەکی دیکەش بەکار دێ، واتا "دەنگی با کە کەلێنەوە دێ".

**فشین1 fışîn 1** [ *fišīn* ] - "با کردن، فوو کردن، هەڵمساندن": لە خۆ فشین واتا با لەخۆ کردن، خۆ هەڵمساندن، لەخۆ بایی بوون، خۆ زل کردن. بنەوشەی فش -fış وەك وشەیەکی سەربەخۆش دە زمانی کوردمادیدا هەیە [فش و فۆڵ] و مانای "گوشاد، هەڵمساو، فرەوان" دەبەخشێ. بەم جۆرە وشەکە خزمە دەگەڵ ↑فش *fış*، ↑فیس fîs / فیز fîz "دەعێ، با دەخۆ کردن، لەخۆ بایی بوون".

**فشین2 fışîn 2** [ *fišīn* ] - "هاشەی مار، دەنگی ماری تووڕە کە لە فیکە دەکا": ↑فیزین fîzîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە". دە پلەیەکی دووررتردا پێوەندی پەیدا دەکا دەگەڵ ↑فشین1 fışîn 1 بە مانای "بادیهەوا بوون، لەخۆ بایی بوون". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑فشە fışe "دەنگی با کە کەلێنەوە دێ".

**فك fık** - فك کردن واتا "1- کردنەوەی پێچراوی زامدار یان لەجێ چووك 2- زانینی پرسی دژوار": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***ui-* , *wi- < (IE.)** "لە یەکتر جیا بوونەوە، لە یەکتر دوور بوونەوە". پێشگری ڤە -ve یان پاشگری we(e) (ە)وە [ڤەکردن ve kırın، کردنەوە kırdınewe] لەم ریشەوە هاتووە.

**فکلە fıkle** [ *fıkla* ] - "1- تۆێڵ، تیوچاوان 2- مووی سەر تیوچاوان": خزمە دەگەڵ ↑بسك bısık "مووی سەر لا جانك" و ↑بژ bıj [یاڵ و بژ].

**فکە fıke** [ *fıka* ] - "دەنگی گریان و ناڵین": کردارەکەی دەبێتە فکین fıkîn "گریان و ناڵین". [فغان faġān (.P)]. خزمە دەگەڵ ↑فینگە fînge و دواجار دەگەڵ ↑فوو fu.

[تێبینی: لەباری پێوەندی "فوو" لە لایەك و "فکە" واتا گریان لە لایەکی دیکەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ هەناسە و هەنیسك].

**فل fıl** - "شل و شەکەت": [فل بوون واتا زۆر ماندوو بوون]. ول wel (.P) [شل و ول šol o wel] هەروەها ولو welou (.P) "بڵاو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "پان و بڵاو" بوون. مەبەست لە "فل بوون" دە بنەڕەتدا پان و بڵاو بوونەوە بەسەر ئەرزدا بووە لەبەر ماندوویەتی زۆر. خزمە دەگەڵ ↑بڵاو bılaw و چەندین وشەی دیکە کە لە ژێر ↑*وڵات wılat* دا باس کراون.

**فلتان fıltan** [ *fıltān* ] - "شەکەت بوون، فل بوون": خزمە دەگەڵ ↑فل fıl.

**فڵتۆخ fıltox** - "لەبەریەك هەڵوەشاو": خزمە دەگەڵ ↑فل fıl.

**فلتە fılte** [ *filta* ] - "قسەی بێجێ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پەلێت pelît [هەلێت و پەلێت] و plaudern (.G) "خۆش و بێش (قسە) کردن". وشە ژێرمەنییەکە دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگ و هەرایە.

**فلتین fılıtîn** [ *filıtīn* ] - "رزگار بوون، دەرباز بوون": شێوەیەکی دیکە لە ↑فەلتین feltîn "هەڵاتن، دەرباز بوون".

**فڵچ1 fılç 1** [ *filč* ] - خزمە دەگەڵ ↑پڵچ pılç [پان و پڵچ].

**فڵچ2 fılç 2** [ *fılč* ] - دەگەڵ "دەم" دێ [دەم و فڵچ dem û fılç]. خزمە دەگەڵ ↑پل1 [دەم و پل].

**فلّچه fılçe** [ *fılča* ] - "برۆس": فرچه fırçe و فرشه fırşe ش دەگوترێ. فرچه ferče (P.)، لەوە دەچێ وشەیەکی وەرگیراو بێ. ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ وێنە بەم چەشنەیە: brush (E.)، Bürste (G.) "برۆس، فلّچە". ئەم وشانە دە زمانە کۆنە ژێرمەنییەکاندا بە مانای"موو یان خوری زبر" بوون، وەک bursta (OG.)، byrst (OE.) و borst (Sw.). وشەکان دەچنەوە سەر ریشەی **< *bhar-** ***(IE.)*** "چقڵ، تیژایی، زبری". bhrstí-h (OIn.) "نووک، گۆشە، دەرپەڕیوی" و Bart (G.) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "ردێن" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ↑پۆڕ por "کاکۆڵ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**فلفل fılfıl** - "بیبار": فلفل felfel (P.)، شێوەی عەرەبێنراوی ↑بیبار bîbar یان بیبەر bîber.

**فلّقانەوە fılqan(ewe)** [ *fılqānawa* ] - "تولّخانەوە، پلّیشان": فلیقان fılîqan یش دەگوترێ. بنەوشەی فلّق -fılq بە جیاش بەکاردەهێندرێ و دەگوترێ "فلّقە لێ هاتن" یان "جلّق و فلّق دەرهاتن". خزمە دەگەڵ welk (G.) "سیس و چرچ" و welken (G.) "چرچ بوون، چرمسین". وشەکانی welk (OG.)، welc (MG.) و (MNl.) بە مانای "تەڕ، ئاودار" بوون و پاشان وشەکان مانایەکی پێچەوانەیان وەرگرتووە، واتا سیس و هیشک هەڵاتن و چرچ بوون. Wolke (G.)، wolken (OE.) "هەور"، vilgti (L.) "تەڕ کردن"، vologa (Rus.) "تەڕایی" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *welg-** ***(IE.)*** "تەڕ، ئاودار". لەم تێروانینەوە دەتوانین بڵێین کە فلّیقان، ↑فلّقە fılqe لێ هاتن یان جلّق و ↑فلّق cılq u fılq دەرهاتن ئاماژە دەکەن بە چەمکی "تەڕ بوون" یاخود "تەڕایی دانە دەرەوە"، بۆ وێنە کاتێک شتێکی وەک میوە یان زیندەوەرێک بە هۆی پاڵ پێوەنان یان پان و پلّچ بوونەوە، هەناوی دەڕژێتە دەرەوە و تەڕ دەبێ. شیاوی باسە کە فلّیقان بۆ پان و پلّچ بوونەوەی شتێک بە کاردەهێندرێ کە تەڕایی دە ناوەوەیدا هەبێ، نەک بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموو پان و پلّچ بوونەوەیەک.

**فلووت fılut** [ *fılūt* ] - وشەیەکی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر flaute (OF.) "فلووت". ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**فلووف fılûf** [ *fılūf* ] - "خولیا و ئارەزووی زوو ڕابر": هەروەها فلووفا fılûfa و فلووفاو fılûfaw هەن بە مانای "خولیادار". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑فریو fırîw و فریفتە farīfte (P.) "فریواو، شەیدا". لەوانەیە وشەکە هەمان "فریواو" بووبێ.

2- فاڵ² fal.

**فلین fılîn** [ *fılīn* ] - "ڕێکگوشران، هەڵقرچان": خزمە دەگەڵ ↑وڵین wılîn "گوشین" و هێندێک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان".

[تێبینی: لە باری پێوەندی دوو چەمکی "سووڕان" و " گلّۆفین" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ فەرکاندن ferkandın].

**فم fım** - فم کردن واتا دەرخستنی توندی هەوا لە لووت بۆ چلّم دەرکردن. فین fīn (P.). خزمە دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فناز fınaz** [ *fınāz* ] - "کاری ناڕەوا و مایەی شەرمەزاری": فناس fınas یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Feind (G.)، fiend (E.)، fiende (Sw.) "دوژمن"، fiēn (OG.)، fijan (Gt.)، fion (OE.)، fjā (OIs.) "رق لێبوون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *pē(i)-** ***(IE.)*** "زیان گەیاندن، ئازار

دان، سووکایەتی کردن". کەرتی ئاز az- یان ئاس as- پاشگرە و شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑ئۆز oz-.

**فنج[1] fınc** [ *finj* ] - "دەنگێ لە لووتەوە هاتن": [فنجەفنج]. خزمە دەگەڵ ↑فینگە fînge "دەنگی گریان لە لووتەوە" و دواجار دەگەڵ دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فنج[2] fınc** [ *fınj* ] - دەگەڵ "گنج" دێ [گنج و فنج gınc û fınc]. "گنج" خۆی لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "چەمانەوە". هەر بە م شێوەیە "فنج"یش خزمە دەگەڵ ↑فیزانەوە fîzan(ewe) "چەمانەوە، نووشتانەوە". فۆتیمی n دە وشەی "فنج"دا زێدەیە و بۆیە خزاوەتە ناو وشەکەوە تاکوو دەگەڵ وشەی "گنج" باشتر بێتەوە. تیوەخزانی ئەم فۆتیمە دە ژمارەیەک وشەی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ، لەم بارەوە بروانە وشەی "کرمانج" [کۆنتر: کوردماد].

**فنچقە fnçıqe** [*finçıqa* ] - "خونچە، شکۆفەی تازە": دە بنەڕەتدا بە مانای "چکۆڵە، خڕکەڵە"یە و خزمە دەگەڵ ↑فندلی fındlî "چکۆڵەی نازدار".

**فند fınd** - "1- مۆم 2- شەمچە": فندک fındık یش دەگوترێ. fandak (P.) "چەخماق بۆ هەڵکردنی جگەرە". هەروەها فندانک fındanık هەیە بە مانای "شەمدان". خزمە دەگەڵ ↑پەنگر pengır "پۆڵوو".

**فندلی fındlî** [ *findlī* ] - "چکۆڵەی نازدار": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *pau- (IE.)** "کەم، بچووک، گچکە".جگە لەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا ↑فنک fınık و ↑فنچقە finçıqe ش هەن کە یەکەمیان بە مانای "جاش ئێستر، بێچووی ئێستر"ە و دووەمیشیان بە مانای "خونچە". [بەراوری وشەی "خونچە" بکە دەگەڵ "خونجیلانە" واتا "چکۆڵەی جوانکیلە". ئەم دوو وشەیە لە یەک خێزانن]. "فندلی" و وشەکانی سەرەوە خزمن دەگەڵ ↑پوور pur و ئەو وشانەی لەوێدا باس کراون.

**فندق fındıq** - "بەرێکی دارە لە تیرەی پستە و بادام": فندق fendeq (P.). دە پەهلەویدا fundig (Pl.). دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑فنچقە finçıqe هەیە بە مانای "خونچە". وشەی "فنچقە" چ لەباری شێوە و چ لەباری ماناوە زۆر لە "فندق" دەچێ. دەشێ وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑فنچقە finçıqe و ↑فندلی fındlî "چکۆڵە، وردیلە". لەباری ماناوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ "فسقل"، "گزگل" و "خسکە". ئەم وشانە دە زمانی کوردمادیدا ناوی بەرهەمی وردیلەن و دە بنەڕەتدا مانای "چکۆڵە، کەموسکە" دەبەخشن. وشەی ↑فسقل fisqıl یش لەم ریشەی سەرەوە هاتووە. دە زمانی فارسیدا فسقلی fesqelī (P.) بە مانای "فندلی"ی کوری بەکار دێ.

**فنک fınık** - "جاش ئێستر": خزمە دەگەڵ few (E.) "کەم" سەر بە ریشەیەک بە مانای "چکۆڵە، کەم". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە بە مانای "چکۆڵە، کەمووسکە" پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، بەتایبەتی چەند وشە کە بۆ ناوی "بێچوو" [بیچووی مرۆڤ و ئاژەڵ و پەلەوەر] بەکار دێن، وەک ↑فندلی fındlî "چکۆڵەی نازدار"، ↑فوودڵ fûdıl "چکۆڵەی خونجیلانە"، ↑فینۆ fîno "تولەقەندی"، ↑فنچقە finçıqe "خونچەی تازە"، ↑فندق fındıq، ↑فسقل fisqıl "گزگل"، ↑بچووک bıçûk و هتد. ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی **< *pau- (IE.)** "کەم، بچووک، گچکە". هەروەها بەراوردی ئەم وشانە بکە دەگەڵ ↑پنتک pıntık "گزمۆڵە، کەمووکەیەک لە قوڕ و ....".

[تێبینی: وا دیارە هەر لەم ریشەیە شێوەیەکی دیکە پەرەی گرتووە و فۆتیمی n ی هاتووەتە سەر (*paun-*). هێندیک لە وشەکان لەم ریشەی دوایی پەیدا بوون].

**فورات furat** *[ furāt ]* - "ناوی چەمێکی مەزنی کوردستان، ئاوالّی تیگرە [دیجلە]": فەرات ferat و فرات fırat یش دەگوترێن. خزمە دەگەلّ هێندێک وشەی وەک ↑بوورین burîn، ↑بوارbuwar، ↑پەرین perîn [تێپەڕین]، ↑بردن bırdın [ڕابردن]، ↑برین2 bırîn [ڕێگە برین، دەبنەڕەتدا: بوورین burîn یان پەڕین perîn]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "ڕابردن، تێپەرین". چەمی فوڕات لەبەر ئەوەی پەڕینەوەی لێ خۆش بووە، بەم جۆرە ناوزەد کراوە، بە پێچەوانەوە چەمی دیجلە کە لەبەر توند و تیژییەکەی بە "تیر" چووێنراوە و ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ریشەیەک بە مانای "تیرِاچوون". یۆنانییەکان ناوی چەمەکەیان ناوە Euphrátēs (Gr.). ئەوان ناوەکەیان لە زمانی کوردمادی وەرگرتووە کە بریتی بووە لە Huperethuua و لە دوو کەرت پێک دێ، کەرتی یەکەم واتا "باش، خاس" و کەرتی دووەم واتا "پەڕینەوە" و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "خاس بۆ پەڕینەوە، خاس بوار".

[تێبینی: بە داخەوە لە وشەنامە ئەورووپییەکان و هەروەها لە ویکیپێدیاشدا وەک چەندین وشەی کوردمادی [مادی] دیکە ژێدەری وشەکان بە زمانی پارسی کۆن دەست نیشان دەکرێ، کە دیارە ئەمەش هیچ بنچینەیەکی زانستی نییە. ڕەنگە تێگەیشتن لەم شتە زۆر گران نەبێ کە ناوی شوێن و مەڵبەندە دێرین و گرینگەکانی هەر وڵاتێک دانیشتوانی ئەم وڵاتە دایدەنێن و ناوی دیجلە و فراتیش بۆ زمانی مادەکان (یان باو و باپیرانی ئەوان؟) دەگەڕێتەوە و هیچ پێوەندییەکی بە پارس و زمانی پارسییەوە نەبووە کە بە سەدان کیلومیتر دوورتر لە دیجلە و فرات ژیاون. بێگومان پارسەکان ئەم ناوەیان لە زمانی مادەکان وەرگرتووە. هەر وەک چۆن ئەمڕۆ کورد وشەی "زایندەرود" بەکار دێنێ کە چەمێکە لای ئیسفەهان و ئەو وشەیەی لە زمانی فارسی وەرگرتووە، پارسەکانیش لەو سەردەمەدا وشە مادییەکەیان وەرگرتووە و بەکاریان هێناوە. بە داخەوە لە دەیەکانی ڕابردوودا زۆر لە توێژەرانی وڵاتانی ڕۆژئاوایی، ژمارەیەک لەرووی بێئاگایی و ژمارەیەکیش بە زانین و بە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ئابووری و دەست تێکەڵ کردنیان لەگەڵ داگیرکەرەکانی کوردستان، کەوتوونەتە ژێر کارتێکەری شۆڤینیزمی پارس و داگیرکەرانی دیکە و گەلێک میراتی فەرهەنگی و زمانیی مادیان بە ناوی ئەوان لە قەڵەم داوە، بۆ ئەوەی ناوی ماد لە مێژوودا بسڕدرێتەوە و کوردیش وەک پاشماوەی ماد بەتەواوی بتوێندرێنەوە. بەڵام مێژوو نیشانی دا کە ناتوانرێ گەلێکی چەند هەزار ساڵە بۆ هەمیش پەراوێز بخرێ و خاک و سامانی مێژوویی و فەرهەنگییەکەی بە داگیرکەران ببخشرێ. بۆیە کاتی ئەوە هاتووە و هیواداریین کە ئەو توێژەرە ئەورووپییانە کە تا ئێستا لە ئاست ماد (کوردماد، کورد)دا چاوی خۆیان قووچاندووە، ئیتر پێداچوونەوەیەک بە هەڵوێستی خۆیاندا بکەن و لەمەودوا هەڵوێستێک بگرن کە شیاوی لێکۆڵینەوەی زانستی و ئاکادێمی بێ و هەروەها دەگەڵ بنەماکانی دادپەروەری و مرۆڤپەروری یەک بگرێتەوە].

**فوو fu** *[ fū ]* - "با (ی دەم)": فوت fūt (P.). دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە هەن کە لەسەر بنچینەی دەنگیکی وەک *fu- یان *phu- دروست کراون و ئەم دەنگانەش لە کاتی دەرچوونی یان تێچوونی با [هەوا] لە دەم یان هەر شتێکی دیکەوە پەیدا دەبن. ئەم وشانە لەلایەکەوە ئاماژە بە هێندێک دەنگ دەکەن، لەلایەکی دیکەوە چەمکی "هەوا، هەناسە، فوو" دەگرنە خۆ و لە لایەکی دیکەشەوە دەربڕی چەمکی "با کران و هەڵمسان و فش بوونەوە"ن. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە بۆ دەربڕینی هێندێک دەنگ بەکاردێن کە ڕەنگە بتوانین ناویان بنێین "دەنگی بایی"، وەک ↑فسە fıse، ↑فززە fızze، ↑فکە fıke "ناڵین"، ↑فیکە fîke، ↑فیتە fîte، ↑فنکە fınke [فینگە fînge]، ↑فنە fıne [فنەفن]، ↑ویزە wîze، ↑وژژە wıjje،

↑فشقاندن fışqandın، ↑فیزین fîzîn "هاشاندنی مار"، ↑فیراندن fîrandın "سک چوون"، ↑فوورین furîn "فیچقاندن"، ↑پرمه pırme، ↑پرخه pırxe، ↑پژمه pıjme، [↑پنژه pınje]، ↑پسکه pıske و ↑پفه pıfe. ده زمانی ئەڵمانیدا fauchen (G.) هەیە کە بۆ گەیاندنی هێندێک مانای وەک پرمە، فشقە، وژژە و هیتر بە کار دێ. هاوپێوەند دەگەڵ ئەو وشانە هێندێک وشەش هەن کە مانای "هەناسە، فوو، دەم" یان "فوو کردن، هەڵمساندن" دەگەیەنن، وەک ↑پیش pîş [پیش خواردنەوە]، ↑پشوو pışû، ↑بین bîn [بینە bîne]، puff (E.) بە مانای "هەناسە، فوو" و pusta (Sw.) "هەناسە کێشانی سەخت، با کردن، فوو کردن"، pusten (G.) "فوو کردن، با کردن"، buchnuti (Rus.) "هەڵمساندن"، physa (Gr.) "بڵۆق، پزدان"، puffen (G.) "هەڵپزاندن، هەڵمساندن" و دە کوردمادیشدا ↑پزان pızan [هەڵپزان]، ↑پەنمان penman "ئاوسان"، ↑پیشان pîşan [بۆقی پیشاو] و هەروەها دە پلەیەکی دوورتر دا گەلێک وشەی وەک ↑فش fış، ↑بۆش boş، ↑بەس bes،↑ بۆق boq، ↑بۆقژە boqje، ↑بێشە bêşe و هتد. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا گشتیان ئاماژە دەکەن بە چەمکی "هەڵمساوی" و دواتریش لە سەر بنچینەی ئەم مانایە ماناکانی "زۆر و زەوەندی، زلی، هەراوی" سەریان هەڵداوە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە بە کورتی دەتوانین بڵێین کە ئەم وشانە پێوەندییان بە ریشەی **< *bhu-** *(IE.)* "ماسین، با کردن، فش بوون"وە هەیە و ئەم ریشەیەش بۆی هەیە دە بنەڕەتدا پێوەندی بە دەنگی ***phu- , *fu-** *(IE.)* ەوە هەبێ کە وەک لە سەرەوە باس کرا بە هۆی دەرچوون یان تێچوونی تەوژمی هەواوە دروست دەبێ.

**فوودڵ fûdıl** [ *fūdıl* ] - "چکۆڵەی خونجیلانە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑فنک fınık "جاش ئێستر"دا باس کراون.

**فوورهە furhe** [ *fūrha* ] - "تاڤگەی بچووک": خزمە دەگەڵ ↑فوورین furîn "1- فیچقەکردن، فوارەکردن".

**فوورین furîn** [ *fūrīn* ] - "1- فیچقەکردن، فوارەکردن 2- هەڵاتنی هەویر3- کوڵین": فوویریان fuyrîyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فۆتە fote** [ *fota* ] - "پەڕۆی لەخۆ پێچان دە حەمامدا": دەشێ وەرگیرابێ لە Frotte (G.) "خاولی"> frotté (Fr.) "ڕێخشراو" > *frotter* *(Fr.)* " ڕێخشاندن".

**فۆرت fort** - "خۆ هەڵدان، خۆ زل کردنەوە": خزمە دەگەڵ Furtz (G.)، fart (E.)، fjärta (Sw.) "تڕ"، páradté (OIn.) "دەتڕێ"، pérdesthai (Gr.) و perdet (Rus.) "تڕین، تڕ بەر دان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *perd-** *(IE.)*. دە زمانی کوردمادیدا بە مرۆڤی خۆهەڵکێش و لەخۆفش هەروەها دەگوترێ "تڕزل".

[تێبینی: لەوانەیە ئەم ریشەیە خۆی بچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر و بەگشتی بە مانای دەردانی دەنگی توند بێ لە کاتی دەرپەڕینی هەوادا. بەم شێوەیە وشەکە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ریزەوشەیەکی دیکە وەک پرماندن، فرماندن، فیراندن، فوویران و هتد].

**فۆقل foqıl** - "تەرپۆش، رێک و پێک": دە زمانی فارسیدا فکل fokol (P.) مانای "یەخەی دوگمەدار، شاڵگردن، کراوات" دەدا و فکلی fokolī (P.) یش بە کەسێک دەگوترێ کە جلکی ئەورووپی لەبەر کردبێ. وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشە فارسییانەوە هەیە. ریشە؟

**فۆڵ fol** - دەگەڵ "فش" دێ [فش و فۆڵ fış û fol واتا گوشاد، هەراو، فرەوان]. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑پڕ pır، ↑پۆڵ pol، ↑پۆڕ por [پان و پۆڕ]، ↑فرە fıre، ↑فرەوان fırewan سەر بە ریشەی **< *pleu-** *(IE.)* "زۆر، پڕ".

فەت **fet** *[ fat ]* - "ساخی، لەش ساخی": خزمە دەگەڵ ↑پتەو pıtew. جێی ئاماژەیە کە وشەی "ساخ"یش دە بنەڕەتدا مانای "پتەو" دەدا. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە "ساخ".

فەتات **fetat** *[ fatāt ]* - "پاک، بێخەوش": خزمە دەگەڵ ↑پەتی petî.

فەتار **fetar** *[ fatār ]* - "شڕ، دڕ": [فەتارفەتار]. خزمە دەگەڵ ↑پەت pet [لەت و پەت].

فەتان **fetan** *[ fatān ]* - "ڕزین و هەلا بوون، لەبەریەک چوون": [دە بنەڕەتدا: لێک جیا بوونەوە و بڵاو بوونەوە]، خزمە دەگەڵ weit (G.) "دوور، لێک جیا"، weiten (G.) "دوور کردنەوە" و erweitern (G.) "هەراو کردن، بەربڵاو کردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ پێشگر یان پاشگری ↑وە we/ ڤە ve [ڤەکردن، کردنەوە].

فەتاندن1 **fetandın 1** *[ fatāndın ]* - "1- کۆڵین، هەڵکۆڵین 2- لێکۆڵینەوە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑فەتان fetan.

فەتاندن2 **fetandın 2** *[ fatāndın ]* - "ئاوەدان کردنەوەی زەوی بێ خاوەن و نەکێڵدراو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پیت pît و مەبەست بەپیت کردنی زەوی بووبێ.

فەتلین **fetlîn** *[ fatlīn ]* - "وەرسووڕانەوە، ئاوڕ دانەوە": دەشێ بنەوشەی -fet(l) پێوەندی هەبێ بە بادانەوە ba danewe. وشەی با ba دە بنەڕەتدا ↑باد bad ە [بۆ وێنە دەگوترێ گشتەکی دوو باد واتا دووجار با(د) دراو]. دە زمانی فارسیدا پاتیل patīl (P.) هەیە کە بۆ کەسێک تەواو مەست بێ بەکار دێ [واتا دە گێژەوە هاتوو، بە لاداهاتوو، وەرسووڕاو]. د. م. چایەت "فەتلین"ی بردۆتەوە سەر ریشەی ئارامی petal (Arc.) "با دان". (بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 193). وشە فارسییەکە ئەوەمان پێ دەڵێ کە وشەکە سەر بە زمانی ئارامی نەبێ و بە پێچەوانەوە زمانی ئارامی وەری گرتبێ و فۆتیمی p کردبێ بە f. وەک دەزانین زمانی عەرەبیش لە زۆر وشەی خوازراودا p دەکا بە b یان f، بۆ وێنە "پاڵە"ی کوردمادی کراوە بە "فلاح" یان "پاڵی" [پاڵەیی] کراوە بە "فەیلی".

فەتین **fetîn** *[ fatīn ]* - "پیش هەڵاتن (لە گەرمان)": خزمە دەگەڵ baden (G.)، badōn (OG.)، bathe (E.)، baden (Nl.)، bada (Sw.) "گەرماو کردن، حەمام کردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑پیشان pîşan و ↑پێژان *pejan* [نان پێژان].

فەتیر **fetîr** *[ fatīr ]* - "هەویری هەڵنەهاتوو، ناتێک کە هەویرەکەی هەڵنەهاتووە": ئەم وشەیە وێ دەچێ لە زمانی کوردمادییەوە چووبێتە ناو زمانی عەرەبی. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑پاتە pate، ↑بیات beyāt (P.) و↑پەیت peyt "سفت، چیڕ". وشەی "بیات" دەشێ شێوەی عەرەبێنراوی وشەکە بێ و تێیدا فۆتیمی p گۆڕاوە بۆ b.

فەخفووری **fexfurî** *[ faxfūrī ]* - "دەفری چینی": لە وشەی فەغفوور faġfūr وەرگیراوە کە لەقەبی پادشایانی چین بووە.

فەدی **fedî** *[ fadī ]* - "شەرم": فەهێت fehet یش دەگوترێ. هەروەها فەدیۆک fedîyok بە مانای "شەرمن" دێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فناز finaz "کاری ناڕەوا و مایەی شەرمەزاری".

فەڕ **fer** *[ far ]* - "پیرۆزی، شکۆداری": بڕوانە ↑فەرخ ferx "پیرۆز".

فەراجە **ferace** *[ farāja ]* - "فەرەنجی ژنانە": ↑فەرەنجی ferencî [فەرەجی ferecî] "پاڵتەوی لە لباد".

فەراش **feraş** *[ farāš ]* - "بەرداش": فەر -fer شێوەیەکی کۆنترە لە ↑بەرد berd و شێوەی کورتکراوی وەرد verd ە. کەرتی دووەمیش هەر ئەو ↑ئاش aş یە کە لە "بەرداش"یشدا هەیە.

فەراشین **feraşîn** [ *farāšīn* ] - "1- ناوی زۆزاتیکی بە ناوبانگ 2- بای فێنکی هاوینان": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ frisch (G.)، frisc (OG.)، vers (Nl.)، fresh (E.) "تەڕ و تازە، بووژاوە، فێنک". دە زمانی ئاڵمانیدا وشەکە بە تایبەتی بۆ خواردەمەنی تازە و هەروەها هەوای باش و سازگار بە کار دێ و مەبەست با یان هەوای تازە و فێنک کەرەوەیە. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونتیک خزمە دەگەڵ priscus (L.) "کۆن، پێشان، لەگۆڕ رەوشی بەرێ". لەم تێروانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "گەڕانەوە بۆ سەر دۆخی پێشوو، وەک رەوشی بەرێ لێ هاتنەوە، تازە بوونەوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑فراژی fıraj̄î "بووژاوە، بەخوداهاتوو، گەشەکردوو".

فەرتووت **fertut** [ *fartūt* ] - "پیری پەککەوتە": فرتوت fartūt (P.) [فر far + تووت tūt ؟]. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ فرسووده farsūde (P.) "کۆن، بە کەلک نەماو" [دە بنەڕەتدا: سواو]. گۆڕانکاری فۆتیمەکانی s و t نموونەی زۆرە، وەک "هەتوان" و کە پێوەندی بە کرداری "ساوین"ەوە هەیە، یان "تیر"ی کوردی و "سیر"ی فارسی و ...

فەرتەنە **fertene** [ *fartana* ] - "1- ئاژاوە، بشێوی 2- تۆفانی دەریا": خزمە دەگەڵ ↑فڕ fır، ↑وڕ wır، ↑وەرانین weranîn و چەندین وشەی دیکەی سەر بە ریشەی ***(IE.) *wer->*** "سووڕان".

فەرحانی **ferhanî** [ *farħnī* ] - "هەرزانی و فراوانی، پێچەوانەی تەنگانە": فەرعانی fereanî و فەرعانە fereane ش دەگوترێ [لەپاش تەنگانە، فەرعانەیە]. دە شێوەزاری کوردمادی باکووردا فرەهی fırehî دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فرە fıre "زۆر" و ↑فرەه fıreh " گوشاد". دە فارسیدا فراخ ferax (P.) بە مانای " گوشاد، پان و بەرین" بە کار دێ.

فەرخ **ferıx 1** [ *farıx* ] - "بێچووی پەلەوەر": خزمە دەگەڵ ↑بەرخ berıx "بێچووی مەڕ".

فەرخ **ferıx 2** [ *farıx* ] - "پیرۆز، ناوە بۆ پیاوان": فرخنده farxonde (P.) "پیرۆز، ناوە بۆ ژنان" و هەروەها farrox (P.) "ناوە بۆ پیاوان". ئەم وشەیە و هەروەها ↑فەر fer "پیرۆزی، شکۆداری" جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ خواژنی frija (OG.)، frigg (OIs.). ئەم وشەیە بە واتای "خۆش ویستراو، حەز لێکراو" بووە و ناوی خواژنێک بووە، وەک خواژنی venus لە لای رۆمییەکان. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *prai->*** "پاراستن، خۆش ویستن، حەز لێکردن". priya-h (OIn.) "حەز، گراوی، هاوسەر"، frijon (Gt.) "خۆش ویستن"، freidjon (Gt.) "ئاگا لێبوون، پاراستن"، Freund (G.) "دۆست، یار" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا ↑پەری perî "بوونەوەری جوانی ئاسمانی" [دە بنەڕەتدا خواژنی پاراستنی مرۆڤ؟] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و لەوانەیە ↑پاراستن parastın یش دەگەڵ ئەم وشانە خزم بێ.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Schutzengel هەیە بە مانای "فریشتەی پارێزگاری (کردن)" و گۆیا هەر کەسێکیش لە رووداوێکی کارەساتبار رزگاری دەبێ، فریشتەی تایبەتی خۆی رزگاری کردووە. ئەگەر کەسێک لە بەڵایەکی لەنەکاو و مەترسیدار رزگاری بێ، ئەڵمانییەکان دەڵێن "Schutzengel"ەکەت تۆی رزگار کرد. وا دیارە باوەڕ بە فریشتەی پارێزگاریکەر دەناو مرۆڤەکاندا بیر و باوەڕێکی کۆن و لەمێژینە].

فەرداندن **ferdandın** [ *fardāndın* ] - "بە دەست ورد کردن": خزمە دەگەڵ ↑فەرکاندن ferkandın "پشاوتن، گلۆفین"، ↑پریواندن pırîwandın و وەردێنە werdene [وەردەنە werdene] و چەندین وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕاندن، با دان".

فەردە **ferde** [ *farda* ] - "تایەک، تابارێک":

1- لەوانەیە بچێتەوە سەر فرد fard (Arb.) "تاك، تاق". [تێبینی: لە باری ماناکەیەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشە کوردمادییەکانی تاك tak "فەرد" و تا ta "فەردە"].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ fardel (OFr.) "بار، بەندیل، بەستە".

**فەرزین ferzîn** [*farzīn*] - "دەرچوون و خۆ خشکاندن":خزمە دەگەڵ ↑فەلتین feltîn "را کردن، دەرباز بوون".

**فەرژاندن1 ferjandın 1** [*faržāndın*] - "دادرین": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1 - ↑برین bırîn.

2-↑پەرت pert و ↑پارچە parçe.

3- دەگەڵ brechen (G.)، break (E.)، brikan (Gt.) و هاوتاکانی دیکە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا سەر بە ریشەی **< *bhreĝ- (IE.)** "شکاندن".

**فەرژاندن2 ferjandın 2** [*faržāndın*] - "پڕماندن، دەنگێ لە لووت هاتنی ئەسپ بۆ داوا کردنی ئالف": ↑فرژین fırjîn.

**فەرسە ferse** [*farsa*] - "پنە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *pel- (IE.)** "پان و بڵاو، بەرین، بڵاو کردن(ەوە)". دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ دار، بەرد و ئاسنی پان و تەخت Platte (G.) دەگوترێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑پڵچ pılç [پان و پڵچ].

**فەرش ferış** [*farıš*] - "مافوورە": فرش farš (Arb.)، ئەم وشەیە بە شیمانەیەکی بەهێز شێوەی عەرەبێنراوی ↑پەلاس pelasە بە مانای "بەرە، رایەخی کەم نرخ" [palās (P.) "بەڕە"]. جێی ئاماژەیە کە زمانی عەرەبی فۆتیمی p لە وشە وەرگیراوەکاندا دەکا بە b یان f.

**فەرشك ferşık** [*faršık*] - "جومگەی دەست": بنەوشەی فەر -fer دەبێ پێوەندی هەیە بە ریشەی **< *wer- (IE.)** "سووڕان" و دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑فڕ fır "لوول". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە شوێنی سووڕان و با درانی دەست.

**فەرقان ferqan** [*farqān*] - "بوورانەوە": بنەوشەی فەر -fer دەتوانێ:

1- لە لایەکەوە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە باس لە "سووڕان" دەکەن، وەك ↑فەرکاندن ferkandın "گلۆفین، پشاوتن". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "سەر سووڕان و دە گێژەوە هاتن" بووبێ.

2- لەلایەکی دیکەوە بنەوشەکە دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە بنەوشەی بوور -bur دە کرداری ↑بوورانەوە buranewe دا. لەم گۆشە نیگایەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەك ↑بەر ber [بەر بوونەوە] و ↑وەرین werîn دە بنەڕەتدا بە مانای "کەوتن، هاتنە خوار". فۆتیمی q دە وشەی "فەرقان" دا دەشێ ناوگری جەخت کردن بێ کە بە وێنەی k ش دە هێندێك کرداردا دەبیندرێ، وەك ئالۆزکان، خلیسکان، بزرکان، جنقین، زرووقان2 zıruqan شەلقاندن و هتد.

**فەرکاندن ferkandın** [*farkāndın*] - "پشاوتن، گلۆفین": فرکاندن fırkandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ↑ فڕ fır و ↑وڕ wır و ژمارەیەك وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "سووڕان". هەروەها هەڵیسەنگێنە دەگەڵ ↑پریواندن prîwandın.

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی گلۆفین و گوشین لە لایەك و سووڕان و با دران لە لایەکی دیکەوە پێوەندی نیزیك هەیە و ئەم پێوەندییە دە وشەکانی وڵین wılîn و پریواندن prîwandın یشدا بەدی دەکرێ].

فەرمان **ferman** *[ farmān ]* - "ئەمر، دەستوور": بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی: < (پاشگری کردنەناو) na + (ئەندازەگرتن) mā + (پێش) fra (OP.).

فەرموون **fermun** *[ farmūn ]* - "گوتن [بۆ کەسانی پایەبەرز]": دەبێ لە ↑فەرمان ferman ەوە هاتبێ و دە بنەڕەتدا بە مانای "ئەمر کردن، دەستوور دان" بووبێ.

فەروار **ferwar** *[ farwār ]* - "حوکم، دەستوور": دەچێتەوە سەر ↑فەرمان ferman.

فەروە **ferwe** *[ farwa ]* - "کەوڵی تیسکن": ئەم وشەیە و هەروەها ↑فەرەنجی ferencî "پاڵتەوی بەرگن" خزمایەتییان هەیە دەگەڵ Fell (G.)، fill (Gt.)، fell (E.)، fjäll (Sw.)، "پێست، پێستە، خەز"، pellis (L.)، pella (Gr.) "چەرم، پیست"، سەر بە ریشەی **(IE.) *pel- >** "پۆشین، داپۆشین، لێهاڵان". دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پۆرگ porg، ↑پووڵ pul و ↑پووڵەکە puleke [ی ماسی].

فەرهاندن **ferhandın** *[ farhāndın ]* - "ترساندن". خزمە دەگەڵ fear (E.)، vār (OS.)، fāra (OG.) "ترس" و Gefahr (G.) "مەترسی"، سەر بە ریشەی **(IE.) *per- >** "وێران، زات کردن". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک↑ پەروا perwa، ↑وێران weran، ↑پەڕموون permun. ئەوەی کە لە ریشەیەک بە مانای "وێران و نەترسان" چۆن مانای "ترس" پەیدا بووە، دە کتێبە ئێتیمۆلۆژییەکاندا باس نەکراوە، بەڵام ئەم دیاردەیە جار و بار دەبیندرێ کە لە ریشەیەکەوە دوو مانای پێچەوانەی یەکتر پەیدا دەبن، بۆ وێنە بڕوانە وشەی "شێو".

فەرەج1 **ferec 1** *[ faraj ]* - دەگەڵ "فێڵ" دێ [فێڵ و فەرەج fel u ferec]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑فریو fırîw.

2- ↑فێڵ fel.

فەرەج2 **ferec 2** *[ faraj ]* - "رزگاری لە تەنگانە، دەرەتان": ئەم وشەیە دەتوانێ بە ئەسڵ وشەیەکی کوردی بێ و پێوەندی بە ↑فرە(ە) fıre(h) "زۆر، بەربڵاو، گوشاد"ەوە هەبێ و یان دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑فەلتین feltîn [فلەتین] "فیرار کردن، دەرباز بوون". بە هەر بارێکدا لێکی دەینەوە، دواجار دەگەینەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش، چونکە "فەڵتین" خوێ دواجار دە ریشەدا دەگەڵ "فرە" یەک دەگرێتەوە.

فەرەک **ferek** *[ farak ]* - "دەستاڕ":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ پێوەندی بە کرداری ↑فەرداندن ferdandınەوە هەبێ.

2- لەلایەکی دیکەوە دەکرێ بەراوردی بکەین دەگەڵ ↑وەردێنە werdene و ئەو وشانەی باس لە چەمکی "سووڕان" دەکەن.

فەرەنجی **ferencî** *[ faranjī ]* - "پاڵتەوی بەرگن": ↑فەرەجی fereçî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فەروە ferwe "کەوڵی تیسکن". فۆنیمی n زێدەیە، لەم بارەوە بڕوانە وشەی "کرمانج" [دە بنەڕەتدا: کوردماد].

فەریک **ferîk** *[ farīk ]* - "کاڵ، نەگەیشتوو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑بەر ber "زوو، پێش" سەر بە ریشەی **(IE.) *per- >** "بەر، پیش". لەم تێڕوانینەوە فەریک دەبێ کۆنتر "پاریک parîk" بووبێ، بەو مانایە کە بەرهەمێک لە دۆخێکی "بەر لە پێگەیشتن" دایە.

فەساڵ **fesal** *[ fasāl ]* - "بیچم، روخسار": پێوەندی هەیە بە facies (L.) "شێوە، بیچم، تەرح و دیدار". وێ دەچێ وشەیەکی وەرگیراو بێ.

فەشەل feşel [ fašal ] - وشەیەکی بە رەچەڵەک کوردمادییە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑فیسەل fîsel و ↑پووچەڵ puçel "بەتاڵ". فەش + ئەل feş + el. بنەوشەی فەش -feş خزمە دەگەڵ ↑بۆش boş، ↑پووچ *puç* "بەتاڵ"، ↑فیشە fîşe "دەنگی با کە لە کەلێنەوە دەردەچێ"، ↑پیش pîş "هەوا، هەناسە" و هتد. کەرتی دوومی وشەکە واتا - el پاشگرێکی زمانی کوردمادییە کە دە دەیان وشەدا دەبیندرێ. فەشەل بوون دە بنەڕەتدا هەمان "پووچەڵ بوون"ە و دە زمانی عەرەبیدا [فشل feşel (Arb.)] مانای "بوونەوە هیچ، پووچ دەرچوون"ی وەرگرتووە.

فەغفووری feġfurî [ faġfūrī ] - "چینی": قاب و قاچاخی چینی دە بنەڕەتدا لە وڵاتی چین دروست کراوە و لەوێوە هاتووەتە وڵاتانی دیکە. لە بەر ئەوە ناونراوە "چینی" یان فەغفووری کە ئەویش ناوی پاشاکانی چین بووە.

فەفە fefe [ fafa ] - "خواردنی گەرم بە زمانی زارۆک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) bähen "پیشاندن"، (G.) backen "پێژان" سەر بە ریشەی **(IE.) *bhe-,*bho- <** "گەرم کردن، پیشاندن، برژاندن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پیشان pîşan و ↑پێژان pejan.

فەقێ feqe [ faqe ] - "شاگردی مەلا، خوێندکاری حوجرە": دەچێتەوە سەر فقە *(Ar.) fîqh* "دەرسی مەلایان".

فەکەهان fekehan [ fakahān ] - ئەم وشەیەم لە برادەرێکی کوردی ئێزیدی بیستووە (خەڵکی ناوچەی مێردین)، بە مانای "لە جێ چوون"ی دەست و لاق بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑فاق faq 1.

فەلات felat [ falāt ] - "رزگاری": خزمە دەگەڵ ↑فەلتین feltîn "راکردن، دەرباز بوون" و فلتین fılıtîn "رزگار بوون".

[تێبینی: پاشگری -at پاشگرێکە ناوی مانا دروست دەکا و دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک جڤات، شەوات، بەرات و هتد. ئەم پاشگرە دەکرێ لە وشەسازی کوردیدا چالاکتر بکرێ و بۆ زۆر وشەی تازە کەڵکی لێ وەربگیرێ].

فەلاقە felaqe [ falāqa ] - پەت و دارێکە لە پای دەبەستن بۆ دارکاری کردن": فلک (P.) felek. خزمە دەگەڵ ↑پلۆسین plosîn "لێدانی توند"، (G.) fluchen "نەفرین کردن" [دەبنەڕەتدا: لێدان، بەدەست لەسینگی خۆ دان لە کاتی تووک و نزا کردندا]، (OE.) flocan "لێدان"، (Gt.) flokan "سکاڵا کردن" [دەبنەڕەتدا: خەمگینانە لە سینگی خۆ دان]، (L.) plage "زەبر" و (L.) plangere "لێدان، خەمبار بوون"، (Gr.) plessein " لێدان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *plak- <** "لێدان، بریندارکردن".

فەلتین feltîn [ faltīn ] - "را کردن، دەرباز بوون": خزمە دەگەڵ (G.) fliehen، (E.) flee، fly (Sw.) "هەڵاتن، راکردن لەمەترسی" و هەروەها (G.) Flucht "فیرار" و (OG.) fluhten "فیرارکردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *pleu- <** "رۆیینی خێرا، بزوانی خێرا، *فڕین*". وشەی ↑فیرار fîrar یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و ئەم دەستە وشەیە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑فرین fırîn و دوورتریش دەگەڵ ↑فرە fıre. وشەی گریختن (P.) gorīxtan "فلەتین" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە [فۆتیمی f بووەتە g و فۆتیمی x ناوگری جەخت کردنە، پێشتر شتێک بووە لە چەشنی **فریتن* و خزمیشە دەگەڵ "فرین"].

فەلشین felşîn [ falšīn ] - "رووخان، رمان":خزمە دەگەڵ (G.) fallen، (E.) fall، (Nl.) vallen، (Sw.) falla، (Lit.) pulti، (Arm.) pul "کەوتن، بەر بوونەوە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Ger.) * fall-* "کەوتن". دەشێ ئەم وشانە خزمایەتییان هەبێ دەگەڵ ↑بەر ber [بەر بوونەوە] و هەروەها ↑فاڵ fal [فاڵ گرتنەوە].

**فەلە fele** [ *fala* ] - "مەسیحی، کریستیان":

1- بە گوێرەی فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی (ل. 195) وشەکە لە فەللاح fellaħ (Arb.) "وەرزێر" وەرگیراوە و ئاماژەیە بە وەرزێر بوونی دیانەکان. ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاست بێ، ئەوا دیسانیش وشەکە دەبێ دە بنەڕەوتدا وشەیەکی کوردمادی بێ، چونکوو "فەللاح" خۆی لە ↑پالە pale "سەپان، دروێنەوان"ی کوردمادی وەرگیراوە [وەک ئاشکرایە زمانی عەرەبی فۆتیمی p نییە و ئەگەر وشەیەک وەربگرێ ئەو فۆتیمەی تێدا بێ، فۆتیمەکە دەکاتە b یان f].

2- لە لایەکی دیکەوە "فەلە" لەوانەیە پێوەندی بە ↑فەلتین feltîn "را کردن، دەرباز بوون"ەوە هەبێ و مەبەست ڕاکردن و دەرباز بوونی دیانەکان لەو شەر و کوشتارانە بووبێ کە بە بۆنەی ئایینەوە بە سەریان هاتووە. لەم تێڕوانینەوە "فەلە" دەتوانێ دە بنەڕەتدا مانای "ڕاکردوو" یان "دەربازبوو"ی هەبێ.

**فەلەک1 felek** [ *falak* ] - دەگەڵ "چەرخ" دێ [چەرخ و فەلەک çerx u felek]. ئەمەش چەرخێکە لە حەوادا دەسووڕێ و ئامرازێکە بۆ کایە کردنی زارۆکان. هەروەها بە مانای "گەردوون، جیهان، ئاسمان" بەکاردێ. وشەکە بە مانای دووەم دە زمانی عەرەبیشدا بە کار دەهێندرێ، فلك falak (Arb.)، بەڵام ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا ناتوانێ وشەیەکی عەرەبی بێ. وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی فەل + ئەک fel + ek. کەرتی دووەم پاشگری ناواندنە [بەناو کردن] دە زمانی کوردمادی و فارسیدا دە گەلێک وشەدا دەبیندرێ، وەک خەندەک، تەبەک، ڕاوەک، جەندەک، گەڕەک، فیشەک و هتد. کەرتی یەکەم، واتا -fel خزمە دەگەڵ گەلێک وشەی زمانی کوردمادی، وەک ↑وێل wel، ↑پێل pel "شەپۆل"، ↑واڵە wale، ↑وڵین wılîn، ↑فلین fılîn، ↑وەلەک welek "گێژەڵووکە"، ↑وڵاڵە wılale "ئامرازێک دە خەرەک دا". هەروەها خزمە دەگەڵ گەلێک وشەی زمانە هیندوئەورووپییەکان، وەک voluere (.L) "لوول بوون، سووڕان"، valati (.OIn) "با دەداتەوە"، walze (.G) "ئوستوانە، وەردێنە"، walzen (.G) "سووڕاندن"، waltz (.E) "سەمای واڵس" و هتد. ئەم وشانەی سەرەوە گشتیان هەڵگری چەمکی "سووڕان"ن و دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE.) *uel-, *wel-* "سووڕان، خولانەوە". کەوابوو بە دڵنیاییەوە دەتوانین بێژین کە فەلەک وشەیەکی کۆنی زمانی کوردمادییە کە بە مانای چەرخ بەکاریان هێناوە. ئەم وشەیە دەبێ هەر لە کۆنیشەوە مانایەکی دووەمی پەیدا کردبێ، واتا مانای " گەردوون، جیهانی سەرەوە، ئاسمان". [لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی " گەردوون" کە ئەمیش هەم مانای "چەرخ" و هەم مانای "جیهانی ئەستێرەکان" دەبەخشێ و هەروەها لە ریشەیەکیش بە مانای "سووڕان" وەرگیراوە]. ئەم مانای دووەمە بۆ وشەی فەلەک یان گەردوون دەبێ لەوەڕا هاتبێ کە مرۆڤەکان گەڕان و هاتوچۆی ئەستێرەکانیان وەک سووڕانی جیهانی سەرەوە بە دەوری زەویدا لێک داوەتەوە، واتا جیهانیان وەک چەرخێک داناوە کە ناوەندەکەی زەوی بێ. لە لایەکی دیکەوە مرۆڤەکان هەر لە کۆنەوە چارەنووسی خۆیان و ڕووداوەکانی سەر هەردیان بە "ئاسمان و گەڕانی ئەستێرەکان" بەستۆتەوە و بەم جۆرە بەخت یان بەدبەختی مرۆڤیان بە چەمکی فەلەک پێوەند داوە. دە زمانی فارسیدا وشەی "فلك زده" [واتا فەلەک لێدراو] بە مانای "بەدبەخت و بێچارە" بەکار دێ. ئەم پێوەندییانە گوێزراونەوە بۆ ناو زمانی عەرەبی و لەوێشدا وشەی فلاكة felake(t) (Arb.) بە مانای بەدبەختی و "مفلوك" بە مانای بەدبەخت دروست کراون. جگە لەم مانایانەی سەرەوە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا فەلەکە feleke و فلكه falake (P.) بە مەیداتیکی خڕ و بازنەیش دەگوترێ کە ئوتومبێل بە دوریدا دەسووڕێنەوە.

**فەلەک² felek** [ falak ] - "رەق بوونی ئەندام": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal "هێز، گوشار"دا باس کراون.

**فەلیت(ە) felît(e)** [ falīt(a) ] - "ژنی بلّج و بێشەرم": خزمە دەگەڵ blöd (G.) "کەم ئاوەز، گەمژە، ساویلکە"، blōdi (OG.) "نەزان، ترسەنۆک"، blood (NL.) "شەرمێون، ترسەنۆک"، blēad (OE.) "لەسەرەخۆ، شل و شەوێق"، blöd (Sw.) "نەرم، هەستیار". ئەم وشانە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەیەکی ژێرمەنی بە مانای "بێهێز، لاواز" و گومان دەکرێ خزم بن دەگەڵ phlydarōs (Gr.) "شل، لیتە، لەجەن ئاسا" و fluere (L.) "جاری بوون، رژان". بەم پێیە مانای ئەسڵی وشەکە "شل و شەوێق" بووە و دواتر بەو کەسەش گوتراوە کە کەسایەتییەکی لاوازی هەبووە وبە هاسانی کارێگەری کراوەتە سەر. دە زمانی کوردمادیدا دەشێ وشەی ↑بلّج bılḧ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**فلین fılîn** [ filīn ] - "هەڵقرچان، گرژ بوون": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal "هێز، گوشار"دا باس کراون.

**فەند fend** [ fand ] - دەگەڵ "فێڵ" دێ [فەند و فێڵ fend u fel]، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Finte (G.) "فەند و فێڵ". وشەکە سەرەتا لە پێوەندی دەگەڵ "هونەری شەر کردن"دا بەکار هاتووە. وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر finta (It.) "فەند و فێڵ" و ئەویش دەچێتەوە سەر fingere (L.) "بەهەڵەبردن، نەخشە بۆ کێشان"،

2- ↑پەند pend "دەرس، ئامۆژگاری".

وشەی فن fann (Arb.) "هونەر" پێوەندی بە یەک لەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە زمانی فارسیدا فن fenn (P.) کە لە عەرەبی وەرگیراوە، بە مانای "تێکنیک، هونەری دروست کردن یان هونەری زۆرەوانی" بەکار دێ.

**فەنەر1 fener** [ fanar ] - "لە کانزا دروستکراوی نەرم و بە هەڵبەز": فنر fener (P.). لەوانەیە لە زمانە ئەورووپییەکان وەرگیرابێ. دەچێتەوە سەر وشەیەک بە مانای "پەڕ" [پەڕ و باڵ]: Feder (G.)، veder (Nl.)، feather (E.)، fjäder (Sw.)، penna (L.)، pteron (Gr.)، pero (OSlaw.) "پەڕ"، سەر بە ریشەی ***pet- >** (IE.) "فڕین، جووڵانەوەی خێرا". دە زمانی ئەڵمانیدا هەم بە "فەنەر" و هەم بە "پەڕ" دەگوترێ Feder و ئەمەش دەبێ لەبەر هەڵبەزینەوە و دەرپەرینی فەنەرەکە بێ. بەم جۆرە وشەکە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەڕ¹ per.

**فەنەر2 fener** [ fanar ] - "جۆرێک چرا": فانووس fanus یش دەگوترێ. [فانووس دە زمانی فارسیشدا بە مانای "فەنەر" بە کاردێ و دەگەڕێتەوە سەر زمانی یۆنانی]. ئەوی لێرەدا جێگای سەرنجە ئەوە کە هەردووک وشەی فەنەر و فانووس بنەوشەیەکی هاوبەشیان هەیە و لە ریشەیەکەوە هاتوون. بنەوشەی فەن -fen / فان -fan خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک ↑بەیان beyan، ↑باوbaw [سوورباو] سەر بە ریشەی ***bha- >** (IE.) "رووناکی، تیشک".

**فەهێت fehet** [ fahet ] - "شەرم": فەدی fedî و فەهێد fehed یش دەگوترێن.

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فناز fınaz "کاری نارەوا و مایەی شەرمەزاری".

2- بە گوێرەی فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی دەچێتەوە سەر *pahyūtā* (Syr.) "هەڵە".

**فەیلی feylî** [ faylī ] - "ناوی هۆزێکی گەورەی کوردە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal دا باس کراون، کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت، پتەو، بەهێز". ئەسڵی وشەکە دەبێ "پاڵی palî" [یان "پاڵەیی paleyî"] بووبێ بە مانای "بەهێز"، دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە "فەیلی" [گۆڕانی p بۆ f].

[شیاوی باسە کە ناوی زۆرێك لە مەڵبەند و هۆزە کوردمادییەکان دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "بەهێز بوون، سەخت بوون" دەبەخشن. هێندێك لەم ناوانە لە ژێر وشەکانی "سەق" و "سۆران"دا باس کراون].

**فیت fît** [ *fīt* ] - "1- فیکە، فیتوو 2- دنە، هانە": فیك fîk و فیکە fîke و فیتە fîte و فیتوو fîtu ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ pfeifen (G.)، pipe (E.)، pipare (L.)، pipizein (Gr.) "فیکین، فیتوو لێدان". ئەم وشانە وەك لاسا کردنەوەی دەنگێ لێك دراونەوە. لەو باوەڕەدام پێوەندییان بە ↑فوو fu [فوت fut (P.)] هەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە"(دەنگی) دەرچوونی هەوا" بکەن. مانای دووەمی وشەکە، واتا "دنە دان" دەبێ لەوەڕا هاتبێ کە فیتوو لێدان وەك سیگناڵێك بەکار هێندراوە بۆ تێگەیاندنێکی ناراستەوخۆ یان بۆ دنە دان و هەڵخراندنی کەسێك لەپێناو ئەنجام دانی کارێکدا.

**فیتنە fîtne** [ *fītna* ] - "ئاژاوە، بشێوی": ئەم وشەیە بە شیمانەیەکی بەهێز دە بنەڕەتدا وشەیەکی سەر بە زمانی کوردمادییە و خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑با ba [با دان واتا سووڕاندن]، ↑*باد bad* [دوو باد واتا دووجار بادراو]، ↑فەتلین fetlîn "پێچ دران، ئاوڕ دانەوە".

**فیتوو fîtu** [ *fītū* ] - "دەنگی تیژ لە ناو دوو لێو دەرخستن": ↑فیت fit.

**فیتەر fîter** [ *fītar* ] - "زەبەلاحی تەژە":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑پان pan، پهن pahn (P.)، paθana- (Av.) "پان، بڵاو"، petēre (L.) "پان و بڵاو بوونەوەوە"، petys (Lit.) "شان"، سەر بە ریشەی **< *pet- (IE.)*** "پان و بڵاو کردنەوە".

2- یانیش پێوەندی هەیە بە ↑پیت pît "هێز، بڕشت" و ↑پتەو pıtew "بەهێز"، سەر بە ریشەی **< *pad- (IE.)*** "بەهێز بوون"["پادشا" واتا شای بەهێز].

**فیج fîc** [ *fīj* ] - "کۆڵۆس، کەسێك ددانی پێشەوەی کەوتبێ": هەر وەك ↑پسك pısık لەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرێ کە دەچنەوە سەر ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە". مرۆڤی فیج یان پسك لە کاتی قسە کردندا هەوا لە کەلێنی ددانەکانیانەوە دەردەچێ و دەنگیکی تایبەتی دروست دەبێ.

**فیچ fîç** [ *fīč* ] - "1- پێچ 2- خێل": خزمە دەگەڵ ↑واژی wajî [بەرەواژی، بەراوەژوو] و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "با دان، خوار بوونەوە". دەشێ پێچ peç و ↑پێچان peçan یش هەر سەر بەم خێزانەوشەیە بن.

**فیچقە fîçqe** [ *fīčqa* ] - "دەنگی دەرپەڕینی تراو بە تەوژم 2- ئامرازی دەرپەڕاندنی تراو": خزمە دەگەڵ ↑فشقە fışqe و دواجار دەگەڵ ↑فوو fu.

**فیرۆ fîro** [ *fīro* ] - بە فیرۆ دان واتا بە خوڕایی لە دەست دان. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە" و دە بنەڕەتدا دەبێ مەبەست "بە با دان" بێ.

**فیز fîz** [ *fīz* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑فیس fîz "لەخۆبایی بوون، بادیهەوایی".

**فیزار fîzar** [ *fīzār* ] - "هاوار": ڤیزار vîzar یش دەگوترێ. بنەوشەی فیز -fîz یان -vîz خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "دەنگ و هەرا کردن، ئاخافتن" دەبەخشن، وەك ↑*بێژتن bejtn*، ↑وشە wışe، ↑ئاواز awaz [ئا-واز a-waz] و هتد. کەرتی ئار -ar پاشگرە.

**فیزانەوە fîzan(ewe)** [ *fīzān(awa)* ] - "چەمانەوە، نووشتانەوە": خزمە دەگەڵ biegen (G.)، biogan (OG.)، buigen (NL.)، bow (E.)، buga (Sw.) "چەمان، فیزان"، bhujati (OIn.) "دەچەمێنێ". خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی کوردمادی وەك ↑بازنە bazne، ↑باسك bask،

↑بستوو bıstu و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > *(IE.) *bheug-* "خوار بوونەوە، چەمانەوە".

**فیزە fîze** [ *fîza* ] - "دەنگیکی باریک وەك دەنگی با لە دەرزێکەوە یان وەك دەنگی گوللە": ویزە wîze ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فوو fu. هەروەها پێوەندیش پەیدا دەکا دەگەڵ ↑فیزfîz [فیس] بە مانای "بادیهەوایی، لەخۆبایی بوون، لە خۆ فشین].

**فیس1 fîs** [ *fîs* ] - "ئیفادە، لەخۆباییەتی": ↑فیز fîz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فش fış "هەراو، هەڵمساو" و ↑فشین fışîn [لەخۆفشین واتا لەخۆ بایی بوون، خۆ هەڵمساندن].

**فیس2 fîs** [ *fîs* ] - "قووپان، رۆچوون": خزمە دەگەڵ ↑فاق1 faq [فاق دان هەم بەمانای چەمانەوە و هەم بە مانای لاواز بوون دێ].

**فیسان fîsan** [ *fîsān* ] - "خووسان": شێوەیەکی دیکە لە ↑خووسان xusan.

[تێبینی: گۆڕانی فۆتیمی x بە f لە وشەی فێنك fenık یشدا دەبیندرێ].

**فیستان fıstan** [ *fıstān* ] - "جۆرێك كراسی ژنانە": بە گوێرەی فەرهەنگا کوردی - ئینگلیزی: > *(Gr.) foustani*.

**فیسکانی fîskanî** [ *fîskānī* ] - "زۆر وردیلە": فسقلی fesqelī (P.). هەروەها ↑فیسقە fîsqe هەیە بە مانای "خسکە، پیوازی وردیلە بۆ چاندن". خزمە دەگەڵ ↑پز pız "منداڵی ناوسك" و↑پچ pıç [پچێك] و ↑بچووك bıçûk و هتد، سەر بەریشەیەك بە مانای "گچکە، کەم". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑*فسقل fısqıl* "گزگل، بەرێکی دارمازوو".

**فیسکە fîske** [ *fîska* ] - "بەردۆکە لەناو دوو سەری پەنجەڕا هاویشتن": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑فیشەك fîşek.

**فیسماڵك fîsmalk** [ *fîsmālk* ] - فیسماڵك دان واتا "لە بەرانبەر مەترسیدا کشانەوە، خۆ دزینەوە و بۆی دەرچوون". فیس + ماڵك fîs + malk. کەرتی فیس -fîs خزمە دەگەڵ ↑فاق1 faq دان بە مانای "چەمانەوە و لاواز بوون" هەروەها دەگەڵ ↑فێق feq "لاواز، ژار". ئەم وشانە دەگەڕێنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "خوار بوون، لە ژێر گوشار دەرچوون، بەرگە نەگرتن و جێ خاڵی دان" [شتی نەرم کە پاڵی پێوە بندرێ یان هێزی بخرێتە سەر، خۆ ناگرێ، بۆ دواوە دەچێ و جێ خاڵی دەکا، ئەمە هەر وەك هەلاتن و (بۆی) دەرچوون وایە لە بەرانبەر گوشاردا]. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەند وشە هەن کە ئەم مانایانەی سەرەوە دەگرنە خۆ، وەك weich (G.) "نەرم"، weak (E.) "ژار، بێهێز"، weichen (G.) "کشانەوە، لاچوون، جێ خاڵی کردن"، entweichen (G.) "لەژێر کار یان گوشار دەرچوون، بە ئەسپایی کشانەوە و دەرچوون". کەرتی دووەمی وشە کوردمادییەکە، واتا malk- دەتوانین دەگەڵ مل mıl [شل و مل] بەرهەڤ بکەین و ئەویش هەر واتای "نەرم" دەگەیەنێ. بەم جۆرە وشەکە لە دوو کەرتە وشە پێك هاتووە کە مانایان وەك یەك وایە. ئەم جۆرە وشانە دۆخی جەخت کردن دەگەیەنن.

**فیسەڵ fîsel** [ *fîsal* ] - "بۆش، لە با بەتاڵ بوو": خزمە دەگەڵ ↑فەشەل feşel و ↑پووچەڵ puçel. وشەکانی ↑پووچ puç و هەروەها ↑بۆش boş یش بە مانای "بەتاڵ" خزمن و پێوەستن بە ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی کە ماناکانی "با کران، با دەرچوون، هەڵمسان، فش بوون، گوشاد بوون، بەتاڵایی" و هیتر دەگەیەنن.

**فیش fîş** [ *fîš* ] - "زۆر، زاف": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بۆش boş "زۆر" [لەشکرێکی بۆش]. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی دیکە کە ئاماژە بە "زۆر و زەوەندی" دەکەن، وەك ↑بەس bes، ↑بەش beş [بەش ناکا واتا زۆر نییە، کافی نییە]، ↑بێشە bêşe. لە لایەکی دیکەوە ئەم وشانە دەبنە خزم

دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە باس لە "هەڵمسان" دەکەن، وەک ↑فش fış، ↑پزان pızan [هەڵپزان] و هتد.

**فیشاردە fîşarde** [ *fīšārda* ] - "مەتەڵۆک، تشتانۆک": دە بنەڕەتدا ڤەشاردە veşarde بووە، سەر بە کرداری ڤەشاردن veşardın [↑شاردنەوە şardınewe].

**فیشاڵ fîşal** [ *fīšāl* ] - "خۆ هەڵکێشان، خۆ زل کردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑فشین fışîn [لەخۆ فشین].

**فیشەک fîşek** [ *fīšak* ] - "گوللە": فیش + ئەک fîş + ek. کەرتی دووەم پاشگرە. کەرتی یەکەم دەگەڵ گەلێک وشە کە ئاماژە بە دەنگی دەرچوونی با [هەوا] دەکەن وەک ↑فس fıs [فسە fıse]، ↑ویزە wîze، ↑فشقە fışqe، ↑فیتە fîte، ↑فیکە fîke، ↑وژژە wıjje و هتد. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑فوو fu. فیشەک دەبێ بەهۆی ئەو دەنگەوە ناو نرابێ کە لەکاتی دەرچوونیدا پەیدا دەبێ و نیزیکە لەو دەنگانەی دیکە کە ئەوانیش لە دەرچوونی باوە پەیدا دەبن.

**فیق fîq** [ *fīq* ] - دەگەڵ "جیق" دێ [جیق و فیق cîq u fîq]. وشەی جیق cîq هەمان زیقە zîq(e) یە. [دە فارسیدا دەگوترێ جیغ jīġ (P.)]. فیق fîq یش هەمان ↑فک fık "گریان"ە. دە کوردمادیدا ↑فکین fıkîn بە مانای "گریان و ناڵین" بەکار دێ و دە فارسیشدا فغان faġan (P.) بە هەمان مانا بەکار دێ. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە "جیق و فیق دەرهاتن" نەک بە مانای "جەرگ و ریخۆڵە دەرهاتن"، بەڵکوو بە مانای "گریان و هاوار لێ هەستان"ە. وشەکە دەبێ دەگەڵ ئەو ریزەوشانە خزم بێ کە ئاماژە بەو دەنگانە دەکەن کە بە هۆی دەرچوون یان تێچوونی هەوا دروست دەبن، وەک ↑فسە fıse، ↑فیکە fîke، ↑فیتە fîte، ↑فززە fızzte، ↑فشقە fışqe و هتد. ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑فووfuەوە هەیە.

[تێبینی: "جیق و فیق" [یان جیک و پیک] بە مانای "جەرگ و ریخۆڵە دەرهاتن، دەرپەڕینی هەناو لەژێر گوشار"دا بەکار دەهێنرێ. ئەم بە کار هێنانە هەڵەیە و دەشێ ئەم وشانە دەگەڵ "جڵق و فڵق" تێکەڵ کرابن. جڵق و فڵق دەرهاتن بریتییە لە دەرهاتنی تەڕایی ناوەوە لەژێر پەستاندا].

**فیقەنە fîqene** [ *fīqana* ] - "1- فیتفیتە 2- پیکی زوڕنا": خزمە دەگەڵ ↑فیکە fîke و↑فیکین fîkîn "فیتوو لێدان". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا نە ne هەمان نا na یە [↑نەی ney، نایە naye].

**فیقی fîqî** [ *fīqī* ] - "میوە": پێوەندی هەیە یاخود وەرگیراوە لە ficus (L.) "هەنجیر". Feige (G.) "هەنجیر" دەچێتەوە سەر وشە لاتینییەکە. دە زمانی عەرەبیدا فاكهة fakīha (Arb.) "میوە" دەبێ پێوەندی بە وشە لاتینیەکەوە هەبێ.

**فیک fîk** [ *fīk* ] - دەگەڵ "فاک" دێ [فاک و فیک fak u fîk] بە مانای"1- فێڵ و تەڵەکە 2- خەیاڵاتی پووچ". پێوەستە بە ↑فاک fak "فێڵ و گزی".

**فیکە fîke** [ *fīka* ] - "فیتوو": ↑فیت fit.

**فیل fîl** [ *fīl* ] - "ئاژەڵێکی زل و بەهێز": فیل fīl (P.) [کۆنتر: پیل pîl]، -pīlu (OIn.)، pīlā (Aram.)، p'il (Arm.) "فیل". بە گوێرەی "فەرهەنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 308) دەچێتەوە سەر وشەیەکی زمانی حامی کە بریتییە لە elu (ħam.) "فیل" کە دە زمانی پارسی کۆندا نیشانەی دیاری کردنی -p پێوەی لکاوە. هەر بەپێی ئەم سەرچاوەیە ئەم وشە کۆنە دە وشەکانی elephas (Gr.) و elephantus (L.) یشدا خۆی دەبینێتەوە.

**فیلار fîlar** [ *fīlār* ] - "قاپقاپ، قۆندەرەی لە دار": فیلال fîlal یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فێل fel "دەفری پەل" و دواجار دەگەڵ ↑پەل pel "نەک قووڵ". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ flaka (OSächs.) "بەری پێ، بنی پێڵاو" [بڕوانە ↑فراخ fırax بەمانای قاپ و قاچاخ].

**فیلکە fîlke** [ *fīlka* ] - "حیلکە، دەنگی کەنینی بڵێند": خزمە دەگەڵ ↑فوو fu.

**فین fîn** [ *fīn* ] - "داوێن تەڕی، ژنبازی": هەروەها فیناز fînaz یان ↑فناز fınaz هەیە بە مانای "کاری عار و ناڕەوا" و فینۆك fînok "پیاوی داوێن تەڕ".

**فینجان fîncan** [ *fīnjān* ] - "پیاڵە": بە گوێرەی فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی: < (Arc) *pinkā* "دەوری، دەفر" < (Gr.) *pinax* "تەختە، مێز".

**فینجە fînce** [ *fīnja* ] - دەگەڵ "حینجە" دێ [ ħînce u fînce ]. فینجە fînce دەچێتەوە سەر (Gr.) phasie "قسە کردن". [حینجە ħînce ش دەچێتەوە سەر < ***هجاء*** *hīcā* (Arb.) "هەجی کردن"].

**فینگە fînge** [ *fīnga* ] - "دەنگی گریان لە لووتەوە": خزمە دەگەڵ ↑فن fın، ↑فم fım، ↑فین fîn و گشتیان پێوەستن بە ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە".

**فینۆ fîno** [ *fīno* ] - "1- ئەسپ و ئێستری کەم باڵا 2- توڵەقەندی": خزمە دەگەڵ ↑فنك fınık "جاش ئێستر".

**فێ fe 1** [ *fe* ] - "سەرع، نەخۆشی بوورانەوە و کەف هەڵکراندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Wut (G.)، wuot (OG.)، wōd (OE.) "تووڕەیی"، wüten (G.) "بە تەڕەیی تێك و پێکدان"، wuotan (OG.) "خوای تووڕە، دێوەزمە". لەوە دەچێ "فێ هاتن" دە بنەڕەتدا بۆ تووڕە بوونێکی توند و تێکدەر بەکار هاتبێ و دواتر بۆ ئەو نەخۆشییە بەکار هاتبێ کە تێیدا مرۆڤ کۆنترۆڵی بەسەر خۆیدا نامێنێ و دەست و لاق رادەوەشێنێ و کەف هەڵدەکڕێنێ.

**فێ fe 2** [ *fe* ] - "ئایسان": [فێ خستن واتا هەڵکردن، ئایساندن]. جێی بەراورد کردنە دەگەڵ fax (L.) "مەشخەڵ، بڵێسە". ئەم وشانە لەوانەیە دەگەڵ ↑پۆلوو polu هاوریشە بن.

**فێر fer** [ *fer* ] - "1- تێگەیشتن، بە میشك سپاردن 2- راهاتن، خوو پێوە گرتن": بە هەموو ماناکانییەوە خزمە دەگەڵ ↑بیر bîr "فکر، هزر، حافزە" [کۆنتر: ویر vīr] و ↑بەر ber [لە بەر کردن، حیفز کردن].

**فێق feq** [ *feq* ] - "لاوان، ژار": خزمە دەگەڵ ↑فاق[1] faq.

**فێل fel** [ *fel* ] - "دەفری دەم فرە": خزمە دەگەڵ plate (E.) "سەفحە، دەوری پەل"، Platte (G.) "سەفحە، ئاسنی تەنك و پان"، plat (OF.) "دەوری". خزمە دەگەڵ ↑پەل pel "نەقووڵ"، ↑بڵاو bılaw و ↑وڵات wılat و ژمارەیەك وشەی دیکە سەر بە ریشەیەك بە مانای "پان و بڵاو، پانتایی". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑بڵووت bılut بە مانای "دەوری زل و پان " بە کار دێ کە وێ دەچێ لە زمانە ئەورووپییەکان وەرگیرابێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑فراخ fırax بە مانای "قاب و قاچاخ " هەیە کە دەشێ هەر لەم پێوەندییەدا لێك بدرێتەوە.

**فێڵ fel** [ *fel* ] - "گزی، تەڵەکە":

1- یان خزمە دەگەڵ fallere (L.) "فریو دان، فێڵ کردن" و falsus (L.) "ناڕاست، بەدەڵ". ریشەی وشە لاتینییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکانی Fehler "هەڵە، چەوتی" و falsch "ناڕاست" دەچنەوە سەر وشە لاتینییەکە.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ flāh (OE.)، flār (OIs.) "فێڵباز، ناراست، فریودەر" و flehen (G.) "پاڕانەوە". وشەی پاڕانەوە paran(ewe) دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ریشەی وشە ژێرمەنییەکان ساخ نەکراوەتەوە.

**فێنك fenık** [ *fenık* ] - "کەمێك سارد": خنك xonak (P.). فوونك funık و هوونك hunık یش دەگوترێ. بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ feucht (G.)، fūht (OG.) و (OE.)، vocht (Nl.)

"تەڕ". ئەم وشانە بە خزم دادەندرێن دەگەڵ pānka (OIn.) "زەلکاو، باتڵاق"، سەر بە ریشەی> ***pen-** **(IE.)** "زەلکاو، تەڕ". دە زمانە ژێرمەنییە کۆنەکاندا جگە لە مانای "تەڕ" بە مانای "زەلکاو"یش بە کار هاتووە، وەک fani (Gt.) و fen (OIs.) و fenn (OE.) "زەلکاو". دە زمانی کوردمادیدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خوناوە xunawe "بارانی نم نم" [دە بنەڕەتدا "ئاوی فێنک یان فێنک کەرەوە].

## ڤ ( V )

ڤاجا **vaca** [ *vājā* ] - "1- وەرگەڕان، ئاوەژوو 2- ئاستەر": خزمە دەگەڵ ↑فیچ fîç "1- پێچ 2- خێل".

ڤاڵا **vala** [ *vālā* ] - "1- فرە، گوشاد 2- دانەخراو، کراوە": هەروەها ڤاڵایی valayî هەیە بە مانای "1- بۆشایی، بەتاڵایی 2- فەزا": بڕوانە ↑ئاوەڵە awele [ئا-وەڵە a-wele].

ڤامێر **vamer** [ *vāmer* ] - "داربادام": بڕوانە ↑بادام badam.

ڤر **vır** - "ئێرە": لەڤر واتا لێرە. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئێرە ere.

ڤڕ **vır** - "درۆ": ڤڕ کردن واتا درۆ کردن، ڤڕەک vırek واتا درۆکەر. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑فێل fel.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لەنێوان دوو چەمکی "فێڵ" و "درۆ"دا. دە زمانی ئەڵمانیدا trügen مانای "فریو دان، فێڵ کردن" دەبەخشێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "درۆ"ی کوردمادی، هەروەها دەگەڵ "تراویلکە" و دەگەڵ Traum ی ئەڵمانی بە مانای "خەون"].

ڤرچالە **vırçale** [ *vırčāla* ] - "ترسەنۆک": ڤەرچالە verçale دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پەروا perwa "ترس".

ڤرسهاندن **vırsıhandın** [ *vırsıhāndın* ] - دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پاراستن parastın.

ڤرڤراندن **vırvırandın** [ *vırvırāndın* ] - "تلۆر کردنەوە، چاڵە کردن": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی کە مانای "سووڕان" دەبەخشن، بۆ وێنە ↑فرفرە fırfıre.

ڤرڤرک **vırvırk** - "مەچەک": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی کە مانای "سووڕان" دەبەخشن، بۆ وێنە ↑فرفرە fırfıre. مەچەک شوێنێکی لەشە کە توانای سووڕان و وەرسووڕانی هەیە و بۆیە وەها ناودێر کراوە.

ڤرک **vırk** - "سینگ، مێخی ئەستوور": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *perk- >** "هەڵدڕین" و خزم بێ دەگەڵ ↑بەراز *beraz* و ↑بر(ڕ)ەک bır(r)ek.

ڤرک **vırık** - "1-چێشتی دانەوێڵەی وردکراو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑ورد wırd.

2- ↑پەڵوو pelu.

ڤرنی **vırnî** [ *vırnī* ] - "بێچووی درەنگزا": خزمە دەگەڵ ↑بارِ bar و ↑بەرخ berx و چەندین وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کەم، بچووک".

ڤرین **vırîn** [ *vırīn* ] - "را بوون": خزمە دەگەڵ ↑پەڕین perın.

ڤز1 **vız** - "کەموسکە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پز piz "بێچووی ناو سک".

ڤز2 **vız** - "خولخولە، مەزرەق": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑وەگ weg "چاخ، هەرەت"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uei- >** "چەمان، سووڕان". [شیاوی باسە کە وشەی "چاخ" دەشێ پێوەندی هەبێ بە "چەرخ"، کۆنتر: چەخر].

2- پێچ peç و ↑پێچان peçan.

ڤز **vız** - "شلی، خاوی": ڤز بوون vız bun واتا "شل بوونەوە لە کار کردن، خاو بوونەوە". ڤزەک vızek واتا "تەمبەڵ لە کار کردندا، خۆ وەدواوە دەر" و ڤزێ vızê واتا "دەر کراو، بەرەڵدا کراو".

ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑فیسماڵک fîsmalk "فیسماڵک دان" واتا لە بەرانبەر مەترسیدا کشانەوە، خۆ دزینەوە و بۆی دەرچوون.

**ڤزکاندن vızkandın** [ vızākndın ] - "ئاو هەڵقوڵاندن، فیچقە بە ئاو کردن": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑فیچقە fîçqe و فیچقاندن fîçqandın.

**ڤزین1 vızîn** [ vızīn ] - "تیهەڵکردنی با": وزیدن vazīdan (P.) "هەڵکردنی با"، باد میوزد bād mīvazad (P.) واتا "با تیی هەڵکردووە، با دەڤزێ". دە کورمادیدا هەروەها ↑وژ(ژ)ە vıj(j)e هەیە [وژەوژ wıjewıj ی با] کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. ئەم وشەی دوایی دە زمانی ئەمڕۆدا وەک دەنگەوشەیەک دێتە بەرچاو، واتا وشەیەک بۆ دەنگی با. بەڵام وەک لە چەند شوێنی دیکە ئاماژە کراوە، گەلێک دەنگی لەم چەشنە، دە بنەڕەتدا دەربڕی دەنگ نەبوون، بەڵکوو پێوەندییان بە کردارێکی کۆنەوە هەیە کە مانایەکی دیاریکراوی دەربڕیوە، وەک شڵقە، شەقە، تەقە، خوڕە، رمبە، تەپە، فڕە و هتد. "ڤزین" دەبێتە خزم دەگەڵ wehen (G.)، wa jen (MG.)، waaien (Nl.)، waian (Gt.) "شنینەوە، تێ هەڵکردن، فوو کردن، جووڵان بەدەم باوە"، vāyati (OIn.) "دەڤزێت"، vejat (Rus.) "ڤزین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(a)ue-, *hwe- >** "با هاتن، شنینەوە، لەرینەوە بەدەم باوە" و دەبنە خزم دەگەڵ هەوا hewa و Wind (G.) "با" و Wetter (G.) "هەوا". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Wechte (G.) "تیهەڵکردنی بەفر" و Wedel (G.) "باوەشێن، تۆزتەکێن"، vēli (OIs.) "کلکی پەلەوەر"، wallen (G.) "گشت و گوزار کردن" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا ↑ڤەزین vezîn "فوو کردن، پف کردن، با لە دەم دەرخستن" لەوانەیە لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرێ.

**ڤزین2 vızîn** [ vızīn ] - "دەنگ لێ بڵیند بوونی وەک پرخە، فیشەک، دەنگی مێش و زەرگەتە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑ڤزکاندن vızkandın "ئاو هەڵقوڵاندن، فیچقە بە ئاو کردن"، ↑فیچقاندن fîçqandın، ↑فشقاندن fışqandın و دواجار ↑پیش *pîş* و ↑پشوو pışû "هەناسە ( فوو)". ئەم وشانە ئاماژە بە دەرچوونی با، هەوا، هەناسە دەکەن و هەروەها دەنگێک کە لەم پێوەندییەدا دروست دەبێ.

2- ↑بێژتن1 bejtın "قسە کردن"، ↑وشە wışe، ↑وێژە weje، ↑واچە waçe، ↑ئاواز a-waz، ↑ڤەقین veqîn "دەنگی خەمناکانەی رێوی" و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "قسە کردن، دەنگ کردن" [ دوو چەمکی "قسە" و "دەنگ" پێوەندییان زۆر نیزیکە و بۆیەش زۆرجار هامانا بەکار دێن: دەنگ مەکە، قسە مەکە یان قسە و باس، دەنگ و باس...].

**ڤژاندن vıjandın** [ vıžāndın ] - "راتڵەکاندنی تراو لە دەفردا": خزمە دەگەڵ بزاوتن bızawtın و ↑وەشاندن2 *weşandın* [راوەشاندن ra-weşandın]، سەر بە ریشەی **(IE.) *uegh- >** "بزوان، جووڵانەوە، رۆیشتن، ئاژوان".

**ڤژاک fıjak** [ fižāk ] - "پشک هاویشتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑پشک pışk.

**ڤژانەوە fıjanewe** [ vižanewe ] - ↑بووژانەوە bujanewe.

**ڤلت vılt** - "تەقین، لەبەر یەک چوون": دە بنەڕەتدا بە مانای "پەرژ و بڵاو بوون"ە و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑بڵاو bılaw، ↑پەل pel، ↑پلچ pılç. دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *ple-, *pla- >** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەریەک کشانەوە".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا platzen (G.) "تەقین(ەوە)" هەیە کە بە گوێرەی ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان ریشەکەی بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ دەگەڕێتەوە، واتا دەنگێک کە لە کاتی تەقیندا

دروست دەبێ. دوور نییە ئەم وشە ئەڵمانییە بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونە، پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ].

**ڤن vın** - "دەنگێک وەک دەنگی بەر بوونی ژێ لە کەوان": ڤنگە vınge ش دەگوترێ. "ڤنگە" هەروەها بە مانای "دەنگی سووڕانی توندی مەزرەق" بە کار دێ. ئەم وشانە ئاماژە بە دەنگێک دەکەن کە لە کاتی جووڵانی توندی هەوا دروست دەبێ لە ئەنجامی بەر بوونی (توندی) ژێ یان سووڕینی مەزرەق. خزمن دەگەڵ wehen (G.)، wa jen (MG.)، waaien (Nl.)، waian (Gt.) "شنینەوە، تێ هەڵکردن، فوو کردن، جووڵان بەدەم باوە، زرینگانەوەیەکی کز". بڕوانە ↑ڤزین vızîn.

**ڤهر vıhır** [ *vıhır* ] - "زرینگێ لە کار و کاسبیدا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ واهر wahır "سەرپەرستی ماڵ"، سەر بە ڕیشەی **< -wer*** (IE.) "ئاگا لێ بوون، چاوەدێری کردن، پەنا دان، پاراستن".

**ڤەراندن verandın** [ *varāndın* ] - "سوونەوە بە بڕبەند": خزمە دەگەڵ ↑بڕین bırîn.

**ڤەرک verk** [ *vark* ] - شێوەی کۆنتری ↑گورگ gurg. فۆتیمی v لە وشەکەدا کۆنترە و گۆڕاوە بە g.

**ڤەزکین vezkîn** [ *vazkīn* ] - "ئاو بە نهێم لە زەوی دەر چوون، هەڵقوولین": بڕوانە ↑ڤزکاندن vızkandın "ئاو هەڵقوڵاندن، *فیچقە* بە ئاو کردن".

**ڤەزین vezîn** [ *vazīn* ] - "فوو کردن، پف کردن، با لە دەم دەرخستن": پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑ڤزین2 vızîn "دەنگی پرخە، فیشەک و ....".

2- ↑ڤزین1 vızîn "تێهەڵکردنی با".

**ڤەقین veqîn** [ *vaqīn* ] - "دەنگی خەمناکانەی ڕێوی": خزمە دەگەڵ ↑وشە vışe و ↑بێژتن *bejtn*.

**ڤەلا vela** [ *valā* ] - "شەللاق، قامچی": وشەکانی "شەللاق" و "قامچی" دەچنەوە سەر دوو ڕیشە کە مانای "لێدان" دەبەخشن. هەر بەم جۆرە "ڤەلا" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑پل3 pıl "لێدان(ی ڕەک)" و هەروەها ↑بەلا bela.

**ڤەلۆ velo** [ *valo* ] - ڤەلۆ کردن مانای "پشکنین" دەدا. خزمە دەگەڵ ↑بلاو bılaw. دە بنەرەتدا مەبەست لە "ڤەلۆ کردن" یان "پشکنین" پەرژ و بڵاو کردنی شتەکان بووە بۆ دۆزینەوەی شتی مەبەست. وشەی "پشکنین"یش مانایەکی ئەوتۆ دەبەخشێ.

**ڤیان vîyan** [ *vīyān* ] - "خۆشەویستی، دڵداری": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەڤین evîn [ئە-ڤین -e vîn] "خۆش ویستن، حەزی بەتین".

**ڤیت vît** [ *vīt* ] - ئەم وشەیە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "قوت، قیت" مانا کراوەتەوە و ئەم ڕستەیەش بە نموونە هێنراوەتەوە: "گوهێ مشک ڤیتن". بە ورد بوونەوە لەم ڕستەیە وا پێ دەچێ ئەم مانایە ڕاست نەبێ، چونکوو کاتێک باسی گوێی مشک دەکرێ، قوت و قیت بوونی، نە بە چاو دیاری دەکا و نە بۆ ئاخێوەر و گوێگریش گرینگی هەیە. خۆ ئەگەر گوترابا "مەمکێ یار ڤیتن"، ئەودەم گومان لەم مانایە نەدەکرا! مانای وشەکە دەبێ "هەستیار" بێ، واتا ئاماژە بەوە بکا کە مشک گوێی هەستیاری هەیە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بیستن bîstın سەر بە ڕیشەی **< -bheudh*** (IE.) "بێدار بوون، هەست کردن، هۆش پێدان، ئاگادار بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بوت but و دواتر بوودا buda [دە بنەڕەتدا: زانیار، هەستیار، ئاگادار].

**ڤێل vel** *[ vel ]* - "1- نزم، نەوی 2- تەنکاو 3- پەل": بڕوانە ↑پەل pel "ناقووڵ".

# ق (Q)

**قاب1 qab** [ *qāb* ] - "جکێ": قاپ qap و کاب kab یش دەگوترێن. قاب qāb (P.) ["قاب بازی" واتا جگێن]. پێوەندی هەیە بە cubus (L.) "جکێ" و ئەویش دەچێتەوە سەر kybos (Gr.) "جکێ". وشەکان خزمن دەگەڵ Hüfte (G.) "ئێسکی سمت، جومگەی سمت" و لەوانەشە ↑کەفەڵ kefel دە زمانی کوردمادیدا، سەر بە ریشەی **< -keu** (IE.)** "چەمانەوە". دە زمانی کوردمادیدا قاپرەش qapreş بە ئەسپی کوێت دەگوترێ کە جومگەی دەستی رەش بێ، "قاپ" بە مانای "پوون، گوێزینکێ" یش بەکار دێ و هەروەها ↑کاوک kawık مانای "جومگەی دەست و پێ" دەبەخشێ. "قاب" سەرەتا بەو پارچە ئێسکەی جومگەکان [جومگەی دەست و لاق] گوتراوە کە بە هۆی"موکەعەب" بوونییەوە بۆ کایەی هەڵخستن، واتا جگێن کەڵکی لێ وەرگیراوە و دواتر بەگشتی بە شتی "موکەعەب" [سێجا] گوتراوە. وشەی cubic دە زمانە ئەورووپییەکاندا و هەروەها دە زمانی عەرەبیدا وشەکانی کعب kaεb (Arb.)، مکعب mukaεεab (Arb.) و لەوانەشە حبة ħebbe (Arb.) [حەببەقەند] بۆ ئەم وشەیە لاتینییە دەگەرێنەوە.

[تێبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا بە "حەببەقەند" دەگوترێ Würfelzucker، کە لە دوو وشەی Würfel "جکێ، مۆرەی هەڵاویشتن" و Zucker "شەکر" پێک هاتووە. تێبینی 2: وشەی "جکێ"یش خزمە دەگەڵ "چۆک" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە، خوار بوون(ەوە)"].

**قاب2 qab** [ *qāb* ] - "دەفر": ↑قاپ1 qap.

**قابڵەمە qableme** [ *qāblama* ] - "دەفری چێشت تێدا لێنان": قابلمە qāblame (P.). خزمە دەگەڵ ↑قاب² qab "دەفر".

**قاپ¹ qap** [ *qāp* ] - "دەفر، جام": ↑قاب qab یش دەگوترێ. qāb (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- capare (L.) "گرتن، گرتنەوە، وەرگرتن" و هێندێک وشەی گرێدراو وەک capis (L.) "قاپ، جام"، capacitas (L.) "قەبارە، زەرفییەت"، سەر بە ریشەی **< -kap** (IE.)** "گرتن". heben (G.) "هەڵگرتن، بڵیند کردن" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا، هەروەها haben (G.) "خاوەن بوون" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. دە زمانی کوریدا ↑هەبانە hebane "کووپەڵەی بێ دەسک" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: ریشەی هیندوئەورووپی *kap-* (IE.) "گرتن" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی *kopho-**, *kapho-* *(IE.) "سم، دەست". هێندێک وشە وەک چەپۆک cepok "دەست، پەنجە"، ↑چەپ2 çep "دەست، لەپی دەست"، ↑چەپڵە çeple، ↑چەپێک çepık و کف kaf (P.) "بەری دەست" سەر بەو ریشەی دوایین. وێ دەچێ پێوەندییەکی ئێتیمۆلۆژی لەنێوان ئەم دوو ریشەیەدا لەئارادابێ. دەست ئەو ئەندامەیە کە شتی پێ *دەگرن* و لەبەرئەوە بۆی هەیە ریشەی دووەم لە ریشەی یەکەمەوە پەرەی گرتبێ. لە کتێبە ئێتیمۆلوژییەکاندا ئاماژەیەک بە پێوەندییەکی وەسا نەکراوە].

2- هێندێک وشە دە زمانی کوردمادیدا کە مانای "دەفر" دەگەیەنن، پێوەندییان بە چەمکی "قووڵ بوون"ەوە هەیە، وەک "دەفر"، "تاوە"، "تیفسی". لەوانەیە "قاپ"یش دەگەڵ ↑قەپ qep "گاز" خزم بێ. ئەم وشەیە ئاماژە بە "زار، دەم" دەکا، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زار

داپچڕاو" و گەلێک وشەی لێ دەبێتەوە کە ماناکانی "قووڵ، قووڵایی، قووڵکە" دەردەبڕن، وەک ↑کاپان kapan "کونی فرەوان لە میچی خانوودا"، ↑گابار gabar "قەڵشەشاخ"، ↑گۆڕ gor "*قەبر*" و ↑کوور kur [یان ↑قووڵ qul] و هتد.

3- skef ‏(OG.)، skip ‏(OE.) "جام" و هەروەها "گەمی، کەشتی". ئەم وشانە دە زمانی ئێستا بوونە schiff ‏(G.)، ship ‏(E.) "گەمێ، کەشتی"، سەر بە ریشەی **< *(IE.) *(s)kei-*** "بڕین، قەڵشین، تاشین". دە بنەڕەتدا مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە "داتاشراو، هەڵکۆڵدراو" بووە. لەمەوە مانای "قاپ، جام" پەیدا بووە و دواتریش مانای "گەمێ"، چونکوو ئەویش جۆرێک قاپ بووە. [دە زمانی کوردمادیشدا دوو وشەی "جام" و "گەمێ" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە]. ئەم وشانەی سەرەوە بۆ وێنە دەبنە خزم دەگەڵ ↑شکاف şıkaf "قەڵش و کەلێن"، هەروەها "گەنجە" و ↑ئەسکو esko "کەوچکی گەورە" و هەروەها ↑ئەشکەو eşkew "دەفری سواڵەت" [پێشگری ئە + شکەو şkew + e]. وشەکە خزمیشە دەگەڵ ↑ئەسکەنە eskene "ئامرازێکی دارتاشان".

**قاپ2 qap** *[ qāp ]* - "جگَ": ↑قاب qab.

**قاپ3 qap** *[ qāp ]* - "پاروو لێدان، گاز لێدان": ↑*قەپ qep* و ↑قەپاڵ qepal یش دەگوترێ.

**قاپان1 qapan** *[ qāpān ]* - "رفاندن": ↑قۆستنەوە qostın(ewe) ش دەگوترێ. ئەم وشەیەی دوایی دەبێ لە کۆندا *قاپستن qapıstın**بووبێ. قاپیدن qāpīdan ‏(P.). مەبەست لەم کردارە دە بنەڕەتدا "*قەپ* لێدان" بووە. ئەم کردارە دەبێ دە بنەڕەتدا بۆ ئاژەڵ و بۆ ئەو بزاڤە خێرایە بەکار هاتبێ کە ئاژەڵ بە ددانەکانی تێچیر یان خواردنێکی پێ دەگرێ و دەیرفێنێ.

[تێبینی: چەندین ساڵ لەو باوەڕەدا بووم کە ئەم کردارە پێوەندی بە ریشەی *kap-** "گرتن"ەوە هەیە. بەڵام جارێکیان کە لە وشەی ئەڵمانی schnappen "قۆستنەوە، گرتنی خێرا" و پێوەندی ئەو بە وشەکانی Schnabel "دەندووک" و schnepfe "مەلێکی دەندووکدرێژ" ورد بوومەوە، بۆم دەرکەوت کە دە زمانی کوردمادیشدا دەبێ هەر هەمان پێوەندی لۆژیکی لە ئاردا بێ].

**قاپان2 qapan** *[ qāpān ]* - "1- خۆ هەڵکێشان، بەخۆ هەڵگوتن 2- قەپان، تەرازووی زل": وێ دەچێ چەمکی هاوبەش لە هەردوو ماناکەدا "هەڵکێشان و بەرز کردنەوە" بێ، چونکوو ↑قەپان qepan یش بە هەڵکیشانی بارێک قورسایی بارەکە دیاری دەکا. هەروەها شتێکی دیکەش کە جێی باس کردنە، دەستبەندی قەپانی destbendî qepanî یە کە شێوەیەکی ئەشکەنجەدانە کە بە هۆیەوە زیندانی سیاسی دەستەکانی لەپشتەوەڕا بە پەتێک دەبەسترێتەوە و بەو پەتەوە هەڵدەواسرێ [*بەرز دەکرێتەوە*]، واتا قورساییەکی بێ ئامان دەکەوێتە سەر شان و پیلی. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە وێ دەچێ ئەم وشانە خزم بن دەگەڵ heben ‏(G.)، heffan ‏(OG.)، hafjan ‏(Gt.)، heave ‏(E.)، häva ‏(Sw.) "هەڵکێشان، بڵیند کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(IE.) *kap-*** "گرتن". دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا ژمارەیەکی زۆر وشە پێوەندی بەم ریشەوە پەیدا دەکەن، وەک capare ‏(L.) "گرتن"، capsa ‏(L.) "قوتوو، کەپسوول"، Haft ‏(G.) "گیران، دەست بەسەرداگیراوی"، Heft ‏(G.) "دەفتەر [دە بەرگ گیراو]، دەستگیرە"، Haut ‏(G.) "پێست"، haben ‏(G.) "دارا بوون، هەبوون"، Hafen ‏(G.) "قاپ، دەفر، *هەبان*"، ↑هەبان heban، ↑ئیپە îpe، ↑کیپ kîp و هتد.

**قاپقاپ qaqqap** *[ qāpqāp ]* - "پێڵاوی لە دار": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قاپ[1] qap "دەفر، جام" [خاڵی 3]دا باس کراون و باسی داتاشین و هەڵکۆڵین دەکەن.

**قاپووت qaput** *[ qāpūt ]* - "فەرەنجی": دەگەڵ وشەی ↑کەوا kewa پێوەندییان هەیە بە cappa ‏(L.) "پاڵتەوی کڵاودار".

**قاپووچکە[1] qapuçke** [ *qāpūčka* ] - "قاپی بچووک": بڕوانە ↑قاپ[1] qap "دەفر".

**قاپووچکە[2] qapuçke** [ *qāpūčka* ] - "پارووی نان بۆ ماست پێ هەڵگرتن": دەچێتەوە سەر ↑قاف[3] qaf [↑کوفک kufık] "ڕەحەتی" کە دە فارسیدا دبێتە قیف qīf ( P.). ئەم پاروونانە شێوەکەی لە کوفک واتا ڕەحەتی دەچێ، لایەکی زارکێکی گەورەی هەیە و لایەکەی دیکەی تەنگ و قووچاوە.

**قاپۆ(ک) qapo(k)** [ *qāpo(k)* ] - "ئاومالک، ئەو شتانەی لافاو ڕایداون و خستوونییە قەراخ چەم": قافۆ qafo ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*ساوین sawîn* و ↑سفور sıfur "ماڵەڕ، گەسکدەر" [سابیدن sābīdan ( P.) و سپور sopūr ( P.)]. سەرنج بدە کە دە وشەی "ئاومالک"دا کە وشەیەکی دیکەیە بۆ "قاپۆ"، چەمکی "ماڵین" بەدی دەکرێ [ڕامالین]. وەک دەبینرێ ئەم چەمکە دەگەڵ "ساوین" و "سفور" پێوەندی هەیە.

**قاپۆر qapor** [ *qāpor* ] - "قاوغ": دەچێتەوە سەر بنەوشەی ↑قاپ[1] qap "دەفر".

**قاپە qape** [ *qāpa* ] - "ئاخافتنی زلەزل و بێ مانا": ↑قاپان qapan "خۆ هەڵکێشان".

**قات1 qat 1** [ *qāt* ] - "1-زەوی، هەرد 2- مەیدان": ↑قاد qad یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑گێتی getî و↑زەوی zewî.

**قات2 qat 2** [ *qāt* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کات kat "دەم". قەید qeyd و قاس qas یش دوو شێوەی دیکە لەم وشەیەن.

**قات3 qat 3** [ *qāt* ] - "نهۆمی خانوو": خزمە دەگەڵ ↑قەد qed. هەر وەک چۆن هێندێک شت قەد قەد لەسەر یەک دادەنرێن، هەر بەم جۆرەش نهۆمەکانی خانوو قەد قەد واتا چین چین لەسەر یەک دانراون و بۆیەش وشەی "قات" بۆ ئەم مانایە بەکار هێنراوە.

**قات[4] qat** [ *qāt* ] - "ئەندازە، ئەوەندە" [دووقات چاکەی دامەوە]. خزمە دەگەڵ ↑قەد qed بە مانای "ئەندازە" [بە قەد یەک کار دەکەن واتا بە یەک ئەندازە کار دەکەن].

**قات[5] qat** [ *qāt* ] - "دەستێک لە بەرگ و نوێن": [قاتێک کەوا و پانتۆڵ]. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑کۆت[2] kot "کۆت و شەڵوار".

2- ↑قەد qed "بەژن و باڵا، ئەندازە".

**قاتر qatır** [ *qātır* ] - "ئێستر": قاطر qater ( P.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە cattle ( E.) "مەڕ و ماڵات"، chatel ( OF.). ئەم وشانە دەچنەوە سەر capitale ( ML.) "سەرمایە، ماڵ و دارایی".

**قاتۆر qator** [ *qātor* ] - "داری دارەڕا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑کەتیر ketîr "داری بن شەغرە".

2- ↑قاچک qaçık "خێزەر، چرپی".

**قاتۆرک qatork** [ *qātork* ] - "لقی هەرناسکی دار": خزمە دەگەڵ ↑قاچک qaçık "خێزەر، چرپی".

**قاتە1 qate 1** [ *qāta* ] - "1- تیکوڵی چەڵتووک 2- داسووڵکەی خەلە": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەژە qeje "تۆژاڵکی سەر شتی ترشاو"، ↑قەشا qeşa یان ↑قەشەم qeşem "تۆژاڵکی سەهۆڵ"، ↑قەشقوویل qeşquwîl یان ↑قەشقیلک qeşqîlk "تیکوڵەهێلکەی بەتاڵ" و ↑قژ qıj "موو، تووک" و هتد.

**قاتە2 qate** [ *qāta* ] - "رازی، قایل": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ heiter (G.)، heitar (OG.)، hādor (OE.) "شاد، رووگەش"، سەر بە ریشەی **< kāi- (IE.)** "درەوشاوە، درەوشانەوە، گەش(انەوە)". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شاد şad.

**قاجووج qacuc** [ *qācūc* ] - "گڵێنەی ئاوخواردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑کاشی kaşî.

**قاچ1 qaç** [ *qāč* ] - "لاق": هاوریشەیە دەگەڵ Hachse (G.) "قاچکی مەڕ وماڵات" [دە زمانی زارەکیدا بە مانای "لاق"یش دێ]، hähsina (OG.) "چەرمەچەقاڵتەی سەرەوەی پاژنە"، hohsinu (OE.) و hoxena (OF.) "بەلەک، لای خوارەوی پێ". وشە ئەورووپییەکان دە بنچینەدا لە دوو بەشی *hanh(a)-sinwo** پێک هاتووە، بە مانای "چەرمەچەقاڵتەی پێ هەڵواسین". مەبەست ئەو شوێنەی لاق بووە کە مەڕ و ماڵاتیان پێ هەڵواسیوە.

**قاچ2 qaç** [ *qāč* ] - "1- زەقایی، زۆپایی 2- دوو، کلک": خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz [قیت و قۆز] و ↑قۆچ qoç "شاخ" و ↑قاژ qaj "نقێم".

**قاچاخ1 qaçax** [ *qāčāx* ]- دەگەڵ "قاب" دێ [قاب و قاچاخ qab u qaçax]. دە فارسیدا قاشق qāšoq (P.) "کەوچک". دە کوردمادیدا جگە لە وشەی "کەوچک" وشەی ↑کەچک keçık یش بەکار دەهێنرێ کە خزمە دەگەڵ قاچاخ و "قاشق"ی فارسی. "کەوچک" و "کەچک" دوو وشەی جیاوازن، هەرچەند هاومانان، بەڵام ریشەکانیان جیاوازە.

**قاچاخ2 qaçax** [ *qāčāx* ] - "بەچکە وشتری دووساڵە، گامێشی دووساڵە": خزمە دەگەڵ ↑گچکە gıçke "چکۆڵە".

**قاچاخ3 qaçax** [ *qāčāx* ] - قاچاغ qaçaġ یش دەگوترێ.

1- دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئەم مانایانە بۆ "قاچاخ" یان "قاچاغ" کراوەتەوە: "1- کاری دژی دەستووری دەوڵەت 2- کەسێک کاری دژی دەستووری دەوڵەت دەکا 3- ماڵێک کە کڕین و فرۆشی بەرانبەر (بەپێی) دەستووری دەوڵەت نییە 4- کەسێ کە لە ترسی دەوڵەت خۆی شاردۆتەوە 5- تۆراو، تاربووگ (تاراو)". ئەگەر لە هەموو ئەم مانایانە ورد بینەوە و بە شوێن مانای بنەڕەتیدا بگەڕێین، بەم ئەنجامە دەگەین کە مانای وشەکە دەشێ "شاراوە، ون، بزر" بێ. ئەم چەمکە دە هەموو ماناکانی سەرەوەدا خۆی دەردەخا. کەوابوو کاری قاچاخ، کەسی قاچاخ یان ماڵی قاچاخ لەبەر ئەوە بەم ناوە کراون، چونکوو لەبەر چاوی دەوڵەت شاراوە و بزر بوون واتا بە نهێنی روویان داوە. کاتێک لەم تێروانینەوە بۆ ساخ کردنەوەی وشەکە بچین، ئەم ئەنجامە دەست دەخەین کە دەشێ پێوەندی بە هێندێک وشەی زمانی کوردمادییەوە هەبێ کە دە ریشەدا مانای "کەم، گچکە" دەبەخشن، وەک ↑گچکە *gıçke*، ↑کز kız، ↑کاس kas [کەم و کاس] و هتد. لە مانایایەوە هەروەها مانای "(لەبەرچاو) ون بوون، لە ناو چوون" پەیدا بووە، چونکوو شتێک کە چکۆڵە و چکۆڵەتر یان کەم و کەمتر دەبێتەوە، دواجار لەبەر چاو ون و بزر دەبێ یان لە ناو دەچێ. ↑قووچان quçan "وێک هاتن، چکۆڵەبوونەوە"، ↑کۆژۆ kojo "چکۆس، *دەستقووچاو*"، ↑کووژانەوە kujan(ewe) [گوژانەوە gujan(ewe) واتا لە کزی دان و نەمان]، گوژان gujan "کوژران" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. کەوابوو لە مانای "کەم، گچکە (بوونەوە)" مانای "ون و بزر و شاراوە بوون" و دواتر "نەمان و لەناو چوون" سەریان هەڵداوە. بەم شێوەیە دەشێ چەمکی "قاچاخ" پێوەندی بە چەمکی "ون و بزر و شاراوە بوون"ەوە پەیدا کردبێ.

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ وشەکە دەگەڵ ↑قەدەخە qedexe بەرهەڤ بکەین، کە ئەویش وشەیەکی کوردمادی رەسەنە.

[تیبینی 1: بە روونی دەردەکەوێ کە "قاچاخ" وشەیەکی سەرتاپا کوردمادییە و زمانی تورکی وەری گرتووە. هەروەها ↑یاساغ [یاساخ yasax] یش شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە نیشان دەدا.
[تیبینی 2 : دە زمانی ئەڵمانیدا بە قاچاق کردن دەگوترێ schmuggeln. ئەم وشەیە دە ریشەدا بە مانای خۆ مات کردن [کز و مات]، بە ماتەمات و بە خشکەیی دەرباز بوونە].

**قاچان1 qaçan** [ *qāčān* ] - "را کردن": خزمە دەگەڵ ↑کۆچان koçan "رۆیشتن، تەرە بوون".

**قاچان2 qaçan** [ *qāčān* ] - "بزۆز، نائارام": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کیچ keç "زیلەی بزۆز".

**قاچک1 qaçık** [ *qāčık* ] - "1- خێزەرە 2- چرپی": چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەن کە بە گشتی ئاماژە بە چەمکەکانی دار یان لاسکی گیا دەکەن، وەک ↑کاج kac یان قاج qac "ناوی دارێکی دڕکاوی"، ↑قاسک qasık "لاسکی گیا"، ↑قاتۆرک qatork "لقی هەرەناسکی گیا"، ↑قاشم qaşım "گیایەکی بۆنخۆش"، ↑قاشۆ qaşo "لقی دارە مێو" و هتد.
1- ئەم وشانە لەوانەیە پێوەندییان بە چەند وشەیەکی وەک ↑قاش qaş و ↑کووز kuz "لەت، بڕ، کەت"ەوە هەبێ و بچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین".
2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑کۆتەرە kotere.

**قاچک2 qaçık** [ *qāčık* ] - "پاچەی بزن و مەڕ": ↑قاچ qaç "لاق".

**قاچین qaçîn** [ *qāčīn* ] - "پاچین" [هەڵپاچین]. هەروەها قاچی qaçî هەیە بە مانای "تۆرتۆ، برینگ". قیچی qeyčī (P.). خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş [قاش کردن واتا لەت کردن].

**قاخ qax** [ *qāx* ] - "چەماو": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قۆق qoq و دواجار لە ↑قۆز qoz.

**قاد qad** [ *qād* ] - "زەوی، هەرد، خاک، گوڕەپان": ↑قات qat.

**قار qar** [ *qār* ] - "1- تووڕەیی 2- خەم": دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑گۆڕین² gorîn هەیە بە مانای "زوێر بوون، زیز بوون". [لە یەکتر گۆڕین واتا زوێر بوون و قسە نەکردن دەگەڵ یەکتر، یان لە یەکتر تووڕە بوون و قسە نەکردن لەگەڵ یەکتر]. دە فارسیدا دەگوترێ قهر کردن qahr kardan (P.) "زیز بوون، زوێر بوون". وشەی "قهر" دە فارسیدا شێوەی عەرەبێنراوی وشە کۆنەکەیە کە بووەتە قهر qahr (Arb.) بە مانای "تووڕەیی، زەبر و زەنگ" و پاشان بەم شێوەیە هاتووەتەوە ناو زمانی فارسی. بەڵام دە زمانی فارسیشدا هەروەک زمانی کوردمادی لەپاڵ مانای "تووڕەیی" مانای "زوێری، تۆران، رەنجان"ش پارێزراوە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑جەحنین ceħnîn "تووڕە بوون، جەهری بوون".

**قارا qara** [ *qārā* ] - "ئۆقرە": دەگەڵ "ئارا" دێ [ئارا و قارا ara u qara ی نەما]. خزمە دەگەڵ ↑ئۆقرە oqre [o-qıre].

**قاڕاندن qarandn** [ *qārāndın* ] - "1- دەنگ بەرز کردنی پەز 2- گارەکردنی مریشک": خزمە دەگەڵ ↑قیڕاندن qîrandın.

**قارپوز qarpuz** [ *qārpuz* ] - "گندۆرە، کاڵەک": خربزە xarboze (P.). خزمە دەگەڵ Herbst (G.) "پاییز". ئەم وشە ئەڵمانییە دەبنەڕەتدا بە مانای "بەر و بۆم" بووە و خزمە دەگەڵ harfest (OE.)، harfst (OF.)، carpere (L.)، carpos (Gr.) "بەر و بۆم"، kirpti (L.) "لێکردنەوە"، erp (Rus.)، kröpion (Gr.) "داس". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑کرتاندن krtandn، ↑کێرد kerd، ↑کرپە kırpe "دەنگی شکان(ی شتی ناسک)"، ↑کەرپال kerpal "شرۆڵ" و هتد.

**قارژنگ qarjıng** [ *qārjıng* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑قرژاڵ qırjal. خرچنگ xarčang (P.).

**قارس qarıs** [ *qārıs* ] - شێوەیەکی کۆنترە لە ↑قەڵس qelıs.

**قارغ qarıġ** [ *qārıġ* ] - "وەتاغی دوورەتاو و تاریک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قەیرە qeyre سەر بە ریشەیەک بە مانای "بۆر".

**قارنان qarnan** [ *qārnān* ] - "چکۆس، رژد": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرنیس qırnîs.

**قارنج qarınc** [ *qārınj* ] - "پەراوێزی بەرگ و شمەک": خزمە دەگەڵ Grenze (G.) "سنوور". [سنوور دە راستیدا هەروەک پەراوێز و قەراخی ولاتێک وایە]. زمانی ئەڵمانی ئەم وشەیەی لە زمانە سلاڤییەکان وەرگرتووە: granica (Pol.) و hranice (Rus.)، (Chek.) و garn (Rus.) "سنوور، مەرز". خزمیشە دەگەڵ ↑قەراخ qerax.

**قارووش qarûş** [ *qārūš* ] - "گیایەکە گەسکی لێ دروست دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑گرشە gırşe [↑قرشە qırşe] و ↑کلۆش kıloş. ئەم وشانە گشتیان پێوەندییان بە چەمکی "گیا"وە هەیە.

**قاروون qarun** [ *qarūn* ] - "1- بیل گەیتی کەونارا 2- بێشە و زەمەند 3- زۆر، زاڤ": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ناوی چەمی کاروون karun [چەمێک لە ناوچەی خووزستان]. لەوانەیە ئەم چەمەش لەبەر زۆر و زەوەند بوونی ئاوەکەی بەم جۆرە ناو نرابێ. ئەم وشانە دەتوانن پێوەندییان هەبێ بە یەکێک لە دوو ریشانەی خوارەوە:

1- *(IE.) *ger(h)-* > "گران". لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گران gıran. جێی ئاماژەیە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ئەنگران engıran بە مانای "زۆر دەوڵەمەند بوون" بەکار دێ. هەروەها "زەنگین" وشەیەکی دیکەیە کە بۆ مرۆڤی دەوڵەمەند بەکار دێ و هەر ئەو "سەنگین"ەیە بە مانای "قورس، گران".

2- *(IE.) *ghro-* > "شین بوون، هەڵدان، گەورە بوون". لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ گووران guran "1- رسکان، سەرهەڵدان 2- پێگەیشتن، کامڵ بوون".

**قارە1 qare 1** [ *qāra* ] - "گێژی" [قارەی سەر دێ]. خزمە دەگەڵ ↑قر2 qır 2 [قر و فر واتا سوور، خۆ با دان].

**قارە2 qare 2** [ *qāra* ] - "1- تۆپێنی بە دار": قارنە qarne ش دەگوترێ. هەروەها قارنگە qarınge هەیە بە مانای "شار لە یاری تۆپێندا". لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑خر xır و ئاماژە بە "تۆپ" کرابێ کە شێوەیەکی خری هەیە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ كرة korra (Arb.) "خڕۆک، تۆپ" و كرةالقدم "تۆپی پێ".

**قارەمان qareman** [ *qāramān* ] - "پاڵەوان، ناودار": قهرمان qahramān (P.). وشەی Ruhm (G.)، roem (Nl.) "ناوبانگ" دەچنەوە سەر کرداری (h)ruomen (OG.) "ناوبانگ دەرکردن". وشەی "قارەمان" ی کوردمادی دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەم وشەیەی ئەڵمانی کۆن و بەم پێیە دەبێ سەرەتا وشەکە هەروەک دە ئەڵمانیدا وەک کردار بەکار هاتبێ، دواتر بووبێتە ئاوەڵناو. لە باری ماناشەوە دەبێ سەرەتا مەبەست مرۆڤی بەناوبانگ بووبێ، واتا بەو کەسانە گوترابێ کە بە هۆی تێکۆشان و نەبەزینەوە ناو و ناوبانگیان دەرکردووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *kar-* > "بڵند راگەیاندن، دەنگ بەرز کردن". وشەکانی carkarti (OIn.) "بەناوبانگ"، keryx (Gr.) و herold (E.) "قارەمان" دەبنە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

**قاز qaz** [ *qāz* ] - "ناوی مەلێکە": قاز / غاز qāz / ġāz (P.)، goos (E.)، Gans (G.)، gas (Sw.)، hamsa (OIn.)، anser (L.) [پێشتر *hanser*]، chen (Gr.)، žasis (Lit.)، گشتیان بەمانای "قاز" سەر بە ریشەی *(IE.) *ghans-* > "دەم کردنەوە". خزمە دەگەڵ ↑کەنین *kanîn* "پێکەنین" و دواتر ↑قەوچە qewçe "شەویلکە جوڵاندن بە دەمی ئاوەڵە".

**قازاخ qazax** ⌋ *qāzāx* ⌊ - "جوان": [جوان و قازاخ]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەشخە keşxe. رەنگە شێوەی بە تورکی کراوی وشەکە بێ. ئازەرییەکان دەڵێن "گەشەک".

**قازان qazan** ⌋ *qāzān* ⌊ - "مەنجەڵ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑گۆزە goze "دەفری ئاو".

**قازم qazım** ⌋ *qāzım* ⌊ - "ریس لە خوری بنەوە": خزمە دەگەڵ↑ کەزی kezî "پرچۆکە".

**قازەڵاخ qazelax** ⌋ *qāzalax* ⌊ - "ناوی باڵدارێک": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- ↑قشقەڵە qışqele.

2- ↑قاز qaz.

**قازەن qazen** ⌋ *qāzan* ⌊ - "دەسک [چەپک] کردنی چەڵتووک": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گیشە gîşe، ↑قۆشەن qoşen، ↑هێشوو hêşû، ↑قشڵە qışle "سەربازخانە" و هتد. ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "دەستە بوون، زۆر بوون، کۆم بوون، باقە بوون" دەکەن.

**قاژ1 qaj** ⌋ *qāž* ⌊ - "نقیم": خزمە دەگەڵ ↑کووژەکە kujeke "جۆرێک مووروویی شین" و ↑قاچ qaç "زۆپایی، زەقایی". پێوەندیشی هەیە بە وشەکانی ↑قۆچ qoç، ↑قۆز qoz، ↑قوت qut و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەن بە هێندێک چەمکی وەک چەمانەوە، قووت بوونەوە، هەڵتۆقین و دەرپەڕین. نقیمی ئەنگوستیلە شتێکی چەماوە و دە هەمان کاتدا قوت و هەڵتۆقیوە بە سەر ئەنگوستیلەوە.

**قاژ2 qaj** ⌋ *qāž* ⌊ - "برۆ": خزمە دەگەڵ ↑قژ qıj "موو، تووک".

**قاژر qajır** ⌋ *qāžır* ⌊ - "زارۆکی گرینۆک": خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje.

**قاژک2 qajık** ⌋ *qāžū* ⌊ - "قەوچە، دەم لێکدان": خزمە دەگەڵ ↑*قاز qaz*، ↑قەوچە qewçe و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەم کردنەوە" و دواتر "دەم لێکدان، دەم پێکدادان".

**قاژوو qaju** ⌋ *qāžū* ⌊ - "باڵدارێکی رەشە لە کۆتر بچووکتر": قاژ qaj یش دەگوترێ. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑*قیژە qîje* و ↑قشقەڵە qışqele و ↑قژاکە qıjake "تاق تاقکەرە".

**قاس1 qas** ⌋ *qās* ⌊ - "ئەندازە": [چقاس واتا چەندە، چ ئەندازە]. شێوەیەکی دیکە و لەوانەیە شێوەی کۆنتری ↑قات qat [↑قەد qed] بێ، بە مانای "ئەندازە" [دە بنەڕەتدا: "بڵیندایی"، بە قەد یەکتر واتا بە یەک ئەندازە، دە بنەڕەتدا: بە بڵیندایی یەکتر، وەک یەک بڵیند]. وشەکانی " قیاس" و "مقایسة" دە زمانی عەرەبیدا لەم وشەیە وەرگیراون.

**قاس2 qas** ⌋ *qās* ⌊ - "کات، دەم" [ئەوقاس واتا ئەودەم]. شێوەیەکی دیکە لە ↑قات² qat و ↑کات kat.

**قاسپە qaspe** ⌋ *qāspa* ⌊ - "دەنگێ و ئاوازی کەو": خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje و ↑*قاقا qaqa*.

**قاسک qasık** ⌋ *qāsık* ⌊ - "لاسکی گیا": خزمە دەگەڵ ↑قاچک qaçık "خێزەر، چرپی".

**قاسناخ qasnax** ⌋ *qāsnāx* ⌊ - پێوانەیەکی خەلە بەرانبەر بە سی و دوو کیلۆ": رەنگە "قاسناخ" دەفر یان سندووقێک بێ، بری سی و دوو کیلۆ خەلە هەڵبگرێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خەزنە xezne.

**قاش1 qaş** ⌋ *qāš* ⌊ - "لەت، کووز": قاچ qāč (P.)، شێوەیەکی دیکە لە ↑کووز kuz و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑کوت kut، ↑کەت ket، ↑قەتاندن qetandın، ↑قوسان qusan "تاشین" و ↑کۆتایی kotayî "برانەوە" و هیتر کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "برین".

**قاش2 qaş** [ *qāš* ] - "کەوانە، نیوجەغز": خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn، ↑قۆف qof، ↑کەژ kej و ↑کێو kew [کێف kef]، ↑قاژا qaj 1 "نقێم" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "چەمانەوە" دەکەن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.)* ***keu-** > "چەمانەوە"].

**قاش3 qaş** [ *qāš* ] - "نقێم": شێوەیەکی دیکە لە↑ قاژ qaj "نقێم".

**قاشاخ qaşax** [ *qāšāx* ] - "رنەکی ئەسپ": قشو qešou (P.). خزمە لەگەڵ ↑خێشک xêşk. خزمە لەگەڵ ↑قاش qaş "لەت، کووز" سەر بە ریشەیەك بە مانای "برین" و لەوانەیە پێشتر "قاشەك qaşek" بووبێ، هەر وەك "رنەك". لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "رنەك" سەر بە کرداری "رنین" کە ئەمەش دە بنەڕەتدا سەر بە ریشەیەکە بە مانای "تاشین، پچرین، لێکردنەوە".

**قاشقاشە qaşqaşe** [ *qāšqāša* ] - "ناوی گوڵێك": خاشخاش xaşxaş یش دەگوترێ. خشخاش xašxāš (P.). خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş "بڕ، لەت، کوت". پەڕەکانی ئەم گوڵە وەك قاش قاش کراو دێنە بەرچاو.

**قاشگ qaşıg** [ *qāšıg* ] - "پەترۆك، قرتماخەی سەر برین": خزمە دەگەڵ قاشك qaşık [↑قاشڵ qaşıl] "توێکڵ" [تۆێخ]. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "توکڵ" [توێکڵ].

**قاشڵ qaşıl** [ *qāšıl* ] - "توێکڵ": قاشوول qaşûl و قاشك qaşık یش دەگوترێن. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە پێوەندییان بە چەمکەکانی "تۆێکڵ، تۆژ، پێستە، پۆرگ"ەوە هەیە وەك ↑قاشك qaşık "تۆکڵی دار"، ↑قاشگ qaşıg "پەترۆك، قرتماغەی سەر برین"، ↑قەژە qeje "تۆژاڵکی سەر شتی ترشاو"، ↑قەشا qeşa یان ↑قەشەم qeşem "تۆژاڵکی سەهۆڵ"، ↑قەشقوویل qeşquwîl یان ↑قەشقیلك qeşqîlk "تیکوڵەهێلکەی بەتاڵ" و ↑قاتە qate "توێکڵی چەڵتووك" و هتد. ئەم وشانە پێوەندییان بە دەستەوشەیەکی دیکەوە هەیە کە ئاماژە بە چەمکی "بڕین، لەت کردن، تاشین" دەکا، وەك ↑قاش qaş، ↑کووز kuz، ↑کوت kut و ↑کەت ket و هیتر.

[تێبینی: شتێك کە دەمانگەیەنێتە ئەم بۆچوونەی سەرەوە، بەراوردێکە لە نێوان مانای Rinde "توێکڵەدار" دە زمانی ئەڵمانیدا و ئەم وشانەی سەرەوە بە مانای "توێکڵ". وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بڕین، ڕنین، تاشین" و بەهۆی تاشین یان رنینی توێکڵەدارەوە ئەم ناوە دراوە بە "توێکڵەدار". دەشێ دە زمانی کوردمادیشدا بنەوشەی قاش - qaş بە مانای تۆێکڵ بەم جۆرە سەری هەڵدابێ، واتا مەبەست سەرەتا تۆێکڵێك بووبێ کە داڕندراوە یان تاشراوە، لەت کراوە یان لێ کراوەتەوە. هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی "چین" دە زمانی کوردمادیدا بدەین کە زۆر جار دەگەڵ "توێژ" بەکار دێ (چین و توێژ)، دەبینین کە ئەو وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "لێکردنەوە، بڕین، جیا کردنەوە". لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑قژ qıj "تووك". پێوەندی دوو وشەی "قاشك" و "قژ" وەکوو پێوەندی دوو وشەی "تۆکڵ" و "تووك" وایە].

**قاشم qaşım** [ *qāšım* ] - "گیایەکی بۆنخۆش": خزمە دەگەڵ ↑قاچك qaçık "خێزەر، چرپی".

**قاشوول qaşûl** [ *qāšūl* ] - ↑قاشڵ qaşıl "توێکڵ".

**قاشوولە qaşûle** [ *qāšūla* ] - "لەتەسواڵەت، ورکەسواڵەت": قاش + ئوولە qaş + ule. کەرتی "قاش" پێوەندی هەیە بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە:

1- کاشی kaşî.

2- ↑قاش qaş مانای "بڕ، کەرت، لەت" دەدا و کەرتی دووەمیش پاشگری گچکاندنە.

**قاشۆ1 qaşo** [ *qāšū* ] - "لقی دارەمێو": خزمە دەگەڵ ↑قاچك qaçık "خێزەر، چرپی".

**قاشۆ qaşo 2** ⌈ *qāšo* ⌋ - "داری سەرچەماو بۆ گۆبازی": شێوەیەکی دیکە لە ↑کاشۆ kaşo 1.

**قاشە qaşe** ⌈ *qāša* ⌋ - "جۆرێك ماسی پوولەکەزەرد": خزمە دەگەڵ ↑قاشڵ qaşıl "تویکڵ" و ژمارەیەك وشەی دیکەو کە ئاماژە بە "توێکڵ، پێستە، تۆێژ" دەکەن و مەبەست لێرەدا ئاماژەیە بە "پوولەکەکانی" ئەم ماسییە. [بو زانیاری سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی پوولەکە، پۆرکێ، پێستە و تۆێکڵ بڕوانە وشەی "پوولەکە"].

**قاف¹ qaf ¹** ⌈ *qāf* ⌋ - "کەللە": دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- Giebel (G.)، gibil (OG.)، gavel (Nl.)، gavel (Sw.) "نووك، دوند، کونگرە". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ gibilla (OG.)، gebel (MG.)، kephalé (Gr.) "سەر، کەللەسەر". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑قەفەڵ qefel "چەنگاڵ". ئەگەر لەم تێڕوانینەوە چاو لە وشەکە بکەین، دەبێ وای دابنێین کە لە مانای "چەنگاڵ"ەوە مانای "دوند، زەقایی" و لەوێشەوە مانای "سەر، کەللە" پەیدا بووە. پێوەندی وشەی "قاف" بەم وشانەوە زۆر ڕێی تێ دەچێ، چونکوو دە زمانی کوردمادیدا کەپ² kep هەیە بە مانای "دوندی چیا" و هەروەها ↑کەپك kepk "بەشی زەق و دەرپەڕیو لە هەر شتێك".

2- لەوانەشە وشەکە پێوەندی هەبێ بە Kopf (G.) "سەر". ئەم وشەیە دە بنچینەدا بە مانای "دەفر، کاسە" بووە و پاشان لەبەر وێکچواندنی سەر بە کاسە [کاسەی سەر]، مانای کەللەی پەیدا کردووە. ئەم وشە ئەڵمانییە دەبردرێتەوە سەر cuppa (L.) "دەفر، جام". وشە لاتینییەکە خوێ پێوەندی هەیە بە ↑کووپە kupe و چەندان وشەی دیکە وەك ↑قوب qub، ↑قوببە qubbe، ↑قۆپچە qopçe و هتد.

**قاف² qaf ²** ⌈ *qāf* ⌋ - "ناوی کێوێک": [کێوی قاف]. لەوانەیە مەبەست زەنجیرەکێوەکانی قەفقاز qefqaz بێ و پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لەژێر ↑قاف¹ qaf ¹ دا باس کراون.

**قاف³ qaf ³** ⌈ *qāf* ⌋ - "ڕەحەتی": شێوەیەکی دیکە لە ↑کوفك kufık.

**قاف قلۆر qafqılor** ⌈ *qāfqılor* ⌋ - "حەپۆل، نەفام": کەرتی ↑قاف qaf بە مانای "کەللە"یە، کەرتی قڵۆر qlor شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کلۆڕ kılor "بۆش، ناوبەتاڵ". تێکڕای وشەکە مانای "کەللەپووك" دەدا.

**قافك qafık** ⌈ *qāfık* ⌋ - "قاوغ، کالان": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑قاوغ qawıġ. خزم دەگەڵ ↑قاڤۆ qavo "لاسکی ناو بەتاڵ".

**قافلە qafle** ⌈ *qāfla* ⌋ - "کاروان، دەستەی سەفەرکەر": قافلە qāfele (P.). پێوەندی هەیە بە couple (E.) "جووت، دوو یان چەند دانە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر زمانی فەرانسەیی کۆن و لەوێشەوە بۆ زمانی لاتینی واتا copula (L.) "گرێ، پێوەندی". وشەکە دە بنەڕەتدا دروست بووە لە co + apere (L.) "لێکبەستن". دە زمانی کوردمادی دا وشەی ↑کۆپلە cople ش بەکار دێ بۆ چەند بەندێکی هەڵبەست.

**قاڤۆ qavo** ⌈ *qāvo* ⌋ - "لاسکی ناو بەتاڵ": خزمە دەگەڵ ↑قاوغ qawıġ.

**قاق qaq** ⌈ *qāq* ⌋ - "هیشك، زوها": خزمە دەگەڵ ↑قاقر qaqır "زەوی هیشك و ڕووتەن".

**قاقا qaqa** ⌈ *qāqā* ⌋ - "کەنین بە دەنگی بلیند": قهقهه qahqahe (P.). خزمە دەگەڵ kakhati (OIn.) "پێ دەکەنێ"، kichazzen (OG.)، kachazein (Gr.) "قاقا لێدان"، giggle (E.) و kichern (G.) "حیلکاندن". بە گوێرەی ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگە. بەڵام دوور نییە ئەم وشەیە بچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ĝhan-, *ĝhēi-, *ĝhēu- >*** "دەم کردنەوە". وشەی ↑قاز qaz و ↑کەنین kenîn [پێکەنین] دە زمانی کوردمادیدا سەر بەم

ریشەیەن. هەروەها ↑کۆخە koxe [کۆکە koke، قۆزە qoze] و ژمارەیەک وشەی وەک ↑کووکە kuke، ↑قووقاندن qûqandın "خوێندنی کەڵەشێر" و ↑قیژە *qîje* و دە پلەیەکی دوورتردا ↑گەپین gepîn "وەڕین" و هیتر دەشێ پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا ئاماژەیان بە "دەم کردنەوە" کردبێ.

**قاقبین qaqbn** [ *qāqbīn* ] - "خوێندنی کەو": بنەوشەی قاق (ب) qaq(b) شێوەیەکی دیکە لە ↑قاسپە qaspe. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑قاقا qaqa "کەنین بە دەنگی بلیند".

**قاقر qaqır** [ *qāqır* ] - "زەوی هیشک و رووتەن": خزمە دەگەڵ ↑هەژار "فەقیر" و hager (G.) "کز و لاواز، هیشک و رەق و تەق" و هەر وەها ↑کز kız.

**قاقل qaqıl** [ *qāqıl* ] - "تیکولی هێلکە": خزمە دەگەڵ ↑قاشل qaşıl "تێکوڵ" و لەوانەشە ↑کاغەز kaġez.

**قاقلۆک qaqlok** [ *qāqlok* ] - "کەللەسەر": بنەوشەی قاق qaq- هەر ئەوەیە کە لە وشەکانی قاقل qaqıl "تیکوڵی هێلکە"، ↑قاشل qaşıl و هیتردا هەیە کە دەبنەڕەتدا ئاماژە بە "توێکڵ" دەکا و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "برین، رنین، پچڕین، لێکردنەوە". وشەی "قاقلۆک" ئاماژە دەکا بە "توێکڵ"ی سەر یان توێکڵی مێشک، واتا کەللەی سەر وەک توێکڵێک [توێژێک] لەبەر چاو گیراوە کە مێشک دادەپۆشێ. ئەم پێوەندییە ئێتیمۆلۆژیکەی نێوان "توێکڵ" و "کەللە"، وەک لە تێبینی خوارەوەدا شی کراوەتەوە، دە زمانی ئەڵمانیشدا دەبینرێ.

[دە زمانی ئەڵمانیدا Schale دوو مانا دەبەخشێ، یەکەم "توێکڵ" و دووەم "کاسە" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "برین، پچڕین، قەڵشین". مانای یەکەم، واتا "توێکڵ" مانا بنەڕەتییەکەیە. مانای دووەم لێرەوە پەیدا بووە کە لە توێکڵی دار کاسەی ئاوخواردنەوە دروست کراوە. دواتر وشە ئەڵمانییەکە دەگەڵ Hirn "مێشک" بەکار دێ و دەگوترێ Hirnschale بە مانای "کەللەسەر" [دە بنەڕەتدا: کاسەی مێشک یان توێکڵی مێشک]. وەک دەبینین چوار مانای جیاواز لە یەکتر سەرچاوەیان گرتووە کە بریتین لە 1- برین، پچڕین، قەڵشین 2- توێکڵ 3- کاسە 4- کاسەی سەر یان توێکڵی سەر (کەللە). دە زمانی کوردمادیدا وشەی کەللە kelle لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ چاڵ çal [چیلکە و چاڵ] واتا "توێکڵ" و هەروەها Schale ی ئەڵمانی.

**قاقمە qaqme** [ *qāqma* ] - "داری تامان": خزمە دەگەڵ ↑قاچک qaçık "1- خێزەرە 2- چرپی".

**قاقی qaqî** [ *qāqī* ] - "لاوازی کورتەباڵا": قاقیلە qaqîle ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کز kız.

**قاقیلۆک qaqîlok** [ *qāqīlok* ] - "دەزووی لەسەر مقەببا هەڵکراو": خزمە دەگەڵ ↑چەرخ çerx، سەر بە ریشەی **< *qeqlo- (IE.)** "چەرخ، چەرخان".

**قاڵ1 qal** [ *qāl* ] - "1- داغ، گەرم 2- تواوە لە گەرمان": خزمە دەگەڵ calere (L.) "گەرم، داغ بوون" و ge-hleow (OE.) "گەرم"، hlaer (OIs.) "ئاو و هەوای سازگار" [دەبنەڕەتدا گەرم] و lau (G.) "شیلەو گەرم"، سەر بە ریشەی **< *kel- (IE.)** "کوڵان، سووتان، گەرم بوون". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەی دیکە لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن، وەک ↑کەڵ3 kel "داغ، بەتین"، ↑کەڵژ kelj "قەدەم، تیتێک کە بە گرمای زۆر دێتە بەر چاو" و هتد.

[تێبینی: وەک دەبینرێ "قاڵ" هەم مانای "داغ" و هەمیش مانای "تواوە لە گەرمان" دەبەخشێ. دیارە پێوەندی نیزیک لەنێوان ئەم دوو مانایە لەئارا دایە. وێ دەچێ وشەی حل ħall (Arb.) "توانەوە" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**قاڵ2 qal** [ *qāl* ] - دەگەڵ "قیل" دێ [قیل و قاڵ qîl u qal]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گاڵ gal [گر و گاڵ].

قاڵ3 **qal** [ *qāl* ] - "تویکڵ و پرزەی دار": هەروەها دەگەڵ "قرش" دێ [قرش و قاڵ qırş û qal].
شێوەیەکی دیکە لە ↑چاڵ² çal [چیلکە و چاڵ].

**قاڵاخ qalax** [ *qālāx* ] - "تەپاڵەی هیشک کراوی لەسەر یەک قەڵاکراو [کەڵەکە کراو]:
1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کەڵەکە keleke [کەڵەکە کردن].
2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑قەڵا qela و دە بنەڕەتدا لەبەر شێوەکەی، بە قەڵا چوێنرابێ و سەرەتا *قەلاک qelak** بووبێ بە مانای "قەڵای چکۆڵە".

**قاڵاخی qalaxî** [ *qālāxī* ] - "پارچەیەکی رەشە": خزمە دەگەڵ کلاغ kalāġ (P.) "قەلەرەشە، قاڵاو" و دواتر دەگەڵ ↑قەل¹ qel.

**قاڵاو qalaw** [ *qālāw* ] - "قەل": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:
1- krawa (OG.) و crow (E.) "قشقەڵە".
2- hrafan (OIs.)، hraban (OG.)، Rabe (G.)، raven (E.) "قەلەرەشە". ئەگەر ئەم گریمانەی دووەم راست بێ، ئەوسا فۆتیمی b ، f یان v ی زمانە ژێرمەنییەکان دەکوردمادیدا بووەتە w. لەباری ریشەوە دەشێ گشت وشەکان سەر بە ریشەیەک بن، واتا ریشەی ***(IE.) *ker-*** **<** "قڕاندن، قیڕاندن". شیاوی باسە وشەی غراب ġarab (Arb.) "قەلەرەشە" دەبێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و وێ دەچێ لە زمانی کوردمادی کۆن وەرگیرابێ. وشەی ↑قەل qel یان کورتکراوی قاڵاوە یان لەپاڵ ئەودا وەک وشەیەکی سەربەخۆ بە مانایەکی بڕێک جیاواز بەکار هاتووە.

**قالب qalıb** [ *qālıb* ] - "1- قاوغ، بەدەنە 2- بەدەن، لەش": [قالبم دەهێشێ]، شێوەی بە عەرەبیکراوی وشە کوردمادی ↑کۆرپە korpe یە.
[تێبینی: ئەوە کە وشەکە هەر دوو مانای "قاوغ" و "لەش" دەبەخشێ، بۆ ئەم تێڕوانینە دەگەڕێتەوە کە لەش وەک قالبێک لەبەرچاو گیراوە کە رووح تێیدا جێگیرە. هەر ئەم پێوەندییە دە وشەی "لاک"ی فارسیشدا دەبینرێ، بە مانای "قاوغ، قالب". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "لەش"ی کوردمادی].

**قالتاخ qaltax** [ *qāltāx* ] - "داری ناو زین": دەشێ خزم بێ دەگەڵ halten (G.)، haldan (Gt.)، hold (E.)، halla (Sw.) "راگرتن"، halta r (MG.) "راگر، شوان، چاوەدێر" و haltāri (OG.) "وەرگر"، kālayati (OIn.) "چاوەدێری دەکا، ئاگاداری دەکا، رای دەگرێ، هەڵی دەگرێ". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان دەچێتەوە سەر ***(IE.) *kel-, *kle-*** **<** "بانگ کردن، هەرا کردن". لەم تێڕوانینەوە مانای قالتاخ دەبێتە داری "راگر".

**قاڵچغ qalçıġ** [ *qālġıč* ] - "داسووکەی گوڵی وشکی خەلە": بنەوشەی قاڵ -qal خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەڵت qelt و ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن". دەشێ وشەکە دە بنەڕەتدا "قاڵچک" یان "قاڵچکَ" بووبێ.

**قاڵشت qalıšt** [ *qālıṣt* ] - "تویکڵی دار 2- تەڵاشەدار": خزمە دەگەڵ ↑قاڵچغ qalçıġ و ↑*قەڵشین qelşîn*. دە زمانی ئەڵمانیدا Schale (G.) "تویکڵ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها قاڵ3 qal یش دەگوترێ بە مانای "تویکڵ و پرزەی دار" [قرش و قاڵ qırş û qal].

**قالک qalık** [ *qālık* ] - "قالب، تویکڵ، قوتوو، پووکە": خزمە دەگەڵ ↑قاڵ3 qal "تویکڵ". ماناکانی "قالب، قاوغ" لە مانای "تویکڵ"ەوە سەرچاوەیان گرتووە، واتا قالب یا قاوغ بە تویکڵێک یان توێژێک چوێنراون کە شتیکیان داپۆشیوە. دە زمانی ئەڵمانیدا Schale (G.) "تویکڵ" خزمە

دەگەڵ Schild (G.) "قاوغ، قالب، مەتاڵ" و دەگەڵ وشە کوردمادییەکان سەر بە ریشەیەکی هاوبەشن.

**قاڵماسک qalmask** [ *qālmāsk* ] - "قۆچەقانی": خزمە دەگەڵ ↑قالۆر qalor، ↑قەڵەم qelem و قەڵەمە qeleme.

[تێبینی: لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑قانک qanık "قاڵماسک، قۆچە*قانی*" کە دەبێتە خزم دەگەڵ "قامیش"].

**قاڵنگ qalıng** [ *qālıng* ] - "دار بۆ میوەچنین": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەڵانگ qelang "ئاسن و داری سەرخوار بۆ میوە چنین و کاری دیکە".

**قالووچ qaluç** [ *qālūč* ] - "جۆرێک داسی بچووک": خزمە دەگەڵ ↑قەڵت qelt و↑ قەڵشین qeşlîn و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "برین، لەت کردن".

**قالوون qalun** [ *qālūn* ] - "سەبیلەی درێژ": خزمە دەگەڵ ↑قالۆر galor "لاسکەگیای وشکی ناوبەتاڵ".

**قالۆ qalo** [ *qālo* ] - "بەردی نان پێژان": خزمە دەگەڵ ↑قاڵ qal [قاڵ کردن دە بنەڕەتدا واتا گەرم کردن].

**قالۆچە qaloçe** [ *qāloča* ] - "ناوی زیلەیەک": قال (ۆ) + چە qal(o) + oçe. قالۆنچە qalonçe ش دەگوترێ [قالۆ + ن + چە qal(o) + n + çe]، فۆنیمی n زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە، کەرتی کۆتایی پاشگری گچکاندنە. بنجی قال -qal لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑سریلە1 sırîle، Grille (G.) و grillus (L.) "قالۆنچە". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە. لەم تێڕوانینەوە بنجی قال -qal دەبێتە شێوەیەکی دیکە لە -sır یان -gr.

2- ↑قاڵ2 qal یان ↑گاڵ gal بە واتای "دەنگ و هەرا".

**قالۆر qalor** [ *qālor* ] - "لاسکەگیای وشکی ناوبەتاڵ": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک↑قەڵەم qelem، ↑زەل zel "قامیش"، ↑شمشاڵ şım-şal، ↑قالوون qalon "سەبیلەی درێژ"، ↑قالک qalık "قالب، توێکڵ، قوتوو"، ↑قالۆز qaloz "دارۆکەی تەڵە"، ↑قاڵماسک qalmask "قۆچەقانی" و هتد. بنەی ئەم وشانە بە مانای لاسکی گیا یان قامیشە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێهاڵان". بڕوانە↑*کلۆر kılor* "بۆش، بەتاڵ".

**قالۆز qaloz** [ *qāloz* ] - "دارۆکەیەکە لە تەڵە کەروێشکدا": خزمە دەگەڵ↑ قالۆر qalor.

**قالۆس qalos** [ *qālos* ] - "ناوی هەوایەکی گۆرانییە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گەلۆ gelo "هەوایەکی گۆرانی".

**قالی qalî** [ *qālī* ] - "مافوورە": قالی qālī (P.).

1- لە لایەکەوە دەکرێ دەگەڵ وشەی ↑کر kır هەڵی سەنگینین، سەر بە ریشەی < *(IE. *ker(t)-* "چنین، هۆنینەوە، تێکخستن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑نالک nalık "سۆل، کەوشی تەخت و بێ پاژنە".

**قام qam** [ *qām* ] - "گۆرانی، هەوای گۆرانی": خزمە دەگەڵ ↑چامە čāme (P.) "هەلبەست، گۆرانی"، hymnus (L.) و kymnos (Gr.) "گورانی، لاوژە". دە زمانی عەرەبیدا وشەی مقام maqām (Arb.) بەکار دێ کە لەوانەیە لەم وشانەی سەرەوە وەرگیرابێ و عەرەبێنرابێ. دە زمانی ئەڵمانیدا Hymne (G.) "سروود" لە وشە لاتینییەکە وەرگیراوە.

**قامچوور qamçur** [ *qāmčūr* ] - "سەرژمێری ماڵات بۆ ماڵیات": هەروەها قام کرن qam kırın هەیە بە مانای "پێوانی درێژایی و قووڵایی". لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑قام(ک) qamk ەوە هەبێ. "قامک" مانای "داری درێژووکە"ش دەدا و خزمیشە دەگەڵ ↑قامیش qamîş. لەوانەیە "ژماردنی" ماڵات یان "پێوانی" درێژایی و قووڵایی بە کەڵک وەرگرتن لە دارێکی درێژووکە ئەنجام درابێ و ناوەکە لەوەڕا هاتبێ.

[تێبینی: لەم بارەوە دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ Yard (E.) "یەکە یان پێوانەی ئەندازەگرتنی درێژایی". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Gerte (G.) "دار، لکەدار، شووڵ" و لەوانەشە دەگەڵ "گەز"ی خۆمان. لە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەکە هاوکات ئەو چەند مانایەی گەیاندووە: لقەدار، شووڵ، داردەستی شوان، داری پێوان (پێوانەدار)].

**قامچی qamçî** [ *qāmčī* ] - "شەللاق": ئەم وشەیە و چەند وشەیەکی وەک ↑قەمە qem(m)e "قەدارە، شمشێری کورت"، ↑*قیمە qîme* "وردکراو، ئەنجراو" دەشێ سەر بە ریشەیەکی هاوبەش بن بە مانای " لێدان، ورد کردن، لەت و کوت کردن".

**قامک qamık** [ *qāmık* ] - "1- ئەنگوست، تبل، تلی 2- داری ناوچەرخی گاری": خزمە دەگەڵ ↑*قامیش qamîş* [قامووش qamûş]، ↑قامر qamır "نەی بۆ نووسین"، ↑خامە xame "پێنووس، قەڵەم".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵیسەنگینە دەگەڵ "کلک" کە ئەم مانایانە دەبەخشێ: "1- دووڤ 2- قامک 3- قەڵەم"].

**قامیش qamîş** [ *qāmîş* ] - "نەی، چیتک، زەل": ئەم وشەیە زۆر وێ دەچێ شێوەیەکی دیکە بێ لە وشەی ↑نەی1 ney "قامیش". ئەم دوو وشەیە هەرچەند بە رواڵەت زۆر جیاوازن، بەڵام دەشێ پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ، یان دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ canna (L.) و kanna (Gr.) "نەی، قامیش، لوولک". ئەم وشانە بەگوێرەی سەرچاوەکان دەچنەوە سەر *(Sum- Akd.) gin > (Bab-Asr.) qanu >* "قامیش، لوولک". وشە کۆنەکە دەشێ دە زمانی کوردمادیدا بە دوو شێوە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، لە شێوەی یەکەمدا فۆتیمی سەرەتای وشەکە سواوەتەوە و لە شێوەی دووەمیشدا فۆتیمی n گۆڕاوە بۆ m. دە زمانی کوردیدا هەروەها شێوەی کۆنی وشەکە پارێزراوە کە بریتییە لە ↑قانک qanık "قاڵماسک، قۆچەقانی". وشەی "قاڵماسک"یش دە بنەڕەتدا خزمە دەگەڵ *قەڵەم* "قامیش، نەی، زەل"]

**قان1 qan** [ *qān* ] - "دەرفەت بۆ دووبارە کایە کردن": لەوانەیە لە وشەی خان xan وەرگیرابێ و مەبەست دە بنەڕەتدا خانەی بازی بێ [بڕوانە ↑خانوو xanu].

**قان2 qan** [ *qān* ] - "خاڵی ڕوو": شێوەیەکی گۆڕدراو لە ↑شان4 şan "خاڵی سەر گۆنا". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قانی qanî "پەڵە، لەککە".

**قاناو qanaw** [ *qānāw* ] - "جۆگەلەی قەراخ شەقام": قان + ↑ئاو qan + aw. "قەناو"یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ کەندن kendın [↑هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن] بە مانای "کۆڵین، قووڵ کردن، دانەوەی هەرد".

**قانچە qaçne** [ *qānča* ] - "سوانە، لێواری سەربان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kante (E.)، "قەراخ". وشە ئەڵمانییەکە لە وشە فەرانسەییەکە وەرگیراوە و ئەویش دەچێتەوە سەر *(L.) cantus >* "عارەبانەی ئاسن، ئەو ئاسنەی لە دەوری چەرخی عارەبانە دەهاڵێندرێ". لەم مانا بنەڕەتییەوە دواتر دە زمانە رۆمانییەکاندا ماناکانی "دەور، جەغز، قەراخ" پەیدا بوون.

وشەی Kanton "ئۆستان، پارێزگا" دە زمانی سویسیدا پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا بەمانای "دەڤەر، کەوشەن، دەوروبەر" بووە.

[تێبینی: بۆ هێندێک زانیاری زۆرتر سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "قەراخ"، "دەور"، "جەغز" و "سنوور" دەگەڵ یەکتر بڕوانە وشەی "کەوشەن"].

**قانک qanık** [ *qānık* ] - "قاڵماسک، قۆچەقانی": خزمە دەگەڵ ↑قامیش qamîş "نەی، چیتک، زەل".

[تێبینی: "قاڵماسک"یش دە بنەڕەتدا خزمە دەگەڵ *قەڵەم* "قامیش، نەی، زەل"]

**قانگ1 qang 1** [ *qāng* ] - "پووک، کلۆر": خزمە دەگەڵ کەندن kendın [↑هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن] بە مانای "کۆڵین، قووڵ کردن، کلۆر کردن". دە زمانی فارسیدا خنگ xeng (P.) بە مرۆڤی "کەللەپووک" دەگوترێ.

**قانگ2 qang 2** [ *qāng* ] - "دەنگی خوێندنی دوڕنا": خزمە دەگەڵ ↑خوێندن xwendın [خاندن xandın و خێندن xendın یش دەگوترێ].

**قانگ3 qang 3** [ *qāng* ] - قانگ دان واتا بە دووکەڵ دەرکردن. لێرەدا قانگ خزمە دەگەڵ ↑خنکان xınkan. مەبەست پشوو لێبڕین بە هۆی دووکەڵە.

**قانگڵە qangle** [ *qāngla* ] - "کۆمەڵەبەتێک کە لەتێوان قامکی گەورە و تووتەدا هەڵدەکرێ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***(s)ne-** **(IE.)** "چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان" و خزم بێ دەگەڵ چنین1 cınîn.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "وێزنین" [هەڵوێزنین]. ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چنین، هۆنین، گرێ دان"].

**قانگە1 qange 1** [ *qānga* ] - "سەبیلەی کلکدرێژ": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قەننە qenne، خزمە دەگەڵ ↑قانگە2 qange 2 "خەندەکی بناخە" و ↑کەندن *kendın* [هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن]. قانگە یان قەننە ئەو دارەیە کە ناوەکەی هەڵکەندراوە [کۆڵدراوە].

**قانگە2 qange 2** [ *qānga* ] - "خەندەکی بناخە": خزمە دەگەڵ کەندن kendın [↑هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن] بە مانای "کۆڵین، قووڵ کردن، دانەوەی هەرد".

**قانگەلاشک qangelaşk** [ *qāngalāšk* ] - "لاسکی هیشکی ناوبەتاڵ": قانگ + لاشک qang + laşk. ↑قانگ qang مانای "ناوبەتاڵ، هەلۆڵ" دەدا. لاشک laşk شێوەیەکی دیکەیە لە ↑لاسک lask.

**قانوون qanun** [ *qānūn* ] - "یاسا، ریسا": دە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە< *kanon* *(Gr.)* "قانوون". ریشە؟

**قانە qane** [ *qāna* ] - "دێراوەرەز": خزمە دەگەڵ کەندن kendın [↑هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن] بە مانای "کۆڵین، قووڵ کردن، دانەوەی هەرد".

**قانی qanî** [ *qānī* ] - "پەڵە، لەککە": خزمە ↑شان[4] şan "خاڵی سەر گۆنا" و دواتر دەگەڵ ↑سێ se "سایە، سێبەر".

**قاو1 qaw 1** [ *qāw* ] - قاو کردن واتا "بانگ کردن، دەنگ و هەرا کردن".

1- دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *ghau-** ***(IE.)*** "قاو کردن، بانگ کردن". وشەی Got (G.) "خودا" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بە پێی بۆچووتێک لەم ریشەوە هاتووە واتا "بانگ کراو" یان "هاوار بۆ کراو" لە لایەن مرۆڤەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەم کردنەوە"، وەك ↑قەوچە *qewçe*. ئەو وشانە لەوانەیە دواجار دەگەڵ هێندێك وشەی دیکە پێوەندی پەیدا بکەن، وەك ↑قسە qıse و ↑قیژە qîje و هتد.

**قاو2 qaw** [ *qāw* ] - "1- شەقاو 2- شەپ، شەق": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەنگاو hengaw [hen + gaw]. لە وشەی "هەنگاو"دا کەرتی یەکەم پێشگرە.

**قاوت qawt** [ *qāwt* ] - "ئاردی دەغڵی برژاو": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- Weizen (G.)، (h)weizi (OG.)، hvaiteis (Gt.)، hwa te (OE.)، hveiti (ON.) "گەنم"، سەر بە ریشەی **< *kuei- (IE.)*** "هایسان، درەوشان، کاڵ، رووناك".

2- hauen (G.)، houwan (OG.)، heawan (OE.)، hew (E.)، hawa (OF.)، hugga (Sw.)، cūdere (L.)، kauti (Lit.) "لێدان، کوتان"، kovat (Rus.) "کوتك لێدان"، سەر بە ریشەی **< *kāu- (IE.)*** "لێدان، کوتان".

**قاوتاندن qawtāndın** [ *qāwtāndınt* ] - "دەرکردن (بە دەنگ و هەرا)": بنچی وشەکە واتا قاو(ت) -qaw(t) دەشێ بچێتەوە سەر ریشەی **< *skeu(h)- (IE.)*** "هاویشتن، پاڵ نان، ڕادان، دەرپەڕاندن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەپ[1] şep. شیاوی باسە shout (E.) "شاتاندن" لەم ریشەوە هاتووە.

**قاوش qawş** [ *qāwš* ] - "شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ": خزمە دەگەڵ ↑قۆشەن qoşen، ↑گیشە *gîşe* "باقەگیای کەڵەکەکراو"، ↑هێشوو hêşû "دەنکی زۆری پێکەوەنووساو"، ↑قۆش qoş "خۆیانی گیرەنەکراو"، ↑گشت gışt "هەموو، تێکڕا"، ↑قشڵە qışle "سەربازگە" و هتد.

**قاوغ qawġ** [ *qāwġ* ] - "قاپۆر، قالب": خزمە دەگەڵ یەکێك لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑قاپ[1] qap "زەرف، دەفر" [وشەکە دەشێ سەرەتا ***قاپك qapek*** بووبێ]. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑قافك qafık "قاوغ، کالان".

2- ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا هاتوون و ئاماژە بە شتێك یان شوێنێکی "زارکراوە، دەمداپچڕاو" دەکەن.

**قاڤلك qavılk** [ *qāvılk* ] - "کیفی باغەڵی": دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑کەوڵ kewıl "پێست، چەرم".

2- ↑جەواڵ cewal [گواڵ guwal، گواڵە guwale].

**قاوە qawe** [ *qāwa* ] - "بەری دارێکە، دەیکوڵێنن و دەیخۆنەوە": بە گوێرەی سەرچاوە ئەڵمانییەکان ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ **< قهوة *qahwa (Arb.)*** "شەراب، دواتر قاوە".

**قاوەڵتوون qaweltun** [ *qāwaltūn* ] – "1- نانی بەیانی 2- جەمی تێوان بەیانی و نیوەڕۆ": پێك هاتووە لە: قاوە + ڵ + توون qawe + l + tun. وشەکە دەشێ دە بنەڕەتدا "قاوەتوون qawetun" بووبێ و فۆتیمی l وەك ڕێدەیەك بۆ هاسانبێژی خزابێتە ناوی. کەرتی توون tun- شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دان1 dan [دانی بیانی، دانی نیوەڕۆ واتا کاتی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ]. بەم جۆرە مانای "قاوەڵتوون" دەبێتە دانی [کاتی] ↑قاوە qawe خواردنەوە.

[تێبینی: جێی ئاماژەیە کە کوردان پێشتر قاوەیان خواردۆتەوە و ئەمەش لە وشەی "قاوەخانە"دا پارێزراوە. چا یان چایی لەوەدەچێ لە یەك دوو سەد ساڵی رابردوودا هاتبێتە ناو کوردان. ئەڵمانییەکان تا ئێستاش قاوە خواردنەوە لە ناویاندا باوە، نەك چا خواردنەوە].

**قاوێر qawer** [ *qāwer* ] - "کەمە، کەڵلەبێژینگ": خزمە دەگەڵ ↑کەمە keme و ↑کەوان kewan.

قایش **qayış** [ *qāyıš* ] - "چەرمی دەباغیکراو": قاویش qawîş و قاویچ qawîç یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑قەیاسە qeyase "باربەندی پانی لە چەرم". بە لەبەرچاو گرتنی شێوەکانی "قاویش" و "قاویچ" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Haut (G.)، huid (Nl.)، hide (E.)، hud (Sw.)، cutis (L.)، kytos (Gr.) "پێست، پێستە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)keu- >** "داپۆشین، لێهاڵان".

قایق **qayıq** [ *qāyıq* ] - "بەلەم، لۆتکە": قایخ qayıx و قایەخ qayex یش دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا دەگوترێ Kajak (G.)، وشەکە لە زمانی گەلی Inuit [ئیسکیمۆکان] وەرگیراوە.

قایل **qayıl** [ *qāyıl* ] - "رازی": خزمە دەگەڵ geil (G.)، gal (OE.) "بە کەیف، خۆشحاڵ، بە پێز، گەشاوە، زەوەند"، geiligr (OIr.) "تیر و تەسەل، جوان"، gailus (Lit.) "توند و تیژ"، gails (Let.) "رازی، راحەت"، gailjan (Got.) و geilen (MG.) "خۆشحاڵ بوون". دە زمانی کوردمادیدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەیل keyl کە هەردوو مانای "شۆخ و شەنگ" و "پڕاوپڕ" دەگەیەنێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەحێل keĥêl یان ↑کەحلان keĥlan [ئەسپی کەحلان].

قایم **qayım** [ *qāyım* ] - "توند، سەخت، راوەستاو": *< قائم qāim* (Arb.) "راوەستاو".

قبوولی **qıbûlî** [ *qıbūlī* ] - "ناوی چێشتێکە": وێ دەچێ پێوەندی بە وشەی "قبول" دە زمانی عەرەبیدا نەبێ و تەنیا وێکچووتیکی رواڵەتی دەگەڵ ئەو هەبێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گەبۆل gebol "نواڵە لە ئارد و ورتکەساوار" و ساوار sawar، سەر بە کرداری ↑ساوین savîn "رێخشاندن، ورد کردن بە رێخشاندن". لەباری چۆتیتی فۆتیمەکان و گۆڕانکاری تێیاندا هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl (کەڤڵ kevıl) کە ئەویش پێوەندی بە "ساوین"ەوە هەیە].

قپ **qıp** - دەگەڵ "قر" دێ [قر و قپ qır û qıp]. شێوەیەکی دیکە لە ↑کپ kıp.

قجیلک **qıcîlk** [ *qıjīlk* ] - "قامکەتووتە": بنەوشەی قج -qıc دە وشەی ↑گچکە gıçke شدا دەبینرێ و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کەم، گچکە". دە زمانی کوردمادیدا جگە لە "گچکە"، قچک qıçık یش دەگوترێ.

قچقچاندن **qıçqıçandın** [ *qıčqıčāndın* ] - "چۆقاندنی رۆن، هەڵکزاندنی دووکەڵ": بنجی قچ -qıç شێوەیەکی دیکەیە لە کز -kız دە هەڵکزاندن helkızandın دا. بڕوانە ↑کزانەوە kızan(ewe).

قخ **qıx** - قخە qıx(x)e ش دەگوترێ، واتا "پیس" بە زمانی زارۆک. خزمە دەگەڵ kacken (G.)، cacare (L.)، kakat (Rus.) "گوو کردن". شیاوی باسە ئەم وشانە لەو زمانانەشدا وەک وشەیەکی زمانی زارۆک بەکار دەهێندرێن. دە زمانی فارسیدا اخ ax (P.) بە مانای "قخ" کوردمادی بەکار دێ.

قدۆش **qıdoş** [ *qıdoš* ] - "پێ رەش، شووم": بنجی قد -qıd خزمە دەگەڵ ↑چەتە çete و ↑شتە şete سەر بە ریشەیەک بە مانای "زیان گەیاندن". کەرتێ -oş پاشگری بە ئاوەڵناو کردنە لە دۆخی جەخت کردندا و شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑ئۆز oz.

قدیک **qıdîk** [ *qıdīk* ] - "دڵتەنگ، خەمبار": خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک ↑خەیدین xeydîn "تووڕە بوون"، ↑کەد ked "رەنج، زەحمەت" [کەدکار واتا رەنجبەر، زەحمەتکێش] .

قدیلە **qıdle** [ *qıdīla* ] - "ختۆکە": قد + یلە qıd + le. کەرتی دوەم پاشگرە، کەرتی یەکەم واتا بنەوشەی قد -qıd وێنەیەکی دیکەیە لە خت -xıt [بڕوانە ↑ختۆکە xıtoke]. دە زمانی عەرەبیدا دغدغة değdeğe (Arb.) "قدیلە" پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە و بنەوشەی -değ لێرەدا دووپات دەبێتەوە و ئەم بنەوشەیەش هەمان -qıd ە بە جێگۆڕکێ بوونی فۆتیمەکان تێیدا.

قڕ1 **qır 1** - قڕ بوون واتا مردن لە تینووان، دە بنەڕەتدا واتا ویشک هەڵاتن، خزمە دەگەڵ ↑قران qıran "قران تێکەوتن". دە زمانی ئەلمانیدا وشەی behelligen (G.) "ماندوو کردن، هیلاک کردن"

هەیە. بنەی ئەم وشەیە دە ئەڵمانی ناویندا (MD) hel(l) بە مانای "شەکەت، هیلاک، بێهێز" بەکار هێنراوە و دە بنچینەدا مانای "رەق و وشک هەڵاتوو"ی هەبووە. وشەی (ONor.) hallari "وشکەساڵی" لە دوو کەرتی hall "وشک" وar "ساڵ" پێک هاتووە. ئەم وشەیە دەگەڵ وشەی "قرِی" qırî [قات و قرِی] دە زمانی کوردمادیدا یەک دەگرێتەوە. (OE.) hell-heort "دل سست، بێ ورە، بێ هیوا"، (NL.) schal "رەق، هیشک"، (Sw.) skäll "زەوی قاقر"، (E.) schallow "ئاوی تەنک" [دە بنچینەدا ئاوێک کە لە وشکی داوە]، (Let.) kalst "هیشک بوون"، (Gr.) skellein "هیشک بوون"، (Gr.) skeletos "ئێسقانەکانی لەش" [دە بنەرەتدا: لەشی رەق هەڵاتوو، وشک هەڵاتوو] و ژمارەیەک وشەی دیکە هەموو دەچنەوە سەر ریشەی هاوبەشی ***(s)kel-** > (IE.)* "هیشک بوون، هیشک هەڵاتن". دە زمانی کوردمادیدا دەتوانین چەندین وشە لەم پێوەندییەدا شی بکەینەوە، وەک ↑قارووچ qaruç "لەجەر"، ↑قراج qırac "زەوی رووتەن"، ↑قەراچ qeraç [دەشتی قەراچ واتا دەشتی وشک؟]، ↑قەرەوەنە qerewene "کرمی میوەی وشک"، ↑قراڵی qralî "گوێزی پووچی وشک"، ↑قەیلە qeyle "گۆشتی وشکەوەبووی لە هەنبانەدا بۆ زستان" و هتد. دەشێ وشەی هلاك hilāk (Arb.) پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ (G.) behelligen [ be-hellig-en "ماندووکردن، هیلاک کردن"]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑قەلهین qelhîn و قەلهاندن qelhandın هەیە بە مانای لەناوچوون و لەناو بردن [واتا قرِ بوون و قرِ کردن]. لەم دوو وشەیەدا فۆتیمی L کە دە ریشەی وشەکەدا دەبیندرێ، پارێزراوە.

**قر2 qır 2** [ *qır* ] - دەگەڵ "فر" دێ [قرِ و فرِ qır û fır واتا سوور، خۆ بادان]. قر qer (P.). خزمە دەگەڵ ↑قرتی qırtî "هەرزە، جلّف" [دە بنەرِەتدا خۆبادەر]، سەر بە ریشەی ***ger-** > (IE.)* "سووران، با دان". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑قارە1 qare 1 "گێژی" [قارەی سەر دێ].

**قر3 qır 3** [ *qır* ] - دەگەڵ "قپ" دێ [قر و قپ qır û qıp]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کرِ kır [کرِ و کپ].

**قراج qırac** [ *qıraj* ] - "قاقرِ، زەوی رووتەن": خزمە دەگەڵ ↑قر1 qır 1.

**قراش qıraş** [ *qırāš* ] - "لەت، کوت، قاش": [قرِاش قرِاش]. خزمە دەگەڵ ↑قرخاندن² qırxandın.

**قراف qıraf** [ *qırāf* ] - "سیخوار، زوقم": خزمە دەگەڵ ↑خار xar و ئاماژە بە بەستەڵەک، واتا سەخت و رەق بوونی هەرد دەکا. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قراندن qırandın "ئاو کردنە سەهۆڵ، سەهۆڵ دروست کردن".

**قران¹ qran** [ *qrān* ] - "لەناوچوون، تونا بوون": ↑ قر1 qır 1 [قرِ بوون واتا مردن (لە تینووان)، دە بنەرِەتدا واتا هیشک هەڵاتن].

**قران² qran** [ *qrān* ] - "یەکەیەکی پووڵی عەجەمان کە ئێستا نەماوە": ئەم وشەیە لە *Kron* ی زمانە ئەورووپییەکان وەرگیراوە. "کرۆن" لە چەند وڵاتیکی ئەورووپی یەکەی پووڵ بووە و ئێستاش لە سوێد و دانمارک ماوە و مانای "تاج" دەبەخشێ. دیارە ئەو وڵاتانەی "کرۆنیان" هەبووە، وڵاتی پادشایی بوون و ناوی پووڵەکە بە ناوی تاجی پاشایەتی کراوە. لە ئێرانیش عەجەمەکان ئەم شێوەیان لاسا کردۆتەوە. هەروەها دە زمانی فارسیدا soltan e sāĥebqarān "سوڵتانی ساحەبقران" بەکارهاتووە کە ماناکەی "پاشای خاوەن تاج" بووە. (P.)

**قراندن1 qırandın 1** [ *qırandın* ] - "خوێندنی قاڵاو": شێوەیەکی دیکە لە ↑قیرِاندن qîrandın.

**قراندن2 qırandın 2** [ *qırandın* ] - "ئاو کردنە سەهۆڵ، سەهۆڵ دروست کردن": بروانە ↑قراف qıraf "سیخوار، زوقم".

**قرپ1 qırp** - "هەوا دەرچوون لە گەروو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑غەڵبە ġelbe دا باس کراون. هێندێک لەم وشانە باس لە "هەڵگەرانەوە" دەکەن. دە زمانی ئاڵمانیدا umklappen (G.) مانای "هەڵگێرانەوە" دەبەخشێ. لەم تێروانینەوە مەبەست لە "قرپ" بریتییە لە هەڵگەرانەوی هەوا لەناو گەدە بۆ دەرەوە.

**قرپ² qırp** - بڕوانە ↑قرپاندن1 qrpandn.

**قرپاندن1 qırpandın** [ *qırpāndın* ] - "پەرتاوتن، داپاچین": هەروەها ↑قرپ² qırp بەو مانایانە دێ: "1- بڕین بە یەک تەور لێدان 2- پەرتاوتن 3- دەسکەنە 4- بڕەدارێک": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "لێکردنەوە، داپچڕین، بڕین" دەکەن، وەک carpere (L.) "لێکردنەوە، داپچڕین"، karpos (Gr.) "بەر و بۆم" [دە بنەڕەتدا: لێکراوە، داڕنراو]، erp (Rus.)، kröpion (Gr.) "داس" و لەوانەیە ↑قەرفین qerfîn "دەنگی شکانی دار"یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**قرپاندن2 qrpandn** [ *qırpāndın* ] - "پڕ پێداگرتن": شێوەیەکی کۆن لە ↑گرتن gırtın ە.

**قرپۆک¹ qırpok** - "1- مێوژی ویشک هەڵاتوو 2- ئەیاخ، ئەشغاڵ، زبڵ": خزمە دەگەڵ grob (G.)، g(e)rob (OG.)، grof (Nl.) "نەناسک" [هەروەها بە مانی "ڕەق و تەق، زبر، قورس، قەبە]، سەر بە ریشەی *(IE.) *kreup- >* "قرتماغە". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑غەریبۆک ġerîbok هەیە بە مانای "جۆرێک هەرمێ". وێ دەچێ ئەمە جۆرێک هەرمێی ڕەق بێ. وەک لەژێر وشەی "زبڵ"دا شی کراوەتەوە، "زبڵ" دە بنەڕەتدا "زبر(ە)" بووە واتا ئەو درەشتەی لەپاش دابێژتندا دەمێنێتەوە. هەر بەم شێوەیە "قرپۆک"یش ئاماژە بە "درشتی و زبری" دەکا.

**قرپۆک² qırpok** - "بۆق": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرواق qırwaq.

**قرتاندن qırtandın** [ *qırtāndın* ] - "لەت کردن": هەروەها qırt kırdın هەیە بە مانای "خشت کردن، ڕێک بڕین". خزمە دەگەڵ ↑کێرد kerd "چەقۆ" و ↑کەرت kert "لەت، بەش"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن".

**قرتک qırtık** [ *qırtık* ] - "دڵ تێکەڵهاتن": خزمە دەگەڵ ↑قر qır "چەرخین، سووڕان".

**قرتم qırtım** [ *qırtım* ] - "لووتی فیل": خورتووم xurtum یش دەگوترێ. خرطوم xortum (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑قورگ qurıg، ↑قووڕاندن qurandın [هەڵقووڕاندن، قورتاندن]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خواردن، بەگەرووی بردنەخوار، قوت دان [قورت دان]". دەبێ وشەکە لە زمانانی کۆنەوە چووبێتە ناو زمانی عەڕەبییەوە و دواتر بە "ت"ی دەسکدار هاتبێتەوە ناو زمانی فارسی.

**قرتماخە qırtmaxe** [ *qırtmāxa* ] - "1- توێ، توێژ 2- پترۆک": پیک هاتووە لە دوو کەرتی قرت + ماغە qırt + maġe. کەرتی یەکەم، واتا قرت -qırt خزمە دەگەڵ ↑*سارێژ sarej*، ↑کرچ kirç سەر بە ریشەیەک بەمانای "مەیین، قەرسین، توند بوون" و ئەم ریشەیەش خۆی لە ریشەیەکی کۆنترەوە هاتووە بە مانای "سەخت، ڕەق، پتەو". کەرتی دووەم، واتا ماغە -maġe خزمە دەگەڵ ↑مەیین *meyîn* "توند بوون، پەیت بوون" و ↑مایە3 maye "تیری، پتەوی" [مایەدار واتا خەست و خۆڵ، توند و تۆڵ]. بەم جۆرە هەر دوو کەرتی وشەکە مانایەکی یەکسان دەبەخشن و ئاماژە بە خۆ گرتن و پەیت بوونی برینەکە، واتا دروست بوونی توێخێک دەکەن. ئەم جۆرە وشانە کە لە دوو کەرتی هاومانا پێک دێن، دۆخێکی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشن و گەلێک نموونەیان دە زمانی کوردیدا دەبینرێ، وەک بانگاشە، سامۆتک، گەنکەشە، جەنجاڵ، بانگەواز [بانگ + ئاواز]، بایەقووش، جەمبازە، پاکتاو، ڕەشتاڵە، تەپلۆس، تارمایی و هتد.

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "قرتماغە" و "رەق، سەخت" بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەکانی "پەترۆک" و "گەمرە" (کەپرە، کەوەرە) کە ئەوانیش مانای قرتماغە دەبەخشن].

**قرتە qırte** [ *qırta* ] - "دوگمەی تیرومێ دار": قرتێنکە qırtênke ش دەگوترێ. دە ئەسڵدا دەبێ گرتە gırte بووبێ سەر بە کرداری ↑گرتن gırtın. مەبەست یەکتر گرتنی تیرە ومێیەکەیە کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی پێکەوەنووسانی دوو لای کراسێک یان پارچەیەک. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی گیرە gîre. "قرتە" دە فارسیدا وەک "منگنە" مانا کراوەتەوە کە ئەمەش دەگەڵ "مەنگەنە"ی کوردمادی یەکە و جۆرێک لە "گیرە"یە.

**قرتی qırt** [ *qırtī* ] - "هەرزە، جڵف": قرتی qertī (P.). خزمە دەگەڵ ↑قڕ qır "سووڕ"، سەر بە ریشەی ***ger-*** **(IE.)** "سووڕان، با دان". لەم تێڕوانینەوە قرتی واتا "خۆبادەر".هەروەها لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑قردک qırdık "دلقەک، کلاون".

**قرچ qırç** [ *qırč* ] - قرچ قرچ واتا سیڕەسیڕ لە ددان هاتن. خزمە دەگەڵ ↑گرژ gırj. "قرچ" لە ئەنجامی گرژ بوونی ددانەکان [توند بوونی شەویلکە] دروست دەبێ، هەروەک چۆن وشەی "سیرە" یان "چیرە" [ددان دە چیرەوە بردن] دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "توند بوون".

**قرچان1 qırçan** [ *qırčān* ] - "چرچ بوون، وێکهاتن، با دران": هەڵقرچان helqırçan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ قورجاندن qurcandın [↑قورنجاندن qurıncandın] "(رە) با دان" و ↑گرنژین gırınjîn "چرچ و لۆچ بوون"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران".

**قرچان2 qırçan** [ *qırčān* ] - "توانەوەی رۆن لەسەر ئاگر": قرچ qırc هەروەها وەک "گەرمای زۆر" مانا کراوەتەوە. خزمە دەگەڵ Herd (G.)، Haard (Nl.)، hearth (E.) "کوانوو، وەجاق"، carbo (L.) "رەژی"، cremare (L.) سووتاندن، کردنە خۆڵەمێش". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **<** ***ker-*** **(IE.)** "سووتان، هایسان". وشەی کوورە kure "سۆپە" دەشێ لەم ریشەوە هاتبێ.

**قرچە1 qırçe** [ *qırča* ] - "گەرمای زۆر، تەوژمی گەرما": [قرچەقرچی هاوین hawîn qırçeqırçî]. بڕوانە ↑قرچان2 qırçan.

**قرچە2 qırçe** [ *qırča* ] - "دەنگی شکان و رووخان": خزمە دەگەڵ Krach (G.)، crash و crack (E.) "تەق و زرم، شکان و تێکرووخان"، سەر بە ریشەی **<** ***ger-*** **(IE.)** "دەنگ و هەرایەکی هیشک لێ هەستان". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قرخە qırxe، ↑قرە qıre و ↑قیرە qîre و هتد. شیاوی باسە کە وشەی Krach (G.) دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەک "قرە"ی کوردمادی مانای شەڕ و کێشەش دەگەیەنێ و دە بنەڕەتدا دەبێ مەبەست ئەو دەنگ هەڵبڕین و قیڕاندنە بێ کە لە کاتی شەڕ و کێشەدا پەیدا دەبێ یاخود گەروونووسان بەهۆی قیڕاندنەوە.

**قرچۆک qırçok** [ *qırčok* ] - "رژد، خەسیس": خزمە دەگەڵ ↑قرخ3 *qırıx* "لەڕ و لاواز".

**قرچەلۆک qırçelok** [ *qırčalok* ] - "(ژنی) لاواز و رەقەڵە": هەروەها ↑قرچۆک qırçok هەیە بە مانای "رژد، خەسیس". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قرخ3 *qırıx* "لەڕ و لاواز".

**قرخ1 qırıx** - قرخ کردن یان ↑قرخاندن qırxandın واتا تاشینی موو لە بنڕا. خزمە دەگەڵ ↑قرتاندن qırtandın "لەت کردن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک (جودا) کردنەوە".

**قرخ2 qırıx** - "دەفری کۆنی سواڵەت": خزمە دەگەڵ Krug (G.)، kruog (OG.)، crog (OE.) "گوزە"، سەر بە ریشەی **<** ***ger-*** **(IE.)** "با دان، سووڕاندن، تێکچنین".

**قرخ qırıx** - "لەڕ و لاواز": خزمە دەگەڵ (G.) karg، (OG.) karag، (OE.) cearig. وشە ژێرمەنییەکە سەرەتا بە مانای "پەشێو، خەمبار، نیگەران" بووە و دواتر ماناکانی "دەست پێوەگر، چنۆک، کەم"یشی وەرگرتووە و هەروەها مانای "کزی و لاوازی و بێهێزی"یشی لێ کەوتۆتەوە، بۆ وێنە وشەکە دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا مانای "هەژار، بێهێز، لاواز" دەبەخشێ، سەر بە ریشەی **> -karo*** **(.IE)** "کوڵ و کەسەر، نیگەرانی" و ئەمەش دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **> -gar*(.IE)** "هاوار، قیرە، جاڕ".

**قرخاندن[1] qırxandın** [ *qırxāndın* ] - "قرخە qırxe کردن، خرەخری گەروو هاتن": هەروەها ↑قرخێنە qırxêne [قرقێنە qırqêne، قورقێنە qurqene] هەیە بە مانای "قرپ". ئەم وشانە خزمن ↑قرچە2 *qırçe*، ↑قرە qıre و ↑قیرە qîre، ↑خرە xıre، ↑کرخە kırxe "پرخە" و هیتر، سەر بە ریشەی **> -ger*** **(.IE)** "دەنگ و هەرایەکی هیشک لێ هەستان".

**قرخاندن[2] qırxandın** [ *qırxāndın* ] - "1- تاشینی موو لە بنرا 2- هەڵپەڕتاوتنی دار": دەچێتەوە سەر ↑قرخ qırıx.

**قرد qırd** - "ئەستێور": خزمە دەگەڵ ↑خار xar و (.E) hard "سەخت، رەق". مەبەست لەم وشەیە دەبێ ئاماژە کردن بە هیشک و رەق بوونی مەمکی نەزۆک بێ، بە پێچەوانەی مەمکی دایکە کە بە هۆی تێدابوونی شیر تەڕ و نەرمە. لەباری ماناوە هەڵیسەنگینە دەگەڵ "قسر".

**قردک qırdık** - "دلقەک، کلاون": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قڕ qır "سووڕ" و ↑قرتی qırtî "هەرزە، جلف"، سەر بە ریشەی **-ger*** **(.IE)** "سووڕان، با دان".

**قردێلە qırdêle** [ *qırdela* ] - "پارچەی باریک بۆ سەر و پرچ بەستن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەک لەم وشانە خوارەوە:

1- ↑قەرتاڵە qertale، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هۆنینەوە، چنین، تێک خستن".

2- ↑قڕ qır "سووڕ"، سەر بە ریشەی **-ger*** **(.IE)** "سووڕان، با دان". لەوانەیە ئاماژە بە لێهاڵاندن کرابێ.

**قڕ(ڕ)ە qır(r)e** [ *qır(r)a* ] - "دەنگ و هەرا، کێشە": قڕاندن qırrandın یان ↑قیڕاندن qîrandın "هەراکردن، هاوار کردن"، سەر بە ریشەی **> -ger*** **(.IE)** "دەنگ و هەرایەکی هیشک لێ هەستان". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قرچە *qırçe*، ↑قرخە qırxe، ↑قیرە qîre و هتد. شیاوی باسە کە وشەی (.G) Krach "قرچە، قرە" دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەک "قرە"ی کوردمادی مانای شەڕ و کێشەش دەگەیەنێ و دە بنەڕەتدا دەبێ مەبەست ئەو دەنگ هەڵبڕین و قیڕاندنە بێ کە لە کاتی شەڕ و کێشەدا پەیدا دەبێ.

**قڕە qırre** [ *qırra* ] - "دوایین کەس لە گەمەدا": خزمە دەگەڵ ↑قەرە qere "رەعێتی بێ جووت و گا ". لە سیستەمی دەرەبەگیدا قەرە نزمترین پلەی جڤاکی هەبووە و هەر بۆیە بەو کایەکەرەش کە دەکەوێتە دوای هەموانەوە، گوتراوە قڕە.

**قرژ qırj** [ *qırž* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑گرژ gırj "توند بادراو، رێکگوشراو".

**قرژاڵ qırjal** [ *qıržāl* ] - "ناوی گیانلەبەرێکی ئاوی": خرچنگ (.P) xarčang، (.Gr) karkinos "قرژاڵ". دە زمانی لاتینیدا بە قرژاڵ دەگوترێ (.L) cancer کە لەوە دەچێ هەر پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ و فۆنیمەکان تێیدا تووشێ جێگۆڕکێ بووبن. [دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ناوی ئەم گیانلەبەرە، بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا (.G) Krebs دەچێتەوە سەر ریشەی **> -g(e)rebh*** **(.IE)** "خۆخزاندن بەسەرئەرزدا، گاگوڵەکردن". وێ دەچێ هەموو ئەم وشانەی سەرەوە دواجار بچنەوە سەر ریشەیەکی کۆنتری هاوبەشی هیندوئەورووپی].

**قرژن qırjın** ⌈ *qıržın* ⌉ - "سەرقرژن" بە کەسێک دەگوترێ کە مووەکانی هەستاوەتەوە و تێکهاڵاوە.

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑قرژ qırij و ↑گرژ *gırıj* ەوە و مەبەست "گرژ بوون"ی مووەکانە.

2- یانیش پێوەندی هەیە بە ریشەی **> -*ker(s)** ⌈ **IE.** ⌉ "راست بوونەوە، سیخ بوون، تێکهەڵچوون". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑خوری xurî.

**قرژە qırıje** ⌈ *qırža* ⌉ - "نەخۆشی شێرپەنجە": لە وشەی ↑قرژاڵ qrjal وەرگیراوە، هەروەک چۆن دە زمانە ئەورووپییەکاندا و هەروەها زمانی عەرەبیشدا ناوی ئەم نەخۆشییە لە ناوی ئەم گیانلەبەرە وەرگیراوە.

[تێبینی: دە زمانی یۆنانیدا بە قرژاڵ دەگوترێ karkínos (Gr.) و ناوی زانستی بۆ نەخۆشی شێرپەنجەش، واتا carcinom بۆ وشە یۆنانییەکە دەگەڕێتەوە و هەروەها cancer (L.) یش بە کار دێ کە بە لاتینی ناوی قرژاڵە. دە زمانی ئەڵمانیدا Krebs (G.) هەم ناوی "قرژاڵ"ە و هەم ناوی نەخۆشییەکە. وشە ئەورووپییەکان خزمن دەگەڵ قرژاڵ. دە زمانی عەرەبیدا ناوی نەخۆشییەکە دەبێتە سرطان seretan (Arb.) و ئەمەش دە بنەڕەتدا ناوی قرژاڵە. بە ناو کردنی ئەم نەخۆشییە بەم جۆرە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە شێرپەنجەی سینگ و مەمکدا هێندێک جار نەخۆشییەکە بە شێوەی چنگ و لاقی قرژاڵ رەگەکانی ئەم پارچەیەی لەش دادەگرێ. دە وشەی "شێرپەنجە"دا ئەم دیاردەیە بە پەنجەی شێر چوێندراوە. لام وایە باشترە دە زمانی کوردمادیشدا لەجیاتی وشەی "شێرپەنجە"، وشەی "قرژە" بەکار بهێنرێ، تاکوو هاوشێوەییەک دەگەڵ زمانەکانی دیکەدا دروست بکرێ].

**قرساندن** qırsandın ⌈ *qırsāndın* ⌉ - "خەمڵاندن، بەراورد کردن": بنەوشەی قرس -qırs بە مانای "نرخ" خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە هەرز -herz و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑هەرزان herzan [دە بنەڕەتدا واتا شیاوی نرخی خۆی، نرخ شیاو]، ↑هەژی hejî "بەنرخ" [دە بنەڕەتدا هەرژی herjî]، دە فارسیدا ارج erc (P.) واتا نرخ و هەروەها ارز erz (P.) واتا "دراوی قورس"] و هتد.

**قرسیل qırsîl** ⌈ *qırsīl* ⌉ - "1- لاسکەدەغڵی سەوز 2- بەرماوی لەوەڕ": قەرسیل qersîl یش دەگوترێ. بڕوانە ↑قرش qırış.

**قرش qırış** ⌈ *qırıš* ⌉ - "1-چڵەگیا 2- کڵۆش 3- لکی شکاوی هیشک": ↑گرشە gırşe، گەرش gerş و گەرس gers یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Gras (G.) و (Gt.) و grass (E.) و gräs (Sw.) "گیا"، سەر بە ریشەی **> ghre*** ⌈ **IE.** ⌉ "چەکەرە کردن، سەر هەڵدان، سەوز بوون". دە زمانی کوردمادیدا ↑گرس gırıs بوون بە مانای شین بوون بەکار دێ و شێوەی کۆنتری وشەکە نیشان دەدا. وشەی ↑گووران guran "خولْقان، پەیدا بوون" سەر بەم ریشەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست سەرهەڵدان و چەکەرە کردنە.

**قرشک qırışk** ⌈ *qıršık* ⌉ - "چیلکە و چاڵ، پڕ و پووش": ↑قرش qırış.

**قرقرە qırqıre** ⌈ *qırqıra* ⌉ - "دارۆکەیەکی تایبەت بۆ دەزوو لێ پێچان": غەرغەرە ġerġere ش دەگوترێ. قرقرە qarqare (P.). خزمە دەگەڵ↑قڕ qır "سووران" [قڕ و فڕ]، ↑قرتک qırtık "دڵ تێکەڵ هاتن"، ↑قارە qare "گێژی، کاسی" و چەندین وشەی سەر بە ریشەی **> -ger*** ⌈ **IE.** ⌉ "سووڕان، با دان".

**قرک qırık** ⌈ *qırık* ⌉ - "خڕایی گەردن، گوێزەی مل": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑قورِگ qurıg "حەنجەرە".

2- ↑خرِ xır [خرِ + ك واتا "خرِی بچووك"]

قرم **qırım** *[ qırım ]* - "ئیشتیا، ئارەزوو": قورم qurm یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گراوی gırawî "حەز، دەسگیران".

قرمان **qırman** *[ qırmān ]* - تیك قرمان واتا "تیكەوە چوون، خوار بوونەوە، رووخان": خزمە دەگەڵ Krampf ‹.G› و cramp ‹.E› "گیران و قرژ بوونی ماسوولكەكان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر krimpan ‹.OG› "خوار بوون، چەمینەوە، قرژ بوون، چین و چرووك پەیدا كردن". دە زمانی كوردمادیدا وشە (تیك) قرمان جگە لە مانای رووخان و رمان مانای "وێكهاتن و چەمانەوە و قرژ بوون"یش دەگەیەنێ، بۆ وێنە كاتیك دەگوتری فلانەكەس تیك قرماوە واتا بەژنی چەماوەتەوە و خۆی وێك هێناوە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑كورمان kurman [هەڵكورمان helkurman]. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ krumm ‹.G› "خوار، گیرِ" و بەم پێیە وشەكە دەشێ هەروەها خزم بێ دەگەڵ ↑گیرِ ger و چەندین وشەی دیكە دە زمانی كوردمادیدا، گشتیان سەر بە ریشەی **> -ger*‹ .IE›** "سوورِان، با دران، خوار بوونەوە".

قرمچین **qırımçîn** *[ qırımčīn ]* - "چرچ و لۆچ بوون": قورمسین qurımsîn و كرِمشین kırımşîn یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑*قرمان qırman* [تیكقرمان]، ↑كورمان kurman [هەڵكورمان]، ↑قرۆپ qırop "گۆجی" و ژمارەیەكی زۆر وشەی دیكە سەر بە ریشەك بە مانای "سوورِان، با دران".

قرمژن **qırımjın** *[ qırımžın ]* - "تەقە و گرمەی زل": خرمژن xırımjın یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ریشەی **> -ghrem * ‹ .IE›** "گرماندن، گوراندن، زرینگانەوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گرمە gırme و ↑خرمە xırme و ↑قرمە qırme دە زمانی كوردمادیدا. دە زمانە ئەرووپییەكاندا هێندێك وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەك grimm ‹.G›، grim ‹.E›، grym ‹.Sw› "قەڵس، توورِە"، grimmen ‹.OG›، gramjan ‹.Gt›، gremmian ‹.OE› "قەڵس كردن"، chremízein ‹.Gr› "حیلاندن" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ قرمژنی ئەسپ دە زمانی كوردمادیدا]، gremet ‹.Rus› "گرماندن، زرینگانەوە، تەقەتەق كردن"، grom ‹.Rus› "هەورەتریشقە، گرمەی هەور". دە زمانی فارسیشدا وشەكانی غر ġor ‹.P› "بۆڵە"، غرش ġorreš ‹.P› "گرمە، گورِرِە"، اسمان گرمبە grombe āsmān ‹.P› "هەورە تریشقە، گرمەی ئاسمان" و ↑گورِەشە gureşe [هەرِەشە و گورِەشە] پێوەندییان بەو وشانەی سەرەوە هەیە.

قرمە **qırme** *[ qırma ]* - شێوەیەكی دیكە لە ↑گرمە gırme. هەروەها قرماندن qırmandın هەیە كە ئەویش شێوەیەكی دیكەیە لە گرماندن gırmandın. برِوانە ↑قرمژن qırımjın.

قرنجان **qrıncan** *[ qırınjān ]* - "1- داررووشان 2- دەرز بردن": خزمە دەگەڵ ↑قرِاش qıraş "لەت، كوت، قاش" [قرِاش قرِاش] و↑قرخاندن² qırxandın. [فۆتیمی n لە "قرنجان"دا زێدەیە و دواتر خزاوەتە ناو وشەكەوە].

قرنگ **qrıng** *[ qrıng ]* - "لەنگین، خوارەوخوار رۆیشتن": دەچێتەوە سەر ریشەی **> -kleng*‹ .IE›** "چەمانەوە، خوار بوون". دواجار دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قەڵانگ qelang.

قرنوو **qırnû** *[ qırnū ]* - "جۆرێك گەنە كە بە ماڵاتەوە دەنووسێ": خزمە دەگەڵ ↑قرِنیس qırnîs "چنۆك" و چەند وشەیەكی دیكە بە مانای "شێلگیر بوون، حەول و تەقەلای زۆر دان، بە كارێكەوە نووسان و دەست بەر نەدان". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گەرِناس gernas.

قرووش **qırûş** [ *qırūš* ] - "جینگن، تووش و نالەبار": دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم وشانەوە:

1- ↑قەڵس qels.

2- ↑گورەشە gureşe [هەڕەشە و گوڕەشە].

قرۆپ **qırop** - "شەپلە، گۆجی": خزمە دەگەڵ ئەم وشە ژێرمەنییانەی خوارەوە: Krampe (G.) "هێچک، قولاب"، Krampf (G.) " گرژی"، krimphan (OG.) "خوار بوون، با دران"، krempen (G.) "قەراخی شتێک بۆ لای سەرەوە هەڵدانەوە [با دانەوە]، وەک قەراخی کڵاو"، krumm (G.)، chrump (OG.)، crumb (OE.) "خوار، با دراو"، Krüppel (G.) "گۆج، سەقەت"، Kringel (G.) "جەغز، ئاڵقەئاسا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ger- >** "سووڕان، با دران، خوار بوون". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑*قرمان qırman* [تیکقرمان]، ↑قرمچین qırımçîn "چرچ و لۆچ بوون"، ↑قر qır [قر و فر]، ↑گێر ger و هتد.

قرۆت **qrot** [ *qırot* ] - "شەپلە، گۆجی": خزمە دەگەڵ ↑*قرۆپ qırop* و ↑گێر ger "چەوێل" و هتد.

قرۆش **qroş** [ *qroš* ] - "پوولی سکەی کەم نەرخ": قروش qorūš (P.). ناوی سکەیەکی زیو بووە کە لە سەدەی 14ەوە لە شاری Touros لێدراوە و لەبەر ئەوەی سکەکە ئەستوور بووە، بە پێوانەی وشەی لاتینی grossus (denarius) "دیناری قەڵەو" پێی گوتراوە grosse (MG.). وشەی grossus (L.) بە مانای "قەڵەو"ە و ئیتر ئەم وشەیە پاشان گۆڕانی بەسەرداهاتووە و کەوتووەتە ناو زمانەکانی دیکەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە Groschen (G.) "قرۆش". وەک دەبینرێ دە زمانی عەرەبیدا وشەی دینار dīnār (Arb.) وشەیەکی وەرگیراوە و ریشەکەی بۆ زمانی لاتینی دەگەڕێتەوە.

قرۆشکە **qroşke** [ *qroška* ] - "پیاڵەی دەسکداری رووکێش": ئەم وشەیە وێ دەچێ لە زمانی رووسی وەرگیرابێ. بەڵام وادیارە ئەسڵەکەی بۆ زمانی یۆنانی دەگەڕێتەوە: *(Gr.) krōssós* < "گۆزە" و خزمیشە دەگەڵ Krug (G.)، kruog (OG.)، crōg (OE.) "گۆزە"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *ger-** "با دان، سووڕاندن". بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قرخ2 qırıx "دەفری کۆنی سواڵەت".

قرواق **qırwaq** [ *qırwāq* ] - "بۆق": قورباق qurbaq و ↑قرپۆک qırpok یش دەگوترێ. قورباغە qūrbāġe (P.). قر + واق qır + waq. کەرتی یەکەم "قڕ" دەچێتەوە سەر وشەی ↑قڕاندن qırandın. کەرتی واق -waq شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بۆق boq. تیکڕای وشەکە واتا "بۆقی قڕەکەر".

قرە **qırıh** - "ناحەز، دزێو": کریە karīh (P.) "ناحەزی ترسێنەر". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ grisly (E.)، grislic (OE.) "ترسێنەر، تۆقێنەر"، grīsen (MG.) و (MNl.) "ترساندن، تۆقاندن". لەوانەیە پێوەندیشی بە وشەی ↑قەڵس qelıs ەوە هەبێ. خزمە دەگەڵ ↑قرێژ qrej "پیس" و ↑کرێت1 kıret "ناحەزی ترسناک، قێزەون".

قریان **qıryan** [ *qıryān* ] - "ئارام بوون، ئۆقرە گرتن": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑کر kır [قر: قر و قپ qır u qıp یان کر و کپ]، ↑سر sır، ↑کورک kurık و ↑ئۆقرە o-qıre.

قریسک **qırîsk** [ *qırîsk* ] - "ئاورینگ": قر + یسک qır + îsk. کەرتی یەکەم هەمان ↑گر gır ە بە مانای "بڵێسە". کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە.

قریواندن **qırîwandın** [ *qırīwāndın* ] - "هەرا و هوریا کردن": ↑قریوە qırîwe.

قریوه **qırîwe** [ *qırīwa* ] - "هەراو هوریا، دەنگەدەنگی زۆر": قریپ qırîp یش دەگوترێ. غریو ġarīv (P.). خزمە دەگەڵ ↑غەڵبە ġelbe.

قرێژ **qırej** [ *qırež* ] - "پیس": خزمە دەگەڵ ↑قره qırıh "ناحەز، دزێو".

قرێشکە **qırêške** [ *qıreška* ] - "زیڕە": پێوەندی هەیە بە ↑قڕە qıre و ↑قیڕاندن qîrandın.

قز **qız** - "گۆی بازی": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑گوێز guwez.

قزە **qıze** [ *qıza* ] - "ترسەنۆک": خزمە دەگەڵ ↑کچ kıç [↑کیژ kîj] و هەروەها ↑گچکە gıçke. لەوانەیە لە روانگەیەکی تیرسالارییەوە مەبەست ئەوە بووبێ کە کوڕ نەترسە و کچیش ترسەنۆکە. یان لەوانەیە مەبەست خۆ چکۆڵە کردنەوە لە ترسان بێ.

قژ **qıj** [ *qıž* ] - "1- مووی سەر 2- توێژ(ی سەر شتی ترشاو)": بە مانای دووەم قەژە qeje ش دەگوترێ. گیس(و) (gīs(ū (P.) "مووی سەر، کەزی". خزمە دەگەڵ ↑کەزی kezî "پرچ"، ↑قاژ qaj "برۆ"، ↑قشت qışt "پرچۆکەی بان توێڵ" و ↑قازم qazım "ریسی لە کوڵکە دروست کراو". لە لایەکی دیکەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "توێژ، توێکڵ" دەدەن، وەک ↑قاشڵ qaşıl، ↑قاشک qaşık "تۆکڵی دار"، ↑قاشگ qaşıg "پەترۆک، قرتماغەی سەر برین"، ↑قەشا qeşa یان ↑قەشەم qeşem "تۆژاڵکی سەهۆڵ"، ↑قەشقیلک qeşqîlk "تیکوڵەهێلکەی بەتاڵ" و ↑قاتە qate "توێکڵی چەڵتووک" و هیتر. هەموو ئەم وشانە پێوەندییان بە دەستەوشەیەکی دیکەوە هەیە کە ئاماژە بە چەمکی "بڕین، لەت کردن، *تاشین*" دەکەن وەک ↑قاش qaş، ↑قاچین qaçîn، ↑کووز kuz، ↑کوت kut و ↑کەت ket و هیتر.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Rinde "تۆێکڵەدار" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، ڕنین، تاشین"، واتا بەهۆی تاشین یان رنینی توێکڵەدارەوە ئەم ناوە دراوە بە "توێکڵەدار". ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ رنین rınîn و هەروەها رندێن rındên (ردێن rıdên) ی کوردمادی. دەشێ دە زمانی کوردمادیشدا بنەوشەی قاش -qaş بە مانای تۆێکڵ بەم جۆرە سەری هەڵدابێ، واتا مەبەست سەرەتا تۆێکڵێک بووبێ کە داڕندراوە، داتاشراوە و لێ کراوەتەوە. ئەگەر سەرنجی وشەی "چین" بدەین کە دە زمانی کوردمادیدا زۆر جار دەگەڵ "تۆژ" بەکار دێ (چین و تۆژ)، دەبینین کە ئەو وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێکردنەوە، بڕین، جیا کردنەوە". بەم جۆرە لە ریشەیەکی هاوبەش دوو دەستەوشە سەریان هەڵداوە، دەستەیەک بە مانای "توێکڵ" و دەستەیەکیش بە مانای "موو". هەردوو دەستەوشە پێوەندییان بە چەمکی "رنین، تاشین، بڕین"ەوە هەیە. هەروەها ↑خەز xez "پێست"یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. سەرنجراکێش ئەمەیە کە خەز یان پێست هاوکات هەڵگری هەر دوو مانای "توێکڵ" و "موو"یە. دە زمانی فارسیدا بە پێست دەگوترێ "پوست" و بە توێکڵ دەگوترێ "پوستە". لەم دوو وشە فارسییەدا پێوەندی ئەم دوو چەمکە بە تەواوی دەردەکەوێ. لە لایەکی دیکە زۆر وێ دەچێ کە دوو وشەی "توێکڵ" (تۆکڵ) و "تووک" یش پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ].

قژاکە **qıjake** [ *qıžāka* ] - "تاق تاقکەرە": خزمە دەگەڵ ↑قاژوو qaju "باڵدارێکی رەشە لە کۆتر بچووکتر"،↑ قشقەڵە qışqele و دەگەڵ ↑قیژە *qîje*.

قژانگ **qıjang** [ *qıžang* ] - "پووکاوڵە، چەمۆڵە": قژانک qıjank یش دەگوترێ. وشەکانی "پووکاوڵە" و "چەمۆڵە" دەچنەوە سەر دوو ریشە بە مانای "چەمان(ەوە)". [دەست دەچەمێتەوە]. هەر بەم شێوەیە وشەی "قژانگ"یش دەچێتەوە سەر ریشەی > ***geu-** (**IE.**) "خوار بوونەوە، با دران، چەمانەوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قز qız "گۆی بازی" و ↑گۆ *go* "خڕۆک، زۆپ".

**قژقژ qıjqıj** [ *qıžqıž* ] - بە ئاوی لە جەنگەی کوڵین دا دەگوترێ "قژقژ دەکوڵێ". بڕوانە ↑قژقژاندن qıjqıjandın "چۆقاندنی ڕۆن، هەڵقرچاندنی ڕۆن".

**قژقژاندن qıjqıjandın** [ *qıžqıžāndın* ] - "چۆقاندنی ڕۆن، هەڵقرچاندنی ڕۆن": ↑قژلاندن qıjlandın یش دەگوترێ. هەروەها بە ئاوێک کە لە جەنگەی کوڵیندا بێ دەڵێن ↑قژقژ qıjqıj یان قشقش qışqış دەکوڵێ. بنەوشەی قژ -qıj [قش qış] لەوە ناچێ پێوەندی بە "قیژە"وە هەبێ و مەبەست "وە قیژە خستن"ی ڕۆنی داغ لەسەر ئاگر بێ! ئەم وشەیە دەبێ خۆی بە مانای "داغ کردن، کوڵاندن" و خزم بێ دەگەڵ ↑کزانەوە kızan(ewe).

[تێبینی: وشەی "چۆقاندن"یش کە بۆ قاڵ کردنی ڕۆن بەکار دەبردرێ، دەشێ خزم بێ دەگەڵ سووژیان sujyan و ↑سووتان sutan].

**قژلاندن qıjlandın** [ *qıžlāndın* ] - "چۆقاندن، قاڵ کردن": بڕوانە ↑قژقژاندن qıjqıjandın "چۆقاندنی ڕۆن، هەڵقرچاندنی ڕۆن".

**قسر qısır** - "نەزۆک": دەتوانین بیبەستینەوە بە ↑کزر kızır بە مانای "هیشک". پێوەندی چەمکی ڕەق بوون یان هیشک بوون بە چەمکی نەزۆکییەوە دەشێ بگەڕێتەوە بۆ شیر دان و تەڕ و بڕ بوونی مەمکی مێیینە لەدوای زان و بە وتەیەکی دیکە ڕەق و هیشک مانەوەی مەمکی نەزۆک. لەم بارەوە نموونەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا هەیە و چەمکی "نەزۆکی" بە "هیشک بوون"ەوە گرێ دەدا.

**قسڵ qısıl** - "کەرەسەیەکی خانووکردن لە جۆرەبەردێک وەردەگیرێ": خزمە دەگەڵ Kalk (G.)، (Nl.)، cealk (OE.) "قسڵ"، [وشە ئینگلیزییەکە دواتر بووەتە chalk (E.) "گێچ"]. ئەم وشە ژێرمەنیانە دەچنەوە سەر calx (L.) و لەویشەوە بۆ calkulus (L.) و chalix (Gr.) "ورکەبەرد، خیز، چەو". دە زمانی کوردمادیدا فۆتیمەکان جێگوڕکییان تێدا کراوە، واتا وشەکە دە پێشدا دەبێ قلس qıls یان کلس بووبێ.

**قسن qısın** - "زیارەتگا، چاک": گۆڕدراوی وشەی **صحن** seħn (Arb.)ە، فۆتیمەکان تووشی ئاڵوگۆڕ و جێگۆڕکی بوون. ئەم وشە عەرەبییە هەروەک ↑شانۆ şano ی کوردمادی دەچنەوە سەر وشەیەکی یۆنانی بە مانای "چادر، خێوەت".

**قسە qıse** - "گوتە، پەیڤ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گاز *gaz* [گاز کردن] و ↑قیژە qîje و ژمارەیەک وشەی دیکە بە مانای "دەنگ، بانگ، هاوار". وشەکە چووتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە قصة qissa (Arb.) "چیرۆک" و لەوێوە شێوە عەرەبێنراوەکە هاتۆتەوە ناو زمانی فارسی واتا qesse (P.) "داستان، چیرۆک". دە زمانی فارسی ئەفغانیدا وشەی قسە هەر وەک مانا کوردمادییەکەی بەکار دێ ["قسە بکن" واتا قسە بکە، قسان بکە].

[تێبینی: پێوەندی دوو وشەی "قسە" و "قیژە" وەکوو پێوەندی "ورتە" و "وەڕین" وایە. ئەم دوو وشەی دواییش هاوریشەی یەکدین، یان وەک دوو وشەی "چپە" و "شەپۆر"].

**قشت1 qışt** [ *qišt* ] - "پرچۆکەی بان توێڵ": خزمە دەگەڵ ↑قژ qıj "موو، تووک".

**قشت2 qışt** [ *qišt* ] - "خونجیلایە، جوانکیلە": قشتیلە qıştîle و قشتیلانە qıştîlane ش دەگوترێ. بنەوشەی قش -qış بە شێوەیەکی دیکە لە وشەی ↑گچکە gıçke دا دەردەکەوێ. فۆتیمی t دەشێ زێدە بێ.

**قشتن qıştın** [ *qıšıtn* ] - "جۆرێک خوێندنی قاڵاو": خزمە دەگەڵ ↑قژاکە qıjake "تاق تاقکەرە"، ↑قاژوو qaju "باڵدارێکی ڕەشە لە کۆتر بچووکتر"،↑ قشقەڵە qışqele و ↑قیژە qîje.

**قشقەرەق qışqerek** ⌊ *qıšqarak* ⌋ - "زەنازەنا، هەراهەرا": لە دوو بنجی قش -qış و قەر -qer پێک هاتووە، یەکەمیان بە مانای ↑قیژە qîje و دووەمیان بە مانای ↑قرە qıre، تیکرا واتا "قیژە و قرە".

**قشقەڵە qışqele** ⌊ *qıšqala* ⌋ - "مەلێکی بە قیژەقیژ": قش + قەلە qış + qele. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje و کەرتی دووەم هەمان ↑قەل qelە. مەبەست لە وشەکە قەلی قیژەکەرە.

**قشڵە qışle** ⌊ *qıšla* ⌋ - "سەربازخانە": خزمە دەگەڵ ↑قۆشەن qoşen "لەشکر، سوپا".

**قغە qıġe** ⌊ *qıġa* ⌋ - "دەنگی قاڵاو" [قغەقغ qıġeqıġ]. خزمە دەگەڵ ↑گغ qıġ [گاڵ وگغ] "دەنگەدەنگی زارۆک کە هێشتا فێری قسە نەبووە". دواجار خزمن دەگەڵ ↑قسە *qıse* "گوتە".

**قفک qıfık** - "سەبەتەی دەسکدار، زەنبیلی زل": قووفک qûfık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەفەس qefes و دواجار ↑کون *kun*.

**قفڵ qıfıl** - "ئامرازی داخستن، گۆڵە": قفل qofl (.P).

1- لەوانەیە وشەیەکی سەر بە زمانی کوردمادی بێ. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک جار لە جیاتی قفل qıfl، قلف qılf و ↑قوڵف qulf یش دەگوترێ. ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ ↑قولاپ qulap. لەوانەیە مەبەست لە قوڵف [قفڵ] سەرەتا هەر ئەو "قوڵاپ"ە بێ کە دەچێتە ناو ئاڵقەیەکەوە و دەبێتە هۆی داخستنی دەرگا و پەنجەرە و یەخدان و هتد.

2- ئەگەر سەیری وشەی ↑گۆڵە gole بکەین کە ئەویش مانای "قفڵ"دەدا، ئەم شیمانەیە دروست دەبێ کە "گۆڵە" شێوەی گۆڕدراوی "قفڵ" بێ. لەم تێڕوانینەوە وشەی قفڵ دەتوانێ پێوەندی بە ↑کیپ kîp ەوە هەبێ بە مانای "لە یەکدی بەستن، بە یەکەوە نووساندن". لەوانەیە وشەیەکی کۆن لەچەشنی کەپڵ **kepıl* لە ئاردا بووبێ و دواتر لە عەرەبیدا گۆڕابێ بە "قفڵ" و لە کوردیشدا گۆڕابێ بۆ "گۆڵە". لەم بارەوە هەروەها دەگەڵ وشەی ↑کوێلە koyle [کۆلە kole] هەڵی سەنگێنە.

**قفین qıfîn** - "کۆخین، کۆکین": هەروەها قف(ە) qıf(e) هەیە بە مانای "کۆخە". خزمە دەگەڵ ↑گەپین gepîn "حەپین، وەڕین" و ↑قەبۆ qebo "قاسپە، دەنگی، خۆێندنی کەو".

**ققە qıqe** ⌊ *qıqa* ⌋ - "خواردەمەنی دە زمانی زارۆکدا": قەقە qeqe و ککە kıke ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Kuchen (.G)، kuocho (.OG)، kaka (.Sw)، cake (.E)، koek (.Nl) "کێک، کولێرە". بە گوێرەی بۆچوونی تۆژەرانی ئێتیمۆلۆژی زمانی ئەڵمانی ئەم وشە ژێرمەنییە دەشێ دە بنەڕەتدا لە زمانی زارۆک وەرگیرابێ و ماناکەی "چێشت، پەڵوو، خواردەمەنی نەرم" بووبێ. ریشەی ژێرمەنی وشەکە **koka-, *kaka-* (*.Grm*) دیاری کراوە. وشەی "ققە" دە زمانی کوردمادیدا ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا کە وشەکە دە ئەسڵدا لە زمانی زارۆک وەرگیرابێ. دیارە ریشە ژێرمەنییەکە دەبێ بۆ ریشەیەکی کۆنتری هیندوئەورووپی بگەڕێتەوە.

**قل 1 qıl** - "دانە، دەنک": شێوەیەکی دیکە لە ↑گل(ە) gıl(e). [گلە ترێ واتا دەنکەترێ].

**قل 2 qıl** - "لاسک، چڵ": خزمە دەگەڵ↑ قالۆر qalor "لاسکەگیای ناو بەتاڵ".

**قڵادە qılade** ⌊ *qılāda* ⌋ - "1- ئاڵقەی ملی سەگ 2- خشڵی ئەستۆ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*هاڵان halan* [لێهاڵان le-halan] و ↑خەلەک xelek "ئاڵقە". "قلادە" شتێکە لە گەردن دەکرێ [دەهاڵێ].

**قلپ qılıp** - "1- دەنگی جۆشانی ئاو 2- سەرنخوون": بە هەر دوو ماناکەیەوە خزمە دەگەڵ ↑غەڵبە ġelbe "دەنگی تێکەڵاوی حەشیمەت" [غەڵبەغەڵب ġelbeġelb].

قلتیان **qıltîyan** [ *qıltīyān* ] - "جۆشینی ئاو لەسەر ئاگر": بڕوانە ↑قولتە qulte [قولتەقولت qulteqult].

قلچک **qılçık** [ *qılčık* ] - "1- پیشگان 2- داسوو 3- چرنووکی پەلەوەری بچووک": خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن".

قڵخ **qılx** - "برینگ": قەڵەخ qelex یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جوداکردن".

قلخان **qılxan** [ *qılxān* ] - "دڕکێکە بۆ سووتەمەنی": خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن".

قڵغ **qılġ** - "شێوە، بیچم، قەیافە": خزمە دەگەڵ ↑قڵخ qılx "برینگ" و ↑قەل qel کردن و ↑*قەڵشین qelşîn* سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kel- >** "قەلشاندن، بڕین ، لێک جودا کردنەوە". شیاوی باسە *شەقڵ* "شێوە، وێنە، مۆر" و چەقۆش دەچنەوە سەر ریشەی هاوبەشی *(IE.) *sek-* "بڕین". دیارە "شەقڵ" یان "قڵغ" دە بنەڕەتدا لەڕێگەی بڕین و کۆڵین و هەڵکەندنەوە دروست کراوە. هەروەها جێی ئاماژەیە کە وێ دەچێ هەردوو ریشەی سەروە پێکەوە خزمایەتییان هەبێ و بەم شێوەیە هەموو وشەکان دواجار بە خزم دەردەچن.

قلف(ە) 1 **qılf(e) 1** [ *qılf(a)* ] - "ئاڵقەیەکی لە بن دروستکراو کە شل یان توند دەکرێتەوە": ↑هەلەفە helefe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schleife (G.)، sleifa (OG.) "قڵفە"، سەر بە کرداری slifan (OG.) "خزان، خشان، خلیسکان". Klipa (Lit.) "قڵفە" پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییەوە هەیە. بەگوێرەی ئەم شی کردنەوەی سەرەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑زولف zulf.

قلف(ە) 2 **qılf(e) 2** [ *qılf(a)* ] - "دەسکی دەفر و گۆزە و ...": خزمە دەگەڵ یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- Griff (G.)، greep (Nl.)، grip (E.)، grepp (Sw.) "دەسک، دەسگیرە"، سەر بە کردارێک کە دە ئەڵمانیدا دەبێتە greifen (G.) "گرتن"، خزمە دەگەڵ ↑گرتن gırtın و ↑قرپاندن2 qrpandn "پڕ پێداگرتن".

2- ↑قولاپ qulap.

قلووج **qıluc** [ *qılūj* ] - "پشت کووڕ": خزمە دەگەڵ ↑قلۆچ qıloç "چاوخوار"، ↑خێل xel و ↑کل kıl "خوار"، ↑شەل şel "خوار لە رویشتندا" و چەند وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، چەمانەوە، با دران".

قلووژ **qıluj** [ *qılūž* ] - "کۆگا بوون، بەسەریەکدا کۆ بوونەوە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑کلۆ kılo [شتی پێکەوەنووساوی وەک گڵ و قەند و بەفر و هیتر].

2- ↑کەڵەکە keleke کردن .

قلۆت **qılot** - "زەوی نەوی کە ئاو تێیدا دەوەستێ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ klofi (OIs.) "کەلێن، کەلەبەر، خەڵوەتی، ئەنبار"، Kluft (G.) "قەڵش، کەلێن"، cleft (E.) "قەڵش، کەلێن، شیو و دۆڵی تەنگ". ئەم وشانە لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑کەلەبەر keleber.

قلۆچ **qıloç** [ *qıloč* ] - "1- خێل 2- کەسێک چاوێکی لە چاوەکەی دیکە بچووکترە": خزمە دەگەڵ ↑قلووج qıluc "پشت کووڕ".

**قلۆز qıloz** - "تیری شاخ بڵیند و ڕاست": پێک هاتووه له دوو کەرتی قل + ئۆز qıl + oz. کەرتی قل -qıl خزمە دەگەڵ ↑کێل kel "بەردی ڕاست و بڵیندی سەر گۆڕ". کەرتی دووەم پاشگرێکی بە ئاوەڵناوکردنە کە بۆ دۆخی جەخت کردن بەکار دێ و بە چەند شێوە لە ژمارەیەک وشەدا دەبیندرێ، وەک ئالۆز، قەڵووز، تەکووز، چڵێس، قڕنیس و هتد. بۆ ئەم پاشگرە بڕوانە ↑ئۆز - oz.

**قلۆزان qılozan** [ *qılozān* ] - "1- سەرمەقولات لێدان 2- تەقڵە لێدانی کۆتر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kreis (G.) "جەغز" و kreisen (G.) "سووڕانە(ەوە)، دەور لێدان". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ kratzen (G.) "ڕووشاندن، ڕنین"، سەر بە ڕیشەی ژێرمەنی *kraita-* (Gm.) "ڕووشاندن، خەت لێدان". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کڕاندن kırandın. دە بنەڕەتدا مەبەست جەغزێک بووە کە بە ڕووشاندن و کڕاندنی هەرد دروست کراوە.

**قله qıle** [ *qıla* ] - "سکڵی تەواو سوورەوەبوو": خزمە دەگەڵ ↑کڵ kıl.

**قلی بلی qılîbılî** [ *qılībılī* ] - "شادمانی زۆر": [پشیلە لە ماڵ نییە، مشک قلی بلییانە]. لە دوو وشەی قلی و بلی پێک هاتووە. قلی qılî دەبێ خزم بێ دەگەڵ glad (E.) و (Sw.) "خۆشحاڵ، ڕووگەش"، glatt (G.)، gladkij (Rus.) و glaber (L.) "ساف و لووس". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **< -*ghel (IE.)** "درەوشانەوە، ڕووناک، گەش". [پێوەندی ساف و لووس بە درەوشانەوە ئاشکرایە]. وشەی "قلی" دە زمانی کوردمادیدا دەبێ بە مانای "خۆشحالی و شادمانی، گەشاوەیی ڕوخسار" هاتبێ. وشە دووەمەکەش، واتا بلی bılî دەبێ بچێتەوە سەر ڕیشەی **< -*bhel (IE.)** "درەوشانەوە". ئەم وشەی دوایی خزمە دەگەڵ ↑بڵیسە belse و ↑بەڵەک belek و گەلێک وشەی دیکە.

**قلیچ qılîc** [ *qılīj* ] - "شمشێر": خزمە دەگەڵ ↑قلێل qılel "کوناودیو، کون بوو" و ↑قەلشین qelşîn.

**قلیچ1 qılîç** [ *qılīč* ] - "ڕیپۆقی چاو": خزمە دەگەڵ ↑خلیچک xılîçk [خاو و خلیچک] و هەروەها ↑خلیسک xılîsk سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "تەڕ و لیچق و خلیسک بوون".

**قلیچ2 qılîç** [ *qılīč* ] - "قامکە چکۆڵە": قڵێنجک qılencık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کلک kılık کە بە مانای "قامک"یش بەکار دێ و هەروها ↑کلێنجە kılence، دە بنەڕەتدا واتا "کلک یاخود زەقایی بچووک".

**قلێل qılel** [ *qılel* ] - "کوناودیو، کون بوو": خزمە دەگەڵ ↑قەل qel کردن واتا هەڵپاچین، ↑کەلێن kelen و ↑قەلشین qelşîn و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "بڕین، لەت بوون، لێک جودا بوونەوە" دەکەن.

**قڵێنچکەسڵاو qılençıkesılaw** [ *qılenčıkasılw* ] - "باپشکێو": خزمە دەگەڵ قلیچ2 qılîc "قامکە چکۆڵە" [قڵێنجک qılencık یش دەگوترێ] و هەروەها ↑کلک kılık و ↑کلێنجە kılence، دە بنەڕەتدا واتا "دەرپەڕیوی یاخود زەقایی بچووک". کەرتی "سڵاو" ناشێ پێوەندی بە سڵاو و چاک و خوشییەوە هەبێ، بەڵکوو پێوەندی بە شتێکی دیکەوە هەیە. سڵاو sılaw پێوەندی بە ↑زل zıl ەوە و هەیە و سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "ماسین"ە.

[تێبینی 1: سێ ناوی دیکە بۆ قڵێنچکەسڵاو بریتین لە ↑سیچقەسڵاو sîçqesılaw، ↑سیتکەزەلام sîtkezelam و ↑قنچکەسڵاو qınçıkesılaw. کەرتی "سیچقە" و "سیتکە" [بنجەکانی سیچ- و سیت- ] خزمن دەگەڵ "سووچ" و "زیت" و دواجار "زەق" و گشتیان ئاماژە بە زەق و دەرپەڕیو بوون دەکەن. هەروەها بنجی "قنچ"یش ئاماژە بە هەمان مانا دەکا و خزمە دەگەڵ "قنج" [قیت و قنج].

تێبینی 2: سەبارەت بەو پێوەندییانەی سەرەوە هەروەها سەرنجی وشەی "تووتە" بدە کە هەم مانای "قامکە چکۆڵە" دەدا و هەمیش مانای "زێدە گوشت لە چاو یان لە پێلووی چاودا"].

**قن qın** - "کولانەی مریشک": قنک gınık یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑کون kun.

**قنار qınar** [ qınār ] - "چەنگی ئاژەڵ و پەلەوەر": خزمە دەگەڵ ↑قونار qunar "لکەرەز".

**قنان qınan** [ qınān ] - "رزین": خزمە دەگەڵ ↑گەنین genîn.

**قنب qınb** - "گوشینگەی لە دار بۆ پلیخاندنەوەی ترێ": خزمە دەگەڵ knapp (G.)، knap(p) (Nl.) و hneppr (OIs.) "کەم، کورت، تەنگ" و hneppa (OIs.) "دە گیر خستن، زەخت کردن، گوشار خستنەسەر". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان بە kneipen (G.) و kneifen (G.) هەبێ بە مانای "قورینجاندن، گوشین". لە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکاندا باس لە پێوەندی ئەم وشانەی دوایی لەگەڵ وشەکانی سەرەوە نەکراوە. هەروەها بەراوردی وشە کوردمادییەکە بکە دەگەڵ ↑قەنەفلێ qenefle "سەرتەنگەی پاڵان".

[تێبینی: ریشەی هیندوئەورووپی هیچکام لەو دوو دەستەوشەیەی سەرەوە باس نەکراون. وێ دەچێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی **< *gen- (IE.)** "رێکگوشران، تۆپەڵە بوون، وێکهاتن"].

**قنج qınc** [ qınj ] - "1- راست، رەپ، زۆپ، قیت 2- جوان": سەر بەو خێزانەوشەیە کە دە بنچینەدا ئاماژە بە "خڕ بوون، تۆپەڵە بوون، رێکگوشران" دەکا و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑قوتیرquner "دومەڵ [خڕایی و گرێی سەر پێست]"، ↑خونچە xunçe [گوڵی خڕەوەبوو، نەکراوە، رێکگوشراو، تۆپەڵەبوو]، ↑گنج gınc [دە بنەڕەتدا رێکگوشران و خڕ بوونەوەی شتی شەق]، ↑قونچک qunçık "بنک، کۆتاییەکی خڕ"، ↑قنچکەسڵاو qınçkesılaw "باپشکێو"، ↑قونار qunar "لکە رەز"، ↑قۆنداغ qondaġ "1- منداڵی بابۆڵە پێچ 2- قوونی تفەنگ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *gen- (IE.)** "رێکگوشران، تۆپەڵە بوون، وێکهاتن".

[تێبینی: سەبارەت بە مانای رەپ و راست بۆ وشەی "قنج" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی قوت، قیت و قۆز کە ئەوانیش دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خڕ بوون، چەمانەوە" و ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بە هۆی پەیدا بوونی خڕایی و چەماوی لە سەر رووبەرێک، هەر لەو کاتەدا بەرزایی و قیتاییەکیش دروست دەبێ، بۆ وێنە دیمەنی شاخ هاوکات چەماوی و بەرزایی پێکەوە بە دیار دەخا].

**قنجکان qınckan** [ qınckān ] - "ترووشکان": قنچکان qınçkan و ↑چینچکان çînçkan یش دەگوترێن.

**قنچکەسڵاو qınçıkesılaw** [ qınčıkasılaw ] - "باپشکێو": خزمە دەگەڵ ↑قنج qınc و ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ" و چەندین وشەی دیکە بە مانای "زەق بوون، قوت بوون". کەرتی سڵاو(ە) -sılaw(e) پێوەندی بە سڵاو و چاک و خوشییەوە نییە و دەشێ پێوەندی بە شتێکی دیکەوە هەبێ. ئەم کەرتەوشەیە دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑زل zıl [زەلام] سەر بە ریشەیەک بە مانای "گەورە بوون، قەڵەو بوون، ماسین". لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ "زیبکە" [زیپکە] بەرهەڤی بکەین کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "گەورە بوون، زل بوونەوە".

2- ↑سووڵانەوە sulanewe "سووتانەوەی پێست، کزانەوە".

**قنس qınıs** - "پاژ، پارچە": وشەکانی "بڕ" [بڕێک]، "لەت" و "کوت" هەموویان پێوەندییان بەو ریشانەوە هەیە کە مانای "بڕین، قەلشاندن، لەت کردن" دەگەیەنن. بەم پێیە وێ دەچێ "قنس"

پێوەندی هەبێ بە cnocian ‎(OE.)‎ "لێدان، پێک دادان" و knoca ‎(OIs.)‎ "لێدان، کوتان" و knacken ‎(G.)‎ "دەنگی شکان لێهاتن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ گەڕێنراوەتەوە.

**قنگرتن qıngırtın** - "فێرە رۆیشتن بوونی زارۆک": شیاوی باسە کە لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وشەکە بە فارسی جیاواز لە مانا کوردمادییەکەی مانا کراوەتەوە، واتا "فێری دانیشتن بوونی منداڵ"! مانای راست و دروست دەبێ هەر ئەو مانایە بێ کە بە کوردمادی بۆی کراوە. ئەم وشەیە پێوەندی بە "قنگ"ەوە نییە، چونکوو رۆیشتنی منداڵ بەپێچەوانەی دانیشتنی پێوەندی بە "لاق"ەوە هەیە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑گانگلۆ ganglo [یان گاگۆڵە].

**قنین qınîn** ‎[ *qınīn* ]‎ - "رزین و لەبەریەک چوون": قنان qınan یش دەگوترێ. دەگەڵ پێشگری دا -da دێ، داقنین daqınîn یان داقنان daqınan. دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گەنین genîn "رزین".

**قوار quwar** ‎[ *quwār* ]‎ - "خۆڵەمێشی تەنوور": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەوە kewe "رەنگی بۆری ئاماڵ شین". دە زمانی کوردمادیدا بۆ خۆڵەمێش "خوڵە کەوە"ش بە کار دێ. شێوەی کۆنتری وشەکە دەبێ "کەوار" بووبێ کە سواوەتەوە و بووەتە "قوار".

**قوب qub** - "1- ترۆپک 2- گونبەز 3- دوگمە 4- زۆپایی": قوببە qubbe ش دەگوترێ. هەموو ماناکان زۆر لەیەکدی نیزیکن. دە زۆربەی زمانە ئەورووپییەکاندا بە شێوەی جۆراوجۆر وشەی لەم چەشنە دە بینین، وەک gibber ‎(L.)‎ "پشت کووڕ"، gibbus ‎(L.)‎ "چەماوی، کووڕی، هەڵمساوی"، Gipfel ‎(G.)‎ "دوند، سەرچڵ"، Kuppel ‎(G.)‎ "گونبەز، قوببە"، Kopf ‎(G.)‎ "سەر، کەللە"، kypfos ‎(Gr.)‎ "کووڕ، چەماو"، kakup ‎(OIn.)‎ "زۆپایی، کووڕی"، kupra ‎(Lit.)‎ "کووڕی، زۆپایی"، سەر بە ریشەی ***(IE.)* *kubh- >** "چەمانەوە، خڕ بوون، زۆپ بوون". دە زمانی کوردمادی چەندین وشە خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە وەک ↑گۆپک gopık، ↑قۆپچە qopçe، ↑قۆپ qop، ↑کووپە kuppe، ↑گیپە gîpe.

**قوبالە qubale** ‎[ *qubāla* ]‎ - "دۆڵابی دیوار بۆ شت تێنان": خزمە دەگەڵ ↑قووپان qupan "رۆچون، قووڵ بوون". مەبەست لێرەدا قووپاوییە لە ناو دیواردا.

**قوباندن qubandın** ‎[ *qubāndın* ]‎ - "زەق و زۆپ کردن": خزمە دەگەڵ ↑قوب qub.

**قوببە qubbe** ‎[ *qubba* ]‎ - "نیشان [دوگمە] ی سەر شانی ئەفسەران": خزمە دەگەڵ ↑قوب qub.

**قوبکە qubke** ‎[ *qubka* ]‎ - "1- ترۆپکی چیا 2- گونبەز 3- قوببە": دەچێتەوە سەر ↑قوب qub.

**قوت1 qut 1** - "زۆپ، دەرپەڕیو، زەق": خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قیت qît و چەندین وشەی دیکە. دە زمانی کوردمادیدا قوت بە مانای وریا و لەسەر هەست بوونیش دێ و هەروەها "قوتەقوت qutequt کردن هەیە بە مانای "بە زیتەزیت چاو لەم لا و ئەولا کردن". دە فارسیدا قد qod ‎(P.)‎ بە مانای "زیت، سەرکەش" دێ. مانای "زیت" لێرەوە سەری هەڵداوە کە لەکاتی زیت بوون و سەرنج دانی دەورو بەر مل راست دەکرێتەوە و سەر هەڵدەهێنرێ واتا قوت دەکرێتەوە. ئا بەم مانایە قچ qıç یش دەگوترێ کە شێوەیەکی دیکەیە لە قوت.

**قوت2 qut 2** - قوت بوون واتا "بڕدران، پچڕان". خزمە دەگەڵ ↑کوت kut [لەت و کوت].

**قوتاخ qutax** ‎[ *qutāx* ]‎ - "منالی بەردەستی وەرزێر": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە بە مانای"زارۆک"، وەک ↑قوتتە qutte "جوانووی دوو ساڵە"، ↑کوودەڵە kudele "بەچکەبەراز"، ↑کودک kudık "بەچکەی لاور" [کودک kūdak ‎(P.)‎ واتا زارۆک].

**قوتان qutan** *[ qutān ]* - "خۆ تێ هەڵقوتاندن" واتا "خۆ دە کارێک وەردان". بڕوانە ↑هەڵقوتاندن helqutandın.

**قوتتە qutte** *[ qutta ]* - "جوانووی دوو ساڵە": خزمە دەگەڵ ↑کوودەڵە kudele "بەچکەبەراز"، ↑کودک kudık "بەچکەی لاور" [کودک kūdak (P.) واتا زارۆک].

**قوتم qutım** - "بنەداری بڕاوی لە زەمیندا ماو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Stamm (G.)، stam (OG.)، stam (Nl.) "تەنەی دار"، سەر بە ریشەی **< -sta* (IE.)** "وەستان".

**قوتوو qutu** *[ qutū ]* - "دەفری سەرپۆشدار بۆ شت تێدا هەڵگرتن": قووتی qutî ش دەگوترێ. qūtī (P.): لەوانەیە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- Hut (G.)، hoed (Nl.) "کڵاو"، hood (E.) "سەرپۆش"، Hut (G.) "ئاگاداری کردن"، Obhut (G.) "سەرپەنا"، hoede (Nl.) "پەنا، پارێزگاری"، hüten (G.) "پاراستن"، heed (E.) "شاردنەوە"، سەر بە ریشەی **< -kadh* (IE.)** "تاقەت کردن، داپۆشین بە مەبەستی ئاگاداری کردن و پاراستن".

2- scatola (It.) "قوتیلە، قوتوولە".

**قودیک qudîk** *[ qudīk ]* - "ئاوێنە": هەڵیسەنگینە لەگەڵ ↑ئاوێنە awene.

**قوڕ qur** - "حەڕی، گڵی تەڕ":

1- لەوانەیە خزم بێ یان شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑حەڕی ħerî و ↑گڵ gıl و پێوەندیشی هەبێ بە ↑قیر qîr [قیل qîl] سەر بە ریشەیەک بە مانای "پێوەنووسان".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ gore (E.) "چڵک و پیسایی"، gor (OE.)، goor (MNl.)، gor (OG.) "قوڕ و چڵپاو"، gor (ON.) "شتی شل و لیچق، خواردنی جووتراوی مەڕ و ماڵات"، gor (OIr.) "چڵک و کێم". ریشە؟

**قوڕاندن qurandın** *[ qurāndın ]* - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ، هەڵقوڕاندن واتا قوت دان و فڕ کردنی شلەمەنی. هەر بەم مانایە ↑قورتاندن qurtandın یش دەگوترێ و خزمە دەگەڵ ↑قوڕگ qurg و ↑قوت qut [دە بنەڕەتدا قورت qurt] و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**قورتاندن qurtandın** *[ qurtāndın ]* - شێوەیەکی کۆنترە لە ↑قوڕاندن quradın "هەڵقوڕاندن". قورچاندن qurçandın یش دەگوترێ.

**قورتم qurtım** - "1- سورێنچکە 2- بێڤلی فیل 3- کیسەی ملی کەڵک": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرتم **qırtım** "لووتی فیل".

**قوڕس quris** - "گران، سەنگین": دە زمانی فارسیشدا ئەم وشەیە بەکار دێ و دەگوترێ **قرص و محکم** qors o moħkam (P.) واتا "قورس و قایم". خزمە دەگەڵ ↑کورسین kursîn "رەگ داکوتان و قایم بوون (ی چنار)".

**قوڕساخ qursax** *[ qursāx ]* - "سەنگینی و ویقاری مرۆڤ": دەچێتەوە سەر ↑قورس quris.

**قورسکە qurıske** *[ qurıska ]* - "زیقەی سەگ": خزمە دەگەڵ ↑قرچە qırçe [دە بنەڕەتدا واتا دەنگ و هەرای توند].

**قورسە qurse** *[ qursa ]* - "شمشی زێڕ و زێو": خزمە دەگەڵ ↑گرسە gırse.

**قوڕسین qursîn** *[ qursīn ]* - "قورنجاندن، نقورچک گرتن": قورچی کرن qurçî kırın یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑قورنجاندن qurıncandın [دە بنەڕەتدا: قورجاندن qurcandın، فۆنیمی n زێدەیە].

**قوڕقرۆچکە qurqıroçke** *[ qurqıročka ]* - "سورێنچکە": خرخرە xerxere (P.)، خزمە دەگەڵ ↑قوڕگ qurg.

**قورگ qurg** [ *qurg* ] - خزمە دەگەڵ gurglio (L.) "قورگ، لوولەی هەناسەکێشان"، Kragen (G.) "یەخە، بەربینگ، قورگ" [سەرەتا تەنێ بە مانای قورگ بووە]، سەر بە ریشەی **>** ***gurogh-*** ***(IE.)*** "هەڵلووشین، قورگ" و ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی **>** ***guer-*** ***(IE.)*** "بە گەروودا بردنەخوار". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەرووو geru و ئەگەر ئەم ریشەی دواییش لەبەرچاو بگرین، دەشێ پێوەندی بدەینەوە بە وشەکانی ↑خواردن xwardın و↑قووڕاندن qurandın [هەڵقووڕاندن].

**قورم¹ qurım** - "سیان، دووکەڵی نیشتوو": خزمە دەگەڵ grime (E.) "قورم". وشەکە دە ئەڵمانی و هولەندی ناوینیشدا بە کارهاتووە. ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی فارسیدا جرم cerm (P.) بە چەند مانایەک بەکاردێ، لەوانە "ژەنگی ددان" [قورمی ددان] و "خڵتە، تڵتە، نیشتە". بە فارسی بە لێکردنەوەی قورمی ددان دەبێژن "جرم گیری". لە وانەیە وشە فارسییەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیراوبێ [جرم jirm (Arb.)]، بەڵام ئەسڵی وشەکە کوردمادییە، واتا زمانی عەرەبێ وەری گرتووە و پاشان فارسی لە عەرەبییەکەی وەرگرتۆتەوە. فۆتیمی q دە وشەی "قورم"دا کۆنتر دە زمانی کوردمادیدا هەروەک زمانی ئینگلیزی g بووە. زمانی عەرەبی وشەکەی وەرگرتووە و لە بەر نەبوونی فۆتیمی g لەو زمانەدا، ئەو فۆتیمەی کردووە بە ج c.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبی و فارسیدا هەروەها جرم jirm (Arb.) و jerm (P.) وەک یەکەیەکی فیزیکی و پێوانەی کێش و گرانایی بەکار دێ. ئەم وشەیە جیایە لەو "جرم"ەی سەرەوە و دەبێ پێوەندی هەبێ بە *گرام* "یەکەی کێش و گرانایی". ئەم وشەیە خۆی دەچێتەوە سەر gramme (G.) "خەت، تیپ، نیشانەی نووسین"، سەر بە کرداری graphein (G.) "نووسین"].

**قورم² qurım** - "مرخ، تەماح": ↑قرم qırım.

**قورم³ qurım** - "قومی ئاو": دەشێ شێوەی کۆنتری ↑قوم qum بێ و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑قورگ qurg، (هەڵ) ↑قوڕاندن qurandın، ↑قووت qut [دە بنەڕەتدا: qurt]، ↑خواردن xuwardın و هتد.

**قورمسین qurımsîn** [ *qurımsīn* ] - "قرمچین، هەڵقرچان": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرمچین qırmçîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "با دان، سووڕان".

**قورمین qurmîn** [ *qurmīn* ] - "1- کورک بوون 2- داسەکنان": خزمە دەگەڵ ↑قەرمین qermîn "تەزین، سڕ بوون".

**قورنجاندن qurıncandın** [ *qurınjāndın* ] - "لێ رەبا دان، با دانی پێستی لەش و تێش پێگەیاندن": قورینجاندن qurîncandın و قوولینجاندن qulîncandın یش دەگوترێ. بنجی وشەکە دەبێ قورج -qurıc بووبێ و فۆتیمی n کەوتبێتە ناوەوە و بووبێتە قورنج -qurnc. شیاوی باسە دەنگی n هێندێک جار بۆ هاسانکاری لە گۆ کردنی وشەیەک دەکەوێتە پێش چەند دەنگێکی وەک ج، چ، ک، گ. بۆ وێنە: تاج / تانج، تاجی/ تانجی، قولاج/ قولانج، قالۆچە/ قالۆنچە، جنین/ ئەنجنین [ئە + ن + جنین] و هتد. بنەوشەی قورج -qurıc خزمە دەگەڵ چەندین وشە، وەک ↑قرچان qırçan [هەڵقرچان helqrçan]، ↑گرنژین gırınjn "چرچ و لۆچ بوون"، ↑قر qır "سوڕ"، ↑غەرغەرە ġerġere و دەچێتەوە سەر ریشەی **>** ***ger-*** ***(IE.)*** "سووڕان، با دران، وێکهاتن".

**قورنە qurne 1** [ *qurna* ] - "گۆشە و قەراخ":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ کران(ە) karān(e) (P.) "سنوور، قەراخ" و دەگەڵ ↑قەراخ qerax.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ corner (.L) "گۆشە". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر cornū (.L) "قۆچ، شاخ" و خزمە دەگەڵ ↑کەرەنا kerena "زورنای زل" کە لە بنەڕەتدا لە شاخی ئاژەڵ دروست کراوە.

**قورنە2 qurne 2** [ *qurna* ] - "حەوزۆکەی حەمام، جۆرنەی گەرماو": جۆرنە corne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قوول qul و دەبنەڕەتدا مەبەست "قوڵکە" بووە.

**قورۆمە qurome** [ *quroma* ] - "باسکی ئاموور، ئێرەقە": خزمە دەگەڵ ↑ئاموور amur و ↑*ئامێر amer* و arma (.L) "دەزگا، ئامێر" و armare (.L) "تەیار کردن بە ساز و بەرگ".

**قورینگ qurîng** [ *qurīng* ] - "دوڕنا":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کورکورە kurkure.

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ cycnus (.L) "قوو". دە زمانی فارسیدا قو qū (.P) پێوەندی بەم وشەوە هەیە.

**قوز quz** - "ئەندامی مێیەتی": کوز kuz یش دەگوترێ. kos (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کوت kut، ↑کووز kuz، ↑کەت ket، ↑قاش qaş، ↑قوسان qusan "تاشین لە بن ڕا" و چەندان وشەی لەم چەشنە کە لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "قەڵشین، بڕین، لێک (جودا) کردن(ەوە)". لەم تێڕوانینەوە ئەم ئەندامە بە هۆی "قەڵشدار" بوون یان لێک جیا بوونەوە بەم جۆرە ناو نراوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Scheide (.G) بەم مانایە بەکار دەهێنرێ کە بە پێوانەی زمانی لاتینی دروست کراوە و ماناکەی دە بنەڕەتدا "کالان"ە. بەڵام وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، جودا کردنەوە" و خزمە دەگەڵ "جودا"].

**قوژبن qujbın** [ *qužbın* ] - "گوشە": کوژبن kujbın یش دەگوترێ. قوژ + بن qıj + bın. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گۆشە goşe. کەرتی دووەم هەمان ↑بن bınە و تێکڕا دەبێتە "بنی گوشە".

**قوسان qusan** [ *qusān* ] - "تاشین لە بن ڕا": خزمە دەگەڵ ↑کوت kut، ↑کەت ket، ↑قاش qaş و هیتر، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**قوسین1 qusîn 1** [ *qusīn* ] - "شیر *هەڵچوون*": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑قۆز qoz و ↑قووچ quç و ↑قوت qut و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەن بە چەمکی بەرزی و قیتی.

**قوسین2 qusîn 2** [ *qusīn* ] - "بلۆق کردنی پێ": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشەی وەک ↑قاتەqate، ↑قاشک qaşık و ↑قاشڵ qaşıl و هیتر کە ئاماژە دەکەن بە چەمکی "توێکڵ".

**قوشقی quşqî** [ *qušqī* ] - "سڵ، رەوەک، دەرپەڕیو لە ترسان": خزمە دەگەڵ ↑کۆچ koç و "کۆچان" بە مانای "رۆیین، دوور بوونەوە".

**قو(ف)فە quf(f)e** [ *quffa* ] - "جۆرە بەلەمێکی لادیوار بڵیندە": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- skef (.OG)، skip (.OE) "جام" و هەروەها "گەمی، کەشتی". ئەم وشانە دە زمانی ئێستا بوونە schiff (.G)، ship (.E) "گەمێ، کەشتی"، سەر بە ریشەی ***(s)kei- > (.IE)** "بڕین، قەڵشین، تاشین". دە بنەڕەتدا مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە "داتاشراو، هەڵکۆڵدراو" بووە. لەمەوە مانای "قاپ، جام" و دواتریش مانای "گەمێ" پەیدا بووە. لەوانەیە وشەکە خزمیش بێ دەگەڵ قاپ "جام".

2- هێندێک وشە کە مانای "قووڵ بوون، قوڵکە بوون" دەبەخشن، وەک ↑کاپان kapan "کونی فرەوان لە میچدا"، ↑گۆڤ gov "ئاغەڵ"، ↑گوڤ guv "کونی ئاژەڵی کێوی" و ↑*کون kun*.

**قول1 qul 1** - "1- پێست رەش 2- بەندە، بەردە":

1- لەوانەیە ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "ڕەش" بەکار هاتبێ. ↑قولە qule دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "ئەسپی ڕەش"یش بەکار دێ. لە مانای "ڕەش، پێست ڕەش"ەوە لەوانەیە دواتر مانای "بەندە، بەردە، کۆلە (کۆیلە)" پەیدا بووبێ، چونکوو پێست ڕەشەکان زۆر جار کراونە بەردە. لەباری ماناوە دەکرێ دەگەڵ وشەی "زەنگی" دە زمانی فارسیدا هەڵیسەنگینین کە مانای "ڕەش پێست" دەدا. ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ "زەنگ" دە کوردمادیدا [شەوەزەنگ واتا شەوی تاریک]. لەم تێڕوانینەوە ریشەی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کۆڵوو *kolu* "نانی سووتاو".

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە "قول" شێوەیەکی دیکە لە وشەی کۆلە [کۆیلە] بێ و دیسان بە لەبەر چاوگرتنی پێوەندی دوو چەمکی ڕەش پێست و کۆیلایەتی، مانای وشەکە لە "کۆیلە"وە بۆ "ڕەش پێست" گۆڕدرابێ. لەم بارەوە بڕوانە ↑کۆیلە koyle.

**قول2 qul 2** - "کون": خزمە دەگەڵ ↑قووڵ qul و ↑کون *kun*.

**قول3 qul 3** - "تیوان قامکی زل و قامکی نیشانە": بڕوانە ↑قولانج qulanc.

**قوڵ qul** - "ئاژەڵی کلک پەڕیو": خزمە دەگەڵ ↑قوڵە qule.

**قولاپ qulap** ⌊ *qulāp* ⌋ - "دار یان ئاسنی سەرچەمێنراو": کولاب kulab یش دەگوترێ. قوللاب (P.) qollāb. خزمە دەگەڵ (G.) Klaue "چەنگ، چڕنووک، قولاپ"، (L.) clavus "نینۆک"، سەر بە ریشەی **(IE.) *gel- >** "چەنگ پێداگرتن". ئەم ریشەیە خۆی مانایەکی کۆنتری هەیە کە بریتییە لە "ڕێکگوشین، توپەڵە کردن، مچکاندن". چەندین وشەی دیکە پێوەندی بەم وشەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑کولبە kulbe "بێڵچە"، ↑کولپەک kulpek "هەنگڵی کووپە و مەنجەڵ"، ↑کولاف kulaf "چڕنووکی باڵدار"، ↑کولابە kulabe "کەڵەوە" و هتد.

[تێبینی: "قولاپ" وەک "پشت گوێزینگ، جومگەپێ"ش مانا کراوەتەوە، بەڵام وێ ناچێ ئەم مانایە پێوەندی بە خودی وشەی "قوڵاپ"ەوە هەبێ. "قولاپ" بەم مانایەی دوایی گۆڕدراوی "قولەپێ"یە، واتا ئەو شوێنەی پێ کە *قووڵە*، قووڵایی تێ کەوتووە و دەکەوێتە پشتەوەی جومگەی پێ].

**قولاپاندن qulapandın** ⌊ *qulāpāndın* ⌋ - "پەشیمان کردنەوە": ↑قوڵپاندن qulpandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قڵپ qılıp بوونەوە بە مانای "وەرگەڕان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ (G.) klappen. وشە ئەڵمانییەکە چەندین مانا دەبەخشێ، لەوانە "هەڵگەڕانەوە".

**قوڵاخ qulax** ⌊ *qulāx* ⌋ - "جێگەی ئاو دابەش کردن لە مەزرە": هەروەها قوڵاخە qulaxe هەیە بە مانای "خزگەی ماسی، کۆ بوونەوەی ماسی لە زستان بە دەوری یەکەوە": ئەم وشانە دەشێ لەپێوەندی لەگەڵ یەکتردا بن و خزم بن دەگەڵ ↑قووڵکە qulke. هەم لە شوێنی ئاو دابەش کردن و هەمیش لە شوێنی کۆ بوونەی ماسی لە زستاندا دەبێ قووڵایی یان قووڵکەیەک لەئارادا بێ.

**قولان qulan** ⌊ *qulān* ⌋ - "بە هەنگڵەشەلە ڕۆیشتن": خزمە دەگەڵ ↑کوللە kulle [کوللوو].

**قولانج qulanc** ⌊ *qulānj* ⌋ - "درێژایی تیوان قامکی زل و قامکی نیشانە، گوێل": وشەکە دە ئەسڵدا قولاچ qulaç ە و هەروەها بە شێوەی قولاج qulac یش دەگوترێ. فۆتیمی n زێدە و خزاوەتە ناو وشەکەوە. "قولاچ" خۆی دەچێتەوە سەر ↑گوێڵ guwel. [دە ئەسڵدا واتا گوێلی بچووک، قووڵایی بچووک].

**قوڵپ1 qulp 1** - "1- جۆشینی ئاو 2- دەنگی گریانی لەپڕ": ↑قڵپ qılıp.

**قوڵپ2 qulp 2** - "دەسک و هەنگڵی دەفر": قوڵب qulb یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قولاپ qulap.

قوڵپاندن **qulpandın** ⌊ *qulpāndın* ⌋ - "وەرگەڕاندن، قلّپ کردنەوە 2- پەشیمان کردنەوە": بڕوانە ↑قولاپاندن qulapandın "پەشیمان کردنەوە" و ↑*قلّپ qılıp* بوونەوە بە مانای "وەرگەڕان".

قوڵتاندن **qultandın** ⌊ *qultāndın* ⌋ - "1- ژێر ئاو کردن 2- کوڵاندنی ئاو": خزمە دەگەڵ ↑قوڵتە qulte "بڵقی ئاو" و دواتر ↑*کوڵین kulîn* "جۆشین". هەم لە کاتی ژێر ئاو کردن و هەمیش لە کاتی کوڵینی ئاو دا قوڵتەقوڵت و بڵق کردن بەدی دێ.

قوڵتە **qulte** - "بڵقی ئاو": خزمە دەگەڵ ↑کوڵین kulîn "جۆشین".

قولزین **qulzîn** ⌊ *qulzīn* ⌋ - "چەمانەوە، داهاتنەوە، دانەوین": قولزاندن qulzandın یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کل kıl "خوار، لار".

قوڵف **qulf** ⌊ *qulf* ⌋ - "قفڵ": "قوڵف دان" یان "قوڵف لێدان" واتا قفڵ لێدان، داخستن بە قفڵ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑کەلەپچە kelepçe. لەوانەیە qulf دە زمانی عەرەبیدا گۆڕابێ و بووبێتە قفل qufl (Arb.).

قولفین **qulfîn** ⌊ *qulfīn* ⌋ - "سڕ بوون لە سەرمان": قوفلین quflîn یش دەگوترێ. پێوەندی بە ↑*قولف qulf* "قفڵ"ەوە هەیە و دەشێ مەبەست ئەوە بێ لە دەست یان لەش لە سەرمان لە جم و جۆڵ دەکەوێ. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ kühl (G.)، cool (E.)، koel (Nl.) "فێنک، سارد" و دەگەڵ ↑سارد sard، سەر بە ریشەیەک بە مانای "رێکگوشران، پێکەوەنووسان، گرمۆڵە بوون".

قوڵفە **qulfe** ⌊ *qulfa* ⌋ - "دەسکی گوزە": خزمە دەگەڵ ↑قولاپ qulap.

قوڵکە **qulke** ⌊ *qulka* ⌋ - "چاڵ": قووڵکە qulke و قووڵک qûlık یش دەگوترێن. دەچێتەوە سەر ↑قووڵ qul "رۆچوو، قووپاو، چاڵکراو".

قو(ل)لە **qul(l)e** ⌊ *qul(l)a* ⌋ - "سەرچاوەی ئاو، کانیاو": قوڵقوڵە qulqule ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Quelle (G.) و quella (OG.) "کانیاو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کوڵین kulîn.

قولوچ **quluç** ⌊ *qulač* ⌋ - "قوڵکەی بچووک (بۆ کایەی کەلاێن)": قولوج quluc یش دەگوترێ و ناوی کایەکەش دەبێتە قولوچان quluçan یان قولوچانێ quluçane "کایەی کەلا دە قوڵکە خستن". هەروەها قولوچ قولوچ quluçquluç هەیە بە مانای "پڕ لە قوڵکە و چاڵ". وشەکە دەچێتەوە سەر ↑قوڵکە qulke و دواتر ↑*قووڵ qul*.

قولووز **quluz** ⌊ *qulūz* ⌋ - "پشت کووڕ، پشت چەماو": قلووج qıluc یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قولزین qulzîn "چەمانەوە، داهاتنەوە، دانەوین".

قولۆق **quloq** - "قنچکی گەنمەشامی (بەلال)": شێوەیەکی دیکە لە ↑کلک kılk.

قول(ل)ە **qul(l)e** ⌊ *qul(l)a* ⌋ - "دوند، سەرترین شوێن": خزمە دەگەڵ ↑کەللە kelle [سەر، کەللەسەر]. هەروەها قولەبانک qulebank هەیە بە مانای "هەورەبان". لە هەردوو وشەی "قولەبانک" و "هەورەبان"دا کەرتی یەکەمی وشەکە ئاماژە بە "لای سەرەوە" دەکا.

قولە **qule** ⌊ *qula* ⌋ - "ئەسپی رەش": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قول qul "پێست رەش".

قولەقاپە **quleqape** ⌊ *qulaqāpa* ⌋ - "باریکایی بەلەک" [ئاوەکە تا قولەقاپەم هات]. وشەکە پێک هاتووە کە دوو وشەی قول qul بە مانای قووڵایی [بڕوانە ↑قووڵ qul] و ↑ قاپ2 qap "جکێ". [دە بنەڕەتدا: جومگە]. قاپ یان ↑ *قاپ¹ qab* بە مانای "پووز، گوێزینکێ"یش بەکار دێ. "قولەقاپە" ئاماژەیە بەو شوێنەی خوارەوەی لاق [جومگەی لاق] کە قووڵاییەک [قووپاوییەک]ی تێکەوتووە.

**قولین qulîn** [ *qulīn* ] - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ، هەڵقولین واتا بە تەوژم دەرهاتنی تراو واتا هەڵچوون. خزمە دەگەڵ ↑کولین kulîn.

**قولینچك qulînçık** [ *qulīnčık* ] - "سووچ، گوشە": دە بنەڕەتدا دەبێ لە دوو بەشی قولین + چك qulîn + çık پێك هاتبێ. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. کەرتی یەکەم، واتا قولین qulîn خزمە دەگەڵ ↑کولین kulen "کەلێن و کولێن". دەبێ مانای وشەکە دە بنچینەدا "قوژبن" بووبێ و لێرەوە مانای "گوشە"ی پەیدا کردبێ.

**قولینگ qulîng** [ *qulīng* ] - "ئامرازی هەڵکەندن و قووڵ کردن": لە وشەی ↑قووڵ qul وەرگیراوە. کەرتی دووەمی وشەکە پاشگرێکە کە دە زمانی کوردمادیدا چەندین ناوی ئامراز دروست دەکا، وەك برینگ، بێژینگ، هەروەها قەرسینگ "فرینێر" [هێندێك جار فۆتیمی g دەبێتە k].

**قولێر quler** [ *quler* ] - "دەلاقە": خزمە دەگەڵ قول qul "کون" و ↑قووڵ qul. مەبەست لە "قولێر" شوێنی کونکراو یان قووڵکراو لە دیوار دایە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "دەلاقە" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "دۆڵ" و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "قووپان، رۆچوون، قووڵ بوون".

**قوم1 qum 1** - قوم بوون واتا "چوونە ژێر ئاو":

1- لە لایەکە دەتوانێ شێوەیەکی سواوە بێ لە ↑نوقم nuqım [یان نقوم nıqum].

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ پێوەندی بە ↑گوم gum ەوە هەبێ و لەم تێروانینەوە مەبەست لە قوم بوون دە ناو ئاودا گوم بوون واتا ون بوون لەبەر چاو بێ.

**قوم2 qum 2** - "فڕ، برێك لە ئاو کە هەرجارەی بە گەرووودا دەچێتەخوار": وێ دەچێ مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە "دەم، زار" بووبێ و مەبەست لە "قوم لێدان" هەمان "دەم لێدان" بووبێ، هەر وەك "قەپ لێدان"، بەم جیاوازییە کە قوم لە پێوەندی دەگەڵ خواردنەوەدا و "قەپ" دەگەڵ خواردن بەکار هێنراوە. لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کام2 kam 2 "1- نەخۆشییەکی ناو زاری ئاژەڵ 2- ئاڵ بوونەوەی ددان" [دە بنەڕەتدا: دەم، زار]، Gaumen (G.)، goumo (OG.)، gom (Sw.) "مەڵاشوو"، gums (E.) "پووك"، gomurys (Gr.)، gamurs (Let.) "قوڕگ، لوولەی هەناسەکێشان" و دەگەڵ ↑قەمپۆز qempoz [ qem + poz ]" و ↑کاو2 kaw 2 "چێژ، ئیشتیا". وشەی ↑قوم3 qum 3 "1- کووپەڵە، بستووکە 2- سوێنە 3- جێگەی ئاودانی ماڵات لە دار یان قوڕ، کۆڵ" و و ↑قومقومە qumqume ش دەشێ پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.خودی "قوم" دواجار دەشێ دەگەڵ ↑قەپ qep خزم بێ و لەوانەیە ↑خوم *xum* "کووپەڵەی گڵین" پێوەندی بەمەوە هەبێ.

**قوم3 qum 3** - "1- کووپەڵە، بستووکە 2- سوێنە 3- جێگەی ئاودانی ماڵات لە دار یان قوڕ، کۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑قوم2 qum 2، قومقومە qumqume و لەوانەیە ↑خوم *xum* "کووپەڵەی گڵین".

**قوم4 qum 4** - "داخ، گەرم": بڕوانە ↑قوماندن qumandın "داخ کردن".

**قوماندار qumandar** [ *qumāndār* ] - "رایەداری لەشکر": قوماندان qumandan یش دەگوترێ. وەرگیراوە لە commandeur (Fr.) و commandant (Fr.) "قوماندار" > *commander (Fr.)* "دەستوور دان، فەرمان دان".

**قوماندن qumandın** [ *qumāndın* ] - "داخ کردن": هەروەها قوم4 qum هەیە بە مانای "داخ، گەرم". خزمە دەگەڵ ↑هاوین hawîn سەر بە ریشەی **< *sem- (IE.)*** "هاوین". ئەم وشەیە لەوانەیە شێوەی کۆنتری ↑کواندن kuwandın بێ. مانای ریشەکەی سەرەوە دەبێ دە بنەڕەتدا

"گەرما، داغی" بووبێ و لەمەوە مانای "هاوین" سەری هەڵدابێ. لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی زستان [زڤستان] بەرهەڤی بکەین کە پێوەندی بە سارد و سڕییەوە هەیە.

**قومبەلە qumbele** [ *qumbala* ] - "نارنجۆک": ئەم وشەیە لە قنبلە qunbala (Arb.) وەرگیراوە. وشە عەرەبییەکە خۆی لە خمپارە xompāre (P.) "هاوەن" وەرگیراوە. ڕەنگە وشە فارسییەکە دە ئەسڵدا *"خمپەرە xampare*"* بووبێ، واتا شتێک کە بە شێوەی کەوانی *دەردەپەڕێ*، بە پێچەوانەی گوللە کە ڕاست دەردەپەڕێ.

**قومری qumrî 1** [ *qumrī* ] - "کۆترەباریکە": قمری qomrī (P.). لەوانەیە پێوەندی بە ↑گمانندن gımandın "خوێندنی کۆتر".

**قومری qumrî 2** [ *qumrī* ] - "داشکەلەم": کلم قمری kalam e qomrī (P.). خزمە دەگەڵ کەمر kemır و ↑کەڤر *kevır* "بەرد". مەبەست کەلەمی ڕەقە.

**قومقومە qumqume** [ *qumquma* ] - "مەتارە": بڕوانە ↑قوم qum 2 "بڕی خواردنەوە" و ↑قوم 3 qum "کووپەڵە". وشەکە دە زمانی فارسیشدا هەیە [قمقمە qomqome (P.) ] و وێ دەچێ لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**قومەش qumeş** [ *qumaş* ] - "توتیل، نەغمە، ڕێگەی بن هەرد": قوموش qumuş و قمیش qımîş یش دەگوترێن. هەروەها قومەشکەن qumeşken هەیە بە مانای "ڕەهەند لێدەر، کەنکەنەچی". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "داپۆشین" دەکەن. هێندێک لەم وشانە لەژێر ↑جامە came دا باس کراون.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ Höhle (G.) "ئەشکەفت" کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێهاڵاندن" و خزمیشە دەگەڵ وشەی "هاڵان" (لێهاڵان)ی کوردی].

**قونار qunar** [ *qunār* ] - "لکەرەز": جگە لەم وشەیە چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە سەر بە گرووپێکن، وەک ↑قنار qınar "چەنگی ئاژەڵ و پەلەوەر"، ↑قونجر qucır "1- چنجرۆک 2- پێکوڵ"، ↑قونچرک qunçırk "سیخورمە". ئە وشانە ئاماژە دەکەن بە "زەقایی و دەرپەڕین و قوت بوونە" و دە پلەیەکی دیکەدا دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑قوتیر *quner* "کوان، دومەڵ".

**قونتار quntar** [ *quntār* ] - "بنار، داوێنی چیا": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "خڕەکە بوون، تۆپەڵە بوون" دەبەخشن. هێندێک لەم وشانە لە ژێر↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ"دا باس کراون. لەم تێڕوانینەوە بناری کێو وەک "قونچک" یان "بنک"ی کێو لەبەر چاو گیراوە، واتا ئەو بەشەی خوارەوە کە خڕەکە و تۆپەڵەیە، بە پێچەوانەی بەشی سەرەوە کە تیژ و دەرپەڕیوە.

**قونتک quntık** - "دۆڵمە": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "خڕەکە بوون، تۆپەڵە بوون" دەبەخشن. هێندێک لەم وشانە لە ژێر↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ"دا باس کراون.

**قونجر(ک) quncır(k)** [ *qunjır(k)* ] - "1- چنجڕووک 2- پێکوڵ": خزمە دەگەڵ ↑قونار qunar "لکەرەز".

**قونچڕ qunçır** [ *qučır* ] - "گیایەکە بە عەرزەوە پان دەبێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑قونچک qunçık "بنک، کوتاییەکی خڕ". لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەو گیایە وەک ئەوانی دیکە بەرز نابێتەوە، بەڵکوو وەک پنچک یان قونچکێک لەسەر عەرز دەمێنێتەوە.

**قونچڕک qunçırk** [ *qunčırk* ] - "سیخوڕمە": خزمە دەگەڵ ↑قونار qunar "لکەرەز".

**قونچک qunçık** [ *qunčık* ] - "بنک، کوتاییەکی خڕ": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قوون *qun*، ↑قوتیرquner، ↑قنج qınc و هتد.

**قونچکە qunçıke** [ *qunčıka* ] - "زیپکە، چینچکە": خزمە دەگەڵ ↑قونچک qunçık "بنک، کوتاییەکی خڕ".

**قوندک qundık** [ *qundık* ] - " کوولەکە": خزمە دەگەڵ ↑قۆنداخ qondax .

**قوندە qunde** [ *qunda* ] - "باڵدارێکی کلک کورت": خزمە دەگەڵ ↑قنج qınc و ↑قۆنداخ qondax و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**قوندیلە qundîle** [ *qundīla* ] - "خونجیلە": خزمە دەگەڵ ↑قۆنداغ qondax و شێوەیەکی دیکە لە ↑خونجیلە xuncîle.

**قونین1 qunîn 1** [ *qunīn* ] - "خەرامان رۆیشتنی کەو و کۆتر": قونان qunan ش دەگوترێ. بڕوانە ↑قۆنە qone.

**قونین2 qunîn 2** [ *qunīn* ] - لەگەڵ پێشگری "هەڵ" بەکار دێ [↑هەڵقونین helqunîn "لەپڕ پەیدا بوون، لەپڕ بەرچاو هاتن": مانای بنەڕەتی وشەکە "(لەپڕ) قوت بوونەوە، سەر وەدەر نان" بووە و گۆڕاتێکی بچووکی بەسەردا هاتووە. خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ"دا باس کراون. ئەم وشانە ئاماژە بە شتی قوت و دەرپەڕیو و سەروەدەرناو دەکەن. لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ "گوز" [گوز و گومبەت] بەرهەڤی بکەین کە ئەویش ئاماژە بە قوت بوونەوەی لە نەکاو دەکا.

**قوتیر quner** [ *quner* ] - "کوان، دومەڵ": گۆنر gonır یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی ئەڵمانی کە ئاماژە دەکەن بە شتی خڕەکە، هەڵمساو، قەڵەو و هەڵتۆقاو، وەک Knorren (G.) "بنەدار، مرۆڤی کورتەبنە، گرێ و گوڵی لە لەش دەرپەڕیو"، Knolle (G.) "کلۆ، بنەگیا"، Knospe (G.) "خونچە"، Knopf (G.) "گرێ" و knoten (G.) "گرێ دان" و هتد. knoll (E.) مانای "زۆپایی، تەپک" دەدا. ئەم وشە ژێرمەنییانە سەر بە گرووپێکن کە بە دەنگی -kn دەست پێ دەکەن و دە بنچینەدا مانای "خڕ بوون، تۆپەڵەبوون، پێکەوەنووسان، ڕێکگوشران" لە خۆ دەگرن و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *gen- >** "تۆپەڵە بوون، خڕەکە بوون". بە گوێرەی بۆچووتێکی دیکە ریشە هیندوئەورووپییەکە بریتییە لە ریشەی **(IE.) *gnet- >** "گوشین، ڕێککوشین، تۆپەڵە کردن". ئەم دوو ریشەیە دەشێ دە بنەڕەتدا هەر یەک بن و ئەوەی دووەم لەوەی یەکەمەوە پەرەی گرتووە.

دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە بە مانای جۆربەجۆر لەم ریشەوە پەیدا بوون، وەک ↑گنج gınc، ↑قنج qınc، ↑خونچە xunçe، ↑گونجان guncan، ↑کوان kuwan، ↑قونار qunar "لکەرەز"، ↑سنوورچە sınûrçe "چرۆ، لکی تازەدەرهاتوو"، هەروەها ↑قوون qun یان قنگ qıng [زەقایی و دەرپەڕیوی پاشەوە]، ↑قونتار quntar "بنار، داوێنی چیا"، ↑قونتک quntık "دۆڵمە" و هەروەها ↑سندە sınde [سندەگڵ sındegıl] واتا "تۆپەڵەگڵ، گلێکی ڕێکگوشراو"، ↑سنەی sıney "جۆرێک ترێ" و هتد.

**قوێرە wuwere** [ *quwera* ] - "1-دیوی قووڵی جگێ 2- ناوپووک، کلۆر": خزمە دەگەڵ ↑قووڵ qul و دواتر ↑کون *kun*.

**قووپان qupan** [ *qūpān* ] - "رۆچوون، چەمان و قووڵ بوون بە دیوی ناوەدا": خزمە دەگەڵ ↑کون kun. [کۆنتر:کاپن *kapen* *].

**قووت¹ qut** [ *qūt* ] - دەگەڵ "رووت" دێ [رووت و قووت rut u qut]. ئاقووت aqut یش هەیە [پێشگری ئا a + قووت qut]. خزمە دەگەڵ nackt (G.)، nachot (OG.)، naked (E.)، nagán-h (OIn.)، gymnós (Gr.) وەرگیراو لە nymnó، nudus (L.) گشتیان بە مانای "رووت، قووت". وەک دەبینین دە وشە کوردمادییەکەدا فۆتیمی n لە سەرەتای وشەکەدا سواوەتەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***nog-* (IE)** > "رووت، قووت". لە وشەی ↑نەخت next [نەخت و پوخت]دا فۆنێمی n پارێزراوە. "نەخت" یان "نەغد" مانای "رووت" دەدا و شێوەی کۆنتری "قووت"ە، "پوخت" مانای "پاک، پاککراو" دەدا.

**قووت² qut** [ *qūt* ] - قووت دان واتا "بەگەروودا بردنەخوار". قورت qurt یش دەگوترێ. قورت qūrt (P.). دە هێندێک زاراوەی زمانی کوردمادیدا فۆتیمی r سواوەتەوە. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قورگ qurıg، ↑گەروو geru، ↑قووڕاندن qurandın [هەڵقووڕاندن] و ↑خواردن xuwardın و چەند وشەیەکی دیکە.

**قووتە qute** [ *qūta* ] - "1- بن ئاو کەوتن 2- قوڵکە": خزمە دەگەڵ گوداڵ goudal (P) "قوڵکە". دواجار خزمە دەگەڵ ↑قوڵکە qulke و ↑*کون kun*.

**قووچ quç** [ *qūč* ] - "بڵندی مەخرووتی": قووچکە quçke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قۆچ qoç "شاخی ئاژەڵ" و دواتر دەگەڵ ↑*گۆشە goşe*.

**قووچان1 quçan** [ *qūčān* ] - "وێکهاتن، چکۆڵە بوونەوە": خزمە دەگەڵ ↑گچکە gıçke "چکۆڵە" [کوچک kūčak (P.)]. بنەوشەی گچ -gıç- بە مانای "کەم، چووک"ە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کز kız.

**قووچان2 quçan** [ *qūčān* ] - "ناوی شارێکی کوردنشین لە کوردستانی خۆرهەڵات": ئەم ناوە لە وشەی کۆچ و ↑کۆچان koçan ەوە هاتووە. ئەو شارە، یەکێک لەو شارانەیە کە کوردە کۆچپێنراوەکانی سەردەمی سەفەوییەکان لەوێ نیشتەجێ کراون.

[تێبینی: "کوردستانی خۆرهەڵات" جیایە لە "خۆرهەڵاتی کوردستان" کە بەشێکە لە خاکی کوردستانی مەزن. کوردستانی خۆرهەڵات ئەو خاکەیە کە بەشێکی زۆری نەتەوەی کورد لە چوارسەد ساڵ بەرەوە لەوێ نیشتەجێیە].

**قووچەکە quçeke** [ *qūčaka* ] - "قامکەوانەیەکی شێوە مەخرووتییە لە کاتی درووماندا دە قامک دەکرێ". بڕوانە ↑قووچ quç "بڵندی مەخرووتی".

**قووڕاندن¹ qurandın** [ *qūrāndın* ] - "دەنگێ لێ هەستانی سک لە برسان": بنەوشەی قووڕە -qure دەشێ پێوەندی بە یەک لەم دوو وشانەوە هەبێ:

1- ↑قورگ qurg سەر بە ریشەیەک کە دواجار مانای "خواردن" دەدا. [دە زمانی فارسیدا کاتێک کە مرۆڤ زۆر برسی بێ، دەبێژن "ریخۆڵە گەورەکە ریخۆڵە چکۆڵەکە دەخوا"].

2 - ↑قرە qıre [قیرە qîre] سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەنگی وشک لێ بڵند بوون".

**قووڕاندن² qurandın** [ *qūrāndın* ] - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ، هەڵقووڕاندن یان هەڵقوڕاندن واتا بە پەڵە خواردن (ەوە)". خزمە دەگەڵ ↑قورگ qurıg.

**قووز quz** [ *qūz* ] - "جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە، کەوڵی زۆر بەنرخە": خزمە دەگەڵ ↑خەز xez.

**قووزە quze** [ *qūza* ] - "دەنگی درێژی سەگ": کووزکووز kuzkuz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje.

**قووزی quzî** [ *qūzī* ] - "چولگە و بیابان": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑خاوس xaws "رووت".

قووقاندن **qûqandın** *[ qūqāndın ]* - "خوێندنی کەڵەباب": خزمە دەگەڵ قوقلی قوقو qūqlīqūqū (P.) و kikeriki (G.). هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ kichern (G.)، kacházein (Gr.) "قاقا لێدان"، kákhati (OIn.) "پێ دەکەنێ" و ↑قاقا qaqa. وێ دەچێ هەموو ئەم وشانە دواجار خزم بن.

قووڵ **qul** *[ qūl ]* - "ڕۆچوو، قووپاو، چاڵ کراو": قوور qur یش دەگوترێ. دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا شێوە کۆنترەکەی ماوەتەوە کە دەبێتە ↑کوور kur. خزمە دەگەڵ ↑گۆڕ gor و چەندین وشەیەکی دیکە وەک ↑گەور gewır، ↑خەپر xepır، ↑گەبەڵ gebel "زەلکاو"، ↑گۆل gol و هتد. دە زمانی پەهلەویدا zufr (Pl.) و jafra (Av.) بە مانای "قووڵ" بەکار هاتوون. وشەکە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کون *kun*. دە زمانی فارسیدا قووڵ یان کوور دەبێتە گود goud (P.). ئەم وشە فارسییەش خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و هەموویان دەچنەوە سەر بنەڕەتێکی هاوبەش. دە زمانی فارسیدا هەروەها ژرف žarf (P.) "قووڵ" هەیە کە پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە و فوتیمەکان تێیدا جێگۆڕکێیان کردووە، کۆنتر "ژەفر" بووە. وشەی دەفر defır "جام، قاپ" بە شیمانەیەکی بەهێز دەگەڵ ئەم وشانە خزمە و ئاماژە بە قووڵ بوون دەکا. دە زمانی عەرەبیدا ظرف zarf (Arb.) دەچێتەوە سەر وشەکەی فارسی تازە، واتا ژرف žarf (P.) "قووڵ".

[تێبینی: سەبارەت بە ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکان، ئەم وشەیە بەرهەڤ بکە دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە وەک زۆر zor کە دە بنچینەدا زاڤەر zaver بووە. هەروەها زوور zur کە شێوە کۆنترەکەی، واتا زبر zıbır ئێستاش دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بەکار دێ].

قوولاندن **qulandın** *[ qūlāndın ]* - "هەرا کردن": سەر بە ریشەی **< *gol-* (*IE.*)** "دەنگ، بانگ" و دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گاڵ gal [گڕ و گاڵ].

قووم **qum** *[ qūm ]* - "لم، زیخی زۆر ورد": هەروەها قوومەڵان qumelan هەیە بە مانای "جێگەی لمی زۆر". خزمە دەگەڵ humus (L.) "هەرد، خۆڵ"، chamaí (Gr.) "لەسەر هەرد، بەرەو هەرد"، homo (L.) "مرۆڤ" [دە بنەڕەتدا: بوونەوەری خاکی، بوونەوەری سەر هەرد]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زاوا *zawa* کە ئەویش ناوێکی کۆنە بۆ مێر یان مرۆڤ. هەر لەم پێوەندییەدا وشەی ↑خومخۆرک xumxork یش سەرنج رادەکێشێ بە مانای "قەڵشی هەردە".

قوون **qun** *[ qūn ]* - "پاشەڵ": قونگ qung، قنگ qıng، کوون kun، کونگ kung و کنگ kıng یش دەگوترێن. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا نە مانایەکی ناشیرنی هەیە و نە هیچ پێوەندییەکی بە "کون" [کون و کەلێن] هەیە، بەڵکوو وەک هەموو وشەکانی دیکە وشەیەکی ئاساییە و مانایەکەی دە بنەڕەتدا بێلایەن بووە، پاشان وردەوردە مانا ڕاستەکەی لەبیر چۆتەوە و مانایەکی "خراپ" یان "ناحەز"ی بە بەردا کراوە! خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قوتیر *quner* "کوان"دا باس کران و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خڕایی، زۆپایی، تۆپەڵە بوون". دە زمانی فارسیدا کون kūn (P.) بە مانای قوون بە کار دێ و کوونە kūne (P.) بە مانای "قونچک، بەشی خڕ یان دواوە یان بنەوە" وەک قونچکە جگەرە، قونچکی پیواز و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ ئەم مانایە وشەی Knolle (G.) بەکار دێ کە دەبێتە خزم دەگەڵ "قوون" و دەگەڵ چەندین وشەی ئاڵمانی بە دەنگی -kn دەست پێ دەکەن و دواجار دەچنەوە سەر ریشەی **< *gen-* (*IE.*)** "تۆپەڵە بوون، خڕەکە بوون، ڕێکگوشران". بەم جۆرە "قوون"، واتا بەشی دەرپەڕیوی پاشەوەی لەش، بە هۆی زۆپایی، قوت بوون و تۆپەڵە بوونەکەی ئەم ناوەی پێ

دراوە. دە پلەیەکی دوورتردا وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گۆنا gona، ↑چەنە çene، ↑گونتک guntık و لەوانەشە ↑گون gun.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دە زمانی ئەڵمانیدا دەگەڵ وشەی Arsch (G.) "قوون" کە دواجار دەچێتەوە سەر ریشەی *oros-* (*IE.*) "تەپە، تەپک، گۆپک، زۆپک". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ "هەرزاڵ"ی کوردمادی].

**قوونەبان quneban** [ *qūnabān* ] - "راپەڕ، لە دەست هاتن": [قوونەبانی ئەوەندەی نییە جێگاکەی خۆی هەڵگرێ یان دەگوترێ "قوونەبانی ئەوکارەی نییە، واتا ئەو کارەی لە دەست نایە"]. بە ورد بوونەوە لەم وشە و ماناکەی دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە ناتوانێ پێوەندی بە "قوون"ەوە هەبێ، چونکوو هیچ پێوەندییەک لە تێوان ئەم دوو چەمکەدا بەدی ناکرێ. لە لایەکی دیکەوە کەرتی "بان" چییە کە چووەتە سەر وشەکەوە و لێکدرانی ئەم دوو وشەیە بۆچی ئەم مانایە دەدا؟ کەوابوو وشەکە دەبێ شتێکی دیکە بێ. بەر لە درێژە دانی باسەکە پێویستە کەوانەیەک بکەینەوە:

[دە زمانی کوردمادیدا وشەی *کارین* "توانین" پێوەندی بە *خار* "سەخت" و *خورت* "بەهێز"ەوە هەیە و تێکڕای ئەم وشانەش خزمن دەگەڵ kratos (Gr.) "هێز، دەسەڵات" و kratein (Gr.) "زاڵ بوون، دەسەڵاتدار بوون"، واتا لەتێوان چەمکەکانی "سەخت"، "هێز" (بەهێز بوون)، "توانین" و "دەسەڵات هەبوون و زاڵ بوون"دا پێوەندی لەئارا دایە. نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە: walten (G.)، wealdan (OE.)، waldan (Gt.) "دەسەڵات بەسەردا هەبوون، بەسەردا زاڵ بوون، بەڕێوە بردن"، Gewalt (G.)، (gi)walt (OG.)، geweld (Nl.)، (ge)weald (OE.)، vald (Sw.) "دەسەڵات، زەبر و زەنگ، زاڵ بوون"، vladet (Rus.) "زاڵ بوون، دەست بەسەردا گرتن"، vladyti (Lit.) "فەرمانڕەوایی کردن" دەچنەوە سەر ریشەی < **ual-* (*IE.*) "سەخت بوون، پتەو بوون" و دەبنە خزم دەگەڵ valere (L.) "پتەو بوون، بەهێز بوون" و پاڵەوان palewan ی کوردی. وەک دەردەکەوێ لەم نموونەی دواییشدا گشت وشەکان لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "سەخت، پتەو". ئەم وشانەی دوایی خزمن هەروەها دەگەڵ "پاڵ"ی کوردی بە مانای "گوشار، زەبر، زەخت" (پاڵ پێوەنان واتا بەکار هێنانی زەخت و گوشار). دە زمانی کوردمادیدا هەروەها "زات" کردن یان "زات" هەبوون هەیە بە مانای "وێران، هێز پێ شکان" کە ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ئەستێ یان هەستی بە مانای "بەرد، رەق، کرۆک" واتا لێرەشدا دیسان پێوەندی "سەخت" و "هێزدار بوون" دەردەکەوێ].

ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وشەی "قوونەبان"، بەو ئەنجامە دەگەین کە وشەکە دەبێ دە بنەڕەتدا یەکێک لەم مانایانای خوارەوەی هەبێ کە پێوەندییان بە باسەکەوە هەیە: سەخت، زەخت، هێز، پاڵ، گوشار. هەموو ئەم مانایانە لەپێوەندی دەگەڵ یەکتر دان. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم مانایانە وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑قنب qınb "گوشینگەی لەدار بۆ پلیخاندنەوەی ترێ" و خزمە دەگەڵ knapp (G.)، knap(p) (Nl.) و hneppr (OIs.) "کەم، کورت، تەنگ" و hneppa (OIs.) "دە گیر خستن، زەخت کردن، گوشار خستنەسەر". لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان بە kneipen (G.) و kneifen (G.) هەبێ بە مانای "قورینجاندن، گوشین". ↑قەنەفلێ qenefle "سەرتەنگەی پاڵان" دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە "قوونەبان" دەشێ وشەیەک (کردارێکی کۆن) بێ کە مانایەکی وەک "خاوەنی سەختی، قورسی، گوشار، پاڵ" بدا. لەسەر ئەم بنەمایە دواتر بە کەسێک کە لێهاتوو و بە توانا و شێلگیر بووە (شێلان واتا گوشار دان، زەخت و پاڵ بەکار هێنان)، گوتراوە "قوونەبانی" هەیە و پێچەوانەی ئەو کەسەش پێ

گوتراوە "قوونەبانی نییە". دەشێ وەك چەندین وشەی دیکە "قوونەبان" خۆی لە کۆندا کردارێك بووبێ و دواتر دەوری خۆی وەك کردار لە دەست دابێ. لەم بارەوە هەڵیسەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ "قارەمان". لە درێژەی ئەم باسەدا شتێکی دیکەش جێی ئاماژەیە. کاتێك ئێمە منداڵ بوون، لە ناو منداڵاندا دەگوترا ئەگەر قوونت هەیە، ئەو کارە بکە، یان دەگوترا تۆ قوونی (کردنی) فڵانە شتت نییە. وابزانم دە زمانی ئاخافتنی فارسیشدا دەگوترێ "اگر کونوشو داری...". لەوەدەچێ وشەی "قوون" لەم رستانەدا پێوەندی بە باسەکەی سەرەوە هەبێ و بە مانای "زەخت و توانایی" بەکار هاتبێ، چونکوو بە هەر بارێکی دیکەدا لێکی بدەینەوە، قوون ناتوانێ نیشانەی "هێز و ئازایەتی" بێ!

قۆپ **qop** - "پشت کووڕ": خزمە دەگەڵ↑ قوب qub.

قۆپچە **qopçe** [*qopča*] - "دوگمە": خزمە دەگەڵ ↑قوب qub.

قۆپز **qopız** - "شات و شووتکەر، خۆهەڵکێش": قۆپ + ز qop + ız . کەرتی دووهەم پاشگری ئاوەڵناوە لە دۆخی جەخت کردندا. بنەوشەی قۆپ خزمە دەگەڵ ↑گەپ gep و ژمارەیەك وشە بە مانای "دەم داپچڕین".

قۆپەن **qopen** [*qopan*] - "پەڵەگیای بڵیند": خزمە دەگەڵ ↑قۆپی qopî "قامیشەڵان".

قۆپی **qopî** [*qopī*] - "زەلکاوی قامیشەڵان": خزمە دەگەڵ ↑قۆپەن qopen "پەڵەگیای بڵیند" و دەگەڵ ops, opis (L.) "هێز، گەشە، توانایی، دەوڵەمەندی" و opulentus (L.) "دەوڵەمەند، زۆر و زەوند"، سەر بە ریشەی ***op-** (IE.) > "جێبەجێ کردن، خەبات کردن". وشەی ↑خەبات xebat لەم ریشەوە هاتووە.

قۆتان **qotan** [*qotān*] - "پێرك، هەرزاڵ": هەروەك چۆن "سەکۆ" لە "زەق" وەرگیراوە، هەرواش قۆتان دەچێتەوە سەر ↑قوت qut "زەق، بلیند، زۆپ".

قۆتر **qotır** - "بارگینی پیری پەککەوتە": هەروەها ↑قۆترە qotre هەیە بە مانای "نیوەغاری نارێك، گورگەلۆقە". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کوتر kutır [شەل و کوتر].

قۆترە **qotre** [*qotra*] - هەیە بە مانای "نیوەغاری نارێك، گورگەلۆقە": خزمە دەگەڵ ↑قۆتر qotır.

قۆتل **qotıl** - "هاوئاوایی، هاوگوندی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ siedeln (G.) "بەجێ کردن، نیشتەجێ کردن"، sedal (OG.)، seđel (OE.) "جێگەی نیشتەجێ بوون"، sidilo (OG.) "جووتیار". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑نیشتن *nîştın* [nî-şıtın] و ↑ساتان satan [سمت و ساتان واتا شوێنی لەسەر دانیشتن] و هتد. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شار şar "باژێر".

قۆتەر **qoter** [*qotar*] - "ئەستوورایی، قوتر": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆتار kotar. وشەی قطر qotr (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

قۆتین **qotîn** [*qotīn*] - "رووت": [سەرقۆتین واتا سەررووت]. ↑قووت qut [رووت و قووت].

قۆچ **qoç** [*qoč*] - "1- شاخی ئاژەڵ 2- بەران": خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑کۆشکە koşke "قەڵاخ"،↑قووچ quç،↑قووچکە quçke "بڵیندی مەخرووتی"، ↑قەڵاقووچکە qelaquçke، ↑کۆچکە koçke، ↑قۆچەقانی qoçeqanî، ↑قووچەکە quçeke، ↑ئەنگوچك enguçk (ە سۆرانی) [قۆچك qoçk یش دەگوترێ] و هتد. گشت ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑گۆشە *goşe* و دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای دەرپەڕین، دەرپەڕاندن، دەرپەڕیو بوون.

**قۆچاخ qoçax** [ *qočāx* ] - "چالاک، خێرا له رۆیشتندا": خزمه دەگەڵ ↑کۆچ koç به مانای "رویشتن، دوورکەوتنەوە" و ↑قوشقی quşqî "رەوەک، سڵ".

**قۆچاغە qoçaġe** [ *qočāġa* ] - "جۆرێک سەربەرهەڵبێنە کە لاقیش دادەپۆشێ": خزمە دەگەڵ ↑کۆش koş. ئەو سەربەرهەڵبێنەیە کۆش دادەپۆشێ و بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە.

**قۆچەقانی qoçeqanî** [ *qočaqānī* ] - "دولک، قاڵماسک": قۆزک qozk یش دەگوترێ. قۆچ + قانی qoç + qanî. کەرتی یەکەم هەمان ↑قۆچ qoç ە بە مانی "شاخی ئاژەڵ، قیتکە". ئەم کەرتەوشەیە ئاماژەیە بە دوو لکی دارەکە کە وەک شاخ [قۆچی] ئاژەڵ قیت بوونەوە. کەرتی دووەم، واتا قانی qanî دەتوانێ:

1- نیشانەی بە کۆ کردنی کان kan- دە زمانی کوردمادیدا [ قۆچەکان ← قۆچەکانی ← قۆچەقانی].

2- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قانک qanık "قۆچەقانی" [دە بنەرەتدا: قامیش، قالۆر، قەڵەمە].

**قۆخ qox** - "پشت چەماو": خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn "چەمانەوە".

**قۆڕ qor** - "کۆزی هەڵپەرکێ": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆڕ kor "کۆی چەند کەسێک لە دەوری یەک".

**قۆڕ1 qor** - "نەخۆشێک رێخۆڵەی کەوتبێ": خزمە دەگەڵ chorde (.Gr) "رێخۆڵە، بەندی لە رێخۆڵە"، žarna (.Lit) "رێخۆڵە، شیلانک، لەوعە"، hernia (.L) "قۆڕ بوون، قۆڕی"، gorn (.OIs) "رێخۆڵە"، midgarni (.OG) "بەز و پیوی ناوسک"، Garn (.G)، garen (.Nl)، yarn (.E)، garn (.Sw). ئەم وشانەی دوایی ناوی بەندێک بووە کە لە رێخۆڵەی هیشککراوی بادراو دروست کراوە.

**قۆڕ2 qor** - "گەوجانە، بێتام، بێجێ": هەروەها ↑کۆڵە[4] kole ش هەیە بە مانای "قسەی بێتام". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ kohl (.G) "قۆڕیات، فشقیات". ریشەی وشە ئەلمانییەکە دەبردرێتەوە سەر qol (.Hibr) "قسە". [قول qawl (.Arb)].

**قۆرت1 qort** - "1- بەرگر، لەمپەر 2- بەند و گرێ [دارەکە سێ قۆرتی تێدایە] 3- بەرزایی کەم": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Hürde (.G) "لەمپەر"، hurde (.OG) "چەپەر، پەرژین" [واتا دیوار و دەرگای لە شووڵ تەندراو]، hyrd (.OE) و haurds (.Gt) و hurd (.OIs) "دەرگا"، kyrtos (.Gr) "قەفەس، سەوەتەی ماسیگری"، cratis (.L) "چەپەر، شتی تەنراو"، سەر بە ریشەی < ***ker-t-** (**IE.**) "با دان، تەنین، تێکخستن، هونینەوە". لەوانەیە ↑گرێ gıre یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**قۆرت2 qort** - "چاڵایی، قوڵکە": وا پێ دەچێ کە دوو وشەی "قۆرت" لە دوو ریشەی جیاوازەوە هەبن کە لەبەر وێکچوونی شێوە و ماناکانیان، تێکەڵ بە یەکدی کرابن. بروانە ↑کۆرت2 kort2.

**قۆرتاندن qortandın** [ *qortāndın* ] - "لێو و لچ گرژ کردن": بنەوشەی قۆرت -qort خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گرژ gırıj، ↑گورج gurc و ↑گورد gurd و هیتر کە ئاماژە بە وێکهاتن و توند بوونی ماسوولکەکان دەکەن.

**قۆرزی qorzî** [ *qorzī* ] - "قۆژبن، گوشە": قورچ qurç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ↑ *قەراخ qerax* و ↑قۆرک qork وچەند وشەیەکی دیکە.

**قۆرقۆرە qorqore** [ *qorqora* ] - "گێزەک، گیف گیفە، مەزرەق": خزمە دەگەڵ ↑غەرغەرە ġerġere [قەرقەرە qerqere].

قۆرک **qork** - "1- پشت ئەستۆ 2- ئێسکی کلێنجە 3- خاڵیگە": بە مانا دووەمەکەی qorg یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەبرخە qebırxe "کەلەلە". گشت ئەم وشان ئاماژە بە قووڵایی و قووپاییەک لە لەشدا دەکەن، واتا شوێنێک کە لەوێدا قووڵاییەک بەدی دەکرێ. هەروەها قوورک qurk یش هەیە بە مانای "پاش پانیە" و ئەویش هەر لەم پێوەندییەدا جێ دەگرێ. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑قولەقاپە quleqape "باریکایی بەلەک".

قۆرە **qore** *[ qora ]* - "بەرسیلە، ترێی نەگەیشتوو": غورە ġūre (P.). دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "رەق" بێ، هەروەک چۆن "کرچ"یش ئەم مانایە دەبەخشێ [کرچ و کاڵ]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ خیرە xīra (P.) "رەق" [خیرەسر، خیرەشدن و ... دە فارسیدا]. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشەی کوردمادی کە لەژێر ↑خار xar "رەق، سەخت"دا باس کراون. کرچ kırç یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

قۆری **qorî** *[ qorī ]* - "چادان": قوری qūrī (P.).

1- لەوانەیە پێوەندی بە وشەی ↑قووڵ qul [کوور kur]ەوە هەبێ. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەندین وشە بە مانای "دەفر" پێوەندییان بە چەمکی "قووڵ"ەوە هەیە.
2- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ calix (L.) "جامی قووڵ".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Topf (G.) "مەنجەڵ" لە tief (G.) "قووڵ" وەرگیراوە و "تاوە"ی خۆشمان دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ].

قۆز **qoz** - "جوانچاک" [جەوانی چاک، دە بنەڕەتدا قیت و قۆز ، باڵابەرز]. وێرای ژمارەیەک وشەی کوردمادی دیکە وەک ↑قوت qut، ↑قیت qît، ↑قەد qed، ↑گەد ged، ↑کۆتەر koter، ↑حووج ĥûc "بوونەوەری ئەفسانەیی زۆر درێژ" دەبێتە خزم دەگەڵ hoh (OG.)، hoch (G.)، hauhs (Gt.)، heah (OE.)، high (E.)، hög (Sw.) و häch (OF.) "بەرز، بڵیند". وشەکە دەگەرێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە". دە بنەڕەتدا مەبەست چەمانەوەی سەر رووبەڕێکی تەخت بووە کە بە هۆیەوە بڵیندایی و زۆپاییەک دروست دەبێ.

قۆزاخە **qozaxe** *[ qozāxa ]* - "شکۆفەی پەمۆ": غوزە ġūze (P.). خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn و ↑قۆز qoz بە مانای "زۆپایی، زەقی، دەرپەڕیوی، کووڕی". قۆزاخە شتێکە کە وا لەسەر لقی دار یان گیا وەک زۆپایی و خڕاییەک سەروەدەر دەنێ و قوت دەبێتەوە.

[تێبینی: لە باری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "خونچە" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خڕ بوون، تۆپەڵ بوون"].

قۆزین1 **qozîn 1** *[ qozīn ]* - "کۆخین": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆخین koxîn.

قۆزین2 **qozîn 2** *[ qozīn ]* - "چەمانەوەی پشت": خزمە دەگەڵ قوز یان گوژ qūz / gūž (P.) "چەماوی، کووڕی". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑قۆف qof و↑قۆغ qoġ "چەماوە، کووڕ"، ↑قۆق qoq و ↑قۆقز qoqız "پشت دەرپەڕیو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە وەک ↑قوت qut، قیت qît و ↑قۆز qoz بە مانای "دەرپەڕیو، هەڵتۆقیو"، گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی **< *keu- (IE.)** "چەمانەوە". ئەم وشەیە دە زمانە هیندو ئەورووپییەکان و لەوانەش زمانی کوردمادیدا بە دەیان لک و پۆپی لێ دەبێتەوە کە ئاماژە دەکەن بە ماناکانی "چەمانەوە، هەڵتۆقین، دەرپەڕین، قیت بوون". Hocke (G.) "گیشەگیا"، Hucke (G.) "کۆڵ، باری سەرپشت"، hocken (G.) و hüka (OIs.) "هەڵترووشکان، چەمانەوە"، Hügel (G.) "تەپۆڵکە"، hoch (G.) "بڵند، قۆز" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

**قۆستنەوە qostınewe** [ *qostınawa* ] - "گرتن (ەوەی خێرا)": قۆزتنەوە qoztınewe و خواستنەوە xuwastınewe ش دەگوترێن. هەروەها دە کوردمادیدا ↑قاپان qapan یش دەگوترێ. قاپیدن qāpīdan (P.)، وشە کوردمادییەکە بێگومان چەند گوڕاتیکی بەسەرداهاتووە. دەتوانین گریمانە بکەین کە شێوەی گۆڕانی وشەکە بەم چەشنە بووبێ: [قەپستن ← قەبستن← قەوستن ← قۆستن ← وەقۆستن ← قۆستنەوە]. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑*قاپان qapan* "رفاندن".

**قۆش qoş** [ *qoš* ] - "خۆیانی گیرە نەکراو": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑هێشوو hêşû، ↑حەشیمەت ĥeşîmet، ↑گیشە gîşe و ↑قۆشەن qoşen. ئەم وشانە ئاماژە بە "زۆر و زەوەندی، پێکەوەیی و پڕ و چڕی" دەکەن.

**قۆشقاب qoşqab** [ *qošqāb* ] - "دەوری چکۆڵە": پێک هاتووە لە دوو بەشی قۆش + قاب qab + qoş. لەم تیڕوانینەوە کەرتی یەکەم دەشێ پێوەندی هەبێ بە وشەی ↑گچکە gıçke "چکۆڵە" [کوچک kūčak (P.)] و مانای وشەکە دەبێتە "قابی چکۆڵە".

[تێبینی: لەباری وشەسازییەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی بشقاب bošqāb (P.) بە مانای "دەوری". وشە فارسییەکە پێک هاتووە لە دوو بەشی qab + boş کە کەرتی دووەم هەمان ↑قاب qab ە کە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای دەفر بەکاردێ. کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا -boş خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە دەکەن بە زۆر و زەوەندی یان فش و فۆڵ و کراوەیی، وەک ↑بۆش boş "زۆر"، ↑فش fış "گوشاد". لەم تیڕوانینەوە وشە فارسییەکە مانای "قاپی کراوە" واتا قاپی پەل دەبەخشێ بۆ جیا کردنەوەی لە قاپی تەنگ و قووڵ].

**قۆشمە qoşme** [ *qošma* ] - "زرنگ و قسەخۆش": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑خۆش xoş.

**قۆشە1 qoşe** [ *qoşa* ] - "خاڵی سپی لە توێڵی ئاژەڵ، ئاژەڵی توێڵ سپی": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe.

**قۆشە2 qoşe** [ *qoşa* ] - "وردەپووڵ": وەرگیراوە لە cash (E.) "نەغد، نەغدینە". ئەم وشەیە هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کاسە kasse "سندووقەڵەی پووڵ تێنان".

**قۆشەن qoşen** [ *qošan* ] - "سوپا، لەشکر": قشون qošūn (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گیشە gîşe "باقەگیای کەڵەکەکراو"، ↑هێشوو hêşû "دەنکی زۆری پێکەوەنووساو"، ↑قۆش qoş "خۆیانی گیرەنەکراو"، ↑گشت gışt "هەموو، وێکڕا" و هتد.

**قۆفر qofır** - "بەرد": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڤر kevır "بەرد".

**قۆق qoq** - "پشت کووڕ": قۆقز qoqız یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn "چەمانەوەی پشت".

**قۆقک qoqık** - "کالانەی چاو، قوڵکەی چاو": هەروەها qoqe هەیە بە مانای "سەتڵی دارین". قۆق qoq دە بنەڕەتدا دەبێ *قەپەک qepek** بووبێ [ قەپەک ← قەپک ← قەبک ← قەوک ← قۆق]. ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە:

1- یان گابار gabar "کون و کەلێن، قوڵکە" و دواتر ↑کون kun.

2- یان ↑قاپ qap "دەفر".

[تێبینی: دە وشەی "قۆقک"دا پاشگری ک ık دووبارە بووەتەوە (قەپەک ← قۆق + ık قۆقک qoqık) بەڵام جارێکیان پاشگری دروست کردنی ناوە و جاری دووەم پاشگری گچکاندنە].

**قۆڵ qol-** "لە ئانیشک بەرەژوور تا شان": خزمە دەگەڵ Keule (G.) کە هەم بە مانای رانی ئاژەڵ و پەڵەوەڕ بەکاردێ و هەمیش بە مانای چوماغ و داری سەرئەستوور. دە زمانی ئاڵمانیدا

G.) Hänchenkeule) دەبێتە "رانەمریشک". لێرەدا دەبینین کە رانی ئاژەڵ دە ئاڵمانیدا یان "قۆڵ"ی ئاژەڵ و مرۆڤ دە کوردمادیدا بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە، چونکوو وەک چوماغ، لایەکی لە لایەکەی دیکەی ئەستوورترە و شێوەیەکی کورتەبنەی هەیە. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کۆڵ kol [پەنجەی کۆڵ].

[تێبینی: "قۆڵ" لە زمانی کوردمادیدا بە مانای "جناح"ی عەرەبی یان "باڵ"ی کوردمادیش دێ].

**قۆڵنج qolınc** [ *qolınj* ] - "ژانی پشت و شان": ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا مانای "ژانەسک" دەبەخشێ و دەبێ مانای ئەسڵی وشەکەس هەر ئەمە بێ و دواتر دە زمانی کوردمادیدا گۆڕابێ. وشەکە دەبێ بچێتەوە سەر Gr.) kolike) "ژانی ریخۆڵە"، سەر بە > *Gr.) kolon)* "ریخۆڵە گەورە".

**قۆلە qole** [ *qola* ] - "گوێل، گوێر، قولاج، قولانج": شێوەیەکی دیکە لە ↑گوێل guwel. هەموو ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑قوول qul ەوە هەیە و دواجار خزمن دەگەڵ ↑کون *kun*.

**قۆڵە qole** [ *qola* ] - دەگەڵ "قەرز" دێ [قەرز و قۆڵە qerz u qole: ماڵەکەم هەمووی بوو بە قەرز و قۆڵە]. قۆڵە هەمان قەواڵە qewale یان ↑قەباڵە qebale یە کە دە بنەڕەتدا بە "بەڵگەی نووسراو" گوتراوە. کەوابوو مەبەست لە "قۆڵە" ئەو بەڵگە (کاغەزە)یە کە قەرزەکەی تێدا راگیر کراوە.

**قۆماندن qomandın** [ *qomāndn* ] - "شێواندن، ئاژاوە نانەوە": خزمە دەگەڵ جماندن cımandın [↑جمین cımîn "بزوان"].

**قۆمرغانە qomırġane** [ *qomırġāna* ] - ئەم وشەیە لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "کۆڕی پڕ لە هەرا و هوریا" مانا کراوەتەوە. کەرتی یەکەمی وشەکە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ G.) Kammer)، Nl.) kamer) "دیو، وەتاخ، دیوەلکە"، L.) camera) "دیوی تاقدار" > *Gr.) kamárā)* "دیوەلکە، ئەنبار". کەرتی دووەم دەشێ هەمان خانە xane بێ [↑خانوو xanu].

**قۆمک qomk** - "کەشکەژنۆ": بنجەوشەی قۆم -qom شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قوم3 qum "دەفر". لە وشەی "کەشکەژنۆ"شدا کەرتی "کەشک" خزمە دەگەڵ "کاسە" و مەبەست "کاسەی ئەژنۆ"یە.

**قۆناخ qonax** [ *qonāx* ] - "مەرحەلە": ئەم وشەیە وێ دەچێ وەک وشەی عەرەبی منزل manzil دروست کرابێ. [قۆناخ بە قۆناخ واتا مەنزڵ بە مەنزڵ]. وشە عەرەبییەکە دەچێتەوە سەر وشەیەک بە مانای "هاتنەخوار". "قۆناخ"ی کوردمادیش دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەوتن kewtın. لەم تێڕوانینەوە قۆناخ دەبێتە ئەو شوێنە کە مرۆڤ لە کاتی رێگە بڕیندا لەوێ لێی دەکەوێ یان پاڵ دەکەوێ و دەحەسێتەوە. ئەگەر ئەم شیمانەیە راست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کۆن kon و ↑کەوتن kewtın. بەم پێیە گۆڕانی وشەکە شتێکی بەم جۆرە بووە: کەپناک ← کەوناک ← کۆناک ← قۆناخ.

**قۆنداخ qondax** [ *qondāx* ] - "منداڵی بابۆڵە پێچ 2- قووندی تفەنگ": قۆنداغ qondaġ یش دەگوترێ. قنداق P.) qondāq). ئەم وشەیە و چەند وشەیەکی دیکە ئاماژە بە چەمکی "خڕایی، زۆپایی، بنک [یان سەلک] بوون، کورتەبنە بوون" دەکەن، وەک ↑قوندە qunde "باڵدارێکی کلک کورت"، ↑قوندیلە qundîle "خونچیلە"، ↑قوندک qundık "کوولەکە"، ↑قوون qun یان قنگ qıng "بەشی خڕ و زۆپی پاشەوە"، ↑قونچک qunçık "بنک یان خڕەکەی چکۆڵە" و چەند وشەیەکی دیکە کە ژێر وشەی ↑قنج qınc و ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ"دا باس کراون.

**قۆندەرە qondere** [ *qondara* ] - "پێڵاو(ی پاژنەدار)": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑قنج qınc "1- راست، رەپ، زۆپ، قیت 2- جوان"، ↑قوتیر*quner* "دومەڵ [خڕایی و

گرێی سەر پێست]"، ↑خونچە xunçe [گوڵی خڕەوەبوو، نەکراوە، ڕێکگوشراو، تۆپەڵە بوو]، ↑گنج gınc [دە بنەڕەتدا ڕێکگوشران و خڕبوونەوەی شتی شەق]، ↑قونچک qunçık "بنە، کۆتاییەکی خڕ"، ↑قنچکەسڵاو qınçkesılaw "باپشکێو"، ↑قونار qunar "لکەرەز"، ↑قۆنداخ qondaġ "1- منداڵی بابۆڵە پێچ 2- قوونی تفەنگ"، ↑قوون qun "خرایی و زۆپایی پاشەوە"، ↑قوندک qundık "کوولەکە"، ↑کوان kuwan "دومەڵ"، ↑کوند kund " کوندەبەبۆ" و هتد. ئەم وشانە بەگشتی مانای "خڕەکە بوون، زەق و زۆپ بوون، بنک [یان سەلک] بوون، کورتەبنە بوون" لە خۆ دەگرن. بەم پێیە قۆندەرە ئەم پێڵاوەیە کە بنەکەی دەرپەڕیوە و زەق بۆتەوە واتا پانییەکی بڕێک بڵیند لە بنەکەی دراوە. دیارە پێشتر بنی پێڵاوەکان ساف و تەخت بووە و پاش ئەوەی پانییەی پێڵاوەکان زەق و بەرز کراوە، ناوی قۆندەرەی لێ نراوە. وشەکە دەبێ دە بنەڕەتدا "قۆندار"ە [ قووندار] بووبێ واتا ئاماژە کرابێ بەوەی کە پێڵاوەکە "قۆن" [قوون]ی هەیە بۆ جیا کردنەوەی لە پێڵاوی "بێ قوون"! واتا پێڵاوی ساف و تەخت. دیارە وشەی "قوون" پێشتر مانایەکی گشتی هەبووە و بۆ هەموو ئەو شتانە بەکار هاتووە کە شێوەیەکی زەق و خڕەکە و تۆپەڵەیان هەبووە.

**قۆنە qone** *[ qona ]* - "1- خەرامان ڕۆیشتنی کەو و کۆتر 2- لەشگرانی و تەمبەڵی": قنە qıne ش دەگوترێ. هەروەها کرداری ↑قونین qunîn [یان قونان qunan] هەیە بە مانای "خەرامان ڕۆیشتنی کەو و کۆتر". ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ڕیشەی **(IE.) *suen- <** "چەمینەوە، جوولانەوە، خولانەوە". دە زمانی کوردمادیدا ↑جمین cımîn [جڤین² cıwîn] و هەروەها ↑چمە çıme "کلک" و ↑سەما sema "ڕەقس" لەم ڕیشەوە هاتوون. ناوی "چمە" [دم، دووڤ] لەبەر ئەوە بۆ کلک دانراوە، چونکوو کلک بەم لا و ئەو لادا دەجووڵێتەوە. ئەم دۆخە لە خەرامان ڕۆیشتنی کەو و کۆتریشدا بەدی دەکرێ. مانای دووەمی "قۆنە کردن" دەبێ لە مانای یەکەمەوە وەرگیرابێ. قۆنە کردنی کەو و کۆتر ڕۆیشتنێکی لەسەرەخۆ و هێواشە و هەر بۆیەش بە لەسەرەخۆیی زۆر و دواخستنی کار گوتراوە "قۆنەقۆن کردن".

**قەبارە qebare** *[ qabāra ]* - "بارست، حەجم": ئەم وشەیە هێندێک جار وەک capacitas (L.) وەرگێڕدراوەتەوە کە لە بنجی -cap "گرتن" وەرگیراوە و مەبەست دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بەو ئەندازەیە یاخود ئەو حەجمەیە کە دە ناو دەفرێکدا [دە ناو *قاپێکدا*] جێ دەگرێ، واتا زەرفییەت "دەفرایەتی، قاپایەتی". بەڵام ئەمە لێکدانەوەیەکی ڕاست نییە. ئەم وشەیە بە وێنەی ↑قەوارە qeware ش دەبیندرێ، بە مانای "هەیکەل، بەدەن، قەڵافەت" [قەد و قەوارە، یان قەد و قەڵافەت]. وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ، وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "ئەستوورایی" دەکا. "قەد" ئاماژە بە باڵا و بڵیندی دەکا و "قەوارە"ش ئاماژە بە "ئەستوورایی، قوتر، قەف" دەکا. وشەی "قەڵافەت"یش بە هەمان شێوەیە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "کولفت" [کولوفت] "ئەستوور". هەروەها وشەی ↑قەف qef کە پێوەندی بە "قەبارە، قەوارە"وە هەیە، ئاماژە بە "ئەستوورایی" دەکا. ئێستا پرسیار ئەمەیە کە وشەکە لە چیڕا هاتووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑گیپاڵ gîpal [گەد و گیپاڵ، قەد و گیپاڵ] و ↑گیپەرە gepere [گوێپەرە] "ئەستوورایی". لەم مانایەوە دواتر مانای "هەیکەل، پێکهاتە" سەرچاوەی گرتووە، وەک چۆن دەبێژن "قەوارەیەکی نەتەوەیی".

[تێبینی: هەم وشەی "قەد" کە ئاماژە بە باڵا و بڵیندی پێکهاتەیەک دەکا و هەمیش وشەی "قەوارە" کە ئاماژە بە ئەستوورایی پێکهاتەیەک دەکا، خۆیان مانای "هەیکەل، پێکهاتە"یان وەرگرتووە، بۆ وێنە وشەی *کۆتەل* "هەیکەل، پەیکەر" دەچێتەوە سەر "قەد"].

قەباڵە **qebale** ⌊ *qabāla* ⌋ - "سەنەدی خاوەندارێتی، تاپۆ": شێوەیەکی دیکە لە قەواڵە qewale و ↑کەواڵ2 kewal "1- پێستی مار2- قەباڵە".

قەبانجەڕە **qebancere** ⌊ *qabānjara* ⌋ - "بنەدیزە و گۆزەی لە توول چنراو": وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی قەبان qeban + ↑جەڕە cere "گۆزەی زل". کەرتی "قەبان" خزمە دەگەڵ ↑هەبانە hebane "کووپەڵە و جەڕەی بێ دەسک" [دە بنەڕەتدا: دەفر]. بەم شێوەیە مانای وشەکە دەبێتە "دەفر یان قاپی (ژێرەوەی) جەڕە".

قەبرخە **qebırxe** ⌊ *qabırxa* ⌋ - "کەلەکە، خاڵیگە": قەبرغە qebırġe ش دەگوترێ. قەبر + خە qebır + xe. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "تهیگاه" واتا "شوێنی بەتاڵ". ئەم شوێنەی لەش کە دەکەوێتە نێوان ئێسکی پەراسووەکان و ئێسکی سمت بەتاڵایی یان قوڵاییەک بە خۆیەوە دەبینێ، واتا لەچاو ئەو دوو بەشەی سەرەوە و خوارەوەتر قووپاوە و دە قووڵ دایە. هەر بۆیە پێی دەگوترێ "خاڵیگە". کەرتەوشەی قەبر -qebır لە قەبرخە qebırxe دا شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی ↑قووڵ qul یان کوور kur. کەوابوو "قەبرخە" هەروەک "خاڵیگە" دروست کراوە و هەر ئەو مانایەش دەبەخشێ. ئەم کەرتەوشەیە خزمیشە دەگەڵ قەبر qebır یان ↑گۆڕ[1] gor. بەڵام وشەی قەبرخە لە وشەی "قەبر" [بە مانای گۆڕ] وەرنەگیراوە. لەوانەیە وا بیر بکرێتەوە کە مردوو چونکوو بە دابی ئیسلامەتی لەسەر کەلەکە دە قەبر دەنرێ، بۆیە بەو شوێنەی لەش گوتراوە "قەبرخە"، بەڵام پێشتریش کە مردوویان لەسەر پشت دە قەبر ناوە، تەنانەت پێش دە قەبر نانی مردووکانیش ناوی ئەو شوێنە هەر "خاڵیگە" یان "قەبرخە" بووە، واتا "شوێنی قووڵ و قووپاو" نەک شوێنی (خستنە) قەبرەوە.

قەبڵاندن **qeblandın** ⌊ *qablāndın* ⌋ - "نرخاندن، بەراورد کردن": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خەمڵاندن xemlandın.

قەبۆ **qebo** ⌊ *qabo* ⌋ - "قاسپە، خۆێندنی کەو": قەبقەب qebqeb یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قف qıf "کۆخە، کۆکە" و دەگەڵ ↑گەپین gepîn "حەپین، وەڕین".

قەبە **qebe** ⌊ *qaba* ⌋ - "زل، ئەستوور": قەپە qepe، قەپ qep و گەپ[2] gep یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خەپە xepe.

قەبەس **qebes** ⌊ *qabas* ⌋ - "درشتەی لە گیرەدا نەهاڕدراو": دەچێتەوە سەر ↑قەبە qebe و دەگەڵ ↑خەپە xepe.

قەبین **qebîn** ⌊ *qabīn* ⌋ - "خوێندنی کەو": خزمە دەگەڵ ↑حەپین ħapīn [گەپین gepîn]، حەپەی سەگ] کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زار داپچڕین، کردنەوەی دەم". هەروەها بڕوانە ↑قەبۆ qebo.

قەپ **qep** ⌊ *qap* ⌋ - "گاز لێدان بە ددان": ↑قاپ qap و ↑قەپاڵ qepal یش دەگوترێ. بنەوشەی قەپ qep خزمە دەگەڵ gaftan (Pl.)، gape (E.)، gapa (ON.)، gapen (MNl.) و gaffen (MG.) "دەم ئاوەلا کردن، دەم داپچڕین"، سەر بە ریشەی **< *ĝebh- / *ĝeph- *(IE.)*** "دەم، شەویلکە، خواردن، دەم داپچڕین". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گاپن gapın "نەوسن، زۆرخۆر" [دە بنەڕەتدا واتا کەسێک بەردەوام دەمی بۆ خواردن داپچڕیوە]، ↑حەبیشاندن ħepîşandın "خواردن بە هەڵپە و لەز"، هەروەها لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کەپۆ kepo و ↑زار zar [دە بنەڕەتدا زافەر *zafer*]. هێندێک وشەی دیکە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑گەپ gep "گاڵتە"، ↑گەف gaf "هەرەشە" [زار داپچڕین، ددان نیشان دان بۆ ترساندن]، ↑حەپە

ħapa"وەڕین"، ↑حەپەسان ħapasān یان عەبەسان ebesan "سەرسوڕمان" [زار داپچڕین بە هۆی سەرسوڕمانەوە] و هتد.

**قەپات qepat** [ *qapāt* ] - "بەستراو، داخراو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە↑قەپاخ qepax.

**قەپاخ qepax** [ *qapāx* ] - "سەر یاخود سەرپۆشی قاب و قاچاخ": خزمە دەگەڵ caput (L.)، haupit (Gr.)، Haupt (G.)، huvud (Sw.) و head (E.) "سەر". جێی لێکۆلینەوە کە ئایا وشەی قەپات qepat کردن بە مانای "بەستن، داخستن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە یان نا. لەوانەیە "قەپات کردن" دە بنەڕەتدا بە مانای "سەرنانەوە، سەرپۆش لەسەر دانان" بووبێ و دواتر ماناکەی گۆڕابێ. ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***kap-** (*IE.*) "گرتن". وشەکە کۆنتر بە مانای "قاپ qap[1]" بووە و لەمەوە مانای "کاسەی سەر" و دواتریش مانای "سەر" پەرەی گرتووە.

**قەپاڵ qepal** [ *qapāl* ] - قەپاڵ لێدان واتا "گاز لێدان، بە ددان لێکردنەوە": ↑قەپ + ئاڵ qep + al. کەرتی دووەم پاشگری بە ناوکردنە، وەک بۆ وێنە لە وشەکانی گۆپاڵ، سیپاڵ، ریچاڵ، تۆژاڵ و هیتردا دەبیندرێ.

**قەپان qepan** [ *qapān* ] - "تەرازووی زل": قەپان جۆرێکە لە تەرازوو کە بارێکی زل لە عەرز بەرز دەکاتەوە و وەزنی دەکا. هەروەها لە شکەنجەگاکان، بەتایبەتی لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا جۆرێک شکەنجەی زۆر پڕئازار هەیە کە پێی دەگوترێ "دستبند قپانی" [دەستبەندی قەپانی destbendî qepanî]. لەم شکەنجە کردنەدا دەستەکانی زیندانیی سیاسی راست و چەپ لە پشتەوەڕا کەلەپچە دەکرێ، دەستە بەستراوەکانی پەتی تێ دەکرێ و بە دەست پەتکراوی هەڵدەواسرێ. بەم جۆرە هەموو قورسایی لەش دەکەوێتە سەر ئێسکەکانی دەست و شان و مل و زیندانی ئێش و ئازارێکی لە رادەبەدەر دەکێشێ. وەک دەبینرێ لێرەشدا هەروەک قەپان کردنی بار و کەل و پەل، زیندانی بەرز دەکرێتەوە و هەڵدەواسرێ. دیارە لێرەدا "قەپان کردن" بۆ وەزن کردن و فرۆشتن نییە، بەڵکوو بۆ دان پێدانان بەو شتانەیە کە ئەشکەنجەگەر دەخوازێ! کەوابوو چەمکی هاوبەش لە هەردوو جۆری قەپان کردندا بەرز کردنەوەیە. بەم پێیە "قەپان" دەشێ خزم بێ دەگەڵ heben (G.)، heffann (OG.)، heave (E.)، häva (Sw.) "بەرز کردنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ capere (L.) "گرتن، هەڵگرتن، وەرگرتن"، سەر بە ریشەی < ***kap-** (*IE.*) "گرتن". ژمارەگەلێک وشەی کوردی لەم ریشەوە هاتوون، وەک هەبانە hebane و بە شیمانەیەکی بەهێز ↑قاپ qap "دەفر"، ↑قەپیلک qepîlk "قالب، قاوغ" و هتد.

**قەپۆ qepo** [ *qapo* ] - "چەمۆڵە، پووکاوڵە": خزمە دەگەڵ ↑چەپۆک çepok و ↑چەپڵە çeple و چەند وشەیەکی دیکە دە بنەڕەتدا بە مانای "دەست".

**قەپۆز qepoz** [ *qapoz* ] - "دەم و لێو": دە بنەڕەتدا دەبێ پێک هاتبێ لە قەپ + پۆز qep + poz. قەپ پێوەندی هەیە بە ↑کەپۆ kepo. بۆ کەرتەوشەی دووەم بروانە ↑پۆز1 poz 1 "دەم و لووتی ئاژەڵ".

**قەپیلک qepîlk** [ *qapīlk* ] - "قالب، قاوغ": قەپ + ئیلک qep + îlk. خزمە دەگەڵ ↑قاپ[1] qap "دەفر".

**قەتا1 qeta 1** [ *qatā* ] - "1-ریپۆق 2- ریخەخۆرە": خزمە دەگەڵ shit (E.)، skita (Sw.) "ریان". ئەم وشانە خزمن هەروەها ↑جودا cuda و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جیا بوونەوە، لێبوونەوە، لێک بوونەوە، لەت بوون". مەبەست لەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە

بە جیابوونەوەی پیسایی لە لەش بووە، واتا ئەو پیسایییانە وەک شتێک کە لە لەش جیا دەبێتەوە، لەبەر چاو گیراون.

**قەتا2 qeta** [ *qatā* ] - "خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە، تەتەڵە کردن": خزمە دەگەڵ ↑قەتا1 qeta سەر بە ریشەیەک بە مانای "جیا بوونەوە، لێبوونەوە، لێک بوونەوە، لەت بوون". مەبەست لە قەتا کردنی دانەوێڵە بریتییە لە جیا کردنەوەی دان لە پووش.

**قەتار1 qetar** [ *qatār* ] - "هەوای گۆرانیکە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Gitarre (G.) "گیتار، ئامێرێکی مۆسیقا". ریشەی وشەی گیتاری ئەورووپی دەچێتەوە kithara (Gr.). بە پێی بۆچوونێک ئەم وشە یۆنانییەش دەبێ لە "سێ تار" setār ی فارسی وەرگیرابێ و مەبەست ئامێرێکی ژەندنە کە سێ تار (تاڵ) ی هەیە. لەوانەیە ئەم هەوا کوردمادییە پێشتر بەدەم ژەندنی ئامێری سێ تارەوە گوترابێ.

2- لەوانەیە پێوەندی بە ↑قەتار2 qetar ەوە هەبێ بە مانای "تێک خراو، لێک بەستراو". لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ وشەکانی "بەند" و "بەستە" هەڵیسەنگێنین کە بە مانای گۆرانی بە کار دێن و ئاماژە بە چەمکی "بەستن(ەوە)" دەکەن. مەبەست تێکخستنەوەی بەشەکانی گۆرانییەکەیە. دیسان هەر لەم پێوەندییەدا هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "سیاچەمانە".

**قەتار2 qetar** [ *qatār* ] - "1- سەف، ریز(کراو) 2- ترێن، شەمەندەفەر": بە هێندێک شت کە لە یەکدی بەستراونەوە و بە دوای یەکدا رێزکراون، گوتراوە قەتار، وەک قەتاری کاروانچییان یان قەتار بە مانای رەخت و فیشەکدان. هەروەها بە مانای "ریزەدێراو" و بە مانای "شەمەندەفەر" یش بە کار دێ و ئاماژە بە هەمان مانا دەکا. جگە لەمە قەتارەی زێریش هەیە کە زنبەرێکی سەری ژنانە لە چەشنی زنجیر. وشەکە لە دوو کەرتی قەت + ئار qet + ar پێکهاتووە. کەرتی ar پاشگرە، هەروەک لە گەلێک وشەی وەک کۆمار، کۆڤار، ساوار، نسار و هتد دا دەبیندرێ. کەرتی قەت -qet دەشێ خزم بێ دەگەڵ:

1- یان ↑کۆت[4] kot "چەپەر، دەرگای لە شووڵ چندراو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تێکخستن، یەکانگیر کردن، تێک بەزاندن"،

2- یانیش ↑کۆت[1] kot [کوت و زنجیر].

کەوابوو "قەتار" دە بنچینەدا مانای "تێکخراو" یان "(بەدوای یەکدا) زنجیرکراو" دەگەیەنێ و چووەتە ناو زمانی عەرەبیشەوە و بووەتە قطار qitār (Arb.).

**قەتان qetan** [ *qatān* ] - "گوزەران، مەشین، بەرێوە چوون": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کووچە kuçe.

**قەتاندن qetandın** [ *qatāndın* ] - "1- پساندن 2- تەواوکردنی کار [لێبرینەوە]": خزمە دەگەڵ ↑کوت kut و ↑کەت ket و ↑قەتۆ qeto "پاژ، لەت"، ↑قاش qaş و چەندان وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "برین". کردارەکە دە بنەرەتدا بە واتای "برین (ەوە)" بووە و مەبەست لە برینەوە لێرەدا کۆتایی پێ هێنان و تەواو کردنە. دە زمانی کوردمادیدا کرداری "برینەوە"ش بە مانای کۆتایی پێ هێنان و تەواو کردن بە کار دێ، بۆ وێنە دەگوترێ "لێی ببڕەوە " واتا "بەسە، کۆتایی پێ بێنە". شیاوی باسە وشەی ↑کۆتایی kotayî "پایان، ئاخیر" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و دە بنەرەتدا مانای قەتاندن یاخود برانەوەی شتێک دەگەیەنێ.

**قەتمەر qetmer** [ *qatmar* ] - "مۆر، بنەوشی تاریک": دەشێ پێک هاتبێ لە قە (پێشگر) + تمەر qe+ tımer. کەرتەوشەی تمەر -tımer خزمە دەگەڵ Dämmerung (G.) و demar (OG.) "بوومەلیڵ"، temel (OIn.) "تاریکی"، temere (L.) "کوێرانە"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *tem(ə)-*

"تاریک". لەوانەیە ↑تەمراندن temrandın "1- ژێر خاک کردن، داپۆشین لە ژێر خاک 2- کووژاندنەوەی ئاگر" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی 1: پێشگری قە -qe شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ئە -e یان هە -he کە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی دێن، وەک *قەسرین* "سڕ بوون لە سەرمان"، *قەتەک* "ئامرازی تەتەلە کردنی تووتن"، *قەفازتن* "بازی بلیند بردن، پەڕین". پێشگرەکە بە شێوەی ئە -e یان هە -he لەم وشانەی خوارەوەدا دەبینرێ: ئەتک (هەتک)، ئەتوان (هەتوان)، ئەدەب، ئەڤین، ئەسپاردن، ئەستاندن (هەستاندن) و هتد. تێبینی 2: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "تاریکی"، داپۆشین" و "کوێر" بڕوانە وشەی "کوێر"].

**قەتووف qetuf** [ *qatūf* ] - "سەوەتەی میوەچنین": خزمە دەگەڵ ↑کۆت[4] kot "چەپەر، دەرگای لە شووڵ چندراو". پێوەندی تیوان "قەتووف" و "کۆت" هەر وەک پێوەندی تیوان "سەوەتە" و "سابات" [کەپر] وایە.

**قەتۆ qeto** [ *qato* ] - "پاژ، لەت": هەروەها قەتک qetık هەیە بە مانای "کەمووکە، پچێک" [کوتیک]. خزمە دەگەڵ ↑قەتاندن qetandın "بڕین، لەت کردن".

**قەتەک** qetek [ *qatak* ] - "ئامرازی تەتەلە کردنی تووتن": قە (پێشگر) + تەک qe + tek. بنجی تەک دەچێتەوە سەر ↑تەکاندن tekandın [هەڵتەکاندن]. پێشگری قە -qe شێوەیەکی گۆڕدراوە لە پێشگری ئە -e یان هە -he کە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی دێ، وەک *قەسرین* "سڕ بوون لە سەرمان"، *قەتمەر* "مۆر، بنەوشی تاریک"، *قەفازتن* "باز دان". پێشگری ئە -e یان هە -he بۆ وێنە لەم وشانەی خوارەوەدا دەبیندرێ: ئەتک (هەتک)، ئەتوان (هەتوان)، ئەدەب، ئەڤین، ئەسپاردن، ئەستاندن (هەستاندن) و هتد.

**قەتیس qetîs** [ *qatīs* ] - "گیرخواردوو": قەتیز qetîz یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە بنجی قەت + پاشگری ئیس qet + îs. بنجی قەت -qet خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانی کوردمادیدا کە مانای "تێکبەزین، یەکانگیر بوون، چوونە ناو یەکدی، دەناو یەکدا گیر کردن" دەبەخشن، بۆ وێنە ↑کۆت[4] kot "چەپەر، دەرگای لە شووڵ چندراو". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑خات xat. کەرتی îs- یان îz- پاشگری بە ئاوەڵناو کردنە لە دۆخی جەخت کردندا و شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئۆز -oz.

**قەد qed** [ *qad* ] - "1- باڵا، بەژن، بڵیندی 2- ئەندازە، قەوارە": قد qad (.P). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ وشەکانی ↑قوت qut، ↑قیت qît، ↑قۆز qoz و هتد. ئەم وشانە وەک دەبینین باس لە بڵیندی و بەرز بوون دەکەن و هەر لەم پێوەندییەشدا وشەی قەد qed بۆ دەربڕینی مانای باڵا و بەرزی (مرۆڤ، ئاژەڵ و شتی دیکە) هاتووەتە ئاراوە. ئەوەی بە تایبەتی لێرەدا جێی سەرنجە وێکچوونی وشەی قەد qed دەگەڵ height (.E) "باڵا و بڵیندی"یە. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە سەرەتا کاتێک باس لە قەدی شتێک کراوە، مەبەست ئاماژەکردن بە باڵا و بڵیندی ئەو شتە بووە و پاشان مانای وشەکە زۆرتر پەرەی سەندووە و مانای ئەستوورایی یان کۆتار [قطر qotr (.Arb)] یشی وەرگرتووە و ئەمەش دەبێ لەوە ڕا هاتبێ کە بۆ ئەندازەگرتنی کۆتار ناوقەدی شتەکە ئەندازە دەگیرێ. لە لایەکی دیکەوە وشەکە بە گشتی مانای "ئەندازە"شی وەرگرتووە، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "تەمەنی ئەو دوو منداڵە بە قەد یەکە". وشەی قەد دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کۆتار kotar "ئەستوورایی، قوتر"، ↑کۆتەل kotel "پەیکەرە" [دە بنەڕەتدا: بەژن و باڵا].

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Größe "ئەندازە" لە groß "گەورە" وەرگیراوە و چەندین مانای جۆراوجۆری وەک قەد، قەف، ئەندازە و هیتر لە خۆ دەگرێ]. جگە لەم وشانەی سەرەوە

وشەی ↑قاس qas "ئەندازە"ش پێوەندی بەم خێزانەوشەیە پەیدا دەکا [ئەو قاس، چقاس]. ئەم وشە کوردمادییە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و چەندین وشەی وەک قیاس و مقايسة ی لێ دروست کراوە.

**قەدارە qedare** [ qadāra ] - "جۆرێک شمشێری کورت و دەم پان": غەدارە ġedare ش دەگوترێ. قەد + ارە qed + are. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑کەت ket، ↑کوت kut، ↑کووز kuz، ↑قاش qaş و هتد سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن". کەرتی دووەم، واتا ئارە are پاشگری بە ناوکردنە، هەروەک قەنارە، کەنارە، گەزارە و هتد.

**قەداندن qedandın** [ qadāndın ] - "دوایی پێ هاتن، ئەنجام دان": خزمە دەگەڵ ↑قەتاندن qetandın "1-پساندن 2- تەواوکردنی کار". وشەی ↑کۆتایی kotayî یش خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە.

**قەدەخە qedexe** [ qadaxa ] - "حەرام، نەشیاو": خزمە دەگەڵ ↑چەتە çete "رێگر".

**قەدەک qedek** [ qadak ] - "جاوێکی سەوزکراوە": قەتەک qetek یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەدیفە qedıfe.

**قەدیفە qedîfe** [ qadīfa ] - "خاولی حەمام": قەدیفک qedîfk ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ وشەی ↑قەد qed "بەژن و باڵا" و مەبەست پارچەیەک بووبێ کە لە قەد وەرێندراوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قەدەک qedek "جاوێکی سەوزکراوە".

**قەر1 qer 1** [ qar ] - "1- رەش 2- سووری ئاماڵ رەش 3- تاریکی": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قەرە[1] qere "رەش".

**قەر2 qer 2** [ qar ] - "زوقم، سیخار": هەروەها قەراو qeraw هەیە بە مانای "ئاونگ". وشەکانی "زوقم" و "سیخار" دە بنەڕەتدا بە مانای "سەخت"ن. مەبەست لەم وشانە "بەستەڵەک"، واتا بەستن و سەخت بوونی هەرد و گژ و گیایە. هەر بەم شێوەیە "قەر" خزمە دەگەڵ ↑خار *xar* "سەخت" و ↑قەرسان qersan "1- سڕ بوون 2- مەیین، توند بوونی تراو".

**قەڕابە qerabe** [ qarāba ] - "دەفری گەورەی ئارەق و شەراب": خزمە دەگەڵ ↑غوڕ(ڕ)اب ġur(r)ab [غوڕڕابی خەو واتا قووڵایی خەو]. ئەم وشانە ئاماژە بە "قووڵ بوون، قوڵکە بوون" دەکەن. زۆرێک لەو وشانەی دە زمانی کوردمادی و هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا بە مانای "دەفر" بەکار دێن، پێوەندییان بە چەمکی "قووڵایی، قووڵ بوون"ەوە هەیە، وەک کەندوو، کوار و هتد.

**قەراتە qerate** [ qarāta ] - "رەشکە و پێشکە": هەروەها قەرانتوو qerantu هەیە بە مانای "تارمایی". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قەر1 qer 1 "1- رەش 2- سووری ئاماڵ رەش 3- تاریکی" و دەگەڵ ↑قەرە[1] qere "رەش".

**قەڕاج qerac** [ qarāj ] - "دەشتی هیشک و رووتەن": هەروەها قەراچ qerač یش دەگوترێ بە مانای "زەوی رەقەن". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قڕ *qır* [قڕ هاتن].

**قەڵاچۆ qeraço** [ qarāčo ] - "قڕ، کوشتار": قەڵاچۆ qelaço ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قڕ qır [قڕ کردن].

**قەڕاخ qerax** [ qarāx ] - "کەنار، لێوار، تەنیشت": قەراغ qarāġ یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Grat (G.) "لێوار، قەراخ، تیژی و دەرپەڕیوی شتێک". ئەو وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی > ***gher-** **(IE.)** "تیژی، دەرپەڕیوی". وشەی garn (Rus.) "سنوور" [قەراخەکانی زەوی یان وڵاتێک] لەم ریشەوە هاتووە. هەر بەم پێیە دەبێ وشەکانی کران karān(e) (P.) "سنوور،

قەراخ" و هەروەها وشەی کوردمادی ↑قارنج qarnıc "پەراوێزی شمەک"، ↑قۆرزی qorzî "گوشە" و ↑قۆرک qork "ئێسکی پشت مل و سەر سمت" و ↑قەرە² qere [خۆ لە قەرە دان] پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەبێ. پێوەندیی چەمکی "قەراخ" بە "تیژی و دەرپەڕیوی" لەمە دایە کە گوشە و قەراخی هەرشتێک، ئەوشوێنەیە کە شتەکە لەوێدا تەنک و باریک و تیژ دەبێتەوە و جۆرێک زەقایی و دەرپەڕیوی ساز دەکا، وەک قەراخی چەقۆ، مێز، کاغەز و هتد.

**قەرار qerar** [ *qarār* ] - "1- بڕیار 2- ئارامی، ئۆقرە": ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا وشەیەکی زمانی کوردمادییە و چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە، قرار qarār (.Arb) . وشەکە پێک هاتووە لە بنجی قەر qer + ar- [ar پاشگری کردنە ناوە]. ئەم پاشگرە پاشگرێکی چالاکی وشەسازی دە زمانە ئێرانییەکاندایە و لەناو دەیان وشەدا دەبینرێ، وەک وەک کۆمار، کۆڤار، ساوار، نسار، وتار، شەوار، کەنار، قەتار، ئێوار و هتد. بنجی قەر -qer دە زمانی کوردمادیدا لە چەندین شوێن بە مانای "ئارامی، دامەزراوی، سەقامگرتوویی" بەکار دێ وەک ↑قڕ و قپ qır û qıp [کڕ و کپ kır û kıp]، ↑ئۆقرە oqre [o-qıre]، ↑قەرا qera [ئارا و قەرا ara u qera] یان قەری qerî، ↑قریان qıryan "ئارام بوون، ↑قەرسان qersan "1- سڕ بوون 2- مەیین، توند بوونی تراو" [دە بنەڕەتدا: لە جووڵە وەستان، قەرار گرتن، سەقام گرتن] و هتد. کەوابوو "قەرار" دە بنەڕەتدا بە مانای "سەقامگرتوویی، ئارامی، دامەزراوی، بێجووڵەیی" بەکار هاتووە. ئێستا بزانین مانای دووەم، واتا "بڕیار" چۆن پەیدا بووە. "قەرار" بە مانا یەکەمەکەی زۆرتر چەمکێکی فیزیکییە، بە مانا دووەمەکەی دەبێتە چەمکێکی هزری. کاتێک مرۆڤ سەبارەت بە شتێک بیر دەکاتەوە، هێشتا بڕیاری نەداوە و لەسەری ساخ نەبووەتەوە، ئەوا هزر و بیری چالاک و نائارامە و بەم بار و ئەو باردا شتەکان لێک دەداتەوە. بەڵام کاتێک بڕیاری دا و خۆی ساخ کردەوە، ئیتر هزر و بیری سەبارەت بە کێشەکە لە جووڵە دەوەستێ، ئارام دەگرێ و دادەمەرزێ. لەم بارەوە دەتوانین وشەی "*قەرار* دان" [بڕیار دان] دەگەڵ "*ساخ* بوونەوە لەسەر شتێک" بەرهەڤ بکەین. وشەی "ساخ" دە ریشەدا هەروەک وشەی "قەرار" ئاماژە بە "سەخت بوون، بێجووڵە بوون، قورس و قایم بوون" دەکا و خزمیشە دەگەڵ "سەخت". "قەرار"یش دواجار دەچێتەوە سەر ↑*خار xar* "سەخت" و دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەگەلێک وشە وەک ↑قورس qurs، ↑قەر qer "زوقم، سیخار" [ئاوی بەستوو، بەستەڵەک"، ↑کەرا kera "بەرد"، ↑کەڕاکی kerakî "ساخ، پتەو"، ↑کرەک kırek "بێجووڵە، جماد" [بەپێچەوانەی زیندەوەر] و هتد.

**قەرازە qeraze** [ *qarāza* ] - "زنجیر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەرتاڵە qertale و هیتر، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، هۆنین، تێکخستن".

**قەراسە qerase** [ *qarāsa* ] - "گوریسی سەر بە ئاڵقە بۆ بار پێچان": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قەرازە qeraze.

**قەڕاڵ qeral** [ *qarāl* ] - دە کوردەواریدا بە مرۆڤی بە پۆز و بە دەعێ دەگوترێ "دەڵێی کوڕ [یان کچی] قەڕاڵی فەرەنگە". قەڕاڵ هەمان ناوی Karl ە کە ناوێکی ئەورووپییە و مەبەست ناوی یەکێک لە پادشاکانی ئەورووپی بە ناوی "کارڵ" بووە.

**قەڕان qeran** [ *qarān* ] - "مەیدانی تاودانی ئەسپ": خزمە دەگەڵ ↑ئارا(ن) ara(n) "مەیدان، گوڕ".

**قەرپ qerp** [ *qarp* ] - "دەنگی شکانی دار": قرپە qırpe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەرفین qerfîn.

**قەرپاچ qerpaç** [ *qarpāč* ] - "شەللاق": خزمە دەگەڵ ↑قەرفین qerfîn.

**قەرپک qerpık** [ *qarpık* ] - "1- مل، ئەستۆ 2- پێسیر": گریبان gerîbān (P.) "پێسیر، یەخە". دەچێتەوە سەر ریشەی **< -grib*** (IE.) "گرتن" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گرتن gırtın. هەروەها ↑قەرپەچە qerpeçe هەیە بە مانای "لە ئامێز گرتن". ئەمەش پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

**قەرپاڵ qerpal** [ *qarpāl* ] - "جلکی شڕۆڵ": دەچێتەوە سەر ریشەی **<- grebh*** (IE.) "کۆڵین، هەڵکەندن، کڕاندن، رووشاندن" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە، بۆ وێنە ↑خراب xırab.

**قەرپۆز qerpoz** [ *qarpoz* ] - "زەقایی پێشەوەی زین": دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی قەر + پۆز qer + poz. کەرتی یەکەم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑قەراخ qerax یەک دەگرێتەوە و دە بنەڕەتدا مانایی "زەقایی، تیژایی" دەگەیەنێ. کەرتی دووەم ↑پۆز poz بە مانای "لووت" و تێکرای وشەکە دەبێتە "لووتی دەرپەریو"، واتا شتێک کە وەک لووت دەرپەڕیوە. وشەکە دە زمانی عەرەبیدا بووەتە قربووس qerbus (Arb.).

**قەرپەچە qerpeçe** [ *qarpaça* ] - "لە ئامێز گرتن": خزمە دەگەڵ ↑قەرپک qerpık "مل، ئەستۆ".

**قەرت qert** [ *qart* ] - "1- زبر، زوور 2- پەیت، قایم": [قەرتەمێر qertemer واتا پیاوی ئازا و بەهێز]. خزمە دەگەڵ ↑خورت xurt.

**قەرتاڵە qertale** [ *qartāla* ] - هاوریشەیە دەگەڵ kratto (OG.)، kretto (OE.) "قەرتالە"، cradel (OG.)، cradle (E.) "لانکە" [وەک قەرتاڵە لە شوول چندراوە]، cratis (Lat.) "شتی چنراو" [وەک قەرتاڵە، سەوەتە، پەرژین و هتد]، grathnati (Gr.) "با دان، گرێ دان، تێک خستنەوە". ئەم وشە ژێرمەنییانە بەپێی بۆچوونێک دەچنەوە سەر **< -ger*** (IE.) "سووران، با دان، هونینەوە" [ئەم وشە یۆنانییە هەڵسەنگینە دەگەڵ وشەی ↑گرێ gıre ی کوردمادی]. لەوانەیە بردنەوەی ئەم وشانەی سەرەوە بۆ سەر ریشەی **< -(ker(t** *** (IE.) "بادان، هۆنینەوە، چنین" بەجێتر بێ. لەوانەشە ئەم دوو ریشانە دە پلەیەکی دوورتردا بگەنەوە یەکتر. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە لەم ریشەیەی دوایی هاتوون، وەک *قۆرت* "لەمپەر، پەرژین"، *کرتوو* "باقەبێن" و هتد.

**قەرتیش qertîş** [ *qartīš* ] - "1- توێژەمار 2- پێست و پووڵەکەماسی": هەروەها ↑کڕاژ kıraj هەیە بە مانای "توێژە مار" و ↑کرێژ kırej "توێخی پێست کە لێ دەبێتەوە". خزمە دەگەڵ ↑کڕاندن kırandın و ↑*خوراندن xurandın*، سەر بە ریشەی **< -gradi*** (IE.) "رووشاندن، کڕاندن".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "توێخ، توێکڵ" و "کڕاندن" دە وشەی ئەڵمانی Rinde "توێکڵەدار" دا دەبینرێ کە خزمە دەگەڵ رنین rınîn ی کوردمادی].

**قەرسان qersan** [ *qarsān* ] "1- سڕ بوون، تەزین لە سەرمان 2- مەیین، توند بوونی تراو": قەرسین qersîn و کەرزین kerzîn یش دەگوترێ. هەروەها قەرسینک qersînık هەیە بە مانای "فریزێر". خزمە دەگەڵ ↑کورسین kursîn "رەگ داکوتان و قایم بوون (ی چنار)". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون". شیاوی باسە وشەی "سەهۆڵ" لە ریشەیەکەوە هاتووە کە هەمان مانا دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ "سەخت" و "شەختە".

**قەرساندن qersandın** [ *qarsāndın* ] - "بەراورد کردن، نرخاندن": خەرساندن xersandın یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا "ئەرزاندن یان هەرزاندن erzandın/ herzandın" بووە بە مانای "نرخاندن". خزمە دەگەڵ ↑*هێژان hejan* "نرخدار بوون" و ↑هەرزان herzan.

**قەرشین qerşîn** [ *qaršīn* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑قەڵشین qelşîn.

قەرغوو **qerġû** [ *qerġū* ] - "*جۆرێک قامیشی رەق و ئەستوور کە بلوێری لێ دروست دەکەن*":
خزمە دەگەڵ ئەو وشەگەلەی لەژێر ↑کورسین kursîn دا باس کراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون، بە هێز بوون، قورس و قایم بوون".
قەرف **qerf** [ *qarf* ] - "1- حەنەک، گاڵتە 2- تانە وتیز": ↑قەرفین qerfîn.
قەرفین **qerfîn** [ *qarfīn* ] - "1- قسەی حەنەک و گاڵتە کردن 2- دەنگی شکانی دار هاتن":
1- ئەم وشانەی خوارەوەش پێوەندی بەم وشەوە پەیدا دەکەن: قەرپ qerp یان قرپە qırpe "دەنگی شکانی دار"، ↑قەرف qerf "1- حەنەک، گاڵتە 2- تانە وتیز"، ↑قەرپاچ qerpaç "شەللاق". ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ klopfen (G.)، kloppen (Nl.) clopfōn (OG.) "لێدان، تەق تەق لێدان، دەنگ لێ هەستاندن" (وەک بە دەست یان قامک لە دەرگا دان). دە زمانی ئاخاوتنی ئەڵمانیدا Kloppe (G.) بە مانای "شەڕ و لێکدان" بەکار دێ. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەل klappen (G.) "1- وەرگەڕاندن، وەرسووڕاندن، هەڵگەڕاندنەوە 2- دەنگ و هەرا پەیدا بوون، تەقە و زرمە لێ هەستان" (لەکاتی وێککەوتن و پێکدادانی دووشتدا، وەک دەنگی پێکدادانی دەرگا، دەنگی هەنگاو لەسەر هەرد، دەنگی پێکدادانی سەرەقابڵەمە و هتد)، klappen (MG.) "چەپڵە لێدان، دەنگ لێ هەستان، چەنەدرێژی کردن، چەقەچەق کردن [دەنگی دەم پێکدادان]"، klapfen (MG.)، clap (E.)، klappa (Sw.) "لێکدان، پێکدادان". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Klappe (G.) بە جۆرە دەلاقەیەک دەگوترێ کە لە کاتی تێپەڕ بوونی هەوا یان تراو پێیدا، پارچەکانی وێک دەکەون یان لێک دەدرێن و دەنگی لێ هەڵدەستێ، وەک دەلاقەکانی دڵ. دە زمانی ئاخاوتنی ئەڵمانیدا بە کەسێک کە زۆر چەقەچەق بکا، دەڵێن halt die Klappe "دەمت داخە" [دە بنەڕەتدا: دەلاقە (ی دەمت) بوەستێنە]. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ژمارەگەلێک وشەی دیکە کە بۆ هێندێک دەنگی تایبەتی بەکار دێن، وەک klaffen (G.) "دڕان، درز لێ پەیدا بوون، تەقین" (وەک تەقینی کاڵەک و شووتی)، kläffen (G.) "وەڕین، حەپاندن"، klippen (G.) "پێکدادران و دەنگ لێ هەستان". ئەم وشانە ریشەکەیان بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ گەڕێندراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم خێزانەدا جێ دەگرن، کە هێندێک لەوان لەژێڕ وشەی ↑غەڵبە ġelbe "دەنگی تێکەڵاوی حەشیمەت، دەنگی شلۆقی"دا باس کراوە.
[تێبینی: وەک لەژێر وشەی "قەرف"دا دەبینرێ، ئەم وشەیە جگە لە مانای "گاڵتە، حەنەک"، مانای "تانەو تیز"یش دەبەخشێ. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دوو خاڵ بکەین: خاڵی یەکەم ئەوەیە کە "چەمکی "تانە و تیز" پێوەندی بە چەمکی "لێدان"ەوە هەیە. ئەم پێوەندی لە دوو وشەی کوردمادی "تەوس" و "تەپاندن"دا دەبینین. خودی وشەی "تەوس" زۆر جار دەگەڵ "پللار" بەکار دێ کە ئەویش ئامرازێکە بۆ لێدان. هەروەها وشەی "تانە" دەچێتەوە سەر وشەی عەرەبی **طعن** "لێدان". خاڵی دووەم ئەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا klatschen (G.) "لێدان، چەپڵە لێدان" هەیە کە خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشەیە جگە لە مانا بنەڕەتییەکەی خۆی هەروەها مانای "پشت سەر قسە کردن، قسە بۆ هەڵبەستن، ناو زڕاندن"یش دەدا. ئەم مانایانە نیزیکن لە مانای "تانە و تیزی" کوردمادی. لە لایەکی دیکەوە وەک باس کرا "قەرفین" مانای "گاڵتە کردن"یش دەدا. پێوەندی ماناکانی "گاڵتە و گەپ" دەگەڵ "چەقەچەق" و "وەڕین" دە وشەی "گەپ"یشدا بەرچاو دەکەوێ. "گەپ" نەک هەر بە مانای "گاڵتە"یە، بەڵکوو بە مانای "وەڕین"یشە و خزمە دەگەڵ گەپین "وەرین"].

2- له لایەکی دیکەوە وشەی "قەرفین" دەگەڵ ژمارەیەک وشە جێی هەڵسەنگاندنە کە ئاماژە بە "لێکردنەوە، داپچڕین، بڕین" دەکەن، وەک carpere (L.) "لێکردنەوە، داپچڕین"، karpos (Gr.) "بەر و بۆم" [دە بنەڕەتدا: لێکراوە، داڕنراو]، erp (Rus.)، kröpion (Gr.) "داس"].

**قەرقاوڵ qerqawıl** [ *qarqāwıl* ] - "جۆرەمەلێک": خزمە دەگەڵ ↑قەل qel [کۆنتر کەرک]. کەرتی دووەمی وشەکە جێی لێکۆڵینەوەیە.

**قەرقەش(ە) qerqeş(e)** [ *qarqaš(a)* ] - "دژواری (و نارەحەتی لە ژیاندا)": خزمە دەگەڵ ئەو وشەگەلەی لەژێر ↑کورسین kursîn دا باس کراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون". "قەرقەش" دە بنەڕەتدا مانای "سەخت، سەختی" دەبەخشێ. لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ دوو وشەی "ئاستەنگ" و "ئاستەم" بەرهەڤی بکەین. ئەم دوو وشەیە خزمن و خزمیشن دەگەڵ "ستەم" کە ئەویش بریتییە لە سەختی و دڵرەقی و توندی نواندن دەرهەق بە کەسان و بوونەوەرانی لاواز].

**قەرمین qermîn** [ *qarmīn* ] - "تەزین، سڕ بوون": هەروەها ↑قورمین qurmîn هەیە بە مانای "1- کورک بوون 2- داسەکنان":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ئارام aram. دە زمانی فارسیدا کرداری ارمیدن ārEmīdan (P.) بە مانای "ئۆقرە گرتن، هێور بوون(ەوە)" بەکار دێ.

2- یان لەوانەیە پێوەندی بە ↑کورمان kurman [هەڵکورمان]ەوە هەبێ و لەم مانایەوە مانای "سڕ بوون" پەرەی گرتبێ.

**قەرە1 qere** [ *qara* ] - "1- رەش 2- رەشایی، تارمایی 3- رەعێتی بێ جووت و گا": > *qere* (*Tur.*) "رەش". دە زمانی کوردمادیدا بە قەرە "رەشایی"ش دەگوترێ و دەشێ ئەم ناوانە لەوەڕا هاتبن کە ئەم تۆژە خەڵکە، خەڵکیکی *رەش و رووت* بوون. [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "مسکین" بە مانای هەژار، نەدار]. ئەم وشە تورکییە لەوانەیە دە پلەیەکی دووردا خزم بێ دەگەڵ grau (G.) "بۆر، خۆڵەمێشی". وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی > ***gher(ə)-, *ghrē-*** (*IE.*) "درەوشانەوە، تڕووسکانەوە".

[تێبینی: پێوەندی یاخود باشتر بڵێین نیزیکی دوو رەنگی "بۆر" و "رەش" بە یەکدی ئاشکرایە. بۆ نموونە دە زمانی کوردمادیدا وشەی خۆڵەمێش xolemêş هەیە کە مەبەست خۆڵی بۆر یان رەشی دوای سووتانە. دە زمانی فارسیدا وشەی مشکی meškī (P.) بە مانای رەنگی "رەش" بەکاردێ].

**قەرە2 qere** [ *qara* ] - خۆ لە قەرە دان یان نەدان واتا تخوونی شتێک کەوتن یان نەکەوتن، نزیک نەبوونەوە لێی یان لێی نیزیک نەبوونەوە.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قەراخ qerax. لەم تێڕوانینەوە خۆ لە قەرە نەدان دە بنچینەدا مانای نەچوونە قەراخی شتێک [نەچوونە لای، بۆ لای شتێک نەچوون] بووە.

2- لەوانەشە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە دە بنەڕەتدا مانای "سەخت، سەختی، دژواری" دەبەخشن، وەک ↑کڕ kır [کڕ و کپ]، ↑کەڕ ker، ↑قەرە3 qere "رام، کەوی" و ↑*خار xar* و هتد. لەم تێڕوانینەوە "قەرە" ئاماژە بە سەختی و دژواری شتێک دەکا و مانای "خۆ لە قەرە نەدان" دەبێتە خۆ تووشی سەختی کارێک یان شتێک نەکردن.

**قەرە3 qere** [ *qara* ] - "رام، کەوی": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑ئۆقرە oqre، ↑قەری qerî "سەبر، ئارام"، ↑قارا qara [ئارا وقارای نەما]. هەروەک چۆن وشەی "رام" پێوەندە بە "ئارام"ەوە ، هەربەم چەشنەش "قەرە" پێوەندە بە "ئۆقرە"وە.

**قەرە$^{4}$ qere** *[ qara ]* - "چەلْتووكزار": خزمە دەگەلْ ↑ئارا ara "دەشت، گۆر، زەوی".

**قەرە$^{5}$ qere** *[ qara ]* - "لكی یەكسالە": خزمە دەگەلْ Gerte (G.)، gaerde (Nl.) "لك، شوولْ"، gart (OG.) "داری لێخوڕین، نەقیزە"، yard (E.) "پێوەری ئەندازەگرتنی درێژایی". [ئاشكرایە دە كۆندا درێژاییی شتێكیان بە شوولْ یان داردەست ئەندازە گرتووە]. ↑گەز gez ی كوردمادیش وێ دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**قەرە$^{6}$ qere** *[ qara ]* - "سۆسە، حەدس و گومان، بە خیالْدا هاتن": [قەرەم كردوو، دەزانم ها]. دەشێ پێوەندی بە ↑گریمانە gırîmane وە هەبێ [گری + مانە gırî + mane]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر كرداری ↑گرتن gırtın. شیاوی باسە دە زمانی ئەلْمانیدا greifen (G.) "گرتن" و begreifen (G.) "تێگەیشتن، پەی بردن"، Begriff (G.) "1- چەمك (ناوەرۆكی وشە) 2- تەسوور، خیالْ، تێگەیشتنێكی ناڕوون" خزمن دەگەلْ وشە كوردمادییەكان.

**قەرە$^{7}$ qere** *[ qara ]* - ئەم وشەیە وەك پێشگر دەگەلْ هێندێك وشە دێ و مانای "زۆر و زەوەند، زل و زەبەلاح" دەدا، وەك ↑قەرەچەناخ qereçenax "زۆروێژ، چەنەباز"، ↑قەرەزاخ qerezax "زۆر گرینۆك"، ↑قەرەپەست qerepest "پەستاوتنی زۆر" [↑قەلاپەچن ؟]، قەرەبالْغ "شلۆقی زۆر" و هتد. "قەرە" لەم وشانەدا خزمە دەگەلْ ↑خار xar و دە ئەسلْدا بە مانای "سەخت"ە. لەم مانایەوە دواتر مانای "گەورە، زل، زۆر" پەری گرتووە.

[تێبینی 1: پێوەندی چەمكەكانی "گەورەیی" و "هێز، سەختی، دەسەلْات، زالْ بوون" بەیەكەوە ئاشكرایە. بۆ وێنە بەراوردی دوو وشەی *زالْ* و *سالار* "سەرگەورە" بكە، یان بەراوردی وشەی *بەرد* بكە كە خزمە دەگەلْ *پالْەوان* و هەروەها دەگەلْ gewaltig (G.) "1- زۆر سەخت و بە هێز، بە زەبر و زەنگ 2- زەبەلاح، بە هەیبەت" (بۆ وێنە كاتێك باس لە ئەهرامی میسر بكرێ، بەم وشەیە وەسفی دەكەن. مەبەست لە وشە ئەلْمانییەكە بە مانای دووەم ئەوەیە كە شتەكە ئەوەندە گەورەیە كە بەسەر مرۆڤدا زالْ دەبێ). سەبارەت بە پێوەندی چەمكەكانی "سەختی" و "زل و زەبەلاحی" هەروەها بڕوانە وشەی "گەورە" كە كۆنتر ماناكەی "سەخت، دژوار" بووە.

تێبینی 2: دە زمانی كوردمادی و فارسیدا وشەی كەر ker (بە فارسی خر -xer) وەك پێشگر دەگەلْ هێندێك وشە دێ و مانای "زۆر و زەوندی" و هەروەها "زل و زەبەلاحی" دەبەخشێ، وەك كەرخوێن "كەسێك كە زۆر دەرس دەخوێنێ (دە بنەڕەتدا: سەخت خوێن)، یان ↑خەرتەل xertel "دالْی گەورە" (دە بنەڕەتدا: دالْی بەهێز)، دە فارسیدا "خرپوول" واتا "زۆر دەولْەمەند"، "خرمست" واتا "زۆر مەست" و هتد. ئەگەر لە مانای ئەم وشانە ورد بینەوە، ئەم شیمانەیە دروست دەبێ كە ئەم پاشگرە پێوەندی بە قەرە$^{7}$ qere و دواتر ↑خار xar ەوە هەیە بە مانای "سەخت، بەهێز". لەم مانایەوە مانای "زەبەلاحی" و دواتر "زۆر و زەوەندی" سەرچاوە دەگرێ. هەر سەبارەت بەم پێوەندییانە دەتوانین دەگەلْ "شەق$^{3}$" بەرهەڤی بكەین كە دە بنەڕەتدا بە مانای "سەخت، بەهێز"ە و دەگەلْ هێندێك وشە مانای "زل، گەورە" دەدا، وەك "شەقەزللە"، "شەقەمشار"، "شەقەجۆگە" و هتد. بەم جۆرە دەتوانین بلْێین كە لەو وشانەی سەرەوەدا چەمكی "كەر، خەر" وەك ئاژەلْ لەبەر چاو نەگیراون، بەلْكوو چەمكی "سەختی و هێز" لەبەر چاو گیراون].

**قەرەبالْغ qerebalıġ** *[ qarabālıġ ]* - "حەشامەتی زۆر، دەنگەدەنگی زۆر، شلۆق": قەرەبارغ qerebarıg و قەلەبالْغ qelebalıġ یش دەگوترێن. ئەم وشە وشەیەكی كوردمادییە كە چووەتە ناو زمانی توركییەوە. كەرتی یەكەم ↑قەرە$^{7}$ qere بە مانای "زۆر و زەوەند"ە، كەرتی دووەم خزمە دەگەلْ ↑پلۆز pıloz "ئالۆز" [ئالۆز و پلۆز واتا تێكەلْ پێكەلْ، لێكدراو]. دە فارسیدا

دەگوترێ پلوغ plūġ (P.) [شلوغ پلوغ]. خزمە دەگەڵ ↑پلۆسین plosîn "لێدان". دیارە لێرەدا مەبەست "لێکدان"ە. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە شلۆقی و تێکەڵ پێکەڵی (لێکدراوی) زۆر.
[تێبینی: وشەی شلووق یان شلۆقیش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمیشە دەگەڵ "شەڵەقان"].

**قەرەبەش qerebeş** [ *qarabaš* ] - "ئاژەڵی روخسار رەش و سپی تێکەڵاو": قەرە + بەش be + qere. کەرتی یەکەم ↑قەرە qere بە مانای "رەش"ە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑بەش3 beş "ئاژەلی تیوچاوانی سپی".

**قەرەبینە qerebîne** [ *qarabīna* ] - "جۆرێک دەمانچە": کارابین karabîn یش دەگوترێ، < *carabin (Fr.)* "سواری چەکدار".

**قەرەپەست qerepest** [ *qarapast* ] - "پەستاوتنی زۆر": بڕوانە قەرە7 qere + پەست pest. دە بنەڕەتدا واتا "پەستاوتنی سەخت". لەوانەیە وشەی ↑قەڵاپەچن qelapeçın گۆڕدراوی "قەرەپەستن" بێ.

**قەرەچۆل qereçol** [ *qaračol* ] - "بیابانی زۆر پان و بەرین": بڕوانە ↑قەرە7 qere + ↑چۆل çol.

**قەرەچەناخ qereçenax** [ *qaračanāġ* ] - "زۆروێژ، چەنەباز، چەنەگەتەلایی": بڕوانە ↑قەرە7 qere + ↑چەنە(گە) çene(ge).

**قەرەچی qereçî** [ *qaračī* ] - "گەلێکی گەڕۆکە و بە زۆر وڵاتاندا بڵاو بۆتەوە": قەرەج qerec و قەرەچ qereç یش دەگوترێ. دە زمانی عەرەبیدا فۆتیمەکان پاش و پێش کراون و وشەکە بووەتە غجر ġajar (Arb.). وێ دەچێ ئەم وشەیە لە ناوی کراچی kıraçî یەوە هاتبێ کە ناوی شارێکە لە پاکستانی ئەمڕۆ یان هیندستانی پێشوو. لەم پێوەندییەدا حەز دەکەم بیرەوەرییەکی خۆم بگێڕمەوە: جارێکیان بەرێکەوت دەگەڵ کابرایەکی قەرەچی ئەڵمانی دەدوام. سەبارەت بە بەسەرهات و رابردووی دڵتەزێنی قەرەچییەکان لە سەردەمی نازییەکاندا و هەروەها سەبارەت بە بن و بنەچەکەی ئەوان پرسیارم لێکرد. گوتی ئەوان بەر لە هەشت سەر ساڵ لە ناوچەی *کراچی* ژیاون و دوای شەڕێکی مەزن کە پادشاکەیان تێیدا کوژرا، رایان کرد و بە وڵاتاندا بڵاو بوونەوە. کاتێک وشەی "کراچی"م لە کابرا بیست، یەکسەر وەبیر وشەی "قەرەچی" خۆمان کەوتمەوە و بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەو گەلە دەبێ بە ناو شار و زێدی خۆیان کە لێیەوە هاتوون، کرابن. شیاوی سەرنجە کە بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکان رەچەلەکی ئەم گەلە بۆ هیندستان دەگەڕێتەوە و ئەوان دە بنەڕەتدا هیندی بوون. شار یان مەڵبەندی کراچیش دە پێشوودا بەشێک لە هیندستان بووە. دە زمانی ئینگلیزیدا بە قەرەچی دەگوترێ gipsy و ئەم وشەیە بۆ ناوی Egypt "میسر" دەگەڕێتەوە. ئەورووپییەکان سەرەتا بە هەڵە وایان زانیوە کە قەرەچییەکان بە رەگەز میسرین و لەوێوە پەڕیوەی هەندەران بوون. وەک دە زمانی ئینگلیزیشدا دەیبینین ناوی ئەو گەڵە بۆ وڵاتێک دەگەڕێندرێتەوە و ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە دە زمانی کوردمادیشدا ناوی ئەوان بۆ زێد و وڵاتێک، واتا وڵاتی راستەقینەیان کراچی، بگەڕێتەوە. سەبارەت بە ریشەی وشەکە، دەشێ دەگەڵ وشەی ↑کورد kurd لە یەک ریشەی هاوبەشەوە هاتبن.

**قەرەچێوە qereçewe** [ *qaračewa* ] - "داربەستی خانووکردن": قەرە + چێوە qere + çewe. کەرتی یەکەم، واتا قەرە-qere مانای "تێکخستن، چنین، تەنین" دەدا و خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑کر kır. کەرتی دووەم، ↑چێو çew بە مانای "دار"ە و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "داری تێکخراو یان تێکخراو لەدار"، بە وتەیەکی دیکە "داربەست".

**قەرەخرچە qerexırçe** [ *qaraxırča* ] - "گندۆرەی نەگەیشتوو": ↑قەرە[7] qere بە مانای "ڕەق، سەخت"ە و مەبەست "خرچەی ڕەق"ە، واتا خرچەیەک کە هێشتا نەگەیشتووە.

**قەرەزاخ qerezax** [ *qarazāx* ] - "زۆر گرینۆک": قەرە qere + زاخ zax. بڕوانە ↑قەرە[7] qere و ↑زیقە zîqe [زیقاندن zîqandın].

**قەرەواش** [ *qarawāš* ] - "کڵفەت": قەرەباش qerebaş یش دەگوترێ. ئەم وشەیە دەبێ وەرگیرابێ لە < *servus* (*L.*) "بەندە، خزمەتکار" سەر بە کرداری *servire* (*L.*) "خزمەت کردن". وشەی service دە زمانەی ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێتەوە.

**قەرەوڵ qerewıl** [ *qarawıl* ] - "پاسدەر، ئێشکگر": قراول qarāwol (P.). دەشێ وشەیەکی خوازراو بێ < *قەرەقۆڵ qereqol* (*Tur.*) "ژەندرمەی تورک". مانای ئەسڵی وشەکە دەبێتە "قوڵ ڕەش" و ئاماژە دەکا بە "پەڕۆیەک یان نیشانەیەکی ڕەش کە دەبێ ژەندرمەکان دە قۆڵیان کردبێ. وشەی ↑قۆڵ qol خوێ وشەیەکی کوردمادییە و چووەتە ناو زمانی تورکییەوە.

**قەڕەوێڵە qerewele** [ *qarawela* ] - "تەختەخەو": دە زمانی فارسیدا وشەی غربال ġarbāl (P.) "بێژینگ" و دە ئەڵمانیدا Korb (G.) "قەرتاڵە" پێوەندیان بەم وشە کوردمادییەوە هەیە. کەرتی al- یان ele- دە وشە فارسی و کوردمادییەکەدا پاشگرە. هەر سێ وشەی کوردمادی و فارسی و ئەڵمانی، سەرەڕای برێک جیاوازی لە ماناکانیاندا، دەگەڵ یەکدی خزمن و دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون. بەگوێرەی فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکانی زمانی ئەڵمانیدا وێ دەچێ وشە ئەڵمانییەکە لە cobis (L.) "قەرتاڵە" وەرگیرابێ. لەهەمان کاتدا ئەم وشە لاتینییە بە خزم دادەنرێ دەگەڵ Harfe (G.)، harp(f)e (OG.)، harp (E.)، harp (Nl.)، harpa (Sw.)، "چەنگ، عوود"، سەر بە ریشەی ***(s)kerb(h)-** (***IE.***) "سووڕان، با دران". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانایەکی گشتی وەک "لە شووڵ تەنراو، هۆندراو، هەڵبەستراو"یان هەبووە. دە وشە کوردمادییەکەدا فۆنێتیمی b گۆڕاوە بە w. ئەم ئاڵوگۆڕە دە زۆر وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک "ابر"، "تبر"، "شب"، "تب" و "لب" و هیتر دە زمانی فارسیدا و "هەور"، "تەور"، "شەو"، "تاو" و "لێو" دە زمانی کوردمادیدا. وەک دەبینین دە وشە ئەڵمانی Harfe شدا گۆڕاتێکی لەم چەشنە ڕوویداوە، واتا فۆتیمی f دە ئەسڵدا p بووە.

**قەری qerî** [ *qarī* ] - "سەبر و ئارامی": قارا qara ش دەگوترێ [ئارا و قارا]. خزمە دەگەڵ ↑ئۆقرە oqre.

**قەرێز qerez** [ *qarez* ] - "پەرژین": خزمە دەگەڵ ↑قەرتاڵە qertale.

**قەرێ قەرێن** [ *qareqaren* ] - "گەمەی چاوشارکێ": دەبێ پێوەندی بە وشەی ↑گەڕان geran هەبێ [گەرێ گەرێن] و مەبەست گەران بەدوای ئەو کەس یان کەسانە بێ کە خۆیان شاردۆتەوە.

**قەز qez** [ *qaz* ] - "ئاوریشمی خاو": خزمە دەگەڵ ↑قژ qıj "تووک" و ↑قەژە qeje "تۆیژاڵ".

**قەزاتمە qezatme** [ *qazātma* ] - "گۆشتاوی خەست و خۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑خەست xest.

**قەزبێن qezben** [ *qazben* ] - "جۆرێک تیخی خەنجەر": دە زمانی فارسیدا گزلک gazlak (P.) بە مانای "چەقۆ، خەنجەر" بەکار دێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قاش qaş و چەندین وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**قەزەب qezeb** [ *qazab* ] - "لاسکی دەخڵ": خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆیژاڵ".

**قەژە qeje** [ *qaža* ] - "تۆیژاڵ": بڕوانە ↑قاشڵ qaşıl "تۆیکڵ".

**قەس qes** [ *qas* ] - "دڵ تێکهاڵان": کردارەکەی دەبێتە قەسیان qesyan. خزمە دەگەڵ ↑کاس kas، ↑گێژ gej، ↑خێچ xeç، ↑گەشکە geşke و چەندین وشەی دیکەی ئەو خێزانە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، با دران، سووڕان".

**قەسپ1 qesp 1** [ *qasp* ] - "خورمای هەرەخراب، کوردکوژە": دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "رەق، سەخت، هیشک" بەکار هاتبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قەسفین qesfîn.

**قەسپ2 qesp 2** [ *qasp* ] - "سواو، ساویاو": دەشێ پێک هاتبێ لە قە (پێشگر) + سپ qe + sıp. ئەم کەرتە خۆی دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ساوین sawîn [سابیدن sabīden (P.)].

[تێبینی: پێشگری قە -qe هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑قەسرین qesrîn "سڕ بوون"].

**قەستۆر qestor** [ *qastor* ] - "جۆرێک فاسۆنی *کوڵکدار*": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەستەقول qestequl** [ *qastaqul* ] - "تەرسەقول، ریاوی کەر": وشەکە پێک هاتوو لە دوو کەرتی قەست(ە) + قول qest(e) + qul. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خەست xeat "پەیت، توند". کەرتی دووەم مانای "تۆپەڵە" دەدا. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەرسەقول tersequl.

**قەسر qesır** [ *qasır* ] - "کۆشک و سەرا": qasr (P.)، qasr (Arb.) "قەسر"، Kastell (G.)، castle (E.) "قەسر، قەڵا" < *castellum (L.)* "قەڵا" < *castrum (L.)* "شوێنی بەربەستکراو و قایمکراو".

**قەسرین qesrîn** [ *qasrîn* ] - "سڕ بوون لە سەرمان": قەسران qesran یش دەگوترێ. هەروەها قەسر هەیە بە مانای "سڕی". بنجی وشەکە، واتا قەسر -qesır خۆی پێک هاتووە کە لە دوو کەرتی قە + ↑سڕ qe + sır. کەرتی یەکەم شێوەیەکی گۆڕدراوە لە پێشگری ئە -e یان هە -he کە دەکەوێتە پێش هێندێک لە وشە و کردارەکان، بۆ وێنە ئەتک (هەتک)، ئەتوان (هەتوان)، ئەدەب، ئەڤین، ئەسپاردن، ئەستاندن (هەستاندن) و هتد. ئەم پێشگرە هێندێک جاریش خۆی بە شێوی قە -qe دەدەخا، وەک *قەتەک* "ئامرازی تەتەلە کردنی تووتن"، *قەتمەر* "مۆر، بنەوشی تاریک"، *قەفازتن* "باز دان"، *قەرمین* "کڕ بوون" و هتد.

[تێبینی: لەباری چۆنیتی دروست بوونی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *قەسفین* "سڕ بوون لە سەرمان". ئەم کردارەش پێک هاتووە لە دوو کەرتی qe (پێشگر) و *-سفین* "سفت بوون، سەخت بوون". خودی وشەی "سڕ" دە ریشەدا بە مانای "سەخت"ە].

**قەسفین qesfîn** [ *qasfîn* ] - "سڕ بوون لە سەرمان": قە (پێشگر) + سفین qe + sıfîn. کەرتەوشەی سفین -sıfîn خزمە دەگەڵ ↑سەفین sefîn و ↑سیپان sîpan و دواجار ↑*سفت sıfit* "سەخت". وشەی "سڕ"یش دە ریشەدا هەر مانای "سەخت" دەدا. کاتێک دەست و قاچی مرۆڤ لە سەرمان یان بە هۆیەکی دیکەوە سڕ دەبێ، ئەوا لە راستیدا رەق و سەخت دەبێ و توانای جووڵانی نامێنێ. لەم بارەوە وشەکە بەرهەڤ بکە دەگەڵ "قەسرین".

**قەسەل qesel** [ *qasal* ] - "1- پرزەی کلۆش دوای دروونەوە 2- پەساخۆر": خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەسیان qesyan** [ *qasyān* ] - "دڵ بەیەکدا هاتن، هێڵنج دان": خزمە دەگەڵ وشەگەلێک وەک ↑کاسkas ، ↑گێژ *gej*، ↑گەشکە geşke و هتد.

**قەسیلە qesîle** [ *qasīla* ] - "جۆرێک کەوچکی دارین": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەچک keçık [قاشق qāšoq (P.)]

**قەش qeş** [ *qaš* ] - "ئاژەڵی توێڵ سپی": خزمە دەگەڵ ↑کەژ[4] kej "کاڵ، سپیکەڵە".

**قەشا qeşa** [ *qašā* ] - "سەهۆڵی ناسک" [دە بنەڕەتدا: توێخی بەستووی سەرەوەی ئاو]. خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەشارتن qeşartın** [ *qašārtın* ] - "تیکوڵ لێ کردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەشتاندن qeştandın** [ *qaştāndın* ] - "1- لە توێکڵ دەرهێنانی گوێز و بادام 2- لە قاپوور جیا کردنەوەی جانەوەری سەدەفدار": خزمە دەگەڵ ↑دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەشقە qeşqe** [ *qašqa* ] - "ئارەزوو": خزمە دەگەڵ ↑حەز ḧez. هەروەها خزمیشە دەگەڵ ↑کەشخە keşxe "جوان" [دە بنەڕەتدا: حەزلێکراو، جێی حەز و ئارەزوو]

**قەشم qeşm** [ *qašm* ] - "قەڵشینی پێست لە سەرمان": خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "تۆکڵ" و دواجار ↑قژ qıj "تووک".

**قەشمەر qeşmer** [ *qašmar* ] - "گاڵتەجار": لەوانەیە پێوەندی بە ↑قۆشمە qoşme وە هەبێ.

**قەشە qeşe** [ *qaša* ] - "مەلای مەسیحییەکان": کشیش kêşîş (P.)، قسیس qasīs (Arb.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Geist (G.) "رووح"، geistig (G.) "رووحی، رووحانی"، geest (Nl.)، ghost (E.) "رووح"، سەر بە ریشەی ***ĝheis-*** (***IE.***) ***<*** "وروژاو، قەڵس، توورە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ -zaēša (Av.) "داچڵەکێنەرانە، قێزهەستێن". لەوانەیە خشم xašm (P.) "تووڕەیی" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. بە پێی بۆچوونی ئێتیمۆلۆگەکان لە مانای بنەڕەتی "وروژان" دواتر مانای "رووح" سەرچاوەی گرتووە. لەوانەیە وشەی "قەشە" بۆ ئەم ریشەیە بگەڕێتەوە و مەبەست "رووحانی"یەکانی ئایینی مەسیحی بێ.

**قەشەم qeşem** [ *qašam* ] - "توێژاڵە سەهۆڵی ناسک": خزمە دەگەڵ ↑قەژە qeje "توێژاڵ".

**قەشەنگ qeşeng** [ *qašang* ] - "جوان": قشنگ qašang (P.). دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑کەشخە *keşxe* [بە تیوەخزانی فۆتیمی n].

**قەشیتن qeşîtın** [ *qašītın* ] - "تەرە بوون، چوونی بێ گەڕانەوە": هەروەها قەشتاندن qeştandın هەیە بە مانای "دەر کردن، ترۆ کردن". وێ دەچێ وشەکە پێک هاتبێ لە پێشگری قە + شیتن qe + şîtın. کەرتەوشەی "شیتن" دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چوون çun [شدن šodan (P.)].

**قەف1 qef 1** [ *qaf* ] - "ئەندازەی دەوری شتێک، ئەستوورایی": [قەفی مار]، خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستوورایی"دا باس کراون.

**قەف2 qef 2** [ *qaf* ] - "1- ئەشکەوت 2- پەناگا": خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep "دەم داپچڕین" و مەبەست لێرەدا دەم داپچڕینی شاخە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ gap (E.) "کون، کەلێن" و gaffen (G.) "دەم داپچڕین". وشەی کهف kahf (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە. هەروەها دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑کون kun.

**قەف3 qef 3** [ *qaf* ] - "1- خوارایی گۆچان 2- ئاڵقەی بەن و گوریس": پێوەندی هەیە بە ریشەی ***-kubh**** (***IE.***) "چەمانەوە، خڕ بوون". ↑گۆپک gopık و ↑گێپەر *geper* و ژمارەیەک وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون. خزمیشە دەگەڵ ↑قەف1 qef 1 "ئەندازەی دەوری شتێک، ئەستوورایی".

**قەف4 qef 4** [ *qaf* ] - "سەوڵی کەلەک لێخوڕین": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سەوڵ sewıl [سەب + ل ← سەوڵ]، سەر بە ریشەی ***-skeub**** (***IE.***) "پاڵ پێوەنان، ڕامالین، هاویشتن، پێدادان".

**قەف5 qef 5** [ *qaf* ] - "گاشەبەردی زل لە چیا": ↑کەڤر kevır "بەرد".

**قەفازتن qefaztın** ⌊ *qafāztın* ⌋ - "بازی بلیند بردن، پەڕین": هەروەها قەفاز qefaz [قەڤز qevız] هەیە بە مانای "بازدی بڵیند، پەڕین بە باز". قە (پێشگر) + فازتن qe+ faztın. کەرتی "فازتن" خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑بزووتن bızûtın، ↑بازد bazd. پێشگری قە -qe شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ئە -e یان هە -he کە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی دێ، وەک *قەسرین* "سڕ بوون لە سەرمان"، *قەفاڵتن* "بەستن، راوەستاندن"، *قەتەک* "ئامرازی تەتەلە کردنی تووتن"، *قەتمەر* "مۆر، بنەوشی تاریک".

**قەفاڵتن qefaltın** ⌊ *qafāltın* ⌋ - "1- بەستن، راوەستاندن 2- سڕ بوون لە سەرمان": پێک هاتووە لە قە (پێشگر) + فاڵتن qe + faltın. کەرتی "فاڵتن" خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: walten (G.)، wealdan (OE.)، waldan (Gt.) "دەسەڵات بەسەردا هەبوون، بەسەردا زاڵ بوون، بەرێوە بردن"، Gewalt (G.)، (gi)walt (OG.)، geweld (Nl.)، (ge)weald (OE.)، vald (Sw.) "دەسەڵات، زەبر و زەنگ، زاڵ بوون"، vladet (Rus.) "زاڵ بوون، دەست بەسەردا گرتن"، vladyti (Lit.) "فەرمانڕەوایی کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *ual-dh- (IE.)** و دواتریش **< *ual- (IE.)** "سەخت بوون، پتەو بوون". valere (L.) "پتەو بوون، بەهێز بوون" پێوەندی بەم وشانەوەی سەرەوە هەیە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا بۆ وێنە ↑پاڵەوان palewan. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە لە مانای بنەڕەتی "سەخت، پتەو، بەهێز" دە زمانی کوردمادیدا مانای "سڕ بوون" و "بەستن، راوەستاندن" سەریان هەڵداوە.

[تێبینی: وشەی "سڕ"یش دە ریشەدا بە مانای "سەخت"ە، چونکوو سڕ بوون بریتییە لە سەخت بوون و رەق بوون و لە جووڵە وەستان. سەبارەت بە مانای "راوەستاندن" بۆ وشەکە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ کرداری "پێوەستان" بە مانای "پێ وێران، بەسەردا زاڵ بوون". وەک لێرەدا دەبینین "راوەستاندن" و "پێوەستان" چەشتێک لە زاڵ بوون و دەسەڵات هەبوون بە سەر شتێکدا، کارێک یان کەسێکدا نیشان دەدەن. دیسان سەبارەت بە پێوەندی ئەو چەمکانەی سەرەوە سەرنجی ئەم وشانەی خوارەوە بدە کە هەموویان لە ریشەیەکن: خار "سەخت، پتەو"، خورت "بەهێز"، *کورد* "بەهێز، پاڵەوان"، کرِ "ئارام، بێجووڵە"، *قورس* "قایم، سەقامگیر"، *گیرسانەوە* "جێگیر بوون"، *کارین* "توانین"].

**قەفانجەرە qefancere** ⌊ *qafānjara* ⌋ - "ئامرازێکی لە توول چنراو بۆ ماسی گرتن": ↑قەبانجەرە qebancere ش دەگوترێ.

**قەفانچەلە qefançele** ⌊ *qafānčala* ⌋ - "1- گرێدانی بە ئاڵقە 2- ئاڵقەیەکی دارین": دەشێ لە وشەی ↑کەوان kewan وەرگیرابێ و لەم تێڕوانینەوە ماناکە دەبێتە "کەوانی بچووک". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑گاو یان گەو gew / gaw بە مانای "ئاڵقە، کەوانەی ئاسن" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

**قەفاندن1 qefandın** ⌊ *qafāndın* ⌋ - "پەنا دان": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑حەواندن ħewandın.

**قەفاندن2 qefandın** ⌊ *qafāndın* ⌋ - "سەوڵ لێدان": بڕوانە ↑قەف[4] qef "سەوڵی کەڵەک لێخوڕین".

**قەفتیس qeftîs** ⌊ *qeftīs* ⌋ - "چاڵ و چووڵ، کەند و لەند": خزمە دەگەڵ گاود gawd، گود goud (P.) "قووڵ" و دواجار دەگەڵ ↑کون kun. کەرتی îs- پاشگری بە ئاوەڵناو کردنە لە دۆخی جەختاندن دا. ئەم پاشگرە بە چەندین شێوە خۆ نیشان دەدا، لەوانە ↑ئۆز oz-. بەم پێیە مانای راستی وشەکە دەبێتە "پڕ چاڵ و چووڵ"، نەک "چاڵ و چووڵ".

**قەفل qefıl** ⌊ *qafıl* ⌋ - "قولێک لە درۆێنە": شێوەی کۆنتری ↑قول qul.

**قەفچل qefçıl** [ *qafçıl* ] - "1- خڵتەی ناو سەبیلە و دەمنە 2- لیکاوی دەم 3- قسەی بێشەرمانە": قەف + چل qef + çıl. کەرتی یەکەم مانای "دەم، زار، کون، کەلێن" دەدا [بڕوانە ↑کون kun]. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تەڕ و لیچق بوون" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە، بۆ وێنە ↑چلم çılım.

**قەفۆك qefok** [ *qafok* ] - "لافاوی زۆر بەهێز و بەتەوژم": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قاپۆ(ك) qapo(k) "ئاومالك".

**قەفەزە qefeze** [ *qafaza* ] - "1- ویترین، چاوەچاوەی لە دار بۆ کەل و پەل لەسەر دانان 2- شباکی سەر مەزارگە": خزمە دەگەڵ ↑قەفەس qefes.

**قەفەس qefes** [ *qafas* ] - "رکە، بیرکم": قەفەز qefez یش دەگوترێ. قفس qafas (P.). خزمە دەگەڵ Käfig (G.)، cage (E.)، chevia (OG.)، kevie (Nl.) "قەفەس"، cavea (L.) "قەفەس، قوتوو". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر cavus (L.) "چاڵە، قوڵکە". خودی ئەم وشە لاتینییە خزمە دەگەڵ ↑کون kun.

**قەفەڵ qefel** [ *qafal* ] - "چۆڵەمە": قەفەڵ وشەیەکی کۆنە کە خزمە دەگەڵ Gabel (G.)، gabala (OG.)، gaffel (Nl.)، gafol (OE.) "چەتاڵ، چەنگاڵ"، gabul (OIr.) "دوولك، لقی دووفلیقانە"، سەر بە ریشەی **_(IE.) *ghbh-(o)l- >_** "دووفاقە بوون، دووحاچە بوون". دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە چەندین لق و پۆی لێ دەبێتەوە، وەك gabeln (G.) [چاوكَ] و Gabelung (G.) [ناوی مانا] "دووشاخە بوون، بوون بە دوو فاق". "قەفەڵ" واتا چۆڵەمە ئێسکێکی دوولق واتا دووفلیقانەیە و لەبەر ئەوە وەسا ناو نراوە. دیارە وشەکە دە زمانی کوردمادی سەردەمانی کۆندا مانایەکی بەربڵاوتری هەبووە و بە گشتی بە شتی دووفاقە گوتراوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەفاك kefak "تەپڵەسەر".

**قەفەنگێو qefengew** [ *qafangew* ] - "بەسەر یەکدا کەڵەکەکراو": دەشێ پێکهاتبێ لە قەف + ئەنگێو qef + engew. کەرتی قەف -qef دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قۆپی qopî بە مانای "زۆر و زەوەندی". کەرتی ئەنگێو -engew دەچێتەوە سەر ↑کەوتن kewtın [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑ئەنگاوتن engawtın]. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "زۆر (بەسەریەکدا) کەوتوو".

**قەفیژ qefîj** [ *qafīž* ] - "پێوانەیەکی دەخڵە": قفیز qafīz (P.). خزمە دەگەڵ ↑قاپ qap "دەفر".

**قەڤازتن qevaztın** [ *qavāztın* ] - "بازدی بڵیند هاویشتن": خزمە دەگەڵ ↑بازد bazd و ↑بزووتن bızutın و ژمارەیەك وشەی دیکە. وشەکە دەشێ کۆنتر _هەڤازتن_ _*hevaztın_ بووبێ [هە + ڤازتن he + vaztın] و ئینجا فۆتیمی h گوڕدرابێ بە q. [پێشگری "هە" یان "ئە" he / e دەگەڵ هێندێک کرداری دیکەش بەکار دێ، وەك هەنجنین، هەنگران، هەویستن و هتد].

**قەقنەس qeqnes** [ *qaqnas* ] - "باڵدارێکی ئەفسانەیی": > _cycnus (L.)_ "قورینكَ". قو qū (P.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە، بەڵام وشەی کوردمادی "قورینكَ" دەشێ پێوەندی بە ریشەیەکی دیکەوە هەبێ.

**قەڵ1 qel 1** [ *qal* ] - "پەلەوەر (ی قڕەکەر)": ئەم وشەیە چەمکێکی گشتی بۆ ناوی ژمارەیەك لە پەلەوەرەکان وەك ↑قشقەڵە، قەڵەرەشە، قەلەموونە، قەلەسابوونە. وێنەیەکی دیکەی وشەکە قەر qer ە کە شێوەیەکی کونترە و دە هێندێك وشەدا بەدی دەکرێ، وەك ↑قەرەقووش qereqoş، ↑قەرقاوڵ qerqawıl. تایبەتمەندی ئەم پەلەوەرانە ئەمەیە کە گشتیان دەقڕێنن [دەقیرێنن]. وشەکە خزمە دەگەڵ کلاغ kalāġ (P.)، corus (L.)، Krawa (OG.)، krähe (G.)،

(IE.) *ker-, *ger- > سەر ریشەی "قشقەڵە". ئەم وشانە دەچنەوە (E.) crow ،(Nl.) kraii "قڕاندن، قیڕاندن، بە دەنگیکی هیشك خوێندن یان هاوار کردن".

**قەل2 qel 2** [ *qal* ] - "قەل کردن واتا هەڵپاچین، بڕین": خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەك بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێك جودا کردن".

**قەڵا(ت) qela(t)** [ *qalā(t)* ] - "خانووبەرەی قایم و شوورەداری داخراو کە بۆ خۆ پاراستن کەڵکی لێ وەرگیراوە": ↑کەلات kelat یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schloß (G.)، sloz (OG.) "قەڵات". وشە ژێرمەنییەکان دەگەڕێنەوە سەر ریشەیەك بە مانای داخستن. [ schließen (G.) "داخستن"]. قەڵا جێگەیەکی داخراو بووە و لەبەر ئەمە بەم جۆرە ناودێر کراوە. وشەکە خزمە دەگەڵ چەندان وشەی کوردمادی وەك ↑گاڵە gale دان واتا "داخستن"، ↑کلیل kılîl "ئامرازی داخستن"، ↑کلۆم kılom "قفڵی دارین" و هتد. وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە بووەتە قلعة qelɛe (Arb.).

**قەڵاپەچن qelapeçın** [ *qalāpačın* ] - "لەسەریەك دانراو، پڕاوپڕ": قەلا qela + پەستن pestın [↑پەستاوتن pestawtın]. ئەم وشەیە بۆ ئەو شتانە بەکار دێ کە دە ناو دەفرێکدا دەپەستاوترێن و زیاتر لە لێواری دەفرەکە بەرز دەبنەوە.

1- بە شیمانەیەکی بەهێز ئەم وشەیە گۆڕدراوی ↑قەرەپەست qerepest ە، [قەرەپەستن].

1- لە لایەکی دیکەوە کەرتی "قەڵا" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قەڵا qela و هەروەها ↑کەڵەکە keleke.

**قەڵاتە qelate** [ *qalāta* ] - قەڵاتە کردن واتا "کەڵەکە کردن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑قەڵا qela و مەبەست وەسەر یەك نان و هەڵچنین بە فۆرمی قەڵا [قەڵات qelat] بێ.

2- klettern (G.) "پێدا هەڵچوون". مانای بنەڕەتی وشەکە بریتییە لە "گیر دان، قایم کردن، پێوەنووساندن" و خزمە دەگەڵ ↑گڵ gıl. مەبەست لە وشە ئەڵمانییەکە سەرەتا دەست و قاچ لە دار و بەرد گیر دان بۆ پێداهەڵچوون بووە. لەوانەیە وشەی "قەڵاتە"ی کوردیش سەرەتا مانایەکی وەك قایم کردن و پێکەوە نووساندنی شت بە مەبەستی کەڵەکە کردن بووبێ.

**قەڵاچۆ qelaço** [ *qalāčo* ] - " قڕ، کوشتار": دەبێ شێوەی کۆنتری ↑قەراچۆ qeraço بێ.

**قەلادە qelade** [ *qalāda* ] - "پەتی ملی تاژی": گڵادە gılade ش دەگوترێ. قەلادە qalāde (P.)، هەروەها ↑کەڵەن kelen بە مانای "قەلادە" بەکار دێ. لەوانەیە ئەم وشانە خزم بن دەگەڵ ↑قەڵا(ت) qela(t) "شوێنی داخراو"، ↑کلیدە kılde "داخراو، دەوردراو" و ↑کلۆم kılom [بە فارسی کلون]. خزمەکانی ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "داخستن، بەستن" دەگەیەنن، وەك داخستنی دەرگا، بەستنی چاو و هتد. لەوانەیە لەم مانایەوە مانای "پەت، بەند" دروست بووبێ، هەروەك چۆن وشەی "بەند"ی کوردمادی خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی ژێرمەنی بە مانای "بەستن و گرێ دان(ی شت بە یەکەوە)".

**قەڵاس qelas** [ *qalās* ] - "1- داسووکە 2- ناوی گیایەکە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "بڕین" دەبەخشن، وەك ↑قەل2 qel 2 "قەل کردن واتا هەڵپاچین، بڕین"، ↑*قەڵشین qelşîn*، ↑قلچك qılçık "پیشگان، داسوو"، ↑قڵخ qılx "بڕینگ" و هتد.

**قەڵافەت qelafet** [ *qalāfat* ] - "هەیکەل، قەد و قەوارە": خزمە دەگەڵ ↑قەلەو qelew و کلفت koloft (P.) "ئەستوور". مەبەست لە قەڵافەت دە بنەڕەتدا قەڵەوی واتا ئەستوورایی بەژنی مرۆڤ بووە، هەروەك چۆن مەبەستیش لە"قەد" دە بنەڕەتدا "باڵا و بڵیندی بەژن" بووە [قەد و قەڵافەت].

[تێبینی: ده زمانی ئەڵمانیدا Größe (G.) ده بنەڕەتدا مانای "گەورەیی" دەدا و لە groß (G.) وەرگیراوە بە مانای "گەورە، مەزن". وشەی Größe هەروەها بە هەر دوو مانای "قەد" و "قەڵافەت" بەکار دێ].

**قەڵان qelan** [ *qalān* ] - "1- چەمانەوە لە کایەی حەمزەلدا": خزمە دەگەڵ ↑کل kıl "خوار، داهاتوو".

**قەلاندن1 qelandın** [ *qalāndın* ] - "1- سوور کردنەوە 2- قاڵ کردنی رۆن 3- کوڵاندن":

1- لە لایەکەوە دەشێ شێوەیەکی دیکە لە کوڵاندن kulandın [↑کولین kulîn].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە بە مانای یەکەم و دووەمەوە پێوەندی هەبێ بە ↑قاڵ qal.

**قەلاندن2 qelandın** [ *qalāndın* ] - "لە جێ هەڵکەندن و جووڵانی شتی قورس": شێوەیەکی دیکە لە ↑هلاندن hılandın.

**قەلاندۆش qelandoş** [ *qalāndoš* ] - "شان و مل": قلمدوش qelemdûş (P.). قەلان + دۆش doş + qelan. کەرتی "قەلان-" یان دە فارسیدا "قلم-" qelem پێوەندی پەیدا دەکا بە collum (L.) "مل" و خزمە دەگەڵ↑کۆڵ1 kol "شان و پشت، شان و مل".

**قەڵانگ qelang** [ *qalāng* ] - "ئاسن و داری سەر خوار بۆ میوە چنین و کاری دیکە": خزمە دەگەڵ ↑قەلان qelan "داهاتنەوە، خوار بوونەوە".

**قەڵایی qelayî** [ *qalāyī* ] - "کانزایەکی سپییە تاوانەوەی هاسانە و بۆ جۆشدان کەڵکی لێ وەردەگیرێ". قالایی qalayî ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قاڵ qal [قاڵ بوون واتا تاوانەوە]. ئەم وشەیە دەبێ لە زمانی کوردمادییەوە چووبێتە ناو زمانی عەرەبێ و کرابێ بە قلع qalɛ (Arb.).

**قەڵبە qelbe** [ *qalba* ] - "1- بزماری درشت 2- لکەدار 3- چقڵ 4- بڕبەند 5- ددانەی سەر لێوەدیوار، کۆنگرە": خزمە دەگەڵ ↑کەڵپ kelıp "ددانی پیشەوەی ئاژەڵ".

**قەلبەز(ە) qelbez(e)** [ *qalbaz(a)* ] - "1- تاقگە 2 - شەپۆلی بچووک": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑غەڵبە ġelbe.

**قەڵپووز qelpuz** [ *qalpūz* ] - "زەقایی پێشەوەی زین": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەرپۆز qerpoz.

**قەڵپە qelpe** [ *qalpa* ] - "زەقایی زەویی": خزمە دەگەڵ ↑کێل kel "بەردی زەق و بڵیند".

**قەڵت qelt** [ *qalt* ] - دەگەڵ "بڕ" دێ [قەڵت و بڕ qelt u bır کردن واتا لەت و کوت کردن]. خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن".

**قەڵتاندن qeltandın** [ *qaltāndın* ] - "قرتاندن": خزمە دەگەڵ ↑قەڵشین qelşîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن".

**قەڵخان qelxan** [ *qalxān* ] - "مەتاڵ، سپەر": قەڵغان qelġn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کالان kalan "جێگەی شمشێر تینان" و ↑هاڵان halan "لێهاڵان"، سەر بە ریشەیەک بە مانای"داپۆشین، پۆشین".

**قەلزان qelızan** [ *qalızān* ] - "بە خشکە و ماتەمات بۆ شتێک چوون": قەلزین qelızîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑خلیسکان xılîskan، ↑گلان gılan، ↑خلۆر xılor و هیتر کە ئاماژە بە چەمکی "خوشین و خزین" دەکەن.

**قەڵس qelıs** [ *qalıs* ] - "تووڕە": قارس qarıs یش دەگوترێ کە ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکەیە. هەروەها وشەی ↑جارز carız یان ↑جارس carıs پێوەندی بەم وشەوە هەیە.

1- ↑جرت ²cırt.

2- gräßlich (G.) "ترسێنەر، داچڵەکێنەر". ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر graz (MG.) "قەڵس، تووڕە" (ریشە؟)

**قەڵشین qelşîn** *[ qalšīn ]* - "درز بردن، لەت بوون": کەڵشین kelşîn یش دەگوترێ. هەروەها کەلاشتن kelaştın هەیە بە مانای "قەڵشاندن". سەر بە خێزانەوشەیەکی گەورەیە کە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*(s)kel (IE.)** "قەڵشاندن، برین، لێک جودا کردنەوە". kláein (Gr.) "شکان، شکاندن، قەڵشاندن"، kládos (Gr.) "لقەدار"، koloda (Rus.) " داری خانوو"، Holz (G.) "دار(ی سووتان)"، skélti (Lit.)، skilja (OIs.)، scielian (OE.) "قەڵشاندن"، schallen (G.) "تویکڵ کردن" و بە دەیان وشەی دیکە دە زمانە ئەورووپییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیشدا وشەگەلێکی زۆر پێوەندی بەم ریشەوە پەیدا دەکەن، وەک قەل² qel [قەل کردن واتا برین]، ↑قەڵت qelt [قەڵت و بڕ]، ↑کەلووک kelk "پارچەخشتی بچووک"، ↑چاڵ çal "قوڵکە"، ↑قلێل qılel " کوناودیو"، ↑قلیچ qılîc" شمشێر"، ↑قلخان qılxan "دڕکیکە بۆ سووتەمەنی"، ↑قڵخ qılıx "برینگێ"، ↑قلچک qılçık "1- پیشگان 2- داسووکە 3- چڕنووکی پەلەوەر" و هتد.

**قەلفە qelfe** *[qalfa ]* - "دەستە، کۆمەڵ": خزمە دەگەڵ ↑گلۆپ gılop "لامپی خڕ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تۆپەڵەبوون، پێکەوەنووسان، ڕێکگوشران".

**قەلقاندن qelqandın** *[ qalqāndın ]* - "وە لەقەلەق خستن، ڕاژاندن": قە (پێشگر) + لقاندن lıqandın +qe. کەرتەوشەی لقاندن lıqandn- شێوەیەکی دیکەیە لە لەقاندن leqandın [↑لەق1 leq "شل، ناجێگیر"]. پێشگری قە -qe شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ئە -e یان هە -he کە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی دێ، وەک *قەسرین* "سڕ بوون لە سەرمان"، *قەتەک* "ئامرازی تەتەلە کردنی تووتن"، *قەتمەر* "مۆر، بنەوشی تاریک"، *قەفازتن* "بازی بلیند بردن، پەڕین".

[تێبینی: لەوانەیە قلق qalaq (Arb.) "نیگەرانی" لەم وشە کوردمادییەوە وەرگیرابێ].

**قەللە qelle** *[ qalla ]* - دەگەڵ "دەللە" دێ [قەللە و دەللە qelle u delle واتا کەڵەک و کوڵەک]. خزمە دەگەڵ ↑کەڵەک kelek "فریو، تەڵەکە"، "دەللە"ش خزمە دەگەڵ "تەڵەکە".

**قەلوە qelwe** *[ qalwa ]* - "ددانی پێشەوەی دڕندە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڵپ kelp.

**قەڵوو qelu** *[ qalū ]* - "1- نالەبار 2- بەردی لووسی تەختی چەم": بە هەر دوو ماناکەیەوە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "خز و خلیسک، خلیسکان" دەبەخشن، وەک ↑گلان gılan، ↑خلیسکان xılîskan. مانای دووەم، واتا "نالەبار" لێرەوە پەیدا بووە کە بەردی خز و بێ بار ناتوانرێ لەسەر بارێک دابنرێ و سەقامگیر بکرێ. وشەی "نالەبار"یش هەر ئەم مانایە دەبەخشێ، واتا دە بنەڕەتدا بە دار یان بەردێک گوتراوە کە بە هۆی خز و بێ بار بوونی ناکەوێتە سەر باری خۆی و دەگەڵ پێکهاتەکە ناگونجێ.

**قەلووخە qeluxe** *[ qalūxa ]* - "1- ئەسکوێ 2- جۆرێک مراوی دەندووک پان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn [هەڵکۆڵین]. دیارە "قەلووخە" یان "ئەسکۆ" دارێکە هەڵدەکۆڵدرێ و قووڵ دەکرێ. وشەی "ئەسکۆ" هەر بەم چەشنە پێک هاتووە و پێوەندی بە چەمکی "هەڵکۆڵین"ەوە هەیە. مانای دووەمی وشەکە لەمەوە پەیدا بووە کە دەندووکی ئەو جۆرە مراوییە شێوەی "قەلووخە" دەدا و بۆیە بەم ناوە ناسراوە.

**قەلووز qeluz** *[ qalūz ]* - "کووڕ، پشت کۆم": ↑قلووج qıluc یش گوترێ.

**قەلهین qelhîn** *[ qalhīn ]* - "لەناو چوون، شۆنەوار نەمان": هەروەها قەلهاندن qelhandın هەیە بە مانای "لە ناو بردن". خزمە دەگەڵ ↑قڕ qır [قڕ تێکەوتن یان قڕان تێکەوتن].

**قەڵەم qelem** [ *qalam* ] - "پێنووس": ئەم وشەیە و چەندان وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑قالۆر qalor و ↑قالوون qalun، خزمن دەگەڵ kolemo (Gr.) و calmus (L.)، Halm (G.) "قامیش، نەی، لاسکی وشکی گژ و گیا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -kelmo* (IE.)** "قامیش، نەی" و لە پلەیەکی دوورتردا ریشەی **< -kel* (IE.)** "هاڵان، لێهاڵان". دیارە لە کۆندا بۆ نووسین لە قامیش کەڵک وەرگیراوە. لەوە ناچێ ئەم وشەیە لە عەرەبییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردمادی، چونکوو چەندان وشەی خزمی ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا هەیە، کەچی ئەم وشانە دە زمانی عەرەبیدا نین. وەک دەبینین وشەکە دواجار دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هاڵان" و پێوەندی ئەم چەمکانە لێرەدایە کە قامیش یان لاسکی وشکی ناوبەتاڵی گژ وگیا وەک لوولەیەک وایە کە لە دەوری شتێک هاڵابێ. وشەکانی ↑هاڵان halan و ↑کالان kalan "بەرگی خەنجەر"یش لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە.

**قەڵەمباز qelembaz** [ *qalambāz* ] - "بازد، هەنگاوی بلیند": قەڵەم + باز qelem + baz. قەڵەم "بازد". "باز" یش خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بازد bazd. *hálma* (Gr.) > هێنانی دوو وشەی هاومانا و کردنی بە وشەیەکی لێکدراو دۆخی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشێ، وەک لەم وشانەی خوارەوەدا: بانگاشە، جەمبازە، چەواشە، پاکتاو، رەشتاڵە، تەپلۆس، خرخاڵ، سامۆتک و سرشک و هتد.

**قەلەموون qelemun** [ *qalamūn* ] - "ناوی پەلەوەرێکە"، ↑قەل + موون qel + mun. کەرتی موون دەشێ هەمان ↑مۆن mon بێ و مەبەست دە بنەرەتدا "قەلی مۆن و مرچ" بێ.

[تێبینی: ناوێکی دیکەی ئەم پەلەوەرە عەلەشیش εeleşîş ە. عەل εel خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە qel. شیش şîş مانای "بەهێز، قەبە، زل" دەگەیەنێ و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*سەق seq* دا هاتوون. کەوابوو "عەلەشیش" مانای "قەلی زل و قەبە" دەگەیەنێ. ئەم وشەیە لەباری وشەسازییەوە هەڵسەنگینە دەگەڵ سیسارک "مەلی بەهێز" ].

**قەڵەمە qeleme** [ *qalama* ] - "نەمام": خزمە دەگەڵ ↑قەڵەم qelem.

**قەلەندەر qelender** [ *qalandar* ] - "بەلەنگاز، عەوداڵ، دەروێش": قلندر qalandar (P.). خزمە دەگەڵ elend (G.) "بەدبەخت، بێچارە"، ellende (OE.) و elilenti (OG.) "بیانی، ئاوارە". وشەژێرمەنییەکە دەبنەڕەتدا لە دووبەش پێک هاتووە: eli سەر بە ریشەی **< -alja* (IE.)** "هیتر، ئیدیکە" و *land* "وڵات" و تێکڕای وشەکە واتا ئەوکەسەی لە وڵاتی دیکەڕا هاتووە. [دیارە هەر لە کۆنەوە بیانی و ئاوارە بوون پێوەندی بە چەمکی بەدبەختی و بێچارەییەوە هەبووە].

**قەلەنگ qelang** [ *qalang* ] - "قەلادەی تاژی": خزمە دەگەڵ ↑هاڵان halan [لێهاڵاندن].

**قەڵەو qelew** [ *qalaw* ] - "ئەستوور، قەبە": قەرەو qerew یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ کلفت koloft (P.) "ئەستوو". وشەی قەڵەو خزمە دەگەڵ Kraft (G.) بە مانای "هێز، قەوەت، توانایی". kräftig (G.) دەبێتە "بەهێز، قایم". پێوەندی هێز و قەڵەوی و ئەستووریش بە یەکەوە ئاشکرایە. هەروەک چۆن بە پێچەوانەش کزی و بێهێزی و سستی دە یەک چوارچێوەدا جێ دەگرن. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر **< -ger* (IE.)** "با دان، سووڕان، وێکهاتن". [لێرەدا مەبەست وێکهاتن، گورج بوون و ئەستوور بوونی ماسوولکەکان و پەیدا بوونی هێزە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ بەتیکی بادراو کە قایمترە لە بەتیکی خاو].

**قەلیان qelyan** [ *qalyān* ] - "قەننە": قلیان qılyan یش دەگوترێ. قلیان qalyān (P.). خزمە دەگەڵ هێندێک وشی وەک ↑قوڵتە qulta، ↑قوڵپ qulp و ↑*کوڵین kūlīn* و هتد. لەکاتی کێشان قەڵیاندا ئاوەکە دەکەوێتە قوڵتەقوڵت کردن و دەبێ لێرەوە ناوی "قەلیان"ی بۆ داندرابێ.

**قەلیر qelîr** [ *qalīr* ] - "چڵکن، پیس و پەڵۆخ": بنجی قەل qel- خزمە دەگەڵ:

1- ↑یان گڵ gıl [گڵ و خۆڵ] سەر بە ریشەی ***< *glei- (IE.)*** "چەسپ کردن، سواخ دان، تیهەڵسوون".

2-↑یانیش ↑چلۆک çılok [چەور و چڵۆک] و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەی ***< *(s)lei- (IE.)*** "تەڕ و لیچق بوون".

**قەماندن qemandın** [ *qamāndın* ] - "1- وشک کردنەوەی داری تەڕ 2- جلک دە تەنوور وەشاندن 3- نان بە ئاگر راداشتن": هەروەها قەم qem هەیە بە مانای "داری هیشک". ئەم وشانە لە پێوەندیدا دەگەڵ ↑قوماندن qumandın "داخ کردن".

**قەمبوور qembur** [ *qambūr* ] - "پشتکووڕ": قەم + بوور qem + bur. قەم خزمە دەگەڵ خەم xam (P.) "خوار" و ↑کەوان kewan. بوور bur لەوانەیە پێوەندی بە ↑بەر[7] ber "سینگ"ەوە هەبێ.

**قەمپۆز qempoz** [ *qampoz* ] - "لمبۆز، دەم و لووتی ئاژەڵ": قەم + پۆز qem + poz. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ Gaumen (G.)، goumo (OG.)، gom (Sw.) "مەڵاشوو"، gums (E.) "پووک"، gomurys (Gr.)، gamurs (Let.) "قوڕگ، لوولەی هەناسەکێشان". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑کەنین kenîn [پێکەنین] سەر بە ریشەی ***< *ĝhan-, *ĝhēi-, *ĝhēu- (IE.)*** "دەم کردنەوە، زار داپچڕین". کەرتی دووەم، واتا ↑پۆزە poze بە تەنیاش بەکار دێ و خزمە دەگەڵ ↑پیش pîş و ↑پشووpışû "هەناسە" و مەبەست شوێنی ڕەت بوونی هەوا و هەناسەیە.

**قەمت qemt** [ *qamt* ] - "1- پێسیر 2- شەنگڵەبەرەکەتە": هەروەها ↑قەمتی qemtî هەیە بە دوو مانای "1- گرێدراو، پێوەندی 2- ئەوەندە گیایەک لە دەستدا جێ دەبێتەوە": ئەگەر لە هەموو ئەم مانایانە ورد بینەوە، دەبینین چەمکی سەرەکی "پێکەوە بوون، پێک گەیشتن، کۆم بوون"ە. خزمە دەگەڵ samt (G.)، samet (OG.)، samod (OE.) "پێکەوە". دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ ↑جەم *cem* [لەجەم، لەگەڵ].

**قەمتاندن qemtandın** [ *qamtāndın* ] - "بابۆڵەپێچ کردنی منداڵ": خزمە دەگەڵ ↑قەمتەر qemter "دەمبێنی ئاژەڵ"، ↑قەمتک qemtık "دەسرۆکەی سەری ژنان" و دواجار دەگەڵ ↑جامە came "جلوبەرگ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

**قەمتک qemtık** [ *qamtık* ] - "دەسرۆکەی سەری ژنان": خزمە دەگەڵ ↑قەمتاندن qemtandın "بابۆڵەپێچ کردنی منداڵ".

**قەمتەر qemter** [ *qamtar* ] - "1- دەمبێنی ئاژەڵ 2- خەرتێمی بێقلی ورچ و وشتر کە بەنی تێ دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑قەمتک qemtık "دەسرۆکەی سەری ژنان" و دواجار دەگەڵ ↑جامە came "جلوبەرگ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

**قەمتی qemtî** [ *qamtī* ] - "1- گرێدراو، پێوەندی 2- ئەوەندە گیایەک لە دەستدا جێ دەبێتەوە": بڕوانە ↑قەمت qemt.

**قەمچان qemçan** [ *qamčān* ] - "1- پێچان 2- چرچ و لۆچ بوون": بە مانای دوایی لەگەڵ پێشگری "هەڵ" بەکار دێ [↑هەڵقەمچان helqemçan "چرچ و لۆچ بوون"]. خزمە لەگەڵ ↑قەمچاندن qemçandın "پێچاندن" و ↑گەمژە *gemje* و چەندین وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، با دران". شیاوی سەرنجە کە وشەی "چرچ"یش سەر بە ریشەیەکە کە هەمان مانا دەبەخشێ.

قەمچاندن **qemçandın** *[ qamčāndın ]* - "پێچاندن": بنەوشەی قەم -qem دەشێ خزمە دەگەڵ ↑کەوان kewan و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "چەماوی و بادراوی" دەکەن.

قەمرین **qemrîn** *[ qamrīn ]* - "بەستن، بوونە سەهۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑کەمر kemır / ↑کەڤر kevır "بەرد" و مەبەست دە بنەڕەتدا "وەک بەرد رەق بوون"ە. وشەی ↑کەمر kemır "خەڵووزی بەردین" و ↑کەمرە kemre "ریخی پەستراو و رەق بوو" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑حەمڕین ħemrîn.

قەمزە **qemze** *[ qamza ]* - "بەرگ، بەرگی نوشتە": سەر بە ریشەیەکە بە مانای "داپۆشین"، دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑جامە came و چەندین وشەی دیکە.

قەمس **qems** *[ qams ]* - "گزی، ناراستی": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑گەمژە gemje دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "خواری، خوار بوون، چەمانەوە" دەبەخشن.

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "خواری" و "فێڵ" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "گزی" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "خێچ" (کج دە فارسیدا)].

قەمک(ە) **qemk(e)** *[ qamk(a) ]* - "دزی خێرا و لێهاتوو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑قەمزە qemze "بەرگ، بەرگی نوشتە" و ئەو وشانەی ئاماژە بە "داپۆشین" دەکەن. لەم تێڕوانینەوە "قەمکە" ئەو کەسەیە کارێکی شاراوە و نەهێنی [بە دزی] دەکا.

قەمووش **qemûş** *[ qamūš ]* - "سارێژ، توێخی چاک بوونەوەی برین": قەمووش(ک) گرتن واتا سارێژ بوون.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قەمزە qemze "بەرگ، بەرگی نوشتە" و ئەو وشانەی ئاماژە بە "داپۆشین" دەکەن [ بڕوانە ↑*جامە came*].

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گەمرە gemre [یان ↑کەپرە kepre، ↑کەوەڕە kewere] "پەترۆی برین".

قەمە **qem(m)e** *[ qam(m)a ]* - "شمشێری کورت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قامچی qamçî "شەللاق" و ↑قیمە qîme "وردکراو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان، لەت و کوت کردن". ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ kómma (.Gr) "زەبر، لەت، کوت". ئەم وشە یۆنانییە دەچێتەوە سەر kóptein (.Gr) " کوتان" و ئەمەشیان خۆی خزمە دەگەڵ ↑کوتان kutan. شیاوی باسە وشەی کۆما Komma "فاریزە، وێرگول، *ناوبڕ* دە رستە"دا بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر ئەو وشە یۆنانییەی سەرەوە.

قەمەر **qemer** *[ qamar ]* - "1- ئەسپی سووری ئاماڵرەش، کوێتی داوێن تاریک 2- مرۆی گەنم رەنگ، رەش ئەسمەر": وەک دەردەکەوێ مانای وشەکە "تاریکی"یە. خزمە دەگەڵ ↑شێو şêw [شام šām (.P)].

قەمەردین **qemerdîn** *[ qamardīn ]* - "نانەقەیسی، قەیسی پانەوەکراوی هیشک کراو": خزمە دەگەڵ ↑قەمرین qemrîn "بەستن، بوونە سەهۆڵ" و ↑کەمرە kemre "ریخی پەستراو و رەق بوو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەرد" و دواتر مانای "رەق بوون"یان وەرگرتووە. کەرتی "دین" لەم وشەیە دا چ پێوەندییەکی بە "دین و ئایین"ەوە نییە، چونکوو دین و نانەقەیسی لە پێوەندی دەگەڵ یەکتردا نین. تێکڕای وشەکە لەوانەیە پێشتر وەک کردار بەکار هاتبێ، وەکوو "ژماردن، ژمارتن، بواردن، ئاوارتن" و هتد. کردارەکە دەتوانێ بە مانای "هیشک کردن، رەق کردن" بەکار هاتبێ.

**قەمەری qemerî** [ *qamarī* ] - "پارەی ورد، فلس، شایی": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑قەمەر qemer "ئاماڵ رەش، تاریک". لەوانەیە وردەپارەیەکی ئاماڵ رەش بووبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ "پول سیاه" [پووڵی رەش] دە زمانی فارسیدا.

**قەمی qemî** [ *qamī* ] - "ئەشێ، وێ دەچێ":

[سەرەتا تێبینییەک: دە زمانی کوردمادیدا شیان şîyan و هەروەها شیمانە şîmane پێوەندییان هەیە بە چوون çun و بە skehan ‏(OG.)، scōon ‏(OE.) "پەلە کردن، را کردن، بەرەو پێش چوون، پێش هاتن، قەومان"].

هەر بەم جۆرە وشەی قەمی qemî و لەوانەیە ↑گومان guman یش پێوەندییان هەبێ بە ↑قەومان qewman. خودی وشەی "قەومان" مانای "(پێش) هاتن" دەبەخشێ. سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "هاتن" و "چوون" و "شیان و شیمانە" بڕوانە روون کردنەوەی ژێر وشەی "شیان".

**قەنارە qenare** [ *qanāra* ] - "سێدارە": بنەوشەی قەن -qen خزمە دەگەڵ ↑خنکان xınkan. قەنارە واتا "داری خنکاندن" یاخود "ئامرازی خنکاندن".

**قەناری qenarî** [ *qanārī* ] - "پەلەوەرێکی زەردرەنگی خۆشدەنگە": بە پێی بۆچوونێک ئەم ناوە لە ناوی گراوی kanari وەرگیراوە، واتا دەبێ قەناری لەم شوێنەوە هێنرابێ بۆ وڵاتانی دیکە.

**قەناس qen(n)as** [ *qan(n)ās* ] - "زەوی خوار خێچی لایەک تەسک و لایەک پان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ knicken ‏(G.) "خوار کردنەوە، نووشتاندنەوە"، kneikja ‏(OIs.) "خوار کردنەوە، وێک هێنان". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *gneig-* (IE.)** "قورینجاندن، گنج کردن، نووشتاندنەوە، چەماندنەوە"، شێوەی پەرەگرتووی ریشەی **< *gen* (IE.)** "رێکگوشین، وێک هێنان، تۆپەڵ کردن".

**قەنتەرە qentere** [ *qantara* ] - "ئاوبارە، داری ناوکۆڵدراو بۆ پەڕاندنەوەی ئاو": قەن + تەرە qen + tere. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر کەندن kendın [↑هەڵکەندن helkendın، هەڵقەندن]، کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر وشەی ↑دار dar. تێکڕای وشەکە دەبێتە "داری هەڵکەندراو" یاخود هەڵکۆڵدراو.

**قەند qend** [ *qand* ] - "شەکری پێکەوەچەسپاوی درشت": دە زمانی ئینگلیزیدا candy ‏(E.) دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ candidus ‏(L.) "سپییەکی جوان و درەوشاوە" و candesco ‏(L.) "وەک بەفر درەوشاوە". لەوانەیە قەند بە هۆی رەنگە سپی و درەوشاوەکەی ئەو ناوەی بۆ دانرابێ.

**قەندی qendî** [ *qandī* ] - دەگەڵ "توڵە" دێ [توڵەقەندی واتا توڵەسەگی راو]. ئەم وشەیە لەوە ناچێ پێوەندی بە "قەند و شەکر"ەوە هەبێ. لە وڵاتی ئێمە کە سەگ و پشیلەی بەستەزمان رۆژانە سەد شەقی نامەردانەیان وێ دەکەوێ، سەیر دەبێ سەگ بە "قەند" وەسف کرابێ. ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ hunt ‏(E.)، huntian ‏(OE.) "راو کردن، راو نان"، herihundu ‏(OG.) "دەسکەوتی شەڕ"، frahin?an ‏(Gt.) "دیل گرتن"، hun?s ‏(Gt.) "تێچیر". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان دیاری نەکراوە.

**قەندیل qendîl** [ *qandīl* ] - "چیایەکی بەناوبانگ بۆ سەختی و بەرخۆدان":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑جنگ cıng "جم، بزاڤ"، ↑جنقین cınqin "راپەڕین لە خەو" و ↑چندک *çındık* "وەزاق دان، هەڵبەزین"، ↑جەنگ ceng "شەڕ"، ↑ژەندن jendın "لێدان"، ↑گنایەنە

gınayene "وێککەوتن" و ↑کەندن² kendın سەر بە ریشەیەك بە مانای "لێدان". لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "شەڕ و راپەڕین" پەیدا دەکا.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قەندیلە qendîle "چرای دالەقاو"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "درەوشانەوە، ترووسکانەوە". لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە وشەکە دەتوانێ ئاماژە کردن بە بەفری سەر چیاکە بێ.

**قەندیلە qendîle** [ *qandīla* ] - "چرای دالەقاو 2- قوتیلکەچرا": > *candēla* (*L.*) > *candēre* (*L.*) "درەوشانەوە، ترووسکانەوە".

**قەننە qenne** [ *qanna* ] - "قەلیان": قەندە qende ش دەگوترێ. دەبێ وەرگیرابێ لە > *canna* (*L.*) "لوولە" [ئاماژەیە بەو لوولە درێژەی دەمی پێوە دەنرێ]. وشەکانی Kanone "تۆپی شەڕ" و Kanal "چەمی دەستکرد" دە زمانە ئەورووپییەکاندا لەو وشە لاتینییە وەرگیراون. خودی ئەم وشە لاتینییە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑قامیش qamîş.

**قەنەپە qenepe** [ *qanapa* ] - "کاناپە": کاناپە kanape ش دەگوترێ > *canopy* (*E.*) "کاناپە" > *cōnōpēum* (*L.*) " تۆڕی سەر نوێن و بان" > *kōnōpeion* (*Gr.*) "نوێن و بانی قیبتی بە پێشکەبەندەوە" > *kōnōps* (*Gr.*) " مێش، پێشکە".

**قەنەفلێ** qenefle [ *qanafle* ] - "سەرتەنگەی پاڵان": خزمە دەگەڵ ↑قنب qınb "گوشینگەی لە دار بۆ پلیخاندنەوەی ترێ".

**قەنەك qenek** [ *qanak* ] - "هەرشتێ کە ریسی لەسەر هەڵ دەکرێ": دەچێتەوە سەر ریشەی > ***gen*** (***IE.***) "رێککوشین، وێکهێنان، تۆپەڵ کردن". بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ" و گەلێك وشەی دیکە.

**قەنەواچە qenewaçe** [ *qanawača* ] - "ناوئاخنی جلك": اگنە agene (P.). کەرتی قەنە qene- خزمە دەگەڵ ↑ئاخنین axnîn [a-xınîn]. کەرتی واچە -waçe خزمە دەگەڵ ↑واژی wajî [ئاوەژوو].

**قەوار qewar** [ *qawār* ] - "کاکڵ، ناوەرۆك": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین ĥemrîn دا باس کراون. ئەم وشانە هەڵگری چەمکی "بەرد، رەق، سەخت"ن. مەبەست لە "قەوار" سەرەتا ناوکی رەقی میوەیە، دواتر بە گشتی مانای کاکڵ و ناوەرۆکی وەرگرتووە. لەباری ماناوە هەڵیسەنگینە دەگەڵ *هەستی* "1-بەرد 2- ئێسك 3- ناوکی میوە". وەك دەبینین ئەم وشەیەش جگە لە مانای "ناوکی میوە" [رەقایی ناوەوەی میوە] هەروەها مانای "ئێسك" و "بەرد" دەبەخشێ.

**قەوارتن qewartın** [ *qawārtın* ] - "کاکڵ دەرهێنان": دەچێتەوە سەر ↑قەوار qewar "کاکڵ، ناوەرۆك".

**قەواش qewaş** [ *qawāš* ] - "کەوگیر": خزمە یان شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑کەوچك kewçık.

**قەوال qewal** [ *qawāl* ] - "پیاوی ئایینی ئێزیدی (ئەزدایی) لە پایەی هەرە ژێردا":

1- لەوانەیە شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑گەورە gewre. ئەم وشەی خۆی ناوێك بووە بۆ گەورەکانی زەردەشتی [گبر gabr (P.) "زەردەشتی"]. لەوانەیە دواتر مانای وشەکە گۆڕدرابێ بۆ "پیاوی ئایینی پلەنزم".

2- یان لەوانەیە بچێتەوە سەر قول qawl (Arb.) "قسە" و مەبەست "قسەکەر" بێ.

**قەوان qewan** [ *qawān* ] - "سەفحەی گرامافۆن": خزمە دەگەڵ ↑کەوان kewan و ↑چەمان çeman و ↑گەمارۆ gemaro وچەند وشەیەکی دیکە کە ئاماژە بە بە چەمکی چەمانەوە و دۆخی بازنەیی و خڕ بوون دەکەن. قەوان، سواپ (سەفحە) یەکی خڕە و لە بەر خڕ بوونەکەی بەم جۆرە ناوزەد کراوە.

**قەوچ qewç** [ *qawč* ] - "1- دەم خوار 2- گێلۆکە": هەروەها قەوچە بوون qewçe bun هەیە بە مانای "سەرلێشێوان". خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑گەمژە gemje و ↑گەوز *gewz* دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "خواری، خوار بوون، چەمانەوە" دەبەخشن.

**قەوچە¹ qewçe** [ *qawča* ] - قەوچە بوون qewçe bun بە مانای "سەرلێشێوان" بەکار دێ. بڕوانە ↑قەوچ qewç "1- دەم خوار 2- گێلۆکە".

**قەوچە² qewçe** [ *qawča* ] - "شەویلکە جوڵاندن بە دەمی ئاوەڵاوە": خزمە دەگەڵ ↑قەپ qap و چەند وشەیەکی دیکە کە دە ریشەدا ئاماژە بە "دەم کردنەوە" دەکەن.

**قەوراندن qewrandın** [ *qawrāndın* ] - "دەرکردن، قاو دان": دەشێ پێوەندی بە وشەی ↑ئاوارە aware "دەرکراو" هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "ئاوارە کردن" بووبێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑غەوارە ġeware "غەریبە"].

**قەورە qewre** [ *qawra* ] - "بڕبەند، ئامرازی تیژ کردن": خزمە دەگەڵ ↑کەڤر kevır "بەرد" [دە بنچینەدا مەبەست بەردی تیژ کردن بووە. هەروەها لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی "هەسان" و "سۆهان" کە ئەوانیش دەبنەڕەتدا بەمانای "بەرد"ن].

**قەوزە qewze** [ *qawza* ] - "1- گیایەکی لیچقە سەر ئاو دادەپۆشێ 2- کرێژەبەرد": بە مانای دووەم دە زمانی فارسیدا پێی دەگوترێ خزە xaze (.P). بڕوانە ↑کەڤز kevız کە شێوەیەکی کۆنتری وشەکە نیشان دەدا.

**قەوش qewş** [ *qawš* ] - "کڵۆشی سەر خەرمان": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قۆش qoş.

**قەوغا qewġa** [ *qawġā* ] - "دەنگە و هەرای زۆر": خزمە دەگەڵ ↑قاو qaw [قاو کردن، *قاوەقاو*].

**قەولک qewlık** [ *qawlık* ] - "توورەکەی بچووکی وردەشت": هەروەها قەولەک qewlek هەیە بە مانای "1- کلتوور [*توورەکەی کل*] 2- توورەکەی چکۆڵە". دیارە ئەم دوو وشەیە دە بنەڕەتدا هەر یەکن. خزمە دەگەڵ ↑جەواڵ cewal.

**قەومان qewman** [ *qawmān* ] - "ڕوودان": قەومین qewmîn ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ kommen (.G)، coman (.OG)، qiman (.Gt)، come (.E)، komma (.Sw) سەر بە ریشەی< ***gem-** (*IE.*) "ڕویشتن، هاتن". gimti (.Lit) "بە دونیا هاتن" دەبردرێتەوە سەر ئەم ریشەیە. لەم تێڕوانینەوە "قەومان" واتا "پێش هاتن"ی ڕووداوێک.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی geschehen (.G) مانای "قەومان، ڕوودان" دەبەخشێ و ئەم وشەیەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ڕا کردن، بەپەلە دەرباز بوون". وشە ئەڵمانییەکە خزمە دەگەڵ "چوون"ی خۆمان. مانای "قەومان" بۆ ئەم وشەیە لێرەوەپەیدا بووە کە ڕووداوەکان وەک شتێک لەبەرچاو گیراون کە کوتوپڕ دێنەپێش یان دەرباز دەبن].

**قەوەت qewet** [ *qawat* ] - وشەیەکە بە مانای "گیانە، گیانەکەم":

1- لەوانەیە لە قوة quwwa (.Arb) وەرگیراوە بە مانای "هێز، قەوەت" و دە بنەڕەتدا مەبەست "هێزی هەناو، هێزی دەروون، قەوەتی ژیان" بووبێ. خودی وشە عەرەبییەکە لەوانەیە لە ↑قەبە qebe ی کوردمادی وەرگیرابێ.

2- لەوانەشە شێوەیەکی دیکە بێ لە وشەی "گیان" و پێوەندی هەبێ بە ↑ژین jîn، qius (Gt.) "زیندوو"، kvick (Sw.)، keck (G.)، quick (E.) "خێرا، چوست و چالاک، سەرزیندوو"، سەر بە ریشەی *guei-* (IE.) > "ژین، ژیان". ↑جیوە cîwe ش دەگەڵ ئەم وشانە بە خزم دەردەچێ.

**قەی qey** [ *qay* ] - کورتکراوی ↑قەید qeyd [قەی چییە واتا قەیدی چییە].

**قەیاسە qeyase** [ *qayāsa* ] - "باربەندی پانی لە چەرم": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قایش qayış "بەندی چەرم".

**قەیتان qeytan** [ *qaytān* ] - "بەند، بەن": لەوە دەچێ لە وشەی *قید qeyd* (Arb.) > "[قەید و بەند] وەرگیرابێ. پێوەندی هەیە بە وشەی ↑کۆت kot [کوت و زنجیر].

**قەیتەران qeyteran** [ *qaytarān* ] - دەگەڵ "قارەمان" دێ [قارەمان و قەیتەران]. شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑قەیسەر qeyser "ئیمپراتۆر".

**قەیچی qeaçî** [ *qayčī* ] - "برینگ، تۆرتو": قیچی qeyčī (P.). دەچێتەوە سەر ↑قاچین qaçîn "برین". شیاوی باسە "برینگ" دەچێتەوە سەر "برین" و "تۆرتو"ش دەچێتەوە سەر "درین".

**قەید qeyd** [ *qayd* ] - "پەت و زنجیر 2- جومگەی یەکسم 3- هەوای گۆرانی": قەیدک qeydık یش دەگوترێ. "قەیدک" هەروەها بە مانای "پەراوێزی نووسین" بەکار دێ. لە گشت ئەم مانایانەدا چەمکی "پێوەست بوون، پێوە بەند بوون" لە ئارادایە. "قەید" بە مانای "هەوای گۆرانی"یش هەر وەک "بەند" وایە کە ئەویش بە مانای "گۆرانی" دێ و دە بنەڕەتدا مەبەست بەند بەندی گۆرانییەکەیە کە تیک دەخرێتەوە. وشەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیراوە، بەڵام ئەمەش خۆی شێوەی عەرەبێنراوی ↑کوت kot "بەند، زنجیر"ە.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا " قەیدی ناکا" بە مانای "گرفت نییە" بەکار دێ - بەرانبەری no problem یان never mind (E.). کاتێک سەبارەت بە کردنی کارێک دەگوترێ "قەیدی ناکا"، مەبەست لە بنچینەدا ئەوەیە کە کردنی کارەکە قەید و بەندێکی لە بەر نییە، بە وتەیەکی دیکە مرۆڤ *ئازادە* لە ئەنجام دانی کارەکەدا].

**قەیدک qeydık** [ *qaydık* ] - "زنجیری پەلبەندی یەکسم": خزمە دەگەڵ ↑قەیتان qeytan (P.) "بەند".

**قەیران qeyran** [ *qayrān* ] - "1- جەنگەی توند و تیژی نەخۆشی 2- بوحران، کریزە": دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەی crisis بە مانای "بوحران" بە کاردێ کە دە بنچینەدا وشەیەکی یۆنانییە و بە مانای "جەنگەی توند و تیژی نەخۆشی" بەکار هاتووە و مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا "کاتی بڕیاردەر بۆ نەخۆشی" بووە. وشە یۆنانییەکە دەچێتەوە سەر krinein (Gr.) "کرتان، بڕین، لەت کردن" و وەک باس کرا مەبەستەکە "*بڕیار* دان"ی بارودۆخی نەخۆشییەکە بووە کە لایەکی بە لایەکدا دەکەوێ. وێ دەچێ وشەی "قەیران"ی کوردمادیش هەر لەسەر ئەم پێودانە دروست کرابێ و پێوەندی هەبێ بە وشەکانی ↑کرتان kırtan "بڕان، لەت بوون"و ↑کەرت kert "پاژ، لەت ". وێ دەچێ وشە کوردمادییەکان دەگەڵ وشە یۆنانییەکانی سەرەوە دە ریشەدا خزم بن.

**قەیرە qeyre** [ *qayra* ] - "بەتەمەنتر لە لاو، لاوێنی بەسەربردوو": خزمە دەگەڵ hehr (G.)، hēr (OG.) "بەڕێز، جێکەوتوو، پیرۆز"، hoary (E.) "بەڕێز، بەتەمەن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ hār (OE.) "بۆر، پیر"، hārr (OIs.) "بۆر، بۆز". مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە و قەیرەی کوردمادی بۆر بوون [بۆز بوونی] مووی سەر بە هۆی چوونەسەری تەمەن بووە کە ئەمەش بە مایەی ڕێز و جێکەوتوویی داندراوە. وشەی Herr (G.) "بەڕێز، ئاغا" پێوەندی بەم

وشانەوە هەیە. "قەیرە"ش دە زمانی کوردمادیدا سەرەتا نەک هەر بۆ کچ بەڵکوو بەگشتی بۆ مرۆڤی بە تەمەن بەکار هاتووە کە سەری بۆز بووە [ یاخود مووی سپی تێ کەوتووە] و دواتر ماناکەی بەرتەسکتر بووەتەوە و تەنیا بۆ کچی بەساڵداچوو کەڵکی لێ وەرگیراوە. وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *koiro- >** "بۆر".

[تێبینی: فەرهەنگی ئێتیمۆلۆگی DUDEN ی ئەڵمانی وشە ژێرمەنییەکان دەباتەوە سەر ریشەی **(IE.) *kei- >**، کە بەگشتی بۆ نیشان دانی رەنگی تاریک بەکار هاتووە، وەک (OIr.) cīar "قاوەیی تاریک"، (Rus.) seryj "بۆر"].

**قەیسک qeysık** [ *qaysık* ] - "بانگردێن، بانگلێر": خزمە دەگەڵ ↑کاس kas بوون "گێژ بوون".

**قەیسەر qeyser** [ *qaysar* ] - "ئیمپراتۆر": ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادی و فارسی و عەرەبیدا بەکار دێ، دەچێتەوە سەر *(Gr.) kaīsar >* "سێزار، ئیمپراتۆر". ئەم وشە یۆنانییە لە رێگەی زمانی لاتینەوە چووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکان و هەروەها سلاڤییەکانەوە. لەوانەیە ئەسڵی وشەکە لە دوو کەرت پێک هاتبێ و کەرتی یەکەم -kāi خزم بێ دەگەڵ کەی key دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە مانای "شا" [کەیخوسرەو، کەیقوباد، کەیکاوس و هتد].

**قەیسی qeysî** [ *qaysī* ] - "زەردئاڵوو": دە زمانی لاتینیدا بە قەیسی دەگوترێ praecoquus کە لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی یەکەم مانای "زوو، بەرێ" و کەرتی دووەمیش مانای "گەیشتن، پێگەیشتن" دە بەخشێ و مانای تێکرای وشەکە دەبێتە "زوو بەر دێنێ، زوو پێ دەگا". بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پێوەندییە دەتوانین وای بۆ بچین کە "قەیسی" دە بنەڕەتدا گە*هیزی* **gehîzî*** بووبێ. دە زاراوەی کوردمادی سەروودا شێوە کۆنترەکەی وشەی "گەیشتن" ماوەتەوە کە دەبێتە ↑گەهیژتن gehîjtın.

**قەیقەناخ qeyqenax** [ *qayqanāx* ] - "هێلکەورۆنی بە دۆشاو": خاگینە xāgīna (P.). بنچی وشەکە خاگ‌ -xag یان قەیق- -qeyq شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هێک hek یان هاگ hak "هێلکە".

**قەیلە qeyle** [ *qayla* ] - "گۆشتی وشکەوەبووی لە هەنبانەدا بۆ زستان": خزمە دەگەڵ ↑قڕ[1] qır [قڕان qıran] سەر بە ریشەیەک بە مانای "هیشک بوون، هیشک هەڵاتن".

**قەیماخ qeymax** [ *qaymāx* ] - "سەرشیر، خامە": دە زمانی کوردمادیدا قەیمین qeymîn بەکار دێ بە مانای "رەق بوون (ی ئەندامی لەش)". ئەم کردارە لە ↑قایم qayım "سەخت، بەهێز" وەرگیراوە [قورس و قایم]. خودی قایم وشەیەکی عەرەبییە و دەچێتەوە سەر *قائم qaim* (Arb.) "راوەستاو". بەم جۆرە لە مانای بنەڕەتی "راوەستاو" مانای "سەخت" و سەخت بوون (رەق بوون، لە جووڵە کەوتن) پەیدا بووە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە سەرشیر یان خامە لە ئەنجامی مەیین (سفت بوون، خۆ گرتن)دا دروست دەبێ، وێ دەچێ وشەی "قەیماخ" سەرەتا "قایمەک" بووبێ بە مانای "سفت بوو، مەییو، خۆ گرتوو" و دواتر بووبێتە "قەیماخ".

**قیپ qîp** [ *qīp* ] - "بەلەک ئەستوور": خزمە دەگەڵ ↑قەبە qebe.

**قیت qît** [ *qīt* ] - "زۆپ، دەرپەڕیو، زەق": خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قوت qut و چەندین وشەی دیکە.

**قیچ1 qîç** [ *qīč* ] - "قیت، بلیند، قووچ": شێوەیەکی دیکە لە ↑قیت qît یان ↑قووچ quç.

**قیچ2 qîç** [ *qīč* ] - "خوار و خێچ": شێوەیەکی دیکە لە ↑خێچ xeç "خوار".

**قیچ3 qîç** [ *qīč* ] - "کەسێک کە چاوێکی لە چاوەکەی دیکە بچووکترە": هەروەها "چاو قیچ کردنەوە" هەیە بە مانای "چاوێک قووچاندن و بە چاوێک لێڕوانین". خزمە دەگەڵ ↑قووچاندن quçandın [چاو قووچاندن].

**قیر qîr** [ *qīr* ] - ”ماکەیەکی ڕەش وخەستی چەسپ لە نەوت دەگیری“: ↑قیل qîl یش دەگوترێ. قیر qīr (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گڵ gıl و هتد سەر بە ریشەیەک بە مانای ”پێوەنووسان“. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑قوڕ qur ”ماکەی سواخ دان“.

**قیرا qîra** [ *qīrā* ] - ”بەرەبەیان“: جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑قەیرە qeyre.

**قیراچ qîraç** [ *qīrčā* ] - ”پەڕاوێزی نووسراو“: خزمە دەگەڵ ↑قارنج qarınc ”پەڕاوێزی جل و بەرگ“.

**قیڕاندن qîrandın** [ *qīrāndın* ] - ”هاوار کردن، قیژاندن“: خزمە دەگەڵ ↑قڕ(ڕ)ە qır(r)e ”دەنگ و هەرا، کێشە“.

**قیژلاندن qîjlandın** [ *qīžlāndın* ] - ”وە چۆقەچۆق خستنی ڕۆن“: بڕوانە ↑قژقژاندن qıjqıjandın.

**قیژە qîje** [ *qīža* ] - ”دەنگ و هەرا، زیقە“: جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kauz (G.) ”پەلەوەرێکی بە قیژە“، kauzan (Frank.) ”بە دەنگی توند وەڕین“، kūmen (OG.) ”ناڵاندن“، Köter (G.) ”ناوێکە بۆ سەگ“ [دەبنەڕەتدا: قیژەکەر، بوەڕ]، kūten (MG.) ”چەقە کردن“، gi-kewen (OG.) ”بانگ کردن، ناوبردن“. ئەم وشانە دەبردرێنەوە سەر ریشەیەکی ژێرمەنی **kaujan* (*Grm.*) ”بانگ کردن“. goan (Gr.) ”ناڵاندن، گلێ و گازندە کردن“، gausti (L.) ”دەنگ و هەرا، هاشە کردن“ پێوەندییان بە وشە ژێرمەنییەکانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا دەشێ وشەکانی ↑قسە qıse، ↑گاز gaz ”بانگ“، ↑گازندە gazın(de) ”سکاڵا، گلێیی“، ↑قاسپە qaspe ”ئاوازی کەو“، ↑قووزە quze ”دەنگی درێژی سەگ“ لەم خێزانەدا جێ بگرن. ریشەی هیندو ئەورووپی ئەم وشە ئەورووپییانەی سەرەوە ساخ نەکراوەتەوە. دوور نییە ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑*قاقا qaqa*وە هەبێ.

**قیس qîs** [ *qīs* ] - لە قیس دان شێوەیەکی دیکەیە لە ”لە کیس دان“. بڕوانە ↑کیس kîs [کیسە].

**قیسکە1 qîske 1** [ *qīska* ] - ”چیکڵدانە“: خزمە دەگەڵ ↑کیس kîs [کیسە].

**قیسکە2 qîske 2** [ *qīska* ] - شێوەیەکی دیکە لە↑ گچکە gıçke.

**قیش qîş** [ *qīš* ] - ”بانوو، دەشتی بڵند“: خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قۆز qoz و ↑قووچ quç و هیتر کە ئاماژە بە چەمکی قیتی و بەرزی دەکەن.

**قیق qîq** [ *qīq* ] - ”لەڕ، داڵگوشت“: خزمە دەگەڵ ↑کز kız.

**قیقلۆقی qîqloqî** [ *qīqloqī* ] - ”خوێندنی کەڵەباب“: قوقلی قوقو qūqlīqūqū (P.) و kikeriki (G.). وشە ئەڵمانییەکە دە بنەڕەتدا وەک لاسا کردنەوەی دەنگ باس کراوە. لەوانەشە پێوەندییەک هەبێ دەتیوان ئەم وشانە و ↑قاقا qaqa دا.

**قیل1 qîl 1** [ *qīl* ] - ”قیر“: شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قیر qîr و دەشێ شێوەی کۆنتری وشەکە بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑گڵ gıl و لەوانەشە ↑قوڕ qur. سەر بە ریشەیەکە بە مانای ”پێوەنووسان“.

**قیل2 qîl 2** [ *qīl* ] - دەگەڵ ”قاڵ“ دێ [قیل qîl و قاڵ qal]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گاڵتە galte، سەر بە ریشەی ****ghel-* (*IE.*)** ”قیل و قاڵ کردن، هەراکردن، بانگ کردن“.

**قیلەوقاج qîlewqac** [ *qīlawqāj* ] - ”خوارەوخوار“: قیقاج qīqāj (P.). قیل + قاج qîl + qac. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ وشەی ↑خێل xel ”خوار“. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خێچ xeç [خوار و خێچ]. وشەی ↑خاچ xaç ”نیشانەی کریستیانەکان“ دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ”قاج“ یان ”خێچ“ و مانایەکی تازەی وەرگرتبێ.

قیم **qîm** [ *qīm* ] - "رازی بوون" [قیما من نایه]. دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاو kaw [کام kam] "بە مانای "ئارەزوو، حەز". ["بەکاوەخۆ" دە بنەڕەتدا واتا بە حەزی خۆت، ئەوجۆرەی خۆت پێت خۆشە].

قیمە **qîme** [ *qīma* ] - "وردکراو، ئەنجراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قەمە qem(m)e "شمشێری کورت" و ↑قامچی qamçî "شەللاق"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "لێدان، کوتان، لەت و کوت کردن".

قین **qîn** [ *qīn* ] - "رق، بێزاری": ↑کین kîn یش دەگوترێ. کینە kīne (P.). دەشێ هاوریشە بێ دەگەڵ hohn (G.) "گاڵتە پێکردن، داشکاندن، دارزاندن"، hona (OG.) "جتیو پێدان، بەخودا شکاندنەوە"، hanus (Gt.) ، hean (OE.)، hana (OF.) "سووك کراو، بێزراو"، kaunus (Let.) "شەرم، شوورەیی، دارزان"، küretis (Lit.) "تەریق بوونەوە"، سەر بە ریشەی **< *kau- (IE.)** "نەوی، دانەواندن، دارزاندن". لەوانەیە اهانة ihane (Arb.) "سووکایەتی" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

قێرچاندن **qerçandın** [ *qīrčāndın* ] - "سیرە لە ددان هێنان": خزمە دەگەڵ ↑قرچان qırçan [هەروەك چۆن سیرەش خزمە دەگەڵ "چیرە"]. ئەم وشانە ئاماژە بە گرژ بوون، توند بون، چیڕ بوون دەکەن.

قێز **qez** [ *qez* ] - "بێز، بێمەیلی، بێزاری": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Haß (G.)، haz (OG.)، hatis (Gt.)، hate (E.) و hat (Sw.) "رق، بێزاری"، سەر بە ریشەی **< *kados- (IE.)** "پەژارە، رق، بێزاری". kedos (Gr.) "خەم، ماتەم" لەم ریشەوە هاتووە. غەیدین ġeydîn/ ↑خەیدین xeydîn "تووڕەبوون، رق هەستان" و ↑کەد ked "زەحمەت، رەنج" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

2- Geist (G.) "رووح"، geistig (G.) "رووحی، رووحانی"، geest (Nl.)، ghost (E.) "رووح"، سەر بە ریشەی **< *ĝheis- (IE.)** "وروژاو، قەڵس، تووڕە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ -zaēša (Av.) "داچڵەکێنەرانە، قێزهەستێن" و لەوانەشە خشم xašm (P.) "تووڕەیی".

قێل **qel** [ *qel* ] - "گوانی ئاژەڵی شیردەر": خزمە دەگەڵ ↑زیل2 zîl "1- زمانە چکۆلە 2- بەلووکە"، ↑زیلك zîlık "میتکەی یەکسم" و ↑کلك *kılk* [دە بنەڕەتدا واتا "زەقایی، دەرپەڕیوی"].

## ک (K)

-ک k - فۆنیمی ک k وەک ناوگر دەگەڵ ژمارەیەک وشە و بەتایبەتی کردار دێتە کایەوە و دۆخی جەخت کردن [حاڵەتی موبالەغە، Intensivbildung (G.)] دەداتە کردارەکان. ئەم ناوگرە بۆ وێنە دەگەڵ ئەو کردارانەی خوارەوە دێتە کایەوە: ئالۆزکان alozkan، بزرکان bızırkan، پەشۆکان pşeokan، خلیسکان xılîskan، تڕووسکان tırûskan و هتد. [بیست و چەند ساڵێک لەمەوبەر مامۆستا مەسعوود موحەممەد لە وتارێکدا ئاماژەی بەم ئەرکەی ناوگرەکە کردووە].

ئەم ناوگرە هەروەها مانایەکی تازەتر و بڕێک جیاواز، بەڵام هەر لە چوارچێوەی مانا گشتی و بنەڕەتییەکەدا، درروست دەکا، بۆ وێنە کردارەکانی "خلیسکان"، "بزرکان"، "پەشۆکان" کەمێک جیاوازن لە "گلان"، "بزر بوون" یان "پەشێوان". کردارەکانی سەرووتر نەک هەر توندتر و بەهێزترن، بەڵکوو هەروەها "لەنەکاو و خێراتر"یشن. هێندێک جار ئەم ناوگرە بە وێنەی q یان j دەردەکەوێ وەک وەک هەڵبزووقین helbızqîn، هەڵپرووزقان helpırûzqan، مرقاندن mırqandın، مرچقاندن mırçıqandın، مرژاندن mırjandın، پرژان pırjan، چرژان çırjan [تیکچرژان] و هتد.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا ئەم دیاردەیە وەک زمانی کوردمادی وایە و ئەمەش بۆ وێنە لەم کردارانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێ: grausen لە grauen "داچڵەکاندن، هەستیکی سامناک خستنە دڵ" وەرگیراوە و دۆخێکی جەخت کردن بە کردارەکە دەدا، hören (G.) "گوێ گرتن، بیستن" و horken (MG.) و horchen (G.) "گوێرایەڵ بوون" یان gaffen (G.) "دەم داپچڕین، حەپەسان" و japsen (G.) "بە دەمێکی کراوە و پەیتا پەیتا هەناسە هەڵکێشان". [بەراوردی فۆنیمی s بکە کە وشەکانی حەپەسان ħepesan و japsen (G.)دا].

**کا ka** *[ kā ]* - " گیای وشک کراوی کوتراو، پووش": کاه kāh (P.). خزمە دەگەڵ Heu (G.)، hay (E.)، ha (OF.) سەر بە ریشەیەک بە مانای "کوتان". خزمە دەگەڵ ↑هاوێنگ hawıng [دەسکاوێنگ]. دە زمانی ئەڵمانی کۆندا ناوی مانگی جولای Juli ناوێکی دیکە بووە، واتا houmanot "مانگی کا". دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی لەم چەشنەمان هەیە، واتا "پووشپەڕ" کە بۆ مانگی یەکەمی هاوین بەکار دێ.

**کاب kab** *[ kāb ]* - "قاب، جگێ": شێوەی کۆنتری ↑قاب[1] qab "جگێ".

**کابان kaban** *[ kābān ]* - "خاتوونی ماڵ": ↑کەیبانوو keybanu ش دەگوترێ. کدبانو kadbānū (P.). دە وشەی کابانی کوردمادیدا فۆنیمی d سواوەتەوە، بەڵام فۆنیمەکە دە وشەی ↑کەدی kedî "ئاژەڵی ماڵی"دا پارێزراوە. وشەکە دەبنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی کەد + بان(وو) ked + ban(u). کەد بە مانای "ماڵ، خانوو"یە و ↑بانوو banu ش دە زمانی ئەمرۆی فارسیدا مانای"خانم" یان "خاتوون" دەبەخشێ. کەرتی ban(u) یان باشتر بڵێین وشەی کابان بە تیکڕایی دەتوانین دەگەڵ husband (E.)، husbonda (OE.) "مێرد، شوو" هەڵسەنگێنین. ئەم وشە ئینگلیزییە لە دوو کەرت پێک هاتووە: hus واتا "ماڵ" [هەمان "کەد"ی خۆمان] و boandi "مانەوە، بەسەربردن، دروست کردن، پێک هێنان". بەگشتی مەبەست لە وشە ئینگلیزییەکە "بەڕێوەبەری ماڵ" بووە. ئەم وشەی دوایی خزمە دەگەڵ ↑بوون bun ی کوردمادی. لەم تیروانینەوە مانای کابان دەتوانێ دە بنەڕەتدا "بەڕێوەبەر و هەڵسووڕێنەری ماڵ" بووبێ.

**کابرا kabra** *[ kābrā ]* - "پیاوی نەناسراو": پێک هاتووە لە ↑کا(ک) + ↑برا ka(k) + bra.

**کابۆخ kabox** ⌊ *kābox* ⌋ - "بەشە چێنراوی تیراوتر و گەشتر لە دەوروبەری": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قۆپەن qopen "پەڵەگیای بڵیندی ناو مێرگ و چیمەن".

**کابۆک1 kabok 1** ⌊ kābok ⌋ - شێوەیەکی دیکە لە↑ کەو kew و ↑کۆتر kotır.

**کابۆک2 kabok 2** ⌊ *kābok* ⌋ - "لانە، هێلانە": ↑کاپۆ kapo ش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ ↑کون kun [کون و کەلێن].

**کاپ1 kap 1** ⌊ *kāp* ⌋ - "جگە": شێوەیەکی دیکە لە ↑قاپ qap و ↑کاب kab.

**کاپ2 kap 2** ⌊ *kāp* ⌋ - "تەناف، گوریس، پەتک": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەو هەبێ:

1- ↑ئیپە îpe.

2- copula (L.) "بەند، پەتک".

**کاپان kapan** ⌊ *kāpān* ⌋ - "1- کونی فرەوان لە میچی خانوودا 2- نەقەب": خزمە دەگەڵ ↑کون kun "درز، کەلێن، قووڵایی".

**کاپۆ kapo** ⌊ *kāpo* ⌋ - "هێلانە": خزمە دەگەڵ ↑کاپان kapan و ↑کون *kun* و هەروەها ↑کەپۆ kepo.

**کاپۆخ kapox** ⌊ *kāpox* ⌋ - "گیای گیرەکراوی وردکراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کوتان kutan. رەنگە شێوەی کۆنی وشەکە *kaftok** بووبێ.

**کاپۆک kapok** ⌊ *kāpok* ⌋ - "پێوەندی ئەسپ لە زنجیر": بڕوانە ↑کاپ2 kap 2.

**کاپۆل1 kapol 1** ⌊ *kāpol* ⌋ - ↑کاپۆخ kapox.

**کاپۆل2 kapol 2** ⌊ *kāpol* ⌋ -↑قاپیلک qapîlk.

**کاپۆل3 kapol 3** ⌊ *kāpol* ⌋ - ↑کەپۆ kepo "لووت".

**کاپۆلە kapole** ⌊ *kāpola* ⌋ - "پەیمانە": دەچێتەوە سەر ↑قاپ qap "جام" و مەبەست قاپێکی بچووکە بۆ ئەندازەگرتن.

**کات[1] kat [1]** ⌊ *kāt* ⌋ - "سات، دەم": گاە gāh (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قەتان qetan "گوزەران، رابووردن، تێپەڕین، مەشین".

**کات[2] kat [2]** ⌊ *kāt* ⌋ - شۆرەکات واتا دەشتی قاقڕ. "کات" لێرەدا شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قاد qad و ↑قات qat "هەرد".

**کات[3] kat [3]** ⌊ *kāt* ⌋ - "کەللەسەر": ↑کاتک katık و کاتات katat یش دەگوترێ. هەروەها ↑کاتار katar "پۆپەی کەڵەشێر" و ↑کاتە kate "لکی تازەی پاش سەرچن کردن" هەن کە دەشێ دەگەڵ وشەکەی سەرەوە سەر بە خێزانێک و دەگەڵ ↑قیت qît و ↑قوت qut خزم بن.

**کاتار katar** ⌊ *kātār* ⌋ - "پۆپەی کەڵەشێر": خزمە دەگەڵ ↑کات[3] kat "کەللە".

**کاتک katık** ⌊ *kātık* ⌋ - ↑کات[3] kat "کەللەسەر".

**کاتۆر kator** ⌊ *kātor* ⌋ - "لەوەڕگەی رووتاو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قووت qut [رووت و قووت].

**کاتە kate** ⌊ *kāta* ⌋ - "لکی تازەی پاش سەرچن کردن": خزمە دەگەڵ ↑کات kat "کەللەسەر".

**کاج1 kac 1** ⌊ *kāj* ⌋ - قاج qac، قاژ qaj و کاژ kaj یش دەگوترێ. کاج kāž (P.).

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑قاش qaş و ↑کووز kuz و↑کوت kut و چەند وشەیەکی دیکەی سەر بەم خێزانەوشەیە هەبێ کە ئاماژە بە چەمکی "بڕین" دەکەن. کاج دارێکە گەڵای دەرزیداری هەیە و لەوانەیە بەم هۆیەوە ناوەکەی لە ریشەیەک بە مانای "بڕین"ەوە هاتبێ.

2- لەوانەشە ناوەکە بۆ بەرز و بڵیند بوونی دارەکە بگەڕێتەوە و ببێتە خزم دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قوت qut و ↑قیت qît. بەم شێوەیە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاچ kac 2.

**کاچ kac 2** [ *kāj* ] - "زوورك": ↑کەژ kej [کەژ و کێو].

**کاجینە kacîne** [ *kājīna* ] - "زەوی تەپۆڵك تەپۆکدار": خزمە دەگەڵ↑ کەژ kej،↑قۆچ qoç و ↑قۆز qoz و هتد.

**کاچ kaç** [ *kāč* ] - "ناوێکی دیکەیە بۆ کەوچك": ↑کەچك keçık.

**کاخ kax [1]** [ *kāx* ] - "قەسر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کاژە kaje.

**کاخ kax [2]** [ *kāx* ] - "لودەکای دەشت کە بۆ زستان گڵەبان دەکرێ": ↑کاخیل kaxîl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کا ka.

**کاد kad** [ *kād* ] -"زەوی، مەیدان، گوڕ": ↑قاد qad.

**کادوو kadu** [ *kādū* ] - "دووکەڵ": کادی kadî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schatten (G.)، scato (OG.)، shade و shadow (E.)، scadus (Gt.)، schaduw (Nl.)، scath (OIr.) "سێ، سایە" سەر بە ریشەی **< *skot- (IE.)*** "تاریکایی، سێبەر". skodde (Nor.) "تەم و مژ" و skótos (Gr.) "تاریکایی" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چادر çadır.

**کار kar 1** [ *kār* ] - "ئەرك، ئیش": کار kār (P.). وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ gar (G.)، garo (OG.)، gaar (Nl.)، gearu (OE.)، gorr (OIs.) "ئامادە، ساز، تەواو، حازر". ئەم وشە ژێرمەنییانە پێك هاتوون لە پێشگری *ga-* و *arwa-z* "خێرا، هەڵسوڕ". لەم تێڕوانینەوە مانای "کار کردن" دە بنەڕەتدا دەبێتە "ئامادە کردن، ساز کردن". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەك هەیە بە مانای "دەبباغی کردن" واتا "ئامادە کردنی چەرم" کە بریتییە لە gerben (G.)، garawen (OG.)، gearwian (OE.)، garva (Sw.) "دەبباغی کردن". ئەم کردارە ژێرمەنییە لە کۆندا بەگشتی بە مانای "ساز کردن، ئامادە کردن" بەکار هاتووە. هاوپێوەند دەگەڵ ئەم وشانە دە زمانی کوردمادیدا ↑گوروە gurwe [گورە gure] بە مانای "کار، خەبات" هەیە کە دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە بە مانای "ساز، ئامادە" بەتەواوی ڕێك دەکەوێ و دەبێ شێوەیەکی دیکە لە کار kar بێ. هەروەها ↑هەڤگوڕ hevgur هەیە بە مانای "هاوکار". لەم تێڕوانینەوە "کار" یان "گوروە" یان "گورە" دەبنەڕەتدا بە مانای ئامادە کردن و ساز کردن بووە و بۆ وێنە کاتێك گوتراوە "کار دەکەم" مەبەست ئەوە بووە کە شتێك "ساز دەکەم".

**کار kar 2** [ *kār* ] - "بێچووی ئاژەڵ": [کاریلە، کارمامز]. خزمە دەگەڵ ↑کوڕ kur "زارۆی تێرینە".

**کار kar 3** [ *kār* ] - "کانی خۆی، خوێڵان": ↑کاراك karak "کان، مەعدەن".

**کاراس karas** [ *kārās* ] - "ناوی گیایەکە": کاروش karuş یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑گرشە gırşe [قرشە] "باقە گیای لەسەر یەك داندراو".

2- ↑کارس kars "هەرزنەگەورە".

**کاراك karak** [ *kārāk* ] - "کان، مەعدەن":

[سەرەتا تێبینییەك: وشەی "کان" پێوەندی بە "کەندن" [هەڵکەندن]ەوە هەیە. هەروەها وشەی "مەعدەن"ی عەرەبی دەچێتەوە سەروشەی لاتینی mina "نەقەب، قووڵکە یان چاڵی بەردی کانزا". کەوابوو هەم وشەی "کان" و هەمیش "مەعدەن" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "قووڵکە، هەڵکەندن، هەڵکۆلین" دەکەن. دیسان دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑کارێز karez "قەنات" هەیە.

هەر وەك چۆن دوو وشەی "كان" و "كانی" (ئاو) لە پێوەندی دەگەڵ یەكتردان، هەر بەم شێوەیەش دوو وشەی "كاراك" و "كارێز" (ی ئاو) هاوپێوەندن].

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەردەكەوێ كە وشەی كاراك karak هەڵگری چەمكی هەڵكەندن و هەڵكۆڵینە. وشەكە بەرهەڤ بكە دەگەڵ ↑كارك karık و هەروەها ↑كاریتان karîtan "كەندوو". وەك دەبینین هەردووكی ئەم وشانە هاومانای "كەندوو"ن و خودی وشەی "كەندوو"ش هەمدیسان پێوەندی بە "كەندن" [هەڵكەندن]ەوە پەیدا دەكا. لەم تێروانینەوە كاراك karak، ↑كارك karık، ↑كارێز karez "قەنات"، ↑كارێچ karec "شەنە"، كریژۆك kırîjok "ناوەوەی كونی گوێ" [كونی چكۆڵە، "كونۆچكە"] و ↑كەرچە kerce "گەنە" پێوەندیان بە یەكێك لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- scharren (G.)، scerran (OG.) "كڕاندن، رووشاندن، ساوین، كۆڵین" **< *(s)kars-** ***(IE.)*** "كڕاندن".

2- ↑كڕاندن kırandın سەر بە ریشەی ***(IE.)* *gradi-** **<** "رووشاندن".

**كارامە karame** [ *kārāma* ] - "لێهاتوو، لێوەشاوە": < *كارامد* *kārāmad* *(P.)* [كار + امد] . كەرتی"امد" دەچێتەوە سەر كرداری امدن āmadan (P.) "هاتن". مەبەست لە وشەكە ئەو كەسەیە كاری لە دەست دێ، واتا "كار لە دەست هاتوو".

**كاڕان karan** [ *kārān* ] - "قیژەی مەڕو بەرخ": ↑كالین kalîn.

**كارپووچ karpuç** [ *kārpūč* ] - "خشتی سوور": كارپیچ karpîç یش دەگوترێ. < *kirpič (Rus.)*.

**كارت kart** [ *kārt* ] - "كاغەزی ئەستوور": < *chartes (Gr.)* و ئەمەش خۆی لە زمانی قیبتییەكان وەرگیراوە و پێوەندی بە دروست كردنی كاغەزی پاپیرۆسەوە هەبووە. لە رێگای زمانە ئەورووپییەكانەوە هاتووەتە ناو زمانی كوردمادی و فارسیش. charta (L.) "نووسراوە، رێككەوتن نامە"، Landkarte (G.) "نەخشەی جوگرافی"، خريطة xarīte (Arb.) "نەخشەی جوگرافی"، cartone (It.) "كاغەزی ئەستوور، مقەببا"، cartoon (E.) "كارتۆن، فیلمی سەر كاغەز"، cartel (F.) " یەكێتی خاوەن شەریكەكان"، گشتیان دەچنەوە سەر ئەم وشەی فیرعەونەكان.

**كارتۆل kartol** [ *kārtol* ] - "پەتاتە، بن ئەردك": < *kartoffel (G.)* < *tartofolo (It.)* [*terrae* "هەرد" + *tuber (L.)* "گرمۆڵە، گرکە، قونچك، بنك، سێوك"]. وشە ئەڵمانییەكە چووەتە ناو زمانی رووسی و توركی و لەوێشەوە بۆ ناو زمانی كوردمادی. [دە زمانی فەرانسەییدا وشەی pomme de terre (Fr.) بەكار دێ كە دەكاتە "سێوی هەرد، هەردەسێو".

**كارتیخ kartîx** [ *kārtīx* ] - كارتی kartî و كارتیك kartîk یش دەگوترێن. دەچێتەوە سەر كارد kard [↑كێرد kerd] و مەبەست كێردی گچكەیە.

**كارتێنك kartênık** [ *kārtenık* ] - "جاڵجاڵۆكە": كارتنك kārtanak (P.)، كەرتی دووەمی وشەكە پێوەندی بە كرداری ↑تەنین tenîn ەوە هەیە. كەرتی یەكەمی وشەكە لە وشەی ↑كارەموو karemu شدا دەبینرێ، بە مانای "چنراو لە مووی بزن". ئەم كەرتەوشەیە دەبێ خزم بێ یان شێوەیەكی دیكە بێ لە ↑كر kır "1- تەنراو، چنراو 2- رایەڵی تەون".

**كارچك karçık** [ *kārčık* ] - "هەرمێ": شێوەیەكی دیكە لە ↑كڕۆسك kırosk.

**كاردۆخ kardox** [ *kārdox* ] - "ناوی كێوێكی بەرز لە كوردستان": هەروەها كاردۆخی kardoxî هەیە وەك ناوی هۆزێكی كورد [بڕوانە هەنبانەبۆرینە، ل. 597]. ئەم وشەیە لە هێندێك سەرچاوەدا بە هەڵە وەك ناوێكی كۆن بۆ "كورد" دەژمێردرێ. بە وتەیەكی دیكە هێندێك سەرچاوە بە پشت بەستن بە سەفەرنامەكەی گزێنفۆنی یۆنانی لایان وایە ناو و وشەی "كورد"

بۆ ئەم "کاردۆخ"ە دەگەڕێتەوە کە گزێنفۆن باسی کردووە. بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی کۆنی مێژوویی دیکە باس لە گەلێکی کۆن بە ناوی کاردۆخی لەم ناوچەیەدا ناکا، بە پێچەوانەی ناوی چەندین گەلی دیکە وەک سومێری، ئیلامی، بابلی، ئاشووری، کەلدانی، ماد، ئەرمەن، پارس و هیتر کە لە سەرچاوەی جۆربەجۆردا باس کراون. هەر بۆیە کاردۆخی ناتوانێ ناوی گەلێک و ناوی کۆنی گەلی کورد بووبێ، بەڵکوو تەنیا دەتوانێ ناوی ناوچە و هۆزێکی ماد [کوردمادی، کوردی] بووبێ. بەڵام وشەکە خۆی لەباری ریشەوە خزمە دەگەڵ وشەی ↑کورد kurd و سەر بە ریشەیەکە بەمانای "سەخت، پتەو". ئەوە کە ئەم ناوە هەم وەک ناوی هۆز و هەمیش وەک ناوی چیایەکی بەرز و سەرکەش بەکار هێنراوە، بەڵگەیەکە بۆ مانای بنەڕەتی وشەکە کە ئاماژە بە سەختی و پتەوی دەکا. جێی بیر هێنانەوەیە کە ناوی زۆرێک لە شوێن و هۆزەکانی دیکەی کوردستانیش پێوەندی بە وشەی "کورد"ەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑هەکاری hekarî، ↑ئاکرێakre، ↑هەرکی herkî، ↑ئەردەڵان erdelan و هتد. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە ناوی هۆز و ناوچە کوردییەکان بە چەمکی "سەخت بوون، بەهێز بوون"ەوە گرێ دراون. لەم بارەوە بڕوانە وشەکانی "سۆران" و "سەق".

**کاردۆژە kardoje** [ *krdoža* ] - "دارکوڵین بە تیخ": دەشێ لە دوو وشەی کارد kard [↑کێرد kerd] و↑ئاژنین ajnîn "کون کون کردن، کوڵین".

**کارژ karj** [ *kārž* ] - "تویژە مار": خزمە دەگەڵ ↑کرێژ kırêj. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کاراک karak "کان، مەعدەن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کراندن".

**کارس kars** [ *kārs* ] - "هەرزنەگەورە": گارس gars یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ (G.) Gerste، (OG.) gersta، (Nl.) gerst، (L.) hordeum "جۆ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghers- >** "دڕکاوی، چقڵدار".

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەرزن herzın.

**کارک karık** [ *kārık* ] - "کاڵە و زەنگاڵی لە چەرم": چارق çaroq (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑ کاڵە kale.

2- ↑کارەموو karemu "چنراو لە مووی بزن".

**کارک karık** [ *kārık* ] - "1- کەندوو، جێگەی دانەوێڵە کە لە قوڕ دروست دەکرێ 2- ڕێگەی باریک بۆ چوونەناو باخچەی پەرژینکراو": خزمە دەگەڵ:

1- یان ↑کاراک karak "کان، مەعدەن"،

2- یانیش ↑گارۆ garo "هێلانەمەل لە ناو کونی داردا".

**کارگ karg** [ *kārg* ] - "گیایەکە بەهاران هەڵدەتۆقێ": کوارگ kuwarg و قارچک qarçık یش دەگوترێن. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- agaric (E.) "جۆرێک کارگ". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر agaricum (L.) و لەویشەوە بۆ agarikon (Gr.).

2- ↑کوڕ3 kur "بڵندایی سەر کێو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *gher-, *ghre-** "زەق و دەرپەڕیو بوون".

**کاروان karwan** [ *kārwān* ] - "دەستەی گەشتکەران": کارڤان karvan یش دەگوترێ. کاروان kār(e)vān (P.). وشەکە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیشەوە.

1- لەوانەیە پێوەندی بە "رەوان" و "رۆیشتن"ەوە هەبێ [ ka + revan؟].

2- لەوانەیە پێوەندی بە هێندێک وشەی ژێرمەنییەوە هەبێ کە ریشەی لاتینییان هەیە و دەچنەوە سەر وشەیەک بە مانای "رۆیشتن، گەڕان"، وەک Karre (G.)، carrus (L.) "گاری، داشقە"، car (E.) "ترۆمبێل، ئوتومبێل"، Kurs (G.) "کورس، رەوت"، Kurier (G.) "شاند، تیردراو، پەیک"، Kariere (G.) "رەوتی پێگەیشتن لە کار و شوغڵدا"، currere (L.) "رۆیشتن، راکردن". ریشە؟

**کارۆک karok** [ *kārok* ] - "پۆڵا": خزمە دەگەڵ ↑خار xar "رەق، سەخت".

**کارەبا kareba** [ *kārabā* ] - "هێزی ئەلەکتریک": لە وشەی فارسی کهربا *kahrobā (P.)* وەرگیراوە، دە بنچینەدا بە مانای "کا رفێن". [ئەم ناوە لێرەوە پەیدا بووە کە بە هۆی لێکخشاندنی هێندێک شت، بۆ وێنە خشاندنی دەنکی تەسبێح لە جلوبەرگ، ئەوشتانە هێزی ئەلەکتریکیان تێدا دروست دەبێ و دەتوانن شتی سووکی وەک "کا" بۆ لای خۆیان رابکێشن و بە خۆیانەوە بنووسێنن]. وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە کهربا kahrabā (Arb.). لە هێندێک ناوچەی کوردستان بە جۆرە دەنکی تەسبێحێک کە ئەو هێزی "کا رفاندنیان" هەبێ، دەگوترێ کارەبا.

**کارەڕەهات karerehat** [ *kārarahāt* ] - "شەڕ و جتێوی زۆر": کەرتەوشەی کار -kar هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑شەڕ şer. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا ڕەهات لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑رژد rıjd "سەخت".

**کارەسات karesat** [ *kārasāt* ] - "بەڵا و بەدبەختی مەزن": > kriθa (Arb.) > *krisis (Gr.)* "قەیران". لەوانەیە زمانی عەرەبی وشەکەی راستەوخۆ لە یۆنانی وەرنەگرتبێ، بەڵکوو لە رێگای زمانێکی سێهەمەوە وەری گرتبێ. دە زمانی ئاڵمانیدا وشەکە وەک Krise (G.) بەکار دێ کە لە شێوە عەرەبییەکە زۆر نیزیکە. مانای Krise دە فەرهەنگی ئەڵمانیدا ئەوها شی کراوەتەوە: تێکچوون و تێکرمانی باری ئابووری، کاتی سەخت و تەنگانە، ئاستەنگ و دژواری، وەرچەرخانێکی بڕیاردەر، باڵاترین ئاست یاخود چڵەپۆپەی نەخۆشییەک". ئەم وشەیە سەرەتا وەک چەمکێکی پزیشکی هاتووەتە ئاراوە و مەبەست ئاماژە کردن بە باڵاترین ئاستی نەخۆشی کەسێک بووە کە لەوێدا وەرچەرخانێک روودەدا، کە لە ئەنجامیدا یان نەخۆشەکە ئەو ئاستە تێپەڕ دەکا و بەرەو چاک بوونەوە دەچێ یان دەمرێ. وشەی krisis (Gr.) دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وەرچەرخان، وەرسووڕان".

[تێبینی: دە ئەڵمانیدا Katastrophe بە مانای "کارەسات" بەکار دێ. ئەم وشەیەش بە ئەسڵ یۆنانییە و دەچێتەوە سەر katastrephein (Gr.) "وەرسووڕان، وەرچەرخان"].

**کارەموو karemu** [ *kāramū* ] - "تەنراوی لە موو": کەرتی یەکەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کارتێنک kartênık "جاڵجاڵۆکە".

**کاریتان karîtan** [ *kārītn* ] - "1- کەندوو (بە مانای پلوورەمێش) 2- کەندوو (بە مانای ئەنباری دەخڵ و دان): خزمە دەگەڵ ↑کارک karık "1- کەندوو، جێگەی دانەوێڵە کە لە قوڕ دروست دەکرێ" و دواتر دەگەڵ ↑کاراک karak "کان، مەعدەن".

**کاریتە karîte** [ *kārīta* ] - "داری خانوو": خزمە دەگەڵ Gerte (G.)، gerta (OG.) "شووڵ، لقەدار، داردەست"، yard (E.) دە بنچینەدا "داری پێوان". وشە ژێرمەنییەکان پێوەند دەدرێنەوە بە gart (OG.)، gadd (Sw.)، gazds (Gt.) "چقڵ" و هەروەها hasta (L.) "داردەست، نەقیزە". بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە لەوە دەچێ کە وشەی ↑گەز gez "ئەندازەیەک بۆ پێوان" دە بنەڕەتدا هەمان "داری پێوان" بووبێ و خزمایەتیشی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەبێ.

**کارین karîn** [ *kārīn* ] - "توانین": خزمە لەگەڵ ↑کورد kurd و سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بە هێز" و دواتر ↑خار xar "سەخت". دە زمانە بیانییەکاندا دەبێتە خزم دەگەڵ خزمە دەگەڵ kratos (.Gr) "هێز، دەسەڵات" و kratein (.Gr) "زاڵ بوون، دەسەڵاتدار بوون"، hart (.G) و hard (.E) "سەخت، پتەو".

[تێبینی: دەتیوان چەند چەمکی "سەخت، بەهێز بوون"، "دەسەڵات هەبوون"، "زاڵ بوون، پێوەستان" و "توانین"دا پێوەندی هەیە و ئەو وشانەی دەربڕی ئەم چەمکانەن، پێوەندی ئێتمۆلۆژیکیان بەیەکەوە هەیە. نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە ئەم وشانەی خوارەوە: قەفاڵتن qefaltın "1- بەستن، راوەستاندن 2- سڕ بوون لە سەرمان" و پاڵەوان palewan، walten (.G)، wealdan (.OE)، waldan (.Gt) "دەسەڵات بەسەردا هەبوون ، بەسەردا زاڵ بوون، بەرێوە بردن"، Gewalt (.G)، gi)walt) (.OG)، geweld (.Nl)، ge)weald) (.OE)، vald (.Sw) "دەسەڵات، زەبر و زەنگ، زاڵ بوون"، vladet (.Rus) "زاڵ بوون، دەست بەسەردا گرتن"، vladyti (.Lit) "فەرمانڕەوایی کردن" و valere (.L) "پتەو بوون، بەهێز بوون"، سەر بە ریشەی -ual* (*.IE*) "سەخت بوون، پتەو بوون". نموونەیەکی دیکە خودی وشەی "توانین"ە کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ئەستوور بوون، بەهێز بوون". هەروەها وشەی Macht (.G) "هێز، دەسەڵات" و mogu (.Rus) "دەتوانم" خزمن دەگەڵ وشەی کوردی مکوڕ mıkur "سەرسەخت، پێداگر"].

**کارێچ karec** [ *karej* ] - "شەنە": خزمە دەگەڵ ↑کاراک karak "کان، مەعدەن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، رووشاندن، کۆڵین، ساوین".

**کارێز karez** [ *kārez* ] - "قەنات": خزمە دەگەڵ ↑کاراک karak "کان، مەعدەن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، کۆڵین، هەڵکەندن". شیاوی باسە کە دە زمانی عەرەبیدا وشەی قنات qanāt (.Arb) لە "کان" و "کەندن" [هەڵکەندن] وەرگیراوە و عەرەبێنراوە.

**کارێژ karej** [ *kārež* ] - "شوێنی راگرتن و پاراستنی ترۆمبێل": گەراژ geraj و گەراج gerac یش دەگوترێ. وشەکە دەچێتەوە سەر garage (*.Fr*) < "کارێژ" و garer (.Fr) "تیرمیناڵ". ئەم وشە فەرانسەیی خۆی ریشەی ژێرمەنی هەیە و خزمە دەگەڵ wahren (.G) "ئاگا لێ بوون، پاراستن" و هەروەها دە زمانی کوردمادیشدا خزمە دەگەڵ ↑وریا wırya [وریای خۆت بە، وریای ئەو شتە بە، واتا ئاگات لێی بێ و بیپارێزە]. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "وارگە"ی ترۆمبێل. لەم وشانەدا نموونەیەک سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی w بە g بەرچاو دەکەوێ.

**کاز[1] kaz** [ *kāz* ] - دەگەڵ "کووز" دێ [کاز و کووزی بەیانی]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کسکە kıske و ↑کەسک kesık سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە، رووناکی بەخشین". hasan (.OG) "بۆر، درەوشاوە" دەچێتەوە سەر هەمان ریشە.

**کاز[2] kaz** [ *kāz* ] - "کۆخ": هەڵی سەنگینە دەگەڵ↑ کاژە kaje.

**کازین kazîn** [ *kāzīn* ] - "هەرا و هاوار کردن": کازتین kaztîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje. هەروەها کازەکاز kazekaz یش هەیە بە مانای "گورانی زۆرشاد".

**کازێوە kazewe** [ *kāzewa* ] - "رووناکی بەرەبەیان":

1- لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە کە ئەم وشەیە لە کاذب kazib وەرگیراوە و مەبەست صبح کاذب بووە.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کاز kaz [کاز و کووزی بەیانی].

کاژ **kaj** *[ kāž ]* - "1- تۆیژەمار 2- توێی شیر و ماست 3- توێکڵ یان پێستی ناسک": کاش kaş یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قاشڵ qaşıl "توێژاڵ". هەروەها ↑کاژی kajî هەیە بە مانای "پەردەی ناوسک" کە ئەویش پێستێک یاخود توێخێکی ناسکە.

کاژ **kaj** *[ kāž ]* - "خێل": [چاو بادراو، چاو وەرسووڕاو]، خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑خێس xes، ↑خێچ xeç، کاس kas و دواتر ↑گێژ *gej*.

کاژە1 **kaje 1** *[ kāža ]* - "1- جێ مانەوەی کاروان 2- حەشارگەی راوکەر": سەر بەو خێزانەوشەیە کە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(s)keu- >** "داپۆشین، حەشار دان". کاژە بە هەر دوو ماناکەیەوە دەبێتە ئەو شۆێنە کە شتێک دادەپۆشێ یان حەشار دەدا. مانای یەکەمی وشەکە پەناگایە، مانای دووەم حەشارگەیە. لەوانەیە ↑کۆشک koşk و ↑کاخ kax یش پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ.

کاژە2 **kaje 2** *[ kāža ]* - "کەللەسەر": بە چەند جۆر دەگوترێ: کاژەرە kajere، کاژەڵاک kajelak، کاژەڵە kajele. خزمە دەگەڵ ↑کاسە kase. مەبەست "کاسەی سەر"ە.

کاژی **kajî** *[ kāžī ]* - "پەردەی ناوسک، دیافڕاگم": خزمە دەگەڵ ↑کاژ kaj "توێژ، توێکڵ". ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş و ↑کووز kuz "بڕ، لەت".

[تێبینی 1: توێکڵ یان توێژ شتێکە لێ دەکرێتەوە، دەبردرێ یان دەڕندرێ و هەر بۆیە پێی گوتراوە "کاژ". دە زمانی ئەڵمانیشدا Rinde "توێکڵەدار" خزمە دەگەڵ کرداری "رنین". تێبینی 2: وشەی "دیافراگم"ی یۆنانی خۆی لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی "دیا-" ماناکەی دەبێتە "بەتێودا، لەتێوان" و کەرتی "فراگم" دەبێتە پەردەی جیاکەرەوە و خزمە دەگەڵ "بڕین"، واتا پەردەیەک یان دیوارێک کە شتێک "دەبڕێ" و دەیکاتە دوو "لەت"ەوە].

کاژێر1 **kajer 1** *[ kāžer ]* - "1- قوژبن 2- تاقە لە دیواردا 3- ئۆدەی خەڵەوت لە تەکیەدا": زۆر جار دەگەڵ "کون" دێ [کون و کاژێر kun u kajer]. پێوەندی بە وشەکانی ↑قاش qaş و ↑کووزkuz ەوە هەیە کە لە ریشەیەک دێن بە مانای "بڕین، لەت کردن". کەلێن یان کاژێر دە بنەڕەتدا واتا درزی زەوی.

[تێبینی: کاژێر بە مانای "تاقە" لەباری ماناوە هەڵ سەنگێنە دەگەڵ "شکاف" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "ئەشکەفت" و لە ریشەیەکەوە دێ بە مانای "بڕین"].

کاژێر2 **kajer 2** *[ kāžer ]* - "رەحەت بوون لە سێکسدا": خزمە دەگەڵ ↑کاسان kasan [داکاسان dakasan یان داکاسین dakasîn "ئۆقرە گرتن"].

کاس1 **kas 1** *[ kās ]* - سەر کاس بوون واتا "گێژ بوون". خزمە دەگەڵ ↑گێژ gej و ↑گەشکە geşke [geş + ke] "لەخۆ چوون، فێ هاتن" و چەندان وشەی دیکە. دە زمانی عەرەبیدا وشەکە کراوەتە غش ġeş (Ar.) وچەندان وشەیان لێ ساز کردووە وەک "مغشوش"، "اغتشاش "و هتد.

کاس2 **kas 2** *[ kās ]* - "هەوراز": خزمە دەگەڵ ↑کەژ kej [کەژ و کۆ].

کاس3 **kas 3** *[ kās ]* - "رۆچووکێ، قووپاو": ئەمەش دەگەڵ هەر دووک "کاس"ی سەرەوە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمان(ەوە)، خوار بوون(ەوە)". زەوی رۆچوو و قووپاویش هەر وەک زەوی کەژ و کێو بریتییە لە چەمانەوەیەک کە لەسەر رووبەری زەوی دروست دەبێ.

کاسان **kasan** *[ kāsān ]* - دەگەڵ پێشگری دا da- دێ، داکاسان dakasan یان داکاسین dakasîn بە مانای "ئۆقرە گرتن". خزمە دەگەڵ کز کردن kez kardan (P.) "هەڵکورمان، مات بوون". وشە فارسییەکە خۆی خزمە دەگەڵ ↑کز kız "لاواز" [دەبنەڕەتدا: چکۆڵە، تیکەوەچوو، کەم بۆوە].

"کز" دە کوردمادیدا دەگەڵ "مات"یش دێ، کز و مات. کاتێک گیانلەبەرێک تێک دەقرمێ یان هەڵ دەکورمێ واتا خۆی گرمۆڵە دەکا، ئەوە لە هەمان کاتدا چکۆڵەبوونەوە و هەروەها ئارام گرتنیش بەخۆوە دەبینێ. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑کووژانەوە kujanewe و مانای "داکاسان"یش دەگەڵ مانای "کووژانەوە" پێوەندییەکی ئاشکرایان هەیە.

[تێبینی: پێوەندییەکی لەم چەشنە دەتیوان وشەکانی "داکاسان" و "کووژانەوە" و "کوشتن"دا هەروەها دەناو سێ وشەی "دامرکان"، "دامەرزان" و "مەرگ"یشدا دەبینرێ].

**کاستین kastîn** [ *kāstīn* ] - "لووراندن": خزمە دەگەڵ ↑کازین kazîn "هەرا و هاوار کردن". کاستەکاست kastekast یش هەر بە مانای "وەڕەوەڕی سەگ"بەکاردێ.

**کاسۆ kaso** [ *kāso* ] - "هەژار": خزمە دەگەڵ ↑کز kız و هەروەها دەگەڵ ↑هەژار hejar، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کەم بوون(ەوە)، گچکە بوون(ەوە)".

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "هەژاری" و "کەمی و گچکەیی" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ poor ی ئینگلیزی بە مانای "هەژار". ئەم وشەیەش دە بنەڕەتدا بە مانای "کەم و گچکە"یە، بڕوانە وشەی "پوور"ی خۆمان].

**کاسۆتی kasotî** [ *kāsotī* ] - "بەتاسە، ئارەزوومەند": خزمە دەگەڵ ↑حەز ħez.

**کاسۆخ kasox** [ *kāsox* ] - "مەڵەغان": خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş و ↑کووز kuz و ژمارەیەک وشەی دیکەی سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**کاسە1 kase 1** [ *kāsa* ] - "دەفر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گۆزە goze.

**کاسە2 kase 2** [ *kāsa* ] - "سندووق بۆ پارە تێدا هەڵگرتن": قاسە qase ش دەگوترێ. (G.) Kasse > (Fr.) châsse > *(L.) capsa* "قوتوو".

**کاسینۆک kasînok** [ *kāsīnok* ] - "چیکڵدان": بنجی وشەکە دەچێتەوە سەر ↑کیسە kîse و تێکڕای وشەکە مانای "کیسەی گچکە" دەبەخشێ.

**کاش1 kaş 1** [ *kāš* ] - "خۆزگە، خۆزی": کاش (P.) kāš. خزمە دەگەڵ ↑حەز ħez "خواست، ئارەزوو".

**کاش2 kaş 2** [ *kāš* ] - "1- شوێن پێ لەناو کێڵگە 2- شێو، کێڵانی زەوی": خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş و ↑کووز kuz بە مانای "بڕ، لەت، خەت".

**کاش3 kaş 3** [ *kāš* ] - دەگەڵ "کرد" دێ [چەندی کرد و کاش kaş م کرد، پەیدام نەکرد]. دەچێتەوە سەر ↑کۆشان koşan [تێکۆشان].

**کاشان kaşan** [ *kāşān* ] - "شوێن(پێ) گرتن، دۆزینەوە بە نیشانەی جێگەی پێ": خزمە دەگەڵ ↑سۆسە sose، ↑دۆزینەوە dozîn(ewe) و ↑سەچتین seçtîn و هتد.

**کاشکان kaşkan** [ *kāškān* ] - "1- پێڵاوی خلیسکێن 2- خلیسکباز": خزمە دەگەڵ ↑خزین xızîn.

**کاشوول kaşûl** [ *kašūl* ] - "بریتییە لە پێست": بڕوانە ↑قاشڵ qaşıl "توێکڵ".

**کاشۆ1 kaşo 1** [ *kāšo* ] - "1- دوو داری ناو بار بۆ قایم کردنی 2- داری سەر چەماو بۆ گۆیێن 3- دارە مێو": کاسۆ kaso ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) Kegel " قووڵەدار، تێڵا، کاشۆ"، (MSw.) kaga "قووڵەدار، قەدی دار"، (Nl.) keg "هۆرە"، (MNl.) kak "دیرەک"، (G.) kufe و (Swis.) kueche(n) "دە بنەڕەتدا بە مانای گوچان". وشە ژێرمەنییەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "لقەدار، تێڵا، تەنەی دار" بەکارهاتووە. دەشێ وشەی ↑گوچان goçan یش دەگەڵ کاشۆ خزم بێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *geg(h)-, *gog(h)-*** < "لقەدار، تێڵا".

**کاشۆ2 kaşo** [ *kāšo* ] - "تووڕەکەی ئاڵف کە بە سەری دەوارەوە دەکرێ": هەروەها کاشنگ kaşıng یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑کیسە kîse.

**کاشە1 kaşe** [ *kāša* ] - "پەڕەی ناو پێچکی عەرابە": خزمە دەگەڵ ↑کاشۆ kaşo.

**کاشە2 kaşe** [ *kāša* ] - "ئەو تەختەی بە سەر بەفردا رایدەکێشن":

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑کاشکان kaşkan "پێڵاوی خلیسکێن"ەوە هەبێ

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە کرداری ↑کێشان kêşan [ڕاکیشان]ەوە هەبێ.

**کاشی kaşî** [ *kāšī* ] - "جۆرێک دەفری لووس و رەنگ کراو": کاشی kāšī (P.). خزمە دەگەڵ ↑کاسە kase "جام، دەفر" و ↑گۆزە *goze*.

**کاغەز kaġez** [ *kāġaz* ] - "پەڕی لەسەر نووسین": قاقەز qaqez یش دەگوترێ. kāġaz (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ کاش kaş یان↑کاژ kaj "1- توێژەمار 2- توێی شیر و ماست 3- توێکڵ یان پێستی ناسک"، ↑قاشڵ qaşıl "توێژاڵ"، ↑کاژی kajî "پەردەی ناوسک" کە ئەویش پێستێک یاخود توێخێکی ناسکە. لەوانەیە "کاغەز" سەرەتا تۆکڵی ناسکی دار یان پێستی ناسکی ئاژەڵ بووبێ کە لەسەری نووسراوە.

**کاف kaf** [ *kāf* ] - "ئەشکەوت": کافک kafık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا باس کراون. کهف kahf (Arb.) لەم وشەیە وەرگیراوە.

**کافا kafa** [ *kāfā* ] - "قەحف، کەللەی سەر": خزمە دەگەڵ Kopf (G.) "سەر"، kopf (G.) "قاپ، کاسە"، kollr (OIs.) "سەر" [کاسەی سەر]، kolla (OIs.) "جام، کاسە"، kapála (L.) "کاسە، کاسەی سەر، کەللە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *kap- (IE.)* "گرتن، لەخۆ گرتن". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قاپ[1] qap "دەفر، جام".

**کافر kafır** [ *kāfır* ] - "بێدین": وشەیەکی عەرەبییە، بە ڵام ریشەکەی بۆ زمانی کوردمادی و فارسی دەگەڕێتەوە. بڕوانە ↑گەورە gewre "مەزن". شیاوی باسە وشەی عەرەبی "مجوس" لە "موغ" وەرگیراوە و ئەم وشەیەش خۆی پێوەندی بە وشەی "مەزن"ەوە هەیە و دە بنچینەدا مەبەست لە موغ، مەزنی (ی ئایینی) بووە. هەر بەم شێوەیە بەر لە هێرشی عەرەبەکان وشەی "گەبر"یش کە دە زمانی ئەمڕوی کوردمادیدا دەبێتە "گەورە"، بۆ مەزنانی ئایینی بەکار هاتووە، هەر وەک چۆن ئەمڕۆ لە ناوچەی موکریان وشەی "سەرگەورە" بە مانای "رابەر، سەرۆک" بەکار دەهێنرێ. عەرەبەکان وشەکەیان کردووە بە "کافر". دیارە مانای وشەی کافر دە سەردەمانی زوودا "بێدین" نەبووە، بەڵکوو عەرەبەکان سەرەتا وشەکەیان بە مانا دروستەکەی خۆی واتا بۆ ناو لێنانی گەورەپیاوانی زەردەشتی بەکارهێناوە و دواتر وشەکە لای ئەوان مانای "بێدین"ی وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی هەرکەس و نەتەوەیەک نەچووبێتە سەر ئایینی ئەوان، بە بێدینیان داوەتە قەڵەم. هەر بەم شێوەیەش وشەی"مجوس" دەبێ سەرەتا لەلایەن عەرەبەکانەوە هەر بە مانا دروستەکەی خۆی واتا بە مانای "مەزنانی ئایینی زەردەشتی" بەکارهاتبێ و دواتر ماناکەیان گۆڕیوە بۆ "بێدین".

**کافک kafık** [ *kāfık* ] - "ئەشکەوت": ↑کاف kaf یش دەگوترێ. هەروەها ↑کاو kaw هەیە بە مانای "شکێر، قەڵشەبەرد". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کون kun. دە زمانی عەرەبیدا وشەی کهف kahf (Arb.) "غار، ئەشکەوت" پێوەندی بەم وشە کوردمادییانەوە هەیە.

**کافوور kafur** [ *kāfūr* ] - "شیرەی وشکەوەبووی دارێکە سپی و بونخۆشە": Kamfer (G.)، canfora (It.)، kafur (Arb.) < *karpura (OIn.)* "کافوور".

**کاڤار kavar** [ *kāvār* ] - "ئاقار، ناوچە": خزمە دەگەڵ ↑گوڕ gor "دەشت، پانتایی، تەختایی". دە فارسیدا دەگوترێ کویر kevîr بە مانای "دەشتی مەزن و قاقڕ"، کە ئەویش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. دواتر خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑کون *kun* دا باس کراون.

**کاڤلان kavlan** [ *kāvlān* ] - "کالان، بەرگی خەنجەر": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑کون kun دا باس کراون.

**کاک1 kak 1** [ *kāk* ] - "وشەی رێز لێنان لە کاتی ناو هێنان یان بانگ کردنی پیاوێک": دە بنچینەدا واتای "براگەورە" دەدا. بڕوانە ↑کاکە kake. [شیاوی باسە دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی Bruder "برا، برادەر" وەک وشەی بانگ کردن و رێز لێنانی پیاوان بەکارهاتووە].

**کاک2 kak 2** [ *kāk* ] - "جۆرێ نانی شیرن": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کووکی kukî.

**کاک3 kak 3** [ *kāk* ] - "سەهۆڵ": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- شێوەیەکی دیکە لە ↑یەخ yex "سەهۆڵ".

2- ژمارەیەک وشە کە مانای "رەق، سەخت" دەگرنە خۆ، وەک ↑کۆک *kok* "ریشە، بنەڕەت"، ↑کاکڵ kakıl "ناوک"، ↑کەکەو kekew "دارێکی سەختی جەنگەڵی" و هتد.

**کاکاو kakaw** [ *kākāw* ] - "دەنکی بەری دارێکە، دەیهاڕن و لە ئاودا دەیکوڵێنن و دەیخۆنەوە": لە زمانی سوورپێستەکانی ئەمەریکای ناوەندی وەرگیراوە و لە رێگەی زمانی سپانییەوە [ > *cacao* (*Sp.*) ] کەوتووەتە ناو زمانانی ئەورووپی و ئەوانی دیکەوە.

[تێبینی: چەند وشەی دیکە کە لە زمانی سوورپێستەکانی ئەمریکا وەرگیراون و هەر لە رێگەی زمانی سپانییەوە بەناو زمانانی جیهاندا بڵاو بوونەوە، بریتین لە: تەماتە، "تاباک" (تووتن)، "مایس" (زۆرەت)، شەگەڵات یان چوکلێت].

**کاکڵ kakıl** [ *kākıl* ] - "ناوکی گوێز، ناوەرۆک":

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆک kok "ئەسڵ، بناخە".

[تێبینی: وشەی "کۆک" دە ئەسڵدا بە مانای "سەخت، پتەوە"ە و لەمەوە مانای "بناخە، بەردی بناخە" سەری هەڵداوە. ئەم پێوەندییە دە وشەکانی "کرۆک" و "قەوار"شدا دەبینرێ کە لە دوو ریشەی جیاوازەوە دێن، مانای "ناوەرۆک، کاکڵ، ناوکی میوە" دەبەخشن و خزمن دەگەڵ *کەڕا* "گاشەبەرد" و *هیم* (خیم) "1- بەردی زل، گاشە بەرد 2- بناخە" و دەگەڵ *کەڤر* "بەرد"].

2- دە فەرهەنگا کرمانجی- ئینگلیزی دا ئاماژە کراوە بە kakali (Geo.) بە مانای"گوێز".

3 - "کاکڵ" دەتوانین هەروەها بەرهەڤ بکەین دەگەڵ coccus (L.) "کاکڵ، ناوک".

**کاکۆڵ kakol** [ *kākol* ] - "پۆڕ، قژی هێڵراوە لە پیشەوەی سەر": کاکل kākol (P.). کاک kak + ئۆڵ ol "پاشگری گچکاندن". کەرتی کاک -kak شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قژ qıj "موو".

**کاکە kake** [ *kāka* ] - "براکەورە": کاکا kākā (P.). هەر وەک ئەو وشانەی بۆ بانگ کردن یان ناو لێنانی کەسوکار بەکار دێن، لە دووپات بوونەوەی دەنگێک دروست بووە، واتا دەنگی ka. [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ بابە babe، دادە dade، مامە mame، یایە yaye و نەنە nene و هتد. گشت ئەم وشانە دووپات بوونەی دەنگێک نیشان دەدەن کە ریشەکەی بۆ گڕ و گاڵ کردنی زارۆک دەگەڕێتەوە، واتا دە بنچینەدا لاسا کردنەوەی گڕ و گاڵی منداڵە].

**کاڵ kal** [ *kāl* ] - "پیر، باپیر": خزمە دەگەڵ alt (G.)، old (E.) "پیر"، alan (Gt.) "هەڵدان و گەورە بوون"، altus (L.) "بەرز، بڵیند"، ala (OIs.) و alare (L.) "بژێو پێدان، بەخێو کردن، گەورە کردن". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *al- (IE.)*** "گەورە بوون،

گەورە کردن". وشەکە دەتوانێ دە زمانی کوردمادیدا بووبێتە "هاڵ" و دواتر "کاڵ". وشەی ↑خاڵ xal "برای دایک" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**کاڵ1 kal 1** *[ kāl ]* - "1-کەمرەنگ، رەنگی رووناک 2- نەگەیشتوو، کرچ و کاڵ": خزمە دەگەڵ hell (G.)، hel (Nl.) "کاڵ، رووناک"، سەر بە ریشەی *(IE.) *kle-, *kel- >* "بانگ کردن، هەراکردن، قیژاندن". ئەم وشەیە دە زمانی ئەڵمانی و هولەندیدا نەک هەر بۆ رەنگ، بەڵکوو بۆ دەنگیش بەکار دێ، واتا بۆ دەنگێک کە روون و ساف و زەلال بێ. ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ clarus (L.) "زەلال، روون، ساف" [دە بنەڕەتدا واتا "هاوارکەر"]. مەبەست سەرەتا ئەوە بووە کە دەنگێک یان رەنگێک بە هۆی روون و زەلال بوونییەوە "هاوار دەکا" و خۆی ئاشکرا دەکا. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زەلال zelal "روون، ساف". [بەراوردی وشە کوردمادییەکە بکە دەگەڵ وشە لاتینییەکە]. مانای کرچ و کاڵ و نەگەیشتوو لێرەوە پەیدا بووە کە میوە یاخود بەرهەمی نەگەیشتوو رەنگەکەی هێشتا کاڵە، واتا رەنگی پێویستی وەرنەگرتووە.

**کاڵ2 kal 2** *[ kāl ]* - دەگەڵ کشت دێ [کشت و کاڵ]. خزمە دەگەڵ ↑کێڵان kelan.

**کاڵا kala** *[ kālā ]* - "جینس بۆ کڕین و فرۆش": کاڵا یان کەلوپەل دەشێ سەرەتا بە مانای "جلوبەرگ" بەکارهاتبێ و مەبەست ئەو شتانە بووبێ کە مرۆڤ لەخۆی هاڵاندووە یان خۆی پێ داپۆشیوە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵان² kalan.

[تێبینی: ئەگەر سەرنجی وشەی "کەلوپەل" بدەین، دەبینین لێرەشدا "پەل" دەگەڕێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *pel-* "داپۆشین، تێ پێچان، لێهاڵان" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ پۆلکە polke "تۆیکڵی چەڵتووک، بلۆقی دەست"، پۆرگ porg، Pelle (G.) "پێست، توێکڵ"، Fell (G.)، fill (Gt.)، fell (E.)، pellis (L.)، pella (Gr.) "پێست، چەرم"].

**کاڵان kalan** *[ kālān ]* - هەڵکالان واتا قسەی خراب پێ گوتن. کالیان یان کالین kalîn بە مانای "باڕاندنی بزن و مەڕ"یش دێ.

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گاڵ gal [گڕ و گاڵ] و قاڵ qal [قیل و قاڵ].

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە call (E.) "بانگ کردن، هەراکردن" [دە بنەڕەتدا: قیژاندن].

لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵ kal [کەمرەنگ].

**کالان kalan** *[ kālān ]* - "بەرگی شمشێر و خەنجەر": کێلان kelan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Hülle (G.) "هەرشتێک کە لە دەوری شتێک دەهاڵێ و دایدەپۆشێ"، سەر بە کرداری hüllen (G.) و hullan (OG.) "تێوە پێچان، دە کالان نان"، هەروەها دەگەڵ Hülse "بەرگ، توێکڵ، پۆرگ". ئەم وشانە هەروەها پێوەندییان هەیە بە hehlen (G.)، helan (OG.) و(.OE) "(لێ) هاڵاندن، داپۆشین، شاردنەوە"، kalyptein (Gr.)، celere (L.) "داپێچان، داپوشین، حەشار دان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *kel- >* "(لێ)هاڵاندن، تێوەپێچان، داپۆشین". دە زمانە هیندو ئەورووپییەکان و لەوانەش زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، بۆ وێنە ↑هاڵان halan/ ئاڵان alan، ↑قەڵخان qelxan "مەتاڵ"، ↑کەلپەل kelpel "جلک"، ↑هۆڵ hol، ↑کەللە kelle، ↑قالۆڕ qalor و بە دەیانی دیکە.

**کالانە kalane** *[ kālāna ]* - " قووڵکەی چاو، قوولایی نێوان دوو سمت": خزمە دەگەڵ↑ کالان² kalan.

**کالڤێژ kalvej** *[ kālvež ]* - "مەڕ کە پێشوەخت تامەزرۆی جووت بوونە": خزمە دەگەڵ ↑کەڵ kel [وە کەڵ هاتوو واتا تامەزرۆ]، ↑کەڵکەڵە kelkele "حەز و ئارەزووی توند"، ↑کەلەز kelez "وەرزی جووت بوون" . کەرتی دووەم لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑واز awz و خزم بێ

دەگەڵ ↑ویست wîst. بەم شێوەیە وشەکە دەبێتە وشەیەکی لێکدراو کە لە دوو وشەی هاومانا دروست بووە و ئەمەش دۆخی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشێ.

**کالکی kalkî** [ *kālkī* ] - "کەلەپوور، میرات (لە باو و باپیرانەوە)": دەشێ لە↑ کال kal "پیر، باپیر"ەوە هاتبێ.

**کاڵمە kalme** [ *kālma* ] - "جۆرێ شەمشێر": خزمە دەگەڵ ↑قەل qel کردن و ↑قەڵشاندن qelşandın.

**کالوخ kalux** [ *kālūx* ] - "بەرگی قورئان": خزمە دەگەڵ ↑کالان² kalan "بەرگی شمشێر و خەنجەر".

**کاڵۆش kaloş** [ *kāloš* ] - "جۆرێک پێڵاوی پەلاستیک": گالش gāloš (P.). وشەیەکی فەرانسەییە و دەگەڵ ↑کەڵاش keļaş کوردمادی پێوەندییان هەیە بە gallicula (L.) "تەقیلە".

**کالە kale** [ *kāla* ] - "ئەسپی رەش": خزمە دەگەڵ ↑*کۆڵوو kolu* و خەڵووز xeluz. پێوەندی ئەم وشانە هەڵسەنگینە دەگەڵ پێوەندی وشەکانی "رەش" و "رەژی".

**کاڵە kale** [ *kāla* ] - "پێڵاوی لە چەرمی خاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەڵاش kelaş "جۆرە کەوشێک".

**کاڵەک kalek** [ *kālak* ] - "گندۆرە، قەرپوز": دەچێتەوە سەر ↑کاڵ kal "کەمرەنگ، نەگەیشتوو". ئەم میوەیە بە پێچەوانەی میوە رەنگاورەنگەکانی دیکە ناوەکەی کاڵ و کەمرەنگە و لەبەر ئەوە ناوی بە کاڵەک دەرچووە.

**کاڵەگ kaleg** [ *kālag* ] - "درێشووکەی مار": خزمە دەگەڵ ↑کاڵمە kalme "جۆرێک شەمشێر".

**کالیار kalyar** [ *kālyār* ] - "ترۆزی زل کە بۆ تۆم هەڵگیراوە": وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑*کاڵەک kalek* "گندۆرە". بنجی وشەکە دەشێ ↑کاڵ kal "نەگەیشتوو، کەمڕەنگ" بێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "خیار" کە ریشەکەی دەبردرێتەوە سەر زمانی یۆنانی و مانای "کاڵ، نەگەیشتوو" دەدا].

**کاڵیت kalît** [ *kālīt* ] - "1- رەبەت، سیپە 2- کۆختە": ↑کولێت kulet.

**کام1 kam 1** [ *kām* ] - "کیهە، کیژان": کامە kame ش دەگوترێ. کدام kodām (P.). خزمە دەگەڵ ↑کێ ke.

**کام2 kam 2** [ *kām* ] - "1- نەخۆشییەکی ناو زاری ئاژەڵ 2- ئاڵ بوونەوەی ددان": وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "دەم، زار"ە و مەبەست لە نەخۆشی "کام" دە بنەڕەتدا نەخۆشی و بریندار‌بوونی "دەم" بووە. خزمە دەگەڵ Gaumen (G.)، goumo (OG.)، gom (Sw.) "مەڵاشوو"، gums (E.) "پووک"، gomurys (Gr.) ، gamurs (Let.) "قوڕگ، لوولەی هەناسەکێشان" و دەگەڵ ↑قەمپۆز qempoz [ qem + poz] و ↑*کاو2 kaw 2* "چێژ، ئیشتیا".

**کاما kama** [ *kāmā* ] - "داری چەماو بۆ بێژنگ و دەف و هیتر": خزمە دەگەڵ↑ کەوان kewan و ↑چەمانەوە çeman(ewe).

**کامڕان kamran** [ *kāmrān* ] - "بەختەوەر": کامران kāmrān (P.). کامەران kameran یش دەگوترێ. هەروەها کامڕەوا kamrewa هەیە، بە مانای "بەختەوەر، بە ئاوات گەیشتوو". بنجی وشەکە، ↑کام2 kam 2 ە بە مانای "ئارەزوو" [دە بنەڕەتدا: چێژ، ئیشتیا]. کەرتی دووەم، ران -ran پێوەندی هەیە بە ↑را ra کردن، راندن rāndan (P.) "ئاژۆتن، مەشاندن"، rennen (G.) "را کردن، غار دان" وrinnen (G.) "جاری بوون" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رۆندک rondık "فرمێسک". مانای

"کامڕان" یان "کامڕەوا" دە بنەڕەتدا ئەوەیە کە کەسێك ژیانی بەگوێرەی ئارەزووەکانی بەڕێوە بچێ.

**کامووك kamuk** [ *kāmūk* ] - "دۆشاوکەر": کامۆخ kamox یش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*sme(i)** *(IE.)* "ڕێخشاندن، لێخشاندن". دۆشاو کردن دەبێ لەڕێگەی (دەست) ڕێخشاندنەوە ئەنجام درابێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مووچ muç [ماچ و مووچ].

**کان kan** [ *kān* ] - "1- کاراك، مەعدەن، سەرچاوە 2- داری هەڵکۆڵدراو": هێن hen یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*کەندن* (hel)kendın "کۆڵین"، ↑کانی kanî، ↑کەندوو kendu، کانە kane "سەنعەتی دارکۆڵین 2- ئامرازی دارکۆڵین".

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "کان" و "هەڵکەندن" بڕوانە شی کردنەوەی "کاراك"].

**کانتۆر kantor** [ *kāntor* ] - "دۆڵابی جلکان": خزمە دەگەڵ ↑کەندن kendın [هەڵکەندن]. کانتۆر یان دۆڵاب ئەو قووڵایی، هەڵکۆڵدراوی یان هەڵکەندراویی ناو دیوارە کە جلوبەرگی تێ دەتین. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "دۆڵاب" و "شکاف". وشەی یەکەم دە بنەڕەتدا مانای "قووڵایی، قووپاوی" دەگەیەنێ و وشەی دووەمیش مانای "کون و کەلێن".

**کاندوو kandu** [ *kāndū* ] - "دەفری گەورەی لە قوڕ چێکراو بۆ دانەوێڵە و ئارد": کەندوو kendu ش دەگوترێ و خزمە دەگەڵ ↑کەندن kendın [هەڵکەندن].

**کانزا kanza** [ *kānzā* ] - "مێتال، فلز": کان + زا kan + za. کەرتی یەکەمی وشەکە ↑کان kan ە بە مانای "کاراك، مەعدەن". کەرتی زا -za خزمە دەگەڵ سان san (P.) "جۆر، نەوع" [یەکسان yeksan واتا یەك جۆر]. ئەم وشەیە دە فارسیدا بەشێوەی گون gūn (P.) یش هەیە [گوناگون gūnāgūn (P.) "جۆراوجۆر"]، دە کوردمادیدا دەبێتە ↑گۆن gon یان گوێن guwen [*لەگوێن* "لەجۆری"]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Kind (G.) "زارۆك" و kind (E.) "نەوع، ڕەگەز" و دواتر دەگەڵ ↑زان zan. بەم جۆرە مەبەست لە "کانزا" دەبنەڕەتدا ئەو شتەیە کە لە جۆری "کان" یان مەعدەنە یان ڕەگەزی بۆ "کان" دەگەڕێتەوە.

**کانوا** [ *kanwa* ] - "تاڵەلۆکەی ئەستوورتر لە دەزوو": کاموا kāmwā (P.). لەوانەیە لە ↑کەنەف kenef وەرگیرابێ.

**کانی kanî** [ *kānī* ] - "سەرچاوە(ی ئاو)": xānī (P.)، -xan (Av.)، -khan (OIn.). [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی، ل. 296]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑کان kan "سەرچاوە، مەعدەن"، ↑ کەندن kendın [هەڵکەندن] و ↑کەندوو kendû.

**کاو1 kaw** [ *kāw* ] - لەنەکاو واتا لەناوەخت یان لەپڕ. هنگام hengām (P.) [hen + gām] "وەخت، هەڕەت". ئەسڵی وشەکە gām ە کە دەکوردمادیدا بووەتە کاو kaw و ماناکەشی دە بنچینەدا "لاق، قەدەم، هەنگاو" بووە. ئەم مانایە دە زمانی کوردمادیدا دە وشەی ↑هەنگاو hengaw [ he + n + gaw ] دا پارێزراوە. کەرتی -he پێشگرە و فۆنیمی n ناوگرێکە کە دە هێندێك وشەی کوردمادی و فارسیدا دەخزێتە نێوان بزوێنەکانی a /e لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە بە تایبەتی کۆنسۆنانتەکانی g وc. وەك باس کرا، مانای بنەڕەتی وشەکە "لاق، قاچ" بووە، لەوێوە مانای "شەقاو، هەنگاو" و دواتر مانای"مەرحلە، هەڕەت" [هەنگاو بە هەنگاو واتا مەرحەلە بە مەرحەلە] و دواجار مانای "وەخت، کات" دروست بووە.

**کاو2 kaw** [ *kāw* ] - بەکاوە خۆ واتا لەسەرەخۆ، نەك بە توندی و بەلەز. مانای پێشتری وشەکە "حەز و خواست و ئارەزوو" بووە و مەبەست لە "بەکاوەخۆ" کردنی کارێك، ئەوە بووە کە

کارەکە بە گوێرەی حەز و ئارەزووی خۆ بکرێ، نەک ئەوەی بە پێی حەزی کەسێکی دی پەلەی تێدا بکرێ. "کاو" خزمە دەگەڵ کام kam (P.) "چێژ، مەیل، ئارەزوو". بەڵام کام kam دە قامووسی فارسیدا مانایەکی دیکەشی بۆ دەکرێ کە بریتییە لە "دەم، مەڵاشوو" و ئەمە مانای راستەقینە و کۆنی وشەکە نیشان دەدا کە ئەمڕو ئیتر دە زمانی فارسیدا بەکار ناهێنرێ. ئەم مانا کۆنە دە زمانی کوردمادیدا دە وشەی ↑قەمپۆز qempoz [qem + poz] "لمبۆز" و هەروەها دە وشەی ↑کام kam "نەخۆشی دەمی ئاژەڵ"دا بەدی دەکرێ. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "بە کامت گوارا باد!" واتا بە "دەمت خۆش بێ" یاخود "چێژی لێ وەربگرێ". بەم جۆرە دەبینین کە مانای وشەکە لە "دەم" ەوە گوڕدراوە بۆ "چێژ" و لە وێشەوە بۆ "مەیل و ئارەزوو". دە زمانی فارسیدا هەروەها ناکام nākām (P.) هەیە بە مانای "بە ئارەزوو نەگەیشتوو". وێ دەچێ وشەی ↑ئاکام akam [a + kam] "ئەنجام" هەر لەو وشەوە وەرگیرابێ و بەم جۆرە وشەکە دیسان مانایەکی نوێتری دە زمانی کوردمادیدا پەیدا کردبێ. پەیدا بوونی ئەم مانایە بەم جۆرە بووە کە سەرەتا بە کەسێک یان کارێک کە بە مەبەست گەیشتبێ یاخود نەگەیشتبێ، گوتراوە بە ئاکام گەیشت یان بە ئاکام نەگەیشت واتا ئەو ئەنجامەی کە مەبەست بوو و *ئارەزوو* دەکرا، هاتەدی یان وەدی نەهات. بەمجۆرە مانای"ئەنجام" سەری هەڵداوە.

**کاو3 kaw** [ *kāw* ] - بڕوانە ↑کافک kafık "ئەشکەوت".

**کاوانەوە kawan(ewe)** [ *kāwān(awa)* ] - "سووتانەوە" (ی پێست): ↑کاویان² kawyan یش دەگوترێ. هەروەها کاوە kawe هەیە کە هەر بەو مانایە بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑سووتان sutan [شەوتین şewtîn].

**کاو(و)دان kaw(u)dan** [ *kāwdān* ] - "هەلومەرج": ↑کاو¹ kaw "کات، هەرەت، جەنگە" + ↑دان dan "بەش، پاژ" [دان(ی نیوەڕۆ)، دانە، دەنک، دانکێ و هتد].

**کاوڕ kawır** [ *kāwır* ] - "بەرخی یەکساڵە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کووڕ kur "بزنی تێری دوو بەهاردیتوو".

**کاوک kawık** [ *kāwık* ] - "جومگەی دەست و پێ": خزمە دەگەڵ ↑قاب1 qab "جکێ".

**کاول kawıl** [ *kāwıl* ] - "1- وێران، رووخاو، خرابوو 2- چواردیواری سەرنەگیراو": کاڤل kavıl یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خاپوور xapur و دواجار خزمە دەگەڵ ↑کون kun.

**کاویان¹ kawyan** [ *kāwyān* ] - "گریان بە دەنگی نزم": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ژاوە jawe.

**کاوێژ kawej** [ *kāwež* ] - "جاوین، جووتن": کاو + ێژ kaw + ej. بنجی وشەکە دەچێتەوە سەر ↑جاوین cawîn "جووتن، کایین". دە فارسیدا هەم جویدن javīdan (P.) و هەم خائیدن xaīdan (P.) دەگوترێ. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا ێژ ej- خزمە دەگەڵ پاشگری eš- (P.) دە زمانی فارسیدا. ئەم پاشگرە یەکێکە لە پاشگرە هەرە چالاکەکان دە زمانی فارسیدا و ناوی واتا دروست دەکا، وەک "اموزش، نرمش، سازش، خواهش، کوشش، تابش" و بە دەیانی دیکە. لەوانەیە ئەم پاشگرە سەردەمێک دە زمانی کوردمادیشدا باو بووبێ و دواتر لەناو چووبێ و ئاسەواری تەنیا لە چەند وشەیەکدا مابێتەوە.

**کاهوو kahu** [ *kāhū* ] - "سەوزییەکی خواردن": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کەسک kesık. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کهۆیی kıhoyî "کەسکایی، سەوزەنگی".

**کایە kaye** [ *kāya* ] - "بازی، گەمە": خزمە دەگەڵ ↑کەشە keşe.

**کایین kayîn** [ *kāyīn* ] - "جاوین": خائیدن xāīdan (P.). شێوەیەکی دیکە لە ↑جاوین cawîn "جووتن". ↑کاوێژ kawej "جووتنەوە" لەم وشەی سەرەوە هاتووە.

کپ **kıp** - "ئارام، بێدەنگ، خامۆش": قپ qıp یش دەگوترێ [قڕ و قپ qır û qıp]، خزمە دەگەڵ ↑کوپین kupîn "ئارام گرتن، هەدا دان"، ↑خەفە xefe و ↑کەوتن *kewtın*.

کترم **kıtrım** - "بەگشتی، تیکڕایی": کترمی kıtrımî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گۆترە gotre.

کتری **kıtrî** *[ kıtrī ]* - "دەفری لوولکدار بۆ ئاو تێدا کوڵاندن": کتری ketrī (P.). وشەکە دە لاتینیدا catillus بووە و چووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکانیشەوە، وەک kettel (E.) و kessel (G.) "کتری". وێ دەچێ وشەکە لە لاتینی وەرگیرابێ.

کتک **kıtık** - "پشیلە": ناوی کۆنتری پشیلەیە و خزمە دەگەڵ cat (E.)، Katze (G.)، catulus (L.)، catinas (Lit.) "کتک" و هتد. ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. خزمە دەگەڵ ↑ختتە xıtte "دەنگی دەرپەڕاندنی کتک".

[تێبینی: شیاوی بیر خستنەوەیە کە هێندێک وشەی وەک "ختتە"، "چغغە"، "وەححا" و هیتر کە بۆ بانگ کردن یان دوور کردنەوەی ئاژەڵەکان بەکار دێن، دە بنچینەدا دەچنەوە سەر ناوی ئاژەڵەکان و لە راستیدا ئەم ناوانە بۆ بانگ کردن یان دەر پەڕاندنی ئاژەڵەکان قاو کراون].

کچ **kıç** *[ kıč ]* - "زارۆکی مێیینە": ↑کیژ kîj یش دەگوترێ. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ژمارەیەک وشە بۆ ناو لێنانی زارۆکی مرۆڤ و ئاژەڵ بەکار دێن کە ریشەکانیان مانای "کەم و بچووک بوون" دەگەیەنن، بۆ وێنە وشەکانی بێچوو، کوڕ، باڕ و هتد. هەر بەم جۆرە "کچ"یش پێوەندی پەیدا دەکا بە ریزەوشەیەک کە دەبنەڕەتدا مانای "کەمی و گچکەیی" دەبەخشێ. هێندێک لەم وشانە بریتین لە ↑گچکە gıçke، ↑گجە gıce، ↑گجۆلە gıcole "تووڵەسەگ"، ↑گچە gıçe "بێچووی چێل". ئەم وشانە دە پلەیەکی تردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑کز *kız*، ↑کاس kas [کەم و کاسی]، ↑کووژانەوە kujanewe، ↑کوشتن kuştın. ئەم وشانەی دوایی ئاماژە دەکەن بە "کەم بوون(ەوە)، بچووک بوون(ەوە)، لە کزی دان و لە ناوچوون"، سەر بە ریشەی **<-kak* (IE.)** "کەم، گچکە".

کچێنە **kıçêne** *[ kıčena ]* - "رەشکێنەی چاو، بیبیلە": وەک لەژێر وشەی "بیبیلە"دا ساخ کراوەتەوە، ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "بەبە" و دە بنەرەتدا مانای وشەکە "بەبەلە"ی ئەمرۆیە. ئەم ناوە لەوەڕا هاتووە کە مرۆڤ دە رەشێنەی چاوی بەرانبەرەکەیدا وێنەی بچووک کراوی خۆی وەک بەبەیەک یان بووکەڵەیەک دەبینێ. وشەی "کچێنە"ش هەر بەم شێوە دروست کراوە. ئەم وشەی خزم دەگەڵ ↑گچکە *gıçke* و ↑کچ kıç و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "کەم، بچووک". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە "بیبیلە".

کخس **kıxıs** - "خیسکە، پیوازی گچکە بۆ چاندن": هەر دوو وشەی خیسکە xîske و کخس kıxıs پێوەندییان هەیە بە ↑کچگە gıçke و دەچنەوە سەر ریشەی **<-kak* (IE.)** "کەم، گچکە".

کداسە **kıdase** *[ kıdasa ]* - "لۆدەی کا و ئاڵف کە لە دەشت گڵەبان دەکرێ": هەروەها ↑گدیش gıdîş هەیە بە مانای "خۆیان، خەرمانی گیرەنەکراو": خزمە دەگەڵ ↑کدوو kıdû. بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ گدۆک gıdok "تەپۆڵکە".

کدوو **kıdû** *[ kıdū ]* - "کوندر، کوولەکە": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە بەگشتی مانای "قووت، زۆپ" دەبەخشن، وەک ↑قووت qut، [کت kıt، گت gıt]، ↑گدۆ gıdo "تەپە"، ↑گچە gıçe "چەنە" و هتد. "کدوو" شتێکی زۆپەڵەی قووتەکەیە و بۆیە وەسا بەناو کراوە. چەمکی "زۆپایی، قووتایی" دە وشەکانی "کوندر" و "کولەکە"شدا بەدی دەکرێ، کە ئەوانیش دوو ناوی دیکە بۆ ئەم بەرهەمەن.

کر **kır** - "1- تەنراو، چنراو 2- رایەڵی تەون": خزمە دەگەڵ ↑قەرەچێوە qereçewe. بنەوشەی قەر -qer [کەر/کر] دەچێتەوە سەر ریشەی **< *IE.* *ker(t)-*** "چنین، هۆنینەوە، تیکخستن".

کر¹ **kır** - "1- ئارام، کپ، بێدەنگ 2- توندبوونەوەی شل": خزمە دەگەڵ ↑کەڕ ker "گوێ نەبیس" ["گوێ کر"، "گوێ سڕ"].

کر² **kır** - " هەورازی رژد": بنجی وشەکە بە مانای "سەخت"ە و دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشە کە لەژێر ↑خار*xar* "سەخت، ڕەق"دا باس کراون. وشەی زەرد² zerd [ماه و زەرد] یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها ↑گارێ gare "ناوی چیایەک لە کوردستان" لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرێ.

کراڵ **kıral** *[ kırāl ]* - "قاقڕ، زەوی بێ ئاو وگیا": کراڕ kırar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کڕ kır و ↑خارxar "سەخت، ڕەق".

کراژ **kıraj** *[ kırāž ]* - "توێژە مار": خزمە دەگەڵ ↑کرێژ kırej.

کراس **kıras** *[ kırās ]* - "جلکی تەنک تا ناوقەد یان درێژتر": کراز kıraz یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Kleid (G.)، kleed (Nl.)، cloth (E.) "جلو بەرگ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *IE.* ) *glei-*** "پێوەنووسان، چەسپان، چەسپ بوون". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گڵ gıl و لەوانەشە ↑کل kıl "دەرمانی چاوڕشتن" [تیهەڵسوون]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑خەڵات xelat بەکار دێ بە مانای "جلو بەرگی پێشکێش کراو" و هەروەها بە مانای "کفن، بەرگی مردوو". "خەڵات" دواتر مانای "پێشکێشی، پاداشت"ی وەرگرتووە. وشەی خەڵات دە عەرەبیدا بووەتە خلعت xalεat (Arb.). ئەم وشەیە و هەروەها ↑کوڵوش kuluş "جۆرێک جلکی ژنانە" و ↑کولێجە kulece پێوەندییان هەیە بەم وشانەی سەرەوە. "کراس" هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کراش kıraş [یان کراژ kıraj] "مێو، مۆم، واکس"، و کراسە kırase "جۆش هاتنی چەورایی پیوی سابوون"، ↑کراس بەز kırasbez "توێخی زۆر تەنک و ناسکی ژێر پێست" و هتد.

کراسبەز **kırasbez** *[ kırāsbaz ]* - "توێخی زۆر تەنک و ناسکی ژێر پێست": خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

کراسە **kırase** *[ kırāsa ]* - "جۆش هاتنی چەورایی پیوی سابوون": خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

کراش **kıraş** *[ kıraš ]* - "مێو، مۆم، واکس": کراژ kıraj یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

کراک **kırak** *[ kırāk ]* - "سورێنچکە، قرقراکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قورگ qurg.

کراندن **krandın** *[ kırāndın ]* - "خوراندن، رووشاندن": خزمە دەگەڵ ↑خوراندن xurandın.

کراوات **krawat** *[ krāwāt ]* - "بۆینباخ": ئەم وشە دە زمانە ئەورووپی و نائەورووپییەکاندا بڵاو بۆتەوە و ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی Krawat کە دە زمانی ئەڵمانیدا شێوەدەربڕینێک بووە لە وشەی Kroate (G.) "کۆرۆوات" واتا خەڵکی کرۆاتیا. کراوات دە ئەسڵدا ملبەندێکی سوارکارانی کرواتیا بووە و لەبەر ئەمە ناوەکەی بۆ ناوی خەڵکی ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە.

کرپک **kırpık** - "درشتەی ئارد لە دابێژراندا": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑کەڵپک2 kelpık.

کرپ(ە) **kırp(e)** *[ kırp(a) ]* - "دەنگی شکانی شتی ناسک 2- دەنگی ددانان لە کاتێک شتێک وردەوردە دەشکێنێ": هەروەها کرپەکرپ kırpekırp دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑قەرپ qerp "دەنگی شکانی دار" و پێوەندی هەیە بە ↑*قەرفین qerfîn*.

کرت **kırt** - "بێچووی سەگ و گورگ": خزمە دەگەڵ ↑کارkar و ↑کوڕ kur.

کرتان **kırtan** [ kırtān ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑قرتان qırtan "پسان، لەت بوون".

کرتوو **kırtû** [ *kırtū* ] - "زەل، گیایەکە باقەی پێ دەبەستن":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑قەرتاڵە qertale سەر بە ریشەی **< *ger- (IE.)** "سووران، با دان، هونینەوە، گرێ دان".

2- یان دەگەڵ ↑کر kır "رایەڵی تەون"، سەر بە ریشەی **< *ker(t)- (IE.)** "چنین، هۆنینەوە، تێکخستن".

کرتەک **krtek** [ *kırtak* ] - "بەفری تەڕی سەهۆڵ بەستوو": خزمە دەگەڵ ↑کرچ kırç. ئاماژە بە "رەق بوون" دەکا.

کرچ **kırç** [ *kırč* ] - "کاڵ و کرچ ":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ roh (G.)، raw (E.)، rauw (Nl.)، ra (Sw.) "کاڵ، نەگەیشتوو، نەکوڵیو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە وەک crudus (L.) "کرچ"، crusta (L.) "تۆکڵ، توێخ"، kryos (Gr.) "بەستەڵەک"، krystallos (Gr.) "سەهۆڵ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *kreu- (IE.)** "مەیین، رەق بوون".

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑کڕ kır ەوە هەبێ کە دە بنەڕەتدا مانای "ڕەقی و سەختی" دەدا. وەک دیارە بەرهەمی کاڵ و پێنەگەیشتوو ڕەقە و بۆ خواردن ناشێ. زۆر وێ دەچێ کە ئەو ریشە هیندوئەورووپییەی سەرەوە شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی **< *kar- (IE.)** "سەخت، رەق" کە وشەی "کڕ"ی لێ پەیدا بووە. بەم جۆرە وشەکە دەگەڵ ↑کڕ kır و دەگەڵ هەموو وشەکانی سەرتر دەبێتە خزم و دواجار هەموویان بە خزم دەردەچن.

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین "کرچ" (کاڵ و کرچ) دەگەڵ "خاو" (خاو خلیچک) بەرهەڤ بکەین].

کرچە[1] **kırçe** [ *kırča* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑قرچە qırçe.

کرچە[2] **kırçe** [ *kırča* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑قرشە qırşe.

کرچەنە **qırçene** [ *qırčana* ] - "پژمین، پونژین": خزمە دەگەڵ ↑قرچە2 qırçe "دەنگی شکان و رووخان"، سەر بە ریشەی **< *ger- (IE.)** "دەنگ و هەرایەکی هیشک لێ هەستان".

کرچیان **kırçîyan** [ *kırčīyān* ] - "سیس و چرچ بوون": کرژ kırj یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑چرچ çırç.

کرخە **kırxe** [ *kırxa* ] - "پرخە": خزمە دەگەڵ ↑قرخاندن[1] qırxandın.

کردن **kırdın** - "رسکاندن، خولقاندن، سازدان": کردن kardan (P.). دەکرێ بەرهەڤی بکەین دەگەڵ creare (L.) "کردن، دروست کردن"، سەر بە ریشەی **< *ker- (IE.)** "هەڵدان، گەورەبوون".

کردوو **kırdû** [ *kırdū* ] - "بێڵ ئاستیکی پانە دوو ئاڵقەی تێدایە، پەتی تێ دەخرێ، یەک دایدەگرێ و یەک دەیکێشێ بۆ دێراو هەڵدان": خزمە دەگەڵ ↑کڕاندن kırandın سەر بە ریشەی **< *gradi- (IE.)** "رووشاندن، کڕاندن".

کرژ(ە) **kırje** [ *kırž(a)* ] - "چوست و چالاک": خزمە دەگەڵ ↑گورج gurc [گورج و گوڵ].

کرژی **kırjî** [ *kıržī* ] - "بەڵەکی، بەڵەک بوونی پێست": وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ↑کڕاژ kıraj "توێژە مار" و کرێژ kırej "توێخەپێستی وەریو". خودی ئەم وشانە دەچنەوە سەر ↑*کڕاندن* *kırandın* "رووشاندن، ڕنین". لەوانەیە بەڵەک بوونی پێست وا لێک درابێتەوە کە پێست توێخێک بەر دەدا و لەبەر ئەمە بەڵەک دەبێ.

کرس **kırs** - "زبڵ و زاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کرش kırş "چیلکە و چاڵ". خودی "کرش" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قرش *qırış* "1-چڵەگیا 2- کڵۆش 3- لکی شکاوی هیشک" و ↑ قرشک qırışk "چیلکە و چاڵ، پڕ و پووش".

کرش **kırş** [ *kırš* ] - "ورکێ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەرسەک hersek "هەڵتاوین، توانەوەی خۆراک لە سکدا" و ↑هەڕستین *herıstîn* [یان هەڕشتن herıştın، هەرشین herşîn] "ورد و خاش کردن، هەلا بە هەلا کردن، پلیخاندنەوە، هەڵوەشاندن، لەناو بردن".

کرشە **kırşe** [ *kırša* ] - "کوتکی هەرەزلی ئاسنگەر": خزمە دەگەڵ ↑هەڕستین *herıstîn* [یان هەڕشتن herıştın، هەرشین herşîn] "ورد و خاش کردن، هەلا بە هەلا کردن، پلیخاندنەوە، هەڵوەشاندن، لەناو بردن".

کرکراکە **kırkırage** [ *kırkırāga* ] - دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑کرۆژە kıroje ش بەم مانایە بە کار دێ و دەبێ ئەم وشانە پێوەندیان بە کرداری ↑کرۆشتن kıroştın ەوە هەبێ. شیاوی باسە کە دە زمانی لاتیندا (.L) cartilago " کرکراکە" هەیە کە وێکچوویتێک دەگەڵ وشە کوردمادییەکەدا نیشان دەدا و لە باری خزمایەتی دەگەڵ وشە کوردمادییەکەوە پێویستە لێی بکۆڵدرێتەوە.

کرم **kırım** [ *kırım* ] - "زیلەی خزۆک": کورم kurm یش دەگوترێ. کرم (.P) kerm. خزمە دەگەڵ (.G) Wurm، (.OE) wyrm، (.L) vermis "کرم"، سەر بە ریشەی **(.IE) *uer-, *wer- >** *"سووڕاندن، با دان ، چەماندنەوە، هۆنینەوە".*

کرمانج **kırmanc** [ *kırmānj* ] - "ناوی کۆنتری نەتەوەی کورد": دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە" دا ئەم وشەیە بەشێوەی کرماج kırmac یش هاتووە. لە باکووری کوردستان و دە شێوەزاری سەرووددا کورمانج kurmanc یش دەگوترێ. وەک پێشتر مینۆرسکی و کەساتیکی دیکە [بەو جۆرەی بیستوومە د. قاسملووش] ئاماژەیان کردووە، وشەکە دە بنەرەتدا کوردماد kurdmad [kurd +mad] بووە واتا لە دوو وشەی "کورد" و "ماد" پێک هاتووە. ئەم وشەیە چەند گۆڕاتیکی بەسەردا هاتووە کە بریتین لە:

* فۆتیمی d دە وشەی ماد دا گۆڕاوە بە c، واتا ماد بووەتە ماج. گۆڕانکاری لەم چەشنە دە زمانی کوردمادیدا نموونەی هەیە، وەک گود و گوج، دڕان و جڕان، گورد و گورج، دەم و جەم، تیوەندی و تیونجی، دژتیو و جتیو، خەدیجە و خەجیج، (.G) Kind "منداڵ" و گەنج genc و هتد.

* سوانەوەی فۆتیمی d دە وشەی "کورد" دا. فۆنێمی d دە زمانی کوردمادیدا زۆر ناجێگیرە و زۆرجار تووشی سوانەوە دەبێ، وەک بەند و بەن، خودا و خوا، سارد و سار، بازد و باز، (باد دانەوە) و بادانەوە، پرد و پڕ، شادباش و شاباش و هتد.

* کورت بوونەوەی بزوێنی u دە وشەی کورد دا بۆ سووکەبزوێنی (ı). ئەمەش تایبەتییەکی زمانی کوردییە کە زۆر لە بزوێنە کۆنەکان دەکاتە بزرۆکە. 4

* تیخزانی فۆتیمی n لە تیوان بزوێن و کۆنسۆنانتی c دا. ئەم گۆڕانەش دە زمانی کوردمادیدا زۆر جار دەبیندرێ، وەک لە وشەکانی تاج و تانج، تاجی و تانجی، جنین و هەنجنین، قوولاج و قوولانج، قیلەوقاج و قیلەوقانج ، ئاماج و ئامانج، فەرەجی و فەرەنجی، قورجاندن و قورنجاندن، دیلماج و دیلمانج، فنج سەر بە کرداری فیزان [گنج و فنج]، ژەرەژ و زارانج و مەنجەنیق (مکانیک)، وانج "نیسک، مێژوێ" و وچ "دانەوێڵە"، هەنجەت[2] و "حجت"، کلێجە و کلێنجە و هتد.

ئەوە کە گۆڕانکاری باسکراو لەژێر خاڵەکانی 1 تا 4 کامیان پێشتر و کامیان دواتر بەدی هاتوون، زۆر روون نییە و گرینگش نییە. ئەوەی گرینگە، ئەوەیە کە کوردماد بووەتە کورمانج/

کرمانج : kırmanc ← kurmanc ← kurmac ← kurdmac ← kurdmad. تا ئێرە شی کردنەوەی وشەی کرمانج بوو کە لە دوو وشەی "کورد" و "ماد" پێک هاتووە. وەک ئاشکرایە "ماد" ناوی گەلێکی دێرین لە ناوچەکەدا بووە. وشەی ↑کورد kurd بەڵام خۆی لە کۆندا نە "ناو" بووە و نە ناوی هیچ گەلێک، بەڵکوو ئاوەڵناوێک بووە کە بە ناوی "ماد"ەوە لکێنراوە و ماناکەی بریتی بووە لە "پتەو، بەهێز". بەم جۆرە مانای "کوردماد" [دواتر کورمانج/کرمانج] دەبێتە مادی ئازا و بەهێز. ئەمە وەسفێک بووە کە مادەکان لە لایەن هاوسێکانەوە پێیان دراوە. دواتر ناوی لێکدراوی "کوردماد" بە درێژایی سەدان ساڵ دوو جۆرە گۆڕانی بەسەر داهاتووە. گۆڕانی یەکەم ئەوە بووە کە لەسەرەوە باس کرا و لە ئەنجامدا کوردماد بوو بە کورمانج/کرمانج. گۆڕانی دووەم ئەوەیە کە وشەی لێکدراوی "کوردماد" تووشی سوانەوە و کورت بوونەوە هات و بوو بە "کورد"، واتا ئەو وشەیە کە سەرەتا وەک ئاوەڵناو خرابووە سەر ناوەکەوە، جێی خودی ناوەکەی گرتەوە. ئا بەم جۆرە ماد بوو بە کوردماد و کوردمادیش بوو بە کورد: kurd ← kurdmad ← mad. هەر بۆیە دەربڕینی "زمانی کوردمادی" کە لەم پەرتووکەدا لە جیاتی "زمانی کوردی" بە فراوانی کەڵکم لێ وەرگرتووە، وشەیەکی نوێ و داتاشراوی من نییە، بەڵکوو وشەیەکی زۆر کۆنە و شێوەی ئەسڵی وشەی "کورمانج/ کرمانج"ە. ڕاست کردنەوەی وشەی کرمانج بەم شێوەیە لە زمانی ئەدەبیدا پێویستی و گرینگییەکی زۆری هەیە، چونکوو پێوەندی مێژوویی و هەروەها ئێتیمۆلۆژیکی چەمک و وشەکانی "ماد، کرمانج، کورد" بە ڕوونی نیشان دەدا و ڕوونی دەکاتەوە کە ئێمەی کورد لە ڕاستیدا هەر خودی مادین و تەنیا ناوەکەمان کەمێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە و زمانەکەشمان زمانی مادییە.

[تێبینی 1: شێوەی ئەم گۆڕانکارییە کە لە وشەی کوردماد دا ڕووی داوە، کەم نییە، بۆ وێنە لەم وشانەی خوارەوەدا کە تێیاندا سەرەتا وشەیەکی لێکدراو (ئاوەڵناو + ناو) هەبووە و دواتر ناوەکە پاک بۆتەوە و ئاوەڵناوەکە جێگەی ناوەکەی گرتۆتەوە: کوندەبەبوو kundebebu ← کوند kund (کوند خۆی ناوی پەلەوەرەکە نییە و ئاوەڵناوێک بووە کە دراوە بە "بەبوو"، کە ناوی ئەسڵی پەلەوەرەکەیە). نموونەی دووەم: کۆسەماسی kossemasî ← کۆسە kosse (سەرەتا باسی "ماسی کۆسە" کراوە کە ددانەکانی وەک *گوێزان* وایە و *گاز* دەگرێ و پاشان وشەی ماسی نەماوە و بە کورتی کراوە بە کۆسە). ئەم دۆخە لەباری وشەی لێکدراوی (ناو + ناو)یشدا دەبینرێ، بۆ وێنە "کەللەسەر" سەرەتا بە مانای "کاسەی سەر" بووە و دواتر کورت بۆتەوە بۆ "کەللە" و ئیتر "سەر"یان لێ لا بردووە [کەللەی وە دیوار کەوت]، یان "کەمەربەند" [بەندی کەمەر] کورت بووەتەوە بۆ "کەمەر" [کەمەرێکی ڕەشم کڕی] و هتد. تێبینی 2: بۆ زانیاری زۆرتر لە سەر باسەکەی سەرەوە بڕوانە وتاری نووسەر لەژێر سەردێڕی "ماد، کرمانج، کورد، باسێک لەسەر چەمک، مانا و ڕیشەی وشەکان"].

**کرماندن krmandın** [ *kırmāndın* ] - "داکرۆشتن": هەروەها کرمە kırme هەیە بە مانای "دەنگی کرۆشتن". بنجی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑قرمە qırme، ↑گرمە gırme، قرماندن qırmandın، گرماندن gırmandın [بڕوانە ↑*قرمژن qırımjın*].

**کرمەک kırmek** [ *kırmak* ] - "1- بەندێکی زێڕین بۆ قایم ڕاگرتنی تاسکڵاو 2- زمانەی ناوئاڵقە": خزمە دەگەڵ Klemme (G.) "گیرە، بەند"، سەر بە کرداری klemmen (G.) "گیر پێدان، قایم کردن بە گیرە"، سەر بە ڕیشەی **< -glem*** **(IE.)** "ڕاگیر کردن، قایم کردن".

**کرناس kırnas** [ *kırnās* ] - "ئاوڵاوی، گڕۆ، گرۆێ": خزمە دەگەڵ ↑گرنج gırınc "زبری، زووری" و ↑گرنی *gırnî* [گڕنی گڕنی] واتا "زوور، زبر".

کرنگ kırnıg - "زۆم، دەستەی ڕەشماڵان": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی **< *ger(e)-** **(IE.)** "کۆ کردنەوە، خستنە سەریەک". ↑گەرد² gerd ["وە گەردی یەک" واتا دەگەڵ یەکتر، پێکەوە] دەشێ لەم ڕیشەوە هاتبێ.

کروشمە **kıruşme** *[ krušma ]* - "کز کردن و مات دانیشتن": کورشمە kurşme ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کورش(ە) kurş(e) "بەستەڵەک".

کرووچ **kıruç** *[ kırūč ]* - "1- سواوی کۆن 2 - دەفری لێوشکاو": [کەچ و کرووچ]. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کاراک karak دا باس کراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "کڕاندن، ڕووشاندن، کۆڵین، هەڵکەندن". "کرووچ" واتا شتێک کە لەبەر کۆنی داڕووشاوە، خەت خەتی تێ کەوتووە و درز و قەڵشی لێ پەیدا بووە.

کروور **kırûr** *[ kırūr ]* - "1- پێنجسەد هەزار 2- ئێکجار زۆر": کلوور kıl(l)ur یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەراو heraw. ئەم وشەیە هەروەها خزمە دەگەڵ ↑غللور ğıllûr "1- گای زۆر قەڵەو و بزۆز 2- بادیهەوا، لەخۆفش".

کرووز **kırûz** *[ kırūz ]* - "ناوەرۆک کۆڵین، ناوک هێنانەدەر لە قاپیلک": خزمە دەگەڵ ↑کرووچ kıruç.

کڕووز **kırûz** *[ kırūz ]* - "پیری پەککەوتە": بنجی وشەکە پێوەندی هەیە بە ڕیشەی **< *ĝer-** **(IE.)** "(پێ)گەیشتوو، پیر، بڵ". ↑زرت zırt [زرتەزەلام] لەم ڕیشەوە هاتووە. ئەم وشانەی خوارەوەش دەچنەوە سەر ئەم ڕیشەیە: Kerl (G.)، kerel (Nl.) "زەلام، کابرا"، churl (E.)، Karl (Sw.) "زەلام، پاڵە"، gérōn (Gr.) "پیرەپیاو"، gerousía (Gr.) "جڤاتی پیران" و gēras (Gr.) "تەمەن". کەرتی دووەمی وشە کوردمادییەکە لەوانەیە پاشگر بێ، بڕوانە پاشگری ↑ئۆز oz-.

کڕووزان **kıruzan** *[ kırūzān ]* - "سووتانی موو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قرچان qırçan [هەڵقرچان] "چرچ و لۆچ بوون بە تینی ئاگر".

کڕووزانەوە **kıruzan(ewe)** *[ kırūzān(awa) ]* - "پاڕانەوە و لاڵانەوە": خزمە دەگەڵ gerīstan (P.) "گریان" و هەروەها دەگەڵ greet (E.)، grētan (OE.) و grazan (Got.)، grata (MG.)، (ON.) "گریان، هاوار کردن". وشەی "سڵاو کردن" دە زمانەژێرمانییەکاندا وەک greet (E.) و grüßen (G.)، gruozen (OG.) پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە و دە بنچینەدا مەبەست بانگ کردن و دەنگ هەڵبڕین بووە.

کڕووساندنەوە **kırusandın(ewe)** *[ kırūsānawa ]* - "کڕاندن بە ددان": کڕۆستنەوە kırostın(ewe) ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کڕۆشتن kıroştın.

کڕۆژە **kıroje** *[ kroža ]* - "کڕکڕاکە": پێوەندی هەیە بە ↑کڕۆشتن kıroştın. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کڕکڕاکە kırkırage.

کرۆسک **kırosk** - "هەرمێ کێویلە": ↑کرۆت kırot یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە "ڕەق و سفت بوون" دەکەن، وەک ↑کرچ kırç [کاڵ و کرچ واتا ڕەق]، ↑کورسین kursîn "قایم بوون"، ↑قەرسین qersîn "تەزین، مەیین"، گرسک gırsık "1- کێڵکەی ڕەق 2- کرۆسک، هەرمێ کیویلە"، ↑گەرووز geruz "زوور، ڕەق" و ↑گرسە *gırse* "1- تۆڵا، قورسە 2- زەوی ڕەق" و هتد. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑خار xar "سەخت"، سەر بە ڕیشەی ڕیشەی **< kar-, **ker-** **(IE.)** "سەخت".

کڕۆشتن **kıroştın** *[ kıroštın ]* - "جووتن و کرتە لێهێنانی شتی سفت": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەلۆژتن kelûjtın.

کرە **kıre** *[ kıra ]* - "دەستار": خزمە دەگەڵ ↑گێرە *gere* و ↑هاڕین harîn.

کرەک **kırek** [ *kırak* ] - "نەجووڵ، جماد، دژبەری زیندەوەر": لە بنەوشەی ↑کڕ kır "بێدەنگ، بێجووڵە" وەرگیراوە.

کریژۆک **kırîjok** [ *kırīžok* ] - "ناوەوەی کونی گوێ": خزمە دەگەڵ ↑کاراک karak "کان، مەعدەن".

کریسک(ە) **kırîsk(e)** [ *kırīsk(a)* ] - "پڕیشکی ئاگر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کوورە kure "سۆپە"، سەر ریشەی **< *ker-** *(IE.)* "سووتان، هایسان". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا سکە [(e)ske] پاشگری گچکاندنە کە لە وشەی "پزوسک" یان "بزیسک" و "پروسک"یشدا دەبینرێ. ئەم وشانەش مانای "پڕیشک، ئاورینگ" دەبەخشن.

کریس(ە) **kırîs(e)** [ *kırīsa* ] - "وشەی بانگ کردنی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ↑کوڕ1 kur "زارۆکی تیر".

کڕین **kırîn** [ *kırīn* ] - "هەستاندن بە پووڵ": خریدن xarīdan (P.). خزمە دەگەڵ↑ کرێ kıre "ئیجارە".

کرێ **kıre** [ *kıre* ] - "ئیجارە": کرایە kerāye (P.). هاوریشەیە دەگەڵ heuern (G.)، hire (E.)، hera (OF.) "بە کرێ دان". ریشە ئەم وشەژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑کڕین kırîn "ستاندن بە پارە".

کرێب1 **kırêb 1** [ *kıreb* ] - "زەوییەک کە دوو ساڵ جارێک دەکێلرێ 2- زەوی یەک جار گاسن لێدراو": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑غوڕاب ġurab دا باس کراون.

کرێب2 **kırêb 2** [ *kıreb* ] - "خەم و خەفەت": هەروەک grief (E.) "دژواری، رەنج، پەژارە، خەم و خەفەت" دەچێتەوە سەر **<** *gravāre (L.)* و خزمە دەگەڵ ↑گران gran "سەنگین، قورس".

کرێت1 **kıret 1** [ *kıret* ] - "1- ناحەزی تزسناک، قێزەون 2- پیس، قرێژ": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرێژ qırej.

کرێت2 **kıret 2** [ *kıret* ] - "سندە گڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑گرسە gırse "تۆڵا، پێکەوەنووساو".

کرێژ1 **kırej 1** [ *kırež* ] - "وردەتۆێخی پێست بەتایبەتی پێستی سەر کە لێ دەبێتەوە":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کرچ kırç [کرچ و کاڵ] دا باس کراون و هێندێکیان ئاماژە بە "قرتماغە، تۆژاڵکی سەر برین" دەکەن.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە دەگەڵ ↑کارێز karez خزم بێ، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، رووشاندن".

کرێژ2 **kırej 2** [ *kırež* ] - "شانەی هیشکی هەنگوین": خزمە دەگەڵ ↑کڕاش kıraş "مێو، مۆم، واکس" کڕاژ kıraj یش دەگوترێ.

کرێڤ **kırev** [ *kırev* ] - "خزم، دۆست": **<** *قرب، اقربا* (Arb.)

کرێوە **kırewe** [ *kırewa* ] - "بەفری بە باوە": کرۆڤە kırove و کڵافە kılafe ش دەگوترێ. هەروەها کڵافە1 kılafe هەیە بە مانای "1- خەڕەک 2- کرێوە 3- سەر لێشێواو، پەرێشان". دەشێ خزم بێ دەگەڵ جێیی hwerban (OG.) "سووڕان، تەقەلا کردن"، hwaírban (Gt.) "گۆڕین"، hweorfan (OE.)، hverfa (OIs.) "با دان(ەوە)". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ Wirbel (G.) "چەرخ، گێژەن، گێژەڵووکە" [هەروەها ئاژاوە، شێواوی] و Wirbelsäule (G.) "تیغەرەی پشت" [ئەستوونی وەرسووڕان (ی لەش)] و karpós (Gr.) "مەچەکی دەست" [شوێنی وەرسووڕانی دەست]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *kuerp-** *(IE.)* "سووڕان".

**کز kız** - "لەڕو لاواز، بێهێز، داماو": دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە دەشێ لە یەک پێوەندییدا لێک بدرێنەوە. ئەم وشانە بریتین لە ↑کاس kas [کەم وکاسی واتا کەم و کورتی]، [ دە فارسیدا کاستن kāstan (.P) "کەم بوونەوە"]، ↑کەساس kesas "پەرێشان"، ↑گچکە gıçke [گچ + کە] یان ↑خوچۆک xuçok [خوچ + ئۆک] "چکۆڵە"، [کوچک kūčak (.P)]، ↑کچ / کیژ kıç / kîj "زارۆی مێیینە" [یان مێیینەی گچکە]. جگە لەمانە وشەکانی ↑کوشتن kuştın، ↑کووژاندنەوە kujandınewe، ↑کش kış [کش و مات] هەن بە مانای "لەناو بردن، پاک کردنەوە، دامرکاندن" کە دە بنچینەدا بە مانای "کەم و چکۆڵە بوونەوە، لە کزی دان، بەرەو نەمان چوون" بووە. بەراوردی کوشتن kuştın و کەستەنە kestene "کوشتن" بکە دەگەڵ کاستن kāstan (.P) "لە کەمی دان، لە کزی دان، چکۆڵە بوونەوە". هەروەها بەراوردی کووژانەوە kujandınewe بکە دەگەڵ ↑کاسین kasîn [داکاسین] بە مانای "دامرکان"، سەر بە ریشەی *kak- < (IE.) "کەم، گچکە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قیق qîq "لەڕ، داڵگۆشت"، ↑گەجەر gecer "کز، داڵگۆشت" و ↑هەژار hejar "نەدار، بێچارە" کە ئەوانیش هەر لەم چوارچێوەیەدا خۆیان دەبیننەوە.

**کزانەوە kızan(ewe)** [ *kızānawa* ] - "سووتانەوە (ی پێست)": هەروەها ↑چزانەوە çızan(ewe) هەیە بە مانای "سووتان". جگە لەمە چەند وشەیەک هەن کە دەشێ گشتیان سەر بە خێزانێک بن وەک ↑کزە kıze [کزەی جەرگ]، ↑کسکیان kıskîyan "کزانەوە". ئەم وشانە جێ بەرهەڤ کردنن دەگەڵ:

1- ↑هەژگ hejg، ↑هیشک *hîşk* سەر بە ریشەی *as- < (IE.) "سووتان، هیشک بوون".

2- سووژیان sujyan و ↑سووتان sutan، سەر بە ریشەی *kuei- < (IE.) "هایسان، درەوشان"

**کزخاندن kızxandın** [ *kızxāndın* ] - "هەڵپەرتاوتن": هەروەها کەزاخ kezax یان کساخ kısax هەیە بە مانای "هەڵپەرتاوتن". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قاش qaş و ↑گەستن *gastın* و چەند وشەیەکی دیکەی بە مانای "برین، لەت کردن".

**کزر kızır** [ *kızır* ] - "نیوەهیشک": خزمە دەگەڵ ↑قسر qısır "ئەستیور، نەزۆک". لەوانەیە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- xeros (.L) "هیشک".

2- ↑کزانەوە kızan(ewe) "سووتانەوە (ی پێست)".

**کزک kızık** [ *kızık* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑چزیلک çzîlk، دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چزانەوە çızan(ewe) یان ↑*کزانەوە kızan(ewe)* "سووتانەوە (ی پێست)".

**کزکە kızke** [ *kızka* ] - "نان لە ئاردی بەڕوو": خزمە دەگەڵ ↑ققە qıqe [قەقە qeqe].

**کزگرین kızgırîn** [ *kızgırîn* ] - "لەرزین لەبەر تاو و تێ": خزمە دەگەڵ ↑هەژان hejan.

**کزن kızın** - "گوڵبێبە، باکێش، کونی با": خزمە دەگەڵ ↑خەزێنە xezene "1- گەنج، گەنجینە".

**کزێنکە kızênke** [ *kızenka* ] - "شلکینەی سوورەوە کراو": خزمە دەگەڵ ↑کزکە kızke "نان لە ئاردی بەڕوو".

**کژ1 kıj** [ *kıž* ] - "1- جەنگە 2- وەرز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کات kat.

**کژ2 kıj** [ *kıž* ] - "خاوی بانەدراو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گەچلان geçlan "چرچ و سیس بون" و دەگەڵ ↑کز kız سەر بە ریشەیەک بە مانای "کەم بوون، لەکزی دان، لەناو چوون".

**کژژ kıjj** [ *kıžž* ] - " دەنگی قرمەقرم": خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje و چەندین وشەی دیکە.

**کژک kıjık** [ *kıžık* ] - "پەرێشان حاڵ، دڵتەنگ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کز kız.

کژنگ **kıjnıg** [ *kıžnıg* ] - "چنگنە، زیلەی بە پێستەوە نووساو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گاز gaz و ↑گەستن *gestın*.

کژۆلە **kıjole** [ *kıžola* ] - "ئاڵاش": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەژگ hejg "چرپی، ئاڵاش".

کژین **kıjîn** [ *kıžīn* ] - "پشمین": خزمە دەگەڵ ↑قۆزین qozîn [↑کۆخین koxîn].

کس **kıs** - [کس کس] بۆ دەنگ دانی مەڕ و سەگ بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑کش1 kış "دەنگ دانی جووجکە" [کش کش، کشەکشە] و دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گژ8 *gıj* "وشەی دنە دانی جوانەگا بۆ سەر چێل".

کسپە **kıspe** [ *kıspa* ] - "1- چزە، کزە 2- دەنگی ئاو بەسەر ئاگردا کردن":

1- لەوە دەچێ وشەکە ئاماژە بە "دەنگ" بکا و خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑قیژە qîje، ↑قاسپە qaspe، ↑قووزە quze، ↑گاز gaz [ گاز کردن] و هتد.

2- لەوانەشە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "سووتان" بکا و خزم بێ دەگەڵ ↑کسکیان kıskîyan و ↑کزانەوە kızan(ewe).

کسکە **kıske** [ *kıska* ] - "بریقە، درەوشانەوەی چاوی جانەوەر": خزمە دەگەڵ ↑کەسک kesık "ڕەنگی سەوز".

کسکیان **kıskîyan** [ *kıskīyān* ] - "کزانەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کزانەوە kızan(ewe). بە تێخزانی ناوگری k وەک ناوگری جەخت کردن [لەباری ناوگرەکەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ئالۆزکان، خلیسکان، دامرکان، پەشۆکان و هتد].

کسۆک **kısok** - "1- سەگ 2- توتکەسەگ": ↑کووچەک kuçek ش دەگوترێ.

کش1 **kış** [ *kış* ] - "دەنگ دانی جووجکە": [کش کش یان کشەکشە]. هەروەها ↑کس kıs [کس کس] بۆ دەنگ دانی مەڕ و سەگ بەکار دێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گژ8 gıj "وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چێل".

کش2 **kış** [ *kış* ] - دە کایەی "شەترەنج"دا دەگوترێ [کش و مات]. کش لێرەدا مانای دەنگ دان نییە، چونکە کش یاخود کش کش بۆ دەنگ دانی جووجەڵە بەکار دێ نەک پادشا! کش دەچێتەوە سەر کرداری ↑کوشتن kûşıtn و مەبەست لێرەدا "لەناو چوون" یان "بەرەو نەمان چوون"ی پادشایە. بەم جۆرە دوو وشەی "کش"و "مات" هەر دووک هاومانان. وشەی یەکەم وشە ڕەسەنەکەیە و وشەی دووەمیش وەرگێڕاوی عەرەبی ئەوە. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەروەک چۆن وشەی شەشرەنگ یان شەترەنگ بە وشەی عەرەبێندراوی "شەترەنج" گۆڕدراوەتەوە، هەرواش وشەی "مات"ی عەرەبی خوازراوەتەوە و وێرای وشە ڕەسەنەکەی "کش" بەکار هێندراوە. کش دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کز kız.

[تێبینی: دیارە دە کایەی شەترەنجدا لەپێشدا شایەکە "کش" دەدرێ و دوایە "مات" دەکرێ. بەڵام دەشێ لە کۆندا ئاوا نەبووبێ، بەڵکوو "کش" بە مانا و لە جێگەی "مات"ی ئەمڕۆیی بەکار هێنرابێ. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ ڕەپێ نانی شا لە کایەکەدا دەگوترێ Schach "شا" و کاتێکیش شا مات کرا، دەگوترێ Scachmatt "شا مرد". ئەم وشەیە لەڕێگەی زمانی سپانییەوە هاتووەتە ناو زمانەئەورووپییەکان و دەگەڕێتەوە سەر زمانی عەرەبی. کەرتی یەکەمی وشەکە دەگەڕێتەوە سەر وشەی شا şa. لەوانەیە دە زمانی کوردمادی بەرێدا وەک ئەڵمانییەکە بۆ ڕەپێ نانی شا، هەر خودی وشەی "شا" بەکار هێنرابێ، هەر وەک چۆن بۆ دەرپەڕاندنی "کتک" وشەی "ختتە" بەکار دێ کە خۆی هەر مانای کتک دەدا، واتا شا قاو کراوە کە ڕا بکا و خۆی لە مەرگ دەرباز بکا. کاتێکیش "شا" ڕێگەی هەڵاتنی لێ براوە، گوتوویانە "کش"، سەر بە کرداری

"کوشتن، کوژران"، واتا شا ئیتر کوژرا. بەم جۆرە "کش" بەرانبەری "مات"ی عەرەبی دەوەستێ. کوژرانی شا لە کایەکەدا راسترە تا مردنی (مات بوونی)، چونکوو ئەو کایەیە جۆرێک لە شەڕ و زۆرانبازی جەنگی نیشان دەدا کە سەرباز و قەڵا و ئەسپ و فیل بەشداری تێدا دەکەن و لە شەڕێکی وەهاشدا "شا" نامرێ، بەڵکوو دەکوژرێ، هەروەک زۆرێک لە شاکان کە لە راستیدا تووشی ئەم چارەنووسە بوون و دەبن].

**کشت kışt** *[ kıšt ]* - دەگەڵ "کاڵ" دێ [کشت و کاڵ kışt û kal]. کاشتن kāštan (P.) "چاندنی تۆو، ناشتنی دار". خزمە دەگەڵ ↑کاش2 kaş "1- شوێن پێ لەناو کێلگە 2- شێو، کێڵانی زەوی" و هەروەها دەگەڵ ↑قاش qaş و ↑کووز kuz "بڕ، لەت، خەت" و دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ↑گاز gaz و ↑گەستن *gestın*.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا کشت و کاڵ kışt û kal دەگوترێ کە لە راستیدا لە دوو بنەوشەی جیاواز، بەڵام هاومانا پێک هاتووە. "کاڵ" دەچێتەوە سەر کێڵان kelan و دە فارسیدا کار -kar (P.) دەبێتە رەگی کرداری ئێستا (میکارم mīkāram (P.) "دەکێڵم"). ئەم وشانە دە ریشەدا بە مانای "بڕین، رنین، خەت لێدان" لە زەوین. هەر بەم شێوەیە "کشت" یان رەگی کرداری کاشت -kāšt (P.) پێوەندیان بە چەمکی "بڕین"ەوە هەیە. خاڵێکی دیکەیە کە لێرەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا هەم بۆ کرداری رابردوو و هەمیش بۆ ئێستا یەک رەگی کردار، واتا "کێڵ" بە کار دێ (کێڵام، دەکێڵم). بەڵام دە زمانی فارسیدا بۆ کرداری رابردوو رەگی "کاشت-" بەکار دێ (کاشتم) و بۆ کرداری ئێستا رەگی "کار-" دێ (میکارم). "کاشتن" دە زمانی فارسیدا هەم مانای "کێڵان" و هەمیش مانای "چاندن" دەبەخشێ. بەڵام مانای بنەڕەتی وشەکە "کێڵان"ە. مانای دووەم دواتر لە یەکەمەکەوە سەری هەڵداوە. بە پێچەوانەی بۆچوونێکی باو، دوو رەگەکرداری کاشت -kāšt و کار -kar دە زمانی فارسیدا، سەرەڕای مانای هاوبەش، لە رەگەزێکەوە نین و هەر کام ریشەی جیاوازی خۆیان هەیە. دە زمانی فارسی و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا لە هێندێک کرداری دیکەشدا ئەم دۆخە بەرچاو دەکەوێ، واتا "دۆخی دوورەگەیی" یان دوورەگەزی کردارەکان].

**کشتێل kıštêl** *[ kıştel ]* - "ئەسکۆ، مەلاقە":خزمە دەگەڵ ↑کەشتی keştî. سەبارەت بە پێوەندی ئەو چەمکانە بەیەکەوە بڕوانە ↑جام cam.

**کشمیش kışmîş** *[ kıšmīš ]* - "ترێی وردی وشک کراو": کشمش kešmeš (P.). کەرتی میش -mîş لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ↑ مێوژ mewj. کەرتی یەکەمیش، واتا کش -kış دوور نییە پێوەندی بە ↑هیشک hîşk ەوە هەبێ.

**کشین kışîn** *[ kıšīn ]* - "بەپەلە رابردن": خزمە دەگەڵ ↑خوشین xuşîn.

**کف kıf** - "1- دەنگی هەڵچوون و سەررێژ کردن [کففە kıffe ش دەگوترێ] 2- با کردوو": هەروەها ↑کفت kıft هەیە بە مانای "جۆشینی بە تەوژم" (کفت و کۆ kıft û ko یان کفت و کوڵ kıft û kul). راستە لە کاتی جۆشیندا رەنگە "کەف"یک ساز ببێ، بەڵام ئەم وشەیە لەوەناچێ پێوەندی بە "کەف"ەوە هەبێ، بەڵکوو ئەوەی لێرەدا مەبەستە، هەڵچوون و بەرز بوونەوەیە یان با کردن و هەڵمسانە کە ئەویش جۆرێک لە بەرز بوونەوەی تێدایە. هەر بۆیە وشەکە بە سێ شێوەی کف kıf، ↑کفت kıft و ↑کۆ ko دەر دەکەوێ. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ heben (G.)، heffann (OG.)، heave (E.)، häva (Sw.) "بەرز کردنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ capere (L.) "گرتن، هەڵگرتن، وەرگرتن"، سەر بە ریشەی **< -kap* (IE.)** "گرتن". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑قەپان *qepan* "تەرازووی زل" کە شتی پێ هەڵدەکێشن.

**کفان kıfan** [ *kıfān* ] - لەگەڵ پێشگری "هەڵ" بەکار دێ [↑هەڵکفان helkıfan یان هەڵکفین helkıfîn "1- هەڵچوون لەسەر ئاگر 2- هەڵازنانی پێست لە زیپکە 3- هەڵمسان و با کردن 4- ترشانی هەویر]. خزمە لەگەڵ ↑کف kıf.

**کفت1 kıft** - بڕوانە ↑کف kıf.

**کفت2 kıft** - "شەکەت": هەروەها کفتی kıftî هەیە بە مانای "شەکەتی". جگە لەمانە ↑کوتر kutır هەیە کە دەگەڵ شەل دێ [شەل و کوتر]. "کوتر" دەشێ کۆنتر کەفتر *keftır** بووبێ، سەر بە کرداری ↑کەوتن kewtın [کەفتن keftın : کەفتر keftır ← کەوتر kewtır ← کوتر kutır]. ئەم جۆرە گۆڕانە لە گەلێک وشەی زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ، وەک "زوور" [زبر]، "سووران" [زڤرین]، "زۆر" [زاڤەر]، "کون" [کاڤن]، "شۆق" [شەبەق]، "تۆق" [تەپک] و هتد. وشەی "شەکەت"یش لە سقط عەرەبی وەرگیراوە بە مانای "کەوتن".

**کفتە kıfte** [ *kıfta* ] - "خواردنێکە بە گۆشتی کوتراو ساز دەکرێ": کفتە kofte (P.). خزمە دەگەڵ ↑کوتان kutan.

**کفر1 kıfır** - "دارێکی جەنگەڵی": کوفێری kuferî ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Kiefer (G.) "سنەوبەر". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑سنەوبەر sınewber.

**کفر2 kıfır** - "ڕەنگی ڕەش": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe "خۆڵەمێشی".

**کفش kıfış** [ *kıfiš* ] - "دیار، خویا، ئاشکرا": کفش kıvış یش دەگوترێ. دە فەرهەنگا کورمانجی-ئینگلیزیدا وەرگیرانی ئەم وشەیە لە کشف kaşf (Arb.) "دۆزینەوە، ئاشکراکردن، بەدیار خستن" وەک پرسیار ئاماژەی پێکراوە. بەڵام جێی ئاماژەیە خودی وشە عەرەبییەکە لە کاوش kāveš (P.) "کۆڵین، کۆڵینەوە، تۆژینەوە" وەرگیراوە [پاشگری kāv + eš < کاویدن kavîden واتا کۆڵین(ەوە)]. ئەم وشە فارسییە خۆی دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کون kun "درز، کەلێن". بەم جۆرە دەبێ مانای ئەسڵی وشەکە "تۆژینەوە، کۆڵینەوە، دۆزین" لە زمانی عەرەبیدا گوڕدرابێ بە "دۆزینەوە، پەیدا کردن".

**کڤر kıvır** - "پشیلەی نێر": گڤر gıvır یش دەگوترێ. شێوەیەکی کۆنترە لە ↑گورپە gurpe. بەراوردی وشە "کڤر" بکە بەتایبەتی دەگەڵ hwelan (OE.) "مراندن، گوڕاندن" و hvellr (OIs.) "قیژاندن".

**کڤی kıvî** [ *kıvī* ] - "کووپەڵەی دەم تەنکێ": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- ↑قاپ1 qap "دەفر".

2- ↑کون kun [دە بنەڕەتدا بە مانای شتێک یان شوێنێکی "دەمداپچڕاو"].

**ککەو kıkew** [ *kıkaw* ] - "دارێکی جەنگەڵی سەخت، کەڤۆت، کەوت": بنجی کک -kık دەشێ دەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ کە لە ژێر ↑*سەق seq* دا باس کراون و ئاماژە بە "سەختی" دەکەن. وشەی "کەڤۆت" کە ناوێکی دیکەی ئەم دارەیە، دەچێتەوە سەر وشەی "سفت" و ئەویش ئاماژە بە سەختی دارەکە دەکا. وشەکە هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کۆک kok "ڕەگ و ڕیشە، ئەسڵ" و ↑کاکڵ kakıl "ناوک".

**کل1 kıl** - "خوار بوونە، داهاتنەوە": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قەلان qelan "چەمانەوە"، ↑قەلانگ qelang "داری سەر چەماو"، ↑کەلەکە keleke "تەنیشت"، هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ lehnen (G.)، (h)linen (OG.)، leunen (Nl.)، lean (E.) "پاڵ دانەوە"، klínein (Gr.) "پاڵدانەوە، داهاتنەوە"، clinare (L.) "داهاتنەوە، چەمانەوە"، سەر بە ڕیشەی < *klei-** (IE.) "چەمان، داهاتنەوە، پاڵ دانەوە".

**کل kıl 2** - "سورمە، دەرمانی چاوڕشتن": ئەم وشەیە پەڕیوەتە ناو زمانی ئینگلیزیش و بووەتە kohl (E.). ریشەی وشە ئینگلیزییەکەیان بڕووەتەوە سەر کحول kħûl (Arb.) "گەردێکی ورد و نەرم". هەروەها دەگوترێ وشەی Alkohol دەچێتەوە سەر الکحول alkħûl (Arb.) و ئەمیش پێوەندی بەم وشەوەهەیە. بەڵام کل kıl دەشێ وشەیەکی زمانی کوردمادی بێ وخزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑گڵ gıl و چەند وشەیەکی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "پێوەنووسان، چەسپان، تێهەڵسوون". لەوانەیە وشەی kolla (Gr.) "چەسپ، سرێش" خزمایەتی دەگەڵ وشە کوردمادییەکان هەبێ.

2- ↑خەڵووز xeluz "ڕەژی". جێی ئاماژەیە کە وشەکانی "ڕەش"، "ڕەژی" و "ڕشتن" [چاو ڕشتن، چاو ڕەش کردن] پێکەوە خزمن.

**کل kıl 3** - "درەوشانی هەسارە، تینی ئاگر": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- ↑کل kıl "کوورە".

2- glühen (G.)، gloeien (Nl.)، glow (E.)، glo (Sw.) "هایسان، سوور بوونەوە"، سەر بە ریشەی *ghel- (IE.) "درەوشانەوە، تروسکانەوە". دە زمانی کوردمادیدا ↑زێڕ zer و ↑زەرد zerd، ↑زۆڵ zol [زەرد و زۆڵ zerd u zol] لەم ریشەوە هاتوون

**کڵ kıl 1** - "کوورە بۆ سوور کردنەوەی سواڵەت":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Herd (G.)، Haard (Nl.)، hearth (E.) "کوانوو، وەجاق"، carbo (L.) "ڕەژی"، cremare (L.) سووتاندن، کردنە خۆڵەمێش". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *ker- (IE.) "سووتان، هایسان". وشەی ↑کوورە kure "سۆپە" دەشێ سەر بەم ریشەیە بێ.

2- لەوانەشە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑کل kıl 3 دا باس کراون.

**کڵ kıl 2** - "پایەی پرد": خزمە دەگەڵ ↑کێل kel و ئەو وشانەی ئاماژە بە قیتی و بڵیندی دەکەن.

**کلاچ kılaç** [ kılāč ] - "بەفین، بادیهەوا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ klatschen (G.)، kletsen (Nl.). ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑غەڵبە ġelbe [غەڵبەغەڵب] و ئاماژە بە دەنگێک دەکەن کە لە کاتی وێککەوتن یان پێکدادانا دروست دەبێ. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە مانای "چەپڵە لێدان" و هەروەها "چەنە لێدان" دەبەخشێ. ئەم وشەیە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑کەلاچ kelac.

**کڵاشین kılaşîn** [ kılāšīn ] - "خوراندن": شێوەیەکی دیکە لە ↑کڕاندن kırandın. هەروەها دەگەڵ ↑ئالۆش aloş بەرهەڤی بکە.

**کڵافە kılafe 1** [ kılāfa ] - "1- خەڕەک 2- کرێوە 3- سەر لێشێواو، پەرێشان": ئەم وشەیە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کرێوە kırewe و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، خولانەوە".

**کڵافە kılafe 2** [ kılāfa ] - "چوارچێوەی باریک": خزمە دەگەڵ Klappe (G.) "دەربیجە، دەلاقە". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑غەڵبە ġelbe [غەڵبەغەڵب]. دە زمانی کوردمادیدا ↑کڵاورۆژنە kılawrojne هەیە کە کەرتی یەکەمەکەی خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە، واتا دەلاقەیەک بۆ پێداهاتنی ڕۆشنایی.

**کلان kılan** [ kılān ] - "ژەندن، کیاندن، شڵەقاندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شڵەقان şıleqan. ↑شێلان şêlan یش هەر لە "شڵەقان"ەوە هاتووە و دە بنەڕەتدا مەبەست "لێکدان" بووە.

**کلانە kılane** [ kılāna ] - "کەلارە، دەفری لە ریخ چێکراو":

1- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ ↑کەلارە kelare.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کالان kalan. دە بنەڕەتدا واتا ئەوەی شتێک دادەپۆشێ، شتێک دەچێتە ناوی.

کڵانە **kılane** [ *kılāna* ] - "مووروو":

1- لەوانەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑کەلا kela "مەرمەڕ".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کالان kalan و ↑هاڵقە halqe [خەڵەک xelek]، دە بنەڕەتدا واتا ئەوەی شتێک دادەپۆشێ، شتێک دەچێتە ناوی.

کڵاو **kılaw** [ *kılāw* ] - "سەرپۆش": کوڵاو kulaw و سەرکڵاوە serkılawe ش دەگوترێ. کلاه kolah (P.).

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قول(ل)ە qul(l)e "دوند، سەرترین شوێن".

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کالان kalan و↑ *هاڵان halan* [لێهاڵان].

کڵاورۆژنە **kılawrojne** [ *kılāwrožna* ] - "کونی میچ بۆ ڕووناکی تێخستن": "کڵاورۆژنە" دە بنەڕەتدا بریتییە لە "دەلاقە" یان "چوارچێوەیەک" بۆ پێدا هاتنی ڕووناکایی. بڕوانە ↑کڵافە2 kılafe "چوارچێوەی باریک".

کلب **kılb** - "1- کەڵپ 2- گوڵمیخ": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڵپ kelp.

کڵپاتە **kılpate** [ *kılpāta* ] - "فزە، کەمترین دەنگ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑غەڵبە ġelbe [غەڵبەغەڵب].

کڵپە **kılpe** [ *kılpa* ] - "دەنگی بڵێسە": گڵپە gılpe، گرپە gırpe، گرفە gırfe ش دەگوترێن. کڵپ و هوڕ kılp û hur یان کڵپەکڵپ kılpekılp یش بە کار دێ. ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑غەڵبە ġelbe [غەڵبەغەڵب].

کلتوور **kıltûr** [ *kıltūr* ] - "سورمەدان، کلدان": ↑کل kıl + توور tur. بۆ مانای "توور" بڕوانە ↑توورەکە tureke. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "توورەکەی کل".

کلچان **kılçan** [ *kıčāln* ] - "فانۆس، لەنتەر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑گیرسان gîrsan [داگیرساندن].

کلچۆک **kılçok** [ *kılčok* ] - "چێوکی کل لە چاو کێشان": کلچێو(ک) kılçew(k) یش دەگوترێ. کل kıl + چۆک çok [چێوک]. [بڕوانە ↑چێو çew "دار"].

کلس **kıls** - "قسڵ": شێوەی کۆنتر و دروستی ↑قسڵ qısıl.

کلفەت **kılfet** [ *kılfat* ] - "قەرەواش، خزمەتکاری ژن": کولفەت kulfet یش دەگوترێ. کلفت kolfet (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ helfen (G.)، helfan (OG.)، hilpan (Gt.)، help (E.)، hjälpa (Sw.) "ئاریکاری کردن، کۆمەکێ کردن"، šelpti (Lit.) "ئاریکاری کردن، پشتیوانی کردن"، سەر بە ریشەی **< *kelb- (IE.)** "پشت گرتن، ڕاگرتن" [وەک ڕاگرتنی کاریتە لەسەر ↑کۆڵەکە koleke]، ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **< *kel- (IE.)** "لێهاڵاندن، تاقەت کردن".

[تێبینی: بە گوێرەی "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی" ( ل. 335) وشەکە دەچێتەوە سەر < *kulfah (Arb.)* "زەحمەت، ئەرک".]

کلک **kılık** - "1- قامک 2- دووما، دووڤ": دە زمانی کوردمادی دا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەک کە ئاماژە بە شتی تیژ، زەق و دەرپەڕیو دەکەن، وەک ↑کێل kel "بەردی سەرگوڕ"، ↑کلێچە kılece [کلێنجەش دەگوترێ، بە فارسی "دنبالچە" واتا کلکی چکۆڵە]، ↑کلۆچ kıloç "قۆچی ئاژەڵ" و هتد. دە زمانی فارسیدا کلک kelk (P.) بە مانای "قامیش، قەلەم قامیش" و هەروەها "تیر" بەکار دێ. ئەم وشانە لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە Kiel (G.) و quill (E.) "ئەو

بەشە درێژ و رەقەی پەڕی پەڵەوەر کە پێشتر وەک قەڵەم، واتا وەک خامە کەڵکی لێ وەرگیراوە" ["خامە" خزمە دەگەڵ "قامیش" و دەگەڵ "قامک"]. دە زمانی فارسیدا کلک kelk (P.) بە مانای "قەڵەم، خامە" بەکار دەهێنرێ. ریشەی وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە ساخ نەکراوەتەوە. لە لایەکی دیکەوە ریشەی هیندوئەورووپی **< *kel- (IE.)** "دەرپەڕین، قوت و زەق بوون" سەرنج رادەکێشێ و لەوانەیە ئەو وشانە لەم ریشەیە سەرچاوەیان گرتبێ. وشەیەکی دیکە کە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ، وشەی ↑کیر kîr "ئەندامی تیرایەتی"یە. دە زمانی ئەڵمانیدا دوو وشە بە مانای "ئەندامی تیرایەتی" بەکار دەهێنرێن، دە زمانی نڤیسیندا Penis بەکار دێ کە ریشەی لاتینی هەیە و دە بنەڕەتدا مانای "کلکە"ی هەبووە. دە زمانی ئاخاوتندا Schwanz بەکار دێ کە ئەویش مانای "کلک" دەدا و خزمیشە دەگەڵ وشەکانی "دووڤ، دووم"، "دوو" یان کۆنتر "چمە"ی کوردی. وەک دەبینرێ لە زمانەکانی دیکەشدا وشەیەکی هاوبەش بۆ دوو ئەندام بەکار هێنراوە. بۆیە زۆر رێی تێ دەچێ کە دە زمانی کوردیشدا هەمان پێوەندی لە ئارادا بێ.

**کلکەسووتە kılkesute** *[ kılkasūta ]* - "کلک راتڵەکاندنی سەگ": کلک kılk + سووتە sute. کەرتی "سووتە" پێوەندی هەیە بە کرداری ↑جمین *cımîn* [یان جڤین cıvîn، دە فارسیدا: جنبیدن jonbīdan (P.)]. دەشێ شێوەی کۆنتری ئەم کردارە دە زمانی کوردمادیدا *سڤیتەن* *svîten بووبێ [دە ئەڵمانیدا: schwingen (G.)] و لەمەوە پاشان "سووتە" دروست بووە. شیاوی باسە وشەکانی ↑چمە çıme "کلک" و هەروەها ↑دوو du [دووڤ duv، دووما duma] "کلک" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانەوە بەراوردی ئەم وشانە بکە بۆ وێنە دەگەڵ کرداری *دوان* "قسە کردن"].

**کلل kıll** - "ئەسپی سپی خاڵدار": خزمە دەگەڵ ↑کاڵ kal.

**کلوز kıluz** - "گوڵوگەنمی هەڵپرژوزاو": خزمە دەگەڵ ↑خەڵووز xeluz "رەژی".

**کلۆ kılo** - "شتی خڕ و پێکەوەنووساو": کلوخ kolūx (P.)، خزمە دەگەڵ Kloß (G.)، kloz (OG.) "کلۆ"، kloot (Nl.) "تۆپەڵە"، gluda (Rus.) "لێکهاڵان، پێکەوەنووسان، گلوو بوون" سەر بە ریشەی **< *gel- (IE.)** "گلوو بوون، پێکەوەنووسان، رێکگوشران، تۆپەڵە بوون". دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشە دەچنەوە سەر ئەم وشەیە وەک ↑گلوو gılu، ↑گلۆڵە gılole، ↑گوڵلە gulle و هتد.

**کلۆت kılot** - "ئێسکی سەر سمتی یەکسم": خزمە دەگەڵ ↑کلێجە kılece [کلێنجە kılence] "ئێسکی سەر سمت".

**کلۆچ kıloç** *[ kıloč ]* - "قۆچی ئاژەڵ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کێل kel "بەردی قوت و بڵیند" و دواتر ↑کلک kılk.

**کلۆر kılor** - "هەڵۆڵ، ناوبەتاڵ": قولۆر qulor یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قالۆر qalor و ↑هەڵۆڵ helol و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە شتی ناوبەتاڵ دەکەن.

**کلۆز kıloz** - "ددانی پێشەوە نەماو": کۆلۆس kolos، کلۆس kılos، ↑*کەلفس* *kelfis* و کەلفیچ kelfîç ش دەگوترێ.

**کلۆس kılos** - "دەفری سواڵەتی هەراو، کووپە": هەروەها کلووسک kılûsk هەیە بە مانای "دەفری سەرئاوەڵەی چکۆڵە"، خزمە دەگەڵ ↑کەللە kelle.

**کلۆش kıloş** *[ kıloš ]* - "قرش، لاسکە دەغڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرش qırş.

کلۆشک **kıloşık** [ *kılošık* ] - "نیشانەی سەر ڕێگا": پێک هاتووە لە کەرتی کل kıl- و پاشگری (o)şık. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑کێل kel "بەردی قوت و بڵیند". کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە و تێکڕای وشەکە دەبێتە "کێلی بچووک" کە وەک نیشانە لەسەر ڕێگا دانراون.

کلۆف **kılof** - "بە چنگێ گوشین": دەچێتەوە سەر ↑گلۆفین gılofîn [هەڵگلۆفین].

کلۆڵ **kılol** [ *kılol* ] - "بەدبەخت، کۆڵەوار": ↑کولۆڵ kulol یش دەگوترێ.

کلۆم **kılom** - "قفڵ": خزمە دەگەڵ ↑کلیل kılîl.

کلوا **kılwa** [ *kılwa* ] - "سکڵ، پەنگر": هەروەها کله kıle هەیە بە مانای "1-تین و هاڵاو 2- گڕی ئاگر 3- سووتەمەنی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کڵ kıl "گڕ".

کلیتە **kılîte** [ *kīlta* ] - "قەلاندۆش، تیوان شان و مل": خزمە دەگەڵ ↑کۆڵ1 kol "شان و پشت، شان و مل".

کلیدە **kılîde** [ *kılīda* ] - "لە هەموو لاوە دەوردراو": خزمە دەگەڵ ↑کلیل kılîl "ئامرازی داخستن یان کردنەوەی قفڵ": کلید kelīd (P.). هاوریشەیە دەگەڵ Schlüßel (G.)، clavis (L.)، kleis (Gr.) "کلیل". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schließen (G.)، close (E.)، cludare (L.) "داخستن"، سەر بە ریشەی > *(IE.)* ***skleud-***. مەبەست لە وشە کوردمادییەکە دە بنەڕەتدا "(دەور و بەر) داخراو"ە. دە زمانی ئەڵمانیدا umschließen (G.) مانای "دەور گرتن، گەمارۆ دان" دەبەخشێ.

کلیر **kılîr** [ *kılīr* ] - "جێ کلیل لە دەرگادا": کلر kılır یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کلیل kılîl

کلیزی **kılzî** [ *kılzī* ] - "لیکاوی دەم":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑چرێش çırêş "جۆرێک چەسپ".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑گلاس gılas.

کلیسا **kılîsa** [ *kılīsā* ] - "مزگەوتی فەلەکان": کلێسە kılese ش دەگوترێ. کلیسا kelīsā (P.) > *(Gr.) kyrikon* "ماڵی خودا". ئەم وشە یۆنانییە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان، وەک Kirche (G.)، kiricha (OG.)، church (E.) "کلیسا".

کلێشە **kıleşê** [ *kıleša* ] - "بەدەنی بێ گیان، تەن، قالب": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەلاک kelak [کەلاش kelaş]

کلیل **kılîl** [ *kılīl* ] - "ئامرازی داخستن یان کردنەوەی قفڵ": کەلیلک kelîlk یش دەگوترێ. کلید kelīd (P.). هاوریشەیە دەگەڵ Schlüßel (G.)، clavis (L.)، kleis (Gr.) "کلیل". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schließen (G.)، close (E.)، cludare (L.) "داخستن"، سەر بە ریشەی > ***skleud-*** ***(IE.)*** "ئەو کوتەدارەی پشت دەرگا بۆ داخستنی، کلۆم". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کلۆم kılom [یان کلۆن kılon]، ↑کلر kılır "کونی کلید تێخستن"، ↑کلکلک kılkılık "شمشێرەی دەرگا" و قەڵا qela [کەلات kelat واتا شوێنی داخراو] و چەند وشەیەکی دیکە.

کلیلە **kılîle** [ *kılīla* ] - "رنوو": کلێلە kılele ش دەگوترێ.

1- وەک چۆن "رنوو" یان "رنی" دەچێتەوە سەر کرداری "رنین"، کلیلەش لەوانەیە پێوەندی بە کرداری ↑کڕاندن kırandın ەوە هەبێ.

2- لەوانەشە پێوەندی بە کرداری ↑گلان gılan "خلیسکان"ەوە هەبێ.

کلێلە **kılele** [ *kılela* ] - "رەق بوون و پێکەونووسانی دەم": دەچێتەوە سەر ↑کلیل kılîl و خزمیشە دەگەڵ ↑*کلیدە kılîde* "لە هەموو لاوە دەوردراو". مەبەست لە وشەکە ئەوەیە کە دەم داخراوە.

**کلێجە kılece** *[ kıleja ]* - "خوارترین ئێسکەکانی تیغەرەی پشت کە وەک کلکێکی چکۆڵە زەق و دەرپەڕیو دەنوێنن". کل + جە kıl + (e)ce. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑کلک kılık . کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری گچکاندن. تێکڕای وشەکە مانای "کلکی چکۆڵە" دەبەخشێ. [دە فارسیدا بەم بەشە دەگوترێ دنبالچە donbalče واتا "کلکی چکۆڵە"]. دە زمانی کوردمادیدا وشەکە بە شێوەی کلێژی kılejî، کلێنجە kılence ش دەگوترێ [تێخزانی فۆتیمی n] . هەروەها وشەی ↑قلێچکە qıleçke هەر بەم مانایە دێ و شێوەیەکی دیکە لە وشەکە نیشان دەدا. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها کلیچک klîçık و قلینچک qlînçık بە مانای "قامکەتووتە" بەکار دێن.

**کماخ kımax** *[ kımāx ]* - "کڵۆت، کلێنجە":

1- لەوانەیە دەئەسڵدا بە مانای"سمت، جومگەی سمت" بووبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑سمت sımt.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑کمێ kıme "دونبەلان، چمە"وە هەبێ.

**کمان kıman** *[ kımān ]* - "پەرژین": دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *kem-* > "بە تامان یان پەرژین دەور گرتن، رێکگوشین". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سمتە sımte.

**کمێ kıme** *[ kıme ]* - "دونبەلان، چمە": کمێ kıme و ↑چمە çıme دوو شێوەی دیکەن لە ↑دوو(ڤ) du(v) [دووما duma] "کلک".

**کن 1 kın** - "قەراخ، لا": لەکن واتا لەلا، لەپاڵ. خزمە دەگەڵ ↑کەنار kenar.

**کن 2 kın** - "کەم، کورت":

1- بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی دەچێتەوە سەر kanya- (OIra.) "گچکە". لەم فەرهەنگەدا ئاماژە بە ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە نەکراوە.

2- هەروەها دەشێ دەگەڵ ↑کنۆس kınos "دەستقووچاو" بەرهەڤ بکرێ.

3- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑قنب qınıb "گوشینگەی لە دار بۆ پلیخاندنەوەی ترێ"، knapp (G.)، knap(p) (Nl.) و hneppr (OIs.) "کەم، کورت، تەنگ" و hneppa (OIs.) "دە گیر خستن، زەخت کردن، گوشار خستنەسەر".

[تێبینی: وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی *(IE.) *gen-* بە مانای "رێکگوشران، وێکهاتن، تۆپەڵەبوون". لە مانایەوە دواتر مانای "کەم، چکۆڵە" سەری هەڵداوە، چونکوو شتەکان بەهۆی رێکگوشران و وێکهاتنەوە کەم و چکۆڵە دەبنەوە. وشەکانی "گنج" [گنج بوون]، "خونچە"، "قنج"، "خونجیلانە" و چەندین وشەی دیکە کە لەم ریشەوە هاتوون، چەمکی کەم و چکۆڵە بوون دەردەبڕن. سەبارەت بەم پێوەندییانە دەتوانین ئاماژە بە دەستەوشەیەکی دیکە بکەین، وەک "تەنگ"، "تەنک"، "تونا". لەم وشانەشدا چەمکی تەنگی و رێکگوشران دەگەڵ تەنک و تونا، واتا کەم بوونەوە، لە کەمی دان، لەناو چوون یەک دەگرێتەوە].

**کنا(چە) kına(çe)** *[ kınā(ča) ]* - "دۆت، کچ": ↑کەنیشک kenîşk ش دەگوترێ. هەروەها کن kın و کنە kıne هەیە بە مانای "وشەی بانگ کردنی ژن و کچ". خزمن دەگەڵ↑گەنج *genc* "لاو".

**کنار kınar** *[ kınār ]* - "ناوی دارێک": هەروەها ↑کناری kınarî "دڕکەزی" و ↑کتێرە kınere هەیە کە ناوی دارێک و ناوی گیایەکە. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑چنار çınar.

**کناری kınarî** *[ kınārī ]* - "دڕکەزی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کنار kınar "داری نەبکێ" و دەگەڵ ↑کتێرە kınere و ↑چنار çınar.

**کنج kınc** [ *kınj* ] - "جلوبەرگ": هنجک hıncık یش دەگوترێ. هەروەها ↑کنجڕ kıncır "پەڕۆکۆن"و ↑کونجک kuncık "باڵاپۆشی دەروێشان" هەیە کە پێوەندییان بە وشەکەوە هەیە. ئەم وشەیە دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑کەندر [کندر] kendır "دەزوو، پەت"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، تەنین".

**کنتەنە kıntene** [ *kıntana* ] - "لەش خوران، لەش خوراندن": دەشێ لە دوو کەرتی کن -kın + ↑تەن ten(e) "لەش" پێک هاتبێ. کەرتی کن -kın دەگەڵ ↑کەندن (hel)kendın یەک دەگرێتەوە کە دە ریشەدا بە مانای "کڕاندن، کۆڵین"ە.

**کنسا kınsa** [ *kınsā* ] - "لەش بە دیوار خوراندن": بڕوانە ↑کنتەنە kıntene. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کنۆس kınos.

**کنۆڕە kınore** [ *kınora* ] - "داری دووفلیقانەی دڕک خڕ کردنەوە": کنۆڕک kınork یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کنەک kınek "خێشکی کلۆش کێشان".

**کنۆس kınos** - "چکۆس، دەسقووچاو": کنۆژ kınoj، کونۆش kunoş و کەنسی kensî یش دەگوترێن. کنس kenes (P.). کن + ئۆس kın + os. کەرتی دووەم پاشگری جەخت کردنە، بڕوانە ↑ئۆز oz-. بنجی کن -kın دە وشەکەدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ (ge)nau (G.) "دەقیق، ورد، بەمشوور"، nauw (Nl.) "کەم، تەنگ، بەمشوور". وشە ئەڵمانییەکە دە سەردەمانی کۆندا بە مانای "چکۆس، کنۆس" بووە، بۆ وێنە hneaw (OE.)، hnoggr (OIs.) "کنۆس"، hniuwan (OG.)، niuwan (MG.) "ساوین، هاڕین، پریواندن، کوتانەوە"، knyein (Gr.) "کڕاندن، ڕنین، سوونەوە". بەم جۆرە مەبەست لە کنۆس دەبێ دە بنچینەدا ئەو کەسە بێ کە بە " کڕاندن" لە ماڵ و دارایی خۆی خەرج دەکا. دە کوردەواریدا بە مرۆڤی دەسقووچاو دەڵێن "دادەی خۆت هەڵکڕێنە" ! لەوانەیە وشەی ↑چنۆک çınokç یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. هەروەها شێوە و ماناکانی وشە یۆنانییەکە ئەم بۆچوونەمان لا دروست دەکا کە وشەی ↑کەندن kendın [قەندن qendın، هەڵکەندن، داکەندن] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو هەڵکەندنی زەوی لە راستیدا ڕنین و کڕاندنی زەوییە و هەروەها جلک "داکەندن"یش دەشێ هەمان جل *داڕنین* بێ لە لەش. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە ئەم بۆچوونەی سەرەوە پشتراست دەکەن وەک ↑کنەک kınek "خێشکی کلۆش کێشان"، ↑کنتەنە kıntene "لەش خوران، لەش خوراندن"، ↑کونۆشە kunoşe "گەسک" و هتد.

**کنۆشە kınoşe** [ *kınoša* ] - "گەسک":

1- بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 323: < *kenaš* (*Arc.*) "گەسک دان".

2- لەلایەکی دیکەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کنەک kınek و ↑کنۆڕە kınore. لەوە دەچێ وشە ئارامییەکە پێوەندی بە وشە هیندوئەورووپییەکانەوە هەبی و ڕەنگە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**کنە kıne** [ *kına* ] - کنە کردن واتا "1- دانەوەی زەوی 2- توێژینەوە". خزمە دەگەڵ ↑کنۆس kınos "چکۆس، دەسقووچاو".

**کنەک kınek** [ *kınak* ] - "خێشکی کلۆش کێشان": خزمە دەگەڵ ↑کنۆس kınos "دەسقووچاو".

**کنێرە kınere** [ *kınera* ] - "1- ناوی دارێک 2- ناوی گیایەک": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑کنار kınar.

**کوا kuwa** [ *kuwā* ] - "لە کوێ": خزمە دەگەڵ ↑کوێ kuwe، ↑کووku و ↑کێ *ke* و هتد.

کوار **kuwar** [ *kuwār* ] - "دەفری گەورەی گڵینی دەخڵ و دان (کەندوو) 2- خەڵیفەمێش (کەندوو)": کەوار kewar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn و *قووڵ qul* [کوور kur]، ↑گابار gabar و دواجار ↑کون *kun*. دە بنەڕەتدا مەبەستدا قووڵکە، شوێنی کۆڵدراو و قووڵکراوە. وشەی "کەندوو"ش دەربڕی هەر ئەم چەمکەیە و لە کرداری "کەندن" [هەڵکەندن]ەوە هاتووە. هەروەها وشەی "خەڵیف" [خەڵیفەمێش] دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، کۆڵین، کەندن".

کواکوو **kuwaku** [ *kuwākū* ] - "فرە زۆر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قۆپەن qopen "بێشە". لەوانەیە وشەکە پێشتر "کەپاکەپ" یان "کۆپاکۆپ" بووبێ و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کۆپابەخت kopabext "ئەوپەڕی بەختەوەری".

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "بێشە" و "زۆر" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *بیش* "زۆر" و *بیشە* "بێشە" دە زمانی فارسیدا یان "بێشە" و "بۆش" دە زمانی کوردمادیدا].

کوان **kuwan** [ *kuwān* ] - "دومەڵ، قوتیر": خزمە دەگەڵ ↑گوان guwan "مەمکی ئاژەڵ".

کواندن **kuwandın** [ *kuwāndın* ] - "داخ کردن":

1- لەوانەیە شێوەی تازەتری ↑قوماندن qumandın "داخ کردن" بێ.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کاوانەوە kawan(ewe) "سووتانەوە" (ی پێست).

کوانوو **kuwanu** [ *kuwānū* ] - "ئاگردان": پێوەندی هەیە بە caminus (.L) و kaminos (.Gr) "ئاگردان". ئەم وشە یۆنانییە کەوتووەتە ناو زمانە ئەوروپییەکانیشەوە، بۆ وێنە Kamin (.G)، chimney (.E). وشەکە دە زمانی فارسیدا وەک شومینە šūmīne (.P) بەکار دێ. (ریشە ؟) لەوانەیە ریشەی وشەکە پێوەندی بە چەمکی بەردەوە هەبێ، هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ↑کەڤر kevır [کۆنتر: کەمر kemır].

کوبار **kubar** [ *kubār* ] - "مرۆڤی بەڕێز و بە حورمەت": خزمە دەگەڵ ↑گەورە gewre "مەزن".

کوجیلە **kucîle** [ *kujīla* ] - "دەرماتیکە جانەوەری پێ دەرمانداو دەکرێ": خزمە دەگەڵ ↑کوشتن kuştın.

کوپین **kupîn** [ *kupīn* ] - "ئارام گرتن، هەدا دان": هەروەها ↑گڤین gıvîn یان ↑*گوڤین guvîn* هەیە بە مانای "مەیین، پەیت بوون" خزمە دەگەڵ ↑کپ kıp [کڕ و کپ].

کوت¹ **kut** - "پاژ، لەت، بڕ": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- cut (.E) [پێشتر: cutte ،kette ،kitte]، cyttan (.OE) "بڕین"، kutte (.Noew)، kuta (.Is) "بڕین بە چەقۆیەکی بچووک". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشەیە باس نەکراوە.

2- ↑کووز kuz.

کوت² **kut** - ["کوت کوت" بۆ بانگ کردنی تووڵە سەگ]: هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

[تێبینی: شیاوی بیر خستنەوەیە هێندێک لەو وشانەی بۆ بانگ کردن یان دوور کردنەوەی ئاژەڵەکان بەکار دێن، دە بنچینەدا هەر دەچنەوە سەر ناوی ئاژەڵەکان و لە راستیدا ئەم ناوانە بۆ بانگ کردن یان دەر پەڕاندنی ئاژەڵەکان قاو کراون! وەکوو "ختتە" یان "وەححا" و هتد].

کوت3 **kut** - "زەبر، زەربە": بۆ وێنە "کوت (پێوە)دان" واتا "ژەنین". هەروەها کوتە kute هەیە بە مانای "لێدانی دڵ یان رەگ". "کوت" هەروەها دەگەڵ "پڕ" یان "مت" دێ بە مانای "لەپڕ". کوتوپڕ kut û pır یان کوتومت kut û mıt. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ↑کوتان kutan "لێدان".

[تێبینی: "کوتوپڕ" یان "کوتومت" لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ **یکضرب** yekzerb (.P) دە فارسیدا یان schlagartig (.G) "لەپڕ، یەکجێ". هەم zerb (.P) و هەم Schlag (.G) مانای "لێدان" دەبەخشن].

**کوتان kutan** [ *kutān* ] - "لێدان": کوبیدن kūbīdan (.P) [کۆنتر: کوفتن kūftan (.P)] > **kup-* (.*OIra*). دەشێ خزم بێ دەگەڵ kóptein (.Gr) "لێدان، کوتان". ئەم وشە یۆنانییە بە خزم دادەنرێ دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییانەی کە لەژێر وشەی ↑ساوین sawîn دا باس کراون.

**کوتر kutır** - شەل و کوتر şel û kutır و هەروەها کوێر و کوتر kuwêr û kutır دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەوتن kewtın. وشەکە ئاماژە بە بێ توانایی لە رۆیشتندا دەکا. "کوتر" دەشێ کۆنتر *کەفتر keftır** بووبێ. هەروەها بڕوانە ↑کفت2 kıft 2 "شەکەت".

**کوتک1 kutık 1** - "چەکوشی گەورە": ↑کوتان kutan.

**کوتک2 kutık 2** - "توتکەسەگ": بڕوانە ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

**کوتلوک kutluk** - "چلۆک، ترۆپکی دار": دەچێتەوە سەر ↑ قوت qut [قوتکە، قیتکە].

**کوتلە kutle** [ *kutla* ] - "دەستەی هاوپەیمان، فراکسیۆن": ئەم وشەیە دە زمانی عەرەبیدا بە مانای فراکسیونی پارلمانی بەکار دێ و دەگوترێ كتلة kutla (.Arb). و دە زمانی کوردمادیشدا بەکار دێ. وشەکە بەڕواڵەت لە وشەیەکی عەرەبی دەچێ، بەڵام دەبێ دە ئەسڵدا کوردمادی بێ و چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە. پێوەندی هەیە بە یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- کوت + لە [پاشگر] kut + le. وشەی "فراکسیون" دە زمانە ئەورووپییەکاندا دە ئەسڵدا بە مانای "لەت و کوت"ە و دەچێتەوە سەر وشەیەکی لاتینی بە مانای "شکان". پاشگری "لە" پاشگرێکی چالاکی زمانی کوردمادییە و دە زۆر وشەدا دەبینرێ، وەک گلۆڵە، بابۆڵە، رەوەڵە، تەتەڵە و هتد.

2- لەوانەشە لە ↑گوتلە gutle "تۆڵا، شتی وردی پێکەوەنووساو" وەرگیرابێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژە بە کۆبەندی و دەستە بوونی کەساتێک دەکا.

**کوتوپڕ kutupır** - "لەپڕ": کوت kut [↑کوتان kutan] + ↑پڕ pır "پەلە، خێرا". چەمکی کوتوپڕ زۆر نیزیکە لە **یکضرب** yekzerb ی فارسی و schlagartig ی ئەلمانی کە ئاماژە بە رووداوی کوتوپڕ و لە نەکاو دەکەن. لە وشە فارسی و ئەڵمانییەکەدا بنجی وشەکان مانای "لیدان" دەبەخشن، هەروەک چۆن دە وشە کوردمادییەکەدا بنجی وشەکە لە "کوتان"ەوە هاتووە.

**کوتەک kutek** [ *kutak* ] - "لێدان، دارکاری": ↑کوتان kutan.

**کوتەکوتە kutekut** [ *kutakut* ] - "وڕەوەڕ، کاستەکاست": خزمە دەگەڵ ↑گۆتن gotın [یان کوتن kutın]

**کوچقولێپ kuçqulep** [ *kučqulep* ] - "لێقەوماو، بەدبەخت": هەروەها کوچکرەش kuçıkreş هەیە بە مانای "شووم، بێفەڕ" [بەخترەش]. "کوچ" یان "کوچک" شێوەیکی دیکەیە لە کۆس kos یان کۆست kost "بەخت، تاڵع". "قولێپ" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قلپ qılp. قلپ بوونەوە واتا وەرگەڕان، ئاوەژوو بوون. بەم جۆرە مانای "کوچ قەلێپ" دەبێتە "بەخت وەرگەڕاو" یان هەمان "کۆست کەوتوو". کەرتی یەکەمی وشەکە دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑کۆچ koç. لەم بارەوە بڕوانە تێبینی خوارەوە:

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Schiksal بە مانای "چارەنووس، قەدەر" بەکار دێ. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە geschehen "روودان، قەومان". مانای بنەڕەتی ئەم وشەی دوایی "چوون، رۆیشتن"ە و خزمیشە دەگەڵ وشەی "چوون". مەبەست لە چارەنووس دە بنەڕەتدا رەوتی

ڕووداوەکان بووە. گەر سەیری وشەی "قەومان" بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە مانای "هاتن" دەبەخشێ. چەمکەکانی "چارەنووس، قەدەر، قەومان، بەخت" پێوەندییان هەیە بە چەمکی هاتن و چوونەوە. ئەم پێوەندییە دە وشەکانی *هات* "بەخت" و "بەسەرهات" یان "سەربوردە"شدا بەدی دەکەین. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەتوانین شیمانەی ئەوە بکەین کە "کوچ" یان "کۆس(ت)" خزم بن دەگەڵ کۆچ "چوون، ڕۆیشتن"].

**کوچ(ک) kuç(ık)** *[ kuč(ık) ]* - "بەرد، خڕکەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑خیز xîz "ورکەبەرد".

[تێبینی: وەک دەبینین ئەم وشەیە هەم مانای "خڕکەبەرد" و هەمیش بە گشتی مانای "بەرد" دەدا. ئەم دوو مانایە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و لە مانایەکەوە دەتوانێ ماناکەی دیکە دروست ببێ. لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی *زیخ* "ورکەبەرد" هەڵی سەنگێنین کە خزمە دەگەڵ *زاخ* "بەرد"].

**کود kud** - "کوژرانی لە خۆڕا و بێ خوێنبایی": خزمە دەگەڵ ↑کوشتن kuştın و ڕەنگە دواجاریش دەگەڵ ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

**کودان kudan** *[ kudān ]* - "1- پێک هاتن، جێ بەجێ بوون 2- خایاندن، وەخت بردن": خزمە دەگەڵ ↑قەتان qetan "گوزەران، مەشین، بەڕێوە چوون".

**کودک kudık** *[ kudık ]* - "بێچووی لاور": کودی kudî و کودەڵە kudele ( kude + le ) ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ کودک kūdak (P.) "زاروک"، kid (E.) "زارۆک، بێچوو"، Kitz (G.) "کار، کاریلە، بێچوو"، kid (Sw.) "کاریلە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی *kidja-* (*Grm.*) "بێچوو". ئەمە ریشە ژێرمەنییە بە گوێرەی بۆچوونێک لە دەنگێک وەرگیراوە کە بۆ بانگ کردن و لاواندنەوەی بێچووی ئاژەڵ بەکار هێنراوە. دەنگەوشەیەکی لەم چەشنە دە زمانی ئەمرۆی کوردمادیدا بە دی دەکرێ کە هەمان ↑گدی gıdî یە (گدی گدی بۆ بانگ کردنی بەرخ و کاریلە)، یان ↑کوت kut [کوت کوت بۆ بانگ کردنی تووڵە سەگ]. هەروەها ↑کودیلە kudîle "ساوای خوێن شیرن" و ↑کووتێک kutek "بەرووڵەی تازە" و ↑کوتک2 kutık "توتکەسەگ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. لەوانەیە ئەم وشانە دە پلەیەکی دوورتردا خزمایەتیان دەگەڵ وشەی ↑کچ kıç [کیژ kîj] دە زمانی کوردمادیدا هەبێ.

**کودیلە kudîle** *[ kudīla ]* - "1- ساوای سەگ و بەراز 2- زارۆکی ساوای جوانکیلە": بڕوانە ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

**کوڕ1 kur** - "زارۆکی نێر": < **kura-* (*OIra.*). دە زمانی ئەڵمانیدا Gör هەیە بە مانای "کچ" و کۆی وشەکە، واتا Gören بە مانای "منداڵانی بچووک"- بەکچ و کوڕەوە- بەکاردێ. ئەم وشەیە دەبردرێتەوە سەر gorag (OG.) و gorec (MG.) بە مانای "چکۆڵە، بێدەسەڵات" و وا لێک داوەتەوە سەرەتا بۆ گیانلەبەری بێ دەسەڵات بە کار هاتبێ. هەروها وا بیر دەکرێتەوە کە پێوەندی بە girl (E.) "کچ" ەوە هەبێ. ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا ↑کار2 kar بۆ بێچووی هێندێک ئاژەڵ بە کار دێ، وەک ↑کاریلە karîle "بێچووی بزن". هەروەها ↑کریس(ە) kırîs(e) وەک وشەی بانگ کردنی ئاژەڵ بەکار دێ. شیاوی باسە کە دە زۆربەی ئەو ناوانە کە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بۆ منال و بێچوو بەکار دێن، وشەکان دە ریشەدا مانای "کەم، گچکە"یان هەبووە. دە زمانی فارسیدا کرە korre (P.) بە جاشک و جانوو، واتا بێچووی کەر و ئەسپ و دەگوترێ. [زمانی کوردمادیش وشەی فارسی کودک kudek "منداڵ" بۆ بێچووی ئاژەڵ بەکار دێنی، وەک کوودەڵە kudele بەمانای "بێچووەبەراز"].

**کوڕ2 kur 2** - "هەڵپاچراو": کوڕکری واتا هەڵپاچراو. خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑کێرد kerd، ↑کەڕاندن kerandın "کرتاندن"، ↑کەرت kert، ↑کورت kurt و هتد.

**کوڕ3 kur 3** - "بڵندایی سەر کێو": دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا ئەم وشەیە وەسا مانا کراوەتەوە کە دەبێ مەبەست دوندی کێو بێ. هەروەها ↑کۆڕ2 kor 2 بە مانای "چیای بڵیند" هاتووە. چەند وشەی دیکەش لەم پێوەندییەدا جێی سەرنجن: ↑کوڕ(ڕ)ە kur(r)e "قوت" [کوڕڕەگوێ kurreguwe واتا گوێ قووت و سڵ]، ↑کوڕکە kurke "بەلووکە، میتکە"، ↑کوری kurî "کلك". چەمکی هاوبەش لەم وشانەدا "قوت بوون، دەرپەڕین"ە. ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ریشەی ***gher-* < (IE.)** "زەق و دەرپەڕیو بوون". وشەی ↑قەراخ qerax لەم ریشەوە هاتووە. هەروەها لەوانەیە خار xār (P.) "درك" و ↑کارگ karg [کوارگ kuwarg، قارچك qarçık] لەم ریشەوە هاتبن. دە زمانی کوردمادیدا باوە دەڵێن کارگ *هەڵدەتۆقێ*. ئەم وشەیە ئاماژە بە قوت بوون و دەرپەڕین دەکا.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا جگە لە وشەی "درك" دوو وشەیەکی دیکەش بەم مانایە هەن کە بریتین لە "زی" و هەروەها "زیخ". ئەم وشانەش دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "زەق بوون، دەرپەڕین" و خزمن دەگەڵ "زەق"].

**کوڕادە kurade** [ *kurāda* ] - "کەوەری کێوی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kraut (G.)، Krut (OG.)، kruid (Nl.) "گژ وگیا"، سەر بە ریشەی ***kruda-* < (IE.)** "گژ و گیا"، ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری ***guruto-* < (IE.)** "عارەقی گژ و گیا". بەم جۆرە پێ دەچی وشەکە دواجار خزم بێ دەگەڵ ↑هەڵقوڕاندن (hel)qurandın. جێی ئاماژە پێ کردنە کە دە زمانی عەرەبیدا kurrāθ (Arb.) بە مانای "کەوەر" بەکار دێ.

**کوڕان kuran** [ *kurān* ] - "جۆڕنە، حەوزۆکەی بەرشێرە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کوڕن kurn و ↑جۆڕنە corne و پێوەندی هەیە بە ↑کووڕ kur "قووڵ" و دواتر دەگەڵ ↑کون *kun*.

**کورت kurt** - "قوڵە، دژی درێژ": kurz (G.)، kurt (OF.)، short (E.). وشە ئەورووپییەکان دەبردرێنەوە سەر curtus (L.) "کورت، کورتکراو"، سەر بە ریشەی ***(s)ker-* < (IE.)** "بڕین". وشەکە دە بنچینەدا بە مانای شتێك کە بڕدراوەتەوە و کورت کراوەتەوە، بەکار هاتووە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑قرتاندن qırtandın [کرتاندن kırtandın]، ↑کەرت kert "لەت، بەش" و ↑کێرد kerd و دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑شڕ şır و ↑شیر şîr [شوور şûr] "شمشێر" و هتد.

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا وشەی کوتاه kūtāh (P.) بە مانای "کورت" بە کار دێ. ئەم وشە فارسییە یان خزمە دەگەڵ "کورت" و فۆتیمی r تێیدا سواوەتەوە، یان دەنا خزمە دەگەڵ دەستە وشەیەکی دیکە کە ئەویش ئاماژە بە چەمکی "بڕین" دەکا و گەڵێك وشە دەگرێتە خۆی، وەك کوت kut، کەت ket، قەتاندن qetandın و کۆتایی kotayî و هیتر].

**کورتان kurtan** [ *kurtān* ] - "پاڵان، جلی کەر و ئێستر": خزمە دەگەڵ Gürtel (G.)، gurtila (OG.)، gordel (Nl.)، girdle (E.) grdel (Sw.) "کەمەربەند، پشتێند". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "کەمەر لێ بەستن". کردارەکە دە زمانە ژێرمەنییە کۆنەکاندا بۆ وێنە بەم جۆرە بووە: gurtan (OG.)، (bi)gairdan (Gt.) سەر بە ریشەی ***gher-* < (IE.)** "دەورگرتن، دە بنچینەدا تێکخستن و هونینەوە [ی پەرژین و لەمپەر و هتد]". وشەی Garten (G.) "باخچە" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێنەوە، لەبەر ئەوەی باخچە دەوری بە پەرژین گیراوە. [لەوە دەچێ "کورتان" دە زمانی

کۆنی کوردمادیدا وەک کردار بەکار هاتبێ و دواتر بوو‌بێتە ناو. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "قارەمان"]. دە زمانی کوردمادیدا ↑کورتەک kurtek یش هەیە بە مانای "کەوای پیاوانەی درێژ" و هەروەها ↑کۆرت kort " کەرتی سەوزیکاری" کە دەبێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ. کۆرت kort یان ↑کەرد kerd [کەردوو kerdu] دەگەڵ Garten ‌(.G) و garden ‌(.E) "باخچە" یەک دەگرێتەوە.

**کورتە(ک) kurt(ek)** *[ kurta(k) ]* - "کەوای پیاوانە تا نیزیک ئەژنۆ": خزمە دەگەڵ ↑کورتان kurtan.

**کورتەک kurtek** *[ kurta(k) ]* - "ناوی چیایەکی سەخت لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd و دواجار ↑خار xar "سەخت".

**کورد kurd** *[ kurd ]* - "ناوی نەتەوەی کورد": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانی کوردمادیدا کە دە بنەڕەتدا مانای "سەخت، پتەو، بەهێز" دەدەن، وەک ↑گورج gurc [گورج و گوڵ]، ↑خورت xurt "زۆر، هێز"، ↑خوڕ xur "تەوژم"، ↑گورز gurz "گوپاڵ"، ↑گورد gurd "زەبر، پاڵەوان" [گرد gord ‌(.P)]، ↑گرژ gırj "توند، سفت"، ↑قورس qurs "سەنگین، پتەو، قایم"، ↑خرتە2 xırte "زەوی ڕەقەن و نەکێڵ"، ↑خرتی xırtî "تەژەی مل ئەستوور"، کەڕا kera "بەرد"، ↑کەڕاکی kerakî "ساخ، پتەو"، ↑کرەک kırek "بێجووڵە، جماد" [بەپێچەوانەی زیندەوەر]، کارۆک karok "پۆڵا"، ↑گارێ gare "ناوی چیایەک لە کوردستان"، کر² kır "هەورازی رژد"، کرتەک krtek "بەفری تەڕی سەهۆڵ بەستوو"، کرەک kırek "نەجووڵ، جماد"، قەرت qert "1- زبر، زوور 2- پەیت، قایم"، [قەرتەمێر qertemer ]، کرێت2 kıret "سندە گڵ، گرسە"، کۆرە kore "*بەردی* شینی ناسک کە بە دەست دەشکێ"، کۆروە korwe "جۆرە بەردێکی سپی"، ↑کورە kurıh "چەقالە(بادام)"، کەرژاڵ kerjal "کاری زۆر گران"، کەرسل kersıl "تەرسەقول، قەرسەقول"، ↑کەرسەک kersek "سندەگڵ، کلۆخاک" [پێکەوەنووساوی توند بوو]، ↑کارین karîn "توانین" [دە بنەڕەتدا: هێز و دەسەڵات بەسەردا هەبوون] و هەروەها ژمارەیەک وشەی دیکە کە خوارتر لەژێر وشەی ↑*کورسین kursîn* "ڕەگ دا کوتان و قایم بوون" دا شی کراونەوە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ دەگەڵ xruždā ‌(.Av)، xružd ‌(.Pl) "بەهێز، پتەو"، kratos ‌(.Gr) "هێز، دەسەڵات"، kratys ‌(.Gr) "بەهێز، بە دەسەڵات" و kratein ‌(.Gr) "زاڵ بوون، دەسەڵاتدار بوون"، hart ‌(.G) و hard ‌(.E) "سەخت، پتەو"، karara ‌(.OIn)، kararoi ‌(.Gr) "ڕەق، سەخت" و دواجار خزم دەگەڵ ↑*خار xar* "سەخت"، سەر بە ڕیشەی **< -ker*/ -kar* (.IE)** "خار، سەخت، پتەوە و بەهێز بوون". ئەم کەرتەوشەی دووەم لە وشەی Demokratie دا پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و بە مانای "دەسەڵاتی گەل"ە.

[تێبینی: پێوەندی وشەی "کورد" بەم وشانەوە بەرادەیەک روون و ئاشکرایە کە جێگەی نکۆڵی کردن نییە. بەداخەوە شۆڤێنیستەکان ئەوەندە بەرچاوتەنگ و قین لەزگن کە ناتوانن یان ناخوازن هیچ ڕاستییەک سەبارەت بە دۆزی کورد، تەنانەت سەبارەت بە ناوەکەشی بپەژرێنن. جارێکیان شۆڤێنیستێکی تورک وشەی "کورد"ی وەها شیرۆڤە کردبوو کە ئەم خەڵکە شاخاوییە بەناو بەفردا ڕۆیشتوون و بەفری بن پێیان "کرتەکرت"ی کردووە و ناوەکەشیان بۆ ئەم "کرتەکرتە" دەگەڕێتەوە. وەک دەبینین مێشکی مرۆڤی شۆڤینیست هیچ لۆژیکێک جگە لە ئەتک و سووکایەتی کردن و نزماندنی لایەنی بەرانبەری ناناسێ. بەڵام ئەم جۆرە کەسانە بەو ئاکار و هەڵوێستانەیان لەراستیدا تەنیا خۆیان سووک دەکەن. بەراستی سەیرە کە چۆن کەسێک بە ناوی نووسەر و تۆژەر ئامادەیە لەپێناو پاراستنی دەسەڵاتیکی ناڕەوا و داگیرکەرانەدا قسەی

ئەوەندە بێ مانا بکا و خۆی بکاتە قەشمەر و گاڵتەجاڕی مێژوو. ئێمە لەم بەناو تۆژەرە پرسیار دەکەین کە ئەگەر "کورد" لە "کرتەکرت"ەوە هاتووە، ئەی ناوی گەلێک مەڵبەند و هۆزی کورد وەک موکری، مزووری، موسڵ، مەنگوڕ [مە(ن)گوڕ]، شکاک، شوقاق، زوکری، سەکر، زاخۆ، زازا، کێکا، زەهاو، سەگوەن، زەند، زەنگەنە، تیروەیی، گەورک، گۆران، گورجی، سۆران، بۆتان، باتمان، بیتوێن، قارس، قەرەج، ئاکرێ، هەکاری، قوڕوە، ئەردەڵان، سەقز، فەیلی، پاڵۆ، گردا و گەردی و هەروەها ناوی گەلێک چیای کوردستان وەک سیپان، سەفین، ساسۆن، ئاسۆس، گارێ، کورەک، زاپ، شاهۆ، کۆدۆ، پیرەمەگروون، حەمرین و چەندین ناوی دیکە لە چییەوە هاتوون؟ بۆ ئاگاداری ئەم پیاوە قەشمەرە دەبێ بڵێین سەرلەبەری ئەم ناوانە دە بنەڕەتدا مانای "پتەو، بەهێز" دەبەخشن و ژمارەیەکیش دەگەڵ وشەی "کورد" هاوریشەن. من بەتەواوی لەو باوەڕە دام و گومانم نییە کە وشەی "کورد" دواتر بووەتە ناوی ئەم گەلە کە لەپێشدا بە "ماد" ناوبانگیان هەبووە. مادەکان گەلێکی ئازا و بوێر بوون و لەبەر ئەوە وەک "کورد"، واتا ئازا و بەهێز و بە دەسەڵات ناوبانگیان دەر کردووە. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە وشەی ↑کرمانج kırmanc.

**کوڕ(ڕ)ە kur(r)e 1** *[ kurra ]* - "قوت" [کوڕڕەگوێ kurreguwe واتا گوێ قووت و سڵ]. بڕوانە ↑کوڕ³ "بڵێندایی سەر کێو".

**کوڕ(ڕ)ە kur(r)e 2** *[ kurra ]* - "سوور، پێداگر": پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە لەژێر ↑کورسین kursîn "قایم بوون، سەخت بوون"دا باس کراون.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی مکوڕ "پێداگر، بەبڕیار، شێلگیر" کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هێز، توانایی"].

**کورژان kurjan** *[ kuržān ]* - "قرمچین، چرچ بوون": کورسان kursan یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قرچان qırçan [هەڵقرچان].

**کورسی kursî** *[ kursī ]* - "چوارپایە، سەندەلی":خزمە دەگەڵ ↑کورسین kursîn "قایم بوون، سەقامگیر بوون". وشەکە وشەیەکی بەرەچەڵەک کوردمادییە و چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە: کرسی kursī (.Arb). "کرسی" ئاماژەیە یان بە ↑قورس qurs و قایم وەستان دەکا، چونکوو کورسی چوارپایەی هەیە، یان ئاماژەیە بەوە کە مرۆڤ لەسەری *دەگیرسێتەوە*، واتا جێگیر دەبێ. وشەی ↑گیرسانەوە gîrsanewe ش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. بەڵگەیەکی دیکە بۆ ئەوەی وشەکە کوردمادییە، بریتییە لە پاشگری کە یەکێک لە پاشگرەکانی وشەسازی ئەم زمانەیە و دە دەیان وشەدا بەرچاو دەکەوێ، وەک کاشی، ماسی، سەوزی، تاجی، گاری، قاڵی و هتد.

**کورسین kursîn** *[ kursīn ]* - "رەگ داکوتان و قایم بوون (ی چنار)": خزمە دەگەڵ ↑قورس qurs "قایم، نەجووڵ". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑گیرسان(ەوە) gîrsan(ewe) "جێگیر بوون، راوەستان یاخود مانەوە لە شوێنێک، لە جووڵە وەستان"، ↑قەرسان qersan "1- سڕبوون 2- مەیین، توند بوونی تراو"، ↑*گرسە gırse* "پێکەوەنووساوی رەقبوو"، ↑گرێژنە gırejne "چوارچێوە" و هتد. ئەم وشانە دواجار پێوەندی پەیدا دەکەن بە ↑کڕ kır [سڕ sır] و ↑*خار xar* "سەخت، رەق". دە زمانی فارسیدا غرس ġars (.P) کردن بە مانای "چەقاندن"ی نەمام بەکار و ئەمەش دەگەڵ مانای کورسین، وەک لە سەرەوە دەیبینین، بەتەواوی یەک دەگرێتەوە.

[تێبینی: دیسان لێرەدا دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو پێوەندییانەی سەرەوە وا نیشان دەدەن کە وشەی ↑کورسی kursî کە بە وشەیەکی عەرەبی دەزانرێ، پێوەندی بەم وشانەی

سەرەوە هەیە و بە واتایەکی دیکە لە زمانی کوردمادی وەرگیراوە. ئەگەر سەرنجی وشەی "سەندەڵی" و هەروەها Stuhl "سەندەڵی، کورسی" دە زمانی ئەڵمانیدا بدەین، دەبینین کەئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "وەستان، راوەستان". دیارە لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە مرۆڤ لەسەر سەندەڵی رادەوەستێ، بەڵکوو مەبەست خودی سەندەڵییەکەیە کە لە سەر چوارپایە راوەستاوە، جێگر و نەجووڵە و مرۆڤ دەتوانی بە بێ ترسی لە کەوتن لە سەری دابنیشێ و جێگیر بێ. هەر بەم جۆرە وشەی ↑کورسی kursî پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە کە ئاماژە بە سەقامگیری، نەجووڵی و قایم بوون دەکەن. لەم تێروانینەوە مانای کورسی یان دەبێتە "قورس و قایم، راوەستاو، جێگیر، نەجووڵ (لە شوێنی خویدا)"، یان شوێنی گیرسانەوە و جێگیر بوونی مرۆڤ. دیسان سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی قورس و *قایم* بوون لە لایەك و "راوەستان" لە لایەکی دیکەوە سەرنجی وشەی عەرەبی *قائم qaim* بدە کە خۆی بە مانای "وەستاو، راوەستاو"ە و دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "جێگیر، نەجووڵ، سەخت" بە کار دەهێندرێ].

**کورش(ە) kurş(e)** [ *kurš(a)* ] - "بەفری بەستوو، بەستەڵەك": خزمە دەگەڵ kryos (Gr.) "بەستەڵەك"، krystallos (Gr.) "سەهۆڵ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***kreu-*** < **(IE.)** "مەیین، رەق بوون". ئەم ریشەیە خۆی دەشێ شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی ***ker-*** < **(IE.) *kar-,** "خار، سەخت". دە زمانی کوردمادیدا گەلێك وشە لەم ریشەوە دێن، وەك

↑کڕ kır، ↑کورسین kursîn "قایم بوون، سەخت بوون"، ↑قەرسین qersîn "1- تەزین، سڕ بوون 2- مەیین، توند بوونی تراو". هەروەها کورش هەڵاتن kurş helatın هەیە بە مانای "کز و کروشمە کردن". لێرەشدا وشەکە ئاماژە بە کڕ بوون، بێجووڵە بوون [سەخت بوون] دەکا.

[تێبینی 1: بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی (ل. 339) وشەکە دەچێتەوە سەر *geraš* (*Arc.*) "بەستن، رەق بوون". وەك دەبینین وشەکە پێوەندی هەیە بە گەلێك وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا و ناشێ وشەیەکی وەرگیراو بێ. تێبینی 2: سەبارەت بە مانای "بەستەڵەك" دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ دوو وشەی"سەخت" و "شەختە". وشەی شەختە بە مانای بەستەڵەك دەچێتەوە سەر "سەخت" و مەبەست بەستن یاخود رەق بوونی هەرد و ئاوە. تێبینی 3- ناوی "کۆرش"ی هەخامەنیشی لەوانەیە پێوەندی بەم ناوانەوە هەبێ و لە لایەن دایکییەوە کە کورد بووە، پێی درابێ].

**کورك1 kurk** - "خوری و مووی نەرم": ↑کولکە kulke ش دەگوترێ. کرك kork (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خوری xurî.

**کورك2 kurk** - "مەلی سەر هێلکە هەڵنیشتوو": کرچ korç (P.). خزمە دەگەڵ ↑کڕ kır [کڕ و کپ].

[تێبینی: وەك دەبینرێ کرچ korç دە زمانی فارسیدا بە مانای "کورك" دێ، بەڵام دە زمانی کوردیدا ↑کرچ kırç دەگەڵ وشەی "کاڵ" دێ و دەگوترێ "کرچ و کاڵ". لێرەشدا وشەکە ئاماژە بە "رەق بوون، سفت بوون" دەکا، چونکوو شتی کاڵ و نەگەیشتوو هێشتا رەقە و بۆ خواردن ناشێ. ئەم وشەیە دە ریشەدا خزمە دەگەڵ کرچ korç ی فارسی. لە وشە فارسییەکەشدا مانای "رەق بوون" خۆی حەشار داوە کە بریتییە لە "بێجووڵە بوون، لەجێی خۆ رەق بوون"].

**کورکاندن kurkandın** [ *kurkāndın* ] - "1- قدقد کردن 2- پرتە و بۆڵە کردن": بە مانای دووەم کورکیان kurkîyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کرووزانەوە kırûzan(ewe) [کوروزانەوە kuruzanewe] "پرتە و بۆڵە کردن، بە پرتە و گریانەوە پاڕانەوە".

کورکورە **kurkure** *[ kurkura ]* - "باڵدارێکی راوکەر": چەند وشەیەکی دیکەش دەبێ پێوەندییان بەم وشەوە هەبێ، وەک ↑کۆران koran "دەنگی با لە کاتی تێپەڕ بوونی بە ڕێرەوێکدا"، ↑کۆڕاندن korandn "حیلاندنی ئەسپ"، ↑قورینگ qurîng "ناوی باڵدارێک"، ↑کۆرۆخ korox "مێشەکەرانە"، ↑کۆڕاندن korandn "حیلاندنی ئەسپ" و هتد. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە دەنگ و هەرای توند دەکەن و وێ دەچێ خزم بن دەگەڵ ↑کڤر kıvır "پشیلەی نێر" و دەگەڵ hwelan (OE.) "مڕاندن، گوڕاندن" و hvellr (OIs.) "قیژاندن". ناوێکی دیکەی کورکورە ↑کۆلارە kolare یە. بەراوردی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ وشەی ئیسلەندی hvellr. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کولکولی kulkulî هەیە کە ئەویش ناوی باڵدارێکە. هەموو ئەم ئاژەڵانەی سەرەوەی لەبەر دەنگ و هەرا کردنیان ئەم ناوانەیان پێ دراوە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "قشقەڵە"، "قاژوو"، "کووکوو"، زیقاولە"، "قومری" و "قەل" کە ئەوانیش پێوەندییان هەیە بە "قیژە"، "زیقە"، "گمە" و "قرە"ەوە.

کورکە **kurke** *[ kurka ]* - "بەلووکە، میتکە": خزمە دەگەڵ ↑کوڕ3 kur "بڵندایی سەر کێو".

کورمژین **kurımjîn** *[ kurımžīn ]* - "کرمێ بوون": دەچێتەوە سەر ↑کرم kırım.

کورن **kurn** - "1- بەردی قووڵ کە ئاوی بارانی تێدا کۆ دەبێتەوە 2- حەوزۆکەی حەمام": بە مانا دووەمەکەی جوڕنە curne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قووڵ qul [کوور kur]. مەبەست شوێن یان شتێکی قووڵکراو [کۆڵدراو]ە.

کورنک **kurnık** - "بێشکە، لانکە": خزمە دەگەڵ ↑قووڵ qul [کوور kur]. مەبەست شوێن یان شتێکی قووڵکراو [کۆڵدراو]ە کە زارۆکی تێدەنرێ. گهوارە gahvāre (P.) "لانکە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و هەموو ئەم وشانە دیسانەوە پێوەندی پەیدا دەکەن بە ↑گۆڕ gor "قەبر" و گەلێک وشەی دیکە کە لە ژێر ↑کون *kun* دا باس کراون. وشەی فارسی گهوارە gahvāre (P.) هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑گابار gabar ی کوردی بە مانای "کون و کەلێن".

کوڕنوو **kurnu** *[ kurnū ]* - "چەمانەوە بۆ ڕێز لێنان": کرنش korneš (P.). ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کووڕ kur و ↑خوار xuwar. مەبەست دەبنەڕەتدا خوار بوونەوەیە. وێ دەچێ وشە فارسییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ، چونکوو وشەی "کووڕ" یان "خوار" دە زمانی فارسیدا بەدی ناکرێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کوڕیانەوە kuryanewe هەیە بە مانای "بە زەویدا راکشانی سەوزە لە سەرمان" [دە بنەڕەتدا: خواربوونەوەی گژ و گیا].

کوروک **kuruk** - "1- بنچینە، بنەما، ڕەگ و ریشە 2- ناوکی میوە": خزمە دەگەڵ ↑کورسین kursîn "ڕەگ و ریشە داکوتان، قایم بوون"، سەر بە ریشەک بە مانای "سەخت، توند، ڕەق" و دواتر بە مانای "نەجووڵ، قورس و قایم".

کورۆک **kurok** - "تیرتکی گیا": هەڵی سەنگینە دەگەڵ↑ کوروک kuruk.

کورْه **kurıh** - "چەقالە بادام": [سەرنج بدە فۆتیمی کۆتایی وشەکە h دەگوترێ]. خزمە دەگەڵ ↑کوروک kuruk "ناوکی میوە"، دەگەڕێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ڕەق، سەخت". شیاوی باسە وشەی "چەقالە"ش خۆی بە مانای "توند و سەختە".

کوڕەبەشە **kurebeşe** *[ kurabaša ]* - "چالگ، چوالوو، چالوو": دە فارسیدا بەم ئاژەڵە دەگوتری "گورکن" واتا "گۆڕهەڵکەنە". قوڕەبەشە qurebeşe و کوڕەبەشک kurebeşk یش دەگوترێن. وشەکە پێک هاتووە لە دوو وشەی کوڕ kur و بەش beş. کەرتی یەکەم هەر ↑گۆڕ[1] gor ە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑پشکنین pışkınîn، واتا مانای وشەکە دە بنەڕەتدا ئاژەڵێکە کە گۆڕ دەپشکنێ. دە زمانی کوردمادیدا قەورپشکنەک qewırpışkınek یش دەگوترێ. شیاوی

باسە ناوەکەی دیکەی ئەم ئاژەڵە لە وشەی "چاڵ" وەرگیراوە کە ئەویش لەباری ماناوە لەگەڵ وشەی "گۆڕ" یەک دەگرێتەوە.

کوڕەک **kurek** [ *kurak* ] - "1- ناوەرۆک 2- ناوی کێوێک لای رەواندز": خزمە دەگەڵ ↑کوڕوک kuruk "ناوکی میوە"، ↑کورۆک kurok "تیرتکی گیا"، ↑کورتەک kurtek "ناوی چیایەکی سەخت لە کوردستان" و دواجار دەگەڵ ↑خار xar "رەق و سەخت". کێوەکە لەبەر سەخت بوونی، ئەم ناوەی پێ دراوە. هەر لەم پێوەندییەدا بڕوانە ↑کورد *kurd*.

کوری[1] **kurî** [ *kūrī* ] - "کلک، دوو(ڤ)": خزمە دەگەڵ ↑کوڕ3 kur "بڵندایی سەر کێو".

کوڕی[2] **kurî** [ *kūrī* ] - "پەزی گوێ لوولی کورت 2- پەزی پەشم هەڵپاچراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کورت kurt سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

کوڕیانەوە **kuryan(ewe)** [ *kuryān(awa)* ] - "بە زەویدا درێژبوونی سەوزە لە سەرمان". خزمە دەگەڵ ↑کوڕنوو kurnu "چەمانەوە بۆ رێز لێنان".

کوزراندن **kuzrandın** [ *kuzrāndın* ] - "داخ کردن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆز3 koz "پەنگر، پۆڵوو".

کوزرین **kuzrîn** [ *kuzrīn* ] - "سووتانەوە (ی پێست)" : دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆز3 koz "پەنگر، پۆلوو".

کوزور **kuzur** - "نەوکێ سووتیاکێ بۆ دەرمانی کەچەڵی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆز3 koz "پەنگر، پۆلوو".

کوزین **kuzîn** [ *kuzīn* ] - "راپەڕین بۆ شاڵاو بردن": خزمە دەگەڵ ↑غیژ ğîj "بە نهێم بەرەو خوار لوور بوونەوە" [هەڵۆ غیژی جوچکان بوو]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەستان hestan [خاستن xasten (.P) و خیز xîz (.P)].

کوژ **kuj** [ *kuž* ] - "شێویەکی دیکە لە ↑گوشە goşe، خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑قوژبن qujbın، ↑سووچ suç.

کوش **kuş** - "کلۆر، ئیسفەنجی": لەوانەیە پێوەندی بە ↑کون kun ەوە هەبێ، دەشێ کۆنتر کەبش *kebeş** بووبێ و هەر وەک ↑خەپشە xepşe] و ئاماژەی بە "کون و کەلێن" کردبێ.

کوشتەر **kuşter** [ *kušter* ] - "خەنجەر": هەروەها کوشتەرە kuştere هەیە بە مانای "رەندەی دارتاشی". ئەم وشانە پێوەندییان بە "کوشتن"ەوە نییە، بەڵکوو خزمن دەگەڵ ↑قاش *qaş* و ↑کووز kuz و گەلێک وشەی دیکە کە مانای "بڕین" لە خۆ دەگرن.

کوشمە **kuşme** [ *kušma* ] - "وشکەمیوە": خزمە دەگەڵ ↑کشمیش kışmîş "ترێی وشکراو".

کوشتن **kuştın** [ *kuštın* ] - "لەناو بردن": کشتن koštan (.P)، -kaoš (.Av)، < -*kauš* (.OIra)*.* دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کز kız "لەر و لاواز". بنەوشەی کوژ- دەبێ سەرەتا بە مانای "لە کەمی دان، لە کزی دان، بەرەو نەمان چوون" بووبێ.

کوشین **kuşîn** [ *kušīn* ] - "پشاوتن": گوشین guşîn و ↑گڤاشتن gıvaştın یش دەگوترێ.

کوف **kuf** - "1- دەنگی هەناسەدانی بە هێز 2- خۆ هەڵکێشان و پف بە خۆدا کردن 3- واقەی کەروێشک (کوفەکوف)": هەر لەم پێوەندییەدا چەند وشەیەک هەن کە دەشێ سەر بە ریشەیەک بن، وەک ↑کوفارە kufare "فیچقە"، ↑کوففین kuffîn "وشاندنی مار"، ↑کوفی kufî "1- پرتە و بۆڵە 2- دەنگی پرخە" و هتد.

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ کە دە ریشەدا مانای "دەم کردنەوە، دەم داپچڕین" دەبەخشن، وەک ↑قەپ qep، ↑گەف gef، ↑گەفاندن gefandın، ↑حەپاندن

ħepandın و ↑کوڤک kuvık [کوفک] "ڕەحەتی، ئامرازێکی دەم ڤالا بۆ تێ ڕژاندنی تراو" و هتد.
2- یان لەوانەیە وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگ بێ.
**کوفارە kufare** [ *kufāra* ] - "فیچقە، فەوارە": خزمە دەگەڵ↑ کوف kuf.
**کوفاندن kufandın** [ *kufāndın* ] - ↑کۆباندن kobandın "دروونەوەی دەوری جلک".
**کوففین kuffîn** [ *kuffīn* ] - "وششاندنی مار": خزمە دەگەڵ ↑کوف kuf.
**کوفک kufık** - "برش، کەڕوو": هەروەها کوففک بوون kuffık bûn هەیە بە مانای "گەنین" [دە بنەڕەتدا: برش هەڵێنان]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەپەک[1] kepek "برش، کەڕوو".
**کوفی kufî** [ *kufī* ] - "1- پرتە و بۆڵە 2- دەنگی پرخە": خزمە دەگەڵ ↑کوف kuf.
**کوڤک kuvık** - "ڕەحەتی، ئامرازێکی دەم ڤالا بۆ تێرژاندنی تراو": قاف qaf و کوفک kûfık یش دەگوترێ. قیف qīf (P.). خزمە دەگەڵ ↑کون kun و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "دەم کردنەوە، دەم ڤالا کردن، قووڵایی" دەکەن.
**کول1 kul** - "خەم و خەفەت": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ kar (MG.)، chara (OG.) "خەم، ناڵە" kara (Gt.)، care (E.) "خەم، نیگەرانی، خەم لێخواردن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *ĝar-*** > "بانگ کردن هاوار کردن". gerys (Gr.) "قیژە، بانگ"، gāir (OIr.) "قیژە" دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان بە خزم دادەنرێن. دە زمانی کوردمادیدا کول و کەسەر kul u keser و هەروەها کوڵ و کۆ kul u ko بەکاردێ. کاتێک دەگوترێ فلانە کەس کوڵ و کۆی خۆی هەڵرشت، لێرەدا مەبەستەکە پێوەندی بە کوڵان و کەف کردنەوە نییە! کوڵ بە مانای "خەم و خەفەت"ە و "کۆ"ش کورتکراوی "کۆڤان"ە، دیسان هەر بە مانای "خەم و خەفەت". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑کۆڵەوار kolewar هەیە بە مانای "بەدبەخت، لێقەوماو، پەرێشان". ئەم وشەیەش پێک هاتووە لە بنجەوشەی کۆڵ -kol [هەمان کول، کوڵ واتا خەم و خەفەت] + پاشگری (ە)وار (e)war. ئەم پاشگرە شێوەیەکی دیکە لە↑ -وەر[3] -wer کە لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا و مانای "هەڵگر" دەداتە ئاوەڵناوەکە، وەک بەختەوەر bextewer، هونەروەر hunerwer، دادوەر dadwer [هەڵگری بەخت، هونەر یان داد]. شێوەی ئەسڵی وشەکە ↑-بار[4] -bar ە بە هەمان مانا. کەوابوو کۆڵەوار واتا هەڵگری "خەم و خەفەت". هەر بەم شێوەیە ↑کولۆڵ kulol [کلۆڵ kılol] هەیە کە پێک هاتووە لە کوڵ + ئۆڵ [پاشگر] kul + ol.
**کول2 kul** - "1- دژی تیژ 2- تەڕاد، بەتاڵایی لای سەرووی ران": کۆل kol یش دەگوترێ. کل kol (P.). خزمە دەگەڵ ↑کۆڵ kol "پەنجەی کۆڵ".
**کول3 kul** - کول لێدان واتا ناخونەک لێدان لە خواردەمەنی. خزمە دەگەڵ ↑کولاب kulab "چڕنووک، چنگوڕک". وشەکە دە بنەڕەتدا بۆ نینۆکی ئاژەڵ بەکار هاتووە.
**کول[4] kul** - "ئاڵ، هەستێکە بە خواردنی شتی زۆر ترش لە ددانا پەیدا دەبێ": [ئاڵ بوونەوەی ددان یان کول بوونی ددان]. شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاڵ[5] al.
**کوڵ1 kul** - دەگەڵ "پێ" دێ و دە گوترێ ↑پێکوڵ pekul "دڕکێکی سێ سووچ" کە کاتی ڕۆیشتن دە پێ هەڵدەچەقێ و بریندار دەکا. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قەل qel [قەل کردن واتا بڕین]، ↑قەڵت qelt و ↑قەڵشاندن qelşandın، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".
**کوڵ2 kul** - "1- قووڵە 2- بێ کلک، بێ دوو": شێوەی کۆنتری ↑قوڵە qule.
**کوڵ3 kul** - دەگەڵ چەند وشەیەک دێ، وەک کوڵەبار kulebar "دارێک کە وە بەر داری میوەی دەدەن"، کوڵەبرک kulebırk "پلار بۆ میوە وەراندن" و ↑کۆڵەڕم kolerm "1-تیزە 2- بەرچیخ، داری چیغ ڕاگر". دەشێ پێوەندییان بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ریشەی **< -IE.) *skleud** "کوتەداری پشت دەرگا بۆ داخستنی، کلۆم". ↑کلیل *kılîl* و ↑کلۆم kılom [یان کلۆن kılon] لەم ریشەوە هاتوون.

2- helfen (G.)، helfan (OG.)، hilpan (Gt.)، help (E.)، hjälpa (Sw.) "ئاریکاری کردن، کۆمەکێ کردن، پشت (را)گرتن"، šelpti (Lit.) "ئاریکاری کردن، پشتیوانی کردن"، سەر بە ریشەی **< -kelb*** **(IE.)** "پشت گرتن، راگرتن" [وەك راگرتنی کاریتە لەسەر ↑کۆلەکە koleke]، ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **< -IE.) *kel)** "لێهاڵاندن، تاقەت کردن".

**کولاب kulab** [ *kulāb* ] - "1- قولاپ 2- چنگوڕك، چرنووك": هەروەها کولابە kulabe ش بە مانای "کەڵەوە" دێ. شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی قولاپ qulap. خزمە دەگەڵ Klaue (G.) "چنگوڕك"، klo (Sw.) "چنگوڕك، ددانە"، cla (OE.) "چنگوڕك، سم، خێشك". وا بیر دەکرێتەوە ئەم وشانە دواجار بچنەوە سەر ریشەی **< -IE.) *gel)** "ڕێکگوشین، خڕ کردنەوە، گلۆلەکردن، تۆپەڵە کردن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گلوو gılu، ↑گلۆڵە gılole، ↑گولە gule، ↑کلۆ kılo و چەندین شەی دیکە.

**کولابە kulabe** [ *kulāba* ] - "کەڵەوە": کولاڤە kulave ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڵەوە kelewe و دواتر خزمە دەگەڵ ↑قولاپ qulap.

**کولات kulat** [ *kulāt* ] - "1- کلۆگڵ 2- تۆپەڵەبەفر": خزمە دەگەڵ ↑کولاب kulab.

**کولاف kulaf** [ *kulāf* ] - "چرنووك": شێوەیەکی دیکە لە ↑کولاب kulab.

**کولانە kulane** [ *kulāna* ] - "1- رۆچنە 2- کولێتی مریشکان": وشەکە بە مانای یەکەم بە چەندین شێوە دەگوترێ: کولان، کولانچکە، کولانکە. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "کون و کەلێن" بێ، چونکوو بەم جۆرە دەتوانێ هەردوو ماناکەی سەرەوە بەدەستەوە بدا، وەك رۆچنە ئەو کونەیە کە دە سەربان دەکرێ بۆ رووناك بوونی ژوور، وەك کولێتی مریشکیش دیارە هەر جۆرێك کون و کەلێنە بۆ پەنا گرتنی مریشك. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کولێن kulen هەیە بەمانای "کون" [کەلێن و کولێن]. وشەکە دەشێ پێك هاتبێ لە کول + ان(ە) kul + an(e). کەرتی "کول" بە تەواوی رێك دەکەوێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون *kun* دا شی کراونەوە، وەك ↑قووڵ *qul*، ↑گۆل gol "ئەستێرك"، ↑کاول kawıl "وێران"، ↑گوەل guwel "کونی دیوار بۆ دیدەوانی"، ↑گوێل guwel "کونی بەرداش" و هتد. ↑گەوەڕ gewer "تەویلە"ش پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و ئەویش جێگەی حەوانەوەی ئاژەڵە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ شێوەی کۆنتری "کولانە"، *کاپلان *kaplan/ کاڤلان *kavlan* بووبێ و سوابێتەوە. لەم بارەوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑کاپۆ kapo "هێلانە" و ↑کاڤلان kavlan "کالان، بەرگی خەنجەر" کە ئەوانیش پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە و دواجار خزمن دەگەڵ ↑کون kun.

**کولانەوە kulan(ewe)** [ *kulān(awa)* ] - "وە ژان کەوتنەوەی برین": دەچێتەوە سەر ↑کوور kur [قووڵ qul]. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn "هەڵقەندن، قووڵ کردن". مەبەست لە "کولانەوە" دە بنچینەدا ئەوە بووە کە بریتێك کە دە دۆخی سارێژ بوون دایە، قرتماغەکەی هەڵدەکەنرێ، دیسان *قووڵ* دەبێتەوە و وە ژان دەکەوێتەوە.

**کولب kulb** [ *kulb* ] - "نەوسن، چڵێس": دە زمانی کوردمادیدا وشەی "گاپن" هەیە بە مانای "نەوسن، زۆرخۆر" [نەوسنی گاپن]. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "دەم داپچڕین، زار کردنەوە" دەکا و هەروەها خزمە دەگەڵ "گەپین" [حەپین] بە مانای "وەڕین". هەر بەم چەشنە وشەی "کولب" خزمە دەگەڵ klaffen (G.) "قەڵشدار بوون، کەلێن تێکەوتن، کراوە بوون (ی زارك)"، klaffōn (OG.) "دەنگی وێککەوتن، چەنە لێدان [دەم پێکدادان]"، kläffen (G.) "وەڕین،

گەپین“، Kläffer ‎(G.)‎ ”تولەسەگ“ [دە بنەڕەتدا: ”گەپینۆک“، حەپەکەر، دەم پێکدادەر]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کولفا kulfa ”زۆر برسی“، ↑غەڵبە *ġelbe* [غەڵبەغەڵب] و ↑قریوە qırîwe [قریوەقریو].

کولبە **kulbe** *[ kulba ]* - ”بێڵچە“: خزمە دەگەڵ ↑کولاب kulab.

کوڵپ **kulp** - ”1- قورسی، سەنگینی 2- بەڵا و بەدبەختی“: جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ grob ‎(G.)‎، g(e)rob ‎(OG.)‎، grof ‎(Nl.)‎ ”درشت، زبر“. وشە ژێرمەنییەکە لەپاڵەوە هەروەها ئەم مانایانەش لە خۆ دەگرێ: ”پتەو، قورس، دژوار، گەورە“.

کولپەک **kulpek** *[ kulpak ]* - ”دەسکی کووپە و مەنجەڵ“: خزمە دەگەڵ ↑کولاب kulab ”قوولاپ“.

کولپین **kulpîn** *[ kulpīn ]* - ”دەنگی و شەقەی لێدان مشت و کوتەک“: خزمە دەگەڵ ↑غەڵبە *ġelbe* [غەڵبەغەڵب] و ژمارەیەک وشەی سەر بەم خێزانە کە ئاماژە بە ”لێدان، پێکدادان، دەنگی وێککەوتن“ دەکەن.

کولفا **kulfa** *[ kulfā ]* - ”زۆر برسی“: خزمە دەگەڵ ↑کولب kulb ”نەوسن، چڵێس“. دە بنەڕەتدا مەبەست ”دام داپچڕین، زار کردنەوە“یە بۆ خواردن.

کوڵک1 **kulık 1** *[ kulık ]* - ”1- زۆر بە ژان 2- پەتا، ئاهۆ، ئازار“: وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑کول[1] kul ”خەم و خەفەت“.

کوڵک2 **kulık 2** *[ kulık ]* - ”1- دومەڵ، کوان 2- زیپکە“: کۆڵک kolık یش دەگوترێ. وێ دەچێ ئەم وشەیە جیا بێ لە کوڵک1 kulık ”زۆر بە ژان“ و خزم بێ دەگەڵ ↑گڵۆڵە gılole، ↑کڵۆ kılo، ↑گلوو gılû و هیتر سەر بە ریشەیەک بە مانای ”خڕ بوونەوە، توپەڵە بوون“.

کولکولی **kulkulî** *[ kulkulī ]* - ”ناوی باڵدارێک“: خزمە دەگەڵ ↑کوڕکوڕە kurkure.

کوڵکوڵە **kulkule** *[ kulkula ]* - ”فیچقە، کوفارە“: ↑هەڵقولین (hel)qulîn.

کولکە **kulke** *[ kulka ]* - ”دۆدانە، مەشکۆڵە“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl ”پێست، پێستە“.

کوللە **kul(l)e** *[ kul(l)a ]* - ”زیلەیەکە پەتای دەخڵ ودان“: kullag ‎(MP.)‎. خزمە دەگەڵ ↑کولەک2 kulek ”شەل“ و ↑کولین kulîn ”شەلین، لەنگین“. دەشێ وشەکە ئاماژە بە جۆری ڕۆیشتنی زیلەکە بکا کە ڕۆیشتنێکی بە ”لەنجە و لار“ە. لەم تێڕوانینەوە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کل kıl ”لار، خوار“.

کوللە **kulle** *[ kulla ]* - ”پارچەیەکی تەنکە بۆ پێش گرتن لە مێشوولە بە سەر تەختی نووستنی رادەنگیون“: هەروەها ↑کوڵە kule ”1- ژوور 2- رەبەت، سیپە“ هەیە کە لەوانەیە پێوەندی بە ”کوللە“ەوە هەبێ. ئەم وشانە دەشێ بچنەوە سەر ریشەی **< *kel- ‎(IE.)‎** ”داپۆشان، لێهاڵان“. دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑هاڵان *halan* [لێهاڵان]، هۆڵ hol، ↑کالان kalan و هتد.

کولم **kulım** *[ kulım ]* - ”پەنجەی قووچاو، مست“: [کولمێک خۆڵ، کولمێک ئاو]، خزمە دەگەڵ ↑کۆڵ kol ”بێ پەنجە“، سەر بە ریشەیەک بە مانای ”چەمانەوە“. مەبەست لێرەدا چەماندنەوە و قووڵ کردنی بەری دەستە.

کوڵم **kulm** *[ kulm ]* - ”سەرگونا“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کولم kulm ”پەنجەی قووچاو“ و ↑گوڵم *gulm* ”نەرمایی سەرسمت“.

کولنچی **kulınçî** *[ kulınčī ]* - ”هێلانەی کۆڵدراو لە داردا“: خزمە دەگەڵ ↑کولانە kulane.

کولند **kulınd** - "1- کدوو، کوولەکە 2- کورتەباڵای ڕەزاشیرن": شێوەیەکی دیکە لە ↑کوولەکە kuleke.

کولنگ **kulıng** - "نیمچەرفەیەک لە دیواردا": خزمە دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn. مەبەست شوێنی "قووڵکراو و کۆڵدراو"ە لە دیواردا. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "شکاف".

کوڵنگ **kulıng** - شێوەیەکی دیکە لە ↑قوڵینگ qulîng و خزمە دەگەڵ ↑*قووڵ qul* و دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn.

کولوە **kulwe** *[ kulwa ]* - "1- خانووی زۆر بچووک 2- گۆڕیچە": کلبە kolbe (P.) "کۆختە". خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- Grube (G.) "قوڵکە، دەخمە" و Grab (G.) "گۆڕ". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑غوڕاب ġur(r)ab، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *ghrebh-, *ghrobh- >** "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، داڕووشاندن".

2- ↑کەلەبەر keleber سەر بە ڕیشەی **(IE.) *gleubh- >** "کوتان، قەڵشاندن، بڕین".

کوڵوش **kuluş** *[ kuluš ]* - "جۆرێک جلکی ژنانە": خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

کولووره **kulure** *[ kulūra ]* - "پلووره، پووره هەنگ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کروور kırûr [کلوور kılûr] "یەکجار زۆر".

[تێبینی: وشەکانی "پڵووره" و "پووره" ش دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای *"فره"*، زۆر"].

کولۆت **kulot** - "1- بزنی بێ شاخ 2- ئاژەڵی بێ ددان": خزمە دەگەڵ ↑کلۆز kıloz یان کڵوس kılos "ددانی پێشەوە نەماو".

کولۆفتن **kuloftın** - "دەناو دەستدا ڕێکگوشین و تۆپەڵە کردن": هەروەها کولۆف kulof هەیە بە مانای "دە ناو دەستدا ڕێکگوشراو و چرچکراو". وشەکە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گلۆفین (hel)gılofîn، ↑گلۆپ gılop، ↑گلۆڵە gılole، ↑کلۆ kılo، ↑کولاب kulab و هتد. ڕیشەی ئەم وشانە مانای"ڕێکگوشین و تۆپەڵەکردن" دەدا.

کولۆڵ **kulol** - "بەدبەخت، لێقەوماو": کلۆڵ kılol یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑کول kul "خەم، خەفەت". پێک هاتووە لە کول + ئۆڵ [پاشگر] kul + ol.

کول ه **kulıh** - "کۆخە، قۆزە": هەروەها کولهایۆخ هەیە بە مانای "زۆر بە کۆخە". [سەرنجی پاشگری ئۆخ ox- بدە کە دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە پاشگری ↑ئۆز oz- یان پاشگری ئۆک ok-]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەو وشانە کە لەژێر ↑کوڕکوڕە kurkure دا باس کراون.

کوڵە **kule** *[ kula ]* - "1- ژوور 2- ڕەبەت، سیپە": هەروەها کۆڵە kole هەیە بە مانای "لانی سەگ". ئەم وشانە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و هەروەها خزمن دەگەڵ ↑کولانە kulane.

کولەک1 **kulek 1** *[ kulak ]* - "1- تاقەی ناو دیوار 2- کولانەی سەربان 3- تیخی کەوچک تاشین": خزمە دەگەڵ ↑کولانە kulane و دواتر ↑*کۆڵین kolîn*.

کولەک2 **kulek 2** *[ kulak ]* - "شەل": خزمە دەگەڵ ↑کولین kulîn "شەلین، لەنگین".

کوڵەک **kulek** *[ kulak ]* - "فێڵ": [کەڵەک و کوڵەک kelek u kulek]. خزمە دەگەڵ گول gūl (P.) "فێڵ، فریو". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ gull (E.) "فریو دان". ئەم وشە ئینگلیزییە بەپێی بۆچوونێک لەوانەیە پێوەندی بە † gull (E.) "قوڕگ، هەڵقووڕاندن"ەوە هەبێ. چۆنێتی پێوەندییەکە ڕوون نەکراوەتەوە. لەوانەیە ↑کەڵەک kelek "فێڵ" شێوەیەکی دیکەی وشەکە بێ.

کولیچە **kulîçe** *[ kulīča ]* - "جۆرە نانێکە": کلۆچ kıloç یش دەگوترێ. ئەم وشەیە و هەروەها وشەکانی ↑کولێرە kul(l)ere و ↑کەلانە kelane بنەوشەیەکی هاوبەش یاخود وێکچوویان هەیە کە بریتییە لە کول/ کەل -kul- / kel. ئەم بنەوشەیە خزمە دەگەڵ Laib (D.)، hleib (OG.)،

گشتیان بە مانای "نان"، سەر بە ریشەی **< kloibho-** (Rus.) chleb ،(OE.) hlāf ،(Gt.) hlaifs
**(IE.)** "نانی سوورکراوە لە تاوەدا".

کولی **kulî** [ *kulī* ] - ↑کوللە kul(l)e.

کولیمەک **kulîmek** [ *kulīmak* ] - "ڕان، ئێسکی ران": خزمە دەگەڵ ↑کۆڵ kol "بێ پەنجە" سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە".

کولین **kulîn** [ *kulīn* ] - "شەلین، لەنگین": کولیان kulyan یش دەگوترێ. هەروەها کولیکولی kulîkulî هەیە بە مانای "هەنگڵەشەلە". خزمە دەگەڵ ↑کل kıl "خوار". شیاوی باسە وشەی "شەل"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە هەر بە مانای "خوار".

کوڵین **kulîn** [ *kulīn* ] - "وەجۆش هاتن": کەلان kelan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هەڵقوڵین (hel)qulîn. هەڵقولینی ئاوی کانیش وەک کوڵینی ئاو وایە و لە هەردووک پێوەندییدا هەڵچوون و بڵقەبڵق کردن لە ئارا دایە. وشەکە خزمە دەگەڵ Quelle (G.) "کانی" و quellen ،(G.) quellan (OG.) "کوڵین"، (ge)collen (OE.) "هەڵمسان"، galati (OIn.) "هەڵرژان"، Qualm (G.) "دووکەڵ"، سەر بە ریشەی **< *g(u)el-** **(E.)** "هەڵچوون، هەڵرژان".

کولێت **kulet** [ *kulet* ] - "1- کوختە 2- کولانە": کۆل kol یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Kluft ،(G.) cleft (E.) "قەڵش، کەلەبەر"، klieben (G.) "قەڵشین، قەڵشاندن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کەلەبەر keleber. لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژە بە "کون و کەلێن"ێک دەکا.

2- ↑کولێن kulen "کەلێن و کولێن"و ↑کولانە kulane.

کولێجە **kulece** [ *kuleja* ] - "جۆرێک سوخمەی قۆڵدار": خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

کولێرە **kul(l)ere** [ *kul(l)era* ] - "جۆرە نانێک": خزمە دەگەڵ ↑کولیچە kulîçe.

کولێن **kulen** [ *kulen* ] - "کەلێن و کولێن": خزمە دەگەڵ ↑قووڵ qul [کوور kur] و ↑کولانە kulane "کولێتی مریشکان".

کوماتەک **kumatek** [ *kumātak* ] - "1- بابۆڵەی ساوا تێ پێچان 2- دەسرازەی لانک": خزمە دەگەڵ ↑جامە came سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین، تێوەپێچان".

کومبر **kumbır** - "گاشەبەردی تاشراو لە شاخدا": دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑کووم kum دا باس کراون.

کومبرەک **kumbırek** [ *kumbırak* ] - "1- دوندی چیا 2- سەرلق، چڵەپۆپە": خزمە دەگەڵ ↑کووم kum "1- کڵاو 2- پۆپەی کەڵەشێر".

کومبەلۆک **kumbelok** [ *kumbalok* ] - "کارگ": خزمە دەگەڵ ↑کووم kum "1- کڵاو 2- پۆپەی کەڵەشێر".

کومتل **kumtıl** - "کڵۆی چکۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑سمتە sımte [سمتەگڵ].

کومچا **kumça** [ *kumčā* ] - "دوگمە، قۆپچە": خزمە دەگەڵ ↑کووم kum "1- کڵاو 2- پۆپەی کەڵەشێر". دەشێ ئەسڵی وشەکە "کومچە kumçe" بێ، هەر وەک "قۆپچە".

کومشین **kumışîn** [ *kumıšīn* ] - "هەڵقرچان، قرمچین": خزمە دەگەڵ ↑ گەمژە gemje [دە بنەڕەتدا: خوار، بادراو]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون(ەوە)". کاتێک شتێک هەڵدەقرچێ، ئەوا وێک دێتەوە و خوار و خێچ دەبێ. وشەی "قرمچین"یش کە دەگەڵ "کومشین" هاومانایە، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خوار بوون(ەوە)".

**کومکومین kumkumîn** *[ kumkumīn ]* - "چەمۆڵە دادانی سەگ و شێر و...": خزمە دەگەڵ ↑کۆمۆ komo "پشتکووڕ" [سەرنج بدە کە بنچی وشەکە واتا ڕەگی کردارەکە دووبارە دەبێتەوە. ئەم دۆخە دە ژمارەیەک کرداری دیکەشدا دەبینرێ و دۆخی جەخت کردن دروست دەکا، وەک قژقژاندن، گژگژاندن و هتد].

**کون kun** - "کولێن، قووڵایی، ناوبڕاوی": ئەم وشەیە دەشێ شێوەی گۆڕدراوی وشەیەکی کۆنتر بێ و دە بنچینەدا شتیکی وەک *gapen /*gaven** بووبێ. وشەیەکی ئەوتۆ دەگەڵ هێندێک وشە ڕێک دەکەوی کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەبیندرێ، وەک gaffen (G.) "سەرسام بوون" [زاردابچڕین لە سەرسووڕمان، حەبەسان]، gapen (MG.) "زار داپچڕین"، gapen (Nl.) "زارداپچڕین، باوێشک هاتن"، gapa (Sw.) "باوێشک هاتن، گەروو پچڕاندن، قیژاندن". ریشەی وشەکە بە مانای "دەم، زار(ک)، دەم داپچڕین" بووە. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییانە پەیدا دەکەن، وەک ↑کەپو kepo، ↑گووپ gup، ↑گۆڤ gov "ئاغەڵ"، ↑گوڤ guv "کونی ئاژەڵی کێوی"، ↑قەپ qep [ڤەپاڵ qepal، دە بنەڕەتدا: "زار"]، ↑گەفە gefe "هەڕەشە" [دە بنەڕەتدا زار داپچڕین بۆ ترساندن]، ↑گەپ gep "گاڵتە" [دە بنەڕەتدا دەم پێکدادان، چەنەچەن کردن]، ↑حەپین ħepin [حەپاندن ]"وەڕەوەڕەی سەگ"، ↑گاپن gapın "زۆرخۆر" [دەبنەڕەتدا دەم داپچڕیو بۆ خواردن]، ↑حەبەسان ħebesan [حەپەسان ħepesan واتا زارداپچڕین بەهۆی سەرسوڕمانەوە] یان ↑خەبسین xebsîn [بەراوردی مانای ئەم دوو وشەیە بکە دە گەڵ وشەی ئەڵمانی gaffen (G.) "حەبەسان"]، حەپ یان خەپ xep /ħep "قووت دان بە زمانی زارۆک"، ↑کەپن kepın "بێددان، دەم ڤاڵا"، ↑گەپە gepe "بۆشایی زار"، ↑خەپشە xepşe "قوز" [دەبنەڕەتدا کون و کەلێن، قەڵشی لەشی ژن]، ↑خاڤک xavık "کەلەکە، خاڵیگە" و هتد. وشەکە هەر لە کۆنەوە نەک بەو مانایانە بەکار هاتووە کە پێوەندییان بە "دەم و زار داپچڕین"ی گیانلەبەرەوە هەیە، بەڵکوو بە مانای "دەم داپچڕین"ی شتی بێ گیانیش وەک دار و دیوار و هەرد و شاخ و هیتر بەکار هاتووە، واتا بە مانای "زارک، کولێن، کەلێن، قەڵش، قووڵایی". دە زمانی ئینگلزیدا gap (E.) بە مانای"کەلێن، کون، کەلەبەر، قەڵش، ڤاڵایی" بەکار دێ. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ وشەی "کون"ی کوردمادی دە سەردەمە کۆنەکاندا هەر وەک وشە ئینگلیزییەکە مانایەکی بەربڵاوتری هەبووە و دواتر لە مانای ئەمڕوییدا بەرتەسک بووەتەوە. مانا کۆنەکە دە زمانی کوردمادیدا ئەمڕۆدا دەچەند وشەیەکدا دەبینرێ، وەک ↑کاپۆ kapo "هێلانە"، ↑کاپان kapan "1- کون لە میچی خانوو دا 2- نەقەب"، ↑کافک kafk "ئەشکەوت" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ کهف kehf (Arb.)]، ↑قووپان qupan "ڕۆچوون، قووڵ بوون"، ↑گابارە gabare و ↑کاو³ kaw "قەڵشەکێو، شکێر"، ↑خافوور xafur "ڤاڵا، ناوبەتاڵ"، ↑خوانکە xuwanke یان ↑دەرخۆنە derxone [der + xone] "سەرپۆشی دەفر یان تەنوور" [دە بنەڕەتدا: ئەو شتەی (زارکی) کونی پێ دەبەستن]. کەرتی خوان/ خۆن xon / xuwan لە وشەی خوانکە یان دەرخۆنەدا ئاماژە بە زارکی دەفر یان تەنوور دەکا و بەم جۆرەی خوارەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە: [kun / xon-/ xuwan ←*gaven ←*gapen]. هەروەها دەشێ ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە هێندێک وشەی وەک کاویدن kāvīdan (P.) "هەڵکەندن، قووڵ کردن"، cavus (L.) "ڤالایی، بۆشایی" و هەروەها ژمارەیەک وشەی کوردمادی دیکە وەک ↑کاول kawıl، ↑خاپوور xapur، خابوور xabur [چەمی خابوور واتا چەمی قووڵ]، ↑خەپراندن xeprandın، ↑گەبەڵ gebel"زەلکاو"، ↑گۆل gol "گۆم"، ↑قووڵ qul [یان کوور kur]، ↑گوێل guwel "1- کونی بەرداش 2- لەپی دەست بە قووڵکراوی"، ↑گوەل guwel "کونی دیوار بۆ دیدەوانی"، ↑کولێن kulen

[کەلێن و کولێن]، ↑کولانە kulane "هێلانە"، ↑گۆڕgor، ↑گەوەڕ gewer "1- تەویلە، 2- کەلێنەشاخ"، ↑کەوێل[1] kewîl "1- کۆخ، کۆختە 2- ئەشکەوت" و هتد. گشت ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە چەمکی "کون، کەلێن، بۆشایی، قووڵایی". زۆرێک لەو وشانەی لەسەرەوە باس کران، بنجی *gap- بە جۆرێک لە جۆرەکان نیشان دەدەن. یەکێک لەو وشانەی کە لەم ناوەدا سەرنج رادەکێشێ، وشەی گابارە gabare "کەلێنەشاخ" یە. ئەم وشەیە نیزیکی تەواو دەگەڵ zufr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ" نیشان دەدا. "گابار" دواتر چەندین گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لەئەنجامدا چەندین وشە بە مانای جیاواز، بەلام هاوپێوەند بەدی هاتوون، وەک گەوەڕ، گەبەڵ، خاپوور، کاول، قووڵ و هتد. سەبارەت بە ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشانە پێویستە هەڵوەستەیەکی کورت بکەین. بەگوێرەی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی DUDEN ی ئەڵمانی وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە کە مانای "دەم داپچڕین، زار کردنەوە" دەبەخشن، وێ دەچێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی **(IE.) *ĝhēi-, *ĝhan- >** "دەم کردنەوە". بەم پێیە ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ↑کەنین kanîn [پێکەنین]. بەڵام هەر لەم فەرهەنگەدا لە پێوەندی دەگەڵ وشەیەکی دیکەی ژێرمەنیدا، واتا Kiefer (G.) "شەویلکە" ئاماژە بە ریشەی **(IE.) *ĝeph-, *ĝebh- >** "زار، دەم" کراوە. دەشێ ئەو ریشانە هەردووکیان چەشنە پێوەندییەکیان دەگەڵ یەکتر هەبێ. ئەگەر پێوەندییەکی ئەوتۆ لە ئارادابێ، کە زۆر رێی تێ دەچێ، ئەوسا وشەی ↑زار zar یش خزمایەتی پەیدا دەکا دەگەڵ وشەکانی سەرەوە [زافار← زار]. دە زمانی فارسیدا جگە لە کاویدن kāvīdan (P.) یان کابیدن kābîdan (P.) "هەڵکەندن، قووڵ کردن" چەندین وشەی دیکە دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە خزمایەتی پەیدا دەکەن، وەک کابک kābok (P.) "هێلانە"، کویر kavīr (P.) "دەشتی شۆرەکات، سەحرا"، گور gūr (P.) "گوڕ، دەشت"، گور gūr (P.) "گۆڕ، قەبر"، گهوارە gahware (P.) "لانکە" [دە بنەڕەتدا: قوڵکە بۆ منداڵ- هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گابار gabar]، گود goud (P.) "قووڵ" و هتد.

[تێبینی: سەبارەت بەو گۆڕانەی بەسەر فۆتیمەکاندا هاتووە، وشەی "کون" دەگەڵ هێندێک وشەی وەک "زۆر" و "کۆن" بەرهەڤ بکە].

**کونار kunar** *[ kunār ]* - "دارێکە بەرێک دەگرێ وەک بلچی زەرد": ئەگەر سەیری وشەی "بلچ" بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ *بۆڵ* "دەنکەترێ" واتا شتێکی خڕەکە. هەروەها "گوێژ" کە ناوێکی دیکەیە بۆ بلچ، خزمە دەگەڵ "گۆ" و "گوێز" و ئەم وشانەش دیسان ئاماژە بە شتێکی خڕەکە دەکەن. کەوابوو "کونار"یش هەمان مانا دەردەبڕێ و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قوتیر *quner* [قونار qunar] "کوان، دومەڵ"دا باس کراون. شیاوی باسە وشەی "بلچ"یش خزمە دەگەڵ "بلۆق" و "بالۆکە" و هەموو ئەم وشانەی سەرەوە ئاماژە بە شتی خڕەکە و قووتەکە دەکەن. وشەکە هەروەها هەڵسەنگێنە دەگەڵ ↑کتێرە kınêre.

**کونتار kuntar** *[ kuntār ]* - "بناری چیا": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑حاند ĥand "رووبەروو، بەر". وشەیەکی دیکە بۆ بناری چیا "بەرقەد"ە. وەک دەبینین لێرەدا وشەی "بەر" دەور دەبینێ. کەوابوو دە وشەی "کونتار"یشدا دەشێ هەر ئەم چەمکە لە ئارادا بێ.

**کونج1 kunc** *[ kunj ]* - "گۆشە، قوژبن":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑کون kun ەوە هەبێ [کون و کەلێن] و دە بنەڕەتدا مەبەست "قووڵایی، لای هەرە بنەوە" بێ.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "چکۆڵەبوون(ەوە)، تەنگ بون(ەوە)" دەبەخشن، وەک ↑گنج gınc [گنج بوون]، ↑خونچە xunçe، ↑قنج qınc، ↑خونجیلانە cuncîlane و

هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای"ڕێککگوشران، وێکهاتن". لەم مانایەوە دەشێ مانای "تەنگ و چکۆڵەبوونەوە" سەری هەڵدابێ. لەم تیڕوانینەوە "کونج" ئاماژە بە شوێنێکی تەنگ و چکۆڵە دەکا.

**کونج 2 kunc** [ *kunj* ] - "دەفری سواڵەت بۆ گیا تیداچاندن": خزمە دەگەڵ ↑کوندک kundık "دەفری چەرم بۆ ئاو کێشان".

**کونج 3 kunc** [ *kunj* ] - "ئاوڵاوی، گڕۆ، گڕوێ": خزمە دەگەڵ ↑کونجاندن kuncandın.

**کونجاندن kuncandın** [ *kuncāndın* ] - "بە ددان ورد کردن، کرۆشتن": کونجین kuncîn یش دەگوترێ. ئەم وشانەی خوارەوەش لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەن: ↑کونجڕ kuncır "زبری تیژ"، ↑کونجڕە kuncıre "پێکوڵ، دڕکی سێ سووچ"، ↑کونجڕک kuncırk "قورنج"، ↑کونج kunc "گڕوێ" [ڕوومەت زبر، گڕنی گڕنی، داڕووشاو، کرێندراو؟]. ئەم وشانە دەبێ پێوەندیان هەبێ بە ریشەی *(IE.) *gh(e)nə-* "جووتن، گەستن، خوراندن، کراندن". وشەی ↑گەنە gene دەبێ لەم ریشەوە هاتبێ. لەم پێوەندییەدا هەروەها وشەی ↑کونجی kuncî سەرنج رادەکێشێ کە ناوی "دانەوێڵەیەکی ورد"ە.

[تێبینی: بۆ ئەوەی پێوەندی تێوان ئەم وشەیە بە وشەکانی سەرەوە بدۆزینەوە، پێویستە ئاوڕێک لە وشەی Korn (G.) "دانە، دەخڵ و دان" یان Kern (P.) "ناوک" بدەینەوە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ گڕنی gırnî دە زمانی کوردیدا بە مانای "زبر". مانای بنەڕەتی "گڕنی گڕنی" ئاماژە بە دانەدانە بوون دەکا، وەک دانەکانی هەنار کە رووبەرێکی ناساف و زوور دروست دەکا، یان دانەکانی سەرداری (بەلال). شیاوی باسە کە هەم وشەی Granat "هەنار" بە زمانەکانی ئەورووپی و هەمیش "زۆرەت"ی خۆمان پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە].

بەم جۆرە دەردەکەوێ کە پێوەندییەک هەیە لەتێوان چەمکەکانی "دانە"، "دانەدانە بوون"، "زبر" و "گڕوێ"دا. بە لەبەرچاو گرتنی وەها پێوەندییەک دەشێ کە لە ماناکانی "خوراندن، کراندن"، "گڕۆیی" و "زوور"ەوە مانای "دانەدانە" بوون و هەروەها "دان، دەنک" پەیدا بووبن و وشەی "کونجی"یش بەم شێوەیە مانای "دان، دانە"ی وەرگرتبێ.

**کونجڕ kuncır** [ *kunjır* ] - "زبری تیژ": خزمە دەگەڵ ↑کونجاندن kuncandın.

**کونجڕک kuncırk** [ *kunjırk* ] - "قورینج، قورنج": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑کونجاندن kuncandın.

2- kneifen (G.) "قورنجاندن" و kneipen (G.) "ئاوقاندن، دەگیر خستن، ڕێککگوشین" و gnybti (Lit.) "قورنجاندن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قنب qınıb "گوشینگەی ترێ".

**کونجڕە kuncıre** [ *kunjıra* ] - "پێکوڵ، دڕکی سێ سووچ": خزمە دەگەڵ ↑کونجاندن kuncandın.

**کونجی kuncî** [ *kunjī* ] - "دانەوێڵەیەکی ورد": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کونجاندن kuncandın.

**کونچک 1 kunçık** [ *kunčık* ] - "باڵاپۆشی دەروێشان": بڕوانە ↑کنج kınc.

**کونچک 2 kunçık** [ *kunčık* ] - "کونی وردیلەی پێست": ↑کون kun دە دۆخی گچکاندندا.

**کوند kund** - "کلک قوڵە": هەروەها کوندەفسک kundefısk واتا مرۆڤی زۆر کورتەباڵا. خزمە دەگەڵ ژمارەوشەیەک کە ئاماژە بە هەڵتۆقاویی، زەقایی و خڕاییەکی بچووک دەکەن، وەک ↑قنج qınc، ↑خونچە xunçe، ↑قنچکەسڵاو qınçkesılaw "باپشکێو"، ↑قوندک qundık "کوولەکە"، ↑قۆندەرە qondere "پێڵاوی پاشنەدار" [دە بنەرەتدا: پێڵاوی قۆن دار یاخود قوون دار! دیارە

قۆن یان قوون دە بنەڕەتدا مانای خڕەکەیی، هەڵتەقاوی و دەرپەڕیوی دەدا]. زمانی فارسیدا کندە (ی درەخت) (P.) konde (ye deraxt) بە مانای "بنەدار، کۆلکەدار" بەکار دێ و هەروەها کند (P.) kond بە مانای "کول، تیژایی لە دەست داو" [دە بنەڕەتدا خڕ بووەوە] بەکار دێ. وشەی کوند kund بە مانای "بووم" [کوندەبەبۆ kundebebo] پێوەندی بەم وشەیە هەیە، چونکوو ئەسڵی وشەکە، واتا ناوی پەڵەوەرەکە ↑بەبۆ bebo یە و وشەی "کوند" وەک ئاوەڵناوێک پێوەی لکێندراوە، بەهۆی ئەوەی کە پەڵەوەرەکە ئاژەڵێکی قووڵەبنەی خڕینەیە، بەوتەیکی دیکە "کوندەبەبو" واتا "بەبۆ"ی قوڵەبنە.

**کوندە kunde** [ *kunda* ] - "دەفری زەلامی چەرمین بۆ ئاوکێشان": هەروەها ↑کوندەز kundez هەیە بە مانای "ئەسکوێ، کەوچکی زل" و ↑جەوەندە cewende "توورەکەی ئاو لە چەرم". ئەم وشەی دوایی و "کوندە" دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون، واتا وشەکە "کەوەندە kewende" بووە و ئەم دوو شێوەیەی لێ دروست بووە. خزمە دەگەڵ ↑جەواڵ cewal و دواتر ↑کون *kun*.

**کوند(ە بەبۆ) kund(ebebo)** [ *kund(ababo)* ] - "ناوی پەڵەوەرێک": لە دوو کەرتی کوند + بەبۆ kund + bebo پێک هاتووە و دە بنچینەدا وشەی "کوند" وەک ئاوەڵناوێک بەکارهاتووە و دواتر بە تەنیاش خۆی مانای وشەکەی، واتا مانای ناوی پەڵەوەرەکەی وەرگرتووە. بڕوانە هەردوو وشەی ↑کوند kund و ↑بەبۆ bebo.

**کوندەجەرگ kundecerg** [ *kundajarg* ] - کوندەجەرگ کردن واتا جارز کردنی و پاڵەپەستۆ کردنی لەرادەبەدەر. دە بنەڕەتدا دەبێ کونەجەرگ kunecerg بێ و جەرگ کون کردن وەک کینایە بەکارهاتبێ.

**کوندەفسک kundefısk** [ *kundafısk* ] - "کورتەباڵا، خڕیلە": کوندە kund(e) + فسک fısk. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑کوند kund "کلک قوڵە" [دە بنەڕەتدا: خڕەکە، کورتەبنە]. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑پز *pız*، ↑پس pıs و ↑بێچوو beçu، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چکۆڵە".

**کونگی kungî** [ *kungī* ] - "چارداخ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Scheune (G.) "دیوەلکە، ئەنبار"، scugina (OG.) "سەرپەنا، کۆختە، دیوەلکە"، skunati (OIn.) "دادەپۆشێ"، سەر بە ریشەی < ***(s)keu*** (***IE.***) "داپۆشین، داپێچان، حەشاردان".

**کونۆش kunoş** [ *kunoš* ] - "خەسیس، دەستقووچاو": بڕوانە ↑کنۆس kınos.

**کونۆشە kunoşe** [ *kunoša* ] - "گەسک، گیزک": بڕوانە ↑کنۆس kınos.

**کوتیس kunes** [ *kunes* ] - "پاڵ، دەڵەک": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە دەچنەوە سەر ریشەی ***gen-**** (***IE.***) "تۆپەڵە بوون، رێکگوشران، وێکهاتن". وەک دەبینرێ وشەی هەڵگری چەمکی گوشین، رێکگوشینە، واتا لە مانای "فشار"ەوە مانای "پاڵ" سەری هەڵداوە. ژمارەیەکی بەرچاوی وشەی کوردمادی دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑گنج gınc [دەبنەڕەتدا: رێکگوشراو]، ↑خونچە xunçe، *قوتیر quner* "کوان، دومەڵ" و هتد.

**کوە kuh** - " کول، ناتیژ": لەژێر وشەی ↑کول kul "ناتیژ" و ↑کۆڵ2 *kol 2* "کورت و ناتیژ" بوونی پەنجە بە هۆی لە دەست دانی قامکەکان، روون کراوەتەوە کە ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***geu-**** (***IE.***) "چەمان، خوار بوون، خڕ بوون". کوە kuh یش دەشێ پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ و خزم یان شێوەیەکی دیکە لە "کول" بێ.

**کوێ kuwe** [ *kuwe* ] - "چ جێیەک": خزمە دەگەڵ کوا kuwa، کوو ku و ↑کێ *ke* و هتد.

**کوێت kuwet** [ *kuwet* ] - "سووری ئاماڵ رەش" [بۆ ئەسپ بەکار دەهێنرێ]. کمیت komeyt (P.). خزمە دەگەڵ ↑ ئەو وشانەی لەژێر ↑شێو şêw دا باس کراون، بە مانای "تاریک". دە زمانی

ئەڵمانیدا Schimmel ‎(G.)‎ بە مانای "ئەسپی سپی" بەکار دێ کە دەبێتە خزم دەگەڵ وشە کوردمادییەکە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑شێ şê "رەنگی ئەسپ" [ئەسپەشێ]. ئەوە کە چۆن لە ریشەیەکەوە هەم وشە بە مانای مانای "سپی" و هەمیش بە مانای "تاریک"ی پەیدا بوون، دەگەڕێتەوە سەر مانای دوولایەنی ریشەکە، واتا ریشەی **<** ***skāi-** ‎(IE.)‎ "درەوشانەوە(ی مات)، لە بن شتێکەوە درەوشان و خۆ بە دیار خستن". وەک دەبینرێ مانای ریشەکە هەم "مات و *تەڵخ*" بوون [*تاریک* بوون] و هەمیش "درەوشانەوە" لە خۆ دەگرێ.

**کوێخا kuwexa** [ *kuwexa* ] - "بەڕێوەبەری گوند، بەردەستی ئاغا": کەدخدا kadxodā ‎(P.)‎. دە زمانی کوردمادیدا هەر دوو فۆتیمی d سواونەوە. وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی ↑کەد ked + ↑خودا xuda، کەرتی یەکەم واتا "ماڵ" و کەرتی دووەمیش واتا "خاوەن" و تێکڕای وشەکە دەبێتە "خاوەن ماڵ".

**کوێر kuwer** [ *kuwer* ] - "نابینا": کۆر kor یش دەگوترێ. کور kūr ‎(P.)‎. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ob-scurus "تاریک، نادیار" و skur ‎(Norw.)‎ "سەرپەنا، پەناگا". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی **<** ***(s)keu** ‎(IE.)‎ "داپۆشین، تێوە پێچان". بەراوردی وشەی ↑ژوور ²jur "هۆدە" بکە دەگەڵ وشە نۆروێژییەکە. هەروەها ↑کۆپک kopık "پێلووی چاو" دەشێ پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

**کوێن kuwen** [ *kuwen* ] - "پارچەی رەشماڵ، رەشماڵ": ↑کۆن kon یش دەگوترێ.

**کوو ku** [ *kū* ] - "1- کوێ 2-چۆن": خزمە دەگەڵ ↑کێ *ke* و↑ چ çı [چی].

**کووپە kupe** [ *kūpa* ] - "جۆرێک دەفری گڵین": کوپە kūpe ‎(P.)‎. Kufe ‎(G.)‎ "کووپە" و cup ‎(E.)‎ "جام، دەفر". وشەژێرمەنییەکان دەبردرێنەوە سەر cupa ‎(L.)‎ "کووپە". خزمە دەگەڵ ↑قوب qub، ↑قوببە qubbe، ↑قۆپچە qopçe،↑گێپە gîpe و ↑کیفۆک kîfok و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەی **<** ***kubh-** ‎(IE.)‎ "چەمانەوە، خڕ بوونەوە".

**کووتاڵ kutal** [ *kūtāl* ] - "قوماش، پارچە": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کوودەری kuderî.

**کووتە(لە) kutel(e)** [ *kūtal(a)* ] - "توتکەسەگ": هەروەها کووتی kutî هەیە بە مانای "سەگ". کوچۆ kuço و کوتکوت kutkut یش هەن وەک وشەی بانگ کردنی سەگ.

1- یان خزمە دەگەڵ ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

2- یانیش دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کووچک kûçık "سەگ".

**کووتێک kutek** [ *kūtek* ] - "بەرووڵەی تازە" [خەیاری ساوا]: خزمە دەگەڵ ↑کودیلە kudıle.

**کووچک kûçık** [ *kučık* ] - "سەگ": *kauti-* > ‎(OIra.)‎، خزمە دەگەڵ Hund ‎(G.)‎، hound ‎(E.)‎ و ‎(OF.)‎، canis ‎(L.)‎، kyon ‎(Gr.)‎، cu ‎(OIr.)‎ "کوچک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **<** ***kuo(n)** ‎(IE.)‎ "سەگ".

**کوود kud** [ *kūd* ] - "ئەو پەینەی بۆ بە پێز کردنی زەوی دەکاری دەکەن": کوت kut یش دەگوترێ. کود kūd ‎(P.)‎. خزمە دەگەڵ Kot ‎(G.)‎، kwad ‎(OF.)‎، cwead ‎(OE.)‎ "کوود"، ku ‎(Arm.)‎ "پەین"، govno ‎(Rus.)‎، gutha ‎(OIn.)‎ "گوو، پیسایی"، سەر بە ریشەی **<** ***goudh-** ‎(IE.)‎ "گوو، کوود". خزمە دەگەڵ ↑گوو gu.

**کوودەڵە kudele** [ *kūdala* ] - "بێچووەورچ": بڕوانە↑کودک *kudık* و ↑گەدەک gedek "بەچکەگامێش".

**کووچ kuç** [ *kūč* ] - "1- کەسێک ئەنگوستی لە پێنج کەمترە 2- کۆڵە، بێ شاخ": خزمە دەگەڵ ↑کەت ket "بڕاو، *قەتینراو*".

کووچە **kuçe** *[ kūča ]* - "شەقامی تەنگ": کوچە kūče (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Gasse (G.)، gatwo (Gt.)، gata (Sw.)، gate (E.) "شەقام، کووچە". وشە ئینگلیزییەکە پێشتر بە مانای "ڕۆیستن، گەڕان، سەفر کردن"یش بەکار هاتووە. ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە، ئەوەندە نەبێ کە دەشێ ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە وشەیەک بەمانای "ڕۆیشتن، هەنگاو نان". ئەم شیمانەیەی ئێتیمۆلۆگە ئەوروووپییەکان راستە و ئەم وشەیە کە مانای"ڕۆیشتن، هەنگاونان" دەدا، دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە و بریتییە لە ↑قەتان qetan "گوزەران، مەشین، بەرێوە چوون". لەوانەیە ↑کۆچ koç [کۆچان koçan] یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. وشەی ↑گوزەران guzeran و گدار godar (P.) "بوار" و هەروەها ↑کودان kudan "1- پێک هاتن، جێ بە جێ بوون 2- خایاندن، وەخت بردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

کووچەک **kuçek** *[ kūčak ]* - "سەگ": هەروەها ↑کووچک *kûçık* و ↑کسۆک kısok یش دەگوترێ.

کوودەری **kuderî** *[ kūdarī ]* - "کوتاڵیکە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە kodder (G.) "پەڕۆ، دەسرە". ئەم وشە ئەڵمانییە بە خزم دادەنرێ دەگەڵ Kotze (G.) "پەڕۆی خوری بۆ بە خۆدادان"، سەر بە ریشەی **< *gud-** *(IE.)* "پەڕۆی کوڵکدار". بەم پێیە دەشێ وشەی ↑کوتاڵ kutal "قوماش" لەم ریشەوە هاتبێ.

کوور **kur** *[ kūr ]* - شێوەی کۆنتری ↑قووڵ qul. هەروەها کووراندن kurandın هەیە بە مانای "قووڵ کردن".

کووڕ**1** **kur 1** *[ kūr ]* - "بزنی تیری دوو بەهار دیتوو": دەگەڵ وشەی ↑کاوڕ kawır "برخی لەدایک دابڕاو" دەبنە خزمی Haber (G.)، hafer (OE.)، hafr (OIs.)، caper (L.) "بزن". ریشەی ژێرمەنی وشە ژێرمەنییەکان دەبێتە **< *habra-** *(Grm.)* "بزن". خزمیشە دەگەڵ↑جۆ co [یان جەو cew، جەو دە بنەڕەتدا بە ناوی بزن کراوە و مەبەست "دەنکی بزن" بووە، واتا ئەو دەنکەی بزن پێی خۆشە]. هەروەها وشەی↑سابرێن sabren پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ریشەی هیندوئەورووپییە وشە ژێرمەنییەکە باس نەکراوە.

کووڕ**2** **kur 2** *[ kūr ]* - "خوار": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- schräg (G.)، curvus (L.) "خوار"، krikos (Gr.)، circus (L.) "جەغز"، Ring (G.)، (h)ring (OG.) "هاڵقە"، krug (Rus.) "جەغز، قەوان"، سەر بە ریشەی **< *(s)ker-** *(IE.)* "سووڕان، خوار بوون، با دران".

2- ↑خوار xuwar.

کووراندن **kurandın** *[ kūrāndın ]* - "قووڵ کردن، هەڵقەندن": ↑کوور kur "قووڵ".

کوورک **kurık** *[ kūrık ]* - "1- گیرفان، بەریک 2- مووشەدەمەی مسگەران": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کوور kur "قووڵ".

کووڕکووڕ **kurkur** *[ kūrkūr ]* - "قەلەموونە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کوڕکوڕە kurkure.

کوورە **kure** *[ kūra ]* - "سۆپە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *ker-** *(IE.)* "سووتان، هایسان". لەوانەیە ↑کڵ kıl پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

کووریانەوە **kuryan(ewe)** *[ kūryānawa ]* - "بەزەویدا درێژ بوونی سەوزە لە سەرمان":

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑کورژان kurjan "چرچ بوون"ەوە هەبێ.

2- له لایه‌کی دیکه‌وه ده‌توانێ خزم بێ ده‌گه‌ڵ ↑کووڕ kur "خوار" [خوار بوونه‌وه و به‌لادا هاتنی سه‌وزه له سه‌رمان].

**کووڕین kurîn** *[ kūrīn ]* - "قیژاندن": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑خوڕین xurîn [تیخوڕین].

**کووز1 kuz 1** *[ kūz ]* - "1- قاش 2- خه‌ت 3- ته‌خته‌ی باریک بۆ شۆ کردنی زه‌وی": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑قاش qaş و ↑کوت kut و ژماره‌یه‌ک وشه‌ی دیکه ده بنه‌ڕه‌تدا به مانای "بڕین".

**کووز2 kuz 2** *[ kūz ]* - "1- کووڕ، پشت چه‌ماو 2- به ده‌ور ده‌ست گرتن له هه‌ڵپه‌ڕکێدا 3- زۆپی تیوان تیخی شیر و خه‌نجه‌ر": به هه‌موو ماناکانییه‌وه ده‌چێته‌وه سه‌ر ریشه‌یه‌ک به مانای "چه‌مان، خواربوون (ه‌وه)" و ده‌بێته خزم ده‌گه‌ڵ ژماره‌یه‌کی زۆر وشه وه‌ک ↑قۆز qoz، ↑گه‌وز gewz، ↑گێژ gej، ↑کاس kas و↑کۆس kos(p) "زه‌قایی زه‌وی" و هتد.

**کووزوو kuzu** *[ kūzū ]* - "فیزماڵک دان، بۆی ده‌رچوون": له‌وانه‌یه پێوه‌ندی هه‌بێ به ↑خوشین xuşîn.

**کووزه kuze** *[ kūza ]* - "جانه‌ورێکه پێستی به‌نرخه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑خه‌ز xez.

**کووزه‌ڵه kuzele** *[ kūzala ]* - "ته‌ڕه‌تیزه‌ی ناو ئاو": کێزه‌که kezeke ش ده‌گوترێ. ده‌شێ خزم بێ ده‌گه‌ڵ ↑گژ[1] gıj [گژ و گیا] و له‌وانه‌شه کێزی kezî [↑گه‌سک gesık].

**کووژانه‌وه kujan(ewe)** *[ kūžān(awa) ]* - "1- نه‌مان 2- پاک بوونه‌وه 3- دامرکان": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑کوشتن kûştın "له‌ناو بردن".

**کووژه‌که kujeke** *[ kužaka ]* - "مووروویی شین": خزمه ده‌گه‌ڵ↑ قاژ qaj "نقێم" و چه‌ند وشه‌یه‌کی وه‌ک↑ قۆز qoz، ↑قوت qut، ↑قووچ quç و هیتر که ئاماژه به هه‌ڵتۆقین و زه‌ق و قوت بوون ده‌که‌ن.

**کووله‌که kuleke** *[ kūlaka ]* - "جۆرێک له سه‌وزه": بنه‌وشه‌ی کوول -kul خزمه ده‌گه‌ڵ ↑کۆڵ kol که ئاماژه به "قووڵه‌خره بوون، سه‌رخڕ بوون" ده‌کا.

[تێبینی: ده وشه‌کانی "قوندک" و " کوندر" که دوو ناوی دیکه بۆ ئه‌م به‌رهه‌مه‌ن، هه‌مدیسان چه‌مکی "قووڵه‌خڕه" یاخود "قوته‌که" بوون له‌به‌ر چاو گیراوه].

**کووکله kukle** *[ kūkla ]* - "بووکه‌ڵه، بووکه‌شووشه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑چکۆڵه çıkole.

[تێبینی: سه‌بارەت به پێوه‌ندی دوو چه‌مکی "چکۆڵه" و "بووکه‌ڵه" جێی ئاماژه‌یه که وشه‌ی "بووک(ه‌ڵه)" چ پێوه‌ندییه‌کی ده‌گه‌ڵ "بووک" و زاوا نییه، به‌ڵکوو خزمه ده‌گه‌ڵ "به‌به" [یان بیبی] به مانای "زارۆکی ساوا"].

**کووکه kuke** *[ kūka ]* - "قووقووی که‌ڵه‌شێر": چه‌ند وشه‌یه‌کی دیکه‌ش هه‌ر له‌م چوارچێوه‌یه‌دا جێی لێکدانه‌وه‌ن که بریتین له ده‌گه‌ڵ ↑کووک kuk "که‌ڵه‌شێر"، ↑قووقاندن quqandın "خوێندنی که‌ڵه‌باب" و ↑کووکوو kuku "کۆتره باریکه، خوێندنی کۆتره باریکه، خوێندنی کونده‌بوو"، ↑کۆکه‌ل kokel "په‌پووسلێمانه"، ↑کۆکی kokî "مه‌لێکی بچووکی چۆله‌که‌ئاسا"، ↑کۆکنایش koknayış "ئاوازی خۆشی مه‌لان" و هتد. به‌راوردی ئه‌م وشانه بکه ده‌گه‌ڵ ↑*قاقا* *qaqa* [قاقای پێکه‌نین].

**کووکی kukî** *[ kūkī ]* - "خواردنێکه به هێلکه و ئارد و سه‌وزی ساز ده‌کرێ": کوکو kūkū (P.)، خزمه ده‌گه‌ڵ kochen (G.)، kochon (OG.)، koken (Nl.) "چێشت لێنان". ئه‌م وشه ژێرمه‌نییانه ده‌برد‌رێنه‌وه سه‌ر coquere (L.) "کوڵین، پێگه‌یشتن". ده زمانی کوردمادیدا ده‌بێته‌خزم ده‌گه‌ڵ ↑کۆخ kox "هڵوو". کۆخ ده بنه‌ڕه‌تدا واتا "میوه‌ی پێگه‌یشتوو".

کوولی **kulî** [ *kulī* ] - "1-کۆڵهەڵگر، حەماڵ 2- چۆلپەرەست، دۆم": دەچێتەوە سەر ↑کۆڵ kol 1 "شان و پشت، شان و مل". مانای دووەمی وشەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤی چۆلپەرەست یان دۆم "ماڵەکەی" بریتییە لە چەند شتێک کە بە کۆڵ هەڵی دەگرێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "خانەبدوش" دە زمانی فارسیدا.

کووم **kum** [ *kūm* ] - "1- کڵاو 2- پۆپەی کەڵەشێر": کومک kumık یش دەگوترێ. [کوومرەش واتا کڵاورەش، بریتییە لە عەجەم، کوومسوور واتا کڵاوسوور، بریتییە لە تورکی عوسمانی، قزڵباشی ئێرانی". هەروەها کومێ تللی kum ê tıllî هەیە بە مانای "سەری قامک". چەند وشەی دیکەش لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن، وەک ↑کومبرەک kumbırek "1- دوندی چیا 2- سەرلق، چڵەپۆپە"، ↑کومبەلۆک kumbelok "کارکێ"، ↑کومچا kumça "دوگمە". ئەم وشانە دەبێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی **< *gombho-* ( IE.)** "ددان". پێوەندی "ددان" و "*دوند*" و "دوندووک" [دەندووک] بە یەکەوە ئاشکرایە. هەر وەک چۆن ئەم وشانە پێکەوە خزمن، هەر بەم شێوەش لە ریشەی *gombho- ** ( IE.) "ددان" چەند وشەیەک بە مانای "دوند، نووک، زەقایی، تیژایی" سەریان هەڵداوە. ئەم دیاردەیە دە زمانی ئەڵمانیشدا بەرچاو دەکەوێ. دە زمانی ئەڵمانیدا Kamm (G.) کە لەم ریشەیە وەرگیراوە، بە شێوەی سەرەکی مانای "شانە" (ی موو داهێنان) دەبەخشێ. بەڵام هاوکات ئەم مانایانەی خوارەوەش دەبەخشێ: تیغەرەی شاخ، تیغەشانی کێو (Bergkamm)، کڵاوەکەفی سەر شەپۆل (Schaumkrone der Welle)، خاری سەر ئێسک، زەقایی و هەڵتۆقاویی سەر ئێسک"، "ئەو لاسکە بچووکەی دەنکەترێ بە هێشووەکەوە دەبەستێتەوە"، "لای سەرەوەی ملی ئەسپ" و هتد. gómphos (Gr.) "ددان، سینگ (مێخ)، نینۆک" پێوەندی بەم ریشەی سەرەوە هەیە. هەروەها دە زمانی عەرەبیدا قمة qimme (Arb) "دوند، لوتکە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دەشێ لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

کوویشک **kûyşk** [ *kūyšk* ] - "1- شەی پۆکوتان، کەرکیت 2- دەڵەک، پاڵ": هەروەها کوویک kuyk هەیە بە مانای "دارکوتکە". لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ریشەی ***kāu-** ( IE.) "لێدان، کوتان". ئەگەر ئەمە راست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ هاونگ hawıng. مانای "پاڵ" یان "فشار" دەتوانێ لە مانای "لێدان، زەبر"ەوە پەیدا بووبێ.

کوویک **kuyk** [ *kūyk* ] - "دارکوتکە": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کوویشک kûyşk.

کۆ¹ **ko** - "خڕ، تێکڕا، پێکەوە، چەندانە": کورتکراوی ↑کۆم kom [کۆم بوون، کۆ بوونەوە].

کۆ² **ko** - دەگەڵ "کوڵ" دێ [کوڵ و کۆ kul u ko واتا خەم و خەفەت]. کورتکراوی ↑کۆڤان kovan "خەم و خەفەت].

کۆ3 **ko** - "سڵی، رەوەکی": [ئەم ئەسپە کۆ دەکا]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *(s)kēu-*** **( IE.)** "دەرپەڕاندن، بە زۆر ناردنە پێش، رە پاڵ نان، راو نان، پەلە کردن". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زەق zeq دا هاتوون.

کۆباندن **kobandın** [ *kobāndın* ] - "دروونەوەی دەوری جلک": بڕوانە↑کۆبە kobe "قەراخی دادرواو، پەراوێزی جل و بەرگ".

کۆبە **kobe** [ *koba* ] - "قەراخی دادرواو، پەراوێزی جلوبەرگ": کەف kef یش دەگوترێ. هەروەها ↑کەفی kefî بە مانای" قەراخ، لێوار" و ↑کۆباندن kobandın بە مانای "دروونەوەی دەوری جلک" بەکار دێ. ئەم وشانە دەکرێ دەشێ خزم بن دەگەڵ Saum (G.)، zoom (Nl.)، seam (E.)، söm (Sw.) "قەراخ، پەراوێز"، سەر بە ریشەیەک بە مانای"بەستن، دروون". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سوژن sujın.

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆنۆلۆژییەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی کەف kef (کەفی سابوون) و Schaum دە زمانی ئەڵمانیدا].

**کۆپ kop** - "دوندی چیا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑قوب qub، ↑قوببە qubbe و چەندین وشە کە لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستووریی" [کۆپەرە kopere]دا باس کراون.

2- ↑قاف qaf "کەللە، کەللەسەر".

**کۆپا kopa** [ *kopā* ] - کۆپابەخت kopabext واتا "ئەوپەڕی بەختەوەری":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑کۆپ kop "دوندی چیا". لەم روانگەوە مانای وشەکە دەبێتە "بەختی بەرز وەك دوندی چیا".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قۆپی qopî بە مانای "بێشەڵان" [دە بنەڕەتدا: زۆر و زەوەند]. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "خاوەنی بەختی زۆر و زەوند".

**کۆپارە kopare** [ *kopāra* ] - "زۆپایی ملی گا و پشتی وشتر": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستووریی" [کۆپەرە kopere]دا باس کراون.

**کۆپاڵ kopal** [ *kopāl* ] - "تێڵای سەرئەستوور، چوماق": ↑گۆپاڵ gopal یش دەگوترێ. کوپاڵ kūpāl (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستووریی" [کۆپەرە kopere]دا باس کراون.

**کۆپانە kopane** [ *kopāna* ] - "1- کۆپارە، زەقایی ملی گا و پشتی وشتر 2- تیسکەخوری سەر پشتی ئاژەڵ کە نایبڕنەوە": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستووریی" [کۆپەرە kopere ]دا باس کراون.

**کۆپك kopık** - "پێلووی چاو": خزمە دەگەڵ ↑کەف kef و چەندین وشەی دیکە کە چەمکی "داپۆشین" لەخۆ دەگرن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(IE.) *(s)keu-*** "داپۆشین، تێوەپێچان". هەروەها بڕوانە ↑کوێر kuwer "نابینا".

**کۆپلە kople** [ *kopla* ] - "چەند دێڕەهەڵبەست بە سەر یەکەوە، تێکخراوە": < *(OF.) couple* "بەند، پەت" < cōpulāre (L.) "لێکبەستن". لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "بەند" یان "بەستە" بە مانای "گۆرانی"[ دا بەندێکی تێ هەڵکە!].

**کۆپە kope** [ *kopa* ] - "لادێیی، ناشارستانی": [سەرەتا تێبینییەك: تا ئەو جێیەی لە یادم بێ لە شاری مەهاباد وشەی "کۆپە" بەم مانایەی سەرەوە، وشەیەکی باو بوو کە زۆرتر وەك تانە وتەشەر و گاڵتە پێکردن بەکار دەهات. هەروەها گەرەکێکیش هەبوو لە قەراخ شار کە پێیان دەگوت "کۆپیناوا" [ئەوکات قەراخ شار]. زۆرینەی دانیشتووانی ئەم گەڕەکە، فەقیر و هەژاری لادێیی بوون کە روویان کردبووە شار و لەو گەڕەکە گیرسابوونەوە. دیارە دەبێ ناوی ئەو گەڕەکە بە ناوی دانیشتووانەکەی کرابێ کە زۆرتر لادێی یان بە وتەی مەهابادییەکانی ئەو سەردەم "کۆپە" بوون. وشەی کۆپیناوا دەبێ دە بنەڕەتدا لە سێ کەرتی کۆپە kope و ناوگری n و پاشگری ئاوا awa [ئاوایی] پێك هاتبێ. وەك گەلێك وشەی دیکە دەشێ وشەی "کۆپە"ش سەرەتا بە مانایەکی نۆیتراڵ و بەگشتی بە مانای "لادێیی" بەکار هاتبێ و مەبەستێکی ناحەزی لەپشتەوە نەبووبێ. بەڵام پاشان ماناکە شێوەیەکی نێگاتیڤی وەرگرتووە و بووەتە مایەی تانە و تەشەر لێدان یاخود گاڵتەکردن، چونکوو ئەو خەڵکە لادییە شارەزاییان لە ژیانی شار کەمتر بووە، لە هەڵسوکەوتدا هێندێك جیاوازییان هەبووە کە بووەتە مایەی بەکەمزانینی ئەوان لە لایەن خەڵکی دانیشتووی شارەکەوە. ئەم کێشەیە دەتوانین دەگەڵ "کۆپە" و "کۆپیناوا" کانی

سەردەمی ئەمڕۆ لە ئەورووپا بەرهەڤ بکەین. ئێستا با بگەڕێینەوە سەر باسی وشەی "کۆپە"].
ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑خەبات *xebat* "کار و تیکوشان"، دەگەڵ -aps (.OIn) "کار، کردەوە (ی ئایینی)"، -apas (.OIn) "کار، کردەوە"، opus (.L) " کار" و operari (.L) "کار کردن، خەریک بوون"، üben (.G) "تەمرین کردن"، uoben (.OG) "کێڵان، کار کردن، جێبەجێ کردن"، efnan (.OE) و efna (.OIs) "جێبەجێ کردن"، uobo (.OG) "وەرزێر، پاڵە" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ "کۆپە"]، uop (.MG) "کشتو کاڵ، دابونەریت". ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی ***op-* <** ***(.IE)*** "جێبەجێ کردن، کار کردن" [بە تایبەتی کاری کشتو کاڵ و ئەرکی ئایینی]. بەگوێرەی ئەم وشانە بۆمان دەردەکەوێ کە "کۆپە" دە بنەڕەتدا مانای "وەرزێر، پاڵە"ی هەبووە و لەوێوە مانای "لادێیی" پەیدا بووە و دواجاریش مانای "ناشارستانی".
**کۆپەرە kopere** *[ kopara ]* - "ئەستوورایی، قوتر": شێوەیەکی دیکە لە ↑گێپەڕە gepere یان گوێپەڕە guwepere. [گوێپەڕەی مل واتا ئەستوورایی مل].
**کۆپیتە kopîte** *[ kopīta ]* - "پۆپە، چلەپۆپە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆپ kop "دوندی چیا".
**کۆپین kopîn** *[ kopīn ]* - "ئارام بوون": خزمە دەگەڵ ↑کپ kıp [کڕ و کپ] و ↑گوڤین *guvîn* "مەیین، توند بوون(ی شیر، بوونە ماست یان پەنیر)".
**کۆت1 kot** - "زنجیر، بەند": پێوەندی هەیە دەگەڵ catena (.L) "زنجیر". Kette (.G) "زنجیر" لەم وشە لاتینییە وەرگیراوە. ئەم وشانە لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑کۆت[4] kot "چەپەر".
**کۆت2 kot** - "هاواڵی شەڵوار": وەرگیراوە لە *coote (.F) < coota (.L)* "جلکی سەرەوە". وشەی ↑قات[5] qat "کوت و شەڵوار" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.
**کۆت3 kot** - دەگەڵ "کا" دێ [کا و کۆت ka u kot]. دەچێتەوە سەر ↑کوتان kutan.
**کۆت[4] kot** - "چەپەر، دەرگای لە شووڵ چندراو": خزمە دەگەڵ Gitter (.G) "پەرژین، چەپەر، تیکبەست، قەفەس، تەلبەند"، Gatter (.G) "چەپەر"، gataro (.OG) "دەرگای لەچەپەردروستکراو". هەروەها ↑کۆتاک kotak بە مانای "پەچەمەڕ" و ↑کۆتان kotan بە مانای "زنج، حەوشی لە چەپەر و قامیش بۆ ماڵات". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑خات xat، ↑خاس xas، ↑خزم xızım و هیتر سەر بە ریشەیەک بە مانای "جووت بوون، جۆش خواردن، یەکانگیر بوون، تیکبەزین، دەگەڵ یەک گونجان".
**کۆت[5] kot** - "گۆرانی بەسۆزە": [کۆت کرن واتا بە سۆزە گۆرانی گوتن]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گوتن gutın.
**کۆتا kota** *[ kotā ]* - "کورت، قوڵە": کوتاه kūtāh (.P) "کورت، قوڵە" [دە بنەڕەتدا: بڕدراو، بڕدراوە]. خزمە دەگەڵ ↑*کۆتایی kotayî* "دووماهی، بڕانەوە".
**کۆتار kotar** *[ kotār ]* - "قوتر(ی دار)": کۆتەرە kotere ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*قەد qed* و چەند وشەیەکی دیکەی وەک ↑قات qat و ↑قاس qas. قەد دە بنەرەتدا بە مانای "بڵیندی و بەرزی" بووە [قەد و باڵا] و دواتر وێڕای پاراستنی مانا بنەڕەتییەکەی مانای "ئەستوورایی و قەبەیی" و سەرەنجام مانای "ئەندازە"شی وەرگرتووە. وشەی قطر qutr (.Arb) دە زمانی عەرەبیدا لە کۆتار kotar یان کۆتەرkoter ی کوردمادی وەرگیراوە. پاشگری -ar / -er پاشگرێکی رەسەن و چاڵاکی ناوسازییە لە زمانی کوردمادی و فارسیدا وەک لەم وشانەدا: کەنار، زنار، دانار، شەقار، کۆتەرە، کۆپەرە، دەستەرە و بە دەیانی دیکە.
**کۆتاک kotak** *[ kotāk ]* - "پەچەمەڕ، جێ خەوی مێگەل لەدەر و دەشت": دەچێتەوە سەر ↑کۆت[4] kot "چەپەر".

**کۆتاڵە kotale** *[ kotāla ]* - "چڵەنۆک، قەدکۆتا": کوتولە kūtūle (P.). خزمە دەگەڵ ↑کۆتا kota "کورت، قوڵە" و ↑کۆتایی *kotayî* "دووماییی".

**کۆتان kotan** *[ kotān ]* - "1- زنج، حەوشی لە چەپەر بۆ ماڵات 2- جێ پووش و پاری پاوان": ↑کۆت[4] kot "چەپەر". مەبەست لە "کۆتان" ئەو شوێنەیە کە بە کۆت واتا چەپەر دەوری گیراوە.

**کۆتایی kotayî** *[ kotāyī ]* - "دوایی، پایان": خزمە دەگەڵ ↑کەت ket، ↑کوت kut، ↑قەتاندن qetandın "بڕینەوە" و چەندین وشەی دیکەی سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "بڕین". چەمکی "کۆتایی" دە بنچینەدا واتا "بڕانەوە". دە زمانی کوردمادیدا وشەی بڕانەوەش بە مانای "کۆتایی" بەکار دێ، بۆ وێنە دەگوترێ شەڕ بڕایەوە، لێی ببڕەوە، ببڕای ببڕای واتا "هەرگیز" [دە بنچینەدا بێ بڕا(نەوە)].

**کۆتر kotır** - "پەڵەوەرێکی کەوەرەنگە": کبوتر kabūtar (P.) و کۆنتر کفترkaftar (P.). دە زمانی کوردمادیدا کابووک kabuk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەوkew و ↑کەوە kewe "ڕەنگی ئاماڵ شین". کەو و کوتر بە ناوی ڕەنگەکەیانەوە ناو نراون.

**کۆترە kotre** *[ kotra ]* - "داری تیوان ئەستووندەک و داری سەربان": هەروەها ↑کەتیر ketîr هەیە بە مانای "داری بن شەغرە کە دەکەوێتە سەر پشتی بارەبەر". جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ئەم وشانەوەی خوارەوە:

1- ↑کۆت[4] kot "چەپەر، تیکبەست".

2- ↑کۆتە1 kote "قەدی دار".

**کۆتکە kotk(e)** *[ kotk(a) ]* - "کاسەی دارینی زل، ربە": ↑کۆد kod یش دەگوترێ.

**کۆتمە kotme** *[ kotma ]* - "داری گەورە بۆ سووتاندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆتە1 kote.

**کۆتە1 kote 1** *[ kota ]* - "1- قەدی دار 2- دارێک کە قەساب گۆشتی لەسەر لەت دەکا": چەند وشەی دیکە لەم پێوەندییەدا سەرنج ڕادەکێشن، وەک کەد[3] ked "پارچەدار"، کۆتمە kotme "داری گەورە بۆ سووتاندن"، ↑کیتە kete "تیڵا، قایمەمێو"، ↑گیتە gîte "ئاڵوودار"، ↑کەتیر ketîr "داری بن شەغرە" و هتد. لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندیان هەبێ بە ڕیشەی **< - *ghazdh (IE.)** "دڕک و داڵ" و خزم بن دەگەڵ ↑گەز2 gez.

**کۆتە2 kote 2** *[ kota ]* - "گونج، گۆنجە، بەردی کون کە دە جێگەی ئاوبەردانی ئەستێرک دەگیرێ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گاود gawd "قووڵ" و دواتر ↑کون kun "هەڵکۆڵدراوی، هەڵکەندراوی".

**کۆتەر koter** *[ kotar ]* - "ملوانکە، گەردانە": خزمە دەگەڵ ↑کۆت kot "زنجیر، بەند" و ↑قەتار qetar "لێک بەستراو، زنجیرئاسا".

**کۆتەل kotel** *[ kotal ]* - "هەیکەل، پەیکەر": کتل kotal (P.). خزمە دەگەڵ ↑قەد qed "بەژن و بڵێندی". وشەی "قەد" زۆر جار هاوواتای ئەو وشانە دێ کە ئاماژە بە "بەژن، پەیکەر" دەکەن، وەک قەد و قەڵافەت، قەد و گیپاڵ، قەد و قەوارە و هتد. وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "باڵا ە بڵێندی" بەژن بووە و لەوێوە مانای"بەژن، پەیکەر"ی وەرگرتووە. گۆڕاتیکی لەم چەشنە سەبارەت بە وشەی "قەبارە، قەوارە"ش بەرچاو دەکەوێ.

**کۆتی kotî** *[ kotī ]* - "1- پیس، چڵکن 2- گولی 3- بێئاکار، بێفەڕ": خزمە دەگەڵ ↑کووت kut "پەین، پیسایی".

**کۆج koc** *[ koj ]* - "ئاڵقەی قفڵ پێداکردن بۆ داخستن": خزمە دەگەڵ ↑گاو gaw "ئاڵقە".

کۆچ **koç** *[ koč ]* - "ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوە": کوچ kūč (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ gachati (OIn.) "چوو، ڕۆیشت". دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑کووچە kuçe "شەقام، شوێنی پێداڕۆیشتن".

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گچکە gıçke و کوچک kūček (P.) و دواتر ↑کز kız، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کەم، بچووک (بوونەوە)". شتێک کە ڕێگە بەم شیمانەیە دەدا، بوونی پێوەندی لەتیوان چەمکەکانی "ڕۆیشتن"، "بزر بوون" لە لایەک و "بزر بوون، نەمان" و "کەم و بچووک بوونەوە" لە لایەکی دیکەوەیە. وشەی کوردمادی "بزر" خزمە دەگەڵ weg "ڕێگا" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا. دە زمانی کوردمادیشدا ئەم مانایە هەبووە [بازی بێریان ئەو ڕێگایە بووە کە بێرییەکان پێیدا ڕۆیشتوون]. هەروەها بزر بوون و لە ئارادا نەمان پێوەندییان بە چەمکی "کەم و بچووک بوونەوە" هەیە. بۆ وێنە وشەی "کووژانەوە" و "کوشتن" دەگەڵ "کز، گچکە" خزمن. هەروەها وشەی "ون، وندا" خزمە دەگەڵ vjanut' (Rus.) "سیس بوون، گەچڵان" [گەچڵان خزمە دەگەڵ گچکە]، schwinden ی ئەڵمانی و swintan ی ئەڵمانی کۆن بە مانای "لە کەمی دان، لە کزی دان، کات بەسەر چوون". پێوەندی نەمان، بزر بوون و لەناو چوون لەگەڵ چەمکی "کەم، کز، گچکە" لەوەدایە کە شتێک یان گیانلەبەرێک وردەوردە لە کەمی و کزی دەدا و دواجار نامێنێ، بزر دەبێ و تەواو دەبێ. ئەم پێوەندییە لە کاتی ڕۆیشتن و کۆچ کردنیشدا بە دی دەکرێ، چونکوو ئەو کەسەی دەڕوا و دوور دەبێتەوە، ئەگەر لە خاڵی ڕێکەوتنەوە سەیری بکەین، بە بەردەوام گچکەتر دەبێتەوە و دواجار ئاسەواری نامێنێ. سەبارەت بەم پێوەندییەی دوایی هەروەها بڕوانە بڕوانە وشەی *پنیۆز* "ڕۆیشتوو، بزر بوو".

**کۆچبەر koçber** *[ kočbar ]* - "ئاوارە، پەنابەر": پێک هاتووە لە دوو کەرتی ↑کۆچ koç + بەر ber. هەردوو کەرتی وشەکە یەک مانا دەبەخشن، واتا "تێپەڕین، ڕۆیشتن". کەرتی بەر -ber خزمە دەگەڵ ↑بووڕین burîn، ↑تێپەڕین teperîn و ↑بڕین² bırîn [ڕێگە بڕین].

[تێبینی: وەک لە چەند شوێنی دیکەشدا باس کراوە، هاتنی دوو کەرتەوشەی هاومانا دۆخی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشێ. چەند نموونەیەک لەم بارەوە بریتین لە بانگاشە [بانگ و قیژە] ، بانگەواز [بانگ + ئاواز]، بایەقووش، جەمبازە، پاکتاو، ڕەشتاڵە، تەپلۆس، خڕخاڵ، سامۆتک، تارمایی، گۆنگەشە (گەنگەشە)، قرتماغە و هتد].

**کۆچکە koçke** *[ kočka ]* - "کڵاوێکە بۆ زارۆک و بۆ ژنان": ئەم کڵاوە لە لای پشتەوە گۆشەیەکی دەرپەڕیوی هەیە و شێوەیەکی مەخرووتی پەیدا دەکا. خزم دەگەڵ ↑قووچ quç "بلیندی مەخرووتی"، ↑قۆچ qoç "شاخ". ئەم وشانە ئاماژە بە شتی بلیند و زەق و دەرپەڕیو دەکەن.

**کۆچڵە koçle** *[ kočla ]* - "شوێنی ئاو بەش کردن بۆ برنجەجاڕ": بنەوشەی کۆچ -koç پێوەندی هەیە بە ↑کووز kuz، ↑قاش qaş و ↑کوت kut و چەن وشەیەکی دیکە بە مانای "بڕین، لەت کردن، قەڵشاندن". لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ *شێلەگە* "جێگەی دادڕینی جۆگە" کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قەڵشاندن، بڕین"].

**کۆچەکی koçekî** *[ kočakī ]* - "هەڵپەڕینی زۆر توند و خێرا": هەروەها کۆچەک koçek هەیە بە مانای "شەکرۆکە، زارۆی سەماکەری قاوەخانە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قۆچاخ qoçax و ↑قوشقی quşqî.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی **< -ĝheis* (IE.)** "ورووژاو، قەڵس".

کۆخ **kox** - "هڵوو": ↑قۆخ qox یش دەگوترێ. دەشێ وەرگیرابێ لە praecox (L.) "قەیسی". وشە لاتینییەکە لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی یەکەم واتای "زوو، بەرێ" دەدا، کەرتی دووهەم مانای "پێگەیشتن" دەبەخشێ و تێکرای وشەکە واتا "زوو پێ دەگا".

کۆختە **kox(te)** *[ kox(ta) ]* - "خانووی چکۆڵەی هەژارانە": کۆخ kox یش دەگوترێ. کوخ kūx (P.)، جێ هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kote (G.)، cot (E.)، Kot (Nl.) "کۆختە". ئەم وشانە دەچنەوە سەرریشەی ***gēu-* < (IE.)** "چەمان، خوار بوون، خڕ بوون". لێرەدا وشەکە ئاماژە دەکاتە قووپاوی و هەڵقەندراوی زەوی. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کۆز1 koz.

کۆخین **koxîn** *[ koxīn ]* - "هەناسەبڕکە": ↑قۆزین qozîn و کۆکین kokîn ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ keuchen (G.) "تەنگەنەفەس بوون"، kuchen (Nl.)، cough (E.)، kika (Sw.) "کۆکین". بە گوێرەی ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان ریشەی وشەکان بۆ لاسا کردنەوەن دەنگێ دەگەڕێتەوە. سەرەڕای ئەم بۆچوونە لەوە دەچێ ئەم وشانە پێوەندی بە ↑قاقا qaqa «وە پەیدا بکەن [قاقای پێکەنین] و هەموویان بچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین".

کۆد **kod** - "کاسەی دارین": چەند وشەیەکی دیکەش پێوەندییاین هەیە بەم وشەیە، وەک ↑کۆتک kotık یان کوتیل kutîl "1- ربە 2- کەشکەژنۆ [کاسەی ئەژنۆ] 3- پیاڵە"، کۆتکە kotke "کاسەی دارینی فرەوان"، ↑کۆجەڵە kocele یان کۆجیلە kocîle "کاسەی دارینی چکۆڵە". جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑گاود gawd "کوور، قووڵ" و دواتر ↑کون *kun* [کون و کەلێن]. جێی بیر هێنانەوەیە کە چەندین وشە بە مانای "دەفر" پێوەندییان بە چەمکی "قووڵ بوون"ەوە هەیە.

2- ↑کاسە kasse و ↑گۆزە goze.

کۆدۆ **kodo** - "1-ناوی چیایەکە لە کوردستان 2- چاوچنۆک، چاونەزێر": هەروەها ↑کۆدە kode هەیە بە مانای "زەوی زۆر سەخت و جووت لێ نەکراو". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی ***staī-* < (IE.)** "رەق بوون، سەخت بوون بوون، توند بوون".هەروەها وشەی ↑چیا çîya [ **stîya* ] دەشێ پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ. هێندێک وشەی دیکەش لەم ریشەوە هاتوون، بۆ نموونە ↑ستەم sıtem.

[تێبینی 1: لەنێوان چەمکەکانی "سەختی" و "چاوچنوکی" و "قرنیسی"دا پێوەندی نیزیک هەیە. بۆ نموونە وشەی "رژد" هەم بۆ چیای سەخت و هەمیش بۆ مرۆڤی "چرووک، دەستقووچاو" بەکار دێ. تێبینی 2: دە وشەی "کۆدۆ"دا فۆنێمی s گۆڕاوە بۆ k. ئەم جۆرە گۆڕانە لە وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، بۆ وێنە کۆک kok بە مانای "بناخە، ریشە" خزمە دەگەڵ سۆکین sokîn بە هەمان مانا].

کۆدە **kode** *[ koda ]* - "زەوی زۆر سەخت و جووت لێ نەکراو": خزمە دەگەڵ ↑کۆدۆ kodo.

کۆڕ **kor** - "جێگەی کۆ بوونەوە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑گۆڕک gork "1- تەختایی مەجلیس" و ↑گۆڕ[3] gor "تەختایی". دیارە کۆبوونەوەکان دە سەرەمانی زوودا لەو شوێنانە کراوەن کە تەخت و پان و بەرین بوون. لەم تێڕوانینەوە "کۆڕ" دەتوانێ دە بنەڕەتدا مانایەکی وەک "مەیدان، دەشتایی"ی هەبووبێ.

2- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ chorós (Gr.). ئەم وشە یۆنانییە بە شوێنی سەما کردن و دەستەی سەماکەران گوتراوە کە بۆ خوداکان سەمایان کردووە و گۆرانییان خوێندووە. پاشان وشەکە لە رێگەی زمانی لاتینییەوە[chorus (L.)] هاتووەتە ناو زمانە ئەوروپییەکان و مانای

"گۆرانی بە کۆمەڵ و کۆمەڵی گۆرانی بێژان"ی وەرگرتووە. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -ĝher*) IE.)** "گرتن، دە خۆ گرتن".

3- لە لایەکی دیکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ khoros (.Gr) "شوێن، فەزا".

4- دەتوانێ پێوەندی بە ↑کۆرِ2 kor "چیای بڵیند" و ↑کورِ3 kur "بڵندایی سەر کێو" هەبێ، سەر بە ریشەی ***ghre- ,-gher*) IE.)** "تیژ بوون، زەق و دەرپەرِیو بوون". لەم تیروانینەوە دەشێ مانای وشەکە "دەك" یان "سەکۆ" بووبێ. ئەم وشانەی دواییش خزمن دەگەڵ "زەق".

**کۆرِ2 kor** - "چیای بڵیند": خزمە دەگەڵ ↑کورِ3 kur "بڵندایی سەر کێو"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "زەق، دەرپەرِیو".

**کۆران koran** *[ korān ]* - "دەنگی با لەکاتی تیپەرِ بوونی بە رێرەوێکدا": بروانە ↑کۆراندن korandın "حیلاندنی ئەسپ".

**کۆراندن korandn** *[ korāndın ]* - "حیلاندنی ئەسپ": هەروەها ↑کۆران koran [کووران kuran] هەیە بە مانای "دەنگی با لەکاتی تیپەرِ بوونی بە رێرەوێکدا". لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کڤر kıvır "پشیلەی تیر" و دەگەڵ hwelan (.OE) "مراندن، گوراندن" و hvellr (.OIs) "قیژاندن".

**کۆرپە korpe** *[ korpa ]* - "1- زارۆکی ساوا 2- داری هەڵپەرتیوراو": ئەم وشەیە دە بنچینەدا مانای "لەش، بەدەن، تەن" دەگەیەنێ و مەبەست ئاماژە کردن بە "لەش" (ی زارۆك) بووە. وشەکە خزمە دەگەڵ Körper (.G) "لەش" کە ئەویش خۆی دەبردرێتەوە سەر corpus (.L) "لەش، بەدەن، تەنە". دە زمانی پەهلەویدا karp (.Pl) هەر بەم مانایانە بەکار هاتووە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی کۆرپە مانای "داری هەڵپەرتیوراو"یش دەدا کە بە وتەیەکی دیکە دەبێتە "تەنەی دار"ەکە. وەك دەبینین لێرەشدا مانای "بەدەن، تەن" دەردەکەوێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشە ↑قالب qalıb بە مانای "تەن، لەش" بەکاردێ [قالبم دێشێ]. وشەی قالب qalib (.Arb) بە مانای "قاوغ، بەدەنە، رووالەت" دە زمانی عەرەبیدا دەچێتەوە سەر ئەم وشانەی سەرەوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی قالب هەم بە مانا کۆنەکەی خۆی، واتا بە مانای "لەش، تەن، بەدەن" بەکار دێ و هەم بە مانای "قاوغ، بەدەنە". ریشەی ئەم وشە لاتینییە باس نەکراوە. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ژمارەیەك وشە کە ئاماژە بە "برِین، لێ کردنەوە" دەکەن، وەك carpere (.L) "لێکردنەوە، داپچرِین"، karpos (.Gr) "بەر و بۆم" [دە بنەرِەتدا: لێکراوە، دارِنراو]، erp (.Rus)، kröpion (.Gr) "داس". وشەی قوربان qurban [پێشتر کارپان karpan ؟] و گۆری gorî "قوربانی، سەر براو" دەشێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ. لەم مانای "برِین"ەوە دەتوانرێ مانای "لەش، پەیکەر(ە)" سەرچاوە بگرێ کە لە رێگای برِین و داتاشینەوە دروست کراوە، هەر وەك چۆن وشەی "پەیکەر" دەبردرێتەوە سەر کرداری "کردن"، یان "ئەفراندن" دەچێتەوە سەر کرداری "برِین".

**کۆرت1 kort** - "کەرتی سەوزیکاری": جگەلەمە ↑کەرد(وو) kerd(u) هەیە بە مانای "تەختەزەوی چاندن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Garten (.G)، garden (.E) "باخچە" و هەروەها دەگەڵ ↑کورتان kurtan "پاڵان".

**کۆرت2 kort** - "1- قۆرت، قوڵکە 2- چاڵی چەنە [کۆرتازەنی]": خزمە دەگەڵ ↑*کاراك karak* و ↑کارێز karez. ئەم وشانە ئاماژە بە "هەڵکەندن" و "قووڵ کردن" دەکەن.

**کۆروە korwe** *[ korwa ]* - "جۆرە بەردێکی سپی": خزمە دەگەڵ ↑کۆرە kore "بەردی شینی ناسك".

**کۆرۆخ korox** - "مێشەکەرانە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کورکورە kurkure "ناوی باڵدارێک". لەم تێروانینە وشەکە ئاماژە بە "قیژەقیژ"، واتا وزەوزی مێشەکە دەکا.

[تێبینی: پاشگری ئۆخ ox-، هەر وەک پاشگرەکانی ئۆز oz- و ئۆک ok- دەناو ژمارەیەک وشەی کورمادیدا دەبینرێ].

**کۆرە kore** *[ kora ]* - "*بەردی* شینی ناسک کە بە دەست دەشکێ": ئەم وشانەی خوارەوەش لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەن: کۆروە korwe "جۆرە بەردێکی سپی"، ↑کورْە kurıh "چەقالە(بادام)". ئەم وشەی دوایی ↑کورەک kurek یش دەگوترێ. خزمن دەگەڵ ↑*خار xar* "سەخت". شیاوی باسە وشەی "چەقالە"ش خۆی دە بنەرەتدا مانای "سەخت، رەق" دەبەخشێ.

[لەنێوان چەمکەکانی "سەخت"، "بەرد" و "ناوکی رەقی میوە"دا پێوەندی نیزیک هەیە، بۆ وێنە ئەم وشانەی خوارەوە دەگەڵ یەکتر خزمن: *ئاستەم* "سەخت"، *هەست* "خەست، توند" و *هەستی* "1- ئێسک 2- ناوکی رەقی میوە" (ئێسکی میوە، رەقایی میوە)].

**کۆز1 koz 1** - "1- حەشارگەی کەو 2- تامانی جێگەی بەرخ و کاریلە": هەروەها ↑کۆزک kozık بە مانای "کولانەی مامر" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz "شکێر، شکەفت، دەوڵی تەنگ"، ↑کاژێرا1 kajer "1- قوژبن 2- تاقە لە دیواردا 3- ئۆدەی خەڵەوەت لە تەکیەدا" و ↑*خەزێنە xezene* "گەنج، گەنجینە".

**کۆز2 koz 2** - "پەنگر، پۆلوو": کۆزر kozır یش دەگوترێ. ژمارەیەک وشەی دیکەش هەن کە دەشێ پێوەندییان بەم وشەوە هەبێ، وەک ↑کزانەوە kızan(ewe)، ↑کوزرین kuzrîn "سووتانەوە"، ↑کوزور kuzur "نەوکێ سووتیاگ بۆ دەرمانی کەچەڵی"، کۆزی kozî "تەپاڵەی پێک هەڵپەسێردراو کە ئاگر دەگرێ". ئەم وشانە لەوانەیە بچنەوە سەر ریشەی ***(IE. ) *kuei- <*** "هایسان، درەوشانەوە،ترووسکانەوە". گەلێک وشەی وەک ↑سپی sıpî، ↑سۆز soz و↑سووتان sutan و هیتر هەر لەم ریشەوە دێن.

**کۆز3 koz 3** - "1- بەدەور دەست گرتن لە رەقسدا 2- جەغز": ئەگەر لەم دوو مانایە ورد ببینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست لە "کۆز" دەبێ "هێڵێکی کەوانی" بێ کە لە کاتی دەست گرتن و هەڵپەریندا دروست دەبێ و هەروەها دەگەڵ "جەغز"یش یەک دەگرێتەوە کە ئەویش ئاماژە بە "هێڵێکی بازنەیی" دەکا. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*گەوز gewz* و ↑کەوشەن kewşen.

**کۆزک kozk** - "1- کۆز1 2- خەندەک 3- سیپە، رەبەت": بڕوانە ↑کۆزا1 koz 1 "حەشارگەی کەو".

**کۆژۆ kojo** - "دەستقووچاو": خزمە دەگەڵ ↑قووچان quçan.

**کۆس kos** - "زەقایی زەوی": خزمە دەگەڵ ↑قۆچ qoç و ↑قۆز qoz و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**کۆسار kosar** *[ kosār ]* - "ناوچەی شاخاوی": کوهسار kūhsār (P.). کۆ ko [↑کێو kew، کێف kef] + سار -sar "پاشگری شوێن". ئەم پاشگرە بە شێوەی زار -zar و جار -car یش دەبیندرێ وەک لە وشەکانی گوڵزار، چەمەنزار، کەماجار، تێرگسجار و هتد.

**کۆسپ1 kosp 1** - "زۆپایی کەمی زەوی": خزمە دەگەڵ ↑کۆس kos.

**کۆسپ2 kosp 2** - "بەڵا و دژواری": خزمە دەگەڵ ↑کەسپ kesp "تەپاندنەوەی سەربان".

**کۆست kost** - کۆست کەوتوو kost kewtu واتا "لێقەوماو، بەڵا بەسەرداهاتوو" [دە بنەڕەتدا: بەخت کەوتوو، بەخت وەرگەڕاو]. وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە چەمکی "چارەنووس" دەکا و کۆست کەوتوو کەسێکە کە چارەنووسی تووشی کەوتن و هەرەس بووە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑کوچقولێپ kuçqulep "لێقەوماو، بەدبەخت" [کەسێک کە چارەنووسی قڵپ بۆتەوە و وەرگەڕاوە].

**کۆستە koste** [ *kosta* ] - "بڵندایی وەک سەکۆ": خزمە دەگەڵ ↑کۆس kos.

**کۆستەک kostek** [ *kostak* ] - "1- بەندی خەنجەر 2- بەندی سەعات 3- توورەکەی چەرمین 4- پێوەندی ئەسپ": بە هەموو ماناکانییەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەژوو keju "بەندێکی لە موو چنراو لە تەنگەی ئەسپی دەبەستن".

**کۆسە kose** [ *kosa* ] - "1- جۆری ماسی گەورەی دڕندە 2- پیاوی موو لێ نەهاتگ 3- گەنمی بێ چقڵ و داسوو": ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ↑قوسان qusan "تاشین لە بنڕا" و هێندێک وشەی دیکەی وەک ↑گوێزان guwezan "تیخی سەرتاشین"، ↑کووز kuz، ↑قاش qaş، ↑قاچین qaçîn و هیتر کە مانای "بڕین، لەت کردن، پچڕین" دەبەخشن. دە فارسیدا لەپاڵ کوسە kūse (P.) هەروەها کوسەماهی kūsemāhī (P.) یش دەگوترێ واتا "ماسی کۆسە، کۆسەماسی". ئەمە نیشان دەدا کە "کۆسە" سەرەتا وەسفێک بووە بۆ ئەو ماسییە زلە دڕندەیە کە ↑گاز gaz لە تێچیری خۆی دەگرێ و لەت و پەتی دەکا. بە وتەیەکی دیکە لە کۆندا "کۆسە" خۆی ناوی ماسییەکە نەبووە، بەڵکوو وەک ئاوەڵناو دەگەڵ وشەی "ماسی" بەکار هێنراوە، بۆ ناساندن و جەخت کردن لەسەر گاز گرتن و دڕەندەیی ماسییەکە. دواتر وشەکە کورت بۆتەوە و لە "کۆسەماسی" ڕا بووەتە "کۆسە". ئەم دیاردەیە لە چەندین وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، بۆ وێنە "کوندەبەبۆ" کە بووەتە "کوند". پرسیاری دوایی ئەمەیە کە مانای دووەم، واتا "بێموو، موو لێ نەهاتوو"، چۆن پەیدا بووە. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی دیکە بکەین کە پێوەندییەکی لەم چەشنەیان لەتیواندا هەیە. وشەی "تاس" [تاس و لووس، ساف، بێموو] دەچێتەوە سەر "تاشین" [تاشەبەرد، بەردی داتاشراو]. بە وتەیەکی دیکەوە بەهۆی تاشینەوە شتێک ساف و لووس کراوە و ئەوجار وشەی "تاس" یان "تاش" بە مانای "ساف، بێموو" سەری هەڵداوە. هەر ئەم پێوەندییەش لە نێوان "کۆسە(ماسی)" و "قوسان" و "گوێزان" لە لایەک و لە لایەکی دیکەشەوە "کۆسە" بە مانای "ساف و لووس، بێموو" لە ئارا دایە.

**کۆش1 koş** [ *koš* ] - "سەرڕان، نێوان ڕانەکان":

1- لەلایەکەوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ Schoß (G.)، scoz (OG.)، sceat (OE.)، skat (OF.)، skaut (Gt.) و (OIs.) "کۆش". ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا بە مانای "سووچ، گۆشە" بووە و دە هێندێک لە زمانەکاندا بە هەردوو مانا بەکار هاتووە، وەک try-scyte "سێ گۆش، سێ سوو". دەگوترێ مەبەست لە وشەی کۆش دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرەتا گۆشە و قولینچکی جلوبەرگ (بە تایبەتی هی ژنان) بووە و پاشان بەم شۆینە گوتراوە کە ئەو گۆشە جلکەی کەوتووەتە سەر. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***(s)kēu-** ***(IE.)*** "دەرپەڕاندن، بە زۆر ناردنە پێش، ڕە پاڵ نان، ڕاو نان، پەلە کردن". دیارە قولینچک و گۆشە شتێکی زەق و دەرپەڕیوە و لێرەوە دەگەڵ مانای ئەم ریشەیە پێوەندی پەیدا دەکا.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین دەگەڵ ↑باوەش baweş بەرهەڤی بکەین.

3- هەروەها دەکرێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە بەرهەڤی بکەین کە ئاماژە بە چەمکی "زۆر بوون، کۆم بوون، کۆگا بوون" دەکەن، وەک ↑قۆش qoş "خۆیانی گیرەنەکراو"، ↑گیشە gîşe، ↑گشت gişt، ↑گاشە gaşe [گاشەبەرد] و هتد. ئەگەر سەرنجی وشەی "باغەڵ" بدەین، دەبینین کە گرێدراوە بە وشە "باقە" و چەند وشەیەکی دیکە کە دیسان ئاماژە بە چەمکی "زۆر و زەوەند بوون، گشت بوون، کۆم بوون" دەکەن، واتا باغەڵ بۆیە ئەوها ناو نراوە، چونکە شوێنێکە شتی تێدا باقە دەکرێ، بە وتەیەکی دیکە شتی تێدا خڕ دەکرێتەوە یاخود کۆگایەک شتی پێ

هەڵدەگیرێ. هەر بەم جۆرەش کۆش دەتوانێ شوێنی شت تێدا خڕ کردنەوە بێ. دە زمانی ئەمڕۆدا کۆش زۆرجار بەم مانایە بەکار دێ، بۆ وێنە "کۆشێک کەنگری خڕ کردۆتەوە".

**کۆش2 koş 2** *[ koš ]* - وشەکە زۆرتر دەگەڵ "منداڵ" دێ و دەگوترێ فڵانکەس کۆشێک منداڵی هەیە، واتا منداڵی زۆرە. ئەم وشەیە لەوانەیە پێوەندی بە↑کۆش1 koş ەوە هەبێ، بەڵام هەر چۆتێک بێ خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە خاڵی 3، لەژێر وشەی کۆش1 koş دا باس کراون و ئاماژە بە "زۆر بوون" دەکەن.

**کۆشک1 koşk 1** *[ košk ]* - "قەسر و سەرسەرا": کۆچک koçk یش دەگوترێ. kūšk (.P). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑کۆشکە *koşke* "قەڵاخ" و ↑قەڵاقووچکە qelaquçke. کوشک دەشێ ماڵی بڵیند و چەندنهۆم بووبێ و لەبەر ئەمە دەشێ پێوەندی بەم ناوانەوە هەبێ.

2- ↑کاژە kaje "کاروانسەرا".

**کۆشک2 koşk 2** *[ košk ]* - "شەربەی سواڵەت": خزمە دەگەڵ ↑کاسە kase و هەروەها ↑گوزە goze.

**کۆشکە koşke** *[ koška ]* - "قەڵاخ، تەپاڵە و دەوەی لە سەر یەک هەڵچنراو": شێوەیەکی دیکە لە ↑قووچکە quçke "بڵیندی مەخرووتی". دە کوردمادیدا ↑قەڵاقووچکە qelaquçke ش بەکار دەبردرێ بە مانای "لەسەریەک هەڵچنین، بەسەریەکدا کردن". لەم وشەی دواییدا هەردوو وشەی "قەڵاخ" و "کۆشکە" خۆیان دەبینەوە. کاتێک شتێک بەسەریەکدا دەکرێ یان لەسەریەک هەڵدەچنرێ، بەشێوەیەکی ئاسایی دۆخێکی مەخرووتی پەیدا دەکا، واتا لای خوارەوە پان و گەورەترە و لای سەرەوە چووک و باریک دەبێتەوە. بەم جۆرە شتەکە لە لای سەرەوە حاڵەتێکی گۆشەیی و دەرپەڕیو دروست دەکا. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑قۆچ *qoç*، ↑قووچ quç، ↑کۆچکە koçke، ↑قۆچەقانی qoçeqanî، ↑قووچەکە quçeke، ↑ئەنگوچک enguçk (ە سۆرانی) [قۆچک qoçk یش دەگوترێ]، ↑قوت qut، ↑قیت qît و ↑گۆشە goşe و هتد.

**کۆشین koşîn** *[ koštn ]* - "تەقەلا کردن، تێکۆشین": کوشیدن kūšīdan (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کێشان kêşan.

**کۆفی kofî** *[ koft ]* - "سەرکڵاوی ژنان، سەرپۆشی ژنان": کەفی kefî، کەفیە kefîye و کۆفیە kofîye ش دەگوترێن. دەشێ پێوەندی هەبی ↑کەڤنک kevnık "چارەکەی تەنکی سەری ژنان".

**کۆڤ kov** - "کۆم ، پشت چەماو": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆم kom.

**کۆڤار kovar** *[ kovār ]* - "مەجەللە": گۆڤار govar یش دەگوترێ [گۆڕانی k بۆ g]. کۆڤ + ئار kov + ar. کۆڤ kov شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کۆم kom. مەبەست شوێنی کۆ(م) کردنەوەی بابەتی نووسراوە. [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "مەگازین" دە زمانە ئەورووپییەکاندا کە لە "مخزن" ی عەرەبی وەرگیراوە بە مانای "ئەنبار، شۆێنی کۆم کردنەوەی کەل وپەل". وشە عەرەبییەکە خۆی لە "خەزنە، خەزێنە"ی کوردمادی وەرگیراوە].

**کۆڤان[1] kovan** *[ kovān ]* - "خەم، خەفەت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ kaum (.G)، kūmo (.OG) "بە زەحمەت"، kūma (.OG) "ناڵە، دەردی دڵ"، kūmig "هەژار، لاواز" [دە بنەڕەتدا واتا بە ناڵەناڵ]. وەک دەبینین فۆنیمی m گۆڕاوە بە v و ئەمەش وەک تایبەتمەندییەکی زمانی کوردمادی دە گەلێک وشەدا بەدی دەکرێ. وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *kaujan (.Ger)* "بانگ کردن، هەراکردن". goān (.Gr) "ناڵە، دەردی دڵ"، gaūsti (.Lit)

"دەنکەدەنکێ کردن، وزەوز کردن، خشەخش کردن" دەبردرێنەوە سەر ریشەی سەرەوە. دە زمانی کوردمادیدا لەوانەیە چەندین وشەی وەک ↑قیژە qîje، ↑قسە qıse، ↑قاسپە qaspe، ↑گیزە gîze، ↑گێزە geze پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەبێ.

**کۆڤان² kovan** [ *kovān* ] - "کوان": شێوەیەکی دیکە لە ↑کوان kuwan "دومەڵ". خزمە دەگەڵ ↑کۆپانە kopane و ↑گۆپکە gopke.

**کۆک1 kok 1** - ئەم وشەیە بە چەند مانایەک بەکار دێ وەک کۆک و پۆشتە، کۆک بوون و ناکۆک بوون بە واتای پێکەوە گونجان یان نەگونجان، کۆک کردنی سەعات واتا قورمیش کردن. ئەگەر سەیری پێوەندی ئەو مانایانە بەیەکەوە بکەین، دەبینین کە چەمکێکی هاوبەش تێیاندا بەرچاو دەکەوێ، ئەویش بریتییە لە "خڕ بوون(ەوە)". کەسێکی "کۆک و پۆشتە" ئەو کەسەیە کە جلەبەرگێکی نەک شەلەختە و تێکەڵ پێکەڵ، بەڵکوو "خڕەوەبوو"، بە مانایەکی دیکە قنج یان گونجاوی لەبەردایە [سەرنج بدە کە وشەکانی "قنج" و "گونجاو"یش مانای "خڕ و خڕ بوون" دەبەخشن]. کۆک بوون بە مانای پێکەوەگونجانیش هەر ئەم دۆخە نیشان دەدا کە دوو یان چەند لایەن لەسەر بابەتێک لە دەوری یەکدی کۆ دەبنەوە و یەک دەگرن. هەروەها "کۆک"ی سەعاتیش دەبێ ئەو فەنەرە بێ کە پاش شل بوونەوەی هەڵدەوێزرێ و خڕ دەکرێتەوە. بەم پێیە دەبینین کە مانای سەرەکی وشەکە دەبێ "خڕ و خڕ بوونەوە" بێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گۆک gok "خونچە" و↑ گۆکێ gog "تۆپی بچووک" و دواجار دەگەڵ ↑گۆ *go* سەر بە ریشەی *(IE.) *geu- >* "خڕ و تۆپەڵە بوون". وشەی گۆک gok بە مانای خونچە هەڵ سەنگێنە دەگەڵ وشەی "خونچە" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خڕەکە بوون، قنج بوون".

**کۆک2 kok 2** - "ریشە، بنچینە، ئەسڵ": هەروەها کۆکی kokî هەیە بە مانای "بنەڕەتی، ئەسڵی". خزمە دەگەڵ ↑سۆکین sokîn "بناخە، هیم" و دواجار ↑سەق *seq* سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز". هەروەها بەراوردی وشەکە بکە دەگەڵ ↑ککەو kıkew [کەکەو kekew] "داری کەڤۆت، دارێکی سەختی جەنگەڵی" و هەروەها ↑کێکا keka "ناوی هۆزێکی کورد" [واتا سەخت و بەهێز].

**کۆک3 kok 3** - "تەقەڵی درشت، باقیە": وشەی "باقیە" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قایم کردن". بەم پێیە وشەکە دەبێ لە پێوەندی دەگەڵ ↑کۆک2 kok 2 دا بێ، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز".

**کۆکلە kokle** [ *kokla* ] - "لێک پێچراوی دەزوو، جۆرێک کڵاف": خزمە دەگەڵ ↑کۆک¹ kok.

**کۆکین kokîn** [ *kokīn* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆخین koxîn.

**کۆل1 kol 1** - "1- ئاوەخۆرەی ئاژەڵ لە دار یان لە بەرد و قوڕ 2- قەمتەر 3- تەشتی دارینی زلی نانەوا [کوول kul یش دەگوترێ] 4- پلووسکی گەنم لە ئاسیاو 5- خەڵفەمێش کە هەمووی کلۆرایی دار بێ و بڕابێ 6- پێوانەی دەخڵ لە دار کە شازدە کیلۆ دەبا 7- خێشک 8- چین، توێژ": گشت ماناکانی سەرەوە پێوەندییان بە چەمکی هەڵکەندن، کۆڵین، کلۆر کردنەوە هەیە، واتا قووڵ کردن و (هەڵ)کۆڵینی دار یان هەرد. لەم تێڕوانینەوە وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn "قووڵ کردن، هەڵکەندن" و دواتر ↑کون *kun*.

**کۆل2 kol 2** - "سەرکۆل واتا سەررووت": کل kel (.P) "کەچەڵ، بێموو". خزمە دەگەڵ kahl (.G) "کەچەڵ، تاس"، golyj (.Rus) "تاس، رووت"، holy (.Chek) "رووت". هەروەها سەرنجی calvus (.L) "کەچەڵ، تاس" بدە. ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**کۆڵ kol 1** - "شان و پشت، شان و مل": کول kūl (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- وێ دەچێ مانای "کۆڵ" دە بنەڕەتدا دەگەڵ "مل" جیاواز بێ، چونکوو کۆڵ ئەو بەشەیە کە شتی پێ هەڵدەگیرێ [لە کۆڵ کردن، لەسەر کۆڵ دانان، بە کۆڵ هەڵگرتن....]. بۆیە لەوانەیە ئەم وشەیە خزم بێ دەگەڵ helfen (G.)، helfan (OG.)، hilpan (Gt.)، help (E.)، hjälpa (Sw.) "ئاریکاری کردن، کۆمەکێ کردن"، šelpti (Lit.) "ئاریکاری کردن، پشتیوانی کردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *kelb- >** "پشت گرتن، راگرتن" [وەک راگرتنی کاریتە لەسەر ↑کۆڵەکە koleke].

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Hals (G.)، heals (OE.)، hals (Sw.)، collum (L.) "مل"، سەر بە ریشەی **(IE.) *k(u)el - >** "سووڕان، بەم لا و ئەولادا جولانەوە". kyklos (Gr.) "چەغز"، colere (L.) "کشت و کاڵ کردن، ئاوەدان کردن"، kolo (Pol.) "چەرخ" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

**کۆڵ kol 2** - کۆڵ بوون واتا "کورت و خڕ بوونی پەنجەکان"، بە هۆی لە دەست دانی قامکەکان. خزمە دەگەڵ Keule (G.)، kiule (MG.) "گوپاڵ، تیڵای سەرخڕ"، هەروەها بە مانای"رانی ئاژەڵ و پەلەوەری خواردن". مانای دووەم لێرەوە پەیدا بووە کە رانی ئاژەڵ و پەلەوەر وێنەی گۆپاڵیان هەیە، واتا لایەکی خڕ و قەڵەوترە لە لایەکەی دیکە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑قۆڵ qol "تیوان ئانیشک و مەچەک" و ↑کول kul "ناتیژ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *geu- >** "چەمان، خوار بوون، خڕ بوون". دە زمانی کوردمادیدا هەرەها ↑کولیمەک kulîmek هەیە بە مانای "ئێسکی ران".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "کول بوون" و "گۆپاڵ" دە وشەی چۆماخ çomax یشدا دەر دەکەوێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی stumpf (G.) "کول، ناتیژ"].

**کۆلارە kolare 1** [ kolāra ] - "کورکورە، ناوی باڵدارێکی راوکەر":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑کورکورە kurkure وە هەبێ، سەر بە ریشەیەک بە مانای "قیژاندن".

2- لەوانەیە هەر ئەو کۆلارە² kolare بێ بە مانای "بادەوە" و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە خولانەوەی ئەو باڵدارە لە هەوادا کرابێ.

**کۆلارە kolare 2** [ kolāra ] - "بادەوە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆڵ kol "شان و مل" سەر بە ریشەی **(IE.) *kuel- >** "سووڕان، بەم لا و ئەولادا جووڵانەوە".

**کۆڵان kolan** [ kolān ] - "شەقام، کووچە":

[تێبینی: وشەکانی "رێگا" و "باز" [رێباز] و "کووچە" دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "رۆیشتن، بزووتن" دەبەخشن].

بەم پێیە وێ دەچێ کۆڵان kolan یش پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *k(u)el - >** "سووڕان، بەم لا و ئەولادا جولانەوە". ئەگەر ئەمە راست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کۆڵ kol 1. دە زمانی فارسیدا کو(ی) kū(y) (P.) هەیە بە مانای "گەڕەک"، بەڵام روون نییە کە ئایا ئەم وشەیە پێوەندی بە "کۆڵان"ی کوردمادییەوە هەیە یان لە "کووچە" وەرگیراوە.

**کۆلکە¹ kolke** [ kolka ] - "(داری) قەڵت کراو، (داری) قوڵەکراو": کۆڵ + کە kol + ke . کەرتی "کە" پاشگرە، کەرتی "کۆڵ" خزمە دەگەڵ ↑قوڵە qule "کورت" [قوڵە دە بنەڕەتدا واتا کورتکراوە، بڕدراو]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ Holz (G.)، holt (OE.)، hult (Sw.) "داری سووتەمەنی"، klados (Gr.) "لقەدار"، koloda (Rus.) "کۆلکە، بنەدار"، klaein (Gr.) "شکاندن"، per-cellere (L.) "ورد کردن، لێدان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kel(d)- >** "لێدان، شکاندن،

قەڵشاندن، بڕین". ژمارەیەکی زۆر وشە دە زمانە هیندوئەورووپی و زمانی کوردمادیشدا لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑قەل qel کردن، ↑قەڵشاندن qelşandın، ↑قەڵت qelt، ↑قوڵە qule و هتد.

**کۆلکە² kolke** [ *kolka* ] - دەگەڵ "مەلا" دێ [کۆلکەمەلا]. شێوەیەکی دیکەیە لە↑ کوڵک kulık یان ↑کوڵکە kulke بە مانای "موو، تووک". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بە ردێن هێشتنەوەی مەلایە، واتا مەلای تووکن.

**کۆلکەزێڕینە kolkezerîne** [ *kolkazerīna* ] - "پەلکەزێڕینە": دە فارسیدا وشەکە دەبێتە رەنگین کمان rangīn kamān (P.) واتا "کەوانی رەنگین". کۆلکە kolke هەمان ↑کۆڵەکە koleke "ستوون"ە و مەبەست لە وشەکە "ستوونی زێڕین"ە.

[تێبینی: دە شێوەزاری سەروودا وشەی ↑کێرستوون kerstun بە مانای "کۆلکە زێڕینە" بەکار دەهێندرێ، دەبنەڕەتدا واتا "ستوونی خوار"].

**کۆڵوو kolu** [ *kolū* ] - "1- بنەتاڵوو بۆ سووتانی زستان دەری دەهێنن 2- هەویری سووتاو دە ناو تەندووردا": خزمە دەگەڵ Kohle (G.)، kol(o) (OG.)، kool (NL.)، coal (E.)، kol (Sw.) "خەڵووز". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی -*kula(n)* * *(Grm.)* "رەژی، خەلووز". وشەی ↑خەڵووز xeluz و ↑کۆڵە kole "خۆڵەمێشی تەندوور" و ↑کۆلی kolî "ئێزنگ، پووشکە و چرپی بۆ سووتەمەنی" پێوەندیان بەم وشەوە هەیە. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە.

**کۆڵۆز koloz** - "کز و رەق و تەق": کۆڵ + ئۆز kol + oz. کەرتی یەکەم لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کلک kılk و *کیل kel* "بەردی درێژووکە". کەرتی دووەمی وشەکە پاشگرە، بڕوانە ↑ئۆز oz.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "شووش" (شووش و باریک). شووش شێوەیەکی دیکەیە لە "شیش" یان "سیخ". شووش و باریک واتا باریکی وەک شیش. هەروەها بەراوردی بکە دەگەڵ "قەڵەمی" واتا باریکی وەک قەڵەم. شیاوی باسە کە دە زمانی فارسیدا "کلک" بە مانای "قەڵەم" بەکار دێ].

**کۆلە kole** [ *kola* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆیلە koyle.

**کۆڵە1 kole 1** [ *kola* ] - "خۆڵەمێشی تەندوور": خزمە دەگەڵ ↑کۆڵوو kolu.

**کۆڵە2 kole 2** [ *kola* ] - "1- بێچووی چەند ئاژەڵێک 2- وشەی بچووک نیشان دان [ئەوەند کۆڵەی دامێ] 3- منداڵی باوک مردوو کە دایکی زوو شوو دەکاتەوە و جێی دەهێڵێ": خزمە دەگەڵ ↑کوڕ kur.

[تێبینی: هەر بەم شێوەیە "کچ"یش دەتوانێ دەگەڵ *کودک* "بێچووی لاور" و *کوودەڵە*"بێچووی بەراز"].

**کۆڵە3 kole 3** [ *kola* ] - "پنج، رەگ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Quelle (G.) و quella (OG.) "سەرچاوە، کانیاو". وشە ژێرمەنییەکان خزمن دەگەڵ ↑قوڵین qulîn [هەڵقوڵین helqulîn].

[تێبینی: وشەی ئەڵمانی Ursprung بە مانای "بنەما، سەرچاوە" خزمە دەگەڵ spring ی ئینگلیزی بە مانای "کانیاو، سەرچاوەی ئاو"].

**کۆڵە⁴ kole** [ *kola* ] - "قسەی بێتام": شێوەیەکی دیکە لە ↑قۆڕ² qor [قۆڕیات].

**کۆڵەڕم kolerm** [ *kolarm* ] - "1-تیزە 2- بەرچیخ، داری چیغ راگر": بڕوانە ↑کوڵ3 kul.

**کۆڵەکە koleke** [ *kolaka* ] - "ستوون":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆڵەڕم kolerm "1-تیزە 2- بەرچیخ، داری چیغ راگر" و دەگەڵ ↑کوڵ3 kul. کوڵەبار kulebar "دارێکە وە بەر داری میوەی دەدەن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ دەگەڵ L.) columna) "کۆڵەکە". دە زمانی لاتینیدا وشەی collum بە مانای "مل" بەکار دێ، واتا لێرەدا کۆڵەکە بە مل چوێنراوە. دە زمانی کوردمادیشدا دوو وشەی "ئەستوون" و" ئەستۆ" پێوەندییان بەیەکەوە هەیەو نیزیکی ئەو چەمکانە لەیەکدی بەباشی نیشان دەدەن. لەم تێڕوانینەوە وشەی کۆڵەکە دەچێتەوە سەر ↑کۆڵ kol "شان و مل"، دەبنەڕەتدا "مل".

**کۆڵەوار kolewar** [ *kolawār* ] - "بەدبەخت، لێقەوماو، قوڕبەسەر": خزمە دەگەڵ ↑کول kul [کول و کەسەر]. پێک هاتووە لە کۆڵ [کول] + ە [ناوگر] + وار [پاشگر] kol + e + war واتا "هەڵگری خەم".

**کۆڵەوەژ kolewej** [ *kolawaž* ] - "دارێک کە خۆڵی بن تەنووری پێ تێکوەردەدەن": کۆڵە kole دەشێ ئەو ↑کۆڵە1 kole یە بێ بە مانای "خۆڵەمێشی تەندوور" [بڕوانە ↑کۆڵوو kolu]. وەژ - wej پێوەندی هەیە بە ↑وەشاندن weşandın "پەخش کردن، بڵاو کردن".

**کۆلی kolî** [ *kolī* ] - "ئێزنگ، پووشکە و چرپی بۆ سووتەمەنی": خزمە دەگەڵ ↑کۆڵوو kolu "1- بنەتاڵوو بۆ سووتانی زستان دەری دەهێنن 2- هەویری سووتاو دەناو تەندووردا".

**کۆڵین kolîn** [ *kolīn* ] - "هەڵکەندن، قووڵ کردن": دەچێتەوە سەر ↑قووڵ qul [کوور kur]. وشەی (لێ)کۆڵینەوە (le)kolîn(ewe) "توێژینەوە" لە کرداری "کۆڵین" وەرگیراوە.

**کۆڵینەوە kolînewe** [ *kolīnawa* ] - "توێژینەوە، قووڵ بوونەوە": [کۆڵینەوە (لە)، لێکۆلینەوە (لە)]، ↑کۆڵین kolîn "هەڵکەندن، قووڵ کردن".

**کۆم1 kom** - "دەستە، جڤات، چەند دانە، کۆگا": ↑کۆما koma و کۆ ko ش دەگوترێ کە ئەمەیان شێوەیەکی سواوەیە. خزمە دەگەڵ کومە kūme (.P) "کۆگا". هەروەها دەشێ خزمە دەگەڵ L.) cumulus) "کۆما". ئەم وشە لاتینییە وەک ناو بۆ جۆرێک هەوریش بەکار دێ کە پەڵەکانی لەدەوری یەک کۆم دەبنەوە.

**کۆم² kom** - "1- خوار [پشتی کۆم بۆتەوە] 2- ئاڵقەی دارینی دەرگا": خزمە دەگەڵ ↑کەمان keman و چەندین وشەی دیکە کە دە ریشەدا مانای "خوار بوون و با دران" دەدەن.

**کۆم³ kom** - "کونی پاشەوە": مانای ئەم وشەیە دەبنەڕەتدا "زارک" بووە [وەک زارکی شووشە، گۆزە، کون و کەلێن]. خزمە دەگەڵ ↑کام² kam. "کام" دە بنەڕەتدا مانای "زار" دەدا و خزمە دەگەڵ ↑قەمپۆز qempoz "لمبۆز، دەم و لووتی ئاژەڵ"، سەر بە ریشەی > ***ĝhan-, *ĝhēi-,** ***ĝhēu-** (.IE) "دەم کردنەوە، زار داپچڕین". هەم "کام" هەم ↑زار zar دە ریشەدا مانای "دەم داپچڕین" دەبەخشن و لەوانەیە دە پلەیەکی دوورتردا لە یەک ریشەوە هاتبن و خزم بن دەگەڵ ↑کون *kun*.

**کۆم⁴ kom** - "کڵاو": شێوەیەک دیکە لە ↑کووم kum.

**کۆمار komar** [ *komār* ] - "جەمهووری": دەچێتەوە سەر↑ کۆم(ا) kom(a) "خڕ بوونەوە، ئاپووڕە بوون". دە زمانە ئەورووپییەکان و هەروەها زمانی عەرەبیشدا ئەو وشانەی کە بە مانای کۆمار دێن، پێوەندن بە وشەگەلێک کە مانای "گەل، ئاپۆرەی خەڵک " دەبەخشن. دیارە مەبەست هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵاتە لە لایەن گەلەوە.

**کۆمۆ komo** - "پشتکوور": هەروەها ↑کومکومین kumkumîn "چەمۆڵە دادانی سەگ و شێر و...". خزمە دەگەڵ ↑کۆم² kom "خوار" [میناک: پشتی کۆم بۆتەوە، کۆمەکۆمە ڕۆیشتن].

**کۆمەڵ komel** [ *komal* ] - "جڤات، دەستە، گەل": بڕوانە ↑کۆم¹ kom "دەستە، چەنددانە".

**کۆن1 kon** - "قەدیمی، لەمێژینە": کهنە kohne (.P). بڕوانە ↑کەڤن kevın.

**کۆن2 kon** - "پارچەی ڕەشماڵ": ↑کوێن kuwen ی و ↑کەوەندە kewende ش دەگوترێ. لەم پێوەندییەدا چەند وشەیەکی دیکە سەرنج ڕادەکێشن کە دەشێ دە یەک چوارچێوەدا لێکیان بدەینەوە، وەک ↑کۆنکی پیرێ konkîpîre یان ↑کەڤنکی پیرێ kevınkîpîre "داوی جاڵجاڵۆکە"، کەڤنی kevnî "جاڵجاڵۆکە". ئەم وشانە دە بنچینەدا خزمن دەگەڵ ↑کەپەنەک kepenek "فەرەنجی"، ↑کەپەن kepen [کەفەن، کفن]، ↑کەفی kefî یان ↑کەڤنک kevınk "دەسرەی سەری ژنان لە پارچەیەکی تەنک"، ↑کەڤینک kevînk "پێچی سەری پیاوان". ئەم وشانە گشتیان دەبێ خزم بن دەگەڵ ↑*سابات sabat* "کەپر" و ↑سیپاڵ sîpal "جلوبەرگ و پەرۆ و پاڵی کۆن"، ↑سفرە sıfre و دەگەڵ Spinne (G.) "جاڵجاڵۆکە" و spinnen (G.)، spin (E.)، spinna (Sw.)، pinti (Lit.) "تەنین، ڕستن"، spannen (G.)، spannan (OE.)، spänna (Sw.) "لەبەر یەک کێشانەوە"، spáein (Gr.) "کێشان"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *sp(h)ei- >** "لەبەر یەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، هەراو بوونەوە، *تەنینەوە*". وەک دەردەکەوێ لەم مانایانەوە دواتر مانای "تەنین و تەنراو" پەیدا بوون. [سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی s بۆ k دەتوانین بۆ وێنە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک "سفت و کەڤۆت"، "ساوین و کەوڵ"، "سۆکین و کۆک" بەرهەڤی بکەین].

[تێبینی 1: جێی ئاماژەیە کە وشەی "تەنین" دەچێتەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *ten-* "تەنینەوە، درێژ بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە". تێبینی 2: وشەی "دەوار" کە ئەویش مانای ڕەشماڵ دەدا، پێوەندی بە چەندین وشە بە مانای "ڕەش، بۆری تاریک"ەوە هەیە. هەروەها دە وشەی "ڕەشماڵ"دا ئاماژە بە ڕەنگی ڕەش دەکرێ. لەوانەیە وا بیر بکرێتەوە کە وشەی "کون/کوێن/کەوەندە" دەتوانێ پێوەندی ڕەنگی "کەوە" هەبێ کە ئەویش هێندێک جار مانای "ڕەش، بۆر" دەبەخشێ (خۆڵەکەوە، خۆڵەمێش)، بەڵام بوونی فۆتیمی n لەم وشانەدا پێوەندی ئەوان بە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە پشتراست دەکا].

**کۆنا kona** *[ konā ]* - "وریا، زرینگ 2- فێڵباز": خزمە دەگەڵ kühn (G.) "بوێر، بوێرانە"، kuoni (OG.) "زانا، بە ئەزموون، بەئاوەز"، koen (Nl.) "بوێر، بەجەرگ"، keen (E.) "توند و تۆڵ، بوێر"، ka n (OIs.) "وریا، زرینگ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ئەو کردارانەی زمانە ژێرمەنییەکان بە مانای "توانین"، وەک können (G.) و can (E.). خودی ئەم وشانەش خزمن دەگەڵ ↑زانین zanîn ی کوردمادی. سەرنجراکێشە کە هەر لە کۆنەوە چەمکەکانی "زانین" و "توانین" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، واتا ئەگەر بیزانین، ئەوا دەشیتوانین! وشەکە هەروەها دەگەڵ ↑شێنا şêna بەرهەڤ بکە.

**کۆنتۆ(لە) konto(le)** *[ konto(la) ]* - "پارگوێر، گوێلکی یەکساڵە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەندک kendık.

**کۆندەرە kondere** *[ kondara ]* - شێوەی کۆنتری ↑قۆندەرە qondere.

**کۆنک konık** *[ konık ]* - "تووکی باڵدار": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کونگی kungî "چارداخ"، Scheune (G.) "دیوەلکە، ئەنبار"، scugina (OG.) "سەرپەنا، کۆختە، دیوەلکە"، skunati (OIn.) "دادەپۆشێ"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *(s)keu >** "داپۆشین، داپێچان، حەشاردان". Haut (G.) "پێست" و Schote (G.) "تۆکڵی بادام و گوێز و..." پێوەندییان بەم ڕیشەوە هەیە. جێی ئاماژەیە کە دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی "تۆکڵ" و "تووک" پێکەوە خزمن.

**کۆنکی پیرێ konkî pîre** *[ konkī pīre ]* - "تەونی جاڵجاڵوکە": کەڤنکی پیرێ kevınkî pîre ش دەگوترێ، کە ئەمەیان شێوەی کۆنترە. خزمە دەگەڵ ↑کەڤنک kevınık "چارەکەی تەنکی سەری ژنان"، کەڤینک kevnîk "پێچی سەر پیاوان" و ↑کەڤنی kevnî "جاڵجاڵووکە" [تەونکەر]. ئەم

وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑سابات *sabat* "کەپر" و ↑سیپاڵ sîpal "جلوبەرگ و پەڕۆ و پاڵی کۆن" و دەگەڵ Spinne (G.) "جاڵجاڵۆکە" و spinnen (G.)، spin (E.)، spinna (Sw.)، pinti (Lit.) "تەنین، ڕستن"، spannen (G.)، spannan (OE.)، spänna (Sw.) "لەبەر یەک کێشانەوە"، spáein (Gr.) "کێشان"، سەر بە ڕیشەی **< (IE.) *sp(h)ei-** "لەبەر یەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، هەراو بوونەوە، تەنینەوە".

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆنێمی s بۆ k بەرهەڤی بکە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک "سفت و کەڤۆت"، "ساوین و کەوڵ"، "سۆکین و کۆک" و هتد].

**کۆنگرە kongre** [ *kongra* ] - ئەو شوێنە بڵندانەی سەر دیواری قەڵا کە وەک ددانە دەچن و بە ڕیز دەکەونە پاڵ یەکدی": قۆنگرە qongre ش دەگوترێ. کنگرە kongere (P.). کۆنگرە ئەو شوێنە زەق و دەرپەڕیوانەی سەر دیواری قەڵا بوون کە بۆ پەنا گرتن و خۆ پاراستنی پاسەوانان لەکاتی شەڕدا دروست کراون.

خزمە دەگەڵ کۆندەرە [↑قۆندەرە qondere] "قیتکەی بن پاژنەی کەوش". وشەکە دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "زەقایی، دەرپەڕیوی" و دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قوتیر *quner*، ↑قوندک qundık، ↑قونچک qunçık و هتد.

**کۆیلە koyle** [ *koyla* ] - "دیل، بەردە":↑کۆلە kole ش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- لەوانەیە دە بنەڕەتدا کەپل *kepıl** یان کەڤلە *kevle** بووبێ و خزم بێ دەگەڵ Häftling (G.) "گیراو، زیندانی" و capture (E.) "دیل گرتن، داگیر کردن". وشە ژێرمەنییەکان خزمن دەگەڵ ↑ئیپە îpe "بەندێکی قایشە نیری پێ لە ئاموور دەبەستن" و ↑کیپ kîp "توند کردن، بەستن"، سەر بە ڕیشەی **< (IE.) *kap-** "گرتن". ئەگەر ئەم شیمانە ڕاست بێ، ئەم گۆڕانە بەسەر وشەکەدا هاتووە: کەپل یان کەڤلە ← کەول(ە) ← کۆل(ە) / کوێلە. وشەی ↑گۆڵە gole "قفڵ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم جۆرە گۆڕانە دە زمانی کوردیدا گەلێک نموونەی لێ دەبینرێ، بۆ وێنە "زۆر"، "گۆڕ"، "لۆرک"، تۆر [چتۆر].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Schalk (G.)، schalk (Nl.)، scalc (OG.)، scealc (OE.) "خزمەتکار، خوڵام، کۆلە، بەندە". ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە.

**کهۆیی kıhoyî** [ *kıhoyī* ] - "کەسکایی، سەوزڕەنگی": خزمە دەگەڵ ↑کەسک kesık. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کاهوو kahu "سەوزییەکی خواردن".

**کەبادە kebade** [ *kabāda* ] - "دارێکی بە زنجیرەوە کە لە زۆرخانە بەکاری دێنن": کبادە kabāde (P.). خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە "سەخت بوون" دەکەن، وەک کەبۆت kebot [کەڤۆت kevot، کەوت kewıt] "دارێکی سەخت" و ↑کەبس kebıs "ڕەنج کێشان و شەکەت بوون" و ↑کەبەر keber "دەوەنێکی دڕکاوی"، ↑کەپتار keptar "بناری چیای پڕ لە دار" و دواجار دەگەڵ ↑سفت *sıfît*.

**کەبس1 kebıs** [ *kabıs* ] - "ڕەنج کێشان و شەکەت بوون": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کەبادە kebade.

**کەبس2 kebıs** [ *kabıs* ] - "ژێر خاک کردنی لکی تازە بۆ ڕەگ داکوتان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە کون و کولێن، کۆڵین و قووڵ کردن دەکەن. ژمارەیەک لەم وشانە لەژێر ↑کون *kun* دا باس کراون. بە تایبەتی هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑خەپشە xepşe.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ڕەگی کرداری "کار-" دە زمانی فارسیدا [درخت میکارم "دار دەتێژم، دەچەقێنم". ئەم کردارە فارسییە خزمە دەگەڵ "کێڵان"ی کوردمادی کە مانای هەڵکەندن و کۆڵینی هەرد دەبەخشێ].

کەبەر **keber** [ *kabar* ] - "دەوتێکی دڕکاوی": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەبادە kebade.

کەپ1 **kep 1** [ *kap* ] - "1- بەری دەست 2- پڕی یەک دەست 3- چەنبۆڵە": کف kaf (.P) "بەری دەست". بە هەموو ماناکانییەوە خزمە دەگەڵ ↑چەپڵە çeple و ↑چەپک çepık و ↑چەپۆک *çepok* و چەند وشەیەکی دیکە.

کەپ2 **kep 2** [ *kap* ] - "دوندی چیا": خزمە دەگەڵ ↑قاف1 qaf "کەللە".

کەپ3 **kep 3** [ *kap* ] - "بێقل، دەم": بڕوانە ↑کەپۆ kepo.

کەپتار **keptar** [ *kaptār* ] - "بناری چیای پڕ لە دار": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft و چەندین وشەی دیکە. ئەم وشانە ئاماژە بە سەخت بوون، ئاستەم بوون و هەروەها چڕ و پڕ بوون دەکەن.

کەپچە **kepçe** [ *kapča* ] - "کەفچی، کەوچک":

1- دەتوانێ شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑کەوچک kewçık [کۆنتر: کەمچە، کەمچک، کەڤچک]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*جام cam* "قاپ". وشەی ↑چەمچە çemçe ش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

2- لەوانەشە پێک هاتبێ لە کەپ kep + چە çe [↑قاپ1 qap 1 + چە، پاشگری گچکاندن].

کەپر **kepır** [ *kapır* ] - "سابات، سەیوانی بەدار و پەلکەگیا چنراو": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑کۆنکی پیرێ konkî pîre [کەڤنکی پیرێ kevınkî pîre] "تەونی جاڵجاڵوکە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەنینەوە".

2- ↑کەف kef "توێژاڵکی سەر تراو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

کەپرۆکە **keproke** [ *kaproka* ] - کەپرۆکە بەستن واتا پەیدا بوونی تۆژاڵک لەسەر ترشاو واتا کەف کردن. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەف kef "توێژاڵکی سەر تراو" و ↑کەپەک1 kepek 1 "برش، کەڕوو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

کەپرە **kepre** [ *kapra* ] - "1- پترۆکەی سەر برین 2- ریخی پەستیوراو": بە مانای یەکەم کەپرۆکە keproke و ↑کەوەرە kewere و ↑گەمرە gemre ش دەگوترێ. بە مانای دووەم ↑کەمرە kemre ش دەگوترێ. هەمووی ئەم وشانە دەچنەوە سەر وشەیەکی بنەڕەتی کە بریتییە لە کەمر kemır "بەرد". ئەم وشە کۆنە دە زمانی کوردمادیدا بە شێوەی ↑*کەڤر kevır* یش دەگوترێ و دە بنەڕەتدا "بەرد" مانا دەدا. چەندین وشەی کوردمادی کە مانای "سەخت، ڕەق، پتەو" لە خۆ دەگرن، پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن. مەبەست لە "کەپرە" یان "کەپرۆکە" بە مانای تۆژاڵکی ڕەق بۆوەی سەر برین ئەوەیە کە برینەکە خۆی گرتۆتەوە، واتا لەختە و دەڵمەخوێنەکە ڕەق بۆتەوە. جێی ئاماژەیە کە وشەکانی "سارێژ" و "پترۆک(ە)" [پەترۆک(ە)] یش پێوەندی بەو ریشانەوە پەیدا دەکەن کە باس لە "سەخت و ڕەق بوون" دەکەن.

کەپک **kepık** [ *kapık* ] - "زەقایی، دەرپەڕیوی": کەپکە kepke ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەپ2 kep 2 "دوندی چیا":

2- لە لایەکی دیکەوە دە فارسیدا بەرانبەری ئەم وشەیە دماغە damāġe دێ کە دەچێتەوە سەر دەماغ damāġ "لووت، کەپۆ". هەر بەم چەشنە لەوانەیە "کەپک"یش بچێتەوە سەر ↑کەپ3 kep 3

[کەپۆ kepo] "لووت". لەم تێڕوانینەوە مەبەست شوێنێکە وەک لووت دەرپەڕیبێ و زەقتر لە دەوروبەری خۆی بێ.

**کەپلەمە kepleme** *[ kaplama ]* - "دەسپەڕ": لە وشەی ↑کەپ[1] kep "بەری دەست" وەرگیراوە. وشەی "دەسپەڕ"یش دەچێتەوە سەر وشەی "دەست" [دەست + پەڕین]. دەشێ وشەکە سەرەتا "کەپماڵە" [واتا بە دەست داماڵین] بووە و گۆڕینی بە سەردا هاتووە. وشەیەکی دیکە کە بە مانای "کەپلەمە" بەکار دێ بریتییە لە "مشتە". ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە "مشتوماڵ دان". شیاوی باسە دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا کەفماڵ kefmal بە مانای "بە دەست داماڵین، ماساژ" بەکار دێ.

[تێبینی: وشەی "بە ئەدەبانە"ی دەستپەر وشەیەکی هەڵەیە. پەڕین [وە سەر پەڕین] دە بنەڕەتدا بۆ تێری ئاژەڵ بەکار هاتووە کە بە پەڕین خۆی دەهاوێتە سەر مێیەکەی. وشەکانی "مشتە" یان "کەپماڵ، کەپماڵە" بە جێترن].

**کەپن kepın** *[ kapın ]* - "دەم بەتاڵ، بێ ددان": kep + ın . بنەوشەی کەپ -kep دە وشەی ↑کەپۆ kepo و چەند وشەیەکی دیکەدا دەبیندرێ و دە ریشەدا مانای "ڤاڵایی، دەم کردنەوە، قووڵایی" دەدا. پاشگری ın- پاشگری بە ئاوەڵناوکردنە و دە چەندین وشەی دیکەدا دە بیندرێ وەک نەوسن، خرپن، جرپن، گوشتن و هتد. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کون *kun*، باشتر بڵێین شێوەی کۆنتری وشەکەیە.

**کەپۆ kepo** *[ kapo ]* - "لووت": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑کەپن kepn "دەم بەتاڵ"، ↑قەپ qep [قەپاڵ] "گاز"، ↑گەپ gep "گاڵتە"، ↑گەفە gefe "هەرەشە". [مانای ئەم دوو وشەی دوایی دە بنچینەدا "دەم" پێکدادان یان زار داپچڕین بووە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ gap (.E) "کەلێن، قەڵش، ڤاڵایی، بۆشایی"، gaffen (.G) "حەپەسان، زار داپچڕین، دەم ڤالا کردن". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کون *kun* [کون و کەلێن].

[تێبینی: لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ "دفن" کە ئەویش پێوەندی بە چەمکی "قوڵایی"یەوە هەیە].

**کەپۆڵ(ک) kepol(k)** *[ kapol(k) ]* - "ناوشان": شێوەیەکی دیکە لە ↑شەپیلک şepîlk [شان و شەپیلک].

**کەپۆلە kepole** *[ kapola ]* - "پێوانەی دارین": خزمە دەگەڵ قاپ[1] qap [↑قاب[2] qab "دەفر"].

**کەپەر keper** *[ kapar ]* - "کوڵۆس، کەسێک کە ددانی پێشەوەی نییە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەپن kepın.

**کەپەز kepez** *[ kapaz ]* - "چیایەک کە سەرەوی تەختایی هەبێ":

1- لەوانەیە خزم بێ ↑کەپ1 kep "بەری دەست". "کەف" دە زمانی فارسیدا هەم بۆ "بەری دەست" بەکار دێ و هەمیش بۆ "پانتایی هۆدە".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کەپ2 kep "دوندی چیا".

**کەپەک1 kepek** *[ kapak ]* - "برش، کەڕوو": کفک kafak (.P). دەچێتەوە سەر ↑کەف kef.

**کەپەک2 kepek** *[ kapak ]* - "تێکوڵی دانەوێڵەی دەستارکراو": خزمە دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl [کەڤڵ kevıl] "پێست" و ساوین و چەندین وشەی دیکە کە ماناکانی "ساوین، رێخشاندن، ورد کردن" دەردەبڕن.

[تێبینی: وشەکانی "پووش" و "پێست"یش پێکەوە خزمن. هەروەها وشەی فارسی سبوس sabūs (P.) "کەپەك، پووش" خزمە دەگەڵ "کەپەك".ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ سپور sopur (P.) "گەسك لێدەر" [دە بنەڕەتدا: "ڕێخشێنەر"].

**کەپەك3 kepek** [ *kapak* ] - "درشتەی ئاردی دابێژراو": پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەیە:

1- کەپەك2 kepek "تێکوڵی دانەوێڵەی دەستارکراو".

2- ↑قەبە qebe "درشت". [لە باری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "زبڵ" و "زبرە"].

**کەپەن kepen** [ *kapan* ] - "کفن": شێوەی کۆنتری وشەی کفن بووە و چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە، بووەتە کفن kafan (Arb.) و دواتر بەم شێوەیە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی. "کەپەن" دە بنەڕەتدا بە مانای "تەنراو، چنراو" بووە و خزم دەگەڵ ↑کۆن kon، ↑کوێن *kuwen* "پارچەی ڕەشماڵ". دە زمانی عەرەبیدا فۆتیمی p بووەتە f.

**کەپەنە kepene** [ *kapana* ] - "دەرمانی هاڕدراو کە دەکرێتە دەمەوە": خزمە دەگەڵ ↑کەپەك2 kepek "تێکوڵی دانەوێڵەی دەستارکراو".

**کەپەنەك kepenek** [ *kapanak* ] - "فەرەنجی": کەپان kepan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ کەپەن kepen "کفن" و ↑کۆن kon، ↑کوێن *kuwen* "پارچەی ڕەشماڵ".

**کەت1 ket** [ *kat* ] - "1- پارچە، پاژ 2- بڕاو، لێوبڕاو، شاخ شکاو 3- تاك، تەنیا": خزمە دەگەڵ ↑کوت kut "لەت، تیکە، بڕ" و ↑کەتاندن ketandın "پساندن، قەتاندن، پچڕاندن". مانای سێهەم لێرەوە پەیدا بووە کە کاتێك شتێك یان کەسێك لە کۆمەڵەکەی خۆی یان دەوروبەری خۆی دەکەتێ [هەڵدەبڕێ، جیا دەبێتەوە]، دەکەوێتەوە دۆخێکی تاك و تەنیاییەوە.بەم مانایە ↑کەتۆ keto ش دەگوترێ.

[تێبینی: کەت یان کەتۆ بە مانای "تاك و تەنیا" بەرهەف بکە دەگەڵ "ڕەبەن" یان وشەی عەرەبی "مجرد". ئەم وشانەش ریشەکانیان مانای "لێکردنەوە، جیا کردنەوە"دەبەخشن].

**کەت2 ket** [ *kat* ] - "چارۆکە": وشەی "چارۆکە" خۆی دە ئەسڵدا "چادر" بووە [چادر + ئۆکە] و خزمیشە دەگەڵ "چەتر". کەت پێوەندی بەم وشانەوە هەیە، بڕوانە ↑چادر çadır.

**کەت3 ket** [ *kat* ] - "بەسەرهاتی ناخۆش": خزمە دەگەڵ ↑کەد ked "ڕەنج، زەحمەت".

**کەت[4] ket** [ *kat* ] - "دەفری قووڵ و دەم واڵا بۆ جێگەی ئاردی نانەوا": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆد kod "کاسەی دارین".

**کەت[5] ket** [ *kat* ] - "تەختی دارینی لەسەر نووستن": پێوەندی هەیە بە ↑ساتان satan و ↑[دانیشتن da-ni-şıtın]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ kathédra (Gr.) "سەندڵی، کورسی، جێگەی دانیشتن". دە زمانی فارسیدا نیمکت nīmket (P.) بەو تەختە یان سەندەڵییە درێژانە دەگوترێ کە چەند کەس لەسەری دادەنیشن. زۆر وێ دەچێ کە وشەسازەکانی زمانی فارسی ئەم وشەیان لە "کەت"ی کوردمادی وەرگرتبێ. ئەوان دیتوویانە کە "کەت" دە زمانی کوردمادیدا بە مانای تەختەخەو بەکاردێ. جا لەبەر ئەوەی تەختەخەو پانە، وشەسازەکانی زمانی فارسی تەختەکەیان نیوە کردووە، کردوویانە بە "نیمکت" و بۆ دانیشتن بەکاریان هێناوە.

**کەت[6] ket** [ *kat* ] - "زەلام": کەتە kete و گتە gıte ش دەگوترێن. دە زمانی فارسیدا کت و کلفت kat o koloft (P.) هەیە بە مانای "زەلام و ئەستوور". دە زمانی کوردمادیدا قەد و قەڵافەت هەیە. "قەڵافەت"ی کوردمادی و "کلفت"ی فارسی خزمن و دیسانەوە دەبنە خزم دەگەڵ "قەڵەو"ی کوردمادی و دە ریشەدا مانای "بەهێز" دەبەخشن. وشەی "کەت" بە مانای زەلام پێوەندی هەیە بە ↑قەد qed "بەژن، هەیکەل".

[تێبینی: دوو چەمکی "قەد، هەیکەل، ئەندازە" و "زل و گەورەیی، قەڵەوی" پێوەندی نیزیکیان بە یەکەوە هەیە. وەک دەزانرێ دە زمانی کوردمادیدا "قەد" یان "گەد" دەگەڵ "گیپاڵ" دێ ( ged u gîpal). "گیپاڵ" خۆی دەشێ پێوەندی بە قەبە "زل، ئەستوور، بەهێز"ەوە هەبێ. دە زمانی فارسیدا بینیمان دەگەڵ "کلفت" دێ. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Größe دە ئەسڵدا مانای "گەورەیی" دەبەخشێ و هاوکات مانای "ئەندازە، قەد"یش دەگەیەنێ].

**کەت**[7] **ket** [ *kat* ] - "کەتا بنی" و "کەتا سەری" مانای "بەرداشی ژێروو و بەرداشی سەرەوە" دەبەخشن. پێوەندی هەیە بە ↑کۆدۆ *kodo* "ناوی چیایەکە لە کوردستان" و ↑کۆدە kode "زەوی زۆر سەخت و جووت لێ نەکراو".

**کەتان** **ketan** [ *katān* ] - " لۆکە": > *kithuna (Aram.)* "جلکی بنەوە". لەرێگەی زمانی جوو چووەتە ناو عەرەبییەوە و لەویشەوە بۆ ناو زمانە ئەورووپییەکانەوە.

**کەتاندن** **ketandın** [ *katāndın* ] - "پساندن، قەتاندن": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەتاندن qetandın. خزمە دەگەڵ ↑کەت ket و ↑کوت kut و هتد.

**کەترە** **ketre** [ *katra* ] - "1- لەکارکەوتوو 2- سست و گوێنەدەر 3- عەیب و عار":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کاس kas [کەم و کاسی، کەم و کەسری].

2- لەوانەشە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑کوتر kutır [شەل و کوتر].

**کەتک** **ketk** [ *katk* ] - "هەنجیری هیشکی ناو مەشکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گوتلە gutle.

**کەتلە** **ketle** [ *katla* ] - "زەمبیل": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑سەتڵ setıl "دۆڵچە".

**کەتن** **ketın** [ *katın* ] - "پیلان، کاری درێو": لەوە دەچێ پێوەندی بە شەیتان şeytan ەوە هەبێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر satanās (Gr.) "شەیتان" > *śatan (Ibr.)* "خەنیم، دوژمن". ئەم وشە عیبرییە دەچێتەوە سەر کردارێک بە مانای "فریو دان".

**کەتوو** **ketu** [ *katū* ] - "قەمتەر، ئاوبارە": خزمە دەگەڵ ↑کۆد kod "دەفری دارین".

**کەتۆ** **keto** [ *kato* ] - "1- تاک، تاقانە 2- ناوی پیاوانە": بڕوانە ↑کەت1 ket "تاک، تەنیا".

**کەتەو** **ketew** [ *kataw* ] - "کۆخەی وڵاخی بەرزە": خزمە دەگەڵ ↑کەتێ kete "کوڕکوڕە، ناوی مەلێک".

**کەتیر** **ketîr** [ *katīr* ] - "داری بن شەغرە کە دەکەوێتە سەر پشتی بارەبەر": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کۆتە1 kote "1- قەدی دار 2- دارێک کە قەساب گۆشتی لەسەر لەت دەکا".

**کەتیرە** **ketîre** [ *katīra* ] - "شیرەی هیشکەوەبووی گوێنی": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گوتلە gutle "تۆڵ".

**کەتیفە** **ketîfe** [ *katīfa* ] - "سوانە، پاسارە": وشەی "سوانە" دە بنەڕەتدا "سەیوان" بووە، واتا "سایەبان". هەر بەم چەشنە "کەتیفە" پێوەندی هەیە بە ریشەی **> **skot-* (IE.)** "سێبەر، تاریکایی". وشەکانی چەتر çetır و چادر çadır لەم ریشەوە هاتوون. "کەتیفە" بەتایبەتی هەڵسەنگینە دەگەڵ shadow (E.)، schaduw (Nl.) "سێ، سایە". وشەی ↑چەتفە çetfe "دەسرۆکەی سەری عارەبان" دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**کەتیکانێ** **ketîkane** [ *katīkāne* ] - "کایەی قەمچان، پێنج بەردە": بنجی وشەکە کەت -ket ە کە دەبێ بە مانای "بەرد، ورکەبەرد" بێ. بڕوانە ↑کەت[7] ket. کەرتی دووەمی وشەکە، "کان" پاشگری بە کۆ کردنە [چەنددانە بەرد]، کەرتی دوایی، واتا پاشگری e پاشگری بە ناو کردنە [کردنە ناو]، وەک ململانێ، جێگۆڕکێ، سەرەتاتکێ، چنگەکڕکێ، پەلەکوتێ و هتد.

**کەتێ kete** *[ kate ]* - "کورکورە، ناوی مەلێک": قەتێ qete ش دەگوترێ. هەروەها ↑کەتەو ketew هەیە بە مانای "کۆخەی وڵاخی بەرزە". هەروەک لەژێر وشەی "کورکورە"دا شی کراوە، ئەم وشەیە ئاماژە بە "دەنگ" و هەرا، قاژ و قیژ" دەکا. هەر بەم شێوەیە "کەتێ" و "کەتەو"یش ئاماژە بە دەنگ و هەرا دەکەن و دەشێ شێوەیەکی دیکە بن لە ↑قاژ qaj و ↑قیژە *qîje*.

**کەچاچاڤ keçaçav** *[ kačāčāv ]* - "بیبیلەی چاو": هەروەک لەژێر وشەی "بیبیلە" و چەند شوێتیکی دیکەدا شی کراوەتەوە، ئەو وشانەی دە زمانی کوردمادی و زمانە ئەورووپییەکاندا مانای "بیبیلە" دەبەخشن، دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "بچووک، زارۆک، بەبە" دەکەن. هۆی ئەم دیاردەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤ دە رەشێنەی چاوی بەرانبەرەکەیدا وێنەی خۆی بە بچووککراوی دەبینێ، واتا وێنەی چاولێکەر بە ئەندازەیەکی زۆر چکۆڵە دە چاوی بەرانبەرەکەدا بە دیار دەکەوێ. دە "کەچاچاڤ"یشدا هەر ئەم پێوەندییە بەدی دەکرێ. "کەچ" پێوەندی هەیە بە ↑گچکە gıçke و ↑کچ *kıç*. وشەی "بیبیلە"ش پێوەندی هەیە بە "بەبە" و هەروەها "بیبی" یەوە.

**کەچک keçık** *[ kačık ]* - "کەوچک": کاچ kaç و کاچک kaçk یش دەگوترێ. قاشق qāšoq (P.)، خزمە دەگەڵ ↑قاچاخ qaçax [قاپ و قاچاخ دە بنەڕەتدا واتا قاپ و کەچک]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کاسە kase "قاپ" و مەبەست "قابی چکۆڵە"یە [کاسە+ ک (e)k + kasse]. کەچک پێشان و دە راستیدا قابێکی گچکەی دەسکدار بووە کە لە مەنجەڵیان ناوە و چێشتیان پێ هەڵ گرتووە. شێوەی ئەمرۆیی کەچک واتا کەرەستەی پێ خواردن و لە دەم نانی چێشت لەوە دەچێ شتێکی زۆر کۆن نەبێ و پێشتر بە دەست خواردوویانە و خواردەمەنی تراویش یان تێیان کوشیوە و بە دەست خواردوویانە یان هەر بە قابەکە هەڵیان قوراندووە.

[تێبینی: شتێک کە ئەم شی کردنەوەی سەرەوە پشتراست دەکا، وشەی "کەوچک"ە کە ئەویش مانای "کەچک" دەدا، بەڵام لە ریشەیەکی جیاوازەوەیە. وشەی کەوچک یان کەڤچک پێشتر "کەمچک" بووە و خزمە دەگەڵ "چەمچە" و دواتر "جام". واتا لێرەشدا مەبەست "جامی گچکە"یە].

**کەچەڵ keçel** *[ kačal ]* - "تاس، بێموو": کچل kačal (P.) و کل kal (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ kahl (G.)، kaal (Nl.)، callow (E.)، calvus (L.) "کەچەڵ". ریشەی وشەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک دەشێ پێوەندی هەبێ بە galdyti (Lit.) "پاک کردنەوە، لێکردنەوە".

**کەحلان keħlan** *[ kaħlān ]* - ↑کەحێل keħêl.

**کەحێل keħêl** *[ kaħel ]* - کەهێل keħêl و ↑کەحلان keħlan یش دەگوترێ. دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "ئەسپی حدوود" مانا کراوەتەوە کە ئەمەش لە مانا فارسییەکەیدا کراوەتە "اسب نجیب"! دیارە کەحێل یان کەحلان ناتوانێ خۆی بە مانای "ئەسپ" بێ، بەڵکوو دەبێ مانایەکی دیکەی هەبێ کە وەک ئاوەڵناو بۆ وەسفی جۆرێک لە "ماین" - نەک ئەسپ! - بەکار هاتووە. ئێمە نەمان بیستووە کە بڵێن ئەسپ ئاژەڵێکی کەحلانە! کاتێک نەمر حەسەن زیرەک دە گۆرانییەکیدا یارەکەی بە ماینی کەحلان دەشوبهێنێ، لەوە ناچێ مەبەستی یارێک بێ کە وەک "ئەسپی حدوود" یان "ئەسپی نەجیب" بووبێ. شتێکی ئەوتۆ نە دەگەڵ زەوقی حەسەن زیرەک دێتەوە و نە دەگەڵ درێژەی هەڵبەستەکەدا. بێگومان ئەو تایبەتمەندییەکی دیکەی یارەکەی لەبەرچاوە و ئەوەش لە توێی هەڵبەستەکەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێ. ئەو لە گۆشە نیگایەکی سێکسییەوە وەسفی یار دەکا و پێی حەیفە کە "گۆڵەبارگین"، واتا مێردی ژنەکە

دەگەڵ ئەو ژنە کە وەکماینی کەحلان وایە، رابوێرێ، بە وتەیەکی دیکە خۆزگە ئەو لەجیاتی گۆڵەبارگین دەگەڵ ژنەکە رایدەبوارد! جا ئەگەر لەم تیڕوانینەوە سەیری باسەکە بکەین، دەشێ کەحێل یان کەحلان بەراورد بکەین دەگەڵ geil ‹G.›، geil ‹OG.›، gal ‹OE.› "بە کەیف، بە زەوق و شەوق، زۆرخۆشحاڵ، بە پێز، گەشاوە، زەوەند" [دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە هەروەها باری سێکسی وەرگرتووە و بۆ وێنە مەبەست لە geile Frau ژنی بە زەوق و هەوەس هەستینە، geiligr ‹OIr.› "تیر و تەسەل، جوان"، gailus ‹Lit.› "توند و تیژ"، gails ‹Let.› "رازی، راحەت، *قایل*"، gailjan ‹Got.› و geilen ‹MG.› "خۆشحاڵ بوون"، سەر بە ریشەی ***< *ghoilo- ‹IE.›*** "کەف و کوڵ کردن". دە زمانی کوردمادیدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەیل keyl کە هەردوو مانای "شۆخ و شەنگ" و "پڕاوپڕ" دەگەیەنێ، هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قایل qayıl. ئەگەر سەرنجی وشە ژێرمەنییەکان بدەین، دەبینین کە وشەکە هەم بە چەشنی ئاوڵناو و هەم بە چەشنی کردار دەردەکەوێ. وێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا پێشتر هەروا بووبێ، واتا "کەحێل" [یان "کەحەل"] ئاوەڵناوەکە بووبێ و "کەحلان"یش کردارەکە. دوور نییە وشەی گیڵان gelan [گیلان gīlān ‹P.›] کە ناوی مەڵبەندێکە لەسەر دەریاچەی قەزوێن پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ئەو ناوچەیە بە هۆی باراناوی بوونی زۆر ناوچەیەکی بەپێز و زەوەند و گەشاوەیە و دەشێ ناوەکەشی ئاماژەیەک بەو تایبەتمەندییە بکا.

**کەد¹ ked** ‹ *kad* › - "کار، زەحمەت، رەنج": خزمە دەگەڵ ↑خەیدین xeydîn "تووڕە بوون"، سەر بە ریشەی ***< *kad- ‹IE.›*** "غەم، دەرد، ناخۆشی". هەر لەم پێوەندییەدا وشەی "کەدکار" بە مانای "رەنجبەر" یاخود "زەحمەتکێش" بە کار دەهێنرێ.

**کەد² ked** ‹ *kad* › - "ماڵ، خانوو": خزمە دەگەڵ ↑هۆدە hode.

**کەد³ ked** ‹ *kad* › - "پارچەدار": هەڵی سەنگینە دەگەڵ کۆتە1 kote 1 "1- قەدی دار 2- دارێک کە قەساب گۆشتی لەسەر لەت دەکا".

**کەدوون kedun** ‹ *kadūn* › - "جەڕەی ئاو": هەروەها کەدێنە kedene هەیە بەمانای "شەربەی سواڵەت".دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەتوو ketu "قەمتەر، ئاوبارە" و ↑کۆد kod "دەفری دارین".

**کەدە kede** ‹ *kada* › - "کوڕی چکۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑کودک kudık "بێچووی لاور".

**کەدەو kedew** ‹ *kadaw* › - نەخۆشییەکی ماڵاتە کە لە سەرمان تووشی دەبێ: دەشێ شێوەیەکی دیکە لە ↑جدەوە cıdew بێ.

**کەدی kedî** ‹ *kadī* › - "ماڵی، کەوی، دەستەمۆ": دەچێتەوە سەر ↑کەد ked بە مانای"ماڵ، خانوو". بەم جۆرە وشەکە مانای "ماڵی، بە ماڵ راهێنراو" دەدا. بنەوشەی "کەد" دە وشەکانی ↑کابان kaban و ↑کوێخا kuwexa شدا هەیە و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هۆدە hode.

**کەر ker** ‹ *kar* › - "گوێدرێژ، ئاژەڵی بارەبەر": خر xar ‹P.›. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ gerere ‹L.› "بارهەڵگرتن، کێشان، بردن".

[تێبینی: "کەر" دە زمانی کوردیدا مانای "گەوج، بێ ئاوەز"یشی وەرگرتووە کە لەوانەیە لەجێی خۆی نەبێ. دە زمانی ئاخاوتنی ئەڵمانیشدا وشەی Esel ‹G.› "کەر" بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێ و ئاماژە بە "گەوج، بێ ئاوەز" بوون دەکا. راستییەکی تاڵ هەیە کە ناتوانین لێرە باسی نەکەین و ئەویش ئەوەیە کە نەوعی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی سەرەڕای هەموو هزر و هۆشی خۆی لەهەموو نەوعەکانی سەر گوی زەوی گەوجانەتر ژیاوە و دەژی، بە جۆرێک کە نەک هەر داهاتووی خۆی وەک نەوعی مرۆڤ خستووەتە مەترسییەکی گەورەوە، بەڵکوو داهاتووی تەواوی سروشت و هەموو گیانلەبەرانی دیکەش].

**کەڕ ker 1** [ *kar* ] - "نەبیس، گوێ کپ": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑کڕ kır [قڕ و قەپ] "بێدەنگ"، ↑سڕ sîr [کرخت kerext (P.)] "تەزیو"، ↑ئوقرە(o)qre "ئارامی"، ↑سرەوتن sırewtın "ئارام بوون، لە جووڵە کەوتن"، ↑کورک kurık و هتد. گشت ئەم وشانە چەمکی "بێ هەست و خوست بوون" دەگەیەنن و لە ریشەیەکی هاوبەشەوە هاتوون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *kar- (IE.)** "سەخت، رەق". ↑خار *xar* "سەخت" و خاران xaran "سەخت بوون، رەق بوون" دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون. ئەوەی ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکا، ئەوەیە کە ↑کڕ kır بوونەوە بە مانای "توند بوونەوەی شل"یش بەکار دێ و هەروەها ↑کڕەک kırek مانای "نەجووڵ، جماد" و ↑کڕۆک kırok مانای "هەستی، ناوکی میوە (رەقایی)" دەدا. مەبەست لە کڕ یان سڕ بوون دە بنەڕەتدا ئەوەیە کە کەسێک یان شتێک لە دۆخێکی شلی و بزێوی و جموجۆڵدا دەچێتە ناو دۆخێکی رەق و توند و سەختەوە. هەر بۆیە ↑کەڕ ker [2] کردن دە زمانی کوردمادیدا مانای "خەست کردنەوەی تراو"یش دەگەیەنێ.

[تێبینی: هەر سەبارت پێوەندی دوو چەمکی "سڕ" و "کەڕ" شیاوی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی taub (G.) هەم بە مانای "کەڕ" و هەم بە مانای"سڕ" بەکار دێ و ئەمەش پێوەندی ئەم دوو چەمکە بەیەکەوە نیشان دەدا، واتا کەڕی دە ڕاستیدا سڕ بوونی گوێ یە].

**کەڕ ker 2** [ *kar* ] - "تیر، خەست": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ کەڕ ker 1 "گوێ کپ".

**کەڕا kera** [ *karā* ] - "گاشەبەرد": پێوەندی هەیە بە↑ کەڕ ker 1 "گوێ کپ". سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت".

[لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە کە دە کۆنەزمانانی K.P. دا وشەی "گارا" بە مانای "چیا، کێو" بەکار هاتووە. ئەم وشەیە ئەمڕۆ دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە [چیای گارێ لە کوردستان] و خزمە دەگەڵ "کەڕا" و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا کە هەموویان هەڵگری مانای "سەخت"ن. شیاوی باسە کە پێوەندی نیزیک لە نێوان چەمکەکانی "سەخت"، "بەرد" و "چیا"دا هەیە. بۆ وێنە وشەکانی "ئاستەم"، "هەستی" و "چیا" سەر بە یەک ریشەن].

**کەراک kerak** [ *karāk* ] - "هەوێردە": خزمە دەگەڵ ↑قەل qel.

**کەڕاکی kerakî** [ *karākī* ] - "ساخ، پتەو": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑خار xar دا باس کراون. هەموو ئەم وشانە مانای "سەخت، پتەو" دەگرنە خۆ. شیاوی باسە کە هەر وەک چۆن دوو وشەی "کەڕاکی" و "خار" خزمایەتییان دەگەڵ یەکدی هەیە، هەر ئاواش دوو وشەی "سەخت" و ساخ" لە یەک ریشەوە هاتوون.

**کەڕاندن kerandın** [ *karāndın* ] - "کرتاندن": خزمە دەگەڵ ↑کێرد kerd.

**کەرب kerb** [ *karb* ] - "دەرد و خەم": ↑کرێب kırêb 2ش دەگوترێ.

**کەربا kerba** [ *karbā* ] - "مەگیرانی، بێزوو": کەروایی kerway ش دەگوترێ. هەروەها کەرباندن kerbandın هەیە بە مانای "مەگیرانی کردن".

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *karo- (IE.)** "خۆش ویستن، حەزلێکردن، پێ خۆش بوون" و ببێتە خزم دەگەڵ ↑کەڵکەڵە kelkele "حەز و خولیا".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کرێب kırêb 2 "خەم و خەفەت" [تاسە؟].

**کەرپە kerpe** [ *karpa* ] - "بەربەستی ئاو، بەنداو":

[سەرەتا تێبینییەک: ئەگەر چاو لە وشەکانی *مەتاڵ* "سپەر، قەڵخان" و مەتەرێز "سەنگەر" بکەین، دەبینین کە ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کان، کەندن". هەروەها ئەگەر چاو لە مانای "سەنگەر" دە فەرهەنگی کوردمادیدا بکەین، دەبینین کە وەها مانا

کراوەتەوە: "چەپەر، خەل، مەتەرێز". هەروەها سەنگەر دە زمانی فارسیدا وەک "خەندەک، بەربەست" مانا کراوەتەوە. وەک لەم وشانە دەردەکەوێ، لەتیوان دوو چەمکی "خەندەک، قووڵکە" و "بەربەست، چەپەر"دا پێوەندییەک لە ئارادایە. ئەم پێوەندییەوە لەوەڕا پەیدا بووە کە سەرەتا ئەو وشانەی مانای "خەندەک و قووڵکە" دەبەخشن، بە مانای "بەربەست" بەکار هێنراون و پاشان ئەو وشانە بەگشتی مانای "بەربەست"یان وەرگرتووە].

ئەگەر لەم تیڕوانینەی سەرەوە بۆ ساخ کردنەوەی وشەی کەرپە kerpe بچین، دەبێ بەو وشانەی گرێ بدەین کە لەژێر ↑غوراب ğurab دا هاتوون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵکەندن، کۆڵین".

کەرت **kert** *[ kart ]* - "بەش، بڕ، لەت": دەچێتەوە سەر کرداری ↑کرتاندن kırtandın یان ↑قرتاندن qırtandın "بڕین، لەت کردن".

کەرتکین **kertkîn** *[ kartkīn ]* - "پەڕینی لێوارەی تیخ": دەچێتەوە سەر کرداری ↑کرتاندن kırtandın یان ↑قرتاندن qırtandın "بڕین، لەت کردن".

کەرتە **kerte** *[ karta ]* - "دەستەپەزی کەم ژمارە": دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک جار ئەو وشانەی ئاماژە بە کۆمەڵێک، دەستەیەک، ژمارەیەک لە گیانەوەران دەکەن، دەچنەوە سەر ئەو ریشەیانەی کە مانای "بڕین، لەت کردن" دەدەن و مەبەست دە بنچینەدا "بڕێک"ە [سەر بە کرداری بڕین]، واتا پاژێک لە گشت. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "ران" [گاران] یان "کەرک"، "کەڤاڵ" و هتد. هەر بەم شێوەیە کەرتە دەچێتەوە سەروشەی ↑کەرت kert "بڕ، لەت".

کەرتینە **kertene** *[ kartena ]* - "داوی جاڵجاڵووکە": کارتن kārtan و کارتنک kartonak (P.) "جاڵجاڵۆکە".

1- لەوانەیە وشەکە لە دوو بەشی کەر kar/کار ker [↑کر kır] و بنجی تەن -ten سەر بە کرداری ↑تەنین tenîn پێکهاتبێ. لەم تیڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "دەزووچن، جۆڵا، تەونکەر".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE. *ker(t)- >** "چنین، هۆنینەوە". وشەی ↑کر kır لەم ریشەوە هاتووە.

کەرجە **kerce** *[ karja ]* - "گەنە": کەرزک kerzık و کەرژە kerje ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کاراک karak "کان، مەعدەن"دا هاتوون، سەر بە ریشەیەک بە کانای "کراندن، خوراندن، رووشاندن".

کەرخ[1] **kerx** *[ karx ]* - "دەنگێ نووسان": ↑قرخە qırxe "دەنگی گەرووی نووساو".

کەرخ[2] **kerx** *[ karx ]* - "1- سنوور، کەوشەن 2- لا، ئاڵ": ↑قەراخ qerax.

کەرخ[3] **kerx** *[ karx ]* - "1- شوێن، شۆپ 2- جێ دروێنەی پاڵە لە رۆژێکدا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کاراک karak "کان، مەعدەن"دا هاتوون و ئاماژە بە "هەڵکەندن، هەڵکۆلین، کراندن، رووشاندن، ساوین" دەکەن. جێی بیر هێنانەوەیە کە وشەی "سەپان" پێوەندی بە "ساوین"ەوە هەیە.

کەرخ[4] **kerx** *[ karx ]* - "لەبەر چاو کەوتن، لە دل دان، بێزار بوون": ↑کەرخین kerxîn.

کەرخین **kerxîn** *[ karxīn ]* - "بێز کردن، لەدڵ دان، بێزار بوون": دەشێ وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑کرێت kıret "ناحەز، بێزراو، پیس، بەد" [کریه karīh (P.)] و ↑قرێژ qırej "پیس، چەپەڵ"]. دە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا (ل. 309) ئەم وشەیە دەبردرێتەوە سەر کریه kariha (Arb.) "رق لێ بوون، بێزار بوون". دەشێ ئەم وشە عەرەبییە خۆی لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

کەرچلاندن **kerçılandın** ‌[ *karčılāndın* ] - "تیکەڵ دان، ئاوێتە کردن": بنجی -kerç خزمە دەگەڵ ↑خرۆشان xıroşan و ↑هورووژان *hurujan*. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "تیکەڵ بوون، لێکدران، تیکوەردران" دەکەن.

کەڕڕە **kerre** [ *karra* ] - "زەوی بەردەڵان": خزمە دەگەڵ ↑ کەڕ ker1 "گوی کپ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای"سەخت".

کەرزین **kerzîn** [ *karzīn* ] - "لە سەرمان رەق بوون، تەزین 2- بەستەڵەک": بڕوانە ↑قەرسین qersîn "مەیین، توند بوون" و دواتر ↑خار xar "سەخت".

کەرژال **kerjal** [ *karžāl* ] - "کاری زۆر گران": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑خار xar "سەخت"دا باس کراون.

کەرد(وو) **kerd(u)** [ *kard(ū)* ] - "تەختەزەوی چاندن": کرت / کرد kerd / kert ‌(.P). خزمە دەگەڵ Garten ‌(.G) "باخ، باخچە" garden ‌(.E) "باخ، باخچە، حەوشە" و هەروەها yard ‌(.E)، geard ‌(.OE) "حەوشە"، garta "لەمپەربۆ ئاژەڵان"، gards ‌(.Sw) "ماڵ، حەوشە" وgard ‌(.Sw) "حەوشە"، hortus ‌(.L) و chorto ‌(.Gr) "باخچە، حەوشە"، gort ‌(.OIr) "کێڵکە"، gorod ‌(.Rus) "شار". چەمکی هاوبەش دە هەموو وشەکانی سەرەوەدا ئەوەیە کە ئەو شوێنانە دەوریان گیراوە واتا لەمپەر و پەرژینیان بۆ کراوە. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کورتان kurtan و ↑کورتەک kurtek.

کەرسل **kersıl** [ *karsıl* ] - "تەرسەقول، قەرسەقول": خزمە دەگەڵ ↑کەرسەک kersek "سندەگڵ، کلۆخاک".

کەرسەک **kersek** [ *karsak* ] - "سندەگڵ، کلۆخاک": خزمە دەگەڵ ↑گرس gırs(e) "توند و پێک چەسپاو، تۆڵا، قورسە". دواجار خزمە دەگەڵ ↑کەرسین kersîn "مەیین، وشک بوون"، ↑قەرسین qersîn "مەیین، توند بوون" و دواجار خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت".

کەرسین **kersîn** [ *karsīn* ] - "مەیین، وشک بوون": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەرسین qersîn "مەیین، توند بوون". دواجار خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت".

کەرش **kerş** [ *karš* ] - "عوور، ورگ": خزمە دەگەڵ ↑هەڕشان *herşan* "هەلا هەلا بوون، ورد بوون، لەت و پەت بوون، پلیخانەوە". ئەم وشانە و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەکن بە مانا "ورد بوون، هاڕین". هەر لەم خێزانەوشەیەدا ↑هەرسەک hersek هەیە بە مانای "هەزم، هەڵتاوانی خوادن".

کەرفتن **kerıftın** [ *karıftın* ] - "بێز هەستان لە خواردنێک": خزمە دەگەڵ ↑قرپ qırp.

کەرکیت **kerkît** [ *karkīt* ] - "ئامرازی کوتانی تەون، دفتە": کەر + کیت ker + kît. کەرتی یەکەم هەمان ↑کڕ kır بە مانای "رایەڵ و تەون"ە، کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ↑کوتان kutan. تیکڕا واتا ئەو ئامرازەی "کر"ی تەونی پێ دەکوترێ.

[تێبینی: وشەی "دفتە"ش کە ناوێکی دیکەیە بۆ "کەرکیت" خزمە دەگەڵ *تەپاندن* "لێدان"].

کەرک **kerk** [ *kark* ] - "1- لەت، پارچە 2- بەشێک لە مێگەل": بڕوانە ↑کەڕک kerk "برینگ".

کەڕک **kerk** [ *kark* ] - "برینگ": ناوێکی کۆنترە بۆ "برینگ" و دەبێتە خزم دەگەڵ Schäre ‌(.G) "بڕینگ، مەقەست". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑کەرک kerk و ↑کەرت kert "1- لەت، پارچە 2- بەشێک لە مێگەل" و↑کێرد *kerd* "چەقۆ" و ↑کرتاندن kırtandın و هتد.

کەرگ **kerg** [ *karg* ] - "مامر": کەڕکی kerkî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەل qel.

کەرگەدەن **kergeden** [ *kargadan* ] - "ئاژەڵێکی زڵە، شاخێکی بەناوچاوانەوە هەیە": کرگدن kargadan (P.)، بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا (ل. 309) ناوی ئەم ئاژەڵە دە زمانی سانسکریتدا khadgá.dhenu (OIn.)، "شمشیر، خەنجەر + مانگا" بووە، واتای "مانگای شمشێردار".

کەرمات **kermat** [ *karmāt* ] - "1- زۆر، زاڤ 2- بووژانەوە و گەشە کردنی شینایی": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑هەراو heraw. دە ئینگلیزی کۆندا rum (OE.) ئەم مانایانەی هەبووە: هەراو، بەربڵاو، زۆر و زەوەند، دڵئاوەڵە".

کەرمجین **kerımcîn** [ *karımjīn* ] - "کرمێ بوون": کەرمژین kerımjîn یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر وشەی ↑کرم kırım . فۆتیمی c یان j وەک ناوگری جەخت کردن دەور دەبینێ.

کەروێشک **kerwêşk** [ *karwešk* ] - "ناوی ئاژەڵێکی گوێدرێژ": کەرۆشک keroşk وکەرگوو (شک) kergu(şk) دەگوترێ. خرگوش xargūš (P.). ↑کەر ker + گووشک gûşk [↑گوێچکە gweçke]. وەک دیارە وشەکە ئاماژە بەوە دەکا کە گوێچکەکانی ئەم ئاژەڵە وەک هی کەر درێژە.

کەڕوو **keru** [ *karū* ] - " برش، کەپەک": دەچێتەوە سەر کرداری ↑کڕاندن kırandın. دە بنەڕەتدا واتا ئەو شتەی کە دەکڕێندرێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کرێژ kırêj، کە ئەویش لەوانەیە پێوەندی بە "کراندن"ەوە هەبێ. لەباری چۆتیتی دروست بوونی وشەکەوە، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "سایە[2]" واتا "ژەنگی ئاسن" وەرگیراو لە کرداری "سایین" [ساوین].

کەرە **kere** [ *kara* ] - "ڕۆنی لە شیر دروستکراو": کرە kare (P.). خزمە دەگەڵ creme (F.) کە دەچێتەوە سەر chrisma (L.) "ڕۆن، هەتوان" و لەوێشەوە بۆ chriein (G.) "چەورکردن، ڕۆن تێ هەڵسوون". Christus "ناوی *مەسیح*" لەم وشەیە وەرگیراوە و ماناکەی دەبێتە "(ڕۆن) تێهەڵسووراو، (بە ڕۆن) چەورکراو" ["مەسح" کردن واتا پێداماڵین، ڕێخشاندن، تێهەڵسوون، خزمیشە دەگەڵ "ماشتن" و "مشتوماڵ" دە زمانی کوردمادیدا]. ڕیشەی ئەو وشە ژێرمەنییانەی سەرەوە باس نەکراوە. بەڵام لەم زمانانەدا وشەیەکی دیکەش هەیە کە مانای "کەرە گرتن" دەدا و لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوەی سەرەوە هەبێ: kirnen (G.)، karnen (Nl.)، churn (E.). ئەم وشانەی دوایی دەچنەوە سەر ریشەی **< -ĝer*** *(IE.)* "سوونەوە، ڕێخشاندن" [سەرنج بدە کە وشەی "تێهەڵسوون" لە "ساوین یان سوونەوە" وەرگیراوە].

کەڕە **kere** [ *kara* ] - "کلۆبەفری وردی تەنکەڵە": دەچێتەوە سەر ریشەی **< -glei-, *gli*** *(IE.)* "پێوەنووسان، چەسپان". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە دێن، بۆ وێنە ↑گڵ gıl، ↑هەڕی herî، ↑غەڕە ġere و هتد. لەپاڵ "کەڕە" وشەی "کەڕەسیسە"ش دەگوترێ کە هەر ئەو مانایە دەدا.

[تێبینی: Schnee (G.) "بەفر" دە زمانی ئەڵمانیدا دەچێتەوە سەر ریشەی *-(s)neigh* *(IE.)* "پێوەنووسان، گلوو بوون". وەک دەبینرێ لێرەشدا "بەفر" پێوەندی بە چەمکی "پێکەوە نووسان، کلۆ بوون، گلوو بوون"ەوە پەیدا دەکا].

کەرەستە **keres(t)e** [ *karas(t)a* ] - "کەلوپەلی پێویست بۆ دروست کردن، ماتریاڵ": کەرەسە kerese ش دەگوترێ [تێچوونی فۆتیمی t]. دەشێ لە دوو کەرت پێک هاتبێ، کەرتی یەکەم کەر ker و کەرتی دووەمیش ستە یان ئەستە este-. لەم تێڕوانینەوە کەرتی یەکەم یان پێوەندی بە کرداری ↑کردن kırdın ەوە هەیە یان لە وشەی ↑کار kar وەرگیراوە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ هەیە heye [هەسە] و است est (P.) و دەگەڕێتەوە سەر ریشەی **< -es*** *(IE.)* " بوون،

وجوود". مەبەست لە کەرتەوشەی ئەستە -este [هەبوون یاخود وجوود] دەشێ "مادە یان مەواد" بووبێ و ئەمەش دەمانگەیەنێتەوە سەر چەمکی ماترِیاڵ یان مادە [مواد] ی دروست کردن و دە کار هێنان.

[تێبینی: دە زمانی ئاڵمانیدا wesen (G.) "وجوود، هەستی" وەک پاشگریش چەند وشەیەکی لێکدراو دروست دەکا و مانایەکی نیزیک بە وشەکەی سەرەوە دەبەخشێ، وەک Lebewesen (G.) "زیندەوەر، گیانلەبەر"، Bauwesen (G.) "هەموو ئەو شتانەی پێوەندییان بە دروست کردنی خانوو و رێگا و بانەوە هەیە" و هتد].

**کەرەسیسە keresîse** [ *karasīsa* ] - "کلۆبەفری تەنک و ورد". کەرتەوشەی ↑کەرە -kere بەم مانای "کلۆبەفری وردی تەنکەڵە" هاتووەو خزمیشە دەگەڵ ↑کلۆ kılo [کلۆبەفر]. هەروەها ↑سیس sîs لێرەدا دەشێ وەک جەخت کردن بۆ "کز و لاوازی" بەفرەکە بەکار هێنرابێ.

**کەرەفتوو kereftu** [ *karaftū* ] - "ئەشکەوتێک لە کوردستان": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا کە مانای "قووڵکە، قووڵایی، هەڵکەنراوی، قەبر، دەخمە" و هیتر دەبەخشن. ژمارەیەک لەم وشانە لەژێر ↑غوراب ġurab دا باس کراون. ئەم وشە کوردمادییە بەتایبەتی زۆر نیزیکە لە girophti (OG.) "گۆڕ" و Gruft (G.) "دەخمە، فەزای ژێر هەرد". وشەکە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑کەرەوەت kerewet "پێشخانە، راهرەو".

**کەرەنا kerena** [ *karanā* ] - "شەیپووری زل": کرنا karnā (P.). خزمە دەگەڵ Horn (G.)، (E.)، (Sw.)، cornu (L.) "شاخ، قۆچی ئاژەڵ"، kárā (Gr.)"سەر"، kéras (Gr.) "شاخ، قۆچ"، krāníon (Gr.) "کەللەسەر"، cerebrum (L.) "مێشک"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *ker-* "شاخ، قۆچ، سەر". جێی بیر هێنانەوە کە لە سەردەمانی کۆندا و [هەنووکەش] قۆچی ئاژەڵ وەک ئامرازی مووزیکی فوو تێکردن بەکار هێنراوە و دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە هەم مانای "شاخ، قۆچ" و هەمیش مانای "کەرەنا" دەدا. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قورنە qurne "گۆشە" [دە بنەڕەتدا "قۆچ"]. ئەم وشانەی سەرەوە دە زمانی عەرەبیشدا بەکار هاتوون، بۆ وێنە وەک نازناوی ئەسکەندەری مەقدوونی کە دوو شاخی هەبووە، واتا دوو شاخی لە خۆی ناوە: ذوالقرنین zulqarnayn (Arb.).

**کەرەە kereh** [ *karah* ] - "چڵکن، پیس، گەمار": شێوەیەکی دیکە لە ↑قرێژ qırej.

**کەرەکونتێ kerekunte** [ *karakunte* ] - "کەری بە تەواوی، هەرهیچ نەبیس": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑کەر[1] ker "نەبیس" و کونتێ kunte. فۆتیمی e لێرەدا زێدەیەکە خراوەتە سەر وشەکە و ئەسڵی وشەکە دەبێ "کونت" بێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ganz (G.)، ganz (OG.)، gans (Nl.)، ganska (Sw.) "تەواو، بەتەواوی، پڕاوپڕ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ئاخنین axınîn. شێوەیەکی دیکە لە وشە کوردمادییەکە کەرەنسۆ kerenso یە کە دەتوانێ پێشتر "کەرەکەنسۆ" بووبێ و سوانەوەی بەسەردا هاتبێ.

**کەرەنتوو kerentu** [ *karantū* ] - "جۆرێک داسی دەم پان": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *(IE.) *ghren-* "هاڕین، ورد کردن، هەڵپریواندن". ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دوورتری *(IE.) *ghreu-* "رێخشاندن، ساوین ، ورد کردن، هاڕین". شیاوی باسە کە لەنێوان چەمکی "ساوین" و "دروێنە کردن"دا پێوەندی هەیە، بۆ وێنە وشەی "سەپان" خزمە دەگەڵ "ساوین".

**کەرەوەت kerewet** [ *karawat* ] - "پێشخانە، راهرەو": خزمە دەگەڵ ↑کەرەفتوو kereftu "ئەشکەوتێک لە کوردستان".

**کەڕەهوو kerehu** [ *karahū* ] - "بای زۆر گەرم": پێک هاتووە لە دوو وشەی کەڕ ker و هوو hu. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ریشەی **< (IE.) *ker-** "سووتان، هایسان" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کوورە kure. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەی **< (IE.) *hwe-** "با هاتن، شنینەوە، لەرینەوە بەدەم باوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەوا hewa.

**کەری kerî** [ *karī* ] - "1- برِۆ لە مێگەل 2- کەرت، پاژ": وشەکانی "برِ" [برِێک] و "کەرت" دەچنەوە سەر دوو ریشە کە مانای "برِین، لەت کردن" دەدەن. هەر بەم جۆرە وشەی "کەری" خزمە دەگەڵ ↑کێرد kerd و کەرت kert و کرتاندن kırtandın سەر بە ریشەیەکی دیکە هەر بەم مانایە.

**کەریفۆک kerîfok** [ *karīfok* ] - "شەمەتریلکە": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "پێوە نووسان، چەسپان" دەبەخشن، وەک ↑کەرە kere "کلۆبەفری وردی تەنکەڵە" [دە بنەڕەتدا: کلۆ، پێکەوەنووساو]، ↑گڵ gıl، ↑هەری herî، ↑غەرە ğere و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *glei-, *gli-** "پێوەنووسان، چەسپان".

**کەرێزە kereze** [ *kareza* ] - "رێگەئاوی بە بن هەرددا کیشراو": ↑کارێز karez ش دەگوترێ.

**کەزاختن kezaxtın** [ *kazāxtın* ] - "هەڵپەرتاوتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑کزخاندن kızxandın.

**کەزی kezî** [ *kazī* ] - "پرچۆکە": کەژ kej یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قژ qıj و دواتریش ↑خەز xez "پێست، پێستە".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "موو" و "خەز" بەرهەفی بکە دەگەڵ وشەکانی "پێست، پووش، پەشم، بووزوو" لە لایەک و "بسک" لە لایەکی دیکەوە، یان دەگەڵ (G.) Harr "موو" و ↑خوری xurî (هری hırî) دە زمانی کوردیدا].

**کەزیگە1 kezîge 1** [ *kazīga* ] - "جۆگەی هەڵبەستراو بۆ ئاش": پێوەندی هەیە بە ژمارەیەک وشە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "برِین"، وەک ↑کووز kuz، ↑قاش qaş، ↑قاچین qaçîn، ↑گاز gaz، ↑گەستن *gestn*، ↑کشت kışt [کشت و کاڵ] و هتد. مەبەست لە "کەزیگە" ئەو شوێنەی هەردە کە "برِدراوە" واتا هەڵکەندراوە. [تێبینی: هەر ئەم پێوەندییە دە وشەکانی "جۆگە"، "شێلەگە"، "دێراو"، "کەنداڵ" و "رەهەند" یشدا دەبینرێ. ئەم وشانەش پێوەندییان هەیە بە چەمکەکانی "برِین، درِین، هەڵکەندن"ەوە].

**کەزیگە2 kezîge 2** [ *kazīga* ] - "دەماری ئەستوور": دەماری ئەستوور بە "جۆگەلە" چووێندراوە و لەبەر ئەمە پێی گوتراوە "کەزیگە". بروانە ↑کەزیگە1 kezîge 1 "جۆگە".

**کەزین kezîn** [ *kazīn* ] - "جۆگەی داپۆشراو": بروانە ↑کەزیگە1 kezîge 1 "جۆگە".

**کەژ1 kej 1** [ *kaž* ] - "کێو، شاخ": کاش kaş یش دەگوترێ.دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قۆچ qoç [قاچ] "بەرزایی، زۆپایی"، دەئەسڵدا "چەمانەوە و هەڵتۆقاویی" لەسەر زەوی.

**کەژ2 kej 2** [ *kaž* ] - "1- ئاوریشمی خاو 2- مووی بزنی مەرەزە": خزمە دەگەڵ ↑قژ gıj "موو".

**کەژ3 kej 3** [ *kaž* ] - "وەرزی ساڵ": خزمە دەگەڵ ↑کات kat "وەخت، دەم" و هەروەها ↑کەشە1 keşe "جار، کەرەت".

**کەژ4 kej 4** [ *kaž* ] - "سپی، مرۆڤی زگماک موو سپی": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەسک kesk سەر بە ریشەیەک بە مانای "بۆر، کەوە".

[تێبینی: وەک لە چەند جێگای دیکەش دەردەکەوێ، ناوی ڕەنگەکان لەچاو ڕیشەکانیانەوە هێندێک جار گۆڕانیان بەسەردا دێ یان سەرەڕای ڕیشەی هاوبەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە مانای جیاواز پەیدا دەکەن، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا دوو وشەی "کەوە" و "سپی" ["کبود" و "سپید" دە فارسیدا] لە یەک ڕیشەوە هاتوون. یان وشەی "بۆر" دە کوردمادیدا مانای "کەوە" دەبەخشێ کەچی دە فارسیدا بور būr (P.) مانای "کاڵ، مووزەرد" دەبەخشێ. نموونەیەکی دیکە blau "شین"ی ئەڵمانییە کە خزمە دەگەڵ flavus "زەرد"ی لاتینی. دە زمانی کوردمادیدا "شین" بە هەردوو مانای "سەوز" و "ئابی" بەکار دێ].

**کەژاڵ1 kejal** [ *kažāl* ] - "ئاسک": دە زمانی عەرەبیدا غزال ġezal (Arb.) دەگوترێ. وێ دەچێ زمانی عەڕەبی وشەکەی لە زمانی کوردمادی وەرگرتبێ. ئەم وشەیە لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیش، بۆ وێنە Gazelle (G.). هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کەژاڵ2 kejal.

**کەژاڵ2 kejal** [ *kažāl* ] - "1- بزنی گوێچکە سپی و ڕەش 2- چاوکاڵ": هەروەها کەژەڵ kejel هەیە بەم مانایانە: "پەزی سپی گوێ قاوەیی، بزنی کەوەی تاریک، ئاژەڵی ڕەش و سپی"، دەچێتەوە سەر ↑کەژ4 kej "سپی، سپیکەڵە".

**کەژاوە kejawe** [ *kažāwa* ] - "دیوەلکەی سەر پشتی وشتر بۆ تێدا سواربوون": کجاوە kajāve (P.). لەوانەیە لە ↑کەژ kej بە مانای "خوار، لار"وە هاتبێ و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑خێچ xeç، ↑خێس xes، ↑قیچ qîç و هتد. "کەژاوە" لەکاتی ڕۆیشتنی وشتردا وەک لانکە بەم لا و ئەولادا لار دەبێتەوە و ڕادەژی و ناولێنانەکەی دەشێ بۆ ئەم هۆیە بگەڕێتەوە.

**کەژوو keju** [ *kažū* ] - "بەندێکی پانی لە موو چنراوە لە تەنکەی دەواری دەبەستن": کەژ kej و کەژک kejık و کەژگ kejıg یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قژ gıj و ↑کەزی kezī و ↑خەز xez و چەند وشەیەکی دیکە بەمانای "موو، تووک".

**کەژین kejîn** [ *kažīn* ] - "تەنراو لە ئاوریشم": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کەژ kej "ئاوریشمی خاو".

**کەژێ keje** [ *kaže* ] - "وشەی بانگ کردنی کیژی جوان": خزمە دەگەڵ ↑حەز ħez. مەبەست لە "کەژێ" بریتی بووە لە "حەزی من". دە زمانی ئاڵمانیدا بۆ ئەم مەبەستە دەگوترێ: liebling. کەرتی یەکەمی ئەم وشە ئەڵمانییە مانای "خۆش ویستن، حەز کردن" دەبەخشێ، کەرتی دووەمەکەی پاشگری خۆش ویستنە. ئەگەر وشە ئەڵمانییەکە وەرگەڕێنینە سەر کوردمادی، دەبێتە "حەزیلێ، حەزیلە" یان "کەژیلێ، کەژیلە"!

**کەس kes** [ *kas* ] - "شەخس": کس kas (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ heit (OG.) "کەس، بوونەوەر، نەوع، جینس، تایبەتمەندی"، haidus (Gt.) "چوونییەتی، شێوە"، had (OE.) "کەس، بوونەوەر، شێوە، سروشت، جینس" و -keta (OIn.) "شێوە، نیشانە". دە زمانی ئەڵمانی ئەمڕۆدا -heit (G.) و هەروەها -keit (G.) کە شێوەیەکی دیکەی وشەکەیە، وەک دوو پاشگر زۆر چالاک دەگەڵ ناوی مانا بەکار دەهێنرێن. لەم پێوەندییەدا هەروەها ↑کەسم kesm "سەر و سیما، بیچم" جێگەی هەڵسەنگاندنە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی ***kai-* (IE.)** < "درەوشانەوە، گەشانەوە" و دەبنە خزم دەگەڵ ↑شاد şad.

**کەساخە kesaxe** [ *kasāxa* ] - "جاش پاڵتە، عەبای قووڵە تا سەر ئەژنۆ": ↑کەسەخ kesex یش دەگوترێ بە مانای "جۆرێک پاڵتەوی خوری".

**کەساس kesas** [ *kasās* ] - "حاڵ پەرێشان": خزمە دەگەڵ ↑کز kız. لەوانەیە کساد kasād (Arb.) "بێ رەونەق" پێوەندی بە "کەساس"ەوە هەبێ و لەوە دەچێ لە وشە کوردمادییەکە وەرگیرابێ.

**کەساندن1 kesandın 1** [ *kasāndın* ] - "هیشک کردن و هەڵگرتنی گوشت بۆ زستان": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑هەژگ hejıg و ↑هیشک hîşık سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووتان، هایسان".

**کەساندن2 kesandın 2** [ *kasāndın* ] - "1- سەرپەرستی کردن، مشوور لێ خواردن 2- خاترجەم کردن": لەوانەیە پێوەندی بە هاسان hasan [ئاسان asan] و ↑حەسانەوە ħesan(ewe) هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست پێکهێنانی *ئاسایش* و ئیتمینان بووبێ.

**کەسپ kesp** [ *kasp* ] - "سەربان تەپاندنەوە": ئەم وشەیە دەتوانین دەگەڵ چەندین وشەی دیکەدا لێک بدەینەوە کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکرێ. ئەم وشانە چەمکی "رەق، سەخت" و هەروەها "زەبر، لێدان" دەردەبڕن. پێش ئەوەی بچینە سەر باسی ئەم وشانە پێویستە ئاماژە بە پێوەندی ئەو دوو چەمکەی سەرەوە دەگەڵ یەکتر بکەین، بۆ وێنە وشەی "سەنگ" [سەخت، رەق] خزمە دەگەڵ "زەنگ" [زەبر و زەنگ] و هەروەها "جەنگ". وشەکانی *سەخت* "رەق، پتەو" و *زاگۆڕ* "پەیاغی ئەستوور" [ئامرازی لێدان] لە ریشەیەکن. هەر بەم شێوەیە دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشەی دیکە هەن کە ئەوانیش دەناو خۆیاندا ئەو پێوەندییانەی سەرەوە نیشان دەدەن، وەک کەسپ kesp "تەپاندنەوەی سەربان [هەم بە مانای "لێدان" و هەم بە مانای "رەق و پتەو" کردنی سەربان]، ↑کەسپک kespık "شەیتانۆکە" [ئاماژە بە قاوغە سەختەکەی ئەو جانەوەرە]، ↑کەسپۆ kespo "دەنکەخورما" [ئاماژە بە ناوکی رەقی خورما]، ↑قەسپ qesıp "خورمای رەق"، ↑قەسفین qesfîn "سڕ بوون لە سەرمان" [رەق هەڵاتن]، ↑کەسپەرە kespere "جۆرێک ساچمەی درشت" [ساچمە واتا بەرد، ئاسن بۆ لێدان]، ↑گۆسپە gospe "زەدە، عەیب"، اسیب asīb (P.) "زیان، زەدە"، ↑کۆسپ[2] kosp "سەختی، دژواری" و هتد. هەروەها لێرەدا بە دڵنیاییەوە دەبێ بڵێین کە وشەی عەرەبێنراوی قصف qesf (Arb.) "لێدان بە تۆپ و بۆمب" لە زمانی کوردمادی وەرگیراوە. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر بنچی "کەسپ" کە لە کۆندا دەبێ *ئاسەپ* *asep** بووبێ، پێکهاتوو لە پێشگری ئا a + سەپ sep. ئەم پێشگرە دەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو وشەی کورد و فارسیدا دێ کە لە ژێر پیتەکانی "ئا" و "ئە"دا دەبینرێن. هەرچی "سەپ"یشە، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*سفت sıft* "رەق، سەخت".

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا خێزانەوشەیەکی دیکەش هەیە کە ئەویش وەک ئەم خێزانەوشەی سەرەوە دروست بووە و چەندین لک و پۆی لێ بۆتەوە کە وێکچوونێکی تەواو دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە نیشان دەدەن. چەند دانەیەک لەم وشانە بریتین لە "ستەم" [زەخت و زۆر]، *ئاستەم* "سەخت، گران"، *هەستۆ* یان *هەستی* "1- ئێسک 2- ناوکی رەقی میوە"، *هەست* یان *خەست* "پەیت، توند" و هتد. هەموو ئەم وشانەش دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون". لێرەشدا دیسانەکە پاشگری "ئا" یان "ئە" دەور دەبینێ و شێوەکەشی بە "هە"، "خە" و "کە"، "گ(ە)" دەگۆڕدرێ: "ئەستەم"، "هەستی"، "خەست"، "کەستەک"، "گشت"، هەڵپەڕیتێکی گشت].

**کەسپەڕ kesper** [ *kaspar* ] - "1- چاوشین 2- چاوکاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کەژ[4] kej "کاڵ، سپیکەڵە".

**کەست kest** [ *kast* ] - "ناشیرین، دزێو":

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قێز qez "بێز، بێمەیلی".

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ بەرهەڤی بکەین دەگەڵ Geist ‎(G.)‎ "رووح، شەخس"، سەر بە ریشەی **< *(IE.) *gheis-*** "تووڕە، قەڵس". us-gaisjan ‎(Got.)‎ "راچڵەکاندن، ترساندن" و zaēša ‎(Av.)‎ "راچڵەکێنەر" لەم ریشەوە هاتوون.

**کەستەک kestek** *[ kastak ]* - "1- سندە 2- قورسە، دە قاڵب کراوی توندەوەبووکێ": هەروەها وشەی ↑کەسکوون keskun "توخ، توند" هەیە کە دەشێ پێوەندی بە "کەستەک"ەوە هەبێ. کەستەک خزمە دەگەڵ ↑خەست xest "توند، تۆخ" و هەروەها ↑گشت² gışt [هەڵپەڕینی گشت یان گشت کردنی هەڵپەڕین].

**کەسک kesk** *[ kasık ]* - "رەنگی سەوز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ hasan ‎(OG.)‎ "بۆری ئاماڵ قاوەیی" و hasu ‎(OE.)‎ سەر بە ریشەی **< *(IE.) *kaso-*** "بۆر".

[تێبینی: گۆرانی مانای وشەکە لە رەنگیکەوە بۆ رەنگیکی دیکە شتێکی دەگمەن نییە و دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک جار روو دەدا، وەک "بۆر"ی کوردمادی کە دە فارسیدا "کاڵ، مەیلەوزەرد" مانا دەدا و ئەو وشەیەش دەشێ دەگەڵ braun ‎(G.)‎ "قاوەیی" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا خزم بێ. نموونەیەکی دی blau "شین" دە زمانە ژێرمەنییەکاندایە کە دەزمانی لاتیندا دەبێتە flavus "زەرد"].

بە شێوەیەکی گشتی ئەو وشانەی کە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ئاماژە بە رەنگەکان دەکەن، دە بنچینەدا مانای "درەوشانەوە، تروسکانەوە"یان هەبووە، وەک ئەو رەنگانەی لە سەرەوە و هەروەها رەنگەکانی دیکەش. لەبەر ئەمە سروشتییە کە وشەی "کەسک" سەر بە ریشەی kaso- بێ بە مانای "درەوشانەوە". ئەم مانایە دە وشەی ↑کسکە kıske ی کوردمادیدا پارێزراوە کە بە مانای "بریقە، درەوشانەوەی چاوی جانەوەر" دێ.

**کەسکوون keskun** *[ kaskūn ]* - "تۆخ، توند، خەست": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەستەک kestek. وێ دەچێ وشەکە پێک هاتبێ لە *کەستگوون *kestgun*، گوون یان ↑گۆن gon مانای "چەشن، جۆر" دەبەخشێ.

**کەسکین keskîn** *[ kaskīn ]* - "مرۆڤی توندەمیزاج": بڕوانە ↑کەسکوون keskun.

**کەسم kesm** *[ kasm ]* - "سەر و سیما، بیچم": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەس kes.

**کەسمۆک kesmok** *[ kasmok ]* - "تەنگەنەفەس و پشووسوار": هەروەها ↑کەسمە kesme هەیە کە نەخۆشییەکی کەپۆی یەکسمە. خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە asthma ‎(Gr.)‎ "تەنگەنەفەسی"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *an-*** "هەناسەکیشان، شنینەوەی با".

**کەسمە kesme** *[ kasma ]* - "نەخۆشییەکی کەپۆی یەکسم": بڕوانە ↑کەسمۆک kesmok "تەنگەنەفەس و پشووسوار".

**کەسەخ kesex** *[ kasax ]* - "جۆرێک پاڵتەوی خوری": هەروەها ↑کەساخ kesax یش دەگوترێ بە مانای "جاش پاڵتەو". جگە لەمانە ↑گجی gıcî [گجک gıcık] "کراس" هەیە کە دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**کەسەر keser** *[ kasar ]* - "خەم و پەژارە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑قێز qez "بێز، بێمەیلی، بێزاری"، ↑خەیدین xeydîn، ↑کەد ked "رەنج، ئازار"، سەر بە ریشەی **< *(IE.) *kados-,* kedes-*** "رەنج، ئازار، ناخۆشی". دە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا (ل. 310) ئەم وشەیە براوەتەوە سەر کسر kesr ‎(Arb.)‎ "شکان". خۆ ئەگەر وشەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیرابێ، ئەوا باشتر رێک دەکەوێ دەگەڵ کدر keder ‎(Arb.)‎ "کەسەر، نیگەرانی، کۆڤان". لەوانەیە وشە عەرەبییەکە پێوەندییەکی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ.

**کەسیرە kesîre** [ *kasīra* ] - "تەزیو لە سەرمان": دەشێ پێوەندی بە ↑کزر kızır ەوە هەبێ و مەبەست دە بنچینەدا هیشک بوون و رەق هەڵاتن بە هۆی سەرماوە بووبێ.

**کەش1 keş 1** [ *kaš* ] - "جەو": [کەش و هەوا]. خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "پێست، پێستە، توێکڵ" دەکەن، وەک ↑قژ gıj "موو"، ↑کەژ2 kej 2 "مووی بزنی مەرەزە"، ↑قاشک qaşık "توێکڵ".لەم تیڕوانینەوە "کەش" دەبێتە "توێکڵ"ی دەوری زەوی.

**کەش2 keş 2** [ *kaš* ] - "ئەستیرەیەکی زۆر بە تیشکە": خزمە دەگەڵ ↑گەش geş.

**کەش3 keş 3** [ *kaš* ] - دەگەڵ "هەور" دێ [کەشەهەورێکی هێنا و باری]. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە زۆری، پڕانی، پێکەوەیی دەکەن، وەک ↑گیشە gîşe [گیشەگیا] یان کۆش² koş [کۆشێک منداڵ].

**کەشتی keştî** [ *kaštī* ] - "پاپۆڕ، گەمێ": کشتی keštī (P.). دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Schiff "کەشتی" دە سەردەمی کۆندا بە مانای "جۆرە دەفر" ێکیش بەکار هاتووە. هەروەها گەر بڕوانینە وشەی گەمێ geme دەبینین کە دەگەڵ وشەی جام cam "دەفر" خزمە. ئەم سەرنجانە رێگەمان پێ دەدا بیر لەوە بکەینەوە کە کەشتی keştî دەگەڵ ↑کاسە kase و ↑کاشی kaşî خزمایەتی هەبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەشتیلە keştîle "ئەسکوێ، مەلاقە".

**کەشتیلە keştîle** [ *kaštīla* ] - "ئەسکوێ، مەلاقە": وەک لە سەرەوە باس کرا، "کەشتی" بە زمانی ئەڵمانی دە سەردەمە کۆنەکاندا بە مانای "جۆرەدەفرێک"یش بەکار هاتووە. هەروەها ئاماژە بەوە کرا کە دە زمانی کوردمادیشدا وشەکانی ↑کاسە kase و ↑کاشی kaşî دەشێ پێوەندیان بە "کەشتی"یەوە هەبێ. دیسان باس لەوە کرا کە گەمی "کەشتی" و *جام* "دەفر" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. دە راستیدا "گەمێ" جامێکی گەورەیە یاخود "کەشتی"، کاشی یان کاسەیەکی گەورەیە. کەوابوو مانای بنەڕەتی کەشتیلە "مەلاقە" بریتییە لە دەفر یان "کاسەی بچووک" کە خواردەمەنی پێ هەڵ دەگیرێ یان پێی تێ دەکرێ، بە پێچەوانەی کاسە یان کاشی کە خواردەمەنی تێ دەکرێ یان تێیدا رادەگیرێ. ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجە، ئەمەیە کە وشەی کەچک keçk [قاشق qāšoq (P.)] پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا و ئەمیش هەر پێک هاتووە لە بنجی "کەچ-" یان "قاش-" بە مانای "کاسە، کاشی" و هەروەها پاشگری گچکاندن. دیسانەکە ئەگەر واوەتر بڕۆین و سەیری وشەی "کەوچک" [کەڤچک] بکەین، دەبینین کە ئەمیش پێشتر "کەمچک" بووە و بە شێوەی "کەمچە" و "چەمچە"ش خۆ نیشان دەدا و دەچێتەوە سەر وشەی "جام". کەوابوو مانای بنەڕەتی ئەم وشانەش دەبێتە "جامی بچووک"، هەروەک چۆن لەسەرەوە باس لە "کاسەی بچووک" کرا.

**کەشخە keşxe** [ *kašxa* ] - "جوان، لەبەردڵان": ↑قازاخ qazax یش دەگوترێ [ جوان و قازاخ]. خزمە دەگەڵ ↑قەشقە qeşqe "ئارزوو" و ↑حەز *ħez* "خواست، ئارەزوو". مانای بنەڕەتی وشەکە "بەپێی خواست و ئارەزوو" بووە، واتا ئەو شتەی حەزی لێ دەکرێ. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "خۆشیک"ی کوردمادی و "خوشکل"ی فارسی بە مانای "جوان". ئەم وشانەی دوایی دەچنەوە سەر "خۆش" [خۆش لێ هاتن]. لێرەشدا "خۆش" یان "خۆشیک" ئەو شتەیە کە مرۆڤ حەزی لێدەکا، (دڵی) دەیخوازێ. دە زمانی فارسیدا کاشکی kāškī (P.) هەیە بە مانای "بریا، خۆزگە". دە زمانی فارسیدا و تا رادەیەک دە کوردمادیدا ↑قەشەنگ qeşeng یش بە مانای جوان بەکار دێ. وێ دەچێ ئەم وشەیە هەر "کەشخە" بێ کە فۆنیمی n وەک زێدە کەوتووەتە ناوییەوە.

**کەشک1 keşık** ‌[ *kašık* ] - "شیرێژی وشککراو": کشک kašk ‌(P.). خزمە دەگەڵ Käse ‌(G.)، cheese ‌(E.)، kaas ‌(Nl.). ریشەی وشە ژێرمەنییەکان دەگەڕێتەوە بۆ caseus ‌(L.) "پەنیر". دەبێ ↑سزک sızık یان ↑سزگ sızıg "ئاوی پەنیر، تیژاوی دۆ" پێوەندی بەم وشەیەوە هەبێ.

**کەشک2 keşık** ‌[ *kašık* ] - "سپی": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەژ4 kej "سپی، کاڵ، سپیکەڵە".

**کەشکەئەژنۆ keşkejno** ‌[ *kaškažno* ] - "ئێسکی سەر ئەژنۆ": پێک هاتووە لە کەشک + ئەژنۆ keşık + ejno. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە و رەنگە شێوەیەکی کۆنتر بێ لە ↑کاسە kase "دەفر". کەرتی دووەم ↑ئەژنۆejno یە و تێکڕای وشەکە مانای دەبێتە "کاسۆکەی ئەژنۆ". ئەم ئیسکە شێوەیەکی وەک پیاڵەی هەیە و بۆیە ئەوها ناو نراوە.

**کەشکۆڵ keşkol** ‌[ *kaškol* ] - "1- فینجانی فەغفووری 2- قاپیلکی دەروێشان کە سواڵی پێ دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑کاشی kaşî و ↑کاسە kase و دەشێ مەبەست سەرەتا کاسەی بە *کۆڵ* دادان بووبێ.

**کەشۆیلە keşoyle** ‌[ *kašoyla* ] - "خەزایی، ناوی پەلەوەرێک": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑قاژوو qažū. وشەی ↑خەزایی xezayî پێوەندی بە "خەزا" و کوشت و بڕەوە نییە و شێوەیەکی دیکە لە "کەشۆیلە" [قاژوولە].

**کەشە1 keşe** ‌[ *kaša* ] - "جار، کەڕەت": خزمە دەگەڵ ↑کایە kaye "بازی، نۆرە یان گەڕی بازی". لە شاری مەهاباد و دەورو بەر ئەوەندەی من لە بیرم بێ، وشەی کایە بە مانای "جار، کەڕەت"یش بەکار دەهێنرا، بۆ وێنە دەگوترا "ئەو کایەی ئەگەر هاتمەوە..."، واتا "ئەو جار کە هاتمەوە". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑کەژ3 kej "وەرزی ساڵ" و ↑کات kat "دەم".

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی "کات" و "جار"دا پێوەندی هەیە، بۆ وێنە وشەی "جار" دە زمانی کوردیدا خزمە دەگەڵ eeuw ‌(Nl.) "سەدە" [دە بنەڕەتدا: سەردەم"]، ævi ‌(OIsl.) "دەم، هەرمانەتی"، aevum ‌(L.) "دەم، هەرمان، ژیان"، aion ‌(Gr.) "دەم، تەمەن، هەرمانەتی". هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی "دەور" بە مانای "گەڕ، نۆرە" بدەین، دەبینین کە ئەویش مانای "کات" دەبەخشێ، وەک "دەوری قەدیم"، "دەور و زەمانە"، "دەوران" و هتد].

**کەشە2 keşe** ‌[ *kaša* ] - "تیڵای لە دەستان خۆش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گەز gez.

**کەشەف keşef** ‌[ *kašaf* ] - "سینی": وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاسە kase "دەفر". پێوەندی ئەم دوو وشەی سەرەوە لەباری ماناوە هەڵسەنگینە دەگەڵ "تاس" [جامتاس، تاسکڵاو] و "تەشت".

**کەشیدە keşîde** ‌[ *kašīda* ] - "پێچی زەردی حاجی": دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑کەشک2 keşık و↑کەژ4 kej "سپی، کاڵ، سپیکەڵە". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێ ئاماژە بە رەنگی زەرد و کاڵی پێچەکە بێ.

**کەف1 kef** ‌[ *kaf* ] - "کۆمەڵەبڵقێکی پێکەوەنووساو": کف kaf ‌(P.)، kafa ‌(Av.)، kapha ‌(OIn.). خزمە دەگەڵ Schaum ‌(G.)، skum ‌(OG.)، schium ‌(Nl.)، skum ‌(Sw.) "کەف" [دە ئەسڵدا بە مانای "داپۆش"]، سەر بە ریشەی **< -*(s)keu** ‌**(IE.)** "داپۆشین".

**کەف2 kef** ‌[ *kaf* ] - "پەراوێز، کەنارە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆبە kobe "قەراخی دادرواو، پەراوێزی جل و بەرگ": خزمە دەگەڵ Saum ‌(G.)، zoom ‌(Nl.)، seam ‌(E.)، söm ‌(Sw.) "قەراخ، پەڕاوێز". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەستن، دروون". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ↑ سوژن sujın.

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆنۆلۆژییەوە کەف2 و وشە خزمە ژێرمەنییەکان هەڵسەنگینە دەگەڵ کەف1 kef و وشە ژێرمەنییەکانی خزمی].

**کەفاک kefak** [ *kafāk* ] - "تەپڵەسەر": خزمە دەگەڵ Giebel (G.)، gevel (Nl.)، gavel (Sw.) "نووک، دەرپەریوی، جەمسەر"، gebal (OG.)، kephalé (Gr.) "سەر، کەللە"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *ghbh-(o)l-*** "دووفاقە بوون، دووحاچە بوون".

**کەفتانی keftanî** [ *kaftānī* ] - "جۆرێک سەبیلەی کلکدرێژ": بنجی کەف(ت) kef(t)- لەوانەیە جۆرێکی دیکی بێ لە بنجی سەب seb- [↑سەبیلە sebîle].

**کەفش kefiş** [ *kafiš* ] - "1- پەیدا، خویا 2- بن باخەڵ": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ کاوش kāveš (P.) "کۆڵین، هەڵکەندن"، سەر بە کرداری کاویدن kāvīdan (P.). لەم مانایەوە مانای "کۆڵینەوە، لێکۆڵین، بەدوادا گەڕان" پەیدا بووە و دە زمانی کوردمادیشدا مانای "دۆزینەوە، پەیدا کردن" دروست بووە. وەک ئاشکرایە دەتیوان دوو چەمکی "بە دوادا گەڕان" و "پەیدا کردن"دا پێوەندی نیزیک هەیە. هەر بۆیە دە زمانی کوردمادیدا "دۆزین" مانای "لێگەڕان" و "دۆزینەوە" مانای "پەیدا کردن" دەبەخشێ. زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی وەرگرتووە و کردوویە بە کشف keşf (Arb.) "پەیدا کردن، دۆزینەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی و فارسی کە لەژێر ↑کون kun دا باس کراون. ئەم وشانە بە گشتی ئەم مانایانە دەردەبڕن: کون و کەلێن، قووڵایی، قوڵکە، کۆڵین، هەڵکەندن و هتد.

[تێبینی 1: هەر لەسەر پێوەندی دوو چەمکی "بە دوادا گەڕان" و "پەیدا کردن" دەتوانین ئاماژە بە وشەی فارسی یافتن yāftan بکەین بە مانای "پەیدا کردن، دۆزینەوە". ئەم وشەیە شێوەی کۆنتری کردارە فارسییەکەی سەرەوە، واتا کاویدن kāvīdan (P.) "کۆڵین، هەڵکۆڵین"ە. وێ دەچێ دە کۆندا کردارێکی لە چەشنی *گاپتەن* *gapten** لە ئارادا بووبێ بە مانای "کۆڵین، قووڵ کردن" و لەمەوە دواتر دوو کردار (دوو وشە)ی فارسی، یەکەم کاویدن kāvīdan "کۆڵین، هەڵکۆڵین" و دووەمیش یافتن yāftan بە مانای "پەیدا کردن" سەری هەڵدابێ. تێبینی 2: هەروەها سەرنجی پێوەندی دوو وشەی کوردی "کۆڵین، هەڵکۆڵین" و "لێکۆڵین، لێکۆڵینەوە" بدە].

**کەفشیف kefşîf** [ *kafšīf* ] - "سوێنەی کەشک تێدا سوونەوە": پێک هاتووە لە دوو کەرتی کەف + شیف kef + şîf. کەرتی کەف kef- شێوەیەکی دیکەیە لە قاپ[1] qap "دەفر". کەرتی şîf- شێوەیەکی کۆنترە لە بنجی کرداری ↑ساوین sawîn "سوونەوە". بەم جۆرە مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "قاپی ساوین" واتا قاپی تێدا سوونەوە.

**کەفک kefk** [ *kafk* ] - "قووچەکەی جلدروو کە دە سەری قامکی دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑کوڤک kuvık "رەحەتی، ئامرازێکی دەم ڤاڵا بۆ تێرژاندنی تراو".

**کەفکانی kefkanî** [ *kafkānī* ] - "قۆچەقانی، قەڵماسک": خزمە دەگەڵ ↑کەفاک kefak "تەپڵەسەر"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *ghbh-(o)l-*** "دووفاقە بوون، دووحاچە بوون". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قەفەڵ qefel "چەتاڵ".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە "قۆچەقانی" دەگوترێ "فلاخن". ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ "پڵۆسین" و "فەلاقە"ی کوردمادی بە مانای "لێدان"].

**کەفەڵ kefel** [ *kafal* ] - "سمت": هێفەل hefel ش دەگوترێ.

1- وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ↑ سمت sımt. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ Hüfte (G.) "سمت" و cubitum (L.) "ئانیشک"، سەر بە ریشەیەک بە مانای"چەمانەوە".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑گاو[2] gaw "شەقاو، لۆقاو".

**کەفەڵووک kefeluk** [ *kafalūk* ] - "سست و بۆش (متخلخل)": دەچێتەوە سەر بنجی کەف -kef و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا هاتوون. دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوەیە کە شتەکە کون و کەلێنی زۆر تێدایە. کەرتی دووەمی وشەکە پاشگرە.

**کەفەن kefen** [ *kafan* ] - "سپی، چەرمگ": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe و دواتر ↑سپی *sıpî* [دە فارسیدا "کبود" دەبێتە کەوە و "سپید" دەبێتە سپی].

**کەڤا keva** [ *kavā* ] - "ورتکەنان کە بۆ چنینەوەی پەلەوەر دەیرێژن": بڕوانە ↑کەڤاشتن kevaştın.

**کەڤال keval** [ *kavāl* ] - "دەستە(پەز)، کەرتە(پەز)، بەشێک (لە مێگەل)": بڕوانە ↑کەڤاشتن kevaştın.

**کەڤاشتن kevaştın** [ *kavāštın* ] - "ورد ورد کردن، کەرت کەرت کردن": هەروەها ↑کەڤا keva هەیە بە مانای "ورتکە نان کە بۆ چنینەوەی پەلەوەر دەیرێژن". جگە لەمە ↑کەڤال keval هەیە بە مانای "دەستە(پەز)، کەرتە(پەز)، بەشێک (لە مێگەل)". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قەمە *qem(m)e* "شمشێری کورت" و ↑قیمە qîme "وردکراو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەت کردن، کەرت کردن". هەروەها دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گەواڵ gewal [هەورەکان گەواڵ گەواڵ هاتن، واتا دەستە دەستە]. کەڤاڵ یان گەواڵ دە بنەڕەتدا واتا لەتێک لە گشت.

[تێبینی: وشەکانی "کەرکە" و "کەرت"یش هەر ئەم مانایە دەبەخشن خزمن دەگەڵ "کرتاندن" و "کێرد" و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لەت کردن"].

**کەڤچ kevç** [ *kavč* ] - "چەوت، خوار": کەمچ kemç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گەوج gewc و ↑گەمژە *gemje* "شێتۆکە، کەم ئاوەز".

**کەڤر kevır** [ *kavır* ] - "بەرد": کەموور kemur یش دەگوترێ. هەروەها ↑کەڤراندن kevırandın هەیە بە مانای "سەنگسار کردن". خزمە دەگەڵ Hammer (G.)، hamer (OG.) و (OE.) و (OF.) "چەکوش، چەکوچ". ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا بە مانای "بەرد" بوون، دواتر بوونە "چەکوشی بەردین" و دواجاریش "چەکوچ". خزمە دەگەڵ kamen (Rus.)، akmuo (Lit.) "بەرد"، akmon (Gr.) "بەرد، سندان، ئاسمان"، asman (OIn.) "بەرد، ئاسمان"، سەر بە ریشەی **< *akmen- (IE.)** "بەرد". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئاسمان asman و Himmel (G.) "ئاسمان". پێوەندی دوو چەمکی بەرد و ئاسمان لەوەدایە کە مرۆڤانی سەردەمانی زوو ئاسمانیان وەک "تاقێکی بەردین" هاتووەتە بەرچاو کە هەردی داپۆشیوە. وشەکە دیسان دەبێتە خزم دەگەڵ↑هیم hîm [خیم xîm] "1- بەردی زل، گاشە بەرد 2- بناخە" و هەروەها گەلێک وشەی دیکە کە لەژێر ↑حەمرین ħemrîn دا باس کراون. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑قەورە qewre "بربەند، ئامرازی تیژ کردن" هەیە کە دە بنەڕەتدا مەبەست "هەسان" بووە.

[تێبینی 1: قەورە یان هەسان دە زمانی فارسیدا پێی دەگوترێ "سوهان". جێی ئاماژەیە کە هەر سێ وشەی "قەورە"، "هەسان" و "سوهان" مانای "بەرد" دەبەخشن. وشەی "سوهان"ی فارسی خزمە دەگەڵ *سۆکی* "ئامرازی ساوار کوتان" و *سۆکین* "هیم، بناخە". تێبینی 2: ریشەکەی سەرەوە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر، واتا *ak- (IE.)* "تیژ ، نووک تیژ". لەلایەکی دیکەوە ریشەیەکی دووەم هەر لەم پێوەندییەدا دروست بووە کە بریتییە لە ریشەی **< *kem- (IE.)** "داپۆشین". ژمارەیەک وشە وەک Hemd (G.) "کراس" و ↑جامە came دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە].

**کەڤراندن kevırandın** [ *kavırāndın* ] - "سەنگسار کردن": بڕوانە ↑کەڤر kevır "بەرد".

**کەڤز keviz** [ *kavız* ] - "قەوزە": شێوەی پێشووتری ↑قەوزە qewze. هەروەها کەڤزین kevzîn هەیە بە مانای "بۆگەن بوونی ئاوی وەستاو" [دە بنەڕەتدا: قەوزە گرتن]. جگە لەمە ↑کەڤشک kevşık هەیە بە مانای "کرێژی سەر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schuppe (G.) و scuobba scuoppa (OG.) "کرێژ" [دە بنەڕەتدا: پووڵەکە ماسی کە دەکرێندرێ و لێ دەکرێتەوە]، skove (Norw.) "توێخ". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی کەڤل kevıl [↑کەوڵkewıl] "پێستی داڕندراوی ئاژەڵ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. سەرنج بدە کە کەڤڵ یان کەوڵ تەنیا بۆ پێستی داڕندراو بەکار دێ، نەک بۆ پێستی ئاژەڵی زیندوو. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ schaben (G.) "ساوین، کڕاندن، تاشین" و ↑ساوین sawîn. هەر بۆیە دە زمانی کوردمادیدا ↑کەڤلۆ kevlo ش هەیە بە مانای "1- کەتایی دەمی تیخ 2- تیخی کەت و *سواو*". کەوابوو "کەڤز"، "کەڤشک" و "کەڤل" ئەو شتانە بوون کە بە داڕنین و کڕاندن لێکراونەوە و بۆیە وەها بەناو کراون. هەروەها بڕوانە ↑کەواڵ2 kewal "1- پێستی مار2- قەباڵە".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە قەوزە دەگوترێ خزە xaze. ئەم وشە فارسییە ئەگەرچی بڕێک وێکچوون دەگەڵ وشە کوردمادییەکە نیشان دەدا، بەڵام خزمایەتی دەگەڵ ئەو نییە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ خەز xez ی کوردمادی و خز xaz (P.) "پێستی ئاژەڵ". وەک دەبینین لێرەشدا پێوەندییەک دەتیوان پێستی لێکراوەی ئاژەڵ و هەروەها قەوزەدا هەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ قڕ "تووک" و *قاشڵ* "تۆکڵ" و *قاشە* "ماسی پووڵەکەدار" و هەمووشیان دەچنەوە سەر ریشەیەک کە ئەویش مانای "بڕین، تاشین، لێکردنەوە" دەدا].

**کەڤزین kevzîn** [ *kavzīn* ] - "بۆگەن بوونی ئاوی راوەستاو": دەچێتەوە سەر ↑کەڤز keviz "قەوزە" و دە بنچینەدا مەبەست "قەوزەگرتنی ئاوی راوەستاو"ە.

**کەڤشک kevşık** [ *kavşık* ] - "کرێژی سەر": بڕوانە ↑کەڤز keviz "قەوزە".

**کەڤک kevık** [ *kavık* ] - "بۆسۆ": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe و دواتر ↑*سووتان sutan* [شەوتین şewtîn].

**کەڤلوو kevlu** [ *kavlū* ] - "1- ناوبەر، پشوویەک یاخود فاسیلە لەکاتی باریندا 2- دەرفەت ". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کون kun [کونتر: **gapen* ] "کەلێن، درز، قەڵش". مەبەست لە کەڤلوو دە بنەڕەتدا "درز یان کەلێن"ێکی بچووکە. جا ئەو کەلێنە واتا پێکهاتنی فاسیلەیەک دەتوانێ وەک پشوو، ناوبەر یان وەک دەرفەت و دەرەتان بەکار بهێندرێ.

**کەڤلۆ kevlo** [ *kavlo* ] - "1- کەتایی دەمی تیخ 2- تیخی کەت": خزمە دەگەڵ کەڤل kevıl [↑کەوڵ kewıl] و ↑*کەڤز keviz* "کرێژەبەرد"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، ساوین، تاشین".

**کەڤن kevın** [ *kavın* ] - "کۆن، لەمێژینە": ↑کۆن kon یش دەگوترێ، کە ئەمە شێوەیەکی گۆڕدراو و تازەتری وشەکەیە. کهنە kohne (P.) پێشتر: کهن kohan (P.). بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی: > **kafna (OIra.)* "کەڤن" > **kap- (OIra.)* "کەوتن". لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ "لەکارکەوتە". لەوە دەچێ وشەی کاهن kahin (Arb.) "پیر و شێخی بوودایی" لە وشە فارسییەکە وەرگیرابێ. وشەی "شێخ"یش پێوەندی بە چەمکی "پیر"ەوە هەیە.

**کەڤنک kevınık** [ *kavınık* ] - "چارەکەی تەنکی سەری ژنان": کەڤینک kevnîk یش دەگوترێ بە مانای "پێچی سەر پیاوان". هەروەها ↑کەڤنی kevnî هەیە بە مانای "جاڵجاڵووکە" [تەونکەر] و کەڤنکی پیرێ kevınkîpîrê "تەونی جاڵجاڵووکە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ spinnen (G.) "تەون کردن، چنین" و هەروەها Spinne (G.) "جاڵجاڵووکە". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑*ساباتsabat*

"کەپر". لەوانەیە کەفی kefî [کەفیە، ↑کۆفی kofî، کۆفیە] "جۆرێک سەرپۆشی ژنان" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی s بۆ k بەرهەڤی بکە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک "سفت کەڤۆت"، "ساوین و کەوڵ"، "سۆکین و کۆک" و هتد].

**کەڤۆت kevot** *[ kavot ]* - "دارێکی جەنگەڵی سەخت": کەوت kewıt و کەبۆت kebot یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سفت sıfît.

**کەڤەر kever** *[ kavar ]* - "1- سپی واش 2- بزنی بەڵەک 3- بزنێک کە گوێچکەی پنۆک پنۆکە": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe.

**کەڤەز kevez** *[ kavaz ]* - "بەڵەک، خاڵخاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe.

**کەڤەژ kevej 1** *[ kavaž ]* - "توێخی پێست": خزمە دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl "پێست" و ↑*کەڤز kevız* "قەوزە".

**کەڤەژ kevej 2** *[ kavaž ]* - "سووتانی پێست": خزمە دەگەڵ ↑کەڤک kevık "بۆسۆ".

**کەڤی kevî 1** *[ kavī ]* - "ڕنوو، شاپە، شەپە": کەڤێلە kevele ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑شاپە şape [شەپە şepe].

**کەڤی kevî 2** *[ kavī ]* - "لێواری دەفر": کەڤیلۆک kevîlok ش دەگوترێ. مانای ئەسڵی وشەکە "زارک"ە و دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین". دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کون kun.

**کەڤی kevî 3** *[ kavī ]* - "قەراخ چەم، کەناراو": لە سەرتر باس کرا کە *کەڤی²* "لێواری دەفر" دە بنەڕەتدا مانای "زارک، دەم" دەدا. دە زمانی کوردیدا لەباتی "لە قەراخ چەم" دەشگوترێ "لەدەم چەم" [لە دەم چۆم و ئاوان]. لە هەردوو مانای سەرەوەدا دە بنەڕەتدا وشەی "کەڤی" ئاماژە بە "دەم داپچڕین" و دروست بوونی قووڵایییەک دەکا. لە دۆخی یەکەمدا مەبەست قووڵایی ناو شەربەکەیە و لە دۆخی دووەمدا قووڵایی هەردە کە چۆمەکە پێیدا تێ دەپەڕێ. بەم شێوەیە مانای وشەکە لە "زارک، دەم"ەوە بۆ "لێو، لێوار" و دواتر "قەراخ" پەرەی گرتووە.

**کەڤیز kevîz** *[ kavīz ]* - "پێوانەیەکی دەخڵە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- ↑قاپ qap "دەفر".

2- ↑کەمچە kemçe [کەڤچی، کەوچک].

**کەکلێ kekle** *[ kakle ]* - "کەو": وشەی "کەو" ئاماژەیە بە ڕەنگی پەلەوەرەکە، بەڵام وشەی "کەکلێ" ئاماژە بە دەنگێ و هەرا و خوێندنی کەو دەکا و خزمە دەگەڵ ↑قاقا qaqa.

**کەکەو kekew** *[ kakaw ]* - "داری کەڤۆت": ئەم دارە بە دارێکی سەختی جەنگەڵی بەناوبانگە و ناوەکانیشی بۆ ئەم سیفەتە دەگەڕێتەوە. "کەڤۆت" خزمە دەگەڵ "سفت" و "کەکەو"یش خزمە دەگەڵ ↑سەخت sexıt و↑ *سەق seq* "داربەڕووی ئەستوور".

**کەل kel 1** *[ kal ]* - "1- چیا، کێو 2- بستوو، زینوو": کەڵک kelık یش وەک بچووککراوی وشەکە بەکار دەهێنرێ [کەڵکی بەگزادان لە نزیک شاری مەهاباد].

1- لە لایەکەوە دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ ↑کێل kel و چەند وشەیەک کە ئاماژە بە زەق و قیت بوون و دەرپەڕین دەکەن.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: hill (E.)، hille (MNl.)، collis (L.)، kolonos (Gr.)، kalnas (Lit.) "تەپە، گرد".

**کەل kel 2** *[ kal ]* - دەگەڵ پەل دێ [کەل و پەل kelupel بەواتای شتومەک]. بڕوانە ↑کالا kala.

**کەڵ3 kel** [*kal*] - "داغ، بەتین": خزمە دەگەڵ ↑قاڵ qal.

**کەل4 kel** [*kal*] - "1- قەڵش، کەلێن 2- بڕەدار 3- شاخ شکاو 4- شکانی ئەندام": چەمکی گشتی دە هەموو ئەم مانایانەدا "بڕین، قەڵشین"ە. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قەل2 qel [قەل کردن بە مانای "بڕین، هەڵپاچین"].

**کەل5 kel** [*kal*] - "پەچەی پەز لە دەشت": خزمە دەگەڵ ↑هۆڵ hol، ↑*هاڵان* halan [تیهاڵان] و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین، تیوەپێچان".

**کەل6 kel** [*kal*] - "بریقە، درەوشین": خزمە دەگەڵ glühen (G.)، gloeien (Nl.)، glow (E.)، glo (Sw.) [سوێدی بەرێ] "سوور بوونەوە لە گەرمان، هایسان، درەوشین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***ĝhel-** (*IE.*) "درەوشانەوە، ترووسکانەوە". چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون وەک ↑*زەرد zerd*، ↑زۆڵ zol، ↑زێڕ zer و هتد. لەوانەیە ↑کڵ kıl یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**کەڵ1 kel** [*kal*] - "1- گامێشی تیر 2- بەرانی شاخدار 3- ئاژەڵی شاخدار": کەل و کەر ker یش دەگوترێ. کل kal (P.). خزمە دەگەڵ Horn (G.)، (E.)، (Sw.)، cornu (L.) "شاخ، قۆچی ئاژەڵ"، kárā (Gr.) "سەر"، kéras (Gr.) "شاخ، قۆچ"، krāníon (Gr.) "کەللەسەر"، cerebrum (L.) "مێشک"، سەر بە ریشەی < ***ker-** (*IE.*) "شاخ، قۆچ، دواتر: سەر، تەپڵی سەر، کەللە". وشەی ↑سەر ser و لەوانەیە وشەی ↑کەللە kelle پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**کەڵ2 kel** [*kal*] - دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "مانگا بەکەڵ" یان "بەکەڵ هاتنی مانگا". وشەی "کەڵ" لێرەدا ناتوانێ پێوەندی بە *کەڵ*1 "تیری گامێش"ەوە هەبێ. چونکوو: 1- ئەگەر مەبەست لە کەڵ، تیری گامێش بایە، دەبا گوترابا "گامێشە بەکەڵ" نەک مانگا بەکەڵ 2- تیری مانگا دەبێتە "گا" و هەمدیسان دەبا گوترابا "مانگا بە گا" نەک "مانگا بەکەڵ"! 3- لە باری رێزمانیشەوە "وە کەڵ هاتن" شتێکە وەک وە جۆش هاتن، وە قسە هاتن، وە دەنگ هاتن و هتد. واتا کەڵ لێرەدا ناتوانێ ناوی ئاژەڵ بێ، ئەگینا دەبا بگوترێ: مانگاکە کەڵ دەخوازی یان مانگای کەڵخواز! کەوابوو کەڵ دەبێ چ بێ؟ ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ carus (L.) "خۆشەویست، حەز لێکراو"، kars (Let.) "تامەزرۆ بوون، وە کەڵ هاتن"، cara (OIr.) "دۆست، یار"، Hure (G.) "جندە" [دە بنەڕەتدا دۆستگرتوو، حەزدار]. [هەروەها بەراوردی وشە ئەڵمانییەکە بکە دەگەڵ حوری hūrī (Arb.) "ژنی جوان و جەوان لە جەننەت کە هەر پیاوێکی دیندار هەفتا دانەی بەر دەکەوێ"]. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑کەڵکەڵە kelkele هەیە بە مانای"حەز و تامەزرۆیی زۆر"، ↑کەڵەز kelez "وەرزی جووت بوونی بزن و تیرێ" و ↑کەلاز kelaz "ئاژەڵی بە فاڵ". بەمانەش مانای بنەڕەتی وشەکەمان بۆ ساخ دەبێتەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***karo(s)** (*IE.*) "تامەزرۆ بوون". [بەراوردی ئەم ریشەیە بکە بەتایبەتی دەگەڵ وشەی کەلەز kelez].

**کەلا kela** [*kalā*] - "مەرمەڕی مێشێن": خزمە دەگەڵ ↑کلۆ kılo، کەڵاف kelaf، ↑کەلب kelb "کلۆی بچووک" و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەی < ***gel-** (*IE.*) "رێکگوشین، تۆپەڵە بوون".

**کەلات kelat** [*kalāt*] - شێوەی کۆنتری ↑قەڵا qela. کەل kel یش دەگوترێ. فۆتیمی t پێشتر لە وشەکەدا هەبووە، لەم بارەوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑کلیدە kılîde "لە هەموو لاوە دەوردراو".

**کەللاج kelac** [*kalāj*] - "درۆزن، فێڵباز": کەللاش kellaş و ↑*کەلاچ keleç* یش دەگوترێ. هەروەها دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەڵەک1 kelek.

کەلاخ **kelax** [ *kalāx* ] - "کز و لاواز": خزمە دەگەڵ ↑قەڵهین qelhîn "لەبەین چوون، نەمان".

[تێبینی: هەروەک چۆن "کەلاخ" و "قەلهین" پێوەندییان پێکەوە هەیە، هەر بەم شێوەیەش "کز" و و "کووژانەوە" و "کوشتن" خزمایەتییان پێکەوە هەیە].

کەلار1 **kelar 1** [ *kalār* ] - "لەسەریەک کەڵەکە کراو": خزمە دەگەڵ ↑کەڵەکە keleke کردن.

کەلار2 **kelar 2** [ *kalār* ] - "خاپوور، وێران": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەلارە kelare.

کەلارە **kılare** [ *kılāra* ] - "دەفری لە ریخی وشکەوەکراو بۆ پشکەڵ تێکردن":

[سەرەتا تێبینییەک: لەنێوان چەمکەکانی"قووڵ"، "دەفر"، "قووڵ بوون"، "رۆ چوون" و "رووخان"دا پێوەندی نیزیک هەیە. بۆ وێنە بڕوانینە ئەم دەستەوشەیەی خوارەوە: *دۆپ* "نزم، نەوی"، *تاپی* "قووڵکە، خەندەک"، *تەپین* [داتەپین، تێک تەپین] "رۆ چوون، قووڵ بوون، خاپوور بوون"، *تاڤێر2* "قوڵکەبەردێک ئاوی بارانی تێدا کۆ دەبێتەوە"، *تاپوو* "کەندووی گەورە"، *تاوە* "دەفر" و *تیفسی* "دەفر". هەروەها ئەگەر چاو لە وشەکانی "کوار"، "کۆد"، "جەواڵ" بکەین کە بۆ "دەفری" جۆربەجۆر بەکار دێن، دەبینین کە گشتیان خزمن و هەروەها دەبنە خزمیش دەگەڵ "خاپوور" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "کون و کەلێن، قوڵکە، قووڵایی" دەکەن].

بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەبێ وشەی ↑کەلار kelar "خاپوور" و کەلارە kelare "دەفری لە ریخ چێکراو" خزم بن دەگەڵ ↑چاڵ çal، سەر بە ریشەی **< *(s)kel- (IE.)** "قەڵشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە".

کەلاز **kelaz** [ *kalāz* ] - "ئاژەڵی بە فاڵ": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەلەز kelez "وەرزی تێبەربوونی بەران و تێرێ".

کەڵاش **kelaş** [ *kalāš* ] - "جۆرێک کەوشی کوردمادی": دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کاڵە kale ش هەیە کە "پێڵاوی لە چەرمی خاو دروستکراو"ە. ئەم وشانە دەبێ پێوەندییان هەیە بە gallicula (.L) "تەقیلە". دە زمانی فەرانسەییدا وشەی galoche (.Fr) "کالۆش" دەچێتەوە سەر ئەم وشە لاتینییە. شیاوی باسە کە وشەی فەرانسەیی ↑کالۆش kaloş یش دە زمانی کوردمادیدا بەکار دێ و بە جۆرێک پێڵاوی پەلاستیک دەگوترێ.

کەلاشتن **kelaştın** [ *kalāštın* ] - قەڵاشتن qelaştın یش دەگوترێ. شێوەیەکی کۆنتر لە ↑قەڵشاندن qelşandın.

کەڵاف **kelaf** [ *kalāf* ] - "دەزووی پێچراوە": خزمە دەگەڵ ↑*گلۆپ glop* و گلۆڵە glole و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "کلۆ بوون، پێکەوەنووسان، رێککوشران، تۆپەڵە بوون" دەکەن.

کەڵافەت **kelafet** [ *kalāfat* ] - شێوەی پێشووی ↑قەڵافەت qelafet "بەژن، هەیکەل".

کەلاک **kelak** [ *kalāk* ] - "لاشە": کەلاخ kelax و کەلاش kelaş یش دەگوترێ. کە + لاک ke + lak. خزمە دەگەڵ ↑لەش leş و ↑لاشە laşe. کەرتی یەکەمی وشەکە، "کە" -ke جێی لێکۆڵینەوەیە، لەوانەیە پێشگری ئە e یان هە he بووبێ و گۆڕابێ بە ke. لەوانەشە پاشگرێکی کۆن بێ کە بۆ وێنە دە زمانە ئەڵمانیدا بەشێوەی -ge دەردەکەوێ.

کەلال **kelal** [ *kalāl* ] - "دەرد و زەحمەت، کوێرەوەری": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کول1 kul [کول و کەسەر].

کەلان **kelan** [ *kalān* ] - "جوان، دەلال": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کەل6 kel "بریقە، درەوشین". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "درەوشاوە".

کەلانە **kelane** [ *kalāna* ] - "جۆرە نانێکی بە گۆشت و سەوزی ئاخنراو":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑کالان kalan و ↑*هاڵان halan* سەر بە ریشەیەک بە مانای "تیوە پێچان، داپۆشین".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کولیچە kulîçe و ↑کولێرە kulere.

**کەڵانە kelane** [ *kalāna* ] - "قوبە، قۆپچەی درشت": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑کەلا kela "مەرمەڕ".

2- ↑کەل kel "کێو، ملەی کێو".

**کەلاوە kelawe** [ *kalāwa* ] - "وێرانە، خاپوور": وشەکە بە شێوەی خەرابە xerabe ش دەگوترێ و خزمە دەگەڵ Grab (G.)، graf (Nl.)، gra f (OE.) "قەبر، گوڕ"، Grube (G.)، grōba (Got.)، groeve (Nl.)، grōf (OIs.) "قووڵکە، کولێن، ئەشکەوت". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< - *grebh (IE.)*** "کۆڵین، هەڵکەندن، کراندن".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "قوڵکە، قەبر" لە لایەک و "وێرانە" لە لایەکی دیکەوە بەراوردی وشەکانی کاول، قەبر، گۆڕ، کووڕ و قووڵ بکە، کە ئەوانیش گشتیان پێکەوە خزمن].

**کەلب kelb** [ *kalb* ] - "کڵۆی بچووک": [کەلبە قەندێک]. کەڵوە kelwe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑کەلا kela "مەرمەر"، ↑کلۆ kılo، ↑*گلوو gılû*، ↑گلۆپ gılop و هیتر سەر بە ریشەی **< -gel* (IE.)*** "پێکەوە نووسان، رێکگوشین، تۆپەڵە بوون".

**کەڵبەتان kelbetan** [ *kalbatān* ] - "گاز، ماشە": خزمە دەگەڵ یەک لەم دەستەوشانەی خوارەوە:

1- klofi (OIs.) "کەلێن، کەلەبەر، خەڵوەتی، ئەنبار" کە دەبێتە خزم دەگەڵ klieben (G.) "قەڵشین، لەت بوون"، Kluft (G.) "قەڵش، کەلێن" [کۆنتر هەروەها: گاز، *کەلبەتان*، قەیچی]، cleft (E.) "قەڵش، کەلێن، شیو و دۆڵی تەنگ"، klobe (MG.) "داری قەڵش قەڵش کراو، چەتاڵ، چەنگەک و هەروەها بە مانای "دەستە، باقە، گیشە"، glubere (L.) "توێکڵ کردن"، glyphein (Gr.) "هەڵکۆلین، داتاشین". ↑کەلەبەر keleber دەگەڵ ئەم وشانە بە خزم دەردەچێ.

2- ↑کەلەپچە kelepçe "دەستبەندی زیندانی". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، لەوانەیە "کەلبەتان" دە زمانی عەرەبیدا نیشانەی "بە دوو کردن"ی خرابێتە سەر و بووبێتە "کەلبەتان"، چونکوو گاز دوو لای هەیە و لە دوو لاوە وێک دێ.

3- ↑کەڵپ kelp "ددانی پێشەوەی ئاژەڵ". وەک دەزانرێ وشەیەکی دیکە بە مانای کەلبەتان "گاز"ە کە دەگەڵ گاز گرتن و گەستن خزمە و ئەمەش لە رێگەی ددانی پێشەوە، واتا "کەڵپ" پێک دێ. لەم تێروانینەوە مانای بنەڕەتی "کەلبەتان" هەروەک "گاز" دەبێتە ئامرازی گاز گرتن [گەستن].

**کەڵپ kelp** [ *kalp* ] - "ددانی پێشەوە(ی ئاژەڵ)": خزمە دەگەڵ halb (G.)، halp (MG.)، half (E.)، halv (Sw.) "نیو(ە)". مانای بنەڕەتی ئەم وشانە "لەت" بووە. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ scalpere (L.) "برین، لەت کردن، رووشاندن"، سەر بە ریشەی **< -*(s)kel* (IE.)** "قەڵشاندن، برین، لێک جودا کردنەوە". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە لەم ریشەوە پەیدا بوون، وەک ↑قەڵشین qelşîn [کەلاشتن keläştın]، ↑کەلارە kelare، ↑چاڵ çal و هتد ["چاڵ" بە هەر دوو مانای "قووڵکە" و "چڵتە و چاڵ"].

[تێبینی: دە زمانی ئاڵمانیدا بە ددانەکانی پێشەوە دەگوترێ Schneidezahn (G.) کە لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی یەکەم مانای "برین، لەت کردن" دەدا و کەرتی دووەم "ددان"].

**کەڵپک1 kelpık** ⌊ *kalpık* ⌋ - "1- تۆکڵی دەخڵ و دانی هاڕاو 2- قرتماخەی سەر برین (تۆێخ)": خزمە دەگەڵ ↑کەڵپ kelp "ددانی پێشەوەی دڕندە"، سەر بە ڕیشەی **< -(s)kel* (IE.)** "قەڵشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە". Schale (G.) "تۆکڵ، پووش" و ↑چاڵ çal [چڵتە و چاڵ، چیلکە و چاڵ] لەم ڕیشەوە هاتوون. لەوانەیە ↑گاڵ gal "هەرزنەتاڵە"ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی1: وەک دەبینرێ، وشەکە هەم مانای "تۆکڵ (توێکڵ)" دەدا و هەم مانای "توێخ". ئەم دوو وشەیەش خۆیان ماناکانیان لە یەکدی زۆر نیزیکە و لە یەک ڕیشەوە هاتوون. تێبینی 2: وەک دەبینین لە وشەی "کەڵپک"دا پاشگری ık بە کۆتایی وشەکەوە نووساوە. ئەمە نیشان دەدا کە بنجی وشەکە "کەڵپ" بووە، واتا ئەم وشەیە جگە لە مانای "ددانی پێشەوە"، مانای "توێکڵ و توێخ"یشی گەیاندووە. وشەی ↑خەڵەف xelef دە زمانی کوردمادیدا ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکا کە ماناکەی دەبێتە "تیکوڵی دار، گەڵای دەوری گوڵی دار". لەوانەیە وشەی ↑خەلە xele ش (خەلە و خەرمان) وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادی بێ. پێوەندی "توێکڵ" و "خەلە" لەمەدایە کە دەخڵ و دان توێکڵیان هەیە و توێکڵەکەیان لێ جیا دەکرێتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا جگە لە وشەی Getreide هەروەها وشەی Halmfrüchte بە مانای "خەلە" بەکار دێ کە مانا ئەسڵییەکەی دەبێتە "بەرهەمی پووشدار، پووشەبەرهەم". دە زمانی عەرەبیدا غلاف ġalāf (Arb.) "توێکڵ، کالان" و هەروەها غلة ġalla (Arb.) "خەلە" بەکار دێن کە پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە].

**کەڵپک2 kelpık** ⌊ *kalpık* ⌋ - "کرپک، درەشتەی ئارد لە دابێژتندا": خزمە دەگەڵ ↑کەلب kelb "کلۆی بچووک".

**کەڵپە kelpe** ⌊ *kalpa* ⌋ - "بڵیندایی بەردین لە شاخ" [کەڵپەشاخ]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ cliff (E.)، klep (OG.) "تیشەشاخ، کەڵپە". ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە.

**کەلپەل kelpel** ⌊ *kalpal* ⌋ - "جلک": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەل2 kel [کەل و پەل kelupel بەواتای شتومەک] و ↑کالا kala و ↑هاڵان halan [لێهاڵان].

**کەڵپی kelpî** ⌊ *kalpī* ⌋ - "دێڵەسەگ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گورپە gurpe "پشیلەی تێر".

**کەلتە kelte** ⌊ *kalta* ⌋ - "نوێ کردنەوە، چا کردنەوە (تعمیر)": [خۆم کەلتە کردەوە]. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ glatt (G.) "ساف و لووس" و glätten (G.) "ساف و لووس کردن". ئەم وشە ژێرمەنییە دە ڕیشەدا مانای "بریقەدار (کردن)، درەوشان(ەوە)" دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ ↑کەل[6] kel "بریقە، درەوشین". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی "کەلتە" ئەوە بووە کە شتێک کە ڕەنگ و ڕووی خۆی لە دەست داوە، ساف و لووس و درەوشاوە کراوە و بە وتەییەکی دیکە نوێ کراوەتەوە.

**کەلخانە kelxane** ⌊ *kalxāna* ⌋ - "دووکانی شیرگەر و تفەنگساز": بنەوشەی کەل -kel خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ڕیشەکەیان مانای "لێدان" دەدا. لەم ڕیشەوە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا چەندین وشە پێک هاتوون کە مانای "لێدان، لێکدان" و هەروەها "چەک و چۆڵ" دەبەخشن، وەک ↑شڵەقان şıleqan، ↑کلان kılan "ژاندنی مەشکە" ["ژاندن"یش دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشێ]، ↑شێلان şêlan، ↑زلّة *zılle*، ↑شەللاق şellaq و هتد. وشەی سلاح silaĥ (Arb) "چەک" [ئامرازی لێدان] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**کەلژ kelj** ⌊ *kalž* ⌋ - "قەدەم، تیتێک کە لە گەرمای زۆر دێتە بەر چاو"؛ هەروەها ↑کەلژین keljîn هەیە بە مانای "قەدەم کردن، دیاری کردنی کەلژ". خزمە دەگەڵ ↑کەل3 kel 3 "داغ، بەتین" و ↑قاڵ *qal*.

**کەلژە kelje** ⌊ *kalža* ⌋ - "تیری، سابرین"؛ خزمە دەگەڵ ↑کەڵ kel "گامیشی تیر".

**کەڵژین keljîn** ⌊ *kalžīn* ⌋ - "دیاری دانی تینی گەرما"؛ خزمە دەگەڵ ↑قاڵ qal.

**کەلفس kelfıs** ⌊ *kalfis* ⌋ - "ددانی پێشەوە نەماو"؛ کەلفیچ kelfîç، کۆڵۆس kolos و کڵوس kılos یش دەگوترێن. کەرتی یەکەمی وشەکە دەچێتەوە سەر ↑کەڵپ kelp "ددانی پێشەوە" [دە بنەڕەتدا: ددانی هەڵپاچین و لەت کردن]. کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ پێوەندی بە ↑پووچ puç ەوە هەبێ، بە مانای "بۆش، بەتاڵ" [ لەوانەیە گۆڕانەکە بەم جۆرە بووبێ: کەڵپ پووچ ← کەلفیچ kelfîç ← کەلفس kelfıs ← کڵوس kılos].

**کەڵک1 kelık 1** ⌊ *kalık* ⌋ - "قازانج، ئیستیفادە"؛ وشەکە دەچێتەوە سەر ↑کارkar. دە بنەڕەتدا شتێک کە بەکارهاتبێ، پێیان گوتووە بەکەڵک دێ [بەکار دێ] یاخود کەڵکی هەیە و ئەگەریش بە پێچەوانە بووبێ، گوتوویانە بەکار نایە یاخود بە کەڵک نایە. دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا وشەی کاربرد karbord (P.) بۆ ئەم مەبەستە بەکار دێ و لێرەدا پێوەندی وشەکە بە کار kar بە ڕوونی دەردەکەوێ.

**کەڵک2 kelık 2** ⌊ *kalık* ⌋ - "سوانە، پاسارە"؛ خزمە دەگەڵ ↑کیل kel.

**کەڵک3 kelık 3** ⌊ *kalık* ⌋ - "باڵدارێکی زلی ماسیخۆر"؛ خزمە دەگەڵ ↑قەل qel.

**کەڵکەڵە kelkele** ⌊ *kalkala* ⌋ - "حەز، تامەزرۆیی"؛ بڕوانە ↑کەڵ2 kel 2. [وشەکە لە دووپات بوونەوەی "کەڵ" دروست کراوە و ئەمەش دە زمانی کوردمادیدا باوە، وەک هەراهەرا، پەلەپەل، قوڵتەقوڵت، خۆشی خۆشی و هتد. ئەم دووپات بوونەوە بە مەبەستی جەخت کردن بەکار دێ و دە هێندێک لە ناوی شتەکانیش دەبیندرێ، وەک فڕفڕە، وەروەرە، ترترە، غەرغەرە، شەقشەقە، پلپلە و هتد].

**کەللە1 kelle 1** ⌊ *kalla* ⌋ - "سەر، قاوغی مێشک"؛ کلە kalle (P.).

1- [ئەو وشانەی کە بە مانای سەر دە هێندێک لە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بەکار دێن، دەچنەوە سەر هێندێک وشە کە مانای "دەفر، قاپ، کاسە" دەبەخشن، وەک caput (L.) "سەر" کە پێوەندی بە وشەی "قاپ"ەوە هەیە، یان Karparah (OIn.) "سوالەت، کاسە(ی سەر)". ئەمە نیشان دەدا کە سەر بە قاب یان کاسەیەک چوێنراوە کە مێشک دەگرێتە خۆ. ئەم لێک چواندنە بۆ وشەی "کەللە"ش دەست دەدا]. دە زمانی کوردمادیدا لە جیاتی "کەللەی سەر"، " کاسەی سەر" یش دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا بە کەللە دەگوترێ Hirnschale (G.) کە لە دوو کەرتی Hirn "مێشک" و Schale "کاسە، دەفر، جام" پێکهاتووە. وشەی کەللە دەبێ دەگەڵ هەر ئەم Schale یە خزم بێ و سەرەتا وەک وشە ئەڵمانییەکە بە مانای "کاسە" و دەگەڵ "سەر" پێکەوە بەکارهاتبێ [کەللەسەر] و دواتر خۆی بە تەنیا مانای"سەر"ی وەرگرتبێ. دە زمانی ئەمڕۆشدا زۆرجار "کەللەسەر" دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەلارە kelare "دەفری لە ریخ چێکراو".

2- بە شیمانەیەکی لاوازتر لەوانەیە شێوەیەکی دیکە لە ↑سەر ser بێ.

**کەللە2 kel(l)e 2** ⌊ *kal(l)a* ⌋ - "داری چەمێنراو بۆ دەوری شت"؛ [کەللەبێژینگ]. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑خەڵەک xelek "ئاڵقە"، ↑کالان kalan، ↑*هاڵان halan* [لێهاڵان]، سەر بە ریشەیەک بە مانای ""تێوەپێچان، لە دەور هاڵان، داپۆشین".

2 - ↑خێل xel، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، چەمانەوە"
3- ↑کل kıl "خوار"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، داهاتنەوە".
**کەللە3 kelle** [ *kalla* ] - "وردی پێکەوە نووساو، تۆڵا": [وەکوو کەللەقەند kelleqend]. خزمە دەگەڵ ↑کەلا kela "مەرمەڕ" و ↑کلۆ klo و ژمارەیەک وشە بە مانای "پێکەوە نووسان، رێکگوشران، تۆپەڵە بوون".
**کەلوە kelwe** [ *kalwa* ] - "قەڵپووزی زین": خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکە لە ↑قەڵپووز qelpuz.
**کەلوو[1] kelu** [ *kalū* ] - "بورجی ئاسمان": خزمە دەگەڵ ↑کێل kel و ↑کەل kel و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "بەرزایی و قیت بوون" دەکەن.
**کەلوو[2] kelu** [ *kalū* ] - "ئاڵقەی چنین لە بەن": [جۆرابەکەت کەلووچنە]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم وشانەوە:
1- ↑خەڵەک xelek "ئاڵقە".
2- ↑کەلەوە kelewe.
**کەلوو3 kelu** [ *kalū* ] - "1- کلۆی کوڵکە و پەمۆ 2- بەری گیا کە چەند دەنکی بە ریزی تێدایە 3- پۆلکە": خزمە دەگەڵ ↑کەللە3 kelle "وردی پێکەوە نووساو".
**کەلوو[4] kelu** [ *kalū* ] - "1- ریش سپی و بەرێز لە ئاواییدا": خزمە دەگەڵ ↑کاڵ[3] kal [پیر و کاڵ].
**کەڵوو kelu** [ *kalū* ] - "ناوی چەمێک لە کوردستان": کەڵوێ kelwe ش دەگوترێ. بیستوومە دەڵێن ئەو چۆمە لەبەر بەهێز بوونی رەوتەکەی، "کەڵ" دەبا و بۆیە ئەم ناوەی پێ دراوە. لەوباوەڕەدا نیم "کەڵ" کە بە مەلەوانی بەناوبانگە، لەم چۆمە دەرنەچێ. ناوی ئەم چەمە پێوەندی بە کەڵی ئاژەڵەوە نییە و مانای راست و دروستی وشەکە شتێکی دیکەیە. سەبارەت بەم ناوە دەکرێ شیمانەی بکەین کە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *(IE.) *ghoilo-* "کەف و کوڵ کردن". لەم ریشەوە چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا دروست بوون کە مانای "تیر و تەسەل، پڕاوپڕ"، "توند و تیژ"، "زۆر و زەوەند" دەبەخشن. لەم بارەوە بڕوانە وشەی ↑کەحێل keĥêl.
**کەلووک keluk** [ *kalūk* ] - "نیوچارەکە خشت، لەت و کوتی خشت": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑*قەل kel* کردن، ↑قەڵشاندن qelşandın، ↑کەل[4] kel "بڕەدار"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *(s)kel-* "قەلشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە". لەم تێڕوانینەوە مانای "کەلووک" دەبێتە "لەتکراوی بچووک، لەتۆکە".
**کەلوول kelul** [ *kalūl* ] - "ئاژەڵی توێڵ سپی، قەشە": خزمە دەگەڵ ↑کاڵ[1] kal "رەنگی رووناک، کەمرەنگ".
**کەلۆژتن kelûjtın** [ *kalūžtın* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کرۆشتن kroştın یان کرۆژتن krojtın "جووتن و کرتە لێ هێنانی شتی سفت". هەروەها کەلۆتن kelotın یش دەگوترێ. دە فارسیدا کلوچیدن koločīdan (P.) دەگوترێ. ئەم وشەی خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە سەر بە ریشەی < *(IE.) *(s)kel-* "بڕین، قەڵشتن، لەت کردن، لێک جودا کردن"، وەک ↑کەلووک keluk "لەت و پەت (ی خشت)". لەم تێڕوانینەوە مانای "کەلۆژتن" یان "کرۆشتن" دەبێتە "لەت و پەت کردن".
[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لەپاڵ ریشەی *(IE.) *(s)kel-* هەروەها ریشەی *(IE.) *(s)ker-* هەیە کە لە ماناشدا هیچ جیاوازییەکیان نییە. وێ دەچێ ئەم دوو ریشەیە دە بنەڕەتدا هەر یەک بن و یەکیان لەوەی دیکەوە پەیدا بووبێ واتا یەکیان کۆنتر بێ لەوەی دیکە.

ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، چ ئەو وشانەی فۆتیمی l یان تێدایە، وەک "کەلۆژتن" و "قەڵشاندن، کەلاشتن" و چ ئەوانەش فۆتیمی r یان تێدایە، وەک "کرۆشتن" و "کرتاندن"، هەر هەموویان دواجار دەگەنەوە سەر بنەڕەتێکی هاوبەش].

**کەڵ ە kelıh** *[ kalıh ]* - "کەم وێنە، بێ وێنە": خزمە دەگەڵ ↑کەلۆژتن kelûjtın و چەندین وشەی دیکە کە لە سەرەوە باس کراون، سەر بە ریشەی **< *(s)kel- ( IE.)*** "بڕین، قەڵشتن، لەت کردن، (لێک) جودا کردن". مانای بنەڕەتی وشەکە "جودا، جیاکراوە"یە، واتا شتێکە کە لەوانی دیکە جودایە، وەک ئەوان ناچێ.

[تێبینی: ئەم وشەیە لەباری ماناوە دەتوانین بەراورد بکەین دەگەڵ besonder (G.)، sonder (G.)، suntar (OG.)، sönder (Sw.) "بەلاوە، تاک، تەریک، بەجیا، تایبەت". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *sn-tér- (IE.)* "تاک، بەجیا". وەک لەم وشە ژێرمەنییەدا دەبینین مانای "تاک، تایبەت" پێوەندی هەیە بە چەمکی "جودا (بوون)". هەر بەم جۆرە ئەگەر سەیری وشەی "(هەڵ)بژاردە" بکەین کە ئەویش مانای "کەم وێنە، بێوێنە" نیشان دەدا، دەبینین کە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە "بێژینگ" کە ئامرازێکە بۆ "جودا کردنەوە"].

**کەڵە kele** *[ kala ]* - "بەڵا یان پەتایەک کە تووتن و بێستان هیشک دەکا": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑قڕا qır 1 [قڕ کردن یان *قەلهاندن* واتا لە ناو بردن].

**کەڵەباب kelebab** *[ kalabāb ]* - "کەڵەشێر": کەڵ kel + باب bab. کەڵ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قەل qel و مەبەست لەم وشەیەش "پەلەوەری قیرەکەر"ە. دە زمانی فارسیدا بەم پەلەوەرە دەگوترێ خروس xorūs (P.) کە ئەمەش دەگەڵ corus (L.) "قەل" یەک دەگرێتەوە. وەک دەبینین ئەو وشانە لێک دەچن و دەشێ سەر بە ریشەیەکی هاوبەش بن. وشەکانی ↑قرە qıre و ↑قیرە qîre ی کوردمادیش لەو ریشەوە دێ. کەرتی دووەمی ناوی پەلەوەرەکە، واتا باب bab ئاماژەیە بۆ نێرینە بوونی پەلەوەرەکە و تێکرای وشەکە "قەلی باب، قیرەکەری نێر" مانا دەدا.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا ناوی ئەم پەلەوەرە Hahn (G.) ە و ئەم وشەیەش دەگەڵ وشەی خوێندن xuwendın (xendın) هاوریشەیە و مەبەست ئەوەیە کە ئەم پەلەوەرە دەخوێنێ واتا دەقیرێنێ].

**کەلەبەر keleber** *[ kalabar ]* - "قەڵش، کەلێن": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم دەستەوشانەی خوارەوە:

1- klofi (OIs.) "کەلێن، کەلەبەر، خەڵوەتی، ئەنبار" بکەین کە دەبێتە خزم دەگەڵ klieben (G.) "قەڵشین، لەت بوون"، Kluft (G.) "قەڵش، کەلێن" [کۆنتر هەروەها: گاز، *کەلەبەتان*، قەیچی]، cleft (E.) "قەڵش، کەلێن، شیو و دۆڵی تەنگ"، klobe (MG.) "داری قەڵش قەڵش کراو، چەتاڵ، چەنگەک و هەروەها بە مانای "دەستە، باقە، گیشە"، glubere (L.) "توێکڵ کردن"، glyphein (Gr.) "هەڵکۆلین، داتاشین"، سەر بە ریشەی **< *gleubh- ( IE.)*** "کوتان، قەڵشاندن، بڕین".

1- Kerbe (G.) "کەلەبەر"، kerben (G.)، kerven (Nl.)، carv (E.) "کەلەبەر تێخستن"، gráphein (Gr.) "نووسین" [دەبنەڕەتدا: خەت لێدان، هەڵکۆلین، کڕاندن] و هەروەها Grab (G.) "گۆڕ، قەبر" و graben (G.) "هەڵکەندن" و خزمیشە دەگەڵ ↑کەلاوە kelawe "وێرانە، خاپوور" [دە بنەڕەتدا ↑خەرابە xerabe بە مانای شوێنی قووڵکراو، هەڵکەنراو] سەر بە ریشەی **< -grebh* ( IE.)** "کۆلین، هەڵکەندن، کڕاندن".

**کەلەپچە kelepçe** [ *kalapča* ] - "دەستبەندی زیندانی": کەلەبچە kelebçe و کەلەمچە kelemçe ش دەگوترێن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ clip (E.)، clyppan (OE.)، kleppa (OFris.)، glóbti (Lit.) " گرتن، دە گیر(ە) خستن، دە ئامێز گرتن، ئاوقان". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کەلبەتان kelbetan هەیە بە مانای "گاز" کە ئەویش لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ئەم وشانە لەوە دەچێ خزمایەتییان هەبێ دەگەڵ ↑*کەلەمە keleme* [کەڵەوە kelewe].

**کەلەپوور kelepur** [ *kalapūr* ] - "جێماگ، میرات": *(Gr.) kelepúri* > [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 304].

**کەڵەز kelez** [ *kalaz* ] - "وەرزی جووت بوونی بزن و تیری": بڕوانە ↑کەڵ kel 2.

**کەلەژ kelej** [ *kalaž* ] - "داربەستی رەز": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قەڵشین qelşîn [کەلشین kelşîn]دا هاتوون. هەروەها ↑کولک(ە) kolk(e) [کولکەدار] پێوەندی بەم وشانەو هەیە.

**کەڵەشێر keleşêr** [ *kalašer* ] - "کەڵەباب": کەڵەکووک kelekuk یش دەگوترێ. کەرتی یەکەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑قەل qel. کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- شیراندن şîrandın "زیقاندن". دە وشەی "کەڵەکووک"دا کە ناوێکی دیکە بۆ کەڵەشێرە، کەرتی "کووک" ئاماژە بە "دەنگ هەڵبڕین و زیقاندن" دەکا و خزمە دەگەڵ "قووقاندن".

2- لەوانەشە پەلەوەرەکە بە شێر şêr "شای ئاژەڵان" چوێنرابێ، واتا قەلێک [پەلەوەرێک] کە تاجی لەسەرە.

**کەلەک kelek** [ *kalak* ] - "سوانە، لێوار و قەراخی بان": خزمە دەگەڵ ↑کەل kel "ملەی کێو"، ↑کێل kel "بەردی سەرگۆڕ"، ↑قەڵپە qelpe "زەقایی" و هتد. تایبەتمەندی گشت ئەم شتانە زەق و دەرپەڕیو بوونیانە، هەروەک چۆن قەراخی سەربانیش شتێکی دەرپەڕیوە. شیاوی باسە کە وشەی "قەراخ"یش خۆی لە ریشەکەوە دێ بە مانای "تیژ بوون، دەرپەڕیو بوون".

**کەڵەک¹ kelek ¹** [ *kalak* ] - "گزی، فێڵ": ↑کوڵەک kulek یش دەگوترێ [کەڵەک و کوڵەک]. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ guile (E.) "کەڵەک، فێڵ". وشە ئینگلیزییەکە لە فەرانسەیی کۆن وەرگیراوە، بەڵام شیمانەی ئەوە دەکرێ ریشەی ژێرمەنی هەبێ. ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**کەڵەک² kelek ²** [ *kalak* ] - "دیواری ئیشکەبەرد، بەردی لەسەریەک هەڵچنراو": بڕوانە ↑کەڵەکە keleke کردن واتا "وەسەریەک نان، لەسەریەک هەڵچنین".

**کەڵەک3 kelek 3** [ *kalak* ] - "چەند داری لێکبەستراو بۆ پەڕینەوە لە چەم":

1- دە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا (ل. 304) وشەکە دەبردرێتەوە سەر kalkō (Syr.).

2- دەکرێ وشە کوردمادییەکە هەروەها هەڵسەنگێتین دەگەڵ galaia (MGr.). وشەکانی galea (ML.)، galie (OF.) و galley (E.) "جۆرە کەشتییەک" لەم وشە یۆنانییە وەرگیراون.

**کەلەکە kelek(e)** [ *kalaka* ] - "لاتەنیشت": دە زمانی فارسیدا دەگوترێ پهلو pehlu کە ئەمەش دەگەڵ پاڵ pal دانەوەی کوردمادی خزمە، واتا لێرەدا پێوەندی نێوان "کەلەکە" و "پاڵ دانەوە"مان بۆ دەردەکەوێ. هەروەها جێی ئاماژەیە کە "کەلەکە" مانای "قەراخ" بە گشتی نادا و زۆرتر بۆ "تەنیشت و قەراخ"ی مرۆڤ بەکار دەهێنرێ، بۆ وێنە ناگوتری "کەلەکەی ماشین، پەرتووک، شەقام"! لەم تێڕوانینەوە گەر بۆی بچین، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ lehnen (G.)،

(h)leinen (OG.)، lean (E.) "پاڵ دانەوە"، سەر بە ریشەی **<- klei*** **(IE.)** "خوار بوونەوە، پاڵ دانەوە". هەروها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کل kıl "خوار" و چەند وشەیەکی دیکە

**کەڵەکە keleke** [ *kalaka* ] - کەڵەکە کردن واتا "لەسەر یەك هەڵچنین". خزمە دەگەڵ ↑لۆدە2 lode "کۆمای زل لە گیا"، سەر بە ریشەی **<- kla*** **(E.)** "لەسەر یەك دانان، کەڵەکە کردن".

**کەڵەگا kelega** [ *kalagā* ] - "گایەك کە دەپەڕێتە سەر مانگا": پێك هاتووە لە دوو وشەی کەڵ kel + ↑گا ga. کەرتی یەکەم لەوە ناچێ پێوەندی بە "کەڵ"ی ئاژەڵەوە هەبێ، چونکوو "کەڵ" و "گا" دوو ئاژەڵی جیاوازن و گا ناتوانێ ببێتە کەڵ! وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەڵ2 kel [مانگا بەکەڵ یان بەکەڵ هاتنی مانگا]. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تامەزرۆ بوون، هەوس کردن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەڵەهێر keleher "کۆبوونەوەی جوانەگای زۆر لەسەر مانگا بەکەڵ".

**کەڵەگەت keleget** [ *kalagat* ] - "باڵا بەرز": پێك هاتووە لە دوو وشەی کەڵ + گەت kel + get. کەرتی یەکەم لەوە دەچێ پێوەندی بە "کەڵ"ی ئاژەڵەوە نەبێ، بەڵکوو دەگەڵ چەند وشەیەك خزم بێ وەك ↑کەل kel "ملەی کێو"، ↑کێل kel "بەرزەبەردی سەر گوڕ، ↑کلك kılık "1- قامك 2- دووڤ". ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە شتی قیت دەکەن. کەرتی گەت get شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قەد qed بە مانای "قەلافەت، بەژن". لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ "باڵابەرز". وشەی "باڵا" لێرەدا مانای "بەژن، قەد" دەبەخشێ و "بەرز" ئاماژە بە "قیت" بوون دەکا. جگە لەمە ئەگەر وشەکە پێوەندی بە "کەڵ"ەوە هەبایە، دەبا بۆ وەسفی ژنی باڵابەرز بەکار نەهێنرابا و تەنیا بۆ رەگەزی مێر بەکار هاتبا.

**کەلەلا kelela** [ *kalalā* ] - "شەکەت، پەرێشان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کل kıl "خوار، لار". لەم تێڕوانینەوە کەلەلا کەسێکە لەبەر شەکەتی یان پەرێشانی بە لادا دێ. لەوانەیە وشەکە دە ئەسڵدا "کەلە + لاك kele + lak" بووبێ بە مانای "لەش چەماو، لەش بەلاداهاتوو". لاك واتا لەش و دە وشەی "کەلاك"یشدا دەبینرێ.

**کەلەم kelem** [ *kalam* ] - "بەرێکی بێستانە": کلم kalam (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ Kohl (G.)، kol (OG.)، caul (OE.). وشە ئەورووپییەکان دەچنەوە سەر caulis (L.) "لاسک". بەپێی مانای بنەڕەتی وشە لاتینییەکە لەوانەیە ئەم وشانە خزم بن دەگەڵ ↑قەڵەم qelem و ↑قالۆر qalor و هێندێك وشەی دیکە.

**کەلەمچە kelemçe** [ *kalamča* ] - "دەستبەندی ئاسنی زیندانی":

1- دەتوانێ پێوەندی بە ↑کەلەمە keleme ەوە هەبێ.

2- لەوانەشە شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑کەلەپچە kelepçe.

**کەلەمە keleme** [ *kalama* ] - "ئاڵقەی دارینی ملی گا": کەڵمە kelme و ↑کەلەوە kelewe ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑چەڵەمە çeleme "هاڵقەی سەری قەیاسە". ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ klemmen (G.) "رێککوشین، هاڵقاندن، گیر کردن، بە هاڵقە و گیرە قایم کردن"، klamm (G.)، Klemme (G.) "گیرە" (وەك گیرەی موو، بەراوردی شێوەی ئەم کلیپ یان گیرەیە بکە دەگەڵ" چەڵەمە"، یان بەراوردی گیرە [کلیپ]ی فیلم هەڵگرتن بکە دەگەڵ "چەڵەمە"]، Klammer (G.) "1- گیرە، کلیپ (بۆ پێکەوەنووساندن و راگرتنی شت، بۆ وێنە ئەو گیرەیەی چەند پەرەکاغەزی بەیەکەوە پێ رادەگرن 2- کەوانە، پەرانتێز (دە نووسیندا) 3- ئاوقا بوون دە زۆرەوانیدا"، klimmen (G.) و climb (E.)، climban (OE.) "بە شاخ هەڵچوون" [دە بنەڕەتدا: دەست و پێ لە بەرد گیر دان بۆ سەرکەوتن؟]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی

**> *glem (IE.)** ”ڕێککوشین“. ئەم ریشەیەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دوورتر واتا ریشەی **> *gel(ə)- (IE.)** ”ڕێککوشین، گلۆڵە کردن، تۆپەڵە کردن، گلوو کردن“. بەم جۆرە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گلوو gılû. ئەم وشانە لەوانەشە خزم بن دەگەڵ ↑کەلەپچە kelepçe ”دەستبەندی زیندانی“ [دە بنەڕەتدا: ”گیرە یان کلیپی چکۆڵە“].

**کەڵەن kelen** [*kalan*] - ”قەلادەی ملی تاژی“: لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- کەڵەوە/ ↑کەڵەمە *keleme*.

2- ↑قەلادە qelade.

**کەلەندر kelendır** [*kalandır*] - ”مەڵەغان“: کەلەندی kelendî ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schale (G.)، scala (OG.) ”تۆکڵ“، scelan (OG.) ”تۆکڵ لێکردنەوە، داڕندنی تۆکڵ“. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> *(s)kel- (IE.)** ”قەلشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە“.

[تێبینی: دەناو ئامرازەکانی ددانپزیشکدا ئامرازێک هەیە لە چەشنی مەڵەغاتێکی بچووک کە قورمی ددانی پێ دەکرێنن و پێی دەگوترێ Scaler. ئەم وشەیە پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە].

**کەڵەوە kelewe** [*kalawa*] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڵەمە keleme.

**کەڵەهێر keleher** [*kalaher*] - ”کۆ بوونەوەی جوانەگای زۆر لەسەر مانگا بەکەڵ“: خزمە دەگەڵ ↑کەڵەگا kelega ”گایەک کە دەپەڕێتە سەر مانگا“. ”کەڵ“ لەم وشانەدا بە مانای ”تامەزرۆیی، هەوەس“ دێ و ناتوانێ بە مانای ”کەڵ“ی ئاژەڵ بێ، چونکوو کەڵ تێری مانگا نییە.

کەرتەوشەی هێر her لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هار har و ئاماژە بە ”هار و هاج“ بوون بکا.

**کەلی kelî** [*kalī*] - ”1- کونی شانەهەنگوین 2- تێوان تێکەوتوو (فاسیلە)ی دیوار و ددان 3- کلک قوڵە“: بە هەر سێ ماناوە خزمە دەگەڵ ↑کەلێن kelen، سەر بە ریشەیەک بە مانای ”بڕین، قەڵشاندن“.

**کەلیژە kelîje** [*kalīža*] - ”تێری“: کەلیجە kelîce ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەڵ kel 1 ”تێری گامێش“.

**کەلیلان kelîlan** [*kalīlān*] - ”داخ و حەسرەت“: هەروەک چۆن ”داخ“ هەر دوو مانای ”گەرم“ و ”خەم، کەسەر“ دەبەخشێ، هەر بەم شێوەیە ”کەلیلان“ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە پەیدا دەکا:

1- ↑قاڵ *qal* ”تواوە لە گەرمان“.

2- ↑کوڵین kulîn [کەلین kelîn یش دەگوترێ].

**کەلێژ kelej** [*kalež*] - ”کلێجە، کلیێتجە“: شێوەیەکی دیکە لە ↑کلێجە kılece ”زەقایی سەرسمت“.

**کەلێژ kelej** [*kalež*] - ”دەسەڵات“: جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Heer (G.)، heri (OG.)، here (OE.)، här (Sw.) ”سوپا، هێزی شەڕکەر“. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ karas (Lit.) ”شەڕ“ و karias (Lit.) ”سوپا“ و kara (OP.) ”هێزی شەڕکەر“، koíranos (Gr.) ”سەرلەشکر، سەرکردەی سوپا“، سەر بە ریشەی **> *koro-s (IE.)** ”شەڕ“.

[تێبینی 1: سەبارە بە پێوەندی دوو چەمکی ”شەڕ“ و ”دەسەڵات“ سەرنجی وشەی ”زەنگ“ بدە کە دەگەڵ ”زەبر“ دێ و دەگوترێ ”زەبر و زەنگ“. وشەکە خۆی خزمە دەگەڵ ”جەنگ“ و هەروەها ”زەبر و زەنگ“ مانای ”دەسەڵات و ئۆتۆریتە“ش دەبەخشێ. تێبینی 2 : لەوانەیە ئەم وشەیە

پێوەندی هەبێ بە ریشەی ‎*kar- /*ker-‎ ‏(IE.)‏ "خار، سەخت، بەهێز بوون". لەم ریشەیە چەندین وشە بە مانا "دەسەڵات و زاڵ بوون" پەیدا بوون، بۆ نموونە وشەی "کورد"].

**کەلێن kelen** ‏[*kalen*]‏ - "درز، قەڵش، کون": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑کالان kalan "بەرگی خەنجەر" [دە بنەڕەتدا: کون و کەلێن، کلۆرایی].

2- ↑قەل *qel* [قەل کردن واتا برین]، ↑کوڵ kul [پێکوڵ]، ↑قەڵت qelt و ↑قەڵشاندن qelşandın.

**کەم kem** ‏[*kam*]‏ - "دژی زۆر": کم kam ‏(P.)‏. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- some ‏(E.)‏ "هێندێک، ژمارەیەک"، sum ‏(OE.)‏، ‏(OG.)‏ sums ‏(Gt.)‏ hamos ‏(Gr.)‏، sama ‏(OIn.)‏، hama ‏(Av.)‏. لەم تێڕوانینەوە "کەم" دەبێ سەرەتا بە مانای "هێندێک، ژمارەیەک" بەکارهاتبێ، واتا "نەک زۆر". پاشان ماناکە گۆڕاوە بۆ "دژی زۆر".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا وشەی اندک endek کە هەمان "هێندێک"ی کوردمادییە، مانای کەم دەدا، واتا دەبینین لێرەشدا وشەیەک کە دە زمانی کوردمادیدا مانای "نەک زۆر" دەبەخشێ، دە زمانی فارسیدا مانای "دژی زۆر"ی پەیدا کردووە].

2- smāhī ‏(OG.)‏"کەمی، کەماسی، بچووکی"، smāhi ‏(OG.)‏ "کەم، بچووک، بێنرخ" و schmähen ‏(G.)‏ "سووک کردن، روسوا کردن" [دەبنەڕەتدا: بە کەم زانین، کەم کردنەوەی ڕێز و بایەخ]. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەمک2 kemık "روخسارچکۆڵە" و↑شەمزە şemze "بەرخۆلە و کارژیلە".

**کەمان keman** ‏[*kamān*]‏ - "داری چەماوە، مونحەنی، گەوزی": کمان kamān ‏(P.)‏. کەوان kewan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑کەمەند kemend، ↑کەمەر kemer، ↑کەمە keme "داری دەوری دەفە"، سەر بە ریشەی **< ‎*kam(p)-‎ ‏(IE.)‏** "چەمانەوە".

**کەمپەر kemper** ‏[*kampar*]‏ - "رکەبەری": هەروەها کەمپەراندن kemperandın هەیە بە مانای "رکەبەری کردن": خزمە دەگەڵ Kampf ‏(G.)‏ "خەبات، شەڕ" و champion ‏(E.)‏ "قارەمانی زۆرەوانی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر camp ‏(L.)‏ "مەیدان، مەزرا، دەشت" [مەبەست لێرەدا مەیدانی شەڕ و زۆرانبازی بووە].

**کەمت kemt** ‏[*kamt*]‏ - "دوگمەی قەبە، قوبە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< ‎*kam(p)-‎ ‏(IE.)‏** "چەمانەوە" و خزم بێ دەگەڵ ↑کەوان kewan [کەمان keman].

**کەمچ kemç** ‏[*kamč*]‏ - "خوار و خێچ": خزمە دەگەڵ ↑گەمژە gemje و دواتر دەگەڵ ↑گەوز gewz.

**کەمچە1 kemçe** ‏[*kamča*]‏ - "1- کەچک 2- ماڵە": مانای دووەم لێرەوە هاتووە کە ئەو ئامرازەی قوڕەکارییان بە کەوچکێک شوبهاندووە کە قوڕی پێ هەڵدەگیرێ. وشەکە شێوەی کونتری ↑کەوچک kewçık یان کەڤچک kevçık ە.

**کەمچە2 kemçe** ‏[*kamča*]‏ - "داغی ئاژەڵ و وڵسات": خزمە دەگەڵ ↑قوم4 qum "داخ، گەرم" و ↑قوماندن qumandın "داخ کردن".

**کەمر kemır** ‏[*kamır*]‏ - "خەڵووزی بەردین": بڕوانە ↑کەڤر kevır "بەرد".

**کەمرە kemre** ‏[*kamra*]‏ - "ریخ و پەینی رەقبوو و پەستراو": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑قەمرین qemrîn "بەستن، بوونە سەهۆڵ"، ↑کەمر kemır "خەڵووزی بەردین"، ↑کەڤر *kevır* "بەرد"، ↑کەمێل kemel "چەڵمی هیشک و رەق هەڵاتوو" و هتد. ریشەی وشەکە بە مانای "بەرد" بووە.

**کەمشۆ kemşo** [ *kamšo* ] - "گەمژە": شێوەیەکی دیکە لە ↑گەمژە gemje.

**کەمک1 kemık 1** [ *kamık* ] - "دەسرە": کەمیک kemîk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جامە came سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

**کەمک2 kemık 2** [ *kamık* ] - "روخسارچکۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑شەمزە şemze "بەرخۆلە و کارژیلە".

**کەمکۆل kemkol** [ *kamkol* ] - "توێکلی شینی گوێز": ↑کەمک kemık + ئۆل ol [پاشگری گچکاندن]. خزمە دەگەڵ ↑*جامە came* سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

**کەملتە kemılte** [ *kamılta* ] - "کەستەک، سندەگڵ": خزمە دەگەڵ ↑سمتە sımta [سمتەگڵ].

**کەموور kemur** [ *kamūr* ] - "بەرد": کەمر kemır یش دەگوتری. شێوەیەکی دیکە لە ↑کەڤر kevır [فۆتیمی m کۆنترە لە v].

**کەمۆ1 kemo 1** [ *kamo* ] - "کەڵەکباز، فێڵباز": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑گەمژە gemje و ↑*گەوز gewz* دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "خواری، خوار بوون، چەمانەوە" دەبەخشن."کەمۆ" کەسێکە کە بە "خوار و خێچی" - نەک بە راست و دروستی- دە گەڵ ئەوانیتر هەڵسوکەوت دەکا.

**کەمۆ2 kemo 2** [ *kamo* ] - "کۆدک، کاسەی دارینی زل": هەروەها کەمۆڵە kemole یان کەموولە kemule هەیە بە مانای "کاسەی دارینی چکۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑جام cam "دەفر".

**کەمە keme** [ *kama* ] - "داری دەوری دەفە": خزمە دەگەڵ ↑کەمان keman.

**کەمەر kemer** [ *kamar* ] - "1- ناوقەد 2- بەندی ناوقەد": کمر kamar (P.). خزمە دەگەڵ ↑کەمان keman "داری چەماوە" و ↑*چەمان çeman* "خوار بوونەوە، داهاتنەوە". لەم تێڕوانینەوە کەمەر واتا شوێنی چەمانەوەی لەش. مانای دووەم لە مانای یەکەمەوە پەیدا بووە، واتا سەرەتا وشەکە "کەمەربەند" بووە و دواتر کورت بووەتەوە بۆ "کەمەر".

**کەمەرە kemere** [ *kamara* ] - "گاشەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑کەمر kemır "خەڵووزی بەردین" و ↑*کەڤر kevır* "بەرد".

**کەمەند kemend** [ *kamand* ] - "پەتی سەر بە ئاڵقە": کمند kamand (P.). خزمە دەگەڵ ↑کەمان keman.

**کەمین kemîn** [ *kamīn* ] - "بۆسە، حەشارکە": کمین kamīn (P.). دەچێتەوە سەر ریشەی **<** ***kem-** ***(IE.)*** "داپۆشین، حەشاردان، لێهاڵان". وشەی ↑جامە came "جلک"یش لەم ریشەیە هاتووە.

**کەمێل kemel** [ *kamel* ] - "1- چڵمی رەقبوو 2- ریخی رەقبووی بە پشت دووگەوە لکاو 3- پترۆی برین": خزمە دەگەڵ ↑کەمرە kemre.

**کەن ken** [ *kan* ] - "کرێژی سەر": کەنک kenık یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر کرداری ↑کەندن kendın [هەڵکەندن]. مەبەست ئەو توێخەیە کە لە پێستی سەر هەڵدەکەنرێ. لە باری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "کرێژ" و "کەڤشک" کە ئەوانیش هەر ئەم مانایە دەبەخشن. وشەی یەکەم دەچێتەوە سەر کرداری "کڕاندن" و هی دووەم دەچێتەوە سەر کرداری "ساوین، سوونەوە".

**کەنار kenar** [ *kanār* ] - "قەراخ": کنار kenār (P.). بە شێوەیەکی کورتکراوە ↑کن kın یش دەگوترێ. هەروەها کەنارە kenare هەیە بە مانای "پەڕاوێز" و کەناری kenarî بە مانای "پەرژین". دوو شیمانە لەم بارەوە رێی تێ دەچێ:

1- دە زمانی کوردمادیدا وشەی "جەم" [ل جەم تە] مانای "کەنار، کن، قەراخ، تەنیشت" دەدا و دە بنەڕەتدا بە مانای "پەڕاوێز و قەراخی دووراو" بووە و لەمەوە مانای گشتی قەراخ پەیدا بووە. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چنین، دروون، گرێ دان، هۆندنەوە". هەر بەم شێوەیە دەتوانێ مانای "کەنار"یش دە بنەڕەتدا "پەراوێزی دووراو" بووبێ و ئەمیش لە ریشەیەکی دیکە هاتبێ بە هەمان مانا، واتا ریشەی **< *(s)nē-** ***(IE.)***. شیاوی باسە کە وشەی ↑نک nk یان ↑تیز nez و ↑نیزیک nîzîk یش پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. هەروەها ↑چنین çınîn و Schnur (G.) "دەزوو" لەم ریشەوە دێن. شتێک کە شیمانەی پێوەندی "کەنار" بەم وشانەوە بەهێزتر دەکا، وشەی "کەناری" بە مانای "پەرژین"ە. وەک ئاشکرایە چەمکی "پەرژین" دەگەڵ چەمکی "گرێ دان، تێکچنین و هۆندنەوە" پێوەندی تەواویان هەیە.

2- لە لایەکە دیکەوە ئەگەر سەرنجی وشەی "قەراخ" بدەین دەبینی کە ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "زەق و دەرپەڕیو بوون" دەکا، چونکوو قەراخی هەر شتێک بریتییە لە شوێنی زەق و دەرپەڕیوی ئەو شتە [گۆشە و قەراخ]. ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە بۆی بچین، ئەوا "کەنار" دەگەڵ ژمارەیەک وشە پێوەندی پەیدا دەکا کە مانای "زەق ودەرپەڕیو" دەگرنە خۆ، وەک ↑قوتیر *quner* [گۆنر gonır] "کوان، دومەڵ"، ↑قونار qunar "لکەرەز"، ↑سنوورچە sınûrçe "چرۆ، لکی تازەدەرهاتوو"، ↑قنار qınar "چنگی ئاژەڵی راوکەر" و هتد.

**کەند kend** [ *kand* ] - دەگەڵ "لەند" دێ [کەند و لەند بە مانای بەرزی و نزمی زەوی]. کەند دەچێتەوە سەر کرداری↑ کەندن kendın "هەڵکەندن".

**کەنداڵ kendal** [ *kandāl* ] - "قووڵکە، چاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کەندن kendın "هەڵکەندن".

**کەندر kendır** [ *kandır* ] - "1- دەزوو 2- پەتی لە پرزەی گیا": کندر kındır و کنر kınır یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schnur (G.)، snor (Norw.)، snoer (Nl.) "دەزوو، پەت"، snēre (OE.) "ژێ"، snōrjō (Got.) "قەرتاڵە، تۆڕ". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)ne-** ***(IE.)*** "چنین، تەنین". وشەی ↑چنین çınîn خۆی پێوەندی بەم ریشەوە هەیە. ئەم ریشەیەش خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەیەکی کۆنتر کە وشەکانی ↑نک nık و ↑نیزیک nîzîk و ↑نەخ nex "دەزوو" لێیەوە هاتوون. وشەی ↑کنج kınc "جلک" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

**کەندڕ kendır** [ *kandır* ] - "کەنداڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەنداڵ kendal.

**کەندک kendık** [ *kandık* ] - "گوێلکی یەکساڵە": خزمە دەگەڵ Kind (G.)، (Nl.)، (OIs.) "زارۆک"، kundr (OIs.)، gnatus (OL.) "کوڕ"، kind (E.) "جۆر، نەوع". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑کەنیز keniz و ↑کەنیشک kenîşk "کچۆڵە"، ↑گەنج genc "لاو"، سەر بە ریشەی **< *gen-** ***(IE.)*** "زان، بەدونیا هێنان". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ژن jın و ↑زان zan و ↑گۆن gon [گوێن، لەگوێن] "جینس، جۆر، نەوع".

**کەندن1 kendın 1** [ *kandın* ] - دەگەڵ پاشگری "هەڵ" دێ، هەڵکەندن [هەڵقەندن] واتا دانەوە و قووڵ کردنی زەوی. هەروەها دەگەڵ پاشگری "دا" دێ، داکەندن واتا لێکردنەوەی جلوبەرگ لە لەش. دە زمانی فارسیدا کندن kandan (P.) بەو مانایانە دێ: "هەڵکەندن، داکەندن، دەرکێشان، توێکل لێ کردنەوە، داڕنین". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کنۆس kınos "چکۆس"دا باس کراون.

**کەندن2 kendın 2** [ *kandın* ] - دەگەڵ چەند وشەیەک دێ وەک تڕ کەندن tır kendın، تس کەندن tıs kendın. ئاشکرایە ئەم "کەندن"ە ناتوانێ پێوەندی بە "کەندن"ی سەرەوە هەبێ و

دەشێ ماناکەی شتیکی دیکە بێ. ئەم وشەیە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ژەندن jendın بە مانای "لێدان" [زدن zadan (P.)].

[تێبیی: سەبارەت بە کرداری "لێدان" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "فریاد زدن، داد زدن، زرت زدن ..." دە زمانی فارسیدا].

**کەنراوە kenrawe** [ *kanrāwa* ] - "ئاژەڵی قەڵەوبووکێ": خزمە دەگەڵ ↑ئاخنین axnîn [a-xınîn] "پڕپڕ کردن، پەستاوتن".

**کەنزە kenze** [ *kanza* ] - "1- جلیقە 2- جلکی ژێرکراس": خزمە دەگەڵ ↑کنج kınc "جلو بەرکێ" و ↑کەندر *kendır* "1- دەزوو 2- پەتی لە پرزەی گیا".

**کەنشت kenışt** [ *kanıšt* ] - "جۆرێک مۆمی هەنگوین": خزمە دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn سەر بە ریشەی *(IE.) *kn(e)ko- >* "رەنگی زێڕ، زەردی وەک زێڕ".

**کەنکەنە kenkene** [ *kankana* ] - "زۆر زەلام": خزمە دەگەڵ ↑سەنگین sengîn "قورس، گران"، ↑زەنگەنە zengene "بە زەبر و زەنگ"، ↑زەنگ zeng "زەبر، زۆر، دەسەڵات". ئەم وشانە دواجار دەچنەوە سەر ↑ژەندن *jendın* "لێدان".

[تێبینی1: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Gewalt مانای "زەبر و زۆر، زەبر و زەنگ" دەبەخشێ و gewaltig بە مانای "زۆر بەهێز، زۆر زەلام، بە هەیبەت" بەکار دێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ "پاڵەوان"ی کوردمادی].

**کەنگێ kenge** [ *kange* ] - "کەی، کیژان دەم": پێک هاتووە لە دوو کەرتی کە + هەنگێ henge + ke. کەرتی یەکەم شێوەیەکی کۆنترە لە ↑چ çı یان چە çe. بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑گاو gaw "دەم، کات".

**کەنەف kenef** [ *kanaf* ] - "کناراو، پێشاو": هەر وەک "کناراو" و "پێشاو" دەشێ وشەکە لە دوو کەرتی ↑کن kın "کنار، کەنار" و ↑ئاو aw [ئاڤ av] پێک هاتبێ. دیارە مرۆڤەکان لە قەراخ چەم و جۆگە و ئاوان کاری قورسیان کردووە و خۆیان خاوێن کردۆتەوە [دەستیان بە ئاو گەیاندووە] و هەر بۆیەش وشەگەلی وەک "ئاودەست، کناراو، پێشاو، کەنەف" دروست بوون.

**کەنەفت keneft** [ *kanaft* ] - "پەرێشان، کەلەلا": کنفت keneft (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ knapp (G.) و (Nl.)، hneppr (OIs.) "کەم، تەنگ"، hneppa (OIs.) "رێکگوشین، تەنگاو کردن، ناچارکردن". هەروەها بەرهەفی بکە دەگەڵ ↑قنب qınb "گوشینگەی لە دار بۆ پلیخاندنەوەی ترێ".

**کەنەک kenek** [ *kanak* ] - "بەردی زل": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سەنگ seng "بەرد، کەڤر". وشەی سەنگ خۆی خزمە دەگەڵ ↑زەنگ[1] zeng [زەبر و زەنگ] و ژەندن jendın "لێدان". ئەم وشەیەی دوایی بە شێوەی ↑کەندن[2] kendın یش دەگوترێ. "کەنەک" هەروەها هەڵسەنگێنە دەگەڵ ↑کەنکەنە kenkene "زۆر زەلام" [دە بنەڕەتدا: زۆر بەهێز، بە زەبر و زەنگ].

**کەنەنە kenene** [ *kanana* ] - "تیخی کەچک کۆڵین": دەچێتەوە سەر کەندن[1] kendın [هەڵکەندن واتا هەڵکۆڵین].

**کەنی kenî** [ *kanī* ] - "کچ": کنا kına ش دەگوترێ. ئەم وشەیە و هەروەها ↑کەنیز kenîz و ↑کەنیشک kenîşk و هەروەها ↑کەندک *kendık* "گوێلکی یەکساڵە". شیاوی باسە زۆرێک لەو وشانەی بە مانای بێچووی مرۆڤ و ئاژەڵ بەکار دێن، ریشەکانیان هاوبەشە.

**کەنیز kenîz** [ *kanīz* ] - "کچۆڵەی قەرەواش کە بە پارە کڕدابێ": خزمە دەگەڵ ↑کەنی kenî و ↑کەنیشک kenîşk و کنا(چە) kına(çe) گشتیان بە مانای "کچ، کچۆڵە".

کەنیسە **kenîse** [ *kanīsa* ] - "مزگەوتی جووەکان" : کەنیشت kenîşt یش دەگوترێ. < *kenūštā* (*Arc.*) " جڤات، ئەنجومەن، کۆڕ". (بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 322).

کەنیشت **kenîşt** [ *kanīšt* ] - "1- ریپۆقی چاو 2- کەمێڵ، پیسایی لووت": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑کەنشت kenışt "جۆرێک مۆمی هەنگوین"، سەر بە ریشەی **< *kn(e)ko-** (**IE.**) "رەنگی زێڕ، زەردی وەک زێڕ". هەم ریپوق و هەمیش کەمێڵ دوو شتی رەنگ زەردن و لەوانەیە ناوەکە ئاماژە بەم رەنگە بکا.

2- ↑گەنین genîn.

کەنیشک[1] **kenîşk** [ *kanīšk* ] - خزمە دەگەڵ ↑کەنی kenî.

کەنیشکی **kenîşkî** [ *kanīškī* ] - "رەشێنەی چاو": دەچێتەوە سەر ↑کەنیشک[1] kenîşk و ↑کەنی *kenî*. دە زمانی کوردمادیدا وشەی "کچێنە"ش بە مانای "رەشێنەی چاو، بیبیلە" بەکار دێ. ئەم وشانە دە ئەسڵدا مانای "چکۆڵە، زارۆک" دەبەخشن. سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "چکۆڵە، زارۆک" و "بیبیلە" بڕوانە وشەکانی "کچێنە" و هەروەها "بیبیلە".

کەنین **kenîn** [ *kanīn* ] - "پێکەنین": خندیدن xandīdan (P.). خزمە دەگەڵ gähnen (G.)، ginen (OG.)، yawn (E.)، ganian (OE.)، gina (OIs.) "باوێشک هاتن، دەم ئاوەلا کردنەوە". ئاشکرایە کە کەنین (پێکەنین) جۆرێک لە دەم کردنەوەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *ghan-** **/ *ghe-** (**E.**) "دەم (ئاوەڵا) کردنەوە". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑قاز qaz، ↑قەوچە qewçe، ↑زەردەخەنە zerde-xene.

کەو1 **kew 1** [ *kaw* ] - "مەلی قاسپەکەر": کبک kabk (P.). خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe و کبود kabūd (P.) "رەنگی ئاماڵ شین". ئەم مەلە بە هۆی رەنگەکەیەوە ناو نراوە. خزمیشە دەگەڵ ↑کۆتر kotır.

کەو2 **kew 2** [ *kaw* ] - "بێژینگ": خزمە دەگەڵ ↑سەپی sepî "پاڵوێنە" و Siep (G.) "سەپی".

کەو3 **kew 3** [ *kaw* ] - "داخ، چزان": ↑کواندن kuwandın "داخ کردن".

کەوا1 **kewa 1** [ *kawā* ] - "جلکی سەرەوە": دە زمانی عەرەبیدا قبا qabā (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- cappa (L.) "جلکێکی کڵاودار".

2- ↑کەوش kewş، ↑گاوس gaws و ↑*قایش qayş*، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

کەوا2 **kewa 2** [ *kawā* ] - "کەڵەشاخی خوێن بەردان": خزمە دەگەڵ ↑کەو2 kew 2 "بێژینگ " و ↑سەپی *sepî* "پاڵوێنە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چۆڕاندنەوە، دڵۆپاندن".

کەوار **kewar** [ *kawār* ] - "1- دەفری گەوری گڵین بۆ ئارد و دانەوێڵە، کەندوو 2- پلوورە هەنگ، کەندووی مێشەنگوین": ↑کوار kıwar یش دەگوترێ.

کەواڵ1 **kewal 1** [ *kawāl* ] - "دەستەیەک پەز": ↑کەڤاڵ keval یش دەگوترێ.

کەواڵ2 **kewal 2** [ *kawāl* ] - "1- پێستی مار2- قەباڵە": خزمە دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl [کەڤل] "پێست، پێستە". دەشێ وشەی ↑قەباڵە qebale [یان قەواڵە] دە بنەڕەتدا هەر بۆ چەمکی "پێست" بگەڕێتەوە، واتا مەبەست پارچەپێستێک بووە کە بابەتی خاوەندارییەتی لەسەر نووسراوە و وەک بەڵگەی خاوەنداری پارێزراوە و دەست بە دەست کراوە.

کەواڵ[3] **kewal** [ *kawāl* ] - "ئاژەڵ، مەر و ماڵات": شێوەیەکی دیکە لە ↑سەواڵ sewal "مەر و ماڵات".وشەی ↑گەماڵ gemal "سەگ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

کەوان **kewan** [ *kawān* ] - "1- دارێکی چەماوە تیری پێ دەهاوێژن 2- شتی چەماوە": کمان (.P) kamān. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑گاو gaw "ئاڵقە"، ↑چەمان(ەوە) *çeman(ewe)* "داهاتنەوە، خوار بوونەوە"، سەر بە ریشەی **< -(IE.) *kam(p)** "چەمانەوە".

کەواندن **kewandın** [ *kewāndın* ] - "داخ کردن": خزمە دەگەڵ ↑کەو3 kew " داخ، چزان" و ↑کواندن kuwandın "داخ کردن".

کەوانە **kewane** [ *kawāna* ] - "تەنراوێکە لە شووڵ دەکرێتە پاوە بۆ بەسەر بەفردا رۆیشتن، لاکان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زەمۆمە zemome "تیغە، تیوان کردن بە قورِ یان تامان"دا باس کراون.

کەوتاندن[1] **kewtandın** [ *kawtāndın* ] - "حەپینی کەماڵ": بنجی کەو(ت) -(kew(t خزمە دەگەڵ ↑حەپین ħepîn [یان حەپاندن] و هەروەها ↑گەف gef "حەپەی سەگ، هەرەشە" و↑گەفاندن gefandın "هەرەشەکردن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "زار کردنەوە، دەم داپچڕین".

کەوتاندن[2] **kewtandın** [ *kawtāndın* ] - "تۆپاندن": ↑کەوتین kewtîn "تۆپین".

کەوتن **kewtın** [ *kawtın* ] - "بەر بوونەوە، بەلادا هاتن": کەفتن keftın یش دەگوترێ کە شێوەی پێشتری وشەکەیە. دە "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی" ( ل. 314) لەژێر وشەی کەڤن [کۆن]دا ئاماژە بە ریشەی ئێرانی کۆنی *kafna** (.OIr) کراوە و ئەویش بردراوەتەوە سەر ریشەی -*kap** "کەوتن، کەفتن". دە فەرهەنگەکانی بەردەستی مندا، من تووشی ریشەیەکی هیندوئەورووپی ئەوتۆ بەم مانایە نەبووم. بەڵام دوو ریشەوە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن کە بریتین لە:

1- ریشەی **< -(IE.) *su(e)p** "خەوتن، خەفتن". بەم پێیە "کەوتن" دەبێتە خزم دەگەڵ "خەوتن". [تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی "کەوتن" و "خەوتن"دا پێوەندی نیزیک هەیە. ئەم پێوەندییە لە وشەی کوردی "پاڵ کەوتن"دا دەبینرێ کە بە مانای "راکشان، خەوتن" بەکار دەهێنرێ. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا schlafen (.G) "خەوتن" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "شۆڕ، داکەوتوو، داهێزراو" و خزمە دەگەڵ schlaff (.G) "خاو، شل، داکەوتوو، داهێزراو" و خزمیشە دەگەڵ "سلێپ"ی کوردی بە مانای "تەپ، تەوەزەل"].

2- ریشەی **< -(IE.) *k(u)ei** "هێورین". دە زمانی لاتینیدا quietus (.L) "ئارام" لەم ریشەوە هاتووە.

کەوتین **kewtîn** [ *kawtīn* ] - "تۆپین": خزمە دەگەڵ ↑کەوتن kewtın [کەفتن] و لەوانەشە ↑خەوتن xewtın و چەند وشەیەکی دیکە. دە بنەڕەتدا مەبەست لە کەوتین، پاڵ کەوتن یاخود خەوتن [لێرەدا بە مانای مردن] ە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا einschläfern بە مانای "تۆپاندن، کەوتاندن" بەکار دێ کە دەچێتەوە سەر کرداری schlafen "خەوتن"].

کەوچک **kewçık** [ *kawčık* ] - کەفچک kefçık یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە دوو وشەی کەو [کەف] + چک çık + kew. وشەکە دە بنەڕەتدا کەمچە(ک) (kemçe(k بووە. ↑کەمچە kemçe دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادی و فارسیدا بەکار دێ و بە "کەوچکی" بەننایی دەگوترێ کە قوڕی پێ هەڵدەگرن. هەروەها چەمچک çemçık و چمچە çımçe ش بە مانای "مەلاقە، کەوچکی مەزن" و کەمچک kemçık بە مانای "کەوچکی دارین" بەکار دێن. بنەوشەی کەم -kem یان کەو -kew پێوەندی هەیە بە ↑جام cam "دەفر". مانای بنەڕەتی کەمچک یان کەوچک دەبێتە "دەفری بچووک، دەفرۆکە".

کەوتن **kewtın** [ *kawtın* ] - "بەر بوونەوە": کەفتن keftın یش دەگوترێ و ئەمە دەبێ شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. خرمە دەگەڵ افتادن oftaden (P.) "کەوتن". بنەوشەی -kef(t) جێی هەڵسەنگاندنە_دەگەڵ ↑خەوتن xewtın [خەفتن xeftın].

کەودەن **kewden** [ *kawdan* ] - "نازیرەک، گێل": کودن koudan (P.).

[سەرەتا تێبینییەک: ئەگەر سەرنجی وشەی "خنگ" دە فارسیدا بدەین کە دەبێتە خزم دەگەڵ "قانگ"ی کوردمادی، دەبینین کە مانای وشەکە "پووک، کۆڵدراو، کلۆر"ە و پێوەندی بە کرداری "کەندن" [هەڵکەندنەوە] هەیە. هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی "خەرفاو" بدەین، دەبینین کە ئەویش پێوەندی بە چەمکی "کۆڵین، کەندن"ەوە هەیە. پێوەندی ئەم چەمکانە لەوەدایە کە مرۆڤی گێل وەها دانراوە کە کەللەی پووک و هەڵۆڵ و بەتاڵە].

لەم گۆشەنیگایەوە ریشەی "کەودن"یش ساخ دەبێتەوە. "کەودن" خزمە دەگەڵ ↑گاود gawd و گود goud (P.) "قووڵ" و دە پلەیەکی دوورتر دا دەگەڵ ↑*کون kun*.

کەورک **kewırk** [ *kawırk* ] - "هەرمێی رەق": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین hemrîn دا هاتوون.

کەورگ **kewırg** [ *kawırg* ] - "ئەشکەفت": کەوەر kewer یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*کون kun* دا باس کراون.

کەوژ **kewıj** [ *kawıž* ] - "هێشووترێی بە دارەوە وشک بوو": خزمە دەگەڵ ↑هێشوو hêşû و ↑قەوش qewış "کلۆشی سەر خۆیان".

کەوژین **kewjîn** [ *kawžīn* ] - "بێزوو کردن، مەگیرانی کردن": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑هەویستن hewîstın [he-wîstın].

کەوش **kewış** [ *kawıš* ] - "پێڵاو": کفش kafš (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "تیوەپێچان، داپۆشین"، وەک ↑قایش qayış "چەرمی دەباغیکراو" [قاویش qawîş و قاویچ qawîç یش دەگوترێن]، ↑قەیاسە qeyase "باربەندی پانی لە چەرم"، Haut (G.)، huid (Nl.)، hide (E.)، hud (Sw.)، cutis (L.)، kytos (Gr.) "پێست، پێستە"، سەر بە ریشەی **< *(s)keu- (IE.)** "داپۆشین، لێهاڵان". وشەی ↑کەف[1] kef [کەفی ئەسپۆن] لەم ریشەوە هاتووە.

کەوشەن **kewşen** [ *kawšan* ] - "سنوور، تخووب": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑*گەوز gwez* و ↑گەمژە gemje دا باس کراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، با دران، چەمانەوە". مەبەست لە "کەوشەن" ئەو هێڵەیە کە بە دەوری وڵاتیکدا کێشراوە، خوار بووەتەوە. لەباری ماناوە "کەوشەن" هەڵ سەنگینە دەگەڵ "بازن(ە)" کە ئەویش سەر بە ریشەیەکی دیکەیە بە مانای "خوار بوون، چەمانەوە". مەبەست لە کەوشەن هەمان "بازنە"یە، واتا ئەو هێڵەی وەک بازنە دەوری وڵاتەکەی داوە، بە وتەیەکی دیکە موحیت یان سنووری وڵات.

کەوشین **kewşîn** [ *kawšīn* ] - "بوورانەوە، لە هۆش چوون": [دە بنەڕەتدا: خوار بوونەوە و بە لادا هاتن]. خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑گەمژە gemje و ↑*گەوز gewz* دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "خوار بوون، چەمانەوە" دەبەخشن. لەباری ماناوە دەگەڵ وشەی "گێژ" بەرهەڤی بکە کە ئەویش لە ریشەدا مانایەکی ئەوتۆ دەبەخشێ.

کەوگی **kewgî** [ *kawgī* ] - "گەنە": گاوەک gawek یش دەگوترێ. بڕوانە ↑گاوک gawık "مێشوولەی تەپۆ".

کەوڵ **kewıl** *[ kawıl ]* - "پێستی داڕندراو، سفرەی چەرمین": کەڤل kevıl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەڤز kevız "قەوزە".

کەونارا **kewnara** *[ kawnārā ]* - "سەردەمانی کەون": کەون kewın یان ↑کۆن kon + ara < *(L.) aera* "سەردەم ، پاژێکی دیاریکراو لە کات". ئەم وشە لاتینییە خۆی دەچێتەوە سەر aes (aeris) (L.) "بەردی کانزا" و خزمە دەگەڵ ehern (G.)، ērīn (OG.)، a ren (OE.) "بڕونزی، برینجی" [دە بنەڕەتدا، سەخت، ئاسنین، بادەوام، بەردەوام"، ēr (OG.)، aiz (Gt.)، ore (E.)، eir (OIsl.) "بەردی کانزا". وشەی ↑ئاسن asın دە زمانی کوردیدا خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی **< *aios- (IE.)** "مس، برۆنز"، کە رەنگە ئاماژە بە رەنگی سووتاوی کانزاکە بووبێ. وا دەر دەکەوێ کە پێکهاتنی مانای "کات" بەم جۆرە روی دابێ: سەخت، ئاسنین، بادەوام ← بەردەوام، هەرمان ← کات، سەردەم.

[تێبینی: رەنگە ئەم ریشەیە خۆی بچێتەوە سەر ریشەی *-ās* (IE.)* "سووتان، هایسان". وشەی هیشک hîşık و ئارا ara "دەشت" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە].

کەوە **kewe** *[ kawa ]* - "رەنگی شینی کاڵ، بۆری ئاماڵ شین": کبود kabūd (P.). ناوی ↑کەو kew و ↑کۆتر kotır لەم وشەیە وەرگیراون. وشەکە هەروەها دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑سپی sıpî. بەراوردی دوو وشەی سپید sepīd (P.) "سپی" و کبوود kabūd (P.) "کەوی" دە فارسیدا بکە، سەر بە ریشەی **< *kuei- (IE.)** "درەوشانەوە، بریسکانەوە".

کەوەرە **kewere** *[ kawara ]* - "تۆژاڵکی سەر برین": کبرە kabare (P.). شێوەیەکی دیکە لە ↑کەپرە kepre [↑کەپرۆکەkeproke]. شێوە کۆنەکەی لە وشەی ↑گەمرە gemre "پترۆی برین"دا پارێزراوە. خزمە دەگەڵ ↑هەپروون2 heprun "سەخت" [چیایەکی هەپروون]. لەم تێروانینەوە وشەکە ئاماژە بە رەق بوون و چاک بوونەوەی پێستی بریندار دەکا. وشەی "سارێژ"یش ئاماژە بە چەمکی "رەق بوون" دەکا.

کەوەری **kewerî** *[ kawarī ]* - "عاجز، جاڕز": شێوەیەکی دیکە لە ↑زوێر zıwêr [زویر zıwîr] "ناقایل، نارەحەت". وشەی گەورە gewre دە بنەڕەتدا پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

کەوەژ **kewej** *[ kawaž ]* - "پێستی هەڵکەنراو": خزمە دەگەڵ ↑کەوڵ kewıl "پێستی داڕندراو، سفرەی چەرمین" و دواتر دەگەڵ ↑کەڤز *kevız* "قەوزە".

کەوەندە **kewende** *[ kawanda ]* - "چادر، کۆن، خێوەتی رەشماڵ": خزمە یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کۆن kon "رەشماڵ".

کەوی1 **kewî 1** *[ kawī ]* - "رام، دەستەمۆ": خزمە دەگەڵ بنەوشەی چەپ -çep دە وشەکانی [↑چەپلە çeple و ↑چەپۆک çepok] دا بە مانای "دەست". هەروەها دەگەڵ کف kef (P.) "بەری دەست". کەوی واتا "بەدەست فێربوو" یاخو "دەستەمۆ".

کەوی2 **kewî 2** *[ kawī ]* - "رنوو": کەڤێلە kevele ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەست بێ بە وشەی ↑کەوتن kewtın و ئاماژە بێ بە کەوتن و خل بوونەوەی رنووبەفر.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شاپە şape "رنوو".

کەوی3 **kewî 3** *[ kawī ]* - "داغ(ی نیشانە کردن)": خزمە دەگەڵ ↑کاوانەوە kawan(ewe) "سووتانەوە(ی پێست)" [کاویان2 kawyan و کاوە kawe ش دەگوترێ]، سەر بە ریشەی **< *kuei- (IE.)** "هایسان، درەوشانەوە"، یان ریشەی **< *kueit- (IE.)** "بریقانەوە، رووناک بوون". لەم

تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سووتان sutan [شەوتین şewtîn]. ئەم دوو ریشەیەی سەرەوە دەشێ دواجار هەر یەک ریشە بن.

**کەویچە kewıçe** [ *kawīča* ] - "دەمی پلووسکە گەنم لە ئاسیاودا": کەویژە kewîje ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کون kun "قەڵش، بۆشایی" دەبنەڕەتدا سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین، دەم ڤاڵا کردن".

**کەوین kewîn** [ *kawīn* ] - "پێکەوە جۆش دانی کانزا":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کەوی³ kewî "داغی نیشانەکردن"، سەر بە ریشەی **< *kueit-** *(IE.)* "بریقانەوە، ترووسکان".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ schweißen (G.) "جۆش دانی کانزا". ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا "عارقە کردن" مانا دەدا. دە ئەڵمانی ناویندا sweizen (MG.) بە مانای "سووتاندن، برژاندن" بەکار هاتووە. لە مانای "عارەق دەر کردن"ەوە مانای "جۆش دانی کانزا" پەرەی گرتووە. وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *sueid-** *(IE.)* "عارەقە کردن" و دەبێتە خزم دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑خۆە xoh "ئارەقە".

[تێبینی: وێ دەچێ ئەم ریشەیە خۆی پێوەندی هەبێ بە ریشەی *sueid-* *(IE.)* "هایسان، درەوشانەوە"].

**کەویە kewîye** [ *kawīya* ] - "کون و خانووی نزم و نەوی": بڕوانە ↑کەوێل¹ kewel "1- کۆخ، کۆختە 2- ئەشکەوت".

**کەوێل¹ kewel** [ *kawel* ] - "1- کۆخ، کۆختە 2- ئەشکەوت": خزمە دەگەڵ ↑کون kun "قەڵش، بۆشایی"، دەبنەڕەتدا سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین، دەم ڤاڵا کردن".

**کەوێل² kewel** [ *kawel* ] - "ئامان" [کاسە و کەوێل]. دەچێتەوە سەر ↑قاپ¹ qap [فۆتیمی p گۆڕاوە بە w].

**کەهنیک kehnîk** [ *kahnīk* ] - "کەفکانی، قۆچەقانی": دە زمانی فارسیدا بە قۆچەقانی دەگوترێ "فلاخن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "پلۆسین" و "فەلاقە"ی کوردمادی بە مانای "لێدان". قۆچەقانی ئامرازێکی "لێدان" بووە و بۆیە ئەم ناوەی پێ دراوە. بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە وشەی کەهنیک kehnîk یش پێوەندی هەیە بە ↑ژەندن jendın و ↑کەندن² kendın بە مانای "لێدان". فۆتیمی h دە وشەی "کەهنیک"دا زێدەیە و خراوەتە سەری. ئەم زێدەفۆتیمە دە ژمارەیەک وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، وەک کەهر [کار، کاریلە]، کهەڕ [کەڕ]، کەهرێز [کارێز]، کەهنی [کانی] و هتد.

**کەهەنگ keheng** [ *kahang* ] - "نەخۆشی تەنگەنەفەسی": بەرهەنگ berheng یش دەگوترێ. بنەوشەی هەنگ -heng دەچێتەوە سەر ریشەی **< *angh-** *(IE.)* "تەنگ، رێکگوشران". خزمە دەگەڵ ↑خنکان xınkan و چەند وشەیەکی دیکە.

**کەیاندن keyandın** [ *kayāndın* ] - "ژەندنی تراو": شێوەیەکی دیکە لە ↑ژەندن jendın / ژاندن jandın. هەروەها ↑کیان kîyan دەگوترێ بە مانای *"ژان، لێکدران"*.

**کەیل¹ keyl** [ *kayl* ] - "شۆخ و شەنگ": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑قایل qayıl "رازی".

**کەیل² keyl** [ *kayl* ] - "دارماڵ، پڕاوپڕ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەحێل keĥêl. وشەی فارسی خیلی xaylī (P.) "زۆر" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**کەین keyn** ⌊ *kayn* ⌋ - "تیوان، پێوەندی": [کەین و بەین]، خزمە دەگەڵ ↑کون kun [کون و کەلێن]. وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "کەلێن، بەتاڵایی تیوان، فاسیلە" بەکار هاتووە. پاشان لەمەوە مانای "تیوان" پەیدا بووە.

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆری فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی کەیەڵ keyel و ↑کەوێل kewel کە هەردووک دە ئەسڵدا یەک وشەن و خزمیشن دەگەڵ "کەین". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "کەییل و کەوڵ"، "کەیەن و کۆن"، "کەیی و کەوی" و هتد].

**کیان kîyan** ⌊ *kīyān* ⌋ - "ژان، لێکدران": بڕوانە ↑کەیاندن keyandın "ژەندنی تراو".

**کیاستن kîyastın** ⌊ *kīyāstın* ⌋ - "رەوانە کردن، ناردن، شاندن": خزمە دەگەڵ ↑گەیشتن geyıştın [گەهیشتن gehîştın]، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghē(i) >** "لێکبوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە تیوان، جێ هێشتن، چوونە پێش".

**کیپ kîp** ⌊ *kīp* ⌋ - "تەواو بەستراو، بێ دەرز و کەلێن": کیپ کردن بەو مانایە دێ کە دەرگا و پەنجەرە بە تەواوی ببەسترێ [دەرز و کەلێنی تێدا نەمێنێ] بۆ ئەوەی دەنگ یان هەوا پێیدا تێ نەپەڕێ. لە ژێر وشەی ↑ئیپە îpe "*بەندی* قایش"دا شی کراوەتەوە.

**کیتەڵە kîtele** ⌊ *kītala* ⌋ - "دیزە": پێوەندی هەیە بە scutula (L.) "دەفر". وشە لاتینییەکە دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە Schüssel هەر بەم مانایە.

**کیر kîr** ⌊ *kīr* ⌋ - "ئەندامی نێرینایەیی": کێر ker یش دەگوترێ. کیر kīr (P.).

[تێبینی: دە زمانی لاتینیدا pēnis (L.) بە هەردوو مانای "کلک" و "کیر" بەکار دێ. ئەم وشەیە هاتووەتە ناو زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیشەوە و بە مانای "کیر" بەکار دەهێنرێ. هەر دە زمانی ئەڵمانیدا Schwanz (G.) مانای "کلک" دەدا و دە زمانی ئاخافتندا هاوکات بە مانای "کیر"یش بەکار دەهێنرێ].

وەک دەبینین لەم زمانانەدا "کیر" وەک کلکێک [واتا وەک زەقاییەک] لە بەرچاو گیراوە. بە سەرنج دان بەم پێوەندییە، وێ دەچێ دە زمانی کوردمادی و فارسیدا وشەی "کیر" پێوەندی بە وشەی ↑کلک kılık ەوە هەبێ. شیاوی باسە وشەکانی pen (E.) و pencil (E.) "قەڵەم" لەم وشەی لاتینییەی سەرەوە هاتوون و هەروەها کلک kelk (P.) دە زمانی فارسیدا بە مانای "قەڵەم" بەکار دێ.

[تێبینی: کلک دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "قامک"یش بەکار دەهێنرێ. سەرنجراکێش ئەوەیە کە وشەی *دول* "سیرەتی منداڵ" خزمە دەگەڵ *تلی* "قامک"].

**کیڕ kîr** ⌊ *kīr* ⌋ - "هەڵقرچانی پێست بە سووتان": پێوەندی هەیە بە ↑قرچان qırçan [هەڵقرچان].

**کیز kîz** ⌊ *kīz* ⌋ - "زەوی رەقەن و تمتمان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون.

**کێزک kezk** ⌊ *kezk* ⌋ - "قالۆنچە": سوسک sūsk (P.). هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گازولک gazulk و ↑گازۆز gazoz.

**کێزین kezīn** ⌊ *kezīn* ⌋ - "بۆری ئاو لە سواڵەتی سوورەوە کراو": کێزن kêzın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑*کاسە kase*، گۆزە goze، کاشی kaşî و هتد.

**کیژ kîj** ⌊ *kīž* ⌋ - "کچ": شێوەیەکی دیکە لە ↑کچ kıç.

**کێژان kîjan** ⌊ *kīžān* ⌋ - "کێهە، کامە": خزمە دەگەڵ ↑کێ ke.

**کیس kîs** [ *kīs* ] - کیس کردن kîs kırdın ی ددان بە مانای مەبەست هەڵمسانی ڕوومەت بە هۆی چلك کردنی ددانە. پێوەندی هەیە بە cystis (L.) و kistis (Gr.) "هەڵمساوی، بلۆق" (ریشە؟). ئەم وشەیە لە ڕێگەی زمانی لاتینییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکان و وەك چەمکیکی پزیشکی بۆ شوێنی هەلمساوی ناو لەش کە وەك کیسە یان توورەکە دروست دەبن، بەکار دەهێنرێ.

**کیساندن kîsandın** [ *kīsāndın* ] - "شاردنەوە":

1- لە لایەکەوە دەکرێ پێوەندی بدەینەوە بە ↑کیسە kîse کە شتی تێ دەکرێ یان تێیدا دەشاردرێتەوە.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑کاژە kaje "حەشارگە، پەناگە".

**کیسە kîse** [ *kīsa* ] - "توورەکە": کیسە kīse (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑کیس kîs.

2- Kissen (G.) "باڵنج" [توورەکەیەك کە ناوەکەی بە شتێکی نەرم پڕ کراوە]. ئەم وشە ئەڵمانییە بردراوەتەوە سەر culcita (L.) "کیسە، توورەکە".

**کیسەڵ kîsel** [ *kīsal* ] - "ڕەقە": کیسۆ kîso، کووسی kusî و کووسەڵ kusel یش دەگوترێن. لەوانەیە پێوەندی بە kasyapa (Av.)، kaśyápa (OIn.)، kašawag (MP.)، کشف kaşaf (P.). ↑کیس kîs "هەڵمساوی"یەوە هەبێ.

**کیف kîf** [ *kīf* ] - "ساك یاخود توورەکەی چەرمین": کیف kīf (P.). هەرچەند دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەیەکی نیزیك بە "کیف" هەیە [coffre (F.) "قوتوو، یەخدان، چەمەدان"، سەر بە kophinos (Gr.) "سەوەتە، قەرتاڵە"]، بەڵام وێ ناچێ وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گیفان gîfan "بەریك، گیرفان".

**کیفاندن kîfandın** [ *kīfāndın* ] - "هاشاندنی مار": ↑کوففین kuffîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ حەپاندن ħepandın [↑حەپین ħepîn "وەڕینی سەگ"، سەر بە ریشەیە بە مانای "دەم کردنەوە، دەم داپچڕین".

**کیفۆك kîfok** [ *kīfok* ] - "ناوی گیایەکە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑سێو sew.

2- ↑گیپە gîpe و ↑گێپەر *geper*.

**کیڤار kîvar** [ *kīvār* ] - "کرێژی ئەستوور": خزمە دەگەڵ ↑کەڤز kevız "قەوزە".

**کیلەر kîler** [ *kīlar* ] - "ئەنباری ئازووقە": کلەر kıler یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Keller (G.)، kelder (Nl.)، källare (Sw.) "ژێر زمین" > *(L.) cellarium* "ئەنباری ئازووقە" > *(L.) cella* "دیوی بچووك". Zelle (G.) و سلول sellūl (P.) "خانەی لەش، شانەی لەش" لەم وشە لاتینییە وەرگیراون.

**کیوون kîyun** [ *kīyūn* ] - "کوتکی گەورەی ئاسن شکاندن": خزمە دەگەڵ ↑هاونگ hawıng [دەسکاونگ].

**کین kîn** [ *kīn* ] - شێوەی کۆنتری ↑قین qîn "ڕق، بێزاری".

**کێ ke** [ *ke* ] - "چ کەس": kî یش دەگوترێ. کی kī (P.)، ka (OP.)، kō (Av.). خزمە دەگەڵ wer (G.)، (h)wer (OG.)، who (E.)، vem (Sw.)، kah (OIn.)، qui (L.)، kas (Lit.) سەر بە ریشەی ***(IE.) *ko-, ke- >*** "کێ، چ، چی".

**کێته kete** [ *keta* ] - "1- تیڵا، بەرچیغ 2- داربەستی دارەترێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆتە1 kote "قەدی دار".

**کێچ keç** [ *keč* ] - "زیلەیەکی هار و هاج": کک kak (P.)، خزمە دەگەڵ keck (G.) "سەرزیندوو، سەری حاڵ"، quick (E.)، kvick (Sw.)، kwik (Nol.) "خێرا، چاڵاک". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑ژین jîn، ↑جیوە cîwe "کانزای چالاک" و هیتر، گشتیان سەر بە ریشەی **< *guei-** *(E.)* "ژین، چالاک بوون، سەرزیندوو بوون".

[تێبینی: ناوی ئەم زیلەیە دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە Floh (G.) کە ئەمیش خزمە دەگەڵ کرداری fliehen (G.) "*فلەتین*، راکردن، دەرپەڕین"، واتا لێرەشدا ناوی زیلەکە پێوەندی بە چالاکی و خێراییەوە هەیە].

**کێخ kex** [ *kex* ] - "1-چلێک، پیسی 2- چلکی برین": خزمە دەگەڵ ↑قخە qıxe [قخخە qıxxe] "پیس" بە زمانی زارۆک".

**کێڕ[1] ker** [ *ker* ] - "خوار": بۆ وێنە لە وشەی ↑کێرستوون kerstun "کۆلکەزێرینە"دا دەبینرێ. دەچێتەوە سەر ریشەی **< * (s)ker** *(IE.)* "سووڕان، با دران، خوار بوون". وشەکە بە شێوەی ↑کووڕ kur یش دەبینرێ [پشت کووڕ pıştkûr]. خزمە دەگەڵ schräg (G.)، curvus (L.) "خوار"، kírkos (Gr.)، circus (L.) "جەغز"، Ring (G.)، (h)ring (OG.) "هاڵقە، بازنە"، krug (Rus.) "جەغز، قەوان".

[تێبینی: دە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا (ل. 318) وشەی کێڕ بردراوەتەوە سەر ker (Arm.) "خوار"].

**کێڕ[2] ker** [ *ker* ] - "خەت، رووش":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑کێرد kerd "چەقۆ"،

2- یانش ↑کڕاندن kırandın "رووشاندن".

**کێرد kerd** [ *kerd* ] - "چەقۆ": کێر ker و کارد kard یش دەگوترێ. کارد kard (P.). خزمە دەگەڵ scheren (G.) و (Nl.)، sceran (OG.)، shear (E.) و skära (Sw.) "برین، لەت کردن". دە زمانی ئەڵمانیدا Schäre (G.) بە مانای "برینگ، مەقەست" بەکار دێ. [وشەکە هەڵسەنگینە دەگەڵ مشار mişar (Arb.)]. هێندێک وشە دە زمانەکانی دیکەدا پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە، وەک keirein (Gr.) "لەت کردن، جیا کردن، برین"، skirti (Lit.) "لێک جودا کردن"، scarami (OIn.) "جیای دەکەمەوە"، سەر بە ریشەی **< *(s)ker-** *(E.)* "برین، لەت کردن، لێک جودا کردن". ژمارەیەک وشە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑کەڕاندن kerandın "کرتاندن"، ↑کرتاندن kırtandın، ↑شڕ şır [شەق و شڕ] و هتد.

[تێبینی: ئەم ریشەیە دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ریشەیەکی دیکەی هیندوژێرمەنی یەک دەگرێتەوە، واتا ریشەی **< *sek-** *(E.)* "برین". وشەکانی چەقۆ eqoç، چاک çak، شەق şeqe [شەق و شڕ] و چەندین وشەی دیکە بۆ ئەم ریشەی دوایی دەگەڕێنەوە].

**کێرستوون kerstun** [ *kerstūn* ] - "کۆلکە زێرینە، پەلکە زێرینە": کێڕ ker "خوار، چەماو" + ستوون stun، تێکڕا واتا ستوونی چەماو یاخود کەوانی. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "کۆلکەزێرینە" [کۆڵەکەی زێرین، ستوونی زێرین] و هەروەها "رنگین کمان" دە زمانی فارسیدا واتا "کەوانی رەنگین".

**کێرە kere** [ *kera* ] - "مەشکەی لەدار یان تەنەکە": گاریە garîye ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جەرە cera.

کێریان **keryan** *[ keryān ]* - "رووشان، خەت پێداهاتن": ↑کڕاندن kırandın.

کێزان **kezan** *[ kezān ]* - "لێکدرانی تراو": هەروەها کێزاندن kezandın هەیە بە مانای "ژندن". شێوەیەکی دیکە لە ↑هەژان hejan و هەژاندن hejandın.

کێزک **kezk** *[ kezk ]* - "قالۆنچە": ↑گازولک gazulk یش دەگوترێ. هەروەها کێزگ kezg هەیە بە مانای "مێشی پاقڵە". سوسک sūsk (.P) "قالۆچە".

کێزم **kêzım** *[ kezım ]* - "1- دەستەکەدار 2- دارێک کە وەبەر داری رەزی دەدەن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گەز2 gez دا باس کراون.

کێزن **kezın** *[ kezın ]* - "بۆری ئاو لە سواڵەت": کێزین kezîn یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کاسە kase و ↑کاشی kaşî ەوە.

کێش **kêş** *[ keš ]* - "وەزن": کاش kaş یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر کرداری ↑کێشان kêşan بە مانای "وەزن کردن".

کێشان **kêşan** *[ kešān ]* - کشیدن kešīdan (.P). دە زمانی کوردمادیدا بەپێچەوانەی فارسییەکە ↑کشان kışan یش هەیە [راکشان rakışan، داکشان dakışan، هەڵکشان helkışan]. کاتێک لە مانا جۆربەجۆرەکانی وشەکە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا ورد ببینەوە، دەردەکەوێ کە ئەم کردارە دە بنەڕەتدا مانایەکی وەک ↑خشان xışan بە دەستەوە دەدا و دەبێ دەگەڵ ئەم کردارەش خزم بێ. بو وێنە دە زمانی فارسیدا "دەست کشیدن روی" بە کوردی دەبێتە "دەست پێداخشاندن" یان "دەست رێخشاندن". یان مانای "کشان کشان"ی فارسی جگە لە خشان و ↑خوشین xuşîn بەسەر هەردا چیتر نییە. کاتێک باس لە جگەرە کێشان [سیگار کشیدن بە فارسی] دەکرێ، ئەوە مەبەست خوشین و خشاندنی دووکوڵەکە بە ناو دەم و قوڕگدایە. کاتێک باس لە رەنج کێشان [رنج کشیدن، ازار کشیدن بە فارسی] دەکرێ، مەبەست ئەوەیە کە رەنج و ئازار وەک بارێک بەسەر هەرددا بەدوای خۆماندا رادەکێشین، واتا بارەکە بەسەر هەردا رادەخوشێ [لە هەردەکە دەخشێندرێ]. ئەم مانایانەی سەرەوە دەری دەخا کە مانای بنەڕەتی "کێشان" بریتی نییە لەو مانایە کە لە کردارەکانی ziehen (.G) و pull (.E) دا دەردەکەوێ، بەڵکوو بریتییە لە "خشان و خشاندن"ی شتێک بەرەو لایەک. [بەرانبەری وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە دە زمانی کۆنی کوردمادیدا وشەیەکی دیکە بەکار هاتووە. ئەم وشەیە، "تەکینەوە" بووە، کە دە زمانی ئەمرۆدا بە مانای "کشانەوە لە کارێک یان شتێک" بەکار دێ]. بە پێی ئەم هەڵسەنگاندنە دەکرێ شیمانەیەکی بەهێز بکەین کە وشەی "کێشان" و "خشان" و هەرروەها "خوشین" و "خزین" دە بنەڕەتدا هەمووی یەک وشە بووبن. ئەم وشە جیاوازانە کە لە وشە بنەڕەتییەکەوە سەرچاوەیان گرتووە، گشتیان دۆخێک نیشان دەدەن کە شتێک لەسەر رووبەرێک دەبزوێ، بە شێوەیەک کە ئەم شتە لەکاتی بزواندا لە رووبەرەکە جیا نابێتەوە، واتا وەک جۆرێک "سینەخیز" کردن. جێی ئاماژەیە کە کەرتی "خیز" لێرەدا خزمە دەگەڵ "خزین"، "خوشین"، "خشان" و "کشان". ئەمجار پرسیار ئەوەیە کە شتێک، ئەگەر لە رووبەرەکە جیا نەبێتەوە، چۆن دەتوانێ ببزوێ و بۆ ئەم لا و ئەو لا بچێ؟ دیارە هەروەک لە دۆخی "سینەخیز"دا دەبیندرێ، دەبێ ئەو کارە لە رێگەی "خۆ بادان" بەم لا و ئەولادا بێ. هەر بۆیە زۆر رێی تێ دەچێ کە ئەم وشانە بچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *weis- , *ueis- <** "سووڕان، با دان". فۆنێتیمی سەرەتای ریشەکە دە وشە کوردمادی و فارسییەکەدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لەم بارەوە دەکرێ بۆ وێنە دەگەڵ وشەی "وەش" و "خۆش" بەرهەفی بکەین کە هەردووکیان هەر یەک وشەن و دەگەڵ "ویستن" خزمن. لەم پێوەندییەدا وشەیەکی دیکە سەرنج رادەکێشێ کە

بریتییە لە ↑کۆشین koşîn [↑تیکۆشین têkoşîn]. ئەم وشەیە پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست یان دەبێ ئەوە بێ کە مرۆڤ ئەرکێک "رادەکێشێ" و یان ئەوە کە مرۆڤ بەرەو ئامانجێک "دەکشێ" [دەخوشێ]، وەک چۆن کرمێک بە خۆ بادانی بەردەوام بەرەوە ئامانجی خۆی رێگە دەبڕێ.

[تێبینی: پێوەندییەک کە لەتیوان دوو چەمک و دوو وشەی "کێشان" و "کۆشین" (تیکۆشین)دا هەیە، بە هەمان شێوە دەتیوان دوو وشەی "تەکینەوە" و "تەقەلا"شدا بەرچاو دەکەوێ].

**کێشە kêşe** [ *keša* ] - "1- شەڕ 2 - دەمەقاڵە 3- مەسەلە": خزمە دەگەڵ کێشان kêşan.

**کێشە2 kêşe** [ *keša* ] - "داری ناو هەڵۆڵ بۆ پێدا هاتنی ئاوی ئەستێر": خزمە دەگەڵ ↑کێزن kêzın "بۆری ئاو لە سواڵەتی سوورەوە کراو".

**کێک kek** [ *kek* ] - "کادە، کەیک": کێک keyk (P.). خزمە دەگەڵ ↑ققە qıqe [قەقە qeqe] "خواردن بە زمانی زارۆک".

**کێکا keka** [ *kekā* ] - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ ↑کەکەو kekew [ککەو kıkew] "کەڤوت، داری کەوت". ئاماژەیە بە سەختی و بەهێز بوون.

**کێل1 kel** [ *kel* ] - "1- بەردی بلیندی سەر گۆڕ 2- نیشانەی کەوشەن": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک کە ئاماژە بە شتی زەق و قوت و دەرپەڕیو دەکەن، وەک ↑کلک kılk،↑کەل kel [ملەی کێو]، ↑کەڵک kelk "پاسارە، قەراخی دەرپەڕیوی سەربان". دەشێ ئەم وشانە خزمایەتییان هەبێ دەگەڵ culminare (L.) "گەیشتنەئەوپەڕ، گەیشتنە سەر دوند"، سەر بە ریشەی **> *kel-** (IE.) "دەرپەڕین، قوت و زەق بوون".

**کێل2 kel** [ *kel* ] - "سەرداری عێل": کەیل keyıl یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاڵ kal "پیر، بەساڵداچوو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵدان، گەورە بوون، گەورە کردن".

**کێڵ kel** [ *kel* ] - "جووت و شۆ": ↑کاڵ kal یش دەگوترێ [کشت و کاڵ kışt û kal]. خزمە دەگەڵ ↑کێڵان kelan.

**کێڵان kelan** [ *kelān* ] - "هەڵکەندنی هەرد بۆ چاندن": هەروەها ↑کاڵ kal هەیە [کشت و کاڵ kışt û kal]. دە فارسیدا کار -kar (P.) دەبێتە رەگی کرداری ئێستا (میکارم mīkāram (P.) "دەکێڵم، دەچێنم، دەچەقێنم"). دە زمانی فارسیدا بۆ کرداری رابردوو بنجی "کاشت" بەکار دەهێنرێ ("کاشتم" واتا کێڵام، چاندم). دە زمانی فارسیدا مانای وشەکان زۆرتر بەباری "چاندن، چەقاندن"دا شکاوەتەوە. بەڵام مانای ئەسڵی وشەکان دە زمانی کوردیدا پارێزراوە کە بریتییە لە "کێڵان، شۆم". دە زمانی فارسیدا بۆ ئەم مانایە وشەی "شخم" بەکار دێ. ئەگەر سەرنجی وشەی "کشت"ی کوردمادی یان "کاشت"ی فارسی بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیە دەگەڵ ژمارەیەک وشە خزمە کە مانای "بڕین، قەڵشاندن، جیا کردنەوە" دەبەخشن، وەک *کاش2* "1- شوێن پێ لەناو کێلگە 2- شێو، کێڵانی زەوی" و هەروەها *قاش* و *قشت* و کووز "بڕ، لەت، خەت" و هتد. هەروەها ئەگەر سەیری وشەی "شۆ، شێو"ی کوردمادی و "شخم"ی فارسی بدەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشانە دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە خزمایەتی پەیدا دەکەن، کە ئەوانیش مانای "بڕین، لەت کردن، جیا کردنەوە" دەبەخشن، وەک شێ، ژێ، جیا، زام و دە فارسیدا "زەخم". کەوابوو مانای ئەم وشانە لە پێوەندی دەگەڵ زەویدا دەبێتە "بریندار کردن"، بە وتەیەکی دیکە هەڵدڕین و لێک جیا کردنەوەی خاک و خۆڵ بە مەبەستی چاندن. هەر بەم شێوەیە وشەکانی کێڵان kelan و کاریدن kārīdan (P.) یش پێوەندی بە ریشەیەکەوە پەیدا دەکەن کە ئەم مانایە لە خۆ دەگرێ. ئەم ریشەیە بریتییە لە ریشەی **> *(s)kel-** (IE.)

"قەلشاندن، بڕین، لەت کردن، لێك جودا کردنەوە" یان ڕیشەی ***(IE.) *(s)ker- <*** بە هەمان مانا. ↑چاڵ çal "قوڵکە" و ↑قەڵشاندن qelşandın لە ڕیشەی یەکەم وەرگیراون. ↑شڕ şır و ↑کێرد kerd لە ڕیشەی دووەمەوە پەیدا بوون. وێ دەچێ هەردووك ڕیشەی سەرەوە دواجار بەیەك بگەنەوە.

**کێله kele** *[ kela ]* - "پەیمانەی دەخڵ": کەیل keyl و کیله kîle ش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schale (G.)، scāla (OG.)، schaal (Nl.)، skl (Sw.) "قابی پەل"، سەر بە ڕیشەی سەر بە ڕیشەی ***(IE.) *(s)kel- <*** "قەڵشاندن، بڕین، (لێك) جودا کردنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشەیەکی هاوچەشن دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "توێکڵ، پووش" کە دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە ↑چاڵ[2] çal [چیلکە و چاڵ]. هەروەها ↑چاڵ[1] çal بە مانای "قوڵکە"ش لەم ڕیشەوە هاتووە. هەروەها بەراوردی بکە دەگەڵ وشەی ↑کەللە kelle [کەللەسەر، دە بنەڕەتدا: کاسەی سەر].

**کێلێژه keleje** *[ keleža ]* - "1- ئەستوندەکی باریکی درێژ بۆ چادر و کەپر 2- داری ئەم لا و ئەو لای لاشیپانە": کەرتی دووەمی وشەکە پاشگری گچکاندنە. بنجی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑کێل kel.

2- ↑کۆڵەکە koleke "ستوون".

**کێم kem** *[ kem ]* - "چڵك و زنچکاوی برین": خزمە دەگەڵ یاخود وەرگیراوە لە haima (Gr.) "خوێن". هەروەهاخزمە دەگەڵ ↑خوێن xön [خێن xen/ خوون xun].

**کێو kew** *[ kew ]* - "شاخ، چیا": کێف kef یش دەگوترێ. کوه kūh (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم ڕیشانەوە هەبێ:

1- ڕیشەی ***(IE.) *keu- <*** "چەمانەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑قۆز qoz، ↑کۆز2 koz، ↑قۆچ qoç.

2- ڕیشەی ***(IE.) *gēu- <*** "چەمانەوە، خوار بوون، خڕ بوون". ↑گۆ go، گۆیژە goyje [گۆی چکۆڵە، (میوەی)خڕی بچووك] لەم ڕیشەوە هاتوون. وێ دەچێ ئەم دوو ڕیشەیە دواجار بە یەك بگەنەوە.

# گ (G)

**گا ga** [ *gā* ] - "ناوی ئاژەڵێک": گاو gav (P.)، cow (E.)، kuh (G.)، ko (Sw.)، gauh (OE.)، هەروەها bous (Gr.) و bos (L.) "گا" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا و لەم وشانەدا فۆتیمی g گۆڕاوە بە b. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *gous-** "گا".

**گابار(ە) gabar(e)** [ *gābār(a)* ] - "شکێر، قەڵشەشاخ": خزمە دەگەڵ ↑کون *kun* "دەرز، قەڵش" و ↑گۆڕ gor.

**گاپڵ gapıl** [ *gāpıl* ] - "کۆترەگایە": گاپەڵ gapel یش دەگوترێ. کەرتەوشەی "گا" پێوەندی بە "گا"ی ئاژەڵەوە نییە. رەنگە لەژێر کاریگەریی "کۆترەگایە، گاکۆتر"دا فۆتیمی k گۆڕاوە بۆ g. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کەو *kew* و کۆتر kotır [کابۆک kabok].

**گاپن gapın** [ *gāpın* ] - "زۆرخۆر" [دە بنەڕەتدا: دەم داپچڕیو]. خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک↑ گووپ gup، ↑کەپۆ kepo و دواجار ↑کون *kun*.

**گاج gac** [ *gāj* ] - "غەرغەرە": دەشێ هەروەک↑ گێژ gej پێوەندی بە چەمکی "سووڕان"ەوە هەبێ.

**گاخ gax** [ *gāx* ] - "جەغز": شێوەیەکی دیکە لە ↑جەغز *ceğız*. خزمە دەگەڵ ↑یەخە yexe، ↑یوژنە yujne "قایشی جووت" و یوغ yūġ (P.) و Joch (G.) "نیر".

**گادەک gadek** [ *gādak* ] - "سک، کرش": ↑گەدە gede.

**گارام garam** [ *gārām* ] - "مەساسەی دەستی جووتکەر، تیڵای ئەستوور": ↑گا ga + ↑رام ram. مەبەست لێرەدا ئامرازی رام کردنی گایە.

**گاراندن garandın** [ *gārāndın* ] - "دەنگەدەنگی مریشک": خزمە دەگەڵ ↑قڕاندن qırandın [قیراندن qîrandın].

**گاردی gardî** [ *gārdī* ] - "هەڵەپەزە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەرتینە kertene "داوی جاڵجاڵووکە" و کارتن kārtan (P.) "جاڵجاڵۆکە".

**گارنگ garıng** [ *gārıng* ] - "ئامرازێکی کشت و کاڵی": بڕوانە ↑گارنگان garıngan.

**گارنگان garıngan** [ *gārıngān* ] - "گیایەکە شیرەکەی سک رەوان دەکا": هەروەها ↑گارنگ garıng هەیە کە "شتێکە وەک دەمەبێڵ لە شووڵ دەیتەنن، دەسکی هەیە و لەکاتی خۆیان کوتاندا ریخی گاگێرەی پێ دەگرن تا نەکەوێتە ناو دەخڵەوە". کەرتەوشەی "گا" پێوەندی بە "گاگێرە"وە نییە، چونکوو ئەگەر وابێ، لەوشەی "گارنگان"دا بێمانا دەردەچێ، چونکوو "گا" پێوەندی بە "شیرەی گیا"وە نییە. هەروەها ئەم کەرتەوشەیە ناتوانێ پێوەندی بە "گیا"ەوە هەبێ، چونکوو ئەوسا لە وشەی "گارنگ"دا بێمانا دەردەچێ، چونکوو "گارنگ" شتێکە بۆ پاک کردن بەکار دەهێنرێ. بە ورد بوونەوە لە مانای وشەکان و ریشە هیندوئەورووپییەکان دەردەکەوێ کە ئەم دوو وشەیە خزمن و کەرتەوشەی"گا"ش بەشێک لە خودی وشەکانە. ئەم کەرتەوشەیە دەبێ کۆنتر "کا" بووبێ [*کارنگ* *karıng*، *کارنگان* *karıngan*]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑رنگ rıng "هەنگوین و دۆشاوی پاڵاوتە"، rein (G.)، (h)reini (OG.)، hrainis (Got.)، hrēna (OF.) "پاک، *پاڵاوتە*، بێگەرد"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *(s)krei-** "جیا کردنەوە، پاڵاوتن، دابێژتن". وشەکانی cribrum (L.) و criathar (OIr.) "بێژینگ، پاڵوێنە" لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑رنگان rıngan بە مانای "پاڵاوتنی دۆشاو یان هەنگوین" بەکار دێ.

بەم جۆرە دەردەکەوێ کە "گارنگان" ئەو گیایەیە کە دەبێتە مایەی "جیا بوونەوە و پاڵاوتن" لە سکدا. هەروەها "گارنك"یش ئامرازێکی لەشووڵ تەنراوە کە پێشی تێکەڵ بوونی ریخ و دەخڵ دەگرێ و دەبێتە مایەی پاك بوونی دەخڵەکە. شیاوی باسە کە ئەم ریشە هیندوئەورووپییەی سەرەوە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری *(s)ker- (IE.) "برین، لەت کردن، جودا کردن".

**گارۆ garo** [gāro] - "هێلانەمەل لە کونی داردا": دەچێتەوە سەر ریشەی ***(s)ker-** **(IE.)** "برین، لەت کردن، جودا کردن". وەك ئاشکرایە ئەم مانایە پێوەندی نیزیکی هەیە دەگەڵ چەمکی "درز، کون و کەلێن". لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کێرد kerd و لەوانەشە ↑کارك karık "1- جێگەی دانەوێڵە کە لە قوڕ دروستی دەکەن، کەندوو 2- باریکەرێ بۆ چوونەناو باغچەی پەرژینکراو".

**گاری garî** [gārī] - "عارەبانە، داشقە": گاری gārī (P.). پێوەندی هەیە بە carrus (Lat.) "گاری" سەر بە currere (L.) "رۆیشتن، ڕاکردن". وێ دەچێ وشە کوردمادی و فارسییەکە وەرگیراو بن. دە ئینگلیزیدا بووەتە car (E.) "ئۆتومبێل".

**گاریە garîye** [garīya] - "کوندەی گەورەی ئاوکێش کە لەسەر بارەبەری دادەتین": شێوەیەکی دیکە لە ↑کێرە kere "مەشکەی لەدار یان تەنەکە".

**گارێ gare** [gāre] - "ناوی چیایەك لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت" و گەلێك وشە کە لەژێر ↑کورد kurd دا شی کراونەوە.

**گاز1 gaz** [gāz] - "بانگ، هەرا": گاز کردن واتا هەرا کردن، بانگ کردن. دەگەڵ چەندین وشەی دیکە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەنگ کردن، قیژە و هەرا کردن". هێندێك لەم وشانە بریتین لە ↑گازن gazın "گلەیی"، ↑قسە qıse، ↑قیژە qîje، ↑قاسپە qaspe و گاسکە gaske "قروسکەی سەگ"، ↑کازین kazîn "دەنگ و هەرا" و ↑کاستین kastîn "لووراندن" و هتد.

**گاز2 gaz** [gāz] - "1- قەپ، قەپاڵ 2- خەت لە دار دان بە تیخ 3- قەڵشەشاخ 4- شیوی زۆر تەنگ": خزمەدەگەڵ ↑قاش qaş و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "برین، لەت کردن".

**گاز3 gaz** [gāz] - "ئامرازی مێخ دەرکێشان": لە گاز2 gaz "قەپ لێدان" وەرگیراوە، چونکوو ئامرازەکە قەپ لە بزمار دەگرێ و دەری دەکێشێ. وشەیەکی دیکە بۆ گاز "کەلبەتان"ە کە ئەویش لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە "کەلپ" بە مانای "ددانی پێشەوەی ئاژەڵ" واتا ددانەکانی گاز پێگرتن.

**گاز4 gaz** [gāz] - "دۆخێك لە دۆخەکانی مادده": ئەم وشەیە لە زمانە ئەورووپییەکانەوە بە زمانانی دیکەدا بڵاو بۆتەوە و دەچێتەوە سەر وشەی < chaós (Gr.) "تێکەڵ پێکەڵی، بنەماددەی لەشێوەبەدەر". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ĝhan-, *ĝhēi-, *ĝhēu-** **(IE.)** "دەم کردنەوە". ئەم ریشەیە خۆی خزمە دەگەڵ ریشەی *ghē(i) (IE.) "لێکبوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە نێوان، جێ هێشتن، چوونەپێش". بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑کەنین kenîn [پێکەنین] و ↑گەیشتن geyıştın و ↑قاز qaz [قاز و قورینگ] و لەوانەشە ↑قاژ qaj [قاژ و قیژ] و گاز1 gaz "بانگ، هەرا، هاوار کردن". ئەم وشانە ئاماژە بە لێکبوونەوە، بە تایبەتی لێکبوونەوەی دەم دەکەن.

**گاز5 gaz** [gāz] - "شکێر، شکەفت، دەۆلی تەنگ": خزمە دەگەڵ ↑کاژێر1 kajer "1- قوژبن 2- تاقە لە دیواردا 3- ئۆدەی خەڵەوت لە تەکیەدا" و ↑خەزێنە *xezene* "گەنج، گەنجینە".

**گاز6 gaz** [gāz] - دەگەڵ "پشت" دێ [گازی پشت gazî pıt]. بڕوانە ↑گازەرا gazera "تیوەڕاستی پشت".

**گاز⁷ gaz** [ *gāz* ] - "دوند، بەرزترین شوێنی چیا": خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz [قیت و قۆز] و ↑کەژ kej [کەژ و کێو] و دواجار ↑گێژ *gej*.

**گازن gazın** [ *gāzın* ] - "گلەیی": گازندە gazınde ش دەگوترێ. ↑گازا1 gaz "بانگ، هەرا، هاوار کردن".

**گازولک gazulk** [ *gāzulk* ] - "1- قالۆنچە 2- کەرمێش": خزمە دەگەڵ ↑گازۆز gazoz "مۆریانە".

**گازۆز gazoz** [ *gāzoz* ] - "مۆریانە، زیلەی خوری خۆر": هەروەها ↑گازولک gazulk هەیە بە مانای "1- قالۆنچە 2- کەرمێش". دەشێ ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ↑گاز² gaz و ↑گەستن *gestın* ەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کێزک kezk هەیە بە مانا "قاڵۆنچە". وێ دەچێ ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بە "قالۆچە" یان "کێزک" دەگوترێ Käfer. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کردارێکی کۆنی لەناوچوو بە مانای "جووتن" و دەشێ خزم بێ دەگەڵ "زار" دە زمانی کوردمادیدا].

**گازە gaze** [ *gāza* ] - "شفرەی چەرم برین": خزمە دەگەڵ↑ گاز2 gaz.

**گازەرا gazera** [ *gāzarā* ] - "تیوەڕاستی پشت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Gitter (G.) "تێکبەست، داربەست"، ↑کۆت kot "چەپەر"، ↑کۆترە kotre "داری تیوان ئەستوندەک و داری سەربان" و دواجار دەگەڵ ↑خاس *xās*. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تێکبەزین، چوونە ناویەکدی، یەکانگیر بوون، جووت بوون". لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "گازەرا" دەبێ بڕبڕەی پشت یاخود مۆرەکانی پشت بێ کە وەک تێکبەست دەچنە ناویەکدییەوە.

**گازین gazîn** [ *gāzīn* ] - "گلێ و گازن کردن، دەردی دڵ کردن": خزمە دەگەڵ ↑گازن gazın "گلەیی" و دواجار گازا1 gaz "بانگ، هەرا، هاوار کردن".

**گاژ gaj** [ *gāž* ] - "گلۆڵە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گاج gac "غەرغەرە".

**گاسار1 gas(t)ar 1** [ *gās(t)ār* ] - "داری دوو حاچەی سەری گوریس": خزمە دەگەڵ ↑هێچک heçk [هەچک heçk] "قوڵفەداری سەری گوریس".

**گاسار2 gas(t)ar 2** [ *gās(t)ār* ] - "کۆلکەی مێو لەپاش برینی لقەکانی": شێویەکی دیکە لە ↑کۆتەر koter "ئەستوورایی دار، قەدی دار".

**گاستار gastar** [ *gāstār* ] - "هێچک، ئاڵقەی دارینی سەری گوریس": شێوەیەکی دیکە لە ↑هێچک heçk و خزمیشە دەگەڵ ↑هەسک1 hesk 1 "شەن، شەنە".

**گاستین gastîn** [ *gāstīn* ] - "جێگەی کۆ بوونەوە بۆ سانەوە، کلوب": گازتین gaztîn ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاژە kaje "بنەی کاروان لە دەشت".

**گاسکە gaske** [ *gāska* ] - "قروسکەی سەگ": خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje و هتد.

**گاسن gasın** [ *gāsın* ] - "ئامرازی کێڵان": گاواهن gāvāhan (P.). ↑گا ga +↑ (ئا)سن asın [واتا ئاسنی گا].

**گاشە1 gaşe 1** [ *gāša* ] - "زل"، گاشە بەرد واتا بەردی زل. خزمە دەگەڵ ↑گیشە gîşe و ↑گشت gıšt و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە " کۆگا بوون، زۆر و زەوەند بوون، ئاپۆڕە بوون" دەکەن. مەبەست لە "گاشەبەرد" دە راستیدا کۆگایەکی پێکەوەنووساوی بەردە.

**گاشە2 gaşe 2** [ *gāša* ] - "ئاژاوە، بشێوی": خزمە دەگەڵ↑ گێژ gej.

**گاڤ gav** [ *gāv* ] - "شەقاو، قەدەم": بڕوانە ↑هەنگاو hengaw.

گاگۆڵە **gagole** [ *gāgola* ] - "بە چواردەست و پێ ڕۆیشتنی زارۆک": وشەکە چ پێوەندی بە "گا و گوێلک"ەوە نییە؛ شێوەی کۆنتری وشەکە دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە. بڕوانە ↑گانگلۆ ganglo.

گاڵ **gal** [ *gāl* ] - دەگەڵ "گڕ" دێ [گڕ وگاڵ gır û gal کردن واتا زمان کردنەوەی زارۆک]. خزمە دەگەڵ چەندین وشە، لەوانە ↑گالین galîn.

گاڵ **gal** [ *gāl* ] - "هەرزنەتاڵە": هەروەها گالینە galîne هەیە بە مانای "نانی هەرزن". لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑چاڵ çal "چڵت وچاڵ، چیلکە و چاڵ" و هەروەها ↑*کەڵپک kelpık*.

گاڵا **gala** [ *gālā* ] - "هێرش": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑غار ġar "را کردنی توند".

گاڵتە **galte** [ *gālta* ] - "جەفەنگ، فشە": خزمە دەگەڵ galitsja (Rus.) "گاڵتە پێکردن"، سەر بە ڕیشەی **< *ghel-* (IE.)** "قیل و قاڵ کردن، هەرا کردن، بانگ کردن".

گالش **galış** [ *galış* ] - "ژێرپیاڵە": بڕوانە ↑گلاس gılas.

گاڵۆڕ **gallor** [ *gāllor* ] - "لوولاک": خزمە دەگەڵ ↑قالۆر qal(l)or "لاسکی هەڵۆڵ".

گالووف **galf** [ *gālūf* ] - "گیایەکی دەشتەکی": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑*کەڵپک kelpık*.

گاڵۆک **galok** [ *gālok* ] - "داردەست": بنجی گاڵ -gal خزمە دەگەڵ ger (OG.)، gār (OE.)، geirr (OIs.) "دار، داردەست". کەرتی ok- پاشگری گچکاندنە.

گاڵە **gale** [ *gāla* ] - گاڵەدان واتا "داخستن بە قفڵ":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کلیل kılîl و دواتر ↑قەڵا qela [دە بنەڕەتدا: شوێنی داخراو، دەورگیراو].

2- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گۆڵە2 gole "قفڵ".

گاڵیان **galyan** [ *gālyān* ] - دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەگاڵیان vegalyan واتا داچڵەکین]. خزمە دەگەڵ ↑چلیان1 çılyan و ↑*چلەکین çılekîn*.

گالین **galîn** [ *gālīn* ] - "1-گۆرانی خوێندن 2- نالین": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گاڵ gal [گڕ و گاڵ]، سەر بە ڕیشەی **< *ghel-* (IE.)** یان ڕیشەی **< *gal-* (IE.)** "هەراکردن، بانگ کردن، قیژاندن". هەڵی سەنگینە بەتایبەتی دەگەڵ Nachtigall (G.) "بولبول" [دە بنەڕەتدا: (مەلی) شەوخوێن، شەوئاواز].

گامێش **gamêş** [ *gāmeš* ] - "مێیینەی کەڵ": گامووش gamûş ش دەگوترێ. گاومیش gāvmīš (P.). ↑گا ga + مێش mêş، واتا گای مێش [مێشەگا]. کەرتی مێش mêş ئاماژەیە بە ڕەنگی بۆری ئاماڵ ڕەش. ئەم کەرتە دە وشەی ↑خۆڵەمیش xolemêş دا دەبیندرێ. هەروەها دە زمانی فارسیدا مشکی meškī (P.) بە مانای "ڕەش" و دە زمانی کوردمادیشدا ↑مشکی mışkî بە مانای "خۆڵەمێش" بەکار دێ. مەبەست لە وشەکە دەبێ گایەکی ڕەش یان خۆڵەمێشی بێ. زمانی عەرەبی وشە کوردمادییەکەی وەرگرتووە و کردوویە بە جاموس jāmūs (Arb.).

گان **gan** [ *gān* ] - "جووت بوونی نێر ومێ": گایین gayîn ش دەگوترێ. گاهیدن gāhīdan (P.). گاتەن gātan (Pl.). دە پەهلەویدا هەروەها گاتار gatar (Pl.) بە مانای "شوو، مێرد" بەکار هاتووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑*خات xat*، ↑خاس xas، ↑خزم xızım و هیتر، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "پێکەوە گونجان، تێکەبەزین، یەکانگیر بوون، جووت بوون".

گانگلۆ **ganglo** [ *gānglo* ] - "گاگۆلە، گاگۆڵکە": گانگلۆکێ gangloke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Gang (G.)، gang (Sw.)، gang (E.)، gagg (Gt.) "ڕەوت"، سەر بە ڕیشەی **< *ĝhengh-* (IE.)** "لاقەکان لێکردنەوە، بەرەوپێش چوون". jánghā (OIn.) "لە چۆک بەرە ژێر" [خزم دەگەڵ

چەنگ ؟]، (Lit.) žengti "بەرەوپێش چوون، ڕۆیشتن"، (OG.) gangan و (OE.) ganga، (OIs.) (Gt.) gaggan "ڕۆیشتن" لەو ریشەوە هاتوون. دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها (G.) gängeln هەیە بە مانای "زارۆك فێرە ڕۆیشتن کردن" وئەم وشەیەش زۆر لە وشە کوردمادییەکە دەچێ. لەوانەیە ئەم ریشە هیندوئەورووپییەی سەرەوە بچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر واتا ریشەی < ***(IE.) *(s)keng-*** "خوارو خێچ" و ئەگەر وەسا بێ، ئەوجار ئەو وشانە دەبنە خزم دەگەڵ دەستەوشەیەکی دیکە کە لە ژێر وشەی ↑زەنگاڵ zengal دا شی کراونەوە. یەکێك لەم وشانەی کە لەوێدا شی کراونەوە، بریتییە لە ↑چەنگ çeng.

**گاو¹ gaw** [ *gāw* ] - "کات، دەم": هنگام (P.). ئەم وشەیە دەبێ ماناکەی چەندین گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و دواجار مانای "کات"ی پەیدا کردبێ. وشەکە پێوەندی هەیە بە ↑گاو² gaw "شەقاو، لۆقاو، قەدەم". پاشان کاتێك گوتراوە هەنگاو بە هەنگاو [یان دە فارسیدا گام بە گام] لە مانای "شەقاو" یان "قەدەم" مانای "مرحلە" دروست بووە، واتا "قەدەم بە قەدەم" ماناکەی بووەتە "مەرحەلە بە مەرحەلە". دواجار مانای "مەرحەلە" گۆڕدراوە بۆ "دەم، کات".

**گاو² gaw** [ *gāw* ] - "شەقاو، لۆقاو": ↑هەنگاو hengaw [هەن hen + گاو gaw] و ↑پێنگاو pengaw ش دەگوترێ. گام gām (P.). خزمە دەگەڵ gamba (L.) "سم"، jambe (OF.) "لاق"، kampe (Gr.) "جومگە، چەماوی"، gametto (It.) "سەر سم دان، هەڵخزان". وشەی jambon (F.) "(گوشتی) ڕانی بەراز" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەفەڵ kefel. لەوانەیە دەگەڵ ↑چەمان(ەوە) çeman(ewe) و ↑کەوان kewan یش خزم بێ.

**گاو³ gaw** [ *gāw* ] - "تیلێکی چە*ماوە* بۆ پینە کردنی چینی شکاو، تەقەڵ": خزمە دەگەڵ ↑کەوان kewan.

**گاوارە gaware** [ *gāwāra* ] - "بێشکە، لانکە، دەرگووش": گهوارە gahwāre (P.). خزمە دەگەڵ ئەو ریزەوشەیە کە لە ژێر ↑کون *kun* دا باس کراون. ئەم وشانە ماناکانی "کون و کەلێن، *کابار*، قووڵکە، قوولایی، نزمایی" لە خۆ دەگرن.

**گاود gawd** [ *gwıd* ] - "کوور، قووڵ": گود goud (P.). خزمە دەگەڵ ئەو ریزەوشەیە کە لە ژێر ↑کون kun دا باس کراون. ئەم وشانە ماناکانی "کون و کەلێن، *کابار*، قووڵکە، قوولایی، نزمایی" لە خۆ دەگرن.

**گاور gawır** [ *gāwır* ] - "ئاگرپەرست": گبر gabr (P.) "زەردەشتی". وشەی کافر kafir (Arb.) "بێدین، خوانەناس" لەم وشەیە وەرگیراوە. لە ژێر وشەی ↑کافر kafır دا زۆرتر لەم بارەوە باس کراوە. دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەورە gewre "مەزن". [سەبارەت پێوەندی وشەکانی "گاور" و "گەورە" هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "موغ" و "مەزن" کە پێکەوە خزمن. مەبەست لە گاور دە بنەڕەتدا گە*ورە*پیاوانی ئایینی زەردەشتی بووە، بە هەمان شێوەش مەبەست لە مۆغ، مەزنە پیاوانی ئەو ئایینە بووە. لەوانەیە ئەو دوو وشەیە هەر کامیان لە ناوچەیەك بەکارهاتبن، یان بۆ دوو ڕەدەی ئایینی بەکارهاتبن، هەروەك چۆن ئەمڕۆش لەناو ئایینەکاندا چەندین ڕەدە لە پیاوانی ئایینی بەرچاو دەکەون.

**گاوس gawıs** [ *gāwıs* ] - "پێستی چێڵ بۆ مەشکە": خزمە دەگەڵ Haut (G.)، huid (Nl.)، cutis (L.)، kytos (Gr.) "پێست، پێستە"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)keu-*** "داپۆشین، تیوەپێچان، شاردنەوە". hide (E.) "شاردنەوە" لەم ریشەوە هاتووە. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قایش qayış، ↑قەیاسە qeyase و دە پلەیەکی دوورتریشدا لەوانەیە دەگەڵ گەلێك وشەی وەك ↑کەوا kewa، ↑کەوش kewış و هتد.

**گاوشە gawşe** [ *gāwşa* ] - "جەڕڕەی زەلام": خزمە دەگەڵ ↑کۆد kod "کاسەی دارینی شیردۆشین" و ↑گاوود gawd "قووڵ".

**گاوک gawık** [ *gāwık* ] - "مێشوولەی تەپۆ": هەروەها ↑گاوەک gawek [کەوگی kewgî] هەیە بە مانای "گەنە". خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep [قەپ گرتن، گاز گرتن، گەستن]. هەروەها خزمە دەگەڵ Käfer ‹G.›، chevar ‹OG.›، kever ‹Nl.›، chafer ‹E.› "قالۆچە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی لەناوچوو بە مانای "جووتن، گەستن" و هەروەها دەگەڵ Kiefer ‹G.› "زار". خودی وشەی ↑زار[1] zar یش پێوەندی بەم وشانە هەیە. مانای بنەڕەتی "گاوک" دەبێتە "گەزۆک".

[تێبینی: لەباری ماناوە وشەکە هەڵسەنگینە دەگەڵ *گازۆز* "مۆریانە" کە دەچێتەوە سەر "گاز" ‹قەپ› و "گەستن"].

**گاوەک gawek** [ *gāwak* ] - "گەنە": بڕوانە ↑گاوک gawık "مێشوولەی تەپۆ".

**گت gıt** - "1- ڕەقی یەکپارچە 2- وچان، ئۆقرە": پێوەندی هەیە بە ریشەی **‹IE.› *stei- >** "ڕەق بوون، مەیین" [لە جووڵە وەستان]. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*تۆلا tola* "شتی ڕەقبووی پێکەوەنووساو" و ↑تۆڵ tol [توند و تۆڵ]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کۆدە kode "زەوی سەخت و جووت لێنەکراو".

**گدوو gıdu** [ *gıdū* ] - "تەپۆڵک": خزمە دەگەڵ ↑قوت qut و ↑قیت qît.

**گجگاندن gıcgandın** [ *gıjgāndın* ] - "ڕاوەشاندن، لەراندنەوە": هەروەها گجگج gıcgıc هەیە بە مانای "لەرە، ڕاوەشان"، ↑گزگزین gızgızîn "سووک لەرزین"و ↑*گۆزان gozan* "سەر ڕاوەشاندنی منداڵ".

**گجۆڵە gıcole** [ *gıjola* ] - "تووڵە سەگ": دەچێتەوە سەر ↑گچکە gıçke "چکۆڵە". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گچە gıçe "گوێلک".

**گجە gıce** [ *gıja* ] - "ڕەعێت": پێوەندی هەیە بە ↑گچکە gıçke. ڕەعێت وەک مرۆڤێکی چکۆڵە و کەم بایەخ سەیر کراوە [لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "پاڵە"].

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا بە خەڵکی هەژار و ڕەشۆکی دەگوترێ kleiner Mann ‹G.› "خەڵکی بچووک"].

**گجی gıcî** [ *gıjī* ] - "کراس": گجک gıcık یش دەگوترێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەسەخ kesex "جۆرێک پاڵتەوی خوری". لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان بە ↑*کەژین kejîn* "تەنراوی ئاوریشمین"ەوە هەبێ.

**گچکە gıçke** [ *gıjka* ] - "چکۆڵە": کچکە kıçke ش دەگوترێ. کوچک kūček ‹P.›. گچ gıç + کە ke. بنەوشەی گچ -gıç دەبێ بە مانای "کەم، چووک" بێ و پاشگری بچووک کردنەوەی خراوەتەوە سەر و بووەتە گچکە. ئەم وشەیە لە لایەکەوە پێوەندی هەیە بە ↑کچ kıç "بێچووی مێیینەی مرۆڤ" و لەلایەکی دیکەشەوە پێوەندی پەیدا دەکا بە چەند وشەیەکی وەک ↑*کز kız*، ↑کاس kas [کەم و کاسی]، ↑کووژانەوە kujanewe، ↑کوشتن kuştın. ئەم ڕیزەوشەیە دە ریشەدا ئاماژە دەکەن بە "کەم بوون‹ەوە›، بچووک بوون‹ەوە›، لە کزی دان و لە ناوچوون".

**گچە gıçe** [ *gıja* ] - "گوێلک": ↑گچکە gıçke [مەبەست گچکە یان بێچووی مانگایە].

**گدۆل gıdol** - "کز، لەر و لاواز": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گدی gıdî.

**گدیش gıdîş** [ *gıdīš* ] - "خۆیان، خەرمانی گیرەنەکراو": خزمە دەگەڵ ↑کداسە kıdase "لۆدەی کا و ئاڵف کە لە دەشت گڵەبان دەکرێ".

**گدی gıdî** [ *gıdī* ] - "1- وشەی بانگ کردنی کەسی خۆشەویست 2- وشەی بانگ کردنی بەرخ و کاریلە": گدە gıde خۆی بە مانای "کارژیلە" بەکار دێ. هەروەها ↑کودک kudık و کوودەڵە kudele هەن بە مانای "بێچووی لاور" [کوودەڵەبەراز]. دە زمانی فارسیدا کودک kūdak (P.) بە مانای "زارۆک" بەکار دێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ kid (E.) "بێچوو، زارۆک" و Kitz (G.) "کارمامز، کاریلە". بەپێی بۆچوونێک لەوانەیە ئەم وشە ژێرمەنییانە لە وشەیەکی بانگ کردنەوە (بانگەوشە)یەکەوە هاتبن. ئەم بانگەوشەیە دە زمانی کوردمادیدا هەیە. دە کوردمادیدا گدی gıdî و گدینۆ gıdîno وەک وشەی بانگ کردنی کەس یان کەسانی خۆشەویست بەکار دێ. هەروەها گدی گدی gıdî gıdî بۆ بانگ کردنی بەرخ و کاریلە بەکار دێ. لەوانەیە ئەم وشانە دە پلەیەکی دوورتردا خزمایەتییان دەگەڵ ↑گچکە gıçke هەبێ. وشەکانی ↑گدۆڵ gıdol "کز، لەر و لاواز" و ↑گەدا geda "1- خوازەڵۆک، پارسەکەر 2- کچ" پشتڕاست کردنێکە بۆ ئەم بۆچوونە. وەک لەژێر وشەی "گچکە"دا هاتووە، ئەم وشەیە خۆی خزمە دەگەڵ "کز" و هەروەها "کچ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کەم بوون، گچکە بوون، کەم بوونەوە، لە کەمی دان، لە کزی دان". وشەی "گەدا"بە مانای "خوازەڵۆک"یش دە بنەڕەتدا بە مانای "هەژار"بووە، واتا کەسێک کە هەم لەباری فیزیکییەوە و هەم لەباری ئابوورییەوە کز و گچکە و لەر و لاوازە. وشەی ↑هەژار hejar خۆی پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمک و سفەتی "بچکۆڵەیی" [زارۆک بوون] و "خۆشەویستن"دا پێوەندی نیزیک هەیە و ئەمەش لە ژێنێتیکی مرۆڤ و ئاژەڵەکاندا سەقامگیرە، واتا مرۆڤ و ئاژڵەکان حەز و سۆزی تایبەتییان بۆ چکۆڵەکانی خۆیان و نەوعی خۆیان هەیە. تەنانەت مرۆڤەکان حەز لە بێچووی ئاژەڵ دەکەن و زۆرجاریش ئاژەڵەکان نیزیکایەتی زۆرتر دەگەڵ بچووکی مرۆڤەکان پەیدا دەکەن. هەر بۆیە پاشگری "گچکاندن" دە زمانی کوردمادی و فارسی و هەروەها زمانە ژێرمەنییەکاندا هاوکات وەک پاشگری "خۆش ویستن"یش بەکار دێ. ئەمە بەو مانایەیە کە پاشگرەکە سەرەتا وەک پاشگری گچکاندن، واتا بۆ "ناواندن" و بانگ کردنی زارۆک و گیانلەبەری چکۆڵە بەکار هاتووە. لەبەر ئەوەی بەکار هێنانی پاشگرەکە تێکەڵ بووە بە هەستی خۆشەویستی، چەمکی خۆشەویستیشی گرتووەتە خۆ و دواتر بە گشتی بۆ بچووک و گەورە بەکار هێنراوە].

**گڕ gır 1** - " بڵێسە": هەروەها ↑گڕان gıran هەیە بە مانای "کڵپە کردن، بڵێسەدار بوون". خزمە دەگەڵ ↑گیرسان gîrsan [داگیرساندن واتا هەڵکردن یان پێکردنی ئاگر].

**گڕ gır 2** - "زل، قەبە، زوور": [بۆ وێنە: دەنگی گڕ، ددانی گڕ]. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ grob (G.) هەر بەو مانایانە و hreof (OE.) "زوور، شەقارشەقار"، kraupus (Lit.) "زوور". ئەم وشە ئەورووپییانە بە پێی بۆچوونێک دەچنەوە سەر ریشەی ***krup-** < **(IE.)** "قرتماغە، کرێژ". ئەم ریشەیە دەشێ دە پلەیەکی دوورتردا بچێتەوە سەر ریشەی **kar-* (*IE.*) "سەخت، خار" و بەم جۆرە وشەکانی سەرەوە ببنە خزم دەگەڵ ↑خار xar و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە.

**گرار gırar** [ *gırār* ] - "دانەوێڵە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گڕان2 gıran "دەستاڕ".

**گراز gıraz** [ *gırāz* ] - "شلەبرۆش": خزمە دەگەڵ Gries (G.) "دانەوێڵەی وردکراو"، grit (E.) "لمی درشت، خیز"، gryt (Sw.) "کۆگا بەرد". [دە سوێدیدا ماناکە لە خیزەوە بۆ بەرد و لەوێشەوە بۆ کۆگابەرد گوڕاوە]. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑گەرد gerd و ↑ورد wurd و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "ورد کردن، هاڕین".

گران **gıran** [ *gırān* ] - "سەنگین، قورس": خزمە دەگەڵ gravis (L.)، gurú- (OIn.)، kaurjōs (Gt.)، gruts (Let.) "گران، قورس، گرینگ"، سەر بە ریشەی **< -*ger(h) (IE.)** "گران، قورس".

[تێبینی: لەوانەیە ئەم ریشەیە خۆی دەگەڵ ریشەی *ker-/* *kar-* (IE.) "خار، سەخت" پێوەندییان هەبێ، چونکوو شتی سەخت و پتەو هاوکات قورس و گرانە. وشەی "قورس" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەی دوایی].

گڕان1 **gıran** [ *gırān* ] - "کڵپە کردن، بڵێسەدار بوون". خزمە دەگەڵ ↑گڕا1 gır "بڵێسە" و ↑*گیرسان* *gīrsān* [داگیرساندن واتا هەڵکردن یان پێکردنی ئاگر].

گڕان2 **gıran** [ *gırān* ] - "1- دەستاڕ 2- کوتکی زل بۆ بەرد شکاندن": کرە kıre ش دەگوترێ. بڕوانە ↑گڕاندن gırandın "ورد کردن بە دەستاڕ" و ↑گێرە *gere*. هەردوو ماناکە پێوەندییان بە چەمکی "هاڕین، ورد کردن"ەوە هەیە.

گڕاندن **gırandın** [ *gırāndın* ] - "ورد کردن بە دەستاڕ": خزمە دەگەڵ ↑هاڕین harîn و ↑گێرە *gere*.

گڕانە1 **gırane** [ *gırāna* ] - "رووت بوونەوەی سەر، تاسی": دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑کاراک karak "کان"دا شی کراونەوە. ئەم وشانە ئاماژە بە "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، دارووشاندن، کڕاندن" دەکەن. مەبەست لە "گڕانە" دەشێ دە بنەڕەتدا "مووهەڵکەندراو، مووداڕندراو" بێ، هەر وەک چۆن *تاس* "مووتاشراو" پێوەندی بە "تاشین" و هەروەها "کۆسە" پێوەندی بە "گوێزان" و "قاش" و "قاچین"ەوە هەیە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

گڕانە2 **gırane** [ *gırāna* ] - "یەخە": وشەی "یەخە" خزمە دەگەڵ "یوغ"ی فارسی بە مانای "نیر" و هەروەها دەگەڵ "جەغز". ئەم وشانە ئاماژە بە دۆخی وێکهاتنەوە، کەوانەیی و بازنەیی دەکەن. بەم جۆرە دەشێ وشەی "گڕانە"ش هەر لەسەر ئەم بنەمایە چێ کرابێ و خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- corona (L.) "تاج"، korōnós (Gr.) "خوار، بادراو".

2- Kranz (G.) "تاج، تاجەگوڵ"، kranc (MG.) "بازنە، جەغز". ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*ger (IE.)** "سووڕان، بادران" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑قرمان qırman.

گراو **gıraw** [ *gırāw* ] - "کانی ئاوی گەرم":

1- زۆر وێ دەچێ وشەیەکی لێکدراو، واتا (گر-ئاو) نەبێ، بەڵکوو خزم بێ دەگەڵ ↑کرێب kırêb "قوڵکە"، Grab (G.)، grave (E.) "قبر، گۆڕ"، Grube (G.) "قوڵکە". لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژە بەو "قوڵکە و کون و کەلێن"ە دەکا کە ئاوی گەرمی لێ دەر دەچێ. پێوەندی ئەم وشانەی سەرەوە لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ چەند وشەی هاوریشەی وەک "کان، کانی، کەندن [هەڵکەندن]، خەندەک [کەندەک]، کەنداڵ" بەرهەڤ بکەین.

2- لە روانگەیەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە پێک هاتبێ لە دوو کەرتی ↑گڕ gır + ↑ئاو aw. لەم تێڕوانینەوە "گڕ" پێوەندی بە چەمکی "سووتان، هایسان"ەوە پەیدا دەکا.

گراوی **grawî** [ *grawī* ] - "دەسگیران": خزمە دەگەڵ گرامی gerāmī (P.) "ئازیز، خۆشەویست". دە زمانی عەرەبیدا غرامی ġarāmī (Arb.) بە مانای "دڵداری، تاسەبارانە" هەیە. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ:

1- Ruhm (G.) "تیوبانگ، ناو دەنگ"، (h)ruom (OG.)، hra mig (OE.) "پێهەڵگوتراو". (h)ruomen (OG.) "پێهەڵگوتن، پەسن کردن"، hrōđr (OIs.) "پەسن، ناوودەنگ". لەم

تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قارەمان qareman [دەبنەڕەتدا واتا بەناو و دەنگ، پێهەڵگوتراو"].

2- Gram (G.) "خەفەت، تاسە، ئارەزووی پڕ لە حەسرەت". ئەم وشە ئەڵمانییە دەبردرێتەوە سەر gram (OG.)، (OE.) "قەڵس و تووڕە". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گرمە gırme.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "خەفەت" و "تووڕەیی" دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی خوارەوە بکەین کە پێکەوە خزمن: *ئازار* "ڕەنج" و *ئاژر* "تووڕەیی"].

**گرتک gırtık** *[ gırtık ]* - "لەتەگوشت": خزمە دەگەڵ ↑کرتاندن kırtandın.

**گرتن gırtın** *[ gırtın ]* - "ستاندن، وەستاندن، بە دەست هێنان": گرفتن gereftan (P.)، greifen (G.)، gripe (E.)، greipan (Gt.)، gripa (Sw.)، griebti (Lit.)، "بەدەست) گرتن"، grbhnati (OIn.) "گرتی"، سەر بە ریشەی **< *(IE.) *grib-*** "گرتن". لەوانەیە ↑گیرفان gîrfan پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

**گرخ gırx** - "کپ بوونی دەنگ": دەچێتەوە سەر ↑کرِ kır [کرِ و کپ]. کرخت kerext (P.) واتا سڕ بوون.

**گرد gırd** - "شاخی بچووک، تەپۆڵکە": گر gır یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ گرد gerd (P.) "خرِ" و ژمارەیەک وشەی وەک ↑خرِ xır.

**گردا gırda** *[ gırdā ]* - "ناوی هۆزێکی کورد": هەروەها گەردی gerdî یش دەگوترێ. لە فەرهەنگدا روون نەکراوەتەوە کە ئایا ئەم دوو وشەیە ناوی دوو هۆزی جیاوازن یان دوو وشەی جیاوازن بۆ ناوی یەک هۆز. خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز".

**گردک gırdık** - "ماسوولە، زیپەڕ": هەروەها ↑خرتک xırtık هەیە بە مانای "جومگە" و گرتک gırtık "ئێسک، هەستی"(؟). [پیاوی گرتک ئەستوور]. ئەم وشەی دوایی دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "پیشەی لەش، ئێسک" مانا کراوەتەوە، بەڵام دەشێ ماناکەی هەر "ماسوولە" یان "جومگە" بێ. ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑کورد kurd دا باس کراون، بە مانای "پتەو، بەهێز". وشەیەکی دیکە کە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ بریتییە لە ↑گورچوو gurçu و گردە gorde (P.) "گورچیلە". لەوە دەچێ ئەم ئەندامە وەک ماسولکە لەبەر چاو گیرابێ و مانای "سفت و توند"ی بۆ دیاری کرابێ.

**گرژ gırıj** *[ gırıž ]* - "1- بادراو 2- وێکهاتوو، سفت": وشەکە خزمە دەگەڵ ↑قرژ qırıj "وێکهاتوو، گرژ، پێچەوانەی خاو و شلک" [چەنگی قرژ بووە، سەرقرژن واتا مووەکانی قرژ بووە]. خزمە دەگەڵ ↑گورج gurc "توند و تۆڵ".

**گرژاڵ gırjal** *[ gıržāl ]* - "ڕەنگێکە بۆ مەرەز لەتێوانی سوور و ڕەشدا، سووری ئاماڵ ڕەش": خزمە دەگەڵ greis (G.)، grīs (MG.)، grijs (Nl)، grisel (OFr.) "بۆر"، zarja (Rus.) "درەوش، سوورایی لە ئاسمان"، žeréti (Lit.) "درەوشانەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *gher-* *(IE.), *ghrē-*** "درەوشانەوە، تروسکانەوە". لەوانەیە ببێتە خزم دەگەڵ ↑گرِ gır "بڵێسە".

**گرژاندن gırjandın** *[ gıržāndın ]* - "کەوڵ کردن": خزمە دەگەڵ ↑کرێژ kırêj "توێخی کرێنراو" سەر بە ریشەیەک بە مانای "کرِاندن، رنین، دارنین". شیاوی باسە وشەی "کەوڵ"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "کرِاندن، رنین، تاشین، ساوین".

**گرژین(ەوە) gırjîn(ewe)** *[ gıržīn(awa )]* - "بزە هاتن": خزمە دەگەڵ grinsen (G.) "بە تەوسەوە بزە هاتن، ناحەزانە بزە هاتن". ئەم وشە ئەڵمانییە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە

(G.) grinnen "ددان دە چیڕەوە بردن" [کۆنتر هەروەها: بە گریانەوە دەم و چاو تێکنان]، (OG.) grīnan "بە پێکەنینەوە یان بە گریانەوە ددان دەرخستن، تووڕەبوون، مراندن، نەڕڕاندن"، هەروەها خزمە دەگەڵ (Nl.) grienen "بە تەوسەوە یان بە مەسخەرە بزە هاتن"، (E.) grin "بە تەوسەوە پێکەنین"، (Sw.) grina "گریان، هۆڕاندن، بە تەوسەوە پێکەنین". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی -grain* , -grin* (Grm.). ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑گریان gıryan .

**گرس¹ gırs** - "رسکاو، خولقاو": خزمە دەگەڵ↑قرش qırış "چڵەگیا".

**گرس² gırs** - "پایەبەرز": هەروەها ↑گرساندن gırsandıın هەیە بە مانای "بە گەورە زانین". پێوەندی هەیە بە ↑قورس qurs "سەنگین، گران، جێگیر".

**گرس3 gırs** - "کاریتە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کاریتە karîte.

**گرسک gırsık** - "1- کێڵکەی رەق 2- کرۆسک، هەرمێ کیویلە": ↑گەرووز geruz "زوور، رەق".

**گرسە gırse** [ *gırsa* ] - "1- توند و لێک چەسپاو، تۆڵ، قورسە 2- زەوی رەق": ↑قورسە qurse ش دەگوترێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -kar-, *ker* (IE.)** "خار، سەخت، بەهێز بوون". ئەم ریشەیە دواتر چەندین لک و پۆی لێ بۆتەوە و گەلێک مانای جۆر بەجۆری وەرگرتووە، وەک ↑خار xar "سەخت"، ↑کەرسین kersîn "هیشک بوون، مەیین، توند بوون"، ↑قەرسان qersan "تەزین لە سەرمان" [رەق و هیشک بوون لە سەرمان]، ↑سرِ sır "رەق بوون و بێجووڵە بوون"، ↑کەرِ ker "گوێ سرِ"، ↑گیرسان(ەوە) gîrsan(ewe) "بەند بوون، لە جووڵە وەستان، جێگیر بوون"، ↑قورس qurs "سەنگین" [دە بنەڕەتدا: سەخت، قایم ،جێگیر، نەجووڵ"، ↑کورسی kursî "چوارپایە، سەندەڵی" [دە بنەڕەتدا: قورس و قایم وەستاو]، ↑کورسین kursîn "قایم بوون، سەقامگیر بوون"، ↑گرێژنە gırejne "رەسمەی دەرگا"، ↑قورسە qurse "تۆڵ، وردەی پێک چەسپاو" [وردەیەک کە لە ئەنجامی پێکەوەنووساندا سفت بووە]، ↑کەرسەگ kerseg "کلۆی گەورە" و هتد.

**گرش gırış** [ *gırıš* ] - "داری دارەڕا": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گرس3 gırs "کاریتە".

**گرشە gırşe** [ *gırša* ] - "جریوە، بریقە": خزمە دەگەڵ ↑گیرسان dagîrsan [داگیرسان].

**گرفنج gırfınc** [ *gırfınj* ] - "گرێی بچووک": گرفنچ gırfınç و گرفنچک gırfınçk یش دەگوترێن. خزمە ↑کەڵاف kelaf "دەزووی پێچراوە و تۆپەڵە کراو"، ↑گلۆپ glop، گلۆڵە glole و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "کلۆ بوون، پێکەوەنووسان، رێکگوشران، تۆپەڵە بوون" دەکەن. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا (G.) Klump(en) "گلوو، گرفنج" و هەر وەها (E.) club "کلوب، یانە" و (OIs.) klubba "گۆپاڵ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و هەموو دواجار دەگەڵ ↑گلوو *gılû* خزمن.

**گرفە gırfe** [ *gırfa* ] - "دەنگی گڕی ئاگر": [هەروەها: خۆ پێکدادانی گڕەکانی ئاگر]. گرپە gırpe ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑کلپە kılpe. ئەم وشانە دە پلەیەکی دیکەدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑غەڵبەغەڵب ġelbe [غەڵبەغەڵب]. ئەم وشانەی لەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرن، بەگشتی مانای "دەنگی وێککەوتن" و هەروەها مانای "وێککەوتن" و "وەرگەڕان" دەگەیەنن. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە مانای راست و دروستی کلپە خودی "بڵێسە، گڕ" نییە، بەڵکوو خۆ بەم لا و ئەولا دادانی گڕی ئاگرەکە و ئەو دەنگەشە کە بەم هۆیەوە پەیدا دەبێ.

گرک **gırk** [ *gırk* ] - "دەستار، هاونگ": بنەوشەی گر -gır پێوەندی هەیە بە ↑گران2 gıran "1- دەستار 2- کوتکی زل بۆ بەرد شکاندن"، ↑گراندن gırandın "ورد کردن بە دەستار" و ↑گێرە *gere* و هەروەها ↑*هارین harîn* و ↑گەرد gerd.

گرکان **gırkan** [ *gırkān* ] - "کێوی ئاگرپژێن": ↑گر gır + ↑کان kan [کانی گر].

گرکە **gırke** [ *gırka* ] - "کاڵەکی چکۆلە": پێوەندی هەیە بە ↑خر xır [خرچە xırçe ناوێکی دیکەیە بۆ گرکە].

گرگر **gırgır** - "پیاوی گەورە و بەرێز، پیاوی خاوەن پایە": گرە gıre ش دەگوترێ. هەروەها بابەگورگور babegurgur هەیە کە دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و ماناکەی "بابی بەرێز" بێ. ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ریشەی ***(IE.) *gher-,*ghrē- >*** "درەوشانەوە، تروسکانەوە". لەم ریشەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشە بەمانای "بۆر" و هەروەها "پیر" پەیدا بوون، بۆ وێنە grijs (Nl) "بۆر، پیر". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ grau (G.)، gray (E.)، grauw (Nl.)، gra (Sw.) "بۆر". مانای "پیر" لەمەوە پەیدا بووە کە مرۆڤی پیر مووەکانی "بۆر"ە یان بۆر بوون مووەکان وەک نیشانەی پیری هاتووەتە ئەژمادن.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑قەیرە qeyre "بەساڵداچوو". ئەم وشە کوردمادییەش خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا کە مانای "بۆر، پیر" دەبەخشن. لێرەشدا بۆر بوونی مووەکان وەک نیشانەی پیری و بە ساڵداچوون هاتووەتە ئەژماردن.

گرگر **gırgır** - "بەپەلەپەل": خزمە دەگەڵ ↑خێرا xera.

گرگرۆک **gırgırok** - "عارەبانەی زارۆکان": خزمە دەگەڵ ↑غەرغەرە ġerġere [قەرقەرە qerqere].

گرمۆتە **gırmote** - "چکۆڵەی خرەکە": ئەم وشەیەش وەک "گرمۆڵە" لە دوو کەرتی گر -gır و مۆتە -mote پێک هاتووە. کەرتی "گر" پێوەندی بە ↑گرێ gıre یان بە ↑خرxır ەوە هەیە. کەرتی "مۆتە" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑*مچاندن mıçandın* "گوشین، گلۆفین". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ مچالە mačāle (P.) "رێککۆشراو، تۆپەڵە". لەوانەیە وشەی ↑مۆتەکە moteke ش پێوەندی بەم وشانەوەو هەبێ و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "رێکگوشران" دە خەودا بکا.

گرمۆڵە **gırmole** [ *gırmola* ] - "لێکهاڵاوی خرەوەبووک": گرمووڵە gırmûle ش دەگوترێ. هەروەها دە فەرهەنگدا گەرمۆل germol هاتووە بە مانای "تێکەوەهاوێشی حەشامەت".

1- گرمۆڵە دەتوانێ لە دوو کەرتی گرم gırım + ئۆڵە ole پێک هاتبێ. لەم تێروانینەوە کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ger(e)- m >*** "کۆ کردنەوە، خستنە سەریەک" و دەبێتە خزم دەگەڵ gremium (L.) "کۆش، باقە"، grex (L.) "مێگەل، کۆما"، ageírein (Gr.) "کۆم بوونەوە"، agorá (Gr.) "مەیدانی کۆ بوونەوە" و هتد.

2- لەوانەیە لە دوو بەشی گر -gır و مۆڵە mole پێک هاتبێ. کەرتی "گر" دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑گرد gırd یان ↑گرێ gırê وە. کەرتی مۆڵە -mole جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مەڵۆ melo "باوەشێک گیای دروێنەکراو" و ↑مۆڵ mol "لێک خڕ بوونەوە" [مۆڵ دان].

[تێبینی: کەرتی مۆڵە -mole یان مووڵە -mule هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەیەک دە زمانە ئەورووپییەکاندا بە مانای "چکۆڵە"، وەک schmal (G.) "باریک"، small (E.)، smals (Gt.)، smal (Sw.)، smali (ON.) [دە ئەسڵدا: کەم، چکۆڵە] و mīl (OIr.) "(ئاژەڵی) چکۆڵە" و هەروەها malyj (Rus.) "چکۆڵە"].

**گرمه gırme** *[ gırma ]* - "دەنگی توند و بەهێز": کردارەکەی دەبێتە گرماندن gırmandın. خزمە دەگەڵ grimm (G.)، grim(mi) (OE.)، grim (E.)، Grym (Sw.) "بەگرمە، قەڵس و توورە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی **< *ghrem- (IE.)*** "گرماندن، گوڕڕاندن". ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: chremizein (Gr.) "حیلاندن، حیلکاندن، خرمژن"، gremet (Rus.) "گرماندن"، grom (Rus.) "هەورەگرمە"، اسمان گرمبە -āsmān gorombe (P.) "هەورەتریشقە، هەورەگرمە، گرمەی ئاسمان".

**گرنج gırınc** *[ gırınj ]* - "زبری، زووری": ↑گرنی gırnî.

**گرنژین1 gırınjîn** *[ gırınžīn ]* - "بزە کردن": خزمە دەگەڵ grinsen (G.)، grin (E.) "بزە کردن بە تەوسەوە یان لە رووی ئازارەوە"، grina (Sw.) "بەتەوسەوە بزە کردن، گریان". وشەکە دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گریان gıryan.

**گرنژین2 gırınjîn** *[ gırınžīn ]* - "1- چرچ و لۆچ بوون 2- هەڵقرچان": هەر وەک وشەکانی ↑قرچان qırçan [هەڵقرچان]، ↑قورنجاندن qurıncandın [قورجاندن qurcandın] "با دانی پێستی لەش و ئێش پێگەیاندن، رەبا دان" و چەندانی دیکە دەچێتەوە سەر ریشەی سەر ریشەی **< *ger- (IE.)*** "سووڕان، با دران".

**گرنووز gırnuz** *[ gırnūz ]* - "شتی جوان و بەرچاو":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەراخ qerax کە دە ریشەدا ئاماژە بە "زەق و دەرپەڕیو" بوون دەکەن. لەم تێڕوانینەوە "گرنووز" دە بنەڕەتدا واتا شتێک کە لەچاو ئەوانی دیکە زەق و دەرپەڕیوە، بە وتەیەکی دیکە چاوگرە. لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ "برجستە" دە فارسیدا و "بارز" دە عەرەبیدا. "برجستە" بە مانای "زۆرچاک، گرینگ، هەڵکەوتوو"یە و دەچێتەوە سەر کردارێک بە مانای "دەرپەڕین". هەروەها "بارز"ی عەرەبی لە "بەرز"ی کوردمادی وەرگیراوە.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گەڕناس gernas [گەڕنووس gernus] "ئازا، بوێر، مێرخاس"، سەر بە ریشەی **< -*ĝher (IE.)*** "تاسەکردن، مەیل و خواستی بەتین کردن". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "لەبەر دڵان، ئەو شتەی حەزی لێ دەکرێ".

**گرنۆر gırnor** - "زبر": ↑گرنی gırnî.

**گرنە gırne** *[ gırna ]* - "گروو": خزمە دەگەڵ↑گریان gıryan "قیژە و هەرا کردن".

**گرنەوت gırnewıt** *[ girnawıt ]* - "جەنگەی جووت بونی پشیلە":

1- لەوانەیە بنەوشەی گرنە -gırne پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*ĝher (IE.)*** "تاسەکردن، مەیل و خواستی بەتین کردن". لەباری ماناوە وشەکە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ *کەڵەز* "جەنگەی تێبەر بوونی بەران". سەبارەت بە ریشەکە بڕوانە وشەی ↑گەڕناس gerna.

2- یان لەوانەیە گرنە -gırne ئاماژە بێ بە قیژە و هەرای پشیلەکان لەم وەرزەدا. لەم تێڕوانینەوە کەرتی -wıt دەتوانێ کورتکراوی وەخت wext بێ.

**گرنی gırnî** *[ gırnī ]* - گرنی گرنی واتا زوور [زبر]، بە وتەیەکی وردتر رووبەرێک کە "دەنک دەنک"ی بەسەرەوە بێ، وەک رووبەری سەرداری (بەلال) یان هەنار کە تۆکڵەکەی لێ کرابێتەوە. گرناڵ gırnal و گرنۆر gırnor یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Kern و Korn (G.)، corn (E.)، granum (L.)، zerno (Rus.) "دەنک، دان". دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی körnig بەو شتانە دەگوترێ کە لە پێوەنووسانی کۆمەڵێک "دان" دروست دەبن، وەک سەرداری (گەنمەشامی)، هەنار و هیتر. ئەم وشە ئەڵمانییە کە دە بنەڕەتدا بە مانای "دانەدار"ە، مانای

"زوور، زبر" یش دەگەیەنێ. پێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا وشەی گرن gırın سەرەتا هەر بەو مانایانە بووبێ و لەوێوە وشەی گرنی gırnî [کۆنتر: گرنیك gırnîk ؟] سەری هەڵدابێ. وشەکانی granit (L.) "بەردی گرانیت" و granatus (L.) "هەنار" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ĝer- >** "( پێ)گەییو، پیر، بڵ". دە زمانی کوریدا ↑گلە gıle "دەنك، دانە" و چەند وشەیەکی دیکە دەشێ پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ. ئەم ریشەیە خۆی مانایەکی کۆنتری هەبووە کە بریتییە لە "رێخشاندن، ساوین". لەم ریشەوە دواتر مانای "پیر بوون، پێگەیشتن" [دەبنەرەتدا: ئامادە بوون و پێگەیشتنی دەخڵ و دان بۆ ساوین و هاڕین" سەری هەڵ داوە و لەوێشەوە مانای "دەنك، دان" پەیدا بووە.

گرواندن **gırwandın** *[ gırwāndın ]* - "کەوڵ کردن، لە پێست دەرهێنان": ↑گروون gırun یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- gerben (G.)، garawen (OG.)، gearwian (OE.)، garva (Sw.) "دەبباغی کردن". مانای ئەسڵی وشە ژێرمەنییەکان "ئامادە کردن، ساز کردن" بووە و پاشان بووەتە "سازکردنی چەرم". وشەکە دەچێتەوە سەر وشەیەکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "ئامادە، ساز، تەواو"، خزمە دەگەڵ ↑گورروە gurwe [گورە gure] "کار، خەبات" و لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑*کار kar*.

2- ↑گوراندن gurandın "سەر بڕین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)ker- >** "بڕین، لێکردنەوە، ژێ کردن، داپچڕین".

گرووف **gıruf** - "قانگڵە، کۆمەڵەبەتێك کە کە لەتیوان دوو قامکی گەورە و تووتەدا هەڵ دەکرێ". گرووڤ gruv یش دگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەڵاف kelaf [کەڵافەبەن].

گڕوو **gıru** *[ gırū ]* - "پەڵپ و گریان": خزمە دەگەڵ ↑گریان gıryan. هەروەها ↑گرۆز gıroz هەیە بە مانای "گڕووگر".

گرووپ **gırûp** *[ gırūp ]* - "دەستە، تاقم": ئەم وشەیە لە زمانی ئیتالیاییەوە و لەرێگەی زمانی فەرانسەییەوە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانی دیکە و دەچێتەوە سەر gruppo (It.) و ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە.

گرووز **gıruz** *[ gırūz ]* - "هەڵمسانی لەش بە هۆی لێدان": گرووزین gıruzîn یش وەك کردار بەکار دێ، بە مانای "هەڵتۆقین لە لەش یان لە زەویدا". هەروەها ↑گرێژ gırej "مەمکی ئاژەڵ، گوان" وێ دەچێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ریشەی **(IE.) *gher-, *ghre-** "زەق و دەرپەڕیو بوون". وشەی ↑قەراخ qerax لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە بەرهەڤیان بکەین: *کلك* "1- دوو، دووڤ 2- قامك"، *گلك* "1- میتکە 2- لاسکەگەنمی بێ دەنك". ئەم وشانەش لەریشەیەکەوە هاتوون بە مانای "زەق و دەرپەڕیو بوون"].

گروون **gırun** *[ gırūn ]* - "کەوڵ کردن، لە پێست دەرهێنان": شێوەیەکی دیکە لە ↑گرواندن gırwandın.

گرۆ**1** **gıro 1** - "کۆمەڵ، دەستە": گروە gorūh (P.)، خزمە دەگەڵ Gremium (G.) "ئەنجومەنی راوێژکار یان بڕیاردەر". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر gremium (L.) "کۆش". وشە لاتینییەکە دواتر مانای "کۆشێك، باوەشێك، باقە"ی وەرگرتووە، واتا ئەوەندەی لە "کۆش"دا کۆ دەکرێتەوە. وشە لاتینییەکە خزمە دەگەڵ grex (L.) "گەلە، ران، کۆما"، aggregare (L.) "کۆم بوون، کەڵەکە بوون"، ageírein (Gr.) "کۆم بوون(ەوە)"، agorá (Gr.) مەیدانی کۆ بوونەوە". ئەم

وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *ger-, *gere-* < "کۆم کردن(ەوە)". ↑گەرد gerd دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ ["وە گەردی یەك" واتا دەگەڵ یەکتر، پێکەوە].

[تێبینی1: پێوەندی چەمکی "کۆش" بە "کۆما، کەڵەکە، گرۆ، پرانی" دە زمانی لاتینیدا ئەم شیمانەیە بەهێز دەکا کە دە زمانی کوردمادیشدا وشەکانی "گشت، گیشە، گاشە، هێشوو، قۆشەن، قشڵە" پێوەندییان بە "کۆش" و "باوەش" [با-وەش]ەوە هەبێ. ئەم پێوەندییەی سەرەوە لەمەوە هاتووە کە کۆش جێگەی کۆم کردنەوەی شت بووە. تێبینی 2: لەوانەیە وشەکانی *گەڵ* "کۆمەڵ، پرانی"، هەروەها *دەگەڵ* "وێرا، پێکەوە" پێوەندییان بە "گەرد" [وەگەرد یەکتر] ەوە هەبێ و هەموو ئەم وشانەش لەلایەکی دیکەوە پێوەندییان هەبێ بە *گەڵ* "کۆش" [تیوگەڵ] و *گرۆڵ* "پارچەی سێ سووچ بۆ بن *باغەڵ* لە کراس و چۆخەدا"].

**گرۆ2 gıro** - گرۆ بوون مانای "رام بوون، خوو گرتن، ئۆگر بوون" دەبەخشێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ گیرۆدە gîrode و ↑گرتن gırtın .

**گرۆ3 gıro** - "دانار بوونی رۆن و سەمەنی و ...": خزمە دەگەڵ ↑گرنی gırnî.

**گرۆ gıro** [ *gıro* ] - "پێستی ئاوڵەدار، پێستی زبر و گرنی گرنی": گرۆێ gırwe یش دەگوترێ. گر gar (.P) "گرۆیی، کرێژدار، خوروو". ↑گول gul "جوزامی" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گرۆ3 gıro.

**گرۆر gıror** - "دەنکی تاڵ": خزمە دەگەڵ ↑گرنی gırnî "زوور".

**گرۆز gıroz** - "گرووگر، بیانووگر": گرۆك grok یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑گروو gıru. کەرتی ↑ئۆز oz- پاشگرێکە کە چەند شێوەی لێ دەبێتەوە و دە هێندێك وشەدا دەبیندرێ و دەوری جەخت کردن دەگێرێ، وەك کلۆز، قەلووز، ئالۆز، کنۆس، چکۆس، چڵێس، قرنیس و هتد.

**گرۆفیك gırofik** [ *gırofīk* ] - "چەرخ و گاری بچووك": خزمە دەگەڵ ↑گرۆڤەڕ gırover.

**گرۆڤەڕ gırover** [ *gırovar* ] - "1- خڕ 2- جەغزی": ↑گلۆڤەر gılover یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گلۆپ gılop و ↑*گلوو gılû*.

**گرۆڵ gırol** - "پارچەی سێ سووچ بۆ بن *باغەڵ* لە کراس و چۆخەدا": شێوەیەکی دیکە لە ↑گەڵ gel [تیوگەڵ، تیفەك]. بڕوانە ↑*گرۆ gıro* "کۆمەڵ، دەستە".

**گریان gıryan** [ *gıryān* ] - "فرمێسك رژاندن، دەنگ هەڵبڕین لەبەر ئێش وئازار": گریە gerye (.P). ئەم وشەیە و هەروەها ↑گروو gıru و ↑گرنە gırne دەشێ دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە خزم بن: (.G) grinnen "ددان دە چیرەوە بردن" [کۆنتر: دەم و چاو تیکنان]، (.G) greinen "گریان، زاری کردن"، (.OG) grīnan "بە پێکەنینەوە یان بە گریانەوە دەم کردنەوە، تووڕەبوون، مڕڕاندن، نەڕڕاندن"، (.E) grin "بە تەوسەوە پێکەنین"، (.E) groan "ناڵین، زاری کردن"، grina (.Sw) "گریان، هۆڕاندن، بە تەوسەوە پێکەنین". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Grm.) *grain- ,*grin-*. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشانە باس نەکراوە. لەوانەیە ↑گوڕڕاندن gurrandın یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**گریز gırīz** [ *gırîz* ] - "ئاوێك كە لە رەخی دەمەوە دێ، لیکاو": گرێزە gırêze ش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ریشەی *(IE.) *glei-* < "پێوەنووسان، چەسپ، چەسپ بوون". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑چرێش çırêş و ↑کراس kıras [کراز kıraz]دا باس کراون.

**گریزە gırîze** [ *gırīze* ] - "مچوڕك، موچڕك، لەرزین، داچڵەکین": خزمە دەگەڵ (.G) grausen "هەست بە سامناکی یان ڤێزەونی کردن"، (.G) Graus (.MG) grūs(e) "ترس، داچڵەکین"، graus (.G)، (.G) grausig "سامناك، ڤێزەون، داچڵەکێنەر"، (.G) Gräuel کار و کردەیەکی سامناك".

ئەم وشە ئەڵمانییانە شێوەیەکی پەرەگرتوو و جەخت کردوون لە کرداری grauen (G.)، (in)grūēn (OG.) "هەست بە ترس و نارەحەتی زۆر کردن لە بەرانبەر شتێکی سامناک یان قێزەوندا". وشە ئەڵمانییەکان دەچنەوە سەر ریشەی < *ghreu- (IE.) "رێخشاندن، هاڕین، ورد کردن". بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گێرە gere، ↑گەرد gerd، ↑ئارد ard و ↑*هاڕین* *harîn* و هتد. مانای بنەڕەتی وشەکانی سەرەوە ئەوەیە کە شتێک یان کارێک بە رادەیەک سامناک یان قێزەونە، بە رادەیەک سەخت و سەنگینە کە مرۆڤ دەهاڕێ. دە زمانی ئەڵمانیدا ئەم وشانە بۆ نیشان دانی ترس و نارەحەتی هەرە مەزن بەتایبەتی لە پێوەندی دەگەڵ تاوانی گەورە و گراندا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ.

[تێبینی: وەک باس کرا، کرداری grausen دە زمانی ئەڵمانیدا لە کرداری grauen وەرگیراوە و دۆخێکی جەخت کردن بە کردارەکە دەدا کە بە ئەڵمانی پێی دەگوترێ (Intensivbildung). ئەم شێوەیە لە ساز کردنی کردار یان پەرە پێدانی کردار دە ژمارەیەک وشەی ئەڵمانی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ. هەر ئەم شێوەیە دە زمانی کوردمادیشدا باوە، واتا کاتێک فۆتیمی k [یان q، j، z، s] وەک ناوگر دەخزێتە ناو کردارێکەوە و شێوەیەکی جەختکراوی پێ دەبەخشێ. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە یەکەم شی کردنەوە لەژێر پیتی ↑ک k دا].

**گریڤان gırîvan** [ *gırīvān* ] - "ژێرکراس": گریوان gırîwan یش دەگوترێ. وەک لەژێر وشەی ↑کراس kıras دا باس کرا، ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی < *glei- (IE.) "پێوەنووسان، چەسپ، چەسپ بوون" و خزمە دەگەڵ kleben (G.)، clīfan (OE.) "چەسپان، پێوەنووسان". بەم شێوەیە وشەی "گریڤان" دەبێتە خزم دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە. مەبەست لە وشەکانی کراس یان گریڤان دەبنەڕەتدا ئاماژە بەو جلانە بووە کە بە لەشەوە نووساون.

**گریک gırîk** [ *gırīk* ] - "تابشت، توان": خزمە دەگەڵ ↑کارین karîn "توانین".

[تێبینی: لەوانەیەوشەی "گریک" بە مانای "یۆنانی" پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و لەباری ئێتیمۆلۆژییەوە دەگەڵ وشەی "کورد" خزم بێ].

**گرینای gırînay** [ *gırīny* ] - "کوڵین، پێگەیشتن": پێوەندی هەیە بە ریشەی < *ĝer- (IE.) "(پێ)گەییو، پیر، بڵ" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گڕنی gırnî [گڕنی گڕنی].

**گرینگ gırîng** - "موهیم": دەچێتەوە سەر ↑گران gıran، واتا شتێک کە قورسایی و گرانایی هەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا wichtig "گرینگ" و Gewicht "وەزن، قورسایی" پێکەوە خزمن].

**گرێ gıre** [ *gıre* ] - "1- گرێ دان واتا بەستن، هۆنینەوە 2- هەڵتۆقاوی، زۆپایی": گرە gıre ش دەگوترێ. گرە gereh (P.). "گرێ" ئەم مانایانەشی بۆ کراوە: بەند، بەندی قامک، بەندی قامیش و دار و گیا، پاژێک لە شازدە پاژی گەزی پێوان". ئەم مانایانە مانای بنەڕەتی وشەکە نین، بەڵکوو لە پێوەندی دەگەڵ مانا بنەڕەتییەکەدا، واتا "هەڵتۆقاوی، زەقایی"دا هاتوونە ئاراوە. وەک دەزانرێ ئەو شوێنانەی وەک بەندی قامک، قامیش، دار و گیا، زەقاییەکی بچووک بە خۆوە دەبینن. هەروەها دەشێ لە مانای "بەند و گرێ"وە [گرێ گرێ] دواتر مانای "بەش، پاژ" [بەش بەش] پەیدا بووبێ و بۆ "پاژێک لە شازدە پاژی گەزی پێواندا" بەکار هێنرابێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم ریشانەوە هەبێ:

1- ریشەی < *ger- (IE.) "سووران، با دان، هونینەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قەرتاڵە qertale، kratto (OG.)، kretto (OE.) "قەرتالە"، cradel (OG.)، cradle (E.) "لانکە"

[وەک قەرتاڵە لە شوول چندراوە]، cratis (Lat.) "شتی چنراو" [وەک قەرتاڵە، سەوەتە، پەرژین و هتد]، grathnati (Gr.) "با دان، گرێ دان، تێکخستنەوە".

2- ریشەی **< (IE.) * ker(t)-** "بادان، هۆنینەوە، چنین". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کڕ kır. لەوانەیە هەردووک ریشەی سەرەوە دواجار خزم بن.

**گرێچ gırêç** [ *gıreč* ] - "هەراهەرا، زەنازەنا": خزمە دەگەڵ klatschen (G.)، kletsen (Nl.) "دەنگی وێککەوتن، چەپڵە لێدان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑غەڵبە ġelbe و بە گشتی ئاماژە بە دەنگێ و هەرایەک دەکەن کە لە کاتی وێککەوتن و پێکدادانادا پەیدا دەبێ.

**گرێژ gırej** [ *gırej* ] - "مەمکی ئاژەڵ، گوان": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گرووز gıruz "هەڵمسانی لەش بە هۆی لێدانەوە".

**گرێژنە gırejne** [ *gırežna* ] - "رەسمەی دەرگا": خزمە دەگەڵ ↑گیرسان(ەوە) gîrsan(ewe) "بەند بوون، قایم بوون، جێگیر بوون". مەبەست لە وشەکە ئەو شتەیە کە دەبێتە مایەی جێگیر و قایم بوونی دەرگا، کە ئەمەش رەسمە یاخود چوارچێوەکەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Rahmen هەیە کە بە مانای "چوارچیوە" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ ئارام aram ی کوردمادی [ئا-رام a-ram]. چوارچێوە دە زمانی ئەڵمانیدا بۆیە وەسا ناو نراوە، چونکوو دەبێتە مایەی ئارام بوون (راوستاو و جێگیر بوون)ی ئەو شتەی کە دەوری گیراوە].

**گرێل gırel** [ *gırel* ] - "بانگردان": هەروەها گرۆلە gırole هەیە بە مانای "گاری و عەرابەی بار کێشان". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑گەران geran "سووڕان، خولانەوە".

2- ↑قەرقەرە qerqer [قرقڕە qırqıre].

**گرێو gırew** [ *gırew* ] - "1- رەهن 2- مەرج": گرێڤ gırev ش دەگوترێ. گرو gerov (P.) "رەهن" و گروگان gerovgān (P.) "بارمتە". گرێو دەبنەڕەتدا ئەو شتەیە کە لە جیاتی شتێکی دیکە بۆ ماوەیەکی کاتی لە لای یەکێک دادەنرێ، بە وتەیەکی دیکە لایەنی بەرانبەر وەری *دەگرێ* و لای خۆی رایدەگرێ. دەچێتەوە سەر کرداری ↑گرتن gırtın [گرفتن gereftan (P.)]. مانای دووەم، واتا "مەرج کردن" دواتر پەیدا بووە.

**گز1 gız** - "1- ئاڵوودە، خووگرتوو [ئەم کابرایە گز ئارەق و قومارە] 2- بە عەزرەت و ئاوات [گز ئەو رۆژەم تۆ ببینم]": بە هەردوو ماناکەیەوە پێوەندی هەیە بە ↑حەز ħez "مەیل، ئارەزوو". لە مانای یەکەمدا حەز لە ئارەق و قومار و لە مانای دووەمیشدا حەزی دیتنی کەسێک لە ئارادایە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ئاڵوودە" کە ئەویش مانای "حەز و خۆش ویستن" [پێ خۆش بوون] دەردەبڕێ.

**گز2 gız** - "1- بز، چاوزەقی [گزگز تەماشای کردم، ترسام] 2- لەپڕ [گز و گومبەت]": شێوەیەکی دیکە لە ↑گوز guz [گوز و گومبەت]" و خزمیشە دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قوت qut، ↑قۆچ qoç. هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە "زەق بوون و دەرپەڕیو بوون" دەکەن.

**گز3 gız** - "دەنگی کیسەڵی تیر لەکاتی جووت بووندا": خزمە دەگەڵ ↑قیژە qîje.

**گزرە gızre** [ *gızra* ] - "1- گیای وردکراو 2- داری پارچەپارچەکراو 3- پووش و پەڵاش": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑گەز gez "پێوانەی درێژایی".

2- ↑گەسک gesık [گزک] .

گزرزین **gızzîn** [ *gızzīn* ] - "بە گژدا چوون": [لەهەڤ گزرزین lı hev gızzîn].

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەك وەك ↑گوژین gujîn "لوور بوون، بە تەوژم لەسەرڕا هاتنەخوار، شیرجە لێدان"، ↑غیژ ğîj "لوور" [غیژ کرن واتا لوور بوونەوە، بە نهێم بەرەو خوار هاتن] و ↑گژ[5] gıj.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑گژ3 gıj.

گزگزین **gızgızîn** [ *gızgızīn* ] - "سووك لەرزین": هەروەها گزگز gızgız یش وەك ناوی مانا بەکار دێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گۆزان gozan "سەر راوەشاندنی منداڵ".

گزگل**1** **gızgıl** - "1- فسقل، بەرێکی دارمازوو 2- باوەعەمرە، چڵەنۆك": خزمە دەگەڵ ↑خسکە xıske "پیوازی وردیلە بۆ چاندن". ئەم وشانە مانای "وردیلە و چکۆڵە" دەبەخشن و خزمن دەگەڵ ↑گچکە gıçke، ↑کچ *kıç* [کیژ kîj] و کوچک kūčak (P.) "چکۆڵە". "گزگل" و "خسکە" ئەم ناوایانەیان لەبەر وردیلە بوونیان وەرگرتووە.

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی "فسقل"یش کە ناوێکی دیکەیە بۆ "گزگل" هەر بە مانای "وردیلە و چکۆڵە"یە و خزمە دەگەڵ "بەچکە" و "بچکۆڵە"].

گزگل**2** **gızgıl** - "قەلەموون، عەلەشیش": "گزگل" و عەلەشیش eleşîş دەشێ دوو شێوەی یەك وشە بن. کەرتی گل gıl- یان عەل el- دوو شێوەی دیکەن لە ↑قەل qel. هەرچی کەرتی گز gız- یان شیش şîş- ە، پێوەندییان هەیە بەو دەستەوشەیە کە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون. ئەم وشانە ئاماژە بە "سەخت، پتەو و بەهێز بوون" دەکەن. لەم مانایەوە هەروەها مانای "زل و زەبەلاح" سەری هەڵداوە.

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "پتەو" و "زەلام، زەبەلاح" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *تەژی* "پڕ، چڕ" و *تەژە* "زەلام"، یان *تابشت* "هێز" و *تاپاز* "زەلام" ].

گزگلاگە **gızgılage** [ *gızgılga* ] - "ئێسکی پشت گوێ": گز + گلاگە gız + gılage. "گز" خزمە دەگەڵ ↑گژ[4] gıj "رەق، سەخت" و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون. کەرتی دووەمی وشەکە دەچێتەوە سەر گولاغ gulaġ (Tur.) "گوێ".

گزی **gızî** [ *gızī* ] - "فێڵ": هەروەها گزن gızın هەیە بە مانای "فێڵباز". سەر بەو خێزانە وشەیە کە لە ژێر ↑گێزان gezan دا باس کراوە و پێوەیدییان بە ↑گێژ gej ەوە هەیە. ئەم وشانە مانای "خوار بوون، با دران" دەگەیەنن. لەم تێڕوانینەوە گزی کردن واتا "خواری" کردن یان "کەچ" بوون بەرانبەر بە کەسێك، بە وتەیەکی دیکە "ناراستی" کردن بەرانبەر کەسێك.

گزینگ**1** **gıznîg** [ *gızīng* ] - "تیشکی بەرەبەیان": خزمە دەگەڵ ↑کاز kaz [کاز و کووزی بەیانی].

گزینگ**2** **gıznîg** [ *gızīng* ] - "بیبیلە": شێوەیەکی دیکە لە ↑کچێنە kıçêne [کچ، گز، کیژ].

گژ**1** **gıj** [ *gıž* ] - "گژ و گیا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Hag (G.)، haw (E.)، hage (Sw.) "پنچکەگیا، دڕك و داڵ، بێشە، پەرژین، لەوەڕگە". ئەم وشانە دەبردرێنەوە سەر ریشەی < **kagh-* *(IE.)* "پەرژین (کردن)". بڕوانە ↑گەسك gesık یان گزك gezık "ئامرازی ماڵین".

گژ**2** **gıj** [ *gıž* ] - "قەدی دار" (دارمێو لە گژ داربەڕوو ئاڵاوە): شێوەیەکی دیکە لە ↑قەد qed [گەت get].

گژ**3** **gıj** [ *gıž* ] - "بەرەورووبوونەوە، هێرش کردنە سەر": [بە گژ یەکدا چوون].

1- لە لایەکەوە وشەیەك دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرنج رادەکێشێ کە مانای "بەرەوروو، هەمبەر" دەدا کە بریتییە لە gegen (G.)، gagan (OG.)، jeghen (MNl.)، gegn (OE.)

"ڕووبەڕوو" و again (.E) "دووبارە"، Gegner (.G) "خەنیم، ڕەقیب". ریشەی ئەم وشەیە ژێرمەنییە دیار نییە.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە دەبنەڕەتدا هەر بە مانای "قەد، بەژن" بووبێ. لەم تێڕوانینەوە سەرەتا مەبەست لە بەگژ داچوون یان بە گژدا کردن دەبێ ئەوە بووبێ کە لەکاتی شەڕ و هێرش بردندا "قەد" واتا بەژنی لایەنی بەرانبەر کراوەتە ئامانج. بە وتەیەکی دیکە مەبەست لە بە"گژدا چوون یان خۆ بە گژ دادان"، دەبێ "بە قەددا چوون و خۆ بە قەددا دان" بووبێ [چوون بەرەوە قەد و بەژنی کەسێک، خۆ بە قەد و بەژنی کەسێکدا دان]. بەم جۆرە گژ gıj دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قەد qed [گەت get، گەت و گیپاڵ].

3- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑گوژین gujîn "لوور بوون، بە تەوژم لەسەرڕا هاتنەخوار" و ↑گژ[5] gıj.

**گژ[4] gıj** [ *gıž* ] - "ڕەق، سەخت": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون بە مانای "پتەو، سەخت".

[تێبینی: دە وشە "مچوڕک" [دروستتر: مووچڕک]یشدا کەرتی "چڕک" ئاماژە بە "سەخت و پتەو بوون"دەکا].

**گژ[5] gıj** [ *gıž* ] - "لوور بوون، لە سەرەوە بە نهێم بەرەو خوار هاتن": ↑غیژ ĝîj یش گوترێ. کردارەکەی دەبێتە ↑گوژین gujîn و دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*هەستان hestan* [بە فارسی (بر)خاستن bar-xāstan (.P)، خیز xīz (.P) برداشتن].

**گژ[6] gıj** - "مووی تێک هاڵاو و شانە نەکراو": بڕوانە ↑گژاندن gıjandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن" و دواتر ↑گێژ *gej*.

**گژ[7] gıj** - "هەموو، تێکڕا": شێوەیەکی دیکە لە گش gış یان ↑گشت gışt.

**گژ[8] gıj** - "وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چێل": خزمە دەگەڵ ↑گژگژاندن gıjgıjandın "هان دان بۆ شەڕ" [دە بنەڕەتدا: وە جووڵە خستن] و دواتر ↑هەژان hejan.

**گژ[9] gıj** [ *gıž* ] - "ڕاست بوونەوەی مووی لەش": خزمە دەگەڵ ↑قۆچ qoç "شاخ"، ↑قۆز qoz [قیت و قۆز] و ↑*گۆشە goşe* "دەرپەڕیو".

**گژار gıjar** [ *gıžār* ] - "چیکڵدانە": ژاغر žāġar (.P). هەرسێک کەرتەوشەی گژ -gıj، چیک -çîk، و ژاغ -žāġ (.P) شێوەی جۆربەجۆری یەک وشەن. ئەم بنجەوشەیە مانای "سەخت، پتەو" و هەروەها "بەرد"یش دەبەخشێ و لە گەڵێک وشە و بە چەندین شێوە دەردەکەوێ. ژمارەیەک لەم وشانە لە ژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە. وشەکە هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑گژ[4] gıj "ڕەق، سەخت". "گژار" یان "چیکڵدانە" [جیکڵدانە] ئەو شوێنە کە "زیخ و چەوی" تێیدا کۆ دەبێتەوە.

**گژاندن gıjandın** [ *gıžāndın* ] - "تێکەڵ پێکەڵ کردن": خزمە دەگەڵ ↑گیزان gîzan "لێکدرانی تراو، شڵەقان" و دواتر ↑گێژ *gej*.

**گژک gıjk** [ *gıžk* ] - "پرچی پەرێشان": خزمە دەگەڵ ↑گیزان gîzan "لێکدرانی تراو، ژان" و دواتر ↑گێژ *gej*.

**گژگژاندن gıjgıjandın** [ *gıžgıžāndın* ] - "هان دان بۆ شەڕ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەژان hejan و هەژاندن hejandın.

**گژگژەک gıjgıjık** [ *gıžgıžık* ] - "تەرزەی زۆر ورد": گژک gıjık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گچکە gıçke.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ کە*ڕەسیسە* "کڵۆبەفری تەنک و ورد"].

**گژگژین gıjgıjîn** [ *gıžgıžīn* ] - "ڕاست بوونەوەی مووی لەش لە ترسان": بڕوانە ↑گژ[4] gıj.

**گژەبا gıjeba** [ *gıžabā* ] - "گێژەڵووکە": خزمە دەگەڵ ↑گژاندن gıjandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن"، ↑گێزان gîzan "لێکدرانی تراو، ژان" و دواتر ↑گێژ gej.

**گژیان gıjyan** [ *gıžyān* ] - "شێوان و لێکدرانی موو": خزمە دەگەڵ ↑گێزان gîzan "لێکدرانی تراو، ژان" و دواتر ↑گێژ *gej*.

**گشت1 gışt 1** [ *gıšt* ] - "تێکرا، هەموو": گش gış و گژ[7] gıj یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ چەند وشە کە ئاماژە بە "زۆر و زەوەندی، پێکەوەیی"دەکەن، وەک ↑گیشە *gîşe*، ↑گاشە gaşe [گیشەگیا، گاشەبەرد]، ↑هێشوو hêşû. وشەکە سەرەتا بە مانای "کۆگا، پڕانی، ئاپۆڕە، زۆر و زەوەندی" بە کار هاتووە و لەمەوە مانای "هەموو" پەیدا بووە.

[تێبینی: لەنێوان چەمکەکانی "پڕ، زۆر و زەوەندی" و "هەموو، گشت"دا پێوەندی هەیە، بۆ وێنە دە زمانی کوردیدا "گەل" [هەموو خەڵک پێکەوە] و "گەلێک" بە مانای "زۆرێک" [گەلێک کەس]، یان دە زمانی ئەڵمانیدا viel (G.) "زۆر" و volk (G.) "گەل، خەڵک"].

**گشت2 gışt 2** - "گرژ، توند، چالاک": [هەڵپەڕیتێکی گشت]، خزمە دەگەڵ ↑خەست xest "توند، تۆخ".

**گشت3 gışt 3** - "قامک": گست gıst و ↑گوست *gust* و ↑ئەنگوست angust یش دەگوترێن.

**گشت[4] gışt[4]** - "بادراو": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گێژ gej دا باس کراون و ئاماژە بە "با دران، سووڕان، چەمان" دەکەن.

**گشتەک gıştek** [ *gıštak* ] - "چەند بەنی پێکەوە بادراو": خزمە دەگەڵ ↑گشت[4] gışt "بادراو".

[تێبینی: وشەکە بە فارسی وەک "نخ تابیدە" مانا کراوەتەوە. وشەی "تابیدە" مانای "با دران" دەبەخشێ و خزمیشە دەگەڵ "تەون" و "داو" دە زمانی کوردمادیدا، چونکوو تەون کردن یان چنین پێوەندییان بە چەمکی "با دان، گرێ دان، لێکهاڵاندن"ەوە هەیە. هەروەها دە زمانی فارسیدا وشەی "تاب" [پیچ و تاب] مانای "سووڕان" و هەروەها "جولانە، راژان" یش دەبەخشێ [تاب بازی]. ئەم مانایانە هاوشێوەن دەگەڵ مانای وشەکانی ↑گێژ *gej* "1- حۆل 2- سەر دەسووڕەوە هاتوو"، ↑گێزان gezan " تێکوەردران، شڵەقان"، ↑گژەبا gıjeba "گردەلوول، گێژەڵووکە" و ↑گۆزان gozan "سەر راوەشاندنی منداڵ"]. بەم جۆرە وشەکە پێوەندی بە وشەی "گێژ"ەوە پەیدا دەکا و چەمکی "سووڕان، با دران" لە خۆ دەگرێ. ↑گەشت geşt "گەڕان، خولانەوە" و دە زمانی فارسیدا گشتن gaštan (P.) پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی 1: دە زمانی فارسیدا دوو چاوگی "گشتن" و "گردیدن" بەکار دەهێنرێن، کە هەر دووکیان مانای "گەڕان" دەبەخشن. ئەم دوو وشەیە سەر بە دوو ڕیشەی جیاوازن، یەکەمیان دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە و دووەمیان دەگەڵ "گەڕان". دە زمانی فارسیدا بۆ کرداری رابردوو زۆرتر لە وشەی یەکەم کەڵک وەردەگیرێ (گشتم، گشتی...) و بۆ کرداری کاتی ئێستا وشەی دووەم (می گردم، می گردی...). تێبینی 2: دە زمانی فارسیدا ئەم دوو چاوگەی سەرەوە وەک کرداری یاریدەر لەباتی "شدن"یش بەکار دەهێنرێن. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ ئەم دۆخە لە کرداری werden کەڵک وەردەگیرێ کە ئەویش دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "سووڕان، باد ران" دەکا و دەگەڵ "گۆڕین" دە زمانی کوردمادیدا خزمە. مەبەست لەم کردارانە ئەوەیە، کە کاتێک شتێک لە دۆخێکەوە دەبێتە دۆخێکی تر، ئەوا وەرسووڕاتێک تێیدا روو دەدا].

**گغ gıġ** - گاڵ و گغ gal û gıġ واتا گڕ و گاڵ، زمان کردنەوەی زارۆک": خزمە دەگەڵ ↑قسە qıse و ↑قیژە qîje و هتد.

**گفت gıfıt** - "1- سۆن، بەڵێن 2- قسە [گفتوگۆ]": دەچێتەوە سەر> گفتن *goftan* (P.) و ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑گوتن gutın [گۆتن gotın، کوتن kutın] و هەروەها ↑ئاخافتن axaftın [-a xaftın].

**گفشک gıvışk** [ *gıvišk* ] - "قورینج (گرتن)": خزمە دەگەڵ ↑گڤاشتن gıvaştın "پشاوتن، فشار دان".

**گڤالە gıvale** [ *gıvāla* ] - "کۆمەڵی چەکدار": ↑کەواڵ gewal "دەستە، پۆل".

**گڤاشتن gıvaştın** [ *gıvāštın* ] - "پشاوتن، توند فشار دان": گوشین guşîn و کوشین kuşîn یش دەگوترێن. هەروەها ↑گفشک gıvışk "قورینج (گرتن)" و گڤیشک gıvîşk هەیە بە مانای "گوشراوی میوە". خزمە دەگەڵ quetschen (G.)، kwetsen (Nl.) گڤاشتن"، quatere (L.)، quassare (L.) "راتڵەکاندن، لێکدان"، quasser (OFr.) "گڤاشتن، بریندار کردن". وشە ژێرمەنییەکان بە گوێرەی فەرهەنگی WAHRIG ی ئەڵمانی دەچنەوە سەر ریشەی **< *guedh-** ***(IE.)*** "پێکدادان، بریندار کردن، لەناو بردن". وشەی ↑خوست[1] xust [پێخوست pexust واتا پێشێل] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**گڤاند1 gıvand** [ *gıvānd* ] - "هێل، خەتی جووت": هەروەها گڤاندە gıvande هەیە بە مانای "سەرلێوی کەندال و شاخ". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا شی کراونەوە. ئەم وشانە بە گشتی مانای "کون و کەلێن، قوڵکە، قووڵایی، کۆڵین [هەڵکۆڵین]" دەبەخشن.

**گڤاند2 gıvand** [ *gıvānd* ] - "خوار و خێچ": هەروەها گڤاندە gıvande هەیە بە مانای "کەوشەنی کێڵگە". خزمە دەگەڵ ↑کەوان kewan و هێندیک وشە کە مانای "خوار بوون(ەوە)" دەگەیەنن. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "کەوشەن".

**گڤر gıvır** - "پشیلەی تیر": ↑کڤر kıvır یش دەگوترێ.

**گڤردی gıvırdî** [ *gıvırdī* ] - "لەرزین، راچەنین": خزمە دەگەڵ quiver (E.) "لەرزین"، cwiver (ME.)، cwifer (OE.) "چوست و چابوک". ریشەی ئەم وشە ئینگلیزییە باس نەکراوە.

**گفشک gıvışk** - "ئەنگوتەهەویر": خزمە دەگەڵ ↑گەوجە gewce "هەڵووچەی بەهارە"، ↑گوێز goez، ↑گۆیژە goyje [یان گڤیشک gıvîşk] و دواجار ↑گۆ *go*. ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە شتی خڕ و گۆیین دەکەن.

**گڤە gıve** [ *gıva* ] - "دەنگی با": [گڤەگڤی با]، خزمە دەگەڵ گمە gıme و ↑گماندن gımandın "دەنگی کۆتر".

**گڤی gıvî** [ *gıvī* ] - "دەڵەمەی پەنیر": خزمە دەگەڵ گڤین gıvîn "مەیین" [↑گوڤین *guvîn* ش دەگوترێ]..

**گڤین gıvîn** [ *gıvīn* ] - "مەیین": ↑گوڤین *guvîn* ش دەگوترێ.

**گڤێرین gıverîn** [ *gıverīn* ] - "هەزم کردن": گواریدن govārīdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑گەروو geru و ↑خواردن xuwardın و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *g(u)el-** ***(IE.)*** "هەڵقوراندن، هەڵلووشین". gula (L.) "لوولەی پێداچوونی خواردن"، gelid (OIr.) "خواردن، هەڵلووشین" لەم ریشەوە هاتوون.

**گل1 gıl** - گل بوونەوە واتا گلۆر بوونەوە و دە بنەڕەتدا بە مانا ی"خلیسکان"ە. ↑خل xıl بوونەوە و ↑خلۆر xıllor بوونەوەش دەگوترێ [بروانە ↑گلان *gılan*].

**گل2 gıl** - گل دانەوە واتا "لای خۆ هێشتنەوە، راگرتن بۆ خۆ". پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- halten (.G)، haldan (.Gt)، hold (.E)، halla (.Sw) "راگرتن"، halta r (.MG) "راگر، شوان، چاوەدێر" و haltāri (.OG) "وەرگر". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان دەچێتەوە سەر **< *kel-, *kle-** **(.IE)** "بانگ کردن، هەرا کردن". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵ1 kal "1- کەمڕەنگ، رەنگی رووناک" و ژمارەیەک وشەی دیکە.

2- یان لەوانەیە بچێتەوە سەر کرداری ↑گرتن gırtın، واتا دەبنەڕەتدا "گر [گیر] دانەوە" بووبێ.

**گڵ3 gıl** - "جار، کەڕەت": ئەم وشانەی خوارەوەش لەوانەیە پێوەندییان بەم وشەوە هەبێ: ↑چەل çel "جار" [بنزاراوەی مەهاباد و دەوروبەر]، کەلێک kelek یان کێلێک kelek "تاوێک، دەمێک". خزمە دەگەڵ ↑گێڵ1 gel "گەشت، گەڕان" و ↑گێڵان gelan "گەران، سووڕانەوە"، سەر بە ریشەی **< *(s)kel-** **(.IE)** "خوار بوون، چەمانەوە". لەم مانا بنەڕەتییەوە مانای "سووڕان، گەڕان" سەری هەڵداوە و لەمەشەوە چەمکی "گەڕ، نۆرە، دەور" پەیدا بووە. لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "گەڕ" هەڵیسەنگینین کە لە "گەڕان"ەوە هاتووە و چەمکی "سووڕان" لە خۆ دەگرێ. یان دەتوانیین دەگەڵ turn دە زمانی ئینگلیزیدا هەڵیسەنگینین کە هەم مانای "گەڕانەوە، با دانەوە" و هەمیش "گەڕ، نۆرە" دەبەخشێ. دە زمانی کوردمادیدا مانای وشەکە دیسان پەرەی ستاندووە و مانای "جار" و دواتر "دەم" پەیدا بووە.

[تێبینی1: دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا "کەلیک" نووسراوە بە مانای "تاوێک، دەمێک". وێ دەچێ وشەکە هەڵەیەکی تایپ کردنی تێدا بێ و دروستەکەی "کەلێک" بێ. تێبینی 2: دوو چەمکی "دەم، کات" و "جار، کەڕەت" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. لەم بارەوەوە بڕوانە شیرۆڤەی وشەکانی "جار"، "داڵ"، "کەشە"، "مەحەل". هەروەها time دە زمانی ئینگلیزیدا هەم "کات" و هەمیش "جار" مانا دەدا. سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "گەڕ، نۆرە" دەگەڵ "دەم، کات" دەتوانین ئاماژە بە وشەی "دەور" بکەین. کاتێک لە کایەدا بگوترێ "دەوری کێیە؟" مەبەستەکە دەبێتە "نۆرەی کێیە؟". بەڵام "دەور" دەگەڵ زەمانیش بەکار دێ و دەگوترێ "دەور و زەمان" و لێرەدا ئاماژە بە "دەم، کات" دەکرێ، یان دەگوترێ "دەوران" واتا "سەردەم". هەروەها وشەیەکی دیکە کە پێوەندی دوو چەمکی "کات، دەم" بە "سووڕان"ەوە نیشان دەدا، بریتییە لە "چەرخ" (چەرخی بیست و یەکەم واتا سەدەی بیست و یەکەم].

**گڵ4 gıl** - "سەرلق، لقی هەرە بلیند": دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑کلک kılk دا باس کراون.

**گڵ gıl** - "خۆڵی نمدار": گل gel (.P) "قوڕ": خزمە دەگەڵ Klei (.G)، clay (.E) "گڵ، قوڕ"، glia (.Gr) "چەسپ، چرێش"، glej (.Rus) "قوڕ، لم، لیتە"، glutinosus (.L) "چەسپاوی، لیچق"، سەر بە ریشەی **< *glei-** **(.IE)** "چەسپ کردن، سواخ دان، تێهەڵسوون". ئەم ریشەیەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دوورتر واتا ریشەی **< *gel-** **(.IE)** "رێککوشین، تۆپەڵە بوون". بەم پێیە وشەکە دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑گلوو gılu دا باس کراون. لەوە دەچێ ↑کل kıl "دەرمانی چاو رشتن" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو ئەو دەرمانە جۆرە گڵێکە لە برژانگی هەڵدەسوون یاخود برژانگی پێ سواخ دەدەن!

[تێبینی: دە زمانی ئینگلیزیدا kohl (.E) هەیە بە مانای "کل"(ی چاورشتن). ئەم وشە ئینگلیزییە بردراوەتەوە سەر كحول kħûl (.Arb) "کل" و هەروەها باس لەوەش کراوە کە ئەلکۆڵ Alkohol دە ئەسڵدا وشەیەکی عەرەبییە، واتا الكحول alkħûl (.Arb)، کە ئەمیش دەچێتەوە سەر كحول kħûl (.Arb) "کل". ئەو پێوەندییانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێ کرا، وا دەردەخەن کە "کل" وشەیەکی کوردمادی بێ و چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە].

گلّاده **gılade** [ *gılāda* ] - ↑قەلادە qelade "بەندی ملی سەگ".

گلاره**1 gılare** [ *gılāra* ] - "1- دانە، دەنك 2- گلێنەی چاو": ↑گلە gıle "دانە، دەنك".

گلاره**2 gılare** [ *gılāra* ] - "بڕەداری لەسەریەك دانراو": شێوەیەكی دیكە لە ↑كەلار kelar "لەسەریەك دانراو، كەڵەكە كراو" و خزمە دەگەڵ ↑*كەڵەكە keleke* كردن.

گلاس **gılas** [ *gılās* ] - "شەربەی شووشە 2- شووشە": گیلاس gīlās (P.). دەچێتەوە سەر وشەیەك بە مانای "شووشە" دە زمانە ژێرمەنییەكاندا: Glas (G.)، glas (Nl.)، glass (E.)، glas (Sw.) "شووشە". ئەم وشەیە لای هۆزە ژێرمەنییەكان دە كۆندا بە مانای "كارەبا، بەردی كارەبا" بەكار هاتووە. شیاوی باسە دە ئینگلیزی كۆندا gla r (OE.) بە هەمان مانا بەكار هاتووە كە هەر لەپێوەندی دەگەڵ وشەكانی سەرەوە دایە. دواتر كاتێك هۆزە ژێرمەنییەكان لە ڕێگەی ڕۆمییەكانەوە شووشەیان ناسی، ئەو ناوەی زمانی خۆیان لەسەر داناوە. ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی ***ĝhel-* ( *IE.* )** "درەوشانەوە، ترووسكانەوە، بریقانەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها glasur (G.) هەیە بە مانای "لوعاب". دە زمانی كوردمادیدا چەندین وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەك ↑زەرد zerd و ↑*زێڕ zer* و هتد. لەپێوەندی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەكاندا چەند وشەیەكی زمانی كوردمادی سەرنج ڕادەكێشن كە بریتین لە: ↑گلیز gılîz "لیك" [دە فارسیدا دەگوترێ *"لعاب* دهن" (لوعابی دەم)]، ↑گلیزە gılêze "شووشەسەهۆڵ"، ↑گالش galış "ژێرپیاڵە". ئەم وشانە لەوانەیە لەپێوەندی دەگەڵ وشەكانی سەرەوەدا جێ بگرن. هەرچەند وشەی *گلاس* "شووشە" خۆی لە زمانە ژێرمەنییەكانەوە وەرگیراوە، بەڵام *گلیز* "لیك" وشەیەكی بە ئەسڵ كوردمادییە و لەوانەیە خزمایەتی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەكان هەبێ.

گلاله **gılale** [ *gılāla* ] - "ئاڵوو": گەلالە gelale ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ گلّاڵە glale [↑گەلاڵە gelale] و ↑گلۆڵە gılole.

گلان **gılan** [ *gılān* ] - "1- خلۆر بوونەوە 2- كەوتن": ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا مانای "كەوتن" نەبووە، بەڵكوو خلیسكان بووە. واتا كاتێك بۆ وێنە ئەسپ سوار لە سەر ئەسپ هەڵخلیسكاوە (و كەوتووەتە خوار)، گوتوویانە گلاوە. وشەی كوشەكە خزمە دەگەڵ glatt (G.) "ساف و لووس، خلیسك" و gleiten (G.) "خلیسكان". دە زمانی كوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*خلیسكان xılîskan*، ↑گلۆر gılor بوونەوە، ↑چاڵە cale و هتد. سەبارەت بە هێندێك پێوەندی لەسەر ئەم چەمكانە بڕوانە وشەی "تلین".

گلّاو **gılaw** [ *gılāw* ] - "پیس، سەنم": گلّاو كردن واتا "پیس كردن". ئەم وشەیە پێوەندی بە "گڵ" ەوە هەیە، بەڵام نەك بەم مانایە كە "گڵ" و "ئاو" تێكەڵ كرابێ و وشەی "گلّاو" وەك وشەیەكی لێكدراو دروست كرابێ. وشەكە خزمە دەگەڵ kleben (G.)، klīban (OG.)، clīfan (OE.)، klīfa (OIs.) "چەسپان، پێوەنووسان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *glei-, *gli-** ( ***IE.*** ) "پێوەنووسان، چەسپان". چەندین وشە دە زمانی كوردمادیدا لەم ریشەوە دێن، بۆ وێنە ↑گڵ gıl، ↑هەڕی herî، ↑غەڕە ġere و هتد. مەبەست لە گلّاو بوون دە بنەڕەتدا ئەوە بووە كە شتێك بە دەست و قاچ یان جل و بەرگەوە *نووساوە*، وەك تۆز و خۆڵ، قوڕ و چڵپاو و هتد. لێرەوە مانای "پیس بوون" سەری هەڵداوە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ *سەنمین* "پیس بوون، گلّاو بوون".

گلپ**1 gılp** - "هەڵمەت، هێرش": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەڵپە helpe "پەلە، جموجۆڵی خێرا".

گلپ**2 gılp** - "پڕ پێدا كردن و ڕفاندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گرتن gırtın سەر بە ریشەی **< *grib-** ( ***IE.*** ) "گرتن".

گلته **gılte** [ *gılta* ] - "1- شەڕەقسە 2- قسە پەڕاندنی نەخۆش": خزمە دەگەڵ ↑گاڵتە galte.

گلدی **gıldî** [ *gıldī* ] - "خلۆرەوە بووگ": خزمە دەگەڵ ↑*گلۆر gılor* [خلۆر xılor]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑غەلدی ğeldî "سەگی بچکۆڵەی ڕاو" و ↑گلسە gılse "بە زەویدا کەوتن".

گلزە **gılze** [ *gılza* ] - "باقە، دەسکە گیای زل": خزمە دەگەڵ ↑گەل gel "کۆمەڵ، دەستە".

گلسە **gılse** [ *gılsa* ] - "بە زەویدا کەوتن": خزمە دەگەڵ ↑گلان gılan.

گلفچاندن **gılıfçandın** [ *gılıfçāndın* ] - "لەناو دەستدا گوشین": شێوەی جەخت کراوی ↑گلۆفین gılofîn.

گلك1 **gılık 1** [ *gılık* ] - "لاسکەگەنمی بێ دەنک": خزمە دەگەڵ ↑کلك kılık.

گلك2 **gılık 2** [ *gılık* ] - "میتکە": ↑چیلك çîlık یش دەگوترێ. هەروەها ↑زیلك zîlık هەیە بە مانای "میتکەی یەکسم". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑گلك1 gılık 1 "لاسکە گەنمی بێ دەنک" و دەگەڵ ↑*کلك kılık* سەر بە ریشەیەك بە مانای "قوت و زەق بوون".

گلکۆ **gılko** - "مەزار": ↑گل gıl + ↑کۆ ko. مەبەست ئەو کۆگاگڵەیە بە سەر گۆڕدا دەکرێ.

گلگلاندن **gılgılandın** [ *gılgılāndın* ] - "تەتەڵە کردنی دەخڵ و دانەوێڵە": هەروەها گلگل gılgıl هەیە وەك ناوی مانا. بنجی وشەکە گل -gıl ە و لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی < **(IE.) *(s)kel-** "قەلشاندن، بڕین، لێك جودا کردنەوە". schälen (G.) "تۆکڵ کردن" و↑ چاڵ² çal "پووش" [چیلکە و چاڵ] پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

[تێبینی: لەباری پێوەندی فۆتیمەکان بە ریشەی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *گێڵ1* "گەشت، گەڕان"، *گێڵان* "گەڕان"، *گێل* "حۆل، گەمژە" و *گێلگێلە* "ریزەگوڵینگەی تێکخراو بۆ سەر و شەدەی ژنان"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *(s)kel-* "خوار بوون، چەمانەوە"].

گلم **gılım** [ *gılım* ] - "لق، لکی دار": خزمە دەگەڵ ↑قەڵەم qelem و قەڵەمە qeleme.

گڵمەت **gılmet** [ *gılmat* ] - "سندەگڵ، سمتەگڵ": ↑گڵ gıl + مەت met . کەرتی دووەم لەوانەیە پێوەندی بە ↑مزاندن mızandın "لکان، پێکەوەنووسان"ەوە هەبێ.

گڵوێنە **gılwene** [ *gılwena* ] - "باکیشی تەنوور": گڵبێنە gılbene و ↑*گوڵبێنە gulbene* ش دەگوترێ.

گلوو **gılu** [ *gılū* ] - گلوو بوون یاخود گلوو گلوو بوون واتا لێکهاڵان و تۆپەڵە بوونی شت. گولوو gulu ش دەگوترێ. چەند وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەم وشەیەوە هەیە وەك ↑گڵۆڵە gılole، ↑گوللە gulle، ↑گڵۆپ gılop، ↑کلۆ kılo و ↑گڵۆفین gılofîn، ↑گڵۆت gılot "سندەگڵ" کە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "پێکەوەنووسان، لێکهاڵان، تۆپەڵە بوون". لەوانەیە وشەی ↑گەل gel یش بە مانای "ئاپۆڕە، حەشیمەت" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. وشەی globus (L.) "گلوو، گۆ، گڵۆڵە، تۆپ"، galla و glomus (L.) "گرێ و گوڵ" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < **(IE.) *gel-** "خڕ بوون، تۆپەڵە بوون".

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ریشەیەکی دیکەش هەر لە چەشنی ئەو ریشەی سەرەوە هەیە کە مانای "پێکەوەنووسان، ڕێکگوشران" دەبەخشێ. ئێتیمۆلۆگەکان لەم باوەڕەدان کە ئەم دوو ریشە دە بنەڕەتدا هەر یەك ریشەن، واتا لە ئەنجامی پێکەوەنووسان و ڕێکگوشراندا دۆخی گلوو بوون، گرمۆڵە و تۆپەڵە بوون دروست دەبێ. ئەم بۆچوونە زۆر ڕاستە، بۆ وێنە کاتێك سەیری تۆپەڵەبەفر یان تۆپەڵەقوڕ بکەین، دەبینین کە لە ئەنجامی ڕێککوشین و پێکەوەنووساندا دروست دەبێ. بەم جۆرە ئەم وشانەی سەرەوە دەبنە خزم دەگەڵ وشەگەلێکی زۆر لە چەشنی ↑گڵ gıl و ↑گڵۆفین gılofîn و ↑گڵاو gılaw و هتد.

گلووچاندن **gıluçandın** [ *gılūčāndın* ] - "گلۆفین، دەناو دەستدا پشاوتن": گلفچاندن gılıfçandın و ↑گلۆفین gılofîn یش دەگوترێ. هەر سێ وشە لە یەک بنەڕەتەوە دێن. خزمن دەگەڵ ئەووشانەی لە ژێر ↑گلوو gılu دا باس کراون و دەچنەوە سەر بنەوشەیەک بە مانای "خڕکە، گرمۆڵە، تۆپەڵە بوون"، سەر بە ریشەی **< *gel-** (**IE.**) "پێکەوەنووسان، خڕ بوون، تۆپەڵە بوون، رێککوشران".

[تێبینی: مەبەست لە "گلۆفین" دە بنەڕەتدا پشاوتن و تۆپەڵە بوونی شتێکە وەک کاغەز، پەڕۆ و هیتر لە ناو دەستدا. بە فارسی پێی دەگوترێ مچالە moçale [خزمە دەگەڵ "مزاندن"]. دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە zerknüllt (G.)، سەر بە کرداری knüllen و سەر بە ریشەی *gen- (IE.) "تۆپەڵەبوون". گنا gına "گلۆڵە" دە زمانی کوردیدا پێوەندی بەم ریشەوە هەیە].

گلۆ **gılo** - "گش قەدێک، گش چیتێک": خزمە دەگەڵ ↑گەل gel "زۆر، پرانی".

گلۆپ **gılop** - "لامپ": بڕوانە ↑گلوو gılu.

گلۆت **gılot** - "کەستەک، سندەگڵ": خزمە دەگەڵ↑ گلوو gılu و ↑کلۆ kılo و هتد.

گلۆر **gılor** - گلار gılar و خلۆر xılor [خللۆر xıllor]یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- خلیسکان xılîskan و ↑گلان *gılan*.

2- ↑گێڵ *gel l* "گەشت، گەڕان" و ↑خولانەوە xulanewe.

گلۆفین **gılofîn** [ *gılofīn* ] - "پشاوتن و تۆپەڵە کردن لە ناو دەستدا": گلووچاندن gıluçandın و گلفچاندن gılıfçandın یش دەگوترێ. ↑گلووچاندن gıluçandın. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گلۆپ gılop.

گلۆڤەر **glover** [ *glovar* ] - ↑گرۆڤەڕ gırover یش دەگوترێ بە مانای "خڕ، گۆیی". خزمە دەگەڵ ↑گلۆپ gılop "لامپ" و دواتر دەگەڵ ↑*گلوو gılu*.

گلۆڵە **gılole** [ *gılola* ] - "تۆپەڵە(بەن)": بڕوانە ↑گلوو gılu.

گلە **gıle** [ *gıla* ] - "دان، دانە":

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ ↑گرنی gırnî و ژمارەیەک وشە بە مانای "دەنک، دان".

2- هەروەها دەکرێ دەگەڵ ↑گلوو gılû هەڵی سەنگینین. "گلوو" و وشە خزمەکانی ئاماژە بە "تۆپەڵە بوون" دەکەن.

گلیز **gılîz** [ *gılīz* ] - "لیک، لیکاو": گلێژ gılêj یش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑گلاس gılas.

2- ↑گڵ gıl "خۆڵی نمدار"، Klei (G.)، clay (E.) "گڵ، قوڕ"، glia (Gr.) "چەسپ، چرێش"، glej (Rus.) "قوڕ، لم، لیتە"، glutinosus (L.) "چەسپاوی، لیچق"، سەر بە ریشەی **< *glei-** (**IE.**) "چەسپاندن، سواخ دان، تیهەڵسوون".

گلیزە **gılîze** [ *gılîze* ] - "شووشەسەهۆڵ، چلوورە": گلیلە gılîle ش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑گلاس gılas "شووشە".

2- ↑گلێرە gılêre "تەزرە، دەنکەسەهۆڵ".

گلیش **gılîş** [ *gılīš* ] - "1- پووش و پەڵاش 2- شەقڵی خەرمان": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑چاڵ *çal* [چڵتە و چاڵ، چیلکە و چاڵ] و ↑کەڵپک1 kelpık "تۆکڵی دەخڵ و دانی هاڕاو"،

سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kel- >** "قەڵشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە". سەبارەت بە مانای دووەمی وشەکە، واتا "شەقڵ" دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە وشەی "شەقڵ" خۆشی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشاندن" و خزمە بۆ وێنە دەگەڵ "چەقۆ". ئەم ریشەیە بریتییە لە ریشەی *(IE.) *(s)kei-* "بڕین، قەڵشین، جودا کردن". دوور نییە ئەم دوو ریشەیە دواجار پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و ئەمەی دوایی ریشە کۆنترەکە بێ.

**گلیل gîlîl** [ *gılīl* ] - "درێژووکەی گرۆڤەر، ئوستوانەیی": خزمە دەگەڵ ↑گرۆڤەر gırover و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "خڕ و تۆپەڵە" بوون دەکەن. دیارە لە مانای "خڕ"ەوە دواتر مانای "ئوستوانەیی" دروست بووە.

**گلێجە gılece** [ *gıleja* ] - "قووڵایی بەر سینگ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑قووڵ qul [قووڵاییەکی بچووک].

**گلێرە gıl(l)ere** [ *gıl(l)era* ] - "تەرزە، گلەسەهۆڵ": ئەم وشەیە دەتوانێ راستەوخۆ پێوەندی هەبێ بە ↑گلوو gılu، ↑گلۆڵە gılole، ↑کلۆ kılo و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر **(IE.) *gel- >** "گلوو بوون، پێکەوەنووسان، رێکگوشران، تۆپەڵە بوون". لەم تێڕوانینەوە وشەی "گلێرە" ئاماژەیە بە "گلوو بوون"ی ئەو سەهۆڵە وردانەی دەبارێن. بەڵام وشەکە دەشتوانێ راستەوخۆ پێوەندی بە چەمکی "سەهۆڵ بەستن"ەوە هەبێ و خزم بێ دەگەڵ gelare (L.) "سەهۆڵ بەستن". وشە ئەورووپییەکانی "ژێلە" و "ژێلاتین" لەم وشە لاتینییە وەرگیراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *gel- >** "ساردبوون(ەوە)، بەستن لە سەرمان". وشەی سار(د) sar(d) یش لەم ریشەوە هاتووە. ئەم دوو ریشەی سەرەوە دە بنەڕەتدا هەر یەکن، چونکوو لە ئەنجامی ساردبوون(ەوە) و بەستن لە سەرمان وردیلەکان دەچنە پاڵ یەکدی، پێکەوە دەنووسێن، لێک دەهاڵێن و تۆپەڵە دەبن. وشەی ↑چلوورە çılûre ش دەشێ لەم پێوەندییەدا جێ بگرێ.

**گلێنە gılene** [ *gılena* ] - "رەشێنەی چاو": خزمە دەگەڵ یان دەچێتەوە سەر glénē (Gr.) "گلێنە". دوور نییە ئەم وشەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑گلارا gılara "گلە، گلێنە".

**گلێیی gıleyî** [ *gıleyī* ] - " گازن، سکاڵا": گلە gıle و گلێ gıle ش دەگوترێ. گلایە gelāye (P.). خزمە دەگەڵ Klage (G.) "گلێ، سکاڵا"، klagon (OG.) "هاوار و سکاڵا کردن"، gárhati- (OIn.) "گلێ و گازن دەکا"، سەر بە ریشەی **(IE.) *gal- >** "هاوار کردن، قیژاندن".

**گماندن gımandın** [ *gımāndın* ] - "خۆیندنی کۆتر": گومین gumîn ش دەگوترێ هەم بە مانای "خوێندنی کۆتر" و هەمیش بە مانای "گرماندن". بنەوشەی -gım دە چەندین وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ و ئاماژە بە "دەنگ و هەرا کردن" دەکا، وەک ↑گومنی gumnî "دەنگ دانەوە"، ↑گومگومین gumgumîn "گرماندن"، ↑گڤە gıve "دەنگی با"، ↑گمایش gımayış "دەنگی ئاگر" و ↑گومگوم gumgum "1- دەنگی مێش و مەگەس، دەنگی رۆیشتنی ئاو"، خومخوم xumxum "دەنگی رۆینی ئاو بە چەم و جۆگەدا" و هتد. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ Hummel (G.) "ژەنگەسوورە" [دە بنەڕەتدا: وزەوزکەر] سەر بە ریشەی **(IE.) *kem- >** "وزەوز کردن، زەرەزەرکردن، گوڕەگوڕ کردن، خشەخش کردن، دەنگی وێک کەوتنی گەڵا، دەنگی چۆڕانەوەی ئاو". دە فارسیدا همهمه hamhame (P.) "دەنگ و هەرای زۆر و ناڕوون و تێکەڵ پێکەڵ" و دە کوردمادیدا ↑هەوهەو hewhew [هەوهەوی سواران] پێوەندیان بەم ریشەوە هەیە.

**گمایش gımayış** [ *gımāyış* ] - "1- دەنگی بلێسەی ئاگر 2- بۆڵەبۆڵ کردن": خزمە دەگەڵ ↑گماندن gımandın.

**گمگمە gımgıme** [ *gımgıma* ] - "1- تونگە، دەفری ملتەنگ [بەم مانایە گمگمۆک gımgımok و خمخمۆک xımxımok یش دەگوترێن] 2- قومقومە، مەتارە 3- فینجانی قاوە": ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑جام cam و ↑خوم xum "کووپە".

**گن 1 gın** - "( دەنگی) لووت گیراو": هەروها گنین gınîn هەیە بە مانای "گن قسەکردن". خزمە دەگەڵ schnüffeln (.G) "بۆن پێوە کردن، بە دەنگەوە هەناسە کێشان"، snuffle (.E) "بەلووت هەناسە کێشان، گن قسەکردن"، Snüff (.Nl) "لووت، لمبۆز"، Schnupfen (.G) "هەڵامەت" [دە بنەڕەتدا: هەناسەکێشان بە دەنگەوە یاخود لووت گیران"]. ریشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگێ دەگەڕێندرێتەوە.

**گن 2 gın** - "پارچە، پاژ": هەرووەها گنگن gıngın هەیە بە مانای "پارچەپارچە". لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ژەندن *jendın* و کەندن² kendın و ↑گنایەنە gınayene "وێک کەوتن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان". هەرووەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گنجڕ gıncır "شڕ و دڕ، لەت لەت".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "پارچە، پاژ" و "لێدان" هەڵی سەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ دوو وشەی "تیکە" و "تاشین" کە پێکەوە خزمن، یان دوو وشەی خزم دە زمانە ژێرمەنییەکاندا، وەک bite (.E) "گەستن" (دە بنەڕەتدا: کوتان، قەڵشاندن، خزم دەگەڵ "پسان") و bit (.E) "کوت، بڕ، پارچە"].

**گنا gına** [ *gınā* ] - "گلۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑قوتیر quenr "کوان" و ↑گنج *gınc*.

**گنار gınar** [ *gınār* ] - "ئەسپێ": خزمە دەگەڵ ↑گەنە gene.

**گناس gınas** [ *gınās* ] - "بێئاکار، پەست": خناس xannās (.Arb) دەشێ لەم وشە کوردمادییە وەرگیرابێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑کنۆس kınos "رژد، چنۆک".

2- یان لەوانەیە پێوەندی بە چەمکی "خوار و خێچی" [ناراستی]یەوە هەبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑قەناس qen(n)as.

**گنایەنە gınayene** [ *gınāyana* ] - "وێککەوتن": خزمە دەگەڵ ↑ژەندن *jendın* و کەندن² kendın سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان".

**گنتەڵ gıntel** [ *gıntal* ] - "گوندە، قەڵەو": بڕوانە ↑گونتک guntık "تۆپەڵەهەویر".

**گنج gınc** [ *gınj* ] - "چرچ و لۆچی، دەق شکان، شەق شکان": دە بنەڕەتدا بە مانای لێکهاڵان و گلۆڵە بوونی شتێکی سافە بە هۆی پشاوتن [دە فارسیدا دەگوترێ مچالە mačāle]. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑خونچە xunçe، ↑قنج qınc، ↑خونجیلانە xuncîlane و هتد. ئەم وشانە سەرەڕای جیاوازی لە ماناڵا دەچنەوە سەر ریشەی **(.IE) *gen- <** "خڕ بوون، توپەڵە بوون". دە زمانی ئەڵمانیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک Knospe (.G) "چرۆ، خونچە، گۆک"، Knopf (.G) "قۆپچە، دوگمە"، Knoten (.G) "گرێ"، Knoll (.G) "بنەگیا، سەلک"، Knüppel (.G) "داری سەرخڕ، بنەدار" و هتد. ئەم وشانە بە گشتی ئاماژە بە شتێک دەکەن کە رێکگوشراو یان خڕ و تۆپەڵە بووبێتەوە. وشە کوردمادییەکان هەریەک بە جۆرێک ماناکانیان دەگەڵ مانای ئەم ریشەیە دەگونجێ. وشەی قنج gınc کە زۆرتر دەگەڵ قیت دێ، دە بنچینەدا ئاماژە بە خراپیەک دەکا لە سەر رووبەرێک، واتا جۆرە هەڵتۆقاوی و لە هەمان کاتدا قیت

بوونەوەیەک. خونچە xunçe گوڵێکی نەکراوە و وێکهاتوویە. خونچیلانە بۆ وەسف کردنی شتی گچکەی جوان بەکار دێ، و هەروەها قنج qınc کە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا هاومانای جوان بەکاردێ، دەبنەڕەتدا ئاماژەیە بەوە کە شتێک زل و قەبە یان پەرژ و بڵاو و نارێک و پێک نییە، بە واتایەکی دیکە *گونجاوە*. هەرچی وشەی↑ گونجان guncan یشە سەر بەم خێزانەوشەیە. گونجان کە بە مانای "باش، شیاو و لەبار بوون" و هەروەها "جێ بوونەوە" دێ، دە بنەڕەتدا بە مانای "وێکهاتن" یان "خڕ بوونەوە"ی شتێک هاتووە، کە دەبێتە مایە "جێ بوونەوە"ی ئەو شتە لەناو شتێکی دیکەدا. بە وتەیەکی دیکە "گونجاو" دە بنەڕەتدا ئەو دۆخەی بەیان کردووە کە شتێک دەتوانێ بە هۆی وێکهاتن و خڕ بوونەوە دەناو شتێکی دیکەدا جێ بگرێ، واتا شێوە و ئەندازەکەی دەگەڵی رێک بخا.

**گنجڕ gıncır** [ *gınjır* ] - "شڕ و دڕ، لەت لەت": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گن2 gın "پارچە، پاژ".

**گنجی gıncî** [ *gınjī* ] - "کەمێڵی پەز": دەچێتەوە سەر ↑گەنین genîn.

**گنخان gınxan** [ *gınxān* ] - "بۆگەن بوون بە هۆی تەڕییەوە": دەچێتەوە سەر ↑گەنین genîn. ناوگری خ x لێرەدا ئەو ئەرکە دەبینێ کە کرداری "گەنین" کە مانایەکی گشتی دەبەخشێ، دەکاتە جۆرێک لە گەنین کە مانایەکی تایبەتی دەبەخشێ، واتا گەنین بەهۆی تەراییەوە.

**گندراندن gındırandın** [ *gındırāndın* ] - "تلۆر کردنەوە": گوندڕاندن gundrandn یش دەگوترێ. هەروەها گندر gındır هەیە بە مانای "تلۆر" و گندڕ gındır بە مانای "باگردێن". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی **< *suen-** (**IE.**) "چەمینەوە، جوولانەوە، خولانەوە". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑جمین cımîn.

**گندڕین gındırîn** [ *gındırīn* ] - "رووخان": هەروەها گنین² gınîn هەیە بە مانای "کەوتن بە زەویدا" کە دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ sinken (G.)، sink (E.)، sjunka (Sw.) "داچوون، رۆچوون، داتەپین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *sengu-** (**IE.**) "کەوتن، داچوون، رۆچوون". وشەکە هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑زنگرین zıngrîn "تۆپین، کەوتین".

**گندک gındık** - "1-ئەنگوتک 2- تەپۆڵکی بچووک": شێوەیەکی دیکە لە ↑گونتک guntık "گونک، تۆپەڵەهەویری چکۆڵە".

**گندۆرە gındore** [ *gındora* ] - "کاڵەک": خزمە دەگەڵ ↑قوندک qundık "کوولەکە" و دواجار ↑کوند kund. هەریەک لەم وشانە ئاماژە بە شتێک دەکا کە خڕەکە و قوڵەبنەیە.

**گندۆش gındoş** [ *gındoš* ] - "سوژن": کوندوش kunduş یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەوە:

1- ↑جنین cınîn، سەر بە ریشەی **< *sneit-** (**IE.**) "جنین، بڕین". وشەی "دەرزی"یش پێوەندی بە ریشەیەکەوە هەیە بە مانای "بڕین، قەتاندن".

2- ↑چنین1 cınîn، سەر بە ریشەی **< *(s)ne-** (**IE.**) "چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان". وشەی "سوژن" خۆی دەچێتەوە سە ریشەیەک بەم مانایەی سەرەوە.

**گنیخە gınîxe** [ *gınīxe* ] - "ئەستووراییی ئەستۆ": هەروەها گنێخە gınêxe هەیە بە مانای "مل ئەستوور". دەشێ خزم بێ دەگەڵ genick (G.)، Nacken (G.) "مل، ئەستۆ" و ↑نیخ nîx "بنی گەرۆ".

**گنین1 gınîn 1** - "گن قسە کردن": بڕوانە ↑گن1 gın 1.

**گنین² gınîn ²** - "کەوتن بە زەویدا": خزمە دەگەڵ ↑گندڕین gındırîn "رووخان".

گوار **guwar** *[ guwār ]* - "بارەکەو": خزمە دەگەڵ ↑کوڕ kur و ↑کار kar.

گوارده **guwarde** *[ guwārda ]* - "جۆرێک خواردن": خزمە دەگەڵ ↑خواردن xuwardın.

گوارە **guware** *[ guwāra ]* - "خشڵی گوێ": گوشوارە gūšwāre (P.)، ↑گوێ gu(we) + وارە ware. کەرتی "وارە" لەوانەیە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑پەرەنگ pereng "لەرزانەی گوارە" و ↑پەڕ per 2 "وەرەق، وەرەقە". دە زمانی کوردمادیدا پەڕە pere بە مانای "پارچەکانزای تەنک" بەکار دێ.

2- wiara (OFr.) " تاج، خشڵ".

گواستنەوە **guwastın(ewe)** *[ guwāstn(awa) ]* - "بردن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گەیشتن *geyıştın* [گەهیشتن gehîştın]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێک بوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە تێوان، جێ هێشتن، چوونە پێش".

گواڵە **guwale** *[ guwāla ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑جەواڵ cewal. فۆنیمی g کۆنترە.

گوان **guwan** *[ guwān ]* - "مەمکی ئاژەڵ": گوهان guhan ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ دەگەڵ ↑کوان kuwan "خڕایی، زۆپایی و زیپکەی گەورە". پێوەندی بە یەکێک لەم ریشانەوە هەیە:

1- ریشەی **< *gēu- ( .IE)** "چەمانەوە، خوار بوون، خڕ بوون". ↑گۆ go لەم ریشەوە هاتووە.

2- ریشەی **< *keu- ( .IE)** "چەمانەوە". ↑کیو kew [کێف kef، کۆ ko]، کوە kūh (G.) و کوهان kūhān "کۆپان، زۆپایی پشتی وشتر" دەشێ لەم ریشەوە هاتبن.

گواندن **guwandın** *[ guwāndın ]* - "شل و نەرم کردن بە کوشین": شێوەیەکی دیکە لە ↑گڤاشتن gıvaştın [گوشین guşîn].

"لە بەرزییەوە بازد دان": خزمە دەگەڵ hüpfen (G.)، hüppen (Nl.)، hop (E.)، hoppa (Sw.) "بازد دان، هەڵبەزین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *keu- ( .IE)** "چەمانەوە" .

گوپ **gup 2** - "جێگەی هەڵمساو بە هۆی دارکاری کردنەوە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑قۆپچە qopçe.

گوت **gut** - دەگەڵ "گوت" دێ [گوت و گومبەز gut u gubez] و دواجار ↑قوت qut [قوت بوونەوە واتا دەرپەڕین، سەروەدەرنانی خێرا].

گوتلە **gutle** *[ kutla ]* - "تۆڵا، شتی وردی پێکەوەنووساو": خزمە دەگەڵ Kitt (G.)، kuti (OG.)، kit (Nl.)، cudu (OE.) "شیرە، گەزۆ"، játu (OIn.) "بتێشت"، kada (Sw.) "شیرەی دار"، سەر بە ریشەی **< *guetu- ( .IE)** "شیرەی دار، جەو، شۆکە". دەشێ وشەکانی ↑گەز gez، ↑گەزۆ gezo و ↑کەتیرە ketîre ش لەم پێوەندییەدا لێک بدەینەوە. دەزمانی عەرەبیدا وشەی كتلة kutla (Arb.) " دەستەی هاوپەیمان، فراکسیۆن، هاوبەوندی ناو پارلمان" لەوانەیە لە "گوتلە"ی کوردمادی وەرگیرابێ بەمانای"شتی پێکەوەنووساو و یەکگرتوو".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندین دوو چەمکی "پێکەوەنووسان، تۆلا" و "دەستە، گرووپ" دەتوانین ئاماژە بە وشەی ئینگلیزی "کلوب" بکەین کە خزمە دەگەڵ وشەکانی "گلوو"، "گرفنج" و "کەڵاف" (کەڵافەبەن)].

گوتن **gutın** - "قسە کردن": کوتن kutın و گوتن gotın یش دەگوترێن. هەروها ↑ئاخافتن axaftın دەگوترێ [ئا (پێشگر) + خافتن a + xaftın]. گفتن goftan (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ qutation (L.) "قسەکردن، گێرانەوە".

گوجوو(ک) **gucu(k)** *[ gujū(k) ]* - "سەگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑کوچک kuçık "سەگ".

گوجگ **gucık** *[ gujık ]* - "جاش پاڵتە": ↑گجی gıcî "کراس".

گود **gud** - "1-خڕ، گرۆڤەر 2- ئەنگوتکی هەویر 3- چۆماخ": وەک دەبینین لە هەر سێ ماناکەدا چەمکی "خڕی" خۆی نیشان دەدا. خزمە دەگەڵ ↑گۆ go. ئەم وشەیە دە ↑ئەنگوتک engutık [ئەن+ گوتک] یشدا خۆی دەبینێتەوە.

گودۆک **gudok** - "تازەلاو، لاوک": هەروەها گۆدەک godek هەیە بە مانای "پیزە، تۆل". کودک kūdak (P.) "زارۆک". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑گدی gıdî.

گوڕ **gur** - "1- هێز، تین و توان 2- خوڕ": [گوڕگوڕ فرمێسکی دەهاتە خوار]. خزمە دەگەڵ ↑خوڕ xur [باراتیکی بەخوڕ یان چەمێکی خوڕ]، ↑*کارین karîn* "توانین"، ↑گوربز gurbız چالاک، زرینگ"، ↑گوراش guraş "زۆرەوانی" و هەروەها ↑کورد kurd و هتد.

گوراش **guraş** [ *gurāš* ] - "زۆرەوانی، عەفرە": خزمە دەگەڵ ↑گوڕ gur "هێز، تین و توان".

گوراندن **gurandın** [ *gurāndın* ] - "سەر بڕین": پێوەندی هەیە بە ریشەی ***(IE.) *(s)ker- >*** "بڕین، لێکردنەوە، ژێ کردن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قرتاندن qırtandın [کرتاندن kırtandın]، ↑کەرت kert "لەت، بەش" و ↑کێرد kerd، ↑کور kur "بڕاو، هەڵپاچراو"، ↑کورت kurt، ↑شڕ şır [شڕ و دڕ] و هتد. دە زمانی کوردمادیدا هەرەها وشەی ↑گۆری gorî هەیە بە مانای "قوربان، قوربانی". ئەم وشەیە دەشێ لە "گوراندن"ەوە هاتبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "سەربڕاو" بووبێ کە دیارە ئاماژەیە بە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ رازی کردنی خودا قەڵس و تووڕەکان.

[تێبینی: وشەی "قوربان" وەک بیستوومە شێوەی عەرەبێنراوی وشەیەکی کۆنی کوردمادییە، کە دەبێ پێوەندی هەر بەم ریشەوە و بەم وشانەوە هەبێ و خزم بێ دەگەڵ carpere (L.) "لێکردنەوە، داپچڕین"، karpos (Gr.) "بەر و بۆم" [دە بنەڕەتدا: لێکراوە، داڕنراو]، erp (Rus.)، kröpion (Gr.) "داس" و ↑*هەرەوەز herewez*. لەوانەیە ↑قەرفین qerfîn "دەنگی شکانی دار" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لە پێوەندی دەگەڵ ئەم باسەی سەرەوەدا جێی ئاماژەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی sensenmann (G.) هەیە. ئەم وشەیە دە ئەسڵدا مانای "مەڵەغانچی" هەیە و لە هەمان کاتدا وەک شوبهاندن بە مانای "عیزرایل" بەکار دەهێنرێ کە گیان دەستێنێ، واتا بە مەڵەغانی مەرگ قوربانی دەگرێ. کەرتی یەکەمی ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ وشەی کوردمادی *زینی* "گوێزان" و کەرتی دووەمی بە مانای پیاوە. مانای تێکڕای وشەکە دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە کەسێک کە بە ئامرازێکی تیژ دەبڕێ و هەڵدەپاچێ، وەک چەقۆ بەدەست، گوێزان بەدەست، مەڵەغان بەدەست...].

گوڕاندن **gurandın** [ *gurāndın* ] - "هەرا کردن بە دەنگی بەرز، هەرا کردن بە تووڕەیی": گوڕڕاندن gurrandın یش دەگوترێ. غریدن ġorrīdan (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گۆرانی gorani.

گوربز **gurbız** - "چالاک، زرینگ": خزمە دەگەڵ ↑گوڕ gur "هێز، تین و توان". وشەکە دەتوانێ بەم شێوەی خوارەوە پێک هاتبێ: گور gur + بز bız. کەرتی بز bız- دەبێتە خزمە دەگەڵ بزاڤ bızav و ↑بزووتن bızûtın. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "گوربز" کەسێکە کە بە چالاکی دەبزوێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی جەربەزە cerbeze هەیە بە مانای "1- هار و هاج، هەدانەدەر 2- غیرەت، ئازایەتی". لەوانەیە ئەم وشەیە پێوەندی بە گوربز gurbız ەوە هەبێ.

گوربک **gurbık** - "خەڵێف، کونی مێشەنگوین": گوربە gurbe ش دەگوترێ. شێوەیەکی کۆنتر لە ↑خەڵێف xelef.

گورپ1 **gurp 1** - "کروشمەکردکێ": دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.)* ***ger- >*** "سووڕان، با دران" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی ئەڵمانی وەک krapfo (OG.) "قولاپ، چەنگێ، چەنگەک" [دە بنەڕەتدا: خوارایی، چەماوی]، Krüppel (G.) "چەوێل"، Krampf (G.) "تەشەنووج"، Kraft (G.) "هێز" و هتد. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑کورمان *kurman* [هەڵکورمان]، ↑قرمان qırman [تیک قرمان]، ↑کروشمە kıruşme ولە لایەکی دیکەوە دەگەڵ ↑قەلەو qelew، ↑قەلافەت qelafet و هتد.

[تێبینی: وەک لە مانای وشە ئەڵمانییەکان دەردەکەوێ، لەتیوان دوو چەمکی "چەنگێ" و "تەشەنووج"دا پێوەندی هەیە. لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە - رەنگە لە بەرهەمەکانی مامۆستا حەسەن قزڵجیدا- کە وشەی تشنج tašannuj (Arb.)ی عەرەبی لە "چەنگێ" وەرگیراوە، واتا بنجی وشە عەرەبییەکە "شنج"ە کە گۆڕدراوی "چەنگێ"ە و لەمەوە "تشنج" دروست کراوە. هەروەک وشەکانی سەرەوە نیشان دەدەن لەتیوان دوو چەمکی "تشنج" و "چەنگێ"دا پێوەندی لە ئارا دایە و وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەیە].

گورپ2 **gurp 2** - "بەفری پەستێوراوی بێ سەهۆڵ بەستن": خزمە دەگەڵ grob (G.) "زوور، درشت" و hreof (OE.) "زوور، شەقارشەقار"، kraupus (Lit.) "زوور". ئەم وشە ئەورووپییانە بە پێی بۆچوونێک دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.)* ***krup- >*** "قرتماغە، کرێژ". ئەم ریشەیە دەشێ دە پلەیەکی دوورتردا بچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *kar-, *ker-* "سەخت، خار". ↑خار xar و ↑گوڕ gur "هێز، توان" و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون.

گورپە1 **gurpe 1** [*gurpa*] - "تەپەی دڵ، خورپە": [گورپەگورپی دڵ واتا توند لێدانی دڵ]. شێوەیەکی دیکە لە ↑خورپە xurpe و دواتر ↑غەڵبە *ġelbe* [غەڵبەغەڵب]. دە زمانی ئەڵمانیدا Herzklappe (G.) بە مانای "دەلاقەی (ناو)دڵ" بەکار دێ کە بە بەستن و کرانەوەی لێکدا لێکدایان غەڵبەغەڵب [گورپەگورپ] دروست دەبێ. کەرتەشەی Klappe خزمە دەگەڵ وشە کوردییەکان.

گورپە2 **gurpe 2** [*gurpa*] - "پشیلەی تیر": خزمە دەگەڵ Welpe (G.)، welp (Nl.)، whelp (E.)، valp (Sw.) "بێچووی سەگێ، ڕێوی، گورگێ". [فۆتیمی w گۆڕاوە بە g]. شیمانەی ئەوە دەکرێ کە ئەم وشەیە پێوەندی هەبێ بە کرداری ژێرمەنی hwelan (OE.) "مراندن، گوراندن" و hvellr (OIs.) "قیژاندن". ئەم بۆچوونە زۆر ڕێی تێ دەچێ، چونکوو دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکەش بە مانای "گورپە" بەکار دێ کە بریتییە لە ↑کفر kıvır [یان گفر gıvır]. ئەم وشەیە بەتەواوی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان بە مانای "مراندن، قیژاندن" یەک دەگرێتەوە. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑کورکورە *kurkure* "باڵدارێکی ڕاوکەر".

گورپە3 **gurpe 3** [*gurpa*] - "گرتک ئەستوور، درشت ئەندام": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەلەو qelew.

گورتل **gurtıl** [*gurtıl*] - "ئاپۆڕە": ↑گوردەم gurdem یش هەر بەم مانایە بەکار دێ. خزمە دەگەڵ Herde (G.)، herd (E.)، hjord (Sw.)، hairda (Gt.) "مێگەل، گاران"، سەر بە ریشەی *(IE.)* ***kerdho- >*** "کۆگا، ئاپۆڕە". مانای ئەم ریشەیە قسەی لەسەرە و هێشتا بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. śárdha-h (OIn.) "ئاپۆڕە، ڕان"، çereda (Rus.) "ریز" [دە زاراوەی ناویندا: ڕان، گەلە] بەم وشە ژێرمەنییانە گرێ دراونەوە. لەوانەیە ↑شەڵغە şelġe "پوورە" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

گورج **gurc** [*gurj*] - "توند و تۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd و چەندین وشەی دیکە کە لە ژێر ↑کورسین *kursîn* دا هاتوون.

**گورجی gurcî** *[ gurjī ]* - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd. [ناوی نەتەوەی "گورجی"یش لە گورجستان دەشێ لەباری ئێتیمۆلۆژییەوە پێوەندی بە ناوی "کورد"ەوە هەبێ].

**گورچک gurçık** *[ gurčık ]* - "مایچەی بەلەک": پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە مانای "سەخت، توند، بەهێز" دەبەخشن، وەک ↑گورج gurc "توند و تۆڵ".

**گورچوو gurçu** *[ gurčū ]* - "ئەندامی پاڵاوتنی ئاوی لەش": گورچک gurçık و گورچیلە gurçîle ش دەگوترێ. دەبێ بنەوشەکەی گورچ -gurç بێ. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ گردە gorde (P.).

1- دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑گورد gurd و ↑گورج gurc ەوە هەبێ بە مانای "سەخت، پتەو". لەم پێوەندییەدا بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑گورچک gurçık "مایچەی بەلەک" و ↑گردک gırdık "ماسوولە، زیپەڕ". دەشێ "گورچوو" وەک ماسولکەیەک لەبەر چاو گیرابێ.

2- هەروەها دەکرێ هەڵی سەنگینین دەگەڵ ریشەی **(IE.) *neguhro-s <** "گورچوو". Niere (G.) و Nepfros (Gr.) "گورچک" دەبردرێنەوە سەر ئەم ریشەیە.

**گورخ gurx** - "قایم، پتەو": خزمە دەگەڵ ↑گورج gurc و ئەو وشانەی لە ژێر ↑کورسین *kursîn* دا هاتوون.

**گورد1 gurd 1** - "1- چابوک، ئازا 2- پاڵەوان 3- تاقەت، هێز 4- زەبر [گوردی خۆی لێدا]": گرد gord (P.) "پاڵەوان". خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd و ئەو وشانەی لە ژێر ↑کورسین *kursîn* دا هاتوون.

[تێبینی: لەنێوان دوو چەمکی "هێز" و "زەبر"دا پێوەندی نیزیک هەیە، چونکوو زەبر شێوەیەکە لە دەربڕین و بەکار هێنانی هێز. لەم بارەوە دەکرێ دوو خزمەوشەی "زەبر " و "زۆر" [واتا هێز] یان دوو خزمەوشەی "سەخت" و "زەخت" بە نموونە بێنینەوە کە هەر ئەم پێوەندییە دە نێویاندا لە ئارادایە].

**گورد2 gurd 2** - "دارێک کە دەخرێتە ناو رایەڵی تەون": خزمە دەگەڵ Gerte (G.)، gerta (OG.) "شووڵ، لقەدار، داردەست"، yard (E.) "داری پێوان". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کاریتە karîte "داری خانوو".

**گوردەم gurdem** *[ gurdam ]* - "حەشیمەت، ئاپۆرە": خزمە دەگەڵ ↑گورتل gurtıl "ئاپۆرە".

**گورز1 gurz 1** - "گۆپاڵی شەڕ":

1- لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "زەبر" بەکار هاتبێ و پێوەندی هەبێ بە ↑گورد1 gurd. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا چەمکی "سەختی و هێز" دەردەبڕێ. لەم مانایەوە دواتر مانای "زەبر" سەری هەڵداوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑گورد2 gurd "دارێک کە دەخرێتە ناو رایەڵی تەون". لەم تێڕوانینەوە "گورز" دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "داردەست، گۆپاڵ" بووبێ.

**گورز2 gurz 2** - "پەت و پەڕۆی بادراوی رەق بۆ کایە کردن": هەروەها گورزەهۆن gurzehon هەیە بە مانای "هۆندنەوەی گوریس بە سێ لۆیە" و ↑گۆرژاڵ gorjal "بەن سامۆرتە". خزمە دەگەڵ ↑گوریس gurîs.

**گورژاندن gurjandın** *[ guržāndın ]* - "گرماندن": شێوەی جەختکراو لە ↑گوڕڕاندن gurrandın.

**گورگ gurg** *[ gurg ]* - "جانەوەری دڕەندە": گرگ gorg (P.). خزمە دەگەڵ wolf (G.)، wulfs (Gt.)، ulv (Sw.)، vilkas (Lit.)، lykos (Gr.)، lupus (L.)، vrka (OIn.) " گورگ"، سەر بە ریشەی

< *ulkos- (IE.) "گورگ"، سەر بە ریشەی < *uel- (IE.) "هەڵدڕین، هەڵپچڕین" [دە زمانی کورد و فارسی دا فۆتیمی w/ v لەسەرەتای وشە کۆنەکەدا بووەتە g. دە زمانانی یۆنانی و لاتینیدا فۆتیمەکە هەر بە تەواوی سواوەتەوە و وشەکە بە فۆتیمی l دەست پێ دەکا].

**گورزە gurze** [ *gurza* ] - "1- باقەبێنی لێک بادراو 2- دەستەوارەیەک لە گیا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گوریس gurîs.

**گورمزین gurımzîn** [ gurımzīn ] - "بزە هاتنە سەر لێو": شێوەیەکی دیکە لە ↑گرنژین gırınjîn [فۆتیمی n گۆڕاوە بە m].

**گوڕنی gurnî** [ *gurnī* ] - "1- دەوەتێکە 2- گیای تازەرواو، شینکە 3- قووتەکە": خزمە دەگەڵ ↑گووران guran "رسکان، سەرهەڵدان"، سەر بە ریشەی < *ghre- (IE.) "چەکەرە کردن، سەرهەڵدان، سەوز بوون".

**گوڕنیک gurnîk** [ *gurnīk* ] - "بەن سامۆرتە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Garn (G.)، garen (Nl.)، yarn (E.)، garn (Sw.) "بەن، پەت". ئەسڵی مانای وشەکە "ریخۆڵە"یە. ئەم مانایە دە زمانە جۆراوجۆرەکاندا و هەروەها دە زمانی کوردمادیشدا پارێزراوە: chorde (Gr.)، hernia (L.)، žárna (Lit.)، gorn (OIs.) "ریخۆڵە"، mitti(a)garni (OG.) "بەزی ناو ورگ". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑قۆڕ qor ماوەتەوە کە بەو نەخۆشە دەگوترێ ریخۆڵەی لە شوێنی خۆی دەردەپەڕێ. دە زمانی پزیشکیدا وشەی لاتینی hernie بە مانای "قۆڕی" بەکار دەهێنرێ کە دەچێتەوە سەر وشە لاتینییەکەی سەرەوە. گۆڕانی مانای وشەکە لە "ریخۆڵە"وە بۆ "بەن، پەت، داو" لەوەڕا هاتووە کە دە سەردەمانی بەرێدا لە ریخۆڵەی هیشک کراو بەن و پەتیان دروست کردووە.

**گوروە gurwe** [ *gurwa* ] - "کار، خەبات": ↑گورە gure ش دەگوترێ و لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کار kar.

**گورۆ guro** - "بە گلوو داوەستان، دانار": گورۆ گورۆ guro guro واتا دانار دانار. خزمە دەگەڵ ↑زورەت zuret.

**گوڕەشە gureşe** [ *guraša* ] - دەگەڵ هەڕەشە دێ [هەڕەشە و گوڕەشە]. خزمە دەگەڵ غرش ġorreš (P.) "گوڕڕە". دەچێتەوە سەر ↑گوڕڕاندن gurrandın.

**گوریس gurîs** [ *gurīs* ] - "پەتی قەڵەو، بەندی ئەستوور و درێژ": شێوە کۆنترەکەی دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا ماوەتەوە و دەگوترێ وەریس werîs یان ڤەریس verîs. فۆتیمی w دە شێوەزاری تیوەراستدا بووەتە g. خزمە دەگەڵ ↑رستن rıstın "بادانی خوری و لۆکە و کردنی بە بەن".

**گۆڕێ gure** [ *gure* ] - "وشەیەکە بۆ لێک جیا کردنەوەی پەز": خزمە دەگەڵ ↑گۆڕی gorî "قوربان، سەدەقە" و ↑گوراندن gurandın "سەربڕین"، سەر بە ریشەی < *(s)ker- (IE.) "بڕین، لەت کردن، (لێک)جودا کردن".

**گوز guz** - دەگەڵ "گومبەت" دێ [گوز و گومبەت guz u gumbet واتا لەپڕ، کوتوپڕ]. خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قوت qut، ↑قۆچ qoç و وشەی دیکە بە مانای "هەڵتۆقاوی، قیتایی". وشەی گومبەت [گومبەز gumbez] یش دیارە هەر ئاماژە بە "هەڵتۆقاوی" دەکا و مەبەست لە"گوز و گومبەت" هەڵتۆقین و پەیدا بووتیکی خێرایە.

**گوزرە guzre** [ *guzra* ] - "باوەشێک گیا، باقەگیا": خزم دەگەڵ ↑گۆترە gotre.

گوزم **guzım** - "بارانی بە تەوژم": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەژان hejan دا ئاماژەیان پێ کراوە.

گوزوور **guzur** [ *guzūr* ] - "(رێگا)چارە": [لە ناگوزووری واتا لە ناچاری]. ناگزیر nagozīr (P.) "ناچار". گزیر gozīr (P.) دە فەرهەنگی فارسیدا وەسا مانا کراوەتەوە: "یارمەتی، رێگای دەرباز بوون، چارەسەری، دەرمان". مانای ئەم وشەیە دەشێ دە بنەڕەتدا "رێگای دەرباز بوون" بێ و لەمەوە دواتر ماناکانی دیکە سەرچاوەیان گرتووە. وشەکە پێوەندی هەیە بە ↑گوزەران guzeran "قەتان، رۆیشتن، بوورین". دە بنەڕەتدا مەبەست لە "گوزوور" هەر "گوزەر" بووە واتا دەرباز بوون. کەسی ناگوزوور ئەو کەسە بووە کە رێگەی دەرباز بوونی نەبووە و بە وتەیەکی دیکە لە بنبەستدا گیری کردووە.

گوزەران **guzeran** [ *guzarān* ] - "رۆیشتن، تێپەربوون، بوورین": mī-gozarad (P.) "دەگوزەرێ". دە زمانی فارسیدا gozašt هەم بە مانای "رابورد، تێپەڕی" دێ و هەم بە مانای "بەخشین، لێ بوورین". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کووچە kuçe دا باس کراون.

گوزی **guzî** [ *guzī* ] - گوزی دان guzî dan مانای "یەکبوون، یەکگرتن" دەبەخشێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*iugo*** ***(IE.)*** "لێکبەستن، تێکخستن، یەخە، نیر[ یوغ yūġ (P.)]" [ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی -*jeu** / -*ieu** *(IE.)*"لکاندن، بەستنەوە"]. چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون وەک ↑یەخە yexe، ↑ئەوک ewık "بەرۆک"، جوغز cuġz یان ↑جەغز ceġz "دایرە"، جۆخین coxîn "خۆیان"، ↑جووق cuq یان ↑جووخە cuxe "دەستە، کۆمەڵ". وشەی خونتا *خونتا* "دار و دەستەی لەشکری، هاوبەندی کۆمەڵێک سەرکردەی لەشکری" دە زمانە ئەورووپییەکاندا ریشەی لاتینی هەیە و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە.

گوژمە **gujme** [ *gužma* ] - "1- ئەندازەی زۆر 2- ئەندازەیەک لە پارە و هتد، مەبلەغ": دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*iugo*** ***(IE.)*** "لێکبەستن، تێکخستن، خستنە سەر یەک". ↑یوژنە yujne "قایشی جووت"، ↑یەغنی yeġnî "گیشەی گیا یان گەنم و جۆ"، ↑جوخین coxîn "خۆیان، خەرمان" لەم ریشەوە هاتوون.

گوژین **gujîn** [ *gužīn* ] - "لوور بوون، بە تەوژم لەسەرڕا هاتنەخوار، شیرجە لێدان": بڕوانە ↑گژ[5] gıj.

گوست **gust** - "قامک، ئەنگوست": گشت gışt یش دەگوترێ. [انگشت engošt (P.)].

1- لەوانەیە کورتکراوی ↑ئەنگوست engust بێ. انگشت angošt (P.) بەپێی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"( ل. 140) خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک angulus (L.) "گۆشە" وAngel (G.) "قوڵاپ"، سەر بە ریشەی **< -*ang**, -*ank**** ***(IE.)*** "خوار بوون، چەمانەوە".

2- ↑قۆچ qoç، ↑گووچ guç، ↑گۆشە goşe و چەندین وشەی دیکە بەمانای واتا "زەق و دەرپەریو".

[تێبینی 1: دەگەڵ وشەی "کلک" هەڵی سەنگینە کە مانای "ئەنگوست"یش دەدا و ئەویش خزمە دەگەڵ "کیل" بە مانای بەردی سەرگوڕ و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای"زەق و دەرپەڕیو بوون". تێبینی 2: لە لایەکی دیکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "قووچەکە" بە مانای "ئەنگوستیلەی درووومان". "قووچ" لە وشەی "قووچەکە"دا لەوانەیە ئاماژە بە "گوست"(ئەنگوست) بکا].

گوشاد **guşad** [ *gušād* ] - "فش، هەراو": گشاد gošād (P.)، wišad (MP.). وەک دەبینین وشەکە دە فارسی ناویندا "وشاد" بووە و دواتر گۆڕاوە بە "گوشاد". بەم جۆرە وشەکە خزمە دەگەڵ ↑فش fış و ژمارێەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "هەراوی، هەڵمساوی، باکراوی" دەکەن.

**گوشین guşîn** [ *gušīn* ] - شێوەیەکی تازەترە لە↑ گڤاشتن gıvaştın. کوشین kuşîn یش دەگوترێ.

**گوڤین guvîn** [ *guvīn* ] - "مەیین، توند بوونی شیر، بوونە ماست یان پەنیر": ↑گڤین gıvîn یش دەگوترێ. هەروەها ↑گڤی gıvî هەیە بە مانای "دەڵەمەی پەنیر". مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "سەخت بوون، سفت بوون" بێ. ئەم مانایە لە وشەکانی "مەیین، قەرسین، قەمرین"یشدا دەردەکەوێ کە ئاماژە بە "توند بوونی تراو" دەکەن و دە بنەڕەتدا "سەخت، پتەو" مانا دەدەن. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑کوپین kupîn "ئارام گرتن، هەدا دان"، ↑کپ kıp [قپ qıp، قرِ و ڤپ qır û qıp یان کرِ و کپ kır û kıp] "بێدەنگ و بێجووڵە، دە بنەڕەتدا: بێجووڵە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کەڤۆت kevot [کەوت kewıt] "دارێکی سەختی جەنگەڵی"، ↑سیپ sîp "تابشتی زۆر"، ↑سیڤە sîve "قەڵەو" و دواجار ↑سفت *sıft*. ئەم وشانەی خوارەوەش لەم چوارچێوەدا جێی لێکدانەوەن: ↑خەپە xepe "قەڵەو" [دە بنەڕەتدا: سەخت، ئەستوور، بەهێز]، ↑قەبە qebe "ئەستوور"، ↑خەفە xefe "بێدەنگ، بێجووڵە"، ↑خەفتان xeftan و ↑خپە xıpe کردن بە مانای "خۆ مات کردن لە شتێک" [جووڵە لە خۆ برِین] و هتد.

**گول gul** - "جوزامی": خزمە دەگەڵ ↑گرِۆ gıro "پێستی ئاوڵەدار، پێستی زبر و پرِ چاڵ و چووڵ".

**گوڵ gul** - "خونچەی پشکوتوو": گل gol (P.). وشەکە دە کۆندا -varda (OP.) بووە و دەشێ دە کوردمادی کۆنیشدا شتێکی لەم چەشنە بووبێ. وشەکە پاش چەند گوراتێکی فۆنۆلۆژیک، واتا گورانی فۆتیمی v بە g و تێداچوونی کەرتی -da بووەتە گوڵ. زمانی عەرەبی لە سەردەمانی زوودا وشە کۆنەکەی وەرگرتووە و هەر ئێستا دە زمانی عەرەبیدا بە گوڵ دەگوترێ وردة verde (Arb.). وا لێک دەدرێتەوە کە وشەی Rosa "گوڵی رۆز" دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر وشەکەی فارسی (و کوردمادی) کۆن. دە زمانی کوردمادی ئەمرِۆدا فۆرمی کۆنی وشەکە دە وشەکانی ↑ولی wılî "خونچە" و ↑وڵێو wılew "شۆخ و شەنگ"دا پارێزراوە [دە بنەڕەتدا: وەک گوڵ جوان، گوڵین]. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ Blume (G.)، bloma (Gt.)، bloem (Nl.)، blomma (Sw.) "گوڵ"، bloom (E.) "خونچە"، سەر بە ریشەی < **blo-* (IE.) "پشکووتن، کرانەوە" و ئەمەش دەچێتەوە سەر ریشەی < **bhel-* (IE.) "هەڵمسان، کرانەوە، فش و فۆڵ بوون". blühen (G.)، blow (E.) و هتد بە مانای "پشکووتن"، flos (L.) "گوڵ"، florere (L.) "پشکووتن، گوڵ کردن" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. ریشەی باسکراو یەکێک لەو ریشە سەرەکییانە کە دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا گەلێک لک و پۆی لێ دەبێتەوە و بە دەیان وشەی لێ دەکەوێتەوە، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا ↑فۆڵ fol [فش و فۆڵ]، ↑بلۆق bıloq، ↑باڵۆکە baloke و هتد.

**گوڵبێنە gulbene** [ *gulbena* ] - "کوتێکە لە بنەوەی تەنوور، باکێشی تەنوور": گوڵوێنە gulwene، کێلبە kelbe ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Kluft (G.)، cleft (E.) "قەڵش، درز، کەلێن"، klieben (G.)، chliuban (OG.)، cleave (E.)، klyva (Sw.) "قەڵشین، درز بردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < **gleubh-* (IE.) "کوتان، قەڵشاندن، برِین". glubere (L.) "توێکڵ کردن" و glyphein (Gr.) "بە ئەسکەنە کار کردن" لەم ریشەوە هاتوون. لەوە دەچێ وشەی "گوڵبێنە" سەرەتا شتێکی وەک **گلووبان gıluban** بووبێ و وەک کردار بەکار هێنرابێ.

**گوڵشەن gulşen** [ *gulšan* ] - "گوڵزار": گلشن golšan (P.). ↑گوڵ gul + شەن şen. کەرتەوشەی شەن -şen پێوەندی بە ↑چاندن çandın ەوە هەیە و بەم جۆرە مانای "گوڵشەن" دەبێتە شوێنێک کە گوڵی لێ چاندراوە.

گولم **gulm** - "پەنجەی قووچاو، مست": کولم kulm و گۆڵەمە goleme ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑گوڵم gulm "نەرمایی سەرسمت" و ↑کولم kulm "سەرگۆنا، ڕوومەت". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشەگەلێک کە ئاماژە بە خڕ و تۆپەڵە بوون دەکەن، وەک ↑گلوو gılu [گولوو gulu].

گوڵم **gulm** - "نەرمایی سەرسمت": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە خڕ و تۆپەڵە بوون دەکەن، وەک ↑گلوو gılu [گولوو gulu].

گوللە **gulle** *[ gulla ]* - "فیشەک": گلولە golūle (P.). بڕوانە ↑گلوو gılu.

گوڵنک **gulınk** - "بەلووکە، میتکە": گوڵنگ برین gulıng bırîn هەیە بە مانای "بڕینی میتکەی ماین": خزمە دەگەڵ ↑گلکێ2 gılık "میتکە". فۆتیمی n دە وشەکەدا زێدەیە.

گولیڤک **gulîvk** *[ gulīvk ]* - "گوڵینگەی شەدە و پێچی سەر": بڕوانە ↑گوڵینگ(ە) gulînge.

گوڵینگ(ە) **gulînge** *[ gulīnga ]* - "پرزەی لێک بەستراوی سەرقرتاو بۆ جوانی": گوڵنگ gulıng یش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- هێندێک وشە کە ئاماژە بە خڕ و تۆپەڵە بوون دەکەن، وەک ↑*گڵۆڵە gılole*، ↑گوللە gulle، ↑گلۆپ gılop و هتد. لەم پێوەندییەدا هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گۆلڤند golvınd "تۆپی لە پەڕۆ چنراو بۆ کایە" و هەروەها وشەیەکی دیکە کە بە مانای "گوڵینگ(ە)" بەکار دەهێنرێ، واتا ↑گولیڤک gulîvk. ئەم وشەیە دەگەڵ وشەکانی لەچەشنی گلۆپ gılop باشتر یەک دەگرێتەوە.

2- ↑گوڵ gul، واتا ئەو شتە کە بۆ ڕازاندنەوە بەکار دێ، وێنەکەی بە "گوڵ" شوبهێنراوە.

گوم **gum** - "نادیار": گم gom (P.). دە زمانی ئاخاوتنی فارسیدا جیم jīm (P.) یش بەکار دێ (جیم شدن). دەشێ پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی **< *kem- (IE.)** "داپۆشین، لێهاڵاندن". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑جامە came دا باس کراون.

گومان **guman** *[ gumān ]* - لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قەمی qemî "ئەشێ، وێ دەچێ".

گومبەز **gumbez** *[ gumbaz ]* - "تاق و سەربانی خڕ و زۆپ": گنبد gonbad (P.). [فۆتیمی n دە کوردمادیدا بووەتە m]. دەچێتەوە سەر ڕیشەی **< *gen- (IE.)** "تۆپەڵەبوون، ڕێکگوشران، وێک هاتن". گەلێک وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ڕیشەوە هاتوون، وەک ئەوانەی لەژێر ↑گوتتک guntık "تۆپەڵەهەویری چکۆڵە"دا نووسراون.

گومتل **gumtıl** - "کلۆی چکۆڵە": [گومتلێک قەندم بدەیە]. هەروەها ↑گومتیل gumtîl هەیە بە مانای "لوو، غوددە": خزمە دەگەڵ ↑سمتە sımte [سمتەگڵ] و دواتر ↑*زەمۆمە zemome*.

گومتیل **gumtîl** *[ gumtīl ]* - "لوو، غوددە": بڕوانە ↑گومتل gumtıl.

گومساندن **gumsandın** *[ gumsāndın ]* - "شێلانی قوڕ و هەویر": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی **< *kem- (IE.)** "بە تامان یان پەرژین دەور گرتن، *ڕێکگوشین*". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سمتە sımte [سمتەگڵ] و دواتر ↑*زەمۆمە zemome*.

گومگوم **gumgum** - "1- دەنگی ڕۆیشتنی ئاو 2- وزەوزی مێش": خزمە دەگەڵ ↑گماندن gımandın.

گومگومین **gumgumîn** *[ gumgumīn ]* - "گرماندن": خزمە دەگەڵ ↑گماندن gımandın.

گوملک **gumılk** *[ gumīlk ]* - "کراس": خزمە دەگەڵ ↑جامە came.

گومنی **gumnî** *[ gumnī ]* - "دەنگ دانەوە": خزمە دەگەڵ ↑گماندن gımandın.

گومەتە **gumete** *[ gumata ]* - "باز بردنی ئاژەڵ": گومەڵەک gumelek یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جمین cımîn "بزوان".

گون **gun** - "ئەندامی تۆم ساز کردنی تیرینە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- gone (Gr.) ”تۆم، بەرهەم هێنان“.

2- ↑گوان guwan و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە ”خڕەکە بوون، تۆپەڵە بوون“ دەکەن. هەر لەم پێوەندییەدا هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گونۆڵە gunole ”گلۆڵەبەن“ یان ↑گونک gunk تۆپەڵەهەویری چکۆڵە“.

**گوناح gunaħ** [ *gunāħ* ] - ”خراپە، تاوان“: گناه gonāh (P.)، جنحة junħa (Arb.) لە گوناح وەرگیراوە. فۆتیمی کێ دە زمانی عەڕەبیدا بووەتە ج. وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ Sünde (G.)، sunta (OG.)، zonde (Nl.)، sin (E.) ”گوناه“. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. بەگوێرەی بۆچوونێک لەوانەیە بچێتەوە سەر son, sontis (L.) ”تاوانبار“.

**گونایش gunayış** [ *gunāyıš* ] - ”وێککەوتن، لەش وە لەش کەوتن“: خزمە دەگەڵ ↑گنایەنە gınayene ”وێککەوتن“ و دواتر دەگەڵ ↑ژەندن *jendın* و ↑کەندن[2] kendın.

**گونتک guntık** - ”گونک، تۆپەڵەهەویری چکۆڵە“: گندک gındık یش دەگوترێ. هەر لەم پێوەندییەدا چەند وشەی دیکەش هەن کە دەکرێ پێکەوەیان گرێ بدەین، وەک ↑گندۆرە gındore ”کاڵەک“، ↑گونتۆڵە guntole ”جۆرێک ترێ“، ↑گوندەڵە gundele ”کفتە“، ↑گنتەڵ gıntel و هەروەها ↑گوندە gunde ”قەڵەو“ [گندە gonde (P.)]. ئەم دەستە وشەیە خزمایەتی پەیدا دەکا دەگەڵ چەندین وشەی دیکەی وەک ↑کوند kund [کوندەبەبۆ واتا ”بەبۆ“ی قەڵەوە، قوڵەخڕە]، ↑کوندر kundır ”کوولەکە“، ↑قۆندەرە qondere [پێڵاوی *قۆن* دار]، ↑*قوتیر quner* ”کوان“ و هتد. ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە ”زۆپایی، خڕایی، دەرپەڕیوی خڕ، قوڵەخڕە بوون، قەڵەوە بوون“.

**گونتۆڵە guntole** [ *guntola* ] - ”جۆرێک ترێ“: بڕوانە ↑گونتک guntık ”تۆپەڵە هەویر“.

**گونج gunc** [ *gunj* ] - ”1- بەردی کون کە دە جێگەی ئاوبەردانی ئەستێرک دەگیرێ 2- کونی بن دۆڵاش“: گۆنکێ(ە) gong(e) و گۆنجە gonce ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کونج[1] kunc و ↑کونج[2] kunc.

**گونجان guncan** [ *gunjān* ] - ”لەباربوون، دە بنەڕەتدا چوونە ناو شتێک و جێ بوونەوە دە وێدا“: خزمە دەگەڵ ↑ گنج gınc.

**گونجەزەردە guncezerde** [ *gunjazarda* ] - ”زەردەواڵە، زەرگەتە“: هەروەها گونجەسورخە guncesurxe و گونشێر gunşêr هەن بە مانای ”ژەنگەسوورە“. کەرتەوشەی گونج(ە)- gunc(e)- خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گونایش gunayış ”وێککەوتن، لەش وە لەش کەوتن“، ↑گنایەنە gınayene ”وێککەوتن“، دواتر دەگەڵ ↑ژەندن *jendın* و ↑کەندن[2] kendın. مانای بنەڕەتی ئەم وشانە ”لێدان“ە. وشەکانی ↑ژەنگەسوورە jengesure و دە زمانی فارسیدا زنبور zanbūr (P.) پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**گوند gund** [ *gund* ] - ”دێ، ئاوایی“: کەند kend یش دەگوترێ. جێی بەراورد کردنە دەگەڵ contrata (L.). ئەم وشەیە دە زمانی ئاخافتنی لاتینیدا بە مانای ”دەڤەر، ناوچە، مەڵبەند“ بەکار هاتووە و دە فەرانسەییدا بووەتە contrée (Fr.) ”دەڤەر، بەرجەوەن“. ئەم وشە لاتینییە دەچێتەوە سەر contra (L.) ”بەرانبەر، رووبەروو“. دە بنەڕەتدا مەبەست شوێن یان زەوییەک بووە کە لەبەرچاوی مرۆڤە. وشەی country (L.) ”وڵات، سەرزەمین“ لەم وشە لاتینییە وەرگیراوە.

**گوندە gunde** [ *gunda* ] - ”قەڵەو“: گنتەڵ یش دەگوترێ. بڕوانە ↑گونتک guntık ”تۆپەڵەهەویر“.

**گوندەڵە gundele** *[ gundala ]* - "کفتە": بڕوانە ↑گونتك guntık "تۆپەڵە هەویر".

**گونك gunk** - "تۆپەڵەهەویری چکۆڵە": دە فارسیدا بەو شتە دەگوترێ چونە čūne (P.) کە ئەمەش پێوەندی بە چەنە [چەنەگە] وە هەیە، واتا تۆپەڵەهەویرەکە بە "چەنەگە" چوێنراوە. دە وشە کوردمادییەکەشدا هەر هەمان شێوە ڕەچاوکراوە و وشەکە دەچێتەوە سەر ↑گونا gona کە ئەمیش خۆی پێوەندی بە ↑چەنە çene وە هەیە. وشەی "چەنە" دەچێتەوە سەر ڕیشەی *(IE.)* ***ĝenu-** <* "چەنە".

[تێبینی: ئەم ڕیشەیە وێ دەچێ خۆی لە ڕیشەیەکی دوورترەوە پەیدا بووبێ، واتا ڕیشەی < *(IE.) *gen-* "ڕێکگوشران، تۆپەڵە بوون، پێکەوەنووسان". گەلێك وشە دە زمانی کورمادیدا لەم ڕیشەوە هاتوون کە ژمارەیەکیان لەژێر ↑گونتك guntık "تۆپەڵەهەویری چکۆڵە"دا باس کراون.

**گونگ gung** - "گیای بژار": لەوانەیە پێوەندی بە کەندن[1] kendn [هەڵکەندن]ەوە هەبێ و مەبەست ئەو گژ و گیایە بێ کە هەڵدەکەنرێ.

**گونۆڵە gunole** *[ gunola ]* - "گلۆڵەبەن": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قوتیر quner دا باس کراون.

**گونە gune** *[ guna ]* - "کورتەباڵای خڕکەڵە": هەروەها گونەتوڵە gunetule هەیە بە مانای "قەیسی" و گونەسوورە gunesure بە مانای "تەماتە". "گونە" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "خڕکەڵە بوون، تۆپەڵەبوون" دەکا و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*قوتیر quner* دا باس کراون.

**گوەل guwel** *[ guwal ]* - "1- گوڵ 2- کونی دیوار بۆ دیدەوانی":خزمە دەگەڵ↑ گۆل gol "ئەستێرك، دەریاچە". وشەکە ئاماژە بە کون و کەلێن، قوڵکە و قووڵایی دەکا.

**گوهتیل guhtel** *[ guhtel ]* - "جەنگەی تێبەر بوونی ئاژەڵەکێوی": گوهێر guher یش دەگوترێ. هەروەها ↑گۆهن gohın [گۆن gon] "وە با هاتنی بزن و مەڕ" هەیە. ئەم وشانە لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑*گان gan* [کۆنتر: گاتەن]، سەر بە ڕیشەیەك بە مانای "جووت بوون، یەکانگیر بوون، تێك بەزین".

**گوهن guhın** - "تافی لاوی، هەڕەتی جەوانی": گۆنڵ gonıl و گونەل gunel یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جەوان cewan.

**گوێ guwe** *[ guwe ]* - "ئەندامی پێ بیستن": گۆش goş و گوە goh یش دەگوترێ. گوش gūš (P.). ئەو وشانەی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا و هەروەها زمانی یۆنانی و لاتینیدا بە مانای "گوێ" بەکار دێن، دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.)* ***ōus** - <* "گوێ"، بۆ وێنە Ohr (G.)، oūs (Gr.)، auris (L.). لەوە دەچێ وشە کوردمادییەکەش لەم ڕیشەوە هاتبێ و هێندێك گۆڕانی بەسەر داهاتبێ.

**گوێچ guweç** *[ guweč ]* - "1- بەش، پارە 2- پارە یان جگێ کە لە کایە دادەکرێ": دەشێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*زەق zeq* دا باس کراون، خزم بێ. ↑گۆشە goşe و ↑سووچ suç یش لەناو ئەم دەستە وشەیەدا جێ دەگرن. ئەم وشانە بەگشتی ئاماژە بە دەرپەڕین، قوت بوون، هەڵتۆقین، زەق بوون دەکەن. "گوێچ" دەبێ پێشتر "گۆچ" بووبێ و بەو شتە زەق و دەرپەڕیوانە گوتراوە کە لەسەر هەرد داکراون بۆ نیشانە تێگرتن و ئەنگاوتنیان. مانای دووەم دواتر پەیدا بووە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑گوێچك goeçık.

**گوێچك guweçık** *[ guwečık ]* - "سووچ، گۆشە": [گوێچکی جەواڵەکە بگرە]. ئاشکرایە لەم ڕستەیەدا "گوێچك" ناتوانێ بە مانای "گوێ، گوێچکە" بێ، چەنکوو جەواڵ نە چاوی هەیە نە گوێ! "گوێچك" لێرەدا پێوەندی بە ↑گوێچ goeç ەوە هەیە و ئەمەش خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە

↑گۆشە *goşe*. کەوابوو مانای "گوێچکی جەواڵ" چیتر نییە جگە لە "گۆشەی جەواڵ". ئەم پێوەندییە لە وشەی ↑گوێسوانە goesuwane شدا بەدی دەکرێ.

**گوێر1 guwer 1** [ *guwer* ] - "جۆر": گور(ە) gor(e) یش دەگوترێ [بەگوێرە یان لەگۆر]. بڕوانە ↑جۆر cor.

**گوێر2 guwer 2** [ *guwer* ] - "1- کونی بەرداش 2- پڕدەستێک بە قووڵکراوی": ↑گوێل guwel یش دەگوترێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گۆڵ gol.

**گوێرەکە guwereke** [ *guweraka* ] - "گوێلک": ↑گوێلک guwelık.

**گوێز guwez** [ *guwez* ] - "بەری دارێکە": گووز guz یش دەگوترێ. جوز joz (.P) [دە زمانی فارسی ئەمڕۆ دا گردو gerdū]. خزمە دەگەڵ ↑گوێژە goyje و ↑گۆ go.

[تێبینی 1: وشەی "گردو"ی فارسی پێوەندی بە "گرد"ەوە هەیە. تێبینی 2: وشەی جوز joz (.P) ی فارسی وشەیەکی عەرەبێنراوە، واتا کراوە بە عەرەبی (گۆڕانی فۆتیمی گ بە ج) و دواتر شێوە عەرەبێنراوەکە هاتووەتەوە ناو زمانی فارسی].

**گوێزینگ guwezîng** [ *guwezīng* ] - "زۆپایی ئێسکی پێ": گوێزەک guwezek یش دەگوترێ. قوزک qūzak (.P).خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "خڕ بوون، چەماوە بوون" دەردەبڕن، وەک ↑گوێز guwez [گووز guz ]، ↑گوێژە goyje، ↑گۆ *go* و گووژ žūj (.P) "چەماوە" [گوژپشت واتا پشت کووڕ].

**گوێزان guwezan** [ *guwezān* ] - "تیخی موو تاشین": گووزان guzan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کووز kuz، ↑کوت kut، ↑قاش qaş، ↑گاز gaz و هیتر سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**گوێسوانە guwesuwane** [ *guwesuwāna* ] - "پاسارە": گوێسەبانە goesebane ش دەگوترێ. ئەمەیان شێوەی پێشووتر و دروستتری وشەکەیە، پێک هاتووە لە دوو کەرتەوشەی گوێس(ە) و بان(ە) goes(e) + ban(e). کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑گوێچک goeçık "سووچ، گۆشە" و کەرتی دووەمیش ↑بان ban واتا "سەربان"ە. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "سووچ یان گۆشەی سەربان" یان بە وتەیەکی دیکە قەراخی سەربان. شیاوی باسە وشەی "قەراخ"یش هەر وەک وشەی "گۆشە" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زەق و دەرپەڕیو بوون".

**گوێل guel** [ *guel* ] - "1- کونی بەرداش 2- پڕ دەستێک بە قووڵکراوی": گوێر guer ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گۆڵ gol "ئەستێرک، دەریاچە"، ↑گۆڕ gor و دواجار ↑کون *kun*.

**گوێلاک guwelak** [ *guwelāk* ] - دەگەڵ "سەر" دێ [سەر و گوێلاک ser u guwelak]. دەگەڵ ↑کەلاک *kelak*، ↑لێک lek، ↑لاک lak و دواتر ↑لەش laş. گوێلاک دەبێ بە مانای "لەش، تەن" یاخود "شێوە و شکڵ و پێکهاتە" بێ. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "سەر و سەکوت". سەکوت مانای "شکڵ و شێوە" دەدا.

**گوێلاندن guwelandın** [ *guwelāndın* ] - "کەم کەم گوان بە گوێلک مژاندن بۆ شیردانی چێل": ↑گوێرەمە goereme ش دەگوترێ. وشەکە پێوەندی بە "گوێلک" و "گوێرەکە"ەوە نییە. لێکچوونی ئەم وشانە تەنیا رووالەتییە. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*guer (.IE)** "هەڵ لووشین، بە گەروودا بردنەخوار، قوت دان" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەڕوو geru، ↑قورگ qurg و↑قووڕاندن qurandın [هەڵقووڕاندن].

**گوێلپار guwelpar** [ *guwelpār* ] - "گوێلکی پار": ↑گوێلک guwelık و ↑پار par.

**گوێلک guwelık** [ *guwelık* ] - "بێچووی مانگا": گۆلک golık یش دەگوترێ و ئەمە شێوەی کۆنتری وشەکەیە. خزمە دەگەڵ Kalb (.G)، chalp (.OG)، calf (.E)، kalv (.Sw)، kalbo (.Gt)

بە هەمان مانا. ئەم وشانە گرێ دەدرێن بە -garbah (.OIn) و gere-bus (.Av) "منداڵدان، منداڵی ناوسک". دەشێ وشەی ↑گوێرەکە (guwer(eke ش [کۆنتر: goreke] پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ. لەوانەیە وشەی ↑کورkur و ↑کار kar یش پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**گوێن guwen** [ *guwen* ] - "جۆر، گور، وەک": ["لەگوێن" واتا "لە گور، بەگوێرەی، لەجۆری]. کۆنتر: gon. دە زمانی فارسیدا گون(ە) (gūn(e) (.P) "جۆر، رەنگ" مانا کراوەتەوە، هەروەها خزمە دە زمانی فارسیدا دەگەڵ گوناگون gūnagūn (.P) "جۆراوجۆر" و پاشگری گون -gūn (.P) بە مانای "مینا، وەک، لە رەنگی" [گندمگون gandomgūn (.P) "وەک گەنم، گەنم ڕەنگ"]. دە زمانی فارسیدا پاشگرەکە بە شێوەی سان -san (.P) یش دەبیندرێ. [بۆ وێنە: گربەسان gorbesān "لە جۆری پشیلە، لە تیرەی پشیلە"]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑چەشن çeşın [چە çe + شن şın] دەچێتە ناو ریزی ئەو وشانەوە. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ zan (.Pl)، kind (.E) "جۆر، جینس"، Kind (.G) "زارۆک"، kind (.OIs) "جینس، ڕەچەلەک"، kundr (.OIs) "کوڕ، خزم"، génos (.Gr)، genus (.L) "جۆر، *جینس*، تیرە"، سەر بە ریشەی **< -*ĝen** *(.IE)* "زان، بە دونیا هێنان". دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑زان zan "بەدونیا هێنانی زارۆک"، ↑ژن jın، ↑زارۆک zarok، ↑کەندۆ kendo "پارێن" و هتد. دیسان شیاوی باسە کە وشەی جنس jins (.Arb) لە وشە یۆنانی یان لاتینییەکە وەرگیراوە، چونکە فۆتیمی کۆتایی s تایبەتە بەم دوو زمانە و فۆتیمی g ش هەروەک دە زمانی عەڕەبیدا باوە، کراوەتە ج c.

**گوێنی guwenî** [ *guwenī* ] - "دەوەتیکە": گەوەن gewen یش دەگوترێ. گون gavan (.P). خزمە دەگەڵ ↑گی gî "شیرەی دار، جەوک، جیوە[2]".

**گووپ gup** [ *gūp* ] - "بۆشایی لاشەویلکە": گوب gub یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑گووڤ guv "کونی جانەوەری کێوی" و ↑کەپۆ *kepo*. ئەم وشانە ئاماژە بە "قووڵکە، کون و کەلێن، قووڵایی، هەڵۆڵ بوون" دەکەن.

**گووچ guç** [ *gūč* ] - "گۆشە": شێوەیەکی دیکە لە↑ گۆشە gûşe.

**گوو1 gu 1** [ *gū* ] - "پیسایی": خزمە دەگەڵ ↑کوود kud [کووت kut].

**گوو2 gu 2** [ *gū* ] - "تەڕایی (ترشح)": [گووی گوێ guy goe "چڵکی گوێ" یان گووی خودکار (و خودنڤیس) guy xudkar [خودکارەکە گووی کردووە]. خزمە دەگەڵ ↑گی gî "شیرەی دار، جەوک، جیوە، جەوهەر".

**گوور gur** [ *gūr* ] - "گوێلک": شێوەی دیکە لە ↑گۆڵ[3] gol [گا و گوڵ] و ↑گوێرەکە guwereke.

**گووراسن gûrasın** [ *gūrāsın* ] - "خۆڵەکەوەی پێکەوەنووساوی رەق لە تەنووردا": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گرسە *gırse* [قورسە qurse]، ↑قورس qurıs و ↑کورسین kursîn "قایم بوون".

**گووران guran** [ *gūrān* ] - "1- رسکان، سەرهەڵدان 2- پێگەیشتن، کامڵ بوون": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گەڵا gela و هەروەها ↑گیرانی geranî "بالغ بووگ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چرۆ دەرکردن، چەکەرە کردن، هەڵدان، گەورە بوون".

**گووزان guzan** [ *guzan* ] - "چەقۆی سەر و ردێن تاشین": گوێزان guwezan و گیزان gezan یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑کووز kuz، ↑کوت kut، ↑قاش qaş، ↑گاز gaz و هیتر سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

گووسک **gusk** [ *gūsk* ] - "پارچەی برین پێچان، تەنزیل": ئەم وشەیە لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکایش، وەک Gaze (G.). دەشێ پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشەی وەک ↑کەژین kejîn "تەنراوی ئاوریشمین".

گووشە **gûşe** [ *gūša* ] - "هێشوو": شێوەیەکی دیکە لە↑ هێشوو hêşû و خزمیشە دەگەڵ ↑گیشە gîşe.

گووڤ **guv** [ *gūv* ] - "کونی جانەوەری کێوی بۆ خۆ حەشار دان": هەروەها ↑گۆڤ gov هەیە بە مانای "ئاغەل". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کون *kun*.

گۆ **go** - "خڕۆک، زۆپ": گوی gūy (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک Kugel (G.) "تۆپ، گۆ، گوللە"، Keule (G.) "گۆپاڵ"، kauern (G.) "خۆ لە شتێک مات دان" [هەڵترووشکان، خۆ چەماندنەوە و خۆ نەدیو کردن]، Kobe (G.) "پەچەی بەرازان"، Kote (G.) "دیوەلکە" [دەبنەڕەتدا: قووپاوی هەرد، کۆختە؟]، gōla-h (OIn.) "گۆ"، gyrós (Gr.) "خڕ، گرد". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *geu- >** "خوار بوونەوە، با دران، چەمانەوە، هەڵتۆقین، قووپان". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە پێوەندی بەم ریشەوە پەیدا دەکا، بۆ وێنە ↑گوێز guwez،↑ گوێزینگ guwezîng، ↑گۆیژە goyje یان گێوژ gêwıj، ↑ئەنگوتک engutık [ئەن + گوتک]، ↑گۆک gok یان گەوک gewk "خونچەی دار"، ↑کۆک kok و هتد.

گۆبارە **gobare** [ *gobāra* ] - "گاگەل، گەلەی گا و گامێش": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑گەواڵ gewal "دەستە، کەرتە".

2- چەند وشە کە مانای "زۆر و زەوندی" دەردەبڕن، وەک ↑قۆپی qopî "بێشە".

گۆپاڵ **gopal** [ *gopāl* ] - "داری سەرخڕ کە لە کۆندا ئامرازی شەڕ بووە": کوپال kūpal (P.). کۆپار kopar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑کووپە kupe، ↑کوپانە kupane "زەقایی ملی گا"، ↑کۆپەرە kopere "ئەستوورایی، قوتر"، ↑گێپەر *geper* "ئەستوورایی"، ↑گۆپکە gopke، ↑قوببە qubbe، ↑قۆپچە qopçe و ↑قوب qub، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە، خڕ بوون، زۆپ بوون".

گۆپکە **gopke** [ *gopka* ] - "گۆیەکی بچووک، خڕێکی بچووک": خزمە دەگەڵ ↑قوب qub.

گۆپیتە **gopîte** [ *gopīta* ] - "چرۆی تازە سەرهەڵداو": خزمە دەگەڵ ↑قوب qub. گۆپیتە دە بنەڕەتدا ئەو گوپکە چکۆڵەیە لەسەر لکی دار سەر هەڵدەدا و دەبێتە چرۆ.

گۆتاڵ **gotal** [ *gotāl* ] - دەگەڵ "گا" دێ [گا و گۆتاڵ ga u gotal]. وەک cattel (E.) "ماڵات" دەچێتەوە سەر chatel (OF.) و لەوێشەوە capitāle (L.) "سامان، سەرمایە".

گۆترە **gotre** [ *gotra* ] - "تێکڕا": لە گۆترە le gotre واتا "تێکڕا، بەسەر یەکەوە". خزمە دەگەڵ gather (E.)، gaderian (OE.)، gatern (MG.) "خڕ کردنەوە، کۆ کردنەوە، وەسەر یەک نان" و together (E.) "پێکەوە". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کترم kıtrım "بەگشتی، تێکڕایی" بەکار دێ. جێی سەرنجە کە دە وشەی ئینگلیزی together دا پرێپۆزیسیونی to بە وشەکەوە لکاوە و دە زمانی کوردیشدا پرێپۆزیسیونی لە le ئەم دەورە دەلەیزێ.

گۆترەکین **gotrekîn** [ *gotrakīn* ] - "دەم کردنەوەی خونچە": گۆترەکان gotrekan یش دەگوترێ. لەوە دەچێ شێوەی کۆنتری وشەکە گەبترەکین *gebtırekîn** بووبێ. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep "دەم" و دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *ĝebh-, *ĝeph- >** "دەم، دەم داپچڕین" و دواجار ببێتە خزم دەگەڵ ↑کون kun. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ترکیدن

tarakīdan (.P) و ↑تەقین taqîn. مانای ئەم وشانە دە بنەڕەتدا لێک جودا بوونەوە و لەبەر یەک بڵاو بوونە. بەم چەشنە مانای "گۆترەکین" دەبێتە "لێک جودا کردنەوەی دەم(ی خونچە).

**گۆج goc** [ *goj* ] - "دەست خوار، لاق خوار": گۆد god یش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑گۆ go "خڕۆک، زۆپ"، سەر بە ریشەی **< (.IE) *geu-*** "خوار بوونەوە، با دران، چەمانەوە".

1- ↑گێژ gej و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "چەمانەوە و سووڕان" دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەی **< (.IE) *keu-** "چەمانەوە".

**گۆجاک gocak** [ *gojāk* ] - "دوگمە، قۆپچە": خزمە دەگەڵ ↑کووژەکە kujeke سەر بە ریشەی **< (.IE) *keu-** "چەمانەوە".

**گوجەر gucer** [ *gujar* ] - "لەڕ و لاواز": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەژار hejar.

**گوجی gucî** [ *gujī* ] - "یەخە": گوجو gucu ش دەگوترێ. هەروەها گۆجە goce هەیە بە مانای "بەندی بەرۆک". ئەم وشانە شێوەیەکی دیکەن لە ↑یەخە yexe و دەچنەوە سەر ریشەی **< (.IE) *ieu-, *jeu-** "لکاندن، بەستنەوە".

**گۆچ goç** [ *goč* ] - "لەش داماڵین بە چەوری": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑گوشین guşîn.

**گۆچان goçan** [ *gočān* ] - "داردەستی سەرخوار": خزمە دەگەڵ ↑کاشۆ kaşo.

**گۆد god** - شێوەیەکی دیکە لە ↑گۆج goc.

**گۆدە gode** [ *goda* ] - "لەشی مرۆڤ": خزمە دەگەڵ ↑قەد qed، ↑گەت get [کەڵەگەت] و ↑گەدە gede و چەند وشەیەکی دیکە.

**گۆڕ[1] gor** - "قەبر": خزمە دەگەڵ ↑گۆڕ[3] gor "دەشت، نزمانی".

**گۆڕ[2] gor** - "چەشن، جۆر": دەشێ شێوەیەکی دیکە لە ↑جۆر cor بێ.

**گۆڕ[3] gor** - "دەشت، ئارا": گوهۆڕ guhor یش دەگوترێ. گوور gūr (.P). [لە گۆڕێ بوون واتا لە ئارادا بوون، لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ to take place (.E) "روودان، هاتنەگوڕ، هاتنەئارا]. ↑گەوەر[1] gewer یش دەگوترێ بە مانای "دەشتی پان و بەرین". جگە لەمە گەوران gewran هەیە کە ناوی دەشتێکی پان و بەرینە لە لای شاری ئامێد. وشەی "گەوەر" هەڵ سەنگینە دەگەڵ کویر kavīr (.P) "دەشتی شۆرەکات". بە سەرنج دان لەم وشانە دەدەکەوێ کە "گەوەر" دەبێ شێوەی پێشووتری وشەی "گۆڕ" بێ و دواتر بووبێتە گۆڕ [لە باری فۆنۆلۆژییەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "زۆر" کە پێشتر "زاڤەر" بووە، یان "کۆن" کە پێشتر "کاپەن" بووە]. مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە دەبێ "قووڵایی" بووە، واتا شوێنێک کە لەچاو شوێنە بەرزەکان دە قووڵ دایە، شوێنێک کە کەوتووەتە داوێن و بناری چیاکانەوە. وشەکە سەر بەو خێزانەوشەیە کە باس لە "قووڵایی، زار داپچڕین، ڤالایی، بۆشایی، کون و کەلێن" دەکا. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑گەوەر[2] gewer یان ↑گابار gabar بە مانای"قەڵشە شاخ، قووڵایی دەناو شاخدا"، ↑خابوور xabur [چەمی خابوور واتا چەمی قووڵ] و ↑گۆڕgor "قەبر" و هتد. لێرەدا دەتوانین بێژین کە قبر qabır (.Arb) [دە ئەسڵدا gabır واتا قوڵکە، چاڵ] شێوەی کۆنتری وشەی گۆڕ gor ە و لە سەردەمانی کۆندا چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە "قەبر" و هەر بەم شێوەیەش تا ئەمڕۆ دە زمانی عەرەبیدا ماوەتەوە و تەنانەت بە وشەیەکی عەرەبی لە قەڵەم دەدرێ. نموونەی ئەم چەشنە گۆڕانکارییە زۆرە و دە توێی ئەم لاپەڕانەدا بە دەیان جار تووشی دەبین. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر وشەکانی سەرەوە و چەندین وشەی هاوپێوەند بڕوانە ↑کون *kun*.

گۆران **goran 1** *[ gorān ]* - "هۆزێکی گەورەی کورد": گووران guran یش دەگوترێ. هەروەک لەژێر وشەی "سۆران"دا باس کراوە، ئەم وشەیە، واتا سۆران، پێوەندی هەیە بە وشەی *زۆر* "هێز، زەخت". نەک هەر ئەم وشەیە، بەڵکوو ناوی زۆرینەی هۆز و مەڵبەندە کوردمادییەکان پێوەندییان بەم ریشانەوە هەیە کە مانای "سەخت، پتەو، بەهێز" دەردەبڕن. کەوابوو خۆزاییە ناوی "گۆران" [گووران]یش پێوەندی بەم چەمکەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە وشەی ↑گوڕ gur "هێز، تین و توان".

[تێبینی: "گۆران" لە فەرهەنگدا وەک "دێهاتی، رەعیەت" و "هەروەها "چەتە، رێگڕ"یش مانا کراوەتەوە. لێرەدا دەبێ ئاماژە بە خاڵێکی نەرێنی بکەین کە دەگەڕێتەوە سەر کولتووری هۆزەکی کوردەکان لە رابردوودا. بەگوێرەی ئەم داب و نەریتە نادروستە دانیشتووانی شارەکانی "سۆرانی" ئاخێو خەڵکی ناوچەکانی دیکەی کوردستانیان کە بە زاراوەیەکی دیکە ئاخەڤیون، بە "دیهاتی، لادێیی" لە قەڵەم داوە، بۆ وێنە لە مەهاباد وشەی "کرمانج" هاومانای "لادێیی" بەکار دەهات. دیارە وشەی "گۆران"یش هەر بەم شێوەیە مانای "لادێیی" وەرگرتووە. هۆی ئەمە دەشێ بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە سۆرانییە شارنشینەکان لەبەر تێنەگەیشتن لە زاراوەی خەڵکی کرمانج یان گۆران، ئەوانیان وەک "لادێیی" سەیر کردووە. بەڵام سەیر کردنی هۆز و شێوەزارەکانی کورد بە چاوێکی نزم تەنیا لای سۆرانی یان موکریانییەکان باو نەبووە و لەوە دەچێ دیاردەیەکی هەمەگر بووبێ. لە بیرمە کاتێک 18-19 ساڵم بووە، بۆ یەکەم جار لەگەڵ برادەرێکی خۆشەویستم کە مامۆستای دێیەک بوو، چوومە ناوچەی شکاکان و دووسێ رۆژێک لە دێیەکی خونجیلانە مامەوە. ئەوسا بە پێچەوانەی برادەرەکەم، زۆر کەم لە شێوەزاری سەروو تێ دەگەیشتم و ئەوەش وای دەکرد کە زۆرجار پیاوانی ئاوایی لە دیدارەکاندا بە پێکەنین و گاڵتەوە بە منیان دەگوت "کورکورە". واتا ئەم ناوە ئاماژە بوو بە "غەیرەشکاک" و هاوکات لە روانگەیەکی نزم بینانەوە دەگوترا. دیارە ئەم وشەیەش خۆی لەباری ریشەوە پێوەندی بە "گووران"ەوە هەیە].

گۆران **goran 2** *[ gorān ]* - "لەوەرگە": خزمە دەگەڵ ↑چەرین çerîn "لەوەرین": دە فارسیدا چەریدن čarīdan (P.) و چراگا çerāgā "لەوەڕگە"، grastis (Gr.) "گیای خواردن، لەوەڕ"، grasati (OIn.) "خواردی، لەوەڕا"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghro- <** "شین بوون، هەڵدان، گەورە بوون". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑گووران guran "رسکان، (سەر)هەڵدان"، گەڵا gela و هتد.

گۆرانی **goranî** *[ gorānī ]* - "ستران": خزمە دەگەڵ gellen (G.)، gillan (Nl.)، yell (E.) "هەراکردن، ↑گوڕراندن gurrandın"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghel- <** "بانگ و هەرا کردن، هاوار کردن". دە زمانی ئەڵمانی کۆندا galan (OG.) بە مانای "گۆرانی گوتن" بووە. هەروەها ناوی Nachtigall (G.) "بولبول" لەم وشەوە هاتووە، واتا مەلی "شەوخۆێن، شەوئاواز".

[تێبینی: لێرەدا پێویستە ئاماژە بە چوار ریشەی دیکەی هیندوئەورووپی بکەین، واتا **gar- (IE.)* [بڕوانە ↑کول kul]، **kel- (IE.)* [بڕوانە ↑قەل qel] و **gal- (IE.)* [بڕوانە ↑گلێیی gıleyî] و هەروەها **gol- (IE.)* [گاڵ، گڕ و گاڵ] کە ئەوانیش ماناکانیان "بانگ و هاوار کردن، قیراندن"ە. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە هەن کە دەچنەوە سەر ئەم ریشانەی سەرەوە و زۆرجار ساخ کردنەوەی ئەمە دژوارە کە هەریەکەیان سەر بە کێژان ریشەیە. دەشێ ئەم ریشانە دە پلەیەکی دوورتردا بگەنەوە یەکتر و لە یەک بنەڕەت پەیدا بووبن و پەرەیان سەندبێ.

**گۆرت1 gort** - "بناری چیا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گۆڕ[3] gor "دەشت، نزمانی".

**گۆرت2 gort** - "لێدانی بە تەوژم لە کایەی مێشێندا، لێدانی بەزەبر": خزمە دەگەڵ ↑گورد gurd، ↑خورت xurt "هێز، توند و تۆڵی". وشەکە لە کایەی مێشێندا بە مانای "زەربە، زەبری خورت" بەکار دێ، بە پێچەوانەی لێدانی خشکەیی کە نەرم و بێهێزە.

**گۆرژاڵ gorjal** [ *goržāl* ] - "بەن سامۆرتە". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گورز[2] gurz "بەن و پەڕۆی بادراو" و ↑گوریس *gurîs*.

**گۆرک gork** - "1- تەختایی مەجلیس 2- ئاگردانی کۆڕ": خزمە دەگەڵ ↑گۆڕ[3] gor "تەختایی، دەشت". لەوانەیە ↑کۆڕ kor یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**گۆری gorî** [ *gorī* ] - "قوربان، سەدەقە": خزمە دەگەڵ گوران guran "سەر بران" و ↑گوراندن gurandın "سەر بڕین".

**گۆرین gorîn** [ *gorīn* ] - "فڵانە، ئەوهایی": بڕوانە ↑جۆر cor "شێوە، تەرز".

**گۆڕین[1] gorîn** [ *gorīn* ] - "لە دۆخێکەوە خستنە ناو دۆخێکی دیکە": گۆهارتن gohartın یش دە گوترێ. دە شێوەزارەکانی کوردمادیدا هەروەها ↑فارای faray و وارای waray یش دەگوترێن بە مانای "گۆڕان". بنەوشەی فارِ -far یان وار -war شێوەیەکی کونترە لە گۆڕ -gor، واتا ئەسڵی وشەی "گۆڕان" سەرەتا بە فۆتیمی v /w دەست پێ کراوە و پاشان ئەم فۆتیمە گۆڕدراوە بە g [لەم بارەوە بڕوانە تێبینی خوارەوە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ werden (.G)، werdan (.OG)، weorđan (.OE)، varda (.Sw) "بوون" [بوون بە مانای "تەبدیل بوون"، لە شتێکەوە بوونە شتێکی دیکە، لە دۆخێکەوە چوونە ناو دۆخێکی دیکەوە- دە ئینگلیزیدا بۆ ئەم مانایە become دەگوترێ، دە فارسیدا "شدن"]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> *(IE.) *uer- , *wer-*** "سووڕان". ئاشکرایە چەمکی گۆڕان یان لە شتێکەوە [دۆخێکەوە] بوونە دۆخێکی دیکە، پێوەندی بە چەمکی "وەرسووڕان" هەیە. ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑وڕ wır، ↑فرفرە fırfıre، ↑وەردێنە werdene [وەردەنە werdene]، ↑*وەرانین weranîn*، ↑وریس wırîs [گوریس gurîs]، ↑ورگ wırg و هتد.

[تێبینی: گۆڕانی v /w بە g دە گەلێک وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک گورگ، گوریس، گوڵ و هتد. ئەم گۆڕانە فۆنۆلۆژیکە دە زمانی فارسیدا بەرچاوترە تا دە زمانی کوردمادیدا. بۆ نموونە لەم وشە فارسییانەی خوارەوەدا فۆتیمی سەرەتای وشەکان گۆڕاوە بە g: گرسنە goresne "برسی"، گراز gorāz "بەراز، وەراز"، گریختن gorīxtan "فلەتین"، گزیدن gozīdan "وەژاردن، بژاردن"، گشاد goşād "فش"، گستردن gostardan (دەبێ پێشتر **vistardan* بووبێ، بڕوانە "بەستێن")، گسستن gosastan یان گسیختن gosīxtan "پساندن، (ڕا)پسکاندن" و هتد].

**گۆڕین[2] gorîn** [ *gorīn* ] - "زۆیر بوون، زیز بوون": لە یەکتر گۆڕین واتا زۆیر بوون و قسە نەکردن دەگەڵ یەکتر. دەچێتەوە سەر ↑قار qar "1- توورەیی 2- خەم".

**گۆرەوی gorewî** [ *gorawī* ] - "جۆراب": گۆروا gorwa و گۆرەوا gorewa ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ glove (.E)، glōf (.OE)، glófi (.ON) "دەستەوانە، دەستکێش". ئەم وشانە پێک هاتوون لە پێشگرێک و بنجی lófi "لەپ". ئەم بنجەوشەیە خۆی خزمە دەگەڵ ↑لەپ lap. لەوانەیە دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا "گۆرەوی" بە دەستەوانە گوترابێ و پاشان ماناکەی گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. لەوانەشە هەر لە کۆنە بە مانای ئەمڕۆیی بەکار هاتبێ، چونکوو "لەپ" دە زمانی کوردمادیدا نەک هەر ئاماژە بە لەپی دەست، بەڵکوو ئاماژە بە لەپی دیکەش دەکا. بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا "لووشک" هەیە لە ئاماژەیە بە لەپی لاق یاخود بەری لاق. بۆ زانیاری

زۆرتر بڕوانە ↑لەپ lap. شیاوی باسە کە **جوراب** jūrāb (.Arb) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە و فۆتیمی گ g لە وشەکەدا کراوە بە ج c، چونکوو زمانی عەرەبی خاوەنی فۆتیمی گ g نییە و ئەم فۆتیمە لە وشە وەرگیراوەکانی خۆیدا دەکا بە ج c.

**گۆزان1 gozan 1** [ *gozān* ] - "پڕ، تژی": خزمە دەگەڵ ↑گیشە gîşe.

**گۆزان2 gozan 2** [ *gozān* ] - "سەر راوەشاندنی منداڵ": خزمە دەگەڵ ↑گیزان gîzan "ژاندن، لێکدرانی تڕاو" و دواتر ↑گێژ *gej*.

**گۆزە goze** [ *goza* ] - "دەفری ئاو": کوزە kūze (.P).ئەم وشەیە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑کاسە kas، ↑کاشی kaşî، ↑کەشک keşk [کەشکەژنۆ]،↑کەشکۆڵ keşkol، ↑گاوشە gawşe. ئەم وشانە دەبێ خزم بن دەگەڵ ریشەیەی ژێرمەنی -*kasa** (.Grm) "دەفر، کاسە". وشەکانی kar (.OG)، kas (.Gt) "دەفر" و Kasten (.G) "قوتوو" لەو ریشەوە هاتوون. وشەی **کاس** ka´s (.Arb) "کاسە" دە زمانی عەرەبیدا لە زمانی کوردمادی یان فارسی بەرێ وەرگیراوە.

**گۆس gos** - "مقاش، ماشە": خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz "کەلبەتان" و ↑گەستن *gestın*.

**گۆسان gosan** [ *gosān* ] - "قالۆنچەی باڵدار": خزمە دەگەڵ کێزە keze یان ↑کێزک kêzık "قالۆنچە"و دواجار ↑گەستن *gestın*. "گاز گرتن".

**گۆش goş** [ *goš* ] - "فرچک، یەکەم شیر": گۆچ goç یش دەگوترێ. ئاغوز āġūz (.P). دە فارسیدا بە باوەش یاخود ئامێز دەگوترێ اغوش āġūš (.P). دیارە وشەی "ئاغوز" دەبێ لە "ئاغوش"ەوە هاتبێ و مەبەست دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە زارۆڵەی تازە لە دایک بوو دەکرێتە باوەش و بۆ یەکەم جار شیری دەدرێتێ، بە وتەیەکی دیکە فێری مەمک گرتن و شیرمژتن دەکرێ. "ئاغوش" خۆی لە دوو کەرتی "ئا" (پێشگر) + "غووش" پێک هاتووە و دە کوردمادیشدا وشەی ↑باوەش baweş دە ئەسڵدا (بە + ئاگۆش) بووە و بووەتە "باوەش". وەک باس کرا خودی وشەی ئاغۆش لە بنەوشەی غۆش/ گۆش goş پێک هاتووە و ئەمەش هەر ئەو "گۆش" یان " گۆچ"یە کە دە زمانی کوردمادی دا بە مانای "فرچک" و بە گشتیش بە مانای "فێرکردنێکی هەرە زوو" بەکار دێ. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑باوەش baweş.

**گۆشە goşe** [ *goša* ] - "سووچ، قوولینچک": گوشە gūše (.P). خزمە دەگەڵ وشەگەلێک کە ئاماژە بە "زەق بوون" دەکەن، چونکوو گۆشە بریتییە لە شوێنێکی زەق و دەرپەڕیو. هێندێک لەم وشانە بەم جۆرەی خوارەوەن: ↑قۆچ qoç "شاخ"، ↑کۆچکە koçke "قیتکەکڵاو"، ↑قۆز qoz [قیت و قۆز]، ↑قوت qut،↑کووژەکە kujeke "مووروو بۆ چاوزار"، ↑کۆس kos "زەقایی زەوی"، ↑گوز guz [کوز و گومبەت]، ↑گژ gıj "راست بوونەوەی موو" و هتد. ئەم وشانە پێوەندی بە ژمارەیەک وشە بە مانای "چەماو، چەمانەوە" پەیدا دەکەن [وەک ↑کێو kew، کێف kef] و دەچنەوە سەر ریشەی **< -*keu** (.IE)** "چەمانەوە". جێی ئاماژەیە کە دوو چەمکی "چەمانەوە" و "زەق بوون" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و نموونەی "کێو" ئەم پێوەندییە بە باشی نیشان دەدا. کێو بریتییە لە چەمانەوەیەک لەسەر پانتایی زەوی کە دە هەمان کاتدا قیت بوونەوە و دەرپەڕیتێک دروست دەکا و نووکەکەشی لە گۆشەیەک دەچێ.

**گۆشەر goşer** [ *gošar* ] - "زەنبیل": خزمە دەگەڵ ↑کۆت[4] kot "چەپەر، دەرگای لە شووڵ چندراو"، ↑گازەرا gazera و دەگەڵ Gitter (.G) "پەرژین، چەپەر، تیکبەست"، Gatter (.G) "چەپەر"، gataro (.OG) "دەرگای لەچەپەر دروستکراو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **<**

*ghedh-* (*IE.*) "جۆش خواردن، یەکانگیر بوون، تیکبەزین". شیاوی باسە وشەکانی "قەرتاڵە" و "زەنبیل"یش دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "تیکخستن، لێک گرێ دان" دەبەخشن.

[تێبینی: پێوەندی گۆشەر "زەنبیل" و کۆت "چەپەر" وەک پێوەندی *سەوەتە* و *سابات* "کەپر" وایە].

**گۆشەک goşek** [ *gošak* ] - "ئالوو، بادامەی گەروو": خزمە دەگەڵ ↑گوێز goez [گۆز goz، گووز guz] و ↑گوێزینگ goezîng.

**گۆڤ gov** - "ئاغەل": شێوەیەکی دیکە لە ↑گەورِ gewır "تەویلە" و دواجار دەگەڵ ↑کون *kun*. وشەکانی ↑گووڤ guv "کونی جانەوەری کێوی" و گۆفک gofk [گوفک gufk] "سەرانگوێلک" هەر لەم پێوەندییەدا جێی لێک دانەوەن.

**گۆڤار govar** [ *govār* ] - "مگازین": دە ئەسڵدا ↑کۆڤار kovar بووە.

**گۆڤەند govend** [ *govand* ] - "شایی، زەماوەند": لە دوو کەرت پێک هاتووە، واتا گۆ go + ڤەند vend. کەرتی دووەم، هەر ئەوەیە کە دە وشەی ↑زەماوەند zemawend یشدا دەبینرێ. وەک لەژێر وشەی "زەماوەند"دا باسکراوە، ئەم وشەیە دە بنەرِەتدا بە مانای "هاوبەندی"یە و مەبەست هەڤ و دوو گرتن و کۆ بوونەوەی کۆمێک مرۆڤە (بە بۆنەی هاوسەرگیرییەوە). هەر بەم شێوەیە دەشێ کەرتی گۆ -go دە وشەی "گۆڤەند"دا خزم بێ دەگەڵ ↑کۆ ko و ↑کۆم *kom*. لەم تێروانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "کۆمبەست" و ئاماژە بە بەستنی کۆ بوونەوە، یان کۆمێک مرۆڤ دەکا کە بەسترانەوەیەک لەنێوانیاندا دروست دەبێ.

**گۆک gok** - "1- خونچەی دار 2- خرِی ورد": گەوک gewk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کۆک kok و دواجار ↑گۆ go، سەر بە ریشەی < *gēu-* (*IE.*) "چەمان، خوار بوون، خرِ بوون". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "خونچە" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە مانای "خرِەکە بوون، *قنج* بوون".

**گۆگ(ە) gog(e)** [ *gog(a)* ] - "تۆپی بچووکی یاری": خزمە دەگەڵ ↑گۆک gok.

**گۆگرد gogırd** - "1- مادەی سولفۆر2- شەمچە": گوگرد gūgerd (.P). گو go + گرد gırd. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑گوو gu. کەرتی دووەم هەمان ↑گەرد gerd ە بە مانای "تۆز و خۆڵ". تێکرِای وشەکە دەبێتە "خۆڵێک کە بۆنی گووی لێ دێ". وشەی شقارتة şıqārta (.Arb) بە عەرِەبیکراوی وشە کوردمادییەکەیە.

**گۆل gol** - "ئەستێرک، دەریاچە": ↑گوەل guwel ش دەگوترێ و ئەم وشەیە مانایەکی دیکەش دەبەخشێ، واتا "کونی دیوار بۆ دیدەوانی". هەروەها ↑گوێل guwel و گوێر guwer هەیە بە مانای"1- کونی بەرداش 2- پرِی دەستێک بە قووڵکراوی". ورد بوونەوە لە شێوە و مانای ئەم وشانە بەم ئەنجامەمان دەگەیەنێ کە گشت ئەم وشانە پێوەندییان بەو دەستەوشەیە هەیە کە چەمکی "قووڵایی، ڤاڵایی، دەم داپچرِین، کەلێن و فاسیلە کەوتنە نێوان" دەردەبرِن. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گۆرِ gor بە هەردوو مانای "قەبر" و "دەشت، نزمانی"، ↑*کون kun* "کەلێن" و زۆر وشەی دیکە. دیسان دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وەل wel "باتڵاق، زەلکاو".

**گۆڵ1 gol** - "تیرێ ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ gūl (.MG) "تیری ئاژەڵ بە گشتی و بەتایبەتی بۆ ئەسپ": بە پێی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تەرِ کردن، تۆم رشتن". جۆری ریشەکە باس نەکراوە.

**گۆڵ2 gol** - دەگەڵ "گرێ" دێ و دەگوترێ [گرێ و گوڵ gırê û gol]. هەر وەک گرێ دەبێ ماناکەی "خرِایی" بێ. بروانە ↑گۆڵە gole.

**گۆڵ3 gol** - دەگەڵ "گا" دێ [گا و گۆڵ]. ئەم بنەوشەیە دە وشەی ↑گوێلک guelık [گۆلک golık] دا دەبینین. ↑گوور gur یش دەگوترێ و هەروەها ↑گوێرەکە guwreke. خزمە دەگەڵ Kalb (G.)، kalbo (Gt.)، calf (E.)، kalv (Sw.) "گوێلک"، سەر بە ریشەی **< *guolbh- (IE.)** "پزدان، پیزەدان، پیزە". هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کورِ kur.

**گۆڵ⁴ gol** - دەگەڵ "گورج" دێ [گورج و گۆڵ gurc u gol]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خۆڵ² xol [خەست و خۆڵ]. خزمە دەگەڵ ↑خورِ xur و ↑گورِ *gur* "هێز".

**گۆڵ⁵ gol** - گۆڵەگوڵ واتا زەنازەنا، دەنگەدەنگ. خزمە دەگەڵ ↑گاڵ gal [گرِ و گاڵ].

**گۆلڤند golvınd** - "تۆپی لە پەرۆ چنراو بۆ کایە": خزمە دەگەڵ ↑گلۆپ gılop.

**گۆلە gole** [ *gola* ] - "کەلای کایە کردی لە بەرد": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەلا kela.

**گۆڵە1 gole** [ *gola* ] - "نەخۆشییەکە بە هۆیەوە زارو زمان بلۆقدار و ئەستوور دەبێ": خزمە دەگەڵ ↑گۆڵ gol [گرێ و گۆڵ]. ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑گۆ go و gōla-h (OIn.) "گۆ".

2- ↑ galle (L.) "بلۆق، کوان، گرێ و گوڵ لە لەشدا" و↑ گلوو gılû.

**گۆڵە2 gole** [ *gola* ] - "قفل": بڕوانە ↑قفل qıfıl.

**گۆم1 gom** - "ئاوی وەستاوی قووڵ": خزمە دەگەڵ Gumpe (G.) "گۆل یان گۆمی بچووک". ریشەی وشە ئەڵمانییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**گۆم2 gom** - "1-ماڵی هاوین 2- زنج 3- خانووی دەربەستە 4- پەناگای پاسەوان": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ home (E.)، Heim (G.)، hem (Sw.) "خانوو، ماڵ"، kōmē "دە، گوند"، sem´ja (Rus.) "خێزان، ماڵبات"، سەر بە ریشەی **< *kei- (IE.)** "لێبوون، جێگیر بوون، هەبوون لە شوێنێک". لەوانەیە دەگەڵ ↑خانوو xanu و هەروەها ↑زۆم zom "هۆبە، کۆمەڵەرەشماڵ" خزم بێ.

**گۆنا gona** [ *gonā* ] - "کوڵمە": گونە gūne (P.). خزمە دەگەڵ ↑چەنە çene، سەر بە ریشەی **< *genu- (IE.)** "چەنە". وشەکان بەرهەڤ بکە دەگەڵ gena (L.) "گونا" و genys (Gr.) "چەنە".

**گۆناندن gonandın** [ *gonāndın* ] - "رەنگاندن": ↑گوێن gön "جۆر، رەنگ، جینس".

**گۆنگە gonge** [ *gonga* ] - "چەقە و هەرا، زەنازەنا": هەروەها ↑گۆنگەڵ *gongel* [گەنگەڵ gengel] هەیە بە مانای "گاڵتە، بەزم" [بەزم و هەرا] و ↑گۆنگەشە gongeşe [گەنگەشە gengeşe] "چەقە و هەرا".

**گۆنگەشە gongeşe** [ *gongaša* ] - "1- چەقە و هەرا 2- دەمەقرە، دەمەقاڵە، جەدەل": گەنگەشە gengeşe ش دەگوترێ. لە دووکەرتی گەن -gen و گەشە -geşe پێک هاتووە، یەکەمیان خزم دەگەڵ ↑هانا hana "فریا، هاوار" و دووەمیشیان خزم دەگەڵ ↑قیژە qîje "هاوار". ئەم کەرتەی دوایی دە وشەی ↑بانگەشە bangeşe شدا دەبینرێ. هەڵی سەنگێنە هەروەها دەگەڵ ↑گۆنگەڵ gongel.

**گۆنگەڵ gongel** [ *gongal* ] - "گاڵتە، بزم و هەرا": گەنگەڵ gengel و جەنجاڵ cencal یش دەگوترێ. جنجال janjal (P.).خزمە دەگەڵ ↑گۆنگە gonge. دەشێ وشەکە لە دوو کەرتی گەن -gen و گەڵ -gal پێک هاتبێ، یەکەمیان سەر بە ریشەی **< * kan- (IE.)** "گۆرانی خوێندن" و دووەمیشیان سەر بە یەکێک لەم ریشانەی خوارەوە: ریشەی **< *gal- (IE.)** " دەنگ و سەدا لێ هەستان"، یان ریشەی **< *ghel- (IE.)** "قیل و قاڵ کردن، هەراکردن، بانگ کردن"، یانیش **< *gol-**

(*IE.*) "دەنگ، بانگ". وێ دەچێ هەرسێ ریشەی سەرەوە پێکەوە خزم بن و دە بنەڕەتدا بۆ یەک ریشە بگەڕێنەوە.

[تێبینی 1: ریشەی هیندوئەورووپی *kan-* * (*IE.*) دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی دا مانای "گۆرانی خوێندن"ی بۆ کراوە. بەڵام مانای بنەڕەتی ئەم ریشەیە دەبێ "دەنگ و هەرا کردن"، "دەنگ هەڵبڕین" بێ. ئەم مانایە دە وشەی کوردمادی "هانا" و هەروەها وشەکانی سەرەوەدا پارێزراوە. پێوەندی دوو چەمکی "گۆرانی گوتن" و "دەنگ هەڵبڕین" بەیەکەوە ئاشکرایە، بۆ وێنە وشەی "گۆرانی" خۆی دە ریشەدا مانای "دەنگ و هەرا کردن، هاوار کردن" دەگەیەنێ.
تێبینی 2: گۆنگەڵ (گەنگەڵ) و هێندێک وشەی هاوشێوە دە زمانی کوردمادیدا لە دوو کەرت پێک هاتوون کە هەردووکیان ماناکەیان یەکسانە. ئەم شێوازە لە وشەسازی دۆخی جەخت کردن دروست دەکا (بە ئەڵمانی: Intensivbildung). چەند نموونەیەکی دیکە لەم وشانە بریتین لە بانگاشە، جەمبازە، چەواشە، پاکتاو، رەشتاڵە، تەپلۆس، خڕخاڵ، سامۆتک، سرشک، گۆنگەشە (گەنگەشە) و هتد.

**گۆنی gonî** [ *gonī* ] - "تەلیس": گونی gūnī (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑کون *kun* و چەندین وشە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زار داپچڕین" و هێندێک مانای وەک چاڵ، قووڵ، قووڵکە، دەفر و هیتر لە خۆ دەگرن. وشەی ↑جەواڵ cewal [جواڵ cuwal، گواڵە guwale] ش سەر بەم خێزانەوشەیە. لەم تێڕوانینەوە شێوەی پێشتری وشەکە دەبێ شتێکی لە چەشنی "گەوەنی" [گەپەنی] بووبێ.

2- خزم دەگەڵ ↑کۆن kon "پارچەی رەشماڵ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەنراو، چنراو".

**گۆنیا gonya** [ *gonyā* ] - "گوشەپێو": پێوەندی هەیە بە gony (Gr.) "گوشە، سووچ".

**گۆهن gohın** - "وە با هاتنی بزن و مەڕ": گۆن gon یش دەگوترێ. هەروەها ↑گوهتیل guhtel هەیە بە مانای "جەنگەی تێبەر بوونی ئاژەڵەکێوی". گشن gošan (P.). لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑گان gan [کۆنتر: گاتەن gaten]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "جووت بوون، یەکانگیر بوون، تێکبەزین".

**گۆیژ(ە) goyj(e)** [ *goyž(a)* ] - "بەری دارێکە، بلچ": گێوژ gêwıj، گڤیشک gıvîşk، گوهیژ guhîj یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گوێز guwez و دواتر ↑گۆ *go*.

[تێبینی: ناوەکەی دیکەی ئەم بەرهەمە، واتا "بلچ"، خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "خڕ و تۆپەڵە بوون" دەکەن، وەک "بۆڵ"، "بلق"، "باڵوو" [ئاڵووباڵوو، ئاڵباڵوو]، "بلۆق"، "باڵۆکە" و هتد. "بلچ" دە بنەڕەتدا واتا: تۆپەڵەی بچووک].

**گۆین goyın** - "باڵدارێکی شەوبێدار": گۆیین goyîn ش دەگوترێ. خزم دەگەڵ ↑خوێندن xuwêndın [خوێندنی پەلەوەر].

**گهار gıhar** [ *gıhār* ] - "بوار": دەشێ خزم بێ دەگەڵ گدار godar (P.) "بوار"، gozer (P.) "رەوت"، gozaštan "گوزەران، تێپەر بوون" و gozarān (P.). ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑قەتان qetan "گوزەران، تێپەڕین".

**گە ge** [ *ga* ] - "بەندی قامک، جومگە": گەهە gehe ش دەگوترێ. دەبێ پێوەندی بە↑ گەیشتن geyıştın [گەهان gehan] وە هەبێ و مەبەست ئەو شۆنەیە کە دوو ئێسک *دەگەنەوە* یەکتر.

**گەبرگە gebırge** [ *gabırga* ] - "جۆرێ کایەی زۆرخانە": خزمە دەگەڵ ↑گەورک gewırk "ناوی هۆزێکی کورد" و ↑*گەورە gewre* "مەزن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت و بەهێز بوون".

گەبرە **gebre** [ *gabra* ] - "دەستکێشی لباد": خزمە دەگەڵ ↑گەبەک gebek "مافوورەی تیسکدار" و دواتر ↑کەپەنەک kepenek "فەرەنجی".

گەبۆل **gebol** [ *gabol* ] - "نواڵە لە ئارد و ورتکەساوار": دەشێ پێوەندی بە ↑کوتان kutan [کوفتن kuften (P.)]ەوە هەبێ. لەوانەیە ناوی چێشتی قبووڵی qıbûlî پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

گەبەزە **gebeze** [ *gabaza* ] - "زلحۆرت": خزمە دەگەڵ ↑قەبە qebe. کەرتی دووەم پاشگری زۆر و زەوەندی و جەخت کردنە کە بە چەند شێوەی دیکەش دەبیندرێ، وەک ئاڵۆز، چکۆس، قرنیس و هتد [بڕوانە پاشگری ↑ئۆز oz-].

گەبەک **gebek** [ *gabak* ] - "مافوورەی تیسکدرێژ": خزمە دەگەڵ ↑گەبرە gebre "دەستکێشی لباد" و چەندین وشەی دیکە وەک ↑کەپەنەک kepenek "فەرەنجی".

گەبەڵ **gebel** [ *gabal* ] - "زەلکاو": شێوەی کۆنتری ↑گۆل gol و خزمە دەگەڵ ↑کون *kun*.

گەبەڵە **gebele** [ *gabala* ] - "دارستانی چوغوور": خزمە دەگەڵ ↑قۆپی qopî و ↑قۆپەن qopen "مێشەلان".

گەپ1 **gep 1** [ *gap* ] - "جەفەنگ، گاڵتە": گپ gap (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "دەم داپچڕین، دەم ڤاڵا کردن" دەکەن، وەک ↑گەفین gefîn "هەڕەشە کردن"، ↑گەپین gepîn "وەرین" هەروەها ↑حەپین ħepîn، ↑گەپە gepe "بۆشایی زار"، ↑گاپن gapın "زۆرخور، دەم داپچڕاو"، ↑حەبەسان ħebesan یان حەپەسان ħepesan "سەرسوڕمان، دەبنەڕەتدا: دەم داپچڕین بە هۆی سەرسووڕماوی". چەمکی هاوبەشی هەموو ئەم وشانە "دەم داپچڕان"ە. هەر بەم جۆرە مەبەست لە گەپ gep، واتا گاڵتە کردن، دەم کردنەوەیە یاخود دەم لێکدانە بە مانای قسەکردنی ناجیددی. سەرنج بدە کە دەگوترێ گەپ *لێدان*، نەک گەپ کردن، واتا گەپ هەمان ئاماژەکردنە بە "دەم" کە لێک دەدرێ وەک "چەنە لێدان". دواجار خزمە دەگەڵ ↑قەپ *qep* [قەپ *لێدان*].

گەپ2 **gep 2** [ *gap* ] - "درشت": شێوەیەکی دیکە لە ↑قەبە qebe "زل، ئەستوور" و پێوەندیان هەیە بە ↑خەپە xepe.

گەپچاندن **gepçandın** [ *gapčāndın* ] - "رووخاندن، وێکەوتن": دەشێ پێوەندی بە ↑کەوتن kewtın [کەفتن keftın]ەوە هەبێ.

گەپڵە **geple** [ *gapla* ] - "دونبەلان": خزمە دەگەڵ ↑کۆپانە kopane "زۆپایی پشتی وشتر" و ↑گێپەر *geper* "ئەستوورایی"، بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ Gipfel (G.) "دوند، سەرچڵ، سەرسەرەوە" کە ئەویش سەر بەم خێزانەوشەیە و دەچنەوە سەر ریشەی **< -*keubh (IE.)** "چەمانەوە".

گەپۆل **gepol** [ *gapol* ] - "شەپڵەلێدراو": سەر بەم خێزانە وشەیە کە لەژێر ↑گێپەر geper "ئەستوورایی"دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەی **< -*keubh (IE.)** "چەمانەوە".

[تێبینی: ئەم ریشەیە دەبێ خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی کۆنتری *-*keu (IE.)* "چەمانەوە"].

گەپە **gepe** [1] [ *gapa* ] - "حەپەی سەگ": خزمە دەگەڵ ↑حەپە ħepe، ↑عەوعەو ewew [↑حەوحەو ħewħew]، ↑گەفە gefe، ↑قەپ *qep* و گەلێک وشەی دیکە کە دەبنەڕەتدا مانای "دەم داپچڕین" دەدەن.

**گەپە2 gepe** [ *gapa* ] - "بۆشایی زار": خزمە دەگەڵ ↑گووپ gup، ↑کەپۆ kepo، ↑گاپن gapın و دواجار دەگەڵ ↑کون *kun* "قەڵش".

**گەپین gepîn** [ *gapīn* ] - "حەپین": شێوەی پێشووتری ↑حەپین ȟepîn "وەڕینی سەگ" [دەبنەڕەتدا: دەم داپچڕین". بڕوانە ↑کون *kun*.

**گەچلان geçlan** [ *gačlān* ] - "چرچ و سیس بون": خزمە دەگەڵ ↑کز kız سەر بە ریشەیەک بە مانای "کەم بوون، لەکزی دان، لەناوچوون".

**گەجە gece** [ *gaja* ] - "غەریبە، بێگانە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Gast (G.)، gasts (Gt.)، giest (OE.)، gäst (Sw.)، gost (Rus.) "میوان"، gospodin (Rus.) "بەرێز، ئاغا"، hostis (L.) "دوژمن، خەنیم"، hospes (L.) "میوان"، سەر بە ریشەی **< *ghosti-s*- (IE.)** "بێگانە، غەوارە". وەک دەبینین دە وشە کوردمادییەکەدا مانای ریشەکە بە تەواوی پارێزراوە.

**گەجەر gecer** [ *gajar* ] - "کز، داڵگوشت": خزمە دەگەڵ ↑هەژار hejar "فەقیر، بێنەوا". وشەکە دە زمانی ئەڵمانیشدا مانای "کز و لاواز" دەگەیەنێ [hager (G.)].

**گەد ged** [ *gad* ] - "زەوی پڕ کەند و لەند": شێوەیەکی دیکە لە ↑قاد qad "زەوی، زەمینە" و گیتی gītîî (P.) "جیهان، دنیا".

**گەدا[1] geda** [ *gadā* ] - "کچ": خزمە دەگەڵ ↑کودک kudık و ↑کوودەڵە kudele و هیتر بە مانای "بێچوو، بچووک".

**گەدا[2] geda** [ *gadā* ] - دەبێ مانای بنەڕەتی وشەکە "سواڵکەر" نەبووبێ و ئەم مانایە پاشان پەیدا بووبێ. زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی وەرگرتووە و کردوویە بە تکدی takaddī (Arb.) "گەدایی کردن". وشەکە دەشێ خزمە دەگەڵ ↑گەدا[1] geda "کچ" و ↑کەدە kede "کوڕی چکۆڵە" و ↑گەدەک gedek "بەچکەگامێش". وەک لە چەند جێیەکی دیکەش باس کراوە، ئەو وشانەی ئاماژە بە مانای "گچکە، بچووک" دەکەن، لە لایەکەوە دەگەڵ ناوی بێچوو یان گچکەی مرۆڤ و ئاژەڵ دە پێوەندیدان، وەک وشەکانی ↑کەدە kede، ↑گەدەک gedek، ↑کودک kudık، ↑کوودەڵە kudele و هیتر. لە لایەکی دیکەوە ئەم وشانە پێوەندی دەگەڵ هێندێک وشە پەیدا دەکەن کە باس لە "کز، لاواز، بێهێز، هەژار و...." دەکەن، وەک لە وشەکانی ↑کز kız، ↑هەژار hejar و ↑گەجەر gecerدا. بەم جۆرە وشەکە دەبێ دواجار خزم بێ دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە.

[تێبینی: سەبارەت بەم پێوەندییەی باسکراو بەراوردی بکە دەگەڵ وشەی "پوور". ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا مانای "کوڕ" دەکا (گچکەی تیرینە)، دە زمانی ئینگلیزیدا ماناکەی دەبێتە "هەژار" و خزمیشە دەگەڵ "پاڵە"ی خۆمان، واتا "ڕەنجبەر، سەپان"].

**گەدە1 gede** [ *gada* ] - "ورگ، مەعیدە": وشەکە دەچێتەوە سەر ↑گەت get [↑قەد qed، قەد و گیپاڵ، گەد و گیپاڵ]. وەک لە لێکدانەوەی وشەی ↑قەد *qed* دا باس کرا، ئەم وشەیە چەندان مانای وەرگرتووە، لەوانە "بڵیندی"، "بەژن وباڵا"، "ئەستوورایی"، "لەش". دواتر وشەی ↑بەرگەدە bergede دروست کراوە بۆ ئاماژە کردن بە "خوارەوەی لەش، بەرسک". پاشان کەرتی بەر ber دەرهاوێژراوە و گەدە بە مانای "ورگ، مەعیدە" واتا شوێتێکی سەرتر لە "بەرگەدە" بەکارهێنراوە.

**گەدە2 gede** [ *gada* ] - "کوێستاتیکی بەناوبانگ": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *stei*- (IE.)** "ڕەق بوون، مەیین". لەم ریشەوە گەلێک وشە دە زمانی کوردمادی و زمانە ئەورووپییەکاندا دروست بوون کە هەڵگری مانای "سەخت، ڕەق، بەرد"ن، وەک Stein (G.) "بەرد" و هەستی hestî "ئێسک، بەرد"، ↑ ئاستەم astem و هتد. شیاوی باسە کە ناوی زۆرینەی چیا و کوێستانەکانی کوردستان

دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "سەخت، بەهێز، پتەو" دەبەخشن. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کۆدۆ kodo "1-ناوی چیایەکە لە کوردستان" و ↑کۆدە kode "زەوی زۆر سەخت و جووت لێ نەکراو".

**گەدەبەل gedebel** ⌊ *gadabal* ⌋ - "سەرسەخت": خزمە دەگەڵ ↑گەدە2 gede و ئەو وشانەی مانای "سەخت، رەق، بەهێز" دەبەخشن.

**گەدەک gedek** ⌊ *gadak* ⌋ - "بەچکەگامێش": خزمە دەگەڵ ↑کودک *kudık* و ↑کوودەڵە kudele و هیتر بە مانای "بێچوو، بچووک".

**گەدەیی gedey** ⌊ *gadayī* ⌋ - "سەردەمی منالّی": خزمە دەگەڵ ↑گەدا geda "کچ"، ↑کودک *kudık* و ↑کوودەڵە kudele و هیتر بە مانای "بێچوو، بچووک".

**-گەر ger-** ⌊ *-gar* ⌋ - "پاشگری بە مانای دروستکەر یان دەکارهێنەر": [ئاسنگەر، مسگەر، زێرینگەر...]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کار kar.

**گەڕ1 ger** ⌊ *gar* ⌋ - "1- پێچ، دەور2- چەرخ 3- گێژاوی گوم 4- نۆرە": هەروەها دەگەڵ "گێچەڵ" دێ [گەڕ و گێچەڵ ger u geçel واتا تەشقەڵە]، دەچێتەوە سەڕ ↑گەڕان geran.

**گەڕ2 ger** ⌊ *gar* ⌋ - "سەرسەختی و لاساری": خزمە دەگەڵ↑ گەرووز geruz "زوور، رەق".

**گەرا1 gera** ⌊ *garā* ⌋ - "هێلکە (توخم)ی ماس و بۆق و هتد": خزمە دەگەڵ Rogen (G.)، hrogan (OIs.)، krjak (Rus.) "گەرا"، سەر بە ریشەی **<-*krek (IE.)*** "گەرا".

**گەرا2 gera** ⌊ *garā* ⌋ - [زگی گەراگەرا وێستاوە، لەوانەیە زوو بزێ]. مامۆستا هەژار دەگەڵ بە نموونە هێنانەوەی ئەم رستەیە مانای وشەکەی وەک "پەنەماو" واتا هەڵمساو دیاری کردووە. وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "رەق، سفت"ە و پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑خار xar "سەخت"دا باس کراون. دیارە شوێنی هەڵمساو لە لەشدا هاوکات رەقیش دەبێ و لەبەر ئەمە وا لێک دراوەتەوە کە مانای وشەکە "ماسین"ە.

**گەران geran** ⌊ *garān* ⌋ - "هاتوچۆ کردن، خولانەوە، سەفر کردن": دە زمانی کوردمادیدا بنەوشەی کرداری گەر -ger هەم بۆ کرداری رابوردوو و هەم بۆ هی ئێستا بەکار دێ [گەرام، دەگەرێم]. دە زمانی فارسیدا بۆ کرداری رابوردوو بنەوشەی گشت- بەکار دێ [گشتم واتا گەڕام]، بەڵام بۆ کرداری ئێستا بنەوشەی گرد -gard بەکار دێ [میگردم mīgardam واتا دەگەڕێم]. ئەم دوو بنەوشەیە سەر بە دوو ریشەی جیاوازن. بنەوشەی "گشت" خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک *گیزان* "شڵەقان"، *گژەبا*، *گیزگیزە* "مزراق" و چەندین وشەی دیکە کە مانای "سووڕان" لە خۆ دەگرن. بنەوشەی گەڕ(د) -(ger(d ە ئاڵۆگۆری بەسەرداهاتووە و فۆتیمی سەرەتای وشەکە لە v /w وە گۆڕاوە بۆ g. ئەو وشەیە پێشتر نەک "گەڕان" بەڵکوو شێوەیەکی وەک "وەرتان wertan"ی هەبووبێ، سەر بە ریشەی ***-wer* (IE.)** "سووڕان، گەران(ەوە)، با دان(ەوە)". لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وەرد werd [وەرد دانەوە] واتا "کێڵانەوەی زەوی، گەڕانەوە و پێداهاتنەوە" بە زەوی کێڵدراو. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ دەستەواژەی "ئاو تێ وەر(د) دان" aw te wer(d) dan. هاوتای ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا دەبێتە "اب تو گرداندن" āb tū gardāndan. ئەم ریشەیەی سەرەوە دە زمانی کوردمادی و زمانە ئەورووپییەکاندا چەندین وشەی جۆراوجۆری لێ کەوتۆتەوە، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا ↑وەردێنە werdene، ↑*وەرانین weranîn* "تیوەپێچان"، ↑وەرافتن weraftın "هەڵپشاوتن" [هەڵگێرانەوە، هەڵگێڕ وەرگێڕ کردن]، ↑وڕ wır "گێژ، سەرسوڕماو" و ↑گوریس gurîs [پێشتر

وریس wırs] و ↑گۆڕان goran. سەرنج بدە لەم دوو وشەی دووایيشدا فۆتیمی w گۆڕاوە و بووەتە g.

[تێبینی: وەک دەبینین ریشەی ئەم وشەیە هەڵگری ماناکانی "سووڕان، گەڕان(ەوە)، با دان(ەوە)"یە. شیاوی سەرنجە کە پێوەندی نیزیک لەتیوان "سووران و با دان" لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە " گەڕان و سووڕانەوە" بە مانای گەشت و گوزار کردنەوە هەیە. بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا وشەی "سەفەر" خزمە دەگەڵ "سووڕان" (زڤرین). دە زمانی ئەڵمانیدا winden دەبێتە "با دان، با دانەوە" و خزمە دەگەڵ wandern "گشت و گوزار، گەڕان"].

**گەرد1 gerd** [ *gard* ] - "تۆز": گەرت gert یش دەگوترێ. گرد gard (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ئارد ard، ↑ورد wırd [خورت xurt، هورد hurd]، ↑*هارین harîn* و هتد.

[تێبینی: وشەکە خزمە دەگەڵ groß (G.) و great (E.) "گەورە، مەزن". دە زمانە ژێرمەنییە کۆنەکاندا سەرەتا وشەیەکی دیکە بە مانای مەزن هەبووە، واتا makila کە خزم بووە دەگەڵ وشە کوردمادی "مەزن". پاشان ئەم وشانەی سەرەوە جێگەی وشە کۆنەکەیان لێژ کردووە و وشە کۆنەکە لە ناو چووە. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **ghreu-* *(IE.)* "رێخشاندن، هاڕین، گەرد کردن، ورد کردن". وشە ژێرمەنییەکە سەرەتا بەو دەنکە وردکراوانە گوتراوە کە لەناو کۆگا وردکراوەدا گەورەتر بوون لە دەنکەکانی دیکە، واتا "وردکراوی مەزنتر". دواتر وشەکە مانای "مەزن"ی پەیدا کردووە و جێگەی وشە کۆنەکەی گرتۆتەوە. خاڵێکی دیکە کە لێرەدا شیاوی سەرنجە، ئەوەیە کە فۆتیمی ئەسڵی g، دە زمانی کوردمادی یان بەگشتی زمانانی K.P. دا هەرچەند لە هێندێک وشەدا پارێزراوە (وەک گەرد، گیرە)، بەڵام لە زۆر وشەدا گۆڕدراوە بە a (ئارد) یان بە h (هاڕین، هورد، هەریس) یان بە x (خورد) یان بە w (ورد)].

**گەرد2 gerd** [ *gard* ] - وە گەردی یەک واتا دەگەڵ یەکتر. بڕوانە ↑گەل gel.

**گەرد3 gerd** [ *gard* ] - "قوربان، گۆری": [وە گەرد باڵات بم]. بە زاراوەی موکریانی دەڵێن "دەسەرسەرت گەڕێم". وەک دەبینین "گەرد" پێوەندی بە ↑گەڕان geran ەوە هەیە. پێوەندی دوو چەمکی "قوربان" و "گەڕان" لەوەڕا هاتووە کە ئاژەڵی قوربانی کراویان لە پێشدا لە دەوری کەسێک گێڕاوە و پاشان سەریان بڕیوە. ڕەنگە وا تێگەیشتبن کە ئەگەر ئاژەڵەکە چەند جارێک لە دەوری کەسی دیاریکراو نەسووڕێننەوە، ئەوا هێزی بان سەر نازانێ کەسی قوربانی بۆکراو چ کەسێکە!!

**گەردن gerdın** [ *gardın* ] - "مل، ئەستۆ": گردن gardan (P.). لەوانەشە بچێتەوە سەر ریشەی **< *ger-** ***(IE.)*** "سووڕان، با دان" و بۆ وێنە ببێتە خزم دەگەڵ ↑قرتک qırtık "دڵ تێکەڵ هاتن" و ↑قر *qır* "چەرخین، سووڕان".

**گەردوون gerdun** [ *gardūn* ] - "1- چەرخی زل 2- چەرخی چاڵاو3- فەلەک، جیهان": دەچێتەوە سەر ↑گەڕان geran [کۆنتر: "وەردان" یان "وەرتان" بووە]

[تێبینی: هەروەها وشەی فەلەک felek کە وشەیەکی کۆنترە لە گەردوون و بە هەر دوو مانای "1-چەرخ 2- چەرخی گەردوون" بەکارهاتووە، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، گەڕان" و دەپلەیەکی دوورتریشدا دەشێ ریشەی هەردوو وشەکە لە یەک سەرچاوەوە هاتبن و یەکیان لەوەی دیکەوە پەیدا بووبێ: **wer-* ریشەی "گەڕان، گەردوون"ە و **wel-* ریشەی "فەلەک"ە].

گەردە **gerde** [ *garda* ] - "ریزەگوڵێنکەی رەشی ئاوریشم کە لە سەر دەپێچرێ": دەچێتەوە سەر ↑گەڕان geran. [هەڵی سەنگینەدەگەڵ وشەی "پێچ"ی سەر کە ئەویش دەچێتەوە سەر وشەی "پێچان"].

گەردی **gerdî** [ *gardī* ] - "ناوی هۆزێکە لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑کورد kurd.

گەرزەك **gerzek** [ *garzak* ] - "1- ئاڵقە، خەڵەك 2- کۆز": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kreis (G.) "جەخز، دایرە، دەڤەر"، kreit (MG.)، krijt (Nl.) "جەجز، مەیدانی شەڕ و زۆرەوانی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ kritzeln (G.) و kratzen (G.) "کڕاندن، رووشاندن". مەبەست لە سەرەتادا جەغز یان کێرێکی ئاڵقەیی بووە کە بە کڕاندن و داررووشاندن لەسەر هەرد دروست کراوە. خزمە دەگەڵ ↑*کڕاندن kırandın* و لەوانەشە ↑کێڕ ker و گەڕەك gerek.

گەرش **gerş** [ *garš* ] - "پووش، وردەلاسك": گەرس gers شێوەیەکی دیکە لە ↑قرش qırş.

گەڕك **gerk** [ *gark* ] - "کز و کەنەفت": خزمە دەگەڵ karg (G.)، karag (OG.)، chary (E.) کز، لاواز، رەزیل، قڕنیس". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Kar (G.) "خەم و خەفەت، زاری"، وشەی ↑زاری zarî خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە مانای بنەڕەتی وشەی "گەڕك" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا "خەفەتبار، نیگەران، پەرۆش" بووە و دواتر لەم مانایەوە ماناکانی "دە بیری خۆ و دوارۆژدا بوون، زیرەك، فێڵباز، رەزیل، قڕنیس" سەریان هەڵداوە.

[تێبینی: سەرنجراکێش ئەوەیە کە دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئەڵمانیدا یەکێك لە ماناکانی وشە ئەڵمانییەکەی سەرەوە knapp دیاری کراوە. مانای ئەم وشەیە دەبێتە "زۆر کەم" واتا شتێك کە بە زەحمەت دەست دەکەوێ یان بە ئاستەم بەش دەکا. ئەم وشە ئەڵمانییە خۆی خزمە دەگەڵ کەنەفت keneft ی کوردمادی کە لەسەرەوە وەك یەکێك لە ماناکانی "گەڕك" دیاری کراوە. لێرەدا پێوەندی چەندین چەمکی وەك کەم، کز، لاواز، کەنەفت، قڕنیس بە یەکەوە دەردەکەوێ. دیارە سەبارەت بە چۆنێتی ئەم پێوەندییانە دەکرێ شیرۆڤەی جۆربەجۆر بکەین].

گەرگەر **gerger** [ *gargar* ] - "بەردەڵان": بنجی گەر ger- خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت".

گەرگەری **gergerî** [ *gargarī* ] - "1- کولێرەی چکۆڵە 2- جۆرێك کەچەڵی": خزمە دەگەڵ ↑خڕ xır. وشەکە ئاماژە دەکا بە جەغزی بوون [دایرە بوون].

گەرگەسان **gergesan** [ *gargasān* ] - "ورد و خاش بوون": دەشێ لە دوو کەرتی گەر ger + گەسان gesan پێك هاتبێ، کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ گەرد[1] gerd "تۆز"، کەرتی دووەم هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑گەزخاندن gezxandın "پارچەپارچە کردن".

گەرم **germ** [ *garm* ] - "بەتین": گرم garm (P.). خزمە دەگەڵ warm (G.)، (E.)، (Nl.) و varm (Sw.) "گەرم"، سەر بە ریشەی **< -*uer (IE.)*** "سووتان". varem (Arm.) "داگیرسێنە"، varit (Rus.) "کوڵان" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ئاور awır "ئاگر" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: لە باری گۆڕانی فۆنۆلۆژیکەوە بەراوردی وشەکە بکە دەگەڵ "کرم" و worm (E.)].

گەرماژۆ **germajo** [ *garmāžo* ] - "تاو لێدراو": گرمازده garmāzade (P.). پاشگری jo- دە وشەی بۆژۆ bojo "بون گرتوو، بون لێدراو"یشدا دەبیندرێ و دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژەنین jenîn "لێدان".

گەرمخین **germxîn** [ *garmxīīn* ] - "لە گەرمان بۆگەن بوون": ↑گەرم germ. ناوگری خ x لەم وشەیەدا هەڵ سەنگینە دەگەڵ دەوری ئەو ناوگرە دە وشەی "گنخان" دا. ئەم ناوگرە مانایەکی تایبەتی لە چوارچێوەی مانا گشتییەکەدا دروست دەکا.

**گەرمژە germje** *[ garmža ]* - "زیپکە دەرکردن بە هۆی هەتاو و گەرما": ↑گەرم germ + ژە je. کەرتی je دە وشەی ↑سورێژە sureje شدا دەردەکەوێ.

**گەڕناس gernas** *[ garnās ]* - "ئازا، بوێر، مێرخاس": گەڕنووس gernus یش دەگوترێ و ئەم وشەیە وەک ناوی پیاوانیش بەکار دێ. وشەکە پێوەندی بە "گەڕان" و "ناسین"ەوە نییە، چونکوو بەم چەشنە ئەم مانایە بەدەست نایە کە هەیەتی. وشەکە پێک هاتووە لە گەرن (ا) + ئاس [gern(a) + as]. کەرتی "گەرن" خزمە دەگەڵ (G.) gerne ،(Nl.) gaarne ،(OE.) georene ، (Sw.) garna "بە حەزێکی زۆرەوە" [حەز دەکەی میوان بی لامان؟ بەڵێ بە حەزێکی زۆرەوە]. ئەم ئاوەڵکردارانە دەچنەوە سەر ئاوەڵناوێکی کۆنی ژێرمەنی کە لە زمانە جیاوازەکاندا بەم جۆرە بووە: (OG.) gern "بوێر، گەڕناس"، (Gt.) faihugairns "تەماحکار"، (OE.) georn "بوێر، شێلگیر، تامەزرۆ، ئارەزوومەند"، سەر بە ریشەی **< *ĝher- (IE.)** "تاسەکردن، مەیل و خواستی بەتین کردن". کەرتی ئاس as دە وشەی "گەڕناس"دا شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑ئۆز os. ئەم پاشگرە ئاوەڵناو لە دۆخی جەخت کردندا دروست دەکا و بە چەند شێوە خۆی دەر دەخا. گەرناس هەروەها خزمە دەگەڵ ↑قرنیس qırnîs "چنۆک" [دە بنەڕەتدا تەماحکار، پرحەز (بۆ پارە و پووڵ)] و ↑قرنوو qırnu "گەنە". دیارە قرنوو یان گەنە کە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ، زۆر شێلگیر و بە تەماحە و زۆر بە سەختی لەو شتە جیا دەبێتەوە کە حەزی لێ دەکا.

**گەروو geru** *[ garū ]* - "قورگ، گەردن": گلو galū ‌(P.)، galūk ‌(Pl.)، gar ‌(Av.)، Kehle ‌(G.)، kela ‌(OG.)، keel ‌(Nl.)، ceole ‌(OE.) "قورگ، گەروو"، سەر بە ریشەی **< *g(u)el- (IE.)** "هەڵقووڕاندن". دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑قووڕاندن qurandın [هەڵقووڕاندن]، ↑قورگ qurıg، ↑قووت qūt و هتد.

**گەرووز geruz** *[ garūz ]* - "زوور، رەق": خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت، رەق" و چەندان وشەی دیکە وەک ↑کرۆسک kırosk "هەرمێ کێویلە".

**گەرووشە gerûşe** *[ garūša ]* - "رق هەستاوی":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قەڵس qelıs.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑گوڕەشە gureşe.

**گەرەک gerek** *[ garak ]* - "پێویست، لازم": هەروەها گەرەک ناگەرەک gerek nagerek هەیە بە مانای "بتهەوێ نەتهەوێ، بخوازی نەخوازی". ئەم وشەیە وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادییە، چونکوو پاشگری -ەک ek- یەکێک لە پاشگرە چالاکەکانی زمانی کوردمادییە و لە گەلێک وشەدا بەرچاو دەکەوێ، وەک رەوەک، رووەک، شەبەک، کۆچەک، شەتەک، گەزەک و هتد. سەبارەت بە مانا و ریشەی وشەکە دەکرێ دەگەڵ وشەی "پێویست" بەرهەڤی بکەین. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کرداری "ویستن" [wish ‌(E.) "ئارەزوو کردن"] و ئەمیش سەر بە ریشەیەکە بە مانای "بە دوای شتێک کەوتن، چاو لە دووی شتێک بوون، هەڵوەدای شتێک بوون". بەم پێیە بنجی وشەی "گەرەک"، واتا گەر -ger دەشێ خزم بێ دەگەڵ carus ‌(L.) "خۆشەویست، حەز لێکراو"، kars ‌(Let.) "تامەزرۆ بوون، وەکەڵ هاتن"، cara ‌(OIr.) "دۆست، یار، حەز"، Hure ‌(G.) "جندە" [دە بنەڕەتدا: دۆستگرتوو، حەزدار]. هەر دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑کەڵکەڵە kelkele هەیە بە مانای"حەز و تامەزرۆیی زۆر" کە پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *karo(s) (IE.)** "حەز لێ بوون، زۆر پێ خۆش بوون، تامەزرۆ بوون".

**گەڕەک gerek** [ *garak* ] - " تاخ، بەشێك لە بەشەكانی شار": لەوانەیە پێوەندی بە یەكێك لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ئەو وشانەی لەژێر ↑گەرەنگ gereng دا باس كراون، سەر بە ریشەیەك بە مانای "كۆ كردنەوە، خستنە سەریەك". لەم تێڕوانینەوە وشەكە ئاماژە بە كۆم بوونی خانووەكان دەكا، واتا كۆمەڵە خانوویەك كە لە شوێنێكی شار هەڵكەوتوون. لەباری ماناوە بەراوردی بكە دەگەڵ وشەی "مەڵبەند" [دە بنەڕەتدا: ماڵبەند، واتا ئەو ماڵانەی بەیەكەوە بەندن].

2- دە زمانی ئەڵمانیدا چەند وشە كە ئاماژە بە شوێن و ناوچە دەكەن، دە بنەڕەتدا مانای "جەخز، دایرە" دەبەخشن، بۆ وێنە Bezirk (.G) "ناوچەی بەڕێوەبەرایەتی". ئەم وشە ژێرمەنییە ریشەی لاتینی هەیە و دەچێتەوە سەر circus (.L) "جەخز، دایرە"، خزمە دەگەڵ kírkos (.Gr) "ئاڵقە، بازنە". مانای وشە ئەڵمانییەكە دەبنەڕەتدا "دەور، دەڤەر، دەورووبەر" بووە، واتا ئاماژە بە دەورووبەرێك كراوە [محیط]. لەوانەیە "گەڕەك" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەوانەیە ببێتە خزم دەگەڵ ↑كێڕ[1] ker "خوار".

[سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمكی "شوێن، ناوچە" و "دەورووبەر" هەروەها بڕوانە وشەی "شوێن"].

**گەرەنگ gereng** [ *garang* ] - "دارێكی دووپەلە كە پەلكی تفاقی لەسەر دادەنێن": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *ger(e)- m <** "كۆ كردنەوە، خستنە سەریەك" و خزم بێ دەگەڵ gremium (.L) "كۆش، باقە"، grex (.L) "مێگەل، كۆما"، ageírein (.Gr) "كۆم بوونەوە، agorá (.Gr) "مەیدانی كۆ بوونەوە" و هتد. لەم بارەوە بڕوانە ↑گەل gel. وێ دەچێ فۆتیمی n دە وشەی "گەرەنگ"دا ، وەك گەلێك وشەی لەم چەشنە، زێدە بێ و خزێنرابێتە ناو وشەكەوە.

**گەڕەلاوژە gerelawje** [ *garalāwža* ] - "گۆرانی گوتنی بە نۆرە": گەڕ(ە) gere + ↑لاوژە lawje. ↑گەڕ[1] gar واتا نۆرە، گۆرانی گوتنەكە دەگەڕێ و هەركەسە گەڕی خۆی بەر دەكەوێ.

**گەز1 gez** [ *gaz* ] - "ئاونگی شیرن": ↑گەزۆ gazo.

**گەز2 gez** [ *gaz* ] - "پێوانەی ئەندازەگرتنی درێژایی": دەشێ پێوەندی بە یەكێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- Gerte (.G)، "لقەدار، داردەست، شووڵ، داری پێوان"، yard (.E) "پێوانەی درێژایی"، gazds (.Gt) و gadd (.Sw) "دڕك"، hasta (.L) "دار، تیر، پلار، تیژە"، سەر بە ریشەی **< - *ghazdh** **(IE.)** " دڕك".

2- ↑گەسك gesık [گزك] و ↑گزرە gızre.

**گەزارە gezare** [ *gazāra* ] - "زمانی درێژی مار": دە بنەڕەتدا *ددانی* مار مەبەست بووە و دەچێتەوە سەر ↑گەستن gestın و خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz.

**گەزخاندن gezxandın** [ *gazxāndın* ] - "پارچەپارچە كردن": خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz، ↑كووز kuz و ژمارەیەك وشەی دیكە سەر بە ریشەیەك بە مانای "بڕین". ناوگری خ x وەك لە چەندین كرداری دیكەدا دەوری جەخت كردن دەبینێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ گەسان gesan دە كرداری ↑گەرگەسان gergesan "ورد و خاش بوون"دا.

**گەزگەسك gezgesık** [ *gazgasık* ] - "گیایەكە پێست دەكرێتەوە": گەزگەزك gezgezık یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەكێك لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑گاز gaz و ↑گەستن gestın. [گەڵاكە پێست دەگەزێ].

2- ↑گەزنە gezne "بیرۆی تەڕ"، سەر بە ریشەی سەر بە ریشەی **(IE.) *kes- >** "خوراندن، شانە کردن".

3- ↑کزانەوە kızānawa [ئەو گەڵایە پێست دەکزێتەوە].

**گەزلک gezlık** [ gazlık ] - "کێرد، چەقۆ": خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz، ↑کووز kuz و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**گەزمە gezme** [ gazma ] - "تیری کەوان، خەدەنگ": خزمە دەگەڵ ↑گاز gaz، ↑کووز kuz و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین".

**گەزنە gezne** [ gazna ] - "بیرۆی تەڕ": گەزنەک geznek یش بە کەسێک دەگوترێ بیرۆی تەڕی هەبێ. دیارە گەزنە یان بیرۆ نەخۆشییەکی پێستە و ئازار و خورووی پێوەیە. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *kes- >** "خوراندن، شانە کردن".

**گەزنە gezne** [ gazna ] - "خەڵوەتی": خزمە دەگەڵ ↑خەزنە xezne و ↑خەزێنە *xezene* "گەنج، گەنجینە".

**گەزۆ gezo** [ gazo ] - "شیرەی دار، شیرەی گەڵا ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گوتلە gutle "تۆلا، شتی وردی پێکەوەنووساو".

**گەزەک 1 gezek** [ gazak ] - "تفت و تاڵ": گس gas (P.)، ↑گەستن gestın. مەبەست تامێکە زمان دەگەزێ.

**گەزەک 2 gezek** [ gazak ] - "شارەزا، بەڵەد": خزمە دەگەڵ kiesen (G.)، choos (E.)، tjusa (Sw.) [دەچێتەوە سەر kjusa (OSw.)] "تاقی کردنەوە، بە تاقی کردنەوە هەڵبژاردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *geus- >** "هەڵبژاردن، تاقی کردنەوە، مەزە کردن". وشەی ↑چێشتن çêştın دە زمانی کوردمادیدا سەر بەم ریشەیە. دیارە "چێشتن" دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "بە مەزە کردن تاقێ کردنەوە و هەڵبژاردنی خۆراک" و دواتریش غەیری خۆراک. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑گێز1 gez "بەراورد، لێکدانەوە" پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا. [تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "شارەزا، بەڵەد" و "هەڵبژاردن" دەمانگەیێنیتە ئەو بیرۆکەیە کە وشەی بەڵەد beled یش خزم بێ دەگەڵ "وارتن" (ئاوارتن awartın [a-wartın، هەڵاوارتن یان هەڵاواردن) سەر بە ریشەی *(IE.) *uel-, *wel-* "ویستن، هەڵبژاردن". وشەی بەڵێ bele لەم ریشەوە هاتووە].

**گەزەن gezen** [ gazan ] - "زیان": گزند gazand (P.)، دەشێ وشەکە دە ئەسڵدا فارسی بێ. ↑گەستن gestın. گەزەن واتا "گاز لێدراوی، گەستراوی". گەزەنی رۆژگار واتا رۆژگار یەکێک بگەزێ و بیئێشێنێ.

**گەزیت gezît** [ gazīt ] - "باج و پیتاک کە لە ناموسڵمان دەستێندرێ": زمانی فارسی وشەکەی لە عەرەبی وەرگرتووە، کە دەبێتە جزیة jazīyye (Arb.) "پیتاک لەبری تاوان یان گوناهێک". زمانی عەرەبی وشەکەی لە زمانی کوردمادی وەرگرتووە و فۆتیمی g ی سەرەتای وشەکەی گۆڕیوە بە ج g. وشەکە دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑سزا sıza.

**گەست gest** [ gast ] - "ناحەز، دزێو": کەست kest یش دەگوترێ. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- Geist (G.) "رووح، شەوە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ĝheis- >** "ورووژاو، قەڵس، تووڕە".

2- ↑ قێز qez.

**گەستن gestın** [ gastın ] - "گاز گرتن": ↑گاز gaz.

**گەسک gesık** [ *gasık* ] - "ئامرازی ماڵین": گزک gızık و کێزی kezî ش دەگوترێن. خس xas (P.) "گژ و گیای هیشک، چیلکە و چاڵ". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Hag (G.)، haw (E.)، hage (Sw.) "پنچکەگیا، دڕک و داڵ ، بێشە، پەرژین، لەوەڕگە". ئەم وشانە دەبردرێنەوە سەر ریشەی > ‎*kagh-* (IE.) "پەرژین (کردن)". گریمانەی ئەوەی کە وشەی گەسک [گەزک] پێوەندی بە چەمکی گژ و گیا، یاخود دڕک و داڵەوە هەبێ بە هێزتر دەبێ کاتێک سەیری وشەی ↑گڕ[1] gıj بکەین کە دە زمانی کوردمادیدا وێڕای گیا بەکار دێ [گژ و گیا].

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ریشەی > ‎*ghazdh-* (IE.) "دڕک". [بڕوانە ↑گەز gez "پێوانەی درێژایی"].

**گەش geş** [ *gaš* ] - "کراوە، پشکووتوو، خۆش، تەڕ و تازە": هەروەها ↑کەش2 keş هەیە بە مانای "ئەستێرەیەکی زۆر رووناک". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شاد şad "خۆشحاڵ، دڵگەش"، heiter (G.)، hedar (OIs.)، hador (E.) "شاد، بەکەیف، سەرزیندوو"، سەر بە ریشەی > ‎*kai-* (IE.) "درەوشانەوە، گەشانەوە". ↑کەس kes "شەخس" لەم ریشەیەوە هاتووە.

**گەشت geşt** [ *gašt* ] - "سەفەر، سەیران، گەڕان": گشتن gaštan (P.) "گەڕان". خزمە دەگەڵ ↑گیزان gîzan "شڵەقان"، ↑گژەبا gıjeba، ↑گیزگیزە gîzgîze "مزراق" و چەندین وشەی دیکە کە لە ژێر ↑گێژ *gej* دا باس کراون و مانای "سووران، وەرسووران" دەبەخشن. "گەشت" دە بنەڕەتدا هەر وەک "گەڕان" مانای "سووران(ەوە)" دەبەخشێ. سەبارەت بە مانای "سەفەر" و "گشت و گوزار" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ دوو وشەی "سووڕان" [زڤڕین] و "سەفەر" کە ئەوانیش پێکەوە خزمن.

**گەشکە geşke** [ *gaška* ] - "لە خۆ چوون، بەلادا هاتن، فێ گرتن": گەش geş + کە ke. غش ġeş (P.). بنەوشەی گەش- -geş خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "سووڕان" دەکەن [لێرەدا سەرِ سووڕان و بە لادا هاتن مەبەستە]، بۆ وێنە ↑کاس kas، ↑گێژ *gej*، ↑گاشە gaşe "ئاژاوە"، ↑گیزان gezan "شڵەقان و لێکدرانی تراو". وشەکە برادراوەتە ناو زمانی عەرەبی و چەندین وشەی لێ دروست کراوە، وەک اغتشاش و مغشوش (Arb.).

**گەف gef** [ *gaf* ] - "1- هەڕەشە 2- گاڵتە": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە دەم داپچڕین، دەم قاڵا کردن دەکەن وەک↑گەپین gepîn "وەڕین" [هەروەها↑گەفین gefîn یان ↑حەپین ĥepîn، ↑گەپە gepe "بۆشایی زار"، ↑گاپن gapın "زۆرخور، دەم داپچڕاو"، ↑قەپ qep "گاز گرتن"، ↑گووپ gup "بۆشایی لاشەویلکە". چەمکی هاوبەشی هەموو ئەم وشانە "دەم" یان "دەم داپچڕان"ە. بەم جۆرە مەبەست لە گەف gef "هەڕەشە" دە بنەڕەتدا دەم کردنەی ئاژەڵ [و دواتر مرۆڤ] بە مەبەستی ترساندن بە هۆی نیشان دانی ددانەکان و بۆشایی زار بووە. بۆ مانای "گاڵتە"ش بڕوانە ↑گەپ gep.

**گەفاندن gefandın** [ *gafāndın* ] - "هەڕەشە کردن، ترساندن": ↑گەف gef.

**گەفین gefîn** [ *gafīn* ] - "1- حەپین 2- گوڕەشە کردن": بڕوانە ↑گەف gef.

**گەڤر gevır** [ *gavır* ] - "1- سپی ئاماڵ زەرد 2- بۆر، کەوە": خزمە دەگەڵ ↑کەوە kewe.

**گەڤل[1] gevıl** [ *gavıl* ] - "تاریک و روون، بەرەبەیان": هەروەها گەڤلین gevlîn هەیە بە مانای "رووناک داهاتن، بوونە بەرەبەیان". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گەڤر gevır "بۆر، کەوە".

**گەڤلین gevlîn** [ *gavlīn* ] - "شەپۆلی زل دان": هەروەها ↑گەڤل[2] gevıl هەیە بە مانای "شەپۆلی زل". خزمە دەگەڵ schwellen (G.)، swellan (OG.)، zwellen (Nl.)، swell (E.)، svälla (Sw.) "هەڵمسان، گەورە بوونەوە" و Schwall (G.) و swal (MG.) "شەپۆل". ئەم وشانە دەشێ خزم

بن خزمە دەگەڵ ↑زل zıl "قەبە، گەورە" و ↑سێڵاو selaw "لافاو" ["هەڵمسانی ئاو، ئاوی زل"]. لە وشەی "لافاو"یشدا کەرتی یەکەمی وشەکە مانای "بەرز بوونەوە، هەڵکشان" دەبەخشێ.

**گەڤۆزە gevoze** [ *gavoza* ] - "مووی ماش و برینجی": خزمە دەگەڵ↑ کەوە kewe "رەنگی خۆڵەمێشی". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "خۆڵەکەوە" بە مانای "خۆڵەمێش".

**گەڤەر gewer** [ *gawar* ] - "1- سووچ، قوژبن 2- پەراوێز": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا باس کراون. وەک لەوێدا دەبینرێ، ژمارەیەکی بەرچاو وشەی جۆربەجۆر لە ریشەیەکەوە هاتوون، بە مانای "دەم داپچڕین، زار کردنەوە". ئەم وشانە چەندین مانا دەردەبڕن، لەوانە قووڵکە، کون و کەلێن، دەفر، بۆشایی، قووڵ، نزم، نزمایی، دەشت، *گۆڕایی [گەڤەرایی]*. وشەی "گەڤەر" بە مانای "سووچ، قوژبن"یش هەر لەم پێوەندییەدا سەری هەڵداوە.

[تێبینی: مانای دووەمی وشەکە، واتا "پەراوێز" دەکرێ بە دوو شێوە شیرۆڤەی بکەین. ئەم مانایە دەتوانێ لە مانای یەکەم، واتا "سووچ، قوژبن"ەوە پەرەی گرتبێ، چونکوو سووچ و قوژبنی هەر شتێک دەکەوێتە پەراوێزی ئەو شتەوە. لە لایەکی دیکەوە دەزانین کە "گەڤەر" شێوەی کۆنتری ↑گۆڕ gor "دەشت"ە. ئەوجار لە تێوان دوو چەمکی "دەشت و دەر" و "قەراخ، پەراوێز"دا پێوەندییەک هەیە. ئەم پێوەندییە بۆ وێنە لە دوو وشەی *مێرگ* "دەشتی سەرسەوز، چیمەنزار" و مەرز "قەراخ، کەوشەن"دا بەدی دەکرێ. رەنگە ئەم پێوەندییەوە لەوەڕا هاتبێ کە مێرگ و چیمەنزارەکان لە شوێنانی بەلاوە، قەراخ شار و گوندەکان یان شوێنە دووردەستەکان هەڵکەوتوون].

**گەڤەزە geveze** [ *gavaza* ] - "خۆهەڵکێش، خۆبەزلزان": خزمە دەگەڵ ↑گەڤ gef "هەرەشە" و ↑گەپ *gep* "گاڵتە" و ↑گەڤین gefîn یان ↑حەپین ĥepîn "وەڕین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین". لەمەوە هەروەها مانای "قسە کردنی سەرسەری" سەرچاوەی گرتووە و یەکێک لەم وشانەی کە ئەم مانایە لەخۆ دەگرێ، وشەی "گەڤەزە"یە. کەرتی ەزە eze- پاشگرە و شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑ئۆز oz.

**گەڤەگژ gevegıj** [ *gavagıž* ] - "سەرقژن، مووتێکاڵاو": پێک هاتووە لە گەڤ gef + گژ gıj. کەرتی "گەڤ" خزمە دەگەڵ قەحف qeĥf یان ↑قاف¹ qaf "کەللە". بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑گژ[6] gıj و ↑گژاندن *gıjandın* "تێکەڵ پێکەڵ کردن".

**گەل gel** [ *gal* ] - "1- زۆر، فرە [گەلێک کەس] 2- مەردم، خەڵک [گەلی کورد] 3- ئاپۆڕە [مێگەل] 4- پاشگری کۆ [کوڕگەل]": ئەم وشەیە بە چەندین مانای جیاواز، بەڵام نیزیک و هاوپێوند بەکار دێ. دە زمانی فارسیدا گلە galle (.P) مانای "*گەلە*ی ئاژەڵان" دەبەخشێ. پێ دەچێ وشەی "گەل" پێوەندی بە یەک لەم دوو وشەی خوارەوە هەبێ.

1- دە شێوەزاری کوردمادی خواروودا دەگوترێ "وە گەردی یەک" واتا "دەگەڵ یەکتر". لەوانەیە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*ger(e)** *(IE.)* "کۆ کردنەوە، خستنە سەریەک". ئەگەر ئەمە راست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەڵ gel "ناوەڕاستی دوو ڕان، تیفەک". وشەکانی gremium (.L) "کۆش"، grex (.L)"مێگەل، کۆما"، ageírein (.Gr) "کۆم بوونەوە"، agorá (.Gr) "مەیدانی کۆ بوونەوە" لەم ریشەوە سەریان هەڵداوە. وشەی *گەڵ* "تیفەک" دە بنەڕەتدا بە "کۆش" گوتراوە واتا شوێنێک کە شتی تێدا کۆ کراوەتەوە [لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "باخەڵ" کە ئەویش شوێنی "باقە" کردنە].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە پێوەندی هەبێ بەو وشانەی کە لەژێر ↑گلوو gılū دا باس کراون. ئەم وشانە ماناکانی "لێکهاڵان، خڕ بوونەوە، تۆپەڵە بوون، پێکەوەنووسان" دەبەخشن.

[تێبینی: وەک لەسەرەوە باس کرا، "گەل" دە زمانی کوردمادیدا هەم بە مانای "فرە، زۆر" بەکار دێ (گەلێک ساڵ، ساڵ گەل) و هەم بە مانای "ئاپۆرە، حەشیمەت" [گەلی کورد]. دیارە دە تیوان ئەو دوو مانایەدا پێوەندی تەواو هەیە، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا viel مانای "زۆر، فرە، گەلێک" دەدا و Volk کە خزمی ئەوە، مانای "گەل، خەڵک" دەبەخشێ. یان هەر دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی "فرە"، "پڕ" و "ئاپۆرە" خزمی یەکترن].

**گەڵ1 gel** [ *gal* ] - وێڕای پرێپۆزیسێونی دە -de، لە -le یان رە re دێ و پرێپوزیسێوتیکی لێکدراو دروست دەکا (دەگەڵ degel، لەگەڵ legel، رەگەڵ regel). ئەم پاشگرە چەمکی "پێکەوە بوون" دەردەبڕێ. خزمە دەگەڵ ↑گەڵ gel.

**گەڵ2 gel** [ *gal* ] - "ناوەڕاستی دوو ڕان، تیفەک": [ناوگەڵ، تیوگەڵ]. ↑گرۆڵ gırol ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ gremium (.L) "کۆش"، grex (.L)"مێگەل، کۆما"، ageírein (.Gr) "کۆم بوونەوە، agorá (.Gr) "مەیدانی کۆ بوونەوە"، سەر بە ریشەی **(.IE) *ger(e)- m <** "کۆ کردنەوە، خستنە سەریەک". "گەڵ" واتا کۆش، ئەو شوێنەیە کە شتی تێدا کۆ کراوەتەوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "باخەڵ" کە ئەویش شوێنی "باقە" کردنە].

**گەڵا gela** [ *galā* ] - "پەلکی دار": خزمە دەگەڵ Graß (.G)، gras (.Gt)، grass (.E)، gramen (.L) " گیا، شینکایی"، grün (.G)، green (.E) "سەوز"، سەر بە ریشەی **(.IE) *ghre- <** "چرۆ کردن، چەکەرە کردن، هەڵدان، گەورە بوون" و دواتر سەر بە ریشەی **(.IE) *gher- <** "تیژ بوون، زەق و دەرپەڕیو بوون". گژ و گیای تازە سەردەرهاتکێ وەک شتیکی زەق و دەرپەڕیو لە سەر هەرد یان بە سەر لک و پۆپی دارانەوە خۆی دەردەخا. دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەندین وشە، لەوانە ↑کلۆش kılos، ↑قرش *qırış* "چڵەگیا"، گووران guran "1- رسکان، سەرهەڵدان 2- پێگەیشتن، کامڵ بوون" و ↑گێرانی geranî "بالغ" و هتد.

**گەلات gelat** [ *galāt* ] - "مفتەخۆر": خزمە دەگەڵ ↑گەلاچ gelaç.

**گەلاچ gelaç** [ *galāč* ] - "1- لات، شەلاتی 2- دەسبڕ، درۆزن و فێڵباز": گەلاج gelac و کەلاج kelac و ↑کەللاش kellaş یش دەگوترێ. هەروەها ↑گەلج gelc هەیە بە مانای "کێشە و دەمبەدەمە". جگە لەم وشانە ↑گەلات gelat "مفتەخۆر" و ↑گەللاس gelas "ئاژاوە، بشێوی، فیتنە"ش هەن کە دەشێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ:

-1 Klatsch (.G) "1- تەقە، دەربە، زەبر 2- چەنەوەڕی، قسەی پاشملە". ئەم وشە ئەڵمانییە سەر بە خێزانەوشەیەکی هیندوئەورووپییە کە وشەی ↑غەڵبە ġelbe ش لەوێدا جێ دەگرێ [غەڵبەغەڵب].

-2 ↑کەڵەک kelek [کەڵەکباز].

**گەلاشان gelaşan** [ *galāšān* ] - "1- وردەی پەڕیوی لۆکە و موو لە هەلاجی و شەن کردندا 2- زبڵ و زاڵی ناو جۆگە کە بەری ئاو دەگرێ": خزمە دەگەڵ ↑هەڵاش helaş.

**گەلال gelal** [ *galāl* ] - "وردەبەردی لووسی ناو چەم": دەشێ خزم بێ دەگەڵ glatt (.G)، glad (.Nl)، gladkij (.Rus) "ساف و لووس"، Glatze (.G) "تاسی، سەری بێموو" [تاس و لووسی]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(.IE) *ghel- <** "درەوشانەوە، ترووسکانەوە" و دەبنە خزم

دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑زێڕ zer و ↑زەرد[1] zerd و هتد. وەک دەردەکەوێ لە مانای "درەوشانەوە، ترووسکانەوە" دواتر مانای "ساف و لووس" پەرەی گرتووە، چونکوو ئەم دوو چەمکە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، واتا شتی ساف و لووس دەبێتە مایەی درەوشانەوە.

**گەلالە gelale** ⌐ *galāla* ¬ - "ئاڵوو، خڕایی گەروو": گەلالووچ (ک) gelaluç(k) یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گلۆڵە gılole و ↑*گلوو gılu* [گلوو گلوو بوون واتا لێکهاڵان و تۆپەڵە بوونی شت]، سە بە ریشەی **< -gle* (IE.)** "خڕ بوون، تۆپەڵە بوون، رێککوشران".

**گەڵاڵە gelale** ⌐ *galāla* ¬ - "تەرح، پێشنووس": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گلۆڵە gılole و ↑گلوو gılu [گلوو گلوو بوون واتا لێکهاڵان و تۆپەڵە بوونی شت]، سە بە ریشەی **< -gle* (IE.)** "رێکگوشران، خڕ بوون، تۆپەڵە بوون". گەڵاڵە کردن دەبێ بەم مانایە هاتبێ کە هێندێک بیرۆکە یان خاڵی جۆراوجۆری پێوەندیدار بە بابەتێک لە تۆیی تەرح یان پێشنووسێکدا کۆ دەکرێتەوە [گلۆڵە دەکرێن]. یان لەوانەیە ئەم وشەیە هاومانای وشەی فارسی "جمعبندی" یان وشەی ئەڵمانی Zusammenfassung بەکارهاتبێ کە ماناکەی دەبێتە کۆ کردنەوەی باسێک لە کورتەیەکدا.

**گەلاوێژ gelawej** ⌐ *galāwež* ¬ - "1- ناوی ئەستێرەیەکی گەش 2- ناوی دووەم مانگی هاوین": دەبێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی گەل + ئاوێژ gel + awej، بە مانای "تیشک هاوێژ". کەرتی -gel دەشێ پێوەندی هەبێ بە glühen (G.)، gloeien (Nl.)، glow (E.)، glo (Sw.) "هایسان، سوور بوونەوە"، glitzen (G.)، gleißen، glita (OIs.) و glitenian (OE.) "درەوشانەوە، هایسان"، سەر بە ریشەی **-ghel* (IE.)** "درەوشانەوە، ترووسکانەوە" دە زمانی کوردمادیدا ↑زێڕ zer، ↑زەرد zerd، ↑زۆڵ zol [زەرد و زۆڵ zerd u zol] و لەوانەشە ↑کل[3] kıl "درەوشانی هەسارە، تینی ئاگر" لەم ریشەوە هاتوون. کەرتی دووەم، واتا "هاوێژ" سەر بە کرداری ↑هاویشتن hawîştın ە.

**گەڵپ gelp** ⌐ *galp* ¬ - "بەتاڵایی لاشەویلکە": خزمە دەگەڵ klieben (G.) "قەڵشین"، Kluft (G.) "کەلێن، قوولایی تیوان"، klofi (OIs.) "قەڵش، کەلێن، ئەنبار، خەڵوەتی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -gleubh* (IE.)** "کوتان، قەڵشاندن، برین". لەم تیڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گوڵبێنە gulbene [کێلبە kelbe].

**گەلج gelc** ⌐ *galj* ¬ - "کێشە و دەمبەدەمە": گەلش gelş یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گەلاچ gelaç.

**گەللاس gelas** ⌐ *galās* ¬ - "ئاژاوە، بشێوی، فیتنە": خزمە دەگەڵ ↑گەلاچ gelaç.

**گەلواز gelwaz** ⌐ *galwāz* ¬ - "سەرما و بەستەڵەکی لەنەکاو": خزمە دەگەڵ ↑گلێرە gılêre سەر بە ریشەیەک بە مانای "مەیین، رەق بوون، بەستن".

**گەڵواز gelwaz** ⌐ *galwāz* ¬ - "گۆرانییەکی تایبەتی لە کاتی چرۆ دەرکردنی دار و درەختدا": ↑گەل gel + ↑(ئا)واز (a)waz. کەرتی گەل لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ چەندان وشەی وەک ↑گەلۆ gelo، ↑گالین galîn، ↑گاڵ gal [گڕ و گاڵ]. لەم تیڕوانینەوە هەردووک کەرتی وشەکە هەم "گەل" وهەم "ئاواز" دە بنەڕەتدا مانای "هەرا کردن، دەنگ هەڵبڕین" دەبەخشێ. [جۆرێک لە دروست کردنی وشە لە دۆخی جەخت کردندا]. خۆ ئەگەر ئاوازەکە ئاوازێکی بەکۆمەڵ بێ، ئەوسا کەرتی "گەل" دەشێ بە مانای "کۆمەڵ، ئاپۆڕە" بێ.

**گەڵوازە1 gelwaze** ⌐ *galwāza* ¬ - "فڕینی بە کۆمەڵی پەلەوەر" گەڵبازە gelbaze ش دەگوترێ. ↑گەل gel "گشت، ئاپۆڕە، پۆل" + وازە waze "بزووتن، رۆیشتن، دوور کەوتنەوە، فڕین". کەرتی

دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑بزووتن *bızûtın*، ↑پەرەوازە perewaze، ↑لانەواز lanewaz، ↑بازرە bazre و هتد.

**گەڵوازە2 gelwaze** ] *galwāza* [ - "1- رستەمووروویی سوور و شین کە بە بێشکەوە هەڵدەواسرێ 2- گوێز و هەنجیری بە بەندەوە کراو": گەڵ gel + وازە waze. کەرتی "وازە" خزمە دەگەڵ ↑هەڵاوەسین hel-(a)wesîn ]هەڵواسین hel-wasîn[. کەرتی یەکەم لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ جاڵ cal "تاڵ، دەزوو، بەند" ]↑جاڵجاڵووکە calcaluke[ و مەبەست بەندەکە بێ. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "بەندی هەڵواسراو، بەند بۆ هەڵواسین".

**گەڵۆ[1] gelo** ] *galo* [ - "جۆرێک گۆرانی": خزمە دەگەڵ ↑گالین galîn "گۆرانی گوتن" و چەندان وشەی دیکە.

**گەڵۆ[2] gelo** ] *galo* [ - "1- ( ئەی) خەڵکینە، (ئەرێ) خەڵکینە 2- ئەرێ، ئایا": دەچێتەوە سەر ↑گەڵ gel "خەڵک". پاشگرێ ↑ئۆ -o نیشانەی بانگ کردنە. مانای بنەڕەتی وشەکە "ئایا" نییە. ئەم مانایە دواتر و لێرەوە پەیدابووە کە وشەکە زۆرتر لە دۆخی پرسیارکردندا بەکار هاتووە، بۆوێنە گوتراوە "گەڵۆ چ بکەین؟ گەڵۆ بڕۆین؟". مەبەست لێرەدا ئەوە بووە کە "(ئەرێ) خەڵکینە چ بکەین؟ خەڵکینە (ئایا) بڕوین؟".

**گەڵۆز geloz** ] *galoz* [ - "ناوگەڵ" ]بۆ سەگ بەکاری دەهێنن[. گەڵۆس gelos یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑گەڵ gel ]ناوگەڵ[.

**گەلهە gelhe** ] *galha* [ - "نفووس": ]گەلهەیێ کوردستان واتا نفووسی کوردستان[. دەچێتەوە سەر ↑گەڵ gel "خەڵک، مەردم".

]تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی Bevölkerung (G.) "نفووس" دەچێتەوە سەر Volk "گەل"[.

**گەلی gelî** ] *galī* [ - "دۆڵی تەنگ": گیڕ gîr یش دەگوتری بە مانای "شیوەڵە". ↑گیڕ gîr یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ gully (E.) "دۆڵی تەنگ، کەندری قووڵ". هەرچی وشە ئینگلیزییەکەیە، دەچێتەوە سەر gula (L.) "گەروو". لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑گەروو geru ]گلو gelu (P.)[.

**گەمار gemar** ] *gamār* [ - "پیس و چڵکن": خزمە دەگەڵ schmieren (G.)، smeren (Nl.)، smear (E.)، smörja (Sw.) "چەور کردن، تێهەڵسوون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر وشەیەکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "رۆن" و دەشێ دەگەڵ ↑هەویر hewîr ]دە فارسیدا xamīr (P.)[ خزم بن. هەر لە کۆنەوە دەتیوان دوو چەمکی چەوری و چڵکنی دا پێوەندی ساز کراوە و ئەم پێوەندییە ئەمڕۆش دە زمانە جۆربەجۆرەکاندا دیارە. دە زمانی کوردەمادیدا بۆ وێنە دەگوترێ چەور و چڵۆک واتا پیس و چڵکن. هەروەها دە زمانی ئاڵمانیدا Schmierpapier (G.) هەیە بە مانای "(کاغەزی) رەشنووس، چڵکنووس". لە لایەکی دیکەوە وشەی قمل qiml (Arb.) بە مانای "ئەسپێ" دە زمانی عەرەبیدا سەرنج رادەکێشێ و لەبەر ئەوەی چڵک و ئەسپێ پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، دەشێ لێی بکۆڵدرێتەوە کە وشە عەرەبییەکە پێوەندی بەم وشانە هەیە یان نا. هەروەها بڕوانە ↑گەمر gemır "ناحەز".

**گەمارۆ gemaro** ] *gamāro* [ - "دەورە دان، موحاسەرە": دەچێتەوە سەر بنەوشەی کەم -gem و لەوێشەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەمە keme "داری دەوری دەفە" و ↑کەوان kewan ]کەمان keman[.

**گەماڵ gemal** ] *gamāl* [ - "سەگ": خزمە دەگەڵ ↑سەواڵ sewal "ئاژەڵی بچووک، مەڕ و ماڵات".

گەمبۆڵ **gembol** [ *gambol* ] - "1- گوڵەسەگی پیر 2- زۆر پیری موو چەرمگ": خزمە دەگەڵ gammeln (.G) "کون بوون، رزین، لە کەڵک کەوتن"، gammeln (.MNl) "پیر بوون"، gamol (.OE)، gammal (.Sw) "پیر" و هەروەها ↑خەمڵین xemlîn "پێ گەیستن، کامڵ بوون" دە زمانی کوردمادیدا. وشەی کامل kamil (.Arb) دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لەوانەشە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

گەمر **gemır** [ *gamır* ] - "ناحەز": هەروەها گەمراندن gemrandın هەیە بە مانای "ناحەز کردن، کرێت کردن". پێوەندی هەیە بە ↑گەمار gemar "پیس، چڵکن".

گەمڕ **gemır** [ *gamır* ] - "لەت و پەت، پارچەی ورد": هەروەها گەمڕاندن gemrandın هەیە بە مانای "لەت و کوت کردن، ورد و خاش کردن". دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑قیمە *qîme* [گۆشتی قیمە واتا گۆشتی وردکراو] و هەروەها ↑گەمشاندن gemşandın "دارکاری کردن، لێدان، کوتان".

گەمڕ **gemr** [ *gamır* ] - "نیوەکوڵیو": [دە بنەڕەتدا: هێشتا رەق]. خزمە دەگەڵ ↑حەمرین *ħemrîn* "چیایەک لە کوردستان" و ↑خاو xaw [بە فارسی: خام xām] "نەکوڵیو، پێنەگەیشتوو" .

گەمڕە **gemre** [ *gamra* ] - "پترۆی برین": ↑کەپرە kepre و ↑کەوەرە kewere ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گەمڕ gemr "نیوەکوڵیو" و ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین *ħemrîn* "چیایەک لە کوردستان"دا باس کراون. ئەم وشانە بەگشتی مانای "رەق، سەخت" لە خۆ دەگرن و دەچنەوە سەر ریشەی **< *(a)k(ā)men-** ***(IE.)*** "بەرد". مەبەست لە "گەمڕە"، "کەپرە" یان "کەوەرە" ئەو تۆێژە رەقەیە کە لە شوێنێکی برینداردا دروست دەبێ، واتا برینەکە خۆی دەگرێتەوە و گۆشت و پێست جێگەی دەڵەمەخوێنەکە دەگرێتەوە.

[تێبینی1: ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری *ak-* *(IE.)* "تیژ". وشەی ↑ئاسمان asman بۆ ریشەکەی سەرەوەتر دەگەڕێتەوە. "ئاسمان" لە بەر چاوی مرۆڤانی کەونارا وەک تاقێکی بەردین ئەژمێر کراوە کە هەردی داپۆشیوە. ئەم پێوەندییانە وای کردووە کە ریشەیەکی دیکەش، واتا ریشەی *kem-** *(IE.)* "داپۆشین، لێهاڵاندن" بێتە ئاراوە کە ژمارەیەک وشەی دەچێتەوە سەر، وەک ↑جامە came. تێبینی 2: وەک باس کرا، ناوێکی دیکە بۆ گەمڕە، بریتییە لە "پترۆکە، پەترۆ(کە)". ئەم وشەیەش دە ریشەدا بە مانای "رەق و سەخت بوون"ە].

گەمژە **gemje** [ *gamža* ] - "شێتۆکە، کەم ئاوەز": ↑گەوج gewc یش دەگوترێ. فۆتیمی m کۆنترە لە w و دەشێ وشەکە پێشتر "گەمج(ە)" یان "گەمز(ە)" بووبێ. خزمە دەگەڵ ↑گەوز *gewz* "هێڵی خوار، هێلی کەوانەیی، قەوس". [قوس qaws (.Arb) لە زمانی کوردمادی وەرگیراوە]. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە کە بۆ دەربڕینی لەش نەساخی و کەمەندامی دانراون، دەگەڕێنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "خوار بوون، با دران، سووڕان" دەبەخشن، بۆ وێنە دە کوردمادیدا وشەکانی شەل، چەوێڵ، گیڕ، خێل، گۆج و هتد. هەر بەم شێوەیە هێندێک وشەش کە ئاماژە بە ناتەندروستی مێشک دەکەن، پێوەندییان بەو ریشانەوە هەیە و مەبەست ئەوەیە کە مێشکی مرۆڤە نەساخەکە خوارە، با دراوە و راست و دروست نییە، بۆ وێنە حۆل، گێژ، گێل، وڕ، کاس و هتد. وشەکانی "گەوج" یان "گەمژە"ش خزمن دەگەڵ ↑گەوز gewz و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "خوار بوون" دەکەن، بۆ وێنە ↑کەمچ kemç "خوار و خێچ"، ↑قەمس qems "گزی، ناراستی"، ↑قەمبوور qembur "پشتکووڕ"، ↑چەموور çemur "لاسار"، ↑چەمووش çemûş "سەرشێت"، ↑قەوچ qewç "1- دەم خوار 2- گێلۆکە"، ↑کەمشۆ kemşo "گەمژە"، ↑کەمۆ kemo "کەڵەکباز"، ↑کەوشین kewşîn "بوورانەوە، لەخۆ چوون" [دەبنەڕەتدا: بەلادا هاتن، خوار بوونەوە]، ↑گەوشەک gewşek "سەرلێشێواو، سەرگردان"، ↑کەوشەن

kewşen "سنوور" [ده بنەڕەتدا: موحیت، جەغز، هێڵی بازنەیی] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *kam(p)- <* "چەمانەوە".

**گەمشاندن gemşandın** [ *gamšāndın* ] - "دارکاری کردن، لێدان": خزمە دەگەڵ ↑قامچی qamçî.

**گەموورە gemure** [ *gamūra* ] - "خۆراکی لیچق کە بە لێوەوە دەنووسێ": خزمەن دەگەڵ ↑گەمار gemar "پیس و چڵکن".

**گەمە geme** [ *gama* ] - "کایە": خزمە دەگەڵ game (E.)، gamen (OE.)، gomen (OG.) "گەمە کردن". ڕیشەکەی نەدۆزراوەتەوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ قمار qimar (Arb.). وشەی قومار دەشێ لە زمانی کۆنی کوردمادی وەرگیرابێ، بەتایبەتی بە سەرنج دان بە پاشگری ar- کە پاشگرێکی چالاکە بۆ دروست کردنی ناو لە زمانی کوردمادی و فارسیدا.

[تێبینی: وشەی قومار qumar دە بنزاراوەی مەهابادیدا هاومانای "کایە، یاری" بەکار دێ و ئەمەش شیمانەی ئەوە بەهێزتر دەکا کە وشە عەرەبییەکە بە ئەسڵ کوردمادی بێ. دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی Spiel (G.) بە هەر دوو مانای "کایە، بازی، یاری" (منداڵان) و "قومار(ی لەسەر پارە و پووڵ)" بەکار دێ].

**گەمێ geme** [ *game* ] - "کەشتی (بچووک)": خزمە دەگەڵ ↑جام cam "دەفر".

**گەنج¹ genc** [ *ganj* ] - "خەزێنە": گنج ganj (P.). کاتێک لە مانای بنەڕەبی و ریشەی ئەم وشەیە بکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە دە ڕاستیدا بە مانای "زێر و زیو" یان "پارە"ی زۆر و زەوەندی حەشار دراو نەبووە، بەڵکوو بە شوێنێکی هەڵکەندراو یان کۆڵدراوی هەرد یان دار و دیوار گوتراوە کە خەڵکی دەوڵەمەند لە ترسان زێڕ و زیو یان پارەی زەبەلاحیان تێدا کەڵەکە کردووە و شاردوویانەتەوە. لەم بارەوە وشەکە هەر وەک ↑کان kan "مەعدەن" وایە، کە ئەویش وەک "گەنج" دەچێتەوە سەر کرداری ↑کەندن kendın [هەڵکەندن]. شتێک کە ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا، بوونی دوو وشەی ↑کانتۆر kantor "دۆڵابی جلکان، شکاف" و ↑گەنجە gence "خەڵوەتی، ژووری ئازووقە"یە. پێوەندی وشەی "کانتۆر" بە "کەندن"ەوە پڕ ئاشکرایە، چونکوو وشەکانی دیکەی هاومانای کانتۆر، واتا "دۆڵاب" و "شکاف" پێوەندی بەو وشانەوە پەیدا دەکەن کە ماناکانی "قووڵایی، قووپاوی، کون و کەلێن" دەردەبڕن، بۆ وێنە "دۆڵاب" خزمە دەگەڵ "دۆڵ" و "شکاف"یش خزمە دەگەڵ "ئەشکەوت" [شکەفت]. ئەوجار سەبارەت بە وشەی "گەنجە"، شیاوی باسە کە ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا مانای "شکاف، دۆڵاب" دەبەخشێ. دە زمانی کوردمادیدا ماناکەی دەبێتە "خەڵوەتی" واتا دیوەلکەی بچووکی پشتەوە. دیارە دە سەردەمانی بەرێدا شکاف، دۆڵاب، گەنجە و هەروەها خەڵوەتی وەک سەردەمی ئێستا لە رووی نەخشە و بەشێوەی ئەندازیاری دروست نەکراون، بەڵکوو دیواری پشتەوەی هۆدەیەک کە زۆر جار پشتی بە شاخ و داخەوە بووە، کۆڵدراوە و بۆشاییەکی کەم یان زۆر لە پشت دیوارەکەوە ساز کراوە، جا ئەگەر ئەم بۆشاییە بچووک بووبێ، ئەوا وەک "دۆڵاب" کەڵکی لێوەرگیراوە و ئەگەریش پان و برینتر و قووڵتر بووبێ، کراوە بە "خەڵوەتی" و کەلوپەل و ئازووقەی تێدا هەڵگیراوە. هەڵسەنگاندنی ئەم وشانەی سەرەوە و ماناکانیان، بە ڕوونی دەری دەخا کە دە هەموو وشەکاندا مەبەستی بنەڕەتی "شوێنێکی هەڵکەنراو، کۆڵدراو، قووڵ کراو" بووە کە شتتیان تێدا هەڵگرتووە.

[تێبینی: بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە مانا و ریشەی وشەی ↑خەزنە xezne یان ↑خەزێنە xezene شمان بۆ روون دەبێتەوە. وەک دە زانین ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادی

و فارسیدا هەم مانای "حەوزی حەمام" و هەمیش مانای "گەنج، گەنجینە" دەبەخشێ. لێرەوە ئەمە دەردەکەوێ کە مانای بنەڕەتی "خزنە، خەزێنە" چ پێوەندییەکی بە زێڕ و زێو و پارەوە نەبووە، بەڵکوو شوێنێکی هەڵکەنراو (کۆڵدراو) بووە بۆ تێدا کۆ کردنەوە و تێدا ڕاگرتن بە گشتی. وشەی ↑گەزنە gezne "خەڵوەتی" ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا. هەر لە درێژەی ئەم باسەدا جێگەی خۆیەتی سەرنجێکی وشەی "خەڵوەتی"ش بدەین. زۆر وێ دەچێ ئەم وشەیەش خزم بێ دەگەڵ ↑گوڵبێنە gulbene "کوتیکە لە بنەوەی تەنوور، باکێشی تەنوور"، سەر بە ڕیشەی *gleubh- (IE.) "کوتان، قەڵشاندن، بڕین"، واتا مانای "خەڵوەتی"یش دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە شوێنێکی "قەڵشێنراو و کۆڵدراو".]

**گەنج² genc** [ *ganj* ] - "لاو، جەوان": هەرچەند "گەنج" خۆی زێڕ و زێو و سەرمایەی گەڵ و وڵاتە، بەڵام ئەم وشەیە پێوەندی بە گەنج "خەزێنە"وە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ Kind (.G) و (.Nl) "زارۆک"، gnatos (.OL) "زارۆک"، jāta (.OIn) "لەدایک بوو، زادە". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها کۆنتۆ konto یان ↑کەندۆ kendo بە مانای "گوێلپار" هەیە. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑کەنی kenî، ↑ژن jın، ↑زان *zan* و هتد.

**گەنجە1 gence** [ *ganja* ] - "خەڵوەتی، ژووری ڕسق و کەلوپەل": بڕوانە ↑گەنج¹ genc.

**گەنجە2 gence** [ *ganja* ] - "گاڵتە و گەپ": خزمە دەگەڵ ↑گەنگەڵ gengel.

**گەندار gendar** [ *gandār* ] - "مەشکەی لە دار یان تەنەکە": بنجی "گەن" خزمە دەگەڵ ↑ژەندن jendın. کەرتی دووەمیش دەشێ پێوەندی بە ↑دار dar ەوە هەبێ.

**گەنگەڵ gengel** [ *gangal* ] - ↑گۆنگەڵ gongel یش دەگوترێ.

**گەنە gene** [ *gana* ] - "زیلەیەکە بە پێستی ئاژەڵەوە دەنووسێ و لە خوێن مشتن تێر نابێ": کنە kane (.P). خزمە دەگەڵ nagen (.G)، (g)nagan (.OG)، gnaw (.E)، gnaga (.Sw) "جووتن"، سەر بە ڕیشەی **< -*gh(e)nə (.IE)** "جووتن، گەستن، خوراندن، کراندن". Aiwī-γnixta (.Av) "خوراو، جووتراو" لەم ڕیشەوە هاتووە. هەروەها gnat (.E)، gna t (.OE)، Gnitte (.MG)، gnitze (.G) "جۆرێک مێشوولە" پێوەندی بەم ڕیشەی سەرەوە هەیە.

**گەنین genîn** [ *ganīn* ] - "فاسید بوون": دەشێ پێوەندی هەبێ بە وشەی ↑ئاخنین axnîn کە خۆی دەچێتەوە سەر ڕیشەی **< -*gan (.IE)** بە مانای "با کردن، هەڵمسان". لەم تێڕوانینەوە "گەنین" دەبنەڕەتدا بەمانای "باکردوویی و هەڵمسان"ی شتی ئۆرگانی بووە کە بە هۆی ئەو گازانەوە پێک دێ کە باکترییەکان لە ڕەوتی ڕزین و هەڵوشانی ئەو شتانەدا دروستی دەکەن.

**گەو1 gew** [ *gaw* ] - شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گاو gāw.

**گەو2 gew** [ *gaw* ] - "زنجی سەردانەپوشراو بۆ ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا باس کراون.

**گەواڵ gewal** [ *gawāl* ] - "دەستە": خزمە دەگەڵ ↑کەڤاشتن kevaştın "ورد ورد کردن، کەرت کەرت کردن"، ↑کەڤا keva "ورتکە نان کە بۆ چنینەوەی پەلەوەر دەیرێژن"، ↑کەڤاڵ keval هەیە بە مانای "دەستە(پەز)، کەرتە(پەز)، بەشێک (لە مێگەل)". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قەمە *qem(m)e* "شمشێری کورت" و ↑قیمە qîme "وردکراو". کەڤاڵ یان گەواڵ دە بنەڕەتدا واتا لەتێک لە گشت.

[تێبینی: وشەکانی "کەرکە" و "کەرت" (کەرکەپەز، کەرتەپەز)یش هەر ئەم مانایە دەبەخشن و خزمن دەگەڵ "کرتاندن" و دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "لەت کردن"].

**گەوج gewc** [ *gawj* ] - "شێتۆکە، کەم ئاوەز": شێوەیەکی تازەتر لە ↑گەمژە gemje.

**گەوجە gewce** *[ gawja ]* - "هەڵووچەی بەهارە": گوجە gouje (P.) "هەڵووچە" و goujefarangī (P.) "تەماتە". خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گوێز goez، ↑گۆیژە goyje یان گڤیشک gıvîşk، ↑گڤشک gıvışk "ئەنگوتەهەویر" و دواجار ↑گۆ *go*. ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە شتی خڕ و گۆیین دەکەن.

[تێبینی: وەک دەبینرێ، وشەی "گوجە" دە زمانی فارسیشدا سەرەتا بە مانای "هەڵووچە" بووە. دواتر کاتێک "تەماتە" پەیدا بووە، ئەمیان وەک "گەوجەفەرەنگی" واتا هەڵووژەی ئەورووپی بەناو کردووە. ئەم جۆرە ناو لێنانە بۆ هێندێک لە بەرهەمەکان لەناو زمانە جۆربەجۆرەکاندا باوە. بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا بە "زۆرات" دەگوترێ "گەنمەشامی"، یان دە فارسیدا بە "چلیک" دەگوترێ "توت فرنگی". دە زمانی ئەڵمانیدا بە "پرتەقاڵ" دەگوترێ Apfelsine (سێوی چینی، چینەسێو)، واتا ئەڵمانییەکان ناوی ئەم میوەیان بۆ وڵاتی چین گەڕاندۆتەوە و ئێمەش بۆ وڵاتی پرتەقاڵمان گەڕاندۆتەوە. هەروەها ژێرمەنەکان بە "شەلیل" دەبێژن Pfirisch و ناوەکە دەچێتەوە سەر persicus (لاتینی)، چونکوو رۆمییەکان لەرێگەی فارسەکانەوە دەگەڵ ئەم دارەمیوەیە ئاشنا بوون].

**گەوخان gewxan** *[ gawxān ]* - "تەنگەنەفەس بوون، خنکان لەبەر تەنگەنەفەسی":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑کۆخین koxîn ەوە هەبێ.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە چەند وشەیەکی وەک ↑ئەوک ewık "یەخە، بەرۆک" و ↑ئاوقا awqa یان ↑عەوق ɛewq "قەتیس، دە گیرکەوتوو". لەم تێڕوانینەوە "گەوخان" دەتوانێ بە مانای "گیر کردن"ی هەناسە بێ.

**گەوراندن gewrandın** *[ gawrāndın ]* - "سپی کردنەوە": چەند وشەیەکی دیکەش هەر لەم پێوەندییەدا جێی باس کردنن، وەک ↑گەوری gewrî "سپێنەی هێلکە"، ↑گەورۆ gewro "سپی پێست"، ↑گەورەک gewrek "1-مووزەررد 2- بۆر"، ↑گەڤۆزە gevoze "موو ماش و برینجی"، ↑کەڤەر kever "1- سپی واش 2- بەڵەک"، کەڤەز↑ kevez "بەڵەک ". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑کەوە kewe "شینی کاڵ، بۆری کاڵ".

**گەورک gewırk** *[ gawırk ]* - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ ↑گەورە *gewre* "مەزن" سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت و بەهێز بوون". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گەبرگە gebırge "جۆرێ کایەی زۆرخانە".

**گەورۆ gewro** *[ gawro ]* - "مرۆڤی سپی پێست": ↑گەورەک gewrek یش هەیە بە مانای "مووزەردی ئاماڵ سوور". هەروەها گەورێ gewre هەیە بە مانای "ژنی سپی پێست" کە ناویشە بۆ "ژنان". خزمە دەگەڵ ↑گەوراندن gewrandın "سپی کردنەوە".

**گەورە gewre** *[ gawra ]* - "مەزن": گەڤار gevar یش دەگوترێ. هەروەها ↑کوبار kubar هەیە بە مانای "مرۆڤی بەڕێز و بە حورمەت" [دە بنەڕەتدا: مەزن]. ئەم وشەیە سەرەتا بە مانای "مەزن" نەبووە، بەڵکوو وشەی "مەزن" ئەو مانایەی گەیاندووە کە هەرئێستا دە شێوەزاری سەرووردا بەکار دێ. دە زمانە ئەورووپییەکانیشدا خزمەکانی وشەی "مەزن" بەرچاو دەکەون کە هەمان مانا دەبەخشن. وشەی "گەورە" دە بنەرەتدا بە مانای "سەخت، دژوار، بەهێز، بە هەیبەت" بووە و پاشان لەم مانایەوە مانای "مەزن" سەری هەڵداوە. بۆ وێنە کاتێک باس لە رووداوێکی گەورە یان شاخێکی گەورە کراوە، مەبەست دژوار بوون و بە هەیبەت بوونی رووداوەکە یان شاخەکە بووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑زۆر² *zor* "هێز، گوشار، سەختی". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گاوور gawır [دەبنەڕەتدا: گەورەی ئایینی زەردەشتی].

پێوەندی دوو چەمکی "مەزن بوون" و "سەخت و بەهێز بوون" ئاشکرایە. شتی مەزن یان مرۆڤی مەزن خاوەنی هێز و قورساییە. هەروەها شتێك یان كەسێكی "سەخت و بە هێز" بەگشتی شتێك یان كەسێكی مەزنە. بوونی ئەم پێوەندییە وای كردووە كە ئەم وشانە ماناكانیان تارادەیەك تێكەڵ بە یەكدی ببێ.

[تێبینی 1: وشەی "گەورە" سەرەتا وەك وشەی ئەڵمانی gewaltig (G.) بەكار هێنراوە. ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "سەخت و بەهێز بوون، زاڵ بوون" و خزمیشە دەگەڵ *پاڵەوان* دە زمانی كوردمادیدا. ئەم وشە ئەڵمانییە هەم مانای "زۆر سەخت و بە هێز، زۆر بە زەبر" دەدا و هەم مانای "زۆر گەورە و زەبەلاح"، بۆ وێنە gewaltiger Sturm "تۆفانی زۆر سەخت و بەهێز، تۆفانی مەزن و زەبەلاح" یان gewaltige Felsen "گاشەبەردێن زەبەلاح".
تێبینی 2: وشەی كبیر kebîr (Arb.) دەشێ لە "گەبر" وەرگیرابێ كە شێوەیەكی دیكەی وشەی "گەورە" لە كۆندا بووە].

**گەورەك gewrek** [ *gawrak* ] - "1-مووزەررد 2- بۆر": خزمە دەگەڵ ↑گەوراندن gewrandın "سپی كردنەوە".

**گەوری gewrî** [ *gawrī* ] - "سپێنەی هێلكە": خزمە دەگەڵ ↑گەوراندن gewrandın "سپی كردنەوە".

**گەوز1 gewz** [ *gawz* ] - "1- دروێنەی پری داسێك 2- تل (خواردن)": هەروەها گەوزین gewzîn [یان گەوزان] هەیە بە مانای "تل خواردن لەسەر تەنیشت". شێوە كۆنترەكەی دە زاراوەی كوردمادی سەروودا بریتییە كە ↑گەڤز gevz و گەڤزان gevzan. وشە كوردمادییەكە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و كراوە بە قوس qaws (Arb.) "هێلی كەوانی، نیوەجەخز". سەرەتا سەبارەت بە مانای وشەكە دە زمانی كوردمادیدا: مانای یەكەم واتا "دروێنەی پری داسێك" ئاماژە بەو هێڵە گەوزییە دەكا كە لەكاتی لێدانی داس و مەلەخاندا دروست دەبێ، واتا داس و مەڵەخان لە كاتی دروێنەدا بە شێوەیەكی گەوزی یان قەوسی [هەر جارەی بە گەوزێك] لە پەڵەگیایەكە دەدا و دەیبڕێتەوە. لە مانای دووەمدا واتا "تل خواردن لە سەر تەنیشت"، دیسان ئاماژە دەكرێ بەو هێڵە فەرزییەی كە شێوەیەكی گەوزی هەیە و لەكاتی تل خواردندا دروست دەبێ یاخود تل خواردنەكە لەسەر ئەو هێڵە گەوزییە روودەدا. بۆ وێنە كاتێك كەر یان ئەسپ لەسەر هەرد دەگەوزێ، بە هەر تلێك و خۆ وەرگەڕاندنێك بەم بەر و ئەو بەردا هێڵێكی فەرزی دە حەوادا دروست دەكا كە شێوەیەكی گەوزی یان كەوانی هەیە. بزوانی گەوزی وەك خۆ گەوزاندنی كەر، بزواتێكە بە رادەی 180 پلە، بە پێچەوانەی چەرخان یان سووڕان كە بزواتێكە بەرادەی 360 پلە. بەم شێوەیە دەبینین كە مانای "گەوز" دە بنەڕەتدا بریتییە لە هێڵ یان دۆخێكی كەوانی و نیوجەخزی (نیودایرەیی). "گەوزین" بە مانای "گەوز لێدان" یاخود قەوس لێدانە، هەروەك چۆن دەتوانین بڵێین دەور و دەور لێدان، خول و خول لێدان یان چەرخ و چەرخ لێدان و هتد. ئێستا بێینە سەر ریشەی وشەكە. شێوەی گەڤز gevz دە شێوەزاری كوردمادی سەروودا شێوەی كۆنتری وشەكە نیشان دەدا. لە لایەكی دیكەشەوە دەزانین كە فۆتیمی v دە زۆر وشەی كوردمادی باكووردا، دەبنەڕەتدا m بووە كە بووەتە v و دواتریش دە كوردمادی ناوەڕاستدا بووەتە w (وەك "نیم" دە فارسیدا كە دە كوردمادیدا دەبێتە "نیڤ، نیو" یان "داماد" كە دەبێتە "زاڤا، زاوا" و هتد). بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەشێ وشەكە ببەستینەوە بە چەندین وشەی دیكە كە ئاماژە بە چەمكی "چەمان(ەوە)" دەكەن، وەك ↑كەوان keman [كەمان kamān (P.)]، ↑كەمە keme "داری دەوری دەفە"، ↑كەمەر kemer، ↑گەوە gewe "1- نیوەجەغز 2- قەدی

کێو، بەروار"، ↑گاو gaw "نیوەئاڵقە، تیلی چەماو"، ↑گەمارۆ gemaro، ↑کەمەند kemend و ↑گەوشەک gewşık "سەرلێشێواو، سەرگردان" و هتد.ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی < *(IE.) *kam(p)-* "چەمانەوە".

**گەوز gewz 2** [ *gawz* ] - "شلووق و قەرەباڵغ": [جڤات گەوزە]. دەچێتەوە سەر < *(Gr.) cháos*. ئەم وشەی دە زمانی یۆنانی کۆندا بە مانای "بۆشایی هەراوی ئاسمان" بەکار هاتووە. دواتر دە زمانی لاتینیدا ئەم مانایەی بۆ کراوە: "بەرەماددەی (Urmasse) بێقەوارەی جێگرتوو لە تاریکایی بێ پایاندا". ئەم وشەیە دە زمانە ئەورووپییەکاندا مانای "تێکەڵ پێکەڵی، بشێوی، کەس بەکەس"ی وەرگرتووە. هەروەها وشەی ئەورووپی گاز gas "شێوەیەک لە شێوەکانی ماددە" [کە تێیدا وردیلەکان ڕەها و شلۆق و تێکەڵ پێکەڵن] لەم وشەیە وەرگیراوە. دە زمانی کوردمادیدا کاتێک گوتراوە "جڤات گەوزە"، ئاماژە بە شلۆقی و تێکەڵ پێکەڵی زۆر کراوە.

**گەوشت gewışt** [ *gawıšt* ] - "هەوایەکی گۆرانی": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑قاو qaw "بانگ کردن، هەرا کردن". دوور نییە لە کۆندا کردارێکی وەک "گەوشتن/ گاوشتن" لە ئارادا بووبێ.

**گەوشەک gewşık** [ *gawšık* ] - "سەرلێشێواو، سەرگردان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گەوز[2] gewz "کائۆس"دا باس کراون.

**گەوە gewe** [ *gawa* ] - "1- نیوەجەغز 2- قەدی کێو، بەروار": خزمە دەگەڵ ↑کەمە kama "کەوانە". دە زمانی فارسیدا "بەروار" دەبێتە "کمرە کوە" واتا کەمەرەی کێو. دیارە "کەمەر" یش خۆی پێوەندی هەیە بە "کەمە"وە.

**گەوەر gewer [1]** [ *gawar* ] - "دەشتی مەزن": کویر kavîr (P.) "سەحرا". شێوەی کونتری ↑گۆڕ[3] gor "دەشت، ئارا". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەوەڕ2 gewer "1- تەویلە 2- شکیر، کەلینەشاخ".

**گەوەڕ gewer 2** [ *gawar* ] - "1- تەویلە 2- شکیر، کەلینەشاخ": گەوڕ gewr یش دەگوترێ. مانای ئەسڵی وشەکە شکیر و کەلێنەشاخ [ئەشکەفت]ە و دواتر ماناکەی پەرەی گرتووە بۆ "تەویلە". خزمە دەگەڵ ↑گاباره gabare و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە کە لەژێر ↑کون *kun* دا شی کراونەوە.

**گەوهەر gewher** [ *gawhar* ] - "1- بەردی زۆر بەنرخ 2- کاکڵ و ناوەڕۆک [گەوهەر یان جەوهەری باسەکە]": گوهر go(u)har (P.). لە زمانی کوردمادیدا گەوەر gewer یش وەک ناوی ژنان بەکار دێ. وشەکە لە زمانی کوردمادی یان فارسییەوە گوازراوەتەوە بۆ زمانی عەرەبی و بووەتە جوهر jawhar و جواهر jawāhir (Arb.). وشە عەرەبێنراوەکە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و لەپاڵ وشە کوردمادییەکەدا بەکار دێ. کاتێک مانای یەکەم و دووەمی وشەکە لەگەڵ یەکتر هەڵسەنگێنین، بەو ئەنجامە دەگەین کە مانای بنەڕەتی وشەکە "بەرد" بووە. وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑کەڤر kevır "بەرد" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەوێ شی کراونەوە. لەم مانا بنەڕەتییەوە پاشان مانای "ناوکی میوە" و دواتریش مانای "کاکڵ و ناوەڕۆک" سەریان هەڵداوە کە ئەمەی دوایی لە بنەڕەتدا ئاماژە بە ڕەقایی ناوەوەی میوە بووە [لەم بارەوە دەتوانین لەگەڵ وشەی فارسی "هستە" هەڵی سەنگێنین کە بە مانای "ناوکی میوە" بەکار دێ و دە بنەڕەتدا بەمانای "بەرد"ە و خزمە لەگەڵ وشەی کوردمادی *هەستی* "بەرد، ئێسک، ناوکی میوە"]. وشەکە هەروەها مانایەکی دیکەشی پەیدا کردووە کە بریتییە لە "بەردی بەنرخ".

[تێبینی1: فۆتیمی h لە وشەی "گەوهەر" دا زێدەیە و دواتر خزاوەتە ناو وشەکەوە، واتا ئێمە دەتوانین ببێژین کە شێوەی "گەوەر" شێوەیەکی کۆنتری وشەکە نیشان دەدا. تێخزانەی ئەم فۆتیمە لە ژمارەیەك وشەی دیکەی کوردمادی و فارسیشدا بەرچاو دەکەوی، وەك قەهرین، گوهارتن، ژەهر، گەلهە و هتد. تێبینی 2: لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Edelstein (G.) هەیە بە مانای "گەوهەر، بەردی بەنرخ". ئەم وشەیە خۆی لە دوو وشە پێك هاتووە، یەکەم edel "*ئەسڵ*، رەسەن" و خزمیشە لەگەڵ وشەی کوردمادی "ئەسڵ"، دووەم Stein "بەرد"].

**گەیشتن geyıştın** *[ gayıštın ]* - "چوون یاخود هاتنە شوێنێك": گەهیشتن gehîştın، گهان gıhan و گیهان gîhan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ gehen (G.)، go (E.) "رویشتن"، ga (Sw.) "دەڕوا"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *ghē(i) >*** "لێکبوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە نێوان، جێ هێشتن، چوونەپێش" ئەو ریشە بنەڕەتییە دواتر پەرەی گرتووە و چەند ریشەیەکی دیکەی لێ کەوتۆتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە جگە لە رۆیشتنی مرۆڤ، بە شێوەیەکی گشتی ماناکانی "سەفر کردن، بزووتن، ئاژوان"یش دەدا. jáhāti (OIn.) "جێ دێڵێ، واز دێنێ"، kichēmenai (Gr.) "گەیشتن(ەوە)، بەدەست هێنان" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دە پلەیەکی دوورتر دا دەبنە خزم دەگەڵ ↑گاگوڵە gagole و ژمارەیەکی زور وشەی جۆراوجۆر هەر لە ↑قاز qaz ەوە بگرە تا دەگاتە ↑کەنین kenîn [پێکەنین] و تا دەگاتە ↑کون kun !!

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا هەروەها تێگەیشتن tegeyıştın هەیە بە مانای "فام کردن، دەرك کردن". پێوەندی دوو وشەی "گەیشتن" و "تێگەیشتن" وەك پێوەندی ئەم وشانەی خوارەوەیە کە ئەوانیش پێکەوە خزمن: Sinn (G.)، zin (Nl.) "هەست"، sentire (L.) "هەست کردن، تێگەیشتن"، sensus (L.) "بیر، هەست"، sinteti (Lit.) "هزرین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *sent- >*** "رۆیشتن، گەڕان، بوورین". ئەم مانایە دەبێ ئاماژە بەوە بکا کە مرۆڤ لە کاتی هزریندا بەو شتە *دەگا* کە بیری لێ دەکاتەوە].

**گی gî** *[ gī ]* - "شیرەی دار، جەوك": [گی یێ داری gî ye darî، گی یێ ڤامێر gî ye vamer "جەوکی دار بادام"]. پێوەندی هەیە بە وشەی ↑جەوك cewık [جیوە[2] cîwe]. دە هێندێك لە شێوەزارەکانی کووردمادیدا، وەك بنزاراوەی مەهابادی، ئەم وشەیە بە شێوەی ↑گوو gu دەگوترێ وەك گووی گوێ guy guwe "چڵکی گوێ" یان گووی خودکار (و خودنڤیس) guy xudkar [خودکارەکە گووی کردووە]. دیارە نە گوێ و نە خودکار و خودنڤیس کاری قورس ناکەن. "گوو" لەم نموونانەدا مانای "تەڕایی (ترشح)" دەدا و لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە دایە. جگە لەم وشانە دەبێ ئاوڕێکیش لە وشەی ↑گوێنی goenî بدەینەوە کە ناوی دەوەتێکە کە دە ئەسڵدا کەتیرەیان لێ گرتووە و هەربۆیەش ئەم ناوەیان لێناوە و تێیدا ئاماژە بە "شیرە"ی دەوەنەکە کراوە. هەروەها وشەی ↑جەوهەر cewher دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا بە مانای "شیرە"ی دار و دەوەن بووە [وەك چناری جەوهەردار] و پاشان بەو شیرەیەش گوتراوە کە بۆ نووسین و کێشانەوە کەڵکی لێ وەرگیراوە و دواجار کردوویانەتە ناو خودکار و خودنویسەوە.

**گیا gîya** *[ gīyā ]* - "شینکایی، دار و درەخت": گیاه gīyāh (P.). لەوانەیە پێوەندی بە ↑گیان gîyan ەوە هەبێ.

**گیان gîyan** *[ gīyān ]* - "رووح، مایەی ژیان": جان can یش دەگوترێ. جان jān (P.). خزمە دەگەڵ ↑ژیان jîyan و ↑ژین *jîn* "زیندەگی".

**گیان کەنشت gîyankenıșt** *[ gīyānkaništ ]* - "دەمی سەختی گیان دەرچوون": گیان کەندن gîyan kendın یش دەگوترێ. جان کندن can kandan (P.). کەنشت kenıșt دەچێتەوە سەر ↑کەندن[1] kendın. "گیان کەنشت" بەو دۆخە دەگوترێ کە مرۆڤ دەگەڵ مەرگ دەست و پەنجە نەرم دەکا و هێشتا مەرگ بە تەواوی بە سەریدا زاڵ نەبووە. رەنگە بە گوێرەی باوەڕە کۆنەکان وابیر کرابێتەوە کە لە دەمی گیانەڵڵادا بەرپرسی گیان کیشان گیان لە لەشی مرۆڤ دەردەکیشێ و هەڵی دەکەنێ، هەروەک چۆن دار و دەوەتێک لە هەرد هەڵدەکەندرێ.

**گیانەڵڵا gîyanella** *[ gīyānallā ]* - "دەمی گیاندان": ئەم وشەیە پێوەندی بە "الله"وە نییە، چونکوو ئەگەر وشەکە لە "گیان" و "الله" پێک هاتبا، ئەوسا نەدەبا بگوترێ "دە گیانەڵڵادا بوون". "دە گیانەڵڵادا بوون" ماناکەی دەبێتە "دە گیانی خودادا بوون" و ئەمەش بێ مانا دەردەچێ. کەواتە کەرتی دووەمی وشەکە مانایەکی دیکەی هەیە و لەژێر کارتێکەری ناوی "الله"دا شێوەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لێرەدا دوو شیمانە جێی باس کردنن.

1- دەتوانێ هەڵات helat بووبێ، وەک ↑خۆرهەڵات xorhelat، واتا هەڵهاتن، بڵیند بوون و بەرز بوونەوەی گیان. لەم تیڕوانینەوە وشەکە دەبێ "گیانهەڵات" بووبێ و گۆڕدرابێ بە گیانەڵڵا.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑هەلاندن helandın "بلیند کردن، بەرز کردنەوە". بە هەردوو باری لێکدانەوەکەدا، مەبەست ئەوەیە کە گیان جیهانی خاکی جێ دەهێڵێ و هەڵدەکشێتە جیهانی بان.

**گیپ gîp** *[ gīp ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑گووپ gup.

**گیپاڵ gîpal** *[ gīpāl ]* - دەگەڵ "قەد" دی [قەد و گیپاڵ یان گەت و گیپاڵ] و مەبەست دەبێ ئەستوورایی و قەڵەوی لەش بێ. هەروەها ↑گێپەر *geper* و ↑کۆپەرە kopere هەن بە مانای "ئەستوورایی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کووپە kupe.

**گیپە gîpe** *[ gīpa ]* - "پارچەگوشتی ورگی ئاخنراو": ↑کیپا kîpa وگیپا gîpa و کیپارkîpar یش دەگوترین. خزمە دەگەڵ ↑کووپە kupe و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**گیت gît** *[ gīt ]* - "باو و تۆفان، باهۆز": گیدۆ gîdo ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گێژ gej [گێژەڵووکە، گیجەڵووکە].

**گیتە gîte** *[ gīta ]* - "ئاڵوودار، دارێک کە بەسەر کاریتەدا رادەکیشرێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کۆتە1 kote "قەدی دار، تەنەی دار".

**گیڕ gîr** *[ gīr ]* - "شیوەڵە، دۆڵی تەنگ": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گەلی gelî "دۆڵ".

**گیرسان gîrsan** *[ gīrsān ]* - "هەڵبوونی ئاگر": [داگیرسان، هەڵگیرسان]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑گڕ gır و ↑گرشە gışre و هتد. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ:

1- glühen (G.)، gloeien (Nl.)، glow (E.)، glo (Sw.) "هایسان، سوور بوونەوە"، glitzen (G.)، gleißen، glita (OIs.) و glitenian (OE.) "درەوشانەوە، هایسان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghel-** "درەوشانەوە، ترووسکانەوە" دە زمانی کوردمادیدا ↑زێڕ zer، ↑زەرد zerd، ↑زۆڵ zol [زەرد و زۆڵ zerd u zol] و لەوانەشە ↑کڵ[3] kıl "درەوشانی هەسارە، تینی ئاگر".

2- ریشەی **< *(IE.) *gher(ə)-,*ghrē-*** "درەوشانەوە، ترووسکانەوە". وشەی grau (G.) "بۆر" دە زمانی ئەڵمانیدا لەم ریشەوە هاتووە.

**گیرسانەوە gîrsan(ewe)** *[ gīrsān(awa) ]* - "جێگیر بوون، بەند بوون": گرسانەوە gırsanewe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گرسە gırse "تۆڵا، وردی پێکەوەنووساو" و ↑کورسین *kursîn* "قایم بوون، جێگیر بوون".

**گیرفان gîrfan** ⸤ *gīrfān* ⸥ - "بەریك":

1- لەوانەیە وشەکە هەمان ↑گیفان gîfan بێ بە مانای "بەریك، گیرفان، جێو" و فۆتیمی r وەك زێدە خزابێتە ناوی.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ kryptein ‏(.Gr) "شاردنەوە، تاقەت کردن".

**گیرهە gîrhe** ⸤ *gīrha* ⸥ - "بۆقی ئاوی رەقبووكێ، بڵغ، تمتمان": خزمە دەگەڵ ↑گەرگەر gerger "بەردەڵان" و دواجار ↑خار xar "سەخت". خڵتە یان کلسی ئاو کە دەنیشێ و بە بنی دەفرەوە دەنووسێ، تۆژێکی رەق لە چەشنی بەرد دروست دەکا و هەر بۆیە بەم شێوەیە ناودێر کراوە.

[تێبینی: وەك لە مانای "گیرهە"دا دەبینرێ، وشەکە وەك بۆق boq یش مانا کراوەتەوە. دیارە ئەم "بۆق"ە جیاوازە لە بۆقی ئاژەڵ. بەداخەوە مامۆستا هەژار دە فەرهەنگی هەنبانەبۆرینەدا لەژێر وشەی "بۆق"دا ئاماژەی بەم مانایە نەکردووە. بەڵام ئاماژەی بە مانایەکی دیکە کردووە کە بریتییە لە "تیرتکی چڵەپیواز و سیر". ئەم دوو مانایە، واتا "خڵتەی ئاوی رەقبوو" و "تیرتك" دەشێ پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ، چونکوو هەردووکیان چەمکی "رەق، سفت، قایم" لە خۆ دەگرن. لەم تێڕوانینەوە ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی پەیدا بکا بە هەر دوو وشەی بۆق[4] و بۆق[5]

.[

**گیز gîz** ⸤ *gīz* ⸥ - "تەلەس، مەست": خزمە دەگەڵ ↑گیژ gej، ↑کاس kas، ↑گشکە geşke و چەندین وشە کە ئاماژە بە "(سەر) سووڕان" دەکەن. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑*گێزان gezan* "لێکدران، تێکوەردران، شڵەقان". وەك ئاشکرایە دە دۆخی مەستیدا مرۆڤ سەری دە گێژەوە دێ.

[تێبینی: وشەی "تەلەس"یش خزمە دەگەڵ "تلان"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "سووڕان"].

**گیزگیزە gîzgîze** ⸤ *gīzgīza* ⸥ - "مزراق": خزمە دەگەڵ ↑گێزان gezan "لێکدران، تێکوەردران". مانای بنەڕەتی وشەکە "سووڕان"ە.

[تێبینی: چەندین وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا بە دووپات کردنەوەی بنەوشەیەك دروست کراون، لەوانە "فرفرە"، "خوڵخولە"، "ودودە"، "غەرغەرە"، "شەقشەقە"، "فیتفیتە"، "فشفشە"، "رەورەوە"، "وەرووەرە"، "پڵپڵە"، " گیلگیلە"، "لاولاوە"(ی دەرك و پەنجەرە) و هتد. ئەم شێوەیە لە دروست کردنی وشە نەك هەر بۆ ناوی هێندێك ئامراز و کەلوپەل بەکار دێ، بەڵکوو بەگشتی شێوەیەکە بۆ دروست کردنی ناو و ئاوڵناو و تەنانەت کردار لە دۆخی جەخت کردندا، بۆ وێنە "کەڵکەڵە"، "دەبدەبە"، "تیفتیفە"، "وەلوەلە"، "رارایی"، "دارەدار"، "چاوەچاو"، "ساوەساو"، "خاوەخاو"، "ململانێ"، "تمتمان"، "وازوازی"، "نازنازی"، "سەرسەری"، "کەنکەنەچی"، "بانبانك"، "جاڵجاڵۆکە"، "خاڵخاڵۆکە"، "پەلپەلیسك"، "گسگەسك"، "ترترە"، "لاولاوە" [گوڵی لاڤلاڤ]، "دەستی دەستی"، "چاوچاوێن"، "باوباوێن"، "راوڕاوێن"، "گومگومین"، "گژگژین" و هتد].

**گیزە gîze** ⸤ *gīza* ⸥ - "1-دەنگی باریکی کوڵینی ئاو 2- دەنگی باڵ لێدانی مێش 3- دەنگی تێپەڕینی گوللە": [گیزەگیز]، خزمە دەگەڵ ↑گێزە geze "گورانی بە دەنگی سەبر".

**گیس gîs** ⸤ *gīs* ⸥ - شێوەیەکی دیکە لە ↑قژ qij و ↑کەزی kezî. گیسوو gīsū ‏(.P).

**گیسی gîsî** ⸤ *gīsī* ⸥ - "زنجیرەکێو": پێوەندی هەیە بە ↑*گاشە gaşe* و ↑گیشە gîşe وە. ئەم وشانە ئاماژە بە "زۆر و زەوندی، کۆمایی و پێکەوەیی" دەکەن.

**گیسك gîsık** ⸤ *gīsık* ⸥ - "بزنی جەوان": خزمە دەگەڵ Geiß ‏(.G)، geiz ‏(.OG)، gaits ‏(.Gt)، gat ‏(.OE) و haedus ‏(.L) سەر بە ریشەی ***gaid-** ‏(.IE)* "چقڵ، ڤۆچ، نووك". دیارە لێرەدا ئاماژە بە شاخە تیژەکانی بزن کراوە.

[دە زمانە هیندوئەوروپییەکاندا زۆر جار ناوی ئاژەڵە شاخدارەکان دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە ماناکانی چقڵ، شاخ، تیژایی دەردەبڕن، وەک ”کەڵ“، ”ئاسک“، ”کەرگەدەن“].

**گیشە gîşe** [ *gīša* ] - ”کۆمەڵێک باقەگیای لەسەر یەک دانراو“: دە زمانی کوردمادیدا وشەگەلێک هەن کە دە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشەیەدا جێ دەگرن، واتا ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکێکی هاوبەش دەکەن و لە ریشەیەکی هاوبەشەوە هاتوون. هێندێک لەم وشانە بریتین لە: ↑هێشوو hêşû، ↑قۆش qoş ”خۆیانی گیرەنەکراو“، ↑گێش gêş ”پۆلی باڵداران“، ↑گشت gışt ”تیکڕا، هەموو“، ↑قۆشەن qoşen ”سوپا، ئۆردوو“، ↑قشڵە qışle ”سەربازخانە، ئۆردووگا“، ↑گاشە gaşe ”زلی پێکەوەنووساو“ [گاشەبەرد]، کۆش[2] koş [کۆشێک منداڵ] و چەندانی دیکە. ئەم وشانە هەموو ئاماژە دەکەن بە چەمکی ”زۆر و زەوەندی، بە کۆمەڵ بوون، کۆگا بوون، پێکەوە بوون“. ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بە ↑کۆش[1] koş ەوە هەبێ، بەم پێیە کە کۆش جێگەی تێداخڕکردنەوە، بە کۆگا کردن و بە کۆمەڵ هەڵگرتنی شت بووە [لەم بارەوە بەراوردی دوو وشەی باقە و باخەڵ بکە کە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە].

**گیف1 gîf** [ *gīf* ] - دەگەڵ ”هەڕ“ دێ [هەڕ و گیف her u gîf، واتا هەڕەشە و ترساندن]. شێوەیەک دیکە لە گەف gef ، سەر بە کرداری ↑گەفین gepîn ”1- وەڕین 2- هەڕەشە کردن“ [دە بنەڕەتدا: دەمداپچڕین (بۆ ترساندن)]. وشەی ”هەڕ“ پێوەندی بە ”هەڕەشە“وە هەیە.

**گیف2 gîf** [ *gīf* ] - ”ساز، تەیار، ئامادە“: گیڤ gîv یش دەگوترێ.

[سەرەتا تێبینییەک: لەژێر وشەی ”ساز“دا روون کراوتەوە کە ئەم وشەیە و هەروها چەندین وشەی لە چەشنی ”ساغ“ و”چاک“ خزمن دەگەڵ وشەی ”سەخت“. تیکڕای ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە هاتوون بە مانای ”رەق، سەخت، بەهێز“. مەبەست لە ساز کردنی شتێک دە راستیدا ”قورس و قایم کردن، بەهێز کردن“ی ئەو شتە بووە. هەروەها مەبەست لە کەسێک یان شتێکی ”ساغ“ ئەوە بووە کە ئەو کەسە یان ئەو شتە قایم و پتەو و بەهێزە، بە پێچەوانەی نەخۆش و ”ناساغ“ کە شل و شەوێق و بێهێزە].

جا هەر بەم شێوەیە وشەی گیف gîf لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای ”رەق، سەخت، بەهێز“. دەشێ وشەی ↑گیو gîw ”ناوێکی پاڵەواتیکی کەونارا“ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. ئەم وشەیە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- ↑سیڤە sîve ”قەڵەو“، ↑قەبە qebe ”ئەستوور، زل“ و ↑سفت *sıfıt*.

2- ↑کەڤر kevır ”بەرد“ و ↑*قەمرین qemrîn* ”مەیین، توند بوون، سفت بوون“.

**گیفان gîfan** [ *gîfān* ] - ”بەریک، گیرفان، جێو“: جیب jîb (P.).

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا هەم بۆ ”گیرفان“ و هەم بۆ ”کیف“ یەک وشە بەکار دێ و ئەویش Tasche یە. ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییە ساخ نەکراوەتەوە].

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرینگە ئەوەیە کە وشە ئەڵمانییەکە هەر دوو مانای سەرەوە دەبەخشێ. ئەمە دەرخەری ئەم راستییە کە دە زمانی کوردمادیشدا دوو وشەی *گیفان* ”بەریک“ و ↑کیف kîf ”ساک“ خزمن و دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بوون. سەبارەت بە ریشەی وشەکە دیسان پێویستە سەرەتا تێبینییەک بخەینە روو:

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ ”لە گیرفان نان، خستنە گیرفان“ دەگوترێ in die Tasche stecken. کرداری stecken مانای ”جێگیر بوون، قایم بوون“ دەبەخشێ و هەر لەم کردارەوە بە یارمەتی پێشگرێک کرداری verstecken دروست بووە بە مانای ”شاردنەوە، حەشار دان“. لێرەدا پێوەندی دوو چەمکی ”قایم بوون“ و ”شاردنەوە“ بەباشی دەردەکەوێ. ئەم پێوەندییە دە زمانی

فارسیشدا بەرچاو دەکەوێ. دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا دەگوترێ "تو جیب قایم کردن" واتا "شاردنەوە لە گیرفاندا". دیارە دە بنەڕەتدا مەبەست لە شاردنەوە (لە گیرفاندا) ئەوە بووە کە شتێك لەم شوێنەدا *قایم* و جێگیر بکرێ، بۆ ئەوەی ون نەبێ. هەروەها دە فارسیدا بە گەمەی "قەرێقەرێن، چاوشارکێ" دەگوترێ "قایم موشك". دە زمانی ئەڵمانیشدا دەگوترێ Versteckspiel (دە بنەڕەتدا: کایەی خۆ قایم کردن)].

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەردەکەوێ کە وشەکانی گیفان gîfan و کیف kîf پێوەندییان هەیە بە ↑گیف *gîf* "ساز، تەیار". ئەم وشانە دەبنەڕەتدا مانایەکیان گەیاندووە وەك "سەخت، قورس و قایم، بەهێز". کەوابوو مەبەست لە *گیفان* "بەریك" و *کیف* "ساك" دەبنەڕەتدا ئاماژە بە شوێنێك [شتێك] بووە بۆ جێگیر کردن و قورس و قایم کردنی ئەو شتانەی پێویستیان بە تاقەت کردن هەیە.

**گیڤك gîvık** *[ gīvık ]* - "1- ریشووی شەدە وپێچ، ریشووی زین 2- پلکەی دەسماڵی ژنان": خزمە دەگەڵ ↑گیڤە gîve "بزاڤ"، ↑جڤ cıv "جووڵە، جمە" و↑*جڤین cıvîn* "بزووتن، جووڵان". هەم ریشوو و هەم پلکەی دەسماڵ ئەو شتانەن کە لە کاتی رۆیشتن و هاتوچۆ بەم لاو ئەو لادا دەجووڵێنەوە.

**گیڤ گیڤە gîvgîve** *[ gîvgîva ]* - "گیزەك، مەزرەق": خزمە دەگەڵ ↑گیڤە gîve.

**گیڤە gîve** *[ gīva ]* - "بزووتن (ی سمێل)" [گیڤەی سمێڵی دێ]: ↑جڤ cıv "جووڵە، جمە" و↑جڤین cıvîn "بزووتن، جووڵان".

**گیلك gîlık** *[ gīlık ]* - "1- کلك 2- میتکە": ↑کلك kılık.

**گیم gîm** *[ gīm ]* - "باقەبێن، بەندی بەستنی باقەگیا": خزمە دەگەڵ ↑سمتە sımte [سمتەگڵ] و ↑*زەمۆمە zemome* "تامان".

**گینگڵ gîngıl** *[ gīngıl ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑جینگڵ cîngıl.

**گینۆ gîno** *[ gīno ]* - "زەرتك، گیازەرتك": خزمە دەگەڵ ↑هەنگوین hengwîn، سەر بە ریشەی ***(IE.) *kneko-*** > "زەردرەنگ، زێرین".

**گیو gîw** *[ gīw ]* - "ناوێکی پاڵەواتیکی کەونارا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گیف gîf "ساز، تەیار" [دەبنەڕەتدا: بەهێز، سەخت، پتەو].

**گیوە1 gîwe** *[ gīwa ]* - "کەڵاش، کڵاش": گیوە gīwe (P.). لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)keu-*** "داپۆشین، لێهاڵان". چەندین وشە دە زمانی کوردیدا لەم ریشەوە هاتوون، وەك ↑هۆدە hode، ↑حەوشە ħewşe، ↑قایش qayış [قاویش qawîş]، کەوش kewş و هتد.

**گیوە2 gîwe** *[ gīwa ]* - گیوەگیو gîwegîw واتا "گیژەگیژە، چەقەچەق": خزمە دەگەڵ ↑هەوهەو hewhew.

**گیپەر geper** *[ gepar ]* - "ئەستوورایی": کۆپەرە kopere ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گیپاڵ gîpal [قەد و گیپاڵ qed u gîpal، گەت و گیپاڵ get u gîpal]. دە بنزاراوەی مەهابادیدا گوێپەرە guwepere ش دەگوترێ [گوێپەڕەی مل]. وشەکە مانای "ئەستوورایی، قەڵەوی" دەگەیەنێ، بە پێچەوانەی "قەد، گەت" کە ئاماژە بە "باڵا و بڵێندی" دەکا. [لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "قەڵەو" هەڵی سەنگێنین کە خزمە دەگەڵ "قەڵافەت" (قەد و قەڵافەت) و هەروەها دەگەڵ "کلفت" دە زمانی فارسیدا بە مانای بە مانای "ئەستوور"]. گیپەڕ یان گیپاڵ خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشە وەك ↑گیپە gîpe "خواردتیکی بە برینج ئاخنراو"، ↑کووپە kupe "دەفری قەڵەو"، ↑کۆپار kopar یان ↑کۆپانە kopane "زۆپایی پشتی وشتر"، ↑گۆپاڵ gopal [کۆپاڵ kopal]

”تیڵای سەرخڕ“، ↑گۆپکە gopke ”زۆپایی بچووك“، ↑قەف qef ”ئەندازەی دەور و ئەستوورایی“ [قەفی مارەکە]، لەوانەیە کیفۆك kîfok ”پیوازۆك، سەلك“ و چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑قوب *qub* دا باس کراون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”چەمانەوە“. لەم مانایەوە دواتر مانای خڕ و خۆڵ بوون، قەڵەو بوون، ئەستوور بوون سەرچاوەی گرتووە.

[تێبینی: پێوەندی دوو وشەی ”گۆپکە“ دەگەڵ ”گێپەر“ وەك پێوەندییەك وایە کە دەتیوان دوو وشەی *قوتیر* ”کوان“ و گوندە (*گنتەڵ*) ”قەڵەو“دا هەیە].

**گیتی getî** [*getī*] - ”ئەرد، دونیا“: گیتی gītī (P.). شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*قاد qad* ”زەوی، خاك“، ↑کات kat [شۆرەکات واتا هەردی سوێر] و ↑ئاد ad ”دوورگە، هەرد و وشکایی ناو دەریا“.

**گێچ geç** [*geč*] - ”کەرەستەیەك بۆ سپی کردنی خانوو“: گەچ geç یش دەگوترێ. گەچ gač (P.)، Gips (G.) < *gypsum* (*L.*) < *gypsus* (*Gr.*) ”گەچ“ < *gābīs* (*Ibr.*) ”کریستاڵ“.

**گێچەڵ geçel** [*gečal*] - ”کێشە، ئاژاوە، گۆنگەڵ“: خزمە دەگەڵ ↑گێژ gej. دە بنەڕەتدا واتا بارو دۆخێکی شێواو و تێکەڵ پێکەڵ.

**گێڕ ger** [*ger*] - ”خوار، چەوێل“:

1- یان خزمە دەگەڵ ↑قڕ qır ”سووڕ“ [خۆ با دان]، سەر بە ریشەی ***ger-** (*IE.*) ”سووڕان، با دران“.

2- یان خزمە دەگەڵ ↑کێر ker ”خوار، بادراو“، سەر بە ریشەی **< *(s)ker-** (*IE.*) ”سووڕان، خوار بوون، با دران“.

**گێرە gere 1** [*gera*] - دەگەڵ ”کێشە“ دێ [گێرە و کێشە gêre û kêşe واتا شەڕ و کێشە]. ئەم وشەیە پێوەندی بە گێرە کردنی دەخڵ و دانەوە نییە. وشەکە خۆی بە مانای ↑شەڕ şer ە و لەوە دەچێ شێوەی کۆنتری ئەم وشەیە بێ. گێرە و کێشە ماناکەی هەمان شەڕ و کێشەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمەکان، دەتوانین هەڵی سەنگێنین بۆ نموونە دەگەڵ دوو وشەی *گاو* ”تێلی خوار بۆ دروون و پینە کردن“ و *شەوك* ”1- دەرزیلە 2- قولاپی ماسیگری“].

**گێرە gere ²** [*gera*] - ”ورد کردنی دەخڵ و گیا“: ورد کردنەکە بەم جۆرەیە کە هێندێك ئاژەڵی وەك گا و ئەسپ بەردەوام بەسەر دەخڵ و گیایەکەدا دەرۆن و دەور لێ دەدەن و لە ئەنجامدا گیایەکە دەکوترێتەوە و کا و دان لێك جیا دەبنەوە. هەروەها عوورە ɛure هەیە بە مانای ”خۆیانی ورد کراوی ئامادەی شەن کردن“ کە ئەویش شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ”گێرە“. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ grindan (OE.)، grind (E.) ”هاڕین“، Grind (G.) ”کرێژ (ی سەر)“، grind (Nl.) ”1- خیز 2- ساوار“، grint (MG.) ”خیز، دەخل و دانی وردکراو، ئاردی درشت“، Grund (G.) و ground (E.) ”هەرد، خۆڵ، خاك“، سەر بە ریشەی **< *ghren-** (*IE.*) ”هاڕین، ورد کردن، هەڵپریواندن“ و دوورتریش سەر بە ریشەی **< *ghreu-** (*IE.*) ”رێخشاندن، ساوین ، ورد کردن، هاڕین“. وشەکانی ↑هاڕین harîn و ↑ئارد ard سەر بەم ریشەیەن. فۆتیمی g دە زۆرێك لە وشەکانی سەر بەم ریشەیە، دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بووەتە h یان a. دوو وشەی دیکەش کە لە ”گێرە“ زۆر نیزیکن و فۆتیمە کۆنەکە تێیاندا ماوەتەوە، بریتییە لە ↑گێرووسە geruse و ↑کرِە kıre ”دەستار“.

**گێرانی geran** [*gerān*] - ”بالغ (بووكَ)“: خزمە دەگەڵ ↑گووران guran ”رسکان، پێگەیشتن، سەرهەڵدان“.

**گێرك(ە) gerk(e)** [*gerk(e)*] - ”مێرووولەی زەردی ورد“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*زەرد zerd* و ↑جرج cırc [جرجەمشك].

**گیرم gêrım** [ *gerım* ] - "شۆرباو": هەروەها گیرمی germî هەیە بە مانای "چێشتی دانوولە": ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑گێرووسە "دەستاڕ، کڕە" و ↑گێرە gere "ورد کردن". ڕەنگە مەبەست شۆرباو یان چێشتێک بێ کە دانەوێڵەی وردکراو [لە دەستاڕ دراو]ی تێدا بێ.

**گێرووسە geruse** [ *gerūsa* ] - "دەستاڕ، کڕە": گێرووشە gêrûşe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گێرە gere و هەروەها شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کڕە kıre.

**گێز1 gez 1** [ *gez* ] - "بەراورد، لێکدانەوە": خزمە دەگەڵ ↑گەزەک2 gezek 2 "شارەزا، بەڵەد".

**گێز2 gez 2** [ *gez* ] - "ریشووی شەدە و مێزەر": [گێز و گوڵێنک(ە) gez u gulîng(e) ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گێزان gezan "لێکدران، راتڵەکان، تێکوەردران، شڵەقان". گێز و گوڵێنک(ە) ئەو شتەیە کە لە کاتی کار کردن و هاتوچۆدا رادەتڵەکێ و بەم لا و ئەو لادا دەجووڵێتەوە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی "گێلگێلە" و "گێڤک".

**گێزان gezan** [ *gezān* ] - "لێکدران، تێکوەردران، راتڵەکانی تراو، شڵەقان": چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە دەشێ لە پێوەندی لە گەڵ یەکتر لێکیان بدەینەوە، وەک ↑گژاندن gıȷandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن"، ↑گژیان gıȷyan "شێوان و لێکدرانی موو"، ↑گژەبا gıȷeba "گردەلوول"، ↑گژک gıȷk "پرچی پەرێشان"، ↑گۆزان gozan "سەرراوەشاندنی منداڵ". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بە ↑گێژ gej ەوە هەبێ.

**گێزە geze** [ *geza* ] - "گورانی بە دەنگی سەبر": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑گاز gaz کردن، ↑گیزە gîze، ↑قسە qıse، ↑قیژە qîje، ↑قاسپە qaspe، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەرا کردن، قیژاندن".

[راستە "گێزە" دەنگی سەبر و "قیژە" دەنگی بەرز دەردەبڕێ، بەڵام هەر دوو وشەکە ریشەیان یەکە. لەم بارە نموونەی دیکەش بەرچاو دەکەون، وەک *لۆرین* "گۆرانی بە دەنگی سەبر" و *لووراندن* "وەڕین"، "نارین" و "نەڕڕاندن"، "ورتە" و "وەڕین" و هتد].

**گێزەر gezer** [ *gezar* ] - "بەرهەمێکی بێستان": دە بنەڕەتدا گیازەرgīyazer، بە مانای "گیای زەرد". [↑گیا gıya + ↑زەر(د) zer(d)].

**گێژ gej** [ *gež* ] - "1- حۆل 2- سەر دەسوورەوە هاتکێ": گیج gīj (P.). خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑گێزان gezan "لێکدران، تێکوەردران، راتڵەکانی تراو، شڵەقان"، ↑گژاندن gıȷandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن"، ↑گژیان gıȷyan "شێوان و لێکدرانی موو"، ↑گژەبا gıȷeba "گردەلوول"، ↑گژک gıȷk "پرچی پەرێشان"، ↑گۆزان gozan "سەر راوەشاندنی منداڵ". ئەم وشانە بەگشتی چەمکی "سووڕان" لە خۆ دەگرن [سەرنج بدە کە وشەکانی "حۆل" و "وڕ"یش دە ریشەدا مانای "سووڕان" دەبەخشن]. هەروەها چەند وشەی وەک ↑کاس[1] kas و ↑گەشکە geşke پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن و ئەوانیش جۆرێک لە گێژ بوون و سەرسووڕان نیشان دەدەن. کاتێک بە شوێن ریشەی ئەم وشانەدا بگەڕێین، دەردەکەوێ کە ئەم وشانە پێوەندییان بە دەستەوشەیەکی دیکەوە هەیە کە مانای "خوار، چەماو" دەردەبڕن، وەک ↑خێچ ceç، ↑خێس xes، ↑کەژ kej [کەژ و کێو]، گزی gızî "فێڵ" [دە بنەڕەتدا: ناراستی، خواری]، ↑کووز kuz "ئاڵقەی هەڵپەڕین"، ↑کاژ kaj "خێل" [چاو بادراو، چاو وەرسووڕاو]، ↑کووز kuz "پشتکووڕ"، گوژ gūž (P.) "چەماو، پشت چەماو"، کج kaj (P.) "خوار، خێچ"، ↑کاس[3] kas "رۆچووکێ، قووپاو" و هتد. لە لایەکی دیکەوە هێندێک وشە هەن کە مانای "بەرز و بڵێندی" دەگەیەنن و ئەوانیش دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە خزمایەتی پەیدا دەکەن، وەک ↑کەژ kej [کەژ و کێو، "کەژ" هەم چەمانەوە و خواری سەر رووبەری زەوییە و هەمیش شوێنێکی بەرز و بڵێند]، ↑قاش qaş "نقێمی ئەنگوستیلە"،

↑کووژەکە kujeke "مووروویی چاوزار"، ↑کۆستە koste "بڵیندایی وەک سەکۆ"، ↑کۆس kos یان ↑کۆسپ kosp "زەقایی زەوی"، ↑گاز gaz "دوند، بەرزترین شوێنی چیا"، ↑قۆز qoz "قیت و قۆز". "قۆز" مانای "داچەماو"یش دەدا. وەک دەبینین لە هێندێک لە وشەکاندا، وەک کەژ، قاش و قۆز هاوکات هەردووک چەمکی "چەمانەوە" و "بەرزی" خۆ بەدیار دەخەن. پێوەندی ئەم دوو چەمکە لەوەدایە کە بە هۆی چەمانەوە لەسەر رووبەرێکی ساف وەک هەرد، جۆرێک لە بەرزی دروست دەبێ. دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا، بۆ وێنە hoch (G.) و high (E.)، hög (Sw.) "بەرز، بڵیند" دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە خزمن و هەروەها خزمن بۆ وێنە دەگەڵ Hügel (G.) "تەپۆڵک"، Hocke (G.) "خۆیان، خەرمان"، hocken (G.) "چەمانەوە بۆ خۆ مات کردن" و هتد. هەموو ئەم وشانەی سەرەوە و گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەوروپییەکانی دیکەدا دەچنەوە سە ریشەی **< *keu- (IE.)** "چەمانەوە، خوار بوونەوە". بەم جۆرە دەتوانین بێژین کە لە مانای بنەڕەتی "چەمانەوە، خوار بوونەوە" دوو مانای دیکە سەریان هەڵداوە، واتا هێندێک وشە هەم دە زمانی کوردمادی و هەمیش دە زمانەکانی دیکەدا پەیدا بوون کە ئاماژە بە مانای "بەرزی و بڵیندی" دەکەن. لەلایەکی دیکەوە دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشەی بەمانای "سووڕان، با دران، لێکدران، شڵەقان" پەیدا بوون، وەک "گێژ" و وشەکانی دیکە. ئا بەم مانایە، دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەکم بەرچاو نەهاتووە کە پێوەندی بەم ریشە و بەم وشانەوە هەبێ. بەڵام دە زمانی کوردمادیدا ئەم مانایە لە مانای بنەڕەتی ریشەکەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەمەش چونکوو چەمکەکانی "چەمانەوە، خوار بوون" و "با دران، سووڕان" و "لێکدران، شڵەقان" پێوەندی نیزیکیان بەیەکەوە هەیە. لەم بارەوە بڕوانە تێبینی خوارەوە:

[تێبینی: لەژێر وشەی "شێواندن" بە مانای "لێکدان، شڵەقاندن" شی کراوەتەوە کە ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ شیو şîw "دۆڵ" و شیب şīb (P.) "لێژایی، خوار بوونی زەوی" و schief (G.) "خوار" و چەپ çep "نەراست" [واتا خوار]، شەپڵە şeple "خوار بوون و با درانی دەست و لاق" و هتد. نموونەیەکی دیکە سەبارەت بە پێوەندی ئەوە چەمکانەی سەرەوە بریتییە لە وشەکانی "خێل" و "شەل" کە ئاماژە بە خوار بوون دەکەن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ "خولانەوە" و kylíndein (Gr.) "وەرسووڕاندن(ەوە)، گەوزاندن، خولاندنەوە". دیسان هەر لەسەر پێوەندی ئەو چەمکانەی سەرەوە جێی بیر هێنانەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا "وەرگەڕانی ئوتۆمبێل" دەبێتە überschlagen. کەرتی ئەسڵی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "شڵەقان"ی کوردمادی. دە زمانی کوردمادیدا "وەرچەپین"یش بەمانای "وەرگەڕان" بەکار دەهێنرێ. ئەم نموونانە پێوەندی چەمکەکانی چەماونەوە، خوار بوون، با دران، (وەر)سووڕان، لێکدران و شڵەقان بەیەکەوە بەباشی دەردەخەن].

**گێژک gêjık** [ *gežık* ] - "گێژاو" [ئەو شوێنە لە چەم و دەریا کە سوڕ دەخوا و مرۆڤ هەڵدەلووشێ]. خزمە دەگەڵ ↑گێژ *gej*.

**گێژەنە gejene** [ *gežana* ] - "پاشنەی دەرگا": گێجەنە gcene ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گژ gıj [گژەبا، گێجەبا] و ↑گێژ *gej* [گێژەڵووکە] و چەندین وشەی دیکە کە مانای "سووڕان، خولانەوە" دەبەخشن. "گێژەنە" ئەو شوێنەیە کە دەرگا لەسەری دەسووڕێ.

**گێش gêş** [ *geš* ] - "پۆلی باڵداران": خزمە دەگەڵ ↑گیشە gîşe.

**گیشکوون gêşkûn** ⌈ *geškūn* ⌋ - "بەکۆمەڵ فڕینی مەل بەرەو گەرمێن و کوێستان": خزمە دەگەڵ ↑گیشە gîşe و ↑گشت gıšt. کەرتی دووەمی وشەکە رەنگە پێوەندی بە ↑چوون çûn ەوە هەبێ و مەبەست "چوونی بەکۆمەڵ" بێ.

**گیڤل gêvıl** ⌈ *gevıl* ⌋ - "ئیشتیا، واز، مەیل": ↑گیول gêvıl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خولیا xulya.

**گیل gel** ⌈ *gel* ⌋ - "حۆل، گێژ": خزمە دەگەڵ ↑گێڵ1 gel "گەشت، گەڕان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە، با دران". لەم مانایەوە مانای "سووڕان" پەرەی گرتووە.
[تێبینی: وشەکانی "گێژ" و گەمژە"ش سەر بە دوو ریشەی جیاوازی دیکەن و ئەوانیش دە بنەڕەتدا مانای "چەمانەوە، خوار بوون، با دران" دەردەبڕن. مەبەست لەم وشانە ئەوەیە کە کەسێک مێشکی یان باری زەینی با دراوە، وەرسووڕاوە یان شڵەقاوە، واتا لەسەر جێی خۆی نەماوە. وشەکانی "وڕ" و "حۆل"یش هەر ئەم مانایە دەردەبڕن].

**گێڵ1 gel** ⌈ *gel* ⌋ - "گەشت، گەڕان": هەروەها ↑گێڵان gelan هەیە بە مانای "گەران" و ↑گیل gel بە مانای "حۆل، گەمژە" و ↑گیلگیلە gelgele "ریزەگوڵینگەی تێکخراو بۆ سەر و شەدەی ژنان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "خوار، بادراو"، وەک ↑شەل şel، ↑خێل xel، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)kel-*** "خوار بوون، چەمانەوە". لەم مانا بنەڕەتییەوە مانای "سووڕان، خولانەوە" سەری هەڵداوە. ئەم وشانەی خوارە لەم ریشەوە پەیدا بوون: scheel (G.) "خێل" و schielen (G.)، scīelan (OE.) "خێل بوون" و skelgja (OIs.) "خێل کردن"، kōlon (Gr.) "ریخۆڵە" [دە بنەڕەتدا: چەماو، با دراو]، kylíndein (Gr.) "خولانەوە، خلۆر بوونەوە"، ↑خێڵ2 xel [دڵ دە خێڵەوە هاتن واتا دڵ شێوان]، ↑خول xul و هەروەها ↑خێل xel "چاوخوار"، ↑خولانەوە (xulan(ewe و ↑خۆڵ² xol [خڕ و خۆڵ].
[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکی "چەمانەوە، خوار بوونەوە" دەگەڵ "با دران، سووڕان" بەراوردی بکە دەگەڵ دوو وشەی گۆج "چەماو" و گێژ "سووڕاو". ئەم دوو وشەیە بەیەکەوە خزمن.].

**گێڵ2 gel** ⌈ *gel* ⌋ - "هەڵتەکاندنی دەغڵ و تووتن": هەروەها دەگەڵ "کەرش" دێ [کەرش و گێڵ kerş û gêl، گرش و گێڵ یان گەرس و گێڵ واتا پووش و پەڵاش]. وشەی "کەرش" بە چەندین شێوەی دیکەش دەبیندرێ، وەک ↑قرش(ە) (qırş(e، گەرش gerş، کلۆش kıloş و دە بنەڕەتدا بە مانای "گیا"یە. "گێڵ" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەڵپک1 kelpık "تۆکڵی دەخڵ و دانی هاڕدراو".

**گیلاس gelas** ⌈ *gelās* ⌋ - "بەری دارێکە": Kirsche (G.)، kers (Nl.)، cirse (OE.)، cherry (E.) "گیلاس". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوەسەر cerasus (L.)، ئەمەش دەچێتەوە سەر kérasos (Gr.) "دارەگیلاس". بە ڕای زمانەوانان وشە یۆنانییەکە خۆی لە زمانێکی کۆنی "ئاسیای بچووک" وەرگیراوە. دوور نییە ریشەی وشەکە بۆ زمانی کوردمادی کۆن بگەڕێتەوە، چونکوو مادەکان لەم مەڵبەندەدا دەگەڵ یۆنانییەکان هاوسێ بوون. دیارە لەم بارەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.

**گیلاسی gelasî** ⌈ *gelāsī* ⌋ - "جۆرێک چەرمی بریقەدار": دە زمانی ئەڵمانیدا Glasur (G.) هەیە بە مانای "بەرگێکی ناسکی بریقەداری وەک شووشە، لوعاب". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Glas (G.) "شووشە، گلاس". دەشێ وشە کوردمادییەکە لە زمانە ژێرمەنییەکان وەرگیرابێ و ئاماژەی بەو تۆێژە بریقەدارەی چەرمەکە کردبێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑گلاس gılas.

**گێڵان gelan** ⌈ *gelān* ⌋ - "گەڕان، سووڕانەوە": بڕوانە ↑گێڵ1 gel "گەشت، گەڕان".

**گێلک gelk** *[ gelk ]* - "سرێش"؛ گوولک gulk یش دەگوترێ. هەروەها ↑گێلوو gelu هەیە بە مانای "جۆرێک گەچکاری خانوو". خزمن دەگەڵ↑ گل gıl.

**گێلگێلە gelgele** *[ gelgela ]* - "ریزەگوڵینگەی تێکخراو بۆ سەر و شەدەی ژنان"؛ دەچێتەوە سەر ↑گێل2 gel "گەشت، گەڕان، خولانەوە". وشەکە سەر بە ریشەیەکە بە مانای "سووڕان(ەوە)، بزوان بەم لا و ئەو لادا". "گێلگێلە" شتێکە بەدەم کار و هاتوچۆوە بەم لا و ئەو لادا دە جووڵێتەوە. ئەم وشەیە لەرووی رێسایەک دروست کراوە کە رێگامان پێدەدا وشەکە بە چەمکی جووڵانەوە، سوورانەوە ببستینەوە. هێندێک وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا لەرووی ئەم رێسایە دروست کراون، وەک فرفرە، ودودە، شەقشەقە، پلْپلە و هتد. ژمارەیەک لەم وشانە لەژێر وشەی "گێزگێزە"دا ئاماژەیان پێ کراوە. وەک لەوێدا باس کراوە ئەم جۆرە وشانە بە دووبارە بوونەوەی بنەوشەیەک ساز دەبن [گێل-گێل-ە] و ئەمە وشەکە دەباتە دۆخی جەخت کردن، واتا بۆ وێنە لە وشەی "گێلگێلە"دا "گێل" شتێکە کە دووبارە و دووبارە دەبێتەوە [زۆرجار روودەدا] و هەر بۆیە دەگوترێ "گێلگێلە".

**گێلوو gelu** *[ gelū ]* - "جۆرێک کەچکاری خانوو"؛ خزمە دەگەڵ↑ گل gıl.

**گێنیان genyan** *[ genyān ]* - "ناوی هۆزێکی کورد لە باکووری کوردستان"؛ خزمە دەگەڵ وشەی ↑زەنگەنە zengene "ناوی هۆزێکی کورد" و پێوەندی هەیە بە هێندێک وشەی وەک ↑زەنگ zeng [زەبر و زەنگ]، ↑جەنگ ceng، ↑ژەنین *jenîn* "لێدان".

# ل (L)

لا[1] **la** [ *lā* ] - "1- کن، نک، جەم 2- ئاراستە، تەڕەف": شێوەیەکی دیکە لە ↑لان[1] lan.

لا[2] **la** [ *lā* ] - "1- شیوی تەنگێ 2- خوار، خێچ": خزمە دەگەڵ ↑لار lar "خوار". سەبارەت بە مانای یەکەم، شیاوی باسە کە وشەی "شیو"یش دە بنەڕەتدا بە مانای "خوار"ە و ئەمەش ئاماژەیە بە رووبەری شاخەکە، واتا قەدپاڵی شاخ، کە لە رووبەرێکی لار پێک هاتووە.

لاباشە **labaşe** [ *lābāša* ] - "نانی تەنکی ساج": لواش lavāš (P.). خزمە دەگەڵ Laib (D.)، hleib (OG.)، hlaifs (Gt.)، hlāf (OE.)، chleb (Rus.) گشتیان بە مانای "نان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *kloibho-* (*IE.*)** "نانی سوورکراوە لە تاوەدا". وشەکانی ↑کولیچە kulîçe، ↑کولێرە kul(l)ere و ↑کەلانە kelane ش پێوەندیان بەم ریشەوە هەیە. هەروەها وشەی ↑غوراِبی ġurabî "شیرنییەک لە ئارد و شەکر" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

لابووت **labut** [ *lābūt* ] - "1- سەری ئاسنینی مەساسەی جووتێر 2- ئاستێکی پانی چەقاو بۆ خاوێن کردنەوەی قوڕی پێڵاو": خزمە دەگەڵ ↑لاپیتە lapîte "ئەوشوێنەی داردەست کە کێڵەر دەستی پێ دەکری" و دواتریش خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست".

لاپ **lap** [ *lāp* ] - "چەپۆک": خزمە دەگەڵ↑ لەپ lep "بەری دەست".

لاپار **lapar** [ *lāpār* ] - "سواپ": خزمە دەگەڵ↑ لەپ lep "بەری دەست". لاپار واتا بەردێک کە وەک بەری دەست پانە.

لاپرە **lapre** [ *lāpra* ] - "کەس نەناس، بیانی": پێک هاتووە لە دو کەرتی لا la + پرە pıre. کەرتی "پرە" خزمە دەگەڵ Fremd (G.) "بیانی"، from (E.) "لە"، Fern (G.)، far (E.)، faírra (Gt.)، fjarri (OIs.) "دوور". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< **per-* (*IE.*)** "تێپەڕین، واوەچوون، پێشڤەچوون، دوور بوونەوە". خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑تێپەڕین te-perîn و ↑بوورین burîn و پەرە pere لە وشەی ↑پەرەوازە *perewaze* دا. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا لا[1] la لەوانەیە ئاماژە بە لاوەکی بوون، هاتن لە لاوەڕا بکا.

لاپرەسەن **lapresen** [ *lāprasan* ] - "خۆ هەڵقوتێن، فزوول": ↑لا[1] la + پرەسەن pıresen. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑پرسین pırsîn. مانای وشەکە دەبێتە کەسێک کە "لە لاوە دەپرسێ" واتا کەسێک کە تەرەفی ئەسڵی کێشەکە نییە [لە لاوە وەستاوە] و خۆ تێ هەڵدەقوتێنێ.

لاپک **lapık** [ *lāpık* ] - "دەستەوانە": لەپک lepık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ↑ لەپ lep "بەری دەست".

لاپوشک **lapuşk** [ *lāpušk* ] - "چەنگاڵی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ↑لەپ *lep* "بەری دەست". ئەم وشەیە شێوەی کۆنتری ↑لووشک lûşık ە کە ئەویش هەر ئاماژە بە دەست (سمی) ئەسپ و کەر دەکا.

لاپیتە **lapîte** [ *lāpīta* ] - "ئەوشوێنەی داردەست کە کێڵەر دەستی پێ دەگرێ": لابیتە labîte ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لابووت labut.

لات[1] **lat** [ *lāt* ] - "1- نەدار، پەرێشان 2- بەدفەڕ، شەڕانی": دەگەڵ "لووت ش دێ [لات و لووت lut u lat]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ leid (G.)، leed (Nl.)، loath (E.)، led (Sw.) "ناخۆش، دزێو، بەد، ڤێزەون"، Leid (G.)، leed (Nl.) ، lāđ (E.) "ئازار، نەخۆشی، بێزاری، پەرێشانی، خەفەت"،

(Sw.) leda "بێز، رق" و (G.) leider "افسووس، مخابن". ده زمانی ئەڵمانیدا هەروەها (G.) beleidigen بەکار دێ بە مانای "زوێر کردن، بریندار کردن(ی رووحی)". دە زمانی کوردمادیدا ↑لاتاو lataw بە مانای "تەوس، تانە و تەشەر" بە تەواوی دەگەڵ ئەم وشە ئەڵمانییە دێتەوە و دەبێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ. وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر < (IE.) *leit- "قێز لێ هەستان، بێزار بوون". [وشەی "قێز" دە زمانی کوردمادیدا لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ کەد "رەنج، ئازار"].

لات² **lat** [ *lāt* ] - "تاتە بەرد": پێوەندی هەیە بە (Gr.) lithos "بەرد".

لات3 **lat** [ *lāt* ] - "زەوی خەتدراو بۆ کێڵان": خزمە دەگەڵ ↑لەت let "بڕ، پار، پارچە".

لاتار **latar** [ *lātār* ] - "تاوێرەبەرد": پێوەندی هەیە بە (Gr.) lithos "بەرد".

لاتاو **lataw** [ *lātāw* ] - "تەوس، تانە و تەشەر": خزمە دەگەڵ لات¹ lat "1- نەدار، پەرێشان 2- بەدفەڕ، شەڕانی".

لاترە **latre** [ *lātra* ] - "ڕەت دان، بەلادا هاتن، تل خواردن": لەترە letre و لاتراسکە latraske ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ (G.) lottern "شەلەختە بوون"، (G.) Schlottern "شل و لەرزۆک بوون"، (G.) lotar "شل و شەوێق، پووچ، سەرسەری، شێتۆکە"، سەر بە ریشەی <- (IE.) *(s)leu- "شل و شۆڕ بوون".

لاتە1 **late 1** [ *lāta* ] - "تەنگەنەفەسی": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لات¹ lat.

لاتە2 **late 2** [ *lāta* ] - "جۆرێک کەوای درێژ": هەروەها لاتیە latîye هەیە بە مانای "کڵاوی پەشم". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Lid، (Nl.) lid، (E.) lid، (Sw.) led "پێلووی چاو". مانای وشەکە دە سەردەمە کۆنەکاندا "سەرپۆش، قەپاخ" بووە. ئەم وشە ژێرمەنیانە خزمن دەگەڵ ↑لار lar و ↑کل¹ kıl "خوار"، سەر بە ریشەی <- (IE.) *klei- "چەمان، داهاتنەوە، پاڵ دانەوە".

لاتیە **latîye** [ *lātīya* ] - "کڵاوی پەشم": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لاتە late "کەوای درێژ".

لاج **lac** [ *lāj* ] - "تەنیشت": [بۆ هێلکە دەگوترێ]. خزمە دەگەڵ ↑لا la.

لاجوەرد **lacwerd** [ *lājward* ] - "بەردێکی شینی بەنرخ": لاجورد (P.) lājvard. لاج lac + وەرد werd. لاج lac دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە↑ لاز laz یان لاس las، دە بنەڕەتدا بە مانای "درەوشانەوە". وەرد werd شێوەی کۆنتری ↑بەرد berd ە بە مانای "سەنگ، کەڤر". وشەکە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیشەوە، بۆ وێنە (G.) Lasur "ڕەنگی روون و شەففاف".

لاچلاچ(ک) **laçlaç(k)** [ *lāčlāč(k)* ] - "1- شەویلکە 2- کاکیلە": دەشێ پێوەندی بە ↑لەت *let* [لەت و کوت]ەوە هەبێ و مەبەست ئەو شتە بێ کە خواردن لەت و پەت دەکا. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑لاچۆپاچۆ laçopaço هەیە بە مانای "خرت و پرت، شڕە و بڕە". لێرەشدا "لاچ" مانای "لەت و پەت" دەردەبڕێ و ئەم شیمانەی سەرەوە پشتراست دەکا. کەرتی پاچۆ paço خزمە دەگەڵ ↑پسان pısan "کرتان، لەت بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی لاتینی molar "کاکیلە، خلێنە" کە دە ئەسڵدا مانای "وردکەر، هاڕێنەر" دەبەخشێ و مەبەست دداتیکە کە خواردن دەهاڕێ و خزمە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Mühle بە مانای "ئاش" (شوێنی ورد کردنی دەغڵ و دان). لە فارسیدا بە ددانی خلێنە دەگوترێ "دندان اسیاب" واتا "ئاشەددان". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ئارۆ aro هەیە بە مانای "پووک، شەویلکە" (بە فارسی ارواره ārwāre) کە لەوانەیە پێوەندی بە "هاڕین"ەوە هەبێ].

لاچۆپاچۆ **laçopaço** [ *lāčopāčo* ] - "خرت و پرت، شڕە و بڕە": بڕوانە ↑لاچلاچ(ک) laçlaç(k).

لاچەژ **laçej** [ *lāčaž* ] - "مرەببا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑لێستنەوە lestınewe، (G.) lecken، (OG.) lecchon، (OE.) liccian، (E.) lick و likken (Nl.)، (Gr.) leichein، (Rus.) lizat "لێستنەوە"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *(s)leiĝh-** "لێستنەوە".

2- ↑لیچاڵ lîçal.

لاخ **1** **lax** [ *lāx* ] - "بە دەست دروونەوەی گیا": خزمە دەگەڵ ↑لەت let و ↑لێرین lerın "تیکول کردن".

لاخ **2** **lax** [ *lāx* ] - لاخ کردن واتا "بەسەر یەکدا کردنی دەغڵ و گیای دووراو". خزمە دەگەڵ ↑لێش lêş "بارەگیا".

لادە **lade** [ *lāda* ] - "تەپاڵەی لە سەر یەک دانراو": خزمە دەگەڵ ↑لۆدە lode.

لادێ **lade** [ *lāda* ] - "دێ، گوند": ↑لا la + ↑دێ de [واتا دێیەکی بە لاوە].

لار **lar** [ *lār* ] - "خوار، بەلاداهاتوو": هەروەها دەگەڵ "لەنجە" دێ [لەنجە و لار lence u lar]. دەبێ کورتکراوی ↑سلار sıl(l)ar بێ [سلار بوونەوە واتا خوار بوونەوە و بەلادا هاتن]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کل kıl، ↑لەرینەوە lerîn(ewe) [بەم لا وئەو لادا لار بوونەوە]، ↑لەملمین lemlımîn، سەر بە ریشەی **< (IE.) *klei-** "لار بوون، کل بوون". دە زمانە خزمەکاندا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک clinare (L.) "لار بوون، کل بوون"، clino (Gr.)، -sri nauu- (Av.)، srayate (OIn.) "پاڵ دانەوە"، šli-nu (Lit.) "پاڵ دەدەمەوە"، (h)leinen (OG.) و lehnen (G.) "پاڵ دانەوە".

لارە **1** **lare** [ *lāra* ] - "بزوانی گیا و لکەداری ناسک لەبەر با": خزمە دەگەڵ ↑لەرانەوە leran(ewe).

لارە **2** **lare** [ *lāra* ] - "گریانی توندی زارۆ": خزمە دەگەڵ ↑لۆراندن lorandın.

لاری **larî** [1] [ *lārī* ] - "دوژمنایەتی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ lauern (G.)، lower (E.)، loeren (Nl.)، lura (Sw.) "بە دزییەوە و بە نیازێکی خراپ لێ ڕوانین، خۆ لێ مات دان". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

لاری **larî** [2] [ *lārī* ] - "کایە، گەمە": خزمە دەگەڵ ↑لەیزین leyzîn "کایە کردن".

لاز **laz** [ *lāz* ] - "جوانچاک": لاج lac و لاس las یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ leukos (Gr.) "سپی"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *leuk-** "درەوشانەوە، تروسکانەوە". لەم تێڕوانینەوە لاز مانای "درەوشاوە" دەبەخشێ.

لازە **laze** [ *lāza* ] - "بێکەس، بێ سەرپەرست": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لووگی lugî.

لاژ **laj** [ *lāž* ] - "گەوج": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑لۆچ loç سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمان، با دران". لاژ دە بنەڕەتدا وەک کەسێکی "مێشک خوار یان مێشک بادراو" لەبەر چاو گیراوە.

[تێبینی: لە باری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "گێژ"، "گێل"، "حۆل"، "گەمژە" [گەوج]. گشت ئەم وشانە ریشەکانیان مانای "سووڕان، با دران" دەبەخشێ].

لاس **1** **las** [ *lās* ] - "جوانچاک": ↑لاز laz.

لاس **2** **las** [ *lās* ] - "کۆمای گزرە": خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne و ↑لێش leş "بارەگیا".

لاس **3** **las** [ *lās* ] - "شیاکە، ریخ": خزمە دەگەڵ ↑لووس lus و ↑لیچق lîçıq و چەندان وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەڕ و لیچق بوون".

لاس **las** [4] [ *lās* ] - "دەنگی گۆڵەسەگ لە کاتی جووت بووندا": هەروەها لاس کردن مانای "حیلاندنی سەبری ئەسپ" دەدا. لاسکە لاسک laskelask یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ lachen

(G.) (h)lahhan ،(OG.) hlahjan ،(Gt.) laugh ،(E.) klakka ،(OIs.) "کەنین، پێکەنین"، سەر بە ریشەی **< -kleg*** *(IE.)* "قیژاندن، هەرا کردن" و دوورتریش سەر بە ریشەی **< -kel*** *(IE.)* "بانگ کردن، هەراکردن". ↑حیلاندن hîlandın شێوەیەکی دیکەی ئەم وشەیە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لەق leq "حەنەک، گاڵتە" و ↑لیقە lîqe "تریقەی پێکەنین". دە زمانی فارسیدا لاس زدن lās zadan (P.) هەیە واتا "لاس لێدان" کە ماناکەی دەبێتە قسە کردنی خۆش دەگەڵ رەگەزی بەرابنەر بە مەبەستی راکێشانی سەرنجی ئەو بۆ لای خۆ. زۆر وێ دەچێ مانای "لاس"ی فارسیش دە بنەڕەتدا هەمان پێکەنین بێ و مەبەست "پێکەنین" و خۆش و بێش کردن بێ. دیسان دە زمانی کوردمادیدا ↑لک[4] lık هەیە و لک لک lıklık بە مانای "بارەباڕی مەڕ و بزن" و هەروەها "پێکەنین بە دەنگی بەرز، قاقا پێکەنین" دێ. وشەیەکی دیکەش کە هەر لەم پێوەندییەدا جێی ئاماژەیە، وشەی ↑لەگلەگ legleg [لەقلەق leqleq]ە کە ناوی باڵدارێکی دەندووکدرێژە. ئەم باڵدارە بە لێکدانی پەیتاپەیتای دەندووکی دەنگ و هەرایەکی بەرز دەتیتەوە و لەوانەیە هەر بۆیەش بەم جۆرە ناو نراوە.

لاس[5] **las** *[ lās ]* - "فریو": لاس دان واتا "خاپاندن". خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکە لە ↑لیت lît "فێڵ، گزی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ List (G.)، lists (Gt.)، list (OE.)، (Sw.) "فێڵ، گزی"، سەر بە ریشەی **< -l(a)is*** *(IE.)* "زانین".

لاسا **lasa** *[ lāsā ]* - "چاولێکەری، تەقلید": لاسایی lasayî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ leisten (G.) "ئەنجام دان، دەرەقەت هاتنی کارێک"، leisten (OG.)، laistjan (Gt.)، la stan (OE.) "رەچاو کردن، پێرەو کردن، شوێن کەوتن"، last (E.) "بەردەوام بوون، درێژە کێشان"، سەر بە ریشەی **< -leis*** *(IE.)* "شۆپ، شوێنپێ، رێچکە". بەم جۆرە دەبینین وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێن کەوتن، لەسەر شۆپێک رۆیشتن" بووە. دە زمانە ئەورووپییەکاندا چەند وشەیەکی دیکەش لەم ریشەوە پەیدا بوون، وەک Gleis (G.) "خەتی قەتار"، (wagen)leisa (OG.) "شوێنی چەرخی گاری"، lira (L.) "قوڵکە، کێڕ"، lernen (G.) "فێر بوون"، lehren (G.) "فێر کردن"، List (G.) "فەند و فێڵ".

لاسار **lasar** *[ lāsār ]* - "سەرکێش، ملهوڕ، سەرپێچیکەر": دەبنەڕەتدا لاسەر laser بووە.
[بۆ زانیاری پتر لەبارەی مانای بنەڕەتی وشەکەوە بڕوانە ملهوڕ mılhur].

لاسامە **lasame** *[ lāsāma ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑لێزمە lezme.

لاستیک **lastîk** *[ lastīk ]* - "جیر": لاستیق lastîq یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر وەشەی فەرانسەیی < élastique *(Fr.)* "شتێک کە لەبەر یەک دەکێشرێتەوە، شتێک کە هەڵدەبەزێتەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە elastisch (G.).

لاسک **lask** *[ lāsk ]* - "ساقەتە، بەژنی گیا": لاچک laçk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەش leş "تەن، تەنە". "لاسک" واتا "تەنەی بچووک"ی گژ و گیا.

لاسەنگ **laseng** *[ lāsang ]* - "ناتەراز، لایەک لە لاکەی دیکە قورستر": ↑لا la + ↑سەنگ seng "بەرد، وەزن، قورسایی".

لاشە **laşe** *[ lāša ]* - "کەلاک": ↑لەش leş.

لاشیپانە **laşîpane** *[ lāšīpāna ]* - "داری درێژی چوارچێوەی دەرگا": لا la + شیپانە şîpane. لا la بە مانای "قەراخ"ە و شیپانە şîpane دەچێتەوە سە ↑چێو çew "دار"، مانای تێکرای وشەکە دەبێتە "داری قەراخ". چێو çew دە فارسیدا دەبێتە چوب čūb (P.).

لاعبکەرە **laɛıbkere** *[ lāɛıbkara ]* - "مەراییکەر، زمانلووس": لاعب laɛıb خزمە دەگەڵ ↑لاف laf "خۆ هەڵکیشان" و ↑لاواندنەوە lawandnewe "پێهەڵگوتن".

لاف **laf** *[ lāf ]* - "خۆ هەڵکیشان": وشەکە خزمە دەگەڵ ↑لاواندنەوە lawandnewe، دە بنەڕەتدا بە مانای "تاریف کردن، پێهەڵگوتن". لاف لێدان دە بنەڕەتدا بە مانای "پێهەڵگوتن" بووە و دواتر مانای "خۆ هەڵکیشان و بەخۆ هەڵگوتن"ی وەرگرتووە.

لافاو **lafaw** *[ lāfāw ]* - "سێڵاو": لاپاو lapaw یش دەگوترێ. لاف laf + ئاو aw. بنەوشەی لاف -laf دەشێ بە مانای "بەرز بوونەوە" بووبێ و مەبەست لە وشەکە بەرز بوونەوەی ئاوە. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لیفاندن lîfandın "هەڵدان و بەرز بوونی گیا". هەروەها لەوانەیە وشەی ↑رەپ rap [رەپ بوون] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

لاڤ1 **lav 1** *[ lāv ]* - شێوەی دیکەی ↑لاو law "جەوان، گەنج".

لاڤ2 **lav 2** *[ lāv ]* - "جوان، دڵگر": خزمە دەگەڵ loben (G.)، loven (Nl.)، lofian (OE.) و lova (Sw.) "خۆش لێهاتن، قشەی خۆش پێگوتن، پێهەڵگوتن، *لاواندنەوە*". ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە کە بە مانای "خۆش ویستن" دێن، وەک lieben (G.)، love (E.)، lijbit (Rus.) سەر بە ریشەی ***(IE.) *leubh- >*** "خۆش ویستن، حەز کردن". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لاف laf [لاف لێدان واتا خۆ هەڵکشان، بە خۆ هەڵگوتن] و هەروەها ↑لاوژە lawje و ↑لاوک lawık "گۆرانی پێدا هەڵگوتن"، ↑لفت lıft "قسەی دڵخۆشکەرە"، لاواندنەوە lawandın(ewe) و هتد. "لاڤ" بە مانای "جوان، دڵگر" دە بنەڕەتدا بەو مانایە هاتووە کە مرۆڤ حەزی بە دیتنی شتێک یان کەسێک کردووە، واتا ئەو کەسە یان ئەو شتە جێی دڵخۆشی و خۆش ویستن بووە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی lieb (G.) مانایەکی زۆر نیزیک بەمە دەگەیەنێ، واتا "میهرەبان، خۆشەویست".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی کەشخە"جوان" کە دەبێتە خزم دەگەڵ حەز "(خۆش)ویستن"].

لاڤایی **lavayî** *[ lāvāyī ]* - "پاڕانەوە": لاڤە lave ش دەگوترێ. هەروەها وەک کردار ↑لوباندن lubandın هەیە بە مانای "پاڕانەوە". لابە lābe (P.)، خزمە دەگەڵ ↑لاڤ2 lav 2 "جوان، دڵگر". وەک لەسەرەوە باس کرا، پێوەندی هەیە دە نێوان دوو چەمکی "جوان" و "خۆش ویستن"دا. هەر بەم شێوەیە پێوەندیش هەیە دە نێوان چەمکەکانی "(خۆش)ویستن" و "داوا کردن، داخواز کردن" و "پاڕانەوە"دا. [سەرنجی پاڕانەوەی دڵدارەکان بدە لە ئاست حەزەکانیان، بە تایبەتی لەناو هەڵبەستە دڵدارییەکاندا!].

[تێبینی: هەر سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانەی سەرەوە شیاوی باسە کە وشەی حەز ħez دە زمانی کوردمادیدا مانای "خواستن، خۆش ویستن" دەبەخشێ، دە زمانی ئینگلیزیدا ask مانای "داوا کردن" دەبەخشێ. هەروەها "پەرستن" دە زمانی کوردمادیدا بە هەر دوو مانای "پاڕانەوە" و "خۆش ویستن"ی زۆر بەکار دێ].

لاق[1] **laq[1]** *[ lāq ]* - "قاچ":

1- دە زمانی ئینگلیزیدا leg (E.) "لاق" هەیەکە دە .ON دا legger بووە. [وشە کۆنەکە هەروەها بەوێنەی armlegger و handlegger بەکار هاتووە بە مانای "باسک" و هەروەها بە وێنەی fötlegger بە مانای "لاق"]. ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. دە فارسیدا لگد leged (P.) هەیە بە مانای "لەقە". دە زمانی کوردمادیدا وشەی↑ لینگ ling هەیە کە هەر بە مانای لاق دێ. لەوانەیە "لاق" پێوەندی بە "لینگ"ەوە هەبێ و فۆتیمی n تێیدا سوابووبێتەوە.

[تێبینی: سەبارەت بە سووانەوەی فۆتیمی n هەڵی سەنگینە دەگەڵ شەق şeq و چۆک çok لەلایەک و Schenkel (G.) "ڕان" لە لایەکی دیکەوە].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لۆقاندن *loqandın* "بەپەلە ڕۆیشتن" و ↑لۆقاو loqaw "هەنگاو، قەدەم".

لاق2 **laq** [ *lāq* ] - "گۆشتی لاواز": ↑لەجەڕ lecer.

لاقە **laqe** [ *lāqa* ] - "1- پێوەندی [لاقەم بە سەریەوە نییە] 2- پێوەندی سێکسی ناڕەوا [لاقە کردن]": مانای دووەم لە مانای یەکەم سەرچاوە گرتووە، واتا مەبەست پێوەندییەکە لەباری سێکسییەوە. دە زمانی عەرەبیدا علاقة εilāqa (Arb.) هەیە، بەڵام لەوە ناچێ وشەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیرابێ. تەنانەت دوور نییە وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. لاقە laqe خزمە دەگەڵ ↑لکاندن lıkandın "پێوە نووساندن، گرێ دان، وەسڵ کردن".

لاک **lak** [ *lāk* ] - "کەپەک و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ": چەند وشەیەک دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەن کە دەشێ وشە کوردمادییەکەش پێوەندی بە ئەوانەوە هەبێ. ئەم وشانە بریتین لە: Lake (G.) "سوێراو بۆ تێدا ڕاگرتنی خواردەمەنی، خوێواک"، Lache (G.) "ئاوی وەستاو"، leken (Nl.) "تکانەوە، دڵۆپان"، leka (OIs.) "دەڵاندن، جاری بوون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **<** ***-leg**** ***(IE.)*** "دەڵان، دڵۆپان". وشەی ↑لیک lîk "ئاوی دەم"، ↑لەق3 leq "هێلکەی گەنیو"، ↑لەقلەقی leqleqî "جۆرێک ترێ"، ↑لێچ *leç* *"گۆلاو"* و چەند وشەیەکی دیکە لەم ڕیشەوە سەرچاوەیان گرتووە.

[دە ئەڵمانی ناویندا لە جیاتی Lake وشەی Salzbrühe بەکار هاتووە. ئەم وشەیە پێک هاتووە لە دوو وشەی Salz "خوێ" و Brühe "شۆرباو، ئەو ئاوە خست و خۆڵەی لە کوڵاندنی شتی وەک گۆشت، دانەوێڵە و هیتر دروست دەبێ". مانای ئەم وشە ئەڵمانییە بە تەواوی دەگەڵ مانای وشەی کوردمادی "لاک" یەک دەگرێتەوە].

لاکان **lakan** [ *lākān* ] - "تەنراوێک لە شووڵ بۆ ڕۆیشتن بەسەر بەفردا": لەهان lehan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شێلهان şêl(e)han "ڕاخوشین"، schleichen (G.)، slihhan (OG.)، sliken (ME.) "خوشین"، سەر بە ڕیشەی **<** ***-sleu(k)**** ***(IE.)*** "خوشین، خزین، خلیسکان". ئەم ڕیشەیەش دەچێتەوە سەر **<** ***-(s)lei**** ***(IE.)*** "تەڕ و لووس و لیچق بوون".

لاکە **lake** [ *lāka* ] - "بزووتن بەم لا و ئەولادا": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەقە leqe سەر بە کرداری ↑لەقین leqîn.

لاکی **lakî** [ *lākī* ] - "ڕەنگی قاڵی و بەڕە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لەککە lek(k)e.

لاکین **lakîn** [ *lākīn* ] - "ئەشکەوت": خزمە دەگەڵ ↑لووهین luhîn "نەقەب، تۆتیل".

لاگا **laga** [ *lāgā* ] - "1-جێگەی وچان لە دەشت 2- دێهات": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Lager (G.)، legar (OG.)، ligrs (Gt.)، lair (E.) و läger (Sw.) "ئۆردووگا، شوێنی مانەوە و حەسانەوە". وشە ژێرمەنییەکان پێوەندییان بە کردارێک هەیە کە دە ئەڵمانیدا دەبێتە liegen (G.) "داندران، لێبوون، ڕاکشان، وچان دان"، سەر بە ڕیشەی **<** ***-legh**** ***(IE.)*** "دانران، لێبوون، جێ گرتن".

لاڵ **lal** [ *lāl* ] - "کەسێک نەتوانێ قسە بکا": خزمە دەگەڵ lallen (G.)، lalla (Sw.)، lalle (Den.)، laluoti (Lit.) "زمان گیران و بە کوت و پچڕی قسە کردن"، سەر بە ڕیشەی **<** ***-lal(l)a**** ***(IE.)***. وشەکە بە لاسا کردنەوەی زمانی زارۆک دروست کراوە. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لاڵانەوە lalan(ewe) و ↑لایلای laylay.

**لالانەوە lalan(ewe)** [ *lālān(awa)* ] - "پارانەوە": دەشێ پێوەندی بە ↑لال lal ەوە هەبێ و مەبەست دە بنەڕەتدا قسەکردن وەك مرۆڤی لاڵ بێ.

**لالە1 lale 1** [ *lāla* ] - "خاڵ": لالۆ lalo ش دەگوترێ لە دۆخی بانگ کردندا، وەك بابۆ، مامۆ. وەك لە چەند جێگەی دیکەشدا باس کراوە، زۆر لەو وشانەی دە زمانی کوردمادی و زمانەکانی دیکەشدا وەك ناوی کەسوکار بەکار دێن، لە دووبارە بوونەوەی دەنگێک پێک هاتوون و دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگ [گڕ و گاڵ]ی زارۆك بوون، وەك بابە babe، مامە mame، کاکە kake، دادە dade، یایە yaye، نەنە nene و هتد. وشەی "لالە"ش هەر وەك ئەم وشانە پێک هاتووە.

**لالە2 lale 2** [ *lāla* ] - "رەبەنۆك، مێلاقە": لالە lāle و ئالالە ālāle (P.). دە کوردمادیدا ↑هەڵاڵە helale ش دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا بە گوڵی "سۆسن، سوێسن" دەوگوترێ lilie (G.). لە فەرهەنگی Wahrig دا ئەم وشە ئەڵمانییە بەم جۆرە ریشەناسی کراوە: *lilia > (OG.) lilja > (L.) leirion > (Gr.) hleli > (Kopt.)*.

[تێبینی: بەداخەوە سەرەرای پشکنینی فەرهەنگی ناوبراو بۆم ساخ نەبۆوە کە زمانی *(Kopt.)* چ زمانێکە!].

**لاڵەپەتە lalepete** [ *lālapata* ] - "کەسێک لە قسە کردندا زمانی دەگیرێ": ↑لاڵ lal + پەتە pete. "پەتە" خزمە دەگەڵ ↑پسك pısık.

**لامپ lamp** [ *lāmp* ] - "گڵۆپ": > *(Gr.) *lamp(a)* "گڵۆپی درەوشاو" > *(Gr.) *lampein* "هایسان، درەوشانەوە".

**لامك lamk** [ *lāmk* ] - "دەموچاو بچکۆڵە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ lahm (G.)، lam (Nl.)، lame (E.)، lam (Sw.) "گۆج، شەپڵەلێدراو، چەوێل"، سەر بە ریشەی *> (IE.) *lem-* "شکان". لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا مانایەکی هەبووبێ وەك "شکنندە" دە فارسیدا، واتا شتێك کە ناسك و لاواز و بەرگەنەگرە.

**لاملامك lamlamık** [ *lāmlāmık* ] - "شەویلکەی خوارەوە": دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکە هەیە بە مانا "شەویلکە، کاکیلە" کە بریتییە "لاچلاچ(ك)". ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی بە "لەت" [لەت و کوت]ەوە هەبێ و مەبەست ئەو شتە بێ کە خواردن لەت و پەت دەکا. ئەگەر لەم تێڕوانینەوە بۆ ساخ کردنەوەی وشەی "لاملامك" بچین، دەبینین کە ئەم وشەیە دەگەڵ ریشەی *> (IE.) *lem-* "شکان" بەباشی دەگونجێ. lomit (Rus.) "شکان" لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: دیارە دەتیوان چەمکەکانی "شکاندن" و "ورد و خاش کردن"دا پێوەندی نیزیک هەیە. وشەی "ماردن" یان "مارین" بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا مانای "شکاندن" دەدا، "مارز" مانای "زاڵم، سەرکوتکەر، داپڵۆسێنەر" دەبەخشێ و "مەرس" بە دوو مانای "گاگیرە" (وردکەر) و "پشاوتن" (رێکگوشین) بەکار دێ. دە زمانی ئەڵمانیدا brechen "شکاندن" و brocken "ورد و خاش کردن" مانا دەدا].

**لامۆ lamo** [ *lāmo* ] - "ئاژەڵی بێگانە لەناو گەلەدا": لەوانەیە پێک هاتبێ لە ↑لا la "قەراخ" و ئامۆ amo [↑هاموشۆ hamûşo]. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "لە لاوەڕا هاتوو".

**لامە lame** [ *lāma* ] - "مەڕایی": [لامەلامەی لەبەر دەکا]. خزمە دەگەڵ ↑لم lım "خیزی ورد"، ↑چڵم çılım و هێندێك وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەی *> (IE.) *(s)lei-* "لووس، لیچق". دە زمانی ئەڵمانیدا Schleim (G.) مانای "چڵم، لیتە، لەجەن" [بەگشتی تراوی لیچق] دەبەخشێ و هەر لەم وشەیە وشەی schleimen دروست کراوە کە دوو مانا دەدا: 1- تراوی لیچق دەڵاندن

(مانا ئەسڵییەکە) 2- مەرایی و لامەلامە کردن". وەک لەم وشانە دەدەکەوێ لە کۆنەوە لەناو زمانەکاندا پێوەندییەک دۆزراوەتەوە لەتیوان دوو چەمکی "تەڕ و لووس و لیچق" و "مەڕایی کردندا". وشەی "زمانلووس" یان "زماتیکی لووس پێدا هێنان" یان لە فارسیدا "چاپلوس" [کۆنتر: کەپلووس، کەفلووس] ئەم راستییەی سەرەوە پشتراست دەکا. شیاوی باسە کە وشەی "مەڕایی"یش خۆی دە بنەڕەتدا مانای "مشتومالٚ دان" [کیسەکێشی، خایەمالٚی] دەدا.

**لامیسک lamîsk** [ *lāmīsk* ] - "بێچارە، نەدار": خزمە دەگەلٚ ↑لامک lamk "دەموچاو بچکۆڵە". [تێبینی: سەبارەت بە پێوندی چەمکەکانی "کەم، چکۆڵە" لە لایەک و "لاواز" و "نەدار" لە لایەکی دیکەوە بڕوانە وشەکانی "هەژار" و "پاڵە"].

**لان1 lan** [ *lān* ] - "1- نک، جەم، کن": ئەم وشەیە شێوەی کۆنتری ↑لا la یە. مانای "لان" دە بنەڕەتدا "کەلەکە"یە و خزمیشە دەگەڵ ↑کەلەکە kelek(e) "تەنیشت، قەراخی لەش" و دەگەڵ lehnen (G.)، (h)leinen (OG.)، lean (E.) "پاڵ دانەوە"، سەر بە ریشەی **< *klei-* (IE.)** "خوار بوونەوە، پاڵ دانەوە". هەروها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کل kıl "خوار" و چەند وشەیەکی دیکە. مانای "کەلەکە" دە گۆرانێکی حەسەن زیرەکدا بە ڕوونی دەردەکەوێ، کاتێک دەڵێ: "لانە و لانت کەم". لەم مانا بنەڕەتییەوە، واتا "قەراخی تەن، تەنیشت" دواتر مانای گشتی "کەنار، کن، قەراخ" سەری هەڵداوە و دواتریش مانای "جیهەت، ئاراستە" پەیدا بووە [بۆ کام لا دەچێ]. ئەم مانایانە بە یەکەوە پێوەندییەکی نیزیکیان هەیە و هەر بۆیە ماناکان لە یەکتر سەرچاوە دەگرن. لەم بارەوە لە ژێر وشەی "جەم" هێندێک زانیاری خراوەتە روو. "لان" لەباری فۆنۆلۆژیکەوە بە دوو جۆر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە لایەکەوە سواوەتەوە و بووەتە لا la و لە لایەکی دیکەشەوە بووەتە ↑لایەن layen.

**لان2 lan** [ *lān(a)* ] - "کون و کەلێنێک کە جێی حەسانەوەی ئاژەڵ بێ": لەهن lehın و لانە lane ش دەگوترێ. لانە lāne (P.). خزمە دەگەڵ Lehne (G.)، lene (MG.)، (h)lina (OG.) "شوێنی پاڵ دانەوە، پاڵگە"، klínē (Gr.) "جێگە و بان، تەختەخەو". وشەی کلینیک klinik "نەخۆشخانە" دە زمانە ئەورووپییەکاندا ریشەکەی بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگەڕێتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Lid (G.) "پێلووی چاو" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و مەبەست پێستێکە کە چاو دادەپۆشێ. مانای ئەم وشە ئەڵمانییە دە کۆندا "سەرپۆش، داپۆشەر" بووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *klei-* (IE.)** "خوار بوونەوە، پاڵ دانەوە". بەم شێوەیە لان2 lan دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لان1 lan "نک، جەم، کن". لەم تێڕوانینەوە مانای لان(ە) دە بنەڕەتدا بریتییە لە "پاڵگە، شوێنی پاڵ کەوتن، جێگە و بان (ئاژەڵ)". وشەی ↑لانک(ە) lank(e) "بێشکە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**-ڵان lan-** [ *lān* ] - "پاشگرێکی شوێن": ئەم پاشگرە دەگەڵ هێندێک وشە دێ وەک خیزەڵان، بەردەڵان، بێشەڵان، قامیشەڵان، سەوزەڵان، نەوتەڵان و هتد. پاشگرەکە بەشێوەی ڵێن len- ش دەگوترێ [خیزەڵێن] و ئاماژە بە تایبەتمەند بوونی زەوییەکە بە شتێک دەکا. وەک دەیبینین لە کاتی لکانی ئەم پاشگرە، وەک زۆر پاشگری دیکە بزوێنی e وەک ناوگرێک دەکەوێتە تیوانەوە [خیز + ە + ڵان xîz + e + lan]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ land دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "وڵات" [وەک England، Deutschland، Irland، Scotland]. وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای زەوی و زاری بەرئاوەڵا بووە. ئەم مانا ئەسڵییە تا ئێستاش لە زمانەکاندا ماوەتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ Ackerland (G.) "زەوی کشت و کاڵی"، Waldland (G.) "زەوی جەنگەڵی، هەمان بێشەڵان]، Festland (G.) "زەوی ئیشکایی" [بەرانبەر بە دەریا]، Landschaft

(G.) "زەوی و زار، دیمەنی بەرئاوەڵا و دوورەستی دەشت و دەر". ئەم وشەیەی دوایی بۆ نیشان دانی تایبەتمەندی دەڤەرێکیش بەکار دێ و بۆ وێنە دەگوترێ bergige Landschaft واتا"ناوچەی شاخاوی" یان hügelige Landschaft "دەڤەری پڕ لە تەپۆڵک". شوێنەواری مانا ئەسڵییەکە دە هێندێک وشەی ئەورووپی دیکەشدا دەبینینەوە، وەک linda (Sw.) "مەزرا، کێڵگە"، land (OIr.) "شوێنی بەرئاوەڵا"، ljada (Rus.) "جەنگەڵی بەمەزراکراو"، lada (Chek.) "کێڵگەی نەچێنراو" و هتد. دە زمانی کوردمادیدا پاشگری "ڵان" یان "ڵین" هەروەک ئەو وشانەی سەرەوە ئاماژە بە زەوییەک دەکا کە شتێکی تایبەتی تێدا هەڵدەکەوێ، خیزەڵان واتا زەوییەک کە خیزی زۆر تێدا هەڵدەکەوێ، بەردەڵان واتا زەوی پڕ لە بەرد و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *Lendh-** (**IE.**) "زەوی، زەوی و زار، دەشت و دەر". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لەند lend بەکار دێ بە مانای "بەرزایی زەوی کە ئاو دەوری گرتووە".

**لانک(ە) lank(e)** [*lānka*] - "بێشکە": دەتوانین دوو شیرۆڤە بۆ ئەم وشەیە بکەین:

1- دە زمانی فارسیدا بە لانکە دەگوترێ "گەهوارە" کە خزمە دەگەڵ "گابار" و دواتر "گۆڕ"ی زمانی کوردمادی بە مانای "قوڵکە، شکێر، کون و کەلێن". لەوە دەچێ وشەی لانکە راستەوخۆ لە ↑لان lan [لانە]ەوە وەرگیرابێ کە ئەویش ئەو مانایانەی سەرەوە دەدا.

2- لەوانەشە وشەکە ئاماژە بە ↑کل[1] kıl بوون، ↑لار lar بوونەوەی و ↑لەرین(ەوە) lerin(ewe) بکا، چونکوو لانکە شتێکە بەم لا و ئەو لادا لار دەبێتەوە و دەلەرێتەوە. [جێگەی سەرنجە کە وشەی "بێشکە"ش ئاماژە بە "جووڵانەوەو راوەشان" دەکا]. وشەی "لانکە" بەهەر بارێکدا لێک بدەینەوە، دەچێتەوە سەر ریشەی **< *klei-** (**IE.**) "خوار بوونەوە، پاڵ دانەوە".

**-لانە lane** [*lāna*] - "پاشگری گچکاندن": [خونجیلانە، نەشمیلانە، ژیکەڵانە...]. بڕوانە پاشگری ↑لە[2] le.

**لانەواز lanewaz** [*lānawāz*] - "پەرپوە، هەڵوەدا، پەرەوازە": ↑لانە lane + واز waz. کەرتی یەکەم هەمان "لانە"یە بە مانای "ماڵ، جێگای حەوانەوە". کەرتی واز waz ئاماژە بە "رۆیشتن، دوور کەوتنەوە و ون بوون" دەکا. تێکڕای وشەکە واتا لەماڵ و حاڵ دوورکەوتوو، لانە گوم کردوو، ماڵ بەجێهێشتوو. کەرتی "واز" خزمە دەگەڵ weg (G.) و way (E.) "دوور، ون" و دە چەند وشەیەکی دیکەشدا هەر ئەو مانایە دەبەخسێ وەک ↑پەرەوازە perewaze. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بزر bızır "ون"، ↑بازرە bazre "تاراو، دەرپەڕیو" و چەندین وشەی دیکە و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بزووتن bızutın.

**لاو law** [*lāw*] - "جەوان": هەروەها لاوژۆک lawjok و لاوێژە laweje [لاویژە lawîje] هەیە بە مانای "تازەلاو". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە هێندێک مانای وەک "شل و شەوێق بوون، شلک بوون، ناسک بوون، جەوان بوون، چەمانەوە، سووڕان، راژان و لەرینەوە" دەردەبڕن. دیارە مانای راژان و لەرینەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شتی شلک و ناسک خۆڕاگر و بەهێز نییە و بە هاسانی دێتە بزاوتن. هێندێک لەم وشانە بریتین لە: ↑لاواز lawaz "کز، بێهێز، ↑لەوەند lewend "1- قامیشی باریک 2- جوانچاک، شوخ و شەنگ"، ↑لەوار lewar [لەق و لەوار]، ↑لڤین lıvîn "راژان"، ↑لاوێن lawen "چلەبی، نەمامی بی"، ↑لاولاو lawlaw [لاڤلاڤ lavlav]. دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک↑ لێو lew، ↑لێوە lewe، ↑لێفە lefe و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)leb-, *(s)lap-** (**IE.**) "شل و شۆڕ بوون، بێهێز بوون، داکەوتوو بوون".

**لاواچ lawaç** *[ lāwāč ]* - "پەنجەرەی بچووک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لووهین luhîn "نەقەب" سەر بە ریشەیەک بە مانای "داخستن".

**لاواز lawaz** *[ lāwāz ]* - "بێهێز، کز": خزمە دەگەڵ ↑لاو law.

**لاواندنەوە lawandın(ewe)** *[ lāwāndın(awa) ]* - "1- دڵدانەوە 2- بە مردوو هەڵگوتن": ئەم وشەیە هەرچەند تا رادەیەک مانای "دڵدانەوە"ی وەرگرتووە، بە ڵام دە ئەسڵدا بە مانای "قسەی خۆش پێگوتن، تاریف کردن، پێهەڵگوتن" بووە و تا ئێستاش ئەم مانایە هەر زاڵە. وشەکە خزمە دەگەڵ loben (.G)، loven (.Nl)، lofian (.OE) و lova (.Sw) "خۆش لێ هاتن، قشەی خۆش پێگوتن، پێهەڵگوتن". ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە کە بە مانای "خۆش ویستن" دێن، وەک lieben (.G)، love (.E)، lijbit (.Rus) سەر بە ریشەی < *(IE.) *leubh-* "خۆش ویستن، حەز کردن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لاف laf [لاف لێدان واتا خۆ هەڵکشان، بە خۆ هەڵگوتن] و هەروەها ↑لاوژە lawje و ↑لاوک lawık "گۆرانی پێداهەڵگوتن"، ↑لفت lıft "قسەی دڵخۆشکەرە" و هتد.

**لاوچ lawç** *[ lāwč ]* - "کەنداو، خەلیج": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لۆچ loç سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمان، خوار بوون". دیارە کەنداو جۆرێک چەمان و خوار بوونی رووبەری ئەرد و لە هەمان کاتیشدا قەراخی ئاوە لە ئەنجامی پێشوەچوونی ئاو بۆ ناو وشکایی.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Bucht هەیە کە بەو شوێنەی دەریا و گۆلاو دەگوترێ کە پەل دەهاوێتە ناو هیشکاییەوە و دۆخێکی کەنداوئاسا دروست دەکا. ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی biegen "چەماندن" و خزمیشە دەگەڵ "بازنە" و "باسک"، "بستوو" و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا].

**لاور lawır** *[ lāwır ]* - "ئاژەڵی کێوی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ دوو دەستەوشە:

1- ↑لەوەڕ lewer و ↑لێرین lerîn و چەندین وشەی دیکە، کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێکردنەوە، داپچڕین، داڕنین". لەم تێروانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "پچڕێنەر، لەت و پەتکەر". لەباری ماناوە هەڵیسەنگێنە دەگەڵ "گورگ".

2- Leber (.G) "جگەر" و Leib (.G) "سک، لەش، تەن" و leben (.G) "ژین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE.) *(s)lei-* "تەڕ و لیچق بوون، چەسپان، پێوەنووسان". ↑لم lım، ↑چلم çılım و چەندین وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون. بەم پێیە دوور نییە وشەکە، وشەیەکی کۆن بێ بە مانای "ئاژەڵ، گیانلەبەر". وشەی ئاژەڵ پێوەندی بە "ژین"ەوە هەیە و هەر بەم شێوەش دەتوانێ وشەی "لاور" پێوەندی بە leben (.G) و live (.E) "ژین"ەوە هەبێ.

**لاوژە lawje** *[ lāwža ]* - "گۆرانی": لاژە laje ش دەگوترێ.

1- دە زمانی ئەڵمانیدا loben (.G) مانای "پێهەڵگوتن" دەدا و ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ ↑لاواندنەوە lawandın(ewe) ی کوردمادی. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین وای بۆ بچین کە وشەی لاوژە lawje پێوەندی بە ↑لاواندنەوە lawandın(ewe) هەیە و دە بنەڕەتدا بە مانای "پێهەڵگوتن" بووە. لەم تێروانینەوە لاوژە دە بنچینەدا گۆرانییەک بووە بۆ پێداهەڵدان و پێهەڵگوتنی کەسانی خۆشەویست وەک دڵدار یان مردوو و هیتر. تا ئەمڕۆش دە کوردەواریدا باوە دەڵێن "گۆرانییەکی پێ هەڵگوت"، واتا لێرەدا پێهەڵگوتن بە گۆرانی مەبەستە. خاڵێکی دیکە کە ئەم بۆچوونەی سەبارەت بە مانای بنەڕەتی لاوژە وەک "گورانی پێهەڵگوتن، پیهەڵگوتن بە گۆرانی" پشت راست دەکا، وشەی روضة rouze (.P) یە. ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا بۆ "لاواندنەوە"ی ئیمامان و شەهیدانی شیعە بەکار دێ لە رێگەی "گۆرانی

پێهەڵگوتن" بە ئاوازێکی خەمگینانەوە. وشەی ↑لاوک lawık یش هەر لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەیە.

2- دە زمانی ئەڵمانیدا گۆرانی دەبێتە Lied ‏(G.)، liod ‏(OG.)، leod ‏(OE.)، ljod ‏(OIs.). ڕیشەی ئەم وشانە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام گومان دەکرێ پێوەندی هەبێ بە laus ‏(L.) "پێهەڵگوتن"، سەر بە کرداری laudare ‏(L.). دەکرێ وشەی "لاوژە، لاژە" دەگەڵ ئەم وشانەش بەرهەڤ بکەین، بەڵام ئەم شیمانەیە زۆر ڕێی تێ ناچێ.

لاوس **laws** [ *lāws* ] - "بانی دەم لە ژوورەوە، مەلاشوو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لاوچ lawç "کەنداو، خەلیج" و ↑لۆچ loç سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "چەمان، خوار بوون". بانی دەم شێوەیەکی گەوزی هەیە و بۆیە وێ دەچێ بەم شێوەیە ناو نرابێ.

لاوک **lawık** [ *lāwık* ] - "گۆرانی درێژی کلاسیک": خزمە دەگەڵ ↑لاوژە lawje.

لاولاو **lawlaw** [ *lāwlāw* ] - "گوڵێکە لە قەدی دار دەهاڵێ": لاڤلاڤ lavlav یش دەگوترێ. لبلاب lablāb ‏(P.). خزمە دەگەڵ ↑لاو law.

لاولاوە **lawlawe** [ *lāwlāwa* ] - "ئامرازی لێک قایم کردنی دەرگا و چوارچێوە کە بریتییە لە تیرەیەک کە لەناو مێیەدا دەسووڕێ": لولا loula ‏(P.). خزمە دەگەڵ ↑لوولە lule.

لاونا **lawna** [ *lāwnā* ] - "دڵ دانەوە، لاواندنەوە": خزمە دەگەڵ ↑لاواندنەوە lawandın(ewe).

لاوێن **lawen** [ *lāwen* ] - "چڵەبی ناسک، نەمامی دارەبی": خزمە دەگەڵ ↑لڤین lıvîn "جووڵانەوە، ڕاژان". "لاوێن" ئەوچڵە ناسک و شلکەیە کە بە هاسانی بە دەم شنەباوە دەلەرێتەوە و بۆیە بەم ناوە کراوە. خزمە دەگەڵ ↑لاو law "جەوان" و↑ لاولاو lawlaw و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "شل، شلک، ناقایم، بەجووڵە" دەکەن.

لاهیە **lahîye** [ *lāhīya* ] - "عاریە": [بۆ ددان و قژی بەدەڵ بەکار دێ]. خزمە دەگەڵ leihen ‏(G.)، lihan ‏(OG.)، leihan ‏(Gt.)، lion ‏(OE.)، ljā ‏(OIs.) "بەقەرز دان، عاریە دان"، سەر بە ڕیشەی < ***leik*-** *(IE.)* "جێ هێشتن، هێشتنەوە". وشەی ڕهن rahn ‏(Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

لایدە **layde** [ *lāyda* ] - "بیانی، لاوەکی": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑لا¹ la.

لایلای **laylay** [ *lāylāy* ] - "ئاواز بۆ خەواندنی زارۆک": لایەلایە layelaye ش دەگوترێ. لالایی lālāyī ‏(P.). خزمە دەگەڵ lull ‏(E.) [دەچێتەوە سەر lully, lulla, lullay]، lullen ‏(G.) "لایلایی کردن"، lallare ‏(L.) "گۆرانی لەسەرە خۆ و بێ وشە، نارەنار کردن". خزمە دەگەڵ ↑لال lal و هەروەها دەگەڵ لۆلو lolo و لێلێ lele دە گۆرانی کوردمادیدا.

لایەز **layez** [ *lāyaz* ] - "ئاومالک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لۆپ lop "مەلی مەلەوان"، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "شوشتن".

لب **lıb** - "دانە، دەنک": [لب لب واتا دانەدانە، دەنک دەنک، لبەک واتا دانەیەک]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی < ***leu*-** *(IE.)* "بڕین، پچرین، لێکردنەوە، تۆکڵ لێکردنەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑لەت let، ↑*لۆق loq* [تاق و لۆق]. لەوانەیە وشەکە سەرەتا بە مانای "لەت، بەش، تیکە" بەکار هاتبێ و دواتر ماناکەی بۆ "دانە" پەرەی گرتبێ.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Stück هەم بەمانای "تیکە" و هەمیش بە مانای "دانە" بەکار دێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "تیکە"ی کوردمادی و دە بنەرەتدا مەبەست بەشێک بووە کە بە هۆی لێدان و کوتانەوە لێ دەبێتەوە و خزمە دەگەڵ "تاشین"].

لباد **lıbad** [ *lıbād* ] - "بەرگنی پەستواو": خزمە دەگەڵ لڤا lıva یاخود ↑لوا lıwa "کوڵکەی وشتر و بەرخ". هەروەها لبادە lıbade هەیە بە مانای "فەرەنجی".

لبی **lıbî** [ *lıbī* ] - "دەڵەمە، پەنیری نەگوشراو": خزمە دەگەڵ Lab (G.)، leb (Nl.) "پەنیرمایە" سەر بە کرداری libern (MG.) "مەیاندن". ↑لۆر(ک) lor(k) یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دەشێ لە کۆندا *لەبەرک* *leber** بووبێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لوف luf "دۆی کوڵاو".

لپ **lıp** - "پەلی دار": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لب lıb و ↑*لەوەر* *lewer*.

لتەن **lıten** [ *lıtan* ] - "مژینی مەمک و گوان": خزمە دەگەڵ ↑لشتن lıştın.

لچ **lıç** [ *lıč* ] - "شتێک کە دەچەسپێ، وەک چرێش 2- ریپۆقی چاو": خزمە دەگەڵ ↑لچان lıçan "چەسپان" و↑ لیچ lîç "لیچق".

لچان **lıçan** [ *lıčān* ] - "چەسپان، نووسان": هەروها ↑لچ lıç هەیە بە مانای "چەسپ". خزمە دەگەڵ ↑لیچق lîçıq و ↑*لم* *lım* "خیزی ورد".

لرفاندن **lırfandın** [ *lırfāndın* ] - "خواردن و قووت دانی بەپەڵە": لرپ lırp یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schlürfen (G.)، slorpen (Nl.)، slurp (Norw.) "هەڵقوڕاندن". دەشێ لرفەی ئاگریش هەر لەم پێوەندییەدا لێک بدرێتەوە، واتا دەنگی بڵێسەی ئاگریش بە دەنگی لرفاندنی مرۆڤ چوێنرابێ. هەروەها ↑چڵپاندن çılpandın "1- مژینی مەمک بە هەڵپە و پەلەپەل 2- دەنگی ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

لسکە **lıske** [ *lıska* ] - "هۆگر، خوو پێگرتوو": خزمە دەگەڵ ↑لاسا(یی) lasa(yî) "چاولێکەری، تەقلید"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *leis-*** "شۆپ، شوێنپێ، رێچکە". بەم جۆرە دەبینین وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێن کەوتن، لەسەر شۆپێک رۆیشتن" بووە. دە زمانە ئەورووپییەکاندا چەندین وشە لەم ریشەوە پەیدا بوون، وەک lernen (G.) "فێربوون"، lehren (G.) "فێر کردن".

[تێبینی: "فێربوون" دە زمانی کوردمادیدا مانای "خوو پێگرتن و هۆگر بوون"یش دەگەیەنێ، بۆوێنە دەڵێن فڵانە کەس فێری ئەو کارە خراپە بووە].

لف1 **lıf 1** - "پێچ، پێچ دان": ↑لەف lef یش دەگوترێ. هەروەها ↑لەفە lefe هەیە بە مانای "بابۆڵە".

1- لەلایەکەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لڤین lıvîn "بزووتن، راژان". ئەو وشانەی لەم خێزانەدا جێ دەگرن، بەگشتی مانای "ناجێگیر، ناقایم، لەرزۆک" دەبەخشن. مانای "پێچ خواردن، با دران، سووڕان" دەشێ لەم مانا بنەڕەتییەوە سەرچاوەی گرتبێ. لەم بارەوە سەیری وشەی "لاولاوە" (گوڵی لاولاو) بکە کە دە فارسیدا "پیچک"یشی پێ دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا Lawine (G.) "رنوو، شاپە" دەچێتەوە سەر وشەی لاتینی labi (L.) "خزین، خلۆر بوونەوە" کە ئەویش پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و چەمکی "سووڕان" لە خۆ دەگرێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ loop (E.) "1- قڵفە 2- وەرسووڕان، وەرچەرخان، هەڵگەڕانەوە(لە هەوادا)". ریشەی ئەم وشە ئینگلیزییە دیاری نەکراوە.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیدا هێندێک وشەی وەک ملف malaf (Arb.)، لفافة laffāfa (Arb.) پێوەندییان بە وشە کوردمادییەکەوە هەیە. هەروەها لەوانەیە ↑لێفە lefe "پێخەو" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و مەبەست دە بنەڕەتدا "تێپێچ" بێ].

لف2 **lıf 2** - "1- شەنگڵەبەرەکەتە 2- دوانە، جمک 3- وێنە، هاوشێوە، وەک، ئاواڵ(دوانە) 4- هاوسەر [لف گرتن واتا هاوسەر گرتن]": ئەگەر بچینە ناخی ئەم وشەوە، دەردەکەوێ کە ماناکانی ئەم وشەیە دەبێ بەم شێوە ریزکراوەی سەرەوە پەرەی گرتبێ، واتا لە "پێکەوە

نووسان"ەوە تا دەگاتە "ئاواڵ، هاوسەر". بەم پێیە ئەگەر لەناو وشە و ریشە هیندوئەورووپییەکاندا بگەڕێین، تووشی وشەیەک دەبین بە مانای "ژیان" کە لە زمانە ژێرمەنییەکاندا بەم جۆرەیە: (G.) leben، (E.) live، (Gt.) liban، (Sw.) leva "ژیان". دە بنەڕەتدا مەبەست لەم وشە ژێرمەنییە "پێوەنووسان" و "پێوە(باقی)مانەوە" بووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی دیکە، بۆ وێنە ↑لم lım "خیزی ورد"، (G.) Lehm "گڵی لمدار"و (L.) limus "لیتە و لەجەن" و (G.) Leim "سرێش" [دەبنەڕەتدا: قوڕێک یان گڵێک کە بۆ چەسپاندن بەکارهاتووە]، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)lei- >*** "لووس، لیچق، چەسپ بوون، پێوەنووسان". وەک دەبینین لەم ریشەیەدا مانای "چەسپان، پێوە نووسان" بەدی دەکرێ. لەم ریشەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەی "ژیان" [دە بنەڕەتدا: (باقی) مانەوە] و هەروەها وشەکانی (G.) bleiben [ bi-līban > ] "مانەوە" و (G.) Leber "جگەر" [دە بنەڕەتدا بە مانای "چەسپ، لیچق، چەور] پەیدا بوون. دە زمانی یۆنانیدا (Gr.) liparós "چەوری" خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە. ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وشەی "لف"ی کوردمادی، بۆمان دەر دەکەوێ کە ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا مانای "چەسپان، پێوە نووسان، پێکەوە نووسان"ی هەبووە. لەمەوە دواتر مانای "شەنگڵەبەرەکەتە" و "هەروەها "جمک، دووانە، ئاواڵ دووانە" سەریان هەڵداوە. [شیاوی باسە کە وشەی "شەنگڵە" خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پێوەنووسان، پێکەوەنووسان"]. دواتر لەم مانایانەی سەرەوە مانای "هاوشێوە، مینا" پەیدا بووە، چونکوو شەنگڵەبەرەکەتە یان دووانە لە دوو دانەی هاوشێوە پێک هاتوون. سەرەنجام لەم مانایانەوە مانای "ئاواڵ" و "هاوسەر"یش دروست بوون. لەپێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا پێویستە ئاماژە بە وشەی ↑لوو lu یان ↑لڤک lıvık دە زمانی کوردمادیدا بکەین بە مانای "غوددە". ئەم وشەیە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە.

**لشتن lıştın** [ *lıštın* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑لێستنەوە lestınewe.

**لفت1 lıft** - "قسەی دڵخۆشکەرە": دەگەڵ "گفت" دێ [گفت و لفت gıft u lıft]. خزمە دەگەڵ لاواندنەوە (lawandın(ewe "قسەی خۆش پێگوتن، پێهەڵگوتن" و ↑لاف laf.

**لفت2 lıft** - "رامالینی خواردەمەنی": [لفت و لیسی دا]. خزمە دەگەڵ ↑لەپاندن lepandın "قووت دان".

**لفک lıfık** - "کلکەی شۆڕەوەبووی دەسماڵی سەری ژنان": خزمە دەگەڵ Lappen (G.)، lap (E,)، lap (Nl.)، lapp (Sw.) "پەڕۆ، تیتۆڵ"، خزمیشە دەگەڵ ↑لێفە lefe "پێخەو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)lap- , *(s)leb- >*** "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزاو و داکەوتوو بوون".

**لڤک lıvık** - بڕوانە ↑لوو lu "غوددە".

**لفکە lıfke** [ *lıfka* ] - "پەڕۆی خۆ پێ شوشتن":

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑لفک lıfık.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑لەپ lep "دەست، بەری دەست".

**لڤن lıvın** - "خشت": دەشێ پێوەندی هەبێ بە (L.) lapi "بەرد".

**لڤین lıvîn** [ *lıvīn* ] - "بزووتن، راژان": لەڤین levîn و لەبتین lebtîn ش دەگوترێن. هەروەها لڤ lıv بە مانای "بزاو، لەرە" و لڤۆک lıvok بە مانای "بزۆز، بەلەرە" و لەوتەنە lewtene "بزووتن، جووڵان" دێ. خزمە دەگەڵ (Nl.) labberen "بە سووکی، بە داهێزاوی لەرینەوە" و (L.) labare "راژان، جووڵان". وشەی labil "ناجێگیر، لەرزۆک، لەق و تەق" دە زمانە ئەورووپییەکاندا دە بنەڕەتدا بەم مانایە بووە کە شتێک لە دۆخی جوڵان وراژان دایە. هەروەها (L.) labor "کار،

ئەرك، زەحمەت" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دەبنەڕەتدا مەبەست "لەرزین و بەلادا هاتن لەبن باری قورس" بووە. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑لێو law، ↑لاو law، ↑لێوە lewe، ↑لێفە lefe و چەندین وشەی دیکە و دەچنەوە سەر ریشەی **< -*(s)lap- , *(s)leb** (IE.) "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزاو و داکەوتوو بوون".

**لق lıq** - "یەکەی لەشکر": شێوەیەکی دیکە لە ↑لک2 lık.

**لقلقی lıqlıqî** [ *lıqlıqī* ] - "جۆرێك ترێ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑لاك lak "کەپەك و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "دڵۆپان، تکانەوە، دەڵاندن". ئەم ترێیە رەنگە ترێیەکی پڕئاو و تەڕ و بڕ بێ و ناوەکەی بۆ ئەم سفەتە بگەڕێتەوە.

پێوەندی هەیە بە lygos (.Gr) "شووڵ، لکی دار".

**لک2 lık** - "یەکەی لەشکر": لق lıq یش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەیە:

1- legion (.L). ئەم وشەیە سەرەتا ناوی یەکینەیەکی سوپای رۆمی کۆن بوو کە لە 4200 تا 6000 هەزار کەس پێك دەهات. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne.

2- ↑لک1 lık "پەلی دار". لەم تێروانینەوە لەوانەیە سوپا وەك تەنەی دار چاو لێکرابێ کە گەلێك لک و پۆپی جیاوازی لێ دەبێتەوە. لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەی فارسی"شاخە" بە مانای "لکی دار" کە هەروەها بە مانای "لك و پۆپێ" سازی و رێکخراوەش بەکار دەهێنرێ.

**لک3 lık** - "هەنگوچکی کراس": خزمە دەگەڵ ↑لکان lıkan "بەستران، گرێ دران، پێوەست بوون".

**لک4 lık** - لك لك lıklık بە مانای "بارەبارِی مەڕ و بزن" و هەروەها "پێکەنین بە دەنگی بەرز، قاقا پێکەنین" دێ. بە مانای دووەم لق لق lıqlıq یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لاس4 las "حیلاندنی سەبری ئەسپ".

**لک5 lık** - "خڕایی رەق لەبن پێست": لك و لۆ lık û lo ش دەگوترێ. "لۆ" شێوەیەکی دیکە لە "لوو"یە. "لك" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -leug*** (IE.) "چەمان، با دران، سووڕان". ↑لووشە lûşe "سەوزیی دۆکلێو" لەم ریشەیە وەرگیراوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك گوێز، گوێژە، گۆك، گۆ و هیتر کە ئاماژە بە شتی خڕ دەکەن و لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "چەمان، خوار بوون، خڕ بوون"].

**لکان lıkan** [ *lıkān* ] - "بەستران، رەبت بوون، پێوەنووسان": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لەغاو leġaw "هەوسار" [لگام legam (.P)]. .

[تێبینی: وشەی لحیم lahīm (.Arb) "جۆش دان، پێکەوەلکاندن" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و لەوانەیە لە زمانی کوردمادی یان زماتیکی دیکە وەرگیرابێ. دە زمانی ئەڵمانیدا Legierung (.G) "تێکەڵەکانزا، لێکدراوی چەندین کانزا" ریشەی لاتینی هەیە و پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا].

**لکوژاندن lıkûjandın** [ *lıkūžāndın* ] - "لەوەڕاندن لەسەر تازەڕواو، ئاخەلێو کردنی ئاژەڵ": هەروەها ↑لوکژین lukjîn هەیە بە مانای "1- لەوەڕینی ئاخەلێوە 2- بەحاڵ لەوەڕینی ئاژەڵ دوای نەخۆشی". خزمە دەگەڵ ↑لێستنەوە lestınewe "زبان پێداخشاندن". لە مانگی خاکەلێوەدا کە گژ و گیا تازە سەر وەدەر دەنێ، لەوەڕینی ئاژەڵ وەك جۆرێك لێستنەوەی هەرد سەیر کراوە و هەر بۆیە کردارێك بەکار هێنراوە کە دەبێتە خزم دەگەڵ "لێستنەوە". فۆتیمی ژ j لەم

کردارەدا دۆخی جەخت کردن بە کردارەکە دەبەخشێ، هەروەک لە کردارەکانی پرژان، لۆقژین و هیتردا.

**لکومین lıkûmîn** [ *lıkumīn* ] - "هەڵەنگوتن، ڕەت بردن، کەوتن": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *lē(i)-d-*** "شل بوون، داهێزان، سست بوون، هێڵان".

2- ↑لەق leq "شل، ناجێگیر"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)leg-, *(s)le(n)g-*** "شل بوون، بێ هێز بوون".

[تێبینی: لەوە دەچێ ئەم دوو ریشەیەی سەرەوە لە بنەڕەتدا خزم بن و یەکیان لەوەی دیکە پەرەی گرتبێ].

**لم lım** - "1- خیزی ورد 2- فم کردنی چڵم": لیو lîw یش دەگوترێ. ↑لمت lımt یش هەیە بە مانای "لماو". هاوریشەیە دەگەڵ (G.) Lehm، (Nl.) leem، (E.) loam و (OE.) lām "گڵی لمدار، گڵی گۆزە کردن". هەروەها خزمە دەگەڵ (L.) limus "لیتە و لەجەن" و (G.) Leim "سرێش" [دەبنەڕەتدا: قوڕێک یان گڵێک کە بۆ چەسپاندن بەکارهاتووە]، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *lei-*** "لیتە و لەجەن" و دواتریش سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)lei-*** "لووس، لیچق، چەسپ". خزمە دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑لیم lîm "1- لم 2- کیم، چڵکی برین 3- چڵک"، ↑لێم lem "لیتە، قوڕی شل"، ↑لیچق lîçıq و ↑لووس lus و هتد. هەروەها دە فارسیدا هەڵی سەنگینە دەگەڵ لای lāy (P.) "لیتە، لەجەن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شل$^{2}$ şıl "ئاوەکی، ناپەیت".

**لمت lımt** - "لماو": ↑لم lım "خیزی ورد".

**لمک lımık** - "خوێواوک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لمت lımt.

**لمبۆز lımboz** - "قەمپۆز": لم lım + بۆز boz. کەرتی بۆز boz شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پۆز poz کە لە وشەی ↑قەمپۆز qempoz یشدا دەبیندرێ. کەرتی لم lım- خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک دەگەڵ (G.) Lumpen "پەڕۆ، تیتۆڵ"، (MG.) lampen "شۆڕ بوونەوە"، (G.) Schlampe "شەلەختە" و (G.) Schlaf "خەو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*لەفین lefîn* "شۆڕ بوونەوە" و چەندین وشەی هاوچەشن، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)lep-, *(s)lab-*** "شل، شۆڕ، داهێزاو، داکەوتوو". وشەکانی ↑لێو lew و ↑لێفە lefe و ↑لێوە lewe لەم ریشەوە هاتوون. هەروەها هەڵیسەنگینە دەگەڵ ↑لەم$^{3}$ lem "گوانی ئاژەڵ".

**لنج lınc** [ *lınj* ] - "1- لچق، لیچق 2- هەڕگ، قوڕ 3- لیتە، قوڕاو": لنچق lınçıq یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لیچق lîçıq، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)lei-*** "تەڕ و لیچق بوون، لووس و چەسپۆک بوون".

**لنگاران lîngaran** [ *lıngārān* ] -"ڕکەی غار کردن": دەچیتەوە سەر ↑لینگ lîng.

**لنگ مەتک lıngmetık** [ *lıngmatık* ] - "شووم": پێک هاتووە لە لنگ lıng [↑لینگ lîng] + ↑مەتک metık. دە بنەڕەتدا مانای وشەکە دەبێتە "پێوقەدەم ڕەش".

**لنگوو lıngû** - "هەویرترش، گوتکەهەویر کە بۆ هەویرترش هەڵ دەگیرێ": خزمە دەگەڵ ↑لیندوو lîndu.

**لوا lıwa** [ *lıwā* ] - "کوڵکەی وشتر و بەرخ": لڤا lıva ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ leptos (Gr.) "نەرم و نیان". ئەم وشە یۆنانییە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لە ژێر ↑لاو law دا شی کراونەوە.

**لوان luwan** [ *luwān* ] - "1- رویین 2- دەست دان، شیان": مانای ئەسڵی ئەم وشەیە دەبێ "ڕۆیین" بێ و پاشان مانای دووەم پەیدا بووبێ. [لەم بارەوە دەتوانین بەراوردێک بکەین دەگەڵ زمانی ئەڵمانی. لەم زمانەدا بۆ کارێک یان شتێک کە بلوێ، دەست بدا، جێ بەجێ کردنی لە توانا دا بێ، دەگوترێ "(کارەکە )دەڕوا، دەمەشێ". پێچەوانەکەشی دەبێتە "ناڕوا، نامەشێ" واتا نالوێ، جێ بەجێ نابێ]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ laufen (G.)، (h)loufan (OG.)، leap (E.)، löpa (Sw.) "ڕا کردن، باز دان". دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا مانای "ڕۆیشتن، بزوان"یش دەدا. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**لوباندن lubandın** [ *lubāndın* ] - "پاڕانەوە": بڕوانە ↑لاڤایی lavayî.

**لوبلوب lublub** - "سوور بوون لەسەر شتێک": وشەکە دووبارە بوونەوەی بنجی لوب lub ە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ glauben (G.)، geloven (Nl.)، gelīefan (OE.)، believe (E.). بنجی ژێرمەنی کردارەکە *(Grm.) *laubjan* بووە و ئەم کردارە دە بنەڕەتدا بە مانای "پێ باش بوون، بە دڵ بوون". پاشان لەم مانایەوە مانای "باوەر پێ بوون، باوەر کردن" پەیدا بووە. ئەم کردارە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ lieben (G.)، love (E.)، lijbit (Rus.) "خۆش ویستن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *leubh- >*** "خۆش ویستن، حەز کردن". چەندین وشەی زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە ↑لاڤ2 lav "جوان، دڵگر". دە زمانی کوردمادیشدا دەشێ مانای "لوب" یان "لوبلوب" سەرەتا هەروەک زمانە ژێرمەنییەکان "بەدڵ بوون، پێ باش بوون، خۆش گەرەک بوون" بووبێ و لەم مانایەوە دواتر مانای "باوەڕمەند بوون، سوور بوون" پەیدا بووە.

**لوبیا lobya** [ *lobyā* ] - "دانەوێڵەیەک": لۆپک lopık و لۆوک lovık یش دەگوترێن. لوبیا lūbyā (P.). لەوانەیە پێوەندی بە ↑لەپە lepe وە هەبێ.

**لوچان luçan** [ *lučān* ] - دەگەڵ دا -da دێ: دالوچان daluçan "شۆڕ بوونەوە، داکەوتن"، داڵۆزان dalozan یش دەگوترێ. هەروەها ↑داڵۆسکە daloske هەیە بە مانای "چلوورە، شووشەسەهۆڵ" [ئەو ئاوەی دەیبەستێ و شۆڕ دەبێتەوە]. دالوچاندن: شۆڕ کردنەوە، داهێشتن. خزمە دەگەڵ ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو"، لش laš (P.) [تنەلش tanelaš (P.) واتا تەمبەڵ و داهێزاو]، laß، lasch (G.) "لۆژ"، lassen (G.) "هێشتن"، lēdeīn (Gr.) "تەپ بوون، ماندوو بوون" [داکەوتن]، lāz (OG.) "بەرهەڵدان"، late (E.) "درەنگ" [دە بنەڕەتدا: لەسەرخۆ، هێواش]، lat (Sw.) "تەمبەڵ،تەپ، تەوەزەل" و هەروەها دەگەڵ lassus (L.) ماندوو، بێهێز".

**لوڕ lur** - "پاڵاتێکی باریکی دووفلیقانەیە لەبن جلەوە دەیخەنە سەر پشتی بارەبەر": دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)leu- >*** "شل، داهێزاو، داکەوتوو، شۆربۆوە" و خزمە دەگەڵ چەندین وشە بۆ وێنە ↑لێفە lefe.

[تێبینی: دیارە وشەی "لوڕ" وەک ناوی خەڵکی لورستان پێوەندی بەم وشەی سەرەوە نییە و ئەمە لە ریشەیەکی دیکەوە هاتووە].

**لوف luf** - "دۆی کوڵاو بۆ کەشک و ژاژی": خزمە دەگەڵ ↑لبی lıbî "دەڵەمە، پەنیری نەگوشراو".

**لوقمان luqman** [ *luqmān* ] - "ناوی زانا و پزیشکێکی مێژوویی": کەرتەوشەی لوق -luq دەشێ پێوەندی هەبێ بە **>** *(Gr.) logos* "وتە، قسە، ئاوەز". Logik "مەنتیق" دە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگەڕێتەوە.

[تێبینی: لەنێوان دوو چەمکی "وتە، قسە" و "ئاوەز"دا پێوەندی هەیە. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە وشەی "راشەن"].

**لوقمە1 luqme 1** [*luqma*] - ”پاروو (ی بادراو)“: خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی کە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *lug- >*** ”چەمان، با دان“. بەم جۆرە مانای لوقمە دەبێ هەمان ”پارووی بادراو“ بێ.

**لوقمە2 luqme 2** [*luqma*] - ”1- دەمبەست 2- قایشی ئاوزەنگی“: خزمە دەگەڵ ↑لەغاو leġaw.

**لوکژین lukjîn** [*lukžīn*] - ”1- لەوەڕینی ئاخەلێوە 2- بەحاڵ لەوەڕینی ئاژەڵ دوای نەخۆشی“: بڕوانە ↑لکوژاندن lıkûjandın ”لەوەڕ لەسەر تازەڕواو، ئاخەلێو کردنی ئاژەڵ“.

**لولسە lulse** [*lulsa*] - ”شێتۆکە“: خزمە دەگەڵ ↑لوول lul ”بادراو، پێچدراو، سووڕاو“. لێرەدا مەبەست ”با دران و سووڕان“ی مێشکە. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی ”گێژ“، ”حۆل“، ”گێل“. هەموو ئەم وشانە چەمکی ”سووڕان“ لەخۆ دەگرن.

**لووەل luwel** [*luwal*] - ”1- هەویری لەبن ژیلەمۆ برژاو 2- کەلانە“: خزمە دەگەڵ ↑لەباشە lebaşe ”نانی تەنکی سەر ساج“.

**لوێچ luweç** [*luweč*] - ”پڕی دەستێک“: لۆچ loç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لۆچ loç [چرچ و لۆچ]. مەبەست دە بنەڕەتدا لۆچی دەست بووە، واتا چەماندنەوەی بەری دەست و قووڵ کردنی بۆ شت تێکردن.

**لوو lu** [*lū*] - ”غوددە، تومۆر“: لک lık و ↑لووک luk یش دەگوترێ. هەروەها ↑لڤک lıvık هەیە بە هەمان مانا. لەوانەیە ئەم شێوەی دوایی شێوەی کۆنتری وشەکە بێ.

1- لە لایەکەوە جێ هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەی ↑لف lıf.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لووت lut، ↑لیندوو lîndu ”گرێ و گۆڵی ناو تراو“ و پێوەندییان بە چەمکی ”ئەستوور و گرێ بوون“ەوە هەبێ. لەوانەیە ئەم وشانەش پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ، یان پێوەندییان هەبێ بە ریشەی ***(IE.) *lug- >*** ”چەمان، سووڕان“.

**لووت1 lut 1** [*lūt*] - ”کەپۆ“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لوو lu ”غوددە، تومۆر“.

**لووت2 lut 2** [*lūt*] - دەگەڵ ”لات“ دێ [لات و لووت lat u lut]. شێوەیەکی دیکە لە ↑رووت rut. دە بنەڕەتدا مەبەست مرۆڤی نەدار و بەدبەخت بووە. [رووت دە فارسیدا دەبێتە لخت loxt (P.)].

**لووت2 lut 2** - دەگەڵ ”بزووت“ دێ [لووت و بزووت lût û bızût بە مانای ”کتوپڕ“]. خزمە دەگەڵ ↑لۆت2 lot 2 ”گاڤ، هەنگاو، شەقاو، *باز*“.

**لووتک lûtık** [*lūtık*] - ”قەمتەرە، ئاوبارە“: ”لووتک“ دارێکی هەڵکۆڵدراوە لە شێوەی پلووسکێکی گەورە بۆ پێدا تێپەڕ کردنی ئاو لە لایەکەوە بۆ لایەکی دیکە. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لۆت2 lot 2 ”گاڤ، هەنگاو، شەقاو“، سەر ریشەی ***(IE.) *leit(h)- >*** ”رۆیشتن، چوون، تێپەڕین“. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لۆتکە lotke ”بەلەم“.

**لووتکە lutke** [*lūtka*] - ”دوند، ترۆپک“: ↑لووت lut + کە ke. لووتکەی شاخ وەک شتێکی زەق و دەرپەڕیو بە لووت چۆیندراوە، هەروەک چۆن ”دوند“یش وێچواندن بە ”ددان“ە.

**لووجن lûcın** [*lūjın*] - ”دووکەڵکێش“: لووژن lûjın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Loch (G.) ”کون“ و Lücke (G.) ”کەلێن“، loh (OG.) ”کون، کەلێن، قوڵکە، حەشارگە، زیندان“، usluk (Gt.) ”دەلاقە“، lock (E.) ”قفڵ، سەرپۆش، قەپاخ“، lock (Sw.) ”سەرپۆش، قەپاخ“، lūhhan (OG.) ”داخستن“. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ لووچ luç ”خزگەی ماسییان“ [دە بنەڕەتدا: قوڵکە یان حەشارگە] و ↑*لۆچ loç* ”چرچ“.

**لووچ luç** [*lūč*] - ”خزگەی ماسییان“: خزمە دەگەڵ ↑لووجن lûcın ”دووکەڵکێش“.

لووچکاندن **luçkandın** [ *lūčkāndın* ] - "جووتن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەپاندن lepandın "قووت دان". شێوەی کۆنتری وشەکە دەشێ *لەپچکاندن lepıçkandn** بووبێ. لەباری چۆتیتی سوانەوە و گۆڕانی فۆتیمەکان هەڵی سەنگینە دەگەڵ "لووشک".

**لوور1 lur 1** [ *lūr* ] - "بە تەوژم سەرەوژێر هاتنی باڵدار": [بازەکە لوور بۆوە بۆ کەو]. ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *(s)leib-** (*IE.*) "خلیسکان، خوشین، خزین" [ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی دوورتری **(s)lei-* (*IE.*) "تەڕ ولیچق بوون، لووس و خلیسک بوون"]. وشەکە دەبێ بەم جۆرە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ: لەبر lebır ← لەور lewır ← لوور lur. لوور بوونەوەی باڵدار واتا تیپەڕیتیکی خێرا کە وەک خوشیتێک لە هوا دایە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ کرداری "راخوشین"ی بەردە ئاسمانییە درەوشاوەکان لە شەودا بەرەو زەوی.

**لوور2 lur 2** [ *lūr* ] - "راست، تەخت": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ↑لێر ler.

**لووراندن lurandın** [ *lūrāndın* ] - "وەڕینی گورگ و سەگ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ röhren (.G)، raren (.OG)، roar (.E) "گوڕڕاندن، نەڕڕاندن". rāyati (.OIn) "دەلوورێنێ، دەوەڕێ" و rajat (.Rus) "دەنگ و هەرا کردن" خزمن دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان و دەچنەوە سەر ریشەی **< *ere-* , *re(i)-* (*.IE*)** "هەرا کردن، قیژاندن، گوڕڕاندن". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەرا hera.

**لووزەو luzew** [ *lūzaw* ] - "رژانی خێرا و بە تەوژم": خزمە دەگەڵ ↑لووساو lusaw "1- پلووسک 2- تاڤگە".

**لووس lus** [ *lūs* ] - "خلیسک، ساف": لیز līz (.P) "خلیسک، لووس". خزمە دەگەڵ sleek (.E)، slice (.OE) "لووس"، slician (.OE) "ساف و لووس کردن"، slide (.E)، slīden (.MG)، sledge (.E)، sleigh (.E)، Schlitten (.G)، slito (.OG) "خلیسکێن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lei-* (*.IE*)** "تەڕ و لیچق بوون". دە زمانی فارسیدا سر خوردن sor xordan "خلیسکان" و سرسرەبازی sorsorebāzī "خلیسکێن" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. بە وتەیەکی دیکە هەر دوو وشەی فارسی لیز līz و سر sor (.P) دە ئەسڵدا یەک وشە بوون و سەر بەو ریشەی سەرەوەن. ئەم ریشەیە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا و لەوانە زمانی کوردمادیش لک و پۆپەکی زۆری لێ دەبێتەوە و بە دەیان وشەی دەچێتەوە سەر، بۆ وێنە دە کوردمادیدا ↑چڵم çılım، چڵف cılf، ↑چلق cılq، ↑جەللە celle "ریخ، شیاکە"، ↑سل sıl و ↑لم lım.

**لووساو lusaw** [ *lūsāw* ] - "1- پلووسک 2- تاڤگە": خزمە دەگەڵ ↑لووزەو luzew و دواتر لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە:

1- ↑لووس lus "ساف، خز"، بە فارسی "لیز".

2- یان ↑لەز lez "پەلە، خێرایی".

**لووش1 lûş 1** [ *lūš* ] - "هێشوو": خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne.

**لووش2 lûş 2** [ *lūš* ] - "1- دەنگی لووتی چڵمن [هەر لووشە لووشیەتی] 2- دەنگی دەم و لووتی یەکسم لە تاسەی ئالیک":

1- دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑لووشین lûşîn [هەڵلووشین] واتا هەڵقووراندن یان قووت دان(ی ئاوی دەم و لووت).

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ ↑بە لاس4 las.

لووشک **lûşk** [ *lūšk* ] - "جووتەی یەکسم": خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "(بەری) دەست"، دە بنەڕەتدا: بەری دەست یان لاق". وشەکە پێشتر *لەپەشک* *lepeşk** بووە و سواوەتەوە بۆ لووشک. دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا وشەیەکی لەم چەشنە هەیە، واتا ↑لاپوشک lapuşk بە مانای "چەنگاڵی ئاژەڵ".

لووشمە **lûşme** [ *lūšma* ] - "1- ناڵە و دەنگی نزم بە گریانەوە 2- دەنگێ و هەنیسک دانی کەر و ئێستر لە دیتنی شتێک کە پێی خۆشە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لووش2 lûş.

لووشە **lûşe** [ *lūša* ] - "سەوزییەکە دە دوکڵیوی دەکەن": خزمە دەگەڵ Lauch ‎(G.)، louh ‎(OG.)، look ‎(Nl.)، leek ‎(E.)، lök ‎(Sw.) "ناوی گیایەکی خواردن"، سەر بە ریشەی **< *leug-** ‎***(IE.)*** "چەمان، با دران، سووڕان".

لووشین **lûşîn** [ *lūšīn* ] - دەگەڵ پێشگری هەڵ دێ، هەڵلووشین واتا هەڵقووڕاندن یان قووت دانی بە خێرایی. خزمە دەگەڵ schlucken ‎(G.)، slocken ‎(Nl.)، lýzein ‎(Gr.) "قووت دان"، sluka ‎(Sw.) "هەڵلوشین"، slucim ‎(OIr.) "قووت دەدەم"، سەر بە ریشەی **< *(s)leu-g-** ‎***(IE.)*** "قووت دان".

لووک **luk** [ *lūk* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑لوو lu "گرێ لە لەشدا".

لووکاندن **lukandın** [ *lūkāndın* ] - "گرتنە باوەش و دەست لەملان بوون": خزمە دەگەڵ ↑لۆک lok "داخستن، قفڵ کردن". لووکاندن ئەو بار و دۆخەیە کە دەستەکان لە بەژنی یەکتر دەهاڵێن [دەهاڵقێن] و شێوەیەکی کەوانەیی یان داخراو دروست دەکەن. ئەمە وەک ئەوە وایە دوو کەس یەکتریان قفڵ کردبێ یاخود یەکتریان خستبێتە ناو جەغزی دەستەکانیانەوە. دە زمانی ئیگلیزیدا to be *locked* in each other´s arms بە تەواوی ئەم پێوەندییە نیشان دەدا.

لووگی **lugî** [ *lūgī* ] - "بەرهەڵدا، بێکارە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لۆق loq. هەڵی سەنگینە دەگەڵ مانای بنەڕەتی وشە ژێرمەنییەکانی los ‎(G.)، loose ‎(E.)، laus ‎(Gt.) "شل، لەق، جیابۆوە، بەند نەبوو". وشەی "بەرهەڵدا "ش کە هاومانای "لووگی"یە هەر پێوەندی بە چەمکی "بەر دان و رەها کردن"ەوە هەیە.

لوول **lul** [ *lūl* ] - "1- بادراو، پێچ دراو 2- مەست": لوور lur یش دەگوترێ [چاوان مەرێژە، بسکان مکە لوور]. هەروەها ↑لوولان lulan هەیە بە مانای "پێچ خواردن، سووڕان" و ↑لاولاوە lawlawe "تیرەیەکە لەناو مێیەدا دەسووڕێ". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەروەها ↑لوولە lule هەیە بە مانای "تیرۆک یان وەردێنەی هەڵۆڵ". ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ Rohr ‎(G.)، rōr ‎(OG.)، roer ‎(Nl.)، rör ‎(Sw.) "نەی، قامیش، قاڵۆر، لوولە". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە.

لوولاک **lulak** [ *lūlāk* ] - "ئێسکی لاق": لوول lul + ↑لاق laq. لوول پێوەندی بە↑لوولە lule هەیە و مەبەست لێرەدا ئێسکی لاقە کە لە لوولە دەچێ.

لوولک **lulk** [ *lūlk* ] - "1- بلوێر 2- ئامرازێکی جۆڵایی 3- لوولەی مەسینە 4- غەرغەرە": بچووک کراوی ↑لوولە.

لوولان **lulan** [ *lūlān* ] - "لوول خواردن": لولیدن lūlīdan ‎(P.)، بڕوانە ↑لوول lul.

لوولە **lule 1** [ *lūla* ] - "قەبارەی درێژووکەی بۆش بۆ گواستنەوەی تراو و گاز": لولە lūle ‎(P.). خزمە دەگەڵ ↑لوول lul "بادراو، پێچدراو".

لوولە **lule 2** [ *lūla* ] - "بێچووی ورچ و بەراز": خزمە دەگەڵ ↑لەیر leyır "زارۆ، بێچوو". وشەی ↑رۆڵە role "فرزەند" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

لووهین **luhîn** [ *lūhīn* ] - "نەقەب، ڕێی بن هەرد": خزمە دەگەڵ Loch (.G)، loh (.OG) "کون، کەلێن، غار"، Lücke (.G) "کەلێن"، usluk (.Gt) "زارک، کون، دەلاقە"، lock (.E) "دەرخۆنە، بەستراوی، داخراوی"، lock (.Sw) "دەرخۆنە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "داخستن". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لاکین lakîn "ئەشکەوت"، ↑لۆخ lox "1- جێگەی ئامراز، وەک فیشەک لۆخ 2- داری گەندەڵ".

لۆ **lo** - "قەد، لا، چین، تۆژ": لایە laye (.P). خزمە دەگەڵ ↑لەت let و لاچ laç [↑لاچۆپاچۆ laçopaço "خرت و پرت، شڕە و بڕە"]، سەر بە ریشەی **< -leu*** (.IE) "لەت کردن، لێکردنەوە، ڕنینەوە".

[تێبینی: وشەی "چین"یش (چین و تۆژ) دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێکردنەوە". هەروەها "تۆژ، توێژ" خزمە دەگەڵ "تاشین". هەر سێ وشەی "لۆ"، "چین" و "تۆژ" دە بنەڕەتدا بەو تیکانە گوتراون کە بە تاشین یان بڕین لە شتێک جیا کراونەوە].

لۆبت **lobt** - "زرینگ و چالاک": لۆپت lopt یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*لڤین lıvîn* [لەبتین lebtîn] "بزووتن، ڕاژان"، لڤ lıv "بزاو، لەرە" و لڤۆک lıvok "بزۆز، بەلەرە" و labberen (.Nl) "بە سووکی، بە داهێزاوی لەرینەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -(s)leb*** (.E) "شل و شوڕ بوون، داکەوتن، بێهێز بوون".

[تێبینی: ئەگەر سەیری مانای ریشەکە بکەین، دەبینین کە مانای ریشەکە بە پێچەوانەی مانای وشەکەیە، واتا ریشەکە مانای "شل و بێهێزی و داکەوتن" دەدا، بەڵام "لۆبت" مانای "زرینگ و چالاک". دە زمانە هێندوئەورووپییەکاندا هێندێک جار ئەم دۆخە بەرچاو دەکەوێ کە لە ریشەیەکەوە وشە بە دوو مانای پێچەوانەی یەکدی پەیدا دەبن. سەبارەت بە وشەی "لۆبت" دەتوانین ئاوا ماناکەی شی بکەینەوە کە سەرەتا لە مانای "شل و شوڕ بوون، داکەوتن، بێهێز بوون" مانای "لەرینەوە، ڕاژان، بزوان" سەری هەڵداوە، پاشان شتێک کە زۆر لە دۆخی "لەرینەوە، ڕاژان، بزوان"دا بووە، وەک شتێکی "چالاک، بزۆز، زرینگ" سەیر کراوە].

لۆپ **lop** - "باڵداری مەلەوان": خزمە دەگەڵ lauge (.G)، loog (.Nl)، lye (.E)، laug (.OIs) "ئاوی (خۆ) پێ شوشتن"، سەر بە ریشەی **< -lou*** (.IE) "شوشتن، حەمام کردن". lousthai (.Gr) و lavare (.L) "شوشتن، حەمام کردن"، laben (.G) "تەڕ و تازە کردن" [دە بنەڕەتدا: ئاو پێدا کردن] پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

لۆپک **lopık** - "داوەڵ، داهۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑*لڤین lıvîn* [لەبتین lebtîn] "بزووتن، ڕاژان". ئەم داوەڵە دەشێ بە پەڕۆ و پاڵ دروست کرابێ و بە هۆی لەرانەوەی ئەم پەڕۆ و پاڵە بەدەم باوە بەم جۆرە ناو نراوە.

لۆت1 **lot 1** - "پارووی زل": لۆتە lote ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەت let "تیکە".

لۆت2 **lot 2** - "گاڤ، هەنگاو، شەقاو، باز": دەچێتەوە سەر ریشەی **< -leit(h)*** (.IE) "ڕۆیشتن، چوون" و خزمە دەگەڵ leiten (.G)، leiden (.Nl)، lead (.E)، leda (.Sw) "بەڕێوە بردن"، liđan (.OE)، liđa (.OIs) "ڕۆیشتن، دەرباز بوون، تێپەڕین"، Leiter (.G) "بەڕێوەبەر"، leader (.E) "ریبەر، پێشەوا". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها دەگوترێ ↑لووت و بزووت lût û bızût. لێرەشدا "لووت" ماناکەی دەگەڵ "بزووتن" یەک دەگرێتەوە.

لۆتکە **lotke** [ *lotka* ] - "بەلەم": دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لووتک lûtık هەیە بە مانای "قەمتەرە، ئاوبارە". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑لۆت2 lot 2 "گاڤ، هەنگاو، شەقاو"، سەر ریشەی **< -leit(h)*** (.IE) "ڕۆیشتن، چوون، تێپەڕین". لەم تێڕوانینەوە "لووتک" ئامرازێکە بۆ

پەڕاندنەوی ئاو لە لایەك بۆ لایەكەی دیكە. هەروەها "لۆتكە"ش ئامرازێكە بۆ پەڕینەوە لە چۆم و ئاوان.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بەو لۆتكە یان كەشتییانەی بۆ "پەڕینەوە" بەكار دەهێنرێن، دەگوترێ Fähre. ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ fahren ی ئەڵمانی بە مانای "ئاژۆتن" و خزمە دەگەڵ وشەكانی "پەڕینەوە"، "تێپەڕین" و "بوورین" دە زمانی كوردمادیدا].

**لۆتم lotım** [*lotım*] - "بەش، پاژ": خزمە دەگەڵ ↑لەت let.

**لۆتە lote** [*lota*] - "1- ترێی پلێشاو 2- بەرماوی خواردن": خزمە دەگەڵ ↑لیتە lîte.

**لۆتەر loter** [*lotar*] - "زرینگ، چالاك": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لۆت2 lot 2 "گاف، هەنگاو، شەقاو، *باز*"، سەر بە ریشەی **(IE.) *leit(h)- <** "رۆیشتن، چوون". دە زمانی كوردمادیدا هەروەها دەگوترێ ↑لووت و بزووت lût û bızût. لێرەشدا "لووت" ماناكەی دەگەڵ "بزووتن" یەك دەگرێتەوە.

[تێبینی: وشەی "بزۆز" پێوەندی بە "بزووتن"ەوە هەیە، هەروەها "قۆچاخ" پێوەندی بە "كۆچین"ەوە هەیە بە مانای "رۆیشتن"].

**لۆتی lotî** [*lotī*] - "1- بزمگێڕ 2- بێشەرم و بێ چاوو روو 3- دەستبڵاو": دە زمانی فارسیدا **لوطی** lūtī (P.) لە لایەكەوە بە مانای "دەست و دڵباز" دێ و لە لایەكی دیكەوە بە مانای "خوێڕی و بەرەڵڵا". جێی بەراورد كردنە دەگەڵ ↑لاترە latre.

**لۆج loc** [*loj*] - "ژووری تایبەتی لە تەماشاخانە": لژ loj یش دەگوترێ. *(OFr.) loge* < "ژووری داخراو بەتایبەتی لە تەماشاخانە". ئەم وشە فەرانسەییە خۆی ریشەی ژێرمەنی هەیە و بۆ وێنە خزمە دەگەڵ louba (OG.) "دیوەلكە، ژووری تفاق و گژ و گیا" و Laube (G.) "چارداغ" و Laub (G.) "گەڵا، ئاڵف، گژ و گیا". وشە ژێرمەنییە كۆنەكە چووەتە ناو زمانی لاتینی ناوین و لەوێشەوە چووەتە ناو فەرانسەیی كۆن و پاشان بە شێوە و مانا تازەكەی گەڕاوەتەوە ناو زمانانی ژێرمەنی. وشەی Lobby دە زمانە ئەورووپییەكاندا لەم وشانەی سەرەوەڕا هاتووە. ئەم وشەیە بە مانای "پێشخانە، پێشهاڵ"ی پارڵمان بەكار هێنراوە كە لەوێدا كەسانی سەر بە گرووپە جیاوازەكان ئامادە بوون و هەوڵیان داوە بەشێوەی جۆراوجۆر كارتێكەریان لەسەر بڕیارەكانی نوێنەرانی پارڵمان هەبێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ئالف alıf ی كوردی [a-lıf].

**لۆچ loç** [*loč*] - "چرچ": لۆچان loçan یش هەیە بە مانای "چرچ بوون". دە فارسیدا لوچ lūč (P.) هەیە بە مانای "چاوخوار، خێل". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Locke (G.)، loc (OG.)، lok (Nl.)، lock (E.) و (Sw.) "لوولی موو، مووی لوول بوو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *lug- <** "چەمان، با دران، سووڕان". دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ↑لۆچاو loçaw هەیە بە مانای "شەپۆلی بچووك(ی سەر رووبار)". دە زمانی لاتینیدا luxus (L.) "لەجێ چوونی ئێسك" لەم ریشەوەهاتووە. هەروەها lugnas (Lit.) "شلك، نەرم" [شتێك كە بە هاسانی خوار دەبێتەوە] لەم ریشەوە هاتووە. لوچ lūč (P.) "خێل" مانای خوار بوون و با دران بە تەواوی نیشان دەدا. دە زمانی كوردمادیشدا لۆچ مانای خوار بوون دەردەبڕێ، چونكوو مەبەست لە چرچ بوون دە بنەڕەتدا خوار بوون و با درانی شتێكی ساف و راستە. هەروەها دە وشەی ↑لوێچ luweç [یان لۆچ واتا بەری دەست بە قووڵكراوی] دا ئەم مانایە بە باشی پارێزراوە. ئەم وشانە هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑لووجن lûcın "دووكەڵكێش".

**لۆچاو loçaw** [*ločaw*] - "شەپۆلی بچووك(ی سەر رووبار)": خزمە دەگەڵ ↑لۆچ loç "چرچ".

لۆچکە **loçke** [ *ločka* ] - "قەفانچەی ناڵبەند بۆ بەستنی لێوی یەکسم": لۆشکە loşke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لیچ lîç و ↑لەوس lews.

لۆخ¹ **lox** - "1- جێگەی ئامراز، وەک فیشەک لۆخ 2- داری گەندەڵ": خزمە دەگەڵ↑لاکین lakîn "ئەشکەوت"، ↑لووهین luhîn "نەقەب".

لۆخ² **lox** - "بەفری شل کە زوو دەتوێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑لاک lak "کەپەک و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ".

لۆخان **loxan** [ *loxān* ] - "بەزم وشایی": لۆغان loġan یش دەگوترێ. هەروەها لۆغانە loġane هەیە بە مانای "بەخشیش بەهۆی خەرمان سوور بوون" (شاباش). خزمە دەگەڵ löcken (G.)، lecken (MG.) "لاق کوتان، خۆ هەڵاویشتن"، Frohlocken (G.) "خۆ هەڵاویشتن لە خۆشیان" [دەقاودەق: شایی لۆخانی کوردمادی، کەرتی یەکەمی وشە ئەڵمانییەکە بە مانای "شاد"ە و کەرتی دووەمەکەش هەمان "لۆخان"ی کوردمادییە]، lacka (Sw.) "باز دان، هەڵبەزین"، سەر بە ریشەی **< *lek- (IE.)*** "لاق کوتان، خۆ هەڵاویشتن". خزمیشە دەگەڵ ↑لۆقاندن loqandn "بەپەلە رۆیشتن" [گورگەلۆقە].

لۆخانە **loxane** [ *loxana* ] - "ئەندامێکی پڕ چرچ و لۆچ لەناو سکدا": خزمە دەگەڵ ↑لۆچ loç "چرچ".

لۆخە **loxe** [ *loxa* ] - دەگەڵ هێندێک وشە دێ، وەک ↑مردەلۆخە mırdeloxe "رەقەڵە، بابردەڵە".

لور **lor** - "1- کردە، ئاکار 2- رۆیشتنی بە شلەپەتەیی": خزمە دەگەڵ ↑لڤین lıvîn "لەرینەوە، راژان"، labare (L.) "راژان، جووڵان"، labil "ناجێگیر، لەرزۆک، لەق و تەق". هەروەها labor (L.) "کار، ئەرک، زەحمەت" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دەبنەڕەتدا مەبەست "لەرزین و بەلادا هاتن لەبن باری قورس" بووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lap- , *(s)leb- (IE.)** "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزاو و داکەوتوو بوون". شێوەی کۆنی وشە کوردمادییەکە *لەبەر* **laber* بووە و دواتر سواوەتەوە و بووەتە "لۆر". لەباری سوانەوە و گۆڕانی وشەکە هەڵی سەنگێنە بۆ وێنە دەگەڵ وشەکانی "زۆر"، "گۆڕ"، "زوور"، "ژوور" [ژۆر] و هتد.

لۆراندن **lorandın** [ *lorāndın* ] - "1- گۆرانی گوتنی بە ئەسپایی 2- گریان بە دەنگی لەرزۆک 3- لایلایی گوتن": لۆرین lorîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لووراندن lûrandın "دەنگ هەڵبڕینی سەگ".

لۆر(ک) **lor(k)** [ *lor(k)* ] - "جۆرێک شیرەمەنی": لور lūr (P.). خزمە دەگەڵ ↑لبی lıbî "دەڵەمە، پەنیری نەگوشراو".

لۆرەپ **lorep** [ *lorap* ] - "ئەو جێگە لە گوان کە شیری لێ دێتە دەر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ schlürfen (G.) "هەڵقوڕاندن". لەم بارەوە بڕوانە ↑شۆرباو şorbaw.

لۆری **lorî** [ *lorī* ] - "لایلایی": خزمە دەگەڵ ↑لایلایی laylayî [لالایی lalayî].

لۆرینەوە **lorîn(ewe)** [ *lorīn(awa)* ] - "لەبەرەخۆ گۆرانی گوتن": هەروەها لۆرە lore "گۆرانی سەبر" و لۆرکە lorke هەیە بە مانای "هەوایەکی گۆرانی".دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- lallen (G.)، lalla (Sw.)، lalle (Den.)، laluoti (Lit.) "زمان گیران و بە کوت و پچڕی قسە کردن" و ↑لایلایی laylayî [لالایی lalayî].

2- ↑لووراندن lurandın "وەڕینی گورگ و سەگ"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "دەنگ و هەرا کردن".

[تێبینی: "لۆرینەوە" دەنگ هەڵبڕینێکی کز و لووراندن دەنگ هەڵبڕینێکی بەهێزە. ئەمە دیاردەیە بۆ وێنە دە وشەکانی "قسە و کاستین"، "ورتە و وەڕین" و "چپە و شەپۆڕ"یشدا دەبینرێ کە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە].

**لۆژ loj** [ *lož* ] - "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو": هەروەها لۆژە loje هەیە بە مانای "راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا". لش laš (P.) [تنەلش tanelaš (P.) واتا تەمبەڵ و داهێزاو]. خزمە دەگەڵ laß، lasch (G.) "لۆژ"، late (E.) "درەنگ" [دەبنەڕەتدا: هێواش، بە ئەسپایی]، lat (Sw.) "تەپ، تەوەزەل"، lassus (L.) "ماندوو، داهێزاو"، سەر بە ریشەی **< *lē(i)-d- (IE.)** "شل بوون، داهێزان، سست بوون، هێڵان".

[تێبینی: ئەم ریشەیە دەبێ خۆی خزم بێ دەگەڵ ریشەی **< *(s)lēg- (IE.)** "شل و بێهێز بوون" کە ئەویش هێندێك وشەی لێ کەوتۆتەوە، بۆ وێنە ↑لەق 1 leq "شل، ناجێگیر"].

**لۆژان lojan** [ *ložān* ] - "1- راکشان، تخێل بوون 2- راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا": ↑لۆژ loj. سەبارەت بە مانای دووەم، واتا "راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا" هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "لەق" و "لەقین"].

**لۆژنا lojna** [ *ložnā* ] - "1- خەتی جووت لە کێڵگەدا 2- جۆگەی بچووك لە کێڵگەدا": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *leu- (IE.)** "لەت کردن، لێکردنەوە، رنینەوە" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑لۆق loq "شل، لەق" [لەق و لۆق]. وشەی لاتینی Analyse "شی کردنەوە" لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: شیاوی باسە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی "شی کردنەوە" و "شێوەرد" و "جۆگە" پێکەوە خزمن و دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێکردنەوە"].

**لۆژین lojîn** [ *ložīn* ] - "لۆدەی گیا و گزرە": شێوەیەکی دیکە لە ↑لۆدە lode.

**لۆدە 1 lode** [ *loda* ] - "ناوی گەمەیەکە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ lude (L.) "گەمە، یاری". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑لەیزین leyzîn "کایە کردن".

**لۆدە 2 lode** [ *loda* ] - "کۆمای زل لە گیا": لۆژین lojîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ laden (G.)، (h)laden (OG.)، lade (E.)، ladda (Sw.) "بارکردن، ئەنبارکردن، لەسەریەك دانان"، سەر بە ریشەی **< *kla- (E.)** "لەسەر یەك دانان". klast (Rus.) "دانان"، Last (G.) "بار"، Lade (G.) "قوتوو"، Lade (Sw.) "ئەنباری دەغڵ و دان" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. ↑لۆد lod (G.) "بارەگیا"، ↑لادە lade "تەپاڵەی لەسەر یەك هەڵچنراو" دەبنە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. هەروەها دەشێ ↑کەڵەکە keleke ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ [کەڵەکە کردن].

**لۆس 1 los** - "عادەت گرتوو، فێر بووگ": [لە چەنەبازیدا لۆس بووە]. دە زمانی فارسیدا لوس شدن lūs šodan (P.) هەیە بە مانای "بەدعادەت بوون، نازنازی بوون". خزمە دەگەڵ ↑لاس[5] las "فریو" و ↑لیت lît "فێڵ، گزی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ lernen (G.) "فێر بوون" و lehren (G.) "فێر کردن"، سەر بە ریشەی **< *l(a)is- (IE.)** "زانین".

**لۆس 2 los** - "لەکار کەوتن": [ئیتر لۆس بووم، ناتوانم کار بکەم]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو".

**لۆستك lostık** - "چڵپاو، قوڕاو": خزمە دەگەڵ ↑لووس lus "خلیسك، ساف".

لۆشک **loşık** [*lošık*] - "جۆرێك كولێرەی چكۆڵە": خزمە دەگەڵ ↑لەباشە lebaşe "نانی تەنكی سەر ساج".

لۆشە **loşe** [*loša*] - "كولێرەی گەورە": خزمە دەگەڵ ↑لەباشە lebaşe "نانی تەنكی سەر ساج".

لۆغ **loġ** - "1- لۆچ 2- بانگلێر، بانگردان": بڕوانە ↑لۆچ loç.

لۆغە **loġe** [*loġa*] - "ئەستوور بوون (ی زمان)": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑لوو lu "غوددە، تومۆر"دا هاتوون.

لۆق **loq** - "شل، لەق" [لەق و لۆق]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) los، (E.) loose، (Gt.) laus "شل، لەق، جیابۆوە، بەند نەبوو"، (G.) lösen، (OE.) liesan، (Sw.) lösa "شل كردنەوە، جیا كردنەوە، لێكردنەوە، تواندنەوە" [دەبنەڕەتدا: بەر دان، ڕەها كردن] سەر بە ڕیشەی *(IE.)* ***leu-** < "لەت كردن، لێكردنەوە".

لۆقاندن **loqandın** [*loqāndın*] - "بەپەلە ڕۆیشتن": لۆقین loqîn یش دەگوترێ. دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە هەن كە پێوەندییان بە یەكەوە هەیە: ↑لۆقژین loqîjn "دەرپەڕین، خۆ (هەڵ)هاویشتن" و ↑لۆقە loqe [گورگەلۆقە] و ↑لۆقاو loqaw "هەنگاو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑لۆخان loxan "بەزم وشایی، هەڵپەڕین" و (Sw.) lacka "باز دان، هەڵبەزین"، سەر بە ڕیشەی *(IE.)* ***lek-** < "لاق كوتان، خۆ هەڵاویشتن". لەوانەیە وشەی ↑لاق laq پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

لۆقاو **loqaw** [*loqāw*] - "شەقاو، هەنگاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لۆقاندن loqandın.

لۆقژین **loqîjn** [*loqžīn*] - "دەرپەڕینی بە توندی": خزمە دەگەڵ ↑لۆقاندن loqandın.

[تێبینی: ناوگری ژ j لە كردارەكەدا ناوگری جەخت كردنە و دە هێندێك وشەی دیكەشدا دەبیندرێ، وەك پرژان، لوكژین، لەپژین و هتد].

لۆقە **loqe** [*loqa*] - "بەپەلە ڕۆیشتن": [گورگەلۆقە gurgeloqe]. خزمە دەگەڵ ↑لۆقاندن loqandın.

لۆك1 **lok 1** - "داخراو، مۆركراو": لۆك كردن واتا داخستن، مۆر كردن. خزمە دەگەڵ (E.) lock "قفڵ، داخستن، بەربەست، مەدار". دە زمانە ژێرمەنییەكاندا *(Grm.)* *lükan* كردارێكی هاوبەش بووە بە مانای "داخستن". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ڕیشەیەك بە مانای "چەمانەوە". وەك ئاشكرایە لە ئەنجامی چەمانەوە دا شتێك وێك دێتەوە و دادەخرێ، وەك كەمەی (دەوری) دەفە یان كەمەر، یان مووی لوول [(G.) Locke واتا مووی لوول]، سەر بە ڕیشەی *(IE.)* ***lug-** < "چەمان". دە زمانی كوردمادیدا چەندین وشە لەم بارەوە بە خزم دەردەچن، وەك ↑لۆچ loç"چرچ" [دەبنەڕەتدا وێكهاتوو] ↑لوێچ luweç (loç) "بەری دەستی چەماو"، ↑لووكاندن lukandın "گرتنە باوەش" و هتد.

لۆك2 **lok 2** - "تكە، دلۆپە": خزمە دەگەڵ ↑لێچ leç "گۆلاو".

لۆك3 **lok 3** - "تۆڵا، قورسە": [وردەی پێكەوەنووساو و سفت بووكێ]، لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لكان lıkan "بەستران(ەوە)". ["بەستن" دە زمانی كوردمادیدا مانای "مەیین و سفت بوون"یش دەگەیەنێ].

لۆكە **loke** [*loka*] - "پەمۆ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Flocke، (Nl.) vlok، (E.) flock و (Sw.) بە مانای شتی وەك لۆكە پێكەونووساو بۆ وێنە كلۆبەفر یان كەمێك خوری. ڕیشەی وشە ژێرمەنییەكە ساخ نەكراوەتەوە. گریمانە دەكرێ پێوەندی هەبێ بە (L.) floccus "ڕیس"، (Lit.) plauki "كلۆبەفر، بەرماوی چنین"، (Lit.) plaukas "موو". ئەگەر وشە كوردمادییەكە

پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، ئەوا دەبێ فۆتیمی بەرایی وشەکە دە زمانی کوردمادیدا سوابێتەوە.

لۆکی **lokî** [ *lokī* ] - "رەنگی سووری گەش لە قالیدا": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لەکە lek(k)e.

لۆلۆ **lolo** - "سەربەندی لاوک": خزمە دەگەڵ ↑لایلایی laylayî [لالایی lalayî].

لۆمە **lome** [ *loma* ] - "سەرکۆنە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ blame (Fr.) و blame (E.)، blamieren (G.) "لۆمە کردن". وشە فەرەنسییەکە چووەتە ناو زمانەکانی دیکە، بەڵام خۆی دەگەڕێتەوە سەر blasphemare (L.) "لۆمە کردن، قسە پێگوتن" و دواتریش blasphēmeīn (Gr.). وشە یۆنانییەکە خزمە دەگەڵ phánai (Gr.) "گوتن، قسە کردن" و دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑بانگ bang دە زمانی کوردمادیدا.

لۆنگ **long** - "1- فۆتە 2- رایەخی کەوڵ": لنگ long (P.) "فۆتە".

1- دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑لەی ley "بەرە، پەڵاس"دا باس کراون.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی **> *(IE.)* *(s)leg-, * (s)le(n)g-** "شل بوون، بێ هێز بوون، داکەوتن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لەق leq 1 "شل، ناجێگیر" و ↑لێچکە leçke.

لۆنگە **longe** [ *longa* ] - "تەکان، راژان": خزمە دەگەڵ ↑لەنگین lengîn "شەلین، بەم لا و ئەولادا خوار بوونەوە".

لۆنە **lone** [ *lona* ] - "دەزوو، تاڵ، داو": بڕوانە شیرۆڤەی ژێر ↑لەی ley "بەرە، پەڵاس".

لە **le 1** [ *la* ] - "پرێپۆزیسیۆنێک": [لە وڵات، لە چیا، لە پارەکەوە....]. دە شێوەزاری سەروودا ل l1 دەگوترێ. دە شێوەزاری ناوەڕاست دا ئەم پرێپۆزیسیۆنە بە تەواوی جێگەی پرێپۆزیسیۆنی ژ j1 [جە je] ی گرتۆتەوە و هەروەها تا رادەیەکی زۆریش جێگەی بە پرێپۆزیسیۆنی دە de لێژ کردووە و هاوکات دەوری هەر سێ پرێپۆزیسیونی شێوەزاری سەروودا دەبینێ. لەم بارەوە بڕوانە ئەم رستانەی خوارەوە: لە وڵاتی خۆی دەرکەوت (ژ وەڵاتێ خۆ دەرکەت)، لە کوردستان شۆڕش بەردەوامە (ل کوردستانێ شۆڕش دەدۆمێ)، لە پەرتووکدا نووسراوە (دە پەرتووکێدا هاتییە نڤیسین). وەک دەبینرێ ئەو پرێپۆزیسیۆنە دە شێوەزاری ناوەڕاستدا سێ رۆڵی جیاواز دەلەیزێ، بەڵام کۆنتر هەر وەک شێوەزاری سەروو لە یەک دۆخدا بەکار هاتووە کە بریتی بووە لە ئاماژە کردن بە ئاست و رووبەر، وەک لە کوردستان، لە چیا، لە وڵات، لە شەقام، لە هەندەران و هتد. ئەم پرێپۆزیسیۆنە خزمە دەگەڵ upari (Av.)، ober (G.)، über (G.)، ufar (Gt.)، over (E.)، över (Sw.)، hyper (Gr.)، super (L.) "لەسەر، بەسەر"، سەر بە ریشەی **> *(IE.)* *eup-, *up-** "لەخوارە بەرەوە شتێک یان شوێنێک چوون، بەسەردا تێپەرین، هەڵکشان (بۆ سەرەوە)". دە زمانی ئەڵمانید کۆندا ubiri (OG.)ش بەکار هاتووە.

[تێبینی: لەوە دەچێ کە ئەم پرێپۆزیسیونانەی سەرەوە وشەی لێکدراو بن، چونکوو دە زمانە ئەورووپییەکاندا ئەو پرێپۆزیسیۆنانەی خوارەوەش دەبینرێن کە کە لە راستیدا کەرتی یەکەمی وشەکانی سەرەوەن: up (E.)، auf (G.)، op (Nl.)، ūf (OG.) ، uup (Sw.) "لەسەر، سەرەوەی". دە پەرتووکە ئێتیمۆلۆژییەکاندا بە جیا باس لە کەرتی دووەمی وشەکانی سەرەوە، واتا کەرتی er- یان ri- نەکراوە. پرێپۆزیسیونی لە le دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم کەرتەوشەوە هەیە. لەوانەیە کەرتێکی ئەوتۆ دە زمانە کۆنەکاندا لە ئارادا بووبێ. ئەگەر وشەیەکی ئەوتۆ لە ئارادا نەبووبێ، دەبێ وای دابنێین کە پرێپۆزیسیۆنی لە le شێوەیەکی سواوە لەو وشەیە کە دە زمانی ئاڤێستادا upari و دە ئەڵمانی کۆندا ubiri بووە. هەروەها

پێشگری کرداری ↑هەڵ hel یش [هەڵگرتن helgırtın، هەڵهێنان helhenan، هەڵنیشتن helnîştın ...] شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە نیشان دەدا و ئەویش ئاماژە بە لای سەرەوە دەکا. وشەکە، بە دوو شێوەی جیاواز، جارێکیان بووەتە پریپۆزیسیۆن و جارێکیش بووەتە پێشگری کردار. دە زمانی فارسیدا بۆ هەر دۆ دۆخەکە وشەی بر ber (.P) بەکار دێ و ئەویش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە ["بر روی" واتا لەسەر، "برداشتن" واتا هەڵگرتن، هەڵهێنان]. وشەکانی سەرەوە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑هەوار hewar.

**-لە le 2** *[ la ]* - "پاشگری گچکاندن": [بابەلە babele، برالە bırale، کاکەلە kakele، کاریلە karîle، دەرزیلە derzîle، دانوولە danule، قاشوولە qaşûle ...]. زۆر جار فۆتیمی (ل) ی کز بەشێوەی (ڵ) ی قەڵەو دەردەکەوی وەک تۆپەڵە topele، کووپەڵە kupele، دیزەڵە dîzele، بووکەڵە bukele، ژیکەڵە jîkele، سووکەڵە sukele، بەرخۆڵە berxole وهتد. ئەم پاشگرە بە چەندین شێوەی جیاواز دەردەکەوێ، بۆ وێنە، ناسکۆڵ naskol، فرتۆڵ fırtol، نامیلکە namîlke، چاویلکە çawîlke، قدیلکە qıdîlke، تاسوولکە tasulke یان بابیلان babîlan، خونجیلانە xuncîlane، نەشمیلانە neşmîlane، ژیکەلانە jîkelane و هتد. وەک دەبینرێ، بزوێتێک کە وەک ناوگر دەکەوێتە تێوان وشەکە و پاشگرەکەوە، بە چەند شێوە خۆ نیشان دەدا، وەک ئیلە -île [کاریلە، خرپلە]، ئۆڵە -ole [چکۆڵە، کچۆڵە]، ئەلە -ele [تۆپەڵە، سووکەڵە]، ئەلانە -elane [ژیکەڵانە] یان ئیلانە -îlane [خونجیلانە، قشپیلانە] و هتد. وێ دەچێ جۆری بزوێنەکە کزی و قەڵەوی "ل" دیاری بکا. ئەم پاشگرە خزمە دەگەڵ پاشگرێکی گچکاندنی زمانی ئەڵمانی کە دە شێوەزارە جۆربەجۆرەکاندا بە شێوەکانی -(e)li، -le، -el، -erl خۆی نیشان داوە یان دەدا. دە زمانی ئەڵمانی کۆندا پاشگرەکە بە شێوەی (i)līn (.OG) خۆی نیشان داوە و دە زمانی ئەڵمانی ئەمرۆییدا بووەتە lein (.G) وەک لەم وشانەدا: Äuglein، Bächlein، Kindlein، Männlein، Fräulein، Schätzlein. دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها پاشگری -ling (.G) هەیە [liebling] کە دەشێ ئەمیش لە بنەڕەتدا پێوەندی بەم باسەوە هەبێ.

**لەباتی lebatî** *[ labātī ]* - "لەبری، لە جیگەی": وشەکە دە ئەسڵدا بەم جۆرەیە: لە le + بات bat + ی î. بنجی ئەم وشەیە بات -bat ە و دەچێتەوە سەر ریشەی *uei- *(.IE)* "چەمان، سووڕان" و دەبێتە خزم دەگەڵ با دان(ەوە) (ba dan(ewe) [باد دان(ەوە) (bad dan(ewe)] و ژمارەیەک وشەی دیکە کە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە چەمکی "سووڕان(وە)، باد دان(ەوە)" دەکەن. چۆنیتی پێوەندی ئەم مانایانە بەیەکەوە لەژێر وشەی "لەبری"دا شی کراوەتەوە.

**لەبار lebar 1** *[ labār ]* - "گونجاو": ↑لە + بار le + bar [بڕوانە ↑بار[6] bar "قەراخ، ئاڵ، لا"]. "لەبار" دە بنەڕەتدا واتا شتێک کە لەسەر باری خۆیەتی، بۆ وێنە بەردێک کە لەناو ریزەبەردی دیواردا لەسەر باری خۆی جوان جێ دەگرێ.

**لەبار lebar 2** *[ labār ]* - "ڕەعنا، بەژن وباڵا جوان": [کیژی لەبار]. ئەم "لەبار"ە ناشێ پێوەندی بە "لەبار"ی سەرەوە هەبێ. لەباری سەرەوە لەوەڕا هاتووە کە شتێک، بۆ وێنە جکێ لەسەر باری خۆی بووە یان نا. ئەگەر شتەکە لەسەر باری خۆی بووبێ، پێی گوتراوە "لەبار"، ئەگەریش لەسەر باری خۆی نەبووبێ گوتراوە "نالەبار". بەڵام لەبار وەک وەسفی بەژن و باڵای جوان ناتوانێ پێوەندی بەم چەمکەی سەرەوە هەبێ. بۆیە ئەمانە لەراستیدا دوو وشەی جیاوازن کە وەک چەندین وشەی لەم چەشنە دە زمانی کوردمادیدا تێکەڵ کراون و وەک یەک وشە لە قەڵەم دراون. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑لەوار lewar [لەق و لەوار leq u lewar]. ↑لاو *law*، ↑لاواز lawaz، ↑لەوەند lewend، ↑لاوێن lawen و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی >

**(IE.) *(s)lep-, *(s)lab-** "شل، شۆڕ" [شۆڕەژن، ژنی شل و مل]. "کیژی لەبار" لەباری ماناوە وەک وشەی "شۆڕەژن" وایە. مەبەست لە "لەبار" دە بنەڕەتدا "شلک، زراڤ"ە، واتا بەژن و باڵایەکی شووش و باریک و بە لەنجە و لار.

**لەباشە lebaşe** [ *labāša* ] - "نانی تەنکی سەر ساج": لەواش lavāš (P.). دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لۆشە loşe و ↑لۆشک loşık هەن بە مانای "کولێرەی گەورە" و "کولێرەی چکۆڵە". خزمە دەگەڵ Laib (G.)، (h)leib (Gt.)، hlaf (OE.)، hleifr (OIs.) "نان ساجی" [نەک نانی تەنوور]. خزمە دەگەڵ ↑کولێرە kulere، ↑لەپێخە lepexe "نیوەنمەک"، ↑لەپۆرت leport "نانی هەنجیر" و هتد. وشەی lady (E.) "خانم، یای" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشەیە دە کۆندا hla fdīge (OE.) بووە و ماناکەی دە ئەسڵدا بریتی بووە لە "نانکەر، هەویرشێل". هەروەها وشەی lord (E.) "ئاغا" دەچێتەوە سەرhlāford (OE.) [ *hlāfward* >] کە ئەویش مانا بنەڕەتییەکەی دەبێتە "نانەوا یان نانپارێز"!

**لەبان leban** [ *labān* ] - "گیای حەسیر لێ چێ کردن": خزمە دەگەڵ ↑لاوێن lawen "چڵی دارەبی".

**لەبتاندن lebtandın** [ *labtāndın* ] - "جووڵاندن، تەکان دان": ئەم وشانەش هەن: لەبتین lebtîn "جووڵان" و لەبت lebt "بزاڤ، جووڵە" و لەبتۆک lebtok "زۆر بە جووڵە". خزمە دەگەڵ ↑لڤین lıvîn "جووڵان، راژان".

**لەبری lebırî** [ *labırī* ] - "لەباتی، لەجیاتی": لە le + بری bır(î). دە زمانی فارسیدا بەم مانایە دوو وشە بەکار دێ: "بجای" واتا "بەجێگەی" و "بەعوض". وشەی "عوض" کە خۆی وشەیەکی عەرەبییە، پێوەندی بە چەمکی "گۆڕان و گۆڕین"ەوە هەیە. بە ورد بوونەوە لەم پێوەندییە دەردەکەوێ کە بنجی وشە کوردمادییەکەش، واتا بر bır، پێوەندی بە وشەی گۆڕان goran ەوە هەیە. شیاوی باسە کە فۆتیمی g لە سەرەتای وشەی "گۆڕان"دا پێشتر w /v بووە [↑گۆڕین[1] gorîn، سەر بە ریشەی **< *wer- , *uer- (IE.)** "سووڕان"]. بەم پێیە وشەی "لەبری" دەشێ پێشتر *لە وری le-wırî** بووبێ و فۆتیمی w گۆڕاوە بە b.

[تێبینی: ئەگەر ئەم شی کردنەوەی سەرەوە بە بنەما وەربگرین، ئەوسا دەتوانین وشەی لەباتی lebatî یش شی بکەینەوە. ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەی ***uei- (IE.)** "چەمان، سووڕان" و دەبێتە خزم دەگەڵ با دانەوە ba dan(ewe) (دە بنەڕەتدا: باد دانەوە (bad dan(ewe)) و ژمارەیەک وشەی دیکە کە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە چەمکی "سووڕان(وە)، بەم لا و ئەولادا جووڵانەوە" دەکەن، وەک دارەبی، بی bî، بە فارسی بید bīd (P.)].

**لەبزینە lebzîne** [ *labzīna* ] - "جۆرێک شیرینی": لەوزینە lewzîne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەباشە lebaşe "نانی تەنکی سەر ساج".

**لەبکان lebkan** [ *labkān* ] - "سەر لێشێوان، هۆش بڵاو بوون": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لێوە1 lewe "شێت".

**لەبلەبان lebleban** [ *lablabān* ] - "دەمەهەراش": خزمە دەگەڵ ↑لێو lew [لب lab (P.)].

**لەبە lebe** [ *laba* ] - "گۆشتی زۆرچەور": خزمە دەگەڵ lipos (Gr.) "رۆن، چەوری"، limpáti (OIn.) "تێ هەڵدەسووێ، چەور دەکا"، lipti (Lit.) "پێوەنووسان"، سەر بە ریشەی **< *(s)lei- (IE.)** "تەڕ، لیچق، چەسپدار، پێوەنووسان". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑لەپە[2] lepe "سواخ دان بە دەست". ئەم وشانە هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑لف2 lıf "شەنگڵەبەرەکەتە".

**لەبەن leben** [ *laban* ] - "قامیش، چیتک": بڕوانە ↑لەبان leban "گیای حەسیر لێ چێ کردن".

**لەبیخە lebîxe** [*labīxa*] - "دەرمانی تیر و خەست کە لەسەر برین دادەنرێ": لەپێخە lepexe ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەبە lebe.

**لەپ lep 1** [*lap*] - "بەری دەست": خزمە دەگەڵ luv (G.)، loef (Nl.) "سەوڵی گەمێوان"، lofa (Gt.)، lofi (OIs.)، loppo (OG.) "لەپی دەست"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *lēp- >*** "لەپی دەست، پەڕەی شان، رووبەری سەوڵ و بێڵ و ...". lapa (Rus.) "پەنجە"، lopata (Lit.) "بێڵ"، lopa (L.) "چەنگ، چەنگاڵ" و lopeta (L.) "بێڵ" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەك وشەی خزم بەرچاو دەکەوێ، وەك ↑لاپ lap "چەپۆك"، ↑لاپوشك lapuşk "چەنگاڵی ئاژەڵ"، ↑لووشك lûşık "جووتەی یەکسم، ↑لاپك lapık "دەستکێش، دەستەوانە"، ↑لاپیتە lapîte "ئەوشۆینەی داردەست کە کێڵەڕ دەستی پی دەگرێ"، ↑لاپار lapar "سواپ"، ↑لەپە lepe "لەتەنۆك". وێ دەچێ وشەی لافیتة lafita (Arb.) "پلاکارد" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. [فۆتیمی p دە عەرەبیدا نییە و بۆیە کراوە بە f]. "لافیتە" دە ئەسڵدا وەك "بێڵ" یان "وەروەرە"یەکی سەرەوبن کراو وایە کە کاغەزێکی نووسراوی لەسەرە و دروشمێك نیشان دەدا.

**لەپ lep 2** [*lap*] - "پەلە، لەز": لەپە lepe ش دەگوترێ [لەپەلەپ lepelep واتا پەلەپەل]. خزمە لەگەڵ laufen (G.)، (h)loufan (OG.) "خێرا رۆیشتن، بە غار رۆیشتن"، (us)hlaupan (Gt.) "باز دان"، leap (E.) "بازد دان"، löpa (Sw.) "خێرا رۆیشتن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. وا بیر دەکرێتەوە کە مانای بنەرەتی ئەم وشەیە "باز دان، خۆ هەڵاویشتن" بووبێ. وشە ژێرمەنییەکە دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ تراویش بە کار دێ و مانای "جاری بوون، لەبەر رۆیشتن" دەبەخشێ. وێ دەچێ وشەکە دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا مانایەکی لە چەشنی زمانە ژێرمەنییەکانی بووبێ و ئاماژەی بە بزواتێکی خێرا کردبێ و پاشان لەمەوە مانای "خێرایی، لەز" سەری هەڵدابێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لەپین2 lepîn "1- پەلە کردن 2- گورگەلۆقە کردن" هەیە کە پێوەندی بە *لەپ* "پەلە، لەز"ەو هەیە و هەروەها نیشان دەدا کە دە بنەڕەتدا مەبەست رۆیشتنێکی خێرای وەك گورگەلۆقەیە. هەروەها جێی بیرهێنانەوە کە وشەی "لۆقە"ش لە "گورگەلۆقە"دا سەر بە ریشەیەکە بە مانای "خۆ هەڵاویشتن". کەوابوو مەبەست لە "لەپین" یان "گورگەلۆقە" کردن رۆیشتنێکی تێکەڵ بە خۆ هەڵاویشتن و هەڵبەز دابەز بووە، واتا رۆیشتنێکی خێرا و بە لەز.

**لەپاچە lepae** [*lapāča*] - "پێخەو": خزمە دەگەڵ ↑لێفە lefe.

**لەپاندن lepandın** [*lapāndın*] - "قووت دان": خزمە دەگەڵ läppern (G.) "هەڵقوڕاندن، قووت دان"، lapen (MG.) "لێستنەوە، هەڵقوڕاندن"، leppen (Nl.)، lap (E.) و lapa (Sw.)، سەر بە ریشەی ***(IE.) *lab(h)-, *lap(h)- >*** "هەڵقوڕاندن، لێستنەوەی بە دەنگ". laptein (Gr.)، lambere (L.) و هەروەها Löffel (G.) "کەوچك" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

**لەپڕ lepır** [*lapır*] - "لەنەکاو، کوتوپڕ": ↑لە le + پڕ pır. کەرتی ↑پڕ pır خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑پڕتاو pırtaw، ↑پەلە pele و هتیر کە ئاماژە بە "جم و جۆڵی خێرا" دەکەن.

**لەپژین lepjîn** [*lapžīn*] - "بوورانەوە، لە هۆش چوون": خزمە دەگەڵ ↑لەپین lepîn "بەلادا هاتن"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "شل، شۆڕ، داهێزاو بوون، داکەوتن". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ lapsus (L.) "هەڵەنگوتن، گلان".

**لەپك lepk** [*lapk*] - "دەستکێش، دەستەوانە": ↑لاپك lapık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست".

لەپکە **lepke** [ *lapka* ] - "1-مووررووی شین 2- زاخی شین": بنەوشەی -lep جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ levere (.L) "شین بوونەوە، شین چوونەوە".

لەپۆ **lepo** [ *lapo* ] - "هەویرمایە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ↑ لبی lıbî "دەڵەمە، پەنیری نەگوشراو".

لەپۆرت **leport** [ *laport* ] - "نانی هەنجیر": خزمە دەگەڵ↑ لەباشە lerbaşe "نانی تەنک".

لەپۆل **lepol** [ *lapol* ] - "شەپڵەلێدراو": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ↑لەپژین lepjîn "بوورانەوە، لە هۆش چوون" و↑لەپین lepîn "بەلادا هاتن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "شل، شۆڕ، داهێزاو بوون، داکەوتن".

لەپە[1] **lepe [1]** [ *lapa* ] - "لەتەنۆک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست". لەم تێڕوانینەوە لەپە لەبەر ئەوەی بە هۆی لەت بوونەوە لایەکی ساف و تەخت دەبێ، بەم جۆرە ناوزەد کراوە.

لەپە[2] **lepe [2]** [ *lapa* ] - "سواخ دان بە دەست":

1- لە لایەکەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەبە lebe "گۆشتی زۆر چەور" و ژمارەیەک وشە کە مانای "پێوەنووسان" دەبەخشن.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑لەپ[1] lep [1] "بەری دەست"ەوە هەبێ.

لەپە[3] **lepe [3]** [ *lapa* ] - "ڕاژان، نەوەسان". خزمە دەگەڵ ↑لەپین lepîn "بەلادا هاتن" و ↑لڤین lıvîn "جوولان، ڕاژان".

لەپەتیر **lepetîr** [ *lapatīr* ] - "دەستخۆر": خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست". کەرتی دووەم لەوانەیە پێوەندی بە "تیر"ەوە هەبێ [تیر خواردن؟].

لەپەر **leper** [ *lapar* ] - "زیپکەی زۆر بەژان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی خوارەوە:

1- Lepra (.G) "نەخۆشی گولی". ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر Lepros (.G) "زوور، ناساف". ریشە؟

2- loupe (.F) "زەڕڕەبین". ئەم وشەیە سەرەتا بە مانای "زیپکەی خڕی بن پێست" بووە و دواتر مانا تازەکەی وەرگرتووە. ریشەی وشەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک وشەکە دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە lupa (.L) "دێڵەگورک"، بەڵام چۆنێتی پێوەندییەکە ڕوون نەکراوەتەوە. شیاوی باسە وشەی lupa ی لاتینی و هەروەها "گورک"ی کوردمادی دەچنەوە سەر ریشەی **< *uel-** ***(IE.)*** "لێکردنەوە، داڕنین، داپچڕین، ڕنینەوە".

3- ↑لەوەڕ lewer و ↑لێرین lerîn "تێکوڵ لێکردنەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *leu-** ***(IE.)*** "لێکردنەوە، ڕنین، داپچڕین". وشەی ↑لیر lîr "زیپکەی پانکەڵە" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە و ناوەکان بۆ ئەمە دەگەڕێنەوە کە ئەو زیپکانە دەخورێندرێن، واتا مرۆڤ لەبەر ئێش و ئازار پێستەکەی دادەڕنێ. وشەی "لەپەر" لە باری فۆنۆلۆژییەوە زۆر لە "لەوەر" دەچێ و جگە لەمەش پێوەندی دوو چەمکی *لەپەر* "زیپکەی بەژان" و "(دا)ڕنین و کڕاندن" بەیەکەوە ئاشکرایە.

لەپین1 **lepîn 1** [ *lapīn* ] - "بەلادا هاتن": هەروەها ↑لەپە[2] lepe [2] هەیە بە مانای "ڕاژان، نەوەسان". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لڤین lıvîn "جوولان، ڕاژان".

لەپین2 **lepîn 2** [ *lapīn* ] - "1- پەلە کردن 2- گورگەلۆقە کردن": بڕوانە ↑لەپ[2] lep [2] "پەلە، لەز".

**لەپێخە lepexe** [ *lapexa* ] - "شەڵتە و نیوەنمەک": ↑لەبیخە labîxe ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەبە *lebe*.

**لەت let** [ *lat* ] - "بڕ، پار، پارچە": دە فارسیدا دەگەڵ "پار" دێ [lat o pār (P.)] واتا لەت و پەت]. ئەم وشەیە تەنیا بۆ ئەو شتانە بەکار دێ کە شیاوی دڕاندن و لێکردنەوەن، وەکوو لەتێک نان یان لەت کردنی کاغەز، پەڕۆ، دار و تەختە و هتد. بەپێچەوانەوە ناکرێ "لەت" بۆ ئاو، شەکر، خۆڵ، سامان، خۆشی و شتی لەم چەشنە بەکار بێنین. ئەم پێوەندییە دەری دەخا کە "لەت" دە بنەڕەتدا بەگشتی بەمانای ئەندازەیەکە لە شتێک کە شیاوی بڕین و دڕاندنە، واتا ئەندازەیەک کە لە ئەنجامی بڕین یان دڕیندا دروست دەبێ. کەوابوو "لەت" هەڵگری مانای "دڕین" یان "بڕین"ە. لەم تێڕوانینەوە دەتوانین وشەکە ببەستینەوە بە ریشەی **< *leu- (IE.)** "بڕین، پچڕین، لێکردنەوە، تۆکڵ لێکردنەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا los(e) (G.) بە مانای "لەق، ناجێگیر، نەبەستراوە، رەها" لەم ریشەوە هاتووە. هێندێک وشە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە، وەک ↑لیک[2] lîk "قاش، کووز"، ↑لەە leh "پاژ، لەت، تیکە"، ↑لەوەڕ lewer و ↑لێرین lerîn و چەندی وشەی دیکە. هەروەها دە زمانی فارسیدا کرداری لهیدن lahîdan (P.) "پان و پلچ بوون، پلیخانەوە، لێک بڵاو بوون" [دە بنەڕەتدا: لەت و کوت بوون، ورد و خاش بوون] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**لەتار letar** [ *latār* ] - "شەقار": خزمە دەگەڵ ↑لەت let .

**لەتان letan** [ *latān* ] - "بێدەنگ بوون، ئۆقرە گرتن":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لەجەڕ lecer "کز و لاواز".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە کرداری löschen (G.)، lescan (OG.) "کووژاندنەوە". ئەم وشە ئەڵمانی خزمە دەگەڵ liegen (G.) "قەرار گرتن، لە شوێنێک (جێگیر) بوون". شیاوی باسە وشەی "قەرار" خۆی پێوەندی هەیە بە "ئۆقرە"وە و مەبەست لە "قەرار گرتن" دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە شتێکی بزۆک لە شوێنێک جێگیر دەبێ و لە بزاڤ و گۆڕان دەکەوێ.

**لەتەڕ leter** [ *latar* ] - دەگەڵ "لاق" دێ [لاق و لەتەڕ laq u leter]. خزمە دەگەڵ Glied (G.)، lid (OG.) و (OE.)، lidr (OIs.)، lith (OF.) "دەست و لاق"، سەر بە ریشەی **< *le- (IE.)** "چەمانەوە" [وشەی Glied دە زمانی ئەڵمانی ئەمڕۆ دا هەم بە مانای "دەست و لاق" [چوار پەل] و هەم بەگشتی بە مانای "ئەندام" بەکار دێ.

**لەجە lece** [ *laja* ] - "دەردەدڵ، گلەیی":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ lauschen (G.)، hlosēn (OG.) "گوێ گرتن، گوێ راگرتن"، listen (E.) "بیستن، گوێ دان"، lystra (Sw.) "بە گوێ کردن، گوێرایەڵ بوون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *kleu- (IE.)** "بیستن، گوێ گرتن". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها وشەکانی laut (G.) "توند" [بۆ دەنگ] و Laut (G.) "دەنگ" [ئەو شتەی دەبیسترێ] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. لەوانەیە دە زمانی کوردمادیشدا مانای وشەکە سەرەتا "گوێ گرتن" بووبێ، پاشان گۆڕابێ بۆ "گوێ گرتن لە دەردی دڵ و گلەیی" و دواتریش بۆ "گلەیی و دەردی دڵ".

2- لەوانەشە وشەکە خزم بێ دەگەڵ ↑گلێیی gıleyî، Klage (G.) "گلێ، سکاڵا"، klagon (OG.) "هاوار و سکاڵا کردن". لەم دۆخەدا دەتوانێ فۆتیمی سەرەتای وشە کوردمادییەکە سوانەوەی بەسەردا هاتبێ. لە وشە ژێرمەنییەکانی ژێر خاڵی یەکەمیشدا سوانەوەی فۆتیمی سەرەتای وشەکە بەرچاو دەکەوێ.

لەجەر **lecer** [ *lajar* ] - "کز و لاواز": لاغر lāġar (P.)، خزمە دەگەڵ leise (G.)"دەنگی کز و لاواز، هەروەها سەبر، ئارام" [دە بنەڕەتدا: بێ هێز بیستراو]. ئەم وشە ئاڵمانییە بەرهەڤ دەکرێ دەگەڵ liaros (Gr.) و liesas (Lit.) "کز و لاواز"، سەر بە ریشەی **< *lei- (IE.)** "کز و لاواز بوون، لەناو چوون، ون بوون". ↑لەر ler شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە. هەروەها ↑لەل lel "کەمترین دەنگ، دەنگی کز" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

لەجەن **lecen** [ *lajan* ] - خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە leichen (Gr.) "لەجەن". ریشە؟

لەچەر **leçer** [ *lačar* ] - "قرنیس، چکۆس": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ↑ لێشتۆک lêştok "تەماحکار".

لەخت **lext** [ *laxt* ] - "شل، خاو، داکەوتوو": خزمە دەگەڵ leicht (G.)، light (E.)، lihti (OG.)، leihts (Gt.)، lätt (Sw.) "سووک"، سەر بە ریشەی **< *le(n)gh- (IE.)** "سووک" (دە کێش یان دە جمو جۆڵدا).

لەر **ler** [ *lar* ] - "کز و لاواز": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەجەر lecer.

لەرزین **lerzîn** [ *larzīn* ] - "تەکان خواردن، راژان، لەرینەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەرین(ەوە) lerin(ewe).

[تێبینی: فۆنێمی z شێوەیەکی جەخت کردن بە کردارەکە دەبەخشێ. بەم پێیە لەرزین واتا لەرینەوی زۆر و زەوەند. لەم بارەوە بۆ نموونە هەڵی سەنگینە دەگەڵ فۆنێمی s دە زمانی ئەڵمانی و لەم کردارانەدا: gaffen (G.) "دەم داپچڕین، حەپەسان" و japsen (G.) "بە دەمێکی کراوە و پەیتا پەیتا هەناسە هەڵکێشان"].

لەرین(ەوە) **lerin(ewe)** [ *larīn(awa)* ] - "لەرزین": هەروەها ↑لەرە lere هەیە بە مانای "لەرزە". دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "راژان ، جووڵانەوە بەم لا و ئەو لادا" بێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لار lar [لەنجە و لار].

لەز **lez** [ *laz* ] - "پەلە، خێرایی": لەزین lezîn و لەزاندن lezandın یش وەک کردار بەکا دەهێنرێن و هەروەها لەزگین lezgîn وەک ئاوەڵناو. خزمە دەگەڵ leicht (G.)، light (E.)، lihti (OG.)، leihts (Gt.)، lätt (Sw.) "سووک"، سەر بە ریشەی **< *le(n)gh- (IE.)** "سووک" (دە کێش یان دە جمو *جۆڵدا*) [شیاوی باسە کە پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان دوو چەمکی "سووک" و "خێرا "دا، بۆ وێنە وشەی "چابوک" کە مانای "خێرا و بە لەز" دەدا، خزمە دەگەڵ "سووک، سڤک"].

لەزگ **lezıg** [ *lazıg* ] - "خەریک": لە le+ زگ zıg. دە هێندێک شێوەزاری کوردمادیدا، بۆ وێنە موکریانی، "لە زگ شتێک بوون" مانای خەریک بوون بە شتێکەوە دەدا. هەروەها دەگوترێ "چوونە زگ شتێک" بەو مانایە کە چوون بۆ لای شتێک و خۆ پێوە خەریک کردن. لە شێوەزاری دیکەدا لە زک lezık دەگوترێ و بۆ وێنە دەبێژن "لە زک بووم بچم" یان "گورگ لە زک بوو دەیخوارد". لێرەشدا وشەکە مانای "خەریک" دەدا و دەکرێ بگوترێ "خەریک بووم بچم" یان "گورگ خەریک بوو دەی خوارد".

[پێش بەردەوام بووم لەسەر شی کردنەوەی ئەم وشەیە حەز دەکەم نەقڵێکی خۆش بگێڕمەوە کە پێوەندی بە باسەکەوە هەیە. سی ساڵێک لەمەوە بەر لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوڕێیانم لە چیا و بەندەنە دوورەدەستەکان پەنامان گرتبوو و لەناو سروشتی رەنگین و سێحراوی کوردستاندا لە زگ سیاسەت بووین (یادی ئەو رۆژانە و هەموو ئەو هاوڕێ خۆشەویستانە هەمیشە بەخێر). دیارە زۆرینەی هاوڕێیان بە کچ و کوڕەوە کەسانی ئازا و بەکار بوون، بەڵام یەکێک لە

کوڕەکان، هاوڕێ x، بەڕاستی زۆر ئازا و دڵسۆز بوو و هەوڵی دەدا بەتایبەتی هاوڕێیانی کچ لەکاتی کار کردنیاندا یارمەتی بدا. ڕۆژێک لە دیوی کچەکان دوای فراوین خواردن یەکێک لە کچەکان دەڵێ ئەوە هاوڕێ x لە زکێ مەنجەڵەکانە، واتا مەبەستی ئەوەیە کە ئەو هاوڕێییە خەریکە مەنجەڵەکان دەشوا و خاوێنیان دەکاتەوە. یەکێک لە هاوڕێیان کە خانمێکی بەڕێزی سنەیی بوو، بە بیستنی ئەم وشەیە ڕەنگی سوور هەڵ دەگەڕێ، چاوی زەق دەبێتەوە، لێوی دەگەزێ و بە پەشۆکانەوە دەپرسێ "جا چۆن هاوڕێ x کاری وا ئەکا؟ کچەکانی دیکە کە دەبینن ئەم خراپ تێگەیشتووە و بیری بە لاڕێدا ڕۆیشتووە، دەڵێن کچێ ئەوە خەریکە مەنجەڵەکان دەشوا. هاوڕێ کچەکە ئاهێکی دێتەوە بەر و دەبێژی باوە من ترسام، لای ئێمە "چوونە سک" مانایەکی فرە خراپ ئەدا، واتا مەبەستی ئەوەیە کە مانایەکی سێکسی دەدا. ئەوەی ڕاستی بێ، کاردانەوەی ئەو هاوڕێ کچە منی سابڵاخی وەها ترساند کە ئیتر بە دەگمەن "چوونە زکێ" و "لە زکێ بوون"م بە سەر زماندا هاتەوە. بۆ ساڵانی ساڵ باوەڕم کردبوو، کە ترس و تۆقینی ئەم هاوڕێ کچە لەخۆڕا نەبووە و پێم وابوو ئەم دەستەواژەیە لە بنەڕەتدا پێوەندی بە کار و باری سێکسییەوە هەبووە و دواتر ماناکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەم بۆچوونە بەردەوام بوو تا ڕۆژێک لە ڕۆژان لە وشەنامەدا بۆ جارێکی دیکە لەگەڵ دەستەواژەکە ڕووبەڕوو بوومەوە و ئەوسا ئیتر نەدەکرا هەروا بە هاسانی بەسەریدا بازد بدەم. ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو بزانم بە ڕاستی پەشۆکانی ئەو کاتی هاوڕێمان بە جێ بوو یان نا. پاش شەن و کەو کردن و هێنان و بردنێکی زۆر بۆم دەرکەوت، سەرەڕای هەموو ئەو شەرم و ترسەی هاوڕێمان وشەکە ناتوانێ پێوەندی بە بابەتی سێکسەوە هەبێ. ئەم ترسەی سەرەوە لێرەوە پەیدا بووە کە بۆ وێنە گوتراوە "فەڵانەکەس دەچێتە زکێ ژنان"، یان "فڵانە کەس لە زکێ ژنێک بوو". دیارە لەم دۆخەدا تەنیا مانای "خەریک" کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، مەبەست بووە، واتا مەبەست ئەوە بووە کە فڵانەکەس خەریکی ژنانە یان لەگەڵ ژنێک خەریکە. لەم دەستەواژەیەدا بەهیچ جۆرێک مەبەست لە زکێ [سک، زک] وەک ئەندامی لەش نییە، چونکوو ئەگەر مەبەست ئەوە بایە، دەستەواژەکە دەبا بە جۆرێکی دیکە داڕێژرابا. بەکار هێنانی دەستەواژەی وەک "لەگەڵ ژن بوون" یان "لەباڵ ژن بوون" لەباری مانا و داڕشتنی ڕێزمانییەوە ڕاست و ڕوون و ئاشکرایە. لەم دەستەواژانەدا پیاو لەگەڵ ژنە یان لە باغەڵی ژندایە، بەڵام پیاو ناتوانێ لە زگی ژن دابێ، مەگەر ئەوەی هێشتا لەدایک نەبووبێ و لە زگی دایکیدا چاونواری هاتنە سەر دنیا بکا! هەروەها پیاو ناتوانێ بچێتە (ناو) زگی ژن، مەگەر ئەوەی کارکەی نەشتەرگەری بێ. جگە لەمە، ئەوەش لەگەڵ ئاوەز جۆر نایەتەوە کە مرۆڤی کورد، چەمکێکی سێکسی کە بەداخەوە هەمیشە وەک شتێکی نەرێنی و تەنانەت پیس و ناحەز چاو لێکراوە، وەها بگشتێنێ کە بۆ مەنجەڵی چێشت لێنان و بۆ خەریک بوون بە هەموو شت و کار و باری دیکەی ڕۆژانەش کەڵکی لێ وەرگرێ. جا ئێستا با نەقڵی کەر و دەمانچە جێ بهێڵین و بچینەوە سەر باسە خۆشەکەی خۆمان].

ئەم زکێ zıg [زک zık، سک sık]ە دەچێتەوە سەر ڕیشەی **(IE.) *sag- <** "دۆزین، بە شوێندا گەڕان" و خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑سۆسە sose کردن، واتا "پەی بردن بە شتێک، شوێن کەوتن و دۆزینەوەی شتێک"، ↑سوختە suxte "فەقێ" [دە بنەڕەتدا: شوێن کەوتووی زانست یان نەهێنییەکان]، ↑سەچتین seçtın "پشکنین" [گەڕان بە شوێن شتێکدا] و هتد. دەستەواژەکانی "چوونە زکێ" یان "لە زکێ بوون" سەرەتا وەک ئەم وشانەی دیکە پێوەندییان بە چەمکی "وەشوێن کەوتن"ەوە هەبووە. بۆ وێنە کاتێک گوتراوە فڵانە کەس لە زکێ ژنانە، مەبەست ئەوە

بووە وەشوێن ژنان دەکەوێ، حەول و تەقەلا بۆ (دۆزینەوەی) ژنان دەدا. یان چوونە زکێ کتێب و دەفتەر بە مانای ئەوە بووە کە کەسێک وە شوێن ئەو شتانە کەوتووە و حەول و تەقەلایان بۆ دەدا و خۆی پێیانەوە خەریک دەکا. ئا لەم چوارچێوەیەدا پاشان مانای "خەریک بوون" و "خۆ پێوە خەریک کردن" سەری هەڵداوە، چونکوو کەسێک کە وەشوێن شتێک دەکەوێ، لەراستیدا خۆی بەم شتەوە خەریک دەکا و کات و ساتی خۆی لەسەر دادەنێ. کەوابوو ئێمەمانان دەتوانین جارێکی دیکە بەبێ ئازاری ویژدان دەستەواژەی "لە زکێ بوون" و "چوونە زکێ" بەکار بێنینەوە و دڵنیا بکەین کە تێگەرانییەکەی ئەوسای ئەو هاوڕێ کچە لەجێی خۆیدا نەبوو!

[تێبینی: دیسان سەبارەت بە وشەی "زکێ" و هەڵە کردن و تێکەڵ کردنی مانای دوو وشەی جیاواز، بەڵام هاوشێوە، بڕوانە وشەیەکی دیکەش کە بریتییە لە "وەزکێ" (وەزکێ دان)].

**لەزگە lezge** [ *lazga* ] - "چەسپی بە پێستەوە لکاندن بۆ دەرمان": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑لووس lus، ↑لیچق lıçıq و هتد، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەڕ و لیچق".

**لەزگین1 lezgîn** [ *lazgīn* ] - "1- ناوی پیاوان 2- چالاک": خزمە دەگەڵ ↑لەز lez "پەلە".

**لەزگین2 lezgîn** [ *lazgīn* ] - "1- ناوی پیاوان 2- رووخۆش": خزمە دەگەڵ ↑لاز laz [لاس las] سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە".

**لەزم lezm** [ *lazm* ] - "شە، تەڕایی، قوڕ و چڵپاو": خزمە دەگەڵ ↑لێزک lezk "دەڵانی تەڕایی لە لەش".

**لەژگ lejg** [ *lažk* ] - "پەل، لق": بنەوشەی لەژ -lej پێوەندی هەیە بە ↑لق lıq [لک lık]. ↑لەقەل leqel یش هەیە بە مانای "قامیش" کە دەکرێ هەر لەم پێوەندییەدا شی بکرێتەوە.

**لەژم lejm** [ *lažm* ] - "قوڕ و چڵپاو": ↑لەزم lezm یش دەگوترێ.

**لەش1 leş** [ *laš* ] - "بەژن، کۆی ئەندامەکان": خزمە دەگەڵ لاشە lāša (P.)، Leiche (G.)، lik (Sw.) "لاشە، کەلاک"، lich (Gt.)، lika (OE.) "لەش، کەلاک"، سەر بە ریشەی < *lika-* *(IE.)* "بەدەن، لەش". خزمە دەگەڵ ↑لاشە laşe و ↑کەلاک kelak.

**لەش2 leş** [ *laš* ] - دەگەڵ "لار" دێ و دەگوترێ لەش leş و لار lar. خزمە دەگەڵ ↑*لۆژ loj* "تەمبەڵ، تخێڵ، داهێزاو، بەلاداهاتوو"، هەروەها لۆژە loje "راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا" و ↑لۆژان lojan "1- راکشان، تخێڵ بوون 2- راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا".

**لەشکر leşkır** [ *laškır* ] - "سوپا، قۆشەن": لشکر laškar (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لێژنە lejne و ↑لێش1 lêş "بارەگیا" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "کۆما بوون و ئاپۆڕە بوون" دەکەن.

[تێبینی 1: وشەی "قۆشەن"یش بە مانای لەشکر دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە هەر بەو مانایەی سەرەوە و خزمە دەگەڵ "گیشە". هەروەها "سوپا" لە ریشەکەوە دێ کە ئاماژە بە زۆر و زەوەندی دەکا و خزمیشە دەگەڵ "زۆر" [زاف]. تێبینی 2: ئەوەندەی لە بیرم بێ، تەبەری، فەیلەسووف و زمانناسی فارس پێی وابوو کە وشەی عسكر εaskar (Arb.) لە وشەی لشکر laškar (P.) وەرگیراوە. دیارە وشەی "لەشکر" تەنیا وشەیەکی فارسی نییە و و وشەیەکی هاوبەشە و ئەوەندەی فارسییە، دوو ئەوەندە کوردییە، چونکوو لک و پۆی وشەکە دە زمانی کوردیدا بەتەواوی دیارە].

**لەشە leşe** [ *laša* ] - "تەمبەڵ و تەوەزەل، لەشگران": خزمە دەگەڵ ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێڵ، داهێزاو، بەلادا هاتوو".

**لەغاو leġaw** *[ laġāw ]* - "هەوسار": لگام legām (.P). خزمە دەگەڵ Ligamentum (.L) "بەند، پەت"، سەر بە کرداری ligare "بەستن، بەستنەوە". خزمە دەگەڵ ↑لکان lıkan "پێوەنووسان، بەسترانەوە". legieren (.G) "جۆش دانی کانزا " لەم وشە لاتینییە وەرگیراوە. هەروەها دەشێ لحيم lahīm (.Arb) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[شیاوی باسە وشەی "جڵەو"یش دە بنەڕەتدا هەر بەمانای "پەت و بەند" بوون].

**لەغم leġm** *[ laġm ]* - "ڕێگەی بن هەرد، نەقەب": خزمە دەگەڵ ↑لووهین luhîn "نەقەب" و ↑لاکین lakîn "ئەشکەوت".

**لەفـ1 lef 1** *[ laf ]* - "قووت، قووت چوون": [لەف دان واتا قووت دان]. خزمە دەگەڵ ↑لەپاندن lepandın "قووت دان".

**لەفـ2 lef 2** *[ laf ]* - "1- پێچ، لەدەور هاڵان 2- پیل، شەپۆل": هەروەها ↑لەفە lefe هەیە بە مانای "بابۆڵە" [نانی پێچراو، لوولدراو]. ↑لفـ1 lıf دەگوترێ.

**لەفتە kefte** *[ lafta ]* - دەگەڵ "کەفتە" دێ و دەگوترێ کەفتە و لەفتە kefte u lefte واتا"حەول و تەقەلای زۆر". دە بنەڕەتدا واتا کەوتن و هەستانەوە، واتا کۆڵ نەدان. کەفت keft دەچێتەوە سەر کرداری ↑کەوتن [کەفتن] kewtın و لەفت left یش خزمە دەگەڵ ↑لافاو lafaw "سێڵاو، ئاو هەستان" و ↑*لیفاندن lîfandın* "هەڵدان و بەرز بوونەوەی گیا" و lopt (.ON)، lüften (.MG) و lift (.E) "بەرز کردنەوە".

**لەفە lefe** *[ lafa ]* - "بابۆڵە" [نانی پێچراو، لوولدراو]، خزمە دەگەڵ ↑لەفـ2 lef 2.

**لەفین lefîn** *[ lafīn ]* - "شۆڕ بوونەوە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lep- , *(s)lab-** ***(IE.)*** "شل، شۆڕ، داهێزاو، داکەوتوو". هێندێک لەم وشانە بریتین: ↑لێو lew، ↑لاو law، ↑لاواز lawaz، ↑لەوەند lewend، ↑لاوێن lawen، ↑لەپین lepîn "بەلادا هاتن" و ↑لڤین lıvîn "جوولان، راژان" و هتد.

**لەڤا leva** *[ lavā ]* - "بەش، پشک، پاژ": لەڤا کرن leva kırın واتا "بەش بەش کردن". خزمە دەگەڵ ↑لەت let "پار، پارچە" و ↑*لەوەڕ lever* و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەی **< *leu-** ***(IE.)*** "لێکردنەوە، رنینەوە، داپچڕین".

**لەڤەندی levendî** *[ lavandī ]* - "ئەنگوچکەسۆرانی": خزمە دەگەڵ ↑لەفـ2 lef 2 "1- پێچ، لە دەور پێچان" و هەروەها ↑لەفین lefîn "شۆڕ بوونەوە".

**لەق1 leq 1** *[ laq ]* - "شل، ناجێگیر": لق laq (.P). هەروەها لەقین leqîn و لەقاندن leqandın هەن بە مانای "لەق بوون" و "لەق کردن". خزمە دەگەڵ Laken (.G) "مەلافە"، lahhan (.OG) "پەڕۆ، لێفە، پەردە"، lak (.MG) "شل، لەق". ئەم وشانە بە خزم دادەنرێن دەگەڵ lacc (.OIr) "شل، بێهێز" و laxus (.L) "شل، خاو"، سەر بە ریشەی **< *(s)lēg-** ***(IE.)*** "شل و بێهێز بوون".

**لەق2 leq 2** *[ laq ]* - "حەنەک، گاڵتە": خزمە دەگەڵ ↑لیقە lîqe "تریقەی پێکەنین" [شیاوی باسە وشەی "حەنەک" یش لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ "کەنین" (پێکەنین)].

**لەق3 leq 3** *[ laq ]* - "هێلکەی گەنیو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑لاک lak "کەپەک و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ".

**لەقاندن leqandın** *[ laqāndın ]* - دەگەڵ پێشگری دا -da دێ: دالەقاندن daleqandın "هەڵاوەسین". دالەقان daleqan واتا "هەڵواسران".

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لوچان luçan [دالۆزان dalozan] "شۆڕبوونەوە، داکەوتن". لەم تێڕوانینەوە مانای "لەقاندن" دەبێتە "راهێشتن، رەهێڵ کردن، شۆڕ کردنەوە".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لکان lıkan و لکاندن lıkandın "بەستن(ەوە)[بە پەتیکەوە کردن].

**لەقلەقی leqleqî** [ *laqlaqī* ] - "جۆرێک ترێ": خزمە دەگەڵ ↑لەق3 leq "هێلکەی گەنیو"، ↑لاک lak "کەپەک و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەڵاندن، دڵوپان، تەڕایی دانە دەرەوە".

**لەقە leqe** [ *laqa* ] - "لاق هاویشتنی یەکسم": لگد lagad (.P). خزمە دەگەڵ ↑لاق laq "قاچ، لینگ".

**لەقەل leqel** [ *laqal* ] - "قامیش": خزمە دەگەڵ ↑لق lıq.

**لەقین leqîn** [ *laqīn* ] - "شل بوون، تەکان خواردن": ↑لەق leq.

**لەک lek** [ *lak* ] - "بریتییە لە سەد هەزار": دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە رادە و ژمارەی زۆر دەکەن، وەک ↑لەشکر leşkır "سوپا، قۆشەن"، ↑لێژنە lejne و ↑لێش1 lêş "بارەگیا" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "کۆما بوون و ئاپۆڕە بوون" دەکەن. هەروەها دەشێ وشەکانی legio (.L) "یەکەی لەشکری 4200 تا 6000 سەرباز" و legere (.G) "کۆم کردنەوە، گوڵبژێر کردن" پێوەندییان بەم خێزانەوشەوە هەبێ.

**لەکاتە lekate** [ *lakāta* ] - "گوڵچنی، کۆ کردنەوەی گوڵەدەغڵی لە داس پەڕیو": خزمە دەگەڵ ↑لەک lek، ↑لێژنە *lejne* و↑ لیزگە lîzge و چەندین وشەی دیکە، سەر بەریشەیەک بە مانای "کۆ کردنەوە و خستنە سەر یەکی شتی پەرژ و بڵاو، گوڵبژێر کردن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لەککاتە lekkate هەیە بە مانای "ژنی ماڵانگەڕ". مەبەست لەم وشەیەش دەبێ کەسێک بێ کە لە ماڵان شت کۆ دەکاتەوە.

**لەککاتە lekkate** [ *lakkāta* ] - "ژنی ماڵانگەڕ": خزمە دەگەڵ ↑لەکاتە lekate "گوڵچنی".

**لەکە lek(k)e** [ *lak(k)a* ] - "پەڵە": لککە lakke (.P). دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەیەک هەیە، بۆ وێنە Lack (.G) کە بە مانای "رەنگ" بەکار دێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر lak (.P) و lākśā (.OIn) "رەنگ". ئەم وشەیەش پێوەندی دەدرێتەوە بە rajati (.OIn) "رەنگ دەبێ، سوور دەبێ". بە گوێرەی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە "لەکە" دەشێ دە سەرەتادا بە مانای "رەنگ" بەکار هاتبێ و مەبەست لە "لەکە گرتن"، پێوەنووسانی رەنگ بێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لۆکی lokî "رەنگی سووری گەش لە قالیدا" و↑لاکی lakî "رەنگی قالی و بەڕە".

**لەگلەگ legleg** [ *laglag* ] - "باڵدارێکی دەندووکدرێژ": [لەقلەق leqleq]یش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑لاس4 las "حیلاندنی سەبری ئەسپ"دا باس کراون. لەم بارەوە هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ لک لک lıklık "بارەبارِی مەڕ و بزن" و هەروەها "پێکەنین بە دەنگی بەرز، قاقا پێکەنین" [↑لک4 lık]. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە وشەکە ئەو دەنگ و هەرایەیە کە لەگلەگ بە دەندووکەکانی دەری دەهێنێ.

2- دووریش نییە وشەکە پێوەندی بە ↑شڵەقان şıleqan ەوە هەبێ کە لە بنەڕەتدا مانای "لێدان، لێکدان" دەبەخشێ. لەم تێڕوانینەوە مەبەستەکە دەبێتە لێکدانی دەندووک کەبە هۆیەوە دەنگەکە دروست دەبێ. لەم دۆخەدا دەبێ فۆتیمی سەرەتای وشەکە سوابێتەوە.

**لەگە lege** [ *laga* ] - "لینگ درێژ": خزمە دەگەڵ ↑لاق laq.

**لەگەز legez** [ *lagaz* ] - "مەتەڵ، لیچار": لغز loġz (.P). خزمە دەگەڵ ↑لەغم leġm "رێگەی بن هەرد، نەقەب"، ↑لووهین luhîn "نەقەب" و ↑لاکین lakîn "ئەشکەوت"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داخستن". لەم تێڕوانینەوە لەگەز واتا "داخراو، سەر بە مۆر".

لەگەڵ **legel** ⌈ *lagal* ⌉ - "وێڕا": ↑دەگەڵ degel یش دەگوترێ. بڕوانە ↑گەل *gel*.

لەگەن **legen** ⌈ *lagan* ⌉ - "1- قاپی قووڵ 2- بەشێک لە لەشی مرۆڤ لە وێنەی لەگەن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ lacune (.L) "قووڵکە، چاڵ". ڕیشە؟

لەل1 **lel 1** ⌈ *lal* ⌉ - "کەمترین دەنگ": خزمە دەگەڵ ↑لەجەر *lecer* و ↑لەڕ ler "کز و لاواز".

لەل2 **lel 2** ⌈ *lal* ⌉ - "باڵدارێکی ڕاوکەر": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ lov (.Rus)، lucrum (.L) "سوود"، Lohn (.G) " دەسمز، مووچە، پاداش"، سەر بە ڕیشەی **< -*lāu* (.IE)** "ڕاو کردن، (بە ڕاو) دەست خستن". لەوانەیە وشەی ↑ڕاو raw یش پێوەندی بەم ڕیشەوە هەبێ.

لەلوو **lelu** ⌈ *lalū* ⌉ - "بێشکە، جۆلانەی زارۆ تێدا خەواندن". بەم شێوانەی خوارەوەش دەگوترێ: لەلۆ lelo، لەلووک leluk، لەلوە lelwe. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑لار *lar* "خوار، بەلاداهاتوو" [لەنجە و لار lence u lar]، ↑لەرینەوە (lerîn(ewe [بەم لا وئەو لادا لار بوونەوە]، سەر بە ڕیشەی **< -*klei* (.IE)** "لار بوون، کل بوون".

[تێبینی: وشەی "بێشکە"ش خزمە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Wiege "بێشکە، جۆلانە" و ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "بزوان، تکان خواردن، *ڕاوەشان*"].

لەلە1 **lele 1** ⌈ *lala* ⌉ - "قووڵکراوی بە چەقۆ": لەلە کردن واتا "بڕبڕ لێدان بە تیغ یان چەقۆ". بنجی وشەکە لە -le یە. لەلە lele دووبارەکردنەوەی بنجی وشەکەیە، هەروەک بڕبڕ، خەت خەت، شەقارشەقار و هتد. خزمە دەگەڵ ↑لەت let.

لەلە2 **lele 2** ⌈ *lala* ⌉ - "خزمەتکار و بەخێوکەری زارۆک": لەلە lale (.P). هەروەک ↑لالە[1] lale "خاڵ" لە دووبارە کردنەوەی دەنگێک پێک هاتووە کە لاسا کردنەوەی دەنگ (گڕ و گاڵ)ی زارۆکە.

لەم1 **lem 1** ⌈ *lam* ⌉ - "1- بڕکەی میوە 2- پنچکەگیا 3- شفرەی بەراز": خزمە دەگەڵ ↑لێرین lerın "تیکول کردن". لە هەموو ماناکاندا چەمکی "بڕین" لەئارا دایە.

لەم2 **lem 2** ⌈ *lam* ⌉ - "1- زگ، سک": هەروەها لەمو lemo هەیە بە مانای "زگ زل" و ↑لەملانە lemlane بە مانای "مایچە، ماسوولکە". لەوانەیە لەم[3] lem بە مانای "گوانی ئاژەڵ"یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن لەگەڵ ↑لەبە lebe "گۆشتی زۆر چەور" و هەروەها دەگەڵ ↑لف2 *lıf* "1- شەنگڵەبەرەکەتە". دە زمانی ئەڵمانیدا Leib (.G) مانای "تەن، بەدەن" دەبەخشێ، بەڵام مانا قەدیمییەکەی "ژیان" بووە و خزمە دەگەڵ life (.E)، lijf (.Nl)، liv (.Sw) "ژیان". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑لف2 lıf.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی b، p یان f بە m هەڵیسەنگینە دەگەڵ ↑لەم[4] lem].

لەم[3] **lem** ⌈ *lam* ⌉ - "گوانی ئاژەڵ":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لەم2 lem "زگ، سک".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ Lumpen (.G) "پەڕۆ، تیتۆڵ"، lampen (.MG) "شۆڕ بوونەوە"، Schlampe (.G) "شەلەختە" و Schlaf (.G) "خەو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑لەفین lefîn "شۆڕ بوونەوە" و چەندین وشەی هاوچەشن، سەر بە ڕیشەی **< -*(s)lep* , -*(s)lab* (.IE)** "شل، شۆڕ، داهێزاو، داکەوتوو".

لەم[4] **lem** ⌈ *lam* ⌉ - "لەپ، بەری دەست": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەپ lep.

لەمس **lems** ⌈ *lams* ⌉ - "شەپلەلێدراو": خزمە دەگەڵ Lahm (.G)، lame (.E)، lam (.Sw) "گوج، شەپلەلێدراو"، سەر بە ڕیشەی **< -*lem* (.IE)** "[تێک] شکان". "لەسم"یش دەگوترێ کە ئەمە شێوەی گۆڕدراوی "لەمس"ە.

لەملمین **lemlımn** [ *lamlımn* ] - "خۆ کرۆشمە کردن لە سەرمان": بنجی وشەکە لەم -lem ە کە دووبارە دەبێتەوە. دەشێ خزم بێ دەگەڵ لمیدن lamīdan (P.) "پاڵ دانەوە (بە دانیشتنەوە)" و خزم بێ دەگەڵ lehnen (G.)، (h)linēn (OG.)، leunen (Nl.)، lean (E.) "پاڵ دانەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < -*klei* (IE.)* "خوار بوونەوە، پاڵ دانەوە". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە دێن، وەک ↑کەلەکە kelek(e) "تەنیشت"، ↑لار lar، ↑کل kıl "خوار" و هتد.

لەملانە **lemlane** [ *lamlāna* ] - "مایچە، ماسوولکە": خزمە دەگەڵ ↑لەم2 lem 2 "زگ، سک".

لەمەیی **lemeyî** [ *lamayī* ] - "نەخۆشییەکی مندالانە": بەداخەوە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا روون نەکراوەتەوە چ جۆرە نەخۆشییەکە. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لەمس lems "شەپلەلێدراو".

لەن **len** [ *lan* ] - "دورگەی بچووکی ناو چەم": خزمە دەگەڵ ↑لەند lend.

لەنتەر **lenter** [ *lantar* ] - "فانۆس": < *lenterna (L.)* < *lampter (Gr.)* "مەشعەڵ، فانۆس"، سەر بە کرداری lampein (Gr.) "هایسان، هەڵبوون". وشەی وەرگیراوی ↑لامپ lamp "گڵۆپ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

لەنجە **lence** [ *lanja* ] - "رۆیشتنی بەناز و خەرامان": خزمە دەگەڵ ↑لەنگین lengîn "شەلین، لاربوونەوە بەم لا و ئەولادا". لەنجە هەروەها دەگەڵ "لار" دێ [لەنجە و لار lence u lar]. لێرەدا پێوەندی لەنجە دەگەڵ لار بوونەوە بەتەواوی دەردەکەوێ. شیاوی باسە وشەی "خەرامان"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، لار بوون". جووتەوشەی "لەنجە و لار" ئەوە نیشان دەدا کە سەر و خوار کردن یاخود راژان و لەرینەوەی [لار بوونەوە] ی هێندێک شۆینی ژن لە کاتی رۆیشتندا لە لایەن پیاو وەک دیاردەیەکی جوان و سەرنج راکێش سەیر کراوە. رەنگە هەر بۆیەش بێ کە ژنەمۆدێلەکان لە پێشانگاکانی جلوبەرگدا، کاتی خۆ رانان بە بەردەم تەماشاکەراندا، لەنجە و لاریان چەند قات خەست و خۆڵتر دەکەن!

لەند **lend** [ *land* ] - "بەرزایی زەوی کە ئاو دەوری گرتووە": خزمە دەگەڵ Land (G.)، land (E.)، (Sw.) " ئاخ، زەوی، وشکانی، کێڵگە، سەرزەمین"، lund (Sw.) "لەوەرگە، لێرەوار"، land (OIr.) "مەیدان، زەوی بەرئاواڵە"، ljada (Rus.) "زەوی رووتەن"، سەر بە ریشەی < -*lendh* (IE.)* "زەوی، زەوی و زار". وشە ژێرمەنییەکە دەگەڵ ناوی هێندێک لە وڵاتە ئەورووپییەکانیش دێ و مانای "وڵات، سەرزەمین" دەدا، وەک England، Deutschland، Irland، Scotland و هتد. دە زمانی کوردمادیدا وشەکە لە لایەکەوە مانای "زەوی یان وشکانی ناو ئاو"ی وەرگرتووە و لە لایەکی دیکەش بە مانای "زەوی بەرز" بەکار دێ، بەرانبەر بە زەوی نزم، وەک چۆن لە کەند و لەند kend u land دا دەبینرێ. هەروەها وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ پاشگری ↑لان -lan [خیزەڵان، بێشەڵان، قامیشەڵان و هتد]. ئەم پاشگرە دەچێتەوە سەر "لەند" و ئاماژە بە زەوییەک دەکا کە خاوەنی شتێکی تایبەتە وەک خیز، بێشە، قامیش و هتد.

لەنگرین **lengrîn** [ *langrīn* ] - "لەنگین، راژان": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەنگین lengîn.

لەنگوچ(ک) **lenguç(ık)** [ *languç(ık)* ] - "ئەنگوچک، لەوەندی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک Gelenk (G.) "جومگە" [شوێنی خوار بوونەوەی ئێسکەکان]، schlank (G.)، hlanc (OE.) "شل و مل، زراڤ"، (h)lence (OE.) "ئاڵقەی زنجیر"، lenken (MG.) "خوار کردن(ەوە)، با دان(ەوە)"، سەر بە ریشەی < -*kleng* (IE.)* "با دران، خوار بوون(ەوە)". لەم تێڕوانینەوە ئەم

بەشە لە قۆلی کراس لە دەوری دەست *با دەدرێ* یان بەدەم کار و هاتۆچۆوە بەم لا و ئەو لادا خوار دەبێتەوە.

[تێبینی: وێکچوونی دوو وشەی "لەنگوچک" و "ئەنگوچک" شتێکی بە رێکەوتە و هەر کام لەم وشانە ریشەی جیاوازی خۆی هەیە. وشەی یەکەم پێک هاتووە لە "لەنگ" (کەرتی سەرەکی) و "ئوچک" (پاشگر). وشەی دووەم پێک هاتووە لە "ئەن" (پێشگر) و "گوچک" (کەرتی سەرەکی)].

**لەنگەر lenger** [ *langar* ] - لەنگەر راگرتن واتا تەعادوول راگرتنی شتێک کە دەحاڵی جووڵان و راژان دایە. خزمە دەگەڵ ↑لەنگین lengîn "راژان، خوار بوونەوە بەم لا و ئەولادا". مەبەست لە لەنگەر دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە شتەکە دە حەوا دا یان لەسەر ئاو دەلەنگێ، بەڵام ناکەوێ، واتا تەعادوولی خۆی رادەگرێ، وەک لەنگەر گرتنی ئاکرۆباتکار لەسەر پەت یان لەنگەر گرتنی کەشتی لەسەر ئاو. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها لەنگەرە lengere هەیە بە مانای "پاندۆڵ".

**لەنگەری lengerî** [ *langarī* ] - "1- قاپی گەورە و پەل، سینی 2- هەر شتێکی خڕ و گرۆڤەر 3- شەپکە بە دەورەوەو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< (IE.) *kleng-** "با دران، خوار بوون(ەوە)". هێندێک وشەی ژێرمەنی لەم ریشەوە هاتون، وەک Gelenk (G.) "جومگە" [شوێنی خواربوونەوەی ئێسکەکان]، schlank (G.)، hlanc (OE.) "شل و مل، زراڤ"، (h)lence (OE.) "ئاڵقەی زنجیر"، lenken (MG.) "خوار کردن(ەوە)، با دان(ەوە)"، hlykkr (OIs.) "خواری".

**لەنگین lengîn** [ *langīn* ] - "شەلین، بەم لا و ئەولادا خوار بوونەوە": خلنگین xılıngîn یش دەگوترێ. لنگیدن langīdan (P.). ئەم کردارە لە لەنگ leng وەرگیراوە، بە مانای "شەل". خزمە دەگەڵ link (G.) "چەپ"، linc (MG.) و link (Sw.) "چەوێل، شەل" و linka (Sw.) "لەنگین، شەلین"، slinka (Sw.) "بەلادا هاتن، لەترە دان"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *(s)leg-, *(s)le(n)g-** "شل بوون، بێهێز بوون". وەک لە سەرەوە دەبینرێ، دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی link بە مانای "چەپ" بەکار دەهێنرێ کە پێشتر بە مانای "شەل، چەوێڵ" بووە. پێوەندی دوو چەمکی "چەپ" و "چەوێڵ" دە زمانی کوردمادیشدا ئاشکرایە، چونکوو وشەکانی "چەوێڵ" و " شەپڵە" دەچنەوە سەر وشەی "چەپ" بە مانای خوار.

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەند وشەیەک هەن کە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *kleng-* "با دران، خوار بوون(ەوە)". هێندێک لەم وشانە بریتین لە Gelenk (G.) "جومگە" [شوێنی خواربوونەوەی ئێسکەکان]، schlank (G.)، hlanc (OE.) "شل و مل، زراڤ"، (h)lence (OE.) "ئاڵقەی زنجیر" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ جومگەی لەش]، lenken (MG.) "خوار کردن(ەوە)، با دان(ەوە)"، hlykkr (OIs.) "خواری". لەو باوەڕە دام کە ریشەی ئەم وشانە دەگەڵ ریشەکەی سەرەوەتر لە پێوەندیدا بێ و دە پلەیەکی دوورتردا بگەنەوە یەکتر. ئاشکرایە لەنگین [شەلین] جگە لە خوار بوونەوەی لەش لە کاتی رۆیشتن بەم لا و ئەو لادا چیتر نییە. دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "لەنجە و لار". لەنجە دەچێتەوە سەر "لەنگین" و لاریش مانای "خوار" دەبەخشێ. لێرەوە دەردەکەوێ کە هەموو ئەو وشانەی سەرەوە دەتوانن دواجار سەر بە ریشەیەکی هاوبەشن بن. هەروەها جێی ئاماژە کردنە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑لێژ lej بە مانای "خوار" دەگەڵ وشەکەی زمانی ئیسلەندی کۆن واتا hlykkr (OIs.) "خواری" و ریشەی *(IE.) *(s)leg-* نیزیکی نیشان دەدا و لەوانەیە ئەو وشە کوردمادییەش سەر بەم خێزانەوشەیە بێ].

**لەنگێز(ە) lengez(e)** [ *langez(a)* ] - "قوڕ و چڵپاو": خزمە دەگەڵ ↑لەی *ley* "قوڕ و چڵپاو" و ↑لینجاو lîncaw.

**لەولەو lewlew** [ *lawlaw* ] - "لوورەلوور". هەروەها ↑لەپ لەپ leplep هەیە بە مانای "دەنگی وێک کەوتنی تیغ و شمشیر":

1- لەوانە خزم بن دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑غەڵبە ġelbe دا باس کراون [غەڵبەغەڵب]. لەم دوخەدا دەشێ فۆتیمی سەرەتای وشەکە سوابێتەوە.

2- یان لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑لەوت2 lewt 2 "دەنگ، هەرا، چەقە".

**لەوار lewar** [ *lawār* ] - دەگەڵ "لەق" دێ [لەق و لەوار leq u lewar]. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *(s)lep- , *(s)lab-** "شل، شۆڕ، داهێزاو، داکەوتوو". هێندێک لەم وشانە بریتین: ↑لێو lew، ↑لاو *law*، ↑لاواز lawaz، ↑لەوەند lewend، ↑لاوێن lawen و هتد.

**لەواسە lewase** [ *lawāsa* ] - "بەری دەست، بەری پێ": خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep "بەری دەست".

**لەوت1 lewt** [ *lawt* ] - "پیس کردن": هەروەها لەوتان lewtan "پیس بوون" و لەوتاندن lewtandın "پیس کردن"یش بەکار دێن. خزمە دەگەڵ الوودن alūdan (P.) [ā-lūdan ] "پیس بوون، پیس کردن". وشە فارسییەکە بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 48) دەچێتەوە سەر ریشەی **< (IE.) *leu-** "پیس، قرێژ، پیس کردن" و بۆ وێنە خزمە دەگەڵ polluō (L.) "لەوتاندن، لەکەدار کردن" و lutum (L.) "لەجەن، کوود". وشەی لوث lawθ (Arb.) "پیس، لەوت" پێوەندی بە وشە کوردمادییەکەوە هەیە و دەشێ لە وشە کوردمادییەکە وەرگیرابێ.

[تێبینی: لەوانەیە ئەم ریشەی سەرەوە پێوەندی هەبێ بە ریشەی *(IE.) *lei-* "لیتە و لەجەن" و بەم جۆرە ببێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک لم lım "خیزی ورد"].

**لەوت2 lewt 2** [ *lawt* ] - "دەنگ، هەرا، چەقە": [لەوت لەوت واتا چەقەچەق، حەپەحەپ]. خزمە دەگەڵ laut (G.)، (h)lūt (OG.)، luid (Nl.)، loud (E.) "دەنگی بڵیند، توند، بڵیند (بۆ دەنگ)، Laut (G.) "دەنگ"، lauten (G.)، (h)lūtan (OG.) "دەنگ لێ هاتن، زرینگانەوە، دەنگ و سەدا لێ هەستان"، سەر ریشەی **< (IE.) *kleu-** "بیستن، گوێ گرتن". مانای بنەرەتی وشەکانی سەرەوە ئاماژە بە شتێک دەکا کە دەبیسترێ، واتا دەنگ.

**لەوتک lewtık** [ *lawtık* ] - "زاربێنی بێچوو": خزمە دەگەڵ ↑لەوس lews.

**لەوج lewc** [ *lawj* ] - "گەوج": لەودە lewde ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لێوە lewe "شێتۆکە".

**لەوچە lewçe** [ *lawča* ] - "1- قەوچە 2- قسەی نارەوان": [هەر لەوچە لەوچییەتی]. خزمە دەگەڵ ↑لەودە2 lewde 2 "گاڵتەباز".

**لەوح lewĥ** [ *lawĥ* ] - "دەپ، تەختە": دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *lēp-** "لەپی دەست، پەرەی شان، رووبەری سەوڵ و بێل و هتد". ↑لەپ lep "بەری دەست"، ↑لەپە lepe "نۆکی تەخت کراو"، ↑لاپیتە lapîte [لابیتە] "بێڵچە، ئاسنی پان".

**لەودە1 lewde 1** [ *lawde* ] - "لێوە، لەوج، گەوج": بڕوانە ↑لەوج lewc "گەوج".

**لەودە2 lewde 2** [ *lawde* ] - "گاڵتەباز": لودە loude (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەوت2 lewt 2 "دەنگ، هەرا، چەقە".

[تێبینی: وشەی "گاڵتە"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەنگ، هەرا". هەروەها "گەپ" و "جەفەنگ" دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم کردنەوە" [دەم لێکدان]. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە ئاستی نزم بوونی ئەو قسانە دەکەن کە لە کاتی گاڵتە و گەپدا دەگوترێن،

واتا قسەکان جیددی و شیاوی تێرامان و هەڵوەستە کردن نین، بەڵکوو تەنیا ئەرای خۆشی و شۆخی دەگوترێن. دە زمانی ئەڵمانیدا schwatzen (G.) مانای "گەپ لێدان" دەدا و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "دەنگ و سەدا لێ هەستان، قاوەقاو کردن، غەڵبەغەڵب کردن"دەکا، plätschern (G.) "گەپ لێدان" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە دەنگێک دەکا کە لەکاتی بەر بوونەوەی شتی قورس بۆ ناو ئاو دروست دەبێ، plaudern (G.) "خۆش و بێش (قسە) کردن" دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگ و هەرایەکە و خزمیشە دەگەڵ "فلْتە"ی کوردمادی. هەروەها quatschen (G.) "قسەی قۆڕ گوتن، فشقیات گوتن" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە دەنگێک دەکا کە لە ناو قوڕ و چڵپاو دا دروست دەبێ، وەک جلْقە یان فلْقە. هەروەها ئەگەر تەماشای هێندێک وشەی وەک "فشقیات" و "تڕڕەهات" بکەین، دەبینین کە ئەمانیش دە بنەڕەتدا ئاماژە بە جۆرێک "دەنگ و هەرا" دەکەن].

**لەوس lews** [ *laws* ] - "لێوی شوڕ و داکەوتوو": ↑لیچ lîç یش دەگوترێ. هەروەها لەوسن lwesın هەیە بە مانای "لچ و لێوشۆڕ". لوچە lūče (P.)، lefze (G.)، lefs (OG.) "لێو، لێوی ئاژەڵ".

**لەوە lewe** [ *lawa* ] - "چڵپاو، قوڕی شل": خزمە دەگەڵ ↑لم lım و هەروەها لای lay (P.) "قوڕ و چڵپاو". هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لەهی lehî "لافاو" [قوڕ و چڵپاوی لافاو؟].

**لەوەڕ lewer** [ *lawar* ] - "گیای خواردنی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ Laub (G.)، loub (OG.)، lof (OS.)، leaf (E.)، läf (OF.)، laufs (Gt.) "گەڵای داران"، سەر بە ریشەی ***leu-** < (IE.)* "لێکردنەوە، رنینەوە، داپچڕین". ناو لێنانی گەڵا دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بەم شێوەیە، لەبەر ئەوە بووە کە گەڵا لێ کراوەتەوە و داڕنراوە و کراوەتە خواردنی مەڕ و ماڵات. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لێرین lerîn و چەندی وشەی دیکە.

**لەوەڕین lewerîn** [ *lawarīn* ] - "گیا خواردنی ئاژەڵ": ↑لەوەڕ lewer.

**لەوەند lewend** [ *lawand* ] - "1- قامیشی باریک 2- جوانچاک، شوخ و شەنگ": لەڤەند levend یش دەگوترێ. بە هەر دوو ماناکەیەوە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە شلک بوون، ناسک بوون، راژان و لەرینەوە دەکەن، وەک↑ لڤین lıvîn "راژان"، ↑لاوێن lawen "چلەبی، نەمامی بی"، ↑لاو *law* "جەوان، گەنج" و هتد.

**لەه leh** [ *lah* ] - "پاژ، لەت، تیکە": خزمە دەگەڵ ↑لەت let. هەروەها لێ le هەیە بە مانای "پلیخاو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ لە leh (P.) و لهیدە lehīde (P.) "پان و پلچ، پلیخاو".

**لەهەز lehez** [ *lahaz* ] - "مۆخل، هێلەکە": دەشێ پێوەندی بە ↑هێلەکە heleg ەوە هەبێ.

**لەهەک lehek** [ *lahak* ] - "گۆریچە": خزمە دەگەڵ ↑لووهین luhîn "نەقەب، رێی بن هەرد".

**لەهی lehî** [ *lahī* ] - "لافاو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑لەیشۆ leyşo "قوڕاو" و ↑لێشاو lêşaw "سێڵاو". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Lache (G.) "زەلکاو"، Lake (E.) "گۆل، دەریاچە"، la kr (OIs.) "جۆگە"، logr (ON.) "دەریا"، loky (OSl.) "ئەستێرک"، lacus (L.) "دەریا"، lákkos (Gr.) "چاڵ"، سەر بە ریشەی ***leg-** < (IE.)* "دەڵان، دلۆپان".

2- ↑لەوە lewe "قوڕ و چڵپاو".

**لەهێرت lehert** [ *lahert* ] - "بەهێز": لە + هێرت hert + le. داڕشتنی وشەکە وەک ئەم وشانەی خوارەوەیە: لەگەشە، لەبار، لەشەڕ، لەقەست و هتد. هێرت hert شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خورت *xurt* "هێز، سەختی" و ↑خار xat "سەخت". ئەم شێوەیە لە شێوەی ژێرمەنی وشەکە دەچێ، بۆ وێنە hart (G.) "سەخت، پتەو".

لەی **ley** [ *lay* ] - "بەرە، پەڵاس": دەشێ خزم بێ دەگەڵ lein (.G)، līn (.OE) و lein (.Gt) "پەڕۆی کەتان" و Leine (.G) "دەزووی ئەستوور، پەت"، سەر بە ریشەی ***(.IE) *līno- >*** "لۆکە، کەتان". linum (.L) "کەتان"، linea (.L) "دەزوو" لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Linie (.G) "خەت، (خەت)ی سنوور، خەت (ی هەوایی)، ئاراستە، دێڕ، هێڵ، خەت(ی دەوروبەر)" و Lineal (.G) "خەتکێش" لە وشە لاتینییەکە وەرگیراون. دە زمانی کوردیدا وشەی ↑لۆنە lone "تاڵ، داو، دەزوو" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و هەروەها لەوانەیە ↑لۆنگ long "1- فۆتە 2- رایەخ"یش لەم پێوەندییەدا جێ بگرێ.

[تێبینی1: سەبارەت بە پێوەندی چەمکی "فۆتە و رایەخ" دەگەڵ "دەزوو، تاڵ، لۆکە" دەتوانین دەگەڵ وشەی "پەلاس" بەرهەڤی بکەین. تێبینی 2: لەژێر وشەی "سنوور"دا باس کرا کە ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی بە Schnur (.G) "دەزوو"ەوە هەبێ. پێوەندی ئەم دوو چەمکە دەگەڵ یەکتر دە وشەی Linie (.G) دا دەردەکەوێ کە دە ریشەدا ماناکەی "دەزوو"یە و لەمەوە ماناکانی "خەت، (خەت)ی سنوور، جەخز و کەوشەن"یش پەیدا بوون].

لەیر **leyır** [ *layır* ] - "1- زارۆی ساوا 2- شینکەی تازەڕوواو 3- جوجکەمەلی تازە لە هێلکە دەرهاتک": لەیرک leyrık یش دەگوترێ بە مانای "بێچووی ئاژەڵ، زارۆی ساوا". دەچێتەوە سەر ریشەی ***(.IE) *lei- >*** "کز و لاواز بوون، لەناو چوون، ون بوون". وشەی ↑لەڕ ler یان ↑لەجەر lecer پێوەندی بەم ریشەوە هەیە. هەروەها ↑لوولە2 lule "بێچووی ورچ و بەراز"، ↑لەیر leyır "زارۆ، بێچوو" و ↑رۆڵە role [لۆلە lole] پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: لەنێوان چەمکەکانی "چکۆڵە، کز، لاواز" و "لە کزی دان، لەناو چوون، ون بوون" پێوەندی هەیە. نموونەیەکی دیکە لەم پێوەندییە لەم وشانەی خوارەوەدا دەبینین: "کچ" (کیژ)، "گچکە"، "کز"، "کاس"، "کوژانەوە" و "کوشتن". هەموو ئەم وشانە پێکەوە خزمن].

لەیزین **leyzîn** [ *layzīn* ] - "1- هەڵپەڕکێ کردن 2- کایە کردن": لەیستن leystın و لیزین lîzîn و لەهیستن lehîstın یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ leih (.OG) "ئاوان، یاری"، laiks (.Gt) "سەما" laikan (.Gt) "هەڵبەزین، هەڵپەڕین"، lāc (.OE) "کایە، شەڕ"، leika (.OIs) "کایە کردن، سەماکردن"، leichen (.MG) "خۆ هەڵاویشتن، کایەکردن"، lingid (.OIr) "هەڵدەپەڕێ، هەڵدەبەزێ"، سەر بە ریشەی ***(.IE) *leig- >*** "خۆ هەڵاویشتن".

لەیشۆ **leyşo** [ *layšo* ] - "قوڕاو": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لەهی lehî "لافاو".

لەیلان **leylan** [ *laylān* ] - "چۆل، دەشت": لێلات lelat یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑لێڕ ler "جەنگەڵ".

لەیلانۆک **leylanok** [ *laylānok* ] - "گوڵێکی رەنگ پەمبەیی تۆخ": دەشێ پێوەندی بە ↑لێل lel ەوە هەبێ، کە ئاماژە بە رەنگی تاریک دەکا.

لەیم **leym** [ *laym* ] - "چڵک، پیسی": هەروەها لەیمن leymın هەیە بە مانای "چڵکن، گەمار". لەیم و لێشە leym û lêşe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەوت1 lewt "پیس کردن".

لیان1 **lîyan** [ *līyān* ] - "تەنراوی لە شووڵ بۆ رۆیشتن بەسەر بەفردا": شێوەیەکی دیکە لە ↑لاکان *lakan* یان لەهان lehan و دواجار خزمە دەگەڵ ↑شێلهان şêl(e)han "راخوشین" [خوشین بەسەر بەفردا].

لیان2 **lîyan** [ *līyān* ] - "راژان، لەرینەوە": شێوەیەکی سواوەیە لە ↑شڵەقان şıleqan.

[تێبینی: لە هەر دوو وشەی لیان1 و لیان2 دا فۆتیمی سەرەتای وشەکە سواوەتەوە].

**لیاو lîyaw** [ *līyāw* ] - "لینجاو، لوعاب": لی + ئاو lî(y) + aw. "لی" خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە "لیچق بوون" دەکەن، وەك ↑لەی ley "قوڕ و چڵپاو"،↑ لیچق lîçıq، ↑لینج lînc، ↑لووس lus و هتد. ئەم وشانە دواتر دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەك وشەی دیکە وەك چڵم çılım، جڵقە cılqe، ↑زلچە zılçe سەر بە ریشەی (IE.) *(s)lei- > "تەڕ و لیچق بوون، خلیسك، لووس".

[تێبینی: وشەی لعاب luɛāb (.Arb) دیارە وشەیەکە لە زمانی کوردمادی یان فارسی وەرگیراوە. کەرتی یەکەمی وشەکە شێوەی گۆڕدراوی وشەی لی -(lî(y یان ↑لەی ley یە، واتا "لیچق". کەرتی دووەمی وشەکەش -ab واتا "ئاو"ە. بەم جۆرە وشەکە دە بنەڕەتدا هەمان "لیاو"ی کوردمادییە.

**لیپ lîp** [ *līp* ] - "لێو": وێنەیەکی کۆنترە لە ↑لێو lew. "لیپاولیپ" پڕ کردن واتا دەڤرێك تا سەر لێوان پڕ کردن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ Lippe (.G) "لێو، لیچ".

**لیپاو lîpaw** [ *līpāw* ] - "شەپۆلی چەم": خزمە دەگەڵ ↑لافاو lafaw "بەرزبوونەوەی ئاو".

**لیت1 lît 1** [ *līt* ] - "فێڵ، گزی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ List (.G)، lists (.Gt)، list (.OE)، (.Sw) "فێڵ، گزی"، سەر بە ریشەی (IE.) *l(a)is- > "زانین". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑لاس[5] las هەیە بە مانای "فریو" [لاس دان واتا خاپاندن].

**لیت2 lît 2** [ *līt* ] - "ئاغەڵ": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لیز[2] lîz "پەناگا، پەسیو".

**لیتك lîtık** [ *lītık* ] - "پەڕین، باز دانی بە تەوژم": خزمە دەگەڵ ↑لەیزین leyzîn "1- هەڵپەڕکێ کردن 2- کایە کردن".

**لیتە lîte** [ *līta* ] - "لەجەن، قوڕی نیشتوو": خزمە دەگەڵ Letten (.G)، letto (.OG) "لیتە"، letja (.Is) "لم، قوڕ، پیسی"، laith (.Mir) "باتلاق، زۆنگ"، llaid (.Kymr) "لەجەن، قوڕ وچلپاو"، سەر بە ریشەی (IE.) *lat- > "تەڕ، زەل".

**لیتەك lîtek** [ *lītak* ] - "بێچارە، بێنەوا": خزمە دەگەڵ ↑لات lat.

**لیچ1 lîç 1** [ *līč* ] - لەوچ lewç یش دەگوترێ. لوچە lūče (.P) [لب و لوچە (.P)]، شێوەیەکی دیکە لە ↑لەوس lews.

**لیچ2 lîç 2** [ *līč* ] - "1- میوەی کوتراو 2- لیچق، لنج": دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑لیچق lîçıq، ↑لینج lînc، ↑لەژم lejm، دەچێتەوە سەر ریشەی (IE.) *(s)leg- > "تەڕ، لووس و لیچق بوون".

**لیچاڵ lîçal** [ *līčāl* ] - "مرەببا": ریچاڵ rîçal یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لیچ2 lîç 2 "1- مێوژی کوتراو 2- لیچق، لینج ".

**لیچار lîçar** [ *līčār* ] - "مەتەڵ، لەگەز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەگەز legez "مەتەڵ"، دە بنەڕەتدا واتا شتی داخراو، سەربەستە". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لۆچ loç [چرچ و لۆچ]، سەر بە ریشەی (IE.) *lug- > "چەمان(ەوە)، سووڕان". لەم مانایەوە دواتر مانای "داخران، قفڵ بوون" پەیدا بووە، لەم بارەوە بڕوانە ↑*لووهین luhîn*.

**لیچق lîçıq** [ *līčıq* ] - "تەڕ و لووس": خزمە دەگەڵ ↑لم lım. وێ دەچێ لزج lazij (.Arb) لەم وشەوە وەرگیرابێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ لیز līz (.P) "لووس".

**لیخن lîxın** [ *līxın* ] - "قوڕاوی": دەشێ پێوەندی بەو ریزەوشەوە هەبێ کە باس لە چلك، چلپاو، قوڕ و لیتە دەکا، وەك ↑لێش lêş "چڵك، ژەنگ "، ↑لاس las "شیاکە" و هیتر، سەر بە ریشەیەك بە مانای "تەڕ و لیچق بوون".

**لیر lîr** [ *līr* ] - "زیپکەی پان": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەك وەك ↑*لێرین lerîn* "تێکول لێکردنەوە"، سەر بە ریشەی سەر بە ریشەی (IE.) *leu- > "رنینەوە، لێکردنەوە، داڕنین". ئەم جۆرە زیپکەیە دەشێ زۆر بخورێ و بکرێندرێ. هەر بۆیە ناوەکەی لە ریشەیەوە هاتووە بە

مانای "ڕنین، پچڕین". لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *لەپەر* "زیپکەی بەژان" و *بیرۆ* "نەخۆشییەکی خووروداری پێست" کە ئەوانیش ریشەکانیان ئەو مانایەی سەرەوە دەدا.

**لیرد lîrd** *[ līrd ]* - "تلّتە، تلّپە": خزمە دەگەڵ ↑لێر ler "لیک، ئاوی دەم".

**لیرە lîre** *[ līra ]* - "یەکەی پووڵ": لە زمانی ئیتالیایی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر *libra* > *(L.)* "تەرازوو، وەزنکراو".

**لیز[1] lîz** *[ līz ]* - "هەڵپەڕکێ":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑لەیزین leyzîn " کایەو یاری کردن". [لیزین lîzîn یش دەگوترێ]. ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا هەم بە مانای "کایە" و هەم بە مانای "سەما و هەڵپەڕکێ" بەکار هاتووە، بۆ وێنە leih (OG.) "ئاواز، یاری"، laik (Gt.) "سەما"، lāc (OE.) "کایە، شەڕ"، leika (OIs.) "کایە کردن، سەما کردن"، leichen (MG.) "خۆ هەڵاویشتن، کایە کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *leig- (IE.)*** "خۆ هەڵاویشتن".

2- یان دەنا خزمە دەگەڵ ↑لۆخان loxan "بەزم وشایی"، سەر بە ریشەی **< *lek- (IE.)*** "لاق کوتان، خۆ هەڵاویشتن".

[تێبینی: دوور نییە ئەم دوو ریشەیەی سەرەوە دواجار پێکەوەو خزم بن].

**لیز[2] lîz** *[ līz ]* - "پەناگا، پەسیو": ↑لیزگە lîzge ش دەگوترێ. هەروەها لەوانەیە ↑لیت[2] lît "ئاغەڵ"یش پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- luschen (OG.) "خۆ مات دان"، luzen (OG.) "شاراوە بوون، حەشاردراو".

2- ↑لان lan "پەناگای ئاژەڵ".

**لیزک[1] lîzk** *[ līzk ]* - "تیشک، تیرۆژ": خزمە دەگەڵ ↑رۆژ roj.

**لیزک[2] lîzk** *[ līzk ]* - "داوی بادراو، گشتەک":

1- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑لیژگ lijg "هەودا، بەن".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑لێژنە lejne و چەندین وشەی دیکە کە مانای "هاوبەندی و پێکەوەبوون" دەدەن.

**لیسک[1] lîsk** *[ līsk ]* - "تیشکی رۆژ کە لە کولانەوە دێتە ژوور": ↑لیزک lizk.

**لیسک[2] lîsk** *[ līsk ]* - "داری راهەنگیوراو کە مریشک و قەل شەوانە لەسەری هەڵدەنیشن": لیزک lîzg یش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لەقاندن leqandın [دالەقاندن daleqandın "هەڵاوەسین"].

**لیسکە lîske** *[ līska ]* - "ئامرازی لووس کردن": خزمە دەگەڵ ↑لووس lus.

**لیشامە lîşame** *[ līšāma ]* - "پووش و چرپی سەر خانوو": وشەیەکی دیکە کە لە زمانی کوردمادیدا هەر ئەم مانایە دەبەخشێ، ↑هەڵاش helaş ە [یان ئالاش alaş (a-laş)].ئەم وشەی دوایی پێک هاتووە لە پێشگری هە he یان ئا a و هەروەها بنجی لاش laş-. ئەم بنەوشەیە لە وشەی لیشامە lîşame شدا بە جۆرێکی دیکە خۆ نیشان دەدا، دەشێ خزم بێ دەگەڵ Last (G.)، (h)last (OG.)، last (Nl.)، last (E.) "بار" و هەروەها دەگەڵ ↑لۆدە lode ی کوردمادی سەر بە ریشەیەک بە مانای "وەسەر یەک نان، کەڵەکە کردن، هەڵچنین".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە لیشامە یان هەڵاش دەگوترێ "انبیره". ئەم وشە فارسییە پێک هاتووە لە پێشگری "ان" و بنجی "بیره". بنەوشەکە خزمە دەگەڵ "بار"، واتا هەر ئەو مانایە دەبەخشێ کە وشەکانی سەرەوە هەیانە. وشە فارسییەکەش ئاماژە دەکا بە چەمکی "وەسەریەک نان و کەڵەکە کردن" یان بە وتەیەکی دیکە "بار کردن"ی سەر خانوو].

**لیشتۆك lîştok** [ *lîştok* ] - "تەماحکار": بنجی وشەکە لیشت -lîşt ە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Last (G.)، (h)last (OG.)، last (Nl.)، last (E.) "بار". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑لۆدە lode ی کوردمادی سەر بە ریشەیەك بە مانای "وەسەر یەك نان، کەڵەکە کردن، هەڵچنین". لەم تێروانینەوە "لیشتۆك" دەبێتە کەسێك کە شت یان پارە و پووڵ وەسەر یەك دەنێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لیشامە lîşame و ↑هەڵاش helaş [ he-laş ] "پووش و چرپی [وەسەر یەك نراوی] سەر خانوو".

**لیف lîf** [ *līf* ] - "داوا کردن، خواستن": هەروەها لیفۆك lîfok هەیە بە مانای "خوازەلۆك، گەداسفەت": خزمە دەگەڵ ↑لاڤایی lavayî "پاڕانەوە".

["لیف" بە مانای "داوا کردن، خواستن" دە بنەڕەتدا خزمە دەگەڵ love (E.) "حەز، حەز کردن". لەم لاشەوە وشەی "حەز" دەبێتە خزم دەگەڵ ask (E.) بە مانای "داوا کردن"].

**لیفاندن lîfandın** [ *līfāndın* ] - "هەڵدان و بەرز بوونەوەی گیا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Luft (G.)، lyft (OE.)، luftus (Gt.) "هەوا". ریشەی ئەم وشەیە بەتەواوی ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام وا بیر دەکرێتەوە پێوەندی هەبێ بە وشەیەکی دیکە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا کە بە مانای "سەرەوە، قاتی سەرەوە، لای سەرەوە" بەکارهاتووە، بۆ وێنە lopt (ON.). lüften (MG.) و lift (E.) "بەرز کردنەوە". ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. وشەکوردمادییەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑ لافاو lafaw [لاف + ئاو] "سێڵاو، بەرزبوونەوەی ئاو".

**لیقن lîqın** [ *līqın* ] - "لجق، لیچق": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ↑ لیخن lîxın "قوڕاوی".

**لیقە lîqe** [ *līqa* ] - "تریقەی پێکەنین": لیقەلیق [lîqelîq]. خزمە دەگەڵ lachen (G.)، (h)lahhan (OG.)، hlahjan (Gt.)، laugh (E.)، klakka (OIs.) "کەنین، پێکەنین"، سەر بە ریشەی **< *kleg-** (IE.) "قیژاندن، هەرا کردن" و دوورتریش سەر بە ریشەی **< *kel-** (IE.) "بانگ کردن، هەرا کردن". هەروەها بڕوانە ↑لاس[4] las.

**لیڤا lîva** [ *līvā* ] - "بەرخی ساوا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Lamm (G.) و (Sw.)، lamb (Gt.) "بەرخ". ریشەی ئەم وشە ژێرمانییە ساخ نەکراوەتەوە. وەك دەزانرێ فۆتیمی m زۆرجار دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە v یان w.

2- ↑لاو law "جەوان". [پێوەندی "لیڤا " و" لاو" دەتوانێ هەروەك پێوەندی "کار" (کاریلە) و "کوڕ" بێ].

**لیك1 lîk** [ *līk* ] - "ئاوی دەم": خزمە دەگەڵ leken (NL.) و leka (OIs.) "دەڵاندن، دڵۆپاندن، تکانەوە"، سەر بە ریشەی **< *leg-** (IE.) "دڵۆپان، تکان، دەڵاندن". هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ liquidus (L.) "ئاوەکی، تراو"، liquere (L.) "ئاوەکی بوون، شل بوون".

**لیك2 lîk** [ *līk* ] - "قاشی میوە": خزمە دەگەڵ ↑لەت let.

**لیکە lîke** [ *līka* ] - "شینکەی تورت و تیراو": خزمە دەگەڵ ↑لیك2 lîk "قاشی میوە" و ↑*لێریزl lerın* "تیکول لێکردنەوە".

**لیلك1 lîlık** [ *līlık* ] - "کۆرپەی ساوای شل و ول": خزمە دەگەڵ ↑لوولە[2] lule "بێچووی ورچ و بەراز" و رۆڵە role [گۆڕانی L بۆ r].

**لیلك2 lîlık** [ *līlık* ] - "جۆرێك قامیش کە بۆ قەڵەم دەبێ": خزمە دەگەڵ ↑لوولە[1] lule "بۆری".

**لیم lîm** [ *līm* ] - "1- لم 2- کێم، چڵکی برین 3- چڵك": هەروەها ↑لێم lem هەیە بە مانای "لیتە، قوڕی شل". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*لم lım*. وێ دەچێ هەموو ئەم وشانە دە بنەڕەتدا یەك وشە بوون و دواتر بوونە وشەی جیاواز و مانای جیاوازیان وەرگرتووە.

**لیمه lîme** [ *līma* ] - "پارچەگۆشت": دەشێ پێوەندی هەبێ بە lamella (.L) "تەڵەزم، تەڵاش، تیکەیەکی تەنک".

**لیندوو lîndu** [ *līndū* ] - "گرێ و گوڵی ناو تراو": لندوو lındû ش دەگوترێ. هەروەها ↑لنگوو lıngû هەیە بە مانای "گوتکەهەویر کە بۆ هەویرترش هەڵ دەگیرێ". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑لوو lu "غودده، تومۆر" [دە بنەڕەتدا: چەماوە، خڕ، زۆپ].

**لینگ lîng** [ *līng* ] - "لاق، قاچ": لنگ leng (.P). دە فارسیدا هەروەها لنگ long (.P) هەیە بە مانای "فۆتە" و ڕەنگە مەبەست ئەوە بێ کە ئەو پەڕۆیە لە ناوقەد بە خوارەوە واتا "لینگەکان" دادەپۆشێ [وەک "دەرپێ"، "دوولینگە"]. خزمە دەگەڵ Gelenk (.G) "جومگە"، (h)lanca (.OG) "جومگەی سمت" [دە بنەڕەتدا شوێنێک کە دەنووشتێتەوە]، lenken (.MG) و hlencan (.OE) "با دانەوە، نووشتانەوە"، hlence (.OE) "دەنگەکانی زنجیر"، hlanc (.OE) "شلومل، بەلەنجە" [دە بنەڕەتدا شیاوی نووشتانەوە]، hlykkr (.OIs) "خواری، چەماوی"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *kleng-** "نووشتانەوە، با دران".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ هێندیک وشەی وەک شەق، چۆک، زەنگە "لای خوارەوەی لاق"، زەنگی "گوێزینگ"، "زەنگاڵ" و دە زمانی فارسیدا "ساق". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > *(IE.) *(s)keng-* "خوار و خێچ (بوون)"].

**لینگە lînge** [ *līnga* ] - "تا، هاوتا" [وەک لینگەکەوش]. دەچێتەوە سەر↑ لینگ lîng "لاق، قاچ". هێندێک شت کە لە دوو تا [هاوتا] پێک دێن، بە دوو لینگی مرۆڤ چوێنراون کە هاوتای یەکترن. لەوانەشە وشەی لینگە دە بنەڕەتدا بۆ دانەیەک "کەوش" بەکار هاتبێ کە پێوەندی بە "لینگ"ەوە هەیە [لینگەکەوش] و دواتر مانایەکی گشتی وەرگرتبێ، واتا ماناکە لە "تا، تاک، تەک"ەوە گۆڕاوە بۆ "هاوتا" و جووت.

**لێچ leç** [1] [ *leč* ] - "گۆلاو": خزمە دەگەڵ Lache (.G) " ئاوی وەستاو، زۆنگاو"، lake (.MG) "ئاوی وەستاو"، lacus (.L) "دەریاچە، گۆلاو"، laekr (.OIs) "جۆگە"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *leg-** "تکانەوە، دەڵاندن، دلۆپاندن".

**لێچ leç** [2] [ *leč* ] - "گومڕا، لاڕێ": لێچ بوون بە مانای "لاڕێ بوون" بەکار دێ. دەبێ دەبنەڕەتدا بە مانای "هەڵخلیسکان" هاتبێ و لەوێوە مانای "هەڵە کردن و لاڕێ بوون"ی وەرگرتبێ. [تێبینی: دە زمانی فارسیدا لغزش lağzeš (.P) مانای "هەڵخلیسکان" دەدا و لە هەمان کاتیشدا بە مانای "هەڵە و لاڕێ بوون" بەکار دێ]. لەم تێڕوانینەوە لێچ leç دەبێتە خزم دەگەڵ↑ لووس lus و لەوانەشە ↑لێژ lej.

**لێچکە leçke** [ *lečka* ] - "ڕووسەری ژنان": لچک lačak (.P). خزمە دەگەڵ Laken (.G) "مەلافە"، laken (.OS) "پەڕۆ، پێخەو، پەردە"، lahhan (.OG) سەر بە ریشەی **> (IE.) *lakna-** "پەڕۆ" و دوورتریش سەر بە ریشەی **> (IE.) *(s)leg-** "شل، شۆڕ، داهێزراو".

**لێڕ ler** [ *ler* ] - "دارستان": لێڕەوار lerewar یش دەگوترێ.

1-لەلایەکەوە دەشێ دەگەڵ ↑لێرین lerın و ↑لەوەر lewer خزم بێ و لەوانەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێنی لەوەڕاندن" هاتبێ یان بە مانای شوێنی ↑لاور lawr "ئاژەڵی وەحشی".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ loh (.G)، leah (.OE)، lūcus (.L) "جەنگەڵ، بێشەڵان"، laukus (.Lit) "زەوی و زار"، lo (.ON) "دەشت"، loka (.OIn) "شوێنی بەرئاواڵە".

**لێڕەوار lerewar** [ *lerawār* ] - "جەنگەڵ": ↑لێڕ ler.

**لێرین1 lerın 1** [ *lerīn* ] - "تێکول لێکردنەوە": ئەم وشەیە و چەند وشەیەکی دیکە دەتوانین دە یەک چوارچێوەدا شی بکەینەوە، وەک ↑لێنژ lenj "هێشووی دارِندراو" [فۆتیمی n تێخزاوە]، ↑لاخ lax "بە دەست دروونەوەی گیا"، ↑لیکە lîke "شینکەی تورت و تیراو"، ↑لەم lem "بڕکەمیوە، پنچکەگیا"، ↑لەوەر lewer. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ Laub (G.) "گەڵای داران"، lupti (Rus.)، lupitĭ (Lit.) "تێکوڵ کردن"، lapas (L.) "گەڵا"، lub (Rus.) "گەڵا"، lepo (Gr.) "تێکوڵ دەکەم"، سەر بە ریشەی **< *leu- (IE.)** "رنینەوە، لێکردنەوە، دارنین". وشەی ↑لەت *let* یش سەر بەم خێزانەیە.

**لێرین2 lerın 2** [ *lerīn* ] - "بالۆرە": خزمە دەگەڵ ↑لۆرین lorîn.

**لێز lez** [ *lez* ] - "1- خزم 2- بەندە، خولام": خزمە دەگەڵ Leute (G.)، liuti (OG.)، lēode (OE.) "خەلک، مەردم"، ljud (Rus.) "گەل"، سەر بە ریشەی **< *leud- (IE.)** "گەورە بوون، هەڵدان، پێگەیشتن". دە بنەڕەتدا مەبەست ئاماژە کردن بە پێگەیشتنی منداڵ و نەوەکان و بەگشتی وەچەکانی دواتر بووە.

**لێزک lezk** [ *lezk* ] - "دەڵانی تەڕایی لە لەش": لێزکن lêzkın واتا کەسێک کە زۆر عارەقە دەکا. خزمە دەگەڵ lacus (L.) "دەریاچە"، leck (G.) و (Nl.) "دەرزدار، ئاودەڵێن"، سەر بە ریشەی **< *leg- (IE.)** "دەڵاندن، تکان، دڵۆپان". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑لیک lîq "ئاوی دەم" و ↑لێشتۆک lêştok.

**لێزگە lezge** [ *lezga* ] - "مووروویی بە داوەوە کراو": خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne "پارچەداری لەسەریەک دانراو".

**لێزمە lezme** [ *lezma* ] - "بەخوڕ": [لێزمە باران واتا رێژنە باران]. خزمە دەگەڵ ↑لەزم lezm "شە، تەڕایی، قوڕ و چڵپاو" [لەژم lejm یش دەگوترێ]. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑لێزک lezk "دەڵانی تەڕایی لە لەش".

**لیژک lijg** [ *līžg* ] - "هەودا، بەن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ licium (L.) "بەن، دەزوو".

**لێژ lej** [ *lež* ] - "سەرەوژێری":

1- لەژێر وشەکانی ↑لەنگەری lengerî "1- قاپی گەورە و پەل، سینی 2- هەر شتێکی خڕ و گرۆڤەر 3- شەپکە بە دەورەوە" و ↑لەنگین lengîn "شەلین، خوار بوونەوە (بەم لا و ئەولادا)" ئاماژە بە ژمارەیەک وشەی ژێرمەنی کراوە، بۆ وێنە link (G.) "چەپ"، سەر بە ریشەی **< *(s)leg-, *(s)le(n)g- (IE.)** "خوار و خێچ (بوون)". شیاوی باسە کە وشەی "چەپ" خوێ خزمە دەگەڵ "شیو" و "نشێو" و هەروەها "شیب" دە فارسیدا بە مانای "لێژایی". لێژایی بریتییە لە رووبەرێکی خوار و هەر بۆیە زۆر رێی تێ دەچێ کە لەو ریشەوە وشەی "لێژ" دروست کرابێ و ژێرمەنییەکانیش وشەی link بە مانای "چەپ"یان دروست کردبێ. هەر دوو وشەی لێژ و چەپ دە بنەڕەتدا ئاماژە بە چەمکی "خوار، خواری" دەکەن، بە پێچەوانەی راست و راستان.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە hlykkr (OIs.) "خواری". ئەم وشە ئیسلەندییە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *kleng- (IE.)** "چەمانەوە، خوار بوون" و بۆ وێنە دەگەڵ ↑قەڵانگ qelang خزمە. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، ئەوا دە وشە کوردییەکەدا فۆتیمەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

3- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە لووس و لیز līz (P.) "خلیسک". لەم تێڕوانینەوە مەبەست دە بنەڕەتدا "هەڵخلیسکان" بووە و دواتر بووەتە "سەرەوژێری" و شوێنی هەڵخلیسکان.

لێژنە **lejne** [ *ležna* ] - "1- داری سووتەمەنی لەسەریەک دانراو 2- کۆمیتە، جڤات": دە زمانی کوردمادیدا کۆمەڵەوشەیەک هەیە، کە ئاماژە بە چەمکی "کۆمەڵ بوون، کۆ کردنەوە، لەسەریەک دانان" دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. چەند وشەیەک لەمانە بریتین لە ↑لێزگە lezge [یان لیزگە lîzge] "مووروویی بە داوەوە کراو"، ↑لەشکر leşkır "سۆپا" [دە بنەڕەتدا: ئاپۆڕەیەکی زۆر]، ↑لووش lûş "هێشوو"، ↑لێش lêş "بارەگیا"، ↑لاس las "کۆمای گزرە" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ lesen (G.) "خوێندنەوە". مانای بنەڕەتی ئەم وشە ئەڵمانییە "کۆ کردنەوەی شتی پەرژ و بڵاو" بووە، کە دە زمانە کۆن و نوێییەکاندا بەدی دەکرێ، وەک lisan (Gt.)، lesan (OE.)، lesa (OF.)، läsa (Sw.). ئەم وشانە خزمن دەگەڵ legere (L.) "خڕ کردنەوە"، lesti (Lit.) "دەنووک لێدان" [هەڵ گرتنەوەی دەنک و دان بە دەنووک]، leššai (Heth.) "کۆ کردنەوە"، سەر بە ریشەی < ***les-** ***(IE.)*** "هەڵگرتنەوە و کۆ کردنەوەی شتی پەرژ و بڵاو". لەم مانا بنەڕەتییەوە چەند مانای دیکە وەک "بە شوێن دا گەڕان، هەڵگرتنەوە، گوڵبژێرکردن، خوێندنەوە" سەری هەڵداوە. مانای "خوێندنەوە" دە زمانی ئەڵمانیدا بەم شێوەیە پەیدا بووە، کە کاری خوێندنەوە وەک "بە شوێن پیتەکاندا گەڕان" یان "شوێنی پیتەکان هەڵگرتن" لەبەر چاو گیراوە، هەروەک چۆن لە کاتی کۆ کردنەوەی شتی پەرژ و بڵاو دا شوێنی شتەکان دەگیرێ، هەڵدەگیرن و لە سەر یەک دادەنرێن. وشەی لێژنە گوازراوەتەوە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە لجنة lijna (Arb.) و بە مانای "کۆمیتە" بەکار دێ.

لێستنەوە **lestınewe** [ *lestınawa* ] - " زبان پێداخشاندن": لیسیدن līsīdan (P.). خزمە دەگەڵ lecken (G.)، lecchon (OG.)، liccian (OE.)، lick (E.) و likken (Nl.) "لێستنەوە"، سەر بە ریشەی < ***(s)leiĝh-** ***(IE.)*** "لێستنەوە". ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: leichein (Gr.)، lingare (L.) [فۆتیمی n ی تێخزاوە]، lizat (Rus.) "لێستنەوە".

لێسک **lesk** [ *lesk* ] - "تیخی کەوچک تاشین": ↑لیسکە lîske. هەروەها لێسکە leske هەیە بە مانای "ئامرازی دارکۆڵین".

لێسە **lese** [ *lesa* ] - "ماڵەی بەردین بۆ سواخ دان": خزمە دەگەڵ ↑لووس lus، چونکوو لە ڕاستیدا ئامرازەکە بۆ ساف و لووس کردن بەکار هاتووە.

لێش1 **lêş 1** [ *leš* ] - "بارەگیا": خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne.

لێش2 **lêş 2** [ *leš* ] - "چڵک، ژەنگ": لێشک lêşık یش دەگوترێ. هەروەها لێشکن lêşkın هەیە بە مانای "چڵکن". خزمە دەگەڵ ↑لاس las "شیاکە، ریخ".

لێشاو **lêşaw** [ *lešāw* ] - "سێڵاو": لێش lêş + ئاو aw. لووشاو lûşaw یش دەگوترێ.

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑لەز lez "خێرا". لەم تێڕوانینەوە لێشاو واتا ئاوی خێرا و تیژ.

2- یان خزمە دەگەڵ ↑لێژنە lejne و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "زۆر و زەوەندی، کۆگا بوون، خڕ بوونەوە" دەکەن.

لێشتۆک **lêştok** [ *leštok* ] - "تەماحکار": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ lechzen (G.) "سوێ بۆ شتێک چوون، تامەزرۆ بوون". ئەم وشە ئەڵمانییەدەچێتەوە سەر lechen (MG.) "وشک هەڵاتن" و خزمە دەگەڵ leken (Nl.)، leka (OIs.) "دەڵاندن، تکانەوە، دڵۆپان" [لیک هاتنە خوار؟]. وشە ژێرمەنییەکان خزمن دەگەڵ ↑لیک1 lîk 1 "ئاوی دەم".

لێفە **lefe** [ *lefa* ] - "پێخەو":

1- یان خزمە دەگەڵ Lappe (G.)، lappa (OE.)، lap (E.) و (Nl.)، lapp (Sw.) "پەڕۆ"، سەر بە ریشەی < ***(s)lap-, *(s)leb-** ***(IE.)*** "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزاو و داکەوتوو بوون". هەر

لەم ریشەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەکی دیکەش هەیە کە دیسان دەبێتەوە خزم دەگەڵ ”لێفە“ و ئەویش وشە بە مانای ”خەوتن“ە: schlaffen (G.)، sleep (E.)، slāf(f)an (Gt.)، slapen (Nl.) و هتد. بەم جۆرە لێفە سەرەتا چ بە مانای ”پەڕۆ“ بووبێ و چ پێوەندی بە چەمکی ”خەوتن“ەوە هەبێ، دەچێتەو سەر یەک ریشە. وشەکە گۆازراوەتەوە بۆ زمانی عەرەبی و کراوە بە لحاف laḥāf (Arb.). دە زمانی فارسیدا وشە عەرەبێنراوەکە بەکار دەهێنرێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەک کە مانای ”پێچان، (تێ)پێچان“ دەردەبڕن، وەک ↑لفا lıf [لەف lef] ”پێچ، پێچ دان“ و ↑لەفە lefe ”بابۆڵە“.

**لێق leq** [ *leq* ] - ”1- ماستی شل و خۆنەگرتوو 2- گۆشتی لەڕ و لیچق“: خزمە دەگەڵ ↑لیقن lîqın ”لجق، لیچق“ و لەوانەشە دەگەڵ↑ لیخن lîxın ”قوڕاوی“.

**لێک lek** [ *lek* ] - دەگەڵ ”لووس“ دێ [لێک و لووس lek u lus].

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بەو ریزەوشانە دە زمانە ئەورووپییەکاندا: gleich (G.)، gilih (OG.)، galeiks (Gt.)، gelīc (OE.)، like (E.)، (g)līkr (OIsl.)، lik (Sw.)، lygus (Lit.) ”وەکوو، هەمان شێوە، یەکسان“. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا پێک هاتوون لە دوو کەرتی -ga* و -līka* ”لەش، تەن، هەیکەل“. وشەکە دە بنەڕەتدا بەو مانایە بووە: ”هەمان شێوە و *لەش* هەبوون، یەکسان بوون“. بەراوردی ئەم وشانە بکە دەگەڵ ↑کەلاک kelak ”لەش، لاشە“ و ↑گوێلاک guwelak ”سەروسیما، شێوە“. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ *↑لەش leş*.

2- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑رێک rek [رێک و پێک]، دە بنەڕەتدا بە مانای ”راست“.

**لێل lel** [ *lel* ] - ”ناروون، تاریک و روون“: دە زمانی ئینگلیزیدا lilak (E.) و دە ئاڵمانیشدا lila (G.) ناوی جۆرێک گوڵی یاسەمەن و هەروەها ناوی رەنگێکی بنەوشە. ئەم وشە ئەورووپییانە بردراونەوە سەر nīlak / līlak (P.) و nilā (OIn.) ”تاریک، شینی تاریک“. لەوانەیە وشە کوردمادییەکەش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. وشەی لیل layl (Arb.) ”شەو“ لەوانەیە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەبێ.

**لێلان lelan** [ *lelān* ] - ”باڵۆرە، لەراندنەوەی دەنگ لە کاتی گۆرانی گوتندا“: ↑لێرین lerîn ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لەرینەوە lerîn(ewe).

**لێلێ lele** [ *lele* ] -”سەربەند یاخود ناوبەندی گۆرانی“: لۆلۆ lolo ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑لایلایی laylayî [لالایی lalayî].

**لێم lem** [ *lem* ] - ”لیتە، قوڕی شل“: بڕوانە ↑لم lım.

**لێنژ lenj** [ *lenž* ] - ”هێشووی داڕندراو“: خزمە دەگەڵ ↑لێرین lerın ”تیکول کردن“.

**لێو lew** [ *lew* ] - ”لیچ“: لب lab (P.). Lippe (G.)، lip (E.) و (Nl.)، labium (L.) سەر بە ریشەی *(s)lap- , *(s)leb- (IE.) > ”شل و خاو بوون، شۆڕ و داهێزاو بوون“.

**لێوار lewar** [ *lewār* ] - ”قەراخ“: وشەکە دەچێتەوە سەر ↑لێو lew. دە فارسیدا بۆ وێنە دەگوترێ ”لب رودخانه“ واتا لێواری چەم یان ”لب گور“ واتا لێو یان لێواری گۆڕ. مەبەست لە ”لێو“ دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە ”دەم، زار“ کردنەوەی شوێنێک کە چەم پێیدا تێ دەپەڕێ، یان دەم کردنەوەی قووڵاییەک وەک گۆڕ. ”لێو“ لێرەدا هاومانایە بۆ ”دەم“. دە زمانی کوردیدا هەروەها دەگوترێ ”لە دەم چۆم و ئاوان“. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑لێوان lewan ”پەرداخ، گلاس.

**لێوان lewan** ⌈ *lewān* ⌋ - "پەرداخ، گلاس": لیوان lîwan یش دەگوترێ. لیوان līwān (P.) دەچێتەوە سەر ↑لێو lew. وشەکە بە ئەسڵ وشەیەکی کوردمادییە. دە زمانی فارسیدا بە لێو دەگوترێ "لب" و هەر بۆیە وشەکە لە "لێو"ی کوردی وەرگیراوە.

[تێبینی: لەوە ناچێ لێوان لەبەر ئەوەی لێوی پێوە دەنرێ، ئەو ناوەی لەسەر دانرابێ. ئەوە کە چۆن ناوی شەربە، پەرداخ لە وشەی "لێو" وەرگیراوە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "قەپ" لەلایەک و "زەرف"، "دەفر" و "دەوری" لە لایەکی دیکەوە. وشەی "قەپ" دەچێتەوە سەر ریشەی *ĝebh-, *ĝeph- (IE.) "زار، دەم". وشەکانی zufr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ" لەم ریشەوە هاتوون، واتا ئاماژە بە شوێنێک یان شتێک دەکەن کە دەمی کردۆتەوە و بەم شێوەیە قووڵاییەک ساز بووە. وشەکانی "زەرف"، "دەفر" و "دەوری" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە و مەبەست شتی قووڵ (دەم داپچڕاو، زارک کراوە)یە. وشەی "زەرف"، زمانی عەرەبی لە "ژرف"ی فارسی وەرگرتووە، بەڵام وشە فارسییەکە خۆی دەچێتەوە سەر وشەکانی سەرەوە و فۆتیمەکانی جێگۆڕکێی کردووە ["زافر" (دەفر) ← ژرف]. دە زمانی کوردیدا فۆتیمی سەرەتای وشەکە گۆڕاوە بۆ d. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم وشانەی سەرەوە بڕوانە وشەی "کون". هەروەها بۆ هێندێک زانیاری دیکە بڕوانە "لێوار"].

**لێوە1 lewe** ⌈ *lewa* ⌋ - "شێت": خزمە دەگەڵ laffe (G.) "گەوج، نەزان". خزمە دەگەڵ ↑لێو lew و دواجار دەگەڵ ↑لاو *law* سەر بە ریشەیەک بە مانای "شل، خۆنەگرتوو، ناقائم".

[تێبینی: بە گوێرەی بۆچوونێک وشە ئەڵمانییەکە دە بنەڕەتدا واتا "دەم و لیچ شۆڕەوە بوو". بەڵام دەشکرێ وای لێک بدەینەوە کە مەبەستی وشەکە دە بنەڕەتدا کەسایەتییەکی "شل و خۆنەگرتوو" بێ].

**لێوە2 lewe** ⌈ *lewa* ⌋ - "شینکەی تازە کە بەر لێوی ماڵات دەکەوێ": خزمە دەگەڵ ↑لێو lew.

**لێوە3 lewe** ⌈ *lewa* ⌋ - "راچڵەکانی دڵ": بڕوانە ↑لڤین lıvîn "جووڵانەوە، راژان".

**لێوەشانەوە lêweşanewe** ⌈ *lewašānawa* ⌋ - "شیانی کارێک یان شتێک لە کەسێک، لێهاتن": [ئەم کارە لە تۆ ناوەشێتەوە، ئەم جلکەی لێ دەوەشێتەوە]. هەروەها لێوەشاوە lêweşawe هەیە بە مانای "لێهاتوو، ژێهاتی". ئەم کردارە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*شیان şîyan*. دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە کە "کارێک یان شتێک لە کەسێک دەشێ" [دەشێتەوە]. دە زمانی فارسیدا رستەی "ئەم کارە لە تۆ ناوەشێتەوە" دەبێتە "این کار از تو برنمی اید" یان رستە "ئەم جلکەی لێ دەوەشێتەوە" دەبێتە "این لباس بهش می اید". وەک دەبینرێ بۆ ئەم مانایە دە زمانی فارسیدا کرداری "امدن" [واتا هاتن] دەور دەبینێ و دە زمانی کوردمادیشدا کرداری "شیان" بەکار دێ کە خۆی خزمە یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چوون çun. دە زمانی کوردمادیدا هاوکات دەگەڵ "شیان" [واتا چوون] هەروەک زمانی فارسی کرداری "هاتن"یش ئەو دەورە دەبینێ، بۆ وێنە دەگوترێ "لە تۆ نایە ئەو کارەت کردبێ، یان ئەو جلکە لە تۆ نایە". هەروەها هاومانا دەگەڵ "لێوەشاوە" وشەی "لێهاتوو" یان "ژێهاتی" بەکار دێ. خاڵێکی دیکە کە لێرەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە کە چۆن کرداری "شیان" بووەتە "لێ وەشانەوە"؟ ئەم ئاڵوگۆڕە دەبێ بەم جۆرە پەیدا بووبێ: سەرەتا پێشگری ڤە [وە] هاتووەتە سەر کرداری "شیان" و بووەتە "ڤەشیان" یان "وەشیان"، وەک ڤەخارن [وەخواردن]، ڤەکرن [وەکردن] و هتد. پاشان لە کرداری رابردوودا گوتراوە "لێی ڤەشیا" [لێی وەشیا] یان "لەتۆ نەڤەشیا" [نەوەشیا]. لە کرداری ئێستا دا گوتراوە "لێی ڤەدەشێ" یان "لێی دەڤەشێ". دواجار دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا پێشگرە ڤە (وە) جارێکی دیکە، ئەمجار وەک پاشگر بە کردارەکەوە لکێنراوەتەوە و گوتراوە "لێی

دەوەشێتەوە“. بە وتەیەکی دیکە کەرتی ”ڤە“ (وە) بە هەڵە دووجار بە ئەسڵی وشەکەوە لکێنراوە. راستتر وایە بگوترێ ”لێی ڤەدەشێ“ [لێی دەوەشێ] یان دەنا بگوترێ ”لێی دەشێتەوە“.

## م (M)

**ما1 ma** [ *mā* ] - "خۆ گرتن و پێگەیشتن": [دۆکلێوەکە مای هێناوە]. خزمە دەگەڵ ↑مەیین meyîn.

**ما2 ma** [ *mā* ] - "1- وشەی پرسیار کردن 2- وشەی رستەی مەرجی": [ما تە وە نەکر؟ (چما تۆ وات نەکرد؟)، ما رۆژەکی چێ بە (مەگەر رۆژێک چاک بێ)]. ئەم وشەیە، هەر ئەم نیشانەیە کە لە وشەی "مەگەر"دا دەبینرێ. ئەگەر eger لە رستەی مەرجی ئەرێنیدا بەکار دێ و مەگەر meger لە هی نەرێنیدا [ئەگەر هاتی، مەگەر نەچووی. وڵات رزگار *دەبێ*، ئەگەر کورد یەک بگرێ، وڵات رزگار *نابێ*، مەگەر(ئەوەی) کورد یەک بگرێ]. ئەم نیشانەیە دە رستەی فەرمانی نەرێنیشدا بەکار دێ: مەرۆ mero، مەچۆ meço، مەکە meke و هتد. لەوانەیە ئەم وشەیە گۆڕدراوی نا na /نە ne بێ کە وەک نیشانەی نەرێنی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا دەردەکەوێ.

[تێبینی: وشەی ↑چما çima پێک هاتووە لە دوو کەرتی چ çı + ما ma. دە شێوەزاری موکریانیدا ئەم وشەیە بەگوێرەی ریساکەی سەرەوە لە رستەی پرسیاریی نەرێنیدا و بە مانای "مەگەر" بەکار دێ (چما پێم نەگووتی). دە شێوەزاری سەروودا بەگشتی لە رستەی پرسیاریدا بە مانای "بۆچی" بەکار دێ (چما تە وەسا کر).

**مات1 mat** [ *māt* ] - "1- ناروون، نەدرەوشاو 2- کز و بێدەنگ، پەرۆش و داماو": وشەکە دە زمانە ئەورووپییەکانیشدا بەکار دێ و بە گوێرەی فەرهەنگە ئێتیمۆژیکەکانی زمانی ئەڵمانی دەچێتەوە سەر وشەی مات mat (Arb.) "مرد". ئەوە کە وشەکە پێوەندی بەم وشە عەرەبییەوە هەبێ، جێی گومانە. وشەکە زۆرتر وێ دەچێ خزم بێ لەگەڵ هێندێک وشەی زمانی کوردمادی کە ئاماژە بە رەنگی "رەش، تار" دەکەن، وەک ↑مەتک metık "رەش، شووم"، ↑ماتە mate "تەمی بەرچاو، تاری"، ↑مژ *mıj*، ↑مێش mêş [خۆڵەمێش xolemêş]. لەباری ماناوە دەتوانین هەڵی سەنگێنین لەگەڵ وشەکانی "تاڵ" و "تەڵخ" کە هەردووکیان مانای "ناروون" و "ناخۆش" دەبەخشن و پێوەندییان بە "تار"ەوە هەیە بە مانای "تاریک". خودی وشەی "تار" دەتوانرێ لەجیاتی "مات"یش بەکار بهێنرێ، بۆ وێنە کاتێک باس لە شووشەیەک دەکرێ کە ئەوبەری تێدا نابینرێ].

**مات2 mat** [ *māt* ] - "بێ جموجۆڵ، بە زەوییەوە لکاو" [خۆی مات کردووە، بە ماتەمات بۆی چوو]. لەوە ناچێ ئەم وشەیە پێوەندی بە ↑مات1 mat ەوە هەبێ. ئەم "مات"ە باس لە جۆرێک خۆ چکۆڵە کردنەوە و خۆ وێکهێنان دەکا بە مەبەستی خۆ شاردنەوە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مات3 mat "نەوی، نزم".

**مات3 mat** [ *māt* ] - "نەوی، نزم": [ئەو بەردانەی لە زەویت گرتووە، یەکیان ماتە، واتا نەویترە لەوانی دیکە] یان مات کردن mat kırdın هەیە بە مانای "نەوی کردنەوەی زەقایی". خزمە لەگەڵ ↑ماخ1 max "نزمی نێوان دوو بەرزایی".

**ماتک1 matık** [ *mātık* ] - "میمک، خوشکی باوک": خزمە دەگەڵ ↑مەت met "خوشکی دایک".

**ماتک2 matık** [ *mātık* ] - "لانکە، بێشکە": دە زمانی عەرەبیدا مهد mahd (Arb.) دەگوترێ. دیارە ئەم دوو وشانە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. لە لایەکی دیکەوە دەکرێ ئەم وشانە لەگەڵ ↑مات3 mat "نەوی، نزم" و ↑ماخ1 max "نزمی نێوان دوو بەرزایی" هەڵسەنگێنین.

[تێبینی: پێوەندی دەتیوان دوو چەمکی "نزمان، نەوی بوون" و "بێشکە" دە وشەی "گهوارە"ی فارسیدا دەبینرێ. ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ "گابار"ی کوردی بە مانای "شکێر، کون و کەلێن، قەڵشەشاخ" و خزمە دەگەڵ "کوور" و "قووڵ". مەبەست لە هەر دوو وشەی "ماتک" و "گهوارە" بریتییە لە "قولکە، شوێنێکی نزم و قووڵکراو" [نزمی تیوان دوو بەرزایی] کە زارۆکی تێیدا دەخەوێ].

**ماتە1 mate** [ *māta* ] - "ئاو تێگەڕان و ئاڵ بوونی میوە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ madere (L.) "تەڕ و بڕ بوون، گەیشتن"، سەر بە ریشەی **< -(IE.) *mat(i)*** "خواردن، خواردەمەنی".

**ماتە2 mate** [ *māta* ] - "کووژەکە(ی چاوزار)": خزمە دەگەڵ ↑میت mît "قیتکە". [شیاوی باسە وشەی "کووژەکە"ش خزمە دەگەڵ "قۆچ و قیت"].

**ماتە mate** [ *māta* ] - "تەمی بەر چاو": بڕوانە ↑ماتە1 mat.

**ماتەم matem** [ *mātam* ] - "خەمباری، تازیە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑مات[1] mat.

**ماچ mac** [ *māj* ] - "پەیرەوی زەردەشت": ماز maz و ماژ maj یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑موغ muġ و خزمیشە دەگەڵ ↑ماجووج macuc [ئاجووج و ماجووج].

**ماجوو macu** [ *mājū* ] - "کرێ، پاداشت": خزمە دەگەڵ ↑مزد mızd و ↑مووچە muçe.

**ماجووج macuc** [ *mājūj* ] - دەگەڵ "ئاجووج" دێ [ئاجووج و ماجووج acuc u macuc]. خزمە دەگەڵ ↑مەزن mezın.

**ماجووم macum** [ *mājūm* ] - "تێکەڵاو کردنی چەند دەرمانێک بۆ دروست کردنی مەڵحەم": پێ دەچێ لە معجون maεjūn (Arb.) وەرگیرابێ و زمانی عەرەبیش وشەکەی لە یۆنانی یان زمانی کوردمادی وەرگرتووە. وشەکە خزمە دەگەڵ massein (Gr.) "هەڵشێلان، پشاوتن". masse (L.) بە مانای "شتی لێکدراو و هەڵشێلدراو"ە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑مچاندن mıçandın، ↑ماشتن maştın و ↑مشت mışt [مشتومال] و هتد.

**ماجوە macweh** [ *mājwah* ] - "شوێنێ کە ئاوی پێدا هاتووە": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑مچەو mıçew "شە، تەڕایی".

**ماچ maç** [ *māč* ] - "لێو داگرتن لەسەر شتێک بۆ دەربڕینی خۆشەویستی": ماچ māč (P.). خزمە دەگەڵ Schmatz (G.)، smaz (MG.) و smuz (MG.) "ماچ بە دەنگی بڵێند"، smackezen (MG.) "ماچ کردن بە دەنگ". ئەم وشە ئەڵمانییانە دەبردرێنەوە سەر کرداری schmecken (G.) "مەزە کردن". ئەگەر پێوەندی "ماچ"ی کوردمادی بەم وشانەی سەروە ڕاست بێ، ئەوا دە زمانی کوردمادیشدا "ماچ" دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مەزە meze و ماچ کردن دە ڕاستیدا جۆرێک مەزە کردن یان مەزە وەرگرتن بووە. "ماچ" زۆر جار دەگەڵ "مووچ" دێ و مووچیش دەبنەڕەتدا واتا "ڕێخشاندن"ی لێو لەسەر ڕووی خۆشەویستێک.

**ماچلەک maçlek** [ *māčlak* ] - "بەندی ئەندام، جومگە": خزمە دەگەڵ ↑مەچەک meçek.

**ماخ1 max** [ *māx* ] - "نزمی تیوان دوو بەرزایی": دوو وشەی دیکەش لەم بارەوە سەرنج ڕادەکێشن، کە بریتین لە ↑مات[3] mat "نەوی، نزم" [ئەو بەردانەی لە زەویت گرتووە، یەکیان ماتە، واتا نەویترە لەوانی دیکە] یان مات کردن mat kırdın هەیە بە مانای "نەوی کردنەوەی زەقایی"، هەروەها خۆ ↑مات[2] mat کردن، واتا خۆ بە هەردەوە نووساندن، خۆ نەوی کردن. هەروەها ↑ماتک matık هەیە بە مانای "لانکە". [مهد mahd (Arb.)]. ئەم وشەی دوایی دەشێ لە بنەڕەتدا بە مانای "قووڵکە، کون و کەلێن" (ی زارۆک تێنان) بەکار هاتبێ، هەر وەک "گهوارە"ی فارسی کە خزمە لەگەڵ "گابار"ی کوردمادی بە مانای "شکێر، کون و کەلێن". ریشە؟

**ماخ 2 max** [ *māx* ] - "1- کاریتەی سەربان 2- ریزە ئاڵوودار": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑میچ mîç "بانی خانوو" و دواتر ↑میت *mît* "قیتایی، زەقایی".

**ماخولیا maxulya** [ *māxulyā* ] - "نەخۆشییەکی دەروونی": مالیخولیا mālīxūlyā (P.) > *melancholia* (*Gr.*) [دە بنەڕەتدا: cholia "زاڵە، زارە، زراو" + melas "رەش" واتا "زراورەشی"].

**ماد mad** [ *mād* ] - "ناوی رەسەن و راستەقینەی نەتەوەی کورد": ئەم ناوە بە چەند شێوە دەگوترێ: ماد mad، مەد med، مێد(یا) med(ya). هەروەها وشەکە پێشگری ئا a ی وەرگرتووە و بووەتە ئامێد amed [a-med] "پێتەختی باکووری کوردستان". لە باشووری کوردستانیش شاری ئامێدی amedî هەیە. هەروەها لەنێوان مەهاباد - سەردەشت گوندێک هەیە بە ناوی ئامێد amed و لەوانەیە لە چەندین شوێنی دیکەی کوردستانیش ئەم ناوە بە شێوەی جۆراوجۆر بەرچاو بکەوێ. دوور نییە ناوی شاری هەمەدان hemedan کە پێتەختی مادەکان بووە، پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. سەبارەت بە پێوەندی چەمک و وشەکانی "ماد"، "کرمانج" و "کورد" بڕوانە وشەی ↑کرمانج kırmanc. سەبارەت بە وشەی "ماد" سێ ریشەی هیندوئەورووپی سەرنج رادەکێشن و دەشێ وشەکە پێوەندی بە یەکێک لەم ریشانەوە هەبێ.

1- < **medhio-s-* (*IE.*) "ناوەڕاست، ناوەند". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ madhya (L.) medius (OSw.) midja (Gt.) midjis (OF.) midde (OE.) midd (G.) Mitte (OIn.) mesos (Gr.) meženti (Rus.) "تیوەڕاست، ناوەند". دە زمانی فارسیدا هەروەها میان mīyān (P.) هەیە بە مانای "تیوەراست، فاسیلە، بەین" کە تێیدا فۆتیمی d سواوەتەوە. وشەی ↑مەیدان meydan لە زمانی کوردمادی و فارسیدا لەم ریشەوە هاتووە. "مەیدان" دەشێ سەرەتا بە "ناوەند و ناوەراست"ی شوێنێک، بۆ وێنە ناوەندی شار و گوندەکان یان گەڕەکەکان گوترابێ کە لە ناوەندی کووچە و کۆڵانەکاندا هەڵکەوتبوون. بەم پێیە لەوانەیە ناوی "ماد" ئاماژە بە چەمکی "ناوەند و تیوەراست" بکا، جا یان ناوەند و تیوەراستی دووچۆمان ["بین النهرین"، مێزۆپۆتامیا]، یان رۆژهەڵاتی ناوین [ناوەندی رۆژهەڵات]، یان شوێنێک لەنێوان دەریاکاندا [دەریای رەش، سپی، قەزوێن و کەنداو] و هتد.

2- < **med-* (*IE.*) "گەڕان، پێوان، هەڵسەنگاندن، ئەندازە گرتن، (سنوور) دیاری کردن": ژمارەیەک وشە لە زمانە ئەورووپییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەک messen (G.) metan (OE.) mäta (Sw.) "ئەندازە گرتن، هەڵسەنگاندن"، müssen (G.) must (E.) moeten (Nl.) "مەجبوور بوون" [دە بنەڕەتدا: دیاری کردنی شتێک بۆ ئەوەی ئەنجام بدرێ]، Mal (G.)، meal (E.) "جەم" [کاتێکی ئەندازەگیراو، دیاریکراو]، métron (Gr.) "ئەندازە، میتر"، metiri (L.) "ئەندازەگرتن، هەڵسەنگاندن"، meditari (L.) "هەڵسەنگاندن، بیر لێکردنەوە، چوونە ناو بیرەوە" [هەروەها *meditation*]، medicus (L.) "پزیشک" [بیرکەرەوە، هەڵ سەنگێنەر، بەمشوور، ژیر"، modus (L.) "ئەندازە، جۆر، شێوە". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی وەک ↑مێژوو meju، ↑مشوور mışûr (را و تەگبیر) [هەڵسەنگاندن] و ↑مەزەندە mezenda پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر و دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مانگ mang.

3- < **mad-* (*IE.*) "پێک گەیشتن، هاتنە جەم یەکدی، جڤین، پەیمان بەستن". ↑ماڵ2 mal "خانەوادە، فامیل" دەشێ لەم ریشەوە هاتبێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەتوانێ بە مانای جڤین،

پێکگەیشتن یان هاوبەندیی چەند کەس یان چەند هۆزێک بووبێ، وەک پەیمانی مێژوویی دالانپەر.

مادام **madam** ‌[ *mādām* ] - "خامی رەشی بریقەدار": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ماتە mate "تەمی بەر چاو".

مادک **madık** ‌[ *mādık* ] - "قۆنداخ (ی مندال)": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑میت mît "قیتایی، زەقایی". کاتێک منداڵ قۆنداخ دەکرێ، شتێکی قوتەکە دروست دەبێ، هەروەک "قۆنداخ"ی تفەنگ کە ئەویش شتێکی قوت و زەقە. شیاوی باسە کە وشەی "قۆنداخ"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بەمانای "قوتەکە بوون، خڕەکە بوون".

مادە1 **made 1** ‌[ *māda* ] - "1- کەرەستە، شتومەک، دەرمان 2- دایک": مادده madde ش دەگوترێ. مادده mādde ‌(P.). خزمە دەگەڵ materia ‌(L.) "شتومەک، کەرەستە، ماکە". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑مێ me "سەرچاوەی هەبوون" و هەروەها مادر mādar ‌(P.)، Mutter ‌(G.)، mother ‌(E.) و هتد بە مانای "دایک". matter ‌(E.) "مەوزووع، بابەت" دەگەرێتەوە سەر وشە لاتینییەکەوە و دە زمانی کوردمادیدا بووەتە ↑مژار mıjar.

مادە2 **made 2** ‌[ *māda* ] - "1- لوو، گرێی گۆشت 2- کوان، دومەڵ": خزمە دەگەڵ ↑میتکە mîtke.

مادە3 **made 3** ‌[ *māda* ] - "هەوێن، ئامیان": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ئامێتە amete ‌[a-mete].

مادە4 **made 4** ‌[ *māda* ] - "رفێدە": دەچێتەوە سەر **<** *(L.) matta* "حەسیر یان شتی چێکراو لە کا و پووش و پەڵاش بۆ راخستن یان بەسەردا دان". ئەم وشە لاتینییە دە زمانی ئەڵمانیشدا بەکار دێ و بووەتە Matte ‌(G.) و بە شتێک دەگوترێ کە رادەخرێ یان دادەنرێ بۆ ئەوەی کارێکی لە سەر ئەنجام بدرێ. هەر لەم پێوەندییەدا وشەی Fußmatte ‌(G.) جێی ئاماژەیە کە رایەخێکە لە حەسیر، پەڕۆ یان پلاستیک دروست دەکرێ و وەک دۆشەگەڵەیەکی بچووکی لاکێشەیی دەچێ کە بەر دەرگا رادەخرێ بۆ پاقژ کردنەوەی پێڵاوەکان، بەر لە چوونە ژوور. ریشە؟

مار **mar** ‌[ *mār* ] - "جانەوەری خزۆکی پێوەدەر": مار mār ‌(P.). ئەگەر سەرنجی وشەی "خزۆک" بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "خزین" و "خوشین" و هەروەها "رێخشاندن". دە زمانە هیندوئەوروپییەکان ریشەیەک هەیە کە دەشێ مانا هەرە بنەڕەتییەکەی "رێخشان، رێخشاندن" بێ. ئەم ریشەیە بریتییە لە ریشەی **< *(IE.) *(s)mer-*** "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن، هاڕین". ئەگەر سەرنجی ئەو چەند مانایە بدەین، دەردەکەوێ کە ماناکانی دیکە بۆ کرداری رێخشاندن دەگەڕێنەوە، واتا رێککوشین، پشاوتن، ورد کردن، هاڕین دەبنە ئەنجامی رێخشاندن. هێندێک وشە ئەم مانا کۆنە بە باشی نیشان دەدەن، وەک ↑مڕ mır ‌[مڕ و مۆش]. "مڕ" لێرەدا ئاماژە دەکا بەو دۆخە کە ئاژەڵ بە شوێن خۆراکدا دەم و لووتی خۆی لە هەرد دەخشێنێ. ["مۆش1" یش دەشێ خزم بێ دەگەڵ مووچ (ماچ و مووچ) و دەبنەڕەتدا بە مانای "رێخشاندن، لێخشاندن"ە، واتا دەم و لووت لە هەرد *خشاندن* بۆ دۆزینەوەی خۆراک. بەم پێیە لەوە دەچێ وشەی "مار" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە خۆ لە هەر خشاندنی ئاژەڵەکە بکا.

[تێبینی: لەباری مانا و چۆنێتی دروست بوونی وشەکە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ Schnecke ‌(G.) "حەلوورن". ئەم وشەیە دە ئینگلیزیدا دەبێتە snake ‌(E.) بە مانای "مار" و ریشەکەی دەچێتەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی کە دە ئەڵمانی کۆندا snahhan ‌(OG.) بووە بە مانای "خوشین، خزین بەسەر هەردا"].

مارجوو **marcu** [ *māržī* ] - "نیسک": مارژی marjî ش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ خێزانەوشەیەک کە خوارتر شیرۆڤە دەکرێن وماناکانی "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن، هاڕین" دەردەبڕن، وەک ↑مەرس mers "گای گێرە". ڕەنگە نیسک لەبەر ئەوەی شێوەیەکی پانی هەیە، پێی گوترابێ "مارجوو، مارژی" بە مانای "رێککوشراو، پانکراو، رێخشێنراو".

ماردین **mardîn** [ *mārdīn* ] - "شکاندن، ورد کردن": ماردن mardın یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑مارین marîn "وردکردن، هاڕین، شکاندن". وشەکانی marmaieín (.Gr) "هاڕین، لەناوبردن"، marmaros (.Gr) "بەرد، تاشە بەرد"، mortarium (.L) "ئاونگ، دەفری شت تێدا کوتانەوە"، Mord (.G) "کوشتن، لەناو بردن" پێوەندییان بە وشە کوردمادییەکەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **< -(IE.) *(s)mer** "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن، هاڕین".

مارز **marız** [ *mārız* ] - "زاڵم، سەرسەخت": پێوەندی هەیە بە ↑مارین marîn [ماردین mardîn]ەوە بە مانای "شکاندن، ورد و خاش کردن". کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ پاشگری جەخت کردن بێ، وەک چۆن بۆ وێنە لە وشەی "قۆقز"یشدا دەبیندرێ بە مانای "پشتکووڕ" [بڕوانە پاشگری ↑-ئۆز oz-]. ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ڕیشەی **< -(IE.) *(s)mer** "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن، هاڕین".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ oppression (.E) "ستمکاری، سەرکوتکاری" و oppressor (.E) "مارز، زاڵم" کە دەچێتەوە سەر pressāre (.L) "گوشار دان، پشاوتن، پەستاوتن"].

مارزا **marza** [ *mārzā* ] - "پیسایی ئاژەڵی ساوا کە زەرد و شلە": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑میراز mîraz "هەویرترش"، ↑مەرەگە merege "شلکینە"، ↑مرتۆخە mırtoxe "چێشتی ئارد و ڕۆن و شەکر" و دواتر ↑مەڕە[1] mere "پێمەڕە".

مارکە **marke** [ *mārka* ] - "ئەو هێلکەی لە کولانە دادەنرێ بۆ ئەوەی مریشک لەوێ هێلکە بکا". بە وتەیەکی دیکە *نیشانە* دانان بۆ مریشکی هێلکەکەر [دە بنەڕەتدا واتا "نیشانە"]. مارە mare ش دەگوترێ. بێگومان وشەیەکی زۆر کۆنە و خزمیشە دەگەڵ ↑مۆر mor "شەقڵ، نیشانە". خزمە دەگەڵ Marke (.G)، mark (.E)، merke (.OF)، mearc (.OE)"نیشانە، عەلامەت" و هەروەها Mark "پوولی ئەڵمانی". [سەبارەت بە پێوەندی دوو وشە ئاڵمانییەکەی Marke "نیشانە، شەقڵ" و Mark "پوولی ئەڵمانی" هەڵسەنگینە دەگەڵ دوو وشەی هاوریشەی "شەقڵ" و "سکە"]. بەپێی فەرهەنگی ئەڵمانی Duden وشە ژێرمەنییەکان پێوەندییان بە کرداری merken (.G) ەوە هەیە بە مانای "تێگەیشتن، سەرنج دان، هۆش پێدان" و دە بنەڕەتدا مانای کردارەکە بریتی بووە لە "نیشانە دیاری کردن، بە نیشانە ناسینەوە". خودی وشەی Marke (.G) شیمانەی ئەوە دەکرێ لە وشەی Mark (.G) وەرگیرابێ بە مانای "سنوور، زەوی سەرسنوور". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ ↑مەرز merz و ↑مێرگ merg دە زمانی کوردیدا. ڕەوتی گۆڕان و پەرەگەرتنی ماناکان لەو وشانەی سەرەوەدا دەبێ بەم جۆرە بووبێ: "قەراخ، سنوور" ← "زەوی بەلاوە، سەرحەد، مێرگ" ← "نیشانەی سەرسنوور" [نیشانە کردنی سنوور] ← "نیشانە کردن، نیشانە دانان" ← "تێگەیشتن" [وەرگرتنی نیشانەکان].

ماroووت **marut** [ *mārūt* ] - "فریشتەی هەواڵی ئاroووت": جیی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Mars "خودای شەڕ" (لای رۆمییەکان). ناوی مانگی "مارت" یان "مارس" و هەروەها ناوی هەسارەی "مارس" بە ناوی ئەم خودا (یان فریشتە )یە کراوە.

ماroووتە **marute** [ *mārūta* ] - "قوڵاخە، خزگەی ماسی لە زستاندا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) Meer ،(OE.) mere ،(L.) mara ، (Rus.) more "دەریا"، سەر بە ریشەی ***mer-* > (IE.)** "بریقانەوە". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە بە مانای "زەلکاو، باتڵاق " پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

مارۆ **maro** [ *māro* ] - "1- قەشان، ئاژەڵی رەشی ناوچاوان سپی 2- ئەسپێک کە لاقی خاڵی سپی تێدایە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑ (G.) Mähre "ئەسپی خراپ"، (OG.) marah ،(OE.) mearh ،(OIs.) marr "ئەسپ". بڕوانە↑مەیتەر meyter "خزمەتکاری ئەسپ"،

2- ↑مۆڕ2 mor "1- رەنگی بنەوشی 2- خۆڵەمێشی، بۆر".

مارە **mare** [ *māra* ] - مارە کردن واتا بەستنی پێوەندی ژن و مێردایەتی. مهریە (P.) mehrīye و مهر mehr (Arb.) "پارە و زێڕی لەسەر مارە کردن". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑ماڵ² mal "شوێنی حەوانەوەی خێزان".

2- marītus (L.) "مارەکراو". ریشەی ئەم وشە لاتینییە ساخ نەکراوەتەوە.

مارین **marîn** [ *mārīn* ] - "ورد کردن، شکاندن": شێوەیەکی دیکە لە ↑ماردین mardîn.

مازووڤان **mazuvan** [ *māzūvān* ] - "میواندار، خاوەنی خوان": میزبان mīzbān (P.).

1- دە "فەرهەنگی پەهلەوی، عەلی نانەوازادە، ل. 182"دا دەگەڵ ئەم دوو وشەی خوارەوە هەڵسەنگێنڕاوە: mayazda (Av.) "خواردنی جێژنی ئایینی" و mayazdpan (P.) "کەسێک لە جێژنە ئایینییەکاندا کە بە خوانی خواردن رادەگا". ئەم وشانە لەوانەیە دەگەڵ ئەو وشانە خزم بن کە لەژێر ↑ماست mast دا باس کراون.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑میز mîz.

مازوو **mazu** [ *māzū* ] - "بەری دارێکی کێوی": مازی mazî و مازگ mazıg یش دەگوترێن. دە فارسیدا مازوج māzūj (P.) کە دەشێ شێوەی عەرەبێنراوی وشەکە بێ. لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑ماتە² mate دا باس کراون و ئاماژە بە زەقایی بچووک و خڕەکەبوون دەکەن.

[تێبینی: لەباری ماناوە دەکرێ دەگەڵ *گزگڵ* "بەرێکی دارمازوو" هەڵی سەنگێنین کە خزمە دەگەڵ "گچکە"].

مازە **maze** [ *māza* ] - "1- ناوەراستی پشت 2- دارێکە چەرخی عارەبەی پێوەیە": مازگە mazge ش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم دوو وشانەی خوارەوە:

1- بە شیمانەیەکی بەهێز دەشێ وشەی مازە maze خزم بێ دەگەڵ (G.) Mitte ،(OG.) mitta ،(OE.) midde ،(L.) medius ،(Gr.) mesos "تیوەڕاست"، سەر بە ریشەی ***medhio-s-* > (IE.)** "ناوەڕاست، ناوەند". شیاوی باسە کە وشەی Mittel (G.) "وەسیلە، ئامراز" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست ئەو شتە بووە کە کەوتووەتە تیوانەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە مەژی mejî [مێشک mêşık، مغز maġz (P.)] و مەبەست لە پشتەمازە دە بنچینەدا هەر ئەوشتە بێ کە دە ئاڵمانیدا پێی دەگوترێ Rückenmark (G.)

"نوخاع". وشه ئاڵمانییەکە خۆی لە دوو وشە پێک هاتووە کە یەکەمیان بە مانای "پشت" و دووەمیان بە مانای "مەژی، مێشک"ە. لەم تێڕوانینەوە وشە کوردمادییەکە لەوانەیە سەرەتا بە مانای"مەژی پشت" بووبێ و پاشان مانای "بڕبڕەی پشت، تیوەڕاستی پشت" و"داری تیوەڕاستی" عارەبەی وەرگرتبێ.

**مازێ maze** [ *māze* ] - "ناوی چیایەک لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑مەزن mezın.

**مازێر mazer** [ *māzer* ] - "داربەڕووی ئەستوور": خزمە دەگەڵ ↑مەزن mezın. لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا "مەزدار" mezdar بووبێ، واتا داری مەزن.

**ماست mast** [ *mast* ] - "جۆرێک لە شیرەمەنی":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ mästen (G.)، mast (E.) "دابەستن و قەڵەو کردنی ئاژەڵ"، medas (OIn.) "چەوری"، سەر بە ریشەی **(IE.) *mazdo- >** "چەوری". وشەکانی Messer (G.) "چەقۆ" و Mett (G.) "گۆشتی بەراز" و Maat (G.) پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشە ئەڵمانییەی دوایی مانای "ئەفسەری پلەنزمی کەشتی" دەدا، بەڵام دەچێتەوە سەر وشەیەکی ئەڵمانی ناوینی باکوور بە مانای "هاوڕێ، شاگرد" و کۆنتریش بە مانای "هاوخۆراک".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑مەیین meyîn [ماسین masîn] "توند بوون و خۆ گرتنی تراو".

**ماسلە masle** [ *māsla* ] - "رۆتیکە بۆ چەورکردنی دەزگا": < *(Rus.) maslo* "رۆن، کەرە". وشە رووسییەکە خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی کوردمادی وەک ↑مچاندن mıçandın، ↑ماشتن maştın و هتد.

**ماسوولکە masulke** [ *māsūlka* ] - "جۆرێک لە پێکهاتەی لەش کە بە وێکهاتن و سفت بوونەوە هێز دروست دەکا": ماهیچە māhīče (P.). لەوانەیە بۆ ناوی ↑ماسی masî [ماهی māhī (P.)] بگەڕێتەوە و ماناکەی ببێتە "ماسی بچکۆڵە". لەم تێڕوانینەوە شێوەی ئەم پێکهاتەیە بە "ماسی" چوێندراوە، هەر وەک چۆن دە زمانی لاتینیدا پێی دەگوترێ musculus (L.) و گەڕاندوویانەتەوە سەر ناوی "مشک"، واتا "مشکۆڵە". یان لەوانەیە راستەوخۆ لە وشەی ↑ماسین[1] masîn "ئەستوور بوون" و ↑مەیین meyîn "توند بوون، سفت بوون" وەرگیرابێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "سفت و توند و گرژ بوون"ەوە پەیدا دەکا. وەک ئاشکرایە ماسوولکەکان بە هۆی سفت و گرژ بوونەوە هێزیان تێدا دروست دەبێ. جێی ئاماژەیە کە دوو وشەی "ماسی" و "ماسین" دەشێ لە یەک ریشەوە هاتبن.

**ماسۆڵە1 masole** [ *māsola* ] - "لەتە قامیشێکی کورتە جۆڵا داوی لێ دەپێچن بۆ تەنین": ماسوورە masure ش دەگوترێ. ماسورە māsūre (P.) و ماسولە māsūle (P.). وشەکە دە زمانی فارسیشدا وەک کەرەسەیەکی دەزگای جۆڵایی یان چەرخی دوورین بەکار دێ کە داوەکەی لەسەر هەڵدەکرێ [هەڵدەوێزندرێ]. دە فەرهەنگی فارسیدا وشەی ماز māz (P.) دەبینرێ بە مانای "هەڵوێزنراو، لوولکراو". هەر دە زمانی فارسیدا مازو māzū (P.) بە مانای "وەردێنە" مانا کراوەتەوە و پێوەندی بە چەمکی "خلۆر بوون و وەرسووڕان" پەیدا دەکا. دە زمانی کوردیدا ↑مەزرەق mezreq هەیە کە خولخولەیەکە بەتێکی لەدەوری دەپێچن. وەک بە ڕوونی دەردەکەوێ لەم وشانەدا چەمکی "هەڵوێزنین و لێهاڵاندنی (بەن)" خۆی حەشار داوە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ماشەر maşer "کەڵافەبەن، بەنی هەڵوێزراو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، هۆنینەوە، گرێ دان".

[تێبینی: هاوکات لەگەڵ مانای سەرەکی ریشەکە، واتا "چنین، هۆنینەوە، گرێ دان"،

لەپاڵەوە مانای "سووڕان"یش لە هێندێک لە وشەکاندا خۆی دەردەخا. ئەمەش شتێکی سروشتییە، چونکوو ئەم دوو چەمکە زۆرجار لەپێوەندی دەگەڵ یەکتردا جێ دەگرن. بۆ نموونە وشەی "هۆنینەوە" (هۆندنەوە) خزمە دەگەڵ *"باد* دانەوە"، "بافتن"ی فارسی خزمە دەگەڵ "بابۆڵە"، یان "قلّفە" خزمە دەگەڵ "زولف" [مووی وەرسووڕاو و لوولدراو" یان Schlinge (G.) "قلّفە" (خزمە دەگەڵ "شیلانک") و Schlange (G.) "مار" و schlingen (G.) "پێچان، لێهاڵان" و سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەم لاو لادا جووڵانەوە، خوشین، بادان، هۆندنەوە". ئەو ریشە هیندوئەورووپییانە کە مانای "چنین، هۆنینەوە، گرێ دان" دەبەخشن، هاوکات هەڵگری مانای "چەماندنەوە" و "سووڕان"یشن، چونکوو کاری چینن و هۆنین و گرێ دان لە ئەنجامی چەماندنەوە و سووڕاندنی شووڵ یان بەن و دەزوو پێک دێ. بۆ وێنە کەسێک کە قەرتاڵە ساز دەکا یان جلک دەچنێ، شووڵەکان یان بەن و دەزووەکان دەچەمێنێتەوە، وەریان دەسووڕێنێ و تێکیان دەخاتەوە].

**ماسۆڵە2 masole** *[ māsola ]* - "گلۆڵەبەن بۆ تیوەدان": خزمە دەگەڵ ↑ماسۆڵە$^{1}$ masole "لەتە قامیشێکی کورتە جۆڵا داوی لێ دەپێچن بۆ تەنین".

**ماسە mase** *[ māsa ]* - "لم": ماسە māse (P.). خزمە دەگەڵ mássein (Gr.) "(هەویر)شێلان، گوشین، پەستاوتن، ڕێخشاندن، ئەسترین". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ماش$^{4}$ maş "ئەوەی بەر گەسک دێ، تۆز و خۆڵی ڕامالّراو" و ↑*ماشتن maştın* "گەسک دان".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینەدەگەڵ malm (MG.) "تۆز"، malma (Gt.) "لم" کە دەچنەوە سەر malmen (G.) "پشاوتن، ڕێخشاندن، هاڕین، ورد کردن"].

**ماسی masî** *[ māsī ]* - "ئاژەڵێکی ناو ئاو": ماهی mahī (P.).

[سەرەتا تێبینییەک: وەک لە چەندین شوێنی ئەم فەرهەنگەدا باس کراوە، پێوەندییەکی ئێتیمۆلۆژیک لە تیوان ئەو وشانەدا هەیە کە هێندێکیان مانای "ئەستوور بوون، ماسین، قەڵەو بوون" دەردەبڕن و هێندێکیشیان مانای "بەهێز و پتەو بوون". بۆ وێنە وشەکانی *تبل* "قامک"، تڤی "توو"، *دومەڵ* "کوان" خزمن دەگەڵ وشەکانی "توانین"، "تابشت" و "تەوژم". هەروەها وشەکانی Brausche (G.) "هەڵتۆقاوی، بلۆق"، Bries(el) (G.) "لوو، غوددە" خزمن دەگەڵ "برست، برشت" بە مانای "هێز، توانایی"].

بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە وا دەر دەکەوێ کە وشەی "ماسی" پێوەندی بە ↑ماسین masîn ەوە هەبێ بە ماناکانی "ئەستوور بوون، با کردن، قەڵەو بوون" و هەروەها "بەهێز و پتەو بوون".

**ماسین$^{1}$ masîn** *[ māsīn ]* - "ئەستوور بوون، با کردن": اماسیدن āmāsden (P.). خزمە دەگەڵ ↑مەیین meyîn "ڕەق بوون، سفت بوون" و ↑ماسین$^{2}$ masîn "مەیینی چەوری بە سەر شتێکەوە".

**ماسین$^{2}$ masîn** *[ māsīn ]* - "مەیینی چەوری بە سەر شتێکەوە": خزمە دەگەڵ ↑مایی mayî.

**ماش1 maş** *[ māš ]* - "جۆرێک دانەوێڵە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مێش mêş "ڕەش، بۆری تاریک". ئەم دانەوێڵەیە ڕەنگێکی ئاماڵ ڕەشی هەیە و پێ دەچێ لەبەر ڕەنگەکەی ئەوها ناو نرابێ.

**ماش2 maş** *[ māš ]* - "تامانی سەر دۆڵاش بۆ گێڕانەوەی پووش": خزمە دەگەڵ ↑ماشە1 maşe.

**ماش3 maş** *[ māš ]* - "ئاوی ڕاوەستاو": هەروەها ↑مۆژ moj هەیە بە مانای "ئەستێرکی بچووک". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ Meer (G.)، mere (E.)، mar- (Sw.)، mare (L.)، more (Rus.) "دەریا"، Moor (G.)، moer (Nl.)، moor (E.) "زۆنگ، باتڵاق"، Marsch (G.)،

marsch (MNl.)، mersc (OSäc.) "نزمانی قەراخ چەم و دەریا کە کاتی لافاو ئاو دای دەگرێ و هەردێکی بە پیت و رێژەوە"، سەر بە ریشەی > *mōri- (IE.) "زۆنگ، ئاوی وەستاو، دەریاچە". دە وشە کوردمادییەکاندا دەشێ فۆتیمی r سوابێتەوە.

**ماش 4 maş** [ māš ] - "ئەوەی بەر گەسک دێ، تۆز و خۆڵی رامالڕاو": خزمە دەگەڵ ماسە māse (P.) "لم" و دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسک دان".

**ماشتن maştın** [ māštın ] - "گەسک دان، ماڵین": ماشتن دە زمانی کوردمادیدا هاومانایە دەگەڵ "ماڵین". وەک هێندێک چاوگی دیکە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا کردارەکانی "ماشتن" و "ماڵین" خاوەنی دوو بنج یان دوو رەگن، یەکەمیان رەگی ماش(ت) -maş(t) ە کە بۆ کاتی رابوردوو بەکار دێ [ماشتم، ماشتت، ماشتی] و دووهەمیان رەگی ماڵ -mal کە بۆ کرداری ئێستا بەکار دێ [دەماڵم، دەماڵی، دەماڵێت]. بەپێچەوانەی ئەوە کە هێندێک جار بیر دەکرێتەوە، ئەم دوو بنەوشەیە سەر بە یەک ریشە نین و دە ئەسڵدا دوو وشە و سەر بە دوو ریشەی جیاوازن، بەڵام زمانەکە هەر دوو وشەی پاراستووە و لەپاڵ یەکتر و بە یەک مانا بەکاریان دێنێ، یەکەمیان بۆ کرداری رابوردوو و دووەمیان بۆ کرداری ئێستا. لەم تیوەدا کرداری "ماڵین" باڵادەستی پەیدا کردووە، چونکوو دەتوانرێ ئەم کردارە بۆ کاتی رابوردووش کەڵکی لێوەر بگیرێ [ماڵیم، ماڵیت، ماڵی]، بەڵام کرداری "ماشتن" بۆ کاتی ئێستا بەکار ناهێنرێ و ناگوترێ "دەماشم، دەماشی، دەماشێ"! هەرچۆنێک بێ، ئەم کردارە دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ چەندین وشە، لەوانە ↑مچاندن mıçandın "گلۆفین، گوشین"،↑مزاندن mızandın "لکاندن، چەسپاندن"، ↑مشت mışt [مشتوماڵ دان]، ↑مشتە mışte "1- ئامرازی چەرم کوتان 2- کوتکی هەللاجی"، ↑مخەت mıxet "دارێکە چەرمی پێ لووس دەکەن"، ↑مەزرووکە mezruke "داریی نووک تیژ کە نانی لە تەنوور پێ دەردێنن"، مساخ mısax "ئارداوێژی بەرداش"، ↑مشارە mışare "پێوانەیەک لە زەمینی کێڵان"، ↑مشاگ mışag "کرێکاری کێڵگە، کێڵەر"، ↑مشتاک mıştak "دەپی ئاردماڵین لەدەوری بەرداش"، ↑ماش maş "ئەوەی بەر گسک دێ"، ↑ماسە mase "لم" [دە بنەڕەتدا: رێخشێنراو، هاڕدراو، وردکراو]، ↑مەساحە mesaĥe "میداد پاک کەرەوە"، ↑مەسقەل mesqel "ئامرازی خۆ تاس و لووس کردن"، ↑مەسە mese "1- پۆڵای چەقۆ تیژ کردنی قەسابان 2- خاکەندازی مشکی دەردان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشەی هیندوئەورووپی وەک mássein (Gr.) "(هەویر)شێلان، گوشین، پەستاوتن، رێخشاندن، ئەسترین"، mágis و māza (Gr.) "هەویر، ماجووم، قورسە" [دە زمانی لاتیندا بووەتە massa (L.) "شتی هەڵشێلدراو، هەویر، کۆگایەک شتی پێکەوە نووساو"، وشە لاتینییەکەش هاتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکان، بۆ وێنە mass (E.) و Masse (G.) "کۆگا، گرسە، قورسە"]، machen (G.)، maken (Nl.)، make (E.) "کردن" [دەبنەڕەتدا: هەویر کردن، هەڵشێلان]، mazat (Rus.) "تیهەڵسون، رێخشاندن، سواخ دان"، maslo (Rus.) "رۆن، کەرە" [دەبنەڕەتدا: نقیشک واتا ئەو شتەی بۆ تیهەڵسوون دەبێ] سەر بە ریشەی > *maĝ- (IE.) "هەڵشێلان". وەک دەبینین دە وشەکانی سەر بەم ریشەیەدا مانای بنەڕەتی پەرەی گرتووە و چەند مانایەکی دیکەی نیزیک بە یەکدی وەک گوشین، پەستاوتن، رێخشاندن، تیهەڵسوون، ئەسترین پەیدا بووە. هەر بەم شێوەیە دە زمانی کوردمادیشدا بنەوشەکە چەند مانای وەک گەسک دان [(گسک) رێخشاندن]، گوشین، شێلان، چەسپان"ی وەرگرتووە. هەر لێرەدا جێی ئاماژە کردنە کە دە زمانی عەرەبیدا وشەی مسح masĥ (Arb.) "مەسح کردن" و مسیح masīĥ (Arb.) "نازناوی عیسا" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: وەک لەژێر وشەی کەرە kere [ڕۆنەکەرە] دا شی کراوەتەوە، وشەی Christus "مەسیح" دەچێتەوە سەر chrisma (L.) "ڕۆن، هەتوان" و لەوێشەوە بۆ chriein (G.) "چەورکردن، (ڕۆن) *تیهەڵسوون*" و مانای Christus "مەسیح" دە ئەسڵدا دەبێتە"(ڕۆن) تیهەڵسوواو، (بە ڕۆن) چەورکراو، هەنواو، مشتومالٚ دراو". بە هەمان شێوە "مەسح" کردن واتا پێداماڵین، ڕێخشاندن، تیهەڵسوون و "مەسیح"یش واتا "مەسح کراو، دەست پێداخشاو". بەم جۆرە دەبینین کە وشەی مسح (Arb.) لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدایە. دە فەرهەنگی WAHRIG ی ئەڵمانیدا Massage (G.)"ماساژ" و massieren (G.) "ماساژ دان، مشت و ماڵ دان" بردراوەتەوە سەر mass (Arb.) "مەسح، دەست پێداخشاندن" و ئەمەش بە دروستی بردراوەتەوە سەر وشەی یۆنانی mássein (Gr.) "شێلان، گوشین، پەستاوتن، ڕێخشاندن، ئەسترین". دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی DUDEN ی زمانی ئەڵمانیدا سەرچاوەی ئەو دوو وشەیە کە لە ڕێگەی زمانی فەرەنسییەوە هاتوونە ناو زمانی ئەڵمانییەوە، بە گومانەوە براوەتەوە سەر massa (Arb.)، بەڵام ئاماژەیەک نەکراوە بە پێوەندی ئەم وشە عەرەبییە دەگەڵ وشەکانی زمانی لاتینی و یۆنانی. وەک دەبینین لەم بارەوە فەرهەنگی یەکەم قووڵتر بە ناخی کێشەکەدا ڕۆچووە].

**ماشۆت maşot** [ *māšot* ] - "کەڵافە ئاوریشم": خزمە دەگەڵ ↑ماشەر maşer.

**ماشە1 maşe 1** [ *māšar* ] - "سەبەتەی ماسیگری": ماشەڵ maşel یش دەگوترێ بە مانای "چەپەر لەبەر ڕۆبا ر بۆ ماسی گرتن". هەروەها وشەی ↑ماش2 maş هەیە بە مانای "تامانی سەر دۆڵاش بۆ گیرانەوەی پووش" و ↑ماشێوە maşêwe "سەلە، پاڵوێنە". ئەم وشانە دەبێ لە ریشەیەکەوە هاتبن. وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بێ ↑ماشەر maşer "کەڵافەبەن، بەنی هەلۆێزراو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *mezg- >*** بە مانای "گرێ دان، چنین".

**ماشە2 maşe 2** [ *māša* ] - "مەقاش": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑میت mît "قیتایی". وشەکانی سەر بەم خێزانەوشەیە هێندێک مانای وەک "دوند، دەندە، داردەست، نووک، تیزە" و هیتر دەبەخشن.

2- ↑ماشتن maştın "گەسک دان، پێداماڵین، ڕێخشاندن، *پشاوتن*".

**ماشەر maşer** [ *māšar* ] - "کەڵافەبەن، بەنی هەلۆێزراو": خزمە دەگەڵ Masche (G.)، masca (OG.)، maas (Nl.)، mesh (E.)، maska (Sw.) "قڵفەی بەن"، megzti (Lit.) "گرێ دان، چنین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *mezg- >*** "چنین، گرێ دان".

**ماشەرە maşere** [ *māšara* ] - "ئاگرە، جۆرێک کوانە لە دەموچاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مادک madık "قۆنداخ". شیاوی باسە "قۆنداخ"یش خزمە لەگەڵ *قوتیر* "کوان". گشت ئەم وشانە ئاماژە بە "زەق بوون، زۆپ بوون، خڕەکە بوون" دەکەن.

**ماشینەوە maşîn(ewe)** [ *māšīn(awa)* ] - "خواردنی زۆر کە هیچ نەمێتێتەوە": دە بنەڕەتدا مەبەست "ڕاماڵین"ی هەرچی خواردەمەنییە. خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسک دان".

**ماشێوە maşêwe** [ *māšewa* ] - "سەلە، پاڵوێنە": خزمە دەگەڵ ↑ماشە maşe "سەبەتەی ماسیگری".

**ماع maɛ** [ *māɛ* ] - ماعەماع کردن واتا "دەنگێ هەڵبڕینی بزن و مەڕ". خزمە دەگەڵ ↑مس2 mıs "بزن".

**مافەتا mafeta** [ *māfatā* ] - "تاعوون": پێک هاتووە لە دوو کەرتی ما + فەتا ma + feta. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پەتا peta "نەخۆشی گیرۆ". کەرتی ما -ma خزمە دەگەڵ هێندێک

وشەی وەك وەك ↑مژ *mıj*، مێش mêş [خۆڵەمێش xolemêş]. ئەم وشانە ئاماژە بە "رەشی و تاریکی" دەکەن. ئەم نەخوشییە بە "مەرگی رەش" بەناوبانگە.

**ماق maq** [ *māq* ] - "چاوزەق": خزمە دەگەڵ ↑ماسین masîn "هەڵمسان".

**ماك1 mak** [ *māk* ] - "1- شاهەنگ 2- ئەستوور بوونی جێگەی ئاوڵەکوتان 3- قۆپچە، دوگمە": خزمە دەگەڵ ↑ماق maq "چاوزەق".

**ماك2 mak** [ *māk* ] - "ئاسۆ، ئاسۆکە": خزمە دەگەڵ هێندێك وشە کە ئاماژە بە "رەشی و تاریکی" دەکەن، وەك ↑مژ *mıj*، مێش mêş [خۆڵەمێش xolemêş]. ئاسۆ ئەو شوێنە دوورەدەستە تەماوییەیە کە چاو ئەولاتری نابینێ و رەشکە و پێشکە دەکا.

[تێبینی: وشەی "ئاسۆ" بە پێچەوانەی "ماك" ئاماژە بە رووناکایی دەکا و مەبەست لە وشەکە دەبێ دواترین شوێنی رووناك بێ کە دێتە بەر چاوان، واتا ئاسۆ دە راستیدا سنوورێکە لەتێوان رووناکایی و تاریکاییدا].

**ماك3 mak** [ *māk* ] - "دایك": [زاو و ماك تێکەڵن]. بڕوانە ↑ماکە make.

**ماکە make** [ *māka* ] - "مادده، سەرچاوە، بەدیهێن": خزمە دەگەڵ ↑مێ me "دایکە".

**ماکەلە makele** [ *mākala* ] - "مارەیی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماڵ2 mal "خانەوادە، فامیل"دا باس کراون.

**ماڵ1 mal** [ *māl* ] - "1- سامان 2- کەلوپەلی بازرگانی 3- ئاژەڵ، وڵسات": وەك دەبینین وشەی ماڵ دەبێ مانایەکی بنەڕەتی هەبووبی و دواتر چەند مانایەکی دیکەی لێ کەوتبێتەوە. دە زمانی فارسیدا مال mal مانای "1- سامان 2- وڵسات" دەدا و هەروەها وەك جێناو بەکار دێ [مال من، مال تو (.P) māl e man "هی من"، (.P) māl e to "هی تو"]. ئەم وشەیە دەبێ دەبنەڕەتدا بە مانای "مەڕ و ماڵات" [ماڵ + ئات mal + at] بووبێ. ئەم مانایە دە وشەی "ماڵات"دا دەبیندرێ، هەروەها ماڵ و پەز mal u pez یش دەگوترێ. خودی وشەی ↑مەڕ mer دەبێ شێوەیەکی گۆڕدراوی "ماڵ" بێ. لێرەوە دواتر مانای "سامان و دارایی" پەیدا بووە کە سەرەتا ئاماژە بووە بە "ئاژەڵەکان" و دواتر "سامان" بە گشتی. وشەی مال mal (.Arb) کەوتووەتە ناو زمانی عەرەبیشەوە و بە مانای "سامان، دارایی" بەکار دێ. ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەواڵ kewal [↑سەواڵ sewal] بە مانای "ماڵات". ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ schmal (.G) و small (.E) "گچکە" [دە بنەڕەتدا: ئاژەڵی گچکە واتا بزن و مەڕ و هتد]. melōn (.Gr) "مەڕ، ئاژەڵی گچکە" و mīl (.OIn) "ئاژەڵ (ی گچکە)"و maal (.Nl) [دیالێکتی ناوەڕاست] "جوانەگا" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. لەم تێڕوانینەوە "ماڵ" دە بنەڕەتدا بە مانای "مەڕ و پەز" بووە، دواتر مانای "سامان و دارایی" پەیدا کردووە.

**ماڵ2 mal** [ *māl* ] - "1-خانەوادە، فامیل 2- خانوو [شوێنی حاوانەوەی خانەوادە]": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Gemahl (.G)، gimahalo (.OG) "هاوسەر، مێرد" و Gemahlin (.G) "هاوسەر، ژنی بە مێرد"، gimahalen (.OG) "ژوان کردن، دەزگیران گرتن". ئەم وشە ئەڵمانییانە دەچنەوە سەر mahal (.OG) "پێك گەیشتن، جڤین، ژوان، جڤات کردن، شوێنی پێك گەیشتن، قەراردادی هاوسەری". مانای بنەڕەتی وشەکە قەراردادی هاوسەرگیری بووە کە هەر دوو لایەنی دەزگیران لەبەردەم جڤات و کۆبوونەوەی خێڵ بەستوویانە، واتا ئەو پەیمانەی بە یەکتریان داوە. هەر لێرەدا شیاوی ئاماژە کردنە کە ئەو پەیمان و قەرارداده لە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا پێی دەگوترێ ↑مارە mare کردن. وشەی "مارە" دەشێ خزم بێ دەگەڵ وشەکەی ئەڵمانی کۆن کە لەسەرەوە باس کرا. وەك دەبینین وشەی مارە و مارە کردن چ پێوەندییەکی بە زمان و

فەرهەنگی عەرەبییەوە نییە، بەڵکوو وشەیەک و نەریتێکی چەند هەزار ساڵ کۆنە و پاش زاڵ بوونی ئیسلام، بەرگیکی ئیسلامی بە بەردا کراوە. لەوانەشە زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە زمانی کوردمادی وەرگرتبێ. ئەم وشانەی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی **< -mad* (IE.)** "پێک گەیشتن، هاتنەجەم یەکدی، جڤین، پەیمان بەستن". ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وشەی ماڵ، بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین وای بۆ بچین کە مانای "ماڵ" دە بنەڕەتدا "شوێنی بەیەک گەیشتن"ی دوو مارەکراوەکە بووبێ. جگە لەم وشانەی سەرەوە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑محاڵ mıħal یش هەیە کە مامۆستا هەژار بەم جۆرە ماناکەی لێکداوەتەوە: "کۆمەڵەئاواییەک لە سەر زەمیتیکدا کە سەر بە یەکترن" [وەک محاڵی یەختەچی، محاڵی باوەجانی]. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑مەهلا mehla هەیە بە مانای "گەڕەک". دوور نییە وشەکانی محل maħall (Arb.) و محلة maħalla (Arb.) لەم وشە کوردمادییانە وەرگیرابن. وەک دەبینین لێرەشدا پێوەندی بە چەمکی "پێک گەیشتن و کۆ بوونەوە" لە ئارا دایە. وشەی ↑مەڵبەند melbend یش دەشێ هەر لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرێ.

[تێبینی 1: هەر لەسەر پێوەندی دوو چەمکی "ماڵ" و "مارە کردن" دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی ئەڵمانی بکەین کە بریتین لە heiraten (G.) "مارە کردن" و Heim (G.) "ماڵ". ئەم دوو وشە ئەڵمانییە لە یەک ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. تێبینی 2: دە زمانی ژێرمەنییەکاندا ئەم وشانەی خوارەوە سەرنج رادەکێشن: meet (E.)، mētan (OE.)، mōtian (OS.)، moeten (Nl.) "رووبەڕوو بوون دەگەڵ یەکتر، هاتنە جەم یەکتر، جڤین، *میتینگ* بەستن"، moot (E.)، mōt (OE.)، mót (ON.) "جڤات، ئەنجومەن". دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی Oxford ی ئینگلیزیدا ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. لەوە دەچێ ئەم وشانە پێوەندییان بە ریشەکەی سەرەوە هەبێ. ناوی کەونارای میتان mîtan لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ].

**ماڵ³ mal** [ *māl* ] - دەگەڵ مشت دێ [مشتوماڵ mışt u mal واتا بە دەست داماڵین]. دەچێتەوە سەر کرداری ↑ماڵین malîn.

**مالاخمە malaxme** [ *mālāxma* ] - "خەرمانی کوتراو": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**ماڵتڤری maltıvrî** [ *māltıvrī* ] - "ئامرازێکی ئاش": کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn. بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑تەوەر tewer.

**ماڵتە malte** [ *mālta* ] - "وشەی سەرکۆنە": [ماڵتە بۆ وا تووڕەی؟]. ئەسڵی وشەکە مالاتە malate [ماڵا تە mala te] بووە واتا "ماڵی تۆ". وشەکە کۆنتر لەگەڵ کردارێک بەکار هێنراوە، بۆ وێنە گوتراوە مالا تە نەڕمێ، بو وا تووڕەی؟ خۆ ئەگەر کابرا تووڕەتر بووبێ، گوتوویانە مالا تە بڕمێ، بۆ وا تووڕەی؟! بۆ ریشەی وشەکە بڕوانە ↑ماڵ2 mal. چەنە وشەیەکی دیکەش هەر بەم مانایە بەکار دەهێنرێن وەک ماڵخراپ، ماڵوێران، ماڵکاول، ماڵشەوتی....

**ماڵشتن malıştın** [ *mālıştın* ] - "مشت و ماڵ دان": خزمە دەگەڵ↑ماڵین malîn "پێداخشاندن، رێخشاندن".

**ماڵکۆ malko** [ *mālko* ] - "دەسکی دینگی چەڵتووک کوتان": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**ماڵماڵ malmal** [ *mālmāl* ] - "ناوی قارەماتیکی کۆنە لە بەیتێکی کوردمادیدا": [ناسر و ماڵماڵ]. مارمار mārmār یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماڵ2 mal دا باس کراون.

**ماڵنج malınc** [ *mālınj* ] - "ماڵە": ↑ماڵە male.

**ماڵۆ malo** [ *māloِ* ] - "خێشک": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**مالۆچ maloç** ⌈ *mālоč* ⌉ - "گیایەکە لە ڕووەکی نیزیک خۆی پێچ دەخوا": هەڵیسەنگینە لەگەڵ ↑مەلۆ melo.

**مالۆس malos** ⌈ *mālos* ⌉ - "بەرازی مێ": خزمە دەگەڵ ↑مێ me. ئەم وشەیە سەرەتا فۆتیمی ل l وەرگرتووە [لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "دایە" و "دێڵ"]، پاشان پاشگری ئۆس os- بە وشەکەوە لکاوە. ئەم پاشگرە دە بنەڕەتدا پاشگری بەئاوەڵناو کردنە و ئاماژە بە دۆخی جەخت کردن دەکا [بڕوانە ↑ئۆز oz-]. ڕەنگە بەم پاشگرە ویستبێتیان ئاماژە بە زاو و زێی زۆری بەرازی مێ بکەن.

[تێبینی: وشەی Sau (G.) "دێڵەبەراز" خزمە دەگەڵ Sohn (G.) "کوڕ" و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زان"].

**ماڵە1 male 1** ⌈ *māla* ⌉ - "ئامرازی تیهەڵسوون و ڕێخشاندن": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**ماڵە2 male 2** ⌈ *māla* ⌉ - "پەڵەی دەم و چاو (ی ژنی دووگیان)": خزمە دەگەڵ Mal (G.) "پەڵە، نیشانە". دە زمانی ئاڵمانیدا بە "خاڵ" واتا نیشانەی سەر پێست دەگوترێ Muttermal (G.). [واتا: نیشانەیەک کە لە دایکەوە هاتووە، نیشانەی زگماک]. وشەی "خاڵ" یاخود "ماڵە" دە زمانەکانی دیکەدا بەمجۆرەیە: mole (E.)، mēl (OF.) سەر بە ریشەی **< **mel-* (IE.)** "ڕەش بوون، پیس بوون". ڕەنگە ئەوەش بگەڕێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر، واتا ***mei-* (IE.)** "تیهەڵسوون، پیس کردن". ] miaínein (Gr.) "تیهەڵسوون، لەکەدار کردن". ریشەی هیندوئەورووپی **mel-* چەندین وشەی دە زمانە جیاوازەکاندا دەچێتەوە سەر، وەک mélas (Gr.) "ڕەش"، mála (OIn.) "چڵک و چەپەر"، melyna (Lit.) "ڕەنگی شین"، melna (Opreus.) "پەڵەی ڕەش، شین بوونەوەی پێست"، malen (G.) "کێشانەوە، نیگارکێشان" [دە بنەڕەتدا واتا ڕەش کردن، لەککە یاخود پەڵە خستنە سەر کاغەز]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها دەگوترێ خاڵ و↑میل xal u mîl بە واتای "نەخش و نیگار" یان "خەت و خاڵ". "میل" پێوەندی بە "ماڵە"وە هەیە، هەروەک چۆن دە زمانی ئەڵمانیدا Mal "خاڵ، پەڵە، نیشانە" و malen "نیگارکێشان" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە.

**ماڵەفە malefe** ⌈ *mālafa* ⌉ - "سڕینەوە": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**ماڵەڤین malefîn** ⌈ *mālavīn* ⌉ - "نابووت بوون، هیچ بۆ نەمان": خزمە دەگەڵ ↑ماڵەفە malefe "سڕینەوە".

**ماڵیات malyat** ⌈ *mālyāt* ⌉ - "باج، پیتاک": مالیات mālāyt (P.). پێوەندی هەیە بە وشەی ↑ماڵ[1] mal "سامان".

**ماڵین malîn** ⌈ *mālīn* ⌉ - "1- گەسک دان 2- دەست پێداخشاندن، دەست ڕێخشاندن (داماڵین) 3- ساوین": [تێبینی: دە هەر سێ ماناکە دا چەمکی هاوبەش ڕێخشاندن و پێداخشاندنە. دە زمانی ئینگلیزیدا to rub و دە ئەڵمانیدا reiben (G.) ئەم چەمکە دەردەبڕن. هەر لێرەشدا دەتوانین ئاماژە بکەین بە کرداری فارسی روبیدن rūbīdan (P.) کە خزمە دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان و مانای "ماڵین، گەسک دان" دەبەخشێ]. کرداری ماڵین malîn دە زمانی کوردمادیدا دەچێتەوە سەر ریشەی ***(s)mel-* (IE.)** "ڕێخشاندن، تیهەڵسوون، هەروەها (بەهۆی ڕێخشاندنەوە) ورد کردن، نەرم کردن، سڕینەوە". وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشە دە زمانە جیاوازەکاندا، بۆ وێنە: مالیدن mālīdan (P.) "ڕێخشاندن، تیهەڵسوون"، mahlen (G.)، malen (Nl.)، mala (Sw.)، molare (L.)، molot (Rus.) "هاڕین، ورد کردن" [بە هۆی ڕێخشاندنی بەردی دەستار یان بەرداش]، Mühle (G.) "ئاش"، Mehl (G.) "ئارد"، Müll (G.) "زبڵ، ئاشغاڵ" [دە بنەڕەتدا وردە و

پرده]، malm (MG.) "تۆز"، malma (Gt.) "رەڵم"، malmen (G.) "پشاوتن، هاڕین، ورد کردن". دە زمانی کوردمادیدا کۆمەڵێک وشە پێوەندییان بەم وشەوە هەیە، وەک ↑ماڵە male "ئامرازی پێداخشاندن و تیهەڵسوون"، ↑ماڵۆ malo "خێشک"، ↑ماڵێب maleb "شەنە، شەن"، ↑ماڵتڤری maltıvrî "یەکێک لە ئامرازەکانی ئاش"، ↑مالەفە malefe "سڕینەوە، مشتوماڵ دان"، ↑ماڵ[3] mal [مشت و ماڵ]، ↑ماڵکۆ malko "دەسکی دینگی چەڵتووک کوتان"، ↑مالاخمە malaxme "خەرمانی کوتراوە"، ↑دەسماڵ des(t)mal "دەستەسڕ"، ↑مۆڵە mole "قوڕ" [کەرەستەی تیهەڵسوون و سواخ دان]. هەروەک لە سەروە باس کرا، پێوەندی هەیە لە نیوان چەمکی "ڕێخشاندن، ماڵین، پێداساوین" و "ورد کردن و نەرم کردن"دا، هەروەک چۆن دەخڵ و دان بە هۆی ڕێخشاندنی بەرداشەوە *ورد* دەبێ و لە هەمانکاتدا خۆڵێکی نەرمی لێ بەرهەم دێ. هەر بۆیە هێندێک وشەش دە زمانی کوردمادیدا کە پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە، مانای "نەرم، شل" دەگەیەنن وەک ↑مل mıl [شل و مل]، ↑مڵ mıl "نەرم بووکَ، بڵ"، ↑ماڵێز malez "هەویری شل"، مۆڵە mole "قوڕ".

[تێبینی: ئەم وشانەی سەرەوە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ دەستەوشەیەک کە لەژێر ↑مەڕە mere دا شی کراونەوە].

**مالینوس malînus** *[ mālīnūs ]* - "دەرمانەسوورەی چاو": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn "دەست پێداخشاندن، دەست ڕێخشاندن (پێداماڵین)".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەتوان" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "ساوین" و "هەڵسوون" (تیهەڵسوون). "هەتوان" دە بنەڕەتدا "هەسوان" بووە، پێشگری هە + سوان].

**ماڵێب maleb** *[ māleb ]* - "شەنە، شەن": ماڵێڤ malev و مەلهەب melheb یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**ماڵێز malez** *[ mālez ]* - "هەویری شل": خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn.

**مام1 mam 1** *[ mām ]* - "برای باوک": خزمە دەگەڵ ↑میمک mîmık "خوشکی دایک، پوور".

**مام2 mam 2** *[ mām ]* - دەگەڵ وشەیەکی دیکە دێ، وەک مامەگێژە mamegeje یان مامەسوورە mamesure. هەروەها مامالەگیجێ mamalegece و مامانەگیجێ mamanegece ش دەگوترێن. "مام" لەم وشانەدا چ پێوەندییەکی بە "مامە" و "مامان"ەوە نییە، بەڵکوو مانایەکی دیکەی هەیە. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ریشەی **(IE.) *meu- <** "جوولان، بزوان" و خزم بێ دەگەڵ ↑ملیان mılyan "بزوان". کرداری movere (L.) "بزواندن" لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: وشەکانی مامەگێژە و مامەسوورە لەدوو کەرت پێک هاتوون کە هەردووکیان یەک مانا دەبەخشن، هەروەک باوەخولێ، بانگەواز، بانگەشە، سامۆتک و هتد. تێکخستنەوەی دوو وشە [کەرتەوشە]ی هاومانا دوخێکی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشێ، واتا بۆ وێنە "بانگەواز" بانگێکی بڵێندترە و بە هێزترە لە "بانگ"ی ئاسایی].

**مامان maman** *[ māmān ]* - "ژنی یارمەتیکەر لە کاتی زاندا": خزمە دەگەڵ مەمە meme و ↑مەمک memık.

**مامر mamır** *[ māmır ]* - "مریشک": ما ma [↑مێ me] + مر mır. کەرتی دووەم دە وشەی ↑مریشک mırîşık یشدا دەبیندرێ و خزمە دەگەڵ ↑مەل mel. مامر دەبنەڕەتدا دەبێتە "مەلی مێ".

**مامز mamız** *[ māmız ]* - "ئاسک": ما ma + مز mız. کەرتی یەکەم واتا ↑مێ me. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑مس[2] mıs "بزن". تێکڕای وشەکە واتا "بزنی مێ".

مامش **mamış** [ *māmiš* ] - "بێدەنگ، کڕ و مات": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ mump (E.) "کز و مات و بێدەنگ". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە.

مامک **mamık** [ *māmık* ] - "مەتەڵۆکە": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ mummen (G.)، momon (OFr.) "شاردنەوە (لەژێر دەمامکدا)، جل گۆڕین بۆ نەناسرانەوە"، Mumme (G.) "دەمامک، دەمامکدار، خۆگۆڕیو (لە جلو بەرگدا)". وشە ئەورووپییەکان ریشەیان بۆ لاسا کردنەوەی دەنگی زارۆک دەگەڕێتەوە.

مان1 **man 1** [ *mān* ] - "لە شوێتێک وەستان، لە دۆخێکدا وەستان": ماندن (P.) māndan. خزمە دەگەڵ manēre (L.) "مان، مانەوە". ریشە؟

مان2 **man 2** [ *mān* ] - دەگەڵ پێشگری "را" دێ، ↑رامان raman واتا "دە بیرەوە چوون، بیر کردنەوە". خزمە دەگەڵ mahnen (G.)، manōn (OG.)، manen (Nl.)، manian (OE.) "وە بیرهێنانەوە، بە تەوژم داوا کردن"، munter (G.)، mandras (Lit.) "زیت، وریا، سەرزیندە، چەلەنگ"، mudryj (Rus.) "ژیر، زیرەک"، manthánein (Gr.) "فێر بوون"، mens (L.) "مانا، بیرۆکە"، maínesthai (Gr.) "هورووژان، هەژانی دەروونی"، manía (G.) "شێتی، لە کەللە دان"، سەر بە ریشەی **<** ***(IE.) *men(ə)-*** " بیرکردن(ەوە)، هێنانە بەرچاو، چالاکی هزری، هورووژان". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑مینە2 mîna "وێنە، وێکچوو، هاوشێوە"، ↑مان3 man "وێکچوون" و ↑مینە mîne "توێژینەوە".

مان3 **man 3** [ *mān* ] - "وێک چوون": ↑مینین mînîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑مان2 man [رامان raman] "دە بیرەوە چوون، بیر کردنەوە".

مان5 **man 5** [ *mān* ] - "پێ چەقاندن، خۆ بواردن، ئیعتیساب":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مان1 man "لە شوێتێک وەستان، لە دۆخێکدا وەستان و نەبزووتن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑مان2 man و مەبەست "هەژان و هورووژانی دەروونی" بێ. لەوانەیە وشەی ↑ماندەل mandel "حاشا کردن" [دە بنەڕەتدا: نەچوونە ژێربار، نەپەژراندن] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

مانا **mana** [ *mānā* ] - "واتا، نیاز و مەبەست لە وتە": خزمە دەگەڵ mean (E.)، ma nan (OE.)، meinen (G.)، meinan (OG.)، menen (Nl.) "مەبەست بوون، مانا هەبوون، دەربڕین، لە هزردا بوون"، mind (E.) "هزر"، meaning (E.) "مەبەست، مانا"، Meinung (G.) "بیر وڕا، *رامان*"، měniti (Oslw.) "دەربڕین"، mīan (OIr.) "ویست، نیاز، ئارەزوو". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑مان2 man [رامان raman واتا "دە بیرە چوون، بیر(لێ) کردنەوە"] و سەر بە ریشەی **<** ***(IE. *men(ə)-*** "بیرکردن(ەوە)، هێنانە بەرچاو، چالاکی هزری، هورووژان".

[تێبینی: لەوانەیە مرۆڤ وا بیر بکاتەوە کە وشە کوردمادییەکە ریشەی عەرەبی هەیە و لە معنی maɛnī (Arb.) وەرگیراوە. بەڵام پێچەوانەکەی راستە، واتا وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیراوە. زمانی عەرەبی وشەکەی وەرگرتووە، "ع" یەکی زێدەی تێخستووە و پاشان لەم وشەوە کرداری دروست کردووە (اعنی، تعنی، یعنی...). ئەگەر وشەکە بە ئەسڵ عەرەبی بایە، دەبوایە فۆتیمی m لە کردارەکاندا دەربکەوتایە و شتیکی لەم چەشنە دروست ببوایە "امنی، تمنی، یمنی ...". سەبارەت بە وەرگرتن و گۆڕانی وشەکان نموونەی لەم بابەتە لە زمانی عەرەبیدا زۆرە. نموونەیەکی دیکە وشەی "مسجد"ە، ئەم وشەیەش وەک مامۆستا حەسەن قزڵجی ئاماژەی پێ کردووە، لە "مەزگەفت"ی پەهلەوی وەرگیراوە، دوای هێندێک

گۆڕان بووەتە "مسجد" و ئەوجار لەمەوە وشەی "سجده" دروست کراوە و پاشانیش ئەم وشەیە کرداری لێ دروست کراوە (اسجد، تسجد، یسجد...)].

ماندەل **mandel** [ *māndal* ] - "حاشا کردن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مان[5] man "پێ چەقاندن، خۆ بواردن، ئیعتیساب".

مانقێر **manqer** [ *mānqer* ] - "هەژار، نەدار": خزمە لەگەڵ ↑مسری mısrî "کز و لاواز"، mager (G.)، (Nl.) و (Sw.)، magar (OG.)، ma ger (OE.) "لاواز، بێهێز، بێ پێز". هەروەها دەگەڵ macer (L.) "باریک"، makros (G.) "گەورە" [دە بنەڕەتدا: باریک و درێژ] سەر بە ریشەی **>** ***mak-*** ***(IE.)*** "باریک و بنیس". لە وشەی "مانقێر"دا فۆتیمی n وەک زێدە خزاوەتە ناو وشەکەوە. سەبارەت بەم گۆڕانە، واتا تێخزانی فۆتیمی n لە هێندێک وشەدا، بڕوانە وشەی "مەنگوڕ".

مانگ **1mang** [ *mang* ] - "گۆی دەوری زەوی": ماه mah (P.)، Mond (G.)، moon (E.)، mane (Sw.)، mena (Gt.)، mona (OF.)، menuo (Lit.)، men (Gr.)، mā- (OIn.) سەر بە ریشەی **>** ***mēnōt-*** ***(IE.)*** "مانگ، مانگ گوران"، سەر بە ریشەی **>** ***me(d)-*** ***(IE.)*** "گەڕان، پێوان". وشەی مانگ دە بنەڕەتدا مانایەکی هەبووە وەک "گەڕۆک (بە ئاسماندا)".

مانگ **2mang** [ *māng* ] - "بەشێک لە 12 بەشی ساڵ": ماه mah (P.)، Monat (G.)، mānōd (OG.)، mōnath (OF.)، month (E.)، manad (Sw.)، menuo (Lit.)، mensis (L.)، men (Gr.)، mā- (OIn.). خزمە دەگەڵ ↑مانگ1 mang "گۆی دەوری زەوی".

مانگیر **manger** [ *mānger* ] - "شەنەیەکی دەمخوارە بۆ پووش کۆکردنەوە": لەوانەیە ئەسڵی وشەکە *ماگیر mager** بووبێ و فۆنێمی n وەک زێدە خزابێتە ناوی. لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑مکارە mkare "ئامرازی دارکۆڵین".

مانیاق **manyaq** [ *mānyāq* ] - "شێت، لێوە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مان2 man دا هاتوون، بە تایبەتی manía (G.) "شێتی، لە کەللە دان".

ماوش **mawş** [ *māwš* ] - "گیرەی پیشەسازان، مەنگەنە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ماشە maşe "گاز".

ماوە **mawe** [ *māwa* ] - "1- ئەندازەیەک لە کات یان شوێن [ماوەی دووساڵە نەمدیووی، ماوەی ئێرە تا ئەوێ] 2- دەرفەت". لەوانەیە شێوەی سواوەی ↑مەودا mewda "تیوان، فاسیلە" بێ.

ماه **mah** [ *māh* ] - "(شاخی) سەخت": ئەم وشەیە دەگەڵ "ئەستەم" دێ [ماه و ئەستەم] یان لەگەڵ "زەرد" [ماه و زەرد] و ئاماژە بە دژوار و ئەستەم بوونی چیا دەکا. ماهوور mahur یش دەگوترێ بە مانای "شاخی هەڵەمووت". لە پێوەندی لەگەڵ ئەم وشەیە چەندین وشەی دیکەش سەرنج رادەکێشن کە لەژێر ↑مایی mayî دا باس کراون.

[تێبینی: وەک باس کرا، وشەکە یان لەگەڵ "ئەستەم" یان لەگەڵ "زەرد" دێ. هەر دووکی ئەم وشانەش خۆیان ئاماژە بە مانای "سەخت بوون" دەکەن].

ماهووت **mahut** [ *māhūt* ] - "پارچەیەکی پەشمینی ئەستوور": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ↑مایی mayî.

ماهوور **mahur** [ *māhūr* ] - "شاخی هەڵەمووت": بڕوانە ↑ماه mah "(شاخی) سەخت" و دواتر ↑*مایی mayî*.

ماهەک **mahek** [ *māhak* ] - "پەنمانی پێست (لە پاش دەرزی لێدان)": خزمە دەگەڵ ↑مایی mayî.

ماین **may(î)n** [ *māyīn* ] - "ئەسپی مێ": مادینە mādīne (.P) "ئاژەڵی مێ". دەچێتەوە سەر ↑مێ me.

ماینچەقەڵ **mayınçeqel** [ *māyınčaqal* ] - "چەرخ و فەلەك كە زارۆك سواری دەبن": كەرتەوشەی چەقەڵ çeqel شێوەیەكی دیكە لە ↑چەرخ çerıx. كەرتی یەكەمی وشەكە لەوانەیە ↑مەكینە mekîne "دەزگا" بووبێ.

مایە1 **maye 1** [ *māya* ] - "1-سەبەب 2- ماك": مایە (māye) [مایەی خۆشی، مایەی ژیان و ...]. وشەكە بەم مانایەوە لەوە دەچێ شێوەیەكی گۆڕدراو بێ لە ↑مادە1 made 1 "1- كەرەستە، شتومەك 2- دایك (بەدیهێنەر)، عیللەت".

مایە2 **maye 2** [ *māya* ] - "هەوێن، ئامیان": دەشێ پێوەندی بە یەكێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑مادە3 made 3 "هەوێن، ئامیان".

2- ↑مایە3 "تیری، پتەوی". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەكە دەبێتە "ئەو شتە كە مەیین و پتەو بوونی تراوێك دروست دەكا".

مایە3 **maye 3** [ *māya* ] - "تیری، پتەوی": خزمە لەگەڵ ↑مایی mayî.

مایی **mayî** [ *māyī* ] - لەگەڵ "دەشت" دێ، مایيدەشت mayîdeşt یان ماهیدەشت mahîdeşt "مەڵبەندێكە لە كوردستان". "مایی" یان "ماهی" لێرەدا ناشێ چ پێوەندییەكی بە چەمكی "ماسی"یەوە هەبێ، چونكوو "دەشتی ماسی، ماسیدەشت" مانایەك بە دەستەوە نادا. بەڵام وشەكە لەباری ئێتیمۆلۆژیكەوە دەگەڵ وشەی "ماسی، ماهی" خزمە. ئەم وشەیە هەروەها خزمە لەگەڵ چەند وشەیەكی دیكە وەك ↑ماە mah [شاخی سەخت و ئاستەم]، ↑ماهوور mahur "شاخی هەڵەمووت"، ↑ما ma [دوكڵێوەكە مای هێناوە، واتا خۆی گرتووە و توند بووە]، ↑مەیر meyır "دۆكڵێو" [دە بنەڕەتدا: خۆگرتوو، نەك تراو]، ↑ماهەك mahek "پەنمانی پێست لەپاش دەرزی لێدان" [ئەستوور بوون و سەخت بوونی پێست]. دەشێ ↑ماهووت mahut "پارچەیەكی ئەستوور" و ↑مایيچە mayîçe و ↑ماسوولكە masluke ش یش پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ. جگە لەمانە ↑مەیین meyîn [مەهین mehîm] هەیە بە مانای "خۆ گرتن و توند بوون. وشەی "مەیین" پێوەندی بە وشەكانی "ئامێتە" و "امیختن"ی فارسییەوە نییە، بەڵكوو كردارێكی سەربەخۆ بە مانای "سەخت بوون، سفت بوون"ە. ئەو شتەی ئەم بۆچوونە پشتراست دەكا، ئەوەیە كە دە زمانی كوردمادیدا ↑مەیاندن meyandın بە مانای "سفت كردن" و هەروەها "كردنەسەهۆڵ" بەكار دێ و جگە لەمە ↑ماسین² masîn هەیە بە مانای "مەیینی چەوری بە سەر شتێكەوە". كەوابوو ئەم "ماسین"ە دەتوانێ شێوەی كۆنتری "مەیین" بووبێ. هەروەها لەپێوەندی لەگەڵ ئەم وشانەدا، وشەی ↑مەست mest یش جێی هەڵسەنگاندنە كە بەم مانایانە بەكار دێ: 1-سەرخۆش 2- تێر 3- تەوەزەل 4- تەزیو". ئەگەر سەرنجی گشت ماناكان بدەین، دەردەكەوێ كە چەمكی "سەخت و قورس بوون" لە هەمووانیدا هاوبەشە. ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑مێش3 mêş 3 "هێز"، سەر بە ریشەی < **(IE.)** ***magh-** "توان، هێز" [سەختی، پتەوی].

[تێبینی1 : ئەو وشانەی دە زمانی كوردمادیدا پێوەندییان بە چەمكی "مەیین، توند بوون، رەق بوون"ەوە هەیە، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی كە مانای "سەختی، هێز" یان "بەرد" دەبەخشن، بۆ وێنە "سەهۆڵ"، "قەمرین"، "قەرسین"، "تۆلا" و هتد. تێبینی 2: هەروەها سەبارەت بە پێوەندی وشەكانی دەربڕی مانای "ئەستوور بوون، ماسین" و مانای "پتەو و بەهێز بوون" بڕوانە وشەی "بڕست"].

مایيچە **mayîçe** [ *māyīčā* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ماسوولکە masluke. بڕوانە وشەیەک سەرتر، ↑مایی mayî.

**مت1 mıt** [ *mıt* ] - "پووڵ یان شتێک کایەی لەسەر دەکرێ": خزمە لەگەڵ ↑ئامانج amanc [بە فارسی: اماج āmāj (P.) "هەدەف، نیشانە"] و دواتر ↑*مێزاندن mêzandın* "تەماشا کردن". وشەی ↑هەڵماتین helmaten یان ↑مێشێن mêşên لەم وشەوە هاتووە.

**مت2 mıt** [ *mıt* ] - "مووروو": [مت و موور، مت و مووروو، مت و موورە، مت و موورگ]. خزمە لەگەڵ ↑میت mît "زەق، خڕەکە".

**متاندن mtandın** [ *mtāndın* ] - "1- لە زەوی توند کردن 2- توند بە هەرداداں": جێی بەراوردکردنە دەگەڵ meizan (OG.)، maitan (Gt.)، meita (OIs.) "قەڵشاندن، شکاندن، کوتان". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *mait- (Grm.)*.

**متک mıtık** - "گردۆلکە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑میت mît "1- قیتایی 2- بەرزایی، گرد"دا باس کراون.

**متوو(ن) mıtû(n)** [ *mıtū(n)* ] - "هۆگر": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مزاندن mızandın "لکاندن، چەسپاندن".

[تێبینی: لە زمانی ئاڵمانیدا Anhänger مانای "لایەنگر، پێڕەو، پێوەلکاو" دەدا کە ماناکەی نیزیکە لە "هۆگر"، هەروەها anhänglich دەبێتە "بەئەمەگ، وەفادار". ئەم وشانە دەچنەوە سەر anhängen "پێوەلکاندن، پێوەبەستن، لێ قایم کردن"].

**متە mıte** [ *mıta* ] - "بەدەڵ، زڕ، نەڕاست": ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ریشەی **< *mei- (IE.)*** "گۆڕین، گۆڕینەوە، جێگۆڕکێ کردن". "متە" ئەو شتەیە کە "گۆڕاوە" و جێگەی شتە ئەسڵییەکەی گرتۆتەوە. وشەی "بەدەڵ"یش ئەم مانایە دەبەخشێ و خزمە لەگەڵ "تبدیل" بە مانای "گۆڕین". مانای "گۆڕینەوە" لە وشەی ↑بارمتە barımte شدا خۆی دەبینێتەوە. بارمتە دە ئەسڵدا بە شتێک گوتراوە کە لەبری شتێکی تر لای کەسێک دادەندرێ و گۆڕینەوەی پێ دەکرێ. لەوانەیە ئەسڵی ئەم وشەیە بەرمتە *bermıte** بووبێ.

**مجرو1 mıcro** [ *mıjro* ] - دەگەڵ "ماندوو" دێ [ماندوو و مجرۆ mandu u mıcro]. خزمە دەگەڵ mühen (G.) "ماندوویەتی"، moeien (Nl.) "ماندوو کردن"، majat (Rus.) "ماندوو کردن، زەحمەت دان"، moles (L.) "زەحمەت، ماندوویەتی"، سەر بە ریشەی **< *mō- (IE.)*** "ماندوو بوون، ئەرک کێشان".

**مجرو2 mıcro** [ *mıjro* ] - "کوێر": خزمە دەگەڵ ↑مژ mıj "تەم و دوومان".

**مجێز mıcêz** [ *mıjez* ] - "واز، ئیشتیا": خزمە دەگەڵ ↑مەگیرانی megîranî.

**مجێور mıcewır** [ *mıjewır* ] - "خزمەتکاری مزگەوت": مجەور mıcewır یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا مزبەر mızber یان مزوەر mızwer بووە، واتا کرێکار یاخود کەسێک کە لەپای کارەکەی ↑مزد mızd وەردەگرێ. وشەی مزبەر mızber یش دە زمانی کوردمادیدا بەکار دەهێنرێ.

**مچ1 mıç** [ *mıč* ] - "قووت کردنی گوێ": مووچ muç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑میت mît "قوت، قیت".

**مچ2 mıç** [ *mıč* ] - "چنگنە": [جۆرێک گەنەیە]، مچک mıçık یش دەگوترێ. هەروەها ↑مچکە mıçke هەیە بە مانای "جۆرێک زۆرەوانی" [مشتومڕ] لەم وشانەدا مانای "پێوەنووسان،

چەسپان" بەدی دەکرێ. هەربۆیە ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑مزاندن mızandın "لکاندن، چەسپاندن".

**مچاندن mıçandın** [ *mıčāndın* ] - "گلۆفین، گوشین": خزمە دەگەڵ ↑مزاندن mızandın "لکاندن، چەسپاندن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵشێلان".

**مچڕاندن mıçrandın** [ *mıčrāndın* ] - "دەست لێکدانەوە، تۆقە کردن": مچڕین mıçrîn ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑متاندن mtandın "1- لە زەوی توند کردن 2- توند بە هەردادان" و جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ meizan (OG.)، maitan (Gt.)، meita (OIs.) "قەڵشاندن، شکاندن، کوتان". وێ دەچێ مانای بنەڕەتی وشەکە یان ریشەکە "لێدان، کوتان" بێ.

[تێبینی: لە وشەی "دەست لێدانەوە" یان "دەست لێکدانەوە"شدا چەمکی "لێدان" بەدیار دەکەوێ. هەروەها وشەی "تۆقە" کردن دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، لێکدران"].

**مچقاسە mıçqase** [ *mıčqāsa* ] - "نووسەکە، نووسەنەک": خزمە لەگەڵ ↑مچ mıç "چنگنە (جۆرێک گەنە)".

**مچقین mıçqîn** [ *mıčqīn* ] - "هیشک بوونی کانیاو": [کانیا من مچقی]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ریشەی **< -mak*** **(IE.)** "باریک و بنیس". ↑مسری mısrî "کز و لاواز"، mager (G.)، (Nl.) و (Sw.)، magar (OG.)، ma ger (OE.) "لاواز، بێهێز، بێ پێز" لەم ریشەوە هاتوون.

2- ↑مسکین *mıskîn* "هەژار، رەش و رووت": ئەم وشەیە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Meise (G.)، meisa (OG.)، mees (Nl.)، mes (Sw.) "ناوی پەلەوەرێک"، meis (Norv.) "لەڕ و لاواز، بێ هێز".

[تێبینی: فۆتیمی ق q لە وشەی "مچقین"دا ناوگرێکە کە لەگەڵ ژمارەیەک کردار دێ و نیشانەی جەخت کردنە، وەک هەڵبزووقین، مرقاندن، زرووقاندن و ...].

**مچکاندن mıçkandın** [ *mıčkāndın* ] - "گرێو کردن، مەرج کردن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مەتە mıte "بەدەڵ، زڕ، نەڕاست" و ↑بارمتە barımte. [دە فارسیدا بە "بارمتە" دەگوترێ "گروگان" و ئەمەش پێوەندی چەمکەکانی "گرێو" و "بارمتە" بە یەکەوە نیشان دەدا].

**مچکە mıçke** [ *mıčka* ] - "چکۆس، خەسیس":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مچ mıç "چنگنە (جۆرێک گەنە)". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کردارێک بە مانای "پێوەنووسان، چەسپان". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، "مچکە" دەبێتە کەسێک کە وەک گەنە بە ماڵی دنیاوە دەنووسێ و لێی نابێتەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑مچقین mıçqîn "هیشک بوونی کانیاو" [دە بنەڕەتدا: کەم بوون، کز و لاواز بوون؟].

**مچوورک mıçûrk** [ *mıčūrk* ] - "تەزوو": دە ئەسڵدا ↑موو mu + چرک çırk، واتا ↑چیڕ çîr بوونەوە [توند بوون و راست بوونەوەی] موویەکانی لەش بە هۆی سەرما، ترس یان فاکتۆری دیکە.

**مچوون mıçûn** [ *mıčūn* ] - "پەل، دەست و پێ": خزمە دەگەڵ ↑مەچەک meçek.

**مچەو mıçew** [ *mıčaw* ] - "تەڕایی، شێ": خزمە دەگەڵ ↑مۆژ moj "ئەستێرکی بچووک".

**محاڵ mıĥal** [ *mıĥāl* ] - "کۆمەڵەئاواییەک لە سەر زەمیتێکدا کە سەر بە یەکترن": [وەک محاڵی یەختەچی، محاڵی باوەجانی]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ماڵ² mal "شوێنی حەوانەوەی خێزان".

محەل **mıĥel** [ *mıĥal* ] - "دەم، کات": [پارەکە ئەم محەلە، لەم محەلانەدا دێت]. خزمە لەگەڵ Mal (G.)، meal (E.)، mal (Sw.) "دەم، ژەم، کات(ێکی دیاریکراو)". مانای بنەڕەتی وشەکە "پێوراو، ئەندازەگیراو" بووە و دەبێتە خزم لەگەڵ ↑مەزەندە mezende.

مخ **mıx** - "دەنگی لووت": [مخەمخ]. شێوەیەکی دیکە لە ↑مشە mışe.

مخابن **mıxabın** [ *mıxābın* ] - "حەیف، بەداخەوە": مەخابن mexabın یش دەگوترێ. لەوە دەچێ مانای وشەکە لە کۆندا هێندێک جیاواز بووبێ لە مانای ئێستاکەی. ئەم وشەیە دەگەڵ ئەو وشانە رێک دەکەوێ کە لە ژێر ↑مێش[3] mêş "هێز"دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هێز، توانایی، دەسەڵات". ئەگەر لەم روانگەوە سەیری وشەکە بکەین، دەردەکەوێ کە مانای ئەسڵی وشەکە "قەدەر، جەبر" بووە [سەرنج بدە کە "جەبر" شێوەی عەرەبێنراوی "زەبر" و "زۆر"ی کوردمادییە [زەبر و زەنگ، زەخت و زۆر]. لێرەدا مەبەست زەبری رۆژگار یان جەبرێکە لە لایەن خوداوە کە هیچی دەگەڵ ناکرێ و زاڵە بەسەر مرۆڤدا. وشەی "قەدەر"ی عەرەبیش خۆی دە ئەسڵدا مانای "هێز" دەبەخشێ. پێشینیان کاتێک لە باسی رووداوێکی ناخۆشدا گوتوویانە "مخابن"، مەبەستیان ئەوە بووە کە ئەو رووداوە "قەدەر"بووە، "جەبر" بووە و مرۆڤ لە ئاستیدا بێ توانایە و ناچارە ملی پێ بدا. کەرتی بن bın- دە وشەی مخابن mıxabın دا لەوانەیە پێوەندی بە کرداری ↑بوون bun ەوە هەبێ. هەروەها بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑مخانە mıxane "تیرەیەکی کورد" [دە بنەڕەتدا: تیرەیەکی بەهێز، وشەکە خزمە دەگەڵ وشەی "موکری"].

مخانە **mıxane** [ *mıxāna* ] - "تیرەیەکی هۆزی بڵباس لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑مێش mêş "هێز، توان".

مخەت **mıxet** [ *mıxat* ] - "دارێکە چەرمی پێ لووس دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın، ↑مشت mışt و ماڵ دان، ↑مچاندن mıçandın و↑مزاندن mızandın. ئەم وشانە ئەم مانایانە دەگرنە خۆ: پێداهێنان، رێخستن، پێداماڵین، شێلان، گوشین.

مدارا **mıdara** [ *mıdrā* ] - "سەبر و حەوسەلە": مدارا modārā (P.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مدران mıdran "1- راوەستان 2- ئۆقرە گرتن".

مدران **mıdran** [ *mıdrān* ] - "1- راوەستان 2- ئۆقرە گرتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑مەزران mezran [دامەزران damezran].

مڕ**1** **mır** - دەگەڵ "مشت" دێ [مشت و مڕ mışt u mır واتا دەمەقرە]. خزمە لەگەڵ márnasthai (Gr.) "بەشەر هاتن، لەیەکتر سرەواندن" و ئەمەش خۆی خزمایەتی هەیە لەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑مەڕە[1] mere دا شی کراونەوە. ئەم وشانە هێندێک مانای وەک "رێخشاندن، رێکگوشین، چەسپاندن، کوتان، هاڕین ..." دەبەخشن و وشەی "مشت"یش هەر هەڵگری ئەم مانایانەیە.

مڕ**2** **mır** - "زۆر ورد و نەرم": خۆڵەمڕە واتا خۆڵێکی زۆر ورد و نەرمی وەک تۆز. خزمە دەگەڵ Mehl (G.) "ئارد"، Mühl (G.) "زبڵ" [دە بنەڕەتدا: تۆز و خۆڵ] و mahlen (G.) "هاڕین". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ماڵین malîn و ژمارەیەک وشەی دیکە.

مڕ**3** **mır** - "تیر": مڕ بوون واتا زۆر تیر بوون. وەک دەبینین وشەکە پێوەندی بە تیر و تەسەلی و تیر و پڕییەوە هەیە. خزمە دەگەڵ mehr (G.)، more (E.)، mer (Sw.)، mēr (OG.) "زۆرتر، مەزنتر"، سەر بە ریشەی **< *me- (IE.)*** "مەزن، بەرچاو، گرینگ". merōn (OG.) "زۆرتر کردن، گەورەتر کردن، māren (OG.) "راگەیاندن، پێداهەڵدان" [دە بنەڕەتدا: راگەیاندنی گەورەیی و

گرینگی]، mār (OIr.) "مەزن"، -mōros (Gr.) "مەزن، گرینگ" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. ↑مەزن mezın ی کوردمادیش هەر لەم ریشەوە سەرچاوەی گرتووە. بە ورد بوونە لەم وشانە و ماناکانیان بەو ئەنجامە دەگەین کە وشەی ↑میر mîr "شا، مەزن، حاکم" دە ئەسڵدا وشەیەکی کۆنی کوردمادییە و پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. شێوەیەکی دیکەی وشەکە، واتا ئەمیر emîr پێکهاتووە لە پێشگری ئە e + میر mîr. دە زمانی عەرەبیدا وشەکانی امر amr، امیر amīr و امارة imāra (Arb.) و هیتر بە شیمانەیەکی بەهێز لەم وشە کوردمادییە وەرگیراون.

مر[4] **mır** - "مۆن": [مر و مۆن]. خزمە دەگەڵ ↑مرووچ mırûç "کز و خەمبار". دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مر1 mır [مشت و مر].

مراتە **mırate** [*mırata*] - "لکی یەکساڵە": خزمە دەگەڵ ↑مل mıl [شل و مل]. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "نەمام" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "نەوی" بە مانای چەماو، داهاتوو ["دانەواندن" واتا داهێنان، خوارکردنەوە]. کەوابوو ناوی "مراتە" یان "نەمام" بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لکی جەوان، شلکە و بەم لا و ئەو لادا دەچەمێتەوە.

مراندن **mırandın** [*mırāndın*] - "بۆڵاندنی بە تووڕەیی": [زۆرتر بۆ سەگ و پشیلە بەکار دێ]. خزمە دەگەڵ murren (G.) "بۆڵاندن"، murmeln (G.)، murmurare (L.)، mormyrein (Gr.) "دەنگی کز و ناڕوون لە خۆ دانە دەرەوە" و mürisch (G.) "قەڵس، مۆن، ناقایل". ریشەی ئەم وشانە لاسا کردنەوەی دەنگیکی ناروونە. مۆرە[4] more "لۆرە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

مرت **mırt** - دەگەڵ "خرت" دێ [خرت و مرت xırt û mırt واتا نەرم و نۆڵ]. بڕوانە ↑مەڕە mere "پێمەرە".

مرتک **mırtık** - "بن ئاو کەوتوو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑مەلە mele.

مرتۆخە **mırtoxe** [*mırtoxa*] - "چێشتی ئارد و رۆن و شەکر": خزمە دەگەڵ ↑مەڕە[1] "پێمەرە".

مرتین **mırtîn** [*mırtīn*] - "شلی، خاویلکەیی": خزمە دەگەڵ ↑مەڕە[1] "پێمەرە".

مرتێل **mırtel** [*mırtel*] - "دۆشەک": خزمە دەگەڵ ↑مەڕە[1] "پێمەرە".

مرچ **mırç** [*mırč*] - دەگەڵ "مۆن" دێ [مۆن و مرچ mon u mırç].

1- لە لایەکەوە وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑مرووچ mırûç "1- کز و خەمبار 2- چارەرەش".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە لەدەگەڵ mars (Gr.) "خوای شەڕ". martiālis (L.) بەو شتانە گوتراوە کە هی خوای شەڕ بوون. ئەم وشەیە کەوتووەتە ناو زمانی ئەڵمانی و بە مانای "شەڕانی، تووڕە" بەکار دێ.

مرچقاندن **mırçıqandın** [*mırčıqāndın*] - "لەناو پەنجەدا گوشین": مرچقین mırçıqîn یش هەیە بە مانای "چرچ بوون، رێککوشران". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی کە دەچنەوەی سەر ریشەی "رێخشاندن، پێداخشاندن"، وەک ↑مریستن mırîstın "مشتن، مژین" و ↑مەڕە *mere* "پێمەرە". فۆتیمی ق q ناوگرە و نیشانەی جەخت کردنە.

مرخ **mırıx** - "تەماح، تاسە، مەیل": خزمە دەگەڵ ↑مەراق meraq "تاسە، مەیل".

مرخاندن **mırxandın** [*mırxāndın*] - "پرخاندن": هەروەها مرخێش mırxêş هەیە بە مانای "هەناسەسوار بوون بە کێشانی شتی قورس" [مرخێش مرخێش دەیکێشا] و ↑مرژاندن mırjandın "مڕاندنی سەگ"، ↑مرقاندن mırqandın "دەنگ لە گەروو دەرهێنان بێ دەم کردنەوە". خزمە دەگەڵ ↑مراندن mırandın "1- بۆڵاندن 2- دەنگیکی ناڕوون دانە دەرەوە".

مرخێس **mırxês** [*mırxes*] - "جێگەی لێ گەوزینی یەکسم": هەروەها مرخێسانێ mırxêsanê هەیە بە مانای "گەمەی یەکتر لە خۆڵدا گەوزاندن". خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەڕە[1]

*mere* [پێمەڕە] دا هاتوون و مانای "ڕێخشاندن" دەبەخشن. بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ márnasthai (Gr.) "بەشەرهاتن، لەیەکتر سرەواندن" [مشت و مڕ کردن].

**مرداق mırdaq** [ *mırdāq* ] - "دەپ و چرپی بان ئاڵوودار": دەشێ پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ کە ماناکانی "ڕێککوشین، شێلان، کوتان، پان کردنەوە" دەبەخشن، وەک ↑مەرسین mersîn "پشاوتن، ڕێککوشین"، ↑مەرچاندن merçandın "پلێخاندنەوە"، ↑مرچقاندن mırçıqandın "لەناو پەنجەدا کوشین" و دواتر ↑مەرە¹ *mere* [پێمەڕە]. لەم تێڕوانینەوە "مرداق" ئەو شتەیە کە لەسەر بان دەپەستێورێ.

**مردن mırdın** - "ژیان لەدەست دان": مردن mordan (P.). خزمە دەگەڵ mori (L.) "مردن"، Mord (G.)، morth (OF.) "کوشتن، مراندن"، marate و miryate (OIn.) "دەمرێ"، mirti (Lit.) "مردن"، marb (OIr.) "مەرگ"، brotós (Gr.) "میرا" [فۆتیمی m بووەتە b]، mar (Pl.) "پیاوکوژ"، سەر بە ڕیشەی ***(IE.) *mer- <*** "مردن" [دە بنەڕەتدا: تێهەڵسوواو، مشتوماڵ دراو]. دە سەردەمە کۆنەکاندا مردووەکان ڕۆنیان تێهەڵسوواوە یان بە هێندێک داو و دەرمان لاشەکان مشتوماڵ دراون". دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەرە¹ *mere* [پێمەڕە] دا باس کراون. هەروەها دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ماڵ mal [مشتوماڵ]، ↑*ماڵین malîn* "گەسک دان، ڕێخشاندن"، ↑ماڵە male "ئامرازی تێهەڵسوون، ڕێخشاندن، سواخ دان" و چەندین وشەی دیکە.

**مردەلۆخە mırdeloxe** [ *mırdaloxa* ] - "ڕەقەڵە، بابردەڵە": خزمە دەگەڵ ↑مردن mırdın و کەرتی دووەمی وشەکە دە بنچینەدا لۆک / لۆکە loke/ lok بووە. ئەم کەرتەوشەیە دە پیرەڵۆک pîrelok و مسریلۆک mısrîlok یشدا بەدی دەکرێ. مانای ئەم کەرتەوشەیە "وەکوو، لەشێوە"یە، واتا مردەلۆخە یان پیرەڵۆک بە مانای "وەکوو مردوو"، "پیرشێوە، پیرئاسا"یە. دەبێتە خزم دەگەڵ like (E.)، gelīc (OE.)، (g)līkr (OIs.)، lik (Sw.) "وەکوو، لەشێوەی". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ڕیشەی ژێرمەنی *(IE.) *līka-* "هەیکەل، پێکهاتە، شێوە، بەدەن". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەی دیکە پێوەندییان بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەیە، وەک ↑*لەش leş*، ↑لاشە laşe، ↑کەلاک kelak، ↑گوێلاک guwelak.

**مرژاندن mırjandın** [ *mıržāndın* ] - "مڕاندنی سەگ": خزمە دەگەڵ ↑مڕاندن mırandın.

**مرقاندن mırqandın** [ *mırqāndın* ] - "دەنگ لە گەروو دەرهێنان بێ دەم کردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑مڕاندن mırandın.

**مرمرین mırmırîn** [ *mırmırīn* ] - "بە پەلەپەل قسە کردن کە پیاو تێی نەگا": خزمە دەگەڵ murmeln (G.)، murmurare (L.)، mormyrein (Gr.) "مڕاندن، بۆڵاندن، پرتاندن". لەوانەیە ڕیشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگ بێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑مڕاندن mırandın.

**مرک mırık** - "1- کەپەک، سقی 2- کرێژی سەر": پێوەندی بە چەمکی "کڕاندن و ڕێخشاندن"ەوە هەیە و هەر بۆیە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەرە¹ mere "پێمەڕە"دا باس کراون. وشەی "کرێژ"یش دەشێ پێوەندی بە "کڕاندن"ەوە هەبێ.

**مرک mırık** - "پەتا، پەسیو": هەروەها mıro هەیە بە مانای "پەتای مێوژ و شانەهەنگوین". خزمە دەگەڵ morbus (L.) "نەخۆشی". ئەم وشانە خزمایەتییان هەیە لەگەڵ ↑مردن mırdın. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑مرۆک mırok هەیە بە مانای کوژەر [نەخۆشی مرۆک واتا نەخۆشی کوژەر].

مرمرك **mırmırk** - "جۆرێ پێشکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مێروو meru "گیانلەبەرێکی وردیلە".

مرواری **mırwarî** [ *mırwārî* ] - "دوڕڕ": مرواريد (P.) morvārīd < (Gr.) *margarites*. فۆتیمی g دە زمانی کوردمادی و فارسیدا گۆڕاوە و بووەتە v / w. ناوی ژنانەی "مارگرێت" دە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگرێتەوە.

مرووچ **mırûç** [ *mırūč* ] - "1- کز و خەمبار 2- چارەرەش": چەند وشەی دیکەش لەم پێوەندییەدا جێی شیرۆڤە کردنن و لەوانەیە گشتیان بەیەکەوە خزم بن، وەك ↑مرووز mırûz "1- کز و کەنەفت 2- چین و چرووك"، ↑مرچ mırç "رووگرژ" [دەموچاو تیکنەر، دەموچاو گوشراو؟]، ↑مرِ mır [مرِ ومۆن]، ↑مۆڕە more "دەموچاو تیکنان" [دەبنەڕەتدا: رێککوشرانی دەموچاو؟]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schmerz (G.)، smart (Nl.)، smart (E.) "ئێش"، سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)mer-* < " رێخشاندن، رێککوشین، پشاوتن، ورد کردن، هاڕین". هەروەها ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: smerdnós (G.) "سامناك، داچڵەکێنەر" [دە بنەڕەتدا: رێخشێنەر، هاڕێنەر]، mordere (L.) "گەستن" و morbus (L.) "نەخۆشی". وشەی ↑مردن mırdın ↑مرِك mırık "پەتا، پەسیو" و mıro "پەتای مێوژ و شانەهەنگوین" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "کز و خەمباری" و "نەخۆشی، ئێش و ئازار" سەرەنجی ئەم وشە خزمانەی خوارەوە بدە: پەژارە pejare "خەم، ئازاری دەروونی"، پەشیمان peşîman، پەشۆکان peşokan و passio (L.) "رەنج و ئازار"، passion (E.) "ئێش، هەستێکی پڕئازار" و patient (E.) و (G.) "نەخۆش"، pati (L.) "رەنج کێشان"، pathos (Gr.) "نەخۆشی، ئازار" و پەتا peta "ئاهۆ، نەخۆشی"، پەژێك pejîk و پەسیڤ pesîv "هەڵامەت"].

مرۆت **mırot** - "ناوێکی ژنانە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ mārī (OG.)، maere (OE.) "شیاوی پێهەڵگوتن"، maren (OG.)، maera (OE.) "پێهەڵگوتن، ناوبانگ راگەیاندن"، mar (OIr.) "گەورە، گرینگ، بەناوبانگ " و moros- (Gr.). دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مەزن mezın "گەورە".

2- لەوانەشە شێوەیەکی سواوە بێ لە ↑مرواريد mırvārīd.

مرۆخە **mıroxe** [ *mıroxa* ] - "مێشکی ناو ئێسك": مرۆغە mıroġe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Mark (G.)، marag (OG.)، merg (Nl.)، marrow (Sw.) "مێشك، مۆخ"، mazga (Av.)، majjan (OIn.)، mozgŭ (OSlaw.)، smagenes (Lit.) سەر بە ریشەی *(IE.) *mozgo-* < "مێشك". وەك دەبینین هەم وشەی "مرۆخە" و هەمیش وشەی "مێشك، مەژی" لە یەك ریشە سەرچاوەیان گرتووە.

[تێبینی: شیاوی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە هەر وەك مرۆخە بە مانای "مێشکی ناو ئێسك" بەکار دەهێنرێ و بۆ مێشکی ناو کەللەسەر وشەی Hirn بەکار دەهێنرێ کە خزمە دەگەڵ "سەر"].

مرۆر **mıror** - "دەنکێکی تاڵە لەناو گەنمدا": وەك لەژێر وشەی "تاڵ"دا شی کراوەتەوە، وشەی "تاڵ" پێوەندی هەیە بە "تار، تاریك"ەوە، واتا لەنێوان دوو چەمکی "تاری" و "تاڵی"دا پێوەندییەکی ئێتیمۆلۆژیك لە ئارادایە. هەر بەم چەشنە لەوانەیە مرۆر "دەنکی تاڵ" پێوەندی هەبێ بە ↑مۆر2 mor "1- رەنگی بنەوشی 2- خۆڵەمێشی، بۆر" [مژ و مۆر] و Morgen (G.) "سۆزی، بەیانی، شەوەکی" و morok (Rus.) "مژ، تەم و تاریکی"، سەر بە ریشەی *(IE.) *mer-* <

"درەوشان، رووناک داهاتن، تاریک داهاتن". لەوانەیە وشەی مرة marra (.Arb) "تاڵ" لە زمانی عەرەبیدا پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

مرۆشیان **mıroşyan** [ *mırošyān* ] - "گۆڕاندن": هەروەها مرۆش mıroş هەیە بە مانای "گۆڕڕە". خزمە دەگەڵ ↑مراندن mırandın.

مرۆ(ڤ) **mıro(v)** - "1- مێر، پیاو 2- ئینسان": شێوەیەکی دیکە لە ↑مێر mer. وشە کوردمادییەکە کەوتووەتە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە مروة muruwa (.Arb) "مرۆ بوون، جوامێر بوون".

مرۆک **mırok** - "کوژەر": [نەخۆشی مرۆک واتا نەخۆشی کوژەر]. خزمە دەگەڵ ↑مردن mırdın و هەروەها ↑مرک mırık "پەتا، پەسیو".

مریستن **mırîstın** [ *mırîstın* ] - "مشتن، مژین": مشتن کارێکە کە هۆی زمان ڕێخشاندن پێک دێ و وشەی مشتن یان مژین خۆشی دە ریشەدا هەر ئەو مانایە دەبەخشێ. هەر بەم شێوەیە "مریستن" دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە دەچنەوە سەر ریشەیەکی دیکە کە ئەویش مانای "ڕێخشاندن، پێداماڵین" دەدا. هێندێک لەم وشانە بریتین لە ↑مەرایی merayî کردن "کیسەکێشی کردن"، مەرهەم merhem "هەتوان"، ↑مەرە *mere* یان ↑پێمەڕە pemere "بێڵ"، مەرسین mersîn"پشاوتن".

مریشک **mırîşık** [ *mırīšık* ] - "مامر": مر mır(îş) + ک ık. مرغ morġ (.P). کەرتی مر -mır بە شێوەی ↑مەل *mel* "پەلەوەر"یش هەیە و هەروەها دە وشەی ↑مامر mamır دا دەبیندرێ. "مامر" مانای "مەلی مێ" دەبەخشێ، بە پێچەوانەی "کەڵەباب" کە ئاماژە بە "مەلی تیر" دەکا. لە شوێنێک خوێندوومەوە کە وشەی "مریشک" لە دوو کەرتی "مر" [مەل] و "هیشک" پێکهاتووە و مەبەست "مەلی هیشکایی" بووە، بە پێچەوانەی "مراوی" کە دەبێتە "مەلی ئاوی". ئەم شیرۆڤەیە هەڵەیە، چونکوو فۆتیمی ş پێوەندی بە وشەی "هیشک"ەوە نییە و بەشێکە لە کەرتی سەرکی وشەکە. کەرتی سەرەکی وشەکە دە زمانی فارسیدا "مرغ"ە و دە کوردیدا "مریش"ە و ئەوجار پاشگری گچکاندن بە وشەکەوە لکاوە و بووەتە "مریشک". دە فارسیشدا "مرغک" هەیە [تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا بە مریشک دەگوترێ Hähnchen کە تێیدا پاشگری گچکاندن بە دیار دەکەوێ].

مزاندن **mızandın** [ *mızāndın* ] - "لکاندن، چەسپاندن": خزمە دەگەڵ machen (.G)، make (.E)، maken (.Nl) "کردن"، massein (.Gr) "شێلان، گوشین، تێهەڵسوون، پێداماڵین"، mazat (.Rus) "تێهەڵسوون، سواخ دان"، maslo (.Rus) "رۆن"، massa (.L) "شتی هەویرکراو و هەڵشێلدراو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *mag- >*** "(هەویر) شێلان". دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑مچاندن mıçandın "گوشین، گلۆفین"و ↑ماشتن maştın "گەسک دان" [دە بنەڕەتدا: ڕێخشاندن] و ↑مشت mışt [مشتوماڵ، مشتومڕ].

مزچین **mızçîn** [ *mızčīn* ] - "بزە کردن، زەردەخەنە کردن": مزچ mızıç بە مانای "بزە" دێ و هەروەها ↑مزمزین mızmızn یش بە مانای "بزە کردن" دێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schmunzeln (.G)، smunzen (.MG) و smuceln (.MG) "بزە کردن". ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییانە ساخ نەکراوەتەوە. فۆتیمی س s لە سەرەتای وشە کوردمادییەکەدا دەرناکەوێ، ئەم دیاردەیەش لە چەندین وشەی دیکەی کوردمادیدا بەرچاو دەکەوێ، وەک "ماڵین"، "مژین"، "مووچ" و هتد.

مز(د) **mız(d)** - "حەقدەست": مزد mozd (P.). خزمە دەگەڵ Miete (G.) "کرێ" [دەبنچینەدا: مزد]، miata (OG.)، mizdo (Gt.)، meed (E.)، misthos (Gr.)، mîdha (OIn.) سەر بە ریشەی **>** *(IE.) *mizdho-* "مزد، کرێ".

مزدان **mızdan** *[ mızdān ]* - "رێکگوشین": خزمە دەگەڵ ↑مچاندن mıçandın "رێکگوشین، گلۆفین، پێکەوەنووساندن".

مزر **mızır** - "ترش، ترش و شیرن": ملس malas (P.). پێوەندی هەیە بە melasse (OF.) "دۆشاوی چەوەندەر" **<** *(L.) mel* "هەنگوین، شیرنی".

مزگەفت **mızgeft** *[ mızgaft ]* - "پەرستگا": مزگەوت mızgewt و مزگەت mızget یش دەگوترێ. وام لەبیرە کە لە وتارێکی مامۆستا حەسەن قزڵجیدا باس لەوە کراوە وشەی مسجد masjid (Arb.) لە زمانی پەهلەوی وەرگیراوە. دیارە وشە کوردمادییەکە دەگەڵ وشەکەی زمانی پەهلەوی خزمە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑مێژ2 mej "نوێژ، نمێژ". ئەم شێوەیە، شێوەیەکی کۆنتری ↑نمێژ nımej ە، [nı-mej یان ↑نوێژ nuwej] و خزمە دەگەڵ ↑مووچاندن mûçandın "داهێنانەوە، چەماندنەوە".

مزگینی **mızgenî** *[ mızgenī ]* - "خەبەری خۆش": مژدەگانی mojdegānī (P.) "(پاداشی) خەبەری خۆش". لەوانەیە موژدە mujde یان ↑مژدە mıjde بە "خەبەرە خوشەکە" گوترابێ و "مزگینی"ش پاداشی ئەو خەبەرە خۆشە بووبێ. دەبێ پێوەندی هەبێ بە message (E.) "پەیام". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر *(Rom.) *missticum*. ریشە؟

مزمزین **mızmızn** - "بزە کردن": بڕوانە ↑مزچین mızçîn. لە کرداری "مزمزین"دا بنجی وشەکە (رەگی کردارەکە) دووبارە دەبێتەوە. ئەمە یەکێکە لە شێوەکانی وشەسازی لە زمانی کوردمادیدا کە لە ژمارەیەک کرداردا دەبینرێ و ئاماژە بە دۆخی جەخت کردندا دەکا. چەند نموونەیەک لەم کردارانە بریتین لە *مژمژاندن* "چاوترووکاندنی لەسەر یەک"، ململین mılmılîn "بەخشکەوە بزووتن"،*گزگزین* "سووک لەرزین" و هتد.

مزە **mıze** *[ mıza ]* - "جوونەوە و دووپات کردنەوەی قسە": [مزەمز mızemız واتا مینجە مینج]. خزمە دەگەڵ ↑مینگە mînge.

مزەڵق **mızelq** *[ mızalq ]* - "چەسپاو، لکیاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مزاندن mızandın.

مزوور **mızur** *[ mızūr ]* - "بەهێز، قەوی": خزمە دەگەڵ ↑مێش3 mêş "هێز، دەسەڵات". ناوی هۆزی مزووری mızûrî لەم وشەوە هاتووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑موکری mukrî [بڕوانە ↑*موکریان mukıryan*].

مژ1 **mıj 1** *[ mıž ]* - "1- تەم، دوومان 2- نەخۆشییەکی چاوە کە تەم دەگرێ": میغ mīġ و meh (P.). خزمە دەگەڵ mist (E.) و (MG.) و (OE.)، omikhlē (Gr.)، mĭgla (OSl.)، meghá- (OIn.) سەر بە ریشەی **>** ***(IE.) *migh-*** "مژ، تەم، تاریکی". وشەکانی ↑مێش mêş "رەش، ئاماڵ رەش" و ↑مشکی mışkî "خۆڵەمێش" سەر بەم ریشەیەن. هەروەها دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑مجرو2 mıcro "کوێر".

مژ2 **mıj 2** *[ mıž ]* - "جۆرێک جانەوەری وردیلە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑مێش1 mêş [مێش، مۆز]،

2- ↑مژلۆر mıjlor "مێرووولە".

مژار **mıjar** *[ mıžār ]* - "بابەت، مەوزووع": **<** *(E.) matter* "تشت، بابەت" **<** *(L.) māteria* "ماددە، ماکە، ماتریاڵ". خزمە دەگەڵ ↑مەک mek [شتومەک]

مژانە **mıjane** [ *mižāna* ] - "داری بەستراوە لە ئاموور": مشانە mışane ش دەگوترێ، شێوەیەکی دیکە لە ↑میزۆ mîzo.

مژدە **mıjde** [ *mižda* ] - "خەبەری خۆش": مژدە mojde (P.). بڕوانە ↑مزگینی mızgenî.

مژمژاندن **mıjmıjandın** [ *mižmižāndın* ] - "چاوترووکاندنی نائاسایی و لێکدا لێکدا": خزمە دەگەڵ ↑مچاندن mıçandın "ڕێکگوشین، گلۆفین، پێکەوەنووساندن" و هەروەها ↑مزاندن mızandın "لکاندن، پێوەنووساندن، چەسپاندن".

مژۆ **mıjo** [ *mižo* ] دەگەڵ گژ gıj دێ. گژ و مژۆ gıj û mıjo مانای "تێکەڵ پێکەڵ، ناتەکووز" دەبەخشێ. "گژ" دەچێتەوە سەر ↑گژاندن gıjandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن". "مژۆ"ش پێوەندی هەیە بە ↑مژمژاندن mıjmıjandın "چاوترووکاندنی نائاسایی" و↑*مچاندن mıçandın* "ڕێکگوشین، گلۆفین، پێکەوەنووساندن". شیاوی باسە گلۆفین بە مانای "شێلان"یش دێ و ئەم وشەیەی دوایی خۆی دە ئەسڵدا مانای "لێکدان" دەبەخشێ.

مژۆڵ **mıjol** [ *mižol* ] - "برژانگ": مژە moje (P.). پێک هاتووە لە ↑موو mu + ژۆڵ jol. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. [سەبارەت بە پاشگرەکەی هەڵی سەنگێنە دەگەڵ کارژۆڵە یان کارژیلە (کار + ژیلە/ ژۆڵە )]. مانای وشەکە دەبێتە "مووی بچووکەڵە".

مژین **mıjîn** [ *mižīn* ] - "زمان ڕێخشاندن بۆ خواردن یان خواردنەوە، دۆشین بە دەم". ↑مشتن mıştın و ↑میستن[2] mîstın یش دەگوترێن. مکیدن mekîdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسک لێدان، ماڵین" و ڤەمشتن vemıştın "باسک و دەلینگ هەڵماڵین". ئەم وشانە سەر بە ریشەیەکن بە مانای "ڕێخشاندن، پێداماڵین". مژین [مشتن، میستن] کارێکە کە بەهۆی ڕێخشاندن [پێدا ماڵین] ی زمان پێک دێ، هەروەک چۆن بێچوو مەمکی دایکی دەمژێ یان شتێک بە زمان ڕێخشاندن دەناو دەمدا دەتوێنرێتەوە و قووت دەدرێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی ↑مریستن mırîstın کە ئەویش بەمانای "مشتن"ە و ریشەکەشی مانای "ڕێخشاندن" دەگەیەنێ].

مس1 **mıs 1** - "ناوی کانزایەک": مس mes (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ messing (G.) و (Nl.) و mässig (Sw.) "ئاوێتەی مس و رووح". ریشە وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

مس2 **mıs 2** - "بزنی خاڵ لە گوێ": خزمە دەگەڵ mecke (MG.)، mekas (Gr.)، meka (OIn.) "بزن". خزمیشە دەگەڵ meckern (G.)، mēkāsthai (Gr.)، miccire (ML.) "*ماعەماع* کردنی بزن". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە واتا دەنگی "ماعەماع کردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ماع māɛ [ماعەماع] و ↑مەها mahā و ↑میک mîk و ↑مێگەل megel.

مساخ **mısax** [ *mısāx* ] - "ئارداوێژی بەرداش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ماشتن maştın "ڕێخشاندن، پێداهێنان، پشاوتن".

مست **mıst** - "پەنجە هەڵ گلۆفاو و ڕێکگوشراو": مشت mışt یس دەگوترێ. مشت moşt (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑مچاندن mıçandın "ڕێکگوشین، گلۆفین، پێکەوەنووساندن".

مسری **mısrî** [ *mısrī* ] - "کز و لاواز": مسریلۆک mısrîlok یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ mager (G.)، (Nl.) و (Sw.)، magar (OG.)، ma ger (OE.) "لاواز، بێهێز، بێ پێز". هەروەها دەگەڵ macer (L.) "باریک"، makros (G.) "گەورە" [دە بنەڕەتدا: باریک و درێژ]، سەر بە ریشەی < ***mak-** (IE.)* "باریک و بنیس". کەرتی لۆک lok- دە وشەی مسریلۆک mısrîlok دا بەشێوەی لۆخە loxe دە وشەی ↑مردەلۆخە mırdeloxe "ڕەقەڵە، بابردەڵە"دا دەبینرێ و لەوێدا شی کراوەتەوە.

مسکە **mıske** [ *mıska* ] - "جۆرێ کوللە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ملۆ mlo "کوللە، کوللو".

مسکین **mıskîn** [ *mıskīn* ] - "هەژار، رەعێت": مسکین meskīn (P.) "هەژار" و هەروەها مشکین meškīn (P.) "رەش". لە هێندێک شوێندا باس کراوە کە "مسکین" وشەیەکی عەرەبییە. پاشگری în- یەکێک لە پاشگرە چالاکەکانی زمانە ئێرانییەکانە و هەر بۆیە وشەکە دە بنەڕەتدا لەو زمانانەوە کەوتووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە. خزمە دەگەڵ ↑مێش *mêş* "رەش، بۆری تاریک" و ↑مشکی mışkî "خۆڵەمێش". جگە لەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا "رەشایی"، "قەرە" و "تەفاریک" هەر بەم مانایە بەکار دێن و ئەوانیش پێوەندییان بە رەنگی رەشەوە هەیە. ئەم وشانە دەبێ دە بنەڕەتدا یان ئاماژەیان بە رەنگی رەش هەڵگەڕاو و لەبەر تاو سووتاوی هەژارەکان کردبێ یان بە بەختی رەش و سووتاویان.

مسوار **mıswar** [ *mıswār* ] - "کانزای تێکەڵاو لە مس و شتی دیکە": مسوار mesvar (P.). خزمە دەگەڵ ↑مس[1] mıs.

مسۆگەر **mısoger** [ *mısogar* ] - "قورس و قایم، تەسبیت، ئیسبات": وشەی "قورس" پێوەندی بە وشەکانی "خورت" و "خار"ەوە هەیە کە مانای "سەخت، بەهێز" دەردەبڕن. هەروەها "تەسبیت" و "ئیسبات" کە دە زمانی عەرەبیدا بەکار دێن، دەچنەوە سەر "سفت"ی کوردمادی و دە بنەڕەتدا مانای "سەخت و قایم" دەگەیەنن. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەی "مسۆگەر"یش پێوەندی هەیە بە هێندێک وشەی وەک ↑مزوور mızur "بەهێز، قەوی"، ↑موکری mukrî و خزمە دەگەڵ ↑مێش3 mêş "هێز، دەسەڵات". ئەم وشانەش چەمکی "سەخت، پتەو و بەهێز بوون" لە خۆ دەگرن.

مشار **mışar** [ *mišār* ] - "هەڕە، ئامرازی بڕینەوەی دار": وشەیەکی کوردمادییە و خزمە دەگەڵ هێندێک وشە وەک ↑مکارە mıkare "ئامرازی دارکۆڵین"، ↑مووس2 mus "گووزان، گوێزان"، ↑مووشان(ە) mûşan(e) "جەنجەڕ، جەڕجەڕ"، ↑موو[1] *mu* "لێواری تیخ" و هتد. ئەم وشانە دەشێ سەر بە ریشەیەک بن بە مانای "بڕین(ەوە)".

مشارە **mışare** [ *mışāra* ] - "پێوانەیەک لە زەمینی کێڵان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ماشتن maştın "رێخشاندن، پێداهێنان، پشاوتن".

مشاگ **mışag** [ *mišāg* ] - "کرێکاری رۆژمزد، کرێکاری کێڵگە، کێڵەر": هەر چەند وێکچووتێک لە نێوان ئەم وشەیە و وشەی "مزد، مووچە"دا هەیە، بەڵام بە شێمانەیەکی بەهێز وشەکە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماشتن maştın "رێخشاندن، پێداهێنان، پشاوتن"دا باس کراون. لە باری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "سەپان" هەڵی سەنگێنین کە دەگەڵ "ساوین" خزمە و ئەویش مانای "رێخشاندن، پێداهێنان" لە خۆ دەگرێ.

مشت **mışt** [ *mišt* ] - دەگەڵ "ماڵ" دێ [مشتوماڵ دان mıştûmal dan واتا شێلان، دەست رێخشاندن و نەرم کردن]. خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "(پێدا) ماڵین، رێخشاندن". "مشت" هەروەها دەگەڵ "مڕ" دێ [مشت و مڕ mışt û mır] بە مانای "کێشە و بەگژ یەکدا چوون". لێرەشدا وشەکە هەر پێوەندی بە ماناکەی سەرەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست "یەکتر شێلان"ە. وشەی "مڕ"یش مانای "دەست رێخشاندن و نەرم کردن" دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ "مەڕە". دە زمانی فارسیدا دەستەوشەی "دست و پەنجە نرم کردن" بەکار دەهێنرێ.

مشتاگ **mıştag** [ *mištāg* ] - "دەپی ئاردماڵین لە دەوری بەرداش": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "(پێدا) ماڵین، رێخشاندن".

مشتن **mıştın** ⌊ *mıštın* ⌋ - "مژین": ↑مهتن mıhtın و ↑مژین *mıjîn* و ↑میستن² mîstın یش دەگوترێن.

مشته **mışte** ⌊ *mıšta* ⌋ - "1- ئامرازی چەرم کوتان 2- کوتکی هەللاجی 3- دەسپەڕ": خزمە دەگەڵ↑ مخەت mıxet "دارێکە چەرمی پێ لووس دەکەن"، سەر کرداری ↑ماشتن maştın "(پێدا) ماڵین، ڕێخشاندن".

مشک **mışık** ⌊ *mıšık* ⌋ - "ناوی جانەوەرێک": موش mūš ‹P.› maus ‹G.› mius ‹Nl.› mouse ‹E.› mus ‹Sw.› mūs ‹OIn.› mys ‹Gr.› mus ‹L.› "مشک". بەپێی بۆچووتێک لەوانەیە بۆ ڕیشەی **< *mus ‹ IE.)** "دزین" بگەڕێتەوە. دە هیندی کۆندا musnati ‹OIn.› بە مانای "دزین" بووە. وشەی muskulus ‹L.› و mys ‹Gr.› "ماسوولکە" پێوەندییان بە ناوی ئەم جانەوەرەوە هەیە. بەپێی بیرورایەکی دیکە لەوانەیە هەردوو وشەکە بگەڕێنەوە بۆ ڕیشەی **< *meu- ‹ IE.)** "جوولان، بزوان". دە لاتینیدا movere ‹L.› "بزوان" لەم ڕیشەی دوایی وەرگیراوە. دە زمانی کوردیدا چەند وشەیەک هەن کە دەشێ پێوەندییان بەم ڕیشەوە هەبێ وەک ↑مەلە mele [بزوان لەناو ئاودا]، ↑مل mıl، ↑ملیان mılyan "بزوان" و هتد.

مشکی **mışıkî** ⌊ *mıškī* ⌋ - "خۆڵەمێش": بڕوانە ↑مێش2 mêş "ڕەش، تاریک، بۆری توند".

مشووت **mışût** ⌊ *mıšūt* ⌋ - "1- کاوێژ 2- خواردەمەنی بەرماو":

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماشتن maştın "(پێدا) ماڵین، ڕێخشاندن، پشاوتن"دا باس کراون. لەم تێڕوانینەوە مانای "مشووت" دەبێتە "هاڕدراو، وردکراو، ڕێخشێنراو" بە ددان.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Mett ‹G.› meet ‹E.› "گۆشت"، Messer ‹G.› "کێرد". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر **mat(i)- ‹ Grm.)* "خواردەمەنی"، سەر بە ڕیشەی **< - *mad ‹ IE.)** "تڕ و بڕ بوون، چەور و قەڵەو بوون، ئاو تێگەڕان، ڕۆن لێ تکانەوە".

مشوور **mışûr** ⌊ *mıšūr* ⌋ - "1- سەلیقە 2- ڕا و تەگبیر": ماناکەی دە بنەڕەتدا "هەڵسەنگاندن و "بیر لێکردنەوە"یە و خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑ماد mad دا شی کراونەوە.

مشە1 **mışe 1** ⌊ *mıša* ⌋ - "زۆر، زەغف": هەروەها ↑مێشە mêşe یان مێشەڵان mêşelan هەیە بە مانای "دارستانی چڕ و پڕ". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماسین masîn "ئەستوور بوون، زل بوون" و "هەروەها "بەهێز و پتەو بوون"دا باس کراون.

[تێبینی: لەباری ماناوە وەک وشەی چغوور [چوغوور] "دارستانی چڕ و پڕ" وایە کە ئەویش پێوەندی بە چەمکی "پتەو و چڕ و پڕی"یەوە هەیە. دیسان لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "بێشە، بێشەڵان" هەڵی سەنگێنین کە پێوەندی بە ڕیشەکەوە هەیە بە مانای "ماسین، با کران، زل بوون(ەوە)" و خزمە دەگەڵ "بۆش" (لەشکرێکی بۆش) واتا لەشکرێکی زەبەڵاح].

مشە2 **mışe 2** ⌊ *mıša* ⌋ - "دەنگی هەناسە لە لووتەوە": ئەمە و چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا دەچنەوە سەر ڕیشەی **< *mu- ‹ IE.)** "دەنگی کز و نازەلال بە لێوی پێکەوەنووساو دانە دەرەوە". هێندێک لەم وشانە دە زمانی کوردمادیدا بریتین لە ↑مخە mıxe، ↑مرخە mırxe، ↑مڵچە mılçe، ↑مینگە mînge، ↑مینجە mînce، [بە تێخزانی فوتیمی n] و↑مۆ mo [مڵ و مۆ]، ↑مف mıf و هتد. دە زبانی ئەڵمانیدا چەند وشەیەکی وەک mucken ‹G.› muffeln ‹G.› "مینگاندن" لەو ڕیشەی سەرەوە هاتوون.

مشە3 **mışe 3** ⌊ *mıša* ⌋ - بەشێکە لە وشەی مشەخۆر mışexor "چەورە، زکێ لەوەڕێن، ئەنگەل". خزمە دەگەڵ ↑مشووت mışût "1- کاوێژ 2- خواردەمەنی بەرماو".

مشەخت **mışext** [ *mışaxt* ] - "ئاوارە، دەربەدەر": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ریشەی **< -mod* ,** **-med* ( .IE)** "رێگە برین، (رێگە) پێوان، هەڵسەنگاندن". وشەکانی dimensio ( .L) "مەودا، بوعد، لەبەر یەک کشانەوە" و immensus ( .L) "زەبەلاح" [ئەوەندە زل کە ناپێورێ، نەپێور] لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑مێژوو meju و ↑مەودا mewda دەشێ پێوەندیان بەم ریشەوە هەبێ. ئەم وشانە دە پلەیەکی دووورتردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑مانگ mang. "مانگ" بەهۆی رێگەبڕین و گەڕانی بە ئاسماندا ئەم ناوەی لەسەر دانراوە.

مشەوش **mışewış** [ *mišawiš* ] - "نیسکی لە دەستارکراو": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە کە ماناکانی "رێخشاندن، پێداماڵین، ورد کردن، نەرم کردن" دەبەخشن. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ "ساوار" کە خزمە لەگەڵ "ساوین" [سوونەوە].

مف **mıf** - "فن، دەنگی لووت لە چڵم سڕیندا": خزمە دەگەڵ muffeln ( .G) "مینگاندن" و چەندین وشەی هاوچەشن کە لەژێر ↑مشە2 mışe 2 "دەنگی هەناسە لە لووتەوە"دا باس کراون.

مڤرۆ **mıvro** - "سەقەت، پەککەوتە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -mo*( .IE)** "تەقەلا کردن، زەحمەت کێشان، ماندوو بوون".

[تێبینی: پێوەندییەک هەیە لەنێوان دوو چەمکی "سەقەت" و "تەقەلا کردن، ماندوو بوون"دا. وشەی "سەقەت" بە شێوەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە "شەکەت" بە مانای "ماندوو"].

مق1 **mıq 1** - "ساز، ئامادە": خۆ مق کردن واتا خۆ ساز کردن بۆ کارێک. خزمە دەگەڵ ↑مێش[3] mêş "هێز، توانایی".

[تێبینی: وشەی "ساز"یش خزمە دەگەڵ *سەخت* "بەهێز، بەتوان"].

مق2 **mıq 2** - "دەنگی لووت": مخ mıx یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑مف mıf و ↑*مشە2 mışe 2*.

مقام **mıqam** [ *mıqām* ] - "گورانی، ئاواز": وشەکە لە زمانی عەرەبیدا بەکار دێ و دەشێ لە وشەی کوردی ↑قام qam وەرگیرابێ.

مقەرس **mıqers** [ *mıqars* ] - "دژبەر، بەکێشە و نەساز": خزمە لەگەڵ ↑مکوڕ mıkur "1-پێداگر 2- سەرکێش، سەرسەخت".

مقەنەزمە **mıqenezme** [ *mıqanazma* ] - "چەخماخی تفەنگ": < *mechanism* ( *.E*) < *mechanika* ( *.Gr*) "زانستی دروست کردن و بەکار هێنانی مەکینە". وشەکانی↑مەکینە mekîne و ↑ماشێن maşên ش لەم وشە یۆنانییە وەرگیراون.

مقۆمقۆ **mıqomıqo** - "دەنگو": خزمە دەگەڵ mucken ( .G) "دەنگی نزم و ناڕوون لە خۆ دانەدەر". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە. دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑مینگە mînge [فۆتیمی n ی تێخزاوە] و دواتر ↑*مشە2 mışe 2*.

مکارە **mıkare** [ *mıkāra* ] - "ئامرازی دارکۆڵین": مەکارە1 mekare ش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشەی وەک ↑مووس2 mus "گووزان، گوێزان"، ↑مووشان(ە) mûşan(e) "جەنجەڕ، جەڕجەڕ"، ↑مشار mışar "هەڕە" و ↑موو[1] *mu* "لێواری تیغ" و هتد. ئەم وشانە دەشێ سەر بە ریشەیەک بن بە مانای "بڕین(ەوە)".

مل **mıl** - "ئەستۆ": خزمە دەگەڵ ↑ملیان mılyan "بزوان". "مل" ئەو شوێنەی لەشە کە تایبەتمەندی بزوانی تێدایە، هەروەک چۆن "کەمەر" تایبەتمەندی "چەمانەوە"ی تێدایە. وشەکانی "کۆڵ" و "قەلاندۆش" یش پێوەندییان بە ریشەیەکەوە هەیە بە مانای "سووڕان، بزوان".

مڵ **mıl** - "بڵ، نەرم بووکێ": خزمە دەگەڵ mürbe ‏(G.)، mur(u)wi ‏(OG.)، murw ‏(Nl.) "نەرم، بڵ، گەنیو" سەر بە ریشەی ‎*(s)mer-* ‏(IE.) < "رێخشاندن، هارِین، نەرم کردن". دواجار خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn .

مڵ3 **mıl** - دەگەڵ "شل" دێ و بە مانای "نەرم، شلک"ە [شل و مل şıl u mıl واتا نەرم و نۆڵ]. خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn سەر بە ریشەی ‎*(s)mel-* ‏(IE.) < "رێخشاندن، هارِین، ورد کردن، نەرم کردن". هەڵی سەنگینە دەگەڵ mollis ‏(L.) "نەرم" و melt ‏(E.) "توانەوە، شل بوونەوە ".

مڵ **mıl** - دەگەڵ "مۆ" دێ [مڵ و مۆ]. دە فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "حەول و بۆن کردن بۆ خواردن". دەبێ پێوەندی بە یەک لەم دوو وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- یان خزمە دەگەڵ smell ‏(E.)، ‎*smyllan ‏(OE.) "بۆن کردن". ریشەی ئەم وشە ئینگلیزییە ساخ نەکراوەتەوە. لە وشە کوردمادییەکەدا فۆتیمی s دەرناکەوێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "مڵ[3]" کە ئەویش دە ریشەدا s ێکی هەیە کە لە هێندێک وشەدا دەردەکەوێ و لە هێندێکیشدا دەرناکەوێ.

2- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑مرِ mır [مرِ و مۆش هەر بە مانای مڵ و مۆ].

ملا **mıla** [ *mılā* ] - "جۆرێک هەڵپەرِکێ": ملان mılan یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ↑ملیان mılyan "بزوان".

مڵاز **mılaz** [ *mılāz* ] - "خۆ بە هەردەوە چەسپاندن و چاوەرِێی دەرفەت بوون": مەڵاز melaz و مەڵاس melas یش دەگوترێن. مڵ [مەڵ] + ئاز [ئاس] mıl + az. کەرتی "مڵ" پێوەستە بەو وشانەی لە ریشەی ‎*(s)mel-* ‏(IE.) < هوە دێن بە مانای "رێخشاندن، پشاوتن، تیهەڵسوون، هارِین، ورد کردن، نەرم کردن". لەم تێروانینەوە "مڵاز" ئەو دۆخەیە کە ئاژەڵێک لە کاتی راودا بۆ ئەوەی نەدیترێ، دەست و پێی دادەدا و خۆی لە ئەرز دەخشێنێ، دۆخێکی خشکەیی پەیدا دەکا. کەرتی ئاز az- یان ئاس as- پاشگرە و لە زۆر وشەی دیکەدا دەبینرێ [بروانە ↑ئۆز oz]. وشەکە بەشێوەی کرداریش هەیە کە بریتییە لە ↑مەلسین melsîn "خۆ بە هەردەوە نووساندن، خۆ لە هەرد خشاندن".

ملاک **mılak** [ *mılāk* ] - "چەژە، چێشکە": [بە غەوسی گەورە ملاکی ناکەی]. ئەگەر سەرنجی وشەی "مەزە" بدەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە پێوەندی بە کردارەکانی "ماشتن" و "مشتن" و چەندین وشەی دیکەوە هەیە کە دە بنەرِەتدا مانای "رێخشاندن، پێداماڵین" دەبەخشن. مەزە کردن کارێکە لەرێگەی زمان لێخشاندنەوە پێک دێ. هەر بەم شێوە "ملاک" خزمە دەگەڵ وشەگەلێک وەک ↑مەڵاشوو melaşû [شوێنی زمان لێخشاندن]، ↑مەلسین melsîn "خۆ بە هەردەوە نووساندن، خۆ لە هەرد خشاندن"، ↑مەلقاندن melqandın "گەیاندنی میوە بە گوشین، بە رێخشاندن"، ↑ماڵشتن malıştın "مشتوماڵ دان" و ↑*ماڵین malîn* "پێداخشاندن".

مڵت(ە) **mılt(e)** - "تڵتە": خزمە دەگەڵ ↑مل[2] mıl "بڵ، نەرم بووکێ".

مڵچە **mılçe** [ *mılča* ] - "دەنگێ لە دەم دەرهاتن لە کاتی خواردن و خواردنەوە و لە کاتی ماچ کردندا":

1- یان خزمە دەگەڵ Maul ‏(G.)، mūla ‏(OG.)، muil ‏(Nl.)، mule ‏(Sw.) "لمبۆز"، myllon ‏(Gr.) "لێو"، سەر بە ریشەی ‎*mu-* ‏(IE.) < "دەنگێکی نارِوون لێوە هاتن بە گوشار دانی لێوەکان". دە زمانی ئەڵمانیدا چەند وشەی وەک muhen ‏(G.) "بۆرِاندن"، mucken ‏(G.) "دەنگێکی کز و نارِوون لێ هاتن"، muffeln ‏(G.) "نارِوون قسە کردن، مینگە کردن" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیشدا خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑مشە[2] mışe دا باس کراون.

2- یان "مڵچە" دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە لێکخشاندن یان ڕێخشاندنی زمان و دەم و لێو کە کاتی خواردن و خواردنەوە یان ماچ کردندا کە دیارە دەنگیکی لێ دروست دەبێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑مەڵاشوو melaşû [شوێنی زمان لێخشاندن]، ↑مەلسین melsîn "خۆ بە هەردەوە نووساندن، خۆ لە هەرد خشاندن"، ↑مەلقاندن melqandın "گەیاندنی میوە بە گوشین، بە ڕێخشاندن"، ↑ماڵشتن malıştın "مشتومالٚ دان" و ↑ماڵین *malîn* "پێداخشاندن".

ململین **mılmılîn** *[ mılmılīn ]* - "بەخشکەوە بزووتن، جینگڵ دان": خزمە دەگەڵ ↑ملیان mılyan "بزوان". ڕەگی کردارەکە، واتا مل -mıl بە نیشانەی جەخت کردن دووبارە بۆتەوە.

ملۆ **mlo** - "کوللە، کوللو": ملخ malax (.P).

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ moliri (.L) "بە زەحمەت بزواندن"، molestus (.L) " قورس و گران، بەزەحمەت"، mühe (.G) "زەحمەت"، سەر بە ڕیشەی **< *-mō* (.IE)** "زەحمەت کێشان، تەقەلا کردن". هەروەها ↑مسکە mıske هەیە کە ناوی جۆرێک کوللەیە و لەوانەیە ئەم وشەیەش هەر لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرێ. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مڤرۆ mıvro "سەقەت، پەککەوتە" و ↑مجروڵ mıcroɫ "ماندوو".

[تێبینی: ناوەکەی دیکەی ئەم زیلەیە واتا وشەی "کوللە" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "شەلین". لەوانەیە ناوی ئەم زیلەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەو بە شەلەشەل دەڕوا یان بە زەحمەت دەبزوێ].

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مڵە mıle "گیانلەبەرێکی ورد".

ملە **mıle** *[ mıla ]* - "گەردەنەی کێو": خزمە دەگەڵ ↑مل mıl "گەردەن".

مڵە **mıle** *[ mıla ]* - "گیانلەبەرێکی وردەرەگی گیا دەبڕێ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Milbe (.G)، mil(iw)a (.OG) "مۆرانە"، malō (.Gt)، mal (.Sw)، mol (.Rus) "مۆرکە".

ملهوڕ **mılhur** - "لاسار، سەرکێش، سەرپێچیکەر": ↑مل mıl "ئەستۆ" + هوڕ hur. کەرتی دووەم دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- شێوەیەکی دیکەیە لە ↑وڕ wır، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دان". هەر سێ وشەی ملهوڕ و لاسار [ دەبنەڕەتدا: لاسەر] و سەرکێش دەشێ سەرەتا لە پێوەندی دەگەڵ ئاژەڵی بارەبەردا بەکار هێندرابن، بۆ دەربڕینی ئەو دۆخەی کە ئاژەڵەکە *مل* نادا یاخود سەری راناگری کە هەوساری بکەن، واتا بە کێشانەوەی سەر و مل، یان وەرسووڕانی سەر و ملی بۆ ئەم لا و ئەولا ناهێڵێ سواری بن و باری لێ بنێن. لەم تێڕوانینەوە ملهوڕ دەبنەڕەتدا مانای وەرسووڕانی سەر و مل [مل نەدان] دەبەخشێ. هەر بەم جۆرە سەرکێش مانای کێشانەوەی سەر [نەسپاردنی سەر] و لاسار مانای وەرسووڕانی سەر بۆ ئەم لا و ئەولا و بەدەستەوەنەدانی سەر دەگەیەنێ. وشەی "سەرپێچیکەر"یش بەتەواوی ئەم مەبەستە دەگەیەنێ و لێرەشدا "پێچانی سەر" واتا وەرسووڕانی سەر، بەدی دەکرێ.

2- کەرتەوشەی هوڕ -hur هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑گوڕ gur و ↑خوڕxur بە مانای "سەخت، بەهێز". لەم تێڕوانینەوە وشەکە مانایەکی وەک "کەللەشەقی، سەرسەختی"دەدا.

ملیان **mılyan** *[ mılyān ]* - "بزوان": خزمە دەگەڵ movere (.L) "بزواندن"، سەر بە ریشەی **< *meu-* (.IE)** "جووڵان، بزوان". هەروەها ↑ململین mılmılîn هەیە بە مانای "بەخشکەوە بزووتن، جینگڵ دان". دەشێ ↑مل mıl "ئەستۆ" و ↑ملا mıla "جۆرێک سەما و هەڵپەڕکێ"

پێوەندییان بەو وشەوە هەبێ. شیاوی باسە وشەی "سەما" خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جوولان، بزوان".

**من mın** - "ئەز، جێناوی کەسی یەکەمی تاک": من man ‎(P.)‎. خزمە دەگەڵ mein ‎(G.)‎، mine ‎(E.)‎، mīn ‎(OE.)‎، mīn ‎(OG.)‎، meins ‎(Gt.)‎ "جێناوی خاوەتیتی بۆ کەسی یەکەمی تاک". دە بنەڕەتدا پێکهاتووە لە *mei + *no. کەرتی یەکەم لە ژێر وشەی ↑ئێمە eme دا شی کراوەتەوە. کەرتی no- پاشگری بە ئاوەڵناوکردنە.

[تێبینی: دوو وشەی ئەز ez و من mın دە زاروەی کوردمادی باکووردا هەرئەو جۆرە بەکار دێن کە دە زمانە ئەورووپییەکان بە دێ دەکرێ [بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا: ich gehe واتا ئەز دەچم، meine Mutter واتا دایکا من]. دە شێوەزارەکانی دیکەدا و هەروەها دە زمانی فارسیدا، بەهۆی ئاڵوگۆڕی رێزمانییەوە، "ئەز" لەناوچووە و "من" جێگەی ئەوی گرتۆتەوە].

**منارە mınare** ‎[ *mınāra* ]‎ - "بورج": پێوەندی هەیە بە minere ‎(L.)‎ "زەق و دەرپەڕیو بوون".

**منداڵ mındal** ‎[ *mındāl* ]‎ - "زارۆک": مناڵ mınal یش دەگوترێ کە دەشێ شێوەی کۆنتری وشەکە بێ، واتا فۆنیمی d زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە. خزمە دەگەڵ منال manāl ‎(P.)‎ "سامان، دارایی، ماڵ". دە فارسیدا مال و منال māl o manāl ‎(P.)‎ وەک جووتەوشە بەکار دێ و مانای "سامان و دارایی" دەدا. دە زمانی کوردمادیشدا دوو وشەی "ماڵ و منداڵ" زۆرجار دەگەڵ یەکتر دێن.

1- لەوانەیە "مناڵ، منداڵ" پێشتر، هەروەک دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا، بە مانای "ماڵ[1]" و "سامان و دارایی" بووبێ. پاشان ئەم "ماڵ[1]"ە ماناکەی دەگەڵ *ماڵ2* "خانەوادە، فامیل" تێکەڵ بووە و ئەمەش وای کردووە کە وشەی "مناڵ"یش مانای "زارۆک" پەیدا بکا. لەم تێڕوانینەوە هەر دوو وشەی "ماڵ" و "مناڵ" [دواتر "منداڵ"] بە مانای سامان و دارایی بەکار هاتوون، واتا ئەو داراییەی کە لە خاوەندارێتی مرۆڤ دایە. لەم روانگەوە وشەی "مناڵ" [منداڵ] دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑من mın "ئەز" و دە بنچینەدا مەبەست ئەوشتانە بووە کە هی منە، واتا هی خودی مرۆڤە. [تێبینی: ورد بوونەوە لە دوو وشەی ژێرمەنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە روونتر دەکاتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا eigen ‎(G.)‎ و own ‎(E.)‎ بە مانا "خود" بەکار دێ. ئەم وشانە پێوەندییان هەبووە بە کردارێکی کۆنی ژێرمەنی، بۆ وێنە eigan ‎(OG.)‎ بە مانای "خاوەن بوون، دارا بوون". دە زمانی ئەڵمانی ئەمڕۆدا Eigentum ‎(G.)‎ بە مانای "مڵک و ماڵ، دارایی" بەکار دێ. وەک دەبینرێ دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا پێوەندییەک لەنێوان چەمکەکانی "خود" و "خاوەتیتی، دارایی"دا دروست بووە].

2- لە لایەکی دیکەوە دەزانین کە چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بە مانای "زارۆک، بێچوو" دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "گچکە، کەم" دەدەن. هەر بۆیە دەشکرێ "مناڵ" دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە هەڵسەنگێنین: menu ‎(Fr.)‎ "بچووک، تەنک"، minutus ‎(L.)‎ "زۆر بچووک"، minuere ‎(L.)‎ "بچووک کردنەوە، کەم کردنەوە"، minus ‎(L.)‎ "*مینها*، کەمتر"، minimus ‎(L.)‎ "بچووکترین، کەمترین". چەندین وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم وشە لاتینییانە، بۆ نموونە minority ‎(E.)‎ "کەمایەتی"، minute ‎(E.)‎ "1- خولەک، دەقیقە 2- ورد، بچکۆڵە"، minister ‎(E.)‎ "وەزیر" [دە بنەڕەتدا: نۆکەری دەربار و دەسەڵات] و هتد. ریشە؟

[تێبینی: کاتێک مانای minister "وەزیر"م دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ دەرکەوت، یەکسەر وەبیر "عباس هویدا"، سەرۆک وەزیرانی شای گۆڕبەگۆڕی ئێران کەوتمەوە کە لە نووسین و گوتەکانی خۆیدا بۆ شا بەردەوام وشەی "چاکر"ی بەکار دەهێنا، واتا خۆی وەک نۆکەری شا بەناو دەکرد].

**منهۆ mınho** - "مەتن، نوسراوی ناو پەرتووك":

1- لە لایەكەوە جێی بەرهەف كردنە دەگەڵ manuscriptum (L.) "بە دەست نووسراو".

2- لە لایەكی دیكەوە لەوانەیە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ كە لەژێر ↑مان2 *man* [رامان raman] "دە بیرە چوون، بیر كردنەوە" و ↑مانا mana دا باس كراون. وەك لەژێر ئەم وشانەدا باس كراوە، دە زمانە ژێرمەنییەكاندا خزمی ئەم وشانە بە مانای "دەربڕین" [دەربڕینی بیر و مەبەستێك] و "بیر خستنەوە" بەكار دەهێنرێن. لەم تێڕوانینەوە لەوانەیە وشەی "منهۆ" ئاماژەی بە بیرۆكە یان مانا و ناوەرۆكی نووسێتێك كردبێ یان مەبەست دەربڕین [راگەیاندن]ی بیرۆكە و مانایەك بووبێ.

**منەیی mıneyî** [ *mınayī* ] - "پەلە كردن لەڕێگەی (بە دەست هێنان)ی شتێكدا":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **> *me-, *mo-*** **(IE.)** "خۆ ماندوو كردن، تەقەلا كردن، زەحمەت كێشان، حەز كردنی بە تین، خۆ كوتان بۆ گەیشتن بە ئامانج، هەژانی دەروونی". وشەی ↑موود mud "1- شەرەقسە 2- ئیرەیی 3- دژایەتی" لەوانەیە پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە وشەی ↑منێ mıne "1- تۆژینەوە، لێكۆڵینەوە".

**منێ mıne** [ *mıne* ] - "1- تۆژینەوە، لێكۆڵینەوە 2- دیار، ئاشكرا": دەچێتەوە سەر ریشەی **> *men-*** **(IE.)** "بیركردنەوە، چالاكی مێشكی و رووحی". دە زمانە ئەورووپییەكاندا چەندین وشە لەو ریشەوە هاتوون، وەك meinen (G.) "بیر و ڕا دەربڕین"، meen (E.) "مەبەست بوون"، mīan (OIr.) "حەز، داخواز"، měniti (OSl.) "بۆ چوون، را دەربڕین"، mania (Gr./L.) "شێتی" [دە بنەڕەتدا خەیاڵات كردن]، maínesthai (Gr.) "شێت و تووڕە بوون"، man (G.) و (E.) "پیاو، مرۆڤ" [دە بنەڕەتدا: بیركەرەوە]. وشەی ↑مانا mana "مەبەست" [معنی maεnā (Arb.)] پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە زمانی كوردمادیدا هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مینە mîne "توێژینەوە" و ↑مینا mîna "وێنە". وەك لەسەرەوە دەبینرێ، وشەكە مانای "دیار، ئاشكرا"ش دەدا. بەم مانایە هەروەها منامنا mınamına ش دەگوترێ. (دیارە دووبارە بوونەوەی وشەكە دۆخێكی جەخت كردن بە وشەكە دەبەخشێ. ئەم شێوە لە دووبارە كردنەوەیە لە چەندین وشەی دیكەشدا بەدی دەكرێ، وەك بڕای بڕای، خۆش خۆش، توند توند...). وەك بینیمان وشەی "مینا" یان "وێنە" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە و ئەم چەمكەش لەپێوەندی لەگەڵ چەمكی "دیار خستن، نیشان دان" دایە. كرداری "وێنا كردن" دە زمانی كوردمادیدا ئەم پێوەندی بەباشی نیشان دەدا.

**موسڵ musıl** [ *musıl* ] - "ناوی شارێكی كوردستان": ناوێكی كوردمادییە و خزمە دەگەڵ ↑مزوور mızûr "بەهێز، پتەو" و ↑مزووری mızûrî "ناوی هۆزێكی كورد". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑موكوڕ mukur و ↑موكری mukrî "ناوی هۆز و ناوچەیەكی كوردستان". وێكچوونی دوو وشەی "موسڵ" و "مزوور" دەتوانین دەگەڵ دوو وشەی "موكر" و "مكور" بەرهەڤ بكەین.

**موقرایی muqrayî** [ *muqrāyī* ] - "كوێرایی، لێلایی چاو": خزمە دەگەڵ ↑مجرۆ2 mıcro "كوێر" و ↑مژ *mıj* "تەم و دوومان".

**موكریان mukıryān** [ *mukıryān* ] - "ناوچەی موكرییەكان": خزمە دەگەڵ ↑موكور mukur یان مكور mukır بە مانای "پێداگر، سەرسەخت". مانای ئەسڵی وشەكە "بەهێز، سەخت، خاوەنی زەخت"ە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑مێش[3] mêş "هێز، توانین". وشەكانی ↑مزوور mızûr "بەهێز، قەوی"، ناوی هۆزی مزووری mızûrî و هەروەها هۆزی ↑مەنگوڕ mengur پێوەندییان

بەم وشانەوە هەیە و هەر ئەو مانایانەی سەرەوە دەبەخشن. لە وشەی مەنگوڕ mengur دا فۆتیمی n زێدەیە و کەوتووەتە ناو وشەکەوە. وشەکە پێشتر مەگوڕ *megur بووە کە شێوەی کۆنتری مکوڕ mıkur ە. هەروەها ناوی ↑مخانە mıxane "تیرەیەکی هۆزی بڵباس لە کوردستان" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

[تێبینی: ناوی زۆرێک لە ناوچە و مەڵبەندەکان، هۆزەکان و شاخە بەرزەکانی کوردستان دەگەڕێنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "بەهێز، پتەو، سەخت" دەبەخشن. لەم بارەوە بڕوانە وشەی "سۆران"].

موکوڕ **mukur** - "پێداگر، سەرسەخت": مکوڕ mıkur و مقڕ mıqır یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ دەگەڵ ↑میچ mîç "پێداگرتن، موکور بوون" و ↑مێش3 *meç* "هێز". ناوی هۆزی موکری mukrî و ناوچەی ↑موکریان mukıryān پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑مزوور mızūr "ناوی هۆزێکی کورد" کە ئەویش لە چوارچێوەی ئەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرێ.

مونزر **munzır** - "بەهێز، قەوی": مونزور munzur یش دەگوترێ. "مونزور" هەروەها ناوی چیایەکە لە کوردستان. خزمە دەگەڵ ↑مەنگوڕ mengur و هەروەها ↑مزوور mızûr و ↑موکوڕ mukur و موکری mukrî. هەمووی ئەم وشانە لە ریشەدا مانای "بەهێز، سەخت و پتەو بوون" دەبەخشن. لە وشەکانی مونزر [مونزور munzur] و مەنگوڕ mengur دا فۆتیمی n زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە. ئەم دیاردەیە لە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ. لەم بارەوە بڕوانە "مەنگوڕ".

موو1 **mu 1** *[ mū ]* - "نووکی دەرزی 2- لێوی تێژی تیغ": هەروەها ↑مۆ$^2$ mo [موە moh] دەگوترێ بە مانای "پشتی تەشوێ و تەور". خزمە دەگەڵ mähen (G.)، māen (OG.)، mow (E.)، maaien (Nl.)، mia (OF.) "دروونەوەی گیا". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ amaein (Gr.)، metere (L.) "بڕین، دروونەوە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *ma-, *me-* *(Grm.)* "دروونەوە و بڕینەوەی گیا". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشانە باس نەکراوە، بەڵام وشە ژێرمەنییەکان گرێ دەدرێنەوە بە Matte (G.) و mead(ow) (E.) "چەمەنزار" و لەژێر ئەم وشانەدا باس لە ریشەی ***(IE.) * met-*** کراوە. ئەم ریشەیە دەبێ شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی *ma-, me-** . ئەم ریشەیە کە وەك ریشەی ژێرمەنی باس کراوە، دەبێ هاوکات ریشەیەکی هیندوئەورووپی بێ و دواتر ریشەیەکی دووەمیشی لێ دروست بووبێ. دە زمانی کوردیدا هەروەها ↑مەودا$^2$ mewda "لێواری تیغ" و مەورە mewre "1- بڕبەند 2- لکی بڕاوی دارەترێ" بەکار دێن کە دەشێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

[تێبینی: دە زمانی کوردیدا دوو وشەی "مەودا" هەیە، یەکەمیان بە مانای "لێواری تیغ" و دوومیشیان بە مانای "فاسیلە، تیوان". وشەی یەکەم ، وەك باس کراو، پێوەندی بە ریشەی *met-* *(IE.) **ەوە هەیە. وشەی دووەم پێوەندی بە ریشەی *med-** *(IE.)* "رێگە بڕین، (رێگە) پێوان، هەڵسەنگاندن"ەوە هەیە. لە هەر دوو "مەودا"کەدا گۆڕاتیکی هاوچەشن لەچاو ریشەکەدا بەرچاو دەکەوێ].

موو2 **mu 2** *[ mū ]* - "تووك": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑موو1 mu "نووکی دەرزی 2- لێوی تێژی تیغ"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "دروونەوە، بڕینەوە". چەند ئاماژەیەك ئەم بۆچوونە پشتراست دەکەن، بۆ وێنە وشەی "ردێن" [رندێن] خزمە دەگەڵ "رنین(ەوە)" و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بەمانای "بڕینەوە، تاشین، لێکردنەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا rasieren هەم بۆ ردێن تاشین بەکار

دێ و هەم بۆ بڕینەوە [دروونەوە] ی چەمەن. "قژ" [گیس دە فارسیدا] و "کەزی" دەچنەوە سەر ریشەیەک بە هەمان مانای سەرەوە و دەبنە خزم دەگەڵ _قاچین_ "هەڵپاچین" و دە فارسیدا _قیچی_ "مەقەست، برینگ" و هەروەها خزمن دەگەڵ "گوێزان" [گووزان، گیزان].

**مووتی mutî** [ _mūtī_ ] - "شیرەی ترێ": هەروەها مۆت mot و مۆتی motî ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Met (G.)، medu (OE.)، mede (OF.)، medus (L.)، methy (Gr.)، mid (Oir.) "عارەقی هەنگوین"، madhu (OIn.) "شیرە"، medus (Lit.) "هەنگوین"، سەر بە ریشەی < _*medhu-_ (IE.) "هەنگوین، عارەقی هەنگوین". دەشێ خزمیش بێ دەگەڵ ↑مەی mey "شەراب".

**مووچ muç** [ _mūč_ ] - دەگەڵ "ماچ" دێ [ماچ و مووچ]. خزمە دەگەڵ Schmeicheln (G.)، smeichen (G.) "بە زمانی نەرم و لووس دواندن، پێهەڵگوتنی لەرادەبەدر، ناز و نەوازیش کردن" و schminken (G.) "سوراو سپیاو کردن، تیهەڵسوونی رەنگ لە لێو و دەموچاو"، سەر بە ریشەی < _*sme(i)-_ (IE.) "رێخشاندن، لێخشاندن". مەبەست لە "مووچ" دەموچاو لێکخشاندنە لەکاتی ماچ کردندا. وشەکە هەروەها لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑مۆش moş [مڕ و مۆش واتا مڵ و مۆ]. وەک دەبینین لە وشە کوردمادییەکاندا فۆتیمی s ی ریشەکە سواوەتەوە و ئەمەش لە چەندین نموونەی دیکەدا دەبینرێ، وەک وەک وشەکانی "ماڵین"، "مەڕە" [پێمەڕە]، "مەزە" و هتد.

[تێبینی: Schmeicheln (G.) و smeichen (G.) لە باری ماناوە هەڵ سەنگێنە دەگەڵ "مەڕایی" کردن دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "زمانی لووس لێدان، زمانی لووس لێخشاندن". ئەم وشە کوردمادییەش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رێخشاندن، پێداماڵین"].

**مووچاندن mûçandın** [ _mūčandın_ ] - "داهێنانەوە، چەماندنەوە": هەروەها مووچ muç هەیە بە مانای "لار، خوار". دیسان مۆچ moç کردن بە مانای "گوێ شۆڕ کردنی یەکسم" دێ. جگە لەمانە مووچە[2] muçe هەیە کە بە دوو مانای "مەچەک" و "نووشتە" بەکار دەهێنرێ. چەمکی هاوبەش لە هەموو وشەکاندا چەمانەوە و نووشتانەوەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schmiegen (G.)، smiegen (MG.) "خۆ خوارکردنەوە، خۆ خڕ کردنەوە، بەرەو خوار داهاتنەوە [بۆ خۆ شاردنەوە یان جێ خاڵی دان لە بەرانبەر زەبرێکدا"، smūgan (OE.)، smyga (Sw.) "خوشین، بە خشکەیی چوون"، smykatsja (Rus.) "خوشین"، smucken (MG.) "داهاتنەوە، سەر و مل کێشانە خوارەوە"، Schmuggeln (G.)، smuckeln (Nl.) "قاچاق کردن" [دە بنەڕەتدا: بە ماتەمات و خۆ نووشتاندن رەت بوون]. ↑مەچەک meçek دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. جگە لەمانە وشەی ↑مۆز moz هەیە [مۆزەمۆز mozemoz واتا بەدوری شتێکدا سووڕانەوە بە تەمایەک: ئەو کابرایە هەر مۆزەمۆزیەتی لە دەوری ئەو ژنە]. لەوانەیە ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ. لەم پێوەندییەدا وشەیەکی دیکە سەرنج رادەکێشێ و پێ دەچێ دەگەڵ وان وشان خزم بێ. ئەم وشەیە بریتییە لە ↑نوێژ nıwêj یان نمێژ nımêj. دە فارسیدا دەگوترێ نماز nemāz (P.). ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا واتا "داهاتنەوە، خۆ خوار کردنەوە، خۆ تێکەوەنان" و خزمە دەگەڵ نواندن nıwandın (نەواندن newandın) [دانەواندن danewandın، دانواندن danıwandın، کۆنتر: دانەماندن danemandın، دانماندن danımandın - فۆتیمی m گۆڕاوە بۆ w و دواتر بۆ u. ئەم گۆڕانکارییە زۆرجار دە وشە کوردمادییەکاندا دەبینرێ]. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑نووشتانەوە nûştanewe. دەشێ رەوتی گۆڕانکاری وشەکە بەم جۆرە بووبێ کە سەرەتا کردارێک لە ئارادا بووە وەک _نماشتن *nımaştın_، پاشان ئەم کردارە بە دوو جۆر گۆڕانی بەسەرداهاتووە، لە لایەک بووەتە

نووشتان(ەوە) nûştan(ewe) و لەلایەکی دیکەوە کرداری نواندن nıwandın (نەواندن newandın) [دانەواندن] پەیدا بووە. ئەم دوو کردارە هەردووکیان دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا بەکار دەهێنرێن. خودی کردارەکە "نمازتن" یان "نماشتن" دەشێ پێک هاتووە لە پێشگری نێ ne و ئەسڵی کردارەکە، واتا "مازتن" یان "ماشتن". پێشگری نێ ne هەم دە زمانی کوردمادی و هەمیش دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ئاماژە بە لای خوارە دەکا، وەک لە وشەکانی نیشتن [دانیشتن]، نزم، نیسێ، نشێو و هیتردا.

[ تیبینی 1: فۆتیمی س s لە سەرەتای وشە کوردمادییەکانی سەرەوەدا دەرناکەوێ و ئەو دیاردەیەش لە چەندین نموونەی دیکەدا بەرچاو دەکەوێ، وەک وشەکانی "ماڵین"، "مووچ" [ماچ و مووچ]، "مەڕە" [پێمەڕە]، "مەزە" و هتد. تیبینی 2: وەک باسکرا، کردارە کۆنەکە دەبێ "تێماشتن / تێمازتن" بووبێ کە پاشان بەم جۆرە گۆڕانی بەسەردا هاتووە: تێماشتن nêmaştın / تێمازتن nêmaztın ← نەواشتن newaştın / نەوازتن newaztın ← نووشتان(ەوە) nûştan(ewe). هەروەها گۆڕانی دووەم بەم شێوە بووە: تێماشتن nêmaştın / تێمازتن nêmaztın ← نەماندن nemandın نەواندن newandın (دانەواندن) ← نواندن nıwandın (دانواندن). گۆڕانی لەم چەشنە دە ژمارەگەلێک لە کردارەکاندا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە کرداری "قۆستنەوە" پێشتر دەبێ "قاپستن/ قابستن" بووبێ، دوایە دوو شێوەی لێ پەیدا بووە، واتا "قۆستنەوە" و "قاپان" (قابیدن بە فارسی). نموونەیەکی دیکە بریتییە لە "گڤاشتن" کە بە دوو شێوەی دیکەش گۆڕداوە، واتا "گوشین" و "گوان"].

مووچە1 **muçe 1** [ *mūča* ] - "پارەی مانگانە": خزمە دەگەڵ ↑مزد mızd "هەقدەست".

مووچە2 **muçe 2** [ *mūča* ] - "1- مەچەک 2- نووشتە": بڕوانە ↑مووچاندن mûçandın.

موود **mud** [ *mūd* ] - "1- شەرەقسە 2- ئیرەیی 3- دژایەتی": خزمە دەگەڵ Mut (G.)، mood (E.) "ورە، غیرەت، هیمەت". وشە ژێرمەنییەکە دە سەردەمە کۆنەکاندا بە مانای "تووڕەیی"ش بەکار هاتووە. ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک mosthai (Gr.) "حەز کردن، حەولدان"، mos (L.) "خوو و خدە" [دە بنەڕەتدا: ویست و داخواز]، moralis (L.) "بەپێی داب و نەریت"، سەر بە ریشەی **<** ***mo-, *me-*** ( ***IE.*** ) "خۆ ماندوو کردن، تەقەلا کردن، حەز کردنی بە تین، خۆ کوتان بۆ گەیشتن بە ئامانج، هەژانی دەروونی".

مووده **mude** [ *mūda* ] - "ژێهاتی، لێهاتوو": خزمە دەگەڵ ↑موود mud.

موور1 **mur 1** [ *mūr* ] - "بڕەی دار": خزمە دەگەڵ ↑مارین marîn "ورد و خاش کردن، شکاندن" و دەگەڵ ↑مڕ mır [خۆڵەمڕە واتا خوڵی زۆر ورد].

موور2 **mur 2** [ *mūr* ] - "سووچ، گوشە": خزمە دەگەڵ ↑میر mîr "لاتەنیشتی جێگ"، سەر بە ریشەی **<** ***merg-*** ( ***IE.*** ) "قەراخ، سنوور، مەرز".

مووروو **muru** [ *mūrū* ] - "شتی وردیلەی کونکراو کە بە بەنەوە دەکرێ": خزمە دەگەڵ ↑مۆرە more [پێچ و مۆرە].

مووره **mure** [ *mūra* ] - "1- چەکوچ 2- پارچەی بڕاو لە کۆلکەدار": خزمە دەگەڵ ↑مارین marîn [ماردن mardın] "ورد کردن، شکاندن".

مووڕەد **mured** [ *mūrad* ] - "بڕبەند": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەڕە mere "پێمەڕە"دا باس کراون و ئەم مانایانەی خوارەوە دەردەبڕن: "ڕێخشاندن، سوونەوە، هاڕین، وردکردن" و هتد.

**مووس1 mus 1** [ *mūs* ] - "ماچ، ڕەگی کرداری ڕامووسین": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑مووچ muç [ماچ و مووچ]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها موسموس musmus هەیە. ئەم وشەیە دە فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە"دا وەسا لێکدراوەتەوە: "1-کلکەسووتە و قروسکەی سەگ بە خۆشەویستی 2-بریتی لە خۆ ڕێکخستن و زمان لووسی". مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "ڕێخشاندن، لێخشاندن" بێ، هەوەک چۆن لە کاتی ماچ کردندا دەموچاو لێک دەخشێ یان کاتێک ئاژەڵی ماڵی لەرووی خۆشەویستی کلك یان سەری خۆی لە خاوەنەکەی دەخشێنێ.

**مووس2 mus 2** [ *mūs* ] - "گووزان، گوێزان": ئەم وشەیە و هەروەها ↑مووشان(ە) mûşan(e) "جەنجەڕ، جەڕجەڕ" دەشێ پێوەندییان هەبێ بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑مووی[1] mu "لێواری تیخ".

2- ↑مۆژلە mojle "مێروولە" و meizan (OG.)، meita (OIs.)، maitan (Gt.) "بڕین(ەوە)، کوتان(ەوە)".

**مووسم musm** [ *mūsm* ] - "سەرنووکی سمی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ↑میت mît "قیتایی".

**مووش1 mûş 1** [ *mūš* ] - "گوێچ، مت، مته": هەروەها مووشانە mûşane هەیە بە مانای "هەڵماتین، کەلایێن، *مێشێن*". شێوەیەکی دیکە لە ↑مت mıt [مات، هەڵماتین].

**مووش2 mûş 2** [ *mūš* ] - "قڕ و قپ لە ترسان": هەروەها مووش کردن mûş kırdın هەیە بە مانای "بێدەنگ کردن بە گەف": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ mystos (Gr.) "بێدەنگی کردن". هەروەها وشەی Mistik (G.) "بزاوێکی دینی کە تێیدا مرۆڤەکان بە چوونە ناو خۆیانەوە لەگەڵ خودا یەک دەگرن" و mysteriös (G.) "پڕ لە ڕاز و نهێنی" دەچنەوە سەر وشەی myein (Gr.) "داخران". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ Maul (G.) "لمبۆز" و دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *mu- >*** "دەنگی کز و نازەلال بە لێوی پێکەوەنووساو دانە دەرەوە" [ورتەورتەکەی خۆمان]. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑مشە[2] mışe [مشەمش] و چەند وشەیەکی دیکە.

**مووشان mûşan** [ *mūšān* ] - "جەنجەڕ": خزمە دەگەڵ ↑مووس2 mus 2 "گووزان، گوێزان".

**مووشەدەمە mûşedeme** [ *mūšadama* ] - "توورەکەیەکی چەرمین بۆ فووکردن [دەماندن]ی ئاگر": پێک هاتووە لە دوو وشەی مووش- mûş- [خزمە دەگەڵ ↑مەشکە meşke "توورەکەی چەرمین"] + ↑دەم dem "دەماندن ، فوو کردن".

**مووغە muġe** [ *mūġa* ] - "مانگای قەڵەو و غللوور":

1- دەتوانێ گۆردراوی ↑بووغە buġe بێ و فۆتیمی b بۆ m گۆڕابێ.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑*ماسین masîn* و ↑مێشە mêşe و هێندێک وشە کە ئاماژە بە "ئەستوور بوون، چڕ و پڕ بوون، بەهێز بوون" دەکەن.

**موونین munîn** [ *mūnīn* ] - "هۆنینەوە": مووناندن mûnandın یش دەگوترێ. هەروەها موون mun و موونتەنە muntene بە مانای "وەهۆنراو" هاتوون. مانای فارسی وشەکە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "ریسیدن، تاب دادن" هاتووە. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑ملیان mılyan "بزوان"، ↑ملان mılan "جۆرێک سەما"، ↑ململین mılmılîn "خزین، جینگڵ دان"، ↑مۆنک monık "بەندی قامک" [شوێنی جووڵان و سووڕان لە تێوان دوو پارچەئێسکدا]. ئەم وشانە پێوەندیان هەیە بە ریشەی ***(IE.) *meu- >*** "جووڵان، بزوان". هەروەها ↑مل mıl دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو مل ئەندامێکە بەم لا و ئەو لادا دەجووڵێتەوە یان وەردەسووڕێتەوە.

[تیبینی: وشەی "هوندن" [هۆنینەوە]یش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "با دان، سووڕاندن، پێچاندن"].

مۆ¹ **mo** - دەگەڵ "مڵ" دێ [مڵ و مۆ mıl û mo کردن واتا دەم و لووت لە هەرد خشاندن و بە شوێن خواردندا گەڕانی ئاژەڵ].

1- یان خزمە دەگەڵ ↑مشە2 mışe "دەنگی هەناسە لە لووتەوە". ئاماژەیە بەو دەنگە کە لە لووتی ئاژەڵ دەردەچێ لە کاتی بۆن کردندا.

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑مووچ muç [ماچ و مووچ] سەر بە ریشەیەك بە مانای "رێخشاندن، لێخشاندن".

مۆ² **mo** - "پشتی تەشوێ و تەور"؛ موە moh یش دەگوترێ. هەروەها ↑موو¹ mu "1- نووکی دەرزی 2- لێوی تیژی تیغ" هەیە کە دەشێ دە بنەڕەتدا دەگەڵ "مۆ" هەر یەك وشە بن. خزمە دەگەڵ mähen ‹G.›، māen ‹OG.›، maaien ‹Nl.›، mow ‹E.› "دروونەوە، دروێنەکردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *ma-, me- ‹Grm.› "دروونەوە". ریشەی هیندوئەورووپی دیاری نەکراوە. شیمانە دەکرێ amáein ‹Gr.› "بڕین(ەوە)، دروون(ەوە)" پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەبێ. دواتر خزمە دەگەڵ ↑موو² mu "قژ، تووك".

**مۆتە(کە) mote(ke)** [*mota(ka)*] - "شەوە، جۆرێك خەونی ترسناك کە هەناسەی مرۆڤ سوار دەکا":

[سەرەتا تیبینییەك: بە زمانی ئاڵمانی بەو دیاردەیە دەگوترێ Alptraum. وشە ئەڵمانییەکە لە دوو کەرتی Alp و Traum پێك هاتووە، کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ "ئاڵ"ی کوردمادی [ئاڵ و شەوە] و کەرتی دووەم مانای "خەون" دەدا، تیکرای وشەکە دەبێتە "ئاڵەخەون"، واتا خەوتیك کە "ئاڵ" بۆ مرۆڤەکانی دروست دەکا. وەك دەبینین دە زمانی ئەڵمانیدا ئەم دیاردەیە بردراوەتەوە سەر بوونەوەی ئەفسانەیی Alp یان "ئاڵ"ی خۆمان کە لای گەلانی کۆن وەك بوونەوەری خراپ [وەك جنۆکە] سەیر کراون کە لە بن هەرد دا دەژین و شاراوە و نادیارن. ئەم بوونەوەرانە دواتر دە زمانی کوردمادیدا ناوی دیکەشیان بەسەردا براون، وەك "شەوە" [کۆنتر: "شبە"، دە عەرەبیدا کراوە بە "شبح"]، "تارمایی"، "تاپۆ"، "سەهویر"، "ساهل" و هتد. هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "رەشایی و تاریکی" دەکەن. رەنگە ئەمە لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەو بوونەوەرانە دە بیری مرۆڤەکاندا شێوەیەکی رۆشن و ئاشکرایان نەبووە و وەك تەم و مژ و رەشاییەك هاتوونە بەرچاو یان لەوانەیە وەك هێندێك لە ئاژەڵەکان بە شەو چالاك بوون و بە رۆژ خۆیان شاردۆتەوە!].

1- بەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە ئێمەدەتوانین شیمانەی ئەوە بکەین کە وشەی مۆتە(کە) mote(ke) خزم بێ دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑مژ *mıj*، مێش mêş [خۆڵەمێش xolemêş]، ↑مشکی mışkî، مجرۆ2 mıcro "کوێر"، ↑مەتك metık "رەش، شووم"، ↑ماتە mate "تەمی بەرچاو، تاری" و هتد. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە "رەشی و تاریکی" دەکەن. لەم تیڕوانینەوە "مۆتەکە" وشەیەکە وەك "شەوە"، "تارمایی" یان "ساهل" بە مانای بوونەوەرێکی جنۆکەئاسا.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑گرمۆتە gırmote "چکۆڵەی خڕەکە" و ↑مچاندن *mıçandın* "گوشین، گلۆفین" [مچالە mačāle ‹P.› "رێککۆشراو، تۆپەڵە"]. لەوانەیە وشەی ↑مۆتەکە moteke دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "رێکگوشران، گوشار" دە خەودا بکا.

**مۆجلە mocle** [*mojla*] - "مێروو، مرۆچە":

1- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە لە ↑مژلۆر mıjlor "مێرووله" بێ.

2- لەوانەشە "مۆرجەلە morcele" بووبێ و فۆتیمی r تێیدا سوابێتەوە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مێروو meru.

**مۆچ1 moç** [ *moč* ] - "1- قیت، قوت 2- رەگی دەرپەڕیوی پشتی دەست": خزمە لەگەڵ ↑میت mît.

**مۆچ2 moç** [ *moč* ] - "رووگرژ": [مڕ و مۆچ]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑مچاندن mıçandın "گلۆفین، گوشین". لەم تێڕوانینەوە مانای "مۆچ" دەبێتە "رێکگوشراو" و ئاماژە بە دەموچاوی رێکگوشراو دەکا.

**مۆچک moçık** [ *močık* ] - "پێوانەی چکۆڵەی دارین": بنجی وشەکە، واتا مۆچ -moç خزمە دەگەڵ Maß (G.)، māza (OG.) و métron (Gr.) "ئەندازە، پێوانە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رێگەبڕین، (رێگە) پێوان، پێوان، (هەڵ)سەنگاندن" و خزمن دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑مەزەندە mezende.

**مۆخ mox** - "مێشک، مێچک": شێوەیەکی دیکە لە ↑مێشک mêşık.

**مۆخل moxıl** - "پاڵوێنە": خزمە دەگەڵ ↑ماشە1 maşe "سەبەتەی ماسیگری".

**مۆدنە modne** [ *modna* ] - "داری جگەرەکێشان": گۆڕدراوی ↑دەمنە demne.

**مۆد mod** - "دابی تازە بابەت، تازەباو": ریشەکەی بۆ زمانە ئەورووپییەکان دەگەڕێتەوە و دەچێتەوە سەر *modus (L.)* "پێوانە، پێودان، جۆر و شێوە". خزمە دەگەڵ ↑مۆچک moçık "پێوانەی چکۆڵەی دارین".

**مۆدانلوو modanlu** [ *modānlū* ] - "ناوی هۆزێکی کورد": دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑ماد mad "ناوی ئەسڵی نەتەوەی کورد".

2- یان ↑مووده mude "ژێهاتی، لێهاتوو".

**مۆر1 mor** - "نیشانە، شەقڵ": مهر mohr (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑مارکە marke "نیشانە" (بۆ هێلکە دانانی مریشک).

2- morph (Gr.) "شێوە، شەقڵ". رەنگە هەر ئەو وشە یۆنانییە بێ کە دە زمانی لاتینیدا بووەتە forma (L.) [جێگۆڕکێی فۆتیمەکان].

**مۆر2 mor** - "1- رەنگی بنەوشی 2- خۆڵەمێشی، بۆر": هەروەها دەگەڵ "مژ" دێ [مژ و مۆر]. خزمە دەگەڵ Morgen (G.) "سۆزی، بەیانی" و morok (Rus.) "مژ، تەم و تاریکی"، سەر بە ریشەی **< -mer* (IE.)** "درەوشان، رووناک داهاتن، تاریک داهاتن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑مەرێس meres "بریقە، جوانی" سەر بەم ریشەیە.

[تێبینی: لەم بارەوە کە وشەکانی سەرەوە هەم مانای "بریقە و درەوشانەوە" دەدەن و هەمیش مانای "تەم و تاریکی"، دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ وشەی شێو "تێوارەدرەنگان". ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادی و زمانەکانی دیکەدا ماناکانی "درەوشانەوە"، "سێبەر"، "تارمایی" و "بوومەلێڵ"ی وەرگرتووە. پەیدا بوونی مانای "بەرواڵەت" دژ بەیەک لە هێندێک وشەی هاوریشەی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ. ئەم دیاردەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤەکان چۆن سەیری ئەو "لیوانەئاو"ەیان کردووە کە نیوەی ئاو تێدا بووە، هێندێک جار بەلایانەوە نیوەی لیوانەکە "پڕ" بووە و هێندێک جاریش نیوەی "بەتاڵ"].

**مۆران moran** [ *morān* ] - "تەم و مژ، دووکەڵ": خزمە دەگەڵ ↑مۆر2 mor 2 "رەنگی تاریک".

**مۆرە1 more** [ *mora* ] - "شوێنی تێوەچوونی تیرە": مهرە mohre (P.). دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی patrize و matrize بە مانای "تیرە و مێیە" بەکار دێ، واتا تیرە ئەو شتەیە کە دەچێتە

ناو کوتیکەوە و مێیەش ئەو شتەیە کونەکەی تیدایە. وشە ئەڵمانییەکان لە زمانی لاتینی وەرگیراون و دە بنەڕەتدا مانای "باوک و دایک" دەدەن. وشەی مۆرە more و هەروەها ↑مووروو muru ی کوردمادیش دە بنچینەدا خزمن دەگەڵ ↑مێ me و دەگەڵ مادر mādar (P.) "دایک" و هەروەها دەگەڵ ئەو وشانەی دە زمانە ئەورووپییەکاندا مانای "دایک" دەدەن. مۆرە یاخود مووروو کونیان هەیە، شتیان دەچێتە ناوەوە یان پێیاندا رەت دەبێ و لەبەر ئەوە بەم جۆرە ناوزەد کراون. شیاوی باسە دە زمانی کوردمادی کۆنیشدا دەبێ وشەی ماتەر mater "دایک" بەکار هاتبێ. ئەم وشەیە دە گۆرانی منداڵانەی "هەتەرێ مەتەرێ"دا پارێزراوە.

**مۆرە² more** [ *mora* ] - "چینەی دیواری قوڕین":

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑مۆڵ2 mole "قوری سواخ".

2- یانیش پێوەندی هەیە بە murus (L.) "دیوار" سەر بە ریشەی ***(IE.) *moi-, *mei- >*** "قایم کردن". وشە لاتینییەکە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیش، بۆ وێنە Mauer (G.) "دیوار".

**مۆرە³ more** [ *mora* ] - "لەتی بە مشار بڕاو لە کۆلکەدار": موورە mure ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑مارین marîn یان ماردن mardın "شکاندن".

**مۆرە⁴ more** [ *mora* ] - "لۆرە، گۆرانی بەسۆز گوتن": [مۆرەمۆرە واتا لۆرەلۆر]. پێوەندی هەیە بە ↑مڕاندن mırandın ەوە.

**مۆرە more** [ *mora* ] - "ناوچاوان گرژ کردن بە تووڕەییەوە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ خزمە دەگەڵ ↑مرووچ mırûç "کز و خەمبار".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە murren (G.) "بۆڵاندن، مڕاندن، دەنگی ناقایلی دەربڕین" و mürisch (G.) "قەڵس، مۆن، ناقایل". ریشەی وشە ژێر مەنییەکان لاسا کردنەوەی دەنگە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مڕاندن mırandın.

**مۆرانە morane** [ *morāna* ] - "مێرووی دارخۆر": موریانە mūryāne (P.).

1- یان خزمە دەگەڵ ↑مێروو meru

2- یان دەگەڵ ↑مڵە mıle.

**مۆرکە morke** [ *morka* ] - "مێرووی دارخۆر": ↑مۆرانە morane ش دەگوترێ.

**مۆرەگە morege** [ *moraga* ] - "بڕبڕەی پشت، مۆرەی پشت":

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑مۆرە more و ئاماژە بە مۆرەکانی پشت بکا.

2- یان لەوانەیە وشەکە گۆڕدراوی ↑مۆغەرە moġere بێ [مۆغەرەی پشت]. دە زمانی کوردمادیدا ↑مرۆخە mıroxe [مرۆغە mıroġe] ش هەیە بە مانای "مێشکی ناو ئێسک" کە خزمە دەگەڵ وشەی "مۆغەرە".

**مۆری morî** [ *morī* ] - "خامی زۆر سپی": خزمە دەگەڵ ↑مەرێس meres "بریقە، جوانی" و دواتر ↑مۆر2 *mor* "1- رەنگی بنەوشی 2- خۆڵەمێشی، بۆر"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *mer- >*** "درەوشان، رووناک داهاتن، تاریک داهاتن".

**مۆز1 moz 1** - "مێشەکەرانە": خزمە دەگەڵ ↑مێش mêş.

**مۆز2 moz 2** - [مۆزەمۆز mozemoz واتا بەدوری شتێکدا سوورانەوە بە تەمایەک: ئەو کابرایە هەر مۆزەمۆزیەتی لە دەوری ئەو ژنە].

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مووچ muç [ماچ و مووچ].

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مووچاندن mûçandın.

[تێبینی: ئەم وشەیە ماناکەی تارادەیەک کەوتووەتە ژێر کاریگەری مۆز[1] moz "مێش". بە وتەیەکی دیکە لەباتی ئەوە کە بگوترێ "بۆ ئەو ژنە مۆزەمۆز دەکا یان لەدوای ئەو ژنە مۆزەمۆز دەکا، دەگوترێ "لەدەوری" ئەو ژنە مۆزەمۆز دەکا، هەروەک چۆن مۆز (مێش) لەدەوری شتێک دەسووڕێتەوە].

**مۆزە(خانە) moze(xane)** [ *moza(xāna)* ] - "ئەنتیکەخانە": خزمە لەگەڵ ↑مۆسیقا mosîqa.

**مۆزەلان mozelan** [ *mozalān* ] - "مۆڵگە، جێی هەسانەوەی گاران لە چۆلگە": دەشێ خزم بێ لەگەڵ Muße (G.)، muoza (OG.) "وچان، پشوو، کاتی ئازاد". ئەم وشە ئەڵمانییە لە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا نەماوە، خزمە لەگەڵ müssen (G.)، must (E.) "ناچار بوون" و messen (G.) "ئەندازە گرتن، مەزەندە کردن". دە بنەڕەتدا مەبەست لە وشەکە ئاماژە کردن بە کاتێکی دیاریکراو بووە کە دەتوانرێ خۆ بە شتێکەوە خەرێک بکرێ. خزمە لەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑مەخڵ mexıl، ↑مێژ mej، ↑مەزەندە mezende و هتد. مانای "ناچار بوون" لە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەوەڕا هاتووە کە کات، شوێن یان دەرفەتێک دیاری بکرێ [مەزەندە بکرێ] بۆ ئەنجام دانی کارێک. کەرتی دووەمی وشە کوردمادییەکە، واتا "لان" هەر ئەو ↑لان lan ەیە بە مانای "زەوی، جێگە" [وەک بەردەڵان، نەوتەڵان].

**مۆژ1 moj** - "ئەستێرکی بچووک": خزمە دەگەڵ moos (G.)، mos (OG.) و (Nl.)، moss (E.)، mossa (Sw.)، muscus (L.) "زۆنگ، زەلکاو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)meu- >** " تەڕ بوون، لیچق و پیس بوون". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑مچەو mıçew "تەڕایی، شێ" و ↑ماجوە macwe "شوێنێک کە ئاوی پێدا هاتووە".

**مۆژ2 moj** - "لووت پان": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مۆژلە mojle "مێروولە" و خزم بێ لەگەڵ meizan (OG.) "بڕین(ەوە)، کوتان".

**مۆژلە mojle** [ *možla* ] - "مێروولە": بەم شێوانەش دەگوترێ: مژلۆر mıjlor، مژلەور mıjlewr و مژلۆک mıjlok. بنەوشەی مژ- mıj- کە لە هەموو شێوەکاندا خۆی دەبینێتەوە، دەشێ خزم بێ دەگەڵ Ameise (G.)، emmet, ant (E.) "مێروو، مژلۆک". فۆتیمی سەرەتای وشە ژێرمەنییەکان پێشگرە و ئەسڵی وشەکە خزمە دەگەڵ Meißel (G.) "قەڵەم، مکارە" و meizan (OG.)، meita (OIs.)، maitan (Gt.) "بڕین(ەوە)، کوتان(ەوە)". وشە ژێرمەنییەکان بە مانای "مێروو" لەوەڕا هاتوون کە ناوقەدی مێروو بڕدراوییەک یاخود کەت کراوییەکی تێدایە، واتا مانای وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە "بڕدراوە، کەتکراو". [لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "زەرگەتە"].

**مۆژنایش mojnayış** [ *možnayiš* ] - "نیشان دان، لەبەرچاو ڕانان": خزمە لەگەڵ ↑مێزاندن mêzandın "تەماشا کردن".

**مۆسلا mosla** [ *mosla* ] - "باسکیش، درێژترین دار لە هەوجاڕدا": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑مژانە mıjane [مشانە mışane] "داری بەستراوە لە ئاموور" و ↑میزۆ *mîzo*.

**مۆسیقا mosîqa** [ *mosīqā* ] - "ئاهەنگ و گۆرانی": مووزیک muzîk یش دەگوترێ. وشەکە لە زمانە ئەورووپییەکان وەرگیراوە، ئەوانیش لە زمانی لاتینی و ئەویش لە یۆنانی وەری گرتووە. دواجار دەچێتەوە سەر *(Gr.) moūsa >* "هونەر، زانست، پەرەوردەی جوان". هەروەها وشەی ↑مۆزە(خانە) moze(xane) لە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگەڕێتەوە. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑ئامۆژگاری amojgarî.

**مۆش1 moş** [ *moš* ] - دەگەڵ "مڕ" دێ [مڕ و مۆش mır u moş کردن ئەو دۆخەیە کە ئاژەڵ بە شوێن خۆراکدا دەم و لەوسی لە هەرد دەخشێنێ].

1- یان خزمە دەگەڵ ↑مووچ mu [ماچ و مووچ]. ئەم وشەیە دەبنەڕەتدا بە مانای "ڕێخشاندن، لێخشاندن"ە. لەم تیڕوانینەوە "مۆش" واتا دەم و لووت لە هەرد *خشاندن* بۆ دۆزینەوەی خۆراک.

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مشە mışe "دەنگی هەناسە لە لووتەوە". لە کاتی بۆن کردن بە هەرددا دەنگێکی لاواز لە دەم و لووتی ئاژەڵەکە دێتەدەر و لەوانەیە "مۆش" ئاماژە بەو دەنگە بکا.

**مۆش2 moş** *[ moš ]* - "بێنرخ، بێبایەخ":

1- لەوانەیە گۆڕدراوی ↑بۆش boş "بەتاڵ، ڤاڵا" بێ.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ماسین masîn "با کران" [فش بۆوە؟].

**مۆغ moġ** - "پێشەوای زەردەشتی": مغ (.P) moġ، (.Pl) maġ، (.Av) maġa. خزمە دەگەڵ ↑مەزن mezın "گەورە". دە بنەڕەتدا مەبەست " گەورەپیاو" بووە. وشەی Magie (.G) و magic (.E) "جادوو" لە ڕێگەی زمانی یۆنانییەوە [magos (.G)] دەچنەوە سەر ئەم وشەیە. هەروەها وشەی مجوس majūs (.Arb) دەچێتەوە سەر magus کە وشەیەکی مادی و پارسی کۆن بووە.

**مۆغەرە moġere** *[ moġara ]* - "مۆرەی پشت": شێوەیەکی گۆڕدراوی ↑مۆرەگە morege.

[تێبینی: وێ دەچێ گۆڕانی وشەی "مۆرەگە" بە "مۆغەرە" لەژێر کارتێکەری وشەی *مۆخ* "مێشک، مێچک"دا رووی دابێ، چونکوو ئەم مۆرانەی پشت یان مۆرەگە بەگشتی جۆرێک لە مۆخی تێدایە، بە ئاڵمانی بەم مۆخە دەگوترێ Rückenmark "مۆخی پشت، پشتەمۆخ، نوخاع"].

**مۆڤک movık** - "وردەئێسکی ناو لەش 2- بەند و گەی ئێسک 3- گرێی ناو ساقەتەی روەک": [مۆڤکا پشت، مۆڤکا مل]. بەند و گەی ئێسک ئەو شوێنانەی کە جووڵانەوەیان تێدایە، واتا لەم شوێنانەدا ئێسکەکان دەجووڵێنەوە. هەر بۆیە دەبێ وشەکە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **<** ***(IE.) *meu-*** "جوولان، بزوان" و خزم بێ لەگەڵ ↑ملیان mılyan "بزوان".

**مۆک mok** - "ساغ و تەواو، بێ کەمایەسی": هەروەک چۆن وشەی "ساغ" خزمە دەگەڵ "سەخت"، هەر بەم شێوەیەش "مۆک" خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "بەهێز بوون، پتەو بوون"، وەک ↑مێش3 *mêş* "هێز" و ↑موکور mukur "نەترس، ئازا، پێداگر" و هتد.

[تێبینی: وەک دەبینرێ لەنێوان چەمکەکانی "بەهێزی"، ساغی" و "بێکەمایەسی"دا پێوەندی هەیە، بە وتەیەکی دیکە کاتێک شتێک یان کەسێک بەهێز و پتەوە، ئەوا ئەو شتە وەک ساغ و بێ کەمایەسی لەبەرچاو گیراوە و بە پێچەوانەشەوە بوونی کەمایەسی و ناساغی وەک بەرهەم و نیشانەی بێهێزی و ناپتەوەی هاتووەتە ئەژماردن.

**مۆل1 mol** -"لێک کۆ بوونەوەی مەڕ و ماڵات لە شوێنێک": جێی هەڵسەنگاندن دەگەڵ:

1- ↑مەلۆ melo "1-لۆدەی دەخڵی درواو 2- پڕی باوەشێک لە دەخڵی درواو".

2- multus (.L) "زۆر، فرە".

**مۆل2 mol** -"دوڕەی باوک تاژی دایک سەگ": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *mei-*** ***(IE.)*** "گۆڕین، گۆڕینەوە، جێگۆڕکێ کردن". لەم تیڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑متە mıte "بەدەڵ، زڕ، نەڕاست".

**مۆلک molık** - "بەندی قامک": خزمە دەگەڵ ↑ملیان mılyan "بزووتن".

[تێبینی: هەڵی سەنگێنە دەگەڵ جومگە cumge و جمین cımîn بە مانای "بزووتن". دیارە جومگە یان بەندی قامکەکان ئەو شوێنانەن کە ئێسکەکان بەم لا و ئەولادا دەبزوون یاخود دەجمێن].

**مۆلە1 mole** *[ mola ]* -" گوڵمێخی دار": خزمە دەگەڵ ↑میلە mîle "ئاسنی درێژووکە".

**مۆڵە2 mole** *[ mola ]* -"قوڕی سواخ": خزمە دەگەڵ ↑ماڵە male "ئامرازی پێداماڵین" و ↑ماڵین malîn "پێداماڵین، تیهەڵسوون".

**مۆم mom** - "1- کڕاش (کراژ) 2- شەم": بە مانای یەکەم مێوmew یش دەگوترێ [گۆڕانی فۆتیمی m بۆ w]. mūm (P.). وشەی Mumie "مۆمیایی" لە زمانە ئەورووپییەکاندا ریشەکەی بۆ ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە. وشە کوردمادی و فارسییەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و لەوێوە بۆ ناو زمانی ئیتالیایی و دواتریش زمانە ئەورووپییەکانی دیکە. ئەم وشەیە وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی *(IE.) *sme(i)- >* "رێخشاندن، لێخشاندن". لەم تێڕوانینەوە ناوی "مۆم" یان "مێو" لەوەڕا هاتووە کە ئەوە شتە بۆ تیهەڵسوون [رێخشاندن، پێداماڵین] کەڵکی لێ وەرگیراوە. لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ وشەی *کڕاش* "مۆم، مێو" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پێوەنووسان، چەسپ بوون". هەروەها شیاوی باسە کە وشەی "کەرە" [رۆنەکەرە] و "کرێم" لە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سوونەوە، رێخشاندن، تیهەڵسوون". فۆنێمی s ی سەرەتای ریشەکە لە وشە کوردمادییەکەدا دەرناکەوێ و ئەم دیاردەیە لە چەندین وشەی دیکەشدا هەر وایە. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مووچ muç [ماچ و مووچ].

**مۆن mon** - "ڕووگرژ، تیوچاوان تێکناو": هەروەها مۆنە mone کردن هەیە بە مانای ڕوو گرژ کردن. خزمە دەگەڵ moan (E.)، mone (ME.)، ma nan (OE.) "ناقایلی نیشان دان، مۆنە کردن". دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی Oxford دا مانای ئەم وشەیە بەم جۆرە شی کراوەتەوە: *complaint, (with imit. Suggestion) long murmur expressing pain.* دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا مۆن وەک "مڕ و مۆچ" مانا کراوەتەوە. لە هەردوو مانا کردنەوەکەی سەرەوەدا پێوەندی مۆنە بە "مڕ" یان "مۆڕە" کردن بەرچاو دەکەوێ.

**مۆنک monık** - "بەندی قامک": خزمە دەگەڵ ↑موونین munîn "هۆنینەوە" و هەروەها ↑مۆڤک movık "بەندی ناو ئێسکەکان". ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "بزوان و جمین" دەکەن. شیاوی باسە کە وشەی "جمگە، جومگە" پێوەندی بە کرداری "جمین"ەوە هەیە. هەر بەم شێوەیەش "مۆنک" و "مۆڤک" پێوەندییان بە کردارێکەوە هەیە کە دەبنەڕەتدا هەڵگری مانای "بزوان، سووڕان"ە.

**مهاندن mıhandın** *[ mıhāndın ]* - "هەزم کردن، هەرس کردن، هەڵتاواندن": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسک دان، ماڵین". وەک لەژێر وشەی "ماشتن"دا باس کراوە، گەلێک وشە لەو چوارچێوەیەدا جێ دەگرن کە ماناکانیان بریتین لە ماڵین، رێخشاندن، پشاوتن، کوتان، ورد کردن، نەرم کردن و هتد. ئەوەی ئەو بۆچوونە پشت ڕاست دەکا، ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا ↑مهتن mıhtın یش هەیە کە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑مشتن mıştın. مشتن [شیرمشتن] خۆی لە پێوەندی دەگەڵ "ماشتن"دایە.

**مهتن mıhtın** - "مشتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑مشتن mıştın.

**مهەس mıhes** *[ mıhas ]* - "قاشاغ، ڕنەک": خزمە لەگەڵ ↑ماشتن maştın بە مانای "رێخشاندن، پێداماڵین". لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ *مەهلی* "خێشک" کە ئەویش دەچێتەوە سەر کرداری "ماڵین". لەهەر دوو وشەی "مهەس" و "مەهلی"دا فۆنێمی h زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکانەوە.

[تێبینی: جێی باسە کە دوو وشەی "قاشاغ" و "خێشک"یش پێکەوە هاوریشەن].

مهین **mıhen** [ *mıhen* ] - "1- سنگی لەدار 2- بزمار و ئالقە بۆ شت پێ هەڵواسین": خزمە دەگەڵ↑مێخ mex "بزمار". لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*moi-, *mei** **(IE.)** "قایم کردن".

مەبەست **mebest** [ *mabast* ] - "مەنزوور": دەشێ وەرگیرابێ لە < **مبحث** *mabħaθ* (*Arb.*)، واتا ئەو شتەی جێی باسە، بابەتی باس. دە بنەڕەتدا کاتێک گوتراوە "مەبەست ئەوەیە کە..."، ویستوویانە بڵێن "باسەکە یان مەوزووعەکە ئەوەیە کە...".

مەبەه **mebeh** [ *mabah* ] - "گوشاد، هەراو، فرەه": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑مرِ mır "زۆر تێر". دیارە لەتێوان چەمکەکانی گوشادی، فرەهی و زۆریدا پێوەندی نیزیک هەیە، بۆ وێنە "گوشاد" خۆی خزمە دەگەڵ "بۆش" بە مانای "زۆر".

مەت **met** [ *mat* ] - "خوشکی دایک": هەروەها ماتک matık یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا بە مانای "دایک" بووە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ مادر mader (P.)، Mutter (G.)، mother (E.)، mātár (OIn.)، mētēr (Gr.)، mater (L.) "دایک"، سەر بە ریشەی **< -*mātér** **(IE.)** "دایک".

مەتاڵ **metal** [ *matāl* ] - "سپەر، قەڵخان": پێوەندی هەیە بە metallon (Gr.) "کان، کانزا ".

مەتران **metran** [ *matrān* ] - "تیزەی درێژ بۆ راوەماسی": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مەترەق metreq.

مەترکە **metırke** [ *matırka* ] - "ئەسپەرەی پێمەرە": دەشێ پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لەژێر ↑میت mît "قیتایی، زەقایی"دا باس کراون. .

مەترەق **metreq** [ *matraq* ] - "کوتکی ئاسن": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **-*mat** **(IE.)** "چەکوش، تەشوێ، کوڵینگ". matya (OIn.) "چوماخ ، گورز" و mateola (L.) "چەکوش" لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑مەتران metran هەیە بە مانای "تیزەی درێژ بۆ راوەماسی" کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە وشەی ↑میت mît "قیتایی، زەقایی".

مەتک **metık** [ *matık* ] - لەگەڵ "لنک" دێ و دەگوترێ لنکَ مەتک lıngmetık "شووم". ئەم وشەیە دەئەسڵدا بە مانای کەسێکە کە پێوقەدەمی خێر نییە، بە وتەیەکی دیکە پێوقەدەمی رەشە. "لنکَ" مانای "پێ"دەدا و "مەتک"یش خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑مژ mıj، مێش mêş [خۆڵەمێش xolemêş]، ↑مشکی mışkî، مجرۆ2 mıcro "کوێر" و هتد. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە "رەشی، تاریکی" دەکەن.

مەتە **mete** [ *mata* ] - "ئامرازی سمین، کونکەر": پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑سمتین sımtîn کە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سمین simîn "کون کردن". لەم تێڕوانینەوە فۆنێمی s تێیدا سواوەتەوە. سوانەوەی s لە شوێنێکی ئەوتۆدا چەندین نموونەی هەیە.

2- ↑میت mît "قیتایی، زەقایی".

مەتەرێز **meterez** [ *matarez* ] - "سەنگەر، خەندەق": مەترەس metres و مەتەرێس meteres یش دەگوترێن. دەشێ پێوەندی هەبێ بە *mettallon* (*Gr.*) "کان، قوڵکە، بەردی مەعدەن". هەڵی سەنگینە دەگەڵ "سەنگەر" کە ئەویش لەوانەیە پێوەندی بە "سەنکَ"وە هەبێ. هەروەها هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑مەترەتی metretî "دەفری کاشی بۆ تلێت تێداخواردن".

[تێبینی: ئەم وشانەی سەرەوە لەباری ماناکان و پێوەندییان بە یەکەوە دەتوانین هەڵسەنگێنین لەگەڵ مینا mîna "1- شووشە 2- رووکەشی ددان" و minéral (Fr.) "مەعدەنی، کانزا" و mine (Fr.) "کان، مەعدەن، نەقەب"].

**مەتەشا meteşa** [ *matašā* ] - "داردەستی دەروێش": متەشا mıteşa ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەتینان metînan دا باس کراون، وەک matya (OIn.) "چوماخ، گورز".

**مەتینان metînan** [ *matīnān* ] - "ناوی چیایەک لە کوردستان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانە کە لەژێر ↑میت *mît* "قیت"دا شی کراونەوە، بەتایبەتی -mati (Av.) "دوند، نووک". لەوانەیە وشەکە ئاماژە بە " بەرز و بڵیندی" چیاکە بکا، هەروەک چۆن ناوی چیای "البرز" ئاماژە بە بەرزی ئەم چیایە دەکا. یان لەوانەیە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "شەڕ و لێدان" بکا، چونکوو "میت" دەشێ خزم بێ دەگەڵ matya (OIn.) "چوماخ، گورز" و mateola (L.) "چەکوش" و ↑مەترەق metreq "کوتکی ئاسن"، سەر بە ریشەی **< -*mat (IE.)** "چەکوش، تەشوێ، کوڵینگ".

[تێبینی: دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا وشەی مەتینگەری metîngerî بەمانای "زۆرداری، زەبروزەنگ، سەرکوتکاری" بەکار دەهێنرێ. هەر وەک چۆن وشەکانی "کوتک" و "کوتان" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بەم جۆرەش دەشێ لەو وشانەی سەرەوە بە مانای "گورز، چوماخ، چەکوچ" مانای "لێدان و زەبر و زەنگ" پەرەی گرتبێ. لەم تێڕوانینەوە ناوی چیاکە پێوەندی بە چەمکی "شەڕ و لێدان و زەبر و زەنگ"ەوە پەیدا دەکا و ئەمە لە ناوی چیای دیکەشدا بەدی دەکرێ، بۆ وێنە چیای "سەکران" کە ناوەکەی خزمە دەگەڵ ↑زاگۆڕ "پەیاغی ئەستوور"، ↑زەخم "چیای سەخت و رژد"،↑زەخت "گوشار، هێز"، ↑جەخت cext "گوشار، پێداگری" و هتد].

**مەچەک meçek** [ *mačak* ] - "جومگە(ی دەست)": مچ moç (P.). خزمە دەگەڵ ↑مووچاندن mûçandın "نوشتانەوە".

**مەچیر meçîr** [ *mačīr* ] - "داوەبەن، تاڵ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ماشەر maşer.

**مەختە mexte** [ *maxta* ] - "قەبەڵ، گرتنی کاری سەرلەبەر، قۆنتەرات": خزمە دەگەڵ ↑مەزەندە mezende سەر بە ریشەیەک بە مانای "پێوان، هەڵسەنگاندن".

**مەخز mexız** [ *maxız* ] - "ریشە، ئەسڵ، بنەچەکە": خزمە دەگەڵ ↑ماکە make "ماددە، سەرچاوەی بوون".

**مەخڵ mexıl** [ *maxıl* ] - "هەرەتی چنینی رەز لە پاییزدا": خزمە لەگەڵ ↑مێژا mej 1 ["لەمێژە" واتا دەمێکە، لە دەمێکەوە]، Mal (G.)، meal (E.) ، mal (Sw.) "دەم، ژەم ، کاتێکی دیاریکراو، کاتێکی پێوراو"، سەر بە ریشەی **< -(d)*mē (IE.)** "پێوان، رێ پێوان، ئەندازەگرتن، سنوور دیاری کردن". هەروەها دەبێتە خزم لەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑مەزەندە *mezende*.

**مەخلەمە mexleme** [ *maxlama* ] - "قیمە و هێلکەی پێکەوە سوورکراوە": بڕوانە ↑مەخمخین mexmıxn. وێ دەچێ وشەی ملقمة malqama (Arb.) شێوەی عەڕەبێنراوی ئەم وشە کوردمادییە بێ.

**مەخمخین mexmıxn** [ *maxmıxīn* ] - "هەلاهەلا بوون لەبەر کوڵانی زۆر": بنجی وشەکە مەخ -mex ە کە دووبارە دەبێتەوە و دۆخی جەخت کردن لە وشەکە دروست دەکا. دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "تێکەڵ پێکەڵ بوون" بێ و خزمە دەگەڵ ↑ئامێتە amete "لێکدراو، تێکەڵکراو". هەروەها مەخلەمە mexleme هەیە بە مانای "قیمە و هێلکەی پێکەوە سوورکراوە".

**مەخمەر mexmer** [ *maxmar* ] - "پارچەیەکی کوڵکن و نەرم و نۆڵ": مەخمەڵ mexmel یش دەگوترێ. مخمل maxmal (.P). هەردووك بنەوشەی مەخ -mex و مەل -mel یان مەر -mer دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "رێخشاندن، پێداماڵین" دەبەخشن. کەرتەوشەی مەخ -mex خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın و هەروەها کەرتەوشەی مەل -mel دەچێتەوە سەر ↑ماڵین malîn یان ↑مەرە mere [پێمەرە]. لەم تێڕوانینەوە ناوی ئەم پارچەیە لەوەڕا هاتووە کە شتێکی خۆش بووە بۆ دەست پێداخشاندن، هەر وەك پێستی سەگ و پشیلە و ئاژەڵی دیکە کە بۆ ناز کردن دەستیان پێدا دەخشێندرێ.

**مەخەل mexel** [ *maxal* ] - "پەرداخ، مشت و ماڵدراو": خزمە لەگەڵ ↑ماشتن maştın بە مانای "رێخشاندن، رێخستن، پێداماڵین".

**مەدەك medek** [ *madak* ] - "گامێش": ماداك madak یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑مێ me.

**مەڕ mer 1** [ *mar* ] - "پەز": شێوەیەکی دیکە لە ↑ماڵ mal "ئاژەڵ، ولْسات" [ماڵات: ماڵ + ئات].

**مەڕ mer 2** [ *mar* ] - "گۆزە، جەڕە": هەروەها ئەم وشانەش هەن: ↑مەڕکانە merkane "کووپەی دەم گوشاد"، ↑مەڕ mer "زاخە، ئەشکەفت"، ↑مەڕە mere "شکێر، قەڵشەشاخ". ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ریشەی < **-smei*** (**.IE**) "داتاشین، بڕین، کارکردن بە ئامرازی تیژ" و دەبنە خزم دەگەڵ ↑سمین sımîn، سمبە sombe (.P) ["سوراخ سمبە" دە فارسیدا واتا کون و کەلێن]، سمبادە sombade (.P) "کاغەز پەرداخ". [وشەی "پەرداخ" مانای "جام، دەفر"یش دەدا]. لە وشەکانی سەرتردا فۆتیمی s سواوەتەوە. ئەم سوانەوەیە دە وشەی ↑مەتە mete [مەتکەو metkew]یشدا دەبینرێ.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکی "بڕین، (دا)تاشین" دەگەڵ "کون و کەلێن، شکێر" و هەروەها دەگەڵ "جام، دەفر، قاپ" دەتوانین ئاماژە بە وشەی "پەرداخ" بکەین کە هەم مانای "گلاس، لیوان" دەبەخشێ و هەمیش مانای "ساف و لووسکراو" [بە داتاشین و بڕبەند پێدا هێنان]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "بڕین[1]" و دەچێتەوە سەر ریشەی *-bher** (*.IE*) "بەشتی تیژ کار کردن". نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە بریتییە لە وشەکانی *سواڵەت* [بە فارسی سفال] "(لەتە)دیزە و گۆزە" و *شکاف* "کون و کەلێن" و *ساوین* "رێخشاندن، داتاشین". ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی *-(s)kā-bh** (*.IE*) "بە ئامرازی تیژ کار کردن، تاشین، کڕاندن، سوونەوە"].

**مەراس meras** [ *marās* ] - "(زەوی) راو دابەشین بۆ تێچیر گرتن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ markieren (.G) "نیشانە کردن". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە لەگەڵ ↑مارکە marke "نیشانە". لەوانەیە مەبەست لە "مەراس" نیشانە کردنی زەوییەکی بەرفراوان بووبێ بە هێندێك نیشانەی وەك دار و درەخت یان تەپۆڵکە و شتی دیکە بۆ دابەش کردن لەنێوان راوکەراندا.

**مەراشتن meraştın** [ *marāştın* ] - "لە برەو خستن، بێ ڕمێن کردن": هەروەها مەراش meraş هەیە بە مانای "بێ برەو، بێ رمێن". خزمە دەگەڵ ↑ماڵە male 2 "پەڵە(ی دەم و چاوی ژنی دووگیان)"، سەر بە ریشەی < **-mel*** (**.IE**) "رەش بوون، پیس بوون" و دواتر ریشەیەکی کۆنتر، واتا **-mei*** (**.IE**) "تیهەڵسوون، پیس کردن".

**مەراق meraq** [ *marāq* ] - "تاسە، ئارەزوو": دە زمانی کوردمادیدا ↑مرخ mırıx یش هەیە بە مانای "تەماح، تاسە". خزمە دەگەڵ merken (.G) و (.Nl)، märka (.Sw) "سەرنج دان" [دە بنەڕەتدا: نیشانە کردن، ناسینەوە لەڕووی نیشانەیەك]. ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ Marke (.G) "نیشانە" و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ↑مارکە marke "هێلکەی بە

نیشانە دانراو" و لەوانەشە ↑مۆر mor "ئیمزا، شەقڵ، نیشانە". دە زمانی پەهلەویدا وشەی mārāk ‹Pl.› بە مانای "شیاوی سەرنج، هەستیار" بەکار هاتووە و پێوەندی بە وشە ژێرمەنییەکانەوە هەیە. کاک عەلی نانەوازادە دە کتێبی فەرهەنگی پەهلەویدا ‹ل. 186› وشەی "مەراق"ی دەگەڵ وشە پەهلەوییەکە بەراورد کردووە.

**مەرایی merayî** ‹ *marāyī* › - "زمان لووسی، کیسەکێشی": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مەرە mere دا هاتوون، بە مانای "ڕێخشاندن، تیهەڵسوون، ساف و لووس کردن".

**مەرتان mertan** ‹ *martān* › - "رووشاندن": خزمە دەگەڵ ↑مارین marîn "شکاندن".

**مەرج merc** ‹ *marj* › - "1- شەرت 2- گرێو": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑مێرگ merg و ↑مەرز merz "سنوور". دە بنەڕەتدا کاتێک ئاماژە بە مەرجێک کراوە بۆ کردنی کارێک، مەبەست دیاریکردنی چوارچێوەیەک یاخود سنوورێک بووە لەپێوەندی دەگەڵ ئەنجام دانی کارەکەدا. بۆ وێنە کاتێک گوتراوە "بەمەرجێک قسەکەت پێدەڵێم کە لای کەس باسی نەکەی"، مەبەست ئەوە بووە کە مەرزێک بۆ لایەنی بەرانبەری دیاری دەکەی، یان بەوتەیەکی دیکەدا لەسنووری رازداریدا قسەکە باس دەکرێ واتا ئەگەر ئەو مەرزە رەچاو نەکرێ، یان بەڵێنی رەچاو کردنی نەدرێ، ئەوا قسەکە باس ناکرێ. هەروەها کاتێک باس لە ↑هەلومەرج helumerc یش دەکرێ، هەر هەمان مەبەست لەئارادایە. "مەرج" ئەو سنوور یان سنوورانەیە کە زەمینەیەک لە زەمینەیەکی دیکە جیا دەکاتەوە.

**مەرجان mercan** ‹ *marjān* › - "گەوهەرێکە": لەوانەیە بە ئەسڵ وشەیەکی عەرەبی نەبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مەرێس meres "بریقە، جوانی" و دەگەڵ Morgen ‹G.›، morgan ‹OG.›، maurgins ‹Gt.›، morning ‹E.› "بەیانی"، marīci-h ‹OIn.› "تیشک و درەوشانەوە"، سەر بە ریشەی **‹IE.› *mer- >** "بریقەدان، تیشک دان".

**مەرچاندن merçandın** ‹ *marčāndın* › - "پلێخاندنەوە": خزمە دەگەڵ ↑مەردان merdan "1- چەکوچ 2- پێمەڕەکاری 3- بە پێمەڕە کێڵان".

**مەرچقاندن merçıqandın** ‹ *marčıqāndın* › - "گوشینی دومەڵ و کوان": خزمە دەگەڵ ↑مەرچاندن merçandın "پلێخاندنەوە".

**مەرخان merxan** ‹ *marxān* › - "ئێخ خواردن و داکەوتنی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ↑دامرکان damırkan.

**مەردان merdan** ‹ *mardān* › - "1- چەکوچ 2- پێمەڕەکاری 3- بە پێمەڕە کێڵان": خزمە دەگەڵ ↑موورە mure "چەکوچ" و ↑پێمەڕە pemere [پێ pe + مەڕە mere]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ڕێخشاندن، تیهەڵسوون، پێداهێنان، ماڵین". پاشان چەند مانایەکی دیکەش پەیدا بوون، وەک "ورد کردن، هاڕین، نەرم کردن، پشاوتن، شل و شەوێق بوون" و هتد.

**مەردم merdım** ‹ *mardım* › - "خەڵک": مردم mardom ‹P.›، martom ‹Pl.›. دەچێتەوە سەر ↑مێر(د) mer(d) "مرۆ، پیاو".

**مەرژین merjîn** ‹ *maržīn* › - "گوڕڕاندن": مەرژ merj "گوڕڕە". خزمە دەگەڵ ↑مڕاندن mırandın.

[تێبینی: فۆنیمی j دۆخی جەخت کردن دروست دەکا و چەند نموونەی دیکە لەم بارەوە بریتیین لە "چڕژان" [تیکچڕژان]، "لۆقژین"، "لوکژین" و هتد.

**مەرس 1 merıs** ‹ *marıs* › - "1- گای گیرە 2- پشاوتن": خزمە لەگەڵ ↑مەرسین mersîn.

مەرس2 **merıs** [ *marıs* ] - مەرس کردن merıs kırdın واتا "جاڕز کردن". پێوەندی هەیە بە ↑مەرس1 merıs "پشاوتن". دە بنەڕەتدا مەبەست "خستنە ژێر گوشار"ە.

مەرسە **merse** [ *marse* ] - "گومان، خەیاڵ": خزمە لەگەڵ ↑مەراق meraq "تاسە، ئارەزوو" [دە بنەڕەتدا: سەرنج].

مەرسین **mersn** [ *marsīn* ] - "پشاوتن": خزمە دەگەڵ ↑مەرچاندن merçandın "پڵیخاندنەوە".

مەرش **merış** [ *mariš* ] - "لەشگران، تەوەزەل": خزمە لەگەڵ ↑مرکان mırkan [دامرکان].

مەرقان **merqan** [ *marqān* ] - "پیس بوونی شیر و هێلکە": پێوەندی بە ↑مەڵقین melqîn ەوە هەیە بە مانای "بڵ بوون، رزین".

مەرک **merık** [ *marık* ] - "پێمەڕە": بنەوشەی مەر -mer هەر ئەوەیە کە دە وشەی ↑پێمەڕە pemere دا دەبیندرێ. [pe + mere]. خزمە دەگەڵ ↑ماڵە male "ئامرازی سواخ دان و پێداخشاندن" و دواجار ↑ماڵین malîn "رێخشاندن، ساوین، پێداهێنان، گەسک دان، سرینەوە، خاوین کردنەوە".

مەڕکانە **merkane** [ *markāna* ] - "کووپەی دەم گوشاد": ↑مەڕ mer "گۆزە، جەڕە".

مەرگ **merg** [ *marg* ] - "مردن": مرگ marg (P.). ↑مردن mırdın.

مەرگە **merge** [ *marga* ] - "گەورەدینداری ئێزیدی (ئەزدایی)": دەشێ پێوەندی هەبێ ↑مەراق meraq "تاسە، ئارەزوو" [↑مرخ mırıx] و merken (G.) و (Nl.)، märka (Sw.) "سەرنج دان، ئاگا لێ بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "بوودا" هەڵی سەنگینین کە ماناکەی دەبێتە "هەستیار، زانیار"، لەم بارەوە بڕوانە "بوت"].

مەرمەڕ **mermer** [ *marmar* ] - "بەردێکی ساف و جوان": بە شێوەی جوربەجۆر دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەبیندرێ و دەچێتەوە سەر marmoros (Gr.) "بەرد" سەر بە کرداری marainen (Gr.) "سوونەوە، پاکتاو کردن، لە بەین بردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑مارین marîn و دواجار ↑ماڵین malîn دە کوردمادیدا. وشەی "مەرمەڕ" دە زمانی کوردمادی و زمانە ئەوروروپییەکاندا بە مانای "کەلا، دەسکەلا" بەکار دێ، چونکوو کەلا لە بەردی مەرمەڕ دروست کراوە.

مەرمەڕشا **mermerşa** [ *marmaršā* ] - "پارچەی لۆکەیی نەرم": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑مەلمەل melmel.

مەرووز **meruz** [ *marūz* ] - "کز و لاواز": هەڵی سەنگینە دەگەڵ مرض maraż (Arb.) و morbos (L.) "نەخۆشی". ئەم وشە لاتینییە خزمە دەگەڵ ↑مردن mırdın.

مەرهەم **merhem** [ *marham* ] - "هەتوان": مەڵحەم melħam یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ئەو وشانەی لەژێر ↑مەڕە1 mere "پێمەڕە"دا ریز کراون.

2- myron (Gr.) "رۆن".

مەڕە1 **mere** [ *mara* ] - "پێمەڕە": ↑مەڕک merk یش دەگوترێ. مەڕە یان مەڕک بەگشتی بە ئامرازێک گوتراوە کە بۆ کڕاندن، ساف و لووس کردن و خاوێن کردنەوە کەڵکی لێ وەرگیراوە. دواتر شێوەیەک لەم ئامرازە کە بە "پێ" کاری پێ دەکرێ، پێی گوتراوە ↑پێمەڕە pemere واتا "مەڕەی پێ". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەن. هێندێک لەم وشانە بریتین لە: ↑مەرس mers "1- گای گیرە 2- پشاوتن"، ↑مەرسین mersîn

"پشاوتن، ڕێککوشین"، ↑مەرچاندن merçandın "پلّیخاندنەوە"، ↑مەلقاندن melqandın "گەیاندنی میوە بە گوشین و دە قەرە خستن"،↑مرچقاندن mırçıqandın "لەناو پەنجەدا کوشین"، ↑مریستن mırîstın "مشتن" [دەبنەڕەتدا: بەدەم پشاوتن، زمان ڕێخشاندن]، ↑مرق mırq لێدان "(مەمک) مشتن"، ↑مرِ mır [مرِ ومۆن]، [مشتومرِ] و [مرِ و مۆش]، ↑مەرایی merayî "زمان لووسی، کیسەکێشی"، ↑مەرانە merane "جۆرێک داس"، ↑مەرتان mertan "داڕووشاندن، داڕنین، کەولّ کردن"، ↑مەرەنگۆز merengoz "دارتاش"، ↑مەرِمەرِ mermer "بەردی *داتاشین*"، ↑مارین marîn "ورد و خاش کردن"، ↑مارز marız "زالّم" [ڕێککگوشەر، سەرکوتکەر]، ↑مەرهەم merhem "هەتوان" [دەرمان بۆ پێداخشاندندن، تیهەلّسوون" و هتد. ئەم وشانە ریشەیان دەچێتەوە سەر ریشەی *< *(s)mer- (IE.)* "ڕێککوشین، پشاوتن، ڕێخشاندن، پریواندن، ورد کردن، هاڕین".
بەراوردی ئەم ریشەیە بکە دەگەلّ وشەی ↑سمەر sımer "ساقەتەدەخلّی وردکراو، کا". ئەگەر بە وردی سەرەنجی وشەکانی سەرەوە بدەین، دەبینین کە چەمکی "ڕێخشاندن، ڕێککوشین" لە گشت وشەکاندا بە جۆرێک دەردەکەوێ و ماناکانی دیکە پێوەندیان بەو چەمکەوە هەیە. داتاشین، ورد کردن، داڕووشاندن، چین و چرووک پەیدا کردن، تیهەلّسوون هەر یەکەی بە جۆرێک لە ئەنجامی ڕێخشاندن یان ڕێککوشیندا دروست دەبن. هێندێک لە وشەکانی سەر بەم خێزانەوشە گەورەیە مانایەکی دیکەش دەبەخشن کە بریتییە لە "نەرم بوون". وەک ئاشکرایە نەرم بوون یەکێکە لە ئەنجامەکانی "ڕێخشاندن، ڕێک کوشین و ورد کردن". لێرەدا وەک نموونەیەکی بەرچاو دەکرێ ئاماژە بە وشەی ↑مرِ mır بکەین. "مرِ" جارێکیان دەگەلّ "مۆش" دێ [مرِ و مۆش]. لێرەدا ئاماژە دەکرێ بەو دۆخە کە ئاژەلّ بە شوێن خۆراکدا دەم و لووتی خۆی لە هەرد دەخشێنێ، بە وتەیەکی دیکە دە هەردی هەلّدەسوێ. لە لایەکی دیکەوە مرِ دەگەلّ "مشت" دێ [مشت و مرِ]. لێرەدا ئاماژە دەکرێ بە یەکتر "شێلان" و یەکتر کوتان. دە فارسیدا بۆ ئەم دۆخە دەگوترێ "دست و پنجه نرم کردن" واتا "دەست و پەنجە نەرم کردن". لێرەدا پێوەندی گوشین و کوتان بە نەرم بوونەوە دەردەکەوێ. "مرِ" هەروەها دەگەلّ "خۆلّ" دێ [خولّەمرِە]. خۆلّەمرِە واتا خۆلّێکی نەرم و تۆزئاسا کە لە ئەنجامی ڕێخشان، کوشران و کوترانی زۆر بە پێ دروست دەبێ، واتا زۆر بەسەریدا ڕۆیشتوون و پێشێل کراوە. مانای "نەرم" لەو وشە کوردمادییانەی خوارەوەدا بەڕوونی بەرچاو دەکەوێ: ↑مەرەز merez، ↑مۆری morî "خامی سپی"، ↑مەرِمەرِشا mermerşa "خامی سپی"، ↑مرمرۆک mırmırok "شل، کز و کەنەفت"، ↑مرتین mrtîn "شلی و سستی"، ↑مرت mırt [خرت و مرت یان خرِ و مرِ واتا نەرم و نۆلّ]، ↑مرتێل mırtel "دۆشەکَ"، ↑مراتە mırate "نەمام"، ↑مرتۆخە mırtoxe "چێشتی ئارد و رۆن و شەکر"، ↑مەرەگە merege "خۆراکی شل، شلە"، ↑میراز mîraz "هەویرترش"، ↑مارزا marza "پیسایی ئاژەلّی ساوا کە زەرد و شلە"، ↑مەرهەم merhem "رۆن وەک دەرمان"، ↑مەرقان merqan "پیس بوون و لە کەلّک کەوتنی هێلکە" و هتد. ئەگەر سەرەنجی زمانە ئەورووپییەکان بدەین، دەبینین کە لەو زمانانەشدا وشەکانی سەر بەو ریشەیە هەموو ئەو مانایانە بەدەستەوە دەدەن کە دە زمانی کوردمادیدا بەرچاوە. لە خوارەوە هێندێک لەم وشانە: Schmerz (G.)، smart (Nl) "ئێش و ئازار"، smerzen (OG.)، smarten (Nl.)، smart (E.) "ئێشان"، mürbe (G.)، murw (Nl.) "نەرم، تورت"، morsch (G.)، murken (G.) "ڕێککوشین، گنج کردن، *مرچقاندن*، شکاندن"، Mörtel (G.) "شفتە، قوڕی شێلراو و ئامادە بۆ تیهەلّسوون"، maraínein (Gr.) "تیهەلّسوون، لەناو بردن"، mármaros (Gr.) "بەرد، لەتەبەرد"، márnasthai (Gr.) "بەشەرهاتن، لەیەکتر سرەواندن" [مشت و مرِ کردن]، mortarium (L.) "ئاونگ، دەفری شت تیدا کوتانەوە"، morbus (L.) "نەخۆشی"،

Mord (.G) "کوشتن"، mors (.L) "مەرگ". بەم جۆرە ↑مەرگ merg و ↑مردن mırdın یش دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە پەیدا دەکەن. بەگوێرەی فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکان نەخۆش و مردووەکان لە سەردەمانی زوودا لەشیان مەرهەمی تیهەڵسووراوە، یان لاشەیان دەرمانی تیهەڵسووراوە. لەم تێڕوانینەوە "مردوو" دە بنەڕەتدا واتا "هەنواو، تیهەڵسواو".

[تێبینی: لە کۆتایی ئەم باسەدا جێیەتی ئاماژە بە خاڵێکی دیکەش بکەین. دە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکاندا ئاماژە بە ریشەیەکی دیکەش دەکرێ کە ئەویش ماناکەی بەتەواوی دەگەڵ مانای ئەو ریشەیەی سەرەوە یەکسانە، واتا ریشەی **(IE.) *(s)mel- <**. لەم ریشەیەش گەلێک وشە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا سەرچاوەی گرتووە. ئەم وشانە لەژێر ↑ماڵین malîn دا ریز کراون. ئەم وشانە زۆرجار لە شێوە و مانادا بەتەواوی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە رێک دەکەون، بۆ وێنە ماڵە male و مەڕە mere، مارین marîn "ورد و خاش کردن" و mahlen (.G) "هاڕین"، ماڵێز malez "هەویری شل" و مارزا marza "پیسایی شلی ئاژەڵی ساوا"، مۆڵە mole "قوڕ" و Mörtel (.G) "شفتە"، مەڵقین melqîn "رزینی میوە" و مەرقان merqan "پیس بوونی شیر و هێلکە"، مەرەز merez "مووی نەرمی بزن" و ملوس malūs (.P) "نەرم و نیان" و هتد. بە هەڵسەنگاندنی ئەم جۆرە وشانە شیمانەیەکی بەهێز پەیدا دەبێ کە ئەم دوو ریشەیە بچنەوە سەر بنەڕەتێکی هاوبەش، واتا یەک لەوان ریشە کۆنترەکەیە و ریشەکەی دیکە لەو سەرچاوەی گرتووە. سەبارەت بە پێوەندییەکی ئەوتۆ دە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکاندا چ باسێک نەهاتووەتە ئاراوە].

**مەڕە² mere** [ *mara* ] - "مشک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Maulwurf (.G) "مشکە کوێرە". کەرتی یەکەمی وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر molta (.OG) "خۆڵ". کەرتی دووەمی وشەکە مانای "دەردان، فڕێ دان" دەگەیەنێ و تێکڕای وشەکە دەبێتە "خوڵ فڕێدەر". بەراوردی وشەکە بکە دەگەڵ ↑مۆڵە mole "قوڕ" و هەروەها ↑مر mır [خۆڵە مرە واتا خۆڵی ورد].

**مەڕە mere** [ *mara* ] - "شکێر، قەڵشەشاخ": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑مەڕ mer "جەڕە".

**مەرەد mered** [ *marad* ] - "دەرد، نەخۆشی": بۆچوونێک هەیە کە دەڵێ وشەکە لە مرض maraż (.Arb) وەرگیراوە. بەڵام ئەم بۆچوونە شک و گومان هەڵدەگرێ. لەژێر وشەی ↑مەڕە[1] *mere* "پێمەڕە"دا شی کراوەتەوە کە ↑مەرگ merg و ↑مردن mırdın دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشەوە پەیدا دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(s)mer- <** بە مانای "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، پریواندن، ورد کردن، هاڕین". بەگوێرەی فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکان نەخۆش و مردووەکان لە سەردەمانی زوودا لەشیان مەرهەمی تیهەڵسووراوە، یان لاشەیان دەرمانی تیهەڵسووراوە [بە دەرمان مشتوماڵ دراون]. لەم تێڕوانینەوە "مردوو" دە بنەڕەتدا واتا "هەنواو، تیهەڵسواو، مشتوماڵ دراو". morbus (.L) "مەرەد، نەخۆشی"، Schmerz (.G)، smart (.Nl) و (.E) "دەرد، ئێش"، smerdnós (.Gr) "داچڵەکێنەر"، mordere (.L) "گەستن" پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە زۆر رێی تێ دەچێ کە وشەی مەرەد mered دە ئەسڵدا وشەیەکی کوری بێ و لە زمانی کوردییەوە چووبێتە ناو زمانی عەرەبی.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "دەرد، ئێش، نەخۆشی" و "رێککوشین، پشاوتن" دەکرێ سەیری وشەی "زۆر" (زەخت و زۆر) بکەین. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "*زوورانەوە*، ئێشان، چڵک کردن". دە زمانی کوردمادیدا ئەم مانا بنەڕەتییە دە هێندێک

وشەدا پارێزراوە، وەک، *زوورانەوە* "ئێشان، کزانەوە"، *سویر* "تاوێک کە پێست تاوانگاز دەکا"، *سەبەل* "نەخۆشییەکی چاو"، ↑*ژوار* "ژان" (ژان و ژوار)، زوير "نارەحەت، دڵ ئێشاو". هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە لەم ریشەوە هێندێک وشە بە مانای "زەخت، فشار، ئاستەم بوون" بەدی هاتوون، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا swaerliche (.OG) "ئاستەم، گوشەر" (واتا ئەوشتەی گوشارت دەخاتە سەر، بەرتەنگت دەکا یان ئازارت دەدا)، swārlīhho (.OG) "بە زحمەت، بە ئاستەم، بە سەختی" و schwierig (.G) "سەخت، پرزەحمەت، ئاستەم، پرئازار". بەم جۆرە دەبینین کە هەر لە کۆنەوە پێوەندییەک دروست بووە لەتیوان چەمکەکانی "دەرد، ئێش، ئازار" لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە "زەخت و زۆر، گوشار، بەرتەنگ کردن". دە وشەی "زۆر"دا مانای بنەڕەتی بریتییە لە "ئێشان" و لەم مانایەوە مانای "زەخت و زۆر" (رێککوشراوی) سەری هەڵداوە. دە وشەی "مەرەد"دا بە پێچەوانەوە مانای هەرە بنەڕەتی بریتییە لە "رێککوشین، پشاوتن، هاڕین" و لەمەوە مانای "دەرد، ئێش، نەخۆشی" پەیدا بووە].

**مەرەز merez** *[ maraz ]* - "مووی نەرمی بزن": خزمە دەگەڵ molis (.L) "نەرم". دە فارسیدا ملوس malūs (.P) بە مانای "ناسک، نەرم و نیان" دێ. بەراوردی بکە دەگەڵ ئەو وشانەی کە لەژیر وشەی ↑مەرە[1] *mere* "پێمەرە"دا شی کراوەنەوە.

**مەرەگ mereg** *[ marag ]* - "ئەنباری بازرگانی گەورە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ mercatus (.L) "کڕین و فرۆش، بازرگانی کردن"، merx (.L) "کەلوپەل". وشەی market (.E) "بازار" و هاوتاکانی دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر وشە لاتینییەکە.

**مەرەنگۆز merengoz** *[ marangoz ]* - "دارتاش": خزمە لەگەڵ ↑مەڵەغان meleğan [مەرەخان merexan] "داسێکی کەوانی دەسک درێژ". لە وشەی "مەرەنگۆز"دا فۆتیمی n وەک زێدەیەک خزاوەتە ناو وشەکەوە و هەروەها پاشگری ↑ئۆز -oz بە وشەکەوە لکاوە.

**مەریسۆک merîsok** [ marīsok ] - "گیای مژمژە": ↑مریستن mırîstın.

**مەرێس meres** *[ mares ]* - "1- بریقە، جوانی 2- جوانی و خۆشیکی 3- رەنگ و روو": خزمە دەگەڵ Morgen (.G)، morgan (.OG)، maurgins (.Gt)، morning (.E) "بەیانی"، marīci-h (.OIn) "تیشک و درەوشانەوە"، سەر بە ریشەی < ***mer-*** ***(IE.)*** "بریقەدان، تیشک دان، درەوشان". خزمیشە دەگەڵ ↑مۆر[2] mor [مژ و مۆر].

**مەزار mezar** *[ mazār ]* - "گڵکۆی پیاوچاکان": دە بنەڕەتدا واتا شوێنی زیارەت کردن < *زيارة* *zīyārat* (.Arb).

**مەزاق mezaq** *[ mazāq ]* - "چێژ، ئیشتیا": خزمە لەگەڵ ↑مەزە meze "چێژ، چێژە".

[تێبینی: وشەی زوق zawq (.Arb) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە، واتا زمانی عەرەبی وشەی مەزاق mezaq [مەزاک mezak؟] ی وەرگرتووە و لەمەوە وشەی "زوق"ی دروست کردووە.

**مەزخاندن mezxandın** *[ mazxāndın ]* - "1- خەرج کردن 2- بە فیڕۆ دان": مەزاختن mezaxtın یش دەگوترێ. ئەگەر سەرنجی وشەی *ماڵەڤین* "نابووت بوون، هیچ بۆ نەمان" بدەین دەبینین کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ *ماڵەفە* "سڕینەوە" و دواتر "ماڵین" [راماڵین]. هەر بەم جۆرە دەشێ وشەی "مەزخاندن"یش پێوەندی هەبێ بە ↑ماشتن maştın. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێ لە بنەڕەتدا "ماڵدران و سڕانەوە"ی دارایی بێ.

**مەزران mezran** *[ mazrān ]* - دەگەڵ پێشگری "دا" دێ [دامەزران damezran واتا "ئارام گرتن، جێگیر بوون"]. ئەم وشەیە دە ئەسڵدا دامەرزان damerzan ە و ئەم شێوە رەسەنە دە شێوەزاری کوردمادی خوارووی پارێزراوە. خزمە دەگەڵ mārzatan (.Pl) "دامەرزان" و دەگەڵ

↑دامرکان damırkan "هێوربوونەوە، لە جووڵە کەوتن". کرداری "دامەزران" ماناکەی لە "هێور بوونەوە" پەرەی گرتووە بۆ "جێگیربوون" و بە کەسێکیش کە لەباری کار یان ژیان و گوزرانەوە جێگیر بووە دەگوترێ لە فڵانە شوێن دامەزراوە یان بارو دۆخەکەی "دامەزراو"ە، واتا بارودۆخێکی سەقامگرتووی هەیە.

مەزرکە **mezırke** [ *mazırka* ] - "1- رفێدە 2- قۆڵپێچی نانکەر": بە مانای یەکەم مەزرەقە mezreqe ش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مزەڵق mızelıq "چەسپاو، لکاو" و ↑مزاندن mızandın "لکاندن، چەسپاندن، پێداماڵین، ڕێخشاندن".

مەزرووکە **mezruke** [ *mazrūka* ] - "داریی نووک تیژ کە نانی لە تەنوور پێ دەردێنن": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "ڕێخشاندن، پێدا هێنان، پشاوتن".

مەزرەق **mezreq** [ *mazraq* ] - "جۆرێک خولخولەیە، بەتێکی لەدەوری دەپێچن و ئەوجا خولخولەکە دەهاوێژنە سەر هەرد، بەنەکە جیا دەبێتەوە و خولخولەکە بە توندی و بۆ ماوەیەکی بەرچاو دەخولێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑ماسۆڵە masole "لەتە قامیشێکی کورتە جۆڵا داوی لێ دەپێچن بۆ تەنین".

مەزن **mezın** [ *mazın* ] - "گەورە": خزمە دەگەڵ magnus (L.)، megas (Gr.)، mahi (OIn.)، mah (P.) [ئەم وشە فارسییە ئێستا لە باو کەوتووە] "مەزن"، سەر بە ریشەی ***me-*** < ***(IE.)*** "مەزن". دە زمانە ژێرمەنییە کۆنەکانیشدا ****mekila*** *(Grm.)* بە مانای "مەزن" بەکار هاتووە. گەلێک وشەی ئاشنا دە زمانە ئەورووپییەکاندا پێوەندییان بەو وشانەوە هەیە، وەک major، master، majesty دە ئینگلیزیدا و هەروەها mahārāja (In.) "مەزنەپیاو". ناوی "مهاتما گاندی" یش پێوەندی بەم وشەوە هەیە، "مهاتما" واتا "رووحی مەزن".

مەز(ز)ە **mez(z)e** [ *maz(z)a* ] - "چێژ": مزە mazze (P.). خزمە دەگەڵ schmecken (G.)، smekan (OG.)، smekka (OF.)، smack (E.) "مزە دان، مەزە کردن، چێشتن"، smaginti (Lit.) "تاقی کردنەوە" [دە بنەڕەتدا: چێشتن]، smagris (Lit.) "قامکی نیشانە" [قامکی "دۆشاوەمژە"] سەر بە ریشەی ***smeg(h)-*** < ***(IE.)*** "مەزە دان، مەزە کردن". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑سماق sımaq "بەری دارێکە، ترشە و بۆ هێندێک چێشت کەڵکی لێ وەردەگیرێ" تاکوو مەزەکەی خۆش بکا.

مەزەندە **mezende** [ *mazanda* ] - "نرخاندن، هەڵسەنگاندن، بایی لە سەر دانان": خزمە دەگەڵ messen (G.)، mitan (Gt.)، metan (OE.)، mäta (Sw.) "ئەندازە گرتن" [دە بنچینەدا: پێوان، کێشان، هەڵسەنگاندن]، Maß (G.) "ئەندازە". meter "میتر، یەکەی پێوان" دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر metron (Gr.) "ئەندازە" و خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***med- , *mod-*** < ***(IE.)*** "پێوان، هەڵسەنگاندن". لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑مێژوو meju.

مەس **mes** [ *mas* ] - "قەڵەو، پڕگوشت": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەو وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑ماسین masîn "قەڵەو بوون، ئەستوور بوون".

2- ریشەی ***mad-*** < ***(IE.)*** "تڕ و بڕ بوون، چەور و قەڵەو بوون، ئاو تێگەڕان، ڕۆن لێ تکانەوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ماست mast.

مەساحە **mesaĥe** [ *masāĥa* ] - "میداد پاک کەرەوە": ئەم وشەیە کە دە زمانی عەرەبیدا بەکار دەهێنرێ، ریشەی کوردمادی هەیە و خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسک لێدان، داماڵین، *ڕێخشاندن*، پێداهێنان".

مەساس(ك) **mesas(k)** *[ masās(k) ]* - "داردەستی جووتیار کە سەرێکی لە بزمار و سەرێکی پیشکانی تیدایە": مەساسە masase ش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑ماشتن maştın "گەسك لێدان، داماڵین، ڕێخشاندن، پشاوتن".

2- ↑مەتەشا meteşa "داردەستی دەروێش".

مسای **mısay** *[ mısāy ]* - "فێر بوون": خزمە دەگەڵ بنەوشەی مۆژ -moj دە وشەی ↑ئامۆژگاری amojgarî [ a- mojgarî] و چەند وشەیەکی دیکەدا.

مەست **mest** *[ mast ]* - "1- سەرخۆش 2- غللوور، لەخۆبایی 3- تێر و پڕ": دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑مایی mayî دا باس کراون.

مەسقەل **mesqel** *[ masqal ]* - "ئامرازی خۆ تاس و لووس کردن": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسك لێدان، پێداماڵین، ڕێخشاندن، پێداهێنان".

مەسە **mese** *[ masa ]* - "1- پۆڵای چەقۆ تیژ کردنی قەسابان 2- خاکەندازی مشکی دەردان": خزمە دەگەڵ ↑ماشتن maştın "گەسك لێدان، پێداماڵین، ڕێخشاندن".

مەسینە **mesîne** *[ masīna ]* - "ئافتاوە": دەچێتەوە سەر ↑مس mıs، چونکوو پێشتر ئافتاوە لە مس ساز دەکرا. هەروەها مەسینەهەڵگر mesînehelgır یش زۆر بەکار دەهێنرێ.

مەشاك **meşak** *[ mašāk ]* - "داردەستی دەروێشان": خزمە دەگەڵ ↑مەساس(ك) mesas(ık) "داردەستی جووتیار" و ↑مەتەشا meteşa "داردەستی دەروێش" و لەوانەشە ↑میت *mît* "1- قیتایی 2- قامکە تووتە".

مەشت **meşt** *[ mašt ]* - "سبەی، سۆزی": مەست mest یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑مێش² mêş "ڕەش، تاریك، بۆر". لەم تێڕوانینەوە مەبەست دەبێ شەوەکی، بوومەلێڵ واتا بەیانی زوو بێ.

مەشتە **meşte** *[ mašta ]* - "جۆگەیەك کە قەدەدێراوێك ئاو دەدا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ماجوە macwe "شوێتێك کە ئاوی پێدا ڕۆیوە" و ↑مۆژ moj "ئەستێرکی بچووك".

مەشکە **meşke** *[ maška ]* - "1- توورەکەی شیر تێدا ژەندن 2- خیگە 3- ورگ": مەسکە meske ش دەگوترێ. مشك mašk (P.). خزمە دەگەڵ Magen (G.)، mago (OG.)، mage (OF.) و (Sw.) "مەعیدە، ورگ"، megein (Kymr.) "مووشە دەمە"، makas (Lit.) و mošĭna (OSl.) "توورەکە"، سەر بە ریشەی **< -*mak (IE.)** "توورەکەی چەرم، مەشکە". وشەکە دەبیتە خزم دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ↑مووشەدەمە mûşedeme "توورەکەی دەماندن".

مەغەل **meġel** *[ maġal ]* - "حەوشەمەڕ، پەچە": پێك هاتووە لە دوو کەرتی مە me + غەل ġel. کەرتی مە me دە شێوەزارەکانی کوردمادیدا بە چەند جۆری وەك مەه meh، میك mîk، مێشنا mêşna [میش mīš (P.)] دەبینرێ و دە وشەی ↑مێگەل megel یشدا خۆی نیشان دەدا. ئەم وشەیە ماناکەی دەبێتە "مەڕ، پەز". کەرتی دووەهەمی وشەکە، واتا "غەل" خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هۆڵ hol و تێکڕای وشەکە "هۆڵەمەڕ" یان ئەو شوێنەی بۆ ڕاگرتنی مەڕ دیاری کراوە.

مەقاش **meqaş** *[ maqāš ]* - "ماشە، پەنگر": ئەم وشەیە و هەروەها ↑مەقەست meqest دەبێ لە زمانی عەرەبی وەرگیرابن، بەڵام دەشێ ریشەی کوردمادییان هەبێ. دە زمانی عەرەبیدا زۆرجار ناوی تشت، کەرستە و ئامراز بە فوتیم یاخود نیشانەی m دروست دەبێ، وەك "مسواك، مخزن، محور، مروحە، مزمار، **مصقل** و.....". وشەکانی "مقاش" و "مەقەست" خۆی ریشەکەیان دەچێتەوە سەر ↑گاز gaz "کەلبەتان" و خزمن دەگەڵ ↑گەستن gestın، ↑قاچی qaçî [قەیچی qeyçî] و ↑قاچین qaçîn "هەڵپاچین". ئەگەر سەیری وشەی ئەورووپی Pinzette "ماشە" بکەین،

دەبینین کە دەچێتەوە سەر کردارێکی زمانی فەرانسەیی بە مانای "گەستن، قورنجاندن". هەروەها ئەگەر سەیری وشەی فارسی "انبر" بکەین، دەردەکەوێ کە وشەکە پێوەندی بە کرداری "بڕین" هەیە. کەوابوو "مەقاش" و "مەقەست" کە شێوە و کارکردیشیان لەیەک نیزیکە، ئامرازێکن "گاز لە شت دەگرن". ئەم شێوە گۆڕانە لە وشەی "مسواک" و "مخزن"ی عەرەبیشدا بەدی دەکرێ. ئەم وشانە لە "سیواک" و "خزنە"ی کوردمادی وەرگیراون و نیشانەی m خراوەتە سەریان و کراون بە وشەی عەرەبی. لەم باوەڕە دام کە ژمارەیەکی زۆر لە وشەکانی زمانی کوردمادی بەم شێوە عەرەبێنراون.

[تێبینی: لەسەرەوە باسکرا کە وشەی "قاچین" هاومانایە دەگەڵ "هەڵپاچین" و خزمە دەگەڵ "گەستن". وشەی "(هەڵ)پاچین" خۆی خزمە دەگەڵ beißen (G.) "گەستن].

**مەقەست meqest** [ *maqast* ] - "قاچی، برینگ": بڕوانە ↑مەقاش meqaş پەنگر".

**مەک mek** [ *mak* ] - دەگەڵ "شت" دێ [شت و مەک şıt u mek واتا کەرەسە، کەلوپەل]. مەک شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ماکە make "مادده". وەک دەزانین مادده هەم مانای "سەرچاوە و بنەڕەتی بوون" دەگەیەنێ و هەمیش بە مانای "کەرەستە، شت" دێ. دە زمانی کوردمادیدا بۆ مانای یەکەم ماکە make و بۆ مانای دووەم مەک mek دانراوە. دە زمانی ئەڵمانیدا materie بە مانای "مادده، ماکە" و material بە مانای "کەرەسە، شتومەک" بەکار دێ کە لە زمانی لاتینی وەرگیراون و دەچنەوە سەر وشەیەک بە مانای "دایک" و دە بنەڕەتدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑مێ me.

**مەکارە1 mekare 1** [ *makāra* ] - ↑مکارە mıkare ش دەگوترێ.

**مەکارە2 mekare 2** [ *makāra* ] - "قڕقڕەی جلدروو": خزمە لەگەڵ ↑مەکووک mekuk.

**مەکووک mekuk** [ *makūk* ] - "جێگەی ماسوولکە دە ئامرازی جۆلاییدا": مکوک makūk (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ mēchané (Gr.) "ئامێر، مەکینە". ئەم وشە یۆنانییە خزمە دەگەڵ ↑مێش *mêş* "هێز (ی کار و چالاکی)" و دواتر موکور mukur "بەهێز" و ↑موکریان mukıryan.

**مەکۆ meko** [ *mako* ] - ئەم وشەیە لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "1- جێگەی کۆ بوونەوەی خەڵک 2- کۆگا". وێ دەچێ مانای وشەکە لەژێر کاریگەری وشەی "کۆ"دا گۆڕاتیکی بەسەردا هاتبێ. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑ماکە make "سەرچاوە، بەدیهێنەر". لەوە دەچێ سەرەتا وشەکە بەم مانایە بەکار هاتبێ و بۆ وێنە کاتێک باس لە شوێنێک وەک مەکۆی شۆڕش، رووناکبیران و هونەرمەندان و هیتر کراوە، ئەوا مەبەست ئەوە بووە کە ئەو شوێنانە سەرچاوە و کانگای ئەو شتانەن. کەوابوو مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "سەرچاوە، شوێنی لەدایکبوون و بەدی هاتن" بووبێ.

**مەگیرانی megîranî** [ *magīrānī* ] - "مەراقی ژنی دووگیان بۆ خواردنێک": خزمە دەگەڵ ↑مەگێز megez "ئارەزوو، واز، مەراق".

**مەگێز megez** [ *magez* ] - "ئارەزوو، واز، مەراق": مجێز mıcêz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ mögen (G.) "حەز کردن، ئارەزوو کردن"، mugan (OG.)، magan (Gt.)، may (E.)، ma (Sw.) "توانین، شیان"، سەر بە ریشەی ***magh- (IE.)* <** "شیان، توانین". megti (Lit.) "خۆش ویستن، پێ خۆش بوون" لەو ریشەوە هاتووە. دە کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مەگیرانی megîranî، ↑مێش3 mêş "هێز (ی کار و چالاکی). وەک دەبینرێ مانای بنەڕەتی ریشەکە "توانین"ە و لەمەوە پاشان مانای "خواستن، حەز کردن" سەری هەڵداوە. وەک ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان بە دروستی ئاماژەیان پێ کردووە، مانا دووەمەکە سەرەتا لە رستەی نەرێنیدا پەیدا بووە، واتا لە مانای

"نەتوانین"ەوە مانای "بێمەیل بوون، نەخواستن" سەری هەڵداوە و دواتریش مانای "خواستن" پەیدا بووە. ئەمە شیرۆڤەیەکی بەجێیە، چونکوو بۆ وێنە کاتێک کەسێک دەبێژی "ناتوانم ئەو دیمەنە ناخۆشە چاو لێ بکەم"، مەبەستی ئەوەیە کە حەز ناکا ئەو کارە بکا.

مەل **mel** [ *mal* ] - "پەلەوەر": خزمە دەگەڵ ↑مریشک mırîşık و مرغ morġ (P.).

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە fliegen (G.)، fly (E.)، vliegen (Nl.)، flyga (Sw.) "فڕین". ئەم وشە ژێرمەنییانە پێوەند دەدرێنەوە بە plakti (Lit.) "مەلە کردن" و دەبردرێنەوە سەر ریشەی **(IE.) *pleu(k)- >** "مەلەکردن، فڕین، جووڵانەوەی خێرا". هەروەها گومان دەکرێ کە Vogel (G.)، fogal (OG.)، fugls (Gt.)، fowl (E.)، fagel (Sw.) "پەلەوەر، مەل" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەبێ. ئەگەر پێوەندی وشە کوردییەکە بەم وشانەوە راست بێ، ئەوا دەبێ فۆنیمی سەرەتای وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی **(IE.) *meu- >** "جووڵان، بزوان". وشەکانی ↑ملیان mılyan "بزوان" و ↑مەلە mele "بزوان دەناو ئاودا" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

مەڵات **melat** [ *malāt* ] - "قوڕی بەننایی": خزمە لەگەڵ ↑مۆڵە mole "قوڕی سواخ".

مەلاس **melas** [ *malās* ] - "شل و شەوێق، کار لە دەست نەهاتوو": خزمە دەگەڵ ↑مل mıl [شل و مل].

مەڵاشوو **melaşû** [ *malāšū* ] - "بانی ناو زار": ملاج malāj (P.). مەلاژ melaj یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە کە بەشێکیان لە ژێر ↑ماڵین malîn دا ریز کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "پێداخشاندن، ڕێخشاندن، پشاوتن" دەکەن. مەڵاشوو ئەو شوێنەی ناو زارە کە لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا و بەتایبەتی لەکاتی شیرمشتنی زارۆکدا زمانی ڕێدەخشێ. خزمە دەگەڵ melken (G.) "شیر دۆشین" و هێندێک لەو وشانەی لە خوارەوە هاتوون.

مەلاق **melaq** [ *malāq* ] - "1- زمانلووس 2- مەرایی": خزمە لەگەڵ ↑مەرایی merayî.

مەلاقە **melaqe** [ *malāqa* ] - "کەوچکی گەورە": ↑مەلاک[1] melak "کەوچک، کەفچی".

مەلاک[1] **melak** [ *malāk* ] - "کەوچک، کەفچی": مڵاک mılak یش دەگوترێ. ↑مەلاقە melaqe ش بەکار دەبرێ بە مانای "ئەسکوێ، کەوچکی گەورەی کلکدرێژ". دیارە هەمووی ئەم وشانە هەر یەکن و مانای بنەڕەتی وشەکەش "کەوچک"ە. ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی عەرەبی، کراوە بە ملعقة malɛaqa (Arb.) و لەوێرا وەک مەلاقە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و لەپاڵ مەلاک و بە مانایەکی تۆزێک جیاواز بەکار دەهێنرێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ملاک mılak "چەژە، چێژە، مەزە". لەم تێڕوانینەوە مەلاک ئامرازێکە بۆ چەژە یان مەزە کردن.

مەلاک[2] **melak** [ *malāk* ] - "جەرگ، هەناو": ملاک mılak یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Milz (G.)، milt (Nl.) و (E.)، mjlte (Sw.) "سپڵ" و هەروەها schmelzen (G.)، smelten (Nl.)، melta (OIs.)، melt (E.) "نەرم بوون، ورد بوون، توانەوە، هەزم بوون"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)mel- >** "ڕێخشاندن، پشاوتن، هاڕین، ورد کردن، نەرم کردن". خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn و ژمارەیەک وشەی دیکە.

مەلان **melan** [ *malān* ] - "سێ پایەی مەشکە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑میلە mîle "ئاسنی درێژۆکە".

مەلاو **melaw** [ *malāw* ] - "ریتکە، شلکینە": خزمە لەگەڵ ↑مل[3] mıl [شل و مل].

**مەڵبەند melbend** [ *malband* ] - "ناوچە": ماڵبەند malbend یش دەگوترێ، پێك هاتووە لە ↑ماڵ² mal + ↑بەند bend، واتا ئەوشوێنەی ماڵی (مرۆڤی) پێوە بەندە، یاخود ئەو ماڵانەی، ئەو بنەماڵانەی لەناوچەیەكدا پێكەوە بەندن و پێكهاتەیەكی هاوبەش دروست دەكەن.

**مەلسین melsîn** [ *malsīn* ] - "بە زەوییەوە نووسان، خۆ *مەڵاس* دان": بڕوانە ↑مڵاز mılaz.

**مەڵغە melġe** [ *malġa* ] - "باری، لۆسە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑میلە mîle.

2- ↑ملیان mılyan "بزوان" و ↑مەلە mele "بزوان دەناو ئاودا"، سەر بە ریشەی **< *meu-** (*IE.*) "جوولان، بزوان". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەكە دەتوانێ "ئامراز بۆ بزواندن" بێ. [هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە وشەی ئەڵمانی Hebel "مەڵغە" بكەین كە دەچێتەوە سەر كرداری heben "هەڵهێنان"].

**مەلقاندن melqandın** [ *malqāndın* ] - "گەیاندنی میوە بە گوشین و دە قەرە خستن": خزمە دەگەڵ (G.) melken و (Nl.)، (OG.) melchan، (E.) milk، (Lit.) melzti، (Gr.) amelgein، (L.) mulgare "شیر دۆشین"، سەر بە ریشەی **< *mel(g)-** (*IE.*) "دۆشین" و دوورتریش سەر بە ریشەی **< *(s)mel-** (*IE.*) "داماڵین ، پێداخشاندن، ڕێخشاندن".

**مەلقەپ melqep** [ *malqap* ] - "ئامرازێكی داركۆڵین": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑میلە mîle.

**مەڵقین melqîn** [ *malqīn* ] - "ڕزینی میوە": خزمە دەگەڵ ↑مڵ mıl "نەرم بووگ، بڵ". هەروەها ↑مەرقان merqan هەیە بە مانای "پیس بوونی شیر و هێلكە". ئەمەشیان دەبێ دە پلەیەكی دوورتردا پێوەندی بە "مەڵقین"ەوە هەبێ.

**مەلكە melke** [ *malka* ] - "زارۆی خڕەكە": خزمە لەگەڵ ↑مەلۆ melo.

**مەلمەل melmel** [ *malmal* ] - "كووتاڵی مەڕمەڕ شا": > *malmal* (*It.*) "كووتاڵی لۆكەیی نەرم". لەوانەیە دە ریشەدا پێوەندی بە ↑مەرەز merez ەوە هەبێ.

**مەلوول melūl** [ *malul* ] - "دڵشكاو، خەمبار": [مات و مەلوول]. لەژێر وشەی "مات²"دا باس كرا كە "مات" دەشێ پێوەندی بە ریشەیەكەوە هەبێ كە مانای "رەشی، تاریكی، بۆری" دەگەیەنێ. هەر بەم جۆرە دەشێ "مەلوول"یش پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *mel-** (*IE.*) "رەش بوون، پیس بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم لەگەڵ ماڵە1 male "پەڵەی دەم و چاو(ی ژنی دووگیان)". لەباری ماناوە دەگەڵ دوو وشەی "كدر" و "مكدر" دە زمانی عەرەبیدا بەرهەڤی بكە.

**مەلۆ melo** [ *malo* ] - "1- لۆدەی دەخڵی درواو 2- پڕی باوەشێك لە دەخڵی درواو": ئەم وشەیە و هەروەها ↑مەلۆتك(ە) melotk(e) پێوەندییان بەیەكەوە هەیە. هەردووك وشە باس لەو شتانە دەكەن كە تێكەوە پێچراون، كۆ كراونەوە و بەستە كراون. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ (L.) moles "قەبارەیەكی پێكەوەنووساو، تۆلا، قورسە [گرسە]، سندە، تۆپەڵە". وشەی (Fr.) molécule "مولكوول" لەم وشە لاتینیە وەرگیراوە و ماناكەی دەبێتە گرسە یان سندەیەكی بچووك. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑مۆڵ mol دان و ↑گرمۆڵە gırmole.

**مەلۆتك(ە) melotk(e)** [ *malotk(a)* ] - "منداڵی ساوای قونداخ كراو": خزمە دەگەڵ ↑مەلۆ melo.

**مەلە mele** [ *mala* ] - "ئاوژەنی": دە زمانی فارسیدا بە مەلە دەگوترێ "شنا". بەڵام وشەی ملوان (P.) malawān هەر وەك مەلەوان melewan ی كوردی بەكار دێ. "مەلە" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< * meu-** (*IE.*) "جوولان، بزوان". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ملیان

mılyan "بزوان" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی بزوان و جموجۆڵ دەکەن. دیارە مەلە جۆرێك لە جموجۆڵە.

[تێبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا schwimmen "مەلە کردن" دەچێتەوە سەر ڕیشەی *suem- (IE.) "بزوان، لە بزواندا بوون". وشەی "چۆم" [چەم] دەشێ پێوەندی بەم ڕیشەوە هەبێ. ئەم ڕیشەیە خۆی دەبێ دەگەڵ ڕیشەیەکی دیکە خزم بێ، واتا ڕیشەی *suen- (IE.) "جمین، جوولانەوە، خولانەوە". وشەی "جمین" لەم ڕیشەوە هاتووە. ئەم پێوەندییانە نیشان دەدەن کە دوو چەمکی "بزوان، جمین" و "مەلە کردن" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و هەروەها لەتیوان وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانەش پێوەندی ئێتیمولوژیك لە ئارا دایە. تێبینی 2: هەر دوو ڕیشەی *suem- (IE.) و-suen * (IE.) "بزوان، جمین، جووڵانەوە" دەشێ دە بنەڕەتدا هەر یەك ڕیشە بووبن. بەم جۆرە "چەم" دەبێتە خزم دەگەڵ "چمە" بە مانای "کلك"، واتا ئەو شتەی جووڵەجووڵ دەکا].

**مەلەزە meleze** [ *malaza* ] - "گەڵاڵە کردن لە مێشکدا": خزمە دەگەڵ ↑مەلۆ melo "1-لۆدەی دەخڵی درواو 2- پڕی باوەشێك لە دەخڵی درواو". ئەمانە و چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا ئاماژە بە ماناکانی "تیکەوە پێچراون، کۆ کراونەوە، بەستە کران، تۆپەڵە بوون" دەکەن. شیاوی باسە وشەی "گەڵاڵە"ش دە ڕیشەدا مانایەکی ئەوتۆ دەبەخشێ.

**مەلەس meles** [ *malas* ] - "پارچەی ئاوریشم": خزمە دەگەڵ ↑مەرەز merez "تووکی نەرمی بزن".

**مەڵغان meleġan** [ *malaġān* ] - "داسێکی کەوانی دەسك درێژ": مەرەخان merexan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ماڵین malîn سەر بە ڕیشەیەك بە مانای "ڕێخشاندن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑مەڕانە merane "داسی درێژ" و ↑پێمەڕە pemere "بێڵ، خاکەندازی گەورە" کە ئەوانیش دە پلەیەکی دوورتردا پێوەندیان بەم ڕیشەوە هەیە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەستەرە" (فارسی: استره ostore) "گوێزان، تیخی مووتاش". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "ئەسترین" و دەچێتەوە سەر ڕیشەیەك بە مانای "ڕێخشاندن، لێخشاندن". هەروەها دە زمانی ئینگلیزیدا shave (E.) "موو تاشین" خزمە دەگەڵ "ساوین"ی کوردمادی و ئەمیش دە بنەڕەتدا مانای "ڕێخشاندن" دەدا].

**مەمك memık** [ *mamık* ] - "ئەندامی شیردەر": دە زمانی زارۆکدا مەمە meme ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ mama (L.) "مەمك، مەمە". وشەکە لاسا کردنەوە و دووپات کردنەوەی دەنگی ma یان me یە کە لە زمانی زارۆك وەرگیراوە. دە هێندێك لە زمانەکاندا mama بە مانای "دایك" بەکار دێ. دە زمانی کوردمادیدا بەو ژنەی لەکاتی زاندا ئاریکاری دەکا، دەگوترێ ↑مامان maman، دە فارسیدا پێی دەگوترێ ماما mama (P.). هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑میمك mîmık و ↑مام mam.

**مەمڵ memıl** [ *mamıl* ] - "مەمك": بڕوانە ↑مەمك memık. ئاوازێکی زارۆکان هەیە کە دەڵێ : "مەمڵی مەمۆیە، مەمۆ! هی خۆمە و نایدەم بە تۆ". لەوانەیە مانای ئەم وشانە ئاوا بێ: "مەمکی دایەیە، دایە! هی خۆمە و نایدەم بە تۆ". لەوانەیە زارۆکێکی شیرەخۆرە دایکی جارس کردبێ و دایکەش بەم ئاوازە بەرەنگاری بووبێتەوە!

**مەن men** [ *man* ] - "ئەندازەیەکە بەرانبەری سێ کیلۆ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Menge (G.)، managi (OG.)، meniga (OE.)، many (E.)، menia (Lit.) "ئەندازە، ئەندازەیەکی زۆر، پڕانی".

مەنتك **mentık** *[ mantık ]* - "هۆزێکی کورد لە کوردستانی باشوور": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑مەندۆخ mendox "هەرمان".

مەنجەڵ **mencel** *[ manjal ]* - "بادیە": لەوانەیە پێک هاتبێ لە ↑مەن men + جەڵ cel. کەرتی دووەم دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە Schalle (G.) "دەفر". لەم تێڕوانینەوە مانای وشە کوردمادییەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە "دەفرێک کە ئەندازەیەکی زۆر شت دەبا".

مەنجەنیق **mencenîq** *[ manjanīq ]* - "دەزگای ئاگر هاویشتنە ناو قەڵا": دەچێتەوە سەر < *mēchaniké (Gr.)* "زانستی دروست کردن و بەکار هێنانی *مەکینە*" [فۆتیمی n ی پێشەوە زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە].

مەند **mend** *[ mand ]* - "وەستاو، ئارام، لەسەرەخۆ": وشەکە زۆرتر بۆ ئاوی راوەستاو بەکار دێ و هەروەها بۆ مرۆڤی سەنگین و ئارام. دەشێ پێوەندی هەبێ بە کرداری ↑مان man "نەبزووتن، نەگۆڕان". دە بنەڕەتدا مەبەست ئاوێکە کە لە جێی خۆی *ماوەتەوە* و نابزوێ یاخود مرۆڤێک لە هەڵچوون و گۆڕانی خێرا دوورە و بار و دۆخی دەروونی وەک خۆی *دەمێنێتەوە*. خزمیشە دەگەڵ ↑ماندوو mandu "شەکەت، لەجووڵە وەستاو" و لەوانەشە دەگەڵ↑ مەنگ meng. [گێژ و مەنگ دەشێ دەبنەڕەتدا بە مانای گێژ و "کەوتوو"، گێژ و "بێجووڵە" بووبێ.

مەندۆخ **mendox** *[ mandox ]* - "هەرمان": مەندەنە mendene ش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە کرداری ↑مان man "لەناو نەچوون". کەرتی ئۆخ ox- پاشگری بە ئاوەڵناو کردنە و شێوەیەکی دیکەیە لە ئۆک ok-. لەوانەیە ماندانا mandana ناوی شازادەی ماد و دایکی کۆرشی سپڵە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

مەندیل **mendîl** *[ mandīl ]* - "پێچی سەر، مێزەر": خزمە دەگەڵ Mantel (G.) "باڵتۆ" [بە گشتی "تێپێچ"]. وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر *mantellum (L.)* "سەرپۆش، تێپێچ".

مەنقەڵ **menqel** *[ manqal ]* - "ئاگردانی کانزا": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مەنجەڵ mencel.

مەنگری **mengırî** *[ mengırī ]* - "سینی زل": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مەنقەڵ menqel و ↑مەنجەڵ mencel.

مەنگوڕ **mengur** *[ mangur ]* - "ناوی هۆزێکە لە ناوچەی موکریان": خزمە دەگەڵ ↑موکور mukur یان مکور mukır بە مانای "پێداگر، سەرسەخت"، ↑موکری mukrî "دانیشتووانی موکریان، بە مانای بەهێز، پتەو" و ↑موکریان mukıryan "ناوچەی موکرییەکان". دە وشەی مەنگوڕدا فۆنێمی n زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە. ئەم زێدەفۆتیمە لە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک تانج (تاج)، کرمانج (**کرماج*، کوردماد)، سەرنج (**سەرج*)، ئامانج (ئاماج)، سەرەند (سەرەد)، مانقووڵ (ماقووڵ)، مەنگەنە (مەکینە)، مەرەنگۆز [**مەرەگۆز*]، مۆنج (مەوج)، مەندوونە (مەدوونە)، مانگیر (**ماگیر*)، قیلەوقانج (قیلەوقاج)، هەنجەت (**حجة**)، مانقێر، مەنجەنیق، مینگە، مینجە، حینجە (هجی)، مونزوور (مزوور) و هتد.

[تێبینی1: تێخزان و زێدە بوونی فۆتیمی n دە ژمارەیەک وشەی لاتینیشدا بەرچاوە، واتا لەم وشە لاتینییانەشدا بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ زمانانی دیکە زێدەفۆتیمی n بەدی دەکرێ، بۆ وێنە بڕوانە وشەکانی migan (OE.)، miga (OIs.)، mingere (L.) "میستن، میز کردن"، یان stechen (G.)، stehhan (OG.)، steka (Ofrs.)، steken (Nl.)، instingare (L.) " تێراکردن، تێ هەڵچەقاندن". شیاوی سەرنجە کە لەم نموونانەشدا، وەک مەنگوڕەکەی خۆمان، ئەم زێدەیە پێش فۆتیمی g دەردەکەوێ. تێبینی 2: پێوەندی "مەنگوڕ" و "مکور، موکور، موکری" دەقاودەق وەک پێوەندی "مونزوور" و "مزوور" وایە. هەموو ئەم وشانەش پێکەوە خزمن].

**مەنگەنە mengene** [ *mangana* ] - "گیرەی پیشەسازان": خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە مەکینە mēchané (Gr.) "ئامێر، مەکینە". ئەم وشە یۆنانییە خزمە دەگەڵ ↑ماوش mawş "مەنگەنە" و دواتر ↑مێش *mêş* "هێز(ی کار و چالاکی)". فۆنیمی n لە وشەی "مەنگەنە"دا زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە، هەروەک وشەی "مەنگوڕ" و چەندین وشەی دیکە.

**مەنی menî** [ *manī* ] - "گومان، خەیاڵ، راوێژ": بڕوانە ↑مینە mîne "تۆێژینەوە، بیر کردنەوە".

**مەودا¹ mewda** [ *mawdā* ] - "تیوان، بەین، فاسیلەن بوعد": دەچێتەوە سەر ریشەی < ***mod-** (IE.) ***med-,** "رێگە برین، (رێگە) پێوان، هەڵسەنگاندن". وشەکانی dimensio (L.) "مەودا، بوعد، لەبەریەک کشانەوە" و immensus (L.) "زەبەلاح" [ئەوەندە زل کە ناپێوری، نەپێوژ] لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. messen (G.) و metan (OE.)، mäta (Sw.) "ئەندازە گرتن، مەزەندە کردن" [دە بنەڕەتدا: ئەندازەگرتنی مەودایەک] و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑مێژوو meju و ↑مەزەندە mezende پێوەندیان بەم ریشەوە هەیە. ئەم وشانە لە پلەیەکی دوورتردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑مانگ mang. "مانگ" بەهۆی رێگەبڕین و گەڕانی بە ئاسماندا ئەم ناوەی لەسەر دانراوە، واتا "گەڕۆک".

**مەودا² mewda** [ *mawdā* ] - "لێواری تیخ": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑موو1 mu.

**مەورە mewre** [ *mawra* ] - "1- بڕبەند 2- لکی بڕاوی دارترێ": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑موو1 mu.

**مەها meha** [ *mahā* ] - "پەز، مەڕ": خزمە دەگەڵ لە ↑مس mıs "بزن".

**مەهاندن mehandın** [ *mahāndın* ] - "هەڵتاواندن، هەزم کردن": ↑مهاندن mıhandın یش دەگوترێ.

**مەهس mehıs** [ *mahıs* ] - "پاڵا لە هەمبانە، سووکەسۆڵ": مەهسک mehsık و مەست mest ش دەگوترێن. ئەم وشەیەش وەک گەلێک وشەی دیکە پێوەندی بەم خێزانەوشەوە هەیە کە مانای "رێخشاندن" دەبەخشێ و بۆ وێنە خزمە لەگەڵ ↑مهەس mıhes "قاشاخ، رنەک". مەبەست لە "مەهس" دەبنەڕەتدا رێخشاندنی پێڵاوەکە (سەرپێیی)یەکە لە هەرد بووە.

**مەهلا mehla** [ *mahlā* ] - "گەڕەک": بڕوانە ↑ماڵ² mal "خانوو، خانەوادە". ملهة malha (Arb.) "کابارە" لەوانەیە لە "ماڵ" وەرگیرابێ.

**مەهلی mehlî** [ *mahlī* ] - "خێشک": خزمە لەگەڵ ↑ماڵین malîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "رێخشاندن". لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *مهەس* "قاشاخ" کە ئەویش خزمە لەگەڵ کرداری "ماشتن".

**مەهن mehın** [ *mahın* ] - "ناز": [ئەز مەهنێ خۆ لکێ کەم، ئەز بێ باڤم]. خزمە لەگەڵ Minne (G.)، minna (OG.)، min (Nl.) "خۆشەویستی، حەز"، minne (Sw.) "بیرەوەری، یاد کردن". مانای بنەڕەتی وشە ژێرمەنییەکە "بیرەوەری خۆش، بە خۆشەویستییەوە یاد کردن" بووە. لەم مانایەوە لە زمانی ئەڵمانی کۆندا ماناکانی "مەیل، خۆشی، خۆشەویستی" پەیدا بوون. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑مەنی menî "گومان، خەیاڵ، راوێژ"، ↑مینە mîne "تۆێژینەوە، بیر کردنەوە" و ↑*مان² man* [رامان raman]. ناوی ژنانەی ↑مینا mîna دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ناوی ژنانەی ↑مەهین mehîn هەیە کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا بکا.

[تێبینی: دیارە مانای "ناز" پێوەندی تەواوی لەگەڵ "خۆشەویستی" هەیە و مانای "نازەنین" لە ئەڵمانیدا دەبێتە lieb کە ئەویش پێوەندی هەیە بە کرداری lieben "خۆش ویستن". کەسێک کە

کەسێکی دیکە یان ئاژەڵێک ناز دەکا، ئەوا خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێ، هەروەها کەسێک یان ئاژەڵێک کە بۆ یەکێکی دیکە ناز دەکا، ئەویش داوای خۆشەویستی دەکا].

**مەهەیر meheyır** *[ mahayīr ]* - "هەژار، بێچارە": خزمە دەگەڵ ↑مسر mısır [مسریلۆکە mısrîloke] "لەڕ و لاواز".

**مەهین mehîn** *[ mahīn ]* - "ناوێک بۆ ژنان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑مەهن mehın "ناز".

**مەی mey** *[ may ]* - "شەراب": می mey ‹P.›، mada ‹Av.›. خزمە دەگەڵ ↑مووتی mutî "شیرەی هەنگوین"، Met ‹G.›، medu ‹OE.›، mede ‹OF.›، medus ‹L.›، methy ‹Gr.›، mid ‹OIr.› "عارەقی هەنگوین"، madhu ‹OIn.› "شیرە"، medus ‹Lit.› "هەنگوین"، سەر بە ریشەی < ***medhu-* ‹ .IE)** "هەنگوین، عارەقی هەنگوین".

**مەیتەر meyter** *[ maytar ]* - "خزمەتکاری ئەسپ": مەختەر mexter یش دەگوترێ. مهتر mehtar ‹P.›. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Marschall ‹G.› "مارشاڵ". وشەکە دە ئەڵمانی کۆندا marahscalc ‹OG.› بووە بە مانای "مەیتەر، خزمەتکاری ئەسپ". ئەم وشەیە خۆی پێک هاتووە لە دوو کەرتی marah ‹OG.› "ئەسپ" و scalc ‹OG.› "خزمەتکار". "مارشاڵ"ی ئەڵمانی دە سەدەکانی کۆندا بە خزمەتکاری ئەسپ لە دەربار و دیوەخانەکاندا گوتراوە. پاشان کاری مارشاڵ پەرەی سەندووە بۆ بەڕێوەبردنی سوارچاکان و دواتریش لە سەدەی شازدەوە مارشاڵ بووەتە بەرزترین پلەی سوپای سوارکارانی شەڕ. نموونەیەکی هەرەبەرچاو لە مەیتەرێک کە خۆی گەیاندە پلەی مارشاڵی، ڕەزاخان بوو کە دوایەش بوو بە شای ئێران!

**مەیدان meydan** *[ maydān ]* - "گۆڕەپان": میدان meydān ‹P.›. خزمە دەگەڵ Mitte ‹G.›، midd ‹OE.›، midde ‹OF.›، midjis ‹Gt.›، midja ‹OSw.›، medius ‹L.›، madhya ‹OIn.›، mesos ‹Gr.›، meženti ‹Rus.› "تیوەڕاست، ناوەند، تیونجی". دە زمانی فارسیدا هەروەها میان mīyān ‹P.› هەیە بە مانای "تیوەراست" کە تێیدا فۆتیمی d سواوەتەوە. وشەی "مەیدان" دەشێ سەرەتا بە "ناوەند و ناوەراست"ی شوێنێک بۆ وێنە ناوەندی شار و گوندەکان گوترابێ. جا لە بەر ئەوەی ئەو شوێنانە گۆڕەپانی بەرئاوەڵا بۆ کۆ بوونەوەی خەڵک بوون، ئیتر لەوێوە مانای "گۆڕەپان" سەری هەڵداوە.

**مەیر(ە) meyır(e)** *[ mayır ]* - "دۆکڵیو": مەهیر mehîr یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑مەیین meyîn.

**مەیین meyîn** *[ mayīn ]* - "توند بوون، سفت بوون": مەهتن mehtın و مەهین mehîn یش دەگوترێن. هەروەها مەیاندن meyandın بە مانای "کردنەسەهۆڵ"یش دێ. جگە لەمە ↑مەیرە meyre [یان مەهیر mehîr] هەیە بە مانای "دۆکڵیو" [دۆیەک کە بە کوڵین خۆی دەگرێ و خەست دەبێ]. بڕوانە ↑*مایی mayî*.

**میاواندن mîyawandn** *[ mīyāwāndın ]* - "دەنگ کردنی پشیلە": میومیو miou miou ‹P.›، miau ‹G.› "میاو"، miauen ‹G.› "میاواندن"، miaow ‹E.›. ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگی پشیلەیە.

**میت mît** *[ mīt ]* - "1- قیتایی 2- بەرزایی، گرد 3- قامکە تووتە": هەروەها میت کردن mît kırın بە مانای "قیت کردن" دێ [گوهێ خۆ میت کریە]. ژمارەیەک وشە پێوەندییان بەم وشەوە هەیە، ↑مووسم mûsım "سەرنووکی سمی ئاژەڵ"، ↑مۆچ moç [مچ mıç] "قیت، قوت"، ↑متک mıtık "گردۆلکە". هەموو ئەم وشانە مانای "قوت و زەق بوون، تیژ و دەرپەڕیو بوون" لەخۆ دەگرن. [لە فارسیدا "تیز کردن گوش" بە مانای "گوێ قوت کردن" بەکار دێ]. وشەیەکی دیکە کە لەم

پێوەندییەدا سەرنج رادەکێشێ، وشەی ↑میچ mîç "بانی خانوو"یە. لەوە دەچێ دوو وشەی "میچ" و "تاق" جێگەی یەکتریان گرتبێتەوە. "تاق" لە بنەڕەتدا مانای گشتی "داپۆش، سەرپۆش" دەدا و ئەم مانایە دواتر گۆڕاوە بۆ "سەرپۆشی خانوو، میچ" و دواتریش "میچی کەوانی". لەم لاشەوە "میچ" دەشێ سەرەتا بە "بانی کەوانی، زەق، گومبەزی" گوترابێ و دواتر بەگشتی مانای "بانی خانوو"ی پەیدا کردبێ. لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 50) لەژێر وشەی "اماج2"دا هێندێك وشە باس دەکرێن کە وێ دەچێ وشە کوردمادییەکانی سەرەوە پێوەندییان بەوانەوە هەبێ. هێندێك لەم وشانە بریتین لە -mati (Av.) "دوند، نووك"، matyá (OIn.) "گورز، چۆماغ"، mateola (L.) "چەکوچ، پاچ"، motyga (Rus.) "کولینگ، بێڵچە". بە پێی ئەم سەرچاوەیە ئەم وشانەی دوایی دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *mat- >** "چەکوچ، تەشوێ، پاچ، کوڵینگ". لە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە لەگەڵ ئەم وشانەی دوایی یەك دەگرنەوە و دەبێ پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ، وەك ↑مەترکە metrıke "ئەسپەرەی پێمەڕە"، ↑مەترەق metreq "کوتکی ئاسن"، ↑مەتڕان metran "تیزەی درێژ بۆ راوەماسی"، ↑مەتەشا meteşa "داردەستی دەروێشان"، ↑ماشە maşe "گاز"، ↑ماخ2 max "1- کاریتەی سەربان 2- ریزە ئاڵوودار 3- نهۆم" و هتد. ئەگەر ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دروست بن، بەو ئەنجامە دەگەین کە لە مانای "چەکوچ، کوڵینگ"ەوە مانای "تیژ، نووك ، تیژایی، زەقایی" و لەمیشەوە ماناکانی "بەرزایی، بان، میچ" سەریان هەڵداوە. لەوانەشە مانای ئەسڵی ریشەکە، بە پێچەوانەی بۆچوونی باسکراو، "تیژ، نووك، زەقایی" بووبێ و لەمەوە مانای "چکوچ، کولینگ" سەری هەڵدابێ.

[تێبینی 1: سەبارەت بە مانای سێیەمی وشەی "میت"، واتا "قامکە تووتە" دەتوانیین لەباری ماناوە دەگەڵ دوو وشەی *کێل* "(بەردی)قیت" و *کلك* "قامك" هەڵی سەنگینین. تێبینی 2: لە زمانی لاتینیدا meta (L.) هەیە بە مانای "شتی کەللەقەندی، کۆگای گژ و گیای هەڵچنراو". ریشەی ئەم وشەیە بۆ من روون نییە و نازانم کە ئایا پێوەندییەکی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەیە یان نا].

**میتکە mîtke** [ *mītka* ] - "قیتکە، زەقایی چکۆڵە": ↑میت mît "قیتایی، زەقایی" + کە ke "پاشگری گچکاندن".

[تێبینی: وشەکانی "میت" و "میتکە" لە باری ماناکانیانەوە هەڵسەنگێنە دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکانی خوارەوە: Nocken (G.) "دەرپەڕیوی، قیتایی"، Nock (G.) "جەمسەری ئەو دارەی کە بادەوانی کەشتی لێ دەبەسترێ"، nok (Nl.) و nocke (Sw.) "نووك، دوند" و Nuckel (G.) "گوپکەی مەمك (نووکی مەمك)". وەك دەبینرێ وشەکەی دوایی پاشگری گچکاندنی پێوە لکاوە و دە وشەی "میتکە"ی کوردیشدا پاشگری گچکاندن دەور دەبینێ. نموونەیەکی دیکە هەر لەم بارەوە بریتییە لە دوو وشەی نەفر nefır ی کوردمادی بە مانای "شاخی ماڵات، هەرچی وەك شاخ قیت بێ" و nipple (E.) "گۆپکەی مەمك"].

**میجگ mîcık** [ *mījık* ] - "چوست و چالاك": مجك mıcık، مجن mıcın یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑مێش mêş "هێز (ی کار و چالاکی)" و ↑مۆك mok "ساخ، تەواو" [دە بنەڕەتدا: پتەو].

**میچ1 mîç** [ *mīč* ] - "سەقف، (بن) بان": خزمە دەگەڵ ↑میت mît "قیت، زەق".

**میچ2 mîç** [ *mīč* ] - "پێ چەقاندن لە سەر، موکوڕ بوون": خزمە دەگەڵ ↑میجك mîjk "گورج و گۆڵ" و ↑مێش mêş "هێز".

**میچ3 mîç** [ *mīč* ] - "جگ، قاپ": شێوەیەکی دیکە لە ↑مت mıt.

**میچالەك mîçalek** [ *mīčālak* ] - "پچێك، کەموسکەیەك": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مسری mısrî "لاواز، چووکەڵە".

میچران **mîçran** [ *mīčrān* ] - "بەسەریەکدا گلۆفان، ڕێکگوشران": شێوەیەکی دیکە لە ↑مچاندن mıçandın "گلۆفین، گوشین".

میچلە **mîçle** [ *mīčla* ] - "چیری": خزمە لەگەڵ ↑میچ[2] mîç "پێ چەقاندن لەسەر، موکوڕ بوون".

میر[1] **mîr** [ *mīr* ] - "شا، مەزن، حاکم": خزمە دەگەڵ ↑مڕ mır "زۆر تیر و پڕ".

میر[2] **mîr** [ *mīr* ] - "لاتەنیشتی جکێ": خزمە دەگەڵ margo (L.) "قەراخ"، Mark (G.)، مرز merz (P.) "سنوور"، ↑مێرگ merg، سەر بە ریشەی ***(IE.) *merg- >*** "قەراخ، سنوور".

[تێبینی: سەردەمی منداڵی ئێمە گەمەیەک هەبوو کە بە قوتووەشەمچە دەمان کرد. قوتووەشەمچە شتێک بوو، نیوهێندەی ئایفۆنی ئێستا و دوو قات قەڵەوتر! قووتووەشەمچەکەمان هەڵداویشت و هەوڵمان دەدا وەها هەڵی بهاوێین کە لەسەر لاتەنیشت بکەوێ و ڕابوەستێ. بەم کایەمان دەگوت "میرمیرێن". بیستبووم کە وەچەی بەر لە ئێمە لە ڕێی ئەم کایەوە دەبوون بە "میر"، واتا هەر کەس براوەی کایەکە بایە، وەک میر قسەی دەرۆیشت و دەیتوانی خواستەکانی خۆی کە هێندێک جار ناماقووڵ و زێدەرۆیانەش بوون، بە سەر دۆڕاوەکاندا بسەپێنێ. بەختەوەرانە لە سەردەمی منداڵی ئێمەدا پێشکەوتن بە دەست هاتبوو و کەس نەدەبوو بە "میر". شتێک کە لەم پێوەندییەدا جێی ئاماژەیە، تێکەڵ بوونی مانای دوو وشەی "میر[1]" و "میر[2]" لەم گەمەیە دایە. ئەم کایە دەبێ گەمەیەکی زۆر کۆن بێ و دیارە بەر لە قوتووەشەمچە بە جکێ کراوە. مەبەست لە "میرمیرێن" دە بنەڕەتدا هەڵخستنی جکێ و وەستاندنی لەسەر لاتەنیشت بووە، واتا میر [لاتەنیشت]ی جکێ مەبەست بووە. پاشان ئەم وشەیە لەگەڵ "میر"ی دەسەڵاتدار تێکەڵ کراوە و وا دانراوە کە هەرکەس جکێ بەسەر لاتەنیشتدا بخا، دەبێتە میر و دەسەڵاتدار].

میرات **mîrat** [ *mīrāt* ] - "ماڵ و موڵکی لە مردوو بەجێ ماکێ": میراث mīrās (P.) > mīrāθ (Arb.) > ers (Arb.) > *hērēs (L.)* "ئێرس، میرات". دە زمانی ئینگلیزیدا وشەکانی heir (E.) "ئێرس"، inherit (E.) "بە ئێرس بردن" دەچنەوە سەر ئەم وشە لاتینییە. وەک دەبینرێ وشەی "میرات" ریشەی لاتینی هەیە و زمانی عەرەبی وشەکەی بە شێوەی خۆی گۆڕیوە.

میراز **mîraz** [ *mīrāz* ] - "هەویرترش": خزمە لەگەڵ ↑مەڕە[1] mere [پێمەڕە].

میز **mîz** [ *mīz* ] - "پێشاوی گیانلەبەر": هەروەها ↑میستن mîstın هەیە بە مانای میز کردن. خزمە دەگەڵ Mist (G.) "کوود، کەمرە". ئەم وشە ئەڵمانییە ماناکەی ئاڵوگۆڕی بەسەرداهاتووە و دەچێتەوە سەر کردارێک کە دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا نەماوە. کردارەکە دە هێندێک لە زمانەکاندا بەم جۆرە بووە: migan (OE.)، miga (OIs.)، mingere (L.) [فۆتیمی n خزاوەتە ناو وشەکەوە]، myžti (Lit.) "میستن، میز کردن"، méhati (OIn.) "دەمیزێ"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *migh- >*** "میز، میستن".

میزڵدان **mîzıldan** [ *mīzıldān* ] - "توورەکەی میز": مسوڵدان mısuldan یش دەگوترێ. ↑میز mîz + (ل l) + ↑دان dan، واتا شوێنی تێدابوونی میز، هەر وەک چۆن دەگوترێ خوێدان، چادان، گوڵدان و هتد. فۆتیمی l زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە. زمانی عەرەبی وەشەکەی وەرگرتووە و کردوویە بە مثانة maθāna (Arb.) [میزدان].

میزۆ **mîzo** [ *mīzo* ] - "ئەو پارچە دارەی گاسنی دەچێتە ناو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑میت mît "قیتایی"دا باس کراون.

میساب **mîsab** [ *mīsāb* ] - "مشتەی پینەچی": خزمە لەگەڵ ↑مشتە mışte.

میستن[1] **mîstın** [ *mīstın* ] - "میزکردن": ↑میز mîz. هەروەها دەگەڵ "هەڵ" دێ [هەڵمیستن].

میستن² **mîstın** *[ mīstın ]* - "مشتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑مشتن mıştın یان ↑مژین *mıjîn*. هەروەها دەگەڵ "هەڵ" دێ [هەڵمیستن].

میسک **mîsk** *[ mīsk ]* - "ماکەیەکی بۆنخۆش لە ناوکی ئاسک دەگیرێ": مشک mošk (P.) . وشەکە خزمە دەگەڵ -muşká (OIn.) "تووڕەکەی گون". هۆی ئەم ناولێنانە دەبێ لەوەڕا هاتبێ کە میسک لەناو تووڕەکەیەکی وەك هی گوندا دروست دەبێ. وشەکە لە ڕێگەی زمانی یۆنانییەوە گوازراوەتەوە بۆ ناو زمانە ئەورووپییەکان، بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا Moschus (G.). وشەکە بە ڕەچەڵەك بە خزم دەزانرێ دەگەڵ ↑مشك mışık، بەڵام چۆنیەتی پێوەندییەکە روون نەکراوەتەوە. زۆر ڕێی تێ دەچێ وشەکە خزم بێ دەگەڵ ↑مەشکە meşke "تووڕەکەی چەرم".

میک **mîk** *[ mīk ]* - "پەز": مێشنا mêşna دەگوترێ. میش m (P.)، خزمە دەگەڵ mecke (MG.)، mekas (Gr.)، meka (OIn.) "بزن". بڕوانە ↑مس² mıs "بزن".

میل **mîl** *[ mīl ]* - دەگەڵ "خاڵ" دێ [خاڵ و میل xal u mîl بە مانای "نەخش و نیگار"]. خزمە دەگەڵ ↑ماڵە male "پەڵەی سەر پێست".

میل(ە) **mîl(e)** *[ mīl(a) ]* - "ئاسنی باریك و درێژ": میلە mīle (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ smilē (Gr.) "چەقۆی کەندەکاری"، smynē (Gr.) "قولاپ" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "میل"ی چنین کە قولاپێکی بە سەرەوەیە]، Schmied (G.) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "ئاسنگەر"، سەر بە ڕیشەی **< -*smēi (IE.)** "هەڵکۆڵین، بە ئامرازی تیژ کار کردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑سمین sımîn "کون کردن".

میمک **mîmık** *[ mīmık ]* - "خوشکی دایك، پوور": خزمە دەگەڵ Mume (G.)، muoma (OG.) "میمك". خزمە دەگەڵ ↑مام mam، ↑مامان maman و دواجار دەگەڵ مەمە meme و ↑مەمك memk.

مینا1 **mîna 1** *[ mīnā ]* - "1- شووشە 2- لوعاب 3- تۆیژی ڕەق و بریقەداری سەر ددان": خزمە دەگەڵ mina (ML.) "بەردی کانزا، کان". وشەی mineral "کانزا " دە زمانە ئەورووپییەکاندا لەو وشە لاتینیەوەرگیراوە. ڕیشە؟

مینا2 **mîna 2** *[ mīnā ]* - "وێنە، وێکچوو، هاوشێوە": مانند mānand (P.). دە شێوەزاری کوردمادی ناویندا فۆنیمی m بووەتە w و وشەکە بووەتە ↑وێنە wene. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کردارێك کە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەبووە و ئەمڕۆ شوێنەوارێکی ئەوتۆی لێ نەماوەتەوە. ئەم کردارە دە کوردمادیدا ↑مان2 man یان مینین mînîn ە بەمانای "وێکچوون، هاوشێوە بوون" و دە فارسیشدا مانستن mānestan (P.) یان مانیدن mānīdan (P.) "وێکچوون، هاوشێوە بوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ دەستەوشەیەك کە لە ژێر ↑مینە mîne "تۆیژینەوە"دا باس کراون و دەچنەوە سەر ڕیشەی **< -(ə)men* (IE.)** " بیرکردن(ەوە)، هێنانە بەرچاو، تەسەوور کردن".

مینا3 **mîna 3** *[ mīnā ]* - "ناوێکی ژنان": خزمە دەگەڵ ↑مەهن mehın "ناز".

مینین **mînîn** *[ mīnīn ]* - "وێکچوون، هاوشێوە بوون": مان² man یش دەگوترێ. ↑مینا2 mîna "وێنە، وێکچوو، هاوشێوە". دە فارسیدا بۆ وێنە دەگوترێ "بە این میماند کە ..."، واتا "وەك ئەوە وایە، لەوە دەچێ". دە زمانی کوردمادیشدا دەشێ تا چەند دەساڵێك لەمەوبەر ئەم کردارە وەك وشەیەکی باو بەکار هاتبێ. من لە هێندێك حەیران و گۆرانی کۆندا بیستوومە.

مینگە **mînge** *[ mīnga ]* - "بە دەنگی گن بۆڵاندن": مینجە mînce ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ mucken (G.) "دەنگی نزم و ناڕوون لە خۆ دانەدەر" [دە وشە کوردمادییەکەدا فۆنیمی n

خزاوەتە ناو وشەکەوە]. ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە. دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑مشە mışe و ↑مقۆمقۆ mıqomıqo.

**مینە1 mîne 1** [ *mīna* ] - "تۆێژینەوە": خزمە دەگەڵ ↑مان2 man [رامان raman] "دە بیرەوە چوون، بیر کردنەوە".

**مینە2 mîne 2** [ *mīna* ] - "تیوان": میان mîyān (P.) "تیوان".

1- یان خزمە dimensio (L.) "مەودا، بوعد، لەبەریەک کشانەوە" و immensus (L.) "زەبەلاح [ئەوەندە زل کە ناپێوری، نەپێوژ]، سەر بە ریشەی **< *med-, *mod-** *(IE.)* "رێگە برین، (رێگە) پێوان، هەڵسەنگاندن". ↑مەودا[1] mewda "تیوان، بەین، فاسیلەن بوعد" دەچێتەوە سەر ریشەی ناوبراو. لەم تێروانینەوە مانای وشەکە دە بنەڕەتدا "فاسیلە، بوعد"ی تیوان دوو شت بووە و لەمەوە مانای "تیوان" پەیدا بووە.

2- یان سواوەی وشەی ↑مەیدان meydan ە، سەر بە ریشەی **< - *medhio** *(IE.)* "ناوەڕاست، ناوەند".

**مینەق mîneq** [ *mīnaq* ] - "هێزی بەرگری لە ئاپۆڕە بۆ کاتی پێویست": خزمە دەگەڵ allgemein (G.) [all-ge-mein] "گشتی، تیکڕایی"، gemein (G.) "گشتی، ئاسایی"، gemeinde (G.) "کۆمۆن، ئاوایی، کۆمەڵە"، gemeinsam (G.) "پێکەوە، تیکڕا"، communis (L.) [com-munis] "هاوبەش، پێکەوە، تیکڕایی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *mei-** *(IE.)* "گۆڕین، گۆڕینەوە، جێگۆڕکێ کردن". لەم مانا کۆنەوە دواتر مانای "نۆرە گەیشتن لەناو کۆمەڵێکدا" سەری هەڵداوە و لەمەشەوە مانای "تیکڕایی، گشتی" پەیدا بووە. لەوانەیە ↑مینەک mînek یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە ماناکەی دەبێتە "بار و ئازووقەی کاروانچی و دەشتەوانان".

**مینەک mînek** [ *mīnaq* ] - "بار و ئازووقەی کاروانچی و دەشتەوانان": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑مینەق mîneq.

**میهەنگ mîheng** [ *mīhang* ] - "1- پێوانە، عەیارە 2- ئەندازەپێو (عەقرەبە، دەرەجە)": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *med- , *mod-** *(IE.)* "پێوان، هەڵسەنگاندن" و دەبێتە خزم لەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑مەزەندە mezende، ↑مەختە mexte "قەبەڵ، گرتنی کار بەپێی هەڵسەنگاندنێکی تیکڕایی"، ↑مشوور mışûr "سەلیقە، تەگبیر" [دە بنەڕەتدا: هەڵسەنگاندن] و ↑مەودا[1] *mewda* و ↑میقات mîqat "سەعاتی باش کە پاش و پێشی نییە". دە وشەی "میهەنگ"دا فۆنیمی h لە کۆندا t بووە، لەم بارەوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ وشەی "شار" [شەهر] و "مێر" [میهر] و چارە [چێهرە] کە لەوانیشدا فۆنێمی h پێشتر t بووە. هەروەها فۆنیمی n دواتر پەیدا بووە، واتا وشەکە دەبێ ئەم گۆڕانەی خوارەوەی بەسەردا هاتبێ: *مێتەک← مێهەک ← مێهەنک ← میهەنگ. وشەی محك maĥak (Arb.) "پێوەر" ریشەی کوردمادی هەیە [سەنگی مەحەک واتا پێوەرەبەرد، یان بەردی هەڵسەنگاندن]

**مێ me** [ *me* ] - "بەرانبەری تێر": خزمە دەگەڵ مادە mād(d)e (P.) "1- مێ 2- ماکە، سەرچاوەی هەبوون" و هەروەها مادر mādar (P.)، Mutter (G.)، mother (E.) و هیتر بە مانای "دایک". ریشەی وشەکە دەنگی [ma]ma کە لاسا کردنەوەی زمانی زارۆکە. بەم پێیە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑مەمە meme، ↑مام mam، ↑میمک mîmık و↑مامان maman و هتد. هەروەها مادة mādda (Arb.) و materia (L.) "ماددە، کەرەستە، شتومەک" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

مێخەک **mexek** ⌊ *mexak* ⌋ - "1- گوڵێکە 2- دەنکێکی بۆنخۆش": خزمە دەگەڵ ↑مێخ mex "بزمار".

[تێبینی1: ناوی ئەم دەنکە دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە Nelke (G.). ئەم ناوە پێشتر neilke و بەر لەویش negelke بووە و پێک هاتووە لە وشەی Nagel "مێخ" و پاشگری گچکاندن. شیاوی باسە دە وشە کوردمادییەکەشدا پاشگری گچکاندن بەکار هێنراوە و دەنکی مێخەک بە مێخی بچکۆڵە شوبهێنراوە. تێبینی2: دە زمانی ئەڵمانی و هەروەها دە زمانی کوردمادی و فارسیدا ئەم وشەیە ناوە هەم بۆ گوڵێک [Nelken] و هەمیش بۆ دەنکێکی بونخۆش کە وەک بەهارات لە چێشت و خواردەمەنیدا کەڵکی لێ وەردەگرن. ناوەکە دە بنەڕەتدا ناوی دەنکەکە بووە و پاشان لەبەر وێکچوونی بۆنی ئەم و بۆنی گوڵەکە، بۆ هەردووک شت بەکار هێنراوە].

مێر **mer** ⌊ *mer* ⌋ - "خۆشەویستی": مێهر mêhır یش دەگوترێ [مێهرەبان، مێریڤان]. هەروەها "مێر و وەفا" ناوی داستانێکی دڵداریی کوردمادییە کە من بە منداڵی لە دایکم بیستووە. ↑مهر mehr (P.). ئەم وشەیە لە سەردەمی کۆندا بەشێوەی میترا mîtra بووە و ئایینی "میترائیسم" پێوەندی بەم وشەوە هەیە. [فۆتیمی t لە وشە فارسی و کوردمادییەکەدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، هەر وەک لە وشەکانی "شار"، "چارە" (چێهرە) و... ]. وشەی "مهر" یان "میترا" لە ویکیپێدیای فارسیدا بەم جۆرە مانا کراوەتەوە: "ڕووناکی، دۆستایەتی، خۆشەویستی، پێوەندی". لەناو ئەم وشانەدا لەوە دەچێ مانای "پێوەندی" مانای کۆنتری وشەکە بێ و ماناکانی دیکە لەمەوە سەریان هەڵدابێ. لەم تێڕوانینەوە لەوانەیە وشەکە خزم بێ لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ماڵ2 mal "1-خانەوادە، فامیل" دا شی کراونەوە.

مێر(د) **mer(d)** ⌊ *mer(d)* ⌋ - "پیاو": مرد mard (P.)، mart (PL.)، mareta (Av.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ vir (L.)، wer (OE.) و (OG.)، fer (OF.)، vyras (Lit.) "مێر"، سەر بە ریشەی > ***wera-** (IE.) "مرۆ". دە کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑مرۆ(ڤ) mıro(v)، ↑مردم merdım "خەڵک". وشەی مروة muruwa (Arb.) "پیاوەتی، جوامێری" لەم وشەیە وەرگیراوە.

مێرگ **merg** ⌊ *merg* ⌋ - "زەوی و زاری پڕ لەچیمەن و سەوزەڵان": مرغزار marġzār (P.) "مێرگ" و هەروەها مرز merz (P.) "سنوور"، mareġā (Av.). خزمە دەگەڵ Mark (G.) "زەوی و زاری سەر سنوور"، marcha (OG.)، marka (Gt.) "سنوور"، mearc (OE.) "سنوور، دەڤەر"، mark (Sw.) "ناوچە، وڵات، زەوی و زار". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ margo (L.) "قەراخ، کەنارە" [بە واتایەکی دیکە سنوور] سەر بە ریشەی > ***mer(g)-** (IE.) " قەراخ، سنوور". بەم جۆرە مەبەست لە "مێرگ" دە بنەڕەتدا زەوی و زار و ناوچە دوورەدەستەکان [دوور لە ناوەند، سەر سنوور، ناوچە بەلاوەکان] بووە. ئەم ناوچانەش زۆرجار سەرسەوز و پڕ لە دار و دەوەن بوون و ئیتر لێرەوە وشەکە مانای "زەوی و زاری سەوزەڵانی" وەرگرتووە.

مێروو **meru** ⌊ *merū* ⌋ - "گیانلەبەرێکی وردیلە": موور mūr (P.)، mier (Nl.)، maoiraii (Av.)، moirb (OIr.)، morovij (ORus.) "مێروو". ریشە؟

مێز **mez** ⌊ *mez* ⌋ - "چوارپایە کە کارێکی لەسەر دەکەن": میز mīz یش دەگوترێ. میز mīz (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ mensa (L.) "خواردن، مێزی خواردن، مێز".

[تێبینی: لەباری پێوەندی نێوان "مێز" و "خواردن" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "خوان" (نان و خوان). "خوان" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە تەختەیەک دەکا و ئەم مانایە لە وشەی "خوانچە"دا بە باشی دەردەکەوێ].

مێزاندن **mêzandın** *[ mezāndın ]* - "تەماشا کردن": مێزە meze کردن و مەیزین meyzîn و مەیزاندن meyzandın یش دەگوترێن. وێ دەچێ وشەی ↑تەماشا temaşa پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و لە دوو کەرتی تە te + ماشا maşa پێک هاتبێ. کەرتی دووەم لەگەڵ "مێزە" و "مەیزین" یەک دەگرێتەوە. جگە لەمە وشەی ↑مۆژنایش mojnayış هەیە بە مانای "نیشان دان، لەبەرچاو ڕانان". هەروەها وشەی ↑ئاماژە amaje [a-maje] هەیە کە بە مانای "ئیشارە" بەکار دێ و لەبنەڕەتدا مەبەست لە ئاماژە کردن یان ئاماژە پێدان *نیشان* دان و خستنەبەرچاو بووە. هەر لەم پێوەندییەدا وشەیەکی دیکە سەرنج ڕادەکێشێ کە بریتییە لە ↑ئامانج amanc [بە فارسی: اماج āmāc (.P)]. فۆنیمی n لە وشە کوردمادییەکەدا زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە [هەر وەک وشەی تاج (تانج)، قیلەوقاج (قیلەوقانج)، قولاج (قولانج)]. هەروەها کەرتی ئا -a لە وشە کوردمادی و فارسییەکەدا پێشگرە و لەگەڵ ژمارەگەلێک وشەی کوردمادی و فارسی دێ [وەک ئاوەز، ئاواز، ئارام، ئامێد، ئافرەت، ئاشنا....]. مانای "ئاماج" لەبنەڕەتدا "هەدەف، نیشانە"یە، واتا شتێک کە کراوەتە نیشانە و مرۆڤ چاوی تێ بڕیوە بۆ ئەوەی بیپێکێ یان پێی بگا. هەر لێرەدا دەشێ ئاماژە بە وشەی ↑مت mıt و هەڵماتین helmaten [مێشێن mêşên، مووشانێ mûşanê، ماچانێ maçane...] بکەین کە ئەوانیش لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرن و باس لە "نیشانە" و کایەی "نیشانە داکردن و نیشانە پێکان" دەکەن. و پێوەندی ئەم وشانە لەگەڵ یەکتر روون و ئاشکرایە. دەمێنێتەوە بزانین ریشەی ئەم وشانە چییە. لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 50) سەبارەت بە وشەی اماج āmāc ئەم شیمانەیە هاتووەتە ئاراوە کە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ریشەی -*ma "هەڵسەنگاندن، ئەندازە گرتن"ەوە. ئەم بۆچوونە پڕ بە پێستی خۆیەتی. دیارە ئەم ریشەیە خۆی پێوەندی هەیە بە ریشەی ***mod- <** ***med-,*** ***(IE.)*** "پێوان، هەڵسەنگاندن" و لە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە وەک ↑مەزەندە mezende لەم ریشەوە پەیدا بوون. بەم پێیە "مت" یان نیشانە شتێکە لە رووی هەڵسەنگاندنەوە دیاری دەکرێ و چاوی تێ دەبڕدرێ. ئەوجار لە مانای "نیشانە (دا)کردن"ەوە ماناکانی "نیشان دان" و "چاو تیبڕین، روانین" سەریان هەڵداوە. لە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا بە کەسێک کە بە وردی لە شتێک یان کەسێک بڕوانێ، دەبێژن "ئەوە سیلەت لە چی گرتووە؟". دەتوانین بڵێین کە هەر ئەم مانای "سیلە تیگرتن"ە بووە کە دواتر مانای "چاو تیبڕین"ی لێ پەیدا بووە.

[تێبینی1- لەنێوان دوو چەمکی "نیشان دان" و "چاو تیبڕین، روانین"دا لە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک دەبینرێ، لە زمانەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا دوو وشەی خزم هەن بەم جۆرە: schauen (.G) "چاو لێکردن، روانین" و show (.E) "نیشان دان". تێبینی 2- لە زمانی ئەڵمانیدا دەنێوان دوو چەمکی "لێنوارین" و "هەڵسەنگاندن"دا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک دەبینرێ، وشەی beobachten (.G) مانای "لێنوارین، لێروانین" دەگەیەنێ و begutachten (.G) مانای "هەڵسەنگاندن (یکی لێزانانە و کارناسانە)". وشەی گوداختە gudaxte کردن کە من لە مەهاباد گوێم لێ بووە، لەم وشە ئەڵمانییە وەرگیراوە. تێبینی3- لە فارسیدا بە "مت" دەگوترێ تیلە tīle (.P) و بە "هەڵماتین" دەگوترێ تیلەبازی tīlebāzī (.P). وشەی "تیلە" خزمە لەگەڵ "سیلە" (سیلە گرتن، سیلە تیگرتن) واتا نیشانە گرتن. مانای بنەڕەتی "سیلە" یان "تیلە"ش، هەر وەک "مت"، بریتی بووە لە "دیاریکراو، ئەندازەگیراو"].

مێزەر **mezer** *[ mezar ]* - "پیچ، مەندیل": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ماشەر maşer "کەڵافەبەن، بەنی هەڵۆێزراو"، سەر بە ریشەی ***mezg- <*** ***(IE.)*** "چنین، گرێ دان".

**مێژ1 mej** [ mež ] - "لەمێژە" واتا دەمێکە، یان لە دەمێکەوە. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *mē(d)- (IE.)** "پێوان، هەڵسەنگاندن، ئەندازەگرتن، (سنوور) دیاری کردن". دە زمانە ئەورووپییەکاندا ئەو وشانەی خوارەوە لەم ریشەیەوە هاتوون: Mal (G.)، meal (E.)، mal (Sw.) "دەم، ژەم" [دە بنەڕەتدا: (کاتێکی) دیاریکراو، پێوراو]. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑محەل mıħel "دەم، وەرز، هەرەت"، ↑مەختە mexte "قەبەل، گرتنی کاری سەر لەبەر" [وەرگرتنی کارەکە بە پێی هەڵسەنگاندنێکی تێکڕایی، نەک حیساب و کتابێکی ورد]، ↑*ئامانج* *(a)ma(n)c*، ↑مەزەندە mezende، ↑مشوور mışûr، ↑میهەنگ mîheng و هتد.

[تێبینی: "لەمێژە" بە زمانی ئەڵمانی دەبێتە seit einiger *Zeit* کە ئەگەر دەقاودەق وەریگێڕین، دەبێتە "لە دەمێکەوە". وەک دەبینرێ لێرەشدا چەمکی "دەم، کات" رۆڵ دەلەیزێ].

**مێژ2 mej** [ mež ] - "نوێژ، نمێژ": هەروەها مێژگە mejge هەیە بە مانای "مزگەت، مزگەفت". لەوانەیە وشەی ↑مزگەوت mızgewıt پێوەندی بە "مێژ"ەوە هەبێ. وەک لەژێر وشەی ↑نوێژ nıwêj [nımêj] دا شی کراوەتەوە، فۆتیمی n لەم وشەیەدا کەرتێکی جیاوازە لە ئەسڵی وشەکە و ئاماژە بە "لای خوارەوە" دەکا [nı-mej].

**مێژوو meju** [ mežū ] - "دیرۆک": دەچێتەوە سەر ↑مێژ1 mej.

**مێژۆرد mejord** [ mežord ] - "گیایەکە بۆ ئاژەڵ زۆر خۆشە": مێژوەرد mejwerd یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ لەگەڵ Mus (G.)، moes (L.)، mōs (OE.) "شلکێنە، ریتکە". ئەم وشە ژێرمەنییە کۆنتر بە مانای "خۆراک، خواردەمەنی" بووە و لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑مازووڤان mazuwan "میواندار، *میزبان*".

**مێژۆکە mejoke** [ mežoka ] - "بەرخی تازەزاو": دەشێ بە گشتی مەبەست لە بێچووی تازە لە دایک بووی ئاژەڵ بێ کە بە خێرایی بە مەمکی دایکیانەوە دەنووسێن و دەیمژن، واتا وشەکە دەچێتەوە سەر ↑مژین mıjîn.

**مێش1 mêş** [ meš ] - "ناوی زیلەیەک": مگس magas (P.)، mucha (Rus.)، musca (L.)، mіśca (Gr.) "مێش"، myia (Gr.) "فڕین"، Mücke (G.)، mycg (OE.)، makşā (OIn.) "مێشوولە"، makas (Pl.)، maxši (Av.) سەر بە ریشەی **< *mu- (IE.)** "مێش". دە زمانی کوردمادیدا ↑مۆز moz یش هەیە بە مانای "مێشەکەرانە".

**مێش2 mêş** [ meš ] - "رەش، تاریک، بۆر": بۆ وێنە دەگەڵ "خۆڵ" دێ [خۆڵەمێش xolemêş واتا خۆڵی رەش یاخود بۆری ئاماڵ رەش، گامێش gamêş دە بنەڕەتدا واتا "گای رەش"]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑مشکی mışkî بەکار دێ بە مانای "خۆڵەمێش". دە فارسیدا مشکی meškī (P.) بە مانای "رەش" بەکار دێ و میشی mīšī (P.) بە مانای "شینی تاریک" بەکار دێ. دەشێ وشەکان پێوەندییان بە ↑مژ mıj ەوە هەبێ.

**مێش3 mêş** [ meš ] - "هێز"(ی کار و چالاکی): خزمە دەگەڵ Macht (G.)، mahts (Gt.)، meaht (OE.)، mecht (OF.) "هێز و دەسەڵات"، mögen (G.)، may (E.) "شیان"، mogu (Rus.) "دەتوانم"، megt (Let.) "توانایی، دەستەڵات"، māchaná (Gr.) "ئامراز، ئامێر"، سەر بە ریشەی **< *magh- (IE.)** "توان، هێز". دە کوردمادیدا چەندین وشە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑میچ mîç "پێداگرتن"، ↑میچکێ mîcık "گورجوگۆڵ"، ↑مزوور mızūr "بەهێز"، ↑موکور *mukur* [مکوڕ mıkur] "پێداگر، سەرسەخت" و ↑مخابن mıxabın "حەیف" [دە ئەسڵدا: قەدەر، جەبر]، ↑مق[1] mıq "ساز، ئامادە"، ↑مۆک mok "ساخ، تەواو"، ↑موکری mukrî "بەهێز، پتەو".

مێشک **mêşık** [ *mešık* ] - مەژگ mejg و مەژی mejî و مۆخ mox و مێچک mêçık یش دەگوترێ. مغز maġz (P.) و مخ mox (P.). خزمە دەگەڵ Mark (G.)، marag (OG.)، merg (Nl.)، marrow (Sw.) "مێشک، مۆخ"، mazga (Av.)، majjan (OIn.) ، mozgŭ (OSlaw.)، smagenes (Lit.)، سەر بە ریشەی **< *mozgo-** ***(IE.)*** "مێشک". [دە وشە ژێرمەنییەکاندا فۆتیمی r خزاوەتە ناو وشەکەوە].

مێشنا **mêşna** [ *mešnā* ] - "پەز": ↑میک mîk.

مێشێن **mêşên** [ *mešen* ] - "کەلایێن، هەڵماتین": ئەم وشەیە بە چەندین شێوە دەگوترێ: میچێن mîçen، میتین mîten، هەڵماتین helmaten، مووشانە mûşane، مووشانێ mûşanê، ماچانێ maçane و هتد. دەچێتەوە سەر ↑مت mıt بە مانای "بابەتی کایە لەسەر کردن (دە مێشێندا)". مانای "مت" لە بنەڕەتدا "نیشانە، ئامانج"ە و مانای کایەکەش دەبێتە یاری "نیشانە گرتن، نیشانە پێکان".

مێگوان **megwan** [ *megwān* ] - "مانگای جەوان": مێنگوین menguwīn ش دەگوترێ. ↑مێ me + ↑گوان guwan. تیکڕای وشەکە واتا "مێیەک کە (تازە) گوانی دەر کردووە". دە وشەی مێنگوین menguwīn دا وێڕای گۆڕانی بزوێنەکان، فۆتیمی n وەک زێدەیەک خزاوەتە ناو وشەکەوە.

مێگەل **megel** [ *megal* ] - "رانەمەڕ": مێ me + ↑گەل gel. کەرتی مێ me شێوەیەکی دیکەیە لە↑ مس *mıs* "بزن" یان ↑میک mîk "پەز". تیکڕای وشەکە واتا گەلەی بزن و مەڕ. کەرتی "مێ" لێرەدا چ پێوەندی بە "تیر و مێ"وە نییە، بەڵکوو خۆی بە مانای "بزن و مەڕ"ە و وەک دەزانین "مێگەل" تەنیا لە بەزن و مەڕی مێ پێک نایە و هەر دوو رەگەزی تیر و مێ دەگرێتەوە.

مێلاق **melaq** [ *melāq* ] - "ترێی هەڵواسراو بۆ زستان": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- بنەوشەی -mel کە لە زمانی یۆنانیدا بە مانای "هەنگوین" دێ. هەر لەم بنەوشەیە mēlon (Gr.) "سێو" دروست کراوە کە دە زمانە ئەورووپییەکاندا دواتر مانای "کاڵەک"ی وەرگرتووە. ریشە؟

2- معلق muɛellaq (Arb.) "هەڵواسراو". ئەم وشەیە خۆی پێوەندی هەیە بە ↑لکاندن lıkandın و ↑دالەقاندن daleqandın "هەڵواسین" [بە بەن و پەتەوە کردن].

مێنەکە **meneke** [ *menaka* ] - "ئەنگوستیلەی بێ نقیم لە شاخی بزن": خزمە دەگەڵ ↑مینا mîna "1- شووشە 2- لوعاب 3- تۆیژی رەق و بریقەداری سەر ددان".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "گەوهەر" کە دە بنەڕەتدا مانای "بەرد" دەدا].

## ن (N)

-ن **ın-** "پاشگری بە ئاوەڵناو کردن لە دۆخی  جەخت کردندا": [نموونە: نەوسن، تۆسن، ترِن، جرپن، خرپن، زیقن، گاپن، درۆزن [درۆز + ن] و هتد. ئەم پاشگرە دە زمانی کوردمادیدا زۆرتر بە ناوەوە دەلکێ و هەروەها زۆرتریش ئاوەڵناوێکی نەرێنی دروست دەکا. خزمە دەگەڵ پاشگری فارسی ان an (P.). ئەم پاشگرە دە زمانی فارسیدا زۆرتر دەگەڵ بنجی رەگی کردار دێ و ئاوەڵناو دروست دەکا، وەك "درخشان، فروزان، رەوان، دەوان، بران، گردان" و هتد. وێ دەچێ ئەمانە خزم بن، یان کورتکراوەی پاشگرێك بن کە دە زمانی  فارسی ئێستادا دەبێتە اندە -ande (P.). ئەم پاشگرە دە زمانی فارسیدا دەچێتە سەر بنجی کردارەکان و ناوی کارا دروست دەکا، وەك "شنوندە، بینندە، گویندە، برندە، دوندە، فروشندە" و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا پاشگرێك هەیە کە ئەویش بە کردارەوە دەنووسێ و ئاوەڵناو دروست دەکا، وەك kommend "لە حاڵی هاتندا"، gehend "لە حاڵی رۆیشتندا"، schlafend "لە حاڵی خەوتندا"، laufend (G.) "لە حاڵی تێپەرِیندا" و هتد. ئەم پاشگرە ئەڵمانییە دەبێ خزم بێ دەگەڵ پاشگری ing- (E.). لەوانەیە هەموو ئەو پاشگرانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان بە یەکەوە هەبێ.

نا **na** [ *nā* ] - "وڵامی نەرێنی": نە na (P.)، no (E.)، nein (G.) [ni + ein]، ni (OG.)، nā (OF.)، non (L.) سەر بە ریشەی **<** ***ne-** ***(IE.)*** "نا، نە".

ناترە **natre** [ *nātra* ] - "داری نیشانە کە لە خەرماندا لە تیوان کا و گەنم دادەنرێ": خزمە دەگەڵ ↑*نیشانە nîşane*، ↑نیتکە nîtke، ↑ناتۆرە natore و ↑نتراندن nıtrandın "نەخشاندن"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "ناسین، زانین".

ناتف **natf** [ *nātf* ] - "گشتەکی برین دروون": خزمە دەگەڵ Naht (G.)، nāt (OG.)، naad (Nl.) "تەقەڵ" و Nadel (G.) "دەرزی". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ نەخ nex (P.) "دەزوو"، nere (L.) "تەنین، رستن"، nemen (Gr.) و nēma (Gr.) "دەزوو، گشتەك، تەون" و néein (Gr.) "تەنین، رستن"، سەر بە ریشەی **<** ***(s)nē-** ***(IE.)*** "رستن، تەنین، چنین، گرێ دان". دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چنین1 cınîn "تەنین، هۆنینەوە، دروون":

ناتۆرە **natore** [ *nātora* ] - "لەقەبی ناحەز": نیتکە nîtke و نووتکە nutke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑نیشانە nîşane و دواجار دەگەڵ ↑*ناسین nasîn*.

ناچە **naçe** [ *nāča* ] - "گەرووی ئاش": نا na + ↑چە çe. نایژە nayje ش دەگوترێ. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑نەی ney "قامیش، لوولك". کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. دەگەڵ وشەی فارسی نای nāy (P.) "قورِگ، لوولکی هەناسەکێشان لە لەشدا" بەرهەڤی بکە.

ناچەخ **naçex** [ *nāčax* ] - "تەوری دەستی شەرِکەران": ↑نەژاخ nejax "تەوری بچووك".

ناحەز **naħez** [ *nāħaz* ] - "ناشیرن، دزێو": ↑نا na + ↑حەز ħez "خواست، ئارەزوو". تێکرِای وشەکە دەبێتە "نەخوازراو، نەویستراو".

ناخ **nax** [ *nāx* ] - "قووڵایی": دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە مانای جۆربەجۆر دەبەخشن و گشتیان دەگەڵ ئەم وشەیە شی دەکەینەوە. ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "رۆچوون، قووڵ بوون، نزم بوون، نوقم بوون" دەکەن، وەك ↑نخرۆ nıxro "نزم، رۆ چووگ، نقوم بووگ" [نغرۆ nığro]، ↑نوقم nuqım "چوونە ژێر ئاو" [یان نقوم nıqum]، ↑نقە nıqe "ماسی ئاوی قووڵ"، ناخۆرە naxore "زەوی قووپاو و رۆچوو"، ↑ناخار naxar "بە کەند و لەند"، ↑نوقار

nuqar "1- گیانداری ژێرئاو 2- ژێر دەریایی"، ↑نۆقڤان noqvan "مەلەوانی ژێرئاو، غەوواس"، ↑نزم nızım "لەخوارەوە، بەرانبەری بڵیند"، ↑نەقر neqır "1- قووڵ 2- دەفری قووڵ". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەروەها وشەی ↑ناخودا naxuda [ناخدا nāxodā (P.)] "کاپیتانی کەشتی" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە، چونکوو ئەمیش وەک نقە nıqe پێوەندی بە ئاوی قووڵەوە هەیە. هەروەها وشەی ↑نەهەنگ neheng دە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە دایە. ئەم وشەیەی دوایی بەتایبەتی هەڵسەنگینە دەگەڵ↑نقە nıqe. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ nieder (G.)، neder (Nl.) و (Sw.)، nider (OE.)، nither (OF.) "نزم، نەوی"، nitarām (OIn.) "بۆ خوارەوە"، nizū (OSl.) "خوارەوە" [ئەم وشە سلاڤییە بەرهەڤ بکە دەگەڵ نزم nızım ی کوردمادی]، سەر بە ریشەی > *nitra- (IE.) "نزم، نەوی، خوارەوە". ئەگەر سەرنجێکی وشە هیندییە کۆنەکە واتا nitarām (OIn.) بدەین، دەتوانین بڵێین کە دە زمانی کوردمادی کۆنیشدا وشەیەکی لەم چەشنە هەبووە و ئەوجار بە گۆڕانی فۆتیمی t و سوانەوەی وشەکە چەندین وشەی وەک ناخ، نغرۆ، ناخار، نوقم، نزم و هیتر سەریان هەڵداوە.

**ناخار1 naxar** [ nāxār ] - "بە کەند و لەند": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**ناخار2 naxar** [ nāxār ] - "تیخی دەبانی تیژ": ناغار naġar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تیزە neze.

**ناخر naxır** [ nāxır ] - "رەووەی شەوبەکێو": خزمە دەگەڵ Nacht (G.)، naht (OG.)، nachts (OF.)، night (E.)، niht (OE.)، natt (Sw.)، nyx (Gr.)، nox (L.)، naktis (Lit.)، nocht (OIr.)، nakt (OIn.) "شەو"، سەر بە ریشەی > *nokt- (IE.) "شەو". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑نووتەک nutek [تاریک و نووتەک] و هتد.

**ناخودا naxuda** [ nāxudā ] - "دەریاوان": ناخدا nāxodā (P.). خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**ناخۆرە naxore** [ nāxora ] - "زەوی قووپاو و رۆچوو": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نادۆک nadok** [ nādok ] - "(داری) سێ پایەی مەشکە": ئەسڵی وشکە *nardok *ناردۆک* بووە و پێوەندی بە چەندین وشەی دیکەوە هەیە کە مانای "دار، تەختە" دەدەن، بۆ وێنە ↑نەرد nerd "تاوڵە".

**نادە nade** [ nāda ] - "1- میوەیەک کە زوو پێ بگا 2- کارێک کە زوو پێک بێ": پێوەندی هەیە بە ↑نۆش noşەوە.

**ناردن nardın** [nārdın ] - "شاندن": ↑هەناردن henardın یش دەگوترێ. وێ دەچێ "هەناردن" شێوەی کۆنتر بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑شاندن şandın.

**نارنج narınc** [ nārınj ] - "میوەیەکە لە چەشنی پرتەقاڵ": نارنج nārenj (P.). وشەی نارنجی narıncî لەم وشەیە وەرگیراوە و بۆ رەنگی ئەم میوەیە دەگەڕێتەوە. وشەکە دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هەنار henar.

**نارنگی narıngî** [ nārıngī ] - "میوەیەکە لە چەشنی پرتەقاڵ": نارنگی nārengī (P.). خزمە لەگەڵ ↑نارنج narınc.

**نارین narîn** [ nārīn ] - "گۆرانی خەمبارانە": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ناڵین nalîn، ↑نوورە nure "قیژەی پشیلە"، ↑نەڕڕاندن nerrandın، ↑نهار nıhar "شیوەن"، ↑نڕین nırîn "حیلاندنی ئەسپ"، ↑نەعرەتە neɛrete، سەر بە ریشەی > *(s)ner- (IE.) "پرتاندن، نەڕاندن،

مراندن". هەر لەم ریشەوە دە زمانی ئەڵمانیدا schnarchen (G.) هەیە بە مانای "پرخە، نرخە" و nörgeln (G.) هەیە بە مانای "نقە کردن".

**ناز naz** [ nāz ] - "1- عیشوە 2- خۆشەویستی، دلۆڤانی": خزمە لەگەڵ niedlich (G.) "ژیکەڵە، خونجیلانە، خوێن شیرین". ئەم ئاوەڵناوە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر وشەیەک کە لە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا نەماوە، بەڵام دە زمانە کۆنە ژێرمەنییەکاندا هەبووە و بریتی بووە لە niot (OG.)، niet (MG.)، nēod (OE.) "حەز، تامەزرۆیی، ئارەزوومەندی". مانای ئاوەڵناوە ئەڵمانییەکە دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "حەز بزوێن، ئارەزوو هەستێن" و دواتر ماناکانی "خۆش، چێژبەخش"، "چکۆڵە" و "باریک و تەنک"یش سەریان هەڵداوە. شیاوی باسە هەموو ئەم مانایانە لە زمانی کوردمادیشدا بەدی دەکرێن. لە زمانی کوردمادیشدا "ناز" ئەو شتەیە کە لە حەز و ئارەزوو و خۆشەویستی سەرچاوە دەگرێ و هەروەها حەزی لایەنی بەرانبەریش وەگەڕ دەخا. هەروەها مانای "چکۆڵە، زەریف، خۆش" لە وشەی ↑ناسک nasık دا بەدی دەکرێ. وشەی ناسک یان نازک nazık چووەتە ناو زمانی عەرەبی و وشەی نزاکة nazāka(t) (Arb.) "ئەدەب"ی لێ چێ کراوە. مەبەست لە "نزاکت" دە بنەڕەتدا نازک بوون یان ناسکایەتی لە گوتار و رەفتاردا بووە. هەروەها ↑نەشمیل neşmîl پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

[تێبینی: لەپێوەندی لەگەڵ وشەی "نەشمیل" و سەبارەت بە گۆڕانکاری فۆتیمەکان هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی کوردمادی نۆش noş کە لە ریشەی *neud- (IE.) "(بەهرە) وەرگرتن، بە دەست هێنان" پەیدا بووە].

**نازە naze** [ nāza ] - "بن نینۆک": [نازەی ناخون]. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑ناخ nax و ↑نزم nızım سەر بە ریشەیەک بە مانای "ژێر، نزم، خوارەوە".

**ناژ naj** [ nāž ] - "داری سنەوبەر": خزمە دەگەڵ ↑تیزە neze.

**ناسک nasık** [ nāsık ] - "1- نەرم 2- باریک، تەنک 3- تورت": نازک nazık یش دەگوترێ. نازک nazok (P.). بڕوانە ↑ناز naz.

**ناسۆر nasor** [ nāsor ] - "زام، برین": لەوانەیە وشەکە لە دوو کەرتی نا na (؟)+ سۆر sor پێکهاتبێ. ئەگەر ئەمە راست بێ، پێوەندی هەیە بە sēre (MG.) "زامی بەژان"، sēr (OG.)، sair (Gt.) "ئێش"، sēro (OG.)، sāre (OE.) "بەژان، پرئێش"، sēr (OG.) zeer (Nl.)، sore (E.)، sar (Sw.) "زام، برین"، saevus (L.) "تووڕە، سامناک"، sāeth (OIr.) "نەخۆشی"، سەر بە ریشەی **< *sai- (IE.)** "ئێش، ئازار، نەخۆشی".

**ناسین nasîn** [ nāsīn ] - "ناس کردن، زانین": شناسین şınasîn یش دەگوترێ. شناختن šenāxtan (P.). خزمە دەگەڵ ↑زانین zanîn و هەردووک وشە دەچنەوە سەر یەک ریشە، واتا ریشەی **< *gen(o)- (IE.)** "ناسین، زانین". (g)noscere (L.) و gnoskein (Gr.)، kennen (G.)، cennan (OE.)، känna (Sw.) "ناسین" لەم ریشەوە هاتوون. وشەی diagnose (Gr.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەی دیکە وەک ↑نیشان nîşan و ↑نیشانە nîşane.

**ناشتا naşta** [ nāštā ] - "خورێن": ناشتا naşta (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ nüchtern "خورێن، ناشتا". وشە ئەڵمانییەکە دەبردرێتەوە سەر nocturnus (L.) "شەوەکی" و ئەم وشە لاتینییەش خۆی خزمە دەگەڵ Nacht (G.) و night "شەو"، سەر بە ریشەی **< *nok(t)- (IE.)** "شەو". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ناخر naxır "رەوەی شەوبەکێو".

ناشتن **naştın** [ *nāštın* ] - "1- چەقاندنی شتڵ و نەمام 2- شاردنەوە و بە خاك سپاردنی مردوو": خزمە دەگەڵ نهادن nahdan (P.)، نهال nahāl (P.) "نەمام" و نهان nahān (P.) "شاراوە" [تیدا جێگیر کراو]، ↑نان *nan* [نیان، دانان] و ↑نهێنی nıhênî. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ناهتۆر nahtor "باخەوان" هەیە کە دە ئەسڵدا مەبەست "تیژەر(ی نەمام)"ە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -dhe*** (**IE.**) "دانان، جێگیر کردن، قەرار دان". ↑هەروەها ↑تایە taye "نەمامی بی" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. وشەکە دە بنەڕەتدا پێکهاتووە لە پێشگری ne کە ئاماژە بە لای خوارەوە دەکا و ریشەی *-dhe**، واتا بنجی کردارەکە دە کۆندا شتێك بووە وەك نەدە **nede*، پاشان بووەتە نها naha یان ناشە -naşe و ئینجا نیشانەی بەکردار کردنی دن /dan تن tın پێوەی لکاوە و بووەتە نهادن nahādan یان ناشتن naştın. هەروەها لەم بارەوە بڕوانە پاشگری ↑دان dan دە وشەکانی چادان، قەندان، خوێدان و هتد.

ناڤرۆ **navro** [ *nāvro* ] - "ئاد، دووڕگە": ناڤ nav [↑ناو naw] + رۆ ro [↑رووبار rubar]. بەم پێیە مانای وشەکە دەبێتە هیشکاییەك کە لە ناو ئاودا هەڵکەوتووە.

ناق **naq** [ *nāq* ] - "گەروو، قوڕگ": هەروەها ↑نیخ nîx ە هەیە بە مانای "بنی گەرۆ". خزمە دەگەڵ Nacken (G.)، nac (OG.)، hnekka (OF.)، hnecca (OE.)، nek (E.) "پشت سەر، پشت مل". ئەم وشە ژێرمەنییانە بە پێی بۆچوونێك دەچنەوە سەر ریشەی **< -knak*** (**IE.**) "قرچە، خرتەی مۆرەکانی مل".

ناقر **naqır** [ *nāqır* ] - "گەردن": ↑ناق naq.

ناقۆڵا **naqola** [ *nāqolā* ] - "نارێك، خوار و جێچ": ناقلا nāqolā (P.) "زیرەکی کەڵەکباز". دەبێ کەرتی "نا" بەشێك لە خودی وشەکە بێ، چونکوو "قۆڵا" خۆی بە تەنیا چ مانایەك بە دەستەوە نادا. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ناخۆر "زبر و بە کەند و لەند". لەم تێڕوانینەوە "ناقۆڵا" دەبێ بە شتێك یان کەسێك گوترابێ کە رێك و پێك و ساف و راست نەبووبێ.

ناکا **naka** [ *nākā* ] - لە کاتی ئارەزوو نەکردنی روودانی کارێك دەگوترێ ، بۆ وێنە دەڵێن "ناکا بەشەر هاتبن". نەکا neka ش دەگوترێ. نکنە nakone (P.) [دە زمانی ئاخافتندا]. نا na [↑نە ne] + کا ka، سەر بە کرداری ↑کردن kırdın.

ناگوزووری **naguzurî** [ *naguzūrī* ] - "دەستنەگی، ناچاری، بێچارەیی": بڕوانە ↑گوزوور guzur "(رێگا)چارە".

ناڵ **nal** [ *nāl* ] - "ئەو پارچە ئاسنەی لە سمی ئەسپ دەدرێ": ناڵ کردن هەروەها بە مانایەکی دیکەش بەکار دێ کە بریتییە لە "تاشینی لایەکی دار بۆ جووت بوون". خزمە دەگەڵ ↑نینۆك nînok و هەروەها Nagel (G.) و nail (E.) "نینۆك، بزمار". خزمەکانی ئەم وشەیە دە هێندێك لە زمانە ئەورووپییەکاندا چەند مانایەکی وەك "قاچ" و "سم"یشی وەرگرتووە و لێرەوە ئەم بۆچوونە پەیدا دەبێ کە مەبەست لە وشەی ناڵ دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بە "نینۆك" و سمی ئەسپ بووبێ. دیارە وشەی نعل naɛl (Arb.) و ناڵی کوردمادی دەبێ پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و دەکارین بڵێین وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیراوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بە "ناڵ" دەگوترێ Huf. ئەم وشەیە بە خزم دادەنرێ دەگەڵ -śaphá (OIn.) "چەنگاڵ (نینۆکی ئاژەڵ)، ناڵ" و -safa (Av.). وەك دەبینرێ وشەکە دە زمانی هیندی کۆندا بە هەر دوو مانای "نینۆکی ئاژەڵ، سم" و "ناڵ" بەکار هاتووە. پێوەندی نێوان ئەم دوو چەمکە دە زمانی ئینگلیزی کۆنیشدا بەدی دەکرێ. clēa لەم زمانەدا بەم مانایانە بەکار هاتووە: ناڵ، چەنگاڵ، قولاپ (چەنگەك). چەمکی هاوبەش لەم مانایانەدا "خوار بوون، چەمانەوە"یە،

چونکوو ناڵ، چەنگاڵ و قولاپ دۆخێکی چەماو و کەوانییان هەیە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە [↑نالجاخ nalcax].

**ناڵبەکی nalbekî** *[ nalbakī ]* - "ژێرئیستیکان": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑نالک nalık "سۆل".

**نالجاخ nalcax** *[ nālcıx ]* - "بێڵچە 2- زەنگن، کولینگ": هەروەها نالجخ nalcıx دەگوترێ بە مانای "بیور، تەور". خزمە لەگەڵ ↑ناڵ nal. وەک لەسەرەوە شی کراوە، "ناڵ" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "نینۆک، چنجرووک". لەم مانایەوە لە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "مێخ، بزمار" پەیدا بووە کە ئەویش کەرەستەیەکی تیژە. هەر بەم شێوەیە لە زمانی کوردمادیشدا وشەی "نالجاخ" یان "نالجخ" پەیدا بووە.

**نالک nalık** *[ nālık ]* - "سۆل، کەوشی تەخت و بێ پاژنە": ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی هەبێ بە وشەیەکی دیکە کە بریتییە لە ↑نالی nalî [نالیک nalîk، ناهلیک nahlîk، نوهلیک nuhlîk، ناڵیچە nalîçe] بە مانای "دۆشەک". ئەگەر لەم وشانە و ماناکانیان ورد بینەوە، دەبینین کە هەردووکیان ئاماژە بە شتی "تەخت" دەکەن کە دەخرێتە *بنەوە*، واتا دەکرێتە تەختایی بنەوە. "نالک" پێڵاوێکی تەختە و "نالیک"یش دۆشەگە و رووبەرێکی تەختە کە لە بنەوە رادەخرێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکان پێوەندی پەیدا دەکەن بە ریشەی **< *ndheri- (IE.)** "ژێر، خوارەوە" و دەبنە خزم لەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑ژێر jer. ئەم ریشەیە خۆی لەپێوەندی دایە لەگەڵ ریشەی **< *nitra- (IE.)** "نزم، نەوی، خوارەوە". لە زمانی ئەڵمانیدا nieder (G.) مانای "ژێر، نزم، تەخت" دەدا، Niederung (G.) بە مانای "تەختان، نزمان" بەکار دێ، ناوی وڵاتی هولەند بە زمانی هولەندی دەبێتە Nederlande واتا وڵاتێک کە نزمان و تەختانە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها نوهال nuhal یان ↑نواڵە nuwale "شیو، دۆڵ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. لێرەدا شیاوی ئاماژە کردنە کە وشەی نعلین naɛlayn (Arb.) لە وشە کوردمادییەکە وەرگیراوە. وشە کوردمادییەکە لە زمانی عەرەبیدا پاشگرێکی خراوەتە سەر کە وشەکە دەکا بە "دوودانە"، واتا "دوو دانە نالی، جووتێک نالی". جگە لەم دوو وشەی سەرەوە دەشێ وشەی ↑ناڵبەکی nalbekî ش لەم چوارچێوەیەدا لێک بدرێتەوە، چونکوو ئەویش پانتاییەکە لە بنەوە دادەندرێ و ئیستیکانی دەخرێتە سەر. هەروەها لەوانەیە وشە ↑قالی qalî "فەرش" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و بەم جۆرە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ: نەتالی netalî ← نەهالی nehalî ← نەقالی neqalî ← قالی qalî.

[تێبینی1: لەباری گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیکەوە دەتوانیین شیمانەی ئەوە بکەین کە بنجی وشەکە وەسا گۆڕدرابێ: "*ناتر *natır*، *ناهل* nahıl، *نال* nal". گۆڕانی فۆتیمی t بە h و گۆڕان یان سوانەوەی ئەم فۆتیمەی دواییش لە وشە کوردمادییەکاندا کەم نییە، بۆ وێنە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "شاتر"ی کۆن و "شهر"ی فارسی و "شار"ی کوردمادی، میترا و مهر و مێر، "چاترە" و چێهرە و چارە و هتد. تێبینی 2: وشەی "سۆل"یش کە بەمانای "نالک، پێڵاوی تەخت" بەکار دێ، خۆی دە بنەڕەتدا مانای "رووبەری بنەوە، پانتایی بنەوە" دەبەخشێ].

**نالی nalî** *[ nālī ]* - "دۆشەگ": نالیک nalîk، ناهلیک nahlîk و ناڵیچە nalîçe ش دەگوترێن. خزمە لەگەڵ ↑نالک nalık.

**ناڵین nalîn** *[ nālīn ]* - "نکین، ئاهین، ئاخین": دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە ئاماژە بە دەنگ لێوە هاتن دەکەن و دەشێ گشتیان سەر بە یەک ریشە بن، وەک ↑*نارین narîn* و ↑نەڕاندن nerrandın و هتد.

ناموس **namus** *[ nāmūs ]* - "ئابڕوو، شەرەف": وێ دەچێ وشەکە لە عەرەبییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردمادی و دە ئەسڵدا دەچێتەوە سەر nomos (Gr.) "قانوون". گۆڕانی مانای وشەکە لە "قانوون"ەوە بۆ "ئابڕوو" لەوەڕا هاتووە کە ڕەچاو کردنی یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵگا بە نیشانەی ئابڕوومەندی و پێچەوانەکەشی بە بێ ئەخلاقی و بێ ئابڕوویی دانراوە.

نامۆ **namo** *[ nāmo ]* - "نائاشنا، نەناس": لە سێ کەرت پێک هاتووە: نە ne [یان نا na] + ئام am [هام ham، هاو haw] + ۆ o. کەرتی یەکەم نیشانەی نەرێنییە. کەرتی سەرکی وشەکە هەر ئەو کەرتەیە کە بۆ وێنە لەگەڵ وشەی ↑هاواڵ hawal، ئاواڵ awal، ↑ئاماڵ amal دێ. ئەم کەرتە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "یەک". مەبەست لە وشەکانی هاواڵ یان ئاماڵ لەبنەڕەتدا ئەوەیە کە دوو یان چەند شت لەگەڵ یەکتر دێنەوە، یەکانگیرن، لە یەک دەچن. بەپێچەوانەوە "نامۆ" [ نە- ئام- ۆ] ئەو شتە یان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ئەوانی دیکە یەک ناگرێتەوە، واتا وەک ئەوانی دیکە ئاشنا و ئاسایی نییە.

نامە **name** *[ nāma ]* - "پەیامی نووسراو بۆ کەسێک": نامە nāme (P.). خزمە دەگەڵ ناو1 naw و مەبەست ئەوەیە کە پەیامەکە بۆ ناوێکی دیاریکراو [بۆ کەسێکی دیاریکراو] دەنووسرێ.

نان **nan** *[ nān ]* - "نیان، جێگیر کردن، قەرار دان": زۆرتر دەگەڵ پێشگری دا -da بەکار دەهێنرێ [دانان danan]. نهادن nahdan (P.). دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑نهاندن nıhandın [نیاندن nîyandın] و ↑ناشتن naştın پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەی **< *dhe- (IE.)***. گۆڕانی وشەکە دەشێ بەم جۆرە بووبێ: نی nî [پێشگری ئاماژە بە خوارەوە، لەم بارەوە بڕوانە "نیشتن"] + dan دان، *نیدان *nîdan* ← نهان nıhan [هەروەها ناشتن naştın] ← نیان nîyan ← نان nan.

ناو1 **naw** *[ nāw ]* - "وشەی پێناسە": ناڤ nav و نێو new یش دەگوترێ. هەروەها ناڤاندن navandın هەیە بە مانای "ناو لێنان". نام nam (P.)، Name (G.)، name (E.)، namō (Gt.)، namn (Sw.)، nomen (L.)، ónoma (Gr.)، nāma (OIn.)، ainm (OIr.) سەر بە ریشەی **< *(e)nomen (IE.)*** "ناو".

ناو2 **naw** *[ nāw ]* - "هەناو، دیوی ژوورەوە": ناڤ nav و نێو new یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Nabe (G.)، naff (Nl.)، nave (E.)، nav (Sw.) "ناوەندی چەرخ کە تەوەرەی دەچێتە ناو". ئەم وشەیە دە زمانە ئەورووپییەکاندا خزمە دەگەڵ وشەیەک کە مانای "ناوک، ناوەندی سک" دەدا و هەردووک وشە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(e)nebh- (IE.)*** "ناوەندی چەرخ، ناوەندی سک". خزمە دەگەڵ چەندان وشەی وەک ↑هەناو henaw، ↑ناوەند nawend، ↑ناوەڕاست nawerast و ↑نیفەک nefek "پارچەی سێ سووچی ناوەڕاستی دەرپێ" و هتد.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بە ناوک (تیوک، ناوەندی سک) دەگوترێ Nabel (G.). وەک دەبینرێ، پاشگری گچکاندنی (e)l خراوەتە سەر ئەسڵی وشەکەوە، واتا nabe. دە زمانی کورمادیشدا پاشگری گچکاندنی ık دەچێتە سەر ناو naw و دەبێتە ناوک nawık. ئەم دیاردەیە دە چەندین وشەی دیکەشدا هەر بەم جۆرەیە، بۆ وێنە جاشک caşık و Esel یان جووشک cûşık و Igel و هتد. ئەم پاشگرە ژێرمەنییە دە زمانی کوردیشدا هەیە، وەک "کیسەڵ"].

ناوبژی **nawbıjî** *[ nāwbıžī ]* - "پێکهێنانی دوو لایەنی بەکێشەهاتوو": ↑ناو2 naw + بژی bıji. "ناو" بە مانای "تیوان"ە و "بژ"یش دەچێتەوە سەر یەکێک لەم دوو کردارانە:

1- ↑بێژتن1 bejtın "قسە کردن". لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "ناوبژی" کردن، کەوتنە تیوان دوو لایەنی کیشەیەک و قسە کردن دەگەڵیانە بە نیازی پێکهێنان و ئاشت کردنەوەیان.

2- ↑بێژتن[2] bejtın [دابێژتن dabêjtın واتا لێک جودا کردنەوە]. کرداری ↑بژاردن bıjardın [هەڵبژاردن و هەڵوەژاردن] یش پێوەندی بەم وشەوە هەیە و لە بنەڕەتدا بە مانای (لێک) جودا کردنەوەیە. لەم تێڕوانینەوە "ناوبژی کردن" بریتییە لە (لێک)جودا کردنەوەی دوو لایەنی کێشەیەک. لە زمانی کوردمادیدا ناوبژە nawbıje کردنیش هەیە بە مانای "کەوتنی ددانی شیری". لێرەشدا "بژە" ئاماژە بە جودایی [کەلێن و فاسیلە] دەکا کەدەکەوێتە تیوان ددانەکانەوە بە هۆی ددان کەوتنەوە.

**ناوتان nawtan** *[ nāwtān ]* - "تیغەی لە شووڵ تەنراو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نژنی *nıjnî* "تەون، تەنین"، ↑نژنین nıjnîn "بەرد لەسەر یەک هەڵچنین" و ↑نژن nıjın "ئیشکەبەردی لەسەر یەک هەڵچنراو"، سەر بە ریشەی **< *-(s)nē* (IE.)*** "چنین، تەنین، تەقەڵ لێدان".

**ناورتە nawırte** *[ nāwrta ]* - "تێکەڵ پێکەڵ، نارێک": دەشێ پێک هاتبێ لە نا + ورتە + wırte na. کەرتی ئەسڵی وشەکە، واتا ورتە wırte- لە *orde (L.)* "ریز، نەزم و تەرتیب، پلە و پایە" وەرگیراوە. لە زمانی ئەڵمانیدا Ordnung (G.) "نەزم و تەرتیب" و ordnen (G.) "نەزم و تەرتیب دان" لەم وشە لاتینییە وەرگیراون.

**ناوک1 nawık** *[ nāwık ]* - "1- قووڵایی تیوەڕاستی سک": ناڤک navık و تیوک newık یش دەگوترێ. ناف naf (P.) "ناوکی سک". خزمە دەگەڵ nabel (G.)، nabalo (OG.)، nafela (OE.)، navela (OF.)، navel (E.) و (Nl.)، navle (Sw.)، nabhi (OIn.) "ناوک" سەر بە ریشەی **< *(e)nebh- (IE.)*** "ناوەڕاستی سک، ناوەندی چەرخ".

**ناوک2 nawık** *[ nāwık ]* - "کاکڵ یاخود دەنکی میوە": دەچێتەوە سەر ↑ناو[2] naw "هەناو، دیوی ژوورەوە".

**ناوە nawe** *[ nāwa ]* - "دەفری قوڕ کێشان": ناوە nāwe (P.). لە زمانی کوردمادیدا ↑ناوەڵ nawel "کەویژەی ئاش" و ↑ناوەوان nawewan "گەمێوان" پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. ناوە nāve لە وشەنامەی فارسیدا دوو مانای "کەشتی چکۆڵە" و "دەفری قوڕکێشان"ی بۆ کراوە. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە nāvis (L.) "کەشتی". هێندێک وشە وەک ناوگان nāvgan (P.) و navy (E.) "کەشتیگەل" لەم وشەوە هاتوون. لە زمانی فارسیدا وشەی ناودان nāvdān "پلوسک" یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. "ناودان"ی فارسی یان پلووسک لەباری شێوەی کەرەستەکەوە وەکوو *ناوەڵ* "کەویژەی ئاش"ە. "ناوە"، "ناوەڵ"، "ناودان"ی فارسی شێوەکەیان لە کەشتی یان گەمێیەکی بچووک دەچێ و بۆیە وەسا ناو نراون.

[تێبینی: لەباری چۆنیەتی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە بەراوردی وشەکە بکە لەگەڵ وشەکانی *جام* "دەفر"، *گەمێ* "کەشتی"، *زەممە* "دەفری قوڕکێشان کە بە دوو کەس هەڵدەگیرێ" و *کەشتیلە* "کەوچکی گەورە". هەروەها شیاوی باسە کە وشەکانی "کەوچک" [کەمچک، کەڤچک] و "کەویژە"ش خۆیان دەبنە خزم لەگەڵ "گەمێ" و دواجار "جام" و بەگشتی هەموویان مانای "دەفر" دەبەخشن].

**ناوەراست nawerast** *[ nāwarāst ]* - "تیوان، تیونجی": تیوەراست newerast یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ناو2 naw "هەناو، دیوی ژوورەوە".

**ناوەڵ nawel** *[ nāwal ]* - "کەوێژەی ئاش": خزمە دەگەڵ ↑ناوە nawe "دەفری قوڕ کێشان".

**ناوەند nawend** *[ nāwand ]* - "ناوەراست، مەرکەز": خزمە دەگەڵ ↑ناو2 naw "هەناو، دیوی ژوورەوە".

**ناوەوان nawewan** *[ nāwawān ]* - "گەمێوان": خزمە دەگەڵ ↑ناوە nawe "دەفری قوڕ کێشان".

**ناوین1 nawîn** ] *nāwīn* [ - "ناوەڕاست": ناڤین navîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ناو2 naw "هەناو، دیوی ژوورەوە".

**ناوین2 nawîn** ] *nāwīn* [ - "سواخ دان": دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە چەند مانایەکی نیزیک لەیەکتر دەدەن و سەر بە خێزانێکن، وەک ↑نڤانی nıvan "قوڕەکاری" [دە بنەڕەتدا: سواخ دان]، ↑نڤیشک nıvîşk "ڕۆنەکەرە" [دە بنەڕەتدا: ئەوەی بۆ تیهەڵسوون دەبێ] و هتد. وەک دەبینین ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکەکانی "ڕێخشاندن، تیهەڵسوون، سواخ دان" دەکەن. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ hniuwan (OG.) "ڕێخشاندن، سوونەوە، تیهەڵسوون"، hnoggwa (OIs.) "ورد کردن، کوتانەوە، لێدان"، hnēaw (OE.) "چنۆک، ڕژد" [دە بنەڕەتدا: هەڵکرێن؟]، knyein (Gr.) "کڕاندن، سوونەوە". ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە دیاری نەکراوە. دەشێ وشەی ↑کەندن kendın [هەڵکەندن] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**ناهتۆر nahtor** ] *nāhtor* [ - "باخەوان": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ناشتن naştın "چەقاندنی شتڵ و نەمام"ەوە.

**نایە naye** ] *nāya* [ - "شمشاڵ": ↑نەی ney.

**نتراندن1 nıtrandın** ] *nıtrāndın* [ - "نەخشاندن، گوڵدۆزی کردن": نتلاندن nıtlandın یش دەگوترێ. بنەوشەی نتر -nıtır خزمە دەگەڵ ↑نیشانە nîşane، ↑ناتۆرە nator، نیتکە nîtke یان ↑نووتکە nutke، [ناو و ناتۆرە یان ناو و نووتکە دە بنەڕەتدا واتا "ناو و نیشان"، شتێک کە مرۆڤەکەی پێ دەناسرێتەوە]، ↑ناترە "داری بە نیشانە دانراو لە خەرماندا". ئەم وشانە گشتیان دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑ناسین nasîn. ئەم وشانە خزمن هەروەها دەگەڵ nota (L.) "نیشانە، نەخش، عەلامەت ". دیارە "نتراندن"یش دروست کردنی نەخش و نیشانە لەسەر پارچەیە.

**نتراندن2 nıtrandın** ] *nıtrāndın* [ - "چاوەنۆڕی کردن": لە پێوەندی دەگەڵ ↑نتراندن1 nıtrandın دایە. سەبارەت بە جۆری پێوەندییەکە بڕوانە ↑نگا nıga.

**نچ1 nıç** - "گۆشەی جلک و لێفە و ...": خزمە لەگەڵ ↑نووک nuk.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "گۆشە" و "تیژایی"، شیاوی باسە کە وشەی Ecke (G.) بە مانان "گۆشە" دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بەمانای "تیژ، نووک تیژ" و خزمە لەگەڵ "ئاژنین"ی کوردمادی]. هەروەها بڕوانە ↑نچک nıçık "چڵوپۆپی دار".

**نچ2 nıç** - "دەنگی باریکی کرووزانەوە": [نچەنچ nıçenıç]. خزمە لەگەڵ ↑نووکە nuke [نووکەنووک].

**نچک nıçık** ] *nıčık* [ - "چڵوپۆپی دار": نچ nıç + ک ık. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑نووک nuk.

**نخ nıx** - "بە چۆکدا هاتنی وشتر": هەروەها ↑نۆخ nox هەیە بە مانای "پشت چەماو" و ↑نخین nıxîn "گوڵەشلێرە" [دە بنەڕەتدا: (گوڵی) سەر دانەواندوو، دە فارسیدا "لالەسرنگون"]. لەوانەیە ↑نۆکەر noker یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و وشەکە ئاماژەی بە "داهاتنەوە، سەر دانەواندن" یان "بە چۆکدا هاتن" کردبێ کە تایبەتمەندی مرۆڤی نۆکەرە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ neigen (G.) و nicken (G.)، neigen (Nl.)، hna gan (OE.)، hneigja (OIs.)، hneigan (OG.) "داهاتنەوە، چەمانەوە". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ niti (L.) "هەڵپەساردن، پاڵ وەدان" و nictare (L.) "چەمانەوە، چاو داگرتن" و دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) * kneigh-* < "نەوین، چەمانەوە".

[تێبینی: هێندێک لەو وشانەی پێوەندییان بە خێزانەوە هەیە، مانای "قەد" لە خۆ دەگرن، وەک ↑نهۆم nıhom و ↑نشف nışıf. ئەم مانایەش پێوەندی بە چەمکی "چەمانەوە، نووشتانەوە"وە پەیدا دەکا. ئەم وشانە دەتوانین لەباری ماناوە دەگەڵ وشەی "گنج" [چین و چرووک] بەراورد بکەین، کە پێوەندی بە چەمکی "قەد" بوونەوە هەیە [چین چین واتا قەد لەسەر قەد]. وشەی "گنج" خزمە دەگەڵ knicken (G.) "نووشتانەوە، قەد بوون" و ئەم وشانەش دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە"].

**نخافتن nıxaftın** [ *nıxāftın* ] - "خۆ داپۆشین بە لێفە": هەروەها نخاف nıxaf [نخێف nıxêf] هەیە بە مانای "لێفە" و ↑نخفتن nıxıftın بە مانای "داپۆشین، شاردنەوە". لە زمانی فارسیدا نهفتن nahoftan (P.) بە مانای "شاردنەوە، شاراوە بوون" دێ. وشەی ↑نقاب nîqab پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و لەوانەیە↑نەقەب neqeb و ↑نەغمە neğme ئاماژە بە ماناکانی "تاریکی، *داپۆشراوی*" بکەن. ئەم وشانەی دوایی براونە ناو زمانی عەرەبی و زۆر کەس وەک وشەی عەرەبی سەیریان دەکا، کەچی پێوەندییان بە وشە کورمادییەکانەوە ئاشکرایە.

1- ئەم وشانە لەوانەیە لە بنەڕەتدا پێوەندییان بە چەمکی "تاریکی" و دواتر "نەدیار بوون، شاردرانەوە" هەبێ و لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑نیسێ nîse.

2- لەوانەشە پێک هاتبێ لە دوو کەرتی *nı* [پێشگری ئاماژە کردن بە خوارەوە، وەک لە وشەکانی نیشتن، نزم، نشێو و ....] + *خافتن xaftın*. [لەم بارەوە دەتوانین لەگەڵ وشەی "داپۆشین" هەڵیسەنگینین کە لەویشدا پێشگری "دا" ئاماژە بە خوارەوە دەکا]. لەم تێڕوانینەوە بنجی کردارەکە دەبێتە *خاف xaf* و جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑کەف[1] kef [کەف و کوڵ کە وەک توێژێک شت دادەپۆشێ]، سەر بە ریشەی ***(s)keu > (IE.)*** "داپۆشین، تێوە پێچان"

[سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی"تاریکی" و داپۆشران" جێی بیرهێنانەوەیە کە وشەی کوێر kuwer "نابینا" [چاو داپۆشراو] دەشێ خزم بێ دەگەڵ ob-scurus "تاریک، نادیار" و skur (Norw.) "سەرپەنا، پەناگا". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی *(s)keu > (IE.)* "داپۆشین، تێوە پێچان". ئەمە هەر ئەو ریشەیە کە وشەکانی سەرەوە لەژێر خاڵی 2دا سەرچاوەیان لێی گرتووە].

**نخای nıxay** [ *nıxāy* ] - "بێ ئەدەب، رەوشت خراپ": هەروەها ↑نز nız هەیە بە مانای "سووک، بێ ئابڕوو". پێوەندی هەیە بە ↑نخرۆ nıxro "نزم، رۆ چووکَ، نقوم بووکَ" و ↑*ناخ nax* "قووڵایی". [لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ وشەی "پەست" کە هەم بۆ زەوی نزم و رۆچووکَ بەکار دێ و هەمیش بۆ مرۆڤی بەدرەوشت، هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "سپڵە"].

**نخرۆ nıxro** [ *nıxro* ] - "نزم، رۆ چووکَ، نقوم بووکَ" نغرۆ nığro ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نخری nıxrî** [ *nıxrī* ] - "منداڵی نۆبەرە": نەخری nexrî، نخوری nıxurî و ناخوری naxurî یش دەگوترێن. "نخوری" هەروەها بە مانای "براگەورە"ش بەکار دێ. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ↑نوێ nue [نوو nu]. "نوێ" لە وشەی "نۆبەرە"شدا بەدی دەکرێ. کەرتی خری xırî- یان خوری- xurî خزمە دەگەڵ ↑کوڕ kur و ئاماژە بە "زارۆک، منداڵ" دەکا.

**نخفتن nıxıftın** - "داپۆشین، شاردنەوە": خزمە لەگەڵ ↑نخافتن nıxaftın "خۆ داپۆشین بە لێفە".

نخووماندن **nıxûmandın** [ *nıxūmāndın* ] - "نخوون کردنەوە، بەراوەژوو کردن": بڕوانە ↑نخوون nıxun.

نخوون **nıxun** [ *nıxūn* ] - "ئاوەژوو، وەرسووڕاو": نخووم nıxum یش دەگوترێ. نگون negūn (P.) "ئاوەژوو، وەرسووڕاو، شۆڕەوەبوو". ["سرنگون" واتا رووخاو، دە بنەڕەتدا: چەمانەوە و داهاتنەوەی سەر بەرەو خوار، "نگون بخت" واتا بەخت وەرگەڕاو]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەند وشەیەك وەك ↑نخ *nıx* "بە چۆکدا هاتنی وشتر"،↑نۆخ nox "پشت چەماو"، ↑نخین nıxîn "گوڵەشلێرە" [دە بنەڕەتدا: (گوڵی) سەر دانەواندوو، دە فارسیدا "لالەسرنگون"]، ↑نخوماندن nıxûmandın "نخوون کردن، بەراوەژوو کردن" و هەروەها ↑نهۆم nıhom "قات". جێی سەرنجە کە وشەی "قات" خۆی خزمە دەگەڵ "قەد" [قەد کردن] و ئەمەش پێوەندی هەیە دەگەڵ چەمکی چەمانەوە و داهاتنەوە، بۆ وێنە بە چۆکداهاتنی وشتر جۆرێك لە قەد بوونی لاقەکانی وشتر نیشان دەدا، یان کەسێك کە پشتی زۆر چەمابێتەوە، وەك ئەوە وایە لەشی دوو قەد بووبێتەوە.

نخین **nıxîn** [ *nıxīn* ] - "گوڵەشلێرە": خزمە لەگەڵ نگون negūn (P.) "ئاوەژوو، وەرسووڕاو، شۆڕەوەبوو" [دە فارسیدا بە نخین یان شلێرە دەگوترێ "لالەسرنگون"]. بڕوانە ↑نخوون nıxun و هەروەها ↑نخ *nıx* "بە چۆکدا هاتنی وشتر".

نرت **nırt** - لەگەڵ "نوێ" دێ [نرت و نوێ nırt û nuê]. خزمە دەگەڵ nähren (G.) "خواردن پێدان، بژێو پێدان"، nar (MG.)، nara (OG.) "ساغی و تەندروستی، رزگاری، بژێو". مانای بنەڕەتی ئەم وشانە بریتی بووە لە "بە ساغی و تەندروستی راگرتن، لە ژیاندا هێشتنەوە". لەم تێڕوانینەوە مانای وشە کوردمادییەکە دەبێتە "ساغ و سالم". لەبەر ئەوەی شتی نۆی یان دەکار نەکراو ساغ و سالمە، ئیتر وشەکە بووەتە هاواڵێك بۆ وشەی "نوێ". وشە ژێرمەنییەکان خزمن لەگەڵ genesen (G.) [ge-nesen] "چاك بوونەوە لە نەخۆشی" [ساغ بوونەوە]، سەر بە ریشەی **(IE.) *nes- >** "رزگار بوون، ساغ و تەندروست مانەوە".

نرخاندن **nırxandın** [ *nırxāndın* ] - " هەڵسەنگاندن": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑نقراندن nıqrandın "نرخاندن".

نرخە **nrxe** [ *nırxa* ] - "دەنگی سینگی نەخۆش و ماندوو": خزمە دەگەڵ ↑نرکە nırke، نارە nare [↑نارین narîn].

نرکە **nırke** [ *nırka* ] - "دەنگی لە سینگەوە هاتوو": خزمە دەگەڵ ↑نرخە nrxe.

نریخە **nırîxe** [ *nırīxa* ] - "کورژنی ئەسپ": خزمە دەگەڵ↑نەڕڕە nerre.

نڕین **nırîn** [ *nırīn* ] - "حیلاندنی ئەسپ": خزمە دەگەڵ ↑نەڕڕە nerre.

نز1 **nız 1** - "سووك، بێئابڕوو": خزمە دەگەڵ ↑نزم nızım "نەوی" [سەرشۆڕ]. هەروەها ↑نخای nıxay هەیە بە مانای "بێ ئەدەب، بەدرەوشت".

نز2 **nız 2** - "هەناسە": بڕوانە ↑نزگ nızg "نیوە هەناسە" و دواتر ↑*هەناسە* *henase* "نەفەس، پشوو".

نزار **nızar** [ *nızār* ] - "کز و داماو، بێچارە":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑نیاز nîyaz.

2- هەروەها دەگەڵ nosos (Gr.) "نەخۆشی".

نزاو **nızaw** [ *nızāw* ] - "1- زنە، زەوی هەمیشە تەڕ 2- ئاوی دەڵاو 3- میوەی ئاو تێگەڕاو": خزمە دەگەڵ ↑نسیس nısîs "ئاو دانی زەوی بەر لە چاندن".

نزبه **nızbe** [ *nızba* ] - "زەوی دێمی تازە پێگەیشتوو": هەڵی سەنگینەدەگەڵ ↑نسیس nısîs و ↑نسار nısar.

نزگ **nızg** - "نیوە هەناسە": خزمە دەگەڵ ↑هەناسە henase "نەفەس، پشوو".

نزگەرە **nızgere** [ *nızgara* ] - "هەناسەکێشاتیکی کورت و پەیتاپەیتا کە بە هۆی گرژی پەردەی ناوسک پەیدا دەبێ": خزمە دەگەڵ ↑هەناسە henase و چەند وشەیەکی دیکە.

نزم **nızım** - "نەوی": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

نزەبا **nızeba** [ *nızabā* ] - "شنەبا": نزە nıze + ↑با ba. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑نزگ nızg، ↑هەناسە *henase*، ↑هەنیسک henîsk، ↑نزگەرە nızgere و هیتر کە ئاماژە بە چەمکی "نەفەس، هەوا" دەکەن. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ نسیم nesîm (Arb.) "شنەبا".

نژ **nıj** - [ *nıž* ] - "شفرەی چەرم برین": ↑نەشتەر neşter.

نژد **nıjd** [ *nıžd* ] - "برین": خزمە دەگەڵ↑ نژ nıj "نەشتەر".

نژدار **nıjdar** [ *nıždār* ] - "برینگەر": خزمە دەگەڵ ↑نەشتەر neşter و هەروەها ↑تیزە neze.

نژدی **nıjdî** [ *nıždī* ] - "ئەسپی کلک هەڵپاچراو": خزمە دەگەڵ ↑نژ nıj "نەشتەر".

نژنی **nıjnî** [ *nıžnī* ] - "تەون، تەنین": هەروەها ↑نژنین[2] nıjnîn هەیە بە مانای "بەرد لەسەر یەک هەڵچنین" و نژن nıjın "ئیشکەبەردی لەسەر یەک هەڵچنراو". مانای وشەکە دەبێ "تەنین، چنین" بووبێ و خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک nähen (G.) "دروون، تەقەڵ لێدان"، Netz (G.) "تۆڕ" [پارچەی گرێچن]، nuda (L.) "گرێ"، سەر بە ریشەی **< *(s)nē-*** ***(IE.)*** "چنین، تەنین، تەقەڵ لێدان".

نژن **nıjın** - "تەژی، پڕ": نژنین[1] nıjnîn یش هەیە بە مانای "پڕ بوون". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑نقاندن nıqandın "وێکهێنان، رێکگوشین".

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "پڕ" و "وێکهێنان، رێکگوشین" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "ئاخنین" کە هاوکات هەردوو مانا دەردەبڕێ].

نژنین1 **nıjnîn** [ *nıžnīn* ] - "پڕ بوون": بڕوانە ↑نژن nıjın "تەژی، پڕ".

نژنین2 **nıjnîn** [ *nıžnīn* ] - "بەرد لەسەر یەک هەڵچنین": خزمە دەگەڵ ↑نژنی nıjnî "تەون، تەنین".

نسار **nısar** [ *nısār* ] - "شوێن یان دیوی تاونەگر لە چیا": نزار nızar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑نیسی nîse [نسی nısê].

نسرم **nısrım** - "تاونەگر و سارد": ئەم وشەیە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "نسار" مانا کراوەتەوە. من لە دۆستێکی خۆشەویستی مەریوانی گوێم لێ بوو کە ئەم وشەیەی بۆ ژوورێک [ماڵێک]ی سارد و تاونەگر بەکار دەهێنا. هەر چۆتێک بێ وشەکە خزمە دەگەڵ ↑نسار nısar.

نسک **nısk** [ *nısk* ] - "نەدار، بێچارە": وێ دەچێ پێوەندی بە↑نیاز nîyazەوە هەبێ، واتا وشەکە دە ئەسڵدا بەمانای "نیازمەند" بووە.

نسکۆ **nısko** [ *nısko* ] - "رەت، سەرسم": بنەوشەی نس -nıs خزمە دەگەڵ ↑نووچ nuç [نووچ دان].

نسکیان **nıskîyan** [ *nıuskīyān* ] - "نزگەرە کردن لە گریانەوە": خزمە دەگەڵ ↑هەناسە henase و چەند وشەیەکی دیکە.

**نسلین nıslîn** [ *nıslīn* ] - "پسان": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نقراندن nıqrandın و ↑نووکراندن nukrandın "1- هەڵکۆڵین لەسەر دار و بەرد 2- بیراز کردنی بەرداش". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ سەرەتا بە مانای پساندن یان بڕین بووبێ بە کەڵک وەرگرتن لە ئامرازێکی تیژ.

**نسیس nısîs** [ *nısīs* ] - "ئاو دانی زەوی بەر لە چاندن": هەروەها ↑نزاو nızaw هەیە بەم مانایانە: "1- زنە، زەوی هەمیشە تەڕ 2- ئاوی دەڵاو 3- میوەی ئاو تێگەڕاو". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑نەقتاندن neqtandın "ئارەقە کردن" و نەشت našt (P.) "تەڕایی، دەڵاندن".

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Nass (G.)، naz (OG.)، nat (Nl.) "تەڕ" و netzen (G.) "تەڕ کردن"، سەر بە ریشەی ژێرمەنی *nata- (Grm.)*. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە.

2- nieseln (G.) "بارینی نەرم، خوناوە(باران)". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشەیەش ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە هەموو ئەم وشانە پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ.

[تێبینی 1: کرداری ئەڵمانی netzen (G.) دە وشەنامەدا وەک befeuchten (G.) مانا کراوەتەوە، واتا تەڕ کردنێکی کەم، وەک تەڕ کردنی لێو. ئەم کردارەی دوایی لە وشەی ئەڵمانی feucht (G.) "کەمێک تەڕ" وەرگیراوە [بە پێچەوانەی تەڕی خووساو]. وشە ئالمانییەکە خزمە دەگەڵ وشەی "فێنک" [خنک دە فارسیدا] و "خوناوە". تێبینی 2: سەبارت بە ئاڵوگۆڕی فۆنیمەکانی t و s لە وشەکاندا، وەک دەبینرێ دە زمانی ئەڵمانیشدا فۆنیمی t کە دە ریشە ژێرمەنییەکەدا هەیە، بووەتە ss].

**نشف nışf** [ *nıšf* ] - "1- چیتێک لە بەرهەم 2- نهۆم، قات": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑نهۆم nıhom. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "چەمانەوە، داهاتنەوە، قەد بوون" دەبەخشن، لەمەوە دواتر ماناکانی "قات" و "چین" پەیدا بوون [چین چین واتا قەد لەسەر قەد].

**نشکاڤ nışkav** [ *nıškāv* ] - "لەپڕ، کتوپڕ": نش nış، نشکاڤک nışkavık و نەژگاڤ nejgav یش دەگوترێن. نش + کاڤ [گاڤ واتا کات، دەم]. کەرتی نش nış پێوەندی بە ↑نها nıha وە هەیە. لە زمانی ئەڵمانیدا Im Nu (G.) مانای "دەسبەجێ" دەبەخشێ کە ئەویش لە مانای "کتوپڕ" نیزیکە. وشە ئەڵمانییەکە خزمە لەگەڵ "نها".

**نشکن nışkın** [ *nıškın* ] - "دیواربڕ، ئاسنی دەستی دز بۆ دیوار بڕین": هەروەها نشکنین nışkınîn هەیە بە مانای "دیوار بڕین". خزمە دەگەڵ ↑نەشتەر neşter "تیخی جەڕڕاحی" و ↑تیزە neze و چەند وشەیەکی دیکە.

**نشووک nışûk** [ *nıšūk* ] - "توتنی زۆر کوتراوی تاڵەبێژکراو کە دەکرێتە لووتەوە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *nas- (IE.)*** "لووت". لەم بارەوە بڕوانە ↑هەناسە henase "نەفەس، پشوو".

**نشۆ nışo** [ *nıšo* ] - "خاڵی سەر پێست": خزمە دەگەڵ ↑نیشان nîşan(e).

**نشیان nışyan** [ *nıšyān* ] - "مۆر و ئیمزا کردن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑نیشان(ە) nîşan(e).

**نشێو nışêw** [ *nıšew* ] - "سەربەرەوژێر": نشیب nêşîb (P.)، nı + şêw. کەرتی -nı لە چەند وشەیەکی وەک ↑نیشتن nîştın، ↑نخرۆ nıxro و ↑ناشتن naştın شدا دەر دەکەوێ و ئاماژە بە "بەرەوخوارە، لای خوارەوە" دەکا و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ni- (IE.)*** "نەوی، خوارەوە". کەرتی دووەمی وشەکە واتا شێو -şêw خزمە دەگەڵ ↑شیو şîw "دۆڵ" و شیب šīb (P.) "خوارایی رووبەرێک، لێژایی". بەم جۆرە دە وشەی "نشێو"دا مەبەست لێژایی یان خواری زەوی یان

رووبەرێکە بەرەوە خوارەوە [نەک بەرەو سەرەوە]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ schief (G.)، schef (MG.)، scaf (OE.)، skev (Sw.)، škibs (Let.) "خوار، لێژ"، skimbos (Gr.) "چەوێل"، skaios (Gr.)، scaevus (L.) "چەپ". ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامە کە وشەی ↑چەپ *çep* دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ شیو şîw و نشێو nışêw و هەروەها چەندین وشەی دیکە وەک ↑چەوێل çewel، ↑چەوت çewt، ↑شەپلە şeple و هتد. دیارە گشت ئەم وشانە مانای "خواری، راست نەبوون، چەپ بوون" دەگەیەنن.

**نفت nıft** - لەگەڵ "نوێ" دێ [نفت و نوێ nıft û nuwe]. شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە بریتییە لە ↑نوت[2] nut "زۆر تازە" [تازە رسکاو]. خزمە لەگەڵ ↑نۆتل notıl.

**نفتک nıftık** - "کفتە": هەر وەک چۆن "کفتە" پێوەندی بە "کوتان"ەوە هەیە، دەشێ "نفتک"یش خزم بێ لەگەڵ ↑نڤژاندن nıvjandın "بە دار شل و کوت کردن" [دە بنەڕەتدا: لێدان، کوتان] و دواتر دەگەڵ ↑*کنۆس kınos* "دەستقووچاو".

**نفتەک nıftek** - "(دەنکە)شەمچە، (چڵە)شخارتە": خزمە لەگەڵ ↑نفتک nıftık "کفتە" و ↑*کنۆس kınos* "دەستقووچاو". وەک لەژێر وشەی "کنۆس" و وشە خزمەکانی ئەودا شی کراوەتەوە، ئەو وشانە چەندین مانای وەک "کڕاندن، ساوین، هاڕین، کوتان، هەڵکەندن، تێهەڵسوون، پێداکێشان، رێخشاندن" دەبەخشن. وشەی "نفتەک" ئاماژە بەوە دەکا کە دەنکەشەمچەکە لە قوتووەشەمچەکە دەخشێندرێ، واتا ئاماژە بە چەمکی" ساوین، پێداکێشان، رێخشاندن" دەکا.

[تێبینی: لە زمانی ئاڵمانیدا Streichholz (G.) مانای "دەنکەشەمچە" دەدا و پێک هاتووە لە دوو بەشی -Streich "پێداخشاندن، رێخشاندن" و Holz "دار" و تێکڕا دەبێتە "دارۆکەی پێداخشاندن". کەرتی یەکەمی وشە ئەڵمانییەکە خزمە دەگەڵ "(ئە)سترین"ی کوردی کە ئەویش ماناکەی دەبێتە "رێخشاندن"].

**نفز nıfız** - "1- نزم، نەوی 2- بەدئاکار، خراپ، پەست": نڤز nıvız یش دەگوترێ. بەهەر دوو ماناکەوە خزمە لەگەڵ ↑نەوی newî "نزم". وشەکە هەور وەک وشەی "پەست" هەم ئاماژە بە زەوی نزم و هەمیش ئامازە بە مرۆڤی نزم (نەفس نزم) دەکا. دەشێ وشەکە لە کۆندا *نەڤەز* **nevez* [کۆنتر: *نەمەز *nemez*] بووبێ. خزمیشە دەگەڵ نمێژ nımêj [↑نوێژnuwej] کە ماناکەی دە بنەڕەتدا بریتییە لە "خۆ دانەواندن و خۆ نزم کردن" لەبەرانبەر هێزی بانسەردا.

**نفش nıfış** - "1- تۆرەمە، بەرە 2- نەوع، جۆر": پێوەندی بە ↑نەوە newe وە هەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو ماناکەی سەرەوە دەکرێ هەڵی سەنگێنین دەگەڵ وشەی kind (E.) "جۆر، نەوع" کە خزمە لەگەڵ Kind (G.) "منداڵ، زارۆک" و گەنج ganc ی کوردمادی بە مانای "لاو". هەروەها هەڵی سەنگێنە لەگەڵ *گۆن، گوێن* "نەوع، جۆر" کە دەبێتە خزم لەگەڵ "زان"، "فرزەند" و "زارۆک"].

**نڤان nıvan** *[ nıvān ]* - "خەوتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑نووستن nustın [نڤستن nıvıstın].

**نڤانی nıvanî** *[ nıvānī ]* - "قوڕەکاری": خزمە دەگەڵ ↑ناوین[2] nawîn [نڤان nıvan] "سواخ دان".

**نڤژاندن nıvjandın** *[ nıvžāndın ]* - "بە دار شل و کوت کردن" [دە بنەڕەتدا: لێدان، کوتان]. خزمە دەگەڵ ↑*کنۆس kınos* "دەستقووچاو".

**نڤیشک nıvîşk** *[ nıvīšk ]* - "رۆنەکەرە": نڤشک nıvışk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ناوین2 nawîn [نڤان nıvan] "سواخ دان" باس کراون و مانای "رێخشاندن، تێهەڵسوون" دەبەخشن.

[تیبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ماسڵە masle کە رۆتیکی چەور کردنە، لە زمانی رووسی وەرگیراوە و دە بنەڕەتدا دەچێتەوە سەر ریشەیەک کە ئەویش هەر بە مانای "رێخشاندن، سوونەوە، مشتومالٚ دان"ە (خزمە دەگەڵ "ماشتن"). دیسان لە باری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Aufstrich کە بەو شتانە دەگوترێ وەک پێخۆر دە نانی هەڵدەسوون. ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رێخشاندن" و خزمیشە دەگەڵ "ستڕین" (ئەستڕین، سرینەوە) دە زمانی کوردمادیدا].

**نق nıq** - "پڕ": خزمە لەگەڵ ↑نقاندن nıqandın "وێکهێنان، رێککوشین". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑نژنین1 nıjnîn "پڕ بوون" و ↑نژن nıjın "تەژی، پڕ".

**نیقاب nîqab** [ *nīqāb* ] - "رووپووش، دەمامک": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑نخافتن nıxaftın "خۆ داپۆشین بە لێفە" و ↑نخفتن nıxıftın "داپۆشین، شاردنەوە"دا باس کراون. وشەیەکی کوردمادی رەسەنە.

**نقار nıqar** [ *nıqār* ] - "دڵ رەنجان، گلەیی، قار": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑نقاندن nıqandın "وێکهێنان، رێککوشین".

**نقاندن nıqandın** [ *nıqāndın* ] - "وێکهێنان، رێککوشین": نووقاندن nuqandın یش دەگوترێ. [نووقاندنی چاو، دەست...]. مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە دەبێ "تەنگ بوون، تەنگ کردن" بێ کە دیارە ئەمەش لەگەڵ چەمکی "رێککوشین" پێوەندی هەیە. جگە لەم وشەیە، ↑نق nıq هەیە بە مانای "پڕ" [ئەمرۆ بازاڕ نق بوو] و هەروەها نقانق nıqanıq "پڕاوپڕ"، ↑نژن nıjın "تەژی، پڕ"، ↑نژنین1 nıjnîn "پڕ بوون". ئەم وشانە دەشێ لە بنەڕەتدا ئاماژە بە بەرتەنگی، رێککوشراوی [پەستاوتن] بکەن، بۆ وێنە نق بوونی بازار دەشێ بەو مانایە هاتبێ کە بەهۆی پڕانی و شلۆقی، بازارەکە (بەر)تەنگ بووە، واتا مرۆڤ هەستی بە رێککوشراوی کردووە. هەروەها نقانق لەبنەڕەتدا دەشێ بە مانای شتێکی پڕکراوی ئاخنراو و پەستیوراو بەکار هاتبێ. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ نگرین nıgrîn یان ↑ئەنگرین angrîn "تووڕە بوون"، anger (E.)، angra (ON.) "نارەحەتی، تووڕەیی"، eng (G.) "تەنگ"، Angst (G.)، angst (Nl.) "ترس" [دەبنەڕەتدا: بەرتەنگ بوون، تووشی تەنگەتاوی بوون]، angustus (L.) "تەنگ"، angustiae (L.) "بەرتەنگی، خەفەگی، گیر و گرفت"، ágchein (Gr.) "رێککوشین، خنکاندن" و هەروەها ↑خنکان xınkan سەر بە ریشەی < ***anĝh-** (**IE.**) "تەنگ، ریککوشراو". لە وشەکانی "نق" و "نقاندن" و "نگرین"دا دەشێ فۆتیمی سەرەتای ریشەکە سوابێتەوە. وشەیەکی دیکەش کە دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، ↑نقار nıqar "دڵ رەنجان، گلەیی، قار"ە. لێرەشدا وەک وشە ئەورووپییەکانی سەرەوە چەمکی "رێککوشراوی، بەرتەنگی" خۆی حەشار داوە.

[تیبینی: هەر سەبارەت بە پێوەندی ئەو چەمکانەی سەرەوە جێی ئاماژەیە کە وشەی "رەنج"ی کوردمادی بە مانای "زەحمەت، ئازار"، خزمە لەگەڵ ringen (G.) "خۆ ماندوو کردن، زۆرەوانی کردن" و wrigen (MG.) "با دان، رێککوشین". وەک دەبینین لێرەشدا چەمکەکانی "ئازار، زەحمەت، رەنج" پێوەندییان بە "کوشین" (وێکهێنان، بەرتەنگ کردن)ەوە هەیە].

**نقر nıqır** [ *nıqır* ] - "تیوانی ددانەکانی هەڕە و شانە، تیوانی پلەکانی پەیژە، تیوانی پلەکانی گەرماپێو": هەروەک لە ماناکانی وشەکە دەردەکەوێ، وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای ئەو قووڵاییە بووبێ کە لە تیوان ددانەکان یان پلەکانی شتێکدایە. دە زمانی کوردمادیدا بە داری هەڵکەندار، لەلە کراو یان قووڵکرا دەگوترێ نقرنقر کراو nıqrnıqr kıraw. ئەمەش دەگەڵ مانای ئەسڵی وشەکە یەک دەگرێتەوە و نیشان دەدا کە ئەم وشەیە پێوەندی بە چەمکی

"قووڵایی، قووڵ کردن"ەوە هەیە و بە تایبەتی بە مانای "قووڵایی" تیوان ددانەکان یان پلەکان بەکار هاتووە. دواتر مانای وشەکە لە قووڵایی تیوان پلەکانەوە پەرەی سەندووە بۆ خودی مانای "پلە و دەرەجە". دە زمانی کوردمادیدا ↑نقراندن nıqrandın بە مانای "نرخاندن" بەکار دێ کە دە ئەسڵدا بە مانای "پلە بۆ دانان، دیاری کردنی پلە و پایە" بووە. بە لەبەرچاو گرتنی وشەی "نقراندن" بیر بۆ ئەوە دەچێ کە وشەی ↑نرخاندن nırxandın شێوەیەکی گۆڕدراوی هەمان وشە بێ. ئەم وشانە دواجار پێوەندییان بە ↑ناخ nax ەوە هەیە بە مانای "قووڵایی". لەم تێڕوانینەوە وشەکان دەبێ ئەم مانایانەی خوارەوەیان یەک لەدوای یەک پەیدا کردبێ: ناخ، قووڵایی، قووڵ کردن، قوڵایی تیوان ددانەکان و پلەکان، پلە و دەرجە، دیاری کردنی پلە و دەرەجە واتا نقراندن کە دواتر گۆڕاوە و بووەتە نرخاندن.

**نقراندن nıqrandın** [ *nıqrāndın* ] - "نرخاندن": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑نقر nıqır.

**نقرس nıqrıs** - "جۆرێک نەخۆشی جمگەکان": نقرس neqres (P.). دەشێ پێوەندی هەبێ بە nekrose "مردنی بافتی لەش". ئەم وشە پزیشکییە دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر nekros (Gr.) "مردوو".

**نقرە nıqre** [ *nıqra* ] - "مەنجەڵی قووڵ": ↑نەقر neqır.

**نقورچ nıqurç** [ *nıqurč* ] - "سیخورمە": نەقورچ nequrç و ↑نقورچک nıqurçık یش دەگوترێ. هەروەها ↑نقووچاندن nıquçandın "نقورچک گرتن" هەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑نووک nuk، نەقیزە neqze و لەوانەشە↑نوکراندن nukrandın.

**نقول nıqul** - "کون، قووڵ": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نقووچاندن nıquçandın** [ *nıqūčāndın* ] - "نقورچک گرتن": ↑نقورچ nıqurç. پێوەندی هەیە بە هێندێک وشەی وەک ↑تیزە neze، ↑نەشتەر neşter و ↑نەقیزە neqîze و ئاماژە بە چەمکی "تیژی و بڕین و تێهەڵچەقین" دەکا. دە زمانی فارسیدا بۆ ئەم چەمکە وشە نیشگون nīšgūn (P.) بەکار دێ کە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە.

**نقە[1] nıqe** [ *nıqa* ] - "باقۆ، ماسی ئاوی قووڵ": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نقە[2] nıqe** [ *nıqa* ] - "دەنگی دە خۆ نووسان": نەقە neqe ش دەگوترێ و هەروەها نکە nıke ش دەگوترێ بە مانای "دەنگی نەفەس تەنگی". ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑نقاندن nıqandın "وێکهێنان، رێککوشین، تەنگ کردن"دا باس کراون. "نکە" لە فارسیدا بە "هن هن خستە و بیمار" مانا کراوەتەوە کە ئەمەش لەگەڵ ↑هانکە hanke [هانکەهانک]ی کوردمادی یەک دەگرێتەوە کە لە ئەنجامی ماندوو بوون و پشووسواریدا دروست دەبێ. لەوانەیە خزمیش بێ لەگەڵ ↑نکین nıkîn "ناڵین".

**نک1 nık** - لە نک واتا "لە لای، لەجەم" [دە بنەڕەتدا: لە تیزیک]. خزمە دەگەڵ ↑نیزیک nîzîk [کۆنتر: تیز nez].

**نک2 nık** - "بێچارە، هەناسەسارد": دەشێ پێوەندی بە ↑نزار nızarەوە هەبێ.

**نک3 nık** - لەگەڵ "نوێ" دێ و دەگوترێ نک و نوێ nık û nuwe "نرت و نوێ، نفت و نوی"].

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نرت nırt [نرت و نوێ]، واتا هەردوو وشەکە لە ریشەیەک سەرچاوەیان گرتبێ یان دوو شێوە بن کە لەوشەیەکی کۆنترەوە پەیدا بوون.

2- لە زمانی ئاڵمانیدا nagelneu (G.) بە مانای شتی زۆر نوێ (تازە لە قوتوو دەرهاتگ) بەکار دێ. ئەم وشەیە خۆی لە دوو وشەی Nagel "مێخ، بزمار" و neu "نوێ" دروست بووە و لە بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە کە شتێک تازە بزماری لێدراوە [تازە دروست کراوە). دەکرێ

شیمانەی ئەوەش بکەین کە وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشە ئەڵمانییەوە هەبێ. ئەگەر پێوەندییەکی ئەوتۆ ڕاست بێ، وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑نگ nıg "لاق، پێ".

**نکا nıka** [ *nıkā* ] - "مارەبڕین، مارەبڕان": لە زمانی عەرەبیدا نکاح nikāḥ (Arb.) دەگوترێ و دەشێ لە وشەی کوردمادی ↑نک[1] nık "تیزیک" وەرگیرابێ. لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی "نکا" دەبێتە "نیزیک کردن" یان "پێکگەیشتن"ی دوو کەس. شیاوی سەرنجە کە لە زمانی فارسیدا "نزدیکی کردن" بە مانای "جووت بوون لەگەڵ هاوسەر"یش بەکار دێ.

**نکاڵ nıkal** [ *nıkāl* ] - "لا، تەرەف": دەشێ پێک هاتبێ لە ↑نک nık "نیزیک، تەنیشت" + ↑ئاڵ al "لا". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "لاتەنیشت".

**نکل nıkıl** - "دندووک": نک nık [↑نووک nuk] + ل ıl. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. هەروەها نکلاندن nıkıladın هەیە بە مانای "دندووک لێدان".

**نکین nıkîn** [ *nıkīn* ] - "ناڵین": خزمە دەگەڵ ↑نووکە nuke و نووکاندن nukandın.

**نگ 1 nıg** - "کونی سیلەگرتنی تفەنگ و دەمانچە": خزمە لەگەڵ ↑نقول nıqul "کون، قووڵ".

**نگ 2 nıg** - "لاق، پێ": هەروەها ↑نێک nek هەیە بەمانای "ئێسکی ران". ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ ↑نینۆک nînok [لە بنەڕەتدا: ناخون naxun، دە وشەی "نینۆک" یان "نینۆخ"دا فۆتیمەکان جێگۆڕکێیان کردووە]. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -(IE.) *(o)nogh** "نینۆک، چەنگ، چەنگاڵ". لەم ریشەوە هەروەها وشە بە مانای "لاق، پێ" سەری هەڵداوە، بۆ وێنە لە زمانی رووسیدا nogot (Rus.) "نینۆک" و noga (Rus.) "قاچ" هەیە. لە زمانی سلاڤی کۆندا مانای "قاچ" و لە لاتینیشدا naga (L.) مانای "سم"ی پەیدا کردووە.

**نگا nıga** [ *nıgā* ] - "ئاگا لێ بوون": نگادار nıgadar یان نیگادار nîgadar واتا "ئاگاداریکەر، چاوەدێر"، لە فارسیدا نگهدار negahdār (P.). هەروەها ↑نیگا nîga بە مانای "چاو لێکردن، تەماشا" دێ کە دە زمانی فارسیدا دەبێتە نگاه negāh (P.). وشەیەکی دیکەش لە زمانی کوردمادی و فارسیدا پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە بریتییە لە نگریستن negarīstan (P.) "چاو لێکردن، نواڕین"، نوارین nıwarîn یان ↑تێرین nerîn و هەروەها ↑نیگەران nîgeran کە دەبێ لەبنەڕەتدا بە مانای "چاوەنوار، چاولەدوو" بووبێ [لە فارسیدا نگران negarān (P.)]. لە لایەکی دیکەوە لە زمانی کوردمادیدا ↑نیگار nîgar یان نگارە nıgare هەیە بە مانای "وێنە، نەخش، تەسویر" [ئەو شتەی چاوی لێ دەکرێ] و هەروەها ↑نگارین nıgarîn "وێنە کێشان، نەخش و نیگار کێشان، تەسویر کردن". دیسانەوە لە زمانی فارسیدا چەند وشە هەن کە ئەوانیش دەشێ لە پێوەندی لەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا بن، وەک انگ ang (P.) "نیشانە، هێما" و انگارە angāre (P.) "نەخشە، تەرح" و می انگارم mī angāram (P.) "بیر دەکەمەوە، (وا) بۆی دەچم" [لە بنەڕەتدا: (وا) دێنمە بەرچاو، تەسوور دەکەم]. لەم سێ وشەی دوایی زمانی فارسیدا پێشگر یان زێدەی a هاتووەتە سەر وشەکانەوە. ئەم کردارەی دوایی، چاوگەکەی لە زمانی فارسیدا دەبێتە انگاشتن angāštan (P.) و کرداری ڕابردووەکەی بۆ کەسی یەکەمی تاک دەبێتە انگاشتم angāštam (P.) "تەسوورم کرد، هێنامە بەرچاو". هەروەها لە زمانی فارسیدا نگاشتن negāštan (P.) هەیە کە بە مانای "نووسین، وێنە کێشانەوە" بەکار دێ و هەر ئەم وشەیەش لە زمانی عەرەبیدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووەتە نقش naqš و نقاش naqqāš (Arb.) و هتد. کاتێک چاو لە تێکڕای ئەم وشانە و ماناکانیان دەکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە بە گشتی دوو چەمک لەم ناوەدا خۆ دەنوێنن، یەکەم چەمکی "نیشانە، هێما، نەخش، وێنە..." [ئەو شتەی چاوی لێ دەکرێ، بە نیشانە دادەنرێ] و دووەم چەمکی "خستنە بەرچاو، چاوەدێری کردن،

هێنانە بەرچاو"، واتا بە کورتی دوو چەمکی "تەسویر" و "تەسوور". کاتێک ئەم وشانە لەگەڵ وشە هیندوئەورووپییەکاندا هەڵسەنگێنین، تووشی چەند وشەیەکی زمانی لاتینی دەبین کە ئەوانیش ماناکانیان وەک مانای وشەکانی سەرەوە دەچێ و رێگەمان پێدەدا کە ئەوان لەگەڵ وشە کوردمادی و فارسییەکان بە خزم دابنێین. هێندێک لەم وشە لاتینییانە بریتین لە nota (.L) "نیشانە، هێما، نمرە، بیرخەرەوە"، notare (.L) "نیشانە کردن، لەبەرچاو گرتن، ناساندن"، notarius (.L) "میرزا، دەبیر"، nobilis (.L) "ناسراو، رەسەن، بەناوو دەنگ" [خاوەنی ناو و نیشان]. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ noscere (gnoscere) (.L) "ناسین (شناسین)". بەم جۆرە تێکرای وشەکانی سەرەوە دەبنە خزم لەگەڵ ↑ناسین nasîn، نیشان nîşan و ↑نیشانە nîşane و چەندین وشەی دیکە. هەروەها بۆمان دەردەکەوێ کە وشەکانی "نیگا"، "نیگادار"، "نوارین"، تێرین" و "نیگەران" لەبنەڕەتدا پێوەندییان هەبووە بە چاو لێکردن، وەرگرتن و ئاگادار بوون لە "نیشانە"کان. وشەیەکی دیکە کە هەر لەم پێوەندییەدا جێی باس کردنە، ↑نتراندن nıtrandın ە بە مانای "1- چاوەنوارِی کردن 2- گوڵدۆزی کردن (نەخشاندن)". هەروەها ↑نتلاندن nıtlandın هەیە بە مانای "نەخشاندن". نتر مانای چاوەنۆڕی دەدا و نتل مانای "نەخش". کرداری "نتراندن" هەر دوو مانای "نوارین" و "نەخشاندن" [لەبنەڕەتدا: نیشان دان، خستنە بەرچاو، دانەزانین] دەگرێتە خۆ و ئەمەش پاڵپشتێکە بۆ پێوەندی هەموو ئەم چەمک و وشانە بەیەکەوە. لە وشەی "نوارین"دا ئەم گۆڕانکارییەی خوارەوەدا بەدی هاتووە: *نترین" ← نهێرین (نگارین) ← [گۆڕانی t بۆ h و دواتر بە g] ← تێرین ← نوارین. سەبارەت بە گۆڕانی t بۆ h چەندین نموونە هەیە، وەک وشەی "شار" کە پێشتر "شەهر" و پێشتریش "شەتر" بووە، یان مێر و مێهر و میترا، چارە و چێهرە و "چاترە"، هەروەها چار و "چهار"ی فارسی و "چەتۆر". جگە لەم وشانەی سەرەوە چەندین وشەی دیکەش لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن، وەک ↑نێد ned "نوخشانە"، ↑نوخشانە nuxşane، ↑ناتۆرە nator، نیتکە nîtke یان ↑نووتکە nutke [ناو و ناتۆرە یان ناو و نووتکە دە بنەڕەتدا واتا "ناو و نیشان".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "نیشانە" و "تەماشا کردن، چاو لێکردن" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی *مێزاندن* "تەماشا کردن". هەروەها سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "نیشانە" و "ئاگا لێبوون، پێزانین، تێگەیشتن، بە مێشک ئەسپاردن" هەڵی سەنگێنە لەگەڵ دوو وشەی ئەڵمانی Marke "نیشان، نیشانە" و merken بەو مانایانەی سەرەوە].

**نگارین nıgarîn** [ *nıgārīn* ] - "وێنە کێشان، نەخش کردن": لەژێر ↑نگا nıga "ئاگا لێ بوون" دا شی کراوەتەوە.

**نگرین nıgrîn** [ *nıgrīn* ] - "تووڕە بوون": خزمە دەگەڵ anger (.E) "تووڕەیی، جارس بوون" و Angst (.G) "ترس". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑خنکان xınkan و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تەنگ، تەنگاو بوون، رێکگوشران".

**نگە nıge** [ *nıga* ] - "تاسە، ئارەزوو": خزمە لەگەڵ ↑نیگا nîga "چاو تێبرِین" و دواتر ↑نگا *nıga* "ئاگا لێ بوون، چاو لەسەر بوون".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی ئەو دوو چەمکەی سەرەوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ "مرخ" یان "مەراق" بە مانای "ئارەزوو" کە خزمە لەگەڵ merken (.G) "ئاگا لێ بوون، زەین دان، سەرنج خستنە سەر"].

**نگین nıgîn** [ *nıgīn* ] - "1- نەقیم 2- بەخت، تاڵع": بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑نەجمە necme.

**نم1 nım 1** - ”تەڕایی، شێ“: نم nam (P.)، namb (Pl.). سەر بە ڕیشەی **< (IE.) *(e)nebh-** ”تەڕایی، هەوڕ و هەڵا، هەڵم“. ↑نەواڵ newal ”لافاوی توانەوەی بەفر لە چیا“ سەر بەم ڕیشەیە. دە زمانە خزمەکاندا ئەم وشانە لەم ڕیشەوە هاتوون: Nebel (G.)، nebul (OG.)، nevel (Nl.) ”هەور“، néphos (Gr.)، nephélē (Gr.) ”مژ، هەور“، nebula (L.) ”هەور، هەڵم، مژ“ و nimbus (L.) ”هەورەبەباران“.

**نم2 nım 2** - ”ئیلاقە کردن“: [تێبینی: وشەی ”ئیلاقە“ لە ”علاقە“ی عەرەبی وەرگیراوە بە مانای ”پێوەندی، ڕەبت“. لێرەدا مەبەست لە ”ئیلاقە“ پێوەندی سێکسییە]. وشەی ”نم“ دەشێ پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی **< (IE.) *(s)ne-** ”چنین، تەنین، هۆنین، گرێ *دان*“. nēma (Gr.) ”دەزوو“ و nemen (Gr.) ”چنراو، تەنراو“ لەم ڕیشەوە هاتوون.

[تێبینی: وشەی عەرەبی ”علاقە“ خۆی لە پێوەندی دایە یان وەرگیراوە لە ↑لکاندن lıkandın ”بەیەکەوە بەستنەوە“. وشەی ”لکاندن“ خزمە لەگەڵ ligare (L.) ”بەستن، بەستنەوە“ و ligament (L.) ”بەند، پێوەند“].

**نم3 nım 3** - ”کورت، کۆتا“: دەشێ پێوەندی هەبێ بە نیو nîw [نیم nīm (P.)]. ”نیو“ دەچێتەوە سەر ڕیشەیەك بە مانای ”بەش کردن، بەش وەرگرتن“. بەم شێوەیە مەبەست لە ”نیو“ سەرەتا ”بەش“ بووە، دواتر مانای ”پار، پارچە، لەت“ و دواجاریش مانای ”کورت، کۆتا“ پەیدا بووە کە پێوەندی بە پارچە کردن و لەت کردنەوە هەیە. لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ”قوڵە“ یان ”کۆتا“. ئەم دوو وشەیە دەچنەوە سەر دوو ڕیشە بە مانای ”بڕین، لێکردنەوە“.

**نمازە nımaze** [ *nımāza* ] - ”بەتایبەتی“: نەمازە nemaze و ناوازە nawaze ش دەگوترێن. وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ چەندین وشەی وەك نموونە nımune و نمودن nemūdan (P.)، نمایان nemāyān (P.)، نمایش nemāyeš (P.) و هتد. ئەم وشانە هەموو باس لە نیشان دان و بەرچاو بوون دەکەن. بەم پێیە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ ”بەرچاو“ [بەرچاوتر لەوانی دی، نموونە] بووبێ و پاشان ماناکە بۆ ”تایبەتی“ پەرەی سەندبێ.

**نمەد nımed** [ *nımad* ] - ”لباد“: نمد nemad (P.). جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ nēma (Gr.) ”دەزوو“ و nemen (Gr.) ”چنراو، تەنراو“، سەر بە ڕیشەی **< (IE.) *(s)ne-** ”چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان“. لەم تێڕوانینەوە دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑نم2 nım 2.

**نوار nuwar** [ *nuwār* ] - ”بەرکەڵ، نۆهگوان“: دەچێتەوە سەر ↑نوێ nuwe. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ نۆهگوان nohguwan.

**نوارین nuwrîn** [ *nuwārīn* ] - ”ڕووانین“: شێوەیەکی دیکە لە ↑تێرین nerîn. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑نگا *nıga*.

**نواڵ(ە) nuwal(e)** [ *nuwāl(a)* ] - ”1- شیوەڵەی بچووك لە قەدی چیا 2- شوێنی تاونەگر لە چیا، نسار“: نەواڵ newal، نهاڵ nıhal و نێل nel یش دەگوترێن. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی **< (IE.) *nitra-** ”نزم، نەوی، خوارەوە“. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑نالك nalık ”سۆل، کەوشی تەخت و بێ پاژنە“ و دواجار ↑ناخ nax.

**نواڵە nuwale** [ *nuwāla* ] - ”بابۆڵەهەویر کە بە ئاژەڵ دەدرێ“: هەروەها نواڵە کردن nuwale kırdın هەیە بە مانای ”پێچانەوەی بابۆڵە و شتی دیکە“. نوردیدن navardīdan (P.) ”پێچانەوە“. وشەی ↑نەوار newar ”بەندی پێچراو، هەڵوێزراو“ پێوەندی بەم وشەوە هەیە. لە زمانی فارسیدا ”نوردیدن“ مانای ”گەڕان“ و ”سەفەرکردن“یش دەدا. لێرەشدا چەمکی ”سووڕان و خولانەوە“ بەدی دەکرێ. [جێی سەرنجە کە وشەی ”سەفەر“ خۆی خزمە لەگەڵ سووڕان (زڤرین)]. کەوابوو

وشەکە دە بنەڕەتدا هەڵگری مانای "سووڕان، پێچرانەوە"یە. لەناو وشەکانی زمانی ئەڵمانیدا من وشەیەکم پەیدا نەکرد کە بتواندرێ دەگەڵ ئەم وشە کوردمادییە هەڵبسەنگیندرێ. لەوانەیە وشەکە لە ئەسڵدا لە دوو کەرت پێک هاتبێ و کەرتی سەرەکی وشەکە شتێک بووبێ وەک *"وارین* *warîn*" یان *"واڵین* *walîn*". وشەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی دیکە یەک دەگرێتەوە، وەک ↑وەرانین weranîn "پێچانەوە، تێ پێچان" یان ↑وێڵ wel "سەرگەردان".

**نواندن1 nuwandın** [ *nuwāndın* ] - "نیشان دان، بە دیار خستن": نمودن nemūdan (P.). ↑نموونە nımûne پێوەندی بەم وشەوە هەیە. مانای بنەڕەتی وشەی "نموونە" دەبێ "نیشانە، شێوە" بێ، واتا شتێک کە خۆی بەدیار دەخا. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ nehmen (G.)، niman (OE.)، nema (OIs.) "(هەڵ)گرتن"، némein (G.) "بەش کردن، بەش بۆ دیاری کردن، بەش نیشان دان"، سەر بە ریشەی **< *nem-** ***(IE.)*** "بەش کردن، (بەش) بۆ دیاری کردن". وشەی ↑نیو nîw لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: وەک دەبینین لێرەدا پێوەندییەک دروست بووە لەتێوان مانای ریشەکە و مانای دواتری "دیار خستن، نیشان دان" و هەروەها "نیشانە". ئەم پێوەندییە دەتوانین دەگەڵ دوو وشەی عەرەبی "تعیین" بە مانای "دیاری کردن" و "عنوان" بە مانای "ناو و نیشان" هەڵسەنگینین. هەروەها دەتوانیین هەڵی سەنگینین لەگەڵ وشەی annehmen (G.) "تەسەوور کردن، پێ وا بوون". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە لەگەڵ وشەکانی سەرەوە و لەمیشدا چەمکێک دیارە کە بریتییە لە "نیشانە، شێوەیەک" کە لەهزردا دروست دەبێ (خۆ دەنوێنی)].

**نواندن2 nuwandın** [ *nuwāndın* ] - "داهێنانەوە، نزم کردنەوە": ↑نەواندن newandın.

**نوت1 nut** - "ڕشک، گەرا یان تۆوی ئەسپێ": خزمە لەگەڵ Niss (G.)، neet (Nl.)، nit (E.) "ڕشک، گەرای ئەسپێ". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ konís (Gr.)، gnet (Sw.)، gnida (Rus.) "ڕشک". بە گوێرەی بۆچوونێک ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -k(o)nid** ***(IE.)*** "ڕشک، ئەسپێ". بەپێی بۆچوونێکی دیکە وشەکان لەپێوەندی لەگەڵ هێندێک کردار لە زمانە هیندوئەورووپییەکاندان کە مانای "خوراندن، گەستن، پێوەدان" دەبەخشن.

**نوت2 nut** - "زۆر تازە": [لەبنەڕەتدا: تازە ڕسکاو، ساوا]. خزمە لەگەڵ ↑نۆتل notıl.

**نوتنە nutne** [ *nutna* ] - "گەرا، تۆوی ماسی و زیندەوەری بچووک": بڕوانە ↑نوت1 nut.

**نوخاف nuxaf** [ *nuxāf* ] - "بووردن، بەخشین": هەروەها نوخافتۆخ nuxaftox هەیە بە مانای "گوناهبەخش". لەوانەیە ئەم وشەیە پێوەندی بە هەبێ بە ↑نوخافتۆر nuxaftor و ↑نخفتن nıxıftın "داپۆشین، شاردنەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێ لە بنەڕەتدا مەبەست "داپۆشینی هەڵە و گوناه" بێ، هەروەک چۆن باس لە "داپۆشینی عەیب و عار" دەکرێ.

**نوخافتۆر nuxaftor** [ *nuxāftor* ] - "خۆ گومکەر، ئەوەی خۆ لە فەرمانی میر دەدزێتەوە": خزمە لەگەڵ ↑نخافتن nıxaftın "خۆ داپۆشین بە لێفە" و ↑نخفتن nıxıftın "داپۆشین، شاردنەوە". دە بنەڕەتدا "نوخافتۆر" ماناکەی دەبێتە "خۆوەشێر، خۆ حەشاردەر".

**نوخاندن nuxandın** [ *nuxāndın* ] - "نخوون کردنەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑نخوون nıxun کردنەوە.

**نوڕ nur** - "بەراوەژوو": خزمە لەگەڵ Nord (G.)، north (E.)، norr (Sw.) "باکوور". وشە ژێرمەنییەکە خزمە لەگەڵ nérteros (Gr.) "خوارترەکە، نزمترەکە"، سەر بە ریشەی **< -*ner** ***(IE.)*** "خوارەوە". وشە ژێرمەنییەکە لە بنەڕەتدا ئاماژە بووە بە "نزم بوونەوە و هاتنە خوارەوەی خۆر [داکشان و ئاوا بوون]، بە پێچەوانەی ئەو وشەی کە لەم زمانانەدا بە مانای

"باشوور" بەکاردێ و ئاماژە دەکا بە "بەرز بوونەوە و هەڵکشانی خۆر". سەبارەت بە مانای وشە کوردمادییەکە، جێی ئاماژەیە کە لەتیوان دوو چەمکی "خوار، خوارەوە" و "بەراوەژوو"دا پێوەندی هەیە، واتا لە بنەڕەتدا شتێك سەرەوبن کراوە و لەمەوە مانای "بەراوەژوو"پەیدا بووە. ئەم پێوەندییە لە وشەی "وارونە"ی فارسیشدا بەدی دەکەین کە مانای "بەراوەژوو" دەدا و خزمە لەگەڵ "خوار، خوارەوە" و *وەرین* "کەوتنەخوار". وشەی ↑نوراشتن nuraştın "دانوشتاندن، قەد کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و ئەم کردارە لە بنەڕەتدا ئاماژەی بە "داهاتنەوە (بۆ لای خوارەوە)" کردووە.

**نوراشتن nuraştın** [ *nurāštın* ] - "دانوشتاندن، قەد کردن": خزمە لەگەڵ ↑نوڕ nur "بەراوەژوو".

**نوستن nustın** - "خەوتن": ئەم وشەیە بە پێچەوانەی هێندێك بیر و ڕا لە وشەی عەرەبی نوم nawm (Arb.) وەرنەگیراوە، وشەیەکی کۆن و رەسەنی کوردمادییە و دەبێتە خزم دەگەڵ nafzen (G.)، napfen (MG.)، hnappian (OE.)، nap (E.) "نووستن، خەو بردنەوە". هەروەها دەگەڵ غنوودن ġanūdan (P.) "خەوتنێکی سووك و ئارام". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان دیاری نەکراوە. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا دەشێ شێوەی کۆنی وشەکە **(he)nev(s)ten* بووبێ، چەند گۆڕاتیکی بەسەرداهاتبێ و لێرەوە چەندین وشە دروست بووبن، وەك ئەوانەی سەرەوە و هەروەها ↑هەنژین henjîn "رازان، خەوتن" و ↑وەنەوز wenewz "خەو بردنەوە" [گۆڕانی h بۆ w]. دوور نییە وشە عەرەبییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. لە وشەی "وەنەوز" دا فۆتیمی سەرەتای وشە کۆنەکە گۆڕاوە و بووەتە w ["هەنەوز" ← وەنەوز].

**نوسك nusk** - "پاڵ، دەلەك": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Niete (G.) "مێخێك کە سەری پەرچ دەکرێتەوە یان پان دەکرێتەوە"، pi- hniutan (OG.) "قایم کردن"، hnjōđa (OIs.) "لێدان، کوتان"، nieten (MG.) "پەرچ کردنەوە یان پان کردنەوەی مێخ". لە زمانی کوردمادیدا ↑نووژین nujîn "کون کردن، سمین" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "لێدان" و "تەکان، پاڵ" دەکرێ ئاماژە بە وشەی *ژەندن* "راتڵەکاندن" کە دەبێتە خزم دەگەڵ *زەنگن* "پاچ، کولینگ"].

**نوسکاندن nuskandın** [ *nuskāndın* ] - "ناڵین بە دەنگی کز": شێوەیەکی دیکە لە ↑نووزاندن nuzandın.

**نوغرۆ nuġro** - "رۆچوونی هەرد": نهۆرم nıhorm یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑نوقم nuqım و دواتر ↑*ناخ nax*.

**نوفت nuft** - "کەپۆ، لووت، بێڤڵ": خزمە لەگەڵ Nippel (G.) "قیتکە"، nipple (E.) "گۆپکەی مەمك". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر neb (E.)، nib (E.) "دەنووك".

[تێبینی: جێی ئاماژەیە کە "لووت" و "لوتکە" پێکەوە خزمن، هەر وەك "دوند" و "دەنووك"یش. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە "قیت بوون" دەکەن].

**نوقار nuqar** [ *nuqār* ] - "1- گیانداری ژێرئاو 2- ژێر دەریایی": بڕوانە ↑نوقم nuqım.

**نوقان nuqan** [ *nuqān* ] - "نوقم بوون": بڕوانە ↑نوقم nuqım.

**نوقرسك nuqırsık** [ *nuqırsık* ] - "بەلادا هاتنی سەر لەبەر خەو هاتن": دەشێ پێك هاتبێ لە بنجی نوق -noq + ناوگری r + پاشگری گچکاندنی سك: nuq + r + sık. کەرتی نوق -nuq خزمە دەگەڵ ↑نخ nıx "بەچوکداهاتنی وشتر"، ↑نۆخ nox "پشت چەماو" و ↑*نخوون nıxûn* "وەرگەڕان".

ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە، داهاتنەوە" شیاوی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیشدا Nickerchen (G.) بە مانای "سەرخەو شکاندن، سووکەخەو، چۆرت" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

**نوقرە nuqre** [ *nuqra* ] - "زیو": نوقرا nuqra ش دەگوترێ. نقره noqre (P.) "زیو". دەچێتەوە سەر *Nickel* "ناوی کانزایەک". ئەم وشەیە ریشەی سوێدی هەیە و دەچێتەوە سەر *kopparnickel* (*Sw.*). وشە سوێدییەکە خۆی لە دوو وشەی koppar "مس" و nickel پێک هاتووە. ئەم کانزایە رەنگ و وێنەکەی لە مس چووە، بەڵام کانکارەکان نەیانتوانیوە مسی لێ بەدەست بهێنن و لایان وابووە کە جنۆکەیەک بە ناوی "نیکل" دەستی لەم کارەدایە و ناهێڵێ کانزاکە مسی لێ بەرهەم بهێنرێ. "نیکل" ناوێکی پیاوانەیە کە دراوە بەو جنۆکەیە کە ئەویش خۆی شێوەیەکی بچووککراوە لە ناوی Nikolaus .

**نوقڵ nuqıl 1** - "شەکرۆکەی رەق کە دەمژرێ یان دەکرۆژرێ": نقل noql (P.). بنەوشەی -nuq جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ nagen (G.)، (g)nagan (OG.)، gnaw (E.)، gnaga (Sw.) "وردە وردە بە ددان لێکردنەوەی خواردنی رەق"، aiwī-ynixta (Av.) "جووتراو"، سەر بە ریشەی > *(IE.) *gh(e)ne-* "خواردن، جووتن".

**نوقڵ nuqıl 2** - "قووڵایی لە زاراوەی بەننایاندا": خزمە لەگەڵ خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax.

**نوقم nuqım** - "ژێرئاوچوو": نقوم nıqum یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax.

**نوکراندن nukrandın** [ *nukrāndın* ] - "1- هەڵکۆڵین لەسەر دار و بەرد 2- بیراز کردنی بەرداش":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشە وەک ↑نکل nıkıl "دندووک"، ↑نووک nuk و ↑تیزە neze و هتد.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑نقر nıqır [نقرنقر واتا لەلە کراو].

**نونو nunu** - "تازەتازە": نینی nînî ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑نوێ nuwe [نوو nu].

[دە زمانی فارسیدا نینی nīnī (P.) بە مانای "زارۆکی ساوا، بەبە" بەکار دێ و لەوانەیە لەبنەڕەتدا مەبەست "نونو"ی کوردمادی بووبێ واتا شتێک یان گیانلەبەرێک کە *تازەتازە* پەیدا بووە. سەبارەت بە پێوەندی چەمکی "نوێ" و "بەدی هاتن" بڕوانە وشەی "تازە"].

**نوهال nuhal** [ *nuhāl* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑نواڵە nuwale. خزمە لەگەڵ ↑نالک nalık "سۆل، کەوشی تەخت و بێ پاژنە".

**نوهتن nuhtın** - "سمین": خزمە دەگەڵ ↑نۆژ noj "سمین".

**نوهلیک nuhlîk** [ *nuhlīk* ] - "دۆشەک": خزمە لەگەڵ ↑نالک nalık "سۆل، کەوشی تەخت و بێ پاژنە".

**نوێ nuwe** [ *nuwe* ] - "تازە": nu ش دەگوترێ. نو nou (P.)، neu (G.)، new (E.)، ne (OF.)، navya (OIn.)، neios (Gr.)، noujas (Lit.)، néos (Gr.)، novus (L.)، novyj (Rus.) سەر بە ریشەی > *(IE.) *nouio-, *neuio-* "نوێ".

**نوێن nuwen** [ *nuwen* ] - "پێخەو": خزمە دەگەڵ ↑نووستن nustın "خەوتن".

**نووتەک nutek** [ *nūtak* ] - "تاریکایی خەست " [تاریک و نووتەک]. خزمە دەگەڵ Nacht (G.)، night (E.)، natt (Sw.)، nak (OIn.)، nox (L.)، noč (Rus.) "شەو"، سەر بە ریشەی > **nok(t)-* *(IE.)* "شەو". خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑ناخر naxır "رەوەی شەوبەکیو" و لەوانەشە ↑نیسێ nîse. ئەم وشانە باس لە چەمکی شەو بوون یان رەش و تاریک بوون دەکەن.

**نووچ 1 nuç** *[ nūč ]* - "سووچی لێفه و کراسی و هتد": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑نووک nuk.

**نووچ 2 nuç** *[ nūč ]* - "1- چەم، قەد 2- رەت، ساتمە": بڕوانە ↑نووچان(ەوە) nuçan(ewe).

**نووچان(ەوە) nuçan(ewe)** *[ nūčān(awa) ]* - "نووچ دان، نووشتانەوە، قەد بوون": هەروەها ↑نووچ nuç "1- چەم، قەد 2- رەت، ساتمە" هەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑نسکۆ nısko و ↑نووشتانەوە nûştan(ewe).

1- لە لایەکەوە knicken (G.)، kneikja (OIs.) "نووچانەوە، قەد بوون" سەر بە ریشەی **< *gen-** *(IE.)* "با دان، چەمان".

2- لە لایەکی دیکەوە neigen (G.)، hneigan (OG.)، neigen (Nl.)، hngen (OE.)، hneigan (OIs.) "داهاتنەوە، خوار بوونەوە، چەمانەوە"، سەر بە ریشەی **< * kneigh-** *(IE.)* "نەوین، چەمانەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها nicken (G.) و nücken (MG.) هەن کە پێوەستن بەم وشانەی سەرەوە و دۆخی جەخت کردن نیشان دەدەن.

**نووچە nuçe** *[ nūča ]* - "دەنگوباس": دەبێ لە رووی وشەی news (E.) ی ئینگلیزی داتاشرابێ و لە دوو کەرتی نوو nu [↑نوێ nuwe] + چە [↑چوون çun] پێک هاتبێ. تێکڕای وشەکە واتا ئەو شتەی بە تازەیی دەرباز بووە و رووی داوە.

**نوورە nure** *[ nūra ]* - "1- گریان بە دەنگی زبر و ناخۆش 2- قیژەی سەگ و پشیلە": خزمە دەگەڵ ↑نەڕاندن nerandın.

**نووزاندن nuzandın** *[ nūzāndın ]* - "ناڵاندن بە دەنگی کز و ناڕوون": نووزە nuze و هەروەها نووز nuz یش هەیە [ناز و نووز naz u nuz]. نیزە nîze ش دەگوترێ. هەروەها نیسکە nîske هەیە بە مانای "نووزەی سەبری تاژی لە خۆشیان" [تاژی نیسکەنیسکیانە]. خزمە دەگەڵ nuscheln (G.)، nuseln و näseln (G.) "گن قسە کردن، دە لووتدا قسە کردن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچێتەوە سەر Nase (G.) "لووت". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ ↑هەناسە henase و ↑هەنیسک henîsk و ↑نزگەرە nızgere.

**نووژین nujîhn** *[ nūžīn ]* - "کون کردن، سمین": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Niete (G.) "مێخێک کە سەری پەرچ دەکرێتەوە یان پان دەکرێتەوە"، pi- hniutan (OG.) "قایم کردن"، hnjōđa (OIs.) "لێدان، کوتان"، nieten (MG.) "پەرچ کردنەوە یان پان کردنەوەی مێخ".

**نووسان nusan** *[ nūsān ]* - "لکان، چەسپان": لەوانەیە بەم جۆرە پێک هاتبێ: پێشگری نێ ne [نی ] + بەستن bestın ؟. بەم پێیە گۆڕانی وشەکە دەتوانێ بەم جۆرە بووبێ: "تیبەستن" ← "تیوەستن" ← نووسان. ئەم پێشگرە دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبیندرێ، وەک "دانیشتن".

**نووشتانەوە nûştan(ewe)** *[ nūštān(awa) ]* - "قەد بوون، نووچ دان": بڕوانە ↑مووچاندن mûçandın "داهێنانەوە، چەماندنەوە".

**نووشتە nûşte** *[ nūšta ]* - "دووعای قەدکراوی دە بەرگ گیراو": بە دوو جۆر دەکرێ لێکی بدەینەوە:

1- خزم دەگەڵ ↑نووسین nusîn [نوشتن neveštan (P.)] و مەبەست لێرەدا "دووعا نووسین"ە.

2- خزم دەگەڵ ↑نووشتانەوە nûştan(ewe) "قەد بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێ قەد کردنی چەند جارەی نووسراوەکە مەبەست بێ.

**نووقاندن nuqandın** *[ nūqāndın ]* - "قووچاندن، بەستنی چاو": بڕوانە ↑نقاندن nıqandın "وێکهێنان، رێککوشین".

[تێبینی: "نووقاندن" دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تەنگ بوونەوە"، هەر بەم شێوەیە "قووچاندن"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "گچکە بوونەوە"].

**نووك nuk** *[ nūk ]* - "تیژایی هەرە پێشەوە": نیك nîk یش دەگوترێ. نوك nok (P.).

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نینۆك nînok سەر بە ریشەی **< -nogho* (IE.)** "نینۆك، چەنگاڵ، چنجرووك". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ تیزە neze، ↑نەقیزە neqîze، ↑نەشتەر neşter و هتد.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ چەند وشەیەکی ژێرمەنی وەك Nocken (G.) "دەرپەڕیوی، قیتایی"، Nock (G.) "جەمسەری ئەو دارەی کە بادەوانی کەشتی لێ دەبەسترێ"، nok (Nl.) و nocke (Sw.) "نووك، دوند" و Nuckel (G.) "گوپکەی مەمك (نووکی مەمك)". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان ساخ نەکراوەتەوە.

**نووکە1 nuke** *[ nūka ]* - "دەنگی کزی ناقایل بوون": وەك کردار دەبێتە نووکاندن nukandın "نووکە نووك کردن". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ nucken (MG.) "ناقایلی دەربڕین". هەروەها بەراوردی بکە دەگەڵ ↑نقە² nıqe [نەقە] "دەنگی دە خۆ نووسان".

**نووکە2 nuke** *[ nūka ]* - "ئێستا": شێوەیەکی دیکە لە ↑نها nıha و ↑هەنووکە henuke.

**نوون1 nun** *[ nūn ]* - "کەمایەسی": [نوون لە چاوی مندا بێ، لەودا نییە]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کنۆس kınos سەر بە ریشەیەك بە مانای "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، کڕاندن". دەشێ "نوون" بە مانای "زەدە" یان "دارووشاوی" بێ. لە زمانی فارسیدا بۆ ئەم مەبەستە وشەی "سایيدگی" بەکار دەهێنرێ کە ئەویش خزمە لەگەڵ "سوانەوە" بە مانای رێخشاندن.

**نوون2 nun** *[ nūn ]* - "هوردترین شت، زەڕڕە": وشەی "هورد" [ورد] پێوەندی هەیە بە "هاڕین" کە ئەویش خۆی لەریشەدا مانای "رێخشاندن، ساوین" دەبەخشێ، واتا بەهۆی رێخشاندن و ساوینەوە بۆ وێنە دەخڵ و دان هاڕدراوە. لەم تێروانینەوە وێ دەچێ کە وشەی "نوون²"یش پێوەندی هەبێ بە ↑نوون1 nun.

**نۆ1 no** - "ژمارەی نۆ": نە noh (P.)، neun (G.)، niun (Gt.)، nine (E.)، nio (Sw.)، nava (L.)، novem (L.)، ennea (Gr.)، noi (OIr.)، nigum (OF.). گومان دەکرێ ئەم وشەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نوێ nuwe "تازە". بە پێی ئەم بۆچوونە مرۆڤەکانی کەونارا لە کاتی ژماردن بە قامکەکان، قامکە گەورەکانیان نووشتاندۆتەوە و بە هەشت قامك ژماردوویانە و کاتێك هەشت قامکەکان تەواو بوون، لە "نوێ"وە دەستیان پێ کردۆتەوە و لەبەر ئەوە ناوی ئەم ژمارەیان ناوە "نۆ".

**نۆ2 no** - "1- دڕ 2- شەڕانی 3- هارو هاج 4- تامی تیژ": چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەم مانایانەدا "دڕین، بڕین"ە. بەم پێیە لەوانەیە وشەکە خزم بێ لەگەڵ ↑نوهتن nuhtın و ↑نوژ nuj "سمین".

**نۆتك1 notık** - "ناوکی میوە": خزمە لەگەڵ Nuß (G.)، noot (Nl.)، nut (E.)، nöt (Sw.)، nux (L.)، cnū (Ir.) "(ناوکی) گوێز، فندق و پستە". هەروەها وشەی nucleus (L.) "ناوکی میوە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ریشەی ئەم وشە ئەورووپییانە باس نەکراوە. لەوانەیە پێوەندی بە ↑نۆتك2 notık ەوە هەبێ.

**نۆتك2 notık** - "رشك، گەرا یان تۆوی ئەسپێ": ↑نوت¹ nut یش دەگوترێ.

**نۆتل notıl** - "وەکی، لەوێنەی، لەگوێن": لە زمانی ئینگلیزیدا kind (E.) مانای "جۆر، گۆن، گوێن" دەبەخشێ. Kind (G.) لە زمانی ئەڵمانیدا مانای "زارۆك" دەدا و ئەمەش خزمە لەگەڵ ↑گەنج genc "لاو" [فۆتیمی د d گۆڕاوە بە ج c، ئەمە لەوشەی"کرمانج" و چەند وشەیەکی دیکەشدا

بەدی دەکرێ]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -(IE.) *ĝen(e)** "زان" [دواتر هەروەها "بەر(هەم) هێنان"]. وشەکانی natio (.L) "لەدایك بوون، بە دنیا هێنان، رەگەز، تۆرەمە، نەتەوە"، natus (.L) "لەدایك بوو، زارۆك" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. لەم وشانەدا فۆتیمی g ی سەرەتای ریشەکە، کە لە زمانی لاتینی کۆندا هەبووە، سواوەتەوە. ئەم وشانە هەروەها خزمن لەگەڵ gens (.L) و genus (.L) "جینس، جۆر، رەگەز" [وشەی "جنس" لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێتەوە]. بەم شێوەیە وشەکە دواجار دەبێتە خزم لەگەڵ ↑زان zan. هەروەها ئەم وشانە دەبنە خزم لەگەڵ ↑نوت² nut یان ↑نفت nıft "زۆر تازە" [تازە رسکاو].

[تێبینی: هەر سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "زان، لەدایك بوون، بەرهەم هێنان" و "جۆر، جینس، رەگەز" دەتوانین ئاماژە بە وشەی "توخم" بکەین کە لە زمانی کوردمادیدا بە مانای "عونسور، رەگەز"یش بەکار دەهێنرێ].

**نۆتە note** [*nota*] - "پاشەکەوت": شێوەیەکی تازەتر لە ↑نیاتە nıyate.

**نۆخ nox** - "پشت کووڕ": خزمە دەگەڵ ↑نخ *nıx* "بە چۆکداهاتنی وشتر"، ↑نخین nıxîn "چەماو، سەردانەواندوو" و ↑نخوون nıxûn "وەرگەڕاو"، ↑نخوماندن nıxûmandın "نخوون کردن، بەراوەژوو کردن" و هەروەها ↑نهۆم nıhom "قات". جێی سەرنجە کە وشەی "قات" خۆی خزمە دەگەڵ "قەد" [قەد کردن] و ئەمەش پێوەندی هەیە دەگەڵ چەمکی چەمانەوە و داهاتنەوە، بۆ وێنە بە چۆکداهاتنی وشتر جۆرێك لە قەد بوونی لاقەکانی وشتر نیشان دەدا، یان کەسێك کە پشتی زۆر چەمابێتەوە، وەك ئەوە وایە لەشی دوو قەد بووبێتەوە. نهۆم یان نوهۆم nuhom جگە لە مانا "قات"ی خانوو، مانای "زگ دان"ی دیواریش دەدا. لێرەدا بەتەواوی مانای بنەڕەتی وشەکە، واتا "چەمانەوە" و پێوەندی ئەم مانایە بە مانای "قەد، قات" دەردەکەوێ.

**نۆز noz** - "دیسان، سەر لە نوێ": خزمە دەگەڵ ↑نوێ nuwe.

**نۆژ noj 1** [*nož*] - "سمین، کون کردن": ↑نووژین nujîhn "کون کردن، سمین".

**نۆژ noj 2** [*nož*] - "گەنە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نۆژ noj 1 "کون کردن".

2- لەوانەشە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گەنە gene و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

**نۆسکە noske** [*noska*] - "زارۆی نۆبەرە": نۆزکە nozke و نوزگە nozge ش دەگوترێن. وشەکە بەم جۆرە پێك هاتووە: نۆ no + سکە sıke [سك sık، زگ zıg]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی بە "سك" پەیدا دەکا. وشەی سك دە زمانی کوردیدا، لەپاڵ مانا ئەسڵییەکەی، هەروەها ئاماژە بە ئاوس بوون و بە دنیا هێنانی زارۆك دەکا. بۆ وێنە دەگوترێ "ئەو ژنە هەفت سکی کردووە" واتا هەفت زارۆکی بە دنیا هێناوە. ئەمجار کەرتی نۆ no شێوەیەکی دیکەیە لە ↑نوێ nuwe [نوو nu]. کەرتی "نۆ" دە وشەی "نۆبەرە"شدا دەبینرێ و هەمان مانا بە دەستەوە دەدا. ئەم وشانە لەباری ماناوە هەروەها دەگەڵ نخری "نۆبەرە" هەڵسەنگینە [نخری، دەبنەڕەتدا: نۆکۆڕ].

[تێبینی: وشەی "نوێ" مانای "تازە" دەبەخشێ، کەچی وشەکانی نۆبەرە و نوسکە ئاماژە بە زارۆکی یەکەم دەکەن کە لەراستیدا کۆنترین زارۆکە! "نۆ" لەم وشانەدا ئاماژە بە "یەکەم جار" بوون دەکا، چونکوو شتێك کە یەکەم جار روودەدا، وەك شتێکی نوێ دێتە ئەژماردن].

**نۆش noş** [*noš*] - "پێکەوتن و بە گیان خۆش بوون": نوش nūš (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ genießen (.G) "چێژ وەرگرتن، نۆش کردن"، nēotan (.E)، niāta (.OF)، njuta (.Sw) "چێژ و

بەهرە وەرگرتن"، nutzen (G.) "کەڵك و قازانج وەرگرتن"، سەر بە ریشەی < *neud- (IE.) "وەرگرتن، بە دەست هێنان".

[تێبینی: فۆتیمی d/ t دە وشە کوردمادییەکەدا بووەتە ş. گۆڕاتیکی نیزیك لەمە دە وشەی نسیس nısîs یشدا دەبینرێ، بە مانای "ئاو دانی زەوی بەر لە چاندن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ netzen (G.) "تەڕ کردن"].

**نۆف nof** - "جۆرێك پێڵاوی سووك 2- پینەی پێڵاو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *(s)ne- (IE.) "چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان" و خزم بێ لەگەڵ ↑چنین1 cınîn. وشەکانی Naht (G.) "تەقەڵ" و nēma (Gr.) "چنراو، تەون" لەم ریشەوە هاتوون.

**نۆق[1] noq** - "1- خاڵیگە، کەلەکە 2- نوقم": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی". ئەو بەشەی لەش لەوانەیە بۆیە پێی گوترابێ نۆق، چونکوو قووڵاییەك پێك دێنێ لە تێوان دوو بەشی سەرەوە و خوارەوەی لەشدا.

**نۆق[2] noq** - "کەمەر":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە "نووشتانەوە" دەکەن، وەك ↑نۆخ nox "پشتکووڕ، پشت چەماو" و ↑نخین nıxîn "داهاتنەوە، خوار بوونەوە". لەم تێڕوانینەوە "نۆق" ئەو شوێنەی لەشە کە دەچەمێتەوە و قەد دەبێتەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ ↑نۆق[1] noq "1- خاڵیگە، کەلەکە".

**نۆقڤان noqvan** [ *noqvān* ] - "مەلەوانی ژێرئاو، غەوواس": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نۆك nok** - "دانەوێڵەیەکە": نخە nıxe و نخۆ nıxo ش دەگوترێ. نخود noxod (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ nucleus (L.) "ناوکی میوە"، nux (L) "بەر و بۆمی وەك گوێز و فندق"، nucatum (vL.) "ماجوومی گوێز و فندق". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑نەختێك nextek هەیە بەمانای "کەمێك" کە پێوەندی بەم وشەوە پەیدا دەکا. "نەختێك" واتا چکۆڵە و کەمووسکە بە ئەندازەی نۆکێك.

**نۆکەر noker** [ *nokar* ] - "خزمەتکاری پیاو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نۆخ nox "پشتکووڕ، پشت چەماو" و ↑نخین nıxîn "گوڵەشلێرە" و↑نخوون nıxun [نخووم nıxum] "ئاوەژوو، وەرسووڕاو". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "چەمانەوە، داهاتنەوە" دەبەخشن. لەم تێڕوانینەوە "نۆکەر" واتا ئەو کەسەی لەبەر دەم گەورەی خۆیدا دەچەمێتەوە یان سەر دا دەنەوێنێ.

**نۆگها nogıha** [ *nogıhā* ] - "تازەلاو": نۆ + گها no + gıha. کەرتی نۆ واتا ↑نوێ nuwe "تازە". کەرتی گها gıha- دەچێتەوە سەر کرداری ↑گەیشتن geyıştın [گەهیشتن gehîştın]. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "تازە(پێ)گەیشتوو".

**نۆڵ nol** - دەگەڵ نەرم دێ [نەرم و نۆڵ nerm u nol]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە nullus (Gr.) "گچکە، وردیلە". شیاوی باسە لە تێوان دوو چەمکی "وردی" و "نەرمی"دا پێوەندی نیزیك هەیە، وەك چۆن شتی وردی لە چەشنی خۆڵ، خاکە، ئارد کە بەرهەمی هاڕین و ورد بوونن، لە هەمان کاتیشدا نەرمن.

**نۆنۆڵە nonole** [ *nonola* ] - "زەلامێك کە ئاکاری منداڵانەیە": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ننر nonor (P.) "بەدئاکار، بەزمگر، نازنازی". وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ↑نا na [نە ne] و مەبەست ئەو زارۆکانە بن کە بەردەوام "نا" دەڵێن و هەڵوێستی نەرێنی دەگرن.

**نۆهگوان nohguwan** [ *nohguwān* ] - "مانگای سێ ساڵە": تینگوون nengun یش دەگوترێ. دەشێ نۆە noh [↑نوێ nuwe] + ↑گوان guwan بێ بە مانای "تازە گوان دەرکردوو".

**نها nıha** [ *nıhā* ] - "ئێستا": نووکە nuke و هەنووکە henuke ش دەگوترێ. اکنون aknūn (.P)، خزمە دەگەڵ nun (.G)، nu (OG.) و (.OE)، now (.E)، nu (.OIn)، nū (.Sw)، (.Lit) و (.OIr)، ny (.Gr) سەر بە ریشەی **(IE.) *nū- >** "نها، نووکە". بەم پێیە وشەی نها nıha دەبێ کۆنتر "نووها nuha" بووبێ. کەرتی نوو nu دە وشەی نووکە nuke دا پارێزراوە.

**نهار nıhar** [ *nıhār* ] - "شیوەن": نەهار nehar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑نارین narîn "گۆرانی خەمبارانە".

**نهاندن nıhandın** [ *nıhāndın* ] - "جووت بوون لە گەڵ ژن": نیاندن nîyandın یش دەگوترێ. وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "جێگیر کردن، ناشتن، چەقاندن، تینان"ە و خزمە دەگەڵ ↑نان nan [نیان، تینان].

**نهنگ nıhıng** - "نیزیک": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑نیزیک nîzîk.

**نهۆم nıhom** - "1- قاتی خانوو 2- زکێ دانی دیوار": نوهۆم nuhom یش دەگوترێ. وەک دەبینرێ ئەم وشەیە جگە لە مانای "قات" بە مانای "زکێ دانی دیوار"یش بەکار دێ. گەر لەم دوو مانایە ورد ببینەوە، دەردەکەوێ کە وشەکە سەر بەو خێزانەیە کە ئاماژە بە مانای "چەمانەوە، نووشتانەوە، قەد بوون" دەکا. وشەکانی ↑نخ nıx "چۆکدادانی وشتر" [قەد بوونی چۆک]، ↑*نۆخ nox* "*پشتکوور*"، ↑نخین nıxîn "گوڵەشلێرە" [سەردانەواندوو] و↑نخوون nıxun [نخووم nıxum] "ئاوەژوو، وەرسووڕاو"، سەر بەو خێزانە وشەیەن. "نهۆم" یان "نوهۆم" دە بنەڕەتدا مانای "داهاتنەوە، نووشتانەوە، قەد بوون" دەدا و دواتر لەمەوە مانای "قەد" یان "قات" پەیدا بووە. بەراوردی مانای دووەمی وشەکە، واتا "زکێ دانی دیوار" بکە دەگەڵ مانای "نۆخ" کە بۆ مرۆڤی "پشتکووڕ" بەکار دێ.

**نهون nıhun** - "جوگەی سەرداپۆشراو 2- نەغمە": خزمە لەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نهێت nıhet** [ *nıhet* ] - "تاتەبەرد": خزمە لەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی". ئەم وشەیە سەر بەریشەیەکە بە مانای "نزم، قووڵ، خوارەوە".

[تێبینی: چەمکەکانی "نزم، قووڵ، ژێر" لەگەڵ چەمکی "تات، تەخت" لە پێوەندی دان. ئەم وشانەی دوایی خۆیان خزمن لەگەڵ تەه teh (.P) "خوارەوە" و ↑تەشک teşk "داوێن"].

**نهێم nıhêm** [ *nıhem* ] - "تەوژم، زۆر": هەروەها نهێو nıhêw هەیە بە مانای "پەلامار، شاڵاو". هەڵسەنگاندنی دوو وشەکە و ماناکانیان رێگەی ئەم شیمانەیە دەدا کە وشەکان پێوەندییان هەبێ بە ↑نەقین neqîn "پەڕینی پێلووی چاو" و خزمایەتییان لەگەڵ هێندێک وشە هەبێ بە مانای "*لێدان*، کوتان".

[تێبینی: لەتیوان دوو چەمکی "زۆر، هێز" و "لێدان" پێوەندی هەیە، بۆ وێنە دوو وشەی "زۆر" و "زەبر" لە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. هەروەها لەوە دەچێ دوو وشەی "نهێم" و "نهێو" لەبنەڕەتدا هەر یەک وشە بووبن، هەر وەک چۆن دوو وشەی "زۆر" و "زەبر"یش لەبنەڕەتدا هەر یەک وشەن].

**نهێنی nıhênî** [ *nıhenī* ] - "شاراوە، نادیار": نهانی nahanī (.P). هەروەها دە فارسیدا پنهان penhān و پنهانی penhānī "شاراوە" هەیە کە تییاندا پێشگری -pa خراوەتە سەر ئەسڵی وشەکەوە، پێکهاتووە لە -*ni-dāna** سەر بە ریشەی *dā* > "دانان، تینان، نیاندن، جێگیر کردن".

خزمە دەگەڵ پاشگری ↑دان dan- لە دە وشەکانی قەندان ، چادان، خوێ دان و هتد. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل.289]. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑ناشتن naştın.

**نهێو nıhêw** [ *nıhew* ] - "پەلامار، شاڵاو": بڕوانە ↑نهێم nıhêm.

**نەئاڵ neal** [ *neāl* ] - "شەڕانی، ئاژاوەگێڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑نەیار neyar "دژبەر".

**نەباندن nebandın** [ *nebāndın* ] - "وە خۆ نەگرتن، دووری کردن": ne + bandın. کەرتی یەکەم پێشگری نەیاندنە. وشە سەرەکییەکە باندن bandın ە و ئەمەش دەبێ پێشتر وەک کردارێکی سەربەخۆ بەکار هاتبێ و ماناکەی پێچەوانەی "نەباندن" بووە، واتا بە مانای "وە خۆ گرتن، خوو پێگرتن، خۆش لێ هاتن". هەر ئێستا دە زمانی کوردمادیدا ↑بانین banîn یان ↑باناندن banandın هەیە کە ماناکەی دەبێتە "بێچووی بێ دایک خستنە بەر دایکێکی دیکە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ wohnen (.G) "لەماڵێک ژیان بردنە سەر". مەبەست لەم وشە ئەڵمانییە دە بنەڕەتدا ئەوە بووە: بە پێخۆش بوونەوە نیشتەجێ بوون، خۆ بە شوێنێک بەستنەوە، خوو بە شوێنێک گرتن". ریشەی وشەکە دەبنچینەدا مانای "خۆش لێ هاتن، حەز کردن" دەگەیەنێ. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا گەلێک وشە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە، وەک una (.OIs) "قایل بوون، راحەت بوون"، unwunands (.Gt) "خەمگین، نارەحەت"، gewöhnen (.G) "خوو پێگرتن" و Wonne (.G) "خۆشی، لەززەت"، -vanas (.OIn) "حەن، لەززەت"، venus (.L) "خواژنی دڵداری" و هتد. ئەم وشانە دە کوردمادیدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑ئەڤین evîn [e-vîn]و ↑ڤیان vîyan "خۆشەویستی، دڵداری" و هەروەها ↑با ba [دێڵە بەبا واتا مێی بە ئارەزوو، حەزکەر]. ئەم وشانە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە پێوەندی پەیدا دەکەن کە لە ژێر ↑ویستن wîstın دا باس کراون. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە کرداری بانین banîn [باندن] دە ئەسڵدا بە مانای "خۆش لێهاتن، حەز لێکردن، وەخۆ گرتن، خوو پێگرتن" بووە و "نەباندن" یش پێچەوانەی ئەم مانایانە دەگەیەنێ. مەبەست لە مەڕ و بزنی "نەبان" ئەوەیە کە دایکەکە بێچووەکەی خۆی خۆش ناوێ، خووی پێ ناگرێ و وەخۆی ناگرێ.

**نەبەگە nebege** [ *nabaga* ] - "شل و شەوێق، خۆ نەگرتوو": دە ئەسڵدا نەبووگە nebuge واتا نەبووەتێ، پێ نەگەیشتووە [بڕوانە ↑بوون bun]

**نەپۆر nepor** [ *napor* ] - "نارێک": هەڵی سەنگینە دەگەڵ impar (.L) "نایەکسان" کە دەچێتەوە سەر *par* (*.L*) "یەکسان".

**نەپەرووشک neperûşık** [ *naparūšık* ] - "چرنووکی مەلی راوکەر": ئەسڵی وشەکە دەبێ نەپەر -neper بێ و کەرتی دووەمەکە پاشگری گچکاندنە. کەرتی "نەپەر" خزمە دەگەڵ Nippel (.G) "قیتکە"، nipple (.E) "گۆپکەی مەمک" و neb (.E)، nib (.E) "دەنووک". وشەی ↑نوفت nuft "کەپۆ، لووت، بێڤڵ" لەگەڵ ئەم وشانە خزمە.

**نەپەندن nependın** [ *napandın* ] - "شاردنەوە، گوم کردن": نە ne + پەندن pendın. *پەندن pendın** دەشێ پێشتر وەک وشەیەکی سەربەخۆ دە زمانی کوردمادیدا بەکارهاتبێ و خزمە دەگەڵ finden (.G)، find (.E) "دۆزینەوە". وشەکە خزمیشە دەگەڵ ↑پەیدا peyda. هەروەها ↑نەپەنی nepenî هەیە بە مانای "نەدیار، شاراوە".

**نەپەنی nepenî** [ *napanī* ] - "شاراوە، نەدیار": خزمە دەگەڵ ↑نەپەندن nependın "شاردنەوە".

**نەتراندن netrandın** [ *natrāndın* ] - "رەت پێدان، بزاوتن": بڕوانە ↑نەترە netre.

**نەترە netre** [ *natra* ] - "رەت، تەکان، لارە": پێوەندی هەیە بە nutare (.L) "تەکان خواردن، لارەلار کردن، خوار بوونەوە". نەترە بردن لە ترسان واتا تەکان خواردان لە ترسان.

**نەترەك netrek** [ natrak ] - "پەرەنگی گوارە": دەچێتەوە سەر ↑نەترە netre "رەت، تەکان، لارە". نەترەك بە هۆی "لەرانەوە"ی ئەم ناوەی پێ دراوە.

**نەتك netık** [ natık ] - "رێگەی سەنگفەرش، پیادەرەو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ دەگەڵ -pi hniutan (OG.)، hnjōđa (OIs.) "لێدان، کوتان"، nieten (MG.) "پەرچ کردنەوە یان پان کردنەوەی مێخ". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام ئاشکرایە کە دەبێ لە ریشەکەوە هاتبن بە مانای "لێدان، کوتان". لەم تێروانینەوە "نەتك" بە رێگەیەك گوتراوە کە کوتاویانەتەوە و پان و تەختیان کردووە.

[تێبینی: سەبارەت بەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین ئاماژە بە وشەی ئەڵمانی Bahn (G.) بکەین بە مانای "جادە" کە بەگوێرەی بۆچوونێك لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "لێدان، کوتان"].

**نەتل nrtıl** [ natıl ] - "دوژمن، نەیار": نەتەل netel یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Neid (G.)، nīd (OG.)، nīđ (OE.)، nīđ (OIs.) "حەسوودی، رق، کین، دوژمنایەتی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) * nit-** "دوژمنایەتی کردن، سووکایەتی پێکردن، ئەتك کردن" و خزمە لەگەڵ ↑نزم nızım. هەروەها ↑نەتوو netu "بەدفەڕ، ئاکارخراپ" [نەتووکەس واتا نامەرد، ناکەس، نەتووتشت واتا هیچ و پووچ] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لەوانەیە ↑نەتەوی netewî "دوژمن" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: وشەی "ئەتك"یش مانایەکی لەم جۆرە دەبەخشێ].

**نەتوو netu** [ natū ] - "بەدفەڕ، ئاکارخراپ": بڕوانە ↑نەتل nrtıl "دوژمن، نەیار".

**نەتە nete** [ nata ] - "شۆکراوی ئامادەی چاندن": خزمە دەگەڵ Nut(e) (G.)، nuot (OG.) "کێڕ، قەڵش، دەرز"، nuoen (OG.) "ساف کردن، دەرز گرتن" < *(Grm.) *hnojan*. دە زمانی یۆنانیدا knēn (Gr.) "کراندن، رێخشاندن" خزمە دەگەڵ ئەم وشە ژێرمەنییە. ریشەی هیندوئەورووپی وشە ژێرمەنییەکە باس نەکراوە. وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەندن kendın [هەڵکەندن] و ↑کنۆس *kınos* "چکۆس، دەسقووچاو".

**نەتەوە netewe** [ natawa ] - "میللەت": لە natio (nationis) (L.) وەرگیراوە بە مانای "لە دایك بوون، تۆرەمە، نەژاد، رەچەڵەك (ی گەل)، گەل" < *(L.) *(g)natus-* "زان"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *gen-** "زان". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑ژن jın، ↑زان zan، ↑زارۆك zarok، ↑کەنی kenî و هتد.

**نەتەوی1 netewî** [ natawī ] - "نەتەوەیی": ↑نەتەوە netewe.

**نەتەوی2 netewî** [ natawī ] - "دوژمن، نەیار": دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑نەتل *nrtıl* "دوژمن، نەیار" و ↑نەتوو netu "بەدفەڕ، ئاکارخراپ".

2- لەوانەشە بەم جۆرە پێك هاتبێ: نەت net + هەوی (h)ewî [↑(هە)ویستن (he)wîstın]. واتا ئەو کەسەی تۆ ناتهەوێ، حەز لە چارەی ناکەی.

**نەجدی necdî** [ najdī ] - "ئەسپی کلك هەڵپاچراو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ژمارەیەك وشە وەك ↑نەژاخ nejax "تەوری گچکە"، ↑نەشتەر neşter "تیغی جەرراحی" و ↑تیزە *neze* "داری نووك تیژ". لەوانەیە لە کۆندا کردارێك لە چەشنی نەژتن *nectın** / نەزتن *neztın** لە ئارادا بووبێ و وشەی "نەجدی" لەمەوە هاتبێ.

**نەجمە necme** [ najma ] - "ئەستێرەی سەر شانی ئەفسەر": ئەم وشەیە لە نجم najim (Arb.) وەرگیراوە بە مانای "ئەستێرە". لە زمانی عەرەبیدا هەروەها "کوکب" بە مانای ئەستێرە بەکار

دێ. هەرچی وشەی "نجم"ی عەرەبییە، وێ دەچێ لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. لە زمانی کوردمادیدا ↑نەقیم neqîm بریتییە لە "بەردی نرخداری ناو ئەنگوستیلە". لە فارسیدا دەبێتە نگین negîn (P.). وشەی ↑نگین nıgîn لە کوردمادیدا مانای "بەخت و تاڵع"یش دەدا. وشەی "تاڵع" خۆی شێوەیەکی عەرەبێنراو لە وشەی "ستیرە" [ئەستیرە]یە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤەکان لە کۆندا بەختی خۆیان بە رەوتی ئەستیرەکان گرێ دراوە و ئەم بیرۆکە لە سەردەمی ئێستاشدا یەکێک لە باوترین بیرۆکەکانە! لێرەدا پێوەندییەک لەنێوان نەقیم و ئەستیرەدا دروست دەبێ و ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئایا "نەقیم" [کۆنتر نەگیم؟] وشەیەک بووە کە لە زمانی کوردمادیدا بە مانای "ئەستیرە" بەکار هاتووە و دواتر مانای "بەردی ئەنگوستیلە"ی وەرگرتووە. شتێک کە گومانی ئەوە دروست دەکا، وشە عەرەبییەکە لە کوردمادی وەرگیرابێ، بوونی فۆتیمی ج c لە وشە عەرەبییەکەدایە. زمانی عەرەبی لەبەر نەبوونی فۆتیمی گ g، ئەم فۆتیمەی گۆڕیوە بۆ ج c. سەبارەت بەو پێوەندییانە و هەروەها ریشەی وشەکە لێکۆڵینەوەی زورتر پێویستە.

**نەحس neħıs** *[ naħıs ]* - "شووم": نەخس nexıs یش دەگوترێ کە دەشێ شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. لەوانەیە زمانی عەرەبی وشەکەی وەرگرتبێ و گۆڕیبێتی بۆ "نەحس" و ئەوجار بەم شێوەیە هاتبێتەوە ناو زمانی کوردمادی. خزمە دەگەڵ ↑نووتەک nutek "تاریکایی" و ↑ناخر nzxır "رەوەی شەوبەکێو"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "شەو".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "شووم" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "شێو" (شام) بە مانای "ئێوارەدرەنگان، تاریکان". بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە پێوەندییەک هەیە لەنێوان دوو چەمکی "شوومی، نەخسی" و "رەشی، تاریکی". ئەم پێوەندییە لە چەند وشەیەکی وەک چارەرەشی، رەشپۆشی، سیاچەمانە و هیتر دەردەکەوێ].

**نەخت next** *[ naxt ]* - لەگەڵ "پوخت" دێ و دەگوترێ نەخت و پوخت next u puxt. نەغد neġd یش دەگوترێ. پوخت لەبنەڕەتدا بە مانای "پاک"ە، "نەخت"یش شێوەیەکی کونترە لە وشەی ↑قووت[1] qut [رووت و قووت، کۆنتر: نقوت]، سەر بە ریشەی **< *nog-* (IE)** "رووت، قووت". مەبەست لە "نەخت" دەبێتە بێ داپوشین و شاردنەوە، واتا بە ئاشکرایی.

**نەختێک nextek** *[ naxtek ]* - "کەمێک": نەخت next + ێک ek. "نەخت" شێوەیەکی کۆنترە لە ↑نۆک nok [نخود noxod (P.)]. کەرتی دووەم نیشانە نەناسیارییە. مەبەست لێرەدا کەم و چکۆڵە بوون وەک "نۆکێک"ە. دە زمانی کوردمادیدا لەباتی "نەختێک" دەشتوانین بڵێین "نیسکێک" کە ئەویش لە "نیسک" وەرگیراوە. دیارە نۆک یان نیسک لێرەدا وەک سیمبۆلی "کەم و گچکەبوون" بەکار هاتوون. هەروەها دە شێوەزاری سەروودا "هەب" بەکار دێ و دەگوترێ "هەبەکی" واتا نەختێک. "هەب" شێوەی کۆنی "جۆ، جەو"ە.

**نەخش nexış** *[ naxıš ]* - "وێنە، نیگار": هەروەها نەخشە nexşe هەیە بەمانای "پلان، خەریتە". ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ نیگار nîgar و ↑نگا *nıga* "ئاگا لێ بوون". ئەسڵی وشەکە دەشێ *تێگاش* *nêgaş** بووبێ و چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە "نقش" و ئەوجار هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و بووەتە "نەخش".

**نەر ner** *[ nar ]* - "نک، جەم": هەر سێ شێوەی نەر ner، ↑نک nık و نێز nez [یان ↑نیزیک *nîzîk*] لەبنەڕەتدا یەک وشە بوون، واتا لە یەک وشەی بنەڕەتییەوە پەیدا بوون. "نەر" خزمە لەگەڵ nähern (G.) "نیزیک بوونەوە" و Näherung (G.) "نیزیکایەتی".

**نەرد nerd** *[ nard ]* - "گەمەی تاوڵە": دە زمانی کوردمادی و فارسیدا چەند وشەیەك هەن کە دەشێ هەموویان پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ. ئەم وشانە بریتین لە ↑نەردە nerde "لەمپەر(ی بە دار و تەختە چێکراو)"، ↑تێردیوان nerdîwan [نردبام nardebām (P.)] "پەیژە" [دە بنەڕەتدا: داری پێداچوونە سەربان]. جگە لەمانە دە زمانی کوردمادیدا ↑نەڕڕ nerr هەیە بە مانای "ناوەراستی سەر شان و پشت" [تەختی شان و پشت یان تیرەگەی واتا کۆڵەکەی پشت؟]، ↑تێرتك nertık "لاسکی سەرەکی و ڕەقی ناوەڕاستی گیا"، ↑تێرە nere "1- ناوەراست و خوڕایی ئاو 2- شەقەجۆگە"، ↑تێرەك nerek "ناوەراست، دۆر، چەق". هەر بەم شێوەیە دەتوانین باس لەم وشانەی خوارەوەش بکەین: ↑تێرگە nerge "کاریتە، دیرەكَ"، ↑تێرگەل nergel "ریزەئاڵوودار" [تێر ner + گەڵ gel واتا چەند دانە]، ↑تێرە nere "مەشکەی لە دار"، ↑نەرە nere "داربەڕووی زل". لەلایەکی دیکە دە زمانی وشەی کوردمادیدا وشەی ↑تێر ner هەیە [ڕەگەزی تێر، جیا لە مێ]. کاتێك چاو لە مانای هێندێك لە وشەکانی سەرەوە بۆ وێنە "تێرتك"، "تێرکە" دەکەین، جۆرێك پێوەندی لەگەڵ ئەم وشەی دوایی، واتا چەمکی "تێر" دەبینرێ. لەلایەکی دیکەوە لەچەندین وشەدا مانای "دار" بەرچاو دەکەوێ و لەلایەکی دیکەشەوە مانای "خوڕ، بەتەوژم، سەخت" و هەروەها "ناوەڕاست، چەق، شوێن یان بەشی هەرە ناوەوە". کاتێك لە پێوەندی ئەم مانایانە لەگەڵ یەکتر بە وردی بکۆڵینەوە، دەردەکەوێ کە وشەکە لەبنەڕەتدا مانایەکی هەبووە کە دواتر گشت ماناکانی دیکە لەوەوە سەریان هەڵداوە. ئەم مانایە دەبێ مانای "بەهێز، پتەو، سەخت" بووبێ، چونکوو هەموو ماناکانی دیکە دەتوانن لەم مانایەوە سەرچاوە بگرن، "دار" یان "تەختە" شتێکی هیشك و ڕەق و تەقە [سەختە] و هەر بۆیە بەم ناوە کراوە. ئەمجار بەشی ناوەند و هەرەناوەی هێندێك شت وەك گیا یان چەم سەخت و بەهێزترن و بەم شوێنانە گوتراوە تێرە، تێرتك و مەبەست لە بنەڕەتدا ئاماژە بە سەخت و بەهێز بوونی ئەم بەشانە کراوە، لەچاو بەشەکانی قەراخەوە. لێرەوە پێوەندییەك دروست بووە لەتێوان دوو چەمکی "هێز، پتەوی" و "ناوەند، ناوەراست" و بەم جۆرە مانای بنەڕەتی وشەکە پەرەی گرتووە و مانای "ناوەند، ناوەراست" پەیدا بووە. لەلایەکی دیکە ئەم وشەیە بۆ ڕەگەزی پێچەوانەی "مێ" بەکار هێنراوە کە لێرەشدا لەبنەڕەتدا ئاماژە بە "هێز و توانایی" ئەم ڕەگەزە کراوە، دیارە مەبەست هێزی فیزیکییە و نەك هزری و رووحی. لە سەردەمی ئەمرۆدا هێندێك جار ڕەگەزی "مێ" وەك "جینسی زەریف" واتا ناسك ناوی لێ دەبرێ و پێشتریش وشەی "زەعیفە" بۆ ڕەگەزی مێ بەکار هێنراوە. هەر ئەم تێڕوانینە وای کردووە کە لە سەردەمی کۆندا وشەی "تێر" بەمانای "بەهێز، پتەو" بۆ ڕەگەزی "نامێ" بەکار هێنراوە. ئەم وشانەی سەرەوە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑نیركَ *nîrg* "خورت، بەهێز و توانا" و نیرو nīrū (P.) "هێز". وشەیەکی دیکە کە هەر لەم پێوەندییەدا جێی لێکدانەوەیە، ↑نێڵ nel ە، [تێڵ دان واتا خۆش کردنی ئاگر و تەوژم پێدانی]. کاتێك بە شوێن ریشەی ئەم وشانەدا بگەڕێین و دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکاندا هەڵیان سەنگێنین، تووشی وشەیەك دەبین کە دەشێ پێوەندی بە وشە کوردییەکانەوە هەبێ، واتا schnell (G.)، snel (Nl.) "بەلەز، گورج"، snel (OG.)، snell (OE.)، snjallr (OIs.) "بەتوانا، خورت، گورج و گۆڵ، بە دەستوبرد". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. سوانەوەی فۆتیمی s لە وشەی کوردیدا لەچاو وشەی ژێرمەنی نموونەی زۆرە.

[تێبینی1: لەگەڵ هەموو ڕێز و هاوسۆزیم بۆ فێمینیستەکان، هیوادارم ئەم روون کردنەوە زمانەوانییە وایان لێ نەکا داوای گۆڕینی وشەی چەند هەزارساڵەی "تێر"یش بکەن و لە فەرهەنگی وشەدا شاربەدەری بکەن! تێبینی 2: وشەی "تەختەنەرد" لەبنەڕەتدا هەڵەیە، چونکوو

"نەرد" خۆی بەمانای "تەختە"یە و ناکرێ بگوترێ "تەختەتەختە"! کەوابوو دەبێ یان بگوترێ "نەرد" یان "تەختە". وشەیەکی دیکە کە بۆ ئەم گەمەیە بەکار دێ، بریتییە لە "تاوڵە" کە خزمە دەگەڵ وشەی table ی ئینگلیزی].

**نەردە nerde** [ narda ] - "لەمپەر": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑نەرد nerd "گەمەی تاوڵی".

**نەڕڕ nerr** [ narr ] - "ناوەراستی سەر شان و پشت": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑نەرد nerd "گەمەی تاوڵی".

**نەڕڕاندن nerrandın** [ narrāndın ] - "قیژاندن": خزمە دەگەڵ snarl (E.)، snarren (Nl.)، schnarren (G.) "نەڕڕاندن". ریشەی ئەم وشانە بەپێی بۆچوونێک لاسا کردنەوەی دەنگێ بووە. سەرنج بدە کە دە وشە ژێرمەنییەکانیشدا فۆتیمی r شێوەیەکی تایبەتی وەردەگرێ و بە دوو جار r دەنووسرێ.

**نەروم nerum** [ narum ] - "لەخۆبایی، بادیهەوا": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Narr (G.) "شێتۆکە"، narren (G.) "بە شێت زانین". ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییە ساخ نەکراوەتە، وا گومان دەکرێ پێوەندی هەبێ بە nario (L.) "خۆ بەزل زان، مەسخەرەکەر".

**نەرە nere** [ nara ] - "داربەڕووی زل": خزمە لەگەڵ ↑نەرد nerd "گەمەی تاوڵە".

**نەریت nerît** [ narīt ] - "داب، دەستوور": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑تیرین nerîn [نەرین] "چاو لێکردن، ئاگا لێبوون". لەم تیروانینەوە "نەریت" ئەوشتەیە کە چاوی لێ دەکرێ [چاو لێکەری دەکرێ] و ئاگاداری لێ دەکرێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑نگا *nıga* "ئاگا لێبوون".

**نەزڵە nezle** [ nazla ] - "هەڵامەت، پەسیوی سەخت": نوزڵە nuzle ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ niesen (G.)، niosan (OG.)، niezen (Nl.)، hnjōsa (OIs.) "پشمین". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑گن gın "کەسێک کە لە لووتدا قسە دەکا، لووت گیراو".

**نەزیلە nezîle** [ nazīla ] - دەگەڵ نەقڵ دێ [نەقڵ و نەزیلە]. < نظیرة *nazīra* (Arb.) "هاوشێوە". نەقڵ و نەزیلە گێڕانەوە واتا گێڕانەوەی بابەتێکی هاوشێوەی بابەتی بەرباس واتا نموونەیەک.

[تێبینی: *نظیرة* لە *نظر nazar* (Arb.) وەرگیراوە و ئەمەش دەچێتەوە سەر وشەی کوردمادی نوارین nuwarîn [نهێرین nıherîn، کۆنتر: نتێرین nıterîn/ ↑نتراندن nıtrandın].

**نەژاخ nejax** [ nažāx ] - "تەوری بچووک": خزمە دەگەڵ ↑نەشتەر neşter و هەروەها ↑تیزە neze.

**نەژد 1 nejd** [ našd ] - "قرچان، چرچ و قەد بوون":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑نووشتانەوە nûştan(ewe).

2- یان دەگەڵ ↑نشف nışıf "چین، قات".

**نەژد 2 nejd** [ našd ] - "تاڵان": هەروەها نەژدی بە مانای "ماڵی تاڵانی" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑قووت qut "رووت"، سەر بە ریشەی < *nog- (IE) "رووت، قووت". ماناکەی دەبێتە "رووت کردن، رووتاندنەوە". هەروەها دەبێتە خزم لەگەڵ ↑نەخت next [نەخت و پوخت، نەغد و پوخت].

**نەستەق nesteq** [ nastaq ] - "پەنداوی، ئامۆژێن": قسەی نەستەق واتا قسەیەک کە پەند و ئامۆژگاری تێدایە. دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑ناخ *nax* "قووڵ". هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑ناخودا naxuda "کاپیتانی کەشتی". لە زمانی فارسیدا نغز nağz هەیە بە مانای "قسەی جوان، ناسک" و پێوەندی ئەم وشە فارسییە بە "ناخ" ئاشکراترە.

**نەسل nesıl** [ *nasıl* ] - "1- کڵافەدەزوو 2- پشتتیند": خزمە لەگەڵ Naht (.G) "تەقەڵ" و Nadel (.G) "دەرزی". لە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Nessel (.G) هەیە کە ناوی گیایەکە و خزمە لەگەڵ ئەم وشانە. ئەم گیایە وەک چنراو بەکار دەهێنرێ. ئەم وشانە دواجار خزمن لەگەڵ ↑چنین çınîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، گرێ دان، تێکخستنەوە".

**نەسەل nesel** [ *nasal* ] - "پاڵوێنە، راوەک": نەسل nesıl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ nieseln (.G) "بارینی ورد، خوناوەباران". ریشەی وشە ئەڵمانییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵیسەنگینە لەگەڵ *سەپی* "پاڵاوتە"، *سافان* "دڵۆپە، چکە"، *سافۆ* "پاڵوێنە، راوەک"، زیپک "دڵۆپە" و هەروەها کەو [کەو و بێژینگ]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چۆڕاندنەوە، دڵۆپاندن"].

**نەشتەر neşter** [ *naštar* ] - "1- شفرەی چەرم برین 2- تیخی جەڕڕاحی": خزمە دەگەڵ ↑تیزە neze.

**نەشمیل neşmîl** [ *našmīl* ] - "جوانی خونجیلانە": خزمە لەگەڵ ↑ناز naz. وشەکە لە دوو کەرتی نەش neş و میل mîl پێک هاتووە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑مل[3] mıl [شل و مل].

**نەعرەتە neεrete** [ *naεrata* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑نەڕڕە nerre و خزمە دەگەڵ ↑نارین narîn.

**نەغم neğım** [ *naġım* ] - "رەهەند، توتیل": خزمە دەگەڵ ↑نەقەب neqeb.

**نەفر nefır** [ *nafır* ] - "شاخی ماڵات، هەرچی وەک شاخ قیت بێ": خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑نوفت nuft "لووت"دا باس کراون، وەک Nippel (.G) "قیتکە"، nipple (.E) "گۆپکەی مەمک".

**نەڤسی nevıs(î)** [ *navıs(ī)* ] - "زڕکوڕ، زڕکچ": ↑نە ne + ڤس (ی) vıs(î). ناپسری napesarī (.P). کەرتی یەکەم پێشگری نەیاندنە. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکە لە ↑پس pıs، ↑پز pız، ↑بێچوو beçu و هتد و مانای "بێچوو، منداڵ" دەدا. وشەکە بە واتای ئەوەیە کە منداڵەکە نە هی خۆتە، هەروەک چۆن دە زمانی فارسیدا دەگوترێ ناپدری nāpedarī (.P) "زڕباب" یان نامادری nāmādarī (.P) "زڕدایک".

**نەڤینا nevîna** [ *navīnā* ] - "وازوازی": ↑نە ne + ڤینا vîna. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ↑ئەڤین evîn "حەز، مەیل، خۆش ویستن".

**نەقار neqar** [ *naqār* ] - "بەردتاش": خزمە دەگەڵ ↑نەقین neqîn "پەڕینی پێلووی چاو". وشەی "نەقین" دە بنەڕەتدا بە مانای "لێدان"ە و "نەقار"یش بە مانای "لێدەر، کوتەر".

**نەقارە neqare** [ *naqāra* ] - "دەهۆڵ": نەقرا neqra ش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نەقر neqır "1- قووڵ 2- دەفری قووڵ" کە ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ↑*ناخ nax* "قووڵایی". لە وشەی "دەهۆڵ"یشدا چەمکی "قووڵی" بەدی دەکرێ.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑نەقار neqar "بەردتاش" و ↑نەقین neqîn "پەڕینی پێلووی چاو". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشن. لەم تێڕوانینەوە "دەهۆڵ" ئەو شتەیە کە لێی دەدەن. وشەکانی "تەپڵ" و "دەفە"ش دەچنەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە مانای "لێدان".

**نەقاندن neqandın** [ *naqāndın* ] - "دە خۆ نووسان": خزمە دەگەڵ ↑نکین nıkîn "ناڵاندن" و نووکاندن nukandın.

**نەقتاندن neqtandın** [ *naqtāndın* ] - "ئارەقە کردن": لە فارسیدا نەشت našt (.P) هەیە بە مانای "نم، شێ، تەڕایی". خزمە لەگەڵ nass (.G)، nat (.Nl) "تەڕ، نمدار"، netzen (.G)، netten

(Nl.) "تەڕ کردن". وشانە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *nata- (Gm.) "تەڕ"، ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە دیاری نەکراوە.

**نەقر neqır** [ naqır ] - "1- قووڵ 2- دەفری قووڵ": نەقل neqıl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نەقوستان nequstan** [ naqūstān ] - "سەقەت، کەم ئەندام": <نقص neqs (Arb.) "کەم و کورتی، کەماسی".

**نەقور nequr** [ naqur ] - "دەنووک، دندووک": خزمە لەگەڵ ↑نووک nuk. شێوەیەکی دیکە لە ↑نکل nıkıl "دندووک".

**نەقە neqe** [ naqa ] - "ماسی گەورە، باقۆ": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی". ئەم ماسییە لە ئاوی قووڵدا دەژی و بۆیە بەو جۆرە ناو نراوە. هەروەها خزمیشە دەگەڵ ↑نەهەنگ neheng و وێ دەچێ دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بووبن.

**نەقەب neqeb** [ naqab ] - "تونێلی بن هەرد": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑نخفتن nıxıftın "داپۆشین، شاردنەوە". لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژە بە چەمکی "داپۆشران و نەدیار بوون" دەکا.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑ناخ nax و ژمارەیەک وشەوە هەبێ کە مانای "قووڵایی، نزمایی، ژێر و خوارەوە" دەبەخشن.

**نەقیزە neqîze** [ naqīza ] - "داری نووک تیژ": خزمە دەگەڵ ↑تیزە neze.

**نەقیم neqîm** [ naqīm ] - "بەردی نرخدار کە دەخرێتە ناو زێڕ و زێو": نقیم nıqîm یش دەگوترێ. نگین negīn (P.).

1- بڕوانە شی کردنەوەی ژێر ↑نەجمە necme "ئەستێرەی سەر شانی ئەفسەر". دەشێ وشەی نقیب naqīb (Arb.) لەم وشەیە وەرگیرابێ و دە زمانی عەرەبیدا وشەیەکی وەرگیراو بێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ *gemma* (*L.*) "نەقیم". ئەم وشە لاتینییە دە بنچینەدا بە مانای "خونچەی دارەمێو" بەکار هاتووە.

**نەقین neqîn** [ naqīn ] - "پەڕینی پێلووی چاو": نەق neq و نەکێ neg یش بەکار دێ کە دەبێتە بنجی وشەکە. کردارەکە بەشێوەی نەقیان neqyan و نەگاندن negandın یش بەکار دێ. ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ knacken (G.) "قەڵشین، تەقین"، knocka (OIs.) "لێدان، کوتان"، knäcka (Sw.) قەڵشین، شکان"، cnocian (OE.) "لێدان، لێکدان، پێکدادان". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ دەگەڕێندرێتەوە. وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و مەبەست "لێدان، لێکدان"ی پێلووی چاوە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ فۆتیمی سەرەتای وشەکە لە زمانی کوردمادیدا سوابێتەوە. لە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑نەقار neqar "بەردتاش" هەیە کە پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا و مەبەست کەسێکە کە لە بەرد دەدا و دەیشکێنێ.

[تێبینی1: سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانەی سەرەوە جێی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیدا Knochen بە مانای "ئێسک، هەستی" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. دە زمانی کوردمادیدا "هەستی" بە چەند مانا بەکار دێ: ناوکی میوە [ئێسکی میوە]، ئێسک، بەرد. تێبینی 2: سەبارەت بە "نەقار" و مانای "بەردتاش" جێی ئاماژەیە کە وشەی "تاشین"یش خۆی لەبنەڕەتدا دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، لێکدران"].

نەکاو **nekaw** [ *nakāw* ] - "کوتوپڕ": دە بنەڕەتدا واتا بێوەخت، بێوادە. ↑نە ne + کاو kaw [↑گاو gaw] "کات".

نەکس1 **nekıs 1** [ *nakıs* ] - "تەنیشتی قووڵی میچ (جکێ)": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑نۆق noq "1- خالیکە، کەلەکە". نەکس واتا لاتەنیشتی جکێ لەباری شێوەوە زۆر لە لاتەنیشتی مرۆڤ دەچێ و هەردووکیان جۆرێک قووڵاییان تێدایە.

نەکس2 **nekıs 2** [ *nakıs* ] - "نەخۆشی سەرمابوون کە سپیەلاک دێشێ": لەوانەیە پێوەندی بە ↑نقاندن nıqandın وە هەبێ، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەنگێ" و ئاماژەی بە "هەناسەتەنگی" کردبێ.

نەگبەت **negbet** [ *nagbat* ] - "1- بەڵا 2- چارەرەش": لەوانەیە بە ئەسڵ وشەیەکی عەرەبی نەبێ و پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*nok(t)** (*IE.*) "شەو". لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑نەگریس negrîs.

نەگریس **negrîs** [ *nagrīs* ] - "1- شووم، بەدفەڕ 2- لاسار، کەللەشەق": نگریس nıgrîs یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نووتەک nutek "تاریکایی" و ↑*ناخر naxır* "رەوەی شەوبەکێو" سەر بە ریشەیەک بە مانای "شەو". لەم مانایەوە دەتوانێ مانای "شووم، بێفەڕ" پەیدا بووبێ، هەروەک چۆن وشەکانی "شووم" و "شام" ["شێو" واتا تاریکان] پێوەندنیان لەتێواندا هەیە. ئاڵقەی پێوەندی تێوان دوو چەمکی "شەو" و "شووم" بریتییە لە چەمکی "تاریکی و رەشی" کە وەک نیشانەی بەدبەختی و چارەرەشی دەژمێردرێ. لەم تێڕوانینەوە کەرتی دووەمی وشەکە، واتا îs- پاشگری جەخت کردنە و دە چەندی وشەی دیکەدا دەبیندرێ [بڕوانە پاشگری ↑ئۆز - oz]. وشەکانی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی **< -*nok(t)** (*IE.*) "شەو".

2- لەوانەشە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "پەست و نزم کردار" بێ. لەم تێڕوانینەوە پێوەندی پەیدا دەکا بە هێندێک وشە کە ئاماژە بە ↑نزم nızım و قووڵ بوون دەکەن، وەک ↑نوغرۆ nuġro [نغرۆ nıġro، نخرۆnıxro] "(بە ئەرزدا) رۆ چووکێ"، ↑نقرنقرکراو nıqr "هەکەندراو، لەلەکراو"، ↑ناخار naxar "زەوی پڕ کەند و لەند" [پڕ لە قوڵکە و چاڵ]، ↑نخای nxay "بێ ئەدەب، بەدئاکار" و دواجار ↑*ناخ nax* "قووڵایی، نزمایی"، سەر بە ریشەی **-*nitra** (*IE.*) "نزم، نەوی، خوارەوە".

نەگۆمە **negome** [ *nagoma* ] - "خۆنەگرتوو، نەبەگە": [شەپلەی لێداوە و دەست و لاقی نەگۆمەیە]. دەشێ پێک هاتبێ لە نە ne + گۆمە gome. کەرتی "گۆمە" جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑کۆم kom. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ سەرەتا بەو مانایە هاتبێ کە مرۆڤی شەپلەلێدراو دەست و لاقی بۆ کۆم ناکرێتەوە، واتا دەست و لاقی بەم لا و ئەولادا بڵاو دەبێتەوە.

نەمام **nemam** [ *namām* ] - "ریشەی یەکساڵە": خزمە دەگەڵ نەوین newîn و ↑نەواندن newandın و ↑نویژ nuwej [نمێژ nımej] و چەندان وشەی دیکە بە مانای "خوار بوونەوە، چەمانەوە، داهاتنەوە". نەمام بە هۆی شلک و ناسک بوون و خوار بوونەوەی لەبەر با، بەم جۆرە ناودێر کراوە.

نەنک **nenık** [ *nanık* ] - "داپیرە": پێک هاتووە لە ↑نەنە nen(e) + ک ık، هەروەک بابە و باوک [*بابک**]. نەنە nane (P.) "دایە" [دە زمانی ئاخافتندا]. وشەکە خزمە دەگەڵ nonna (L.) "دایکی رووحانی". وشەکە لە رووی لاسا کردنەوەی دەنگی زارۆک و بە دووپات کردنەوەی دەنگی نە -

ne دروست بووە، هەروەک بابە، مامە، دادە ، کاکە، یایە و هتد. لە هەموو ئەم وشانەدا دەنگێک دووپات دەبێتەوە و ئەم دەنگانەش لە زمانی زارۆک وەرگیراون.

**نەوا1 newa 1** *[nawā]* - "دەنگ و ئاواز": نوا nawā (P.) "نەوا" و نواختن navāxtan (P.) "ژنین" و نوازندە navāzande (P.) "ژنیار". وشەکە لەبنەڕەتدا بەمانای "دەنگ و ئاواز" نییە، بەڵکوو دواتر ئەو مانایەی وەرگرتووە. "نواختن" دە فارسیدا مانای "ژەنین"ی مووسیقای هەیە و ئەمە وای کردووە کە لەم کردارەوە وشەیەک بەمانای "دەنگ و ئاواز" دروست بکرێ. خودی کردارەکە مانای "لێدان، ژەنین" دەدا و دەبێتە خزم لەگەڵ ↑نڤژاندن nıvjandın "بە دار شل و کوت کردن" [دە بنەڕەتدا: لێدان، کوتان]، دواجار دەبێ لەگەڵ ↑کنۆس *kınos* "دەستقووچاو" خزم بێ.

**نەوا2 newa 2** *[nawā]* - "جێگە و پەنا": ئەنوا enwa ش دەگوترێ. نوا navā (P.). بێنەوا benewa واتا بێ ماڵ و حاڵ. دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑نڤان nıvan [شێوەیەکی دیکە لە ↑نووستن nustın] و ↑نوێن nuwen "پێخەو". دەبێ "نەوا" دە ئەسڵدا بە کەسێک گوترابێ کە شوێن و سەرپەنای بۆ خەوتن نەبووە.

**نەوار newar** *[nawār]* - بەندی پێچراو، هەڵوێزراو": خزمە لەگەڵ ↑نواڵە nuwale "پێچراوە".

**نەواندن newandın** *[nawāndın]* - "خوار کردن، نزم کردنەوە": نواندن nıwandın و نەمیانەوە nemyanewe ش دەگوترێ. فۆتیمی م m کۆنترە و ئەم فۆتیمە لەچەندین وشەی دیکەشدا دەر دەکەوێ، وەک نمێژ nımêj [↑نوێژ nıwêj]، نەمە neme یان نمێر nımêr "نەوی، نزم" [↑نەوی newî]. وەک دەبینرێ مانای سەرەکی لەم وشانەدا "نزم و نەوی" بوونە. سەر دانەواندن مانای "نزم کردن، هێنانەخوار"ی سەر دەگەیەنێ و هەروەها "نوێژ" [نمێژ] بریتییە لە خۆ نزم کرنەوە فیزیکی [خوار کردنەوەی بەژن] لەبەرانبەر هێزی بانسەران و هەروەها نزم کردنەوەی خۆ لەباری دەروونییەوە، واتا خۆ بە نزم زانین لەبەرانبەر ئەو هێزەدا. ئەم وشانە لە دوو کەرت پێک هاتوون کە کەرتی یەکەم پێشگرێکە و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ni- (IE.)** "نەوی، خوارەوە". ئەم پێشگرە لە چەند وشەی وەک "نشێو"، "نزم"، "نیشتن"دا دەردەکەوێ. کەرتی سەرەکی وشەکە خزمە یان شێوەیەکی کۆنترە لە ↑مووچاندن mûçandın و خزمیشە دەگەڵ ↑مەچەک meçek "شوێنی خوار بوونەوە".

**نەوازش newazış** *[nawāzeš]* - "ناز کردن، لاواندنەوە": ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا بەمانای "دەست بەسەردا هێنان"ە بە نیشانەی خۆش ویستن و ناز کردن. [دە فارسیدا "ناز و نوازش" زۆرجار پێکەوە بەکار دەهێنرێن]. وشەکە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی خزمە وەک ↑نڤانی nıvanî یان نەوانی newnî "قوڕەکاری" (سواخ دان، تێهەڵسوون، دەست پێداماڵین)، نڤیشک nıvîşık "رونەکەرە" (ئەو شتەی لە نانی هەڵدەسوون) و هتد. وەک دەبینین مانای وشەکە "(دەست) رێخشاندنە". زۆر جار دەبیسترێ کە ئاخێوەرێک سەری "رێز و نەوازش" دادەنەوێنێ کە لەراستیدا قسەیەکی نادروستە. ئەگەر مەبەست لە "نەوازش" هەر ئەو وشەیە بێ کە زمانی فارسی بە کاری دێنێ، ئەوە لەگەڵ "سەر دانەواندن" یەک ناگرێتەوە. ئەگەر "نەوازش"ە کوردییەکە پێوەندی بە وشە فارسییەکەوە نەبێ و دەگەڵ وشەکانی وەک نمێژ [نوێژ] "چەمانەوە، داهاتنەوە" خزم بێ، دیسانیش بەکار هێنانی بەم شێوەیە هەڵەیە. لەم دۆخەدا مانای "سەری رێز و نەوازش دادەنەوێنم" دەبێتە "سەری رێز و دانەواندن دادەنەوێنم"!

**نەواڵ newal** *[nawāl]* - "لافاوی توانەوەی بەفر لە چیا": خزمە لەگەڵ ↑نم nım "تەڕایی".

نەوت **newıt** [ *nawıt* ] - "پێترۆل": نەفت nefit یش دەگوترێ. بەگوێرەی سەرچاوە ئەڵمانییەکان دواجار دەچێتەوە سەر وشەی بابلی nabatu (Babl.) "هایسان" و لە رێگەی زمانی یۆنانییەوە هاتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان.

نەورنایش **newırnayış** [ *nawırnāyiš* ] - "گوڵدۆزی کردن": دەشێ خزم بێ لەگەڵ nere (L.) "تەنین، رستن"، nemen (Gr.) و nēma (Gr.) "دەزوو، گشتەک، تەون" و néein (Gr.) "تەنین، رستن"، سەر بە ریشەی **< *(s)nē-** *(IE.)* "رستن، تەنین، چنین، گرێ دان". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چنین1 cınîn "تەنین، هۆنینەوە، دروون".

نەورۆ **newro** [ *nawro* ] - "هەڕەتی جووت بوونی پشیلە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نوورە nure، ↑نیرە nîre "قیژەی پشیلە" [نیرەنیری پشیلان] و↑نەڕراندن nerrandın "قیژاندن" و دەگەڵ snarl (E.)، snarren (Nl.)، schnarren (G.) "نەڕراندن". ریشەی ئەم وشانە بەپێی بۆچوونێک لاسا کردنەوەی دەنگێ بووە. لەم هەڕەتەدا نیرەنیری پشیلان زۆر بەرگوێ دەکەوێ.

نەوس **newıs** [ *nawıs* ] - "1- دڵ و دەروون 2- ئیشتیا، تامەزرۆیی": دەچێتەوە سەر نفس nefs (Arb.) "رووح، زات، خۆد، کەس". وشە عەرەبییەکە خۆی لە nous (Gr.) "رووح" وەرگیراوە. ئەگەر وشەی "نەوس" دە زمانی کوردیدا وشەیەکی وەرگیراو بێ، لە زمانی عەرەبی وەرنەگیراوە و راستەوخۆ لە وشە یۆنانییەکە وەرگیراوە.

نەوەسە **newese** [ *nawasa* ] - "نەخۆشی": پێوەندی هەیە بە nosos (Gr.) "نەخۆشی".

نەوشە **newşe** [ *nawša* ] - "هۆنە، هەڵبەست": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "چنین، هۆنین، دروون، گرێ دان، تێکخستنەوە"، وەک ↑*نەسل* *nesıl* "1- کڵافەدەزوو 2- پشتتێند". هەروەها ↑نەوگ newıg "نمەد" و ↑نمەد nımed یش هەر لەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرن.

نەوق **newq** [ *nawq* ] - "1- خالیگە، بەتاڵایی لاتەنیشت 2- نوقم": ↑نۆق noq یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑*نەکس* *nekıs* "تەنیشتی قووڵی میچ (جکێ)" و دواتر ↑ناخ nax "قووڵایی".

نەوگ **newıg** [ *nawıg* ] - "نمەد": خزمە لەگەڵ ↑نەوشە newşe "هۆنە، هەڵبەست".

نەوە **newe** [ *nawa* ] - "منداڵی فرزەند": نوە nave (P.)، napt (OIn.)، nepos (L.). خزمە دەگەڵ Neffe (G.)، nevo (OG.)، neef (Nl.)، nefa (OE.)، nefi (OIs.). ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرەتا بە مانای "نەوە" بەکار هاتوون، دواتر مانایان گۆڕاوە و بووەتە "برازا و خوشکەزا"، سەر بە ریشەی **< *nepot-** *(IE.)* "نەوە"[ne "بێ، نا" + pot "دەسەڵات"]. مەبەست لەم وشەیە دە بنچینەدا بێدەسەڵاتی یاخود سەغیر بوونی منداڵەکە بووە.

نەویرە **newîre** [ *nawīra* ] - "نەوەی نەوە، نەدیدە": نبیرە nabīre (P.). لەوانەیە پێوەندی بە ↑بیر bîr [ویر wîr]ەوە هەبێ، بە مانای "هزر". ئەگەر سەیری وشەی "نەدیدە" بکەین، دەبینین کە وشەکە باس لە وەچە یان زارۆکێک دەکا کە زۆرینەی هەرە زۆری مرۆڤەکان نایبینن، واتا دوای مردنی ئەوان پێ دەتیتە سەر دنیا. هەر بەم تەرزە لەوانەیە وشەی "نەویرە" [نەبیرە] ئاماژە بە زارۆکێک بکا کە مرۆڤ بیر لە بە دنیا هاتنی ناکاتەوە.

نەهامەتی **nehametî** [ *nahāmatī* ] - نە ne + هامەتی hametî. وشەکە پێوەندی هەیە بە امدن āmadan (P.) "هاتن". مانای وشەکە دەبێتە "(باش) بۆ نەهاتن"، واتا رۆژگار رووداوی خراپی لەگەڵ خۆی هێناوە.

نەهتک **nehtık** [ *nahtık* ] - "ئەنێ، تیوچاوان": نەعتک neɛtık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Naht (G.) "(ریزە)تەقەڵ". ئەو وشەیە لە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها وەک زاراوەیەکی ئاناتۆمی

بەکار دێ بە مانای "خەتی تەپڵی سەر کە شوێنی تێکخرانەوەی دوو ئێسکی چەپ و راستی کەللەیە". دوور نییە وشە کوردمادییەکە سەرەتا بە مانای تەپڵی سەر بەکار هاتبێ.

**نەهری nehrî** ⌊ *nahrī* ⌋ - "1- ناوی مەڵبەندێک لە کوردستان 2- نازناوی سەرکردە و قارەماتیکی مێژوویی کورد": تیری nerî یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم دوو وشانەوە هەبێ:

1- ↑نیرگ nîrg "خورت، بەهێز".

2- ↑نەهلە nehle.

**نەهلە nehle** ⌊ *nahla* ⌋ - "ئاوایی لەناو شیوی بەرفرەدا": خزمە لەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی".

**نەهوراندن nehurandın** ⌊ *nahurāndın* ⌋ - "گۆرانی گوتن بە دەنگی نزم": خزمە دەگەڵ ↑نارین narîn.

**نەهەنگ1 neheng** ⌊ *nahang* ⌋ - "گەورەترین گیانداری ژێر ئاو": خزمە دەگەڵ ↑ناخ nax "قووڵایی". ئەسڵی وشەکە دەبێ "نەهەگ" بووبێ و فۆتیمی n وەک زێدەیەک هاتبێتە ئاراوە.

**نەهەنگ2 neheng** ⌊ *nahang* ⌋ - دەگەڵ "کەیف" دێ [کەیف و نەهەنگ keyf u neheng]. خزمە دەگەڵ ↑نۆش noş "چێژ و بەهرە وەرگرتن". کەرتی دوومی وشەکە واتا ئەنگ eng- پاشگرە و دە وشەی ↑جەفەنگ cefeng یشدا دەبینرێ.

**نەی1 ney** ⌊ *nay* ⌋ - "قامیش": نی ney (P.). خزمە دەگەڵ canna (L.) و kanna (Gr.) "نەی، قامیش، لوولک" > qanu (Babl.-Asr.) > gin (Sum- Akd.) "قامیش، لوولک". وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑قامیش qmîş. دە وشەی "نەی" [نا، نایە]دا فۆتیمی سەرەتای وشە کۆنەکە سواوەتەوە.

**نەی2 ney** ⌊ *nay* ⌋ - "داو، تاڵ": خزمە لەگەڵ ↑نەسل *nesıl* "1- کڵافەدەزوو 2- پشتێند"، ↑نەوگ newıg "نمەد" و ژمارەیەک وشە سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، هۆنین، دروون، تێکخستنەوە".

**نەیار neyar** ⌊ *nayār* ⌋ - "دوژمن، کەسی بەرهەڵست": ↑نە ne + ↑یار yar "دۆست".

**نیاتە nıyate** ⌊ *nıyāta* ⌋ - "پاشەکەوت": ↑نۆتە note ش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا وشەی "پس انداز" بەمانای پاشەکەوت پێوەندی بە کرداری "انداختن"ەوە هەیە و دەشێ سەرەتا مەبەست تێهاویشتنی پووڵ بۆ ناو داخڵی بووبێ. دە فارسیدا "اندوختە"ش دەگوترێ کە دەبێ هەمان "انداختن" بێ. لە وشەی "پاشەکەوت"یشدا کرداری "کەوتن" بەکار هێنراوە و لەمەشدا دەبێ مەبەست خستنی پووڵ بۆ ناو داخڵی بێ. بەم پێیە دەشێ وشەی "نیاتە" پێوەندی هەبێ بە ↑نیان nıyan [تێنان].

**نیار nıyar** ⌊ *nıyār* ⌋ - "1- شانۆ 2- شانۆکار": دەشێ لەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ کە لەژێر ↑نگا nıga دا شی کراونەوە. ئەم وشانە چەندین مانای وەک "نیشان، نەخش، نیشان دان، تەماشا کردن" دەبەخشن. هەروەها جێی باسە کە وشەی ↑یاری yarî [یاری کردن واتا کایە کردن] لە کوردمادیی ناوەراستدا دەشێ لەم وشەیەی کوردمادی سەروو وەرگیرابێ و فۆتیمی سەرەتاکەی سوابێتەوە یان قرتێنرابێ. وەک دەبینین "نیاری کردن" مانای کایە کردن لەسەر شانۆ دەدا و لە کوردمادی ناوەراستدا بەگشتی مانای "کایە، گەمە"ی پێ دراوە.

**نیاز nîyaz** ⌊ *nīyāz* ⌋ - "ئاتاج، پێداویستی": هەروەها ↑تێز nez هەیە بە مانای "برسی". خزمە دەگەڵ Not (G.)، need (E.)، nöd (Sw.)، nuda (Rus.)، "ئاتاج، تەنگانە، نیاز". ریشەی وشە

ژێرمەنییەکە وەسا دیاری کراوە: *(IE.) *nau,- *nu- > (Gem.) *naudi- >* "رەنج کێشان تا ئاستی لە پێ کەوتن، ئەوپەڕی داهێزران".

**نیان nîyan** [ *nīyān* ] - "نەرم، ساف": دە زمانی فارسیدا پرنیان parniyān (P.) بە مانای "ئاوریشم" شیرۆڤە کراوە، بەڵام مانای ڕاست و دروستی ئەم وشەیە دەبێ "پەڕی نەرم و نیان" بووبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ناسک nasık "1- نەرم 2- باریک، تەنک 3- تورت".

**نیچک nîçık** [ *nīčık* ] - "1- بەلووکە 2- سەرنوچک": هەروەها ↑نچک nıçık "چلۆپۆپی دار" هەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑نووک nuk و ئاماژە بە زەقایی و دەرپەڕیوییەکی بچووک دەکەن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ Nuckel (G.) "گۆپکی مەمک" کە لەوانەیە دەگەڵ وشە کوردییەکان خزم بێ.

**نیخ nîx** [ *nīx* ] - "بنی گەرۆ": خزمە دەگەڵ Nacken (G.)، nac (OG.)، hnekka (OF.)، hnecca (OE.)، neck (E.) "مل، پشت مل". ئەم وشانە بە پێی بۆچوونێک دەگەڕێنەوە سەر ریشەی *(IE.) *knak- >* "قرچە، خرتەی مۆرەکانی مل".

[تێبینی: شیاوی سەرنجە کە وشەی Rachen (G.) "قوڕگ " دە بنەڕەتدا بە مانای "قرخە" بووە. وەک دەبینین لێرشدا دا ناوی قوڕگ بۆ ناوی دەنگی (گەروو) دەگەڕێتەوە].

**نیخە nîxe** [ *nīxa* ] - "دەنگی هەناسەسواری":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑نیخ nîx "بنی گەرۆ".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑نقە[2] nıqe "دەنگی دە خۆ نووسان" [نەقە neqe ش دەگوترێ [نقەنق، نەقەنەق].

**نیر nîr** [ *nīr* ] - "داری سەر ملی گاجووت": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- near (E.)، nēar (OE.)، nāhor (OG.) "نیزیکتر"، سەر بە ریشەیەکی ژێرمەنی بە مانای"لە یەکدی نیزیک، لێکبەستراو، تێکخراو". "نیر" دە زمانی کوردمادیدا بەو دارە دەڵێین کە دەخرێتە سەرملی دوو گاجووت و لێکیان دەبەستێ و ئەمەش بەتەواوی دەگەڵ مانای ئەو ریشەیە یەک دەگرێتەوە. لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑نک nık [نکاڵ nıkal] و ↑نیزیک *nîzîk* "بەرانبەری دوور"، سەر بە ریشەی هیندوئەورووپی *< (IE.) *nek-* "گەیشتن (ەوە)،نیزیک بوون(ەوە)". لەم تێروانینەوە "نیر" ئەو ئامرازەیە کە دوو گایەکە پێک دەگەیەنێ و دەیان خاتە تێزیکی یەکتر.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑نەرد nerd "دار، تەختە".

**نیڕ nîr** [ *nīr* ] - "قیژەی پشیلە": [نیڕەنیڕی پشیلان]. خزمە لەگەڵ ↑نە*ڕڕاندن nerrandın* و لەوانەشە ↑نەورۆ newro "هەڕەتی جووت بوونی پشیلە".

**نیرگ nîrg** [ *nīrg* ] - "خورت، بەهێز": دەشێ خزم بێ لەگەڵ schnell (G.)، snel (Nl.) "بەلەز"، snel (OG.)، snell (OE.)، snjallr (OIs.) "بەتوانا، خورت، گورج و گۆڵ، بە دەستوبرد". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. نیرو nīrū (P.) "هێز، وزە" خزمە لەگەڵ وشە کوردمادییەکە. فۆتیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑نەرد nerd "تاوڵە".

**نیرگە nîrge** [ *nīrga* ] - "کاریتە، دیرەک": خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd.

**نیرگەل nîrgel** [ *nīrgal* ] - "ریزی ئاڵوودار": نیر nîr + گەل gel. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑نەرد nerd.

**نیرڤانا nîrvana** [ *nīrvānā* ] - "ڕۆژی حەشر": دە زمانی هیندی کۆندا nirvana (OIn.) بووە بە مانای "کووژانەوە، نەمان و ئارام بوونی تیکڕایی" [ئاخرزەمان]. وشەکە هاتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیشەوە، بۆ وێنە nirwana (G.). ریشە؟

**نیزیک nîzîk** [ *nīzīk* ] - "بەرانبەری دوور": تیز nez و تیزیک nezîk و نهنگ nıhıng یش دەگوترێ. نزدیک nazdīk (P.). خزمە دەگەڵ nah (G.)، neah (OE.)، ni (OF.)، na (OIs.) "نیزیک". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑نک nık [لەنک le nık واتا لە تیزیک]. دە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا ریشەی ئەم وشانە دیاری نەکراوە. دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا لە پێوەندی دەگەڵ وشەی "اسیدن"دا باس لە ریشەی هیندوئەورووپی **< *nek- (IE.)** "گەیشتن (ەوە)،نیزیک بوون(ەوە)" کراوە. وشەکانی سەرەوە بە تەواوی دەگەڵ ئەم ریشەیە دەگونجێن. جێی پرسیارە کە بۆچی دە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا ئاماژەیە بەم ریشەیە نەکراوە.

**نیسک nîsık** [ *nīsık* ] - "جۆرێک دانەوێڵە": نۆژی nojî ش دەگوترێ. جێێ هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑نۆک nok.

**نیسە nîse** [ *nīsa* ] - "نووسراو": خزمە لەگەڵ ↑نیشان nîşan. [خەت و نیشان]. هەروەها خزمە لەگەڵ ↑نیشە nîşe "1- یادداشت 2- نمرەی خوێندکار 3- چەشن، لەگوێن".

**نیسێ nîse** [ *nīse* ] - "سایە": نسێ nısê ش دەگوترێ. ئەم وشەیە هەرچەند لەگەڵ وشەی "سایە" هاومانا و هاوشێوەیە، بەڵام پێوەندی ریشەیی بەمەوە نییە. وشەی "سایە" پێوەندی هەیە بە چەندین وشە وەک *سیا* "ڕەش"، *سهنە*"تارمایی" و *شێو* "تاریکان" و هتد. بەڵام وشەی "نیسێ" دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی دیکە وەک ↑نووتەک nutek "تاریک"، ↑ناخر naxır "ڕەوەی شەو بەکێو"، ↑نسار nısar "شوێنی تاونەگر و بەر نیسێ لە چیا"، ↑نسرم nısrım "ماڵ یان دیوی تاونەگر و سارد". ئەم وشانەش ئاماژە بە ڕەشی و تاریکی دەکەن.

**نیشاستە nîşaste** [ *nīšāsta* ] - "ئاردی دەئاوکراوی پاڵێوراو": نشاستە nešāste (P.). خزمە دەگەڵ ↑نیشتن nîştın و نشستن nešastan (P.) " نیشتن، دانیشتن" و مەبەست نیشتنی ئاردە گوشراوەکە لە ئاودایە. وشەکە لە زمانی فارسی وەرگیراوە.

**نیشان nîşan** [ *nīşān* ] - نیشان دان واتا "خستنە بەرچاو":

1- لەوانەیە پێک هاتبێ لە پێشگری کۆنی نی -ni + شان şan و خزم بێ دەگەڵ ↑شانی(ک) şanî(k) "نیشان، بەڵگە، مەدرەک". شانی دان şanî dan بە مانای "نیشان دان، خستنە بەرچاو" بەکار دەهێنرێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑ناسین nasîn. لەم تێڕوانینەوە "نیشانە" هۆکاری ناسینەوەی شتێکە و هەروەها "نیشان دان"یش واتا شتێک دانە ناساندن و خستنە بەر سەرنج. ئەگەر ئەم پێوەندییە ڕاست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑نیتکە nîtke، ↑نووتکە nutke، ↑ناتۆرە natore و هتد. [ناو و نیتکە naw u nîtke، ناو و ناتۆرە naw u natore وەک "ناو و نیشان"].

**نیشانە nîşan(e)** [ *nīšān(a)* ] - "مۆرک، عەلامەت، شۆپ": بڕوانە ↑نیشان nîşan.

**نیشتن nîştın** [ *nīštın* ] - دەگەڵ پێشگری "دا" دێ [دانیشتن danîştın]. نشستن nešastan (P.). پێکهاتووە لە ın + ş(ı)t + nî. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ni- (IE.)** "نەوی، خوارەوە". کەرتی سەرەکی وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *sed- (IE.)** "(دا)نیشتن". ئەم وشانەی خوارەوە لەم ریشەوە هاتوون: sit (E.)، sitzen (G.)، sitan (Gt.)، sitta (Sw.)، seděti

(Lit.) sidet ،(Rus.) hézesthai ،(Gr.) sedere (L.) "دانیشتن". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها وشەیەکی سەرنجراکێش هەیە کە لەم ریشەوە هاتووە، واتا Nest (G.) "هێلانە". ئەم وشەیە هەروەک نیشتن nîştın ی کوردمادی لە پێشگرەکەی سەرەوە و بنەوشەکە دروست کراوە و دە بنچینەدا واتا شوێنی نیشتنەوە یاخود هەڵنیشتنی پەلەوەر.

**نیشە nîşe** [ *nīša* ] - "1- یادداشت 2- نمرەی خوێندکار 3- چەشن، لە شێوەی": خزمە لەگەڵ ↑نیسە nîse "نووسراو" و ↑*نیشان nîşan*. [خەت و نیشان].

**نیک nîk** [ *nīk* ] - "دارێکە بەرداشی پێ نزم و بەرز دەکەن": خزمە دەگەڵ ↑نووک nuk.

**نیگا nîga** [ *nīgā* ] - "روانین": نگاه negāh (P.). خزمە دەگەڵ ↑تیرین nerîn، لەژێر ↑نگا nıga "ئاگا لێبوون"دا شی کراوەتەوە.

**نیگار nîgar** [ *nīgār* ] - "وێنە، نەخش" نگارە nıgare ش دەگوترێ. هەروەها ↑نگارین nıgarîn هەیە بە مانای "وێنە کێشان، نەخش کردن". لەژێر ↑نگا nıga "ئاگا لێبوون"دا شی کراوەتەوە.

**نیگەران nîgeran** [ *nīgarān* ] - "دڵ پەرێشان": نگران negarān (P.). خزمە دەگەڵ ↑تیرین nerîn. دە بنەڕەتدا بە مانای "چاولەدوو بوون، دە چاوەنواریدا بوون" بەکار هاتووە، لەژێر ↑*نگا nıga* "ئاگا لێبوون"دا شی کراوەتەوە.

**نیل nîl** [ *nīl* ] - "رەنگێکی شینی تاریکە لە گیایەک دەگیرێ بۆ خم کردن": نیل nīl (P.). خزمە دەگەڵ nīlā (OIn.) "تاریک، شینی تاریک". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑لێل lel.

**نیلووپەر nîluper** [ *nīlūpar* ] - "ناوی گوڵێک": نیلووفەر nîluper و ↑لیلووپەر lîluper یش دەگوترێ. نیلوفر nīlūfar (P.). دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی نیل(وو) + پەڕ par + nīl(ū). کەرتی یەکەم هەمان ↑نیل nîl ە بە مانای "رەنگێکی شین". کەرتی دووەمیش ↑پەڕ par ی گوڵە و تێکڕای وشەکە ئاماژە دەکا بە شین بوونی رەنگی پەڕەکانی ئەم گوڵە. شیاوی سەرنجە دە وشەی لیلووپەر lîluper یشدا کەرتی یەکەم دەبێ پێوەندی بە ↑لێل lel ەوە و مەبەست لێل بوونی رەنگی پەڕەکانە. لەوانەیە هەردوو وشەی نیل nīl و لێل lel دە ریشەدا یەک وشە بووبن.

**نینۆک nînok** [ *nīnok* ] - "ناخون": ناخون naxun و نینۆخ nînox ش دەگوترێ. ناخن nāxon (P.). دە وشەی "نینۆک" یان "نینۆخ" دا فۆتیمەکان جێگۆڕکێیان کردووە. خزمە دەگەڵ Nagel (G.) nagal ،(OG.) naegel ،(OE.) nil ،(E.) neil ،(OF.) onyx ،(G.) unguis (L.) "نینۆک"، noga (Rus.) "قاچ" و nogot (Rus.) "نینۆک". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەکە مانای "مێخ و بزمار" یشی وەرگرتووە و دە زمانی کوردمادیشدا خزمە دەگەڵ ↑ناڵ nal. دە زمانی سلاڤی کۆندا مانای "قاچ" و دە لاتینیشدا naga (L.) مانای "سم" ی پەیدا کردووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(o)nogh- >** "نینۆک، چەنگاڵ". هەروەها ↑نگ nıg "قاچ، لاق" و ↑نووک nuk و چەندین وشەی دیکەش پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**نیو nîw** [ *nīw* ] - "بەشێک لە دوو بەش": نیم nīm (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ nehmen (G.)، niman (Gt.) و (OE.) nema (OIs.) "هەڵگرتن"، nāma (OG.) "هەڵگرتنی بەزۆر، تاڵان"، nemein (Gr.) " بەش کردن، دابەش کردن" سەر بە ریشەی **(IE.) *nem- >** "دابەش کردن". لەم تێڕوانینەوە نیوە کردن دە بنەڕەتدا بە مانای "بەش کردن"ی شتێک بە دوو ئەندازەی یەکسان بووە.

نیوەنمەک **nîwenımık** ⌊ *nîwanımak* ⌋ - "ئاردی بەئاوی گەرم شێلدراو بۆ سەر برین": ↑نیوە + نمەک nîwe + nımek. کەرتی نمەک دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑نم nım "تەڕایی". لەم تێڕوانینەوە نیوەنمەک واتا "نیوەتەر، کەمێک نمدار".
[تێبینی: لەوانەیە نمک nemak (.P) بە مانای "خوێ" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و ناوی ئەم ماکەیە ئاماژە بە تەڕ و نمدار بوونی خۆیی دەریا بکا].
نێتار **netar** ⌊ *netār* ⌋ - "خونسا، بێ لایەن": > *neutrum* (*L.*) "نێرەمووک" [دە بنەڕەتدا: لە دوولایەن هیچیان].
نێد **ned** ⌊ *ned* ⌋ - "نوخشانە": لەبنەڕەتدا وشەکە بەو مانایە هاتووە کە شتێک یان ڕووداوێک وەک نیشانەیەکی باش بۆ ئاکامی کارێک بە کەسێک نیشان دراوە [خراوەتە بەر چاو، دراوەتە زانین]. دەبێتە خزم لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑نگا nıga دا باس کراون. ↑نوخشانە nuxşane ش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.
نێر **ner** ⌊ *ner* ⌋ - "تەواوکەری مێ": [نێر و مێ]. نەر nar (.P). خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑نەرد nerd "تەختە"دا باس کراون.
نێرتک **nertık** ⌊ *nertık* ⌋ - "لاسکی سەرەکی و ڕەقی گیا": خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd "گەمەی تاوڵە".
نێردیوان **nerdîwan** ⌊ *nerdīwān* ⌋ - "پەیژە": خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە".
نێرز **nerz** ⌊ *nerz* ⌋ - "1- جۆرێک تیخی خەنجەر 2- ئاژەڵی زۆر باش": خزمە لەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە، تەختە" و خێزانەوشەیەک کە دە بنەڕەتدا بە مانای "پتەو، بەهێز"ە.
نێرکە **nerke** ⌊ *nerka* ⌋ - "1- دەرهاتکێ لە دومەڵ 2- چووزەی گیا": خزمە لەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە، تەختە" و خێزانەوشەیەک کە دە بنەڕەتدا بە مانای "پتەو، بەهێز"ە. لێرەدا ئاماژە بە "ڕەقاییەک" دەکرێ کە سەری وەدەر ناوە.
نێرگە **nerge** ⌊ *nerga* ⌋ - "کاریتە، دیرەکێ": خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە".
نێرگەل **nergel** ⌊ *nergal* ⌋ - "ڕیزەئاڵوودار": نێر + گەل ner + gel [واتا دارگەل]. خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە".
نێرۆیی **neroyi** ⌊ *neroyī* ⌋ - "ناوی هۆزێکی کورد": نێروەیی nerweyî ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑نیرکێ nîrg "خورت، بەهێز". جێی سەرنجە کە ناوی زۆرینەی هۆزە کوردەکان پێوەندی بە چەمکی"هێز، پتەوی"یەوە هەیە. لەم بارەوە بڕوانە ئەو وشانەی لەپەڕاوێزی وشەی "سۆران"دا باس کراون.
نێرە**1** **nere 1** ⌊ *nera* ⌋ - "مەشکەی لە دار": خزمە دەگەڵ ↑نەرد nerd "تاوڵە".
نێرە**2** **nere 2** ⌊ *nera* ⌋ - "1- ناوەراست و خوڕایی ئاو 2- شەقەجۆگە [لەبنەڕەتدا: جۆگەی *ناوەندی* یان جۆگەی زل، *بەتەوژم*]": هەروەها نێری nerî و نێرینە nerîne ش دەگوترێ بە مانای "قووڵترین و بەتەوژمترین شوێن لە چەم": خزمە لەگەڵ ↑نێرە1 nere 1 و دواتر ↑*نەرد nerd* "تاوڵە".
نێرە **nere** ⌊ *nera* ⌋ - "زیقەی پشیلە": نووڕە nure ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑نارین narîn "گۆرانی خەمبارانە".
نێرەک **nerek** ⌊ *nerak* ⌋ - "ناوەند، چەق": خزمە دەگەڵ ↑نێرگە nerge "کاریتە، دیرەکێ" و دواتر↑*نەرد nerd*.

تیرین **nerîn** [ *nerīn* ] - "روانین": نهێرین nıherîn یش دەگوترێ. نگریستن negarīstan (P.). هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑نیگا nîga و ↑نیگەران nîgeran [دە بنەڕەتدا: چاولەدوو] و هەروەها ↑نەریت nerît "داب و شوێن، ترادیسیۆن" [دە بنەڕەتدا: چاولێکەری لە رابردوو، تەقلید یاخود تەقالید". لەژێر ↑نگا nıga "ئاگا لێبوون"دا شی کراوەتەوە.

تیز **nez** [ *nez* ] - "برسی": خزمە دەگەڵ ↑نیاز nîyaz "ئاتاج، پێداویستی".

تیزە **neze** [ *neza* ] - "داری نووک تیژ": دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە دەکرێ گشتیان دە چوارچێوەیەکدا لێک بدەینەوە. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە چەمکی "تیژی" دەکەن، وەک ↑نووک nuk، ↑نەقیزە neqîze، ↑نەشتەر neşter، ↑نژ nıj، ↑نژدار nıjdar "برینکەر"، ↑نەژاخ nejax "تەوری گچکە"، ↑ناژ naj "داری سنەوبەر" [گەڵاکانی تیژ و نووکدارە]، ناخار2 naxar "تیخی دەبانی تیژ" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ نیش nīš (P.) "تیژایی، نووک" و دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑نینۆک *nînok*، سەر بە ریشەی **(IE.) *nogho- >** "نینۆک، چڕنووک".

تیسکان **neskan** [ *neskan* ] - "سەما و گەمە کردنی ئەسپ": هەروەها تیسک nesk هەیە بە مانای "سەمای ئەسپ". ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑نینۆک nînok دا هاتوون. لەم بارەوە بەتایبەتی ↑نگ nıg "قاچ، لینگ"، noga (Rus.) "قاچ" و naga (L.) "سم". وشەکە ئاماژە بە سەمای قاچ و سمی ئەسپ دەکا، واتا کاتێک ئەسپ بە قاچ و سم سەما دەکا.

تیش **nêş** [ *neš* ] - لەگەڵ "ئێش دێ [ئێش و تیش êş û nêş]. هەر وەک چۆن "ئێش" پێوەندی بە "ئاه" [ئاه و ناڵە] و "ئاهین، ئاخین"ەوە هەیە، هەر بەم چەشنە "تیش" خزمە لەگەڵ ↑نکین nıkîn "ناڵین".

تیفەک **nefek** [ *nefak* ] - "پارچەی سێ سووچی ناوەراستی دەرپێ": خزمە دەگەڵ ↑ناو2 naw "هەناو، ناوەراست". دە زمانی ئەڵمانیدا بە داری ناوەندی چەرخ، واتا ئەو بەشەی راست دەکەوێتە چەقی چەرخ، دەگوترێ Nabe (G.).

تیک **nek** [ *nek* ] - "ئێسکی ران": خزمە لەگەڵ ↑نگ nıg "قاچ، لینگ".

تیڵ **nel** [ *nel* ] - تیڵ دان واتا "خۆش کردنی ئاگر و تەوژم پێدانی". خزمە دەگەڵ Schnell (G.)، snel (Nl.) "خێرا، لەزگین"، snel (OG.)، snell (OE.)، snjallr (OIs.) "بەهێز، زرینگ، خێرا، بەتوانا، بەدەستوبرد". دە زمانی سوێدی دا snäll (Sw.) ماناکەی گۆڕاوە و بووەتە "دەلال، میهرەبان"، ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. ئەم وشەیە لە پلەیەکی دوورتردا دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑نەرد texte "دار، تەختە".

تیوان **newan** [ *newān* ] - "تیوەراست، مابەین، فاسیلە": خزمە دەگەڵ ↑ناو2 naw "هەناو، دیوی ژوورەوە".

تیوگەڵ **newgel** [ *newgal* ] - "ناو هەردوو ران": تیو new [↑ناو2 naw] + ↑گەڵ gel.

وا¹ **wa** [ *wā* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑وەها weha. ئەوها ewha و ئاوا awa ش دەگوترێن. لەم دوو شێوەی دواییدا پێشگری e یان a بە سەرەتای وشەکەوە لکاوە. شێوەی ئەسڵی وشەکە ↑وەسا wesa یە کە بووەتە "وەها" و دواتر شێوەکانی دیکەی لێ پەیدا بووە.

[تێبینی: وەک لەسەرەوە باس کرا، دە وشەکانی "ئەوها" و "ئاوا"دا پێشگری ئە e یان ئا a بە سەرەتای وشەکانەوە لکاوە. هاتنەئارای ئەم پێشگرە دە ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی و فارسیدا دەبیندرێ و لەوانەیە بۆ ئەوە بەکارهاتبێ کە وشەکان لەسەر زار خۆشتر بکا. چەند نموونەیەک لەو وشانەی ئەو پێشگرەیان بەسەرەوە هەیە، برینتین لە ئاهەنگ، ئەدەب، ئارام، ئاراستە، هەنگاو [ e بووەتە he]، ئەنجنین یان هەنجنین، ئاتەگ، ئەتک، ئاپۆڕە، هەترە، ئەژمار یان هەژمار و هتد].

وا² **wa** [ *wā* ] - [وا وەرە، وا وەچوو، واوەتر دایبنێ]. وەک دەبینین لێرەدا "وا" وەک وشەیەکی سەربەخۆ دەور دەبینێ و مانای "دوور بوونەوە" دەگەیەنێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ پێشگر یان پاشگری ↑وە we [وەکردن یان کردنەوە، وەگەڕان یان گەڕانەوە]. ئەم پاشگرە لە ریشەیەکەوە دێ کە ئاماژە دەکا بە لێک جیا بوونەوە، دوور بوونەوە. بڕوانە پاشگری ↑وە we.

و**ا3** **wa** [ *wā* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑با ba [بای شەماڵ].

وا⁴ **wa** [ *wā* ] - "خۆزی، کاشکی": خزمە لەگەڵ ↑*ویستن wîstın*، ↑هەوا hewa [هەوایەکی لە کەللە دایە] و ↑با ba [دڵە بەبا] واتا دڵێک کە حەزی هەیە. ژمارەیەکی دیکە لە وشە خزمەکان لەژێر ↑نەباندن nebandın "وە خۆ نەگرتن، حەز لێ نەکردن"دا باس کراون.

-وا⁵ **wa** [ *-wā* ] - لە وشەی نانەوا nanewa "نانکەر"دا بەکار دێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- شێوەیەکی کورتکراوە لە پاشگری ↑وان wan- "پاشگری ئاگاداری و پاراستن" [وەک باخەوان، دەرکەوان،...].

2- hlāford (OE.) [*hlāward*] "نانەوا". ئەم وشەیە دەبنەڕەتدا مانای "پارێزەر یان ئاگاداریکەری نان" دەگەیەنێ و بە مانای "نانەوا" بەکار هێنراوە. دواتر شێوە و مانای وشەکە گۆڕاوە و بووەتە lord "سەروەر، ئاغا". کەرتی دووەمی وشە ئینگلیزییەکە خزمە لەگەڵ ↑واهر wahır "خاوەن، سەرپەرست" [لەبنەڕەتدا: ئاگاداریکەر].

[تێبینی: وشەی "لورد" لە لای ئێمە بە مرۆڤی خەرپووڵ دەگوترێ، لای ئینگلیزییەکان وەک ناوی "خودا"ش بەکار دەهێنرێ. وەک دەبینین لێرەدا پێوەندییەک لەنێوان دوو چەمکی "نان" و "خودا" دروست دەبێ. لەسەردەمی منداڵی مندا لە مەهاباد کاتێک ورکەناتێک لەسەر هەرد بکەوتایە، هەڵیان دەگرتەوە و بە رێزەوە دەیانخستە کەلێن و قوژبنی ناو دیوارێک یان سەر دیوارێک بۆ ئەوەی کەس پێی لێ نەنێ، دەیانگوت "نان پەڕێک لە قورئان گەورەترە". هی وابوو ورکەنانەکەی ماچ دەکرد و ئەوجار دەیخستە کەلێنێکەوە. جارێکیان بە منداڵی لەباوکم پرسی "ئەری بابە یانی چی نان پەڕێک لە قورئان گەورەترە"؟ باوکم کە لەباری دین و ئیمانەوە لەناوشاردا ناو و ناوبانگی هەبووە و ئێستاش خاوەنی مزگەوتێکە بە ناوی خۆی، گوتی رۆڵە

ئەگەر مرۆڤ برسی بێ و هیچی نەبێ بیخوا و قورئانێکی لە ماڵدا هەبێ، قورئانەکەی دەفرۆشێ بۆ ئەوەی نان بکڕێ و لەبرسان نەمرێ. بریا لەسەردەمی ئێستاشدا ئاوا رێزی نان بگیرایە].

**واپۆک wapok** [ *wāpok* ] - "رمۆک، قوشقی": بنەوشەی واپ wap- خزمە دەگەڵ wipf (OG.) "بزوانی خیرا، دەرپەڕین"، wippen (G.)، (Nl.)، whip (E.) "بزوان، بازد دان، هەڵبەزین، راژان". [دە بنەڕەتدا: جوڵانەوە بەم لا و ئەولادا]. خزمیشە دەگەڵ ↑فافۆن fafon.

**واتا wata** [ *wātā* ] - "مانا": دەچێتەوە سەر وتن wıtın [↑گوتن gutın]

**واتۆ wato** [ *wāto* ] - "دەنگۆ": دەچێتەوە سەر وتن wıtın [↑گوتن gutın].

**واج wac** [ *wāj* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑وێژ wej [گێژ و وێژ].

**واجە wace** [ *wāja* ] - "دەلاقەی کوناودیو": باجە bācje (P.). دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑دەربیچە derbîce "رۆچنە لە دەرگا و پەنجەرەدا".

**واخ wax** [ *wāx* ] - "ئاخ و داخ": خزمە دەگەڵ ↑وەی wey و ↑وەیش weyş و ↑وەه weh "دەنگی ئێش و ئازار".

**وار1 war** [ *wār* ] - "ماڵ، جێگەی ژیان": خزمە دەگەڵ ↑وارش warş و چەند وشەیەکی دیکە بە مانای "بەربەست کردن، دیوار کردن". لەوانەیە "وار" دەبنەڕەتدا بە مانای "حەوشەی ماڵ" بووبێ واتا شوێنێک کە بە پەرژین دەورە دراوە واتا بەربەست کراوە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑بیر bîr "هزر" و ↑وریا wırya.

**وار2 war** [ *wār* ] - "خواروو، ژێر": شێوەیەکی دیکە لە ↑خوار xuwar "ژێر". خزمە لەگەڵ ↑وەرین *werîn* "هاتنە خوار، کەوتنە خوار" و وارنایش warnayış "هاتنە خوار".

**وار3 war** [ *wār* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑خوار xuwar [خوارزا واتا خوشکەزا] و ↑خوشک *xuşık*. واهەر waher یش دەگوترێ.

**وار4 war** [ *wār* ] - لەگەڵ "وەش" دێ و دەگوترێ [وەش و وار weş û war واتا ساغ و بەدەماخ]. "وەش" شێوەیەکی دیکەیە لە "خۆش". "وار" خزمە لەگەڵ ↑وەڕەک werek "خۆزگە، وەشڵە" و خزمە لەگەڵ ↑بریا bırya و هەروەها دەبێتە خزم لەگەڵ woll (G.) و well (E.) "باش". ئەم وشانە دواجار دەچنەوە سەر ریشەی **< *uel-, *wel- (IE.)** "ویستن، هەڵبژاردن". شیاوی باسە کە "وەش" [خۆش]یش خزمە لەگەڵ "ویستن". هەم "خۆش" و هەم "وار" لەبنەڕەتدا بەمانای "دڵخواز، بەگوێرەی ویست و ئارەزوو" بووە.

**وار5 war** [ *wār* ] - دەگەڵ "ویخ" دێ [وار و ویخ war u wîx واتا "دار و نەدار، هەست و نیست]. وشەکان لە *war* (Tur.) و *yox* (Tur.) وەرگیراون، بە مانای "هەیە و نییە".

**-وار6 -war** [ *wār* ] - پاشگرێکە لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا و مانای "هەڵگر" دەداتە ئاوەڵناوەکە، وەک ↑خوێندەوار xuwendewar واتا "هەڵگری خوێندن و زانست" یان ↑بەندەوار bendewar واتا "هەڵگری بەسترانەوە، هەڵگری بەستراوە بوون". شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑-بار4 -bar بە هەمان مانا و هەروەها پاشگری ↑وەر wer- [بەختەوەر، هونەوەر، دادوەر...].

**وارای waray** [ *wārāy* ] - "گۆڕان": ↑فارای faray یش دەگوترێ. شێوەی کۆنتری ↑گۆڕان *goran* ە، واتا بنەوشەکە سەرەتا "گۆڕ-" نەبووە، بەڵکوو وار war- بووە و بووەتە گۆر gor- [گۆڕانی فۆتیمی w بە g]. ئەم بنەوشەیە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر وشەی ↑وەرانین weranîn دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران". دە زمانی ئەڵمانیدا werden (G.) "بوون، تەبدیل بوون" [لە شتێکەوە بوونە شتێکی دیکە] لەم

ریشەوە هاتووە، کە لە باری شێوە و ماناوە نیزیکی زۆرە دەگەڵ "وارای" یاخود "گۆڕان"ی کوردمادی.

[تێبینی: دوو چەمکی "گۆڕان" و "سووڕان یان با دران" پێوەندی توند و تۆڵیان پێکەوە هەیە. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە wenden دەبێتە "با دانەوە، گەڕاندنەوە" و wandeln دەبێتە "گۆڕین" و هەر دووکیان خزمن دەگەڵ "با ba دانەوە"ی کوردمادی].

**واربای warbay** *[ wārbāy ]* - "پێپەتی": وارواى warway یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە وار war+ bay/ way . ئەم دوو وشەیە دەقاودەق یەک دەگرێنەوە دەگەڵ barfuß (G.) "پێپەتی". کەرتی یەکەمی ئەم وشانە بە مانای "رووت"ە و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بەیار beyar "رووتەن". کەرتی دووەم بە مانای "پا، ↑پێ pe "یە.

**واڕزدن warızdın** *[ wārızdın ]* "دوورین، دروون": ↑ورازین wırazîn، وراستن wırastın دەگوترێ. هەروەها واڕز wārız و وراز wıraz بەمانای " درووماں" بەکار دەهێنرێن.

**وارش warş** *[ wārš ]* - "دیواری (دەوری باخ و بێستان)": خزمە دەگەڵ باروو bārū (P.) "دیواری قەڵا". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دە زمانی کوردمادیدا کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەربەست کردن، پەرژین کردن، پاراستن"، وەک ↑وار war "ماڵ"، ↑بیر bîr "هزر" [دە بنەڕەتدا: حافظة] و ↑وریا wırya. هەروەها خزمە دەگەڵ -varez (Av.) "بەربەست کردن"، vraja-h (OIn.) "لەمپەر، پەرژین"، fraig (OIr.) "دیوار"، werī (OE.) "قایم کردن، پەنا گرتن، خۆ پاراستن"، verja (OIs.) "بەرگری کردن"، Gewehr (G.) "تفەنگ" و گەلێک وشەی لەم چەشنە.

**واڕن warın** *[ wārın ]* - "خوری بە چەنگ ڕناو": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وێرت wert سەر بە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، ڕنین".

**واروندا warwında** *[ wārwındā ]* - "وەجاخ کوێر": وارکۆر warkor یش دەگوترێ، واتا ئەو کەسەی ↑وار[1] war هکەی [ماڵەکەی] کوێر دەبێتەوە، ون دەبێ و لە ناو دەچێ.

**وارۆ waro** *[ wāro ]* - "ئاوەژوو": وارونە wārūne (P.). خزمە لەگەڵ ↑وار2 war "خوار، ژێر"، ↑وەرین werîn "هاتنەخوار" و هتد. مانای بنەڕەتی وشەکە دەشێ "سەراوبن، سەراوژێر" بووبێ. لەنێوان دوو چەمکی "ئاوەژوو" و "سەراوبن"دا پێوەندی هەیە. لە زمانی فارسیدا "واژگون" بەمانای "سەراوبن، سەرنخوون" بەکار دێ و خزمە لەگەڵ "ئاوەژوو" [ئا-وەژوو].

**-وار(ە) -war(e)** *[ -wār(a) ]* - پاشگرێکە و دەگەڵ هێندێک وشە دێ وەک دەستەوارە desteware. دەشێ دەبنەرەتدا "بارە bare" بووبێ ["دەستەبارە destebare"واتا باری دەست].

**وارە ware** *[ wāra ]* - شێوەیەکی دیکە لە بار، ↑بارە bare [دە وشەکانی " لە *بارە*ی" یان "*بار* و دۆخ" دا].

**وارەسە warese** *[ wārasa ]* - "خەبەر پێدان": خزمە لەگەڵ ↑وریا wırya [وریا کردنەوە] و دواتر ↑بیر bîr [ویر wîr].

**وار1 waz 1** *[ wāz ]* - "تاسە، مەیل": خزمە دەگەڵ ↑ویستن wîstın. وشەی وازوازی wazwazî لە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشەوە هەیە و مەبەست کەسێکە کە زووزوو "واز"ی دەگۆڕدرێ و هەردەم لەسەر هەوایەکەیە. ئەم وشە کوردمادییە لە زمانی عەرەبیدا گۆڕاوە و بووەتە وسواس و وسوسة (Arb.).

**واز2 waz 2** *[ wāz ]* - "بازد": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑بازد bazd.

**واز3 waz 3** *[ wāz ]* - "ئاواڵە، کراوە": دە فارسیدا باز bāz (P.). دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا واز wāz دەگوترێ کە شێوەی کۆنتری وشەکەیە. پێوەندی هەیە بە پێشگر یان پاشگری ↑وە we

[وەکردن یان کردنەوە، وەگەڕان یان گەڕانەوە]. ئەم پاشگرە لە ریشەیەکەوە دێ کە ئاماژە بە لێك جیا بوونەوە، دوور بوونەوە دەکا.

**وازⁿ waz** [ *wāz* ] - دەگەڵ "لانە" دێ: ↑لانەواز lanewaz واتا دووربۆوە لە لانە، لانەگومکردوو، لە لانە هەڵبڕاو. کەرتی واز waz خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑وازرwazır یان ↑بازر(ە) bazır(e) "1-تەرە 2- سرك"، ↑بزر bızır "گوم"، ↑باز baz "1- رێگە 2- راکردن، دەرپەڕین" و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بزووتن bızûtın. ئەم کەرتە هەروەها دە وشەی ↑*پەرەوازە perewaze* یان پەرتەوازە pertewaze شدا دەبینرێ.

**واز[5] waz** [ *wāz* ] - "1- کەمێکی جیا [تاق و واز پەیدا بوون] 2- جزیرەی بچووك لە ناو رۆبار [لە بنەڕەتدا: جیا بووە، تاق و واز هەڵکەوتوو] 3- دەگەڵ، وێرا [واز تۆ دێمە شار] 4- دیسان [باز bāz (.P) ]": گشت ئەم مانایانە سەرەرای جیاوازییان، پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان بەیەکەوە هەیە و بۆیە هەوڵ دەدرێ بەیەکەوە شی بکرێنەوە. "واز" بە هەموو ئەم مانایانەوە پێوەندی هەیە بە ↑واز3 waz "ئاواڵە، کراوە" [باز bāz (.P)] و دواتر پێشگر یان پاشگری ↑*وە we* [وەکردن یان کردنەوە، وەگەڕان یان گەڕانەوە]. ئەم پاشگرە لە ریشەیەکەوە دێ کە ئاماژە بە "(لێك) جیا بوونەوە، دوور بوونەوە" دەکا. پێوەندیی ماناکانی یەکەم و دووەمی وشەکە بە ریشەکەوە ئاشکرایە. سەبارەت بە مانای سێهەم دەبێ ئاماژە بکەین بە with (.E) "لەگەڵ، وێرا". ئەم وشە ئینگلیزییە پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە و لە هەمان ریشەوە هاتووە. سەبارەت بە مانای چوارم، واتا "دیسان" دەبێ ئاماژە بکەین بە wieder (.G) "دیسان" کە لەگەڵ وشە ئینگلیزییەکە خزمە. بەگوێرەی بۆچوونی ئێتیمۆلۆگە ئەورووپییەکان لە مانای بنەڕەتی "لێك جیا، لێك دوور" مانای "دیسان" سەری هەڵداوە. پێوەندی ئەم چەمکانە لە هێندێك وشەی کوردمادی و ئەڵمانیدا بە دیار دەکەوێ. دە زمانی ئەڵمانیدا weit (.G) "دوور" مانا دەدا، weiter (.G) دەبێتە "1- دوورتر 2- هەروەتر، دیسان، دەی". ئەم وشانەش خزمن لەگەڵ وشەکانی سەرەوە. لە کوردمادیدا ↑هەروەتر herwetır [ her-wetır] - ناوچەی موکریان بەکاری دێنێ- خزمە لەگەڵ وشەکانی سەرەوە و مانای "هەروەها، دیسان" دەبەخشێ [میناك لە رستەدا: ئەمە بەڵگەیەکە بۆ باسەکە، هەروەتر دەتوانین ئاماژە بە بەڵگەیەکی دیکە بکەین، واتا دیسان دەتوانین ئاماژە بە بەڵگەیەکی دیکە بکەین]. لێرەوە دەتوانین پەی بە مانای "لەگەڵ"یش ببەین. وشەی "هەروەتر" یان "هەروەها" لە زمانی کوردمادیدا چەمکی "لەگەڵ"یش دەگرێتە خۆ. بۆ وێنە کاتێك دەگوترێ "چوومە هەولێر و هەروەتر چوومە ئامێد" مەبەست ئەوەیە، "*جیا* لەهەولێر، سەردانی ئامێدیشم کرد"، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم مانایەش پەیدا دەبێ "وێرای سەفەری هەولێر، سەردانی ئامێدیشم کرد".

**واز[6] waz** [ *wāz* ] - "وەعز، نوتقی مەلا": خزمە لەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەك ↑وشە wışe، ↑وێژە weje، ↑بێژتن bêjtın، ئاواز awaz [a-waz]. وشەکە لە زمانی عەرەبیدا گۆڕانی بەسەرداهاتووە و بووەتە وعظ waεz (.Arb).

**-واز[7] -waz** [ *wāz* ] - پاشگر بە مانای "گەمە کردن، سەرگرم بوون" [کۆترواز، مەکرواز، قومارواز...]. شێوەی کۆنتری باز -baz و دەچێتەوە سەر ↑*بازی bazî* یان وازی wazî "گەمە، کایە".

**وازار wazar** [ *wāzār* ] - شێوەی کۆنتری ↑بازار bazar.

**وازانەوە wazan(ewe)** [ *wāzān(awa)* ] - "لەرانەوە، جووڵانەوە" [وەک دەرگایەکی کراوە کە با دەیجووڵێتەوە یان شتێک کە چەندین جار بەدوای یەکدا دەلەرێتەوە. خزمە دەگەڵ ↑هەڵبەزینەوە helbezîn(ewe) و ↑ڕاوەشان *raweşan* و دواجار ↑بزووتن bızûtın.

[تێبینی: هەر سێ وشەی (هەڵ)بەزینەوە، (ڕا)وەشان و وازان(ەوە) دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش بە مانای "بزووتن، حەرەکەت کردن، ڕۆیشتن". جیاوازی ئەم وشانە لە مەدایە کە وشەی "هەڵبەزینەوە" ئاماژە بە بزاڤی ئەستوونی دەکا واتا سەر و خوار کردن. دوو کردارەکەی دیکە بۆ بزاڤی ئاسۆیی بەکار دێن، واتا ئەم لا و ئەو لا کردن].

**وازر wazır** [ *wāzır* ] - "1- بازر(ە)، تەرە 2- سرک، لەسەر هەست": شێوەی کۆنتری ↑بازر bazır.

**وازوازی wazwaz** [ *wāzwāzī* ] - "هەردەم لەسەر هەوایەک": خزمە دەگەڵ ↑واز waz و ↑ویستن *wîstın* [وازتن waztın یش دەگوترێ]. وسواس waswās (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

**وازە[1] waze** [ *wāza* ] - "بازک، ئاژەڵی بەڵەک": لە شی کردنەوەی وشەی "بەڵەک"دا دەرکەوت کە ئەم وشەیە دە چێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سپی چوونەوە، بریقانەوە" و لێرەوە بەو ئاژەڵانەی پەڵەی سپی یان کاڵ بەسەر پێستیانەوە بووە، گوتراوە بەڵەک، چونکوو ئەو پەڵانە لەسەر رووبەری رەش، بۆر، قاوەیی، سووری پێستەکەدا بریقاونەوە. هەر بەم شێوەیە وشەی وازە waze یان بازک bazg خزمە دەگەڵ weiß (P.)، (h)wīz (OG.)، white (E.)، vit (Sw.) "سپی"، śvindatē (OIn.) "دەبریسکیتەوە"، śvēta-h (OIn.) "سپی"، šviēti (Lit.) "هایسان، تیشک دان"، svet (Rus.) "تیشک، رووناکی"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *kuei-** "هایسان، تروسکانەوە، تیشک دان". خزمە دەگەڵ ↑سپی sıpî و ↑سووتان sutan [یان شەوتین şewtîn] و هتد.

**وازە[2] waze** [ *wāza* ] - "زیپکەی رووی زارۆک": هەروەها وەزە weze ش دەگوترێ بە مانای "نەخۆشییەکی زاری منداڵان". خزمە دەگەڵ wehen (G.)، wahen (OG.)، wajan (OE.)، vejat (Rus.) "با هاتن، هەڵکردنی با، با کران". دە زمانی فارسیدا وزیدن wazidan (P.) هەیە ["وزیدن باد" واتا هەڵکردن یاخود هاتنی با]. دە زمانی کوردمادیدا وژ(ژ)ە wıj(j)e ی با هەیە بە مانای "دەنگی بای توند". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑با ba و دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *(a)uē-** "با هاتن، با کران". ئێستا بزانین پێوەندی ئەم ریشەیە بە "زیپکە"وە چییە. ئەگەر سەیری وشەکانی "بالۆکە"، "ئاوڵە" و "بۆقژە" بدەین، دەبینین کە ئەم وشانە دەچنەوە سەر دوو ریشەی دیکە کە ئەوانیش مانای "با کران، هەڵمسان" دەدەن. هەر بەم شێوەیە لە ریشەی *(a)uē- وشەی "وازە" بە مانای زیپکە سەری هەڵداوە کە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە هەڵمساوی و باکراوییەکی (بچووک) لە سەر پێست دەکا.

[تێبینی1: دە زمانی ئەڵمانیدا Blase (G.) بە مانای "بلۆق" بە کار دێ و هاوکات مانای "بڵق"یش دەدا و دەچێتەوە سەر کرداری blasen (G.) "با کردن، فوو (تێ) کردن". لەم نموونەیەدا پێوەندی دوو چەمکی "زیپکە، بلۆق" و "با کران" بە روونی دەردەکەوێ. تێبینی 2: سەبارەت بە وشەی وژ(ژ)ە wıj(j)e خاڵێک جێی باس کردنە. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە هەن، کە دەکرێ وەک "وشەی دەنگی" یان "دەنگەوشە" بە ناویان بکەین، وەک شڵقە، شەقەقە، تەقە، گڤە، رەپە و هتد. ئەم وشانە دە زمانی ئەمرۆی کوردمادیدا دەربڕی دەنگی هێندێک شتن، بەڵام لەراستیدا ئەم وشانە پێشتر وشەی تەواو و سەربەخۆ بوون و تەنانەت وەک کردار مانای تایبەتی خۆیان هەبووە. دواتر ئەم وشانە - هێندێک جار شوێنەواریان کز بووەتەوە - مانای

ئەسڵی خۆیان لە دەست داوە و مانای دەنگیکیان وەرگرتووە. هەر بەم جۆرە دەتوانین باس لە وشەی وژ(ژ)ە wıj(j)e بکەین کە پێشتر بنجی کردارێك بووە بە مانای "هاتن و هەڵکردنی با" - وزیدن wazidan (P.) - و دواتر وەك کردار وەلا نراوە و بنجەکەی مانای "دەنگی با"ی وەرگرتووە].

**وازی wazî** [ *wāzī* ] - " کایە، گەمە": بازی bāzī (P.). خزمە دەگەڵ ↑بازد bazd، ↑بەزین bezîn و ↑بزاوتن bızawtın و هتد. مەبەست لە وازی دە بنەڕەتدا "هەڵبەز دابەز" بووە.

[لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی لیزین lîzîn ی کوردمادی بە مانای "کایە کردن" و leichen (MG.) "خۆ هەڵاویشتن، کایەکردن"].

**واژ1 waj 1** [ *wāž* ] - "وەبەر هاتنی مەڕ": خزمە دەگەڵ واز1 waz 1 "تاسە، مەیل" و ↑ویست wîst [↑ویستن wîstın].

**واژ2 waj 2** [ *wāž* ] - "پێچەوانە": دە وشەکانی ↑بەرەڤاژی berevajî و ↑ئاوەژوو aweju شدا دەیبینین. لەوانەیە بە شێوەیەکی دیکە لە ↑چەواشە çewaşe شدا بەدی بکرێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە خوار بوون، چەمان، با دران" دەکەن، وەك ↑وێش wêş [واش1 waş 1] "خوار و خێچ"، ↑وێژە weje "کەڵەوە"، وێزنین weznîn [هەڵوێزنین] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *uei-** ***(IE.)*** "چەمانەوە، سووڕان". هەروەها وشەی ↑وێژینگ wejîng "چۆرت، خەونووچکە" [چەمانەوەی مل لە کاتی خەو بردنەوەدا]، ↑وەگ weg "چاخ، هەڕەت" [چەرخی رۆژگار] و ↑بی bî پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. ناوی "دارەبی" بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شووڵەکانی بە باشی دەچەمێنرێنەوە و بۆ کاری قەرتاڵەچنین کەڵکی لێ وەرگیراوە.

**واژۆ wajo** [ *wāžo* ] - "ئیمزا، مۆر": *visa (Fr.)* < "مۆر، شەقڵ، ئەرێ کردن" < *videre (L.)* "دیتن". مانای وشە فەرانسەییەکە دە بنەڕەتدا "دیتراو" بووە، واتا نووسراوەیەك لە لایەن کاربەدەست یان مرۆڤی پێوەندیدار دیتراوە.

**واژە waje** [ *wāža* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑وشە wışe و دواجار خزمە دەگەڵ ↑بێژتن bejtın "گوتن".

**واسە wase** [ *wāsa* ] - "ئێشك": واسە گرتن واتا ئێشك گرتن. خزمە لەگەڵ پاس pās (P.) "ئاگا لێبوون، چاوەدێری" و هەروەها پاشگری ↑وان wan- [باخەوان، دەرکەوان...].

**واش1 waş 1** [ *wāš* ] - "خوار و خێچ": شێوەیەکی دیکە لە ↑واژ2 waj 2 "پێچەوانە".

**واش2 waş 2** [ *wāš* ] - لەگەڵ "شاش" دێ [شاش و واش şaş û waş، بۆ وێنە دەگوترێ بیرت شاش و واشە]. "شاش" دە بنەڕەتدا مانای "لێك بڵاو، لێك جودا" دەبەخشێ. هەر بەم جۆرە "واش" دەبێتە خزم لەگەڵ ↑واز[5] waz، سەر بەریشەیەك بە مانای "لێك جودا".

**-واش3 -waş 3** [ *-wāš* ] - پاشگرێکە بە تایبەتی دەگەڵ رەنگ دێ [سپی واش sıpîwaş]. دە بنەڕەتدا بە مانای "جۆر، چەشن، گۆن"ە و مەبەست وێکچوونە، وەك سپی چوون(ەوە)، رەش چوون(ەوە). خزمە دەگەڵ ↑وەك wek و ↑*وەسا wesa* "ئاوا، وەها". دە زمانی فارسیدا وەش - waš (P.) وەك پاشگر بەکار دێ بە مانای "مینا، وەك"، بۆ وێنە مهوش mahvaš (P.) "وەك مانگ"، پریوش parīvaš (P.) "وەك پەری".

**واشتا waşta** [ *wāštā* ] - "دڵدار، حەز، گراوی": خزمە دەگەڵ ↑ویستن wîstın.

**واشە1 waşe 1** [ *wāša* ] - "باز": هەر سێ وشەی ↑باز baz و واشە waşe و ↑باشوو başû دە بنەڕەتدا یەك وشەن و سێ شێوەی جیاوازیان پەیدا کردووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بزاڤ

bızaw و ↑بزاوتن bızawtn. ئەم پەلەوەرە بە هۆی بزاوتی خێرا و چالاکی لە کاتی فڕیندا بەم جۆرە ناونراوە. [فۆتیمی w کۆنترە لە فۆتیمی b و لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑وشاندن weşandın. لەم وشەیەشدا ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکان بە هەمان شێوە بەرچاو دەکەوێ].

**واشە2 waşe 2** [ *wāša* ] - "تفاقی ئاژەڵ": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:
1- Wiese (G.) "چیمەن، سەوزەڵان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ueis-** "چەکەرە کردن، شین بوون، هەڵدان". wīse (OE.) "چەکەرە، لاسک" و viridis (L.) "سەوز" لەم ریشەوە هاتوون.
2- Weide (G.) "بژوێن، سەوزەڵان"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *uei-** "وەشوێن (خواردن) کەوتن، خواردن دەست خستن".

**واق waq** [ *wāq* ] - واق وڕ مان واتا "سەرسام بوون، سەر سووڕ مان". خزمە دەگەڵ ↑هۆش hoş "زەین، ئاگا". واق وڕ مان دە بنەڕەتدا واتا تیکچوونی هۆش، هۆش لە خۆ نەمان و گێژ و وێژ بوون. هەروەها واق پەڕین waq perîn هەیە بەمانای "بێهۆش بوون (لە ترسان)".

**واقاندن waqandın** [ *wāqāndın* ] - "ناڵینی رێوی و کەروێشک": بنەوشەی واق -waq هەم بۆ دەنگی رێوی و کەروێشک بەکار دێ [واق واق، واقەواق] و هەم بە مانای "قیژە" [واق و ویق wîq u waq ی زارۆکان] و هەمیش بە دەنگی مەڕ وماڵات دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا واق واق waq (P.) بە "وەڕینی سەگ" دەگوترێ. خزمە دەگەڵ wiehern (G.)، wihen و weijen (MG.)، weion و weigon (OG.) دەنگی بلیند و ناخۆش دەرهێنان". ریشەی وشەکە وەک لاسا کردنەوەی دەنگ باس کراوە، بەڵام دوور نییە وشەکە پێوەندی بە ↑وشە wışe ەوە هەبێ.

**واک¹ wak¹** [ *wāk* ] - "ماسیگرە": خزمە دوگەڵ ↑واقاندن waqandın. ئەم پەڵەوەرە بەهۆی زاق و زیق کردنەکەی بەم جۆرە ناوزەد کراوە. ناوەکەی دیکەی ئەم پەڵەوەرە "زیقاوڵە"یە کە ئەویش دەچێتەوە سەر "زیقاندن".

**واک² wak²** [ *wāk* ] - "واتیک، شت، هین": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ with (OG.)، waihts (Gt.) "هین، شتەکە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Grm.) *uekti* "شت، هین".

**واکس waks** [ *wāks* ] - "بۆیاخ": وشەیەکی وەرگیراوە: < *(E.) wax*، Wachs (G.)، vax (Sw.)، was (Nl.)، vosk (Rus.) "مۆم، مێو". دە بنەڕەتدا بە مێوی هەنگوین گوتراوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *ueg-** "تەنین، چنین، هۆنین". خزمە دەگەڵ ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین]. ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی **< (IE.) *uei-** "چەماندنەوە، سووڕاندن، با دان".

**واڵ¹ wal¹** [ *wāl* ] - "پان، گوشاد، پەل": خزمە دەگەڵ ↑وڵات wılat سەر بە ریشەی **< *pla-**، **(IE.) *ple-** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

**واڵ² wal²** [ *wāl* ] - دەگەڵ "ئاڵ" دێ [ئاڵ و واڵا al u wala واتا رەنگاوڕەنگ]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Farbe (G.)، verf (Nl.) "رەنگ"، farawēr (OG.) "رەنگین"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *perk-** "پەڵەپەڵە، رەنگاورەنگ". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پرشنگ pırşeng و ورشە wırşe.

**واڵا wala** [ *wālā* ] - واڵا کردن وەک "راڤە کردن" مانا کراوەتەوە. بە فارسی نووسراوە "شرح و تفسیر". مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "کردنەوە" بێ، بە مانای بەربڵاو کردنەوەی باسێک یان بە بەربڵاوی باس کردن. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑واڵ¹ wal¹ "پان، گوشاد، پەل" و دواتر ↑بڵاو *bılaw*.

**واڵامەن walamen** [ *wālāman* ] - "جۆرێک زیپکە": خزمە دەگەڵ ↑بالۆکە baloke.

**واڵە¹ wale** *[ wāla ]* - دەگەڵ "وردە" دێ [وردەواڵە wırdewale واتا کەڵەوپەلی ورد. هەروەها دەگەڵ "ئاسن" دێ و دەگوترێ ئاسنەواڵە واتا کەلوپەلی ئاسن]. بەشێوەی وێڵە wele- ش بەکار دێ، دە وشەی ↑دانەوێڵە danewele دا بە مانای "بەرهەمەکان (جۆرەکان)ی دەخڵ و دان". خزمە دەگەڵ Ware (.G)، vaar (.Nl)، vara (.Sw)، ware (.E) "کالا، کەلوپەل". ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ ↑وریا wırya، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پاراستن، ئاگاداری لێکردن". مەبەست دە بنەڕەتدا ئەو شتانە بوون کە پێویستیان بە ئاگاداری لێکردن هەبووە.

**واڵە² wale** *[ wāla ]* - دە زاراوەی موکریانیدا بە چەرخی دووچەرخە کە ڕێک نەسووڕێ و لەکاتی سووڕاندا ئەم بەر ئەوبەر بکا، دەڵێن "تەگەرەکە واڵە(ی) دەکا". خزمە دەگەڵ ↑وێڵ wel "سەرگەردان، ئاوارە" و ↑*فەلەک felek* "گەردوون".

**-وان -wan** *[ -wān ]* - "پاشگری ئاگاداری و پاراستن": -ڤان -van یش دەگوترێ [گاوان، باخەوان، شاخەوان، ڕۆژنامەوان، دارەوان، دەرکەوان...]. بان ban- (.P) [باغبان، مرزبان، اتشبان...]. ئەم پاشگرە دە بنچینەدا مانای "ئاگا لێبوون، ئاگاداری کردن"ی گەیاندووە و دواتر مانایەکی بەربڵاوتری وەرگرتووە و بە تایبەتی پێوەندی بە کار و پیشەیەکی تایبەتی نیشان دەدا. وشەکە دە زمانی کوردمادیدا هەروەها بە شێوەی وانە wane- و وانکە wanke- لەگەڵ ناوی هێندێک کەلوپەل دێ کە لە وانیشدا چەمکی "پاراستن" دەبینرێ، وەک دەستەوانە destewane، پووزەوانە puzewane، قامکەوانە qamkewane، بەروانکە berwanke و هتد. دە زمانی پەهلەویدا پاشگرەکە pan بووە، بۆ وێنە derpan (.Pl) "دەرکەوان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Futter (.G) "تۆیی بنەوەی جل و بەرگ، ئاستەر"، fuotar (.OG) "بەرگ"، fōdr (.Gt) "کالان"، fōdor (.OE) "کالان، بەرگ، قەپاخ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -*pō(i)* (IE.)** "ئاگا لێبوون (لە ئاژەڵ)، پاراستن، تاقەت کردن". چەندین وشە دە زمانەکانی دیکەدا لەم ریشەوە هاتوون، وەک patra-m (.OIn) "قوتوو"، pōma (.Gr) "قەپاخ، سەرپۆش"، poimen (.Gr) "شوان"، -pāti (.OIn) "پاراستن، ئاگا لێبوون"، pātan (.Pl) "ئاگا لێبوون". دە زمانی فارسیدا پائیدن pāīdan (.P) "چاوەدێری کردن، ئاگا لێبوون" بەکار دێ کە پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها بنەوشەی پاس -pas دە وشەی ↑پاسەوان pasewan و پاسگا pasga دا لەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: ئەم پاشگرە لە هێندێک وشەدا لە جێی خۆی بە کار نەهاتووە و بەداخەوە بە شێوەیەکی هەڵە بەکار هێنراوە کە ئەمەش دیارە بۆ تێگەیشتنی نادروست لە مانا و ریشەی وشەکە دەگەڕێتەوە. وەک باسکرا، ئەم پاشگرە دە بنەڕەتدا بە مانای "ئاگاداری کردن، چاوەدێری کردن، پاراستن، تاقەت کردن" بەکار هاتووە، بەڵام لە هێندێک وشەدا ڕێساکە رەچاو نەکراوە، بۆ وێنە لە وشەکانی مەلەوان، شەڕوان، چالاکوان، پارێزوان، جەردەوان و هتد. "مەلە"، "شەڕ"، "چالاکی"، "پارێز"، جەردە" شتگەلێک نین کە بتوانرێ ئاگادارییان لێ بکرێ یان بپارێزرن. هەروەها دە زمانی فارسیدا وشەی "پاسبان" (دە کوردمادیدا: پاسەوان) بە هەڵە چێ کراون، چونکوو بنجی "پاس" خۆی خزمە دەگەڵ پاشگرەکە و مانای "ئاگاداری" دەبەخشێ. بەم پێیە "پاسەوان" دەبێتە کەسێک کە "ئاگاداری لە ئاگاداری" دەکا یان "پارێزەری پاراستنە"! لەجیاتی ئەم وشانەی سەرەوە دەکرێ بۆ نموونە ئەم وشانە بەکار بهێنرێن: مەلەزان، ئاوژەن، مەلەکەر، شەڕکەر، جنگاوەر، چالاک (چالاکی سیاسی)، خەباتکار، پارێزگار، پارێزەر، جەردە، جاش (جەحش)، وڵاتفرۆش، بەکرێگیراو و هتد].

**وانج wanc** [ *wānj* ] - "نیسک، مێژوێ": خزمه لەگەڵ ↑وچ wıç "دانەوێڵە". فۆتیمی n زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە.

**وانە wane** [ *wāna* ] - "دەرس": دە شێوەزاری هەورامیدا زۆرجار فۆتیمی w بەکار دێ بەرانبەر بە فۆتیمی x یان h ی سەرەتای وشەکان دە زاراوەکانی دیکەی کوردمادیدا. [مینا وەش/ خۆش، هۆندنەوە/ وەندنەوە...]. هەر بەم جۆرە وەندن wendın شێوەیەکی دیکەیە لە خاندن xandın یان ↑خوێندن xuwendın [xendın]. وشەی "وانە" دەچێتەوە سەر کرداری وەندن wendın، واتە ئەو شتەی دەوەندرێ [دەخوێندرێ].

**واتیک wanek** [ *wānek* ] - "شتەکە، هەرامە، هینەکە": وا(ن) wa(n) [ڤێ ve] + ↑یەک yek. [دە بنەڕەتدا: ئەو یەکە، ڤێ ئێکێ]. فۆتیمی n ناوگرە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ لە وێندەرێ le wendare کە دە ئەسڵدا لەوێ دەرێ le we dare یە و فۆتیمی n خزاوەتە ناو وشەکەوە.

**واوا wawa** [ *wāwā* ] - "برین و برینداری دە زمانی زارۆک دا": [چەچم واوا بووە]. خزمە دەگەڵ ↑وەی wey "دەنگی ئێش و ئازار".

**واوە wawe** [ *wāwa* ] - "وشەی ئاماژە بە دوور بوونەوە (لە شوێنی وەستان)":[واوە وەرە (وا وەرە)، واوە برۆ]. وێوە wewe ش دەگوترێ [وێوە چوو واتا برۆ ئەو لا]. بڕوانە ↑واز[5] waz "کەمێکی جیا".

**واوی wawî** [ *wāwī* ] - "دیسان": بڕوانە ↑واز[5] waz "کەمێکی جیا".

**واهر wahır** [ *wāhır* ] - "سەرپەرستی ماڵ": واهار wahar، وایر wayır و وایەر wayer ش دەگوترێن. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Wirt "خاوەن ماڵ، میواندار"، (Gt.) wairdus، (Nl.) waard "خانەخوێ"، (OIs.) verdr "ژەم ، خواردەمەنی"، سەر بە ریشەی **(IE.) *wer- >** "ئاگا لێبوون، چاوەدێری کردن، پەنا دان، پاراستن". دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑وریا wırya.

**واهوور wahur** [ *wāhūr* ] - "باهۆز، گێژەڵووکە": وا wa [↑با ba ] + هوور hur [↑وڕ wır]. کەرتی "وڕ" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، خولانەوە".

**واهۆفە wahofe** [ *wāhofa* ] - "کرێوە": واووە wawıwe ش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە وا wa [↑با ba] + هۆڤە hove. کەرتی یەکەم شێوەیەکی کۆنترە لە "با". کەرتی هۆڤە خزمە دەگەڵ بنەوشەی باب -bab دە وشەی ↑بابۆڵە babole "نانی پێچراوە" و هەروەها دەگەڵ بافتن baften (P.)، weben (G.)، weven (Nl.)، weave (E.)، väva (Sw.) "چنین، تەنین، هۆنین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uebh- >** "چنین، تەنین، لوول خواردن، لێکهاڵانی زۆر". ūrna-vábhi-h (OIn.) "جاڵجاڵووکە"، لەم ریشەوە هاتووە. بەم پێیە "واهۆڤە" دە بنەڕەتدا بە مانای "گێژەڵووکە، گەردەلوول"ە.

**واهەر waher** [ *wāhar* ] - "خوشک": شێوەیەکی دیکە لە ↑خوار xuwar [خواهر xāhar (P.)] "خوشک".

**وای way** [ *wāy* ] - "وشەی ئێش و ئازار": [وای لە دەست چەرخی سپڵە، وای لە دەست جاش و خۆفرۆش]. شێوەیەکی دیکە لە ↑وەی wey.

**واین wayın** [ *wāyın* ] - "رای کردن، هەڵاتن": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑واز[4] waz [↑لانەواز *lanewaz*] واتا دووربۆوە لە لانە، لانەگومکردوو، لە لانە هەڵبڕاو. کەرتی واز waz خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑وازر wazır یان ↑بازر(ە) bazır(e) "1-

تەرە 2- سرك“، ↑باز baz ”1- ڕێگە 2- ڕا کردن، دەرپەڕین“ [way (.E) ”1- ڕێگە 2- دوور“]. لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە ”دوور بوونەوە“،

2- ↑واز[5] waz و دواتر پێشگر یان پاشگری ↑وە *we* [وەکردن یان کردنەوە، وەگەڕان یان گەڕانەوە]. ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە دێن کە ئاماژە دەکا بە ”لێك جیا بوونەوە، دوور بوونەوە“. لە زمانی فارسیدا وشەی واهی wāhī (.P) هەیە بە مانای ”بێجێ، بێ مانا، بێ ڕەبت“ [دە بنەڕەتدا: دوور لە بابەت، جیا لە ڕاستی؟].

وت **wıt 1** - ”کەمترین دەنگ، وز(ز)ە، فز(ز)ە“: وتوت wıtwıt ”پرتە و بۆڵە“ و وتەوت wıtewt ”دەنگۆ“ش پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. هەروەها وچوچ wıçwıç هەیە بە مانای ”جریوەجریوی مەلی بچووك“. لەوە دەچێ ئەم وشەیە پێوەندی بە ”گوتن، وتن“ەوە نەبێ، بەڵکوو شێوەیەکی دیکە بێ لە وز(ز)ە wız(z)e، ↑فز(ز)ە fız(z)e. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑وێژە weje و ↑بێژتن bejtn. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها پسەپس pıs(t)epıs(t) و پچەپچ pıçepıç لەوانەیە پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

وت **wıt 2** - ”1- شێ، تەڕایی 2- دڵۆپە 3- فڕ، قوم“: خزمە لەگەڵ wet (.E)، wa t (.OE)، vátr (.ON) ”تەڕ، نمدار“. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ water (.E) ”ئاو“ و دەچنەوە سەر ریشەی ***(a)ued-** **(.IE)** ”تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون“. ↑وەشتەی weştey ”بارین“ لەم ریشەوە هاتووە.

وتش **wıtış** [*wıtıš*] - ”خەوتن“: شێوەیەکی دیکە لە ↑خەوتن xewtın. فۆتیمی سەرەتای وشەکە سواوەتەوە.

وتن **wıtın** - شێوەیەکی دیکە لە ↑گوتن gutın.

وتۆز **wıtoz** - ”گلۆر، خللۆر“: وت wıt + ↑ئۆز oz. خزمە دەگەڵ ↑ئوتوز *utuz* ”باگردان، بانگردێن“ [بە فارسی ”بام غلتان“. ”غلتیدن“ واتا گلۆر بوونەوە و خزمیشە دەگەڵ ”گلان“ و ”گلۆر]. ”وتۆز“ و ”ئوتوز“ دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”ڕۆیشتن، گەڕان“.

[تێبینی: چەمکەکانی ”ڕۆیشتن، گەڕان، تل خواردن (تلۆر) و گلان (گلۆر) پێوەندییان پێکەوە هەیە. ئەم پێوەندی دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ، بۆ وێنە وشەکانی ”ڕێ“ (ڕێگا)، ”ڕەت“ بردن واتا پێ خلیسکان، ratha (.OP) و (.OIn) ”چەرخ، گاری“، Rad (.G)، rad (.Nl) و ratas (.Lit) ”چەرخ، تەگەر“، rollen (.G) ”تل خواردنی شتێکی خڕ یان لوولەیی لەسەر ڕووبەرێك“، دەچنەوە سەر ریشەی *ret(h)- (*IE.*) ”گەڕان، ڕۆیشتن، تلان، خلۆر بوونەوە“. نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە وشەی *سەفەر* ”چوون بۆ شوێنێکی دوور“ە کە دەبێتە خزم دەگەڵ ”زڤرین“ و ”سووڕان“].

وجارای **wıcaray** [*wıjārāy*] - ”گێڕانەوەی خەون“: خزمە لەگەڵ ↑وێژە weje و ↑*بێژتن bejtn*.

وچ **wıç** [*wıč*] - ”دانەوێڵە و ئەرزاقی ماڵ“: هەروەها وچخانە wıçxane هەیە بە مانای ”ژووری ئەرزاق و کەلوپەل، پاشخان، خەڵوەتی“. دەشێ خزم بێ لەگەڵ Weizen (.G)، wheet (.E)، veta (.Sw) ”گەنم“. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ weiß (.G) ”سپی“ و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا. دە زمانی کوردمادیشدا چەندان وشە هەن کە دەبنە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە وەك ↑وازە waze ”ئاژەڵی بەڵەك“، ↑ویس wîs ”درەوشانەوەی ئەستێرە“، ↑بەش beş ”ئاژەڵی تیوچاوان سپی“. هەروەها ”وچ“ جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑واشە waşe ”تفاقی ئاژەڵ“.

وچان **wıçan** *[ wıčān ]* - "پشوو دان، حەسانەوە": خزمە دەگەڵ wesan (OG.) و (OE.)، wesen (MG.)، wisan (Gt.)، vesa (OIs.) "بوون (لە شوێنێک)، مانەوە لە شوێنێک"، vásati (OIn.) "ماوە لە شوێنێک، وچانی دا"، vástu-h (OIn.) "وچان، مەنزل کردن"، سەر بە ریشەی **< *ues-, *wes-** **(IE.)** "بوون، مانەوە لە شوێنێک، وچان دان، مەنزڵ کردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ war (G.)، was (MG.) و (E.) "بوو"، Wesen (G.) "بوون، بوونەوەر".

[تێبینی: لەوە دەچێ وشەی "وچان" پێشتر چاوگێ بووبێ و بەم شێوەیە بەکار هاتبێ: وچام، وچای، وچا و هتد].

وچک1 **wıçık 1** *[ wıčık ]* - "نووک، نووکی قەڵەم و تەشی و ...": پێک هاتووە لە وچ wıç + ک ık. خزمە دەگەڵ wetzen (G.)، (h)wezzen (G.)، hwettan (OE.) "تیژ کردن"، hwaet (OE.)، (h)waz (OG.)، hvass (ONor.) "تیژ". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان باس نەکراوە.

وچک2 **wıçık 2** *[ wıčık ]* - "لە بزگوڕ و تیتاڵ گوریس چێ کردن": خزمە دەگەڵ Wickel (G.)، wicha (OG.) "گوریس"، wick (OE.) "گوریس، قتیلە، بەنی چەندلوو"، سەر بە ریشەی **< *ueg-** **(IE.)** "چنین، تەنین، گرێ دان". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین].

وچوچ **wıçwıç** - "جریوەجریوی مەلی بچووک": خزمە لەگەڵ ↑وت1 wıt "کەمترین دەنگ"، وز(ز)ە wız(z)e، ↑فز(ز)ە fız(z)e و دواتر ↑*ئاواز awaz* [a-waz].

ودم **wıdım** - "ئیجازەی شێخ": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ wittum (G.)، widimo (OG.)، wituma (OE.) "جیازی بووک، مڵک و ماڵی بخشراو (بە مزگەوت)"، widem (G.) "مڵک و ماڵی مەلا"، widmen (G.) "بەخشین، خەڵات کردن، پێشکێش کردن". لەوانەیە "ودم" ئەو ئیجازەیە یان ئەو هەقە بووبێ کە لە سەرەوەڕا بە شێخ بەخشراوە یان لە لایەن شێخەوە بە پیاوچاکان بەخشراوە و ئەوانیش بە هۆی ئەو ودمەوە ئیش و کاری سەیر و سەمەرەیان ئەنجام داوە. ریشە؟

ودودە **wıdwıde** *[ wıdwıda ]* - "بادەوە": بادبادک bādbādak (P.). شتێکە لە کاغەز دروست دەکرێ و لە هەوادا بە دەم باوە بەردەوام لە پێچان و خۆ با دان دایە. خزمە دەگەڵ↑ باد bad "پێچ"، ↑وتۆز wtoz "خللۆر"، ↑با ba دانەوە "پێچانەوە" و هتد.

وڕ1 **wır 1** - "گێژ، کاس": خزمە دەگەڵ Wirr (G.) "شێواو، لێکدراو، تێکەڵ پێکەڵ". ئەم ئاوەڵناوە ئەڵمانییە لە کرداری (ver)wirren (G.)، werran (OG.) وەرگیراوە بە مانای "سەر لێشێوان، گێژ و وڕ بوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ گەلێک وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە ئاماژە بە چەمکی "سووڕان" دەکەن، بۆ وێنە vertare (L.) "با دان، سووڕاندن"، werden (G.) "تەبدیل بوون"، ↑وەرانین weranîn "تیوەپێچان"، ↑گوریس gurîs [دە بنەڕەتدا: وریس wurîs واتا بەنی بادراو] و ↑گۆڕین gorîn "تەبدیل کردن" [کۆنتر: worîn].

وڕ2 **wır 2** - "خرووی لەش، خورووی": شێوەیەکی دیکە لە خروو xırû یان خورووی xuru. بڕوانە ↑خوراندن xurandın. فۆتیمی x بووەتە w.

[تێبینی: فۆتیمەکانی h، x ، w دەگۆڕدرێنە سەر یەکتر، بۆ وێنە "هیشک" و "وشک" لە فارسیدا بووەتە "خشک". شێوەی "ئیشک" لە شێوەکانی دیکە کۆنترە، هەروەها بڕوانە "ورچ" و "هرچ" ی کوردی و "خرس"ی فارسی. شێوەی "هرچ" لە شێوەکانی دیکە کۆنترە].

ورا **wıra** *[ wırā ]* - "کاول، تێک و پێک چوو": هەروەها ورای wıray هەیە بە مانای "رمیان". خزمە دەگەڵ ↑وەرین werîn "هاتنەخوار، کەوتنەخوار". ↑وێران weran لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دەبنەڕەتدا مەبەست "داکەوتن، دارمان" بێ.

ورار **wırar** [ *wırār* ] - شێوەیەکی دیکە لە↑ورە wıre.

ورازنای **wıraznay** [ *wırāznāy* ] - "ڕاستەوە کردن": خزمە لەگەڵ ↑بەرز berz [بەرز کردنەوە].

ورازین **wırazîn** [ *wırāzīn* ] - "درووما‌ن کردن، دوورین": وراستن wırastın و وارزدن warızdın یش دەگوترێ. هەروەها وراز wıraz یان وارز warız بە مانای "درووما‌ن" بەکار دەهێنرێن. کاتێک سەیری وشەی "چنین" دەکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە لە ریشەیەکەوە دێ کە ئەم مانایانە دەدا "چنین، هۆنینەوە، گرێ دان، تێکخستنەوە، دروون"، واتا پێوەندییەک دەتیوان هەموو ئەم چەمکانەدا بەدی دەکرێ. ئەمجار کاتێک سەرنجی وشەی "هونینەوە" دەدەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە لە ریشەدا بە مانای "با دان، سووڕاندن"ە، واتا پێوەندییەک لەتیوان دوو چەمکی "با دان" و "هۆنینەوە"دا دروست بووە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەشێ کە "ورازین" پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -wer* ,-uer* ( .IE)** "سووڕاندن، با دان".

وراق1 **wıraq** [ *wırāq* ] - "گوشاد": خزمە دەگەڵ ↑وڵە wıle "پان و بەرین"، ↑فراخ fırax "ئامان، قاپ و قاچاخ" و چەندین وشەی دیکە وەک ↑وڵات wılat.

وراق2 **wıraq** [ *wırāq* ] - "رفان" [وراق وراق wıraq wıraqواتا رفان رفان]. خزمە دەگەڵ ↑وەرساندن wersandın "پچڕاندن". [وشەی "رفاندن"یش دە بنەڕەتدا مانایەکی وەک "پچڕاندن، پچرینەوە" دەبەخشێ].

وراوە **wırawe** [ *wırāwa* ] - "قسەی تێکەڵ پێکەڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ورێنە wırene.

ورای **wıray** [ *wırāy* ] - "رمان، رووخان": خزمە دەگەڵ ↑وێران weran "کاول" [دە بنەڕەتدا: رووخاو، رماو].

ورتاندن1 **wırtandın** [ *wırtāndın* ] - "ورتەورت کردن": بڕوانە ↑ورتە wırte.

ورتاندن2 **wırtandın** [ *wırtāndın* ] - "چڵك دانی برین": [دەمی برینەکەم دەورتێنێ]. بنجی وشەکە، واتا ورت -wırt دەچێتەوە سەر ریشەی **< -uer(a)* ( .IE)** "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون". vār (.OIn) "ئاو"، urina (.L) "میز" لەم ریشەوە سەرچاوە دەگرن.

ورتە **wırte** [ *wırta* ] - "قسەی بن لێوان": خزم دەگەڵ Wort (.G)، word (.E)، waurd (.Gt)، ord (.Sw) "وشە"، verbum (.L) "گوتە، قسە"، vardas (.Lit) "ناو"، eirein (.Gr) "گوتن"، vrat (.Rus) "درۆکردن، هەڵبەستن"، سەر بە ریشەی **< -wer* ,-uer * ( .IE)** "گوتن، قسەکردن". وشەی ↑حەیران ĥeyran "چیرۆک گوتنی بە ئاواز" دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.[دە بنەڕەتدا دەبێ ئەیران *eyran** بووبێ]. وشە حەیران بە تایبەتی هەڵسەنگینە دەگەڵ وشەی یۆنانی eirein (.Gr) "گوتن". هەروەها چەندین وشەی دیکە لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن، وەک ↑هۆرە hore "جۆرێک گۆرانی"، ↑وێرد werd "دوعا (ی بن لێوان)، ↑ورە2 wıre و هەروەها ↑ورنگە wırnge "گۆرانی بە دەنگی نزم"، ↑وەرام weram "بەرسڤ" و لەوانەشە ↑ورێنە wırene. هەروەها ↑وەڕین werîn و وەڕ -wer [وڕەوەڕ werewer] و وڕ -wır [وڕەوڕ wırewır، وڕوڕە wırwıre] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

ورچ **wırç** [ *wırč* ] - "ناوی ئاژەڵێکی کێوی کە دۆستایەتییەکەی بە ناوبانگە": هرچ hırç یش دەگوترێ کە شێوەی کۆنتری وشەکەیە. خرس xers (.P). خزمە دەگەڵ arktis (.Gr) "هرچ". ریشە؟ وشەی arktis بە مانای جەمسەری باکووری گۆی زەوی لەوەڕا هاتووە کە ئەو شوێنە ورچی زۆری لێ ژیاوە و بەم بۆنەوە ناوی ورچی لەسەر دانراوە.

ورد **wırd** - "زۆر گچکە": هورد hurd و خرت xırt یش دەگوترێ [خرتە و پرتە]. خرد xord (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ groß (G.)، great (E.)، groot (Nl.) "درشت، گەورە". لێرەدا سەیر و جێی پرسیارە کە چۆن وشەیەکی هاوریشە دە زمانی کوردمادی و فارسی لە لایەک و دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لە لایەکی دیکەوە دوو مانای بە تەواوی دژ بە یەک دەبەخشێ. لێکدانەوەی ئێتیمۆلۆژی لەسەر وشە ئەورووپییەکان ئەو کێشەیە روون دەکاتەوە. وشە ژێرمەنییەکان دە بنەڕەتدا بە مانای "درشت ورد کراو" بوون، واتا ئەو دەنکە وردکراوانەی درشتتر بوون لە وانی دیکە. لێرەوە وشەکە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "درشت، مەزن"ی پەیدا کرد و جێگەی بە وشەیەکی کۆنتری ژێرمەنی بە مانای "مەزن" لەو زمانانەدا لێژ کرد و جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەو وشە کۆنترە -mekila (*Grm.*) بوو کە خزمە دەگەڵ وشەی کوردمادی "مەزن" و تا ئێستاش دە هێندێک ناوی کۆن و مێژوویی ژێرمەنیدا پارێزراوە. ئەو وشە ژێرمەنییانەی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ghreu- <** "رێخشاندن، هاڕین، ورد کردن". ئەم ریشەیە دەبێ پێوەندی بە ریشەیەکی دیکەی هیندوئەورووپییەوە هەبێ، واتا ریشەی **(IE.) *ghren- <** "ورد کردن، هارین". چەندین وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەک grind (E.) "رێخشاندن، پریواندن، هاڕین"، Grund (G.) و ground (E.) "هەرد" [دە بنەڕەتدا: خیز و خۆڵ]، gresti (Lit.) "رێخشاندن، کراندن". دە زمانی کوردمادیدا ↑گەرد gerd "تۆز و خۆڵ" و ↑ گێرە[2] gere "ورد کردنی دەخڵ و گیا" دەبنە خزم دەگەڵ ئەو وشانە. بە تایبەتی بەراوردی وشەی گێرە gere بکە دەگەڵ ریشەکانی باسکراو لە سەرەوە، واتا *-ghreu** و *-ghren** بە مانای "ورد کردن".

وردیان **wırdîyan** [ *wırdīyān* ] - "زیندانوان": پێوەندی هەیە بە ward (E.) "چاوەدێر، زیرەڤان، زیندانوان". ئەم وشەیەی زمانی ئینگلیزی و هەروەها وشەکانی guard و guardian (E.) دەچنەوە سەر ریشەی لاتینی wardāre (L.). وێ دەچێ ئەم وشە لاتینییە خزم بێ دەگەڵ ↑بیر bîr، [کۆنتر: ویر wîr] و ↑وریا wırya.

وڕڕە[1] **wırre[1]** - "دەنگی سووڕانی خێرای چەرخ": پێوەندی هەیە بە ↑وڕ wır "گێژ" [دە بنەڕەتدا بە مانای "سووڕاو"]. وەک دەبینین مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا دەنگی سووڕانی چەرخ نەبووە، بەڵکوو خودی سووڕانەکە بووە و ماناکە پاشان گۆڕاتیکی بەسەردا هاتووە. گۆڕانکاری لەم چەشنە دە ژمارەیەکی بەرچاو وشەدا دەبینرێ، وەک شڵقە، شەققە، تەقە، گیڤە، ڕەپە، تەپە و هتد.

وڕڕە2 **wırre 2** - "چەقە، چەنە درێژی": شێوەیەکی دیکە لە وەڕڕە werre [↑وەڕین werîn].

وڕڕە3 **wırre 3** - "پەمۆی تازە هەڵلاجی کراو": خزمە دەگەڵ Wolle (G.)، wolla (OG.)، wool (P.)، ull (Sw.)، wulla (Gt.)، volna (Rus.)، ūrna (OIn.)، vilna (Lit.) "خوری، پەشم"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uel- <** "دارنین، داپچڕین".

ورشە **wırşe** [ *wırša* ] - "بریقە، بریسکە": وریش wırîş و وریسکە wırîske ش دەگوترێن. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑بریسک bırîsk.

2- ↑پڕشەنگ pırşeng.

ورشەک **wırşek** [ *wıršak* ] - "جۆرێک پشیلەکێوی کە کەوڵی نرم و زۆر بەنرخە": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑ورشە wırşe "بریقە، بریسکە" و ناوی ئاژەڵەکە ئاماژە بۆ "بریقانەوە"ی پێستەکە بووبێ.

ورکە1 **wırke 1** [ *wırka* ] - "وردیلە": ورتکە wırtke ش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑ورد wırd.

ورکە2 **wırke 2** [ *wırka* ] - "1- دەنگی کەمی گریاناوی 2- خەم و خەیاڵاتی دڵ": خزمە دەگەڵ ↑ورتە wırte "قسەی بن لێوان". سەبارەت بە مانای دووەم، لەوانەیە دە بنەڕەتدا مەبەست "قسەی دڵ" بووبێ.

ورگ **wırg** - "گەدە، ناوسک": عوور εur، عرگ εırg و ↑هوور *hur* یش دەگوترێن.

ورمان **wırman** [ *wırmān* ] - "رووخان، رمان": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑هەڕمان herman، ↑هەڕفتن herftın و دواجار ↑رمان rıman. کەرتی هە -he پێشگرە و دە وشەی "ورمان"دا فۆتیمی h بووەتە w. ئاڵوگۆڕی ئەم دوو فۆتیمە دە ژمارەیەک وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ، وەک ورچ و هرچ، ورد و هورد، وشک و هیشک، هۆندن و وەندن و هتد.

ورنگە **wırınge** [ *wırınga* ] - " گۆرانی لەبن لێوان": ولنگە wılınge ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ورتە wırte.

وڕێنە **wırene** [ *wırena* ] - "وڕاوە، قسەی بێ مانا و تێکەڵ پێکەڵ": دوو بۆچوون رێی تێ دەچێ:

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ورتە wırte سەر بە ریشەیەک بە مانای "قسە کردن".

2- یان ↑وڕ wır "گێژ، کاس، تێکەڵ پێکەڵ".

ورنگ **wırıng** - "وچان، پشوو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هێوران hewran "ئارام بوون".

وروو‌ژان **wırujan** [ *wırūžān* ] - "بزوانی توند" (ی دەروونی): ↑هوروو‌ژان hurujan.

ورووکان **wırukan** [ *wırūkān* ] - "هاڵان": تێورووکان واتا تێهاڵان، لە دەور کۆ بوونەوە. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە چەمکی "سووڕان" دەکەن، وەک ↑وڕ wır، ↑وەرانین weranîn "تێوەپێچان"، ↑وێڕ wer، ↑وەردێنە werdene و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***wer-** < (*IE.*) "سووڕان".

وڕۆ **wıro** - "مرۆڤی نزم و هیچ و پووچ": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک کە مانای "خوار، ژێر، نزم" دەبەخشن، وەک ↑ورای wıray "رمان، رووخان"، ↑وار war "*خوار*، ژێر"، ↑*وەرین werîn* "کەوتنەخوار، هاتنەخوار" و لەوانەشە↑وێران[1] weran "کاول" [دە بنەڕەتدا: رووخاو، رماو، تێکتەپیو]. وشەکە هەڵ سەنگینە لەگەڵ "فرومایە" لە فارسیدا بە مانای "پەست". وشەی فرو -frū (.P) خزمە لەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "نزم و نەوی بوون" و "مرۆڤی خراپ" دەکرێ ئاماژە بە وشەی "پەست" بکەین کە هەر دوو مانای سەرەوە دەگرێتە خۆ. هەروەها وشەی *سپڵە* "پست، نزم کردار" دەچێتەوە سەر وشەیەک بە مانای "قووڵ" و لەم مانایەوە مانای "ژێر، خواروو"ش سەری هەڵداوە].

ورە1 **wıre 1** [ *wıra* ] - "هێزی دەروون، جەسارەت": دەچێتەوە سەر ↑وێران2 weran "نەترسان".

ورە2 **wıre 2** [ *wıra* ] - "گۆرانی لەبن لێوان": ورنگە wırınge ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑ورتە wırte دا باس کراون.

ورەس **wıres** [ *wıras* ] - "ئاڵوودار": خزمە دەگەڵ wala (.OE)، walus (.Gt)، volr (.Onor)، valus (.L) "دار، دیرەک"، سەر بە ریشەی ***uel-** < (*IE.*) "سووڕان" [دەشێ دەبنەڕەتدا مەبەست "خڕەدار" واتا داری ئوستوانەیی بووبێ بەپێچەوانەی داری تاشراوی تەختکراو].

وریا **wırya** [ *wıryā* ] - "زیرەک، زیت، هوشیار": وریا بوون دە کوردمادیدا هەم بە مانای "ئاگا لێبوون" دێ [وریای خۆت بە] و هەم بە مانای "زیت و زیرەک و بە هۆش". ئەم دوو مانایە

پێوەندی ئێتیمۆلۆژییان پێکەوە هەیە. وشەکە لە لایەکەوە خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە پێوەندییان بە چەمکی "ئاگاداری لێ کردن و پاراستن" وە هەیە، وەک wahren (.G)، warian (.OE) و vara (.OIs) "پاراستن"، wehren (.G) "بەرگری و داکۆکی کردن"، verties (.Let) "چاوەدێری کردن، سەرنج دان"، -orontai (.Gr)، vereri (.L) "چاولێکردن". گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(.IE) *wer- >** "پەرژین کردن، بەربەست کردن (بە مەبەستی پاراستن)".
لەم مانایەوە پاشان مانای "پاراستن و ئاگا لێبوون و چاوەدێری" پەیدا بووە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە کە پێوەندییان بەم مانایانەی سەرەوە هەیە وەک ↑وارش warş "دیواری باخ و بێستان"، ↑وار war "ماڵ" [دە بنەڕەتدا: شوێنی دەورگیراو] و هتد.
لە لایەکی دیکە ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بیر bîr [کۆنتر: ویر vîr] بە مانای "هزر" [دە بنەڕەتدا: *حافیزە*، شوێنی یاخود هێزی پاراستنی شت لە مێشکدا]، و ↑بەر ber [لە بەر کردن واتا حیفز کردن یاخود پاراستن لە مێشکدا]. مانای دووەمی وریا واتا "بیرمەند، بە هۆش" لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. هەروەها وشەکانی warn (.E) "وریایی دان" و aware (.E) "هوشیار، ئاگادار" پێوەندییان بەم خێزانە وشەوە هەیە.

وزاق **wızaq** [ *wızāq* ] - "دەرپەڕین، بازدی بڵند": خزمە دەگەڵ ↑بزاوتن bızawtın و ↑بازد bazd و چەندین وشە کە ئاماژە بە "جووڵان، ڕۆیشتن، دەرپەڕین، دوورکەوتن" دەکەن. دە زاراوەی موکریانیدا وەزگ دان wezıg dan هەیە بە مانای "مردن" (لە داخان). تا ئەو جێیە بیرم یاری بکا، مامۆستا مەسعوود مەحەممەد لە وتارێکیدا بە دروستی نووسیبووی کە کرداری "وەزگ دان" پێوەندی بە زگ [سک]ەوە نییە، بەڵکوو ماناکەی پەڕین، تێپەڕین و بازدانە کە دەبێ مەبەست لێرەدا بازدان و دوورکەوتنەوەی رووح لە لەش بێ. ئەم تێبینییەی مامۆستا زۆر بە جێیە و وەزگ wezıg ی موکریانی دەگەڵ ئەم وزاق wızaq ە هەر یەک شتە.

وزتن **wıztın** - "هاویشتن، فڕێ دان": وستن wıstın یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑هاویشتن یان ئاویشتن hawîştın [(h)a-wîştın].

وزە **wıze** [ *wıza* ] - "هێز": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑هێز hez. هەڵی سەنگینە دەگەڵ -vāja (.OIn) "هێز، دەست و برد".

وزەوز **wızewız** - "1- دەنگی میش و زەرگەتە 2- سرتە": بە مانای یەکەم ↑ویزان wîzan [ویزاندن wîzandın] یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە (دەنگی) دەرچوون و ڕەت بوونی هەوا دەکەن، بەتایبەتی دەرچووتیکی خێرا، وەک ↑پشوو pışû، ↑فشقەfışqe، ↑فیشەک fışek، ↑فشفشە fışfışe، ↑ویزەwîze، ↑فیچقە fîçqe و هتد.

وژن **wıjın** [ *wıžın* ] - "بژار": وجین vejīn (.P). خزمە دەگەڵ ↑وەژاردن wejardın [هەڵوەژاردن].

وژ **wıj** [ *wıž* ] - "1- دەنگی تەوژمی ئاو 2- دەنگی گوللە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وزەوز wızewız.

وژنگ **wıjng** [ *wıžng* ] - "چۆک، ئەژنۆ":
1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑واژ2 waj "پێچەوانە" و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون، چەمان، با دران".
2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑بازن(ە) bazın(e) و هێندێک وشە کە ئەوانیش هەر ئەو مانای سەرەوە دەبەخشن. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم لەگەڵ کەرتی دووەم لە وشەی Ellbogen (.G) "ئانیشک"دا. هەم چۆک و هەم ئانیشک ئەو شۆینەن کە خوار دەبنەوە یان دەچەمێنەوە.

وژەك **wıjek** [ *wıžak* ] - شێوەیەكی دیكە لە ↑فیشەك fîşek. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وزەوز wızewız.

وست **wıst** - "بیدەنگ (بە)": دەشێ خزم بێ دەگەڵ pst (G.) "وست !".

وسكورا **wıskura** [ *wıskurā* ] - "دەفر بۆ خواردەمەنی تراو": خزمە دەگەڵ ↑ئەسكوێ eskuwe [ئەسكۆ esko] "مەلاقە".

وسكی **wıskî** [ *wıskī* ] - "ئەسكۆ": شێوەیەكی دیكە لە ↑ئەسكوێ eskuwe [ئەسكۆ esko] "مەلاقە".

وشتر **wıştır** [ *wištır* ] - "ناوی ئاژەڵ": حوشتر ḧuştır یش دەگوترێ. شتر šotor (P.) یان اشتر oštor (P.). فۆنێتیمی سەرەتای وشەكە زێدەیە. خزمە دەگەڵ Stier (G.)، stior (OG.)، stiur (Gt.)، steer (E.)، stjōrr (OIs.) "جوانەگا"، staora- (Av.) "ئاژەڵی ماڵی مەزن"، tjur (Sw.)، taūtos (Gr.)، taurus (L.) "گا"، taūras (Lit.) "گامێش". ریشەی وشەكە ساخ نەكراوەتەوە. وشەكە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئێسترestır. هەروەها وشەی ↑دەوار dewar "ئەسپ و ئێستر" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. بەراوردی ئەم وشەی دوایی بكە بەتایبەتی دەگەڵ وشەكانی زمانانی سوێدی، یۆنانی و لاتینی.

وشش **wışşe** [ *wišša* ] - "دەنگی ناڵین": خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑وت1 wıt "كەمترین دەنگ، *وزا ز)ە، فزا ز)ە*"دا باس كراون.

وشكارۆ **wışkaro** [ *wıškāro* ] - "بیابان": وشك wışık [↑هیشك hîşık] + ئارۆ [↑ئارا ara "پانتایی زەوی، دەشت، گوڕ]. تێكڕای وشەكە واتا "زەوی هیشك".

وشە **wışe** [ *wıša* ] - "وتە، قسە": خزمە دەگەڵ ↑بێژتن bejtın "گوتن".

وشیار **wışyar** [ *wışyār* ] - شیار şîyar یش دەگوترێ. شێوەیەكی كۆنتر لە ↑هوشیار huşyar.

وشین **wışîn** [ *wıšīn* ] - "پشاوتن": وشاردن wışardın یش دەگوترێ. هەر سێ شێوەی وشین wışîn، پشاوتن pışawtın و وشاردن wışardın دە بنەرەتدا یەك وشە بوون. دە فارسیدا فشردن fošordan (P.) "وشین، گوشین". دە فارسیدا هەروەها فشار fešār (P.) بە مانای "گوشار" و افسردە afsorde (P.) "دڵتەنگ، رێكگوشراو" دێ. بنجی ئەو وشە كوردمادییانە بە دوو شێوەی وش -wış و پش -pış خۆ نیشان دەدا. وێ دەچێ فۆتیمی p شێوە كۆنەكە بێ، چونكە ئەمەیان دە وشەكانی ↑پست *pest* و ↑پەستان pestan و ↑پەستاوتن pestawtın یشدا بەدی دەكرێ كە هەموویان ئاماژە بە چەمكی "پشاوتن، رێكگوشین، پاڵ پێوەنان" دەكەن.

ول **wıl** - "شل و ول": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑وڵەwıle، ↑*وڵات wılat*، ↑بلاو bılaw و ↑ڤاڵا vala [ئاواڵە a-wale] و هتد. شل و ول واتا ئەو شتەی شلە و پان و بڵاو بۆتەوە.

وڵات **wılat** [ *wılāt* ] - "سەرزەوی، نیشتمان": وەڵات welat یش دەگوترێ. ئەم وشەیە دە بنچینەدا بە مانای "رووبەر و پانتایی" زەوی بەكار هاتووە، جا ئەم رووبەرە چ رووبەرێكی گچكە بووبێ، یان رووبەرێكی گەورە، واتا خاك و نیشتمانی گەلێك و تەنانەت رووبەری زەوی بەگشتی. هەرسێك مانا دە زمانی كوردمادیدا پارێزراون. بۆ وێنە كاتێك دەگوترێ "وڵات هەڵدەوەژێرم یان وڵات خاوێن دەكەمەوە"، وا ئاماژە بە پانتاییەكی بچووك دەكرێ، واتا رووبەری ناوماڵ، یان حەوشە و هتد. كاتێك باس لە وڵاتی گەلێك دەكەین، ئەوە پانتاییەكی زۆر گەورەی زەوی مەبەستە. هێندێك جاریش كە بۆ وێنە دەگوترێ "وڵات تاریك داهات"، ئەوا مەبەست گشت پانتایی زەوییە واتا دونیا. [دیارە لە كەونارادا زەوی نەك وەك گۆ و خڕۆك بەڵكوو وەك پانتایی سەیر كراوە]. ئەم وشەیە دەگەڵ ژمارەیەكی زۆر وشە دە زمانە

هیندوئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر ڕیشەی **< *plad-, *plat-** ***(IE.)*** "بڵاو، پان، بڵاو بوونەوە" و دواتریش ڕیشەی **< *ple-, *pla-** ***(IE.)*** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە". خزمە دەگەڵ plateīa (Gr.) "بەرین، پان"، platys (Gr.)، plattus (L.) "تەخت، پان و بەرین"، Fladen (G.)، vlade (Nl.) "کولێرەی پانکەلە"، flade (Norw.) [دیالێکتی ناوین] "گۆڕەپان، مەزرا"، flaz (OG.) "تەخت، پەل"، Feld (G.) "مەزرا، زەوی بەربڵاو" و هتد. دوو وشەی Platz (G.) "گۆڕەپان، شوێن، جێگە، زەوی بەرئاوەڵا" و place (E.) دەچنەوە سەر وشە یۆنانییەکەی سەرەوە. دە زمانی فارسیدا وشەی falāt (P.) هەیە کە بە مانای "بانوو، ڕووبەری بەرز، زەوی تەختی بەرز هەڵکەوتوو" بە کار دێ و بۆ وێنە دەگوترێ فلات ایران falāt e Iran کە وەک چەمکێکی جوگرافی- نەک سیاسی دەوڵەتی- بەکار دێ و چوارچێوەیەکی جوگرافی بەربڵاوتر لە ئێرانی ئەمڕۆ دەگرێتەوە. لێرەدا شیاوی ئاماژە پێکردنە کە بەڕێز Dr. Michael Chyet لە فەرهەنگی کوردی- ئینگلیزیدا وشەی "وەڵات" دەباتە سەر وشەی ولایة wīlāya(t) (Arb.). ئەو بۆچوونە ڕێی تێ ناچێ، چونکە وەک لە خوارەوە دەیبینین، وشەی وڵات وشەیەکە پێوەندی بە گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەیە. ئەگەر پێوەندییەک لە تێوان وشەکانی "وڵات" و "ولایەت"ی عەرەبیدا هەبێ، کە من لێی دڵنیا نیم، ئەوسا بە باوەڕی من وشە عەرەبییەکەیە کە لە زمانی کوردمادییەکە وەرگیراوە، نەک بە پێچەوانە. هەروەها وشەی بلد balad (Arb.) "شار" دەشێ لە وشە کوردمادی "وەڵات" وەرگیرابێ. تێکڕای ئەم وشانە دە پلەیەکی دیکەدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑وڵ wıl [شل و وڵ]، ↑فل fıl، [فل بوون واتا پان بوونەوە] ↑وڵە wıle "پان، بەرین"، ↑واڵ wal "پان، گوشاد، پەل"، ↑ڤالا vala "کراوە"، ↑ڤالایی valayî "بۆشایی، فەزا"، ↑ئاواڵە awale "کراوە"، ↑پەل pel "تەخت"، ↑پلێچ pılç "پان و پلێچ"، ↑بڵاو bılaw، ↑بەلەم belem و چەندین وشەی دیکە. گشت ئەم وشانە وەک باس کرا، دەچنەوە سەر ڕیشەی **< *ple-, *pla-** ***(IE.)*** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە". سەبارەت بە مانای وشەکە و ڕیشەکەی بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "تاخ".

**وڵاخ wılax** [ *wılāx* ] - "ئەسپ و ئێستر": وەڵاخ welax یش دەگوترێ. الاغ olāx (P.) "کەر". خزمە دەگەڵ wallach (G.) "ئەسپی یەختەکراو". ڕیشەی ئەم وشە ئەڵمانییە دەگەڕێتەوە بۆ walachei کە ناوی وڵاتێک بووە و لەوێوە ئەسپی یەختەکراوی چاک بۆ وڵاتانی دیکە بەرێ کراوە. ئەوە کە چۆن دە زمانی کوردمادیدا وڵاخ جگە لە ئەسپ و ئێستر بە گامێش و گا و گۆڵیش دەگوترێ [ڕەشەوڵاخ]، جێی لێکۆڵینەوەیە. لێرەدا دەکرێ شیمانەیەک بخەینەڕوو: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەی Bull(e) (G.) "گا" هەیە. لەوانەیە وشەیەکی لەم چەشنە دە زمانی کۆنی کوردمادیدا هەبووبێ و پاشان دەگەڵ وشەی wılax تێکەڵ بووبێ و ماناکانیان تێکەڵ کرابن.

**وڵاڵە wılale** [ *wılāla* ] - "ئامرازێک لە خەرەک دا": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑وێڵ wel "سەرگەردان"، ↑وڵین wılîn "هەڵ گلۆفین"، ↑پێل pel "شەپۆل"، سەر بە ڕیشەی **< *uel-** ***(IE.)*** "سووڕان".

**وڵس wılıs** [ *wılıs* ] - "ئاژەڵ، مەڕ و ماڵات": خزمە دەگەڵ vlies (G.)، flēos (OE.)، fleece (E.) "پێستەمەڕ، خوری مەڕ"، pluskos (Lit.) "تیسکەموو"، plūma (L.) "پەڕ". هەروها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑پوول *pul* و ↑فلس fılıs.

**وڵکە wılke** [ *wılka* ] - "مەڵبەند":

1- لەوانەیە شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ملک mılk "زەوی، سەرزەوی" [ملک *melk* (*Arb.*)].

2- لەوانەشە پێک هاتبێ لە وڵ wıl + کە ke و پێوەندی بە ↑وڵە wıle "پان و بەرین" و ↑وڵات wılat ەوە هەبێ.

وڵمە **wılme** [ *wılma* ] - "پارچە گۆشتی بێ ئێسک، زەقایی سەر ران": ↑گوڵمە gulme.

وڵنگە **wılınge** [ *wılınga* ] - "1- دەستپاچە 2- قسەی بێمانا": خزمە دەگەڵ ↑ولین wılîn "هەڵگلۆفین"، سەر بە ریشەی < **(IE.) *uel- , *wel-** "سووڕان، خولانەوە، با دران". لەم مانایەوە دواتر مانای "تێکەڵ پێکەڵ" سەری هەڵداوە. دەستپاچە بوون بریتییە لەوە کە کەسێک دەست و پێی لێ تێکەڵ دەبێ، واتا نازانێ کامیان دەست و کامیان لاقییەتی! هەروەها مانای دووەمی وشەکە، واتا "قسەی بێمانا" ئاماژەیە بە قسەی تێکەڵ و پێکەڵ. لەم بارەوە بەراوردی بکە دەگەڵ "وڕێنە".

وڵوڵە **wlwle** [ *wılwıla* ] - "هێلکەی دەڵەمەی ناو سکی مامر": پێوەندی هەیە بە ↑وڵ wıl "شل و وڵ".

وڵۆ **wılo** - "وەسا، ئاوا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Bild، (Nl.) Beeld، (OG.) bilidi "وێنە، ئەسک، شێوە، نەخش"، سەر بە ریشەی < **(IE.) *bil-** "وێنە، شێوەی موعجیزەئاسا".

وڵە **wıle** [ *wıla* ] - "پان و بەرین": خزمە دەگەڵ ↑وڵات wılat [دە بنەڕەتدا: پانتایی زەوی].

وڵە **wıle** [ *wıla* ] - "کون، قووڵ": دەشێ خزم بێ لەگەڵ (G.) hohl، (Nl.) hol، (OE.) hol "هەڵۆڵ، بۆش"، (G.) Höhle، (E.) hole "کون". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن لەگەڵ ↑هەڵۆڵ helol و دواجار ↑*هاڵان halan*.

وڵی **wılî** [ *wılī* ] - "خونچە، بشکوژ": وڵ wıl یش دەگوترێ، بە مانای "گوڵ، خونچە". شێوەی کۆنتری↑ گوڵ gul [فۆتیمی w (v) کۆنترە و گۆڕاوە بە g].

ولین **wılîn** [ *wılīn* ] - "1-هەڵ گلۆفین 2- تێکوشین، تریت کردن": دەچێتەوە سەر ریشەی سەر بە ریشەی < **(IE.) *uel- , *wel-** "سووڕان، خولانەوە، با دران". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئەم مانایانە لە خۆ دەگرن، وەک ↑وێڵ wel "سەرگەردان"، ↑پێل pel "شەپۆل"، ↑ولنگە wılınge "دەستپاچە [سەر لێشێواو]، قسەی بێ مانا [وڕێنە]"، ↑فەلەک felek "گەردوون"، ↑وەلوەلە welwele "تێکەو لێکە، شلووقی"، (OIn.) valati "دەسووڕێ"، (L.) voluere "سووڕاندن، لوول دان، گلۆڵە کردن"، (Gr.) eileīn "سووڕاندن، با دانەوە"، (G.) Welle "پێل، شەپۆل"، (G.) Walze "نواڵە، باگردێن، وەردێنە"، (G.) walzen "جۆرێک سەما کردن [خۆ با دان]، خلۆر بوونەوە"، (OE.) wealt "ئاڵقە، بازنە"، (G.) wallen "جاری بوونی تێکەڵ پێکەڵ" و هتد.

وڵێو **wılew** [ *wılew* ] - "جوانچاک": دەشێ پێوەندی هەبێ بە وڵ wıl "گوڵ" و ↑وڵی wılî "گوڵ" و دە بنەڕەتدا بە مانای "جوان بوون وەک گوڵ".

ون **wın** - "گوم، نادیار، بزر": وندا wında ش دەگوترێ کە دەشێ شێوە کۆنترەکە بێ. خزمە دەگەڵ (G.) (ver)schwinden "وندا بوون"، (OG.) swintan، (OE.) swindan "کز بوون، لەناو چوون"، (Rus.) vjanut "ژاکان"، سەر بە ریشەی < **(IE.) *suendh-** "لە کزی دان، لە کەمی دان، لە ناو چوون".

ونار **wınar** [ *wınār* ] - "خێشکی تەخت کردنی زەوی": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑هۆن3 hon "خەت لە زەوی دان بۆ ئاو پێداهێنان".

2- ↑وەیەنە weyene "قەرتاڵە" و ↑وییە wîye "بێڵی دارین". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە کرداری ↑هۆنین honîn [هۆندن hondın، وەندن wendın، وناندن wınandın]. ئەم ئامرازانە لە شووڵ چندراون و ناوەکانیشان بۆ چەمکی "چنین، هۆنین" دەگەڕێنەوە.

ونجڕ **wıncır** *[ wınjır ]* - "لەت و پەت، بریندار": خزمە دەگەڵ Wund (.G)، wunt (.OG)، wond (.Nl)، wund (.OE) "برین، زام"، سەر بە ریشەی **< -*uen (.IE)** "لێدان، بریندار کردن". هەروەها هەڵیسەنگینە لەگەڵ ↑هۆن³ hon "خەت لە زەوی دان بۆ ئاو پێدا هێنان".

وندا **wında** *[ wındā ]* - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑ون wın "بزر".

وهار **wıhar** *[ wıhār ]* - "نزم ، نەوی": خزمە دەگەڵ ↑خوار xuwar "پێچەوانەی سەر".

وە **we** *[ wa ]* - پاشگرێکی کردارە چەند دۆخێکی وەک کشانەوە بۆ دواوە، دووبارە بوونەوە و بەردەوام بوون نیشان دەدا. [بۆ وێنە: گەڕانەوە، هاتنەوە، کشانەوە، پرینگانەوە، خولانەوە و هتد]. کاتێک ئەم پاشگرە دەکەوێتە کۆتایی کردارێک، فۆتیمی e وەک تیوگر دەکەوێتە تیوانی کردار و پاشگرەکە و دەبێتە "ەوە" ewe. شێوەی کۆنتری ئەم وشەیە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا وەک پێشگری↑ڤە ve دێتە کایەوە، بۆ وێنە ڤەکرن، ڤەخارن، ڤەشاردن، ڤەبرن و هتد. دە زمانی فارسیدا باز bāz (.P) و وا(ز) vā(z) (.P) وەک پیشگر بەکار دەهێندرێن [بازگشتن، بازماندن، بازداشتن، واز کردن، وارفتن، واشدن و هتد]. دە زمانی فارسیدا ئەسڵی وشەکە واز vāz بووە کە نها دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا بەکار دێ. ئەم وشەیە دواتر دە زمانی نووسینی فارسیدا بووەتە "باز" و دە زمانی ئاخافتنیشدا شێوەیەی کورتکراوی "وا"ی لێ دروست بووە. بەم جۆرە دەبێ فۆتیمی سەرەتای وشەکەدا دە ئەسڵدا v بووبێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ wieder (.G) "دووبارە"، کە دە زمانی ئەڵمانیدا هەم وەک وشەیەکی سەربەخۆ و هەمیش وەک پاشگر یاخود پێشگرە کوردمادی و فارسییەکە دەور دەبینێ. vider (.OIs)، witra (.Gt)، wider (.OE) بە هەمان شێوە بەکار هاتوون. وشە ژێرمەنییەکان پێک هاتوون لە *-tero + wi*. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑تر tır [زۆرتر، باشتر، فرەتر]. کەرتی یەکەم مانای "لێک جیا بوونەوە، لێک دوور بوونەوە" دەگەیەنێ و تیکڕای وشە ژێرمەنییەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "زۆرتر لێک جیا بۆوە، زۆرتر لێک دوور بۆوە، *واوەتر*" بەکار هاتووە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ weit (.G) "دوور، گوشاد"، weiter (.G) "دوورتر، *واوەتر، هەروەتر*، دیسانەکە" و دەگەڵ vitaram (.OIn) "دوورتر، ئەولاتر، واوەتر"، vtoroj (.Rus) "ئەوەی دووەم" [ئەوەی ئەولاتر] سەر بە ریشەی **< -*ui- , *wi (.IE)** "لێک جیا، لێک دوور". شیاوی باسە وشەی باز baz (.P) دە زمانی فارسیدا نەک هەر وەک پێشگر بە مانای "وە/ ڤە"ی کوردمادی، بەڵکوو وەک وشەیەکی سەربەخۆش بە مانای "کراوە، ئاوەڵا" بەکار دێ. ئەم مانایە دەگەڵ مانای ریشە هیندوئەوروپییەکە بە باشی یەک دەکرێتەوە، چونکە کاتێک بۆ وێنە دەرگا دەکرێتەوە، یان قوتوویەک سەری دەکرێتەوە، ئەوا لە هەمان کاتدا دۆخێکی لێک جیا بوونەوە و لێک دوور بوونەوە دروست دەبێ، واتا شتێک لە شتێکی دیکە جیا یاخود دوور دەبێتەوە و لە ئەنجامدا "کرانەوە" دروست دەبێ. "باز" دە زمانی فارسیدا هەروەها مانای "دیسان" دەبەخشێ و ئەم مانایەش لە وشەکانی سەرەوەدا بەرچاو دەکەوێ. هەر لێرەدا دوو وشەی کوردمادی واوەتر wawetır و هەروەتر herwetır سەرنج رادەکێشن کە کەرتی دووەم تێیاندا، واتا -wetır بەتەواوی دەگەڵ wieder (.G) و witero (.Grm) یەک دەگرێتەوە. کەرتی یەکەم لە وشەی "واوە"دا، واتا wa وێ دەچێ دە بنەڕەتدا ڤێ ve بەمانای "ئەو" بووبێ. سەبارەت بەم وشانە هەروەها بڕوانە ↑واز⁵ waz "کەمێکی جیا".

وەباڵ **webal** [ *wabāl* ] - "گوناح، تاوان": ↑شێوەی تازەتری ئۆباڵ obal.

وەتاخ **wetax** [ *watāx* ] - "هۆدە": اتاق otāq (P.)، شێوەیەکی دیکە لە ↑هۆدە hode "ژوور، دیو".

وەچ1 **wec 1** [ *waj* ] - شێوەیەکی سواوە لە ↑وەرج werc.

وەچ2 **wec 2** [ *waj* ] - "دەسکورت، هەژار": [ئەز وەجم]. خزمە لەگەڵ ↑وەزا weza "لاواز، داڵگۆشت" و ↑ویسک *wîsk* "لەر و لاواز".

[تێبینی: لەنێوان دوو چەمکی "لەڕ و لاوازی" و "هەژاری"دا پێوەندی هەیە. وشەی "هەژار" خۆی خزمە لەگەڵ hager (G.) "کز، لاواز". دیارە لە سەردەمانی پێش ئێستادا خەڵکی هەژار خواردنی پێویستیان نەبووە و بەم هۆیەشەوە لەر و لاواز بوون. لە سەردەمی ئێستادا بەتایبەتی لە وڵاتانی پیشەسازی ئەو پێوەندییە گۆڕانی بەسەرداهاتووە و زۆرجار هەژاری دەبێتە مایەی قەڵەوی و زکێ زلی و نەخۆشییە پێوەندیدارەکان؛ رەنگێ بێ هەژارەکانی سەردەمی بەرێ لە هی ئێستا ساغتر بووبن، چونکوو جموجۆڵ و هەواخۆری و تێکەڵاوییان زۆرتر بوو].

وەجاخ **wecax** [ *wajāx* ] - "ئاگردان": اجاق ocāq (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەک بە مانای "ئاگردان" بەکار دێ کە بریتییە لە Ofen (G.)، oven (E.)، ugn (Sw.) و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < **(IE.) *auk(h)-** "قاپ و مەنجەڵی چێشت لێنان". دە هێندی کۆندا ukha-h (OIn.) هەبووە بە مانای "قاپ و مەنجەڵی سەر ئاگر". "وەجاخ"ی کوردمادی لەوانەیە پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

وەجەر **wecer** [ *wajar* ] - "دەستوور، فەرمان، فتوا": هەروەک چۆن "فەرمان" پێوەندی بە "فەرموون"ەوە هەیە، هەر ئاواش "وەجەر" دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑وێژە weje و ↑بێژتن bêjtın "ئاخافتن".

وەچ(ە) **weç(e)** [ *wač(a)* ] - "1- بێچوو 2- چەکەرە 3- نەوە، نەسل": خزمە دەگەڵ ↑بێچوو beçu و ↑بەچکە beçke و چەندین وشەی دیکە.

وەححا **weḧ(ḧ)a** [ *waḥ(ḥ)ā* ] - "دەنگێ دانی گا و گاڕان": دە زمانی کوردمادیدا هێندێک لەو دەنگانەی بۆ بانگێ کردن یان دەنگێ دانی ئاژەڵەکان بەکار دێن، دە بنەڕەتدا شێوەیەک لە ناوی خودی ئاژەڵەکەن. بۆ وێنە "ختتە" کە بۆ دەرکردنی پشیلە دەگوترێ، دەچێتەوە سەر وشەی "کتک" کە ناوی پشیلەیە. یان "چغە" کە بۆ دوور کردنەوەی سەگێ دەگوترێ، دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە وشەی "سەگ". هەر بەم جۆرە "وەححا" دە بنەڕەتدا دەبێ ناوێک بووبێ بۆ گا. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ vacca (L.) و vāśā (OIn.) "گا". وێ دەچێ ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ox (E.)، oxa (OE.)، Ochse (G.)، auhsa (Gt.)، oss (OIr.) " گا". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی < **(IE.) *ūgh-** "تەڕ، تەڕ کردن، پڕژاندن".

وەر1 **wer** [1] [ *war* ] - "پێشگری کردار": [میناک: وەرگەڕان، تێوەردان، وەرکەوتن، وەرسووڕان]. پێشگرەکە دە زمانی کوردمادیدا کاتێک دەگەڵ کردارەکان دێ، زۆرتر مانای "سووڕان" یان "گۆڕان" لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر دەگەیەنێ. خزمە دەگەڵ پێشگری ber (P.)، ver (G.)، far (OG.)، par (OIn.)، pro (L.) و (Gr.)، por (L.)، peri (Gr.)، pro و per (Lit.)، fra و fair (Gt.) سەر بە ریشەی< **(IE.) *per-** "پێش، بەر". خزمە دەگەڵ ↑بەر ber "پێش" و چەندان وشەی دیکە.

وەر$^{2}$ **wer** [ *war* ] - "پێشگری کردار": لە کرداری پێوەرکردن pe wer kırdın دا دەیبینین. "وەر" بەم مانایە لە پێوەندیدایە لەگەڵ ↑وەرین werîn. مەبەست لە "پێوەرکردن" هەمان "بەسەردا وەراندن"ە.

وەر$^{3}$ **wer** [ *war* ] - "پێشگری کردار": بەشێکە لە کرداری تێوەردان te wer dan [ئاوی تێ وەردە، دە ئاوی وەردە]. لە فارسیدا دەگوترێ "اب توش بگردان". ئەم "وەر"ە خزمە لەگەڵ هێندێک وشەی زمانی کوردمادی وەک ↑*وەرانین weranîn*، ↑وەردێنە werdene [وەردانە werdane]، ↑وەرد (دانەوە) werd danewe و هتد. هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "سووڕاندن(ەوە)، گەڕاندن(ەوە)" دەکەن. کرداری گەڕاندن gerandın یان گەرداندن gardāndan (P.) شێوەیەکی گۆڕدراوە لە کردارێکی کۆنتری وەک *وەرداندن werdandın**، واتا فۆتیمی g لەم وشەیەدا فۆنێمێکی تازەیە و گۆڕدراوی فۆتیمی w یە.

-وەر$^{4}$ **-wer** [ *war* ] - پاشگرێکە لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا و مانای "هەڵگر" دەداتە ئاوەڵناوەکە، وەک ↑بەختەوەر bextewer، هونەروەر hunerwer، دادوەر dadwer [هەڵگری بەخت، هونەر یان داد]. شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑-بار$^{4}$ -bar بە هەمان مانا.

وەرار$^{1}$ **werar** [ *warār* ] - "ورە": شێوەیەکی دیکە لە ↑ورە wıre "هێز و ئازایی دەروون".

[تێبینی: ئەم وشەیە نیشان دەدا کە هێندێک وشەی دیکەش، بۆ وێنە "قەرار" و "وەرار$^{2}$" وشەی کوردمادین. ئەم وشانە بەم چەشنە پێک هاتوون: بنجی وشەکە + پاشگری ar].

وەرار$^{2}$ **werar** [ *warār* ] - " پێشڤەچوون": وەرار کرن دە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزیدا وەک to develop مانا کراوەتەوە. مانای بنەڕەتی وشەکە "تەحەوول" و ئاڵوگۆڕ بەسەردا هاتنە. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وارای waray "گۆڕان"، گۆڕان goran و ↑گۆڕین gorîn.

وەراز **weraz** [ *warāz* ] - "کۆخڵ، زانا لە چەڵتووک چاندن": خزمە دەگەڵ oryza (L.) و (Gr.) "برینج". ئەم وشە یۆنانییە ریشەکەی بۆ زماتیکی نەناسراوی باشووری ئاسیا دەگەڕێتەوە و لە رێگەی زمانی هیندی و فارسییەوە چووەتە ناو زمانانی یۆنانی و لاتینی. دە زمانی هیندی کۆندا vrīhi-h (OIn.) بووە و دە ئەفغانیدا vrižē بە مانای "برینج" دێ. ئەم وشانە هاتوونە ناو زمانە ژێرمەنییەکانیش و بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا بووەتە Reis "برینج". وشەکانی ↑برینج bırînc و لەوانەیە ↑برۆش bıroş پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

وەرافتن **weraftın** [ *warāftın* ] - "هەڵپشاوتن": خزمە دەگەڵ wringen (G.) "گوشین و با دانی جلکی تەڕ" و ↑وەرانین weranîn "تیوەپێچان"و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "با دان، سووڕاندن".

وەرام **weram** [ *warām* ] - "بەرسڤ": ↑وەڵام walām یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ورتە wırte سەر بە ریشەیەک بە مانای "گوتن، قسە کردن". شیاوی باسە کە وەرام دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە Antwort (G.) کە لە دوو بەش پێک هاتووە و کەرتی دووەمی پێوەندی بە "ورتە" کەی خۆمانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا واتا "رووبەرووی قسەیەک بوونەوە".

وەرانین **weranîn** [ *warānīn* ] - "تیوەپێچان، لێهاڵاندن": وەراندن werandın یش دەگوترێ. هەروەها وەران weran هەیە بە مانای "پێچران، لێهاڵان". لەم پێوەندییەدا دەبێ ئاماژە بە چەندین وشەی دیکەش بکەین کە لە یەک ریشەوە سەرچاوە دەگرن، وەک ↑وەرافتن weraftın "هەڵپشاوتن، هەڵشێلان"، ↑وەرد werd دانەوە "گەڕاندنەوەی گاجووت لە خەتی جووتدا" [دە بنەڕەتدا: با دانەوە]، ↑وەرتە werte "وشەی گەڕاندنەوەی گاجووت لە خەتی جووت دا"، ↑وەردێنە werdene "داری پان کردنەوەی گونکە هەویر"، ↑گوریس gurîs [دە بنەڕەتدا:

↑وەریس werîs] "بەنی لێک با دراو"، ↑ور wır "گێژ، سەر سووڕاو"، ↑وڕڕە[1] wırre "دەنگی سووڕانی خێرای چەرخ"، ↑وررووکان wırukan "تیهاڵان، تیورووکان" و هتد. ئەم وشانە گشتیان هاوبەشن دە چەمکی "سووڕان"دا و دەچنەوە سەر ریشەی **< *uer-, *wer- (IE.)** "سووڕان، با دران". گەلێک وشە دە زمانە هیندو ئەوروپییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەک werden (G.) "بوون" [لە شتێکەوە بوونە شتێکی دیکە، تەبدیل بوون]، werfen (G.) "هاویشتن، فڕێ دان"، verwirren (G.) "وڕ بوون، سەرلێشێوان"، wringen (G.) "گوشین و با دانی جلکی تەڕ"، vártati (OIn.) "دەسووڕێ"، várjati "با دەداتەوە"، vertare (L.) "سووڕان، گەڕانەوە، بادانەوە"، veržti (Lit.) "ڕێکگوشین"، rémbein (Gr.) "خولانەوە"، vergere (L.) "چەمانەوە، داهاتنەوە"، verpti (Lit.) "تەنین، هۆنینەوە"، versti (Lit.) "با دانەوە، سووڕاندن"، vertet (Rus.) "سووڕان" و هتد. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑گەڕان geran و ↑گۆڕان goran پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە و فۆتیمی سەرەتای ئەم وشانە لە w بووەتە g.

**وەر(ب) wer(b)** [ *war(b)* ] - "بەفر": ڤەرڤە verve ش دەگوترێ. شێوەی کۆنتری بەرف berf. دە کوردمادی سەروودا و هەروەها دە فارسیدا berf دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑وەرڤین wervîn "دڵۆپان، ئاو لێ چۆڕان، تکە کردن".

**وەرت wert** [ *wart* ] - "1- بریکار، وەکیل 2- ناوەڕاست": بە مانای دووەم ↑وەرتە[1] werte ش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑ئۆرت *ort*.

**وەرتە[1] werte[1]** [ *warta* ] - "1- ناوەڕاست 2- قالی زل": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئۆرت ort.

**وەرتە[2] werte[2]** [ *warta* ] - "وشەی گەڕاندنەوەی گاجووت لە خەتی جووتدا": خزمە دەگەڵ ↑وەرد werd بە مانای "گەڕانەوە، پێداهاتنەوە و کێڵانی دووبارەی زەوی". وشەکە دەبێ بە واتای بانگ کردن و فەرمان دان بە بادانەوە و گەڕانەوەی گاجووت بێ.

**وەرج werc** [ *warj* ] - "1- نرخ 2- فایدە": وەج wec یش دەگوترێ [سوانەوەی فۆتیمی r]. هەروەها ↑ئۆرت2 ort2 هەیەبە مانای "ڕێز، ئیعتیبار". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Wert (P.)، werd (OG.)، worth (E.)، värd (Sw.) "وەرج، نرخ" و Würde (G.) "کەرامەت". هەروەها خزمن دەگەڵ ↑وەرانین weranîn "لێهاڵاندن" و ↑گۆڕین gorîn [دە بنەڕەتدا "وەرین werîn"] سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دان". وشەی ↑بەرژەوەند berjewend بەمانای "قازانج، فایدە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و پێشتر بە شێوەی وەرجەوەند/ وەرزەوەند/ وەرژەوەند بوو.

**وەرچەپین werçepîn** [ *warčapīn* ] - "لا دان، کلا بوون، چەپ بوون لە ڕێی ڕاست": دە فارسیدا چپە شدن čape šodan (P.) بە مانای "لە ڕێی لادان و وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل" بەکار دێ. ↑وەر wer + چەپین çepîn [↑چەپ çep]. چەپ دە بنەڕەتدا بە مانای "خوار"ە و هەر بۆیەش بەرانبەری "ڕاست" بەکار هێنراوە.

**وەرد werd** [ *ward* ] - وەرد دانەوە واتا "1- کێڵانەوەی زەوی 2- ژێر و رووکردنی خۆیانی بەر پێی گاگێرە": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑وەردێنە werdene، ↑*وەرانین weranîn* "تێوەپێچان"، ↑وەرافتن weraftın "هەڵپشاوتن" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *wer- (IE.)** "سووڕان، گەران(ەوە)، با دان(ەوە)". لە هەردوو مانای وشەی "وەرد"دا چەمکی "سووڕان و گەرانەوە" یاخود "هەڵگەڕانەوە" بەدی دەکرێ. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ vártati (OIn.) "دەسووڕێ" و várjati "با دەداتەوە"، vertare (L.) "سووڕان، گەڕانەوە، با دانەوە". وەرد دانەوەی زەوەی کێڵدراو یان ئەوەتا بە مانای با دانەوەی گاجووت و پێداهاتنەوە بە زەوییەکەیە، یانیش مەبەست هەمان هەڵگەراندنەوەی دووبارەی خۆڵەکەیە. لە مانای دووەمی

وشەکەشدا کە لە سەرەوە دەیبینین، مەبەست لە وەرد دانەوە، ژێر و رووکردن واتا هەڵگەڕاندنەوەی خۆیانە.

وەردێنک **werdenk** *[ wardenk ]* - "ناوەند، کرۆک": بڕوانە ↑وەرتە[1] werte "ناوەڕاست" و دواتر ↑ئۆرت *ort*.

وەردێنە **weredne** *[ wardena ]* - "داری ئەنگوتك پان کردنەوە": وەردەنە verdene ش دەگوترێ. vardane (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑وەرانین weranîn "تیوەپێچان" و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەك بە مانای "سووڕان، با دان". وەردێنە دارێکی خڕە کە لەسەر گونکە هەویر دادەنرێ و بە هەر دوو لەپی دەست دەسووڕێندرێ و بە هۆیەوە هەویرەکە پان دەکرێتەوە.

وەرز **werz** *[ warz ]* - "دەمسالْ، فەسڵ": دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەی Saison "وەرز" دەچێتەوە سەر کردارێك بە مانای "چاندن"، واتا سەرەتا "وەرزی چاندن" مەبەست بووە. هەر بەم جۆرە دە زمانی کوردمادیشدا وشەی وەرز سەرەتا بە مانای "وەرزی کشت و کاڵ" بووە و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "کار، کاری کشت و کاڵ". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑وەرزا werza "گاجووت" و ↑وەرزێڕ werzer "جووتیار" و ↑وەرزین[1] *werzîn* "وەرزش کردن" [کۆنتر: کار (ی کشتوکاڵی) کردن]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Werk (G.) و work (E.) "کار، کار کردن". ئەم وشانەدەچنەوە سەر ریشەی **< -*wer- ,*uer (IE.)** "سووڕاندن، با دان، چەماندنەوە، هۆنینەوە".

وەرزا **werza** *[ warzā ]* - " گاجووت": وەرزە werze ش دەگوترێ. ورزو warzū (P.). خزمە دەگەڵ ↑وەرزێڕ werzer "کێڵەر".

وەرزاخ **werzax** *[ warzāx ]* - "زەرد و ماە، شاخی سەخت": خزمە لەگەڵ ↑بەرز berz "بڵیند". شیاوی باسە کە وشەی Berg (G.) "شاخ، چیا" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها وەرزەك یان بەرزەك هەیە بە مانای "بڵندایی کەم لەناو راستاییدا". مامۆستا هەژار وێڕای مانا کردنەوی "وەرزەك، بەرزەك" لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا، بە دروستی دەنووسێ کە برزخ barzax (Arb.) لەم وشەیە وەرگیراوە.

وەرزەك[1] **werzek** *[ warzak ]* - شێوەیەکی دیکە لە بەرزەك berzek و خزمە لەگەڵ ↑وەرزاخ werzax "زەرد و ماە، شاخی سەخت".

وەرزەك[2] **werzek** *[ warzak ]* - "زانا لە ژمارەگەری و لێکدانەوە": بڕوانە ↑وەرزین2 werzîn 2 "لێکدانەوە، راڤە".

وەرزین1 **werzîn 1** *[ warzīn ]* - "وەرزش کردن": خزمە دەگەڵ ↑وەرزێڕ werzer "جووتیار" و سەر بە ریشەی **< -*wer- ,*uer (IE.)** "سووڕاندن، با دان ، چەماندنەوە، هۆنینەوە".

وەرزین2 **werzîn 2** *[ warzīn ]* - "لێکدانەوە، راڤە، لێکدانەوەی خەون": هەروەها وەرزەك[2] werzek هەیە بە مانای "زانا لە ژمارەگەری و لێکدانەوە". خزمە لەگەڵ ↑وەرزین1 werzîn 1 و ↑وەرزێڕ *werzer* و دواجار ↑بیر bîr [ویر wîr] "هزر". وەك لەژێر ↑وەرزین1 werzîn 1 دا باسکرا، ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*wer- ,*uer (IE.)** "سووڕاندن، با دان ، چەماندنەوە، هۆنینەوە". بەڵام ئەم ریشەیە هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە مانایەکی دیکەشی وەرگرتووە کە بریتییە لە "دەورگرتن و پاراستنی شوێتێك بە دار و دیوار و بەربەست". ئەم مانای دووەمە لەوەڕا هاتووە کە شتگەلی وەك دیوار، بەربەست، پەرژین و هیتر دە بنەڕەتدا جۆرێك لە کرداری هۆندنەوەیان تێدابووە، واتا لەڕێگای چەماندنەوە و تێکخستن و هۆندنی شووڵ و

لقەدار دروست کراون. وشەی ↑وار war "ماڵ" و ویر wîr "هزر، حافیزە" لەم مانا دووەمەوە سەرچاوەیان گرتووە.

وەرزێر **werzer** *[ warzer ]* - "جووتیار": وەرز werz + ێر er [پاشگر]. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑وەرزین werzîn، ↑وەرزا werza، ↑وەرز *werz*. بنەوشەی وەرز -werz دە بنەڕەتدا بە مانای "کار کردن، کاری کشت و کاڵ کردن" هاتووە و خزمە دەگەڵ Werk (G.)، work (E.)، werk (Nl.)، verk (Sw.)، ergon (Gr.)، gorc (Arm.) "کار"، vrajá-h (OIn.) "پەرژین"، -varez (Av.) "بەربەست کردن"، eirgein (Gr.) "دەورگرتن، قەتیس کردن"، fraig (OIr.) "دیوار". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا سەر بە ریشەیەکن بە مانای "سووڕاندن، چەماندن، تێکخستن، تەنین، چنین". ئەم وشانە دە پلەیەکی دیکەدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑وار war "ماڵ" و ↑وارش warş "شوورە"، ↑*وریا* *wırya* "زیرەک، بیرمەند" و ↑بیر bîr "هزر" و چەندین وشەی دیکە.

وەرژوو **werju** *[ waržū ]* - "شێلان و مشتوماڵ دان": خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕاندن، با دان"، وەک wringen (G.) "گوشین و بادانی جلکی تەڕ"، vártati (OIn.) "دەسووڕێ" و várjati "با دەداتەوە"، vertare (L.) "سووڕان، گەڕانەوە، بادانەوە"، veržti (Lit.) "ڕێکگوشین" و دە زمانی کوردمادیشدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وەرانین weranîn "لێهاڵاندن" و چەندین وشەی دیکە.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا ولین wılîn یش بە مانای "هەڵگلۆفین" دێ و دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە مانای "سووڕاندن، با دان"].

وەرساندن **wersandın** *[ warsāndın ]* - "پچڕاندن": خزمە دەگەڵ ↑وێرت wert "لەوەڕگە".

وەرسە **werse** *[ warsa ]* - "مایچە": هەروەها وەرسەل wewrsel بە مانای "ئێسک" هاتووە. ئەم مانایانە دەری دەخەن کە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "سەخت، رەق" بووبێ. ناوەکانی دیکەش، وەک "مایچە" یان "زێیەر" لە بنەڕەتدا مانای "سەخت، سفت" لە خۆ دەگرن. دەشێ وشەکە پێوەندی بە ↑*بەرد* *berd* ەوە هەبێ کە لە کۆندا وەرد werd بووە. ئەم وشەیە بەم شێوەیە لە وشەی ↑لاجوەرد lacwerd دا دەبینرێ.

[تێبینی: لەنێوان ئەو وشانەی بە مانای "ئێسک" و "بەرد"دا بەکار دەهێنرێن، پێوەندی هەیە. بۆ وێنە وشەی "هەستی" لە زمانی کوردمادیدا هەم مانای "ئێسک" دەدا (استخوان بە فارسی) و هەم مانای "بەرد" و خزمیشە لەگەڵ وشەی ئەڵمانی Stein "بەرد"].

وەرڤین **wervîn** *[ warvīn ]* - "دڵۆپان، ئاو لێ چۆڕان، تکە کردن": وەرفتن werıftın یش دەگوترێ، هەروەها وەرڤاندن wervandın هەیە بە مانای "دڵۆپاندن، پاڵاوتن". دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑ورتاندن2 wırtandın "چڵک دانی برین"، سەر بە ریشەی **< -*(a)uer (IE.)** "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون". ↑وەر(ب) wer(b) [ڤەرڤە verve] "بەفر" دەشێ پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

وەرقیل **werqîl** *[ warqīl ]* - "ئاڵقەی دارین لە رەشکەدا":

1- یان خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑ورگێلان wırgelan "سووڕان، گەرانەوە".

2- یان ↑وەرانین weranîn "لێهاڵاندن، تیوە پێچاندن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران، چەمان".

[تێبینی: "ئاڵقە" خۆی خزمە لەگەڵ "هاڵان" [لێهاڵان]. هەروەها دە نێوان دوو چەمکی "سووڕان" و "ئاڵقە، بازنە"دا پێوەندی هەیە. wealt (E.) "ئاڵقە، بازنە" خزمە دەگەڵ "وڵین"ی کوردی و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، باد ران"].

وەرگ1 **werg** [ *warg* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑گورگ gurg.

وەرگ2 **werg** [ *warg* ] - "گەڵا": برگ berg (P.)، ئەم وشەیە لە زمانی عەرەبیدا گۆڕاوە و بووەتە ورقة waraqa (Arb.)، بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑وەرەق wereq "پەڕ".

وەرگێرکە **wergerke** [ *wargerka* ] - "1- منداڵی فێرە ڕۆیشتن 2- منداڵی بەردەست بۆ ئیش و کار": ↑وەروێرکە werwerke ش دەگوترێ. ئەمە شێوەی کۆنتری وشەکەیە [گۆڕانی فۆتیمی w/v بۆ g]. پێوەندی هەیە بە کرداری ↑گەڕان geran. مەبەست منداڵێکە بەم لا و ئەولادا دەسووڕێتەوە یان هەڵدەسووڕێ.

وەروەرە **werwere** [ *warwara* ] - "شاپالۆخ، بەفرماڵ": خزمە دەگەڵ ↑پریواندن pırîwandın یان پرواندن pırwandın "(دەست) ڕێخشاندن"، reiben (G.)، riban (OG.)، wriven (MNl.) "ڕێخشاندن". وەروەرە ئەو شتەیە کە بۆ ڕاماڵینی بەفر لە هەرد دەخشێندرێ. هەروەها خزمیشە دەگەڵ رفتن roftan (P.) یان روبیدن rūbīdan (P.) بە مانای "ماڵین، ڕاماڵین". ئەم وشانەی سەرەوە دە کۆندا خاوەنی فۆتیمی w بوون لە سەرەتای وشەکاندا و دەچنەوە سەر ریشەی > ***wer-, *uer-** (*IE.*) "سووڕان، با دران، چەمانەوە". دە وشەی "وەروەرە"دا بنجی وشەکە دووبارە دەبێتەوە و ئەمەش دە گەلێک وشەی کوردمادیدا دەبینرێ و دۆخی جەخت کردن دروست دەکا، وەک فرفرە، پڵپڵە، شەقشەقە، ڕەوڕەوە، لاولاوە [هی دەرگا و پەنجەرە] و هتد. هەروەها وشەی پارو pārū (P.) "بەفرماڵ" دەشێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و بەتایبەتی هەڵیسەنگێنە دەگەڵ وشەی کوردمادی "پریواندن".

[تێبینی: مامۆستا هەژار وشەی "وەروەرە"ی وەسا شی کردۆتەوە کە لە دوو کەرتی وەر wer (بە مانای بەفر) + وەرە were (بەرە) پێک هاتووە، واتا "بەفر بەرە"، ئەو شتەی بەفر دەبا (هەنبانە بۆرینە، ل. 918)].

وەروێرکە **werwerke** [ *warwerka* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑وەرگێرکە wergerke.
فۆتیمی w کۆنترە لە g.

وەرە **were** [ *wara* ] - "بەرەی زین": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑بەرە bere "ڕایەخ".

وەڕە **were** [ *wara* ] - "گەڵا": [سێوەڕە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑وەرگ2 werg و ↑وەرەق *wereq* "پەڕ".

وەرەز **werez** [ *waraz* ] - "جارز": هەر سێ وشەی وەرەز werez و ↑جارز carız و ↑قەڵس qelıs لەیەک ریشەوە هاتوون و دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون. فۆتیمی سەرەتای وشەکە دە بنەڕەتدا g بووە و گۆڕاوە بە q، c و w.

وەرەق1 **wereq** [ *waraq* ] - "پەڕ": تا ئەو جێیەی بیرم یاری بکا، زمانەوانی فارس ئیحسانی تەبەری لە وتارێکدا نووسیبووی ئەم وشە عەرەبییە لە برگ berg (P.) "گەڵا" وەرگیراوە. ئەم وشە فارسییە خۆی خزمە دەگەڵ ↑پەل pel [یان پەلک pelk، وەڵگ velg] "گەڵا"، ↑پەڕ per "وەرەق" و هەروەها ↑بەڵگە belge [دە بنەڕەتدا: وەرەقی کاغەز]. ئەوەی دەکرێ لێرەدا بیخەینە سەر بۆچوونەکەی تەبەری ئەوەیە کە دەشێ فۆتیمی سەرەتای ئەم وشانە دە زمانی کۆنی کوردمادی و فارسیدا فۆتیمی v بووبێ و زمانی عەرەبیش لەو سەردەمەدا وشەکەی خواستبێتەوە. دواتر ئەم فۆتیمە گۆڕاوە بە b و p. بەم جۆرە دەبێ وشەکە سەرەتا **ver(e)g* یان **ver(e)k* بووبێ. دە شێوەزارەکانی کوردمادیدا ↑وەرگ werg و ↑وەڕە were [سێوەڕە] ش دەگوترێن کە شێوەی کۆنتری ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا نیشان دەدەن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ follium (L.)، phyllon (Gr.)، Blatt (G.)، blad (Nl.)، (Sw.)، blade

(E.) "پەڕ، پەڕە، گەڵا، وەرەقە". ئەو وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *bhel-** < "هەڵمسان، گەورەبوون، هەڵدان". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ↑گوڵ gul و ↑ولی wılî "خونچە".

وەرەق **2 wereq** [ waraq ] - "تولەی دوورەگەی سەگی تیر و تاژی مێوینە": خزمە لەگەڵ ↑باڕ bar [بارەکەو] و ↑پوور *pur* [پور pūr (P.) "کوڕ" لە فارسیدا].

وەرەک **werek** [ warak ] - "خۆزگە": شێوەیەکی دیکە لە ↑بریا bırya.

وەریس **werîs** [ warīs ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑گوریس gurîs. فۆتیمی w کۆنترە و گۆڕاوە بە g.

وەرین[1] **werîn** [ warīn ] - "کەوتنەخوار، بەربوونەوەی گەڵا و مێوە و ...": وەریان weryan یش دەگوترێ. وشەکە دەبنەڕەتدا بە مانای "کەوتن، بەربوونەوە"یە. خزمە دەگەڵ ↑بەر ber [بەر بوونەوە] و هەروەها ↑وەر[2] wer "پێشگری کردار" [پێوەرکردن pe wer kırdın "پێوەرکردن" هەمان "بەسەردا وەراندن"ە].

وەرین[2] **werîn** [ warīn ] - "هاتن": [وەرە ئێرە]. هەروەها هەرە here هەیە بە مانای "بڕۆ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑هەڕا hera کردن [↑ڕا کردن ra kırdın]، سەر بە ریشەی < ***reu-** **(IE.) *ere-, *re-,** "بزووتن". گۆڕانی فۆتیمی h بە w دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک "هێز" و "وزە"، "هرچ" و "ورچ"، "هورد" و "ورد"، "هوشیار" و "وشیار" و هتد. نموونەی پێچەوانەی ئەم گۆڕانەش بەرچاو دەکەوێ، واتا w دەبێتە h.

وەڕین **werîn** [ warīn ] - "دەنگێ هەڵبڕینی سەگ": چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەن کە دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش، وەک ↑وڕنگە wırnge "گۆرانی بن لێوان"، ↑وڕڕە wırre "چەقە، چەنەدرێژی" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < **(IE.) *uer-** " گوتن، قسە کردن". ↑ورتە wırte، ↑هاوار hawar، هۆڕە hore، ↑حەیران ĥeyran [دەبنەڕەتدا: "هەیران"، "ئەیران"] و چەند وشەیەکی دیکە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

وەزا **weza** [ wazā ] - "لاواز، داڵکۆشت": ↑ویسک wîsk "لەر و لاواز".

وەزگ **wezıg** [ wazıg ] - وەزگ دان واتا مردن (لە داخان). [وەختە لەداخ بێگانەپەرستی وەزگ بدەم]، بڕوانە ↑وزاق wızaq "دەرپەڕین، بازدی بڵند".

وەزن **wezın** [ wazın ] - "کێش، قورسایی": لەوانەیە ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبی نەبووبێ، بەڵکوو لە زمانی کوردمادی بەرێ یان فارسی کۆن وەرگیرابێ. ئەم وشەیە دەقاودەق یەک دەگرێتەوە دەگەڵ wägen (G.)، weigh (E.)، vega (OIs.) "وەزن کردن"، Waage (G.) "تەراوزوو"، abwägen (G.) "هەڵسەنگاندن" و هتد. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ دەیان وشەی کوردمادی کە ئاماژە بە چەمکی "بزووتن، جووڵان" دەکەن و دە بنەڕەتدا مەبەست لە "وەزن کردن" هەڵهێنان و جووڵاندنی شتێک بووە بۆ پەی بردن بە قورساییەکەی. وشەکە دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بزاوتن *bızawtın*، ↑بازد bazd، ↑هەڵبەزین helbezîn، داوەزین dawezîn، ↑وەشاندن weşandın [راوەشاندن]، ↑بێشکە bêşke "جۆلانە، لانکە" و هتد.

وەزەن **wezen** [ wazan ] - "ئێش و ئازار": خزمە لەگەڵ ↑وەی *wey* "ئێش و ئازار" [وەیش weyş].

وەزیر **wezîr** [ wazīr ] - "راوێژکاری سەرۆکی وڵات": خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑ئاوەز awez [a-wez] "ئەقڵ، ژیری"، ↑وەیس weys، ↑ویژدان wîjdan، ↑وەسا wesa "وەها، ئاوا"

و هتد. وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە. لە بنەڕەتدا مەبەست لە "وەزیر" مرۆڤی "ئاوەزمەند" بووە.

**وەزین wezîn** [ *wazīn* ] - "با هاتن، جووڵانەوەی با": وزیدن wazīdan (.P). دوو لێکدانەوە ڕێی تێدەچێ:

1- خزم بێ لەگەڵ wehen (.G)، wajan (.Gt)، wawan (.OE) "با هاتن، هەڵکردنی با، بەدەم باوە جوولانەوە".

2- لەوانەشە خزم بێ لەگەڵ ↑بزووتن bızuwtın "جووڵانەوە، تەکان خواردن، لەرینەوە".

**وەژاردن wejardın** [ *wažārdın* ] - هەڵوەژاردن واتا "خاوێن کردنەوە، جوێ کردنەوەی شتومەک و دانانی هەر شتەی لەسەر شوێنی خۆی": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بژاردن bıjardın، ↑دابێژتن dabejten، ↑بژار bıjar کردن، ↑بیژوو bîju و هتد. چەمکی هاوبەشی گشت ئەم وشانە "جیا کردنەوە"یە، واتا بنجی ئەم وشانە ئاماژە بە "جیا کردنەوە" دەکا. مەبەست لە هەڵوەژاردن دە بنەڕەتدا جیا کردنەوەی شتە تێکەڵ و پێکەڵ یان نارێک و پێکەکان لە یەکترە. دە زمانی فارسیدا وشەی ویژه wīže (.P) بە مانای "تایبەتی" هەیە [دە بنەڕەتدا واتا جیاکراوە، هەڵبژاردە، شتیکی جیا لەوانی دیکە]. ئەم وشە فارسییە دەگەڵ بیژوو bîju ی کوردمادی بە مانای "زۆڵ" یەک دەگرێتەوە و دە بنەڕەتدا مەبەست شتیکی [لێرەدا منداڵێکی] جیا لەوانی دیکەیە، منداڵێکی جیاواز.

**وەسا wesa** [ *wasā* ] - "وەها، ئاوا، وەک": گشت وشەکانی وەسا wesa، ↑وەها weha و ↑وەک wek دە بنچینەدا یەک وشە بوون. دە زمانی فارسیدا وەش -waš (.P) وەک پاشگر بەکار دێ بە مانای "مینا، وەک"، بۆ وێنە مهوش mahvaš (.P) "وەک مانگ"، پریوش parīvaš (.P) "وەک پەری". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Weise (.G)، wijs (.Nl)، wīsa (.OG)، wīse (.OE)، wīs (.OF)، vis (.Sw) "جۆر، چەشن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑(ئا)وەزین (a)wezîn "تێگەیشتن، ژیر بوون" و دەچنەوە سەر ریشەی **< -ueid* (.IE)** "دیتن". دە بنەڕەتدا مەبەست لە وشەکانی سەرەوە ئەوە بووە کە فڵانە شت چۆن دێتە بەرچاو، چۆن دیاری دەکا.

**وەسار wesar** [ *wasār* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑بەهار behar.

**وەستا westa** [ *wastā* ] - "لێزان، کارزان لە پیشەیەکدا": استاد ostād (.P). بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی (ل. 90) بنجی وشەکە دە بنەڕەتدا بریتییە لە -stāta "وەستاو"، سەر بە ریشەی **< -stā (.IE)** "وەستان". مەبەست لە "وەستا" ئەو کەسەیەکە لە پێشەوە وەستاوە، واتا پێشەوا.

**وەستان westan** [ *wastān* ] - "(بەپێوە) لە شوێنێک جێگیر بوون": خزمە دەگەڵ ایستادن īstādan (.P) و وایستادن wā-īstadan (.P). وشەکە دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە پێشگری ↑وە we [ڤە ve] + ستان sıtan، هەر وەک وەخواردن، وەکردن، وەگەڕان و هتد. کەرتی "ستان" خزمە دەگەڵ stehen (.G)، stān (.OG)، staan (.Nl)، sta (.Sw) "وەستان، راوەستان"، سەر بە ریشەی **< -st(h)ā (.IE)** "وەستان، وەستاندن، جێگیر کردن". ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: stare (.L) "وەستان، دانان"، histánai (.Gr) "دانان"، stóti (.Lit) "وەستان"، stojat (.Rus) "راوەستان". دە زمانی کوردیدا خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە، لەوانە ↑ستان sıtan "وڵات" [وەک کوردستان kurdıstan].

[تێبینی: لە هێندێک لە زمانەکاندا وشەکە مانای "دانان، جێگیر کردن"یش دەدا. دە زمانی ئەڵمانیدا stehen دەبێتە "(را)وەستان" و stellen "دانان"، کە ئەویش لەم ریشەیەوە دێ. وەک

دەزانین ریشەکە هەردووک مانا بە دەستەوە دەدا. مانای "دانان" دە بنەڕەتدا "وەستاندن"ی مەبەست بووە. دانانی شتێک لە شوێنێک لە راستیدا وەک وەستاندنی ئەو شتە لەو شوێنە وایە، چونکوو تا کاتێک شتەکە دانەنرێ، واتا "بە حەواوە بێ"، ئەوا وەک جێگیر و وەستاو نایەتە ژماردن].

وەسمە **wesme** [ *wasma* ] - "رەنگێکە ژنان لە برۆی دەدەن": وسمە vasme (P.). دە "فرهنگ جامع المانی بە فارسی"دا وشەکە وەک Waidblätter (G.) مانا کراوەتەوە، واتا "گەڵای رووەکێک بەناوی Waid کە لە کۆندا رەنگی شینی بۆ رەنگ کردن لێ بەرهەم هاتووە. ناوی ئەم رووەکە دەچێتەوە سەر ریشەی ژێرمەنی **waizda-* (*Grm.*). دەکرێ وشە کوردمادییەکە دەگەڵ ئەم وشە ژێرمەنییە هەڵسەنگێنین.

وەش **weş** [ *waš* ] - "خۆش": واش waş یش دەگوترێ. هەروەها ↑وەشلە weşle هەیە بە مانای "خۆزیا". شێوەیەکی کۆنتر لە ↑خۆش xoş و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ویستن wîstın. "وەش" یان "خۆش" دەبێ دە بنەڕەتدا بەمانای "خوازراو، دڵخواز" بووبێ، واتا ئەو شتەی دڵ حەزی لێ دەکا.

وەشاندن**1** **weşandın** [ *wašāndın* ] - "بڵاو کردنەوە": هەروەها وشەکانی ↑هەڵوەشان helwešan و ↑داوەشان daweşan بە مانای "لە بەر یەک بڵاو بوون" بەکار دێن. دە زمانی فارسیدا بەرانبەری ئەم وشە کوردمادییانە "از هم پاشیدن" az ham pāšīdan دەگوترێ. هەر وەها وشەی پەخش pexş [پەخش و پەرێشان] و ↑پەخشان pexşan پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادییدا "داوەشان" بۆ مرۆڤ و "هەڵوەشان" بۆ شت [ی پێکهاتوو لە چەند بەش] بەکار دێ. دیارە مەبەست ئەوە کە پێکهاتەکە لەبەر یەک بچێ و بەشەکان لێک جیا ببنەوە. چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەن کە پێوەندییان بەم وشانەوە و هێندێکیان لەژێر ↑پژان pıjan دا باس کراون. هەر وەک ئاماژە کرا، دە زمانی کوردیدا زۆرجار "پەخش و پەرێشان" دەگەڵ یەک بەکار دەهێنرێن و ئەمەش مانای بنەڕەتی وشەکە پشتراست دەکا. وشەی "پەرێشان" خزمە دەگەڵ "پرژان" و دە بنەڕەتدا مانای "لەبەر یەک بڵاو بوون و بەم لا و ئەولادا بڵاو بوونەوە" دەبەخشێ. ئەم وشانە چ پێوەندییەکیان بە وشەکانی "بەش"، "بەشینەوە" و "بەخشین"ەوە نییە.

وەشاندن**2** **weşandın** [ *wašāndın* ] - "تەکان دان": دەگەڵ پێشگری "را" و "دا" بەکار دێ [راوەشاندن، داوەشاندن]. خزمە دەگەڵ↑ بزاوتن bızawtın و گەلێک وشەی دیکە سەر بە ریشەی ***uegh- < (IE.)*** "بزوان، جووڵانەوە، رۆیشتن، ئاژوان". ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: bewegen (G.)، wegan (OG.)، (ga)wigan (Gt.) "وەشان، بزوان، تەکان خواردن"، vega (OIs.) "بزوان، راژان، هەڵێنان، هەڵکێشان"، váhati (OIn.) "داژوێ، دەڕوا"، vahitra-m (OIn.) "ئامرازی هاتوچوو، کەشتی"، vehere (L.) "ئاژۆتن".

وەشت **weşt** [ *wašt* ] - "نەرمەبا": خزمە دەگەڵ ↑وەزین wezîn "با هاتن، جووڵانەوەی با ".

وەشتە **weşte** [ *wašta* ] - "جوان، دڵرفێن": خزمە دەگەڵ↑ وەشتی "تاسە، حەز، ئارەزوو" و ↑ویستن wîstın.

وەشتەن **weşten** [ *waštan* ] - "سەمای دەروێشان": پێوەندی هەیە بە ↑وەشاندن weşandın بە مانای "راوەشاندن، لەرزاندن". وشەی "سەما"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بزوان، جوولانەوە".

وەشتەی **weştey** [ *waštay* ] - "بارین": خزمە دەگەڵ (G.) waschen، (E.) wash، (Nl.) wassen " شوشتن"، (G.) Wasser، (E.) water، (Gt.) wato، (Sw.) vattan "ئاو"، سەر بە ریشەی **< *(a)ued-* (IE.)** "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون".

وەشتی **weştî** [ *waštī* ] - "تاسە، حەز": شێوەیەکی کۆنترە لە ویست wıst [↑ویستن wîstın].

وەشڵە **weşle** [ *wašla* ] - "خۆزگە، خۆزیا": خزمە دەگەڵ ↑ویستن wîstın.

وەشەت **weşet** [ *wašat* ] - "شین و شەپۆڕ": دەشێ خزم بێ لەگەڵ واخ wax [ئاخ و واخ] و ↑وەیش weyş و ↑وەی *wey*.

وەشەک **weşek** [ *wašak* ] - "راژان، لەرزینی توند": ↑وەشاندن² weşandın "راوەشاندن".

وەشەگ **weşeg** [ *wašag* ] - "جانەوەرێکە لە تیرەی دەڵەک و رێوی": وەشەک weşek یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ (G.) Wiesel، (Nl.) wezel، (E.) weasel، (Sw.) vessla "راسوو" [وەشەگ؟]. لەوانەیە ئەم ناوە وشەیەکی کوردمادی بێ بۆ "راسوو". وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ueis-* (IE.)** "توانەوە و جاری بوون (بەتایبەتی بۆ گژ و گیای رزیو و تراوی بۆگەن)". ناوی جانەوەرەکە لە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ "بۆنی ناخۆشی" جانەوەرەکە دەگەڕێتەوە. لەوانەیە وشەی ↑فسۆس fisos "ناوی جانەوەرێک" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ یان شێوەیەکی دیکە لەم ناوە بێ. دە وشە ئەڵمانییەکەدا پاشگری بە ناو کردنی el- بەرچاو دەکەوێ. هەر ئەم شتە دە وشە کوردییەکەشدا، لە شێوەی پاشگری ık [کۆنتر: ek] دەبینرێ. چەندین نموونەی لەم جۆرە هەن کە دە زمانی کوردی و ئەڵمانیدا ئەم پاشگرانە وەردەگرن، بۆ وێنە "جاشک" و "جووشک" و هیتر.

وەشەن **weşen** [ *wašan* ] - "شڵێوە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وەشتەی weştey "بارین".

وەقا **weqa** [ *waqā* ] - "کیشانەیەکە": هۆقە hoqe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ (G.) gewicht، (Nl.) wicht، (E.) weight، (OIs.) va tt "کیش، وەزن، قورسایی". ئەم وشانە خزمن هەروەها لەگەڵ ↑وەزن wezın. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ وەها weha [↑بەها beha] "بایی، نرخ" [قورسایی، گرانایی؟].

وەک **wek** [ *wak* ] - "جۆر، مینا": خزمە دەگەڵ ↑وەسا wesa.

وەگ **weg** [ *wag* ] - " چاخ، هەرەت": خزمە دەگەڵ (G.) Woche، (OG.) wohha، (E.) week، (Sw.) vecka "حەوتە، هەفتە"، (Gt.) wikō "نۆرە"، (G.) Wechsel "گۆڕان"، (G.) weichen "دوور بوونەوە، دەرباز بوون، جێ هێشتن، جێگا کردنەوە"، (L.) vicis "گۆڕان، گەڕ، نۆرە، جێگا"، سەر بە ریشەی **< *uei-* (IE.)** "چەمانەوە، سووڕان". مانای دوور بوونەوە و جێ چۆل کردن لەوەڕا هاتووە کە شتێک لەژێر پەستانێکدا دەچەمێتەوە، جێ چۆل دەکا و لە شوێنی خۆی دوور دەبێتەوە. گەلێک وشە دە زمانی کوردیدا بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێنەوە، وەک ↑بی bî [دارەبی]، ↑با *ba* دان، ↑بابۆڵە babole و هتد.

وەل¹ **wel** [ *wal* ] - "باتڵاق، زەلکاو": خزمە دەگەڵ ↑گۆل gol یان گوەل guwel "ئەستێرک، دەریاچە".

وەل² **wel** [ *wal* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑خۆڵ xol. هەروەها وەڵن welın هەیە بە مانای "خوڵاوی، تۆزاوی". [وەل wel + ن ın، پاشگری بە ئاوەڵناوکردن، وەک ورگن، چڵمن، خرپن، نەوسن و هتد].

وەلاف **welaf** [ *walāf* ] - "لەوەڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئالف alıf.

[تێبینی: لەباری گۆڕانی فۆنۆلۆژیکەوە هەڵیسەنگینە دەگەڵ "وەباڵ" و "ئۆباڵ"].

وەڵام **welam** ⌊ *walām* ⌋ - "بەرسف": گۆڕدراوی ↑وەرام weram.

وەلچەک **welçek** ⌊ *walčak* ⌋ - "پێوانەی دەخڵ کە چل کیلۆ دەگرێ": وەلچەگ welçeg یش دەگوترێ.

1- هەر وەک چۆن وشەی "بۆشکە" پێوەندی بە "بۆش"ەوە هەیە و ئاماژە بە "بۆشایی و هەراوی" دەکا، لەوانەیە "وەلچەک"یش پێوەندی هەبێ بە وەلا wela [ڤالا vala، واڵا wala، ↑ئاواڵا awala]. ئەم وشانەش هەم مانای "هەراو" و هەمیش "بەتاڵ، بۆش" دەگرنەخۆ.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑وەل[1] wel "باتڵاق، زەلکاو" و دواتر ↑*قووڵ qul*. لەم پێوەندییەدا چەندین وشە دە زمانی کورمادیدا دروست کراون کە مانای جۆرێک لە جۆرەکانی دەفر دەگرنە خۆ، وەک "جەواڵ" [گواڵ] و هتد.

وەلگ **welg** ⌊ *walg* ⌋ - "وەڵگ، گەڵا": شێوەی کۆنتری ↑بەلگە belge "وەرەقە".

وەللک **wellık** ⌊ *wallık* ⌋ - "کرێوە": خزمە لەگەڵ ↑وەلەک welek "گێژەڵووکە".

وەلوەلە **welwele** ⌊ *walwala* ⌋ - "دەنگ و هەرای زۆر، تێکەڵ و پێکەڵی زۆر": خزمە دەگەڵ ↑وەلەک welek "گێژەڵووکە". وشەکە بە دووبارە بوونەوەی بنجی "وەل-" دروست کراوە کە ئەمەش شێوەیەک لە وشەسازی لە دۆخی جەخت کردندا نیشان دەدا. نموونەی دیکە: کەڵکەڵە، هەلهەلە، زەلزەلە، دەبدەبە و هتد.

وەلەج **welec** ⌊ *walaj* ⌋ - "شێلاقە، باڵدارێکە بەقەد گاوانی بەڵام لینگدرێژ": وشەی "شێلاقە" شێوەیەکی دیکەیە لە"شەللاق" و ئەمەش خۆی ئامرازی لێدانە و ریشەکەشی مانای "لێدان" دەبەخشێ. بەم پێیە "وەلەج" یش پێوەندی هەیە بە ↑*پڵۆسین plosîn* و ↑فەلاقە felaqe [لە فەلاقە دان] و ئەمانەش مانای "لێدان" دەبەخشن. لە کوردمادیدا مرۆڤی باریک و درێژ بە "شەللاقە" وەسف کراوە، رەنگە مەبەست درێژ و باریک بوونی لاقەکانی بێ، وەکوو باڵدارەکە. "وەلەج" دەگەڵ ↑وەلەجاخ welecax لە خوارتر هەڵ سەنگینە. ئەوە کە ناوی باڵدارەکە چۆناوچۆن بە چەمکی "شەللاق" یان "لێدان"ەوە گرێ دراوە، جێی لێکۆڵینەوەیە. لەوانەیە لاقە درێژەکانی بە "شەللاق" کە ئەویش شتیکی بارێک و درێژە، شوبهێنرابێ.

وەلەجاخ **welecax** ⌊ *walajāx* ⌋ - "بەڵا، نەهاتی": وەلجاخ welcax یش دەگوترێ. هەر دوو وشەی وەلەجاخ welecax و ↑بەڵا bela خزمن دەگەڵ Plage (.G) "رەنج، ئازار، بەدبەختی"، plāga (.OG) "بەدبەختی، بەڵای ئاسمانی، سزای خودا، زجر و ئازار". زمانی ئەڵمانی ئەم وشەیەی لە plag (.L) "زەبر، لێدان، زەبری ئاسمان" وەرگرتووە و ئەویش دەچێتەوە سەر plāgā (.Gr) "لێدان، زەبر، برینداری". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*پڵۆسین plosîn* و ↑فەلاقە felaqe. هەروەها بڕوانە ↑وەلەج welec.

وەلەک **welek 1** ⌊ *walak* ⌋ - "داردەستی سەردووحاچە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑وەلەج *welec* ↑*وەلەجاخ welecax* "بەڵا، نەهاتی". رەنگە ئەم داردەستە بۆ لێدانی شتێک کەڵکی لێ وەرگیرابێ.

وەلەک **welek 2** ⌊ *walak* ⌋ - "گێژەڵووکە، کرێوە": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "سووڕان" دەکەن وەک ↑وێڵ wel "سەرگەردان"، ↑وەلوەلە welwele "شلووقی، ئاڵۆزی، ئاژاوە"، ↑ولین wılîn "پشاوتن، تێکوشین"، ↑*فەلەک felek* "گەردوون، چەرخی جیهان" و هتد.

وەڵین **welîn** ⌊ *walīn* ⌋ - "پێشوو": پێوەندی هەیە بە ↑بەر[2] ber [وەر wer] "پێش".

-وەند **-wend** ⌊ *wand* ⌋ - "1- پاشگری وەپاڵدان و بەستنەوە" [هەمەوەند، کاکاوەند ...] 2- پاشگری کۆ بوونەوە و یەککرتن [گۆوەند، زەماوەند...]": دە بنەڕەتدا بەند bend بووە و خزمە

دەگەڵ ↑بەن ben و ↑بەند bend سەر بە ریشەی **< (IE.) *bhendh-** "بەستن، بەستنەوە". وەند وەک پاشگری وەپاڵدان (نیسبەت) بۆ وێنە پێوەندی خێڵەکان بە سەرۆکەکانیان یاخود دامەزرێنەرانیان دەردەخا، واتا بە کەسێک یان شوێنێکیان دەبەستێتەوە. لە وشەکانی گۆوەند یان زەماوەندا مانایەکی وەک "کۆڕ بەستن" پێشان دەدا.

**وەندانە wendane** [ *wandāna* ] - "ئازایانە، بوێرانە": خزمە لەگەڵ Schwung (G.) "بزاوتێکی خێرا و بەهێز". ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر schwingen (G.)، swingan (OG.)، swingen (MNl.)، swing (E.) "بزوان یان لێدانی خورت و بەهێز". لە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑جمین cımîn "بزووتن، جووڵان" [جڤین² cıvîn] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆنۆلۆژیک هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی *ون (وندا)*].

**وەندن wendın** [ *wandın* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑هۆندنەوە hondınewe.

**وەندە wende** [ *wanda* ] - "پەردی لە چەپەر": خزمە دەگەڵ ↑وەیەنە weyene "قەرتاڵە".

**وەنەنە wenene** [ *wanana* ] - "لەرەلەر، جووڵەجووڵ": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ wehen (G.)، wajan (Gt.)، wawan (OE.) "با هاتن، هەڵکردنی با، بەدەم باوە جوولانەوە"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *hwe-** "با هاتن، شنینەوەی با، با کران". ↑هەوا hewa لەم ریشەوە هاتووە. Wind (G.) "با" لەم ریشەوە هاتووە.

**وەنەوز wenewz** [ *wanawz* ] - "وێژینگێ دان، خەو بردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑نووستن nustın "خەوتن".

**وەوڵە wewle** [ *wawla* ] - "بووکەڵە": وەویلە wewîle ش دەگوترێ. بچووککراوی ↑وەوی wewî "بووک".

**وەوی wewî** [ *wawī* ] - "بووک": شێوەی کۆنتری ↑بووک buk. وشەکە دە فارسی دەریدا biug (MP.) و پێشتریش wiug بووە. فۆتیمی بەرایی وشەکە دە بنەڕەتدا w بووە. دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا هەردوو شێوە کۆن و تازەکە بەدی دەکرێن.

**وەها weha** [ *wahā* ] - "وەک، مینا": وا wa و ئاوا awa ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە↑وەسا wesa.

**وەهی wehî** [ *wahī* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑وەوی wewî "بووک".

**وەهید wehîd** [ *wahīd* ] - "باربوو، یارمەتی لەلایەن هاوسا و هاوماڵانەوە": ئەگەر دوو وشەی ↑وەهی wehî "وەوی، بووک" و وەهید wehîd "باربوو" دەگەڵ یەکتر هەڵسەنگینین، بەو ئەنجامە دەگەین کە "وەهید" دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "ئاری کردن و شت پێوە بردن بە بۆنەی گواستنەوەی بووک" بێ. لێرەوە شتێکی دیکەشمان بۆ روون دەبێتەوە و ئەویش مانای بنەڕەتی وشەی ↑باربوو barbu یە. ئەم وشەیە پێک هاتووە کەرتی بار bar + بوو bu. کەرتی یەکەم پێوەندی بە ↑بارbar یان ↑بردن bırdın ەوە هەیە و کەرتی دووەمیش هەمان کورتکراوی ↑بووک buk ە. بەم جۆرە "بار بوو" دەبێتە ئەو بارەی پێشکێش بە بووک دەکرێ یان ئە شتەی بۆ بووک دەبردرێ.

**وەهیە wehîye** [ *wahīya* ] - "کاری پووچ و بێ مانا": واهی wāhī (P.). دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑واز⁵ waz و دواتر پێشگر یان پاشگری ↑وە *we* [وەکردن یان کردنەوە، وەگەڕان یان گەڕانەوە]. ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە دێن کە ئاماژە دەکا بە مانای "لێک جیا بوونەوە، دوور بوونەوە". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "دوور لە بابەت، جیا لە راستی".

وەی **wey** [ *way* ] - "1- دەنگی ئێش و ئازار دەربڕین 2- ئێش و ئازار": وەیش weyış، واخ wax، وەه weh یش دەگوترێن. وای way (P.)، Weh (G.)، wai (Gt.)، woe (E.)، ve (Sw.)، vayōi (Av.)، vae (L.) "وەی". وشەکە هەروەها بە مانای "ئێش و ئازار"یش دێ [یاخودا بێ وەی بی!]. دە زمانی ئەڵمانیدا Weh tun (G.) بە مانای "ئێشاندن" دێ.

وەیخر **weyxır** [ *wayxır* ] - "شەڕفرۆش": خزمە دەگەڵ wacker (G.)، wacchar (OG.)، wakker (Nl.)، wacor (OE.) "وشیار، بووژاوە، چالاک، ئازا، بوێر". مانای بنەڕەتی وشەکە "بووژاوە، سەرزیندوو"یە و لەمەوە ماناکانی دیکە پەریان گرتووە. دواجار خزمە لەگەڵ ↑واق waq و ↑*هۆش hoş*.

وەیس **weyıs** [ *ways* ] - "ناوە بۆ پیاوان": خزمە دەگەڵ ↑ئاوەز awez "ژیری، بیرمەندی" [ئا a + وەز wez]. هەروەها ئاوزین aw(e)zîn هەیە بە مانای "زانین، تێگەیشتن". وشەی "وەیس" دە بنەڕەتدا بە مانای "زانا، تێگەیشتوو، ژیر"ە. خزمە دەگەڵ weise (G.)، wīz (OG.)، wise (E.)، vīs (Sw.)، wijs (Nl.)، věšči (ORus.) "وەیس، زانا، بیرمەند". وشەی ↑وەزیر wezîr "راوێژکاری پادشا" وشەیەکی زمانی کوردمادییە کە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە و پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -*ueid* (*IE.*)** "دیتن، زانین، پەی بردن".

وەیشوومە **weyşûme** [ *wayšūma* ] - "1- بەڵا 2- سەرما و سەقەم": وێ دەچێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی وەی wey + شوومە şûme. کەرتی یەکەم دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑وەی wey "ئێش و ئازار". کەرتی دووەم دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑شووم şûm "بێفەڕ، بەخت رەش".

وەیلان **weylan** [ *waylān* ] - "سەرگەردان": خزمە دەگەڵ ↑وێل wel.

وەیەنە **weyene** [ *wayana* ] - "قەرتاڵە، سەبەتە": وێنە wene ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هۆنینەوە honîn(ewe) (یان وەندن wendın). هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وەندە wende "پردی لە چەپەر".

[تێبینی: وشەی قەرتاڵە qertale ش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تێکچنین، تێکخستنەوە"].

ویت ویتک **wîtwîtık** [ *wītwītık* ] - "پەڕتووکێکی پیرۆزی ئێزیدییەکان (ئەزادییەکان)". دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*weid* , -*ueid* (*IE.*)** "دیتن، زانین، تێگەیشتن، دوزینەوە". چەندین وشە لە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑*ئاوەز awez* [a-wez]، ↑پیتۆڵ pîtol "زانا" و ↑وەیس weyıs "شێخی بەناوبانگ"، ↑وەزیر wezîr و ↑ویژدان wîjdan و هتد.

ویچ **wîç** [ *wīč* ] - "دابێژتن": شێوەیەکی دیکە لە بێژ bej [↑دابێژتن bejtın].

ویر1 **wîr 1** [ *wīr* ] - "ورنگە، گۆرانی لە بن لێوان": ↑ورنگە wırınge.

ویر2 **wîr 2** [ *wīr* ] - شێوەی کۆنتری ↑بیر bîr "هزر".

ویزان **wîzan** [ *wīzān* ] - "وزەوز کردن": بڕوانە ↑وزەوز wızewız [ویزەویز wîzewîz].

ویزە **wîze** [ *wīza* ] - بۆ وێنەدەگوترێ "بە دار هاتە ویزەم، تیر کوتامی". خزمە لەگەڵ ↑واز[5] waz "1- کەمێکی جیا [تاق و واز] 2- جزیرەی بچووک لە ناو رۆبار" و دواتر خزمە لەگەڵ پێشگر یان پاشگری ↑وە *we* [ڤەکردن یان کردنەوە، ڤەگەڕان یان گەڕانەوە، ڤەزڤرین یان سووڕانەوە]. ئەم پاشگرە لە ریشەیەکەوە دێ کە ئاماژە دەکا بە "لێک جیا بوونەوە، دوور بوونەوە". هەر لەکۆنەوە لەناو زمانە ژێرمەنییەکانیشدا لە مانای "دوورتر" مانای "بەرەوروو، حاند، دژ" سەری هەڵداوە. دەشێ لە مانای "دوورتر" مانای "ئەولاتر، ئەوبەرتر" سەری هەڵدابێ و لەمەشەوە مانای "بەرەوروو، دژ" پەیدا بووبێ. هێندێک لەم وشانەی لە زمانی ئەڵمانیدا

پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە، بریتین لە: wider (G.) "دژ، بەرەورووو"، widerstand (G.) "بەربەرەکانی، بەرەنگاری"، wiedersache (G.) "دژ، بەرهەڵستکار"، widerlegen (G.) "بەرپەرچ دانەوە"، widarōn (OG.) "دژ بوون، دژایەتی کردن، بەرەوروو بوونەوە"، widarstēn (OG.) "بەرەنگاری کردن، دژ وەستان"، widarwartig (OG.) "دژ، دژمنانە" و هتد. wider (G.) کە لە زمانی ئەڵمانیدا مانای "دژ، بەرەورووو" دەگەیەنێ، شێوەیەکی دیکەش پەیدا دەکا کە بریتییە لە wieder (G.). ئەم شێوەیەی وشەکە وەك پێشگرێك لەگەڵ هێندێك کردار دێ و نەخشی پێشگر یان پاشگری ↑وە *we* ی کوردمادی دەبینێ، بۆ وێنە wiedersehen واتا "ڤەدیتن، دیتنەوە". ئەمە خۆی پاڵپشتێکی دیکەیە بۆ خزم بوونی ئەم وشانە.

ویژدان **wîjdan** *[ wīždān ]* - "هەست کردنی دەروونی بە چاکە و خراپەی خۆ، زەمیر": وجدان wejdān (P.). وشەکە دە بنەڕەتدا وشەیەکی زمانی کوردمادییە و دە عەرەبیدا لەبەر نەبوونی فۆتیمی ژ کراوە بە وجدان wijdān (Arb.) و پاشان بەم شێوەیە هاتۆتەوە ناو زمانی فارسی. دە زمانی ئەڵمانیدا ویژدان دەبێتە Gewissen (G.) [Ge-wissen] کە پێوەندی هەیە بە wissen (G.) "زانین". ئەم وشە ئەڵمانییە خۆی خزمە دەگەڵ ↑ئاو(ە)زین aw(e)zîn [a+w(e)zîn] "زانین، ژیر بوون، تێگەیشتن". کەوابوو وێژدان wîjdan دە بنچینەدا بە مانای (پێ)زانین (ی دەروونی) یە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندی وشەی وەك ↑وەیس weys "ژیر، زانا"، ↑بیستن bîstın "گوێ لێ بوون" [دە بنەڕەتدا: پێزانین بە شتێك، هەست پێ کردن].

ویس1 **wîs 1** *[ wīs ]* - "رووناکی کەم لە دوورەوە" [ئەستێرە ویس ویس دەکەن]. ویسکە wîske ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑وازە waze "ئاژەڵی بەڵەك"، دە بنەڕەتدا بە مانای "سپی، رووناکی".

ویس2 **wîs 2** *[ wīs ]* - لەگەڵ "خیس" دێ و دەگوترێ خیس و ویس xîs u wîs واتا "تەڕ، خووساو". خزمە لەگەڵ waschen (G.)، wascan (OG.)، wash (E.)، vaska (Sw.) "شوشتن"، سەر بە ریشەی **< *(a)ued-** ***(IE.)*** "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون". دە زمانی کوردمادیدا ↑وەشتەی weştey "بارین" و چەند وشەیەکی لەم ریشەوە دێن.

ویستن **wîstın** *[ wīstın ]* - "خواستن، خۆش هەبوون": وازتن waztın، واستن wastın و هەویستن hewîstın یش دەگوترێن [هە + ویستن he + wîstın]. چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا هەن کە پێوەندییان بە "ویستن"ەوە هەیە وەك ↑واز waz "مەیل، حەز، ئیشتیا"، خواز xuwaz و↑خواستن xuwastın، ↑وەشتە weşte "جوان و دلڕفێن"، ↑وەشتی weştî "تاسە، حەز"، ↑خۆش xoş، ↑خۆزگە xozge، وشڵە weşle "خۆزگە"، ↑واژ waj "وەبەران هاتنی مەڕ"، ↑هەوەس hewes [هەویستن he-wîstın]، ↑واشتا waşta "دلدار، گراوی"، ↑وێز wez [↑بێز bez]، ↑بێزوو bezu [↑وێزوو wezu] "مەگیرانی" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ wish (E.)، Wunsch (G.)، wonsc (Nl.)، wūsc (OE.)، ōsk (OIs.) "حەز، واز، خواست، ئارەزوو"، vānchati (OIn.) "حەز دەکا، ئارەزوو دەکا"، vāncha (OIn.) "حەز و ئارەزوو"، سەر بە ریشەی **< *uen-, *wen-** ***(IE.)*** "حەز کردن، دەست خستن، تەقەلا کردن لە پێناو شتێکدا". هەروەها لە لایەکی دیکەوە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەك ↑ئەوین evîn "خۆشەویستی"، ↑ڤیان vîyan و هتد. وشەکانی هوس hawas (Arb.) و وسواس waswās (Arb.) "وازوازی" لە زمانی کوردمادی وەرگیراون.

ویسك **wîsk** *[ wīsk ]* - "لەر و لاواز": خزمە دەگەڵ فسقلی fesqelī (P.) "گچکە، وردیلە، نابووتەکە"، weich (G.)، weih (OG.)، week (Nl.)، wac (OE.)، vek (Sw.) "شل و نەرم"، weak

(E.) "لەڕ و لاواز، بێ هێز". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی < -wig* (Grm.) "کشانەوە بۆ دوا لە ژێر گوشارێک، بەرگە نەگرتن، جێ خاڵی دان". ئەم ریشەی خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتری هیندوئەورووپی، واتا ریشەی **(IE.) *uei- <** "چەمانەوە، سووڕان، با دران". وشەگەلێکی زۆر دە زمانی کوردی و زمانە ژێرمەنییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، بۆ وێنە ↑وەگ weg "چاخ، هەرەت"، ↑بی bî [دارەبی]، ↑واژ2 waj [بەرەواژی] و هتد. "ویسک" هەروەها بەشێوەی ↑وەزا weza "لاواز، داڵگۆشت" دە زمانی کوردمادیدا دەبیندرێ.

ویل **wîl** [ *wīl* ] - "زەنازەنا، چەقە و گوڕە": وێلە wele ش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ holen (G.)، holōn (OG.) "هێتان، هێنانەوە". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *kel- <** "هەرا کردن، بانگ کردن".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑*هۆلین holîn*.

وییە **wîye** [ *wīya* ] - "بێڵی دارین": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑وەیەنە weyene "قەرتاڵە".

وێ **we** [ *we* ] - "پرێپۆزیسێون و پێشگر": [وێی کەوت، وێ دەچێ، وێچوون.....]. پێ pe ش هەیە کە وشەیەکی هاوچەشنە و لەباری ماناوە هێندێک جیاوازی دروست دەکا، وەک "وێچوون، پێچوون، وێکەوتن [گوللەیەکی وێ کەوت]، پێکەوتن [خواردنەکەی پێ کەوت] و هتد. ئەم وشانە دەبێ وەک پرێپۆزیسێون و پێشگرێکی لێکدراو سەیر بکەین، چونکوو لە دوو کەرتی بنەڕەتی پێکهاتوون. کەرتی یەکەم بریتییە لە پرێپۆزیسیۆنی سادەی بە be/ وە we. ئەم پرێپۆزیسیۆنە دە زمانی کوردمادیدا بە هەر دوو شێوەی "بە" و "وە" دەبینرێ و دەبێ یەک لە وان شێوەی کۆنتری وشەکە بێ [بە سەر چاو، وە بان چاو، سڵاو بە گشت (یان وە گشت) خۆشەویستان...]. بۆ ناسینی کەرتی دووەم پێویستە چاوێک بە زمانی فارسیدا بخشێنین. دە زمانی فارسیدا ئەم پرێپۆزیسییۆنی "بە" دوو شێوە بەکار هێننی هەیە. لەم رستانەی خوارەوەدا ئەم دوو شێوە بەکار هێنانە پێکەوە هەڵدەسەنگینین: "بە من be man بگو" (بە من بێژە)، "بهم behem بگو" (پێم pem بێژە)، "بە تو be to" (بە تۆ)، "بهت behet" (پێت pet)، "بە او be u" (بە ئەو، بەو، بەوی)، "بهش beheš" (پێی pey) و هتد. وەک دەبینرێ، پرێپۆزیسیۆنەکە جارێکیان دەگەڵ جێناوی کەسیی من، تۆ، ئەو و ... دا بەکار دێ و جارێکیان دەگەڵ جێناوی لکاوی "م، ت ...". ئەم جێناوە لکاوانە دە زمانی فارسیدا دەبێ دە بنەڕەتدا "ام am، ات at، اش aş ..." بووبن، چونکوو بەم شێوە لە شوێنەکانی دیکەشدا دەردەکەون، بۆ وێنە مادرم mādaram (دایکم)، مادرت mādarat (دایکت)، مادرش mādaraš (دایکی) و هتد. ئەم جێناوە لکاوانە کاتێک دەگەڵ پرێپۆزیسیۆنی "بە" دێن، شێوەکەیان برێک دەگۆڕدرێ و دە زمانی فارسیدا دەبن بە "hem، het، heš" (وەک بهم، بهت، بهش). بەم جۆرە دەردەکەوێ کە دە زمانی کوردمادیشدا وشەکانی پێم pem، پێت pet، پێی pey بەرانبەر بەو وشە فارسییانەی سەرەوە دەوەستن، واتا "بهم behem، بهت behet، بهش beheš". هەر دوو وشەی وێ we و پێ pe پێوەندییان هەیە بە وشەی فارسی بهش beheš (P.)، واتا دە بنەڕەتدا بەرانبەری ئەم وشەیە دەوەستن و لەوانەیە فۆتیمی ş دە وشە کوردمادییەکاندا سوابێتەوە. بەم جۆرە دەتوانین بێژین کە بۆ وێنە "پێ گوتن" دە بنەڕەتدا وەک "بهش گفتن"ی فارسی وا بووە، یان "پێ دان"، وەک "بهش دادن"، "وێ کەوتن" وەک "بهش خوردن" و هتد. لێرەدا بەڵام خاڵێکی گرنگ هەیە کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ و ئەویش ئەمەیە کە پێشگرەکانی "وێک" و "پێک" [وێککەوتن، پێکهاتن...] راستەوخۆ لە "وێ" و "پێ"ی باسکراو وەرنەگیراون، بەڵکوو بە شێوەیەکی دیکە دروست کراون. وشەکانی "وێک" و "پێک"

هەرچەند وەك وشەكانی "وێ" و "پێ" دواجار دەچنەوە سەر پرێپۆزیسیۆنی "بە" و پێوەندی ئێتیمۆلوژیك لەتیوانیاندا هەیە، بەڵام پێوەندی رێزمانییان بە یەكەوە نییە و لێكچوونیان شتێكی رواڵەتییە. ئەم پێشگرانە بریتی نین لە "وێ + یەك، پێ + یەك"، بەڵكوو بەم شێوەیە پێك هاتوون: "وە we + ئێك (y)ek ← وێك" و "بە be + ئێك (y)ek ← پێك". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑وێك wek. ئەگەر بخوازین لەم بارەوە هەڵسەنگاندنێك دەگەڵ زمانی فارسی بكەین، دەبێ بێژین كە بۆ وێنە "وێكەوتن" ماناكەی دە فارسیدا دەبێتە "بهش خوردن" [ وێی كەوت واتا "بهش خورد"] و "وێككەوتن" دەبێتە "به هم خوردن". لە دۆخی یەكەمدا "بە" دەگەڵ جێناوی لكاو بووەتە یەك وشە، لە دۆخی دووەمدا "بە" لەگەڵ وشەی "هەم" بووەتە وشەیەكی لێكدراو.

**وێت1 wet 1** [ *wet* ] - دەگەڵ "شێت" دێ [شێت و وێت şêt u wet]. خزمە دەگەڵ Wut (G.)، wuot (OG.) "تووڕە"، wōds (Gt.) "تووڕە، شێت، سەرسەری"، woutan (OG.) wōden (OE.)، Odinn (OIs.) ناوی یەكێك لە خوداكان [دە بنەڕەتدا: تووڕە، دێوەزمە]. wüterisch (G.) كە بە مانای "لاسار، زۆردار" بەكار هاتووە. ریشەی ئەم وشانە باس نەكراوە. لەوانەیە tyrran و despot وشەی ↑فێ fe ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا بە كونترۆڵ لەدەست دان گوترابێ.

**وێت2 wet 2** [ *wet* ] - "دەرماتێكی تراوە بە سەر برینی دا دەكەن": *(F.) iode* > "ناوی ماكەیەكی كیمایییە". وشەكە ریشەی یۆنانی هەیە بە مانای "بنەوش(ەیی)"، ئاماژەیە بە رەنگی ئەو ماكەیە.

**وێچن wêçın** [ *wečın* ] - وێچنە weçne ش دەگوترێ. شێوەیەكی دیكە لە ↑بێژینگ bejîng [بێژنگ].

**وێر1 wer 1** [ *wer* ] - "ئازا": دەچێتەوە سەر وێران ↑weran2 "زات كردن، نەترسان".

**وێر2 wer 2** [ *wer* ] - شێوەیەكی دیكە لە ↑بوار buwar.

**وێر³ wer ³** [ *wer* ] - "خوار": شێوەیەكی دیكە لە ↑خوارxuwar.

**وێرا wera** [ *werā* ] - "ئازا، بوێر": دەچێتەوە سەر ↑وێران2 weran 2 "زات كردن، نەترسان".

**وێرا wera** [ *werā* ] - "وێكڕا، دەگەڵ": پێڕا pera ش دەگوترێ. ↑وێ we/ ↑پێ pe + ڕا ra. كەرتی دووەم دە ئەسڵدا تەواوكەری پرێپۆزیسیۆنە، بۆ وێنە كاتێك دەگوترێ "لە منڕا دیارە، ژ تەڕا سلاڤ، بە چیڕا دەزانی؟".

**وێران1 weran 1** [ *werān* ] - "رماو، رووخاو، كاول": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑وەرین werîn "كەوتنەخوار". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑ورای wıray "رمان، رووخان".

**وێران2 weran 2** [ *werān* ] - "زات كردن، نەترسان": خزمە دەگەڵ peiran (Gr.) "وێران"، peira (Gr.) "ورە". وشەی pirate "چەتەی دەریایی" دە زمانە ئەورووپییەكاندا لەم وشە یۆنانییە وەرگیراوە. خزمە دەگەڵ ↑ورە wıre "هێزی دەروون، جەسارەت" و دەگەڵ ↑وێرا wer 1 و ↑وێرا wera "ئازا ". خزمیشە دەگەڵ ↑پەروا perwa.

**وێرت wert** [ *wert* ] - "لەوەرگە": خزمە دەگەڵ Wald (G.)، walt (OG.)، woud (Nl.) "جەنگەڵ"، wold (E.) "بەندەن"، vall (Sw.)" لەوەرگە"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *uel-*** > "پچڕین، رنین" (ی گژ و گیا بۆ لەوەڕ). دە زمانی كوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە، وەك ↑گورگ gurg [كۆنتر: ↑وەرگ werg واتا "پچڕینەر، دڕندە"]، ↑وەرساندن wersandın "پچڕاندن"، ↑وێرد2 werd 2 "كێرد"، ↑وەلاف welaf "لەوەڕ" و هتد.

**وێرد1 werd 1** [ *werd* ] - "دووعای بن لێو": خزمە دەگەڵ ↑ورتە wırte "قسەی بن لێوان".

وێرد **2 werd** [ *werd* ] - "کێرد": خزمە دەگەڵ ↑وێرت wert "لەوەڕگە".

وێرغە **werġe** [ *werġa* ] - "توند ڕۆیشتنی ئەسپ": یورغە yūrġe (P.). ئەم وشەیە زۆر نیزیکە لە وشەی یورش yūreš (P.) و ئەمەش دەگەڵ ↑هێرش herış هاومانا و هاوریشەیە.

وێرە **were** [ *wera* ] - "شی کردنەوەی مانا": خزمە دەگەڵ ↑وێرد2 werd "کێرد" و ↑وێرت wert "لەوەڕگە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، دڕاندن، (لێک) جیا کردنەوە".

[تێبینی: وشەی شی şî کردنەوەش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بەمانای "لێک جودا کردن، لەت کردن" و خزمە بۆ وێنە دەگەڵ ژێ je (سەر ژێ کردن) و چەقۆ çeqo. هەر لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "شەرح و تشریح"ی عەرەبی کە هەم بۆ شی کرنەوەی بابەت و مانا بەکار دەهێندرێ و هەمیش بۆ شیکاری لەش -"کالبدشکافی"، anatomy].

وێز **wez** [ *wez* ] - دەگەڵ "قێز" دێ [قێز و وێز qez u wez]. شێوەی کۆنتری ↑بێز² bez بە مانای "دووری کردن، خۆ دوور راگرتن" لە شتێک.

وێزنین **weznîn** [ *weznīn* ] - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ، ↑هەڵوێزنین helweznîn یان هەڵوەزنین helweznîn واتا گلۆڵە کردن یان لە دەوری شتێک هاڵاندنی بەن و شریت بە مەبەستی کۆ کردنەوەی. خزمە دەگەڵ wickeln (G.) "هەڵوێزنین"، Wickel (G.) "پێچراوە، هەڵکراو، هەڵوێزراو، قونداخ کراو"، wich (OG.) "بەن، کۆریشاڵ، فتیلە"، wick (E.) "فتیلە، پڵێتە"، vagura (OIn.) "داو، تۆڕی داو"، figum (OIr.) "قوماش، کر، بافت"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *ueg-* "چنین، تەنین، گرێ دان، تێکخستن، لێهاڵاندن". دە کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑هۆجەنە hocene "دۆخین" [یان هۆچنە hoçne] و↑هۆچ hoc "بابۆڵە"، ↑باهۆز bahoz "گردەلوول" و هتد.

[تێبینی: ئەم ریشەیە لەوە دەچێ خۆی بچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری *(IE.) *uei-* "چەمان، سووڕان، با دران". دوو چەمکی "چەماندن(ەوە)، سووڕاندن(ەوە)" دەگەڵ "چنین، تەنین، هۆندنەوە" لە پێوەندی نیزیکدان. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە وشەی "هۆندن(ەوە)" بکەین کە خزمە دەگەڵ winden (G.)، سەر بە ریشەی "با دانەوە، هۆندنەوە"].

وێزوو **wezu** [ *wezū* ] - "مەگیرانی": شێوەی کۆنتری ↑بێزوو bezu یە و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ویستن wîstın.

وێژ **wej** [ *wež* ] - "گێژ و وێژ": سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمان، خواربوون (ەوە)". خزمە دەگەڵ ↑وێژە² weje "کەڵەوەی ناو نیر". گێژ و وێژ ئەو حالەتەیە کە مرۆڤ بە هۆی سەر سووڕان واتا لە دەست دانی هاوسەنگی بە لادا دێ (خوار دەبێتەوە) یان ئەو کەسەی مێشکی راست نییە، بە واتایەکی دیکە میشکی خوار و بادراوە. وشەی "گێژ"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە هەر بە مانای "چەمان، خوار بوون".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا verwirrt (G.) "گێژ، وڕ، سەرلێشێواو" پێوەندی بە ریشەیەکەوە هەیە بە مانای "سووڕان، با دران، چەمانەوە" و خزمیشە دەگەڵ "وڕ"ی کوردی].

وێژە **1 weje** [ *weža* ] - "ئەدەبیات": خزمە دەگەڵ ↑بێژتن bejtın "گوتن".

وێژە **2 weje** [ *weža* ] - "کەڵەوەی ناو نیر": چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە گشتیان سەر بەیەک ریشەن، وەک ↑وێژ wej [گێژ و وێژ]، ↑واش waş [شاش و واش]، ↑وێش wêş "خوار و خێچ"، ↑واژ2 *waj 2* "پێچەوانە" [بەرەواژی، بەراوەژوو]، ↑چەواشە çewaşe [دەبنەڕەتدا: چەپ çep + واشە waşe] و هتد.

وێژە **3 weje** [ *weža* ] - "باوێشک": خزمە دەگەڵ ↑پشوو pışû.

وێژینگ **wejîng** [ *wežīng* ] - "خەونووچکە، چۆرت": وێژنگ wêjıng یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑واژ waj "پێچەوانە" و چەندین وشە کە ئاماژە بە "چەمانەوە، خوار بوونەوە" دەکەن. وێژینگ یان خەونووچکە ئەو دۆخەیە کە بە هۆی خەو هاتن یان چوونە خەوەوە سەر دەچەمێتەوە، واتا باس لە دۆخێک دەکا کە مرۆڤ بە دانیشتنەوە خەوی لێ دەکەوێ.
[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Nickerchen (G.) بە مانای "خەوێکی کورت و سووک، چۆرت" بەکار دێ کە خزمە دەگەڵ neigen (G.) "خوار بوونەوە، چەمانەوە".

وێش **wêş** - "خوار و خێچ": خزمە دەگەڵ ↑واژ waj "پێچەوانە"، ↑وێژە weje "کەڵەوە" و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە، خوار بوونەوەو".

وێک **wek** [ *wek* ] - "پێشگری کردار": کورتکراوی ↑وە we + یێک yek [↑یەک yek]، وەیێک ← وێک. پێشگری هاوچەشنی پێک pek یش هەر بەم شێوەیە دروست کراوە: "بە" + "یەک"/ بە یێک ← بێک ← پێک. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی zusammen (G.) بۆ ئەم مەبەستە بەکار دێ، کە هەم مانای "وێکرا، پێکەوە" دەدا و هەمیش دەوری پێشگرەکانی "وێک" و "پێک" و "تێک" دەبینێ. بۆ وێنە دەگوترێ Wir gehen zusammen واتا "ئێمە پێکەوە (وێکرا) دەڕۆین". هەر ئەم وشەیە بەڵام دەوری پێشگرە کوردییەکەش دەلەیزێ و بۆ وێنە دەگوترێ zusammenstoßen "وێککەوتن، پێککەوتن" یان zusammenfallen "تێکرمان". وشە ئەڵمانییەکە هەر وەک کوردییەکە لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی یەکەم دە ئەسڵدا پرێپۆزیسێونە، هەر وەک "بە/ وە" دە زمانی کوردیدا. کەرتی دووەم دە ریشەدا مانای "یەک" دەبەخشێ و خزمە بۆ وێنە دەگەڵ ↑هاو haw [هاوکار، هاوژین]. دە زمانی فارسیدا بەرانبەری وشە کوردییەکان دەگوترێ "بەهم" و "درهم"، وەک "بهم خوردن، بهم زدن، بهم رسیدن، درهم ریختن...".

وێڵ **wel** [ *wel* ] - "سەرگەردان، ئاوارە": پێوەندی بەم خێزانەوشەوە هەیە کە ئاماژە بە مانای "سووڕان، با دران، خولانەوە" دەکا و دەچێتەوە سەر ریشەی < ***wel-** , ***uel-** (IE.) "سووڕان، خولان، با دران". چەند وشەیەک کە لەم ریشەوە هاتوون، بریتین لە ↑پێل pel، ↑ولین wılîn "تیکوشین، هەڵگلۆفین"، ↑وەلوەلە welwele "تیکەو لێکە، شلووقی"، valati (OIn.) "دەسووڕێ"، voluere (L.) "سووڕاندن، لوول دان، گلۆڵە کردن"، Welle (G.) "پێل، شەپۆل" و ↑واڵە wale (واڵە کردنی تەگەری دووچەرخە)، ↑*فەلەک* *felek* "گەردوون" و هتد.

وینجە **wence** [ *wenja* ] - "جۆرێک گیای لەوەڕ": یۆنجە yonje (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Wiese (G.) "چیمەن"، سەر بە ریشەی < ***weis-** (IE.) "چەکەرە کردن ، هەڵدان". بژوێن bıjwên [بژوون bıjûn] "سەوزەڵان" لەوانەیە پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

2- Weide (G.) "سەوزەڵان"، weida (OG.) "سەوزەڵان، لەوەڕ، خۆراک، چێشتە"، wād (OE.) "ڕاو، ڕاونان"، váyati (OIn.) "وە دوای دەکەوێ، ڕە پێی دەنێ"، vyti (L.) "ڕە پێ نان، ڕاو نان"، سەر بە ریشەی < ***ueiə-** (IE.) "شوێن خواردن کەوتن". هەروەها وشەی Eingeweide (G.) "ورگ" [شوێنی خۆراک لەناو سکدا، "خۆراکدان"] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

وێنە **wene** [ *wena* ] - "شێوە، عەکس": دە کوردمادی سەروودا مینا mîna "وەک، لەشێوەی". مانند mānand (P.) "مینا، وێنە، لەوێنەی". فۆتیمی m دە شێوەزاری ناوەڕاستدا بووەتە w. دە زمانی کوردمادیدا کرداری ↑مان[2] man یان ↑مینین mînîn هەیە بە مانای "وێکچوون، هاوشێوە بوون". [دە هەورامیدا مانایش manayış]. دە فارسیدا مانستن mānestan (P.) و مانیدن mānīdan (P.) "وێکچوون، مینای یەک بوون"

# ھ (H)

ھا **ha** [ *hā* ] - "وشەی ئاگادار کردنەوە و وریایی دان": [ھا ئەو توورەکەم لێ وەرگرە، ھا ئەو کراسە لەبەر کە]. ↑ھانێ hane ش دەگوترێ [ھانێ ئەو کراسە لەبەر کە]، ھا ha (P.) و ھان (P.).
بڕوانە ↑ئەھا eha.

ھات1 **hat 1** [ *hāt* ] - "بەخت": دەچێتەوە سەر↑ھاتن hatın. ھات و بات hat u bat یش دەگوترێ. "بات" شێوەیەکی دیکەیە لە "بەخت". لەوانەیە ئەم وشەیە سەرەتا لە گەمەدا بەکار ھاتبێ و ئاماژەی بە ھاتنی دۆخی خوازراو کردبێ [ بۆم نایە، بۆت ھات...].
[شیاوی باسە نەھامەتی nehametî یش بە مانای "بەدبەختی" دەچێتەوە سەر امدن āmadan (P.) "ھاتن"].

ھات2 **hat 2** [ *hāt* ] - دەگەڵ "ھاوار" دێ [ھات و ھاوار hat u hawar]. جگە لەمە ↑ھەیت و ھووت heyt u hut ھەیە و ھەروەھا ↑ھەت2 *het 2* "وشەی دنەدانی سەگ". وێ دەچێ ↑ھاتەران hateran یش پێوەندی بەم وشانەوە ھەبێ.

ھاتن **hatın** [ *hātın* ] - "گەیشتنە بەرەوە": خزمە دەگەڵ eilen (G.) "بە پەلە ڕۆیشتن، پەلە کردن"، iénai (G.) "ڕۆیشتن"، íon (G.) "ئەوەی دەڕوا"، ire (L.) و abire (L.) "پێشوە چوون"، itti (Rus.) "ڕۆیشتن"، oĩtos (Gr.) "چارەنووس" [دە بنەڕەتدا: ڕەوت]، سەر بە ریشەی **< -ei* ( .IE)** "ڕۆیشتن". وشەی ↑ساڵ sal لەم ریشەوە ھاتووە. وا شیمانە دەکرێ کە ئەم ریشەیە لە پێوەندی دابێ دەگەڵ ریشەی **< -wi* ,-ui* ( .IE)** "لەیەکتر جیا بوونەوە، لە یەکتر دوور بوونەوە". بەم پێیە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە پێشگری ڤە ve یان ↑پاشگری we(e) (ە)وە [ڤەکردن، کردنەوە]. ئەم وشانە ھەروەھا دەبنە خزم دەگەڵ ↑وتۆز wıtoz "گلۆر، خللۆر" و ↑ئوتوز *utuz* "باگردان، بانگردێن".

ھاتوور **hatur** [ *hātūr* ] - "تیڵای شت پێ ورد کردن": خزمە دەگەڵ ↑ھەتار hetar "کوتکی گەورە".

ھاتوون **hatun** [ *hātūn* ] - "توون، ئاگردان، دۆژە": شێوەیەکی دیکە لە↑ھیتوون hîtun.

ھاتەر **hater** [ *hātar* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑ئاگر agır.

ھاتەران **hateran** [ *hātarān* ] - دەگەڵ "پاتەران" دێ [ھاتەران پاتەران hateran pateran واتا قسەی بێ مانا]. جێی بەرھەڤ کردنە دەگەڵ heißen (G.)، heizen (OG.)، heitan (Gt.)، hātan (OE.)، heta (SW.) "بانگ کردن، بانگ کران، بە تیو کردن، فەرمان دان". بە گوێرەی بۆچوونەکان وێ دەچێ ئەم وشانە بچنەوە سەر ریشەی **< -(kei(d* ( .IE)** "وە جووڵە خستن". kineĩn (Gr.)، citare (L.) "وە جووڵە خستن"، citus (L.) "خێرا" پێوەندییان بەم ریشەوە ھەیە.

ھاج **hac** [ *hāj* ] - "بزۆز، نائارام" [ھار و ھاج]. ھاژ haj یش دەگوترێ. ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی عەرەبیش: ھاج hāja (Arb.) "ھەژا"، ھیجان hayajān (Arb.) "ھەژان".
1- لەوانەیە پێوەندی بە کرداری ↑ھەژان hejan ەوە ھەبێ.
2- یان لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی **< -aig* ( .IE)** "جووڵانەوەی توند". Eichhorn (G.) "سمۆرە"، ācol (OE.) "داچڵەکین"، eikinn (OIs.) "بەغار، بەپەلە"، igrat (Rus.) "لەیزین، ھەڵبەزدابەز کردن"، hagedis (Nl.) "مارمێلکە"، óphis (Gr.) "مار" پێوەندییان بەم ریشەوە ھەیە.

هاچە **haçe** ‌[ *hāča* ] - "لکەدار، فاقە": حاچە ћaçe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Ast ‌(G.)، asts ‌(Gt.)، ozos ‌(Gr.)، ost ‌(Arm.) "لکەدار". گومان دەکرێ ئەم وشانە لە دوو کەرت یان بە وتەیەکی دیکە دوو ریشەی **< -o* (.IE)** "دەگەڵ، پێوە" و **< -sed* (.IE)** "(دا) نیشتن" پێک هاتبێ ومەبەست ئەوەبێ کە لکەدار لە دارەکە نیشتووە، واتا پێوەی نووساوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑هەژال hejal هەیە بە مانای "لکەداری سەوز و گەڵادار" و هەروەها ↑هەژگ hejg "لکەدار" یان هەژک hejk.

هار **har** ‌[ *hār* ] - "شێت و توورە، ئۆقرەنەگر": هەروەها ناوی نەخۆشییەکە سەگ تووشی دەبێ و شێت و توورەی دەکا. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- arg ‌(G.)، erg ‌(Nl.)، earg ‌(E.)، arg ‌(Sw.) "بەد، بەدفەر"، سەر بە ریشەی **< -ergh* (.IE)** "هووروووژان، توند جووڵانەوە، لەرزین". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ orcheīsthai ‌(Gr.) "لەرزین، خۆهەڵاویشتن، سەما کردن". وشەی "ئۆرکێسترا" پێوەندی بەم وشەوە هەیە و دە زمانی یۆنانیدا orchéstra ‌(Gr.) بووە بە مانای "سەماگە، شوێنی سەما کردن لە سەر شانۆ".

2- ↑پەتیارە petyare.

هاروو **haru** ‌[ *hārū* ] - "پووک، شەویلکە": اروارە ārwāre ‌(P.). خزمە دەگەڵ ↑هارین harîn. لێرەدا شەویلکە وەک ئامرازی هارینی خۆراک لەبەر چاو گیراوە.

[تێبینی: دەشێ وشەی ↑خلێنە xılene ش پێشتر خرێنە xırene و دە بنەڕەتدا *هارێنە* *harene** بووبێ و ئەویش خزم بێ دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. شیاوی باسە دە زمانی لاتینیدا molaris ‌(L.) هەم بە مانای "بەرداش" و هەم بە مانای "خلێنە" بەکار دێ و دەچێتەوە سەر کردارێک بە مانای "هارین". هەروەها دە زمانی فارسیشدا بە ددانی خلێنە دەگوترێ "دندان اسیاب" کە وشەی دووەمەکەی بە مانای "ئاش"ە].

هارویێ **haruwe** ‌[ *hāruwe* ] - "خیار": خیار xîyar یش دەگوترێ. خیار xīyār ‌(P.). هارویێ و خیار دوو شێوەن لە یەک وشە. خیار xîyar ‌(P.). دە ئەڵمانیدا دەبێتە Gurke ‌(G.) "هارویێ" و دە زمانە ئەوروووپییەکانی دیکەشدا هەیە و گشت وشەکان دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. *aoros* *(.Gr)* < "کاڵ، نەگەیشتوو". ئەم بەرهەمە لەبەر ئەوەی بە شینی لێ دەکرێتەوە و بە پێچەوانەی زۆر بەرهەمی دیکە رەنگێکی زەرد و سووری نییە، ئەوها ناودێر کراوە.

هارە¹ **hare ¹** ‌[ *hāra* ] - "دەنگی بلیندی ماتۆر": خزمە دەگەڵ ↑هەرا hera.

هارە2 **hare 2** ‌[ *hāra* ] - "وردە": دەگوترێ "هارەی لە برەی ناکاتەوە". دەچێتەوە سەر ↑هارین harîn "ورد کردن" و خزمە دەگەڵ ↑ئارد ard و ↑ورد wırd [هورد hurd] و هتد. هارە ئەو "وردە"یە کە بە هۆی هارینەوە دروست دەبێ. "برە" ئەو وردەیە کە بە هۆی "برین"ەوە دروست دەبێ لە کاتی برینەوەی دار بە مشار. کاتێک دەڵێن فڵانکەس هارەی لەبرەی ناکاتەوە، مەبەست ئەوەیە کابرا ئەوەندە گێلە، ئارد لە برەی دار جیا ناکاتەوە.

هارە3 **hare 3** ‌[ *hāra* ] - هارە کردن واتا "تێکرووخان". خزمە دەگەڵ هری herrī یان horrī ‌(P.) [دلم هری ریخت پایین]، هەروەها دلهره delhore ‌(P.) "دڵەراوکێ" [دڵ داکەوتن]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -ere* ,-re* ,-reu* (.IE)** "بزووتن". وشەی هەڕا hera [را³ ra کردن] و ↑رووخان ruxan و چەندین وشەی دیکە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

هارین **harîn** ‌[ *hārīn* ] - "ورد کردن": خزمە دەگەڵ grindan ‌(OE.)، grind ‌(E.) "هارین"، Grind ‌(G.) "کرێژ (ی سەر)"، grind ‌(Nl.) "خیز، ساوار"، grint ‌(MG.) "خیز، دەخل و دانی وردکراو، ئاردی درشت"، Grund ‌(G.) و ground ‌(E.) "هەرد، خۆڵ، خاک"، سەر بە ریشەی **< -ghren***

"هاڕین، ورد کردن، هەڵپریواندن" و دوورتریش سەر بە ریشەی **(IE.) *ghreu- >** **(IE.)** "رێخشاندن، ساوین ، ورد کردن، هاڕین". هەر لەم ریشەوە چەندین وشەی دیکە پەیدا بووە، وەک (G.) Grieß "خێز، ساوار"، (G.) Groß و (Nl.) groot، (E.) great "گەورە، درشت" [دە بنەڕەتدا: دەنکی درشت، وردکراوی درشت، کەپەک]، (Lit.) grūsti "هاڕین، ساوین، ورد کردن". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەک ↑ئارد ard، ↑هورد hurd [↑ورد wırd]، ↑گەرد gerd، ↑هاڕە hare، ↑هەرژین herjîn و ↑هەرشان herşan "هەلا هەلا بوون"، ↑هەرستین herıstîn "شکاندن، ورد و خاش کردن" و ↑هەرسەک hersek "هەڵتاوین و هەزمی خۆراک"، ↑هەریسە herîse "چێشتی گەنمەکوتاو" و ↑گێرە *gere* "ورد کردنی خەرمان" و هتد.

**هازە haze** [ *hāza* ] - "دەنگی باریکی ئاو لەسەر ئاگر": خزمە دەگەڵ ↑هاشە haşe.

**هاژان hajan** [ *hāžān* ] - "بەرز و نەوی بوونی شتێک": خزمە دەگەڵ ↑هەژان hejan.

**هاس has** [ *hās* ] - "جانەوەرێکە وەک پڵینگ و لەم چکۆڵەتر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Hase، (OG.) haso، (Nl.) haas، (OIn.) śaśa-h "کەروێشکی کێوی"، (OG.) hasan "بۆر"، (OE.) hasu "بۆری قاوەیی"، سەر بە ریشەی **(IE.) *kaso- >** "بۆر".

**هاسان hasan** [ *hāsān* ] - ↑ئاسان asan.

**هاست hast** [ *hāst* ] - هاشت haşt یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاشت aşt.

**هاش 1 haş** [ *hāš* ] - "حەز، ئارەزوو": شێوەیەکی دیکە لە ↑حەز ħez.

**هاش 2 haş** [ *hāš* ] - "تینووەتی زۆر": خزمە لەگەڵ ↑هیشک hîşık.

[تێبینی: وشەی "تینوو"ش لە ریشەکەوە دێ بە مانای "هیشک" و لە بنەڕەتدا مەبەست هیشک بوونی گەروویە].

**هاشرمە haşırme** [ *hāšırma* ] - "کەژوویەک کە دەکرێتە پاڵوو": هێشرمە hêşırme ش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری ها ha + شرمە şırme. لەم تێڕوانینەوە بنجی وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ژمارەیەک وشە کە باس لە "تەنین، چنین" دەکەن، وەک ↑شار şar "سەرپۆشی ژنانە، دەسرۆکەی دەوری کڵاوی لباد"، ↑شاڵ şal و ↑جۆڵا *cola* و هتد.

**هاشە haşe** [ *hāša* ] - "دەنگی با": هاژە haje ش دەگوترێ. هێندێک دەنگی دیکەش هەیە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑خشە xışe، ↑هازە haze کە دەکرێ هەموویان سەر بە خێزانێک بن. ئەم وشانە لەوانەیە:

1- خزم بن دەگەڵ ↑قیژە qîje.

2- یان پێوەندییان هەبێ بە (Gr.) echo "دەنگ ".

**هاف 1 haf** [ *hāf* ] - "نک، لا، ئاڵ، جەم": خزمە دەگەڵ ↑ئاڵ al و دە بنەڕەتدا دەبێ هەر دووک وشە لە یەک وشەوە سەریان هەڵدابێ. دەشێ خزم بن دەگەڵ (G.) Halb، (Gt.) halbs، half (E.)، (OG.) healf "نیوە" [دە بنەڕەتدا بە مانای "لەت"]، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kel- >** "لەت کردن، بڕین، قەڵشاندن". بەم جۆرە وشەکە لە مانای "لەت کردن"ەوە مانای "لەت" و پاشان مانای"نیوە"ی وەرگرتووە [نیوە کردن واتا دوو لەت کردن]. هەروەها وشەکە دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە مانای "لا، ئاڵ"ی هەبووە [ئەو لەتە بدە من، ئەو لایە بدە من].

**هاف 2 haf** [ *hāf* ] - "1- رووکاری سەرەوەی بان 2- نهۆمی سەرەوەی خانوو": خزمە لەگەڵ up (E.)، auf (G.)، op (Nl.)، ūf (OG.)، uup (Sw.) "لەسەر، سەرەوەی"، hypo (Gr.) "لەخوار، ژێر،

خوارەوەی"، سەر بە ڕیشەی **<** ***eup- , *up-** ***(IE.)*** "لە خوارەوە بەرەو سەر چوون یان لەسەر بوون".

**هافر hafır** [ *hāfır* ] - "1- ئاخوڕ 2- گیا و تفاق"؛ هەروەها "هافرِدان" هەیە وەک کادان. خزمە دەگەڵ Hafer (G.)، habaro (OG.)، haver (Nl.)، havre (Sw.) "جۆی ڕەش". وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑جۆ co [جەو cew].

**هاڤا hava** [ *hāvā* ] - "دارۆکەیەکە بە کونی نیری گای دا دەکەن"؛ خزمە لەگەڵ ↑ئیپە îpe.

**هاڤاژ havaj** [ *hāvāž* ] - لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک "قسەی زیاد مەکە" مانا کراوەتەوە. هەروەها هاڤاژە havaje ش نووسراوە، بە هەمان مانا. وشەکە دەبێ پێک هاتبێ لە پێشگری ها- ha- [شێوەیەکی دیکە لە a- ] + ڤاژ vaj. کەرتی ڤاژ خزمە لەگەڵ ↑وشە wışe، وێژە weje، ↑بێژتن *bejtın*، ↑ئاواز awaz [a-waz] و هتد. لەوە دەچێ کاتێک بەرانبەر ئاخافتنی کەسێک گوتراوە "هاڤاژە"، مەبەست ئەوە بووبێ وتەکانی ئەو کەسە "قسەیە" یان "بەیت و بالۆرەیە". هەروەها خزمیشە لەگەڵ ↑هەڤۆک hevok "دەستەواژە، ڕستە".

**هاڤل havıl** [ *hāvıl* ] - "بەهرە، قازانج، بەروبوو"؛ هەروەها هافل hafıl هەیە بە مانای "ئاکام، نەتیجە". دیارە مانای ئەسڵی وشەکە "بەهرە، بەرهەم"ە و لەمەوە مانای "نەتیجە" پەیدا بووە. پێوەندی هەیە بە ڕیشەی **<** ***kap-*** ***(IE.)*** " گرتن، چەنگ خستن". دەبێتە هاومانای وشەی فارسی دستاورد destaverd "بەرهەم" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چەپۆک çepok، ↑چەپڵە çeple، ↑هەبەک hebek "لەپی دەست" و چەند وشەیەکی دیکە.

**هاڤی havî** [ *hāvī* ] - "1-نامۆ، غەوارە، سەرگەردان 2- شێتۆکە"؛ هاوی hawî ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑*ئاوا awa* [ئاوا بوونی خۆر]، ↑ئاودیو awdîw، ↑ئەوداڵ ewdal [↑ئەبداڵ ebdal] و هتد. بنەوشەی ئاو aw- [کۆنتر ab-] ئاماژە دەکا بە دوورکەوتنەوە و ون بوون. مانای دوومی وشەکە واتا "شێتۆکە" بۆ ئەو لێکدانەوەیە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤی شێتۆکە ئەقڵ و ئاوەزی *ئاوا* بووە، بە وتەیەکی دیکە ئاوەزی لە دەست داوە. وشەی ئەوداڵ ewdal یان ئەبداڵ ebdal یش هەر ئەو ئەم پێوەندییە نیشان دەدا.

**هاگۆس hagos** [ *hāgos* ] - "تەختەزەوی خەتدراو بۆ ڕۆژەجووت"؛ خزمە دەگەڵ ↑هۆخ hox "هەردی تەواو کێڵدراو".

**هاڵ 1 hal** [ *hāl* ] - "بەرزایی کێو (کە پیاو بۆ خوارەوە بڕوانێ، دە گێژەوە دێ)"؛ خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کاڵ kal دا هاتوون [پیر و کاڵ].

**هاڵ 2 hal** [ *hāl* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑کاڵ[1] kal "کەمڕەنگ".

**هاڵ 3 hal** [ *hāl* ] - "قۆرە، بەرسیلە"؛ دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاڵ[1] kal [مەبەست ترێی کاڵ].

**هاڵ[4] hal** [ *hāl* ] - "1-ئاغەڵی مەڕ 2- ئەشکەوت 3- دیوی مەزن"؛ خزمە لەگەڵ ↑هۆڵ hol.

**هاڵا hela** [ *halā* ] - "1- داد و فریاد 2- پەنا"؛ هەروەها هالان halan هەیە بە مانای "1- هان دان، دنە دان 2- قیرە و هەرا"؛ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هەڵا hela [هەللا hella].

[تێبینی: پێوەندییەک هەیە لەتیوان دوو چەمکی "هاوار کردن، هەڵا کردن" و "کۆمەک و ئاریکاری (خواستن)". ئەم پێوەندییە لەم وشانەشدا بەدی دەکرێ: هانا بردن، بە هاناوە هاتن، بە فریا گەیشتن، بە دەنگەوە هاتن و هتد. هەم "هانا"، هەم "فریا" و هەمیش "دەنگ" ماناکانیان نیزیکە لە یەکتری و لە بنەڕەتدا مەبەست دەنگ و هەرا بووە بە مەبەستی ئاریکاری خواستن.

**هاڵان halan** [ *hālān* ] - "تیپێچران، داپۆشران"؛ ئاڵان alan یش دەگوترێ [لێهاڵان، لێئاڵان]. خزمە دەگەڵ hehlen (G.)، helan (OG.) و (OE.)، hela (OF.) "داپۆشین، داپێچان، شاردنەوە"،

kalytein ‹Gr.› oc-culere ‹L.› ceilid ‹OIr.› "لێهاڵاندن، شاردنەوە"، سەر بە ڕیشەی **< *kel-** **(IE.)** "لێهاڵاندن، شاردنەوە، داپۆشین، تاقەت کردن". ئەم ڕیشە هیندو ئەورووپییە یەکێکە لەو ڕیشانەی کە دە زمانە جیاوازەکاندا بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی گرتووە و گەڵێک لق و پۆی لێ بۆتەوە. هێندێک لەو وشە کوردمادییانەی لەم ڕیشەوە هاتوون، بریتین لە ↑هاڵقە halqe، ↑چەڵتووک çeltuk، ↑چاڵ çal [چیلکە و چاڵ]، ↑کلۆر kılor، ↑قالۆر qalor، ↑کاڵە kale و بە دەیانی دیکە. هەروەها گومان دەکرێ śaranā- ‹OIn.› "پاراستن، بەرگری لێ کردن" پێوەندی بەم ڕیشەی سەرەوە هەبێ. [بەراوردی ئەو وشەیە بکە دەگەڵ ↑شاردنەوە şardın(ewe)].

**هاڵاو halaw** *[ hālāw ]* - "هەڵم":

1- یان خزمە دەگەڵ calere (.L) "گەرم، داغ بوون" و ge-hleow (.OE) "گەرم"، hlaer (.OIs) "ئاو و هەوای سازگار" [دەبنەڕەتدا گەرم] و lau (.G) "شیلەو گەرم"، سەر بە ڕیشەی **< *kel-** **(IE.)** "کوڵان، سووتان، گەرم بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئالاڤ alav "بڵێسە" و ↑قاڵ qal "داغ، تواوە لە گەرمان".

2- یانیش خزمە دەگەڵ halō ‹L.› و hālāre ‹L.› "هەڵم کردن، هاڵاو کردن". وشەی inhalation "هەڵم هەڵمژین" دە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێتەوە. وێ دەچێ وشەی ↑هەڵم helım پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و لەوانەیە هەموو وشەکانی سەرەوە پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ. هەروەها ↑هەڵا hela ش [هەوڕ و هەڵا] لەم چوارچێوەیەدا جێی هەڵسەنگاندنە.

**هاڵقە halqe** *[ hālqa ]* - "بازنە یان جەغزی لە دار و لە کانزا": ئاڵقە alqe و خەڵەک xelek یش دەگوترێ. حلقه ħalqe ‹P.›. وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی هاڵ hal + قە qe [دە بنەڕەتدا ke پاشگری گچکاندن یان پاشگری کردنە ناو]. کەرتی هاڵ hal- [ئاڵ al- یان خەل xel-] خزمە دەگەڵ hüllen ‹G.› و هەروەها hehlen ‹G.› و هاوتاکانی ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "تێپێچان، داپۆشین، شاردنەوە"، Hülle ‹G.› "بەرگ، تێپێچ"، Hülse ‹G.› "پووش، تۆێکڵی دەخڵ و دان"، هاڵاندن halandın "تێپێچان، دەور گرتن" [↑هاڵان halan] و هالە hāle ‹P.› "تیشکی دەوری مانگ" و هتد. هاڵقە دە ڕاستیدا وەک تیشکی دەوری مانگ شتێکی بازنەییە کە دەوری شتێک دەگرێ [لێی دەهاڵێ]. ئەم وشەیە دە ئەسڵدا کوردمادی و فارسییە و شتێکی وەک halek(e) بووە و دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە حلقة ħeleqe ‹Arb.› و پاشان ئەم شێوە عەرەبێندراوە هاتۆتەوە ناو زمانی فارسی. پاشگری ek یان eke پاشگرێکی چالاکی زمانە ئێرانییەکانە و ئەمە نیشان دەدا کە وشەکە لەو زمانانەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبی.

**هاڵوێنی halweni** *[ hālwenī ]* - "قەیسی دەنک شیرن": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- حلوا *ħalwā* ‹Arb.› "هەڵوا".

2- ↑هەڵوو hılu.

**هاڵۆ halo** *[ hālo ]* - "دەفری گڵینی شێو تێدالێنان": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە calix ‹L.› "شەربە، پەرداخ، دەفر". ڕیشە؟

**هاڵۆز haloz** *[ hāloz ]* - "تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراو، لێک هاڵاو": ↑ئاڵۆز aloz یش دەگوترێ. هاڵ hal ‹ئاڵ al›+ ↑ئۆز oz- [یان ئۆس os-]. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑هاڵان halan [لێکهاڵان]. کەرتی دووەم پاشگری جەخت کردن و موبالەغەیە و دە چەندین وشەی کوردمادیدا

دەبیندرێ، وەک بزۆن، گرۆن، وتۆن، کرۆسک ، تەپلۆس، مەلۆس. مانای هالۆز دەبێتە لێکهالاوی و تێکەڵ پێکەڵی زۆر.

**هالە1 hale 1** [ *hāla* ] - "نەخۆشی پێستی دەم و چاوی ژنی دووگیان": خزمە دەگەڵ ↑خاڵ xal "نیشانە".

**هالە2 hale 2** [ *hāla* ] - "جۆرە دومەڵێکی سپی واش": خزمە دەگەڵ ↑ئالوو alu "لوو".

**هامار hamar** [ *hāmār* ] - "دەشتایی، تەختایی": خزمە دەگەڵ هموار hamvār (P.) "ساف، رێک". دەچێتەوە سەر بنەوشەی ↑هاو haw / هاڤ hav [کۆنتر ham]. مەبەست دە بنچینەدا ئەوەیە کە زەوییەکە هەمووی وەک یەکە، هاوئاست و هاوچەشنە.

**هاموشۆ hamûşo** [ *hamûşo* ] - ئامووشۆ amûşo ش دەگوترێ. پێوەندی بە دوو کرداری ↑هاتن hatn و ↑چوون çun هەیە.

**هامین hamîn** [ *hāmīn* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑هاوین hawîn.

**هان han** [ *hān* ] - هان دان واتا "دنە دان": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑خوێندن *xuwendın* [خاندن xandın] سەر بە ریشەی **< *kan- (IE.)*** "دەنگ هەڵبڕین، بانگ دان، گۆرانی گوتن". لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "هان" دە بنەڕەتدا دەنگ هەڵبڕین و بانگ کردن بووە لە پێناوی وەبەر نانی ورە دا و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هانا hana "هاوار" و چەند وشەیەکی دیکە.

2- ↑ئەها eha و ↑هانێ hane "وشەی ئاگادار کردنەوە و وریایی دان". لەم تێڕوانینەوە وشەکە سەرەتا بە مانای "وریایی پێدان" بووە، واتا بە مانای "وریا بە".

**هانا hana** [ *hānā* ] - "هاوار": وشەی هانا دە بنەڕەتدا بە مانای "هاوار، فریا(د)، دەنگ هەڵبڕین"ە و بە هاناوەچوون واتا بە هاوارەوە چوون، بە فریاوە چوون، بە دەنگەوە چوون". هەروەها دەگوترێ هاوار بردنەبەر یان هانا بردنەبەر. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑خوێندن *xwendın* [خاندن xandın]. خوێندن دە بنەڕەتدا بە مانای "دەنگ هەڵبڕین" بووە، هەر وەک چۆن دەگوترێ کەڵەباب دەخوێنێ یان کەو دەخوێنێ.

**هانقار hanqar** [ *hānqār* ] - "دەوروبەر": خزمە دەگەڵ ↑هەنێ hene و ↑حاند ħand و هتد.

**هانکە hanke** [ *hānka* ] - "دەنگی نەفەس تەنگی": [هانکەهانک].هن هن hen hen (P.). خزمە لەگەڵ ↑خنکان xınkan. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تنگ بوون".

**هانگ hang** [ *hāng* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاهەنگ aheng [ئا + هەنگ a + heng].

**هانێ hane** [ *hane* ] - "وشەی ئاگادار کردنەوە": [هانێ ئەو کراسە لەبەر کە]. ↑ها ha.

**هاو haw** [ *hāw* ] - "وشەی هاوبەشی و لەیەک چوون": [هاوکار، هاوبەش، هاوڕێ، هاوسەر و هتد]. هاڤ hav و هەوڤ hev یش دەگوترێن. هم ham (P.). خزمە دەگەڵ samo (OG.)، sama (Gt.)، same (E.)، samma (Sw.) "هەمان"، هەروەها پاشگری-sam (G.) و (Sw.)، -sams (Gt.)، some- (E.). ئەم پاشگرە دە بنەڕەتدا وشەیەکی سەربەخۆ بووە بە مانای "وەک یەک بوون، دەگەڵ یەک هاتنەوە، هاوچەشن بوون"، سەر بە ریشەی **< *sem- (IE.)*** "یەک". کەواتە "هاوکار" بوون واتا "یەک کار" هەبوون، یان "هاوڕێ" بوون واتا "یەک رێگا" گرتنەبەر. ئەو وشانەی خوارەوەش خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە: samt (G.) "وێکڕا، بە یەکەوە"، sanft (G.) "نەرم و نیان" [دە بنەڕەتدا: هەموار، بێ هەڵبەزدابەز]، zusammen (G.) "پێکەوە، دەگەڵ یەک"، gesammt (G.) "تێکڕا"، semper (L.) "هەمیشە"، simplex (L.) "سادە"، homós (Gr.) "هاوبەش، هەمان، وەک یەک"، háma (Gr.) "پێکەوە، هاوکات"، sam (Rus.) "هەمان، خود"،

(OIn.) samá-h "هەمان، وەک یەک، هەروا ". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ساماڵ samal "ئاسمانی ساف و یەکدەست"، ↑هاواڵ hawal، ↑هەمان heman، ↑هەمین hemîn "ناوێکی ژنانە" کە دەبێ بە مانای نەرم و نیان و لەسەرەخۆ بووبێ، ↑هەمار hamar "رێک، تەخت" یان ↑هەموار hemwar "رێک، رێک و پێک ، تەخت، یەکدەست". دواتر هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑جڤین cıvîn "کۆم بوون، یەک گرتن"، ↑سەرجەم sercem "تێکرا، بەیەکەوە" و ↑ئەنجومەن en-cumen "جڤات، یەکگرتن" و هتد.

**هاوار hawar** [ *hāwār* ] - "بانگ، هەرا، زیقە": خزمە دەگەڵ ↑وەڕین werîn "دەنگ هەڵبڕینی سەگ"، ↑وڕنگە wırnge "گۆرانی بن لێوان"، ↑وڕڕە wırre "چەقە، چەنەدرێژی"، ↑هۆرە hore "جۆرێک گۆرانی"، ↑ورتە *wırte*، ↑حەیران ĥeyran و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *uer-* *(IE.)* "گوتن، قسە کردن".

**هاوران hawran** [ *hāwrān* ] - "دەشتێکی هەراو لەتیوان تیگرە و پەڕات (دیجلە و فرات)دا": ئەسڵی وشەکە هاور hawır ە کە پاشگری an- پێوەی لکاوە. "هاور" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گۆڕ gor "دەشت".

**هاوردن hawırdın** [ *hāwırdın* ] - "هێنان": اوردن āvordan (P.). پێک هاتووە لە ↑ها ha [پێشگر] + وردن wırdın. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑بردن bırdın.

[تێبینی: وەک لە چەند شوێندا باس کراوە، پێشگری ئا -a [ها -ha] کە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە وشەکاندا دێ، یەکێک لە ئەرکەکانی بریتییە لە دروست کردنی مانایەکی تازە لە چوارچێوەی مانا گشتییەکەدا. لەم نموونەیەدا دەبینرێ کە کرداری "بردن"، پاش گۆڕانی فۆتیمی b و وەرگرتنی پێشگرەکە، ماناکەی دەبێتە "هێنان، ئانین". دیارە هەم "بردن" و هەم "هێنان، هاوردن" بریتین لە "حەمل کردن، گواستنەوە"].

**هاوریشم hawrîşım** [ *hāwrīšım* ] - "حەریر": ابریشم abrīšam (P.). شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاوریشم awrîşım.

**هاوژین hawjîn** [ *hāwžīn* ] - "خافڵاندن، سەرگەرم کردن": [ئەو منداڵە بهاوژێنە!]. خزمە دەگەڵ ↑حەوانەوە ĥewanewe. فۆتیمی ژ j وەک ناوگر دە هێندێک لە کردارەکاندا دەوری جەخت کردن دەبینێ، وک "لۆقژین"، "مرژاندن"، "لوکژین" و هتد.

**هاوسێ hawse** [ *hāwse* ] - "جیران": همسایه hamsāye (P.). ↑هاو haw + ↑سێ se [سێبەر]. مانای وشەکە دەبێ هاوبەش بوون دە سێبەر دابێ. رەنگە مەبەست ئەوە بێ کە دیواری تیوان دوو ماڵی هاوسێ سێبەر دەخاتە هەر دوو لاوە.

**هاوقان hawqan** [ *hāwqān* ] - "هاڵقان، گیر کردن": ئاوقان awqan یش دەگوترێ. بنەوشەی هاو(ق) -haw(q) خزمە دەگەڵ ↑ئەوک ewk "یەخە، بەرۆک"، ↑هوویە huye "نیر"، ↑یێخە yexe [ئێخە exe]، ↑جەغز *ceğız* و ↑جۆخین coxîn و چەند وشەیەکی دیکە سەر بەریشەی < *ieu-* *(IE.)* "بەستن (ەوە)، لێکبەستن، یەکخستن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئەوق ewıq "قەتیس، گیرخواردوو" و ↑ئەوقە ewqe "گیرۆدە".

**هاول hawıl** [ *hāwıl* ] - "چارە، عیلاج": هاویل hawîl ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ heil (G.) "ساغ" و heilen (G.) "چاک کردنەوە، ساغ کردنەوە"، whole (E.) "تەواو، گشت، ساغ" و hale (E.) "تەرو تازە، دانەهێزراو"، hel (Sw.) "تەواو، گشت"، Heil (G.) و heill (OIs.) "ساغی، بەخت، بەختەوەری، رزگاری". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *heila-* *(Grm.)* کە مانا بنەڕەتییەکەی و هەروەها ریشە هیندو ئەورووپییەکەی بە تەواوی ساخ

نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا ↑چڵ çl "ساز، تەواو، دروست کراو" [نیوەچڵ واتا ناتەواو، نیوەساز] و هەروەها ↑چڵیان çlîyan "دروست بوون، ساز بوون، ئامادە بوون" و دیسان ↑چارە çare "عیلاج" هەیە کە وێ دەچێ هەموو پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەبێ.

**هاونگ hawıng** [ *hāwıng* ] - "ئامرازی شت تێداکوتانەوە": هاون hawın، هاڤن havın، هەڤان hevan، ئاونگ awıng و دەسکاونگ deskawıng یش دەگوترێن. مەبەست لە "دەسکاونگ" دەسکی شتەکەیە. هاون hāvan (P.). خزمە دەگەڵ hauen (G.)، houwen (Nl.)، hew (E.)، hugga (Sw.) "کوتان، کوتانەوە". دە زمانی عەرەبیدا هاون hāwan (Arb.) بە مانای "خۆمپارە" بەکار دێ، ئەم وشەیە لە زمانی کوردمادی یان فارسی وەرگیراوە. دە زمانی ئەڵمانیدا ناوی ئەم چەکە قورسە لە ناوی هاونگ وەرگیراوە و بە هەردووکیان- هەم بە هاونگ و هەم بەو چەکە- دەگوترێ Mörser. جا زمانی عەرەبیش وشەی "هاون"ی خواستۆتەوە و کردوویە بە ناوی ئەم چەکە.

**هاوە hawe** [ *hāwa* ] - "بەکەڵک، بەرێ وجێ": هاولە hawle ش دەگوترێ بە مانای "1- چاک، باش 2- هێژا": خزمە دەگەڵ ↑خوب xūb (P.) و hu (Av.) "باش".

**هاوی hawî** [ *hāwī* ] - "1- شێتۆکە 2- ئاوارە": هاڤی havî ش دەگوترێ بە مانای "نامۆ، غەوارە". خزمە دەگەڵ ↑ئاوا *awa*، ↑ئەبداڵ ebdal و ↑ئاودیو awdîw و چەند وشەیەکی دیکە. بنەوشەی ئاو -aw ئاماژە بە "دوور کەوتنەوە و ون بوون" دەکا. هاوی بە مانای "ئاوارە" ئەو کەسەیە کە لە زێد و وڵاتی خۆی دوور کەوتۆتەوە. هەروەها بە مانای "شێتۆکە"ش ئەو کەسەیە کە ئاوەز لێی دوور کەوتۆتەوە، لە دەور و بەری خۆی هەڵبڕاوە و هۆشی بزر بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی ئەوداڵ ewdal [کۆنتر: ئەبداڵ abdal].

**هاوید hawîd** [ *hāwīd* ] - "داغی نیشانە کردنی ماڵات": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑سپی sıpî [کۆنتر: سپێد sıpêd] و ↑قاوت qawıt سەر بە ریشەی < ***kueit-*** ( ***IE.*** ) "هایسان، رووناک بوون، بریقانەوە".

**هاویشتن hawîştın** [ *hāwīštın* ] - "فڕێ دان، توور هەڵدان": هاویشتن hawîştın (ha-wîştın) شێوەی تازەترە لە ئاویشتن awîştın [a-wîştın]. پێشگری a بە ئەسڵی وشەکەوە لکاوە. ئەم کردارە دە زمانی کوردمادیدا بە شێوەی ↑وزتن wıztın یش دەبینرێ. دە"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 60 )، اویختن² avīxtan (P.) بە مانای "بە شەڕ هاتن" هاتووە و وەک وشەیەکی جیا لە اویختن¹ avīxtan "هەڵواسین" شی کراوەتەوە. وشەی یەکەم برداوەتەوە سەر ریشەی -vaig "خێرا بزوان، راژان" و ئەمەش برداوەتەوە سەر ریشەی هیندوئەورووپی *ueig-* ( *IE.* ) "چەماندن، جووڵاندن، هەڵسووڕاندن". لە پێوەندی دەگەڵ ئەم ریشەیەدا چەندین وشە باس کراون، وەک vijáte (OIn.) "خێرا بزوان، تەکان خواردن"، -vaēg (Av.) "هەڵسووڕاندن"، -vaēya (Av.) "پێکان، وێکەوتن"، wīxtan (MP.) "هەڵسووڕاندن، هاویشتن". وشەی vijáte (OIn.) کە سەرتر ئاماژەی پێکرا، لە وشەنامەی ئێتیمۆلۆژیی ئەڵمانیدا لە پێوەندی دەگەڵ چەندین وشەی دیکەدا و هەروەها بە مانای "هەڵاتن، دەرچوون" باس کراوە. بەگوێرەی شی کردنەوەی من ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑فیزماڵک *fîzmalk*، ↑ویسک wîsk، ↑بی bî [دارەبی] و هیتر کە دواجار دەچنەوە سەر ریشەی < ***uei-*** ( ***IE.*** ) "چەمان، سووڕان، با دران".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "با دان، سووڕاندن" و "هاویشتن" دەتوانین ئاماژە بکەین بە وشەی ئەڵمانی werfen (G.) "هاویشتن، فڕێ دان". ئەم ریشەیە دەچێتەوە سەر

ریشەیەک بە مانای "چەمان، سووڕان، با دران". ئەم مانایە لەمەوە پەیدا بووە کە کاتی هاویشتندا شتیان بە دەست هەڵسووڕاندووە و هاویشتوویانە].

**هاوین hawîn** [ *hāwīn* ] - "وەرزی گەرما": خزمە دەگەڵ Sommer (G.)، summer (E.)، zomer (Nl.)، sommar (Sw.)، sam(rad) (OIr.) "هاوین"، sma (OIn.) "نیوەی ساڵ، وەرزی ساڵ"، -ham (Av.) "هاوین". وشەکانی am (Arm.) "ساڵ" و عام εam (Arb.) "ساڵ" پێوەندی ئێتیمۆلۆژییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *sem-** *(IE.)* "هاوین".

**هاوێر1 hawer** [ *hāwer* ] - "لێک جیا کردنەوە (ی دایکە و بێچوو لە مێگەلدا)": بڕوانە ↑هەڵاواردن helawardın [هەڵ + ئاواردن]. وێ دەچێ ↑بێری berî ی ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**هاوێر2 hawer** [ *hāwer* ] - "1- لا، تەرەف 2- دەورووبەر": هاویر hawîr و هۆرە hore ش دەگوترێن. هاوێردۆر hawerdor مانای "هەرچوار دەور، هەموو لایەک" دەدا. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەوار hewar و چەند وشەیەکی دیکە کە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "لای سەرەوە" دەکەن.

**های hay** [ *hāy* ] - "ئاگا": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاگا aga. [هاگا haga ش دەگوترێ]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ئەها eha "وشەی ئاگادار کردنەوە".

**هایسان hayısan** [ *hāyısān* ] - "هەڵبوون، گرم بوون": ↑ئایسان ayısan یش دەگوترێ.

**هئە hıa** [ *hıā* ] - "وشەی نا گوتن بە زمانی زارۆک": دە زمانی ئاخافتنی ئەڵمانیشدا دەگوترێ: ıa [ئئە].

**هجۆل hıcol** [ *hıjol* ] - "1- بە پەڕەکراو، هەڵلاجی کراو 2- مووی قژن و بڵاو": خزمە دەگەڵ ↑هەلاجان helacan "راژان بە حەواوە" و ↑هەلجاندن helcandın "لێدانی پشم و لۆکە، هەڵلاجی کردن".

**هرتە hırte** [ *hırta* ] - "گەو، ئاڵقە، کەلەمچە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Kreis (G.)، krēt (MG.) "جەغز، دایرە"، krijt (Nl.) "مەیدانی شەڕ، زۆرانگا". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە kritzeln (G.) و krazen (G.) "رووشاندن، ڕنین، کڕاندن". مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکان دە بنەڕەتدا دروست کردنی جەغز بە کڕاندن لەسەر هەرد بووە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کڕاندن kırandın سەر بە ریشەی **< *gradi-** *(IE.)* "کڕاندن". وشەی قرص qors (P.) "حەب" [هەروەها قرص نان، قرص ماه دە فارسیدا] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و ئاماژە بە شتێکی خڕ و جەغزی دەکا.

**هرزا hırza** [ *hırzā* ] - "جۆرێک هەڵپەڕکێ": هۆرز horz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ هۆریزان horîzan "هەستان".

**هرمژاندن hırımjandın** [ *hırımžāndın* ] - خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑هرمە hırme، ↑قرمژن qırımjın [خرمژن xırımjın]، ↑گرمە *gırme* و هتد.

**هرمە hırme** [ *hırma* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑گرمە gırme [هرمین واتا گرماندن].

**هرووش hırûş** [ *hırūš* ] - "دوو جار ورد کردن": خزمە دەگەڵ ↑ورد wırd [هورد hurd].

**هرۆ hıro** - "ژیلەمۆ": خزمە دەگەڵ ↑ئارا ara "دەشت" [دە بنەڕەتدا: زەوی هیشک و سووتاو].

**هریشک hırîşk** [ *hırīšk* ] - "چێشتێکە لە ساوار و ماست ساز دەکرێ": خزمە دەگەڵ ↑هەریسە herîse.

**هزر hızır** *[ hızır ]* - "بیر، ژیری": هیزر hîzır و هژر hıjır یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە پێشگری هە he + زر zır. بنجی وشەکە خزمە لەگەڵ ↑ژیر *jîr*و ↑زیرەک zîrek. وشەی ratio (.L) "ئەژماردن، هەڵسەنگاندن، بیرکردنەوە" خزمە لەگەڵ ئەم وشانە. لە زمانی کوردمادیدا هەروەها چەندین وشەی وەک ↑هەزارە hezare، ↑هەژیر hejîr، ↑هەزیر hezîr "قرسان، خەمڵ" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**هش hış** - "1- دژوار، سەخت 2- ناوەرۆک": خزمە لەگەڵ ↑ئاش aş [لەبنەڕەتدا بە مانای "بەرد"].

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا چەندین ریشە هەن کە مانای "سەخت، رەق، بەرد" دەبەخشن. ئەو وشانەی لەم ریشانەوە هاتوون، لە لایەکەوە مانای "سەختی، ئاستەم، ئاستەنگ" دەبەخشن و لە لایەکیشەوە مانای "ناوەرۆک، کاکڵ". مانای دووەم لە بنەڕەتدا ئاماژەیە بە "ناوک، *رەقایی* ناو میوە" ("بەرد" یان "ئێسک"ی ناو میوە) و دواتر لەمەوە مانای ناوەرۆک پەیدا بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: "هەستی"، "قەوار"، "کاکڵ"، "کرۆک" و هتد].

**هشار hışar** *[ hıšār ]* - "کوێرەرێ بە ناو شاخ و بەردەڵاندا": خزمە لەگەڵ ↑هش hış "دژوار، سەخت".

**هشافتن hışaftın** *[ hıšāftın ]* - "قووتدان، هەڵقووڕاندن": دەشێ پێک هاتبێ لە↑هە he [پێشگر] + شافتن şaftın. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ saufen (.G)، sūfan (.OG)، zuipen (.Nl)، sup (.E) supa (.Sw)، Suppe (.G) "شۆرباو"، sou (.OG)، sēaw (.OE) "شیرە"، sūpa-h (.OIn) "شۆرباو"، sugere (.L)، saugen (.G) "هەڵمژین، هەڵمیسین" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > ***seu-** *(.IE)* "هەڵمژین، فڕ کردن، هەڵقووڕاندن". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زەواد zewad "چێشت، پێخۆر".

**هشاندن hışandın** *[ hıšāndın ]* - "لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هۆش hoş. [لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ "بیر" و "بیر کردنەوە"].

**هشتاری hıştarî** *[ hıštārī ]* - "نەزان، تێنەگەیشتوو": هش hış [↑هۆش hoş] + تاری tarî [↑تاریک tarîk]، واتا کەسێک کە هۆشی تاریکە، بە پێچەوانەی "رووناکبیر" .

**هشتە hışte** *[ hıšta ]* - "جێماگ، کەلەپوور": دەچێتەوە سەر↑ هێشتن hêştın [ئەو شتەی مردوو یان پێشینیان لەپاش خۆیان جێیان *هێشتووە*].

**هشکاندن1 hışkandın 1** *[ hıškāndın ]* - "هیشک کردن". هەروەها هشکیان hışıkyan هەیە بە مانای "هیشک بوون" [↑بڕوانە ↑هیشک hîşık].

**هشکاندن2 hışkandın 2** *[ hıškāndın ]* - "خشاندن، پێداساوین": شێوەیەکی دیکە لە خشکاندن xışkandın [بڕوانە ↑خوشین xuşîn].

**هشەک hışek** *[ hıšak ]* - "هەست، پێنج هەستی ئەندام": دەچێتەوە سەر ↑هۆش hoş.

**هفارە hıfare** *[ hıfāra ]* - "بن خەرمان، دەخڵێک کە لەپاش خەرمان هەڵگرتن دەنکەدەنکە ماوەتەوە و هەژاران دەیماڵن": دەشێ وشەکە پێوەندی بە چەمکی "ماڵین، ماشتن"ەوە هەبێ و مەبەست ئەو دەنکانە بن کە بە ماشتن کۆ دەکرێنەوە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی ە hı [پێشگری هە he] + فارە fare. کەرتی فارە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑وەروەرە werwere "شاپالۆخ، بەفرماڵ" و ↑پریواندن pırîwandın یان پرواندن pırwandın "(دەست) رێخشاندن"، reiben (.G)، riban (.OG) ، wriven (.MNl) "رێخشاندن". هەروەها خزمیشە دەگەڵ رفتن roftan (.P) یان روبیدن rūbīdan (.P) بە مانای "ماڵین، راماڵین" و هەروەها پارو

paru (P.) "بەفرماڵ". ئەم وشانەی سەرەوە دە کۆندا خاوەنی فۆتیمی w بوون لە سەرەتای وشەکاندا و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *wer- >** "سووراندن". دە وشەکانی "پریواندن"ی کوردمادی و پارو paru (P.) فارسیدا فۆتیمی w گۆڕاوە بۆ p.

**هڤێز hıvez** *[ hıvez ]* - "چنینەوەی بە تەقەڵ کە دیاری نەکا": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هێڤک hêvık "پینەی کونی چەرم و پێستە بە دارۆکە"، ↑هیفگە hîfge "تیفەک" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑ئیپە îpe دا هاتوون. هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە "(لێک) بەستن، پێوە نووساندن، قایم کردن" دەکەن.

**هلاب hılab** *[ hılāb ]* - "مانگی چاردە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑گڵۆپ gılop.

2- ↑کولیچە kulîçe و هەروەها بە Laib (D.)، hleib (OG.)، hlaifs (Gt.)، hlāf (OE.)، chleb (Rus.) گشتیان بە مانای "نان"، سەر بە ریشەی **(IE.) kloibho- >** "نانی سوورکراوە لە تاوەدا".

لەم تێڕوانینەوە "مانگی چاردە" دەشێ بە نانی خڕ یان کولێرە چوێنرابێ.

[تێبیی: دە زمانی فارسیدا وشەی "**قرص**" هەم بۆ "نان" و هەم بۆ "مانگ" بەکار دەهێنرێ [**قرص** نان، **قرص** ماە] . وشەکە لە هەر دوو جێدا ئاماژە بە "خڕایی و گرد بوون" دەکا].

**هلاندن hılandın** *[ hılāndın ]* - "هەڵ هێنان، بڵیند کردن": هلەە hıleh "بڵندی" و هلەهتن hılehtın "بڵند بوون" بەکار دێن. دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *al- >** "هەڵدان، گەورە بوون، بەرز بوون". خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەرە1 here دا باس کراون کە دەبێتە "نیشانەی ئاوەڵناو لە دۆخی باڵاتریندا" [هەرەباش، هەرەجوان].

**هلبەرین hılberîn** *[ hılbarīn ]* - "ئیجاد، بەدی هاتن، بەرهەم هاتن": [میکرۆب ژ کرێتی یی تێنە هلبەرین، واتا میکرۆب لە پیسایی پەیدا دەبن]. کردارەکە پێک هاتووە لە پێشگری هل hıl [هەڵ hel] + بەرین berîn. کەرتی ئەسڵی وشەکە دەچێتەوە سەر ↑بەر ber "حاسڵ، بەرهەم".

[تێبینی: لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وێڕای ئەم وشەیە، وشەکانی هلبەر hılber " ئیجاد، حاسڵ" و هلبەرێن hılberên "بەدی هێنەر"یش هاتوون، بەڵام ئاماژە بە کردارێک وەک "هل بەراندن" نەکراوە. لەوە دەچێ وشەی "هلبەرێن" بۆ کردارێکی لەم چەشنە بگەڕێتەوە، وەک "هەڵبەزاندن و هەڵبەزێن"].

**هلبەهین hılbehîn** *[ hılbahīn ]* - "دەرپەڕین، بە پەلە دەر کەوتن": هل hıl [ hel ] + بەهین behîn. خزمە لەگەڵ ↑بەزین bezîn [هەڵ بەزین] و ↑*بزوان bızwan*.

**هلپرژین hılpırjîn** *[ hılpıržīn ]* - "بە چنگان پێ هەڵچوون وەک هەڵچوونی پشیلە بە داردا": هلپەرکین hılperkîn یش دەگوترێ. هل hıl [هەڵ hel] + پرژین pırjîn. کرداری "پرژین" یان "پەرکین" دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑پەڕین perîn. بەم پێیە وشەکە لە بنەڕەتدا ئاماژەیە بە "وەسەر دار و دیوار پەڕین".

**هلپەکاندن hılpekandın** *[ hılpakāndın ]* - "لەت لەت کردن، قەڵش قەڵش کردن": خزمە لەگەڵ ↑پاچین paçîn [هەڵپاچین].

**هلپەنگرین hılpengrîn** *[ hılpangrīn ]* - "هەڵتۆقین": هل hıl [هەڵ hel] + پەنگرین pengrîn. کرداری "پەنگرین" جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Wange (G.)، wang (Nl.)، wange (OE.)، vangi (OIs.) "ڕوومەت، گۆنا". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام مانای بنەڕەتی وشەکە وەک "چەماوی" دەست نیشان کراوە.

**هلپی hılpî** [ *hılpī* ] -"هەنیسک، گریانی بە کوڵ": هەروەها هلپایش hılpayış هەیە بە مانای "گریانی بە کوڵ، هەنیسکی پاش گریان": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:
1- Welpe (G.)، welp (Nl.)، whelp (E.)، valp (Sw.) "بێچووی سەگ، رێوی، گورگ". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا بە مانای "قیژەکەر، قروسکەکەر"ن و وشەی ↑گورپە2 *gurpe* "پشیلەی تیر"یش دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.
2- ↑قولپ qulp [لە قوڵپی گریانی دا].

**هلساندن hılısandın** [ *hılısāndın* ] - "وێران کردن، تەرت و تونا کردن": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەرستین herıstîn "ورد و خاش کردن، پێ رێخستن".

**هلستن hılıstın** - "بەستنەوەی گۆلک و چێل بە گوریس": دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری هل hıl [هەڵ hel] + ستن sıtın. کرداری "ستن" دەشێ خزم بێ لەگەڵ Saite (G.) "ژێ، تاڵ"، sāda (OE.) "پەت، هەوسار"، seiđr (OIs.) "گوریس، پەت"، syáti (OIn.) "دەبەستێ"، sētu-h (OIn.) "پەت، بەند"، siĕtas (Lit.) "گوریس"، saĭtas (Lit.) "کۆت، بەند، تەناف"، set (Rus.) "تۆڕ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *siu- ,* sei-* (IE.)** "بەستن، لێکبەستن" و دەبنە خزم لەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی وەک ↑شەتەک şetek [دان].

**هلشیان hılşîyan** [ *hlšīyān* ] - "هەڵوەشان، لێک جیا بوونەوە": پێشگری هل hıl [هەڵ hel] + شیان şîyan. هەروەها هلشاندن hılşandın هەیە بە مانای "هەڵوەشاندن". خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشەی بە مانای "لەت بوون، (لێک) جودا بوونەوە"، وەک ↑ژێ je، ↑جیا cîya، ↑شی *şî* کردنەوە و هتد.

**هلف hılıf** [ *hılıf* ] - "دەسگیران، دۆستی ژن": هەروەها ↑لف *lıf* هەیە بە مانای "ئاواڵ دوانە" و ↑هاولف hawlıf "هاواڵ، ئاواڵ دوانە".

**هلکەوشاندن hılkewšāndın** [ *hılkawšāndın* ] - "1- لێکۆڵینەوە 2- پشکنین": هلکەواشتن hılkewaştın یش دەبێژن. پێشگری هل hıl [هەڵ hel] + کەوشاندن kewšāndın یان کەواشتن kewaştın. دەچێتەوە سەر ↑کەفش kefiş "پەیدا، خویا".

**هلگاڤتن hılgavtın** [ *hılgāvtın* ] - "بڵند کردن، بەرز کردنەوە، هەڵگرتن و لا بردن": پێشگری هل hıl [هەڵ hel] + گاڤتن gavtın. رەگی کردارەکە بریتییە لە گاڤ- gav- و کردارەکە خزمە دەگەڵ heben (G.)، heffann (OG.)، heave (E.)، häva (Sw.) "بەرز کردنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ capere (L.) "گرتن، هەڵگرتن، وەرگرتن"، سەر بە ریشەی **< *kap-* (IE.)** "گرتن". هەروەها هەڵیسەنگێنە دەگەڵ ↑قەپان qepan "تەرازووی هەڵکێشان".

**هللوور hıllur** [ *hıllūr* ] - دەگەڵ "بللوور" دێ [هللوور بللوور hıllur bıllur گەمەیەکی زارۆکانە]. خزمە دەگەڵ ↑هلوو hılu [یان ↑حولی ĥûlî] "لووس، ساف". مەبەست لە "هللوور بللوور کەتانە" لەوانەیە کەتانێک بێ کە وەک بلوور ساف و لووسە.

**هلوو hılu** [ *hılū* ] - "لووس": حولی ĥulî یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ↑خلیسک xılîsk و دە شێوەزارەکانی زمانی کوردمادیدا شێوەی هلیسکان hılîskan یش هەیە لەباتی ↑خلیسکان xılîskan.

**هلەه hıleh** [ *hılah* ] - "بڵندی، هەوراز": خزمە دەگەڵ ↑هلاندن hılandın "هەڵهێنان، بڵیند کردن".

**هلەهتن hılehtın** [ *hılahtın* ] - "بڵیند کردن": شێوەیەکی دیکە لە ↑هلاندن hılandın.

هلهلەک **hılhılek** [ *hılhılak* ] - " بەری دارێکە وەک گوێژەزەردەی درشت دەچێ": هەروەها هلهلۆک hılhılok هەیە بە مانای "بەڵاڵووکە کێویلە". زالزالک zālzālek (P.) "گوێژە، گیوژ". خزمە لەگەڵ زەر zer [↑زەرد zerd]، gelb (G.)، geel (Nl.)، yellow (E.)، gul (Sw.)، hári-h (OIn.)، helvus (L.) "زەرد"، chlōros (Gr.) "سەوزی ئاماڵ زەرد"، سەر بە ریشەی > *ĝhel- *ĝhlē-, (IE.) "درەوشانەوە". لەم وشەیدا ئاماژە کراوە بە رەنگی زەردی بەرهەمەکە و وشەکە پێک هاتووە لە دووبارە بوونەوەی بنجێک و پاشگری گچکاندن.

هڵێن **hılen** [ *hılen* ] - "جنۆکە، دێوەزمە": خزمە دەگەڵ ↑ئاڵ al [ئال و شەوە].

همهم **hımhım** - "مرقەمرقی بەرازان": خزمە دەگەڵ ↑هەوهەو hewhew و ↑گمین gımîn [گماندن gımandın] "دەنگ کردنی کۆتر".

هنارە **hınare** [ *hınāra* ] - "وەڵام ناردن بە هێما، بە ئاگر یان ئاڵا": دەشێ پێوەندی هەبێ بە هنارتن henardn [هەناردن، ↑ناردن nardın].

هنجاندن **hıncandın** [ *hınjāndın* ] - "پاک کردنەوەی بیر لە پڕ و پووش و ئاوی پیس": پێشگری هەن hen + جاندن candın. خزمە لەگەڵ ↑کەندن[1] kendın [هەڵکەندن].

هنجراندن **hıncırandın** [ *hınjırāndın* ] - "لەت و پەت کردن": پێشگری هەن hen + جراندن cırandın [↑جڕان cıran "دڕان"]

هنجک **hıncık** [ *hınjık* ] - "پۆشاک": شێوەیەکی دیکە لە ↑کنج kınc.

هند **hınd** - "لا، ئاڵ": خزمە دەگەڵ ↑حاند ħand.

هنداڤ **hındav** [ *hındāv* ] - "رووبەڕوو، بەرانبەر 2- لەپەنا، لەکن": خزمە دەگەڵ ↑حاند ħand.

هنداق **hındaq** [ *hındāq* ] - "هاوتا": خزمە دەگەڵ ↑تاک tak [هەنتاک hentak: هە he + ن n + تاک tak].

هندکاندن **hındıkandın** [ *hındıkāndın* ] - "کەم کردنەوە": دەچێتەوە سەر ↑هێندێک hendek.

هندور **hındur** - "ناوەوە": خزمە دەگەڵ اندر andar (P.)، antar (Av.)، inter (L.)، antar (OIn.) "لەناو، دەتیوان". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای وشەکە بڕێک جیاوازە: unter (G.)، under (E.) و under (Sw.) "لەژێر، لەبن". وشە ئەڵمانییەکە بە هەردوو مانا بەکار دێ، هەم "لەتیوان" و هەمیش "لەژێر". سەبارەت بە ریشەکە بڕوانە پرێپۆزیسیۆنی ↑دە[2] de [دە وێدا].

هندۆک **hındok** - "بسکویت، گەڕگەڕی": دەشێ خزمە دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn.

هندووی **hnduy** [ *hındūy* ] - "جۆرێک ترێ": لە فارسیدا هندوانە hendewāne (P.) مانای "شووتی، شفتی" دەدا و انگور angūr (P.) یش مانای "ترێ". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn.

هندەف **hındef** [ *hındaf* ] - "رووبەڕوو، بەرانبەر": خزمە دەگەڵ ↑حاند ħand [لەحاند واتا لەبەرانبەر، لە پێش] و ↑هەنێ hene "ناوچەوان، روو".

هنف **hınıf** - "بەژن باریک": خزمە دەگەڵ ↑کەنەفت keneft "پەرێشان، کەلەلا" و هەروەها دەگەڵ knapp (G.) و (Nl.)، hneppr (OIs.) "کەم، تەنگ"، hneppa (OIs.) "رێکگوشین، تەنگاو کردن". دەشێ "هنف" سەرەتا بە مانای "تەنگ" و دواتر "کەمەرتەنگ" بەکار هاتبێ.

هنگ **hınıg** - "حیلکە، پێکەنین": دەچێتەوە سەر ↑کەنین kenîn [پێکەنین]. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑حەنەک ħenek "گاڵتە، جەفەنگ".

هنگو ونگ **hıngûwıng** [ *hıngūwıng* ] - "شکۆ و دەبدەبە": [مرۆڤەکی بهنگو ونگە]. هنگ hıng دەشێ پێوەندی هەبێ بە هەنگ heng [↑ئاهەنگ aheng] بە مانای "دەنگ و هەرا". ونگ wıng

یش شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بانگ bang. بەگشتی مەبەست کەسێکە کە دەوروبەری پڕ لە حەشیمەت و پڕ لە دەنگەدەنگە.

[لەباری پێوەندی دوو چەمکی "دەنگ و هەرا" و "شکۆداری" هەڵی سەنگینە لەگەڵ "سەنتەنە" و "دەبدەبە"].

**هنۆهنۆ hınohıno** - "کەم کەمە": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑کن2 kın "کەم، کورت".

**هوڕ hur** - "دەنگی تەوژمی ئاو": [شڵپ و هوڕ]. هوڕین hurîn یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑خوڕ xur و ↑خوڕین xuren "بەتەوژم (بۆ چەم و ئاوان)". ئەم وشانە سەرەتا بە مانای "تەوژم، بە تەوژم" بەکار هاتوون، خزمن لەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑خار xar "سەخت" و ↑خورت xurt "بەهێز"، دەچنەوە سەر ریشەیێک بە مانای "سەخت، پتەو"، پاشان مانای دەنگیان پەیدا کردووە، واتا دەنگی ئاوێک کە بەتەوژم دەڕوا، یان ڕەوتێکی خورت و بەهێزی هەیە.

[تێبینی: لە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە مانای دەنگێک دەبەخشن، کەچی ئەم وشانە لە بنەڕەتدا مانای شتێکیان هەبووە کە دەنگەکە لەوەوە پەیدا بووە، واتا ماناکە لە خودی شتەکەوە گۆڕاوە بۆ دەنگی شتەکە. چەند دانە لەم دەنگانە بریتین لە "شڵقە"، "فڵقە"، "وژ(ژ)ە"، "تەقە"، "شەقە"، "کز(ز)ە"، "تەپە (تەپپە)"، "هانکە" و هتد. هەر کام لەم وشانە دەچێتەوە سەر ریشەیەکی هیندوئەورووپی کە مانایەکی تایبەتی هەیە، بۆ وینە "هانکە" خزمە دەگەڵ "خنکان" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تەنگ بوون، بەرتەنگ بوون"].

**هورباندن hurbandın** *[ hurbāndın ]* - "گۆرانی گوتن لەبەر خۆ، ویرەویر": خزمە دەگەڵ ↑گورپە2 gurpe "پشیلەی نێر" [لە بنەڕەتدا بە مانای "مڕەکەر، قیژەکەر"]. مەبەست لە "هورباندن" لەبنەڕەتدا "دەنگ و هەرا" کردنە. لێرەدا وشەکە "دەنگ و هەرایەکی سەبر" مانا دەدا، بەڵام دەشێ دە بنەڕەتدا بەگشتی بە مانای "دەنگ و هەرا کردن" بووبێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑هورپ(ە) hurp(e) "چەقە و گوڕە".

[تێبینی: ئەو ریشانەی مانای "دەنگ و هەرا کردن" دەبەخشن، هێندێک جار وشەیان بە مانای "دەنگ و سەدای" کز لێ دەکەوێتەوە و هێندێک جاریش بە مانای "دەنگ و هەرای" بڵیند، بۆ وێنە "ویرەویر" بە مانای هورباندن واتا گۆرانی گوتنی لەبەرخۆ دێ، کەچی ئەم وشەیە شێوەیەکی دیکەی هەیە کە دەبێتە "وێرەوێر" بە مانای "زۆڕەزۆڕی گریان". یان "لۆرین" مانای "گۆرانی لە بەرەخۆوە" دەبەخشێ، کەچی "لووراندن" دەبێتە "چەق و هەرای گورگ". هەروەها "قسە" دەنگ کردنێکی ئاساییە، کەچی "گاز" کردن دەبێتە "دەنگ هەڵبڕین"].

**هورپ(ە) hurp(e)** *[ hurp(a) ]* - "چەقە و گوڕە": [هورپەهورپ hurpehurp]. بڕوانە ↑هورباندن hurbandın.

**هورم1 hurım 1** - "سەڵت، بێ ژن": خزمە دەگەڵ arm (G.)، (Sw.) arms، (Gt.) earm (E.) "هەژار، بێچارە". ئەم ئاوەڵناوە دە بنەڕەتدا بە مانای "بێکەس، هەتیو، ڕەبەن، تاک ماو" بەکار هاتووە و خزمیشە دەگەڵ orphanós (P.) "هەتیو"، orb (arm.) "هەتیو"، árbha-h (OIn.) "بچووک، لاواز"، Erbe (G.) "میرات". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *orbho-** "هەتیو، هەتیو مانەوە". دەشێ وشەی ↑ڕەبەن reben پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و شێوەکەی بەتایبەتی نیزیکە لە وشە یۆنانییەکە.

**هورم2 hurım 2** - "1- ودم، پیرۆزی 2- ئیعتیبار، جێباوەڕی": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Ehre (G.)، ēra (OG.)، eer (OE.)، ār (Nl.)، eir (OIs.) "ڕێز و ڕوومەت، وەرج، ئیحتیرام، ئیعتیبار"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *ais-** "بەڕوومەت بوون، بە ئەدەب بوون، ڕێز دانان". هەروەها هەڵی

سەنگینە لەگەڵ ↑ئێرەیی ereyî "حەسوودی". لەوە دەچێ "مانای بنەڕەتی "ئێرەیی" بەرز نرخاندنی کارێک بووبێ، بەشێوەیەک کە مرۆڤ حەزی کردووە خۆشی کارێکی وەسا بکا و پاشان لەمەوە مانای "حەسوودی" پەیدا بووە. وشەی حرمة (Arb.) ħurma(t) دەشێ لەم وشە کوردمادییە وەرگیرابێ.

**هورمان hurman** [ *hurmān* ] - "لێرەوار، جەنگەڵ": بنجی وشەکە دەشێ هورم hurm بێ و پاشگری an پێوەی لکاوە، وەک وشەکانی تەختان، تمتمان، راستان و هتد. بنجەوشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گورگ gurg، سەر بە ریشەی ***uel-*** **(IE.)** "جیا کردنەوە، لێکردنەوە، دادڕین، پچڕینەوە، رفاندن".

[تێبینی: وشەی "لێرەوار"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە هەمان مانای سەرەوە و بۆ وێنە خزمە دەگەڵ "لەوەڕ" و "لەت". مەبەست لە "هورمان" یان "لێرەوار" ئەو شوێنەیە کە پەلک و گەڵای داران بۆ لەوەڕ لێ دەکرێتەوە].

**هورووژان hurujan** [ *hurūžān* ] - "شڵەژان یاخود بزواتیکی توند و خێرا": ↑ورووژان wırujan و هارووژان harujan یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ rühren (G.)، (h)ruoren (OG.)، hrēran (OE.)، hrēra (OF.)، roeren (Nl.)، röra (Sw.) "تێکەڵ دان، لێکدان، تێکوەردان"، سەر بە ریشەی **< -*ker** **(IE.)** "تێکوەردان، شڵەقاندن". چەندین وشەی دیکەش پێوەندی بەم ریشەیە پەیدا دەکەن، وەک srīnati (OIn.) "تێکەڵ دەکا"، kerannynai (Gr.) "لێکدان و تێکەڵ کردن". دە زمانی ئاڵمانیدا وشەکە، هەر وەک زمانی کوردی، بۆ "شڵەژان و بزوانی دەروونی"یش بەکار دێ. وشەی ↑خرۆشان xıroşan یش دەشێ پێوەندی بەم وشەیەوە هەبێ. فۆتیمی j دە وشەکەدا دەبێ هەر ئەو ناوگرە بێ کە دۆخی جەخت کردن دروست دەکا، وەک لەم وشانەدا: پرژان، چرژان، لوکژین، لەپژین، لۆقژین و هتد.

**هورووژم hurujım** [ *hurūžım* ] - "هێرش": خزمە دەگەڵ ↑هێرش heriş.

**هورە hure** [ *hura* ] - "کای ورد": خزمە دەگەڵ ↑*هارین* *harîn* و ↑هورد hurd و ↑هارە hare و چەندین وشەی دیکە.

**هوڕە hure** [ *hura* ] - "پەمۆی هەللاجی کراو، پەمۆی هەڵپفاو": [وەک هوڕەی لۆکە نەرمە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑وڕڕە3 wırre "پەمۆی تازە هەللاجی کراو".

**هوڕەبا hureba** [ *hurabā* ] - "بای سارد و توند": هوڕە hure + ↑با ba. کەرتی هوڕە خزمە دەگەڵ ↑وڕ wır "گێژ" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "سووڕان و با دران" دەکەن. بەم جۆرە وشەکە دەبنەڕەتدا بە مانای "گێژەڵووکە، تۆفان" بووە.

**هوریا hurya** [ *huryā* ] - "هاواری شادمانی": هورا hūrrā (P.)، hurra (G.) بە هەمان مانا. وشە ژێرمەنییەکە گومان دەکرێ پێوەندی هەبێ بە hurren (MG.) "خۆ با دان، توند جووڵانەوە". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ئەڵمانییە باس نەکراوە.

**هوڕین hurîn** [ *hurīn* ] - "دەنگی ئاوی زۆر بە تەوژم": خزمە لەگەڵ ↑خوڕین xuren "بەتەوژم" (بۆ چەم و ئاوان).

**هوژم hujım** [ *hužım* ] - "تەکان، بزاڤ": دەچێتەوە سەر ↑هەژان hejan "بزوان (ی توند)".

**هوژەم hujem** [ *hužam* ] - "رەوەبەران، گەلەبەراز": خزمە دەگەڵ ↑هووژە huje "بەگەل دەرچوونی مێروولە".

**هوسک husık** - "هیشک": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑هیشک hîşık.

**هوسکوو husku** [ *huskū* ] - "رەڵماوی، خیزەڵان": دەچێتەوە سەر ↑هوسک husık "هیشک".

هوڵل **hull** - "دەمی نیوەرۆ(ژ)": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هوڵلا hulla "کڵاورۆژنە".

هوڵلا **hulla** [ *hullā* ] - "کڵاورۆژنە": خزمە دەگەڵ (Gr.) helios، (Sw.) sol، (L.) saule، ↑خۆر xor [یان هۆر hor] "رۆژ، هەتاو".

هوڵف **hulıf** - "کونی زۆر گوشاد": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هۆڵ hol.

هولنگ **hulıng** - "تراو، شل": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ول wıl [شل و ول].

هوڵوو **hulu** [ *hulū* ] - "کۆخ": هلو (P.) holū. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑شەلیل şelıl "میوەی خزمی هڵوو"، (G.) Schlehe، (Nl.) slee، (E.) sloe "میوەیەکە وەك قەرەلوو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)li- <** "ئاماڵ شین". (Rus.) sliva "هەڵووچە" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە.

2- (Gr.) glycys "شیرن" و (Arb.) ħulwe "شیرن". دەشێ وشەی ↑شیرن şîrın دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە سەر بە ریشەیەکی هاوبەش بن. سەرنجی وشەی شیرşîr، شیرە şîre [شیلە şîle] و شیرن şîrın دە زمانی کوردمادیدا بدە و هەڵی سەنگێنە دەگەڵ (Gr.) glykos "شیرن" و (Gr.) "شیر".

3- ↑ئاڵوو alu [دە وشەکانی "ئاڵووباڵوو" یان "هەڵووژە"دا].

هولوولی **hululî** [ *hulūlī* ] - "1- وازوازی 2- نائارام، ئۆقرە نەگر 3- مەزەبێکە پەیڕەوانی لایان وایە پاش مەرگ گیانیان دەچێتە بەر زیندەوەرێکی دیکە": بە هەموو ماناکانەوە دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *uel- , *wel- <** "سووران، با دران". دەبێتە خزم لەگەڵ ↑هۆڵ2 hol "1- کرێوە و مژ 2- مزراق"، ↑حۆل ħol "گێژ"، ↑وێڵ wel "سەرگەردان" و هتد. سەبارەت بە مانای سێهەم، پێوەندی هەیە بە وشەی حلول **ħulūl** (Arb.) لە زمانی عەرەبیدا. لەوانەیە وشە عەرەبییەکە لە کوردمادی وەرگیرابێ. خۆ ئەگەر وشەکە بە ئەسڵ عەرەبی بێ، چۆن دەتوانێ مانای "وازوازی، بێ ئۆقرە"ی لە زمانی کوردمادیدا پەیدا کردبێ؟ مانای بنەڕەتی وشەکە، وەك باس کرا، "سووڕان"ە، لەمەوە هەروەها مانای "گۆڕان" یان "وەرسووڕان" پەیدا بووە. بەم جۆرە مانای سێیەم لەوەڕا هاتووە کە شێوەیەك وەردەسووڕێتە سەر شێوەیەکی دیکە، بۆ وێنە گیانی مرۆڤێك پاش مردن وەردەسووڕێتە سەر شێوەیەکی دیکە، لە لەشێکەوە بۆ لەشێکی دیکە. وشەی "گوڕان"یش دە بنەڕەتدا هەر ئەم مانایە دەبەخشێ و ئەمەیان دەچێتەوە سەر ریشەیەکی نیزیك لەوەی سەرەوە، واتا ریشەی *(IE.) *uer-, *wer-* "سووڕان، با دران".

هولیسك **hulîsk** [ *hulīsk* ] - "زمان لووس، کلکەسووتکەر": هەروەها "هولیسکی" هەیە بە مانای "زمانلووسی، کلکەسووتە"، خزمە دەگەڵ ↑حولی ħulî "داردەستی لووس" و ↑*خلیسکان* *xılîskan*.

هولیلك **hulîlk** [ *hulīlk* ] - "1- سەقر، پەلەوەرێکی راوکەر2- خەرتەل": خزمە دەگەڵ Eule (G.)، huwila (OG.) "کوندەبەبۆ". ئەم وشانە لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑هۆلین holîn "قوولە کردن، زیقاندن، گریانی توند".

هوم **hum** - "بێفەڕی":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑شووم şûm و دواتر ↑*شێو* *şêw* "بوومەلێل، بەرەو تاریك بوون". هەروەها خزمە لەگەڵ ↑هۆمەیی homeyî "پەزی بۆری تاریك".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە هێندێك وشە کە مانای "شاردنەوە، داپۆشین" دەبەخشن، وەك ئەو وشانەی لەژێر ↑جامە came دا باس کراون.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک دە نێوان دوو چەمکی "داپۆشین، شاردنەوە" و "تاریکی، رەشایی"دا هەیە، لەم بارەوە بۆ وێنە بڕوانە وشەی "کوێر، کۆر" کە خزمە دەگەڵ "ژوور" [شوێنێکی داپۆشراو، یان شوێنێک بۆ پەنا گرتن و تاقەت کردن"، یان بڕوانە وشەی "چرسین" بە مانای "رەشکەو پێشکە کردنی چاو". ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ "شاردنەوە"].

**هومایل humayıl** [ *humāyıl* ] - "پارچەی سپی کە دەکرێتە کراس": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ئەو وشانەی کە لەژێر ↑جامە came "جلوبەرگ"دا باس کراون.

**هومە hume** [ *huma* ] - "کووپە": هۆمە home ش دەگوترێ. خم xom (.P) "کووپەی گڵ". دەشێ شێوەی کۆنتری ↑خم xım بێ. دە زمانی کوردمادیدا خم مانای ئەو رەنگە شینە دەدا کە خام و بەنی پێ رەنگ دەکەن. لەوانەیە مەبەست لە "خم"ی کوردمادی دە بنەڕەتدا ئەو کووپە گڵینە گەورەیە بووبێ کە رەنگاوەکەیان تێدا دروست کردووە و خام و بەنەکەیان تێ هەڵکێشاوە.

**هومێد humed** [ *humed* ] - "هیوا": ↑ئومێد umed یش دەگوترێ. امید omīd (.P). هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هیوا hîwa [هێڤی hevî].

**هوندور hundur** - "هەناو، ناوەوە": هندور hındur یش دەگوترێ. هەروەها ↑دەروون derun هەیە کە گرێدراوی ئەم وشەیە. اندر andar (.P)، اندروون andarūn (.P) و درون derūn (.P). خزمە دەگەڵ unter (.G)، untar (.OG)، under (.E) و (.Sw)، undar (.Gt) "لە ژێر"، antár و inter (.L) "لەناو". دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە مانای "لەناو"یش دەدا ، بۆ وێنە unter (.OIn) der Menschen واتا "لەناو مرۆڤەکاندا". پرێپۆزیسیۆنی ↑دە de [دە هاویندا، دە قساندا، بە فارسی در dar (.P)] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**هونژین hunjîn** [ *hunžīn* ] - "وەنەوز دان، سووکەخەو کردن": هەروەها هونژەک hunjek دەگوترێ بە مانای "وەنەوز". خزمە دەگەڵ ↑وەنەوز wenewz و ↑نووستن nustın.

**هونەر huner** [ *hunar* ] - "زانست یان توانایی لە بواری جوانکاریدا": هەنەر hener یش دەگوترێ. هنر honar (.P). خزمە لەگەڵ Kunst (.G)، kunst (.OG) "هونەر". وشە ئەڵمانییەکە خزمە لەگەڵ können (.G) "توانین". بەڵام مانای بنەڕەتی ئەم کردارە "زانین، ناسین"ە و خزمیشە لەگەڵ ↑زانین zanîn و ↑ناسین nasîn [شناسین şınasîn] لە زمانی کوردمادیدا. وشە kunst سەرەتا بە مانای گشتی "فەن، *لێزانی*" بەکار هاتووە و دواتر ماناکەی بووەتە "هونەر"ی ئەمڕۆیی. دەشێ لە زمانی کوردمادیشدا هەر ئەم رەوتە لە گۆڕێدا بووبێ. لە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئەم وشانەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە پەیدا دەکەن: kühn (.G) "بوێر"، kuoni (.OG) "بوێر، بەهێز"، koen (.Nl) "بوێر، بەجەرگ"، keen (.E) "توند و تۆڵ، بەورە"، ka nn (.OIs) "زیرەک، زرینگ". دە زمانی کوردمادیدا بەرانبەری ئەم وشانە ↑شێنا şêna دەوەستێ.

**هویر huwîr** [ *huwīr* ] - شێوەیەکی دیکە لە ویر wîr "بیر" [↑بیر bîr].

**هوین huwîn** [ *huwīn* ] - ↑هەڤوتن hevotın.

**هویل huwîl** [ *huwīl* ] - "ئاگا": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هویر huwîr "بیر".

**هوێزی1 huwezî** [ *huwezī* ] - "جۆرێک تیزەی شەڕ": خزمە لەگەڵ ↑گوێزان guwezan [guwezan] "تیخی موو تاشین".

**هوێزی2 huwezî** [ *huwezī* ] - "1- باقەی گیا 2- دەسکەگوڵ": مانای ئەسڵی وشەکە دەبێ "باقە، چەپک" بێ و خزمە لەگەڵ ↑هێشوو hêşû.

هوو **hu** [ *hū* ] - سەبارەت بە کەسێکی وردبین دەبێژن "هوو لە موو جیا دەکاتەوە". دیارە "هوو" دەبێ شتێك بێ لە چەشنی "موو" کە زۆر لەو بچێ و جیا کردنەوەی هاسان نەبێ. دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑هۆجەنە hocene دا باس کراون. هێندێك لەم وشانە مانای "داو، بەن، تاڵ" دەبەخشن.

هووپ **hup** [ *hūp* ] - هووپ کردن واتا "باز دان (لە بڵێندییەوە)":

1- لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ Hupf (G.)، hüpfen (G.)، hüppen (Nl.)، hop (E.)، hoppa (Sw.) "باز دان، هەڵبەزین، خۆ هەڵاویشتن". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ hoffen (G.) و hope (G.) و ↑هیوا hîwa [هێڤی hevî]. مەبەست لە هیوا کردن دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "خۆ هەڵاویشتن لە چاوەنواڕیدا" [بێقەراری؟]. بەپێی بۆچووتێك ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *keu- >* "چەمانەوە". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑کێو kew [کێف kef، کۆ ko] و ژمارەیەك وشەی دیکە.

2- لەوانەشە وشەکە پێوەندی هەبێ دەگەڵ ریشەی *(IE.) *up(o)-, *eup- >* "لەژێرەوەڕا بەرەوە سەرەوە". سەبارەت بەم ریشەیە بڕوانە وشەی ↑حندرحۆ ħındırħo.

هووت1 **hut 1** [ *hūt* ] - "نم، تەڕایی": خزمە دەگەڵ wet (E.)، wa t (OE.) "تەڕ"، هەروەها water (E.) "ئاو" و چەند وشەیەکی کوردمادی وەك ↑وەشتەی weştey "باران" و لەوانەشە ↑خوە xoh "عارەقە".

هووت2 **hut 2** [ *hūt* ] - دەگەڵ "هەیت" heyt دێ [هەیت و هووت]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ode (Gr.) "گۆرانی".

[تێبینی: چەمکی گۆرانی و هاوار کردن پێوەندی نیزیکیان پێکەوە هەیە، بۆ وێنە بەراوردی دوو وشەی هانا hana "هاوار" و ئاهەنگ aheng "گۆرانی" بکە کە هەردووکیان لە ریشەیەکەوە هاتوون].

هوود **hud** [ *hūd* ] - "زاکوون، زەبروزەنگ لە فەرمانڕەواییدا": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Wut (G.)، wuot (OG.) "تووڕەیی"، wōds (Gt.) "تووڕە، شێت، سەرسەری"، woutan (OG.)، wōden (OE.)، Odinn (OIs.) ناوی یەکێك لە خوداکان [دە بنەڕەتدا: خوای تووڕە، دێوەزمە]. هەر لەم پێوەندییەدا wüterisch (G.) وەك هاومانای tyrran و despot "زۆردار، فەرمانڕەوای بەزەبر و زەنگ" بەکار هاتووە.

[تێبینی: wōd (OE.) و ōđr (OIs.) کە هەر لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدان، بە مانای "هونراوە، هونەری هۆنینەوە" [شێعر و شاعیری] بەکار هاتوون. ئەم وشانە دە زمانی ئەڵمانیدا وەك Dichtung "هونراوە" و Dichtkunst "هونەری هۆنینەوە" مانا کراونەوە. وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر وشەی dicht بە مانای "چڕ و پڕ، توند، پەیت". وەك دەبینین لە زمانی ئەڵمانیدا "شێعر و شاعیری" بریتییە لە چڕ کردن و پەیت کردنی وشەکان کە ئەمەش پێوەندی بە چەمکی "سەختی، هێز"ەوە هەیە کە لەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە بە مانای "زۆردار و بە زەبر و زەنگ" یەك دەگرێتەوە.

[تێبینی: هەر ئەم پێوەندییە لە زمانی کوردمادیشدا بەدی دەکرێ. وشەی بەیت (چیرۆکی هۆنراو)خزمە دەگەڵ "پەیت" و "پتەو" و "پیتاندن" و هەروەها خزمە لەگەڵ despot "زۆردار، فەرمانڕەوای بەزەبر و زەنگ" و potens "بەهێز" لە زمانی لاتینیدا. مەبەست لە "بەیت" دەشێ هەمان "هونراوە"، واتا بێژەیەکی پەیت و چڕ و پڕ بێ. ئەم وشە کوردمادییە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە بیت bayt (Arb.) "دێرەهۆنراوە"].

**هوور1 hur 1** [ *hūr* ] - "ورگ": هەر لەم پێوەندییەدا چەند وشەی دیکە سەرنج رادەکێشن کە بریتین لە عوور εur، عرگ εırk، هورگ hurg، ↑ورگ wırg، هۆڵدان holdan، ↑هۆڵمان holman. مانای گشت ئەم وشانە بریتییە لە "ورگ". وشەکە خزمە دەگەڵ schwelgen (G.)، swelgan (OG.)، zwelgen (Nl.)، swallow (E.)، svälja (Sw.) "هەڵلوشین، قووت دان"، svalg (Sw.) "قورگ"، swellen (MG.) "تێر و تەسەل ژیان کردن"، swill (E.) "هەڵقوراندن، هەڵلوشین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *suel- (IE.)** "خواردن، خواردنەوە، هەڵلوشین". دە زمانی کوردمادیدا ↑خواردن *xuwardın* و هەروەها کەرتی دووەم لە وشەی ↑هەلەهوولە helehule پێوەندی بەم وشانەوە هەیە [ئەو هەموو هەلەهوولە چییە دەیخوی؟].

[تێبینی 1: لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ وشەکانی "سک" [زک، ئاشک] و هەر وەها Eingeweide (G.) "ورگ". هەردوو وشەی ناوبراو دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "خۆراکدان" دەکەن، واتا شوێتێک کە خۆراکی تێ دەچێ. تێبینی 2: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانەوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی خۆر xor [یان هۆر hor] "هەتاو"، سەر بە ریشەی *sauel- (IE.)* "خۆر"].

**هوور2 hur 2** [ *hūr* ] - ↑هورد hurd.

**هووراندن hurandın** [ *hurāndın* ] - "بە وردی بیر لێ کردنەوە": دەچێتەوە سەر هورد hurd [یان ↑ورد wırd].

**هوورش huruş** [ *hūršı* ] - هوورش کردن واتا "بڵیند کردن، بەرەوژوور بردن". خزمە دەگەڵ ↑هەوراز hewraz.

**هوورموور hurmur** [ *hūrmūr* ] - "خرتە و پرتە": هوور hur + موور mur. هوور دەچێتەوە سەر هورد hurd [↑ورد wırd]، موور خزمە دەگەڵ ↑مر mır [خۆڵەمرە xolemıre واتا خۆڵی زۆر ورد، خۆڵی کوتراو].

**هووری hurî** [ *hūrī* ] - "ناوی گەلێکی دێرین لەسەر خاکی کوردستانی ئەمرو": خووری xurî یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ئەهوورا ehura [ e-hura]. هوورا شێوەیەکی کۆنە لە وشەی ↑خۆر xor "هەتاو".

**هووژە huje** [ *hūža* ] - "بەگەل دەرچوونی مێروولە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هۆز hoz "گەل" و هوژەم hujem "گەلەبەراز".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قۆشەن qoşen "سوپا، لەشکر" و ژمارەیەک وشەی دیکە، وەک ↑هێشوو hêşû و ↑گیشە gîşe کە مانای "زۆر و زەوەندی، پێکەوە بوون، کۆما بوون" دەبەخشن. [تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Traube (G.) دەبێتە "ترێ" و Truppe (G.) دەبێتە "لەشکر". ریشەی هەر دووک وشەی ژێرمەنی یەکلا نەکراوەتەوە و شیمانەی بوونی پێوەندییەک دە نێوان ئەم دوو وشەیەدا باس نەکراوە، بەڵام زۆر وێ دەچێ کە پێوەندییەک لە ئارادا بێ].

**هووف(ە) huf(e)** [ *hūf(e)* ] - هووفەهووف hufehuf واتا "هاشەهاشی شەپۆل". وەک گەلێک وشەی دیکە، ئەم وشەیەش لەبنەڕەتدا نەک بە مانای "دەنگی شەپۆل"، بەڵکوو مانای خودی "شەپۆل"ی هەبووە [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ هورِ "دەنگی تەوژمی ئاو" و چەندین وشە کە لەوێدا باس کراون]. "هووف" خزمە لەگەڵ wave (E.) "جووڵانەوە، لەرانەوە، شەکانەوە". لێرەدا مەبەست جووڵانەوەی ئاوی چەم و دەریایە. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑فافۆن favon یان بافۆن bafon، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران، بەم لا و ئەولادا جوولانەوە".

**هووک1 huk 1** [ *hūk* ] - "خوو، عادەت": شێوەیەکی دیکە لە ↑خوو xu. بڕوانە ↑هۆگر *hogır*.

هووک **huk 2** [ *hūk* ] - "1- گەڕیدە، سەرلێشێواو 2- نەرم و ملایم 3- خۆ لەکار بوێر، لەژێر کار دەررۆ 4- مان، گە": بە هەموو ماناکانییەوە پێوەندی هەیە بە weich (G.) week (Nl.) "نەرم" و weak (E.) "کز و لاواز"، weichen (G.)، wijeken (Nl.)، wīcan (OE.)، vika (Sw.) "دوور کەوتنەوە، جێ خاڵی دان، دەرچوون (لەژێر گوشار)"، vijáte (OIn.) "هەڵ دێ، دەرباز دەبێ". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑وەکێ weg "چاخ، هەڕەت"، vicis (L.) "گۆڕان، گەڕ، نۆرە، جێگا" و هەروەها ↑بی *bî* [دارەبی]. هەموو ئەم وشانەدەچنەوە سەر ریشەی < ***uei-** (IE.) "چەمان، سووڕان، با دران". چەندین مانا لەم مانا بنەڕەتییەوە سەرچاوەیان گرتووە. مانای "نەرم و لاواز" بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شتی نەرم و لاواز بە هاسانی دەچەمێنرێتەوە، مانای "دووربوونەوە، جێ چۆل کردن، کشانەدواوە، دەرباز بوون" لەوەڕا هاتووە کە کاتێک شتێک دەچەمێتەوە، لە هەمان کاتدا خۆی لەژێر هێز دەرباز دەکا و بۆ دواوە دەچێ، یان جێ خاڵی دەدا. دیسانەوە لە مانای "دەرباز بوون" یان "سووڕان"ەوە ماناکانی "هەڕەت، چاخ، نۆرە، گۆڕان" پەیدا بوون. مانای "مان، گە" لە زمانی کوردمادیدا رەنگە لەمەوە هاتبێ کە کەسێک کە خۆ لە کارێک دەکشێتەوە [لەژێری دەردەچێ، ملی پێ نادا]، یان ئاژەڵێک کە بۆ دواوە دەچێ و مل بە هاتن یان بار کردن نادا، وەک "مان گرتن" مانای بۆ کراوە.

هوول **hul 1** [ *hūl* ] - "1- واش، بەش (پیاوێکی سوور واش) 2- موو زەردی ئاماڵ خورمایی 3- بزنی گوێ سوور": خزمە دەگەڵ hell (G.) "رووناک، کەمرەنگ، کاڵ" و ↑کاڵ kal.

هوول **hul 2** [ *hūl* ] - "گای قەڵەوی زل": شێوەیەکی دیکە لە ↑غوول ġûl.

هوولە **hule 1** [ *hūla* ] - هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هۆلین holîn "قوولە کردن، گریانی توند".

هوولە **hule 2** [ *hūla* ] - دەگەڵ هەلە hele دێ و دەگوترێ هەلەهوولە helehule، واتا "چڵتە وچاڵ، خۆراک". خزمە دەگەڵ ↑هوور hur "ورکێ".

هوومە **hume** [ *hūma* ] - "کووپە": هۆمە home ش دەگوترێ. دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خم xım [خوم xum].

هوون **hun** [ *hūn* ] - "ئێوە، جێناوی کەسی دووەمی کۆ": شێوەیەکی دیکەیە لە↑ئەنگۆ engo.

هوونە **hune** [ *hūna* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑خانوو xanu.

هوونک **hunık** [ *hūnık* ] - هۆنک honık یش دەگوترێ. شێوەیەکی کۆنتر لە ↑فێنک fenık. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑خوناوە xunawe [فێنکەباران].

هووهوو **huhu** [ *hūhū* ] - "1- دەنگی گریان 2- خوێندنی کوند": هووهووکەرە huhukere واتا "کوندەبەبۆ". خزمە دەگەڵ Uhu (G.) "کوندەبەبۆ" [دە هێندێک شێوەزارەکانی پێشووی ئەڵمانیدا وشەکە Huhu بوو]. وشەکە دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگی کوندە. دە کوردمادیدا هەروەها هووهووکەرە huhukere هەیە کە بە "جۆرێک کوند" دەگوترێ.

هوویسیل **huysîl** [ *hūysīl* ] - "کەندووی لە شووڵ تەنراو": هوویسیر huysîr یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ریشەی < ***ueg-** (IE.) "چنین، تەنین، گرێ دان، تێکخستن، لێهاڵاندن" و دەبێتە خزم لەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی وەک ↑هۆجەنە hocene "دۆخین" و ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین].

هوویە **huye** [ *hūya* ] - "نیر، داری سەر ملی گا جووت": یوغ yūġ (P.)، Joch (G.)، joh (OG.)، juk (Gt.)، yoke (E.)، ok (Sw.)، yugá-m (OIn.)، zygón (Gr.)، iugum (L.) "نیر"، سەر بە ریشەی < ***iugo-m-** (IE.) "نیر" و دوورتریش ریشەی < ***ieu-** (IE.) "تێکخستن، لێکبەستن،

بەستن(ەوە)". خزمە دەگەڵ ↑یێخە yexe و ↑جۆخین coxîn و↑جەغز ceğız و چەند وشەی دیکە کە هەموو ئەو مانایانەی سەرەوە دەردەبڕن.

**هۆ1 ho** - "سەبەب، سۆنگە": هوودە hude (P.) "قازانج، بەرژەوەندی، کەڵک"، بیهودە bīhūde (P.) "بێ کەڵک، بێ قازانج، بێ ئاکام، خۆڕایی، لەخۆڕا". لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑سوود sud.

**هۆ2 ho** - "وشەی بانگ کردن": [هۆ کاکی جووتیار!]. لە زمانی ئەڵمانیشدا بەکاری دێنن و دەبێتە o (G.) بۆوێنە o Herr، o mein gott "ئەی خودا(ی من)".

**هۆ3 ho** - "تێهەڵێنانەوە": [زەرەرم کردبوو، بەڵام ئەمجارە هۆی دایەوە]. مانای بنەڕەتی وشەکە دەشێ "کەڵک، بەهرە" بێ و مەبەست لە "هۆ دانەوە"ش دانی بەهرە و قازانج بێ. هەروەها هوو hu هەیە بە مانای "قازانج، سوود". لەم تێڕوانینەوە دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هۆ1 ho "سەبەب، سۆنگە".

**هۆبە hobe** *[ hoba ]* - "چادر، ڕەشماڵ": خزمە دەگەڵ Haube (G.)، huba (OG.)، hufa (OF.)، huva (Sw.)، hufe (OE.) "چادری سەر ژنان، سەرپێچ، سەرپوش [بە مانا گشتییەکەی]، پوپەی سەری پەلەوەر". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *keubh- (IE.)** "چەمانەوە(ی وەک گومبەز)". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑کووپە kupe، ↑گۆپاڵ gopal، ↑گیپە gîpe و هتد. ئەم ریشەیە دەبێ خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی **< *keu- (IE.)** "چەمانەوە". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکەی وەک ↑قۆز qoz و ↑قوت qut و هتد.

**هۆپ hop** - "وتەی گاڵتە کردن بە کەسێک کە بای لێ دەبێتەوە": دە ئەڵمانیدا upps (G.) وشەیەکە کە مرۆ بە خۆی یان بە لایەنی بەرانبەری دەڵێ لە کاتێکدا کارێکی ناجووری لێ بقەومێ وەک با لێ بەر بوون".

**هۆپەڵ hopel** *[ hopal ]* - "تۆپەڵ" [تۆپەڵەقوڕ یان بەفر]. هۆپ hop + ئەڵ el [پاشگری گچکاندن]. دەشێ خزم بێ لەگەڵ Haufe(n) ( )، houf (OG.)، hoop (Nl.)، heap (E.) "کۆگا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *keu- (IE.)** "چەمانەوە" و دەبنە خزم بۆ وێنە لەگەڵ ↑هۆبە hobe "چادر، ڕەشماڵ".

**هۆتەر hoter** *[ hotar ]* - "چۆڵەچرا": خزمە دەگەڵ ↑هاتەر hater "ئاگر".

**هۆجەنە hocene** *[ hojana ]* - "دۆخین": هۆچنە hoçne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Wickel (G.) "پێچراوە، هەڵکراو، هەڵوێزراو"، wich (OG.) "بەن، کۆریشاڵ، فتیلە"، wick (E.) "فتیلە، پڵێتە"، vagura (OIn.) "داو، تۆڕی داو"، figum (OIr.) "قوماش، کر، بافت"، سەر بە ریشەی **< *ueg- (IE.)** "چنین، تەنین، گرێ دان، تێکخستن، لێهاڵاندن". دە کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین helweznîn]، ↑هۆچ hoc "بابۆڵە"، ↑باهۆز bahoz "گردەلوول" و هتد.

**هۆچ hoç** *[ hoč ]* - "بابۆڵە": خزمە دەگەڵ wickeln (G.) "تێپێچانەوە، هەڵوێزنین، بابۆڵە کردن". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هۆجەنە hocene "دۆخین" و ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین] و چەند وشەیەکی دیکە. ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە دێن کە مانای"چنین، تەنین، لێکهاڵاندن" دەبەخشێ.

**هۆچک hoçık** *[ hočık ]* - "ئەنگوچکی کراس": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەنگوچک enguçık [↑ئەن en (پێشگر) + گوچک guçık]. دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گۆشە goşe. پێشگری ئەن en لە هێندێک وشەی دیکەشدا دەبیندرێ، وەک ئەنگاوتن، ئەنگووتن، ئەنگران، ئەنجنین، ئەنجومەن و هتد. خۆی پێشگرەکە دە بنەڕەتدا e یان aیە [هێندێک جاریش دەبێتە he]، بەڵام کاتێک دەکەوێتە پێش وشەیەک کە بە g یان c دەست پێ دەکا، ئەوسا فۆتیمی n وەک ناوگر دەکەوێتەوە تێوانەوە، وەک ئەو وشانەی سەرەوە و چەندین وشەی دیکە.

2- ↑هۆچ hoç "بابۆڵە" و خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "تێپێچانەوە، هەڵوێزنین، لێهاڵاندن".

**هۆخ hox** - "هەردی تەواو کێڵدراو": خزمە دەگەڵ ↑هێش hêş "هەوجار، ئامرازی کێڵان"، خیش xīš (P.) "هەوجار"، ↑هۆگان hogan "خەتی جووت"، ↑هەسک hesk "شەن، شەنە"، ↑هێچک *heçk* "قوڵفەدار" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "شتی نووک تیژ و قولاپ ئاسا".

**هۆدە hode** *[hoda]* - "دیو، وەتاخ": خزمە دەگەڵ Hütte (G.)، hutta (OG.) "خانووی بچووکی یەک وەتاخە"، hytt (Sw.)، hut (E.) "دیوەلکە"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)keu- >*** "تێپێچان، داپۆشین". وشەی ↑وەتاخ wetax [اتاق otaq (P.)] شێوەیەکی دیکەیە لەم وشەیە و دەشێ دەبنەڕەتدا *هۆدەک *hodek* بووبێ. دە زمانی ئەڵمانیدا چەندین وشە لەم ریشەیە وەرگیراون، وەک Haus (G.) "ماڵ، خانوو"، Haut "پێست"، Hode (G.) "(کیسەی) گون" و هتد. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی دیکە لەم ریشەوە سەرچاوە دەگرن، وەک ↑کەف kef، ↑کوێر kuwer [کۆر kor]، ↑حەوشە ħewşe، ↑قایش qayş [قاویش qawîş] و هتد.

**هۆر1 hor** - شێوەیەکی دیکە لە ↑خۆر xor "هەتاو".

**هۆر² hor** - "پێشگری کردار": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑هەل hel. [هۆردان hordan هەڵدان heldan، هۆرگرتن horgırtın هەڵگرتن helgırtın، هۆرکەوتن horkewtın هەڵکەوتن helkewtın و هتد]. [گۆڕانی فۆتیمی r بۆ l. ئەم گۆڕانە دە زۆر وشەی کوردمادیدا بەرچاو دەکەوێ]. ئەم پێشگرە خزمە دەگەڵ بر ber (P.) [کۆنتر ابر abar (P.) بووە، ابرمرد، ابرقدرت]، upari (Av.)، über (G.)، over (E.)، över (Sw.)، ufar (Gt.)، hyper (Gr.)، super (L.) "لەسەر، بەسەر". ئەم وشانە دەگەڕێنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *eup- , *up- >*** "لە خوارە بەرەو شتێک چوون، هەڵکشان، بەسەردا تێپەڕین". دە زمانی فارسیدا هەروەها وشەی ابر eber بەکار دێ بە مانای super دە ئینگلیزیدا، ابرمرد واتا superman. وشە ژێرمەنییەکان هەم وەک پێشگری کردار و هەم وەک پرێپۆزیسیۆن بەکار دێن. ئەم حاڵەتە دە زمانی فارسیشدا دەبیندرێ [برگشتن، برخاستن، بر دل، بر سر]. دە زمانی کوردمادیدا وشە بنەڕەتییەکە سێ وشەی لێ پەیدا بووە، هۆر hor / هەڵ hel وەک پێشگری کردار، ↑وەر wer [وەرگەڕان، وەرچەرخان و...]. وەک پێشگری کردار و ↑لە le وەک پرێپۆزیسیۆن بەکار دێن [لە وڵات، لە چیا، لە حەوشە]. هەر سێ وشە بنەڕەتێکی هاوبەشیان هەیە و دەچنەوە سەر وشەیەک کە لە زمانی ئەوێستادا بەشێوەی upari (Av.) تۆمار کراوە. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هۆرە2 hore "جێگەی زۆر بڵیند"، ↑هەوار hewar و ↑هەورەبان hewreban و هتد.

**هۆر3 hor** - "بای بە تۆز و مژەوە": وڕە wıre ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑وڕ wır و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران". مەبەست سووڕانەوەی تۆز و خۆڵ بە دەم باوەیە. لەگەڵ "با"ش دێ و دەگوترێ ↑هوڕەبا hureba.

**هۆڕ⁴ hor** - "زەوی زۆر نەرم کە سوار لێی دەرناچێ": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خۆڵ xol.

**هۆڕاندن horandın** [ *horāndın* ] - "1- قیژەی گا و کوێرەگە 2 - گریان بە دەنگی بەرز": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە:

1- ↑هەڕاندن herandın و ↑زەڕاندن *zerandın*.

2- یان ↑هۆلاندن holandın و ↑هۆلین holîn "قوولە کردن، گریانی توند".

**هۆرتك hortık** - "زارۆی ناحەز": هۆرت hort [هورد hurd، ↑ورد wırd] + ك ık [پاشگر].

**هۆرتمە hortme** [ *hortma* ] - "دەربیجە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە هۆر hor [↑خۆر xor]، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هوللا hulla "کڵاورۆژنە". وشەی "رۆژنە، رۆچنە" پێوەندی بە "رۆژ"ەوە هەیە.

**هۆرتە¹ horte** [ *horta* ] - "وتەی جووتیار بۆ هێنانەوە سەر خەتی گا جووت": خزمە دەگەڵ ↑وەرد werd دانەوە "گەڕاندنەوەی گاجووت و کێڵانەوەی دووبارە".

**هۆرتە² horte** [ *horta* ] - دەگەڵ "بەرە" دێ [هۆرتە و بەرە horte u bere واتا "داهات و خەرج"]. دە بنەڕەتدا هاوردە hawırde بووە، ↑هاوردن hawırden.

**هۆردە horde** [ *horda* ] - "شیوی تراوی دانەوێڵە، شلە": خزمە دەگەڵ هورد hurd، ↑ورد wırd.

**هۆرن horın** - "کێوی بڵێند، زۆزانا بڵێند": هۆرنە horne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هۆرە hore2 "جێگەی زۆر بڵێند".

**هۆرە1 hore** [ *hora* ] - "پواز": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Hebel (G.) و Heber (G.) "مەڵغە، برغوو". هۆرە لەوانەیە لەبنەڕەتدا وشەیەك بووبێ، بە مانای "مەڵغە" کە وەبەر شتێك دراوە بۆ لەقاندن و هەڵهێنانی.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆنۆلۆژیك هەڵی سەنگێنە لەگەڵ گابار gabar و گۆڕ gor. وشەی دووم گۆڕدراوی وشەی یەکەمە، یان دوو وشەی زبر zıbır و زوور zur. گۆڕانی لەم چەشنە لە ژمارەیەك وشەی کوردمادیدا دەبینرێ. هەروەها گۆڕانی مانای وشەیەك بۆ مانایەکی نیزیك لە مانا بنەڕەتییەکەی زۆر جار روو دەدا].

**هۆرە2 hore** [ *hora* ] - "جێگەی زۆر بڵێند": هەروەها ↑هۆرن horın هەیە بە مانای "کێوی بڵێند، زۆزانا بڵێند": دەشێ خزم بێ دەگەڵ:

1- یان ↑هەوار hewar "کۆیستان".

2- یانیش ↑هەرە here "نیشانەی ئاوەڵناوی بەرزترین" [هەرە جوان، هەرە باش...]

**هۆرە3 hore** [ *hora* ] - "هەوایەکی گۆرانی": خزمە دەگەڵ ↑هاوار hawar و ↑حەیران ĥeyran "هەوایەکی گورانی". هەروەها هۆرەهۆر horehor هەیە بە مانای "لۆرەلۆر، گۆرانی لەژێر لێوانەوە". ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

[تێبینی1: وشەکانی گۆرانی goranî و گەلۆ gelo "هەوایەکی گۆرانی"ش دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "هەرا کردن، دەنگ هەڵبڕین". تێبینی 2: وەك دەبینین "هۆرە" هەم بە مانای "دەنگ هەڵبڕین" بەکار دێ و هەمیش بە مانای "دەنگی کەم" (لۆرەلۆر). لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ "لۆرەلۆر" (دەنگی کەم) و "لووراندن" (دەنگی بەرز). ئەم دوو وشەیەش لە بنەڕەتدا هەر یەکن و دوو مانای جیاوازیان پەیدا کردووە].

**هورەبا hureba** [ *hurabā* ] - "بای توند و سارد": هوڕ hur + با ba. کەرتی "هوڕ" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑وڕ wır "گێژ، (سەر)سووڕواو، (مێشك) لێکدراو" و ئاماژە دەکا بە سووڕان و لوول

خواردن. [لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *باهۆز* "بای پێچراوە، بای پێچەر"، گردەلووڵ، گێژەڵووکە].

**هۆریزان horîzan** *[ horīzān ]* - "هەستان": خزمە دەگەڵ ↑هەوراز hewraz.

**هۆز¹ hoz** - "گەل، عەشیرە": خزمە دەگەڵ hōs ‎(OE.)، hansa ‎(Gt.) و ‎(OG.) "حەشیمەت، ئاپۆرە". ریشەی وشەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بەپێی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی **< *(s)kand-** ***(IE.)*** "دابڕین، جیا کردنەوە، قەڵشاندن". [لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "ڕان" (گاڕان) کە ریشەکەی مانای *"ڕنین*، بڕین، جیا کردنەوە" دەبەخشێ].

**هۆز² hoz** - دەگەڵ "با" دێ [↑باهۆز bahoz " گردەلوول، گێژەڵووکە]، خزمە دەگەڵ ↑*هۆجەنە* hocene و ↑وێزنین weznîn [هەڵوێزنین].

**هۆزان hozan** *[ hozān ]* - "زانا، مامۆستا، هۆنەر، هونەرمەند": هۆزانڤان hozanvan یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑ئاوەز awez "ئەقڵ، تێگەیشتن". هەڵی سەنگینە لەگەڵ ئاوزان a-wızan، ئاوەزین a-wezîn. "وەزان" و "هۆزان" لەباری گۆڕانی فۆنۆلۆژیکەوە هەڵسەنگینە لەگەڵ "هورد" و "ورد"، "هرچ" و "ورچ"، "هۆش" و "واق"، "وچان" و "هوچان" و هتد.

2- ↑هۆژان hojan "فیر بوون" [فێر کردن].

**هۆژان hojan** *[ hožān ]* - "فێر بوون": ↑هەڤۆتن hevotın.

**هۆش hoş** *[ hoš ]* - "ئاگا، زەین": هش hış یش دەگوترێ. هوش hūš ‎(P.)، خزمە دەگەڵ wachen ‎(G.)، wacken ‎(Gt.)، wake ‎(E.)، vaka ‎(Sw.) "لەسەر هۆش بوون، ئاگادار بوون، وریا بوون، لە خەو هەستان". ئەم وشانە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ueg-** ***(IE.)*** "چالاک بوون، بە هێز بوون". vāja-h ‎(OIn.) "وزە"، vegere ‎(L.) "ژیاندنەوە، بووژاندنەوە"، vigilāre ‎(L.) "لەسەر هۆش بوون، بێدار بوون" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هێز hez، ↑وزە wıze [بەراوردی بکە دەگەڵ "وشیار"]، ↑*بووژانەوە bujanewe* [کۆنتر: "ووژانەوە wujanew"] و هتد. شێوەیەکی کۆنتری وشەکە ↑واق waq ە کە تا ئێستاش دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە [واق وڕ مان واتا تێکەڵ پێکەڵ بوونی هۆش].

**هۆشنگ hoşıng** - "سێوی، هەتیو": خزمە لەگەڵ waise ‎(G.)، wees ‎(Nl.) "سێوی"، entwisen ‎(G.) "جێهێڵراو، چۆل"، wīsan ‎(OG.) "خۆ بواردن، دووری کردن". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی **< *ueidh-, uidh- , widh-** ***(IE.)*** "جیا بوونەوە، جیا کردنەوە، بەتاڵ بوون، کەمایەسی هەبوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بێوە bewe و هەروەها دە پلەیەکی دوورتردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑*واز⁵ waz* "کەمێکی جیا" [تاق و واز].

**هۆششە hoşşe** *[ hošša ]* - "وشەی راوەستاندنی کەر": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ:

1- echein ‎(Gr.) "گرتن، راگرتن، وەستاندن" و ochē ‎(Gr.) ناوی مانا سەر بە هەمان کردار.

2- ↑هەچچە heççe "وشەی دەنگ دانی کەر".

**هۆڤی hov(î)** *[ hov(ī) ]* - "وەحشی، کێوی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ovis ‎(L.) "مەڕ". لەوانەیە هۆڤی پێشتر بەگشتی بە مانای "ئاژەڵ، حەیوان" بەکار هاتبێ و دواتر مانای "ئاژەڵی وەحشی" وەرگرتبێ.

2- Weihe "پەڵەوەرێکی راوکەر" و Weide ‎(G.) "لێرەوار، لەوەرگە"، wād ‎(OE.) "راو، راو نان"، veidr ‎(OIs.) "راو"، váyati ‎(OIn.) "دواکەوتن"، vyti ‎(Lit.) "راو نان"، heimai ‎(Gr.) "راکە،

بکۆشە، بەگوڕ بە (بۆ دەستخستنی شتێک)". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی < *wie- , *uei- (IE.) "ڕاو کردن، ڕاو نان، بە دوای خواردندا گەڕان".

**هۆق hoq** - "دەنگی بەرزی گا و گۆل": [هۆقەهۆق] خزمە دەگەڵ واق waq [واقەواق] و ↑واقاندن waqandın "ناڵینی ڕێوی و کەروێشک".

**هۆقە hoqe** [ *hoqa* ] - "یەکەیەکی کێشان، وەزتێکە": خزمە دەگەڵ wägen (G.)، wegan (OG.)، و (OE.)، weigh (E.)، vega (OIs.) "وەزن کردن" و Waage (G.)، waag (Nl.)، wa g (OE.)، vag (Sw.) "تەرازوو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی < *uegh- (IE.) "بزوان، جووڵان". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın [بزوان] و گەلێک وشەی دیکە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑وەزن *wezın*.

**هۆک1 hok** - "گۆشە": خزمە دەگەڵ Ecke (G.)، ecka (OG.)، eg (Nl.)، edge (E.) "گۆشە، قەراخ"، acus (L.) "دەرزی"، oxys (Gr.) "(تامی) تیژ"، akis (Gr.) "دڕک، نووک"، سەر بە ڕیشەی < *ok- , *ak- (IE.) "دەرپەڕیو، تیژ، قیت". دە زمانی فارسیدا اختە āxte (P.) "تیژ، تیژکراو" و دە زمانی کوردمادیشدا چەند وشەیەک لەم ڕیشەوە دێن، وەک ↑ئاژنین ajnîn "بە دەرزی یان شتی تیژ کون کون کردن".

**هۆک2 hok** - "1- تاسە، ئارەزوو 2- مەیل بە جووت بوون": هەروەها هۆکێ hoke "تیری چاولەوەڕێن" و ↑هۆکچ hogıç "بەرانی پەڕێنی" و هۆکی hokî "وازوازی" پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑واز[1] waz و خزم لەگەڵ ↑ویستن *wîstın* "خواستن، خۆش هەبوون"، وشەکە بەتایبەتی هەڵ سەنگێنە لەگەڵ wūsc (OE.)، ōsk (OIs.) "حەز، واز، خواست، ئارەزوو".

**هۆگان hogan** [ *hogān* ] - "خەتی جووت": خزمە دەگەڵ ↑هۆخ hox "هەردی تەواو کێڵدراو".

**هۆگچ hogıç** [ *hogıč* ] - "بەرانی پەڕێنی": خزمە دەگەڵ ↑هۆک hok "تاسە، حەز".

**هۆگر hogır** - "عادەت گرتوو": ئۆگر ogır یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- لەوانەیە هۆ- ho- شێوەیەکی دیکە لە ↑خوو xu "عادەت" بێ. دە زمانی کوردمادیدا ↑هووک huk یش بە مانای "عادەت" دێ. هۆگر واتا کەسێک خووی بە شتێک گرتبێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Ehe (G.) "پێوەندی ژنمێری" [دە بنەڕەتدا: پێوەندی بە پێی داب و نەریت]، ēwa (OF.)، a (w) (OE.) "داب و نەریت، عورف و یاسا". ڕیشە وشە ژێرمانییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بەپێی بۆچوونێک دەشێ پێوەندی هەبێ بە wa (OG.) "هەرمانەتی"، ewig (G.) "هەرمان، هەمیشە". بە بۆچوونێکی دیکە یەک دەگرێتەوە دەگەڵ -evah (OIn.) "خوو، خدە" و دەچێتەوە سەر ڕیشەی < *ei- (IE.) "ڕۆیشتن، چوون". لەم تێڕوانینەوە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هاتن hatın.

2- یان لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا بەم چەشنە پێک هاتبێ: ئۆ + گر o + gır [لەباری وشەسازییەوە بەراوردی بکە دەگەڵ ئۆقرە o-qre] و شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گرۆ2 gıro [گرۆ بوون واتا "ڕام بوون، خوو گرتن، ئۆگر بوون"].

3- ↑هۆک2 hok "1- تاسە، ئارەزوو 2- مەیل بە جووت بوون".

**هۆل1 hol** - دەگەڵ "چۆل" دێ [چۆل و هۆل çol u hol]. خزمە دەگەڵ ↑هەڵۆڵ helol "بۆش، بەتاڵ" و hohl (G.)، hol (NL.) و (OE.)، holr (OIs.)، hollow (E.) "هەڵۆڵ" و hole (E.) "کون"، Höhle (G.) "ئەشکەفت". دە زمانی ئاڵمانیدا Hohlraum (G.) بە مانای "بۆشایی، فەزای

داخراوی بەتاڵ" بەکار دێ و بۆ وێنە ئەگەر ئەم وشەیە لە پێوەندی دەگەڵ شاخ و داخدا بەکار بهێنرێ، مانای ئەشکەفت و کون و کاژێر دەبەخشێ.

هۆڵ2 **hol 2** - "1- کرێیوە و مژ 2- مزراق": خزمە دەگەڵ ↑حۆل ĥol "گێژ" [بە فارسی خل xol (P.)] و لەوانەشە ↑خولانەوە xulan(ewe) و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەی **< *uel- , *wel-** ***(IE.)*** "سووڕان، با دران".

هۆڵ3 **hol 3** - شێوەیەکی دیکە لە ↑حۆل ĥol "گێژ".

هۆڵ **hol 4** - "چاک، باش": خزمە دەگەڵ wohl (G.)، wola (OG.)، wel (Nl.)، well (E.)، väl (Sw.)، waila (Gt.) "باش". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ wollen (G.) و will (E.) "ویستن". وشەکە دەبنەڕەتدا بە مانای "خوازراو، دڵخواز، حەز لێکراو" بووە. خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەك ↑بەڵێ bele، ↑بریا bırya، ↑هەڵاواردن helawardın و هتد.

هۆڵ **hol 5** - "بڵندایی": بڕوانە ↑هاڵ1 hal "بەرزایی کێو".

هۆڵ **hol 6** - "گۆی شەقێن 2- کەلا، هەڵمات": هەروەها هۆلان holan هەیە بە مانای "گۆیێن". دەچێتەوە سەر ریشەی **< *uel- , *wel-** ***(IE.)*** "سووڕان، با دران".

[تێبینی: لە زمانی ئەڵمانیدا Würfel (G.) "مۆرەی هەڵاویشتن، جگێ" پێوەندی بە کرداری werfen (G.) "هاویشتن"ەوە هەیە و هەردووک وشەش دەچنەوە سەر ریشەی **< *uer- , *wer-** ***(IE.)*** "سووران، با دران". هەر دوو ریشەکانی سەرەوە دەشێ دواجار یەك ریشە بووبن].

هۆڵ1 **hol 1** - "1- وەتاخی زل 2- وەتاخی زل بۆ حەوانەوی ئاژەڵ": هۆلك holık یش هەیە بە مانای "خانووی چکۆڵە، کۆخ". خزمە دەگەڵ Halle (G.)، hal (Nl.)، hall (E.) و (Sw.) "هۆڵ، دیوی مەزن". هەروەها خزمە دەگەڵ śālā (OIn.) "هۆدە، خانوو" [↑سەرا sera ؟]، cella (L.) "دیو، خانوو". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑هاڵان halan [لێهاڵان] سەر بە ریشەی **< *kel-** ***(IE.)*** "لێهاڵاندن، داپۆشین، شاردنەوە". دە زمانی فارسیدا بە هۆڵەمەڕ دەگوترێ اغل āġol (P.) [ā-ġol]. کەرتی دووەمی وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە "هۆڵ"ی کوردمادی.

هۆڵ2 **hol 2** - "جاشك و جانووی یەکساڵە": خزمە دەگەڵ ↑گۆڵ3 gol [گا و گۆل].

هۆلاندن **holandın** *[ holāndın ]* - ↑هۆلین holîn.

هۆلس **holıs** - "ئارانشین، ناکۆچەر": هۆل hol + پاشگری س ıs. بۆ کەرتی یەکەم بڕوانە ↑هۆل1 hol [چۆل و هۆل çol u hol]. وشەکە ئاماژە دەکا بە پانتایی بەراوەڵا. "ئارا"ش هەر ئەم مانایە دەگەیەنێ. سەبارەت بە پاشگرەکە بڕوانە ↑ئۆز oz-.

[تێبینی: لەوانەیە وشەی "ئاری" و "ئاریایی" دە بنەڕەتدا پێوەندی بە "ئارا"وە هەبێ و مەبەست هەمان ئارانشین و ناکۆچەر بووبێ].

هۆڵمان **holman** *[ holmān ]* - "گەدە، مەعیدە": خزمە دەگەڵ ↑هوور hur "ورگ".

هۆلۆشە **holoşe** *[ hološa ]* - "ساواری وردکراو": خزمە دەگەڵ ↑هۆلە hole "گێرە، خەرمان کوتانەوە".

هۆلە1 **hole 1** *[ hola ]* - "گێرە، خەرمان کوتانەوە": هەروەها ↑هۆلۆشە holoşe هەیە بە مانای "ساواری وردکراو". لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Hülse (G.)، huls (Nl.)، hulla (OG.) "سەرپۆش، پێچ، لێچکە"، hüllen (G.) "تێوەپێچان، لێهاڵاندن"، hehlen (G.) "داپۆشین، تاقەت کردن"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "لێهاڵان، تێپێچان، شاردنەوە". خزمە دەگەڵ ↑هاڵان halan [لێهاڵان]. لەم تێڕوانینەوە "هۆلە" دەتوانێ دە بنەڕەتدا بە مانای "پووش، تۆێکڵ" بێ و مەبەست لێکردنەوە و جیا کردنەوەی پووش و دان بێ.

**هۆلە2 hole** [ *hola* ] - "1- دەنگی بانگ کردنی گوێرەکە 2- دەنگی گریاناوی": خزمە دەگەڵ ↑هۆلین holîn "قوولە کردن، گریانی توند".

**هۆلین holîn** [ *holīn* ] - "قوولە کردن، گریانی توند": هۆلاندن holandın یش دەگوترێن. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هۆلە hole، ↑هوولە hule، ↑هولیلك hulîlk و هتد. دە ریشەدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- heulen ‎(G.)‎، hwilon ‎(OG.)‎ "گریان بە دەنگی بەرز"، هەروەها ululare ‎(L.)‎ و ulula ‎(L.)‎ "گریانی توند، قیژە". وشەکە دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگ بووە.

2- holen ‎(G.)‎، holōn ‎(OG.)‎ "هێنان، هێنانەوە". ئەم وشەیە بە گوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی ‎< *kel-* ‎(IE.)‎ "هەرا کردن، بانگ کردن". ئەگەر وشەکە سەر بەم ریشەیە بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑هەڵلا hella.

3- خزم دەگەڵ ↑هۆڕاندن horandın.

**هۆلێن holen** [ *holen* ] - "گۆیێن": هۆلانە holane ش دەگوترێ. بڕوانە ↑هۆل[6] hol "گۆی شەقێن".

**هۆمەیی homeyî** [ *homayī* ] - "پەزی بۆری تاریك": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هوم hum "بێفەڕی".

**هۆن1 hon** - "هۆن هۆن واتا دەنگی گریانی سەبر و بە مینگە": خزمە دەگەڵ weinen ‎(G.)‎، wanian ‎(OG.)‎، veina ‎(OIs.)‎، wenen ‎(Nl.)‎ "گریان". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑وەی wey "دەنگی ئێش و ئازار، ئاە و ناڵە".

**هۆن2 hon** - "بافت، هۆنراو، تەنراو": بڕوانە ↑هۆندنەوە hondın(ewe) [وەندن wendın].

**هۆن3 hon** - "خەت لە زەوی دان بۆ ئاو پێدا هێنان": پێوەندی هەیە بە ریشەی ‎< *uen-* ‎(IE.)‎ "لێدان، بریندار کردن" و خزمە لەگەڵ Wund ‎(G.)‎، wunt ‎(OG.)‎، wond ‎(Nl.)‎، wund ‎(OE.)‎ "برین، زام". هەروەها هەڵیسەنگینە دەگەڵ ↑ونجڕ wıncır "لەت و پەت، بریندار". هەروەها ↑هۆناس honas "سەردەستەی دروێنەوانان" دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. [تێبینی: وشەی "هۆناس" لەباری ماناوە هەڵ سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "دروون، دروێنە، ترپان" کە لە ریشەدا مانای "لێدان" دەبەخشن].

**هۆناس honas** [ *honās* ] - "سەردەستەی دروێنەوانان": هۆن hon + ئاس as [پاشگر]. خزمە لەگەڵ ↑هۆن3 hon "خەت لە زەوی دان بۆ ئاو پێدا هێنان". کەرتی دووەم پاشگرە. لەم بارەوە بڕوانە پاشگری ↑ئۆز oz-.

**هۆندنەوە hondın(ewe)** [ *hondın(awa)* ] - "چنین، تەنین": هۆنینەوە honîn(ewe) و وەندن wendın ش دەگوترێ. هەروەها هۆن hon هەیە بە مانای "بافت، هۆندراو". خزمە دەگەڵ wenden ‎(G.)‎ "با دانەوە، هەڵگێڕانەوە"، winden ‎(G.)‎، wintan ‎(OG.)‎، wind ‎(E.)‎، vinda ‎(Sw.)‎ "با دان، سووڕاندن، پێچانەوە"، سەر بە ریشەی ‎< *uend-* ‎(IE.)‎ "با دان، سووڕاندن، با دانەوە، چنین". [دوو چەمکی "با دان" و "چنین" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بۆ وێنە "بابۆڵە" خزمە دەگەڵ "بافتن"ی فارسی بە مانای چنین]. چەندین وشە لەم ریشەی سەرەوە سەرچاوەیان گرتووە، وەك vandhúra-h ‎(OIn.)‎ "شوێنی دانیشتن لە عارەبەدا، دە بنەڕەتدا "قەرتاڵەی عارەبە"، kánnathron ‎(Gr.)‎ "عارەبەی چنراو، دە بنەڕەتدا قەرتاڵەی چنراوی عارەبە"، Wand ‎(G.)‎ "دیوار" [دە بنەڕەتدا بە مانای تێکچنراو] و *windila* ‎(Ger.)‎ "قەرتاڵە".

[تێبینی: ئەم ریشەیە دەشێ شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی - *uei (IE.) "چەمان، سووڕان، بەم لا و ئەولادا با دران"]

هۆنە **hone** [ *hona* ] - "نەسیم، شنەبا": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑با ba. هەڵی سەنگینەدەگەڵ Wind (G.)، wind (E.)، vind (Sw.)، ventus (L.) و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *hwent- (IE.) "با". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەوا hewa.

هۆنینەوە **honîn(ewe)** [ *honīn(awa)* ] - هۆنان honan و ↑ هۆندنەوە hondın(ewe) ش دەگوترێ.

هۆی **hoy** - "وشەی بانگ کردن": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەی hey.

هەب **heb** [ *hab* ] - "1- دەنک، دانە 2- کەمووکە، تۆزکال 3- حەب، دەنکەدەرمان": هەروەها هەبرەش hebreş هەیە بە مانای "سیاوڵە، رەشکە" (دەنکی رەش). خزمە دەگەڵ Hafer (G.)، haver (Nl.)، havre (Sw.) "جۆی دەشتەکی، جۆ رەشە". ↑کاوڕ kawır پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. مانای "کەمووکە" لەوەڕا پەیدا بووە کە دەنکی دەغڵ وەک شتێکی بچووک سەیر کراوە و کراوەتە سیمبۆلی بچووکی و کەمی. دە شێوەزاری ناوەڕاستدا بۆ ئەم مەبەستە دەڵێن نیسکێک [نیسکێک دانیشتم]، نەختێک [نەختێک قسەمان کرد]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر "نیسک" و "نۆک" کە ئەوانیش جۆرێک لە دەغڵ و دانن و وەک نیشانەی کەمی و بچووکی بەکار دێن. وەشەی "زەڕرە"ش مانای "دان، دەنک" دەدا و خزمە دەگەڵ "زوڕەت".

هەبانە **hebane** [ *habāna* ] - "کووپەڵە و جەرەی بێ دەسک": خزمە دەگەڵ Hafen (G.)، havan (OG.) "دەفر" و دەگەڵ قاب qab [↑قاپ qap] و هەروەها ↑*قاپان*[2] *qapan*.

هەبرمان **hebırman** [ *habırmān* ] - "دانەوێڵەی سەوزی وشکی هەڵگیراو بۆ زستان": خزمە لەگەڵ ↑هەب heb "دانە، دەنک".

هەبشاندن **hebşandın** [ *habšāndın* ] - "بە لرفە و پەلە خواردن":

1- لەوانەیە پێک هاتبێ لە هە he + بش bış و خزم بێ دەگەڵ ↑پشمین pışmîn، ↑پشوو pışû، ↑پیش pîş خواردنەوە و چەند وشەیەکی دیکە کە ئاماژە بە دەنگی دەرچوونی هەوا دەکەن لە دەم و لووتەوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەپش hepış [هەپش کردن واتا پشمین].

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑هەپ hep "خواردن بە زمانی زارۆک". ئەم وشەیە بە مانای "حەپ، حەپەی سەگ"یش بەکار دێ و خزمە لەگەڵ ↑قەپ *qep* [قەپ لێدان، قەپاڵ]، ↑گاپن gapın "زۆرخۆر" [زارداپچڕاو بۆ خواردن] و حەپەسان ḧepesan [زارکرانەوە بە هۆی سەر سوڕمان یان واق وڕمان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین".

هەبل **hebıl** [ *habıl* ] - "1- پڕ، تژە 2- نەخۆشی گرفت": هەروەها ↑هەبلین heblîn وەک کردار بەکار دێ بە مانای "پڕ بوون".

هەبلین **heblîn** [ *hablīn* ] - "1- پڕ بوون 2- نەخۆشی گرفت":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑خەپە xepe و ↑هەپڵە heple "خەپلە". ئەم وشانە ئاماژە بە "قەڵەو و ئەستوور بوون" دەکەن و دەشێ لەم مایایەوە دواتر مانای "ئاخنران" پەیدا بووبێ و لەمیشەوە ماناکانی "1- پڕ بوون 2- نەخۆشی گرفت".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەبەش hebeş دا باس کراون.

هەبن **hebın** [ *habın* ] - "بەندی سینگی رەشماڵ": خزمە لەگەڵ ↑ئیپە îpe "بەندێکی قایشە نیری پێ لە ئاموور دەبەستن".

**هەبەش hebeş** [ *habaš* ] - "هەراش، بەکەیف": [کارکێ هەبەشە]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ üppig (G.) و uppīg (OG.) "زۆر و زەوەند، پڕ، تەژی، لە رادەبەدەر". ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ über (G.) "لەسەر" و übel (G.) "زۆر بەد و خراپ" [دە بنەڕەتدا: لە ئەندازە تێپەڕاندن] و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑*هەوار hewar* "کوێستان، بەرزایی چیا" و ↑هەورەبان hewreban. ئەم وشانە ئاماژە بە "لای سەرەوە، بەرەوسەرەوە" دەکەن. دە زمانی فارسیدا بەرانبەری وشە ئەڵمانییەکە دەتوانین وشەی "سرشار" بەکار بێنین کە مانای "زۆر پڕ" دەبەخشێ و لەمیشدا وشەکە ئاماژە بە بەرز بوونەوە و هەڵچوون دەکا.

**هەبوون hebun** [ *habūn* ] - "1- مەوجوود بوون 2- دارا بوون": ئەم کردارە وەک دەبیندرێ دە زمانی کوردمادیدا بۆ دوو مانا بەکار دێ. بۆ مانای یەکەم، واتا "مەوجوود بوون، لە ئارادا بوون" بەتەنیایی ↑بوون bun یش دەگوترێ کە شێوەی دروست تری وشەکەیە بۆ ئەم مانایە. مانای دووەم بریتییە لە "دارا بوون، خاوەن بوون" [هەمە، هەتە، هەیەتی]. کردارەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی هە he + بوون bun. ئەم دوو وشانە دەچنەوە سەر دوو ریشەی جیاواز. کەرتەوشەی هە -he خزمە دەگەڵ هست hest (P.)، ist (G.)، is (E.)، est (L.)، ásti (OIn.) "هەیە"، esse (L.)، eīnai (Gr.) "بوون، هەیین" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هەیین heyîn] سەر بە ریشەی **< -es* (IE.)** "هەیین، بوون". کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ bin (G.) [کۆنتر: bim]، beōm (OE.) "هەم"، be (E.) "بوون"، fui (L.) "بوومە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -bheu* (IE.)** "هەڵدان، بوون، (لە شتێکەوە) بوونە شتێکی دی". دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑بۆتکە botke، ↑بەرە bere [خانووبەرە]. وەک دەبینین دە زمانە ژێرمانییەکاندا ئەو وشانەی مانای "بوون" دەگەیەنن، هێندێکیان لەم و هێندێکیان لەو ریشەی دیکەوە سەرچاوە دەگرن. دە زمانی فارسیدا کرداری بوون لە دۆخی رابوردوودا لە ریشەی دووەم سەرچاوە دەگرێ [بودم، بودی، بود...]، بەڵام لە دۆخی ئێستادا دەچێتەوە سەر ریشەی یەکەم [هەستم، هەستی، هەست...].

[تێبینی: کرداری "هەبوون" شێوەکەی زۆر لە کرداری haben (G.)، have (E.)، habere (L.) "هەبوون، خاوەن بوون" دەچێ، بەڵام پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکی بەم کردارانەوە نییە].

**هەبەک1 hebek 1** [ *habak* ] - "لەپی دەست، بەری دەست": خزمە دەگەڵ چەپک çepık [↑چەپۆک çepok]. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ↑ هەفان hefan.

**هەبەک2 hebek 2** [ *habak* ] - "پچێک، کەمووسکەیەک": ↑هەب heb "دەنک، دان". دە زمانی کوردمادیدا دەنکی دەخڵ و دان وەک سیمبۆلێک بۆ گچکەیی لەبەر چاو گیراوە و دەگوترێ "نیسکێک"، "نەختێک" [نۆک]، "هەبەک"، گشتی بە مانای "زۆر کەم لە شتێک".

**هەپ hep** [ *hap* ] - "1- خواردن بە زمانی زارۆک [هەپکێ بدە بەبکێ] 2- حەپ، حەپەی سەگ". خزمە لەگەڵ ↑قەپ qep [قەپ لێدان، قەپاڵ]. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "زار داپچڕین" دەکەن.

**هەپروون1 heprun 1** [ *haprūn* ] - "ورد و خاش": خزمە دەگەڵ ↑*خێوران xewran* "توانەوە(ی خۆراکی)" [دە بنەڕەتدا: ورد بوون، هاڕدران]، ↑هێڤڕ hêvır "هاڕین، ورد کردن"، هێڤڕان hevran "باراش" و هتد. دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەپروون2 heprun 2 "سەخت، ئاستەم".

**هەپروون2 heprun** *[ haprūn ]* - "سەخت، ئاستەم": [چیایەکی هەپروون]. شێوەیەکی دیکەیە لە [کەمرین kemrîn، کەڤرین kevrîn] بە مانای "بەردین، سەخت". بڕوانە ↑حەمرین ĥemrîn. [جێی ئاماژەیە کە وشەی "ئاستەم"یش دەگەڵ *هەستی* "بەرد" خزمە].

**هەپش hepış** *[ hapıš ]* - هەپش کردن واتا "پشمین"، [هە he + پش pış]، خزمە دەگەڵ ↑پشمین pışmîn.

**هەپشاندن hepşandın** *[ hapšāndın ]* - "پڕ کردنی و پەستاوتنی جەواڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑پشاوتن pışawtın و ↑پەستاوتن pestawtın. کەرتی هە he- پاشگرە، وەک "هەناردن"، "هاوردن"، "هەشفاندن"، "هەجنین"، "هەرافتن" و هتد.

**هەپک hepık** *[ hapık ]* - "بەرەی ئەستوور": بنجی وشەکە، واتا هەپ hep- دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەپلە heple "خەپلە".

**هەپلە heple** *[ hapla ]* - شێوەیەکی دیکە لە↑خەپلە xeple [↑خەپە *xepe*].

**هەپۆ hepo** *[ hapo ]* - "1- جۆرێک پێشکە 2- هەپە، کەرکیت": خزمە دەگەڵ ↑هەپە1 hepe "کەرکیت" و دواتر ↑کوتان kutan. لێرەدا مەبەست "پێوەدان"ە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ "تەپۆ" یان "ژەنگەسوورە" کە ئەوانیش پێوەندییان بە چەمکی "لێدان"ەوە هەیە. جێی ئاماژەیە "کوتان" بە مانای "دەرزی لێدان" [واکسەن لێدان]یش بەکار دەهێنرێ.

**هەپۆل(ە) hepol(e)** *[ hapol(a) ]* -حەپۆل، زرتەزەلامی نەزان": خزمە دەگەڵ ↑حەپەسان ĥepesan [عەبەسان ɛebesan] و مەبەست دە بنەڕەتدا حەپەساو بوونی کەسێکە کە لە دەوروبەری خۆی باش تێ ناگا. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین". لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "لێوە" هەڵی سەنگێنین کە ئەویش مانای "شێتۆکە" دەدا و دە بنەڕەتدا واتا "دەم و لیچ شۆڕەوە بوو".

**هەپە1 hepe** *[ hapa ]* - "کەرکیت": خزمە لەگەڵ ↑هەپۆ hepo "جۆرێک پێشکە" و دواتر ↑کوتان kutan.

**هەپە2 hepe** *[ hapa ]* - "دارێکی کورتە لەتیوان نیر و ئامووردا": وەک دەردەکەوێ ئەم دارۆکەیە نیر و ئاموور بە یەکتر دەبەستێتەوە و هەر بۆیە پێوەندی بە ↑ئیپە îpe ەوە هەیە.

**هەپە3 hepe** *[ hapa ]* - "فریو": پێوەندی هەیە بە ↑خاپاندن xapandın ەوە.

**هەت1 het** *[ hat ]* - "کن، نک، جەم": دەشێ خزم بێ لەگەڵ Seite (G.)، sīta (OG.)، zij(de) (Nl.)، side (E.)، sida (Sw.) "لا، قەراخ، تەنیشت". ئەم وشانە لەپێوەندی دان لەگەڵ sīdr (OIs.) sīd (OE.) "داکەوتوو، شۆڕەوەبوو، درێژ (بۆوە)، هەراو"، sīde (MG.) "نەوی" [داکەوتوو]. مانای "تەنیشت، لا" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە لاتەنیشتی داکەوتووی مرۆڤ و ئاژەڵ بووە، واتا بەز و پیوی بەرەوخوار داکشاو. هەر لێرەدا سەرنجی وشەی ↑هەتیوە hetîwe بدە بە مانای "تەختەکوێنی کەنارەی رەشماڵ کە شۆڕ دەبێتەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> *sei-** ***(IE.)*** "چاندن، وەشاندن، فڕێ دان" و بۆ وێنە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑چاندن çandın و افکندن afkandan (P.) [af-kandan] "هاویشتن، شۆڕ کردنەوە" و syaka-h (OIn.) "پلّار، تیر"، pra-siti-h (OIn.) "هاویشتن، تیر هاویشتن". وشەی ↑پەرەشووت perşûet دەشێ پێوەندی بەم وشەیەی هیندی کۆنەوە هەبێ. وێدەچێ وشەی ↑تەنیشت tenîşt لە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ [تەن ten + ی î + شت ş(ı)t]. لەم تێروانینەوە مانای "تەنیشت" دەبێتە "لابەدەن، قەراخی لەش". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەروەها ژمارەیەک وشە کە پێوەندییان بە چەمکی "کات، دەم"ەوە هەیە، دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمایەتی پەیدا دەکەن، وەک seit (G.) "دواتر،

دێرتر"، Gt.) sainjan) "ئیهمال کردن، وەدوا کەوتن"، OIs.) seim) "هێواش، بەشێنەیی، درەنگ"، MG.) seine) "هێواش، داکەوتوو"، L.) sinere) "هێشتن، هێڵان"، L.) serus) "درەنگ". بەلەبەرچاو گرتنی ئەم وشانە و ماناکانیان دەردەکەوێ کە وشەی ↑شێنەیی şêneyî "سەبر، لەسەرەخۆیی" و ↑شێنی şênî "ئارام" و ↑هەجنین hecnîn "داهێزان، لەشگران بوون" [پێشگری هە he + جنین cınîn] پێوەندییان بەم وشانەی دوایی هەیە. لەلایەکی دیکەوە وێ دەچێ وشەی ↑سات sat "دەم، کات" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی 1: دوو وشەی لاتینی سەرەوە، واتا L.) sinere) "هێشتن، هێڵان" و L.) serus) "درەنگ" خاوەنی پێوەندییەکن کە لە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە E.) let) "هێشتن" و E.) late) "درەنگ" لە یەک ریشەوە هاتوون و خزمن لەگەڵ وشەی کوردمادی *لۆژ* "1- لەشگران 2- پاڵکەوتوو، درێژەوەبوو" [درێژەوەبوو مانای درەنگ بوونیش دەدا]. دیسان سەبارەت بە پێوەندی ئەم دوو چەمکەی سەرەوە سەیری دوو وشەی کوردمادی "هێشتن" و "هێشتا" بکە. تێبینی 2: سەبارەت بە وشەی *سات* "دەم" و پێوەندی بە چەمکی "درێژ بوونەوە، درەنگ بوون" شیاوی باسە کە سەرەتا دوو وشەی "درەنگ" و "درێژ" پێکەوە خزمن، دواتر دەتوانین هەڵی سەنگێنین بۆ وێنە لەگەڵ G.) ewig) "هەمیشەیی، هەرمان" و Nl.) eeuw) "سەدە، سەردەم" و Gt.) aiws) "کات، هەرمان". وەک دەبینرێ چەمکەکانی "کات" و "درێژ بوونەوە" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. هەر ئەم پێوەندییە لەبابەت چەمکی "شوێن"یشدا دەبینرێ. وشەی لاتینی spatium "فەزا" خزمە لەگەڵ "سفرە" و "زاف، زۆر"ی کوردمادی و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەراو بوون(ەوە)، دوور و درێژ بوون(ەوە)"].

**هەت2 het** [ *hat* ] - "وشەی دنەدانی سەگ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ G.) heißen)، haitan Gt.)، hātan OE.)، heta Sw.) "بانگ کردن، ناو بردن، فەرمان دان". وا شیمانە دەکرێ کە ئەم وشانە بچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) kēi(d)- >*** "وە جووڵە خستن". لەم مانایەوە دواتر مانای "تیخوڕین، دنە دان، وادار کردن" پەیدا بووە. L.) citare) "وە جووڵە خستن" و L.) citus) "بەلەز، خێرا" و Gr.) kinein) "جووڵانەوە" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. لە زمانی کوردمادیدا ↑هەچچە heççe "وشەی دنەدانی کەر" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانە هەبێ. ئەم وشەی دوایی هەتتە hette ش دەگوترێ. دە زمانی کوردیدا هەروەها ↑هات hat هەیە [هات و هاوار hat u hawar] کە دیارە لێرەدا "هات" پێوەندی بە "هاتن"ەوە نییە، بەڵکوو پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**هەتا heta** [ *hatā* ] - (هە)تاهەتا(یە) واتا "تا ئەبەد". وەک دەبینرێ وشەکە بە سێ شێوە دەگوترێ کە بریتین لە: هەتاهەتا، هەتاهەتایە، تاهەتایە. وێ دەچێ ئەم دوو "هەتا"یە جیاواز بن لە یەکتری. "هەتا"ی یەکەم دەشێ شێوەی دیکە بێ لە پرێپۆزیسیۆنی "تا" [هە he ی پێشگر + تا ta]. پێوەلکانی پێشگرەکە تەنیا رووالەتی وشەکەی گۆڕیوە و ماناکە هەر وەک خۆی ماوەتەوە [تا ماڵەوە (هەتا ماڵەوە) دەچم، تا ئێوارە (هەتا ئێوارە) کار دەکەم]. "هەتا"ی دووەم مانای "ئەبەد" دەبەخشێ و تێکڕای وشەکە مانای "تا ئەبەد" دەدا. ئەگەر "هەتا"ی دووەم دووبارە کردنەوەی پرێپۆزیسیۆنەکە بێ، ئەوسا مانای "تا ئەبەد" بەدەستەوە نادا. ئێستا بزانین "هەتا" چۆن دەتوانێ بە مانای "ئەبەد" بێ. بۆ پەی بردن بەم مانایە پێویستە سەیرێکی ئەو شی کردنەوە بکەین کە لەژێر وشەی ↑هەت1 het "کن، نک، جەم"دا هاتووە. لەوێ دەبینین کە وشە خزمەکان چەندین مانای جیاوازیان پەیدا کردووە. مانای هەرە بنەڕەتی بریتییە لە "فرێ دان، خستن، هاویشتن". دواتر مانای "(دا)کەوتوو بوون، شۆڕ بوون(ەوە)" پەیدا بووە [دە زمانی

کوردمادیشدا دوو وشەی "خستن" و "(را)هێشتن" خزمن و ئەم پێوەندییەی سەرەوە نیشان دەدەن]. دواتر مانای "کەلەکە، تەنیشت" پەیدا بووە کە ئاماژە بە "بەز و پیوی داکەوتووی کەلەکە" بووە. دواتر مانای "هێواش و شێنەیی" دروست بووە کە دە پێوەندی لەگەڵ چەمکی "شل و شۆڕ بوون و داکەوتوو بوون"دایە [دوو وشەی ش"شل" و "شۆڕ" خزمن]. ئەوجار مانای "درێژە کێشان، درەنگ (بوون)" سەری هەڵداوە و وشەکە پێوەندی بە چەمکی "کات" و ↑سات sat ەوە پەیدا کردووە. ئەم پێوەندییە لە زمانی کوردمادیدا لە دوو وشەی "هێشتن" و "هێشتا"دا بە ئاشکرا دەردەکەوێ [من کارەکەم هێشتەوە (بۆ دوایە)، هێشتا تەواوم نەکردووە]. دواجار لە زمانی کودیدا وشەکە مانای "ئەبەد"ی وەرگرتووە کە ئاماژە بە درێژ بوونەوە (ی کات) و درەنگ بوون دەکا. لەم تیڕوانینەوە "ئەبەد" واتا کاتێکی درێژەوەبوو و درەنگ [هەر دوو وشەی "درێژ" و "درەنگ"یش پێکەوە خزمن].

**هەتار1 hetar** [ *hatār* ] - "کوتکی گەورە": هەترەك hetrek یش دەگوترێ. هەروەها ↑هاتوور hatur هەیە بە مانای "تێڵای شت پێ ورد کردن". وشەی satur (P.) و (Arb.) یش دە فارسی و عەرەبیدا بەکار دێ کە جۆرێك تەورە بۆ ورد کردنی گۆشت.

1- ئەم وشانە لەوانەیە خزم بن لەگەڵ hauen (G.)، houwen (Nl.)، hew (E.)، hugga (Sw.) "لێدان، کوتان، ورد و خاش کردن، لەت و پەت کردن"، cudere (L.) "لێدان، کوتان(ەوە)"، kovat (Rus.) "کوتك لێدان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *kāu- >** "لێدان، کوتان" و دەبنە خزم بۆ وێنە لەگەڵ ↑هاونگ hawıng.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ cut (E.) [پێشتر: cutte، kette، kitte]، cyttan (OE.) "بڕین"، kutte (Noew.)، kuta (Is.) "بڕین بە چەقۆیەکی بچووك". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشەیە باس نەکراوە.

**هەتار2 hetar** [ *hatār* ] - "تاوێرەبەرد، بەردی خلۆرەوەبووک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑هەت1 het، سەر بە ریشەیەك بە مانای "فڕێ دان، هاویشتن، شۆڕ کردنەوە".

2- ↑هەت2 het "وشەی دنەدانی سەگ"، سەر بە ریشەی **(IE.) kēi(d)- >** "وە جووڵە خستن".

**هەتان hetan** [ *hatān* ] - "تامان، چەپەر، تەیمان": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑کۆت[4] "چەپەر" و ↑*قەتیس* "گیرخواردوو، دەور و بەر بەستراو".

**هەتاو hetaw** [ *hatāw* ] - "خۆر": [دە بنەڕەتدا: گەرما و تیشکی رۆژ]. تاو taw یش دەگوترێ. افتاب āftāb (P.). خزمە دەگەڵ ↑تێ te [تا و تێ].

**هەترە hetre** [ *hatra* ] - "1- بازرە، تەرە 2- سەر و بەر کردنی تیر": هەتلە hetle ش دەگوترێ. بە مانای دووەم هەتەر heter یش دەگوترێ. ↑هە [پێشگر] + ترە tıre [↑تەرە tere]. خزمە دەگەڵ ↑تەریك terîk "تاك، دوور کەوتوو".

**هەترە(ش) hetre(ş)** [ *hatraš* ] - "ورە، هیزی دەروون": ↑ئەترەش etreş.

**هەتك hetık** [ *hatık* ] - "سووکایەتی": هەروەها ↑هەتکاندن hetkandın هەیە بە مانای "ئابڕوو بردن". بڕوانە ↑ئەتك etık.

**هەتکاندن hetkandın** [ *hatkāndın* ] - دەچێتەوە سەر ↑هەتك hetk "سووکایەتی".

**هەتلە hetle** [ *hatla* ] - "هەڵوەدا، سەرلێشێواو": خزمە دەگەڵ ↑هەترە hetre "بازرە، تەرە".

**هەتوان hetwan** [ *hatwān* ] - "مەڵحەم": دە بنەڕەتدا *هەسوان hesuwan** بووە [he + suwan ی پێشگر]. و پێوەندی بە کرداری ↑ساوین sawîn ەوە هەبێ [سوون، تیهەڵسوون]. هەتوان واتا

ئەوشتەی کە دە لەشی هەڵدەسوون. کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا پێشگری هە -he زۆر جاریش بە وێنەی ئە -e وێرای وشەگەلێکی دیکە دەردەکەوێ.

**هەتەر1 heter 1** *[ hatar ]* - "ئاگر": شێوەی کۆنتری ↑ئاگر agır.

**هەتەر2 heter 2** *[ hatar ]* - "سەرو بەر کردنی تیر و گوللە، وە ئامانج نەکەوتن و رەت بوون": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەترە hetre.

**هەتەر3 heter 3** *[ hatar ]* - "سوور و پێداگر، مکوڕ":

1- یان خزمە لەگەڵ ↑هەترە(ش) hetre(ş) "ورە، هیزی دەروون". لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ "مکوڕ" کە ئەویش پێوەندی بە ریشەیەکەوە هەیە بە مانای "هێز، توانین".

2- یان خزمە دەگەڵ ↑هەدار hedar "ئارام، ئۆقرە" [دە بنەڕەتدا: سەخت، پتەو].

**هەتەر4 heter 4** *[ hatar ]* - "حوکمی چاو": [چاوم هەتەری لێ ناکا، تا چاو هەتەر دەکا].

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑هەتەر3 heter 3 "سوور و پێداگر، مکوڕ" و ↑*هەترە(ش) hetre(ş)* "ورە، هیزی دەروون"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تین، گەرم و گوڕی". لەم تێڕوانینەوە "هەتەر کردن" واتا پێ وێران، دەرەقەت هاتن، دەسەڵات بەسەردا هەبوون. بەم شێوەیە دەشێ لە مانای "تین، گەرمی"یەوە مانای "هێز و گوڕ" [گەرم و گوڕ] پەیدا بووبێ و لەمیشەوە "دەسەڵات بەسەردا هەبوون، توانایی".

2- لەوانەشە وشەیەکی وەرگیراو بێ و بچێتەوە سەر اثر *asar (Arb.)* "کاریگەری".

**هەتەرێ** hetere *[ hatare ]* - هەروەها هەتارەک hetarek هەیە بە مانای "ئاگرۆکە". هەتەرێ مەتەرێ hetere metere ئاوازێکی منداڵانە کە نەورۆزان دەگوترێ. کەرتی یەکەم مانای "ئاگر" دەبەخشێ و شێوەی کۆنتری ئەم وشەیە [بڕوانە ↑هەتەر1 heter 1 و ↑ئاگر *agır*]. کەرتی دووەم مانای "دایک" دەبەخشێ. تێکڕای وشەکە دەشێ بە مانای "ئاگری دایک" بووبێ، واتا ئاگر وەک ماکە و سەرچاوەی ژیان و بوون دەست نیشان کراوە. دە زمانی کوردمادیدا هەتووڵ مەتووڵ hetul metul یش بە مانای کایەی منداڵانەی "حللور بللوور" بەکار دێ کە دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە فارسیدا دەبێژن اتل متل atal matal (P.).

**هەتەق heteq** *[ hataq ]* - "وتەی گاڵتە کردن" [هەتەق لەو قسە راستە!]. پێشگری هە he + تەق teq. "تەق" شێوەیەکی دیکەیە لە تەح teḧ، [تەک tek، دەک dek].

**هەتەک hetek** *[ hatak ]* - "تەک، نزیک، لا": بڕوانە ↑تەک tek.

**هەتیو hetîw** *[ hatīw ]* - "سێقی، باوک مردوو": یتیم yatīm (P.). ئەم وشەیە دە عەرەبیشدا وەک وشە فارسییەکە بەکار دێ و دەشێ لە زمانی کوردمادی یان فارسی وەرگیرابێ. دەبێ خزم بێ دەگەڵ Stief (G.)، step (E.)، styv (Sw.) "منداڵ یان دایک و باوکی زڕ". کرداری bistiufan (OG.) بە مانای "منداڵ یان دایک و باوک لێ هەستاندن" بووە. stīpan (OE.) بە مانای "رووت کردن، لێ هەستاندن" بەکار هاتووە. [لەباری گۆڕانی فۆتیمی s بە h هەڵی سەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ وشەکانی "هاوین" یان "هاو"]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑سێقی sevî "هەتیو" کە شێوەیەکی دیکە لە وشەی هەتیو hetîw و فۆتیمی t تێیدا سواوەتەوە.

**هەتیوە1 hetîwe 1** *[ hatīwa ]* - "تەختەکوێنی کەنارەی رەشماڵ کە شۆڕ دەبێتەوە": پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە لەژێر ↑هەت1 het 1 "کن، نک، جەم"دا باس کراون. ژمارەیەک لەم وشانە مانای "داکەوتوو بوون، شۆڕ بوونەوە" دەبەخشن.

**هەتیوە2 hetîwe 2** *[ hatīwa ]* - "چەلاکی باریک کە بەر دیرەگی چادر دەدرێ": پێک هاتووە لە پێشگری هە he + تیوە tîwe. کەرتی ئەسڵی وشەکە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑تەمەڵە temele، سەر بە ڕیشەی **< -dhe*) .IE)** "دانان، جێگیر کردن، قایم کردن".

2- ↑دیو dîw، سەر بە ڕیشەی **< -deme* ) .IE)** "تێکخستن، خستنە ناو یەک، خانووکردن، ماڵ دروست کردن". لەوانەیە ئەم دوو ڕیشەیە پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ.

**هەجنین hecınîn** [ *hajnīn* ] - "داهێزان، لەشگران بوون": پێشگری هە he + جنین cınîn. کردارەکە خزمە لەگەڵ sainjan (.Gt) "ئیهمال کردن، وەدوا کەوتن"، seim (.OIs) "هێواش، بەشێنەیی، درەنگ"، seine (.MG) "هێواش، داکەوتوو"، sinere (.L) "هێشتن، هێڵان"، serus (.L) "درەنگ". لە زمانی کوردمادیدا دەبنە خزم لەگەڵ ↑شێنەیی şêneyî "سەبر، لەسەرەخۆیی" و ↑شێنی şênî "ئارام". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑هەت1 het 1 "کن، نک، جەم".

**هەچچە heççe** [ *hačča* ] - "وشەی دەنگ دانی کەر و تێخوڕینی": لەوانەیە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑هەت2 het 2 "وشەی دنەدانی سەگ".

2- ↑کس kıs "وشەی دەنگ دانی مەر و سەگ".

3- جاش caş [↑جاشک caşk]. جاش دە زمانی کۆندا بە مانای "کەر" بووە و بنجی ئەم وشەیە دە زمانە خزمەکاندا بریتییە لە as / es. لەوانەیە "هەچچە" ناو هێنانی ئاژەڵە بووبێ، هەر وەک چۆن بۆ دەنگ دانی "کتک" دەگوترێ "ختتە".

**هەدا heda** [ *hadā* ] - "ئارامی، ئۆقرە": خزمە دەگەڵ ↑هێدی hedî "ئارام، لەسەرخۆ".

**هەدار¹ hedar** [ *hadār* ] - "ئۆقرە، ئارامی": بڕوانە ↑هەدراندن hedrandın.

**هەدار2 hedar 2** [ *hadār* ] - "1- دارایی 2- کەسێک بە پارە ئاریکاری دەکا": دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری he + دار dar و خزمە لەگەڵ دارایی darayî. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "دارا، سامانداز".

**هەدراندن hedrandın** [ *hadrāndın* ] - "ئارام کردن": هەروەها هەدرین hedrîn هەیە بە مانای "ئۆقرە گرتن" و هەدار¹ hedar بە مانای "ئۆقرە، ئارامی".

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑هەدا heda "ئارامی، ئۆقرە".

2- یان پێک هاتووە لە پێشگری هە he + دراندن dırandın و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەندرین [هەن-درین] "ئارام بوون، ئۆقرە گرتن".

**هەدرە hedre** [ *hadra* ] - "1- ئامادەی کار 2- چالاک، چابوک": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ:

1- ڕیشەی **< -(kēi(d ) .IE)** "وە جووڵە خستن". citare (.L) "وە جووڵە خستن" و citus (.L) "بەلەز، خێرا" و kinein (.Gr) "جووڵانەوە" پێوەندییان بەم ڕیشەوە هەیە. لە زمانی کوردمادیدا ↑هەت2 het 2 "وشەی دنە دانی سەگ" لەم ڕیشەوە هاتووە.

2- ↑هەتەر3 heter 3 "سوور و پێداگر، مکوڕ".

[تێبینی: جێی ئاماژەیە کە وشەی "ساز"یش بە مانای "ئامادە" دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز"].

**هەدناندن hednandın** [ *hadnāndın* ] - "خاترجەم کردن": خزمە دەگەڵ ↑هێدی hedî "ئارام، لەسەرخۆ".

**هەدەف hedef** [ *hadaf* ] - "تەپۆڵکە": هە he [پێشگر] + دەف def. کەرتی ئەسڵی وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تەپە tepe. وشەکە هەروەها بە شێوەی هەندەف hendef یش دەگوترێ [تێوەخزانی فۆتیمی n وەک زێدەیەک].

**هەر her** *[ har ]* - "هەموو": [هەر کەس، هەر جار...]. هر har (P.)، خزمە دەگەڵ all (G.)، (E.) و (Sw.)، eall (OE.)، allo (Osk.) "هەموو، هەر"، uile (OIr.) "هەموو، هەر"، aliai (Lit.) "هەموو، هەر". ریشەی ئەم وشەیە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *alnos- <** "گەورە بوون، تەواو، گشت"، دواتر سەر بە ریشەی **(IE.) *al- <** "گەورە بوون، هەڵدان". لەم تێروانینەوە دەشێ ببێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵ kal [پیر و کاڵ]، ↑خاڵ xal و هتد.

**هەر her** *[ har ]* - "ئەحمەق": دەشێ پێوەندی بە ↑هەڵە hele وە هەبێ.

**هەڕ1 her** *[ har ]* - دەگەڵ "گیف" دێ [هەڕ و گیف her u gîf]. هەر و گیف کردن واتا هەرەشە کردن. دەشێ کورتکراوی ↑هەڕەشە hereşe بێ.

**هەڕ2 her** *[ har ]* - "1- زیقەی مندال 2- زەڕەی کەر": خزمە دەگەڵ ↑هەڕاندن herandın و ↑زەڕاندن zerandın و هەروەها عرعر εarεar (P.) "زەڕەی کەر". هەر دوو وشەی "هەڕاندن" و "زەڕاندن" دوو شێوە لە یەک وشەن.

**هەرا hera** *[ harā ]* - "دەنگ، هاوار، قیژە": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەڵا hel(l)a [هەڵڵا هەڵڵا یان هەرا هەرا].

**هەڕا hera** *[ harā ]* - "هەڵاتن": ↑ڕا ra کردنیش دەگوترێ.

**هەڕاج herac** *[ harāj ]* - "شت فرۆشتن لەناو خەڵکدا، کێ نرخی زۆرتر بدا، بۆ ئەو دەبێ": ئەم وشەیە لەوەدەچێ بەئەسڵ وشەیەکی کوردمادی بێ و زمانی عەرەبی وەری گرتبێ و کردبێتی بە حراج ḥarāj (Arb.). دەشێ پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ بە مانای "چوونەسەر، بردنەسەر، بڵیند کردن" وەک ↑هۆریزان horîzan "هەستان"، هرزا hırza "جۆرێک هەڵپەڕکێ"، هوورش hurış [هوورش کردن واتا بڵیند کردن، بەرەوژوور بردن]، ↑هەرستاندن herıstandın "بڵند کردن و راوەشاندن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *reu-, *rei- <** "بزووتن، وە ڕێ کەوتن، هورووژان". ئەم ریشەیە بە دەیان وشەی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لێ کەوتۆتەوە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑*هەوراز hewraz*.

[تێبینی: لە زمانی ئەڵمانیدا وشەکانی Versteigerung و Auktion بە مانای "هەڕاج" بەکار دێن. وشەی یەکەم پێوەندی بە کرداری steigern ەوە هەیە بە مانای "بەرز کردن(ەوە)" و steigen (G.) "وە سەر کەوتن". وشەی Auktion ریشەی لاتینی هەیە و دەچێتەوە سەر augere (L.) "بەرەو ژوور چوون، زۆر بوون"].

**هەڕاز heraz** *[ harāz ]* - "ڕاژان لە جۆلانەدا": هەڕازگە herazge واتا "جۆلانە".

1- یان پێک هاتووە لە پاشگری هە he + ڕاز raz. لەم تێروانینەوە کەرتی ڕاز دەچێتەوە سەر ↑ڕاژان rajan.

2- یان پێوەندی هەیە بە ↑هەرەس heres و هێندیک وشە کە ئاماژە بە چەمکی "بزوان" دەکەن.

**هەڕاژ heraj** *[ harāž ]* - "قرپی ڕشانەوە": ↑هە he [یان ئە e ی پێشگر] + ڕاژ raj. ڕاژ خزمە دەگەڵ ↑ڕشانەوە rışan(ewe).

**هەراس1 heras** *[ harās ]* - "ئارامی، ئۆقرەیی": [هەراسی پێ هەڵگرتووم، دروستترە بڵێین "هەراسی لێ هەڵگرتووم" وەک "ئۆقرەی لێ هەڵگرتووم"]. خزمە لەگەڵ ↑گیرسانەوە gîrsanewe و هەروەها ↑ئۆقرە oqre [o-qıre] و ژمارەیەک وشە کە چەند مانایەکی وەک "سەخت و پتەو بوون"، "قورس و قایم بوون"، "جێگیر بوون، دامەزراو بوون" و "ئارام بوون"

دەردەبڕن. دە وشەکانی "هەراس"، "گیرسانەوە" و "ئۆ-قرە"دا بنجی وشەکە بە سێ شێوەی جیاواز دەردەکەوێ، واتا هەر(اس) her(as)، گیر(س) gîr(s) و قر(ە) qır(e).

**هەراس2 heras** [ *harās* ] - "ترس، دڵەڕاوکێ": هراس harās (P.). هەروەها هەراسە herase مانای "داوەڵ، داهۆڵ" دەبەخشێ. خزمە دەگەڵ ↑هەرەس heres "داڕمان" و گەلێک وشەی دیکە سەر بە ریشەی < ***reu-, *rei-** ***(IE.)*** "بزووتن، هورووژان"، وەک راسان[1] rasan "رژان" و ↑رشتن rıştın، ↑هەراژ heraj "قرپی رشانەوە"، ↑*هەوراز hewraz* و هتد.

[تێبینی: سەبارت بە پێوەندی دوو چەمکی "ترس" و "بزووتن" دەتوانین دەگەڵ وشەی "داچڵەکین" هەڵی سەنگێنین کە مانای "ترسانی زۆر و لەپڕ" دەدا و لە بنەڕەتدا ماناکەی "بزوان، تەکان خواردن"ە].

**هەراش1 heraş** [ *harāš* ] - "گەورە، درشت": دە فەرهەنگدا بە "گەشەکردوو، بەخۆدا هاتوو" مانا کراوەتەوە. بەڵام ئەگەر ماناکە تەنیا ئەوە بێ، ئەوسا ناتوانین وشەی ↑دەمهەراش demheraş "خاوەنی قسەی درشت" ساخ بکەینەوە. دە هەموو ماناکانی ئەم وشەیەدا چەمکی "درشتی، زلی، قەبەیی" دەبینرێ. دە زمانی ئەڵمانیدا großes Maul haben (G.) "لمبۆزی *زل* هەبوون" بەکار دێ بۆ مرۆڤی "دەمهەراش". لەم تێڕوانینەوە دەتوانین وشەی هەراش هەڵسەنگێنین:

1-دەگەڵ ↑هەرزن herzın و وشە خزمەکانی کە هاوکات هەردوو مانای "هەڵداو، گەشەکردوو" و هەروەها " گەورە، درشت" دەگەیەنن.

2- دەگەڵ Riese (G.)، riso (OG.)، reus (Nl.)، rese (Sw.)، wrisilīk (Osäch.) "زەبەلاح، غوول". ریشە ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە.

**هەراش2 heraş** [ *harāš* ] - هەراش هەراش واتا "هەلا هەلا". خزمە دەگەڵ ↑هەرشان herşan "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**هەراش3 heraş** [ *harāš* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاڵاش alaş.

**هەرافتن heraftın** [ *harāftın* ] - "رووخان": هە he + رافتن raftın. شێوەیەکی دیکە لە ↑رمان rıman.

**هەڕاڵە1 herale** [ *harāla* ] - "جاڕ، بانگەواز": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑هەرا hera "بانگ، قاو".

2- Herold (G.) "پەیامدەر، راگەیەنەر". ئەم وشە ئەڵمانییە لە بنەڕەتدا لە دوو کەرتی -hari "لەشکر" و walten "بەڕێوە بردن" پێک هاتووە.

**هەڕاڵە2 herale** [ *harāla* ] - "شکۆفە، پشکۆژ": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گەڵا gela دا باس کراون.

[تێبینی: لە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا ئەو وشانەی مانای "گەڵا" و "شکۆفە" دەدەن، لە یەک ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە لە ئەڵمانیدا Blatt "گەڵا" و Blüte "شکۆفە". دوو وشەی "گەڵا" و "هەڕاڵە" لەباری گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیکەوە هەڵسەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ دوو وشەی "گێرە" و "هاڕین" کە پێکەوە خزمن].

**هەڕاندن herandın** [ *harāndın* ] - "زەڕاندن": خزمە دەگەڵ ↑هەڕ2 her و عرعر εarεar (P.) "زەڕەزەڕ". شێوەیەکی دیکە لە ↑زەڕاندن zerandın.

**هەراو heraw** [ *harāw* ] - "بەربڵاو، جێدار، پان و بەرین": پێک هاتووە لە↑ هە he [پێشگر] + راو raw و خزمە دەگەڵ Raum (G.) "فەزا، جێگا، هۆدە"، سەر بە ئاوەڵناوێکی کۆنی ژێرمەنی

بە مانای "هەراو". "هۆدە" پێوەندییان بەم (E.) room ،(OE.) rum ،(Gt.) rums ،(OG.) rumi وشانەوە هەیە. ئەم وشە ژێرمانییە خزمە دەگەڵ -ravah (Av.) "هەراو"، rus (L.) "وڵات" و ravīnū (OSl.) "تەخت، رێک". وشە کوردمادییەکە دەگەڵ وشە ئەڤێستاییەکە بە باشی یەک دەکرێتەوە و دەنگی هە he لە سەرەتای وشە کوردمادییەکەدا پێشگرێکە کە دە گەلێک وشەی دیکەدا دەبیندرێ، وەک هەتاو، هەنجنین، هەنگاو، هەتوان و هتد. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییانە دیاری نەکراوە. دوو وشەی ↑هیرا hîra "پان و بەرین، هەراو" و هەروەها ↑هێر her "ژووری پیاوان و میوانان" لەوانەیە دەگەڵ "هەراو" خزم بن.

**هەرایی herayî** [ *harāyī* ] - "پان و بەرینی": هەرایەی herayey ش دەگوترێ. هەروەها هەرایەر herayer هەیە بە مانای "دوورتر". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑هەراو heraw.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "پان و بەرین" و "دوور" هەڵیسەنگینە لەگەڵ وشەی ئەڵمانی weit کە هەر دوو مانا دەبەخشێ].

**هەربزە herbıze** [ *harbıza* ] - "کاڵەک": خربزە xarboze (P.)، لەژێر ↑هەرەوەز herewez دا شی کراوەتەوە.

**هەرت hert** [ *hart* ] - هەرت دانەوە واتا "زڤراندنی گا لە خەتی جووتدا". ↑هۆرتە horte.

**هەرتم hertım** [ *hartım* ] - شێوەیەکی دیکە لە هەردەم herdem [↑هەر her + ↑دەم dem "کات، گاو"].

**هەرتووش hertûş** [ *hartūš* ] - "مەڵبەندێکە لە کوردستان": هەروەها هەرتووشی hertûşî ناوی هۆزێکە لە کوردستان. خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کورد kurd دا باس کراون.

**هەرتین hertîn** [ *hartīn* ] - "ئاخ هەڵکێشان": دەشێ خزم بێ لەگەڵ grētan (Gt.) "گریان" [دە بنەڕەتدا: ئاخ و داخ دەربڕین، داد و فیغان کردن]، grüßen (G.)، greet (E.) "سڵاو کردن" [لە بنەڕەتدا بانگ کردن، هەرا کردن]، grel (MG.) "تووڕە، بەقیژەقیژ"، griellan (OE.) "تووڕە کردن". ریشەی هیندوئەورووپی وشەکان باس نەکراوە.

**هەرچڵە herçıle** [ *harčıla* ] - "چەرخ و ئامرازی گواستنەوەی بەرداش": دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری هە he + رچڵە rıçle [کۆنتر: *رتڵە* **rıtle*]. کەرتی "رچڵە" دەبێتە خزم لەگەڵ Rad (G.)، rad (Nl.)، ratas (Lit.)، rota (L.) "چەرج"، rotula (L.) "چەرخۆکە، چەرخی بچووک"، rotare (L.) "خولانەوە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *roto- >** "خرتەک، چەرخ" و دواتر ریشەی **(IE.) * ret(h)- >** "رۆیین، گەڕان، چەرخان، رەت بوون". خرتەک xırtek و هەروەها عرادە εarade (P.) "چەرخ" [کۆنتر: *ئەرادە* **a-rāde*] دوو شێوەی دیکە لەم وشەیە نیشان دەدەن.

[تێبینی: وشەی rund (G.) "خڕ، جەغزی" دەچێتەوە سەر rotundus (L.) "خڕ" و ئەویش لە ریشەکەی سەرەوە وەرگیراوە].

**هەرد1 herd 1** [ *hard* ] - "عەرز، خاک، زەوی": ↑عەرز erız و ئەرد erd یش دەگوترێ. [↑ئەرد erd].

**هەرد2 herd 2** [ *hard* ] - "شاخی سەخت و پڕبەرد": ئەم وشانەی خوارەوەش پێوەدییان بەم وشەوە هەیە: هەردەبانان herdebanan "کۆساران"، هەردە herde "چۆڵ و بیابان" [لەبنەڕەتدا: شاخ و داخ]، هەردە herde "زورکان، دەشتی بە گردولکە"، هەردە herde "تەرە، چۆڵگەرد"، هەردەگێڵ herdegel "چۆلگەرد". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑کورد

kurd دا باس کراون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، پتەو، خار". وشەی زەرد2 zerd یش شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە نیشان دەدا [زەرد و ماە یان ماە و زەرد].

**هەردین herdîn** [ *hardīn* ] - "قەڵس بوون، خەیدین": هەروەها هەرداندن herdandın "تووڕە کردن" هەیە. خزمە لەگەڵ ↑هەرتین hertîn "ئاخ هەڵکێشان".

**هەڕدین herdîn** [ *hardīn* ] - "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون": هەروەها ↑هەرژین herjîn و ↑هەرشان herşan هەر بەو مانایە بەکار دێن. جگە لە مانە ↑هەرستین herıstîn هەیە بە مانای "شکاندن، ورد و خاش کردن" و ↑هەرسەک hersek "هەڵتاوین و هەزمی خۆراک"، ↑هەریسە herîse "چێشتی گەنمەکوتاو". ئەم وشانە گشتیان سەر بە یەک ریشەن و دواجار خزمن دەگەڵ ↑ورد wırd [هورد hurd].

**هەرز2 herız2** [ *harız* ] - "1- سوان و لووس بوون (ی پێچ ) 2- خەسار، فیڕۆ": بە مانای یەکەم لە فارسیدا هرز harz (.P) دەگوترێ. لە زمانی کوردیدا هەرز بوون بە مانای "بە فیڕۆ چوون، زایە بوون" بەکار دێ. هەروەها هەرزڵ herzıl هەیە بە مانای "پواو و رزیوی لەبەر یەک چووک" [هەرزڵ هەرزڵ herzılherzıl]. وشەکە لەناو ئەو خێزانە وشەیەدا جێ دەکرێ کە لە ریشەیەکەوە دێ بە مانای "رێخشاندن، ساوین، نەرم کردن، ورد کردن"، واتا ریشەی > ***greu-*** ***(IE.)*** "ساوین، هاڕین". لەم تیرِوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*هاڕین harîn*، ↑هورد hurd، ↑گەرد gerd، ↑هەرژین herjîn، ↑هەرستن herıstın، هروش hırûş "دووجار وردکراو"، هەریس herîs "ساواری وردکراو" و هتد.

**هەرزا herza** [ *harzā* ] - "ناوچەیەک لە کوردستان، هەروەها ناوی هۆزێک": خزمە لەگەڵ ↑هەرد2 herd "شاخی سەخت و پڕبەرد" و گەلێک وشەی دیکە کە لەژێر ↑کورد kurd دا باس کراون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، پتەو، خار".

**هەرزاڵ herzal** [ *harzāl* ] - "پێرک، سەکۆ": هەرز + ئاڵ [پاشگری ناواندن، کردنە ناو] al + herz. کەرتی "هەرز" خزمە دەگەڵ Arsch (.G)، ars (.OG)، aars (.Nl)، arse (.E)، ars (.Sw) "سمت، ساتان"، سەر بە ریشەی > ***orso-**** ***(IE.)*** "پشتەوە، پاشەوەی لەش" [دەبنەڕەتدا: شوێنی زەق و دەرپەڕیوی لەش]. هەرزاڵ شوێنێکی زەق و دەرپەڕیوە و لەبەر ئەوە بەم جۆرە ناودێر کراوە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "سەکۆ" کە خزمە دەگەڵ "زەق". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ "پێرک" کە ئەویش خزمە دەگەڵ پەڕ3 "ئاخر، دووما" [دەبنەڕەتدا: بان، سەر، لەبان].

**هەرزان herzan** [ *harzān* ] - "کەم بایی": ارزان arzān (.P). دە زمانی فارسیدا هەروەها چەند وشەیەکی دیکە هەن کە لەم بارەوە جێی باس کردنن، وەک ارزش arzeš (.P) "نرخ، بایی"، ارزیدن arzīdan (.P) "بایی دار بوون، نرخان"، ارج arj (.P) "نرخ، رێز"، ارز arz (.P) "دراوی قورس". ئەم مانایانەی سەرەوە بیر بۆ ئەوە دەبن کە "هەرزان" دەبێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ، بەڵام ئایا ئەم پێوەندییە چۆنە؟ چۆنە دە گشت ئەم وشانەدا چەمکی "نرخ" هەیە، بەڵام دە وشەی "هەرزان"دا مانای"کەم نرخی" بەدی دەکری؟ وڵامی ئەم پرسیارە دەتوانین بە بەراوردێک دەگەڵ زمانی ئەڵمانی بدۆزینەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی billig (.G) "هەرزان" هەیە کە دەبنەڕەتدا بەو مانایە بووە کە شتێک، قیمەت و بایەخەکەی شیاو بووە، بە وتەیەکی دیکە مانای ئەم وشەیە "بایەخ گونجاو" بووە. دە زمانی ئەڵمانیدا زۆر جار لەبری وشەی هەرزان وشەی preiswert (.G) "نرخ لەبار، بایەخ هەژی" بەکار دێ و ئاماژە بەوە دەکا کە قیمەتەکە شیاو و پەسەندە. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی "هەرزان"ی کوردمادی

و فارسیش دە بنەڕەتدا هەر ئەو مەبەستەی گەیاندووە، نەك مەبەستی "كەم نرخ". مەبەست لە هەرزان دە بنەڕەتدا "دەهەژێ، دەیهێنێ" بووە [ئەو قیمەتە دەهێنێ، هێژای ئەو نرخەیە كە لە سەری دانراوە]. وشەكە خزمە دەگەڵ ↑هێژا heja "نرخدار، بەرێز"، ↑هەژین hejîn "نرخ هەبوون" [هێژین hejîn یش دەگوترێ، كۆنتر هەرژین herjîn بووە و فۆتیمی r سواوەتەوە، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ارزیدن arzīdan (P.)].

هەرزل **herzıl** [ *harzıl* ] - "ئەنگوتەهەویر": خزمە دەگەڵ ↑هەرزاڵ herzal "پێرك، سەكۆ"، Arsch (G.)، ars (OG.)، aars (Nl.)، arse (E.)، ars (Sw.) "سمت، ساتان"، سەر بە ریشەی < ***orso-** *(IE.)* "پشتەوە، پاشەوەی لەش" [دەبنەڕەتدا: شوێنی زەق و دەرپەڕیوی لەش].

[تێبینی: وێ دەچێ مانای بنەڕەتی ئەم ریشەی سەرەوە بریتی بووبێ لە "چەمانەوە، خڕەكە بوون، زۆپ بوون". لەم مانایەوە دەتوانرێ ماناكانی دیكە، وەك "زەق و دەرپەڕیو بوون" پەیدا بووبێ. لەم بارەوە دەكرێ دەگەڵ وشەكانی "هەنگوتك"، "گونكەهەویر"، "گۆپكە"، "گوان" و "كێو" بەرهەڤی بكەین كە دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی مانای "چەمانەوە" دەبەخشن. وەك ئاشكرایە بە هۆی چەمانەوە لەسەر رووبەرێكی راست، زەق بوون و قیت بوونەوە دێتە ئاراوە].

هەرزن **herzın** [ *harzın* ] - "دانەوێڵەیەكە": ارزن arzan (P.). خزمە دەگەڵ Hirze (G.)، hirzi (OG.)، herse (OE.) "هەرزن"، سەر بە ریشەی < ***ker-** *(IE.)* "خواردن، دەرخوارد دان، هەڵدان، گەورە بوون". Ceres (L.) "خواژنی هەڵدانی گژ و گیا"، creare (L.) "رسكاندن، دروست كردن"، koros (Gr.) "تێر و تەسەل"، crescere (It.) "هەڵدان، گەورە بوون"، šérti (Lit.) "دەرخوارد دان، لەوەڕاندن" لەم ریشەوە هاتوون. دەشێ وشەی ↑هەراش heraş "گەورە، درشت" و ↑چەرە çere [چڵەçıle ، شەوچەلە şewçele] پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ

هەرزە **herze** [ *harza* ] - "1- سووك و چرووك": وشەی هەرزە harze (P.). هەروەها هەرزەكار herzekar هەیە بە مانای "گەنج، تازەلاو". وشەكە لەناو ئەو خێزانەوشەیەدا جێ دەگرێ كە لە ریشەیەكەوە دێ بە مانای "رێخشاندن، ساوین، ورد كردن، نەرم كردن" و دەچێتەوە سەر ریشەی < ***greu-** *(IE.)* "رێخشاندن، ساوین، هاڕین". هەرزە دە بنەڕەتدا بە مانای "سواو" بووە و بە كەسێك گوتراوە كە "سواوەتەوە".[لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "چەقاوەسوو"]. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هەرز herz بوونی پێچ، واتا "سوان"ی پێچ. لەم مانایەوە دواتر دەشێ مانای "خراپ، بەد" پەیدا بووبێ. سەبارەت بە مانای تازەلاویش بۆ وشەی هەرزەكار دەتوانین بڵێین كە مرۆڤی تازەلاو پۆتانسێلی تووش بوون بە كاری چەوت و خراپ، واتا راكێشرانی بەرەوە كاری هەرزە زۆرترە و لەبەرئەمە ئەها ناودێر كراوە. لەم بارە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "جحێڵ" كە دە ئەسڵدا بە مانای "جاهیل و نەزان"ە. "هەرز" هەروەها بە مانای "گیای بژار"یش بەكار دێ و لێرەشدا مانای "خراپ، بەد، بێكەڵك" دەبەخشێ.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمكی "سوان(ەوە)" دەگەڵ "خراپ، بێكەڵك"، بەرهەڤی بكە دەگەڵ وشەی *زایە* "لەكار كەوتوو، بێكەڵك، بە فیڕۆ چوو". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ سایيدە sāyīde (P.) "سواوە" و دە زمانی عەرەبیدا بووەتە ضایع zāyıɛ (Arb.)].

هەرژین **herjîn** [ *haržīn* ] - شێوەیەكی دیكە لە ↑هەردین herdîn "لەبەر یەك بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون". هەروەها هەرژاندن herjandın هەیە بە مانای "1- پلیخاندنەوە 2- لەناو بردن،

نەهێشتن 3- خەسار کردن، خەرج کردنی بێهوودە". هەر سێ مانا لەپێوەندی لەگەڵ یەکتر دان و وشەکە خزمە لەگەڵ ↑هەرز² heriz "1- سوان و لووس بوون (ی پێچ) 2- خەسار، فیرۆ".

**هەرس herıs** [harıs] - "1- فرمێسک، رۆندک 2- ئاخ هەڵکێشان":

1- دەشێ شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑ئەسر(ین) esr(în).

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑هەرتین hertîn "ئاخ هەڵکێشان".

**هەرستاندن herıstandın** [harıstandın] - "بڵند کردن و راوەشاندن": پێک هاتووە لە ↑هەhe [پێشگر] + رستاندن rıstandın و خزمە دەگەڵ ↑هەوراز hewraz [هەو + راز].

**هەرِستن herıstın** [harıstın] - "لێک جووت بوون، پێکەوەلکان": دەچێتەوە سەر ریشەی **< (IE.) *ar-** "چوونەناویەک، تیکبەزین، جووت بوون". چەندین وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەک Arm (G.) "باسک، قۆڵ"، arma (L.) "دەزگا"، ararískein (Gr.) "لێکبەستن، تیکخستن"، árthron (Gr.) "بەند، جومگە"، Art (G.) "هونەر" و هتد. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەرمە herme "شان و پیل، مل".

**هەرستین herıstîn** [harıstīn] - "ورد و خاش کردن، پێ رێخستن": ↑هەردین herdîn "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**هەرسەک hersek** [harsek] - "هەڵتاوین و هەزمی خۆراک": ↑هەردین herdîn "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**هەرشان herşan** [haršān] - ↑هەردین herdîn "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**هەرشتە herışte** [harišta] - "درێژووکەی وەک بەن لە هەویر دروست دەکرێ": ↑هەhe [یان ئە he / e پێشگر] + رشتە rıște. رشتە rešte (P.). دەچێتەوە سەر ↑رستن rıstın. مانای بنەرِەتی وشەکە دەبێتە "ریس، رێسراو، بە بەن کراو".

**هەرِفتن herıftın** [harıftın] - ↑هەرمین hermîn "رمان، رووخان". هەرفین herfîn و هەرافتن heraftın یش دەگوترێن.

**هەرڤە herve** [harva] - "چالاک، چابوک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەرِا hera کردن، ↑خێرا xera، ↑هەرەمە1 hereme "لەن، پەلە" و چەندین وشەی سەر بەم خێزانە. ئەم وشەی دوایی جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑هەڵمەت helmet.

**هەرق herıq** [harıq] - "خەندەق، رەهەند": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Hölle (G.) "دۆزەخ"، hellia (OG.)، halja (Gt.)، hel (E.)، hell (OIs.) "دونیای مردووەکان" یان "دونیای خوارەوە، بنەوە" [دنیای ژێر هەرد؟]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ hol (OE.) "هەلۆڵ"، hole (E.) "کون و کەلێن"، Höhle "ئەشکەوت"، hohl (G.)، holr (OIs.) "هەلۆڵ"، sura (Av.) "کون"، [سوراخ sūrāx (P.)]، سەر بە ریشەی **< (IE.) *kel-** "لێهاڵاندن، شاردنەوە". دە زمانی کوردمادیدا دەیان وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑قالۆر qalor، ↑قەلەم qelem، ↑هاڵان *halan*، ↑هەلۆل helol، ↑کلۆر kılor، ↑هالقە halqe و هتد.

**هەرکی herkî** [harkī] - "ناوی هۆزێکە لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانە کە لەژێر ↑کورد *kurd* دا باس کراون، بەتایبەتی هەڵی سەنگێنە لەگەڵ ↑هێرک2 herk "گاشەبەرد".

**هەرکین herkîn** [harkīn] - "نەزۆک بوون": هەروەها هەرکان herkan "نەزۆک، ستیور" و هەرکاندن herkandın "نەزۆک کردن" هەیە. خزمە دەگەڵ ↑هێرک2 herk "گاشەبەرد" و دواتر ↑خار xar "سەخت، رەق". لەباری ماناوە دەتوانین لەگەڵ وشەی "ئەستیور" هەڵیسەنگێنین، بڕوانە تێبینی خوارەوە.

[تێبینی: ستێور stewır (ئەستێورestewır ) خزمە دەگەڵ Sterke (.G) "مانگای جەوان (کە هێشتا نەزاوە)"، stairo (.Gt) "نازا، ستێور"، stari (.OIn) "مانگای شیر نەدەر"، سەر بە ریشەی < *ster- (.IE) "رەق، سفت". لە زمانی کوردمادیدا هەوەها وشەی "قسر" مانای "نەزۆک" دەدا کە ئەویش لە بنەڕەتدا بە مانای "هیشک"ە. وێ دەچێ مەبەست لەم وشانە ئاماژە بە رەق بوون یان هیشک بوونی گوان (مەمک)ی ئاژەڵ و مرۆڤی مێینەی نەزۆک بێ کە لەبەر بەدنیا نەهێنانی بێچوو هیشک و رەق دەمێنێتەوە، شیر نادا و تەڕ و بڕ نییە].

**هەڕ(گ) her(ıg)** [ har(ıg) ] - "قوڕ": حەرگ ȟerg، حەڕی ȟerî و هوڕی hurî یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑غەرە ġere "چەسپ، سرێشی دارتاشان".

**هەرگیز hargîz** [ hargīz ] - "هیچکات": هەرگیس hergîs ش دەگوترێ. هرگز hargez (.P). پێک هاتووە لە دوو کەرتی ↑هەر her + گیز gîz. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑کەژ kej "وەرزی ساڵ" و دواتر ↑کات kat "وەخت، دەم" و ↑کەشە keşe "جار". مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "هەردەم، هەرتم".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا "هەرگیز" دەبێتە niemals (.G). وشە ئەڵمانییەکە لە دوو کەرتی nie + Mal پێک هاتووە. کەرتی یەکەم لێرەدا ماناکەی دەبێتە "هیچ" و کەرتی دووەم مانای "جار" و "دەم، ژەم" دەبەخشێ. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "هیچجار، هیچکات"].

**هەرگین hergîn** [ hargīn ] - "دروستکراو لە قوڕ، سواڵەت": هەرگینە hergîne ش دەگوترێ. ↑هەڕگ herıg "قوڕ".

**هەرلە herle** [ harla ] - "جاڵجاڵووکە":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑کر kır "تەون"ەوە هەبێ.

2- یان لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی < *ar- (.IE) "تێکخستن، تێکبەزاندن، پێکەوە لکاندن". وشەی ↑هەڕستن herıstın "لێک جووت بوون، پێکەوەلکان" لەم ریشەوە هاتووە].

**هەرمان herman** [ harmān ] - "کار، شوغل": لەوانەیە پێوەندی بە ↑ئەرک erk ەوە هەبێ.

**هەرمووسک hermusk** [ harmūsk ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑جرجەمشک cırcemışk. جرجە cırc و هەر her دوو شێوەی دیکەن لە زەر(د) zer(d). ئەم ناوە دەشێ ئاماژەی بە رەنگی کاڵی ئەو جۆرە مشکە کردبێ بۆ جیا کردنەوەی لە مشکی ئاسایی کە رەنگی تاریکترە.

[لەباری گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیکەوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ هەر2 "شاخی سەخت و پڕبەرد" و *زەرد* (ماە و زەرد)].

**هەرمووش hermûş** [ harmūš ] - "هێشووەترێی بەدارەوە وشک بوو": کەرتی هەر -her دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ئارا ara "دەشت، زەوی"یەوە و دە بنەڕەتدا بە مانای "هیشک، سووتاو". کەرتی مووش mûş دەشێ پێوەندی بە مێوژ mewıj ەوە هەبێ.

**هەرمە herme** [ harma ] - "شان و پیل، مل": خزمە دەگەڵ Arm (.G)، arms (.Gt)، arm (.E) و (.Sw) "قۆڵ، باسک، پیل"، armu (.L) "باسک، شەپیلک"، -irmāh (.OIn) "باسک"، ramo (.OSlav)، artus (.L) "جومگە"، árthron (.Gr) "جومگە، پیل"، ars (.L) "هونەر"، arma (.L) "دەزگا، چەک وچۆڵ". وشەی army (.E) "سوپا" دەچێتەوە سەر ئەم وشە لاتینییە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *ar- (.IE) "تێکخستن، تێکخستنەوە". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەک وەک↑ ئامور amur، ↑ئامێر amer و ↑هەرچڵە herçıle "چەرخ و ئامرازی گواستنەوەی بەرداش" و هتد.

**هەڕمین hermîn** [ *harmīn* ] - "ڕووخان": هەڕفتن herıftın یش دەگوترێ. هە he [پێشگر] + ڕم -rım / ڕڤ -rıv. شێوەیەکی دیکە لە ↑ڕمان rıman.

**هەرمێ herme** [ *harme* ] - "ناوی میوەیەک": دە فارسێ بەرێدا امرود amrūd هەبووە کە دە زمانی فارسی نوێدا بەکار نایە. ئەم وشەیە دە زمانی پەهلەویدا anbrōt (Pl.) "هەرمێ" بووە. دەشێ ئەم وشەیە لە دوو کەرتی brōt [بەر؟] + an پێکهاتبێ. کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا هەن hen- دەناو ناوی هێندێک لە میوەکاندا دەر دەکەوێ وەک هەنجیر، هەنار، هەنی، هەنگوور. ئەم کەرتەوشەیە هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn. وشە کوردمادییەکە دەشێ گۆڕدراوی وشەیەکی کۆنتر بێ لە چەشنی وشەکەی پەهلەوی یان فارسی بەرێ. کەرتی دووەمی وشەکە [brōt (Pl.)] کە کەرتی ئەسڵی وشەکەیە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ pirum (L.) "هەرمی". وشەکانی Birne (G.) و pear (E.) "هەرمی" لەم وشە لاتینییە وەرگیراون.

**هەرمێشک hermêşk** [ *harmešk* ] - "تیکوشینی نانی گەرم لە رۆندا": شێوەیەکی گۆڕدراوی ↑هەڤریشک hevrîşk.

**هەڕنین hernîn** [ *harnīn* ] - "1- مان گرتن، جەنە گرتن 2- غەزرین": بە مانای یەکەم هەڕمین hermîn یش دەگوترێ. وێ دەچێ شێوەی "هەڕنین" راستتر بێ، چونکوو ئەم شێوەیە لەگەڵ وشەی ↑گرنە gırne ش یەک دەگرێتەوە. "گرنە" بە مانای "پەڵپ گرتنی منداڵ بە گریانەوە" بەکار دێ. دوو چەمکی "مان گرتن" و "تووڕە بوون" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. ئەم پێوەندییە لە وشەی "غەزرین"یشدا بەدیار دەکەوێ کە هەر دوو مانای سەرەوە دەبەخشێ. ئەم پێوەندییە هەروەها لە وشەکانی گرنە gırne یان ↑گڕوو gırû شدا دەر دەکەوێ، چونکوو ئەم وشانەش لە بنەڕەتدا هاوکات هەر دووو چەمکی "تووڕە بوون" و "پەڵپ گرتن" [مان گرتن، بە قسە نەکردن] دەبەخشن. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ژمارەیەک وشە لە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە لە بنەڕەتدا مانای "دەنگ هەڵبرین، قیژاندن" دەگەیەنن، دواتر لەم مانایەوە مانای "تووڕە بوون" سەری هەڵداوە. لە زمانی کوردمادیدا هەروەها مانای "مان گرتن" یان "پەڵپ گرتن"یش پەیدا بووە کە ئەویش دیارە پێوەندی بە تووڕە بوونەوە هەیە. بۆ خزمەکانی ئەم وشەیە بڕوانە ↑گریان *gıryan*.

**هەرووم herum** [ *harūm* ] - "چەمووش": دەشێ پێوەندی هەبی بە ↑گرمە gırme "دەنگی توند و بەهێز"، grimm (G.)، grim(mi) (OE.)، grim (E.)، grym (Sw.) "بەگرمە، قەڵس و تووڕە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ghrem- >*** "گرماندن، گوڕڕاندن". هەروەها chremizein (Gr.) "حیلاندن، حیلکاندن، خرمژن" لەم ریشەوە هاتووە. "هەرووم" واتا وەڵاخێک کە لە تووڕەییان دەحیلێنێ.

**هەروەتر herwetır** [*harwatır* ] - ئەم وشەیە جیاوازە لە "هەروەها". دە شێوەزاری ئەدەبی ناوەڕاستدا، "هەروەها" مانای "هەروەتر"یشی وەرگرتووە، بەڵام لە راستیدا ماناکەی جیایە و ئەم دوو وشەیە چ لەباری وشەسازییەوە و چ لەباری ماناوە جیاوازییان دەگەڵ یەکتر هەیە. وشەی هەروەها بەم جۆرە دروست کراوە: "هەر + وەها" و ماناکەی دەبێتە دە فارسیدا دەبێتە "همچنین"، یان دە زمانی ئەڵمانیدا ebenso یان ebenfalls. بۆ وێنە کەسێک دەڵێ "من حەز دەکەم قاوە بخۆمەوە". ئەگەر هاواڵەکەشی حەز لە قاوە بکا دەڵێ "منیش هەروەها"، واتا هەردوو لا وەک یەکتر حەز لە قاوە دەکەن و حەزێکی هاوشێوەیان هەیە. بەڵام وشەی "هەروەتر" ناتوانێ دە ئەسڵدا "هەروەها- تر/ هەروا-تر" بووبێ، چونکوو ئەمە هیچ مانایەک بە دەستەوە نادا. ئەم وشەیە بەم جۆرە دروست کراوە: هەر + وەتر her + wetır. کەرتی ئەسڵی

وشەکە، واتا وەتر wetır- وشەیەکی بەتەواوی جیایە لە "وەها". "وەتر" خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑واز[5] waz دا شی کراونەوە و خزمە دەگەڵ weiter (G.) "1- دوورتر 2- هەروەتر، دواتر، دیسان، دەی". ئەم وشەیە دە زمانی ئەڵمانی و کوردمادیدا وەك یەك بەکار دەهێنرێ، بۆ وێنە: کابرا قاوەیەکی خواردەوە و هەروەتر لیواتیك ئاویشی لەسەر خواردەوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بەدوای قاوەکەدا، واتا لە درێژەی کاری یەکەمدا، کاری دووەم رووی دا.

**هەرە1 here 1** [ *hara* ] - "نیشانەی ئاوەڵناو لە دۆخی باڵاتریندا ": [هەرە باش، هەرەبەرز، هەرەجوان...]. دە ئەوێستادا haraiti- bereza (Av.) بە مانای "شوێنی هەرەبەرز" هاتووە. دەشێ ئەم وشەیە بچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *al- <** "هەڵدان، گەورە بوون، بەرز بوون". چەندین وشە دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەك eōro (Gr.) "هەڵهێنان، بەرز کردنەوە"، elatio (L.) "بەرزی، بەرز بوونەوە، altus (L.) "بلیند، بەرز"، alere (L.) "هەڵدان، گەورە بوون"، alan (Gt.) "هەڵدان"، ala (OIs.)، alan (OE.) "خواردن پێدان، پەروەردە کردن"، alt (G.)، old (E.) "پیر، کۆن" [تەمەن بەرز]. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەك پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە، وەك ↑هەلاندن helandın "بەرز کردنەوە"، ↑هەڕەت heret "جەنگە، تاف، ئەوج" [دە "هەرەتی جەوانیدا"، واتا دە تەمەنی لاوەتیدا یان دە ئەوجی لاوەتیدا].

**هەرە2 here 2** [ *hara* ] - هەرەکردن واتا "ریز کردنی خشت لەسەر تەنیشت بۆ هیشك بوونەوە". هرە here (P.) "رەفعە، تاقە". خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz.

**هەڕە here** - "مشار": ارە erre (P.).

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Ahle (G.)، āla (OG.)، aal (Nl.)، æl (OE.)، ārā (OIn.) "درێشە، درپشە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ela- <**. لەوانەیە مانای وشەکە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و لە "درێشە"وە گۆڕابێ بۆ "مشار". یان لەوانەیە ئەم ریشەیە مانایەکی کۆنتری لەچەشنی "بڕین، قەڵشاندن، درز تێخستن" هەبووبێ و لەمەوە ماناکانی "درێشە" و "مشار" پەیدا بووبن.

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *gher-, *ghre- <** "تیژ بوون، زەق و دەرپەڕیو بوون" و ئاماژە بە ددانەکانی مشار بکا. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قەراخ qerax. [گۆڕانی فۆتیمی g بۆ h لە وشەی "هاڕین"یشدا بەدی دەکرێ].

**هەرەت heret** [ *harat* ] - "تاف": بۆ وێنە دەگوترێ "هەرەتی لاوەتی".

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ Alter (G.)، ealdor (OE.)، alder (Sw.) "تەمەن" [دواتر هەروەها بە مانای: سەردەم، رۆژگار]، alt (G.)، old (E.) "پیر، کۆن، بە تەمەن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *al- <** "هەڵدان، گەورە بوون، بەرز بوونەوە، چوونەسەری تەمەن، پیر بوون". لەم تێڕوانینەوە هەڕەت دەتوانێ دە بنەڕەتدا بە مانای "تەمەن" بەکار هاتبێ و مەبەست لە "هەڕەتی لاوەتی" هەمان "تەمەن یان سەردەمی لاوەتی" بووبێ. شیاوی باسە وشەی "تاف"یش [تافی لاوەتی] خزمە دەگەڵ وشەی "تەمەن" و دە بنەڕەتدا هەمان مانا دەدا. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر مەبەست لە هەرەت "ئەوج" بی [هەڕەتی لاوەتی واتا "ئەوجی لاوەتی"، دیسانیش هەر دەگەڵ ریشەی باسکراو یەك دەگرێتەوە، چونکوو دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەندین وشە بە مانای "بەرز و بەرز بوونەوە" لەم ریشەوە سەرچاوە دەگرن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەرە[1] here [هەرەجوان، هەرە باش].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑هەرین herîn بە مانای "ڕۆیشتن". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دە بنەڕەتدا دەتوانێ بە مانای "قەدەم، مەرحەلە، قۆناخ" بووبێ.

[تێبینی: لەباری دروست بوونی مانای "مەرحەلە" لە وشەیەک بە مانای ڕۆیشتن هەڵی سەنگینە دەگەڵ "گاو" بە مانای "کات". دە زمانی لاتینیشدا gradus "پلە، پلە وپایە" دە بنەڕەتدا بە مانای "قەدەم" بووە و دەچێتەوە سەر gradi "ڕۆیشتن". دە زمانی عەرەبیدا "رحل" و "مرحلە" لە ریشەیەکن].

**هەرەس heres** ⌈ *haras* ⌉ - "رووخان، داکەوتن": خزمە دەگەڵ ↑هەوراز hewraz "سەربەرەژوور".

**هەڕەشە hereşe** ⌈ *haraša* ⌉ - "گەف کردن، ترساندن": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەرتین hertîn "ئاخ هەڵکێشان"، (Gt.) grētan "گریان" [دە بنەڕەتدا: ئاخ و داخ دەربڕین، داد و فیغان کردن]، (G.) grüßen، (E.) greet "سڵاو کردن" [لە بنەڕەتدا بانگ کردن، هەرا کردن]، (MG.) grel "توورە، بەقیژەقیژ"، (OE.) griellan "توورە". ئەم وشانە لەوانەشە خزمایەتییان هەبێ دەگەڵ ↑گوڕڕە gur(r)e و گوڕەشە gureşe. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ئارێشە arêşe هەیە بە مانای "کێشە، گیر و گرفت" کە دەشێ پێوەندی بە وشەی "هەڕەشە"وە هەبێ.

**هەرەمە1 hereme 1** ⌈ *harama* ⌉ - "لەز، پەلە": خزمە دەگەڵ ↑هەڕا hera کردن و چەندان وشەی دیکە کە مانای "پەلە و خێرایی" دەبەخشن.

**هەرەمە2 hereme 2** ⌈ *harama* ⌉ - "برەو، رمێن": هە he + رەمە reme. خزمە دەگەڵ ↑رمێن rımen "برەو".

**هەڕەمە hereme** ⌈ *harama* ⌉ - "پرانی، ئاپۆرە": پێشگری هە he + رەمە reme. بڕوانە ↑رەمەکی remekî.

**هەرەوەز herewez** ⌈ *harawaz* ⌉ - "زبارە، کاری بەکۆمەڵی کشت و کاڵی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) Herbst "پاییز". ئەم وشە ئەڵمانییە دەبنەڕەتدا بە مانای "بەر و بۆم" بووە و خزمە دەگەڵ (OE.) harfest، (OF.) harfst، (L.) carpere، (Gr.) carpos "بەر و بۆم"، (L.) kirpti "لێکردنەوە"، (Rus.) erp، (Gr.) kröpion "داس". لەبەر ئەوەی سەردەمانی زوو هەڵگرتنەوەی بەر و بووم لە پاییزدا بەشێوەی کاری بە کۆمەڵ ئەنجام دراوە لەوانەیە لێرەوە وشەی هەرەوەز مانای "کاری بە کۆمەڵ لە هەڵگرتنەوەی بەر و بووم"ی وەرگرتبێ. خربزە (P.) xarboze و ↑هەربزە herbıze "کاڵەک" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**هەریسە herîse** ⌈ *harīsa* ⌉ - "چێشتی گەنمەکوتاو بە گۆشتەوە": خزمە دەگەڵ ↑هەردین herdîn "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**هەرین herîn** ⌈ *harīn* ⌉ - "ڕۆیشتن": وەرین werîn یش دەبێ شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە بێ. [هەڕۆ، وەرە]. سێ شیمانە ڕێی تێ دەچێ:

1- لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *rei-, * er(e)- <** "بزوان". هەڵی سەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ ↑راسان rasan و ↑هەرەس heres.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە (G.) eilen، (OG.) īllan، (Nl.) ijlen "بە پەلە ڕۆیشتن، پەلە کردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ei- , *iē-, *iā- <** "ڕۆیین". هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە دەچنەوە سەر ریشەیەک کە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەکەی سەرەوە: (G.) Jahr، (OG.) jār، (E.) year، (OE.) gēar، (OF.) jēr، (Sw.) ar "ساڵ"، (Gr.) hōra "کات و سات، وەرزی ساڵ"، jara (Rus.) "بەهار"، (Av.) yar- "ساڵ"، (G.) Uhr "سەعات" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی

+ ar پێر + ئار] perar ده‌ وشه‌ی ↑پێرار *(IE.) * iēro- >* "ساڵ". شێوه‌ی كۆنی ئه‌م وشانه‌ی دوایی
per] دا به‌دی ده‌كرێ، واتا ساڵێك كه‌ رۆیشتووه‌. وشه‌كانی ↑ساڵ sal و ↑*هاتن hatın* یش
پێوه‌ندییان به‌م وشانه‌وه‌ هه‌یه‌.
3- gradi (L.) "رۆیشتن". ریشه‌؟
**هه‌زار hezar** *[hazār]* - "ده‌جار سه‌د":
[تێبینی: وشه‌ی tausend (G.) "هه‌زار" و هاوتاكانی ده‌ زمانه‌ ژێرمانییه‌كاندا ده‌ بنه‌ڕه‌تدا
*tūshundi** "فره‌سه‌د" بووه‌ كه‌ پێك هاتووه‌ له‌ دوو به‌ش: tau "هێز، توان"، سه‌ر به‌ ریشه‌ی >
*teu-** *(IE.)* "هێز، توان، هه‌ڵمساوی، ئه‌ستوورایی" كه‌ خزمه‌ ده‌گه‌ڵ tāvīsī (OIn.) "تاو، تابشت،
هێز" و ده‌گه‌ڵ "تاو و توانین"ی كوردمادی. به‌شی دووه‌می وشه‌كه‌ بریتییه‌ له‌ hundert "سه‌د"].
به‌ له‌به‌ر چاو گرتنی پێوه‌ندی نێوان دوو چه‌مكی "هێز" و "هه‌زار" له‌وانه‌یه‌ وشه‌ی هه‌زار hezar
خزم بێ ده‌گه‌ڵ ↑ هێز hez.
**هه‌زاره‌[1] hezare [1]** *[hazāra]* - هه‌زاره‌ كردن واتا فكر و خیاڵات كردن(ی خه‌وزڕاو). هه‌سه‌ر
heser یش ده‌گوترێ. خزمه‌ ده‌گه‌ڵ ↑هزر hızır "بیر".
**هه‌زاره‌[2] hezare [2]** *[hazāra]* - "1- به‌ردی قیتی لێواری حه‌وز 2- لێواری تاقه": وه‌ك دیاره‌
وشه‌كه‌ مانای "قه‌راخ، لێوار" ده‌دا. بنه‌وشه‌ی هه‌ز -hez خزمه‌ ده‌گه‌ڵ Ecke (G.)، egge (OG.)،
edge (E.)، ecg (OE.)، egg (Sw.)، eg(ge) (Nl.) "گۆشه‌، سووچ"، سه‌ر به‌ ریشه‌ی *< -ak* , -ok**
*(IE.)* "تیژ، تیژایی". خزمه‌ ده‌گه‌ڵ ↑ئاژنین ajnîn "كون كون كردن، ده‌رزی تێراكردن" و چه‌ند
وشه‌ی دیكه‌. شیاوی باسه‌ وشه‌ی "قه‌راخ"یش له‌ ریشه‌یه‌كه‌وه‌ دێ به‌ مانای "تیژ بوون، ده‌رپه‌ڕیو
بوون".
**هه‌زاز hezaz** *[hazāz]* - "هه‌ره‌سی كێو و كه‌نداڵ": ↑هه‌ژان hejan "بزوانی توند، بزوانی
له‌نه‌كاو".
**هه‌زوێڵه‌ hezwele** *[hazwela]* - "وشكه‌گیا و شتی تام و بون خۆشكه‌ری چێشت، ئه‌دویه‌جات،
به‌هارات": خزمه‌ له‌گه‌ڵ ↑هیشك hîşk. بۆ كه‌رتی دووه‌می وشه‌كه‌ بڕوانه‌ ↑واڵه‌ wale
[ورده‌واڵه‌، ئاسنه‌واڵه‌، دانه‌وێڵه‌]
[له‌باری ماناوه‌ هه‌ڵی سه‌نگێنه‌ له‌گه‌ڵ Droge له‌ زمانه‌ ژێرمه‌نییه‌كاندا به‌ مانای "داو و
ده‌رمان". ئه‌م وشه‌یه‌ خزمه‌ له‌گه‌ڵ وشه‌ی ئه‌ڵمانی و ئینگلیزی trocken و dry "هیشك". له‌
زمانی فارسیدا وشه‌ی عه‌ره‌بی"ادویه‌" به‌مانای "هه‌زوێڵه‌" به‌كار دێ كه‌ ده‌ بنه‌ڕه‌تدا به‌ مانای داو
و ده‌رمانه‌. هه‌روه‌ها وشه‌ی كوردمادی "ده‌رمان"یش ده‌شێ ده‌ بنه‌ڕه‌تدا ئاماژه‌ به‌ گژ و گیای
هیشككراو بكا، له‌م باره‌وه‌ بڕوانه‌ وشه‌ی "ته‌رم"].
**هه‌زه‌خ hezex** *[hazax]* - "1- پیرۆز و مبارك 2- به‌رێژه‌و، به‌ حاسڵ": ده‌شێ خزم بێ ده‌گه‌ڵ
↑هێژا heja "به‌نرخ" [↑هێژان hejan "نرخ هه‌بوون"].
**هه‌زیر hezîr** *[hazīr]* - "به‌راورد، قرسان": هه‌زیر كردن واتا "قرساندن، به‌راورد كردن". خزمه‌
له‌گه‌ڵ ↑هزر hızır "بیر، لێكدانه‌وه‌".
**هه‌زین hezîn** *[hazīn]* - "به‌رز و نه‌وی بوونی سینگ له‌ نه‌فه‌س ته‌نگیدا": ↑هه‌ژان hejan.
**هه‌زینگ hezîng** *[hazīng]* - "راپه‌ڕ، شنگڵ": [هه‌زینگ دا خۆ].هه‌روه‌ها هه‌زهه‌ز hezhez هه‌یه‌
به‌ مانای "باڵ لێكدانی بێچووه‌كۆتر". خزمه‌ له‌گه‌ڵ ↑هه‌ژان hejan.
**هه‌ژ hej** *[haj]* - "1- هیشك 2- ده‌شتی هیشكارۆ": بڕوانه‌ ↑هیشك hîşk. سه‌باره‌ت به‌ مانای
دووه‌م هه‌روه‌ها بڕوانه‌ ↑ئارا ara "ده‌شت، پانتایی".

**هەژار hejar** [ *hažār* ] - "نەدار، دەستکورت، بێچارە": خزمە دەگەڵ hager (G.) "کز، لاواز". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *kak- (IE.)** "کز بوون، کەم بوونەوە". وشە ژێرمەنییەکە هەڵ دەسەنگێنرێ دەگەڵ kasauu- (Av.) "کەم، کچکە" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑کز kız، ↑گچکە gıçke، ↑کش kış [کش و مات]، ↑کوشتن kuştın، ↑کووژانەوە kujan(ewe)، ↑کچ kıç [کیژ kîj]، کاستن kāstan (P.) "کەم کردنەوە" و هتد. ئەم وشانە گشتیان هاوبەشن دە چەمکی "کەمی، کزی، گچکەیی" یاخود "کەم بوونەوە، لەکزی دان، لەناو چوون"دا.

**هەژان hejan** [ *hažān* ] - "راتڵەکان، شەکانەوە": لەم پێوەندییەدا ژمارەیەک وشەی دیکەش جێی ئاماژە کردنن کە بریتین لە ↑هاج hac [هارو هاج]، ↑خێزیان xezyan یان بە شێوەکەی دیکەی ↑هەستان hastan [خاستن xāstan (P.)]،↑غیژ ĝîj "لوور بوونەوە"، ↑گوژین gujîn "لوور بوونەوە، بەتەوژم هاتنەخوار"، ↑گوزم guzım "بارانی بە تەوژم"، ↑هەزاز hezaz "دارمانی کێو" هەزینگ hezîng "راپەڕ، شنگڵ"، ↑هەژڤین hejvîn "ترسان" [دەبنەڕەتدا: راتڵەکان، راچڵەکان]، ↑هەژقین hejqîn "شێویان و کەوتنە دڵەخورپە"، گژگژ gıjgj "وشەی دنەدانی جوانەگا"، ↑گژگژاندن gıjgıjandın "هان دان، دنە دان" [برانگیخت ber-an-gīxt (P.) "دنەی دا" و برمی انگیزد ber- mī- an-gīzad (P.) "دنە دەدا"، بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ئەنگیز engez]. دە زمانی عەرەبیدا هزة hazza (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و لەوانەیە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. سەبارەت بە ریشەی ئەم وشانە دەشێ چوار شیمانە ئاماژەیان پێ بکرێ.

1- ریشەی **< *ĝheis- (IE.)** "وروژاو، قەڵس، توورە".

2- ریشەی **< *aig- (IE.)** "بزوانی توند". ācol (OE.) "داچڵەکین"، eikinn (OIs.) "توند، خێرا، هار و هاج"، igrat (Rus.) "لەیزین، کایە کردن" لەم ریشەوە هاتوون.

3- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 10) لەژێر پاشگری اخیز āxīz- دا ئاماژە بە کراوە بە ریشەی **< *haiz-** "تەکان خواردن، جوولانەوە، هەستان". لەوێدا روون نەکراوەتەوە کە ئایا ئەم ریشەیە ریشەیەکی ئێرانییە یان بەگشتی هیندوئەورووپییە.

4- ↑گژاندن gıjandın "تێکەڵ پێکەڵ کردن"، ↑گیزان gîzan "لێکدرانی تراو، شڵەقان" و دواتر ↑گیژ *gej*.

**هەژدەر hejder** [ *haždar* ] - "قسەی بە پەلە": [هەژدەرهەژدەر قسە دەکا]. ئەم وشەیە لەوە ناچێ پێوەندی بە هەژماری "هەژدە"وە هەبێ، بەڵکوو لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *ag- (IE.)** "بەرەو پێش بردن، رەپاڵ دان، وە پیش دان" و ببێتە خزم دەگەڵ ↑ئاژۆتن ajotın. لەوانەیە وشەی فارسی اژدر aždar (P.) "رۆکێتی ژێردەریایی" لەم ریشەوە هاتبێ.

**هەژڤین hejvîn** [ *hažvīn* ] - "ترسان": خزمە دەگەڵ ↑هەژان hejan "جووڵان، تەکان خواردن". مەبەست سەرەتا جووڵانەوەی توند لە ترسان بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "داچڵەکین، راچڵەکین" کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بزواتێکی خێرا، هەڵبەزینەوە".

**هەژقین hejqîn** [ *hažqīn* ] - "شێوان و خورپە کەوتنە دڵ": دەچێتەوە سەر ↑هەژان hejan "جووڵان، تەکان خواردن". فۆتیمی ق q لەم وشەیە دا نیشانە یاخود ناوگری جەخت کردنە [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "هەڵپرووزقان، هەڵبزووقین، جنقین، چرمقین" و هتد]. وشەکە هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑هەژڤین hejvîn "ترسان".

**هەژک hejk** [ *hažk* ] - لەگەڵ "بژاڵ" یان "بەژک" دەگوترێ [hejk û bıjal, hejk u bejk] بە مانای "پووش و پاڵ". هەروەها هەشک heşk هەیە بە مانای "چیلکە و چاڵ". وشەکە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- ↑ئاشغاڵ aşġal.

2- ↑هیشک hîşk. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑هەژگەل hejgel "چیلکە و چاڵی ئاوردوو".

[تێبینی: "بژاڵ" یان "بەژک" پێوەندی پەیدا دەکا بە هێندێک وشەی وەک بێژتن2 bejtın "لە هێڵەک دان"، بێژینگ bejîng، بژار bjar، بژاردن bıjardın و هتد. ئەم وشانە لە بنەڕەتدا ئاماژە دەکەن بە "جیا کردنەوە". بژاڵ یان بەژک ئەو چیلکە و چاڵە (هیشکە)یە کە جیا دەکرێتەوە، خزمە دەگەڵ ↑بژار bıjar].

**هەژ(گ)1 hej(g)** [ *hažg* ] - "لکەداری هیشک": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑هیشک hîşık.

2- ↑هاچە haçe "لکەدار".

**هەژگ2 hejg** [ *hažg* ] - "بەلەک": دەشێ پێک هاتبێ لە ↑هە he [پێشگر] + ژگ jıg. "ژگ" خزمە دەگەڵ ↑شەق şeq و ↑چۆک çok، هەڵی سەنگینە دەگەڵ ساق sāq (P.) "بەلەک".

**هەژگ3 hejg** [ *hažg* ] - "تۆکڵی سەوزی میوە": هەژ hej + گ g [پاشگر]. خزمە لەگەڵ ↑قاشڵ qaşıl "تۆکڵ" [قاش qaş + ڵ ıl].

**هەژگ4 hejıg** [ *hažg* ] - "رەشکە، تۆڕی کا کێشان": هەروەها ↑حیشی ħîşî یان هێشی ħêşî هەیە بە مانای "گوریسی پان و درێژ". دەشێ دە بنەڕەتدا پێک هاتبێ لە پێشگری هە he + ژە je + پاشگری کردنەناوی ık. بنجی "ژە" خزمە لەگەڵ ↑ژێ1 je [ژێی کەوان] و چەندین وشەی دیکە لە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن(ەوە)، لێکبەستن". وشەی set' "تۆڕ، رەشکە" (Rus.) لەباری ماناوە نیزیکی تەواوی هەیە لەگەڵ وشە کوردمادییەکە. ئەم وشە رووسییەش پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

[تێبینی: وشەی "رەشکە"ش پێوەندی هەیە بە "ریس"، "رستن" و "گوریس" و هتد].

**هەژماردن hejmardın** [ *hažmārdın* ] - "ژماردن": ئەژماردن ejmardın یش دەگوترێ. هە he / ئە e [پێشگر] + ↑ژماردن jımardın.

**هەژمەت hejmet** [ *hažmat* ] - "خەم و مەینەت": لەوانەیە کەرتی هەژ -hej خزم بێ دەگەڵ ↑ئێش êş "ئازار، دەرد".

**هەژەک hejek** [ *hažak* ] - "شەکان، لەرزە": بڕوانە ↑هەژان hejan "راتڵەکان، شەکانەوە".

**هەژهەژیک hejhejk** [ *hajhajîk* ] - "پەڕەسێلکە": هاج هاجک hachacık یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەژان hejan "راتڵەکان، شەکانەوە"دا باس کراون. وشەکە ئاماژە بە پەڕ و باڵ لێکدانی خێرا و بزوانی توند و تیژی باڵدارەکە دەکا.

[تێبینی: لە زمانی فارسیدا وشەی چلچلە čelçele (P.) بۆ ئەم باڵدارە بەکار دێ. ئەم وشە فارسییە لە دووبارە بوونەوەی وشەی چل -čel دروست بووە، وەک چۆن وشە کوردمادییەکە لە دووبارە بوونەوەی هەژ hej یان هاج hac دروست بووە. ئەم وشە فارسییە خزمە لەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک چڵە2 çıle (چڵەدان)، چڵیان çılyan واتا "پەڕینی پێلووی چاو، لیدانی دڵ یان شوێنی بریندار"، چڵەکین çılekîn (راچڵەکین) "هەڵبەزینەوە، تەکان خواردن لە ترسان"، چڵەک çılek "سڵ، قوشقی"، سڵ sıl، چرکیان çırkîyan "تەکان و بزاواتیکی خێرا". ئەم

وشانە لە بنەڕەتدا هەروەک بنجی "هەژ، هاج" ئاماژە بە "تەکان و بزواتیکی توند و خێرا" دەکەن].

**هەژیر hejîr** [ *hažīr* ] - "ئاوەزمەند": ↑هە he [پێشگر] + ↑ژیر jîr. خزمە دەگەڵ ↑زیرەک zîrek "وشیار".

**هەس1 hes** [ *has* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑هێز hez.

**هەس2 hes** [ *has* ] - ↑هەست hest یش دەگوترێ.

**هەس3 hes** [ *has* ] - هەس دان hes dan بە مانای "گەڕاندنەوەی گا لە سەر خەت" بەکار دێ و هەروەها هەس دانەوە hes danewe بە مانای "رووشکاندن و تەمێ کردن" [زۆری وت، ئاخری هەسم دایەوە]. ئەگەر سەیری ئەم دوو مانایە و چەمکی هاوبەشیان بکەین، دەردەکەوێ کە هەس دان یان هەس دانەوە دەبێ لە بنەڕەتدا بە مانای "وە ئاگا هێنانەوە، هۆشیاری پێدان" بێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑هۆش hoş و لەوانەشە ↑هەس2 *hes 2* "هەست".

**هەسار hesar** [ *hasār* ] - "حەوشە": هەر لەم پێوەندییەدا وشەیەکی دیکەش سەرنج رادەکێشێ کە بریتییە لە ↑هەسیر hesîr "رایەخی لە جەگەن و قامیش". سەبارەت بە وشەی یەکەم وا دێتە بەر چاو کە ئەم وشەیە عەرەبی بێ، واتا لە حصار ħasār (Arb.) وەگیرابێ و ئەمەش خۆی پێوەندی هەبێ بە حصر "دەور گرتن". بەڵام وەک لەزۆر نموونەدا دەردەکەوێ زمانی عەرەبی بە هۆی توانایی بێوێنە لە وەرگرتن، هەڵتاواندن و گۆڕینی وشە بیانییەکاندا، ناوێک وەردەگرێ و پاشان لەمەوە کردار دروست دەکا، بۆ وێنە "جاروب"ی فارسی وەک "جاروفة" وەردەگرێ و لەمەوە کرداری "جرف" دروست دەکا، یان "مزگەت، مێژگە" دەکاتە "مسجد" و لەمەوە کرداری "سجد" و پاشان چەندین لق و پۆی دیکەی لێ بەرهەم دێنێ تا دەگاتە "امام سجاد". هەر بۆیە دوور نییە کە وشەی "هەسار"یش بەم جۆرە پێک هاتبێ: پێشگری هە he + سار sar. هەروەها هەسیر hesîr پێکهاتبێ لە هەhe + سیر sîr. "سار" یان "سیر" لە بنەڕەتدا بە مانای "بەند، گوریس، ریس، تەون" بەکار هاتووە و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "بەستن، لێکبەستن، دروون". وشەکانی ↑جاڵ cal [جاڵجاڵۆکە calcaloke]، ↑زیلۆ zîlo "پەڵاس، بەڕە"، ↑جۆڵا cola [جیلا cîla] "تەونگەر"، ↑شاڵ şal "شاڵگەردن"، ↑سارمە sarme "گوڵدۆزی سەر زین، گوڵینگەی ئاوریشم و تاڵەزێو" و چەندین وشەی دیکە خزمن بۆ وێنە لەگەڵ Seil (G.) "پەت، تەناف، گوریس". بەم شێوە دەردەکەوێ کە لە مانای بنەڕەتی "بەستن، لێک بەستن" لەلایەکەوە مانای "دروون، تەنین" پەیدا بووە [وەک هەسیر] و لە لایەکی دیکەوە مانای "دەور گرتن، بەربەست کردن" [وەک هەسار]، چونکوو هەسار لەبنەڕەتدا بریتی بووە لە لێکبەستنی دار و دەوەن و لک و پۆ بە دەوری ماڵدا. بەم شێوەیە هەم هەسار و هەمیش هەسیر لەبنەڕەتدا مانای "تێکبەست، تەنراو" دەبەخشن.

**هەسان hesan** [ *hasān* ] - "بەردی تیژ کردنی چەقۆ": خزمە دەگەڵ ↑ئاش aş. مەبەست لە "ئاش" دەبنەڕەتدا "بەرد" بۆ هاڕین بووە.

**هەسانەوە hesan(ewe)** [ *hasān(awa)* ] - "وچان دان، پشوودان، ئارام گرتن": ↑حەسانەوە ħesanewe ش دەگوترێ. اسودن āsūdan (P.)، ↑ئاسوودە asude لەم وشەوە هاتووە، واتا هەساوە، راحەت، ئارام. هەروەها وشەی ↑هاسان hasan [ئاسان asan] دە بنەڕەتدا بە مانای "راحەت"ە و لەم وشەیە وەرگیراوە.

**هەست1 hest** [ *hast* ] - "حیس": ↑هەس2 hes 2 یش دەگوترێ.

1- له لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ aisthesis ‌(Gr.) "هەست کردن" [وشەی Ästhetik "جوانیناسی" پێوەندی بەم وشەوە هەیە]. ئەم وشەیە دوورەخزمە لەگەڵ audare ‌(L.) "بیستن، گوێ لێبوون" و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *aus-** ‌*(IE.)* "گوێ" و دواتریش **< *au(ēi)-** ‌*(IE.)* "هەست کردن".

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە هەست hest یان هەس hes پێوەندی بە وشەی ↑هۆش hoş ەوە هەبێ. ئەم وشەیە بە شێوەی هش hış یش دەگوترێ. هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە پێوەندییان بە "هۆش، هش"ەوە هەیە: ↑هشەک hışek "هەست، حیس"، ↑هشاندن hışandın "لێکدانەوە، لێ ورد بوونەوە" [لە بنەڕەتدا: هۆش پێدان]، هەسیان hesyan "هەست کردن، ئاگا کردن". لەپاڵ ئەمانە حەسین ĥesîn یش بەکار دێ [پێحەسین، پێحەسیان واتا پێزانین، هەست پێکردن، ئاگادار بوون]. وشەی "هۆش" خزمە لەگەڵ ↑هێز hez [هێس hes، هەس hes] "گوڕ، توان، وزە"، هەروەها دەبێتە خزم لەگەڵ ↑*بووژانەوە bujan(ewe)* و لەگەڵ vigilare ‌(L.) "بەئاگا هاتن، بێداربوون" و vegere ‌(L.) "بووژاندنەوە، ژیاندنەوە"، wachen ‌(G.) و wake ‌(E.) "لەخەو هەستان"، vaja-h ‌(OIn.) "هێز، گوڕ، چالاکی"، wakker ‌(Nl.) "بەئاگا، هوشیار، چالاک، بەگوڕ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< weg-** ***ueg-,*** ‌***(IE.)*** "هێز و گوڕ تێدابوون". بەم جۆرە لە مانای بنەڕەتی " هێز و گوڕ پەیدا کردن، بووژانەوە" ماناکانی لەخەو هەستان، وە هۆش هاتنەوە، ئاگادار بوون(ەوە)ی پەیدا بوون. لەوانەیە "هەس" یان "هەست" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو ئەویش راستەوخۆ پێوەندی بە چەمکی هۆش و ئاگاداری یەوە هەیە، واتا کەسێک کە هۆشی دەداتە یان دەخاتە سەر کارێک، ئەوا هەستەکانی بەکار دێنێ و بە پێچەوانەشەوە کەسێکی بێهۆش یان کەمهۆش هەستەکانی کول یان لە کار کەوتوون. لە زمانی عەرەبیدا وشەی حس ĥis ‌(Arb.) پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و لەوانەیە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. هەروەها لە زمانی کوردمادیدا ↑حەساس ĥesas یان حەسحەس ĥesĥes بە مانای "ئێشکگر (ی شەوانەی شار)" کە لە عەرەبیدا دەبێتە عسس εasas ‌(Arb.). ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە و هەروەها بە وشەی ↑ئێشک êşık ەوە هەیە و ئاماژە بە کەسێک دەکا کە شەوانە ناخەوێ، بە ناو بازاڕ و کۆڵانەکانی شاردا دەگەڕێ، هەس رادەگرێ و هۆشی بە ماڵ و حاڵی خەڵکەوەیە.

**هەست2 hest** *[ hast ]* - دەگەڵ نەست دێ [هەست و نەست hest u nest واتا بوون و نەبوون]. دەچێتەوە سەر **<** *هست hast ‌(P.)* "هەیە، هەس" و نیست nīst ‌(P.) "نییە" و ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی **< *es-*** ‌***(IE.)*** "بوون". وشەکە دە زمانی کوردمادیدا کورت بۆتەوە و بووەتە هە(یە) he(ye). دە زاراوەی سنەییدا هەس hes بە کار دێ.

**هەستان hestan** *[ hastān ]* - "راست بوونەوە، بەرز بوونەوە": هەلستان helıstan یش دەگوترێ [هەڵ hel + (هە)ستان (he)stan]. برخاستن berxasten ‌(P.).

1- لەوانەیە پێک هاتبێ لە پێشگری ↑هە he [یان ئە e] + ستان sıtan. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ stehen ‌(G.)، stān ‌(OG.)، staan ‌(Nl.)، stå ‌(Sw.)، stare ‌(L.) "وەستان، وەستاندن، دانان"، aufstehen ‌(G.) "هەستان، هەڵستان"، histánai ‌(Gr.) "دانان" [دە بنەڕەتدا وەستاندن، دانان و گیرساندنەوەی شتێک لە شوێنێک]، stojat ‌(Rus.)، stóti ‌(Lit.) "وەستان"، سەر بە ریشەی **< *st(h)ā-*** ‌***(IE.)*** "وەستان، وەستاندن، دانان". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا گەلێک وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا Stadt ‌(G.) "شار" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ستان"ی کوردمادی وەک کوردستان]، Stand ‌(G.) "بار و دۆخ"، stauen ‌(G.) "پێش گیران، بەند

بوون، وەستان"، Stunde (G.) "سەعات" [دە بنەڕەتدا: کاتێک، ئیستێک، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ئیستێک" دە زاراوەی موکریانیدا]، Stuhl (G.) "سەندەڵی"، Stall (G.) "تەویلە" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ئیستبەڵ"]، Stütze (G.) "پایە، ستوون" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ستوون"] و بە دەیانی دیکە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑ستوون sıtun [ئەستوون estun]، ↑ئەستۆ esto [ستۆ sıto]، ↑ستان sıtan، ئەستێر(ک) ester(k) "گۆلاو، ئاوی وەستاو" و هتد.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە ئەم وشەیە پێوەندی بە ژمارەیەک وشەی دیکەوە هەبێ کە ئاماژە بە بزاڤێکی بەتایبەتی خێرا دەکەن. لەم بارەوە بڕوانە ↑ئاخێز axez "نیوەهەستان".

**هەستوو hestu** [ *hastū* ] - "1- ئێسک، ئێسقان 2- دەنکی ڕەقی میوە، ناوکی میوە": هەست hest و هەستە heste و هەستی hestî یش دەگوترێن. هەروەها هەستێ heste [↑ئەستێ este] هەیە بە مانای "بەردی چەخماخ". وەک دەردەکەوێ ئەم وشانە ئاماژە بە شتی ڕەق دەکەن، وەک بەرد، ئێسک، ناوکی میوە. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ Stein (G.) "بەرد" و لەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑*ئاستەم astem* "سەخت"دا باس کراون.

**هەستەرە hestere** [ *hastara* ] - "گوێزان، تیخی مووتاش": استره ostore (P.). خزمە لەگەڵ ↑ئەستڕین estırîn "سڕین". وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ڕێخشاندن".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ shave (E.) "موو تاشین" کە خزمە لەگەڵ "ساوین"ی کوردمادی و ئەمیش لە بنەڕەتدا مانای "ڕێخشاندن" دەدا].

**هەسک1 hesk 1** [ *hask* ] - "شەن، شەنە": شێوەیەکی دیکە لە ↑هێچک *heçk* و هێشک hêşk و خیش xīš (P.) "هەوجار" و خزمە دەگەڵ ↑هۆخ hox "هەردی کێڵدراو".

**هەسک2 hesk 2** [ *hask* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەسکۆ esko.

**هەسکاندن heskandın** [ *haskāndın* ] - "(هەڵ)پشاوتن": هەروەها هەسک hesk بە مانای "(هەڵ)پشاوتە" بەکار دێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هەسکیان heskîyan.

**هەسکیان heskîyan** [ *haskīyān* ] - "هەنیسک دان، نزگەرەی پاش گریان": هەسکەهەسک heske hesk یش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری هە he + سکیان sıkîyan. بنجی سک -sık خزمە لەگەڵ سکسکە sekseke (P.) "نزگەرە" [saksake ش دەگوترێ]. لە وشە فارسییەکەشدا بنجی وشەکە دووبارە دەبێتەوە، وەک هەسکەهەسک. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***sug-, *suk-** (**IE.**) "مشتن، دوشین" و لەوانەیە خزم بێ بۆ وێنە لەگەڵ ↑ژەک jek. ئەم ریشەیە دەبێ لەپێوەندیدا بێ لەگەڵ ریشەی < ***seu-** (**IE.**) "مژین، گوشین، هەڵقوڕاندن".

[تێبینی 1: پێوەندی دوو چەمکی "هەڵقوڕاندن" و "نزگەرە" لە وشەی ئەڵمانی Schluckauf (G.) دا بەدیار دەکەوێ کە مانای "نزگەرە"دەدا. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کرداری schlucken (G.) "هەڵقوڕاندن، قووت دان". Schluckauf "نزگەرە" دە وشەنامەی ئەڵمانیدا وەسا مانا کراوەتەوە: "هەناسە هەڵکێشانی کورت، گیر تێوەستاو (تەشەننوجی) و پەیتاپەیتا بەهۆی وێکهاتنی خێرا و توندی پەردەی دیافراگم....". وەک لەم مانا لێدانەوەدا دەردەکەوێ، نزگەرە بریتییە لە "قووت دان"ی خێرا و پەیتاپەیتای هەوا. تێبینی 2: وەک لە مانای ریشەکەدا دەبینرێ، ئەم ریشەیە مانای "گوشین"یش دەدا. ئەم مانایە لە هەسکاندن "پشاوتن"دا بەدیار دەکەوێ].

**هەسیدە hesîde** [ *hasīda* ] - "هەڵوای ئارد و دۆشاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئاش aş و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەی < ***ed-** (**IE.**) "خواردن، جووتن".

**هەسیر hesîr** [ *hasīr* ] - "رایەخی لە جەگەن و قامیش": هەشیر heşîr یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەسار hesar "حەوشە".

**هەش heş** *[ haš ]* - "خوم، دەرماتیکی شین بۆ رەنگ کردنی خاو و بەن":
1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ هەشین heşîn [↑شین şîn].
2- لە لایەکی دیکەوە لە ژێر وشەی "خوم"دا شی کراوە کە لەوانەیە ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "گڵ، خۆڵ" بێ و دواتر ماناکە گۆڕابێ بۆ "کووپەی گڵین" و لەوێشەوە بۆ ئەو رەنگەی کە دە کووپەی خمگەردا دەگیرێتەوە. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە لەوانەیە وشەی "هەش"یش پێوەندی هەبێ بە (G.) Asche، (OG.) asca، (Nl.) as، (E.) ash "خۆڵەمێش". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑هیش1 hîş "گڵەسوور، گڵەزەرد"، ↑هیشک *hîşk* دە زمانی کوردمادیدا. جێی باسە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکە بە مانای "خۆڵەمێش" بریتییە لە "خۆڵەکەوە". کەوە دە "وشەنامەی هەنبانە بۆرینە"دا وەک "شین" مانا کراوەتەوە و دە زمانی فارسیشدا کبود مانای "شین" دەبەخشێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەتوانێ سەرەتا بە مانای "خۆڵەکەوە" و دواتر "کەوە، شین" بەکار هاتبێ.
**هەشافتن heşaftın** *[ hašāftın ]* - "قڕ کردن، پاکتاو کردن 2- بن قوڕ دان": هە + شافتن šāftın + ha. خزمە دەگەڵ ↑هەشفاندن heşfandın "سڕینەوە" و ↑*ساوین sawîn*. وەک دەزانین سڕینەوە بە مانای "لەناو بردن"یش بەکار دێ و هەروەها سەبارەت بە مانای دووەم واتا بن قوڕ دان دەبێ بڵێین کە ئەم مانایە دەگەڵ مانای بنەڕەتی سوان suwan یان ساوین sawîn یەک دەگرێتەوە و وشەی ↑سواخ suwax پێوەندی بەم وشانەوە هەیە [سڤاخ ← سواخ].
[تێبینی: کردارەکانی *هەشافتن* "قڕ کردن، پاکتاو کردن" و *هەشفاندن* "سڕینەوە" و *ساوین* لەباری مانا و پێوەندییەکانیان بەرهەف بکە دەگەڵ کرداری (Gr.) marainen "سوونەوە، پاکتاو کردن، لە بەین بردن". ئەم وشە یۆنانییە هاوکات هەموو ماناکانی سەرەوە لە خۆ دەگرێ].
**هەشامەت heşamet** *[ hašāmat ]* - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑حەشیمەت ħeşîmet.
**هەشاندن heşandın** *[ hašāndın ]* - "پڕ کردن، تێئاخنین": ↑هە he [پێشگر] + شاندن. şandın شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئاخنین axnîn [ئا a + خنین xınîn].
**هەشت heşt** *[ hašt ]* - "دووجار چوار": هشت heşt (P.)، acht (G.)، aht (OG.)، eight (E.)، atta (Sw.)، ahtau (Gt.)، oktō (Gr.)، octo (L.)، ocht (OIr.) "هەشت"، سەر بە ریشەی **oktōu- >** **(IE.)** "هەشت" و دواجار ریشەی ***ak- , *ok- (IE.)*** "تیژ، گۆشەیی، زەق، دەرپەڕیو". مەبەست لە "هەشت" دە ریشەدا داگرتن و خوار کردنەوەی دوو قامکە گەورەکە (قامکی ئەسپێکوژە) و زەق کردنەوە و دەرپەڕاندنی قامکەکانی دیکەیە کە دەبێتە هشت دانە. سەردەمانی زوو کاتی ژماردن بە قامکەکان، دوو قامکی ئەسپێکوژەیان داگرتووە و بە هەشت قامک ژماردوویانە. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئاژنین ajnîn "کون کون کردن، تێڕا کردن" و چەندین وشەی دیکە.
**هەشفاندن heşfandın** *[ hašfāndın ]* - "سڕینەوە": هە he [پێشگر] + شڤاندن şıfandın. کەرتی دووەم شێوەیەکی کۆنترە لە سوواندن suwandın [↑ساوین sawîn]. هەروەها بڕوانە ↑*هەشافتن heşaftın*.
[تێبینی: وشەی حذف ħađf (Arb.) "لا بردن، لەناو بردن" بە بێ هیچ گوماتێک لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە، چونکوو وشەکە پاشگرە کوردمادییەکەی تێدا دیارە، واتا "هە" بووەتە "ح" و کەرتی "ذف" یش گۆڕاوی بنجی "شڤ/ سڤ"ە لە "شڤاندن/ سڤاندن"دا].
**هەشک heşk** *[ hašk ]* - "چەرمی قاچ و دەست لە پێستەدا": شێوەیەکی دیکە لە قاچک qaçk [بڕوانە ↑قاچ qaç].
**هەشین heşîn** *[ hašīn ]* - "شین، کەسک": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شین şîn.

**هەفار hefar** [ *hafār* ] - ”1- بووغ، مژ لە شوێنی تەڕ و گەرم 2- بۆنی گرانی تەڕی“: هەروەها هەپ hep یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑هەور hewır.

**هەفان hefan** [ *hafān* ] - ”جانەوەری چەنگَ بە بەردان سواو“: خزمە دەگەڵ ↑سم sım و ↑چەپۆك çepok و ↑چەپلە çeple سەر بە ریشەی **< *kop- , *kap- (IE.)** ”چەنگَ، دەست، سم“. [شیاوی سەرنجە ریشەی *kap- (IE.) هەروەها مانای ”گرتن“ دەبەخشێ و ئەو مانایەش پێوەندی بە مانای یەکەمەوە هەیە].

**هەفتە hefte** [ *hafta* ] - ”حەوتوو“: حەفتە ħefte و حەوتوو ħewtû ش دەگوترێن. دەچێتەوە سەر ↑حەوت ħewt یان هەفت heft.

**هەفدین hefdîn** [ *hafdīn* ] - ”1- داپۆشینی دەفر، قەپاخ لەسەر دانان 2- پێوەدانی دەرك“: خزمە لەگەڵ Haft (G.) ”دەست بەسەرکراوی، بەستراوەیی“، hafta (OG.)، ha ft (OE.)، haptr (OIs.) ”دەست بەسەرکراو، دەست بەسەرداگیراو، بەندکراو، بەستراوە“، haften (G.) ”بەستراوە بوون، پێوەنووسان، قایم بوون“، heften (G.)، ha ftan (OE.)، häfta (Sw.) ”بەستن، قایم کردن، پێوەنووساندن“ و هەوەها Heft (G.) ”دەسك، دەستك، دەسگیرە“. وشەی ↑کیپ kîp ”قایمکراو، پێکەوەنووساو“ پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ئیپە *îpe*.

**هەفکین hefkîn** [ *hafkīn* ] - ”ئاردێك كە ئەنگوتكی تێوەردەدەن“: وێ دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ كە لەژێر ↑هەفدین hefdîn دا باس کراون. ئەم وشانە مانای ”گیر بوون، پێوە نووسان“ دەبەخشن. لەوانەیە مەبەست پێوەنووسانی ئاردەكە بە ئەنگوتكەوە بێ.

**هەفل hefıl** [ *hafil* ] - ”قرتك و داركی هێشووی ترێ و خورما“: خزمە لەگەڵ ↑هەفدین hefdîn و ئەو وشانە مانای ”گیر بوون، پێوەنووسان، بەستراوە بوون“ دەبەخشن. ”هەفل“ ئەو بەشە لە هێشووەكەیە كە دەنكەكانی پێوە بەستراوەتەوە یان پێوەی نووساوە.

**هەفووری hefurî** [ *hafūrī* ] - ”تیری فەحل“: هەوری hewrî و هەڤۆری hevorî یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑کاوڕ kawır.

**هەفهەف hefhef** [ *hafhaf* ] - ”حەپەحەپ“: هەف -hef شێوەیەكی دیكەیە لە ↑حەپ(ە) ħep(e) و پێوەندی هەیە بە ↑گەفین *gefîn* و لەبنەڕەتدا مانای ”زار داپچڕین“ دەبەخشێ.

**هەفهەفی hefhefî** [ *hafhafī* ] - ”تەماحكار“: هەروەها هەفهەفیاتی hefhefyatî هەیە بە مانای ”چڵێسی“. بنجی ئەم وشانە، واتا هەف -hef شێوەیەكی دیكەیە لە ↑حەپ(ە) ħep(e)، پێوەندی هەیە بە ↑گەفین gefîn و خزمە لەگەڵ ↑قەپ *qep* ”قەپاڵ، گاز“. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”زار داپچڕین“. مانای ”تەماحكار“ بریتییە لەوە كە كەسێك زاری داپچڕیوە و تێر نابێ. هەروەها مانای ”چڵێسی“ش دیسان بۆ تێر نەبوون دەگەڕێتەوە. ئەم مانایە لە وشەی ↑گاپن gapın دا بەدی دەكرێ [نەوسنی گاپن واتا چڵێسی زار داپچڕاو“].

**هەفی hefî** [ *hafī* ] - ”ماری گەورە“: دە زمانی عەرەبیدا بووەتە افعي afεī (Arb.). خزمە یان وەرگیراوە لە ophis (Gr.) ”مار“.

**هەڤاندن hevandın** [ *havāndın* ] - شێوەیەی کۆنتری ↑حاواندنەوە ħawandınewe.

**هەڤانی hevanî** [ *havānī* ] - ”بەدفەڕی، شەیتانی كردن“: خزمە لەگەڵ ↑ئۆباڵ obal [هۆباڵ hobal، وەباڵ webal] ”گوناه، تاوان، خراپە“.

**هەڤر hevır** [ *havır* ] - ”قاپ و قاچاخی سواڵەت“: هەوەر hewer یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑کەڤر kevır ”بەرد“. مانای بنەڕەتی وشەكە ”گڵی سوورەوەكراو، رەقكراو، بەردكراو“ە. هەروەها بڕوانە ↑حەمرین ħemrîn.

**هەڤران hevran** [ *havrān* ] - "سپیدار": هەروەها ↑هەڤرس hevrıs [هەڤرست hevrıst] هەیە بە مانای "دارێکی سنەوبەرئاسا" و هەڤریسک hevrîsk [↑هەوریس hewrîs] "داری عەرعەر". ئەم دوو وشەی دوایی دە بنەڕەتدا هەر یەك وشە بوون و پاشان بە کەمێك گۆڕانەوە بۆ ناوی دوو دار بەکار هێنراون، یان لەوانەیە دە دوو شێوەزاردا بۆ ناوی دوو داری کەمێك جیاواز بەکار هێنرابن. خزمن لەگەڵ ↑هەڤر hevır "قاپ و قاچاخی سواڵەت" و دواتر ↑کەڤر kevır "بەرد". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە پێوەندییان بەم خێزانەوە هەیە و زۆرینەی وشەکان مانای "سەخت، رەق" لە خۆ دەگرن. ئەو جۆرە دارانە دەشێ لەبەر سەخت بوونیان ئەم ناوانەیان پێ درابێ.

[تێبینی: وشەی "عەرعەر"یش دەشێ پێوەندی بە *خار* "سەخت"ەوە هەبێ. هەروەها ناوی داری "کەوت" [کەڤۆت] خزمە لەگەڵ "سفت"].

**هەڤرس hevrıs** [ *havrıs* ] - "دارێکی سنەوبەرئاسا": هەڤرست hevrıst یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑هەڤران hevran "سپیدار".

**هەڤریشک hevrîşk** [ *havrīšk* ] - "هەرمێشك، تێکوشینی نانی گەرم لە رۆندا": ئەم وشەیە دەشێ لە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و بووبێتە ↑هەرمێشك hermêşk. وشەکە بەم چەشنە پێك هاتووە: پێشگری هە he + ڤر vır+ پاشگری یشك îşk. بنجی وشەکە خزمە لەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑*پریواندن* *pırîwandın* "لێکردنەوەی شتی هیشك بە دەست رێخشاندن"، سەر ریشەی **< *wer-** (*IE.*) "سووڕاندن، با دان".

[تێبینی: وشەی *وڵین* "تێکوشین"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە هەمان مانا، واتا *wel-* (*IE.*) "سووڕاندن، با دان"].

**هەڤژاڵە hevjale** [ *havžāla* ] - "هەوایەکی لاوك و گۆرانی": هەڤ hev + ژاڵە jale. کەرتی یەکەم دەتوانێ پێشگر بێ، وەك لە وشەی "هەوراز"دا. لەوانەشە خۆی شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑هەوا[2] hewa "لەحنی گۆرانی". کەرتی دووەم لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زایەڵە zayele "دەنگ دانەوە" و یان دەگەڵ ↑زاڵە zale "هاوار، دەنگ هەڵبڕین". سەبارەت بەو وشانەی کە لە دوو کەرتی هاومانا پێك دێن، دە زمانی کوردمادیدا نموونە زۆرە [بڕوانە بانگەشە]. ئەم وشانە دۆخی جەخت کردن نیشان دەدەن.

**هەڤژین hevjîn** [ *havžīn* ] - "خەریك بوون، سەرگەرم بوون":

1- وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑هاوژین hawjîn "خافڵاندن، سەرگەرم کردن".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ خەبتین xabtîn "کارکردن" [↑خەبات xebat].

**هەڤك1 hevk** [ *havk* ] - "تەڵە، داو": خەفك xefk یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑هەفدین hefdîn "1- داپۆشینی دەفر، قەپاخ لەسەر دانان 2- پێوەدانی دەرك"، ↑هەفل hefil "قرتك و دارکی هێشووی ترێ و خورما". ئەم وشانە لە بنەڕەتدا ئاماژە بە مانای "پێوەنووسان، گیر بوون، بەستراوە بوون" دەکەن. "هەفك" یان "خەفك" شتێکە کە ئاژەڵ تێیدا گیر دەکا و پێوەی بەند دەبێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر سەر ریشەی **< *kap-** (*IE.*) "گرتن". وشەکانی Haft (G.) "دەست بەسەرکراوی، بەستراوەیی"، capture (E.) "دیل گرتن، داگیر کردن" لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە. وشە ئینگلیزییەکە ریشەی لاتینی هەیە، بەڵام خزمە لەگەڵ وشە ئەڵمانییەکە و چەندین وشەی کوردمادی و ژێرمەنی کە لەژێر ↑ئیپە *îpe* دا باس کراون. وشەی ↑کویلە koyle [کۆلە kole] لەوانەیە کۆنتر *کەڤلە* *kevle** بووبێ و پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

هەڤک 2 **hevk** [ *havk* ] - "1- ئەوک 2- مل":
1- دەتوانێ شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەوک ewk بێ.
2- یان پێوەندی هەیە بە قفا qafā (Arb.)؟

هەڤگوڕ **hevgur** [ *havgur* ] - شێوەیەکی دیکە لە هاوکار hawkar [بڕوانە ↑کار[1] kar "ئیش، خەبات"].

هەڤۆ **hevo** [ *havo* ] - "پۆ، فریت": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ئیپە îpe "بەندێکی قایشە، نیری پێ لە ئاموور دەبەستن" و ↑هەبن hebın "بەندی سینگی رەشماڵ".

هەڤۆتن **hevotın** [ *havotın* ] - "فێر بوون": ↑هۆژان hojan و ↑هوین huwîn و ↑هین hîn ش دەگوترێ. اموختن āmūxtan (P.). خزمە دەگەڵ ↑ئامۆژگاری amojgarî. [لەباری ئاڵۆگۆڕی فونۆلوژیکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ امیختە āmīxte (P.) "تێکەڵ کراو" و ئاوێتە awete "تێکەڵاو].

هەڤۆک **hevok** [ *havok* ] - "ئیستلاح، دەستەواژە، رستە": بڕوانە ↑هاڤاژ havaj.

هەڤیرکە **hevîrke** [ *haīvrka* ] - "1- دەوروبەر 2- گەو، کەمە": هەڤیر hevîr + پاشگری کە ke. "هەڤیر" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەمەر *kemer*. گەو gew و کەمە keme ش پێوەندییان بە "کەمەر"ەوە هەیە. کەمەر یان کەمەرە بە مانای "دەوروبەر"یش بەکار دێ.

هەڤێز **hevez** [ *havez* ] - "حەوشەمەڕ": شێوەی کۆنتری ↑حەوشە ħewşe.

هەقاندن **heqandın** [ *haqāndın* ] - "کۆڵین، هەڵکەندن": ↑هە he + قاندن qandın [↑کەندن kendın]. حك ħak (Arb.) "هەڵکۆڵین" لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

هەک **hek** [ *hak* ] - "وشەی ئاوات، دنە دان، سەر سوورمان، جتیو دان و هتد": [هەک داوەشێی، هەک دەبەرت مرم]": حەک ħek یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ha (E.) "وشەی دەربڕینی سەر سوورمان، شادی، تەشەر لێدان و هتد".

هەکاری **hekarî** [ *hakārī* ] - "مەڵبەندێک لە کوردستان": خزمە لەگەڵ ↑ئاکرێ akre "شارێک لە کوردستان". ئەم وشانە پێک هاتوون لە پێشگری ئا a- یان هە he- + بنجی کار kar یان کر kır. ئەم بنجە لەژێر وشەی ↑کورد *kurd* دا شی کراوەتەوە و خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت، پتەو".

هەگبە **hegbe** [ *hagba* ] - "خورجینی دووتایی کە لە پشتەوەی سوار لە زین قایم دەکرێ": هەقبە heqbe ش دەگوترێ. ریشەکەی بۆ زمانی عەرەبی دەگەڕێتەوە. < عقب εeqeb (*Arb.*) "پشتەوە".

هەڵ 1 **hel** [ *hal* ] - پێشگرێکی کردارە و ئاماژە دەکا بە بزاڤێک بۆ لای سەرەوە [وەک هەڵگرتن، هەڵچوون، هەڵبەزین، هەڵشێلان و هتد]. شێوەی نوێتری ↑هۆڕ 2 hor ە.

هەڵ 2 **hel** [ *hal* ] - "دەرفەت": وشەکە دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "کات"ی گونجاو بووبێ. هەروەها ↑هێڵ 2 hel هەیە بە مانای "هەڕەت، جەنگە". خزمە دەگەڵ ↑هەڕەت *heret*. وشەکە دە بنەڕەتدا چەمکی "کات" لە خۆ دەگرێ. Alter (G.) "تەمەن" [دە بنەڕەتدا: کات و ماوەی ژیان]، alds (Gt.) "تەمەنی مرۆڤ"، old (OIs.) "مرۆڤ، کات"، welt (G.) "دنیا، جیهان" [دە بنەڕەتدا: تەمەنی مرۆڤ، کاتی (ژیانی) مرۆڤ] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

هەڵ 3 **hel** [ *hal* ] - "فریشتەی جەنگەڵ و دارستان": خزمە دەگەڵ ↑ئاڵ al [ئاڵ و شەوە].

هەڵ[4] **hel** [ *hal* ] - "پەلە": [هەلەهەل و پەلەپەل]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Eile (G.)، īla (OG.) "پەلە، دەست و برد"، eilen (G.)، īlen (OG.)، ijlen (Nl.) "پەلە کردن"، سەر بە ریشەی <

*ei- (IE.) "ڕۆیشتن". هەر لەم ریشەوە هاتوون: iénai (Gr.) "ڕۆیشتن"، ire (L.) "ڕۆیشتن، چوونەپێش". هەروەها لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەرین *herîn* و ↑وەرین werîn "ڕۆیشتن".

**هەلا[1] hela** [ *halā* ] - هەلا هەلا بوون واتا "لەبەریەک هەڵوەشان، لێک جیا بوونەوەی زۆر". هەروەها ↑هەلاندن[2] helandın هەیە بە مانای "تواندنەوە، حەل کردن". دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- حل ħall (Arb.) "توانەوە، هەڵوەشان". ئەم وشە عەڕەبییە لەوانەیە لە زمانی کوردمادی و لە وشە "هەلا" [کۆنتر هەل؟] وەرگیرابێ. وشەکە لەوانەیە وەک گەلێک وشەی کوردمادی دیکە لە دوو کەرت پێک هاتبێ، واتا پێشگری هە he + لا la. لەم تیرِوانینەوە کەرتی "لا" دەچێتەوە سەر ریشەی < *leu- (IE.) "لەت کردن، پچڕین، لێک جیا کردنەوە". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە وەک ↑لۆق loq "شل، لەق" [لەق و لۆق]، ↑لەت let "تیکە" و ↑لەوەڕ lewer لەم ریشەوە هاتوون. lose (G.) "لەق، جیاوەبوو، ڕەها"، lösen (G.) "تواندنەوە، حەل کردن، ڕەها کردن" لەم ریشەوە هاتوون. هەروەها پاشگری -los (G.) و -less (E.) "بەبێ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

2- یان لەوانەیە "هەلا" بچێتەوە سەر ریشەی < *(s)kel- (IE.) "بڕین، لیک جیا کردنەوە، قەڵشاندن، لەت کردن". گەلێک وشە دە زمانی کوردمادیدا دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑قەڵشاندن qelşandın، ↑کۆلکەدار kolke، ↑قەڵت و بڕ qelt، ↑قوڵە qule و هتد.

**هەلا[2] hela** [ *halā* ] - "هێرش": هەلا بردن واتا هێرش بردن. خزمە دەگەڵ ↑هەل[4] hel [هەلەهەل و پەلەپەل].

**هەڵا he(l)la** [ *hal(l)ā* ] - "هەرا، هاوار": دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زەلال zelal "ڕوون" و↑ کاڵ kal "کەم ڕەنگ" و چەند وشەیەکی دیکە سەر بە ریشەی < *kel- , *kle- (IE.) "بانگ کردن، هاوار کردن، هەرا کردن، دەنگ هەڵبڕین".

**هەڵا hela** [ *halā* ] - دەگەڵ "هەور" دێ [هەور و هەڵا hewr u hela].

1- لە لایەکە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑هاڵان halan و هالاندن halandın بە مانای "تێپێچان، حەشار دان، داپۆشین". لەم تیرِوانینەوە مەبەست لە هەور و هەڵا داپۆشرانی هەردە بە هۆی تەم و مژەوە.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑هەڵم helm ەوە هەبێ.

**هەلاب helab** [ *halāb* ] - "مانگی پڕ، مانگی شەوی چاردە": ↑هلاب hılab یش دەگوترێ.

**هەلات helat** [ *halāt* ] - "درۆی زل [ئەم قسەیە هەر درۆ نییە، هەلاتە] 2- خۆ هەڵکێشان": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ halten (G.) و hold (E.) "ڕاگرتن". ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی> *kel- (IE.) "ئاژۆتن، پێش خۆدان، بردنە بەرەوە" و خزمن لەگەڵ kālayati- (OIn.) "دەئاژوێ" (ئاژەڵ) و kéllein (Gr.) "ئاژۆتن، وە پێش خۆدان". ئەم ریشەیەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی < *kel- (IE.) "هەرا کردن، هەڵڵا کردن، بانگ کردن". ئێستا بزانین پێوەندی دوو چەمکی "ئاژۆتن، پێش خۆدان، بردنە بەرەوە" لەگەڵ "درۆی شاخدار، خۆ هەڵکێشان" چۆن پەیدا دەبێ. دە وشەنامەی ئەڵمانیدا مانای ریشەکەی سەرەوەتر و وشەکانی زمانی هیندی کۆن و یۆنانی سەرەوە وەک treiben دەست نیشان کراوە [ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە لەگەڵ "تەرە" و "تاراندن" دە زمانی کوردمادیدا]. ئەوجار زمانی ئەڵمانی وشەی übertreiben بە مانای "ئیفڕات (تێدا)کردن، پێوەنان" بەکار دێنێ. مەبەست ئەوەیە کە شتێک لە ئەندازە و سنووری خۆی زێدە دوور دەکرێتەوە [زێدە بەرەو پێش دەبردێ].

**هەلاجان helacan** [ *halājān* ] - "ڕاژان بە حەواوە":

1- لەوانەیە بەم جۆرە پێک هاتبێ: هەل hel + ئاجان acan. لەم تێڕوانینەوە کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑هەژان hejan "بزوان، تەکان خواردن، لەرزان".

2- لەوانەشە بەم شێوەیە پێک هاتبێ: پێشگری هە he + لاجان lacan. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑لۆژ *loj* "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو" و ↑لۆژە loje "ڕاژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا"، سەر بە ریشەی **< *lē(i)-d- (IE.)** "شل بوون، داهێزان، سست بوون، هێڵان". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "شۆڕ، ڕاهێڵ بوو" [دوو وشەی ڕاهێڵ و هێڵان پێوەندییان بەیەکەوە هەیە]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەڵاژین helajîn "ڕاکشان".

**هەلار helar** [ *halār* ] - "تینی ئاگر، هاڵاو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ calere (L.) "گەرم، داغ بوون" و ↑هاڵاو halāw.

**هەڵازنین1 helazınîn** [ *halāzınīn* ] - "هەڵئاخنین": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاخنین axnîn.

**هەڵازنین2 helazınîn** [ *halāzınīn* ] - "زیپکەدەردانی پێست":

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Ausschlag یان Hautausschlag (G.) بە نەخۆشییەکی پێستی دەگوترێ یان بە گۆڕاتیکی پێست کە دەبێتە مایەی زیپکە و لیر دەرکردن. ئەم وشە ئاڵمانییە دەقاودەق دەبێتە "هەڵئازنین"ی کوردمادی. وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر کرداری schlagen (G.) "لێدان، لێکدان"]. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەشێ ئازنین azınîn پێکهاتبێ لە پێشگری a + z(ı)nîn. کەرتی دووەم دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑ژەنین jenîn "لێدان، لێکدان". ئەم وشانە هەروەها خزمیشن دەگەڵ ↑ژان jan "ئێش و ئازار".

**هەڵاژین helajîn** [ *halāžīn* ] - "ڕاکشان": هەروەها هەلاژیاگ یان ئەڵاژیاگ هەیە بەمانای "ڕاکشاو". لەوانەیە وشەکە لە پێشگرێک و کەرتێکی سەرەکی، واتا لاژین lajîn پێک هاتبێ و خزمایەتی هەبێ دەگەڵ:

1- ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێل، داهێزاو، بەلاداهاتوو". [دە زمانی ئەڵمانیدا وشەیەک کە مانای "خەوتن" دەبەخشێ، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "داکەوتن، داهێزان، شۆڕ بوونەوەوە].

2- یان legen (G.) "دانان"، liegen (G.) "قەرارگرتن"، Lager (G.) "جێ خەو، ئۆردووگا، قەرارگا"، lāga (OG.) "بۆسە، کەمینگا". دە زمانی ئەڵمانیدا sich hinlegen مانای "ڕاکشان" دەدا. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< * legh- (IE.)** "قەرار گرتن".

**هەڵاش helaş** [ *halāš* ] - "گەڵا و چلووی سەر دارەڕا": ئاڵاش alaşa و هەراش heraş یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑لیشامە lîşame "پووش و چرپی سەر خانوو".

**هەڵافە helafe** [ *halāfa* ] - "چەکەرەی گیا، چووزەرە": بە فارسی وەک "نیش گیا" مانا کراوەتەوە. هەم "نیش"ی فارسی و هەمیش "چەکەرە و چووزەرە" ئاماژە بە چەمکی "تیژ و زەق بوون" دەکەن. "هەڵافە" دەبێ خزم بێ لەگەڵ ↑قولاپ *qulap* و لەگەڵ Klaue (G.) "چەنگ، چرنووک، قولاپ"، clavus (L.) "نینۆک"، ↑کولاف kulaf "چرنووکی باڵدار"، سەر بە ریشەی **< *gel- (IE.)** "چەنگ پێداگرتن".

**هەلاکان helakan** [ *halākān* ] - "پشووسوار بوون لە بەر ماندوویی": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑قڕ1 qır [قڕ بوون]دا باس کراون.

**هەڵاڵە helale** [ *halāla* ] - بڕوانە ↑لالە2 lale "ڕەبەنۆک، مێلاقە".

**هەڵامەت helamet** [ *halāmat* ] - "ئارسم، پەسیو": لەوە دەچێ لە علامة *εelame(t)* (*Arb.*) "عەلامەت، نیشانە"وە هاتبێ و ماناکەی دە بنەڕەتدا عەلامەت واتا symptom ی نەخۆشی بێ.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیدا وشەی الم alam (Arb.) "نەخۆشی" هەیە، بەڵام وێ ناچێ "هەڵامەت" پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. ئەم وشەی دوایی دە زمانی کوردمادیدا بووەتە "عەلەم": دەرد و عەلەمی لێ بڕا].

**هەلان helan** [ *halān* ] - "بەردی تەخت و لووس بۆ تەرکی وەتاخ": خزمە دەگەڵ↑ هلوو hılu "لووس" [↑حولی ĥulî یش دەگوترێ] و ↑خلیسک xılîsk. دە زاراوەکانی زمانی کوردمادیدا شێوەی هلیسکان hılîskan یش هەیە لەباتی ↑خلیسکان xılîskan. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑حەلان ĥelan هەیە بە مانای "تاوێرە بەرد، جاڵە" کە ئەمیش ئەو بەردەیە هەڵ دەخلیسکێ و خلۆر دەبێتەوە.

**هەلاندن helandın** [ *halāndın* ] - "بلیند کردن، بەرز کردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑*ئاڵ al* "قامکی هەرە درێژ"، ↑ئاڵا ala "پەرچەم، بەیداخ " [دە بنەڕەتدا واتا بەرز راگیراو]، ↑حەلحەلە ĥelĥele "تەشقی ئاسمان" و هتد.

**هەڵاواردن helawardın** [ *halāwārdın* ] - "جیا کردنەوە": ↑هەڵواردن helwardın و ↑هەڵبواردن helbuwardın یش دەگوترێن. ↑هەڵ hel + ئا a [پێشگر] + واردن wardın. خزمە دەگەڵ↑ ئاوارتە awarte "تایبەتی، جوێ کراوە، جیا لە ئەوانی دیکە". (ئا)واردن (a)wardın دەشێ پێشان وەک کردارێکی سەربەخۆ دە زمانی کوردمادیدا بەکار هاتبێ و خزمە دەگەڵ بنەوشەی var- (Av.) "هەڵبژاردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ wählen (G.)، wellan (OG.)، waljan (Gt.)، välja (Sw.) "هەڵبژاردن"، سەر بە ریشەی ***< *wel- (IE.)*** "ویستن". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا کرداری "ویستن" بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێتەوە، وەک wollen (G.) "ویستن" و will (E.). بەم جۆرە لە ریشەیەک بە مانای "ویستن" دواتر مانای "هەڵبژاردن" پەیدا بووە. دە زمانی کوردمادیدا ماناکە لە "هەڵبژاردن"ەوە دیسان پەرەی گرتووە بۆ "جیا کردنەوە"، هەروەک چۆن بە پێچەوانەشەوە مانای وشەی "هەڵبژاردن" پێشتر "جیا کردنەوە" بووە و پاشان گۆڕاوە بۆ هەڵبژاردن! ئەم ئاڵوگۆرانە دیارە بەهۆی بوونی پێوەندی نیزیک لەناو دوو چەمکی جیا کردنەوە و هەڵبژاردن دایە. هەڵواردن دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑بریا bırya "خۆزگە"، ↑بر bır ["بریا بە بری خودا" واتا خۆزگە، بە ویستی خودا]، ↑هۆل hol "چاک" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ well (E.) و wohl (G.) "باش"، دە بنەڕەتدا "خۆش، خوازراو"] و چەند وشەیەکی دیکە.

[تێبینی: وشەی "خۆش"یش پێوەندی بە "خۆزگە، خواستن و ویستن"ە هەیە و ماناکەی دە بنەڕەتدا دەبێتە "بە گوێرەی ویست و ئارەزوو"، واتا سەرەتا کاتێک باس لە هەوایەک یان خواردنێکی خۆش کراوە، مەبەست ئەوە بووە کە شتەکە ئەو جۆرەیە کە مرۆڤ ئارەزووی دەکا].

**هەڵاوەسین helawesîn** [ *halāwasīn* ] - "بە پەتێکەوە لە حەوادا بەند کردن، یان بە قولاپ و گیرەیەکدا بەند کردن": هەڵ hel + ئا a + وەسین wesîn. وەک دەبینرێ وەشەکە کۆنتر "ئاوەسین" بووە، کە ئەمیش خۆی لە دوو کەرت پێک هاتووە. دە زمانی فارسیدا اویختن āvīxtan (P.). دە زمانی کوردمادیدا هەڵواسین hel-wasîn یش دەگوترێ. بنجی وشەکە بە چەندین شێوە خۆ نیشاند دەدا، واتا وەس -wes، واس -was، یان دە فارسیدا ویخ wīx و ویز wīz [اویزان āvīzān (P.) "هەڵاوەسراو، هەڵواسراو]. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑*ئاوەسین awesîn*. وشەی ↑ئاونگ awıng یش پێوەندی بەم وشەوە هەیە.

**هەلای helay** *[ halāy ]* - "سەما": هەروەها ↑هەلەکا heleka هەیە بە مانای "جەزمە، سەمای دەروێشان". خزمە دەگەڵ ↑چڵەکین çılekîn "ڕاچەنین"، ↑چڵەدان çıle و ↑چڵیان çılyan "پەڕینی پێڵووی چاو یان لێدان و هەڵبەزینی دڵ و دەمارەکان"، هەروەها ↑چرکە çırke و↑چرکیان çırkîyan "تەکان خواردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **< *(s)ker-** *(IE.)* "بازدان، هەڵبەزین، پەڕین". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "تەکان خواردن، بزوانی خێرا".

[تێبینی: وشەی "سەما" پێوەندی بە "جمین"ەوە هەیە کە ئەویش مانای "بزوان" دەدا. هەروەها وێ دەچێ وشەی حرکة ħaraka (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. کوردی بوونی وشەکە لەوەڕا دەردەکەوێ کە فۆتیمی k بەشێک لە بنجی وشەکە نییە، بەڵکوو نیشانە یان پاشگری جەخت کردنە دە زمانی کوردمادیدا، هەر وەک چۆن لە وشەکانی "هەلەکا" و "داچڵەکین"یشدا دەر دەکەوێ].

**هەڵبرنگان helbırıngan** *[ halbırıngān ]* - "وەستانی باران، لێکردنەوەی باران": هەڵ بورونگان helburungan یش دەگوترێ.

1- دەشێ پێوەندی بە ↑برین[2] bırîn "بوورین، تێپەڕین"ەوە هەبێ و مەبەست "تێپەڕ بوون"ی باران بێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑برینگ bırnîg [هیشک و برینگ].

**هەڵبرین helbırîn** *[ halbırīn ]* - "بڵیند کردن، بەرز کردنەوە": [لەپڕ نازانم چۆن سەرم هەڵبڕی، بەرانبەرم بەژنێک دەرکەوت وەک پەری]، هەروەها دەگوترێ "دەنگ هەڵبڕین"، واتا بەرز کردنەوەی دەنگ. هەڵ + برین hel + bırîn. "برین" لێرەدا پێوەندی بە *برین* "لەت کردن"ەوە نییە، بەڵکوو خزمە لەگەڵ ↑بەرز *beriz* و↑بردن bırdın "هەڵگرتن"، سەر بە ڕیشەی **< *bher-** *(IE.)* "بردن، هەڵگرتن، هەڵهێنان".

**هەڵبزرکان helbızırkan** *[ halbızırkān ]* - هەڵ hel + ↑بزرکان bızırkan. وشەکە دەچێتەوە سەر ↑بزر bızır "ون، دوور، ڕۆیشتوو". دە بنەڕەتدا مەبەست لە "ڕەنگ بزرکان" بزر بوون واتا لە دەست چوونی ڕەنگی دەم و چاوە، بە وتەیەکی دیکە زەرد هەڵگەڕان.

**هەڵبزووقین helbızuqîn** *[ halbızūqīn ]* - "هەڵبەز دابەز کردن": خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın، ↑بەزین bezîn [هەڵبەزین]، ↑بازد bazd و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "جووڵانەوە" دەکەن. فۆتیمی q یان k ناوگرێکە کە دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ هێندێک کردار دێ و ئاماژە بە جەخت کردن دەکا، وەک هەڵ خلیسکان، هەڵپرووزقان، ئاڵۆزکان، هەڵبزرکان و هتد.

**هەڵبژنین helbıjnîn** *[ halbıžnīn ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑هەڵبژاردن helbıjardın.

**هەڵبگاردن helbıgardın** *[ halbıgardın ]* - "بواردن، بوورین 2- داو دەتیو ڕاکردن": هەڵ hel + بگاردن bıgardın. شێوەیەکی تازە لە ↑بواردن buwardın "تێپەڕ بوون" [گۆڕانی فۆتیمی w بۆ g].

**هەڵبلۆقین helbıloqîn** *[ halbıloqīn ]* - "هەڵبزۆقین، هەڵبەزدابەز کردن": ↑هەڵ hel + ↑بلۆقین bıloqîn. خزمە دەگەڵ flackern (G.)، flakka (OIs.)، flaca (Sw.) و vlacken (NL.) "لەرینەوەی توند و خێرا، پرتەپرت کردنی چرا"، سەر بە ڕیشەی **< * plak-, * plag-** *(IE.)* "پەڕ و باڵ لێدان" [دەبنەڕەتدا لێدانی توند و پەیتاپەیتا]. ئەم وشانە لەپلەیەکی دوورتر دا دەبنە

خزم لەگەڵ ↑پرتەا pırte "باڵ لێدانی خێرا و پەیتا پەیتا، لێدانی رەگ، حاڵەتی نائارامی شۆقی چرا".

**هەڵبەزین helbezîn** [ *halbazīn* ] - "خۆ هەڵاویشتن": ↑هەڵ hel + بەزین bezîn. دابەزین dabezîn یش هەیە بە مانای "هاتنەخوار، جوولان بەرەوە خوارەوە". خزمە دەگەڵ ↑بازد bazd، ↑بزووتن *bızutın* [بزوان bızwan]، ↑بزۆقین bızoqîn [هەڵبزۆقین] و هتد.

**هەڵپاچین helpaçîn** [ *halpāčīn* ] - "دادڕین یان بڕین بە برینگ": ↑هەڵ hel + ↑پاچین paçîn. خزمە دەگەڵ ↑پسان pısan.

**هەڵپرتاندن helpırtandın** [ *halpırtāndın* ] - "دەرکردن بە سووکایەتی": هەڵ hel + پرتاندن pırtandın. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ پرت کردن part kardan (P.) "فڕێ دان، توورِ هەڵدان [دوور هەڵدان] و دەگەڵ پرت part (P.) "دوور، بەلاوە". بنجی وشەکە، واتا پرت -pırt [پەرت pert] خزمە دەگەڵ کەرتی یەکەم دە وشەی پەرتەوازە pertewaze [↑پەرەوازە perewaze]دا. ئەم وشەیە ئاماژە بە "تیپەڕین، دوور بوونەوە" دەکا و خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشە دە زمانە خزمەکاندا کە دەربڕی ئەم مانایەن، وەك Fremd (G.) "بیانی"، from (E.) "لە"، Fern (G.)، far (E.) "دوور"، fernen (G.) "دوور کردن(ەوە)"، párā (OIn.) "بەرەو، دوور" [بەرەو شتێک یان شوێنێک چوون، دە هەمان کاتدا دوور کەوتنەوەشە]، pérā (G.) "ئەوپەڕ، لەمەش بەولاوە"، fort (G.) "دوور، بزر، بەرەو پێش"، fortan (G.) "لەمەولا" و هتد. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی کوردی وەك ↑پرد pırd و ↑پەڕینەوە *perîn(ewe)*.

[تێبینی: وشەی fort دە زمانی ئەڵمانیدا وەك پێشگرێك دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کردار بەکار دەهێنرێ کە چەمکی بەرەو پێش چوون و دوور کەوتنەوە دەردەبڕن، وەك fortbilden (G.) "پەروەردە پێش خستن"، fortschreiten (G.) "پێشڕەوی کردن"، fortschicken (G.) "دوور خستن(ەوە)، ناردن"، fortreisen (G.) "سەفەر کردن، بە سەفەر دوور کەوتنەوە"، fortkommen (G.) "بەرەو پێش چوون" و هتد].

**هەڵپرچاندن helpırçandın** [ *halpırčāndın* ] - "رفاندنی لە نەکاو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -*perk (IE.)** "داپچڕین، هەڵدڕین". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑برەك bırek "بەرازی تیر".

[تێبینی: وشەی "رفاندن"یش دە ریشەدا مانایەکی ئەتۆ بە دەستەوە دەدا].

**هەڵپرژین helpırjın** [ *halparžīn* ] - "بە چەنگان پێداهەڵچوون": هەروەها هەڵپەرکین helperkîn هەیە بە مانای "پێهەڵچوون". ↑هەڵ hel + پەرژین perjın [پەرکین perkîn]. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ↑پەل pel "دەست" [چەنگ].

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "چەنگ" و "پێهەڵچوون بە چەنگان" دەکرێ دەگەڵ ئەو وشانەی خوارەوە بەرهەڤی بکەین کە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان بەیەکەوە هەیە: klimban (OG.)، climb (E.) "پێهەڵچوون، وە سەر کەوتن"، Klemme (G.) "گیرە"، klemmen (G.) "رێککوشین، دە گیر خستن"، biklemmen (OG.) "چەنگ پێدا گرتن، دە چەنگدا رێککوشین"، و Klaue (G.) "چەنگ، قولاپ". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی "کەڵەمە، کەڵەوە" و "قولاپ" پێوەندییان بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەیە].

**هەڵپرسقاندن helpırsıqandın** [ *halpırsıqndın* ] - شێوەیەکی دیکە ↑هەڵپرچاندن helpırçandın.

**هەڵپرووزقاندن helpırzuqandın** [ *halpırūzqāndın* ] - شێوەیەکی دیکە ↑هەڵپرچاندن helpırçandın.

**هەڵپریواندن helpırîwandın** [ *halpırīwāndın* ] - "ورد کردن بە قامك ڕێخشاندن": ↑هەڵ hel + ↑پریواندن pırîwandın.

**هەڵپزان helpızan** [ *halpızān* ] - "هەڵمسان، با کردن": ↑هەڵ hel + ↑پزان pızan "ماسین، هەڵمسان". پزان pızan خزمە دەگەڵ ↑فشین fışîn [لە خۆ فشین] و وشەگەلێك کە دە ریشەدا ئاماژە بە "ماسین، هەڵمسان" دەکەن و هێندێك لە وشەکانی ئەم خێزانە مانای "زۆر و زەوەند بوون" لە خۆ دەگرن. ژمارەیەك لەم وشانە لەژێر ↑بەس *bes* "کافی، زۆر"دا باس کراون.

**هەڵپشاوتن helpışawtın** [ *halpıšāwtın* ] - "گوشین، گلۆفین": هەڵپشافتن helpışaftın یش دەگوترێ: ↑هەڵ hel + ↑پشاوتن pışawın.

**هەڵپشکین helpışkîn** [ *halpıškīn* ] - "پشمین": هەلپژکین helpıjkîn یش دەگوترێ. ↑هەڵ hel + پشکین pışkîn. خزمە دەگەڵ ↑پشمین pışmîn، ↑پشوو pışû، ↑پیش pîş خواردنەوە و چەند وشەیەکی دیکە کە ئاماژە بە دەرچوونی هەوا دەکەن.

**هەڵپلۆخان helpıloxan** [ *halpıloxān* ] - "داماڵدرانی پێست بە سووتان": داپلۆخان dapıloxan یش دەگوترێ. ↑هەڵ hel + ↑پلۆخان pıloxan. خزمە دەگەڵ ↑پۆلکە polke "پێستی هەڵتۆقیوی دەست، بلۆقی پێستی دەست".

**هەڵپۆقین helpoqîn** [ *halpoqīn* ] - "هەڵتۆقین": ↑هەڵ hel + پۆقین poqîn. خزمە دەگەڵ ↑بۆق boq، ↑بۆقژە boqje "زیپکەی ناو زار"، ↑بۆش boş "زۆر"، ↑پۆخ pox "خونچە" و گەلێك وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "ماسین، با کردن".

**هەڵپە helpe** [ *halpa* ] - "پەلە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ laufen (G.)، (h)loufan (OG.)، löpa (Sw.) "راکردن"، hlaupan (Gt.)، leap (E.) "خۆ هەلاویشتن، باز دان". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**هەڵپەز helpez** [ *halpaz* ] - "منداڵدان، تۆلدان": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پزدان pızdan.

**هەڵپەساردن helpesardın** [ *halpasārdın* ] - ↑پەساردن pesardın.

**هەڵپەقژین helpeqjîn** [ *halpaqžīn* ] - "مچوورك پێداهاتن": ↑هەڵ hel + پەقژین peqjîn. پەقژین خزمە دەگەڵ ↑بۆقژە boqje "زیپکە(ی زاری منداڵان)". مەبەست لە پەقژین دەبنچینەدا خڕبوون و گرمۆڵەبوونی بن موویەکانە لە کاتی مچوورك [مووچڕك] پێدا هاتندا.

**هەڵپەکاندن helpekandın** [ *halpakāndın* ] - "قەڵش قەڵش بوون، لەت لەت بوون": ↑هەڵ hel + پەکاندن pekandın. خزمە دەگەڵ ↑پەقین peqîn "تەقین، تۆقین" و هەروەها دەگەڵ ↑پژان pıjan "پڕژ و بڵاو بوون".

[تێبینی: وشەکانی تەقین و تۆقین دە بنەڕەتدا خزمن دەگەڵ دڕان و دڕین].

**هەڵپیتاندن helpîtandın** [ *halpītāndın* ] - "هەڵپەرتاوتن": هەل hel + پیتاندن pîtandın. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑پتە pıte سەر بە ریشەك بە مانای "لێدان".

**هەڵپین helpîn** [ *halpīn* ] - "هەناسەسواری سەگ لە گەرمان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەلەپچە kelepçe "دەستبەندی زیندانی"، clip (E.)، clyppan (OE.)، kleppa (OFris.)، glóbti (Lit.) "گرتن، دە گیر(ە) خستن، دە ئامێز گرتن، ئاوقان". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑کەلبەتان kelbetan هەیە بە مانای "گاز" کە ئەویش وێ دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. چەمکی هاوبەش لەم وشانەدا "ڕێکگوشین، بەرتەنگ کردن"ە. هەڵپینی سەگ لە گەرمان جۆرێك لە بەرتەنگ بوون و ڕێگوشرانی سەگ بە هۆی پێ نەگەیشتنی ئۆکسیژێنی پێویستە.

[تێبینی: لەباری مانا و پێوەندی چەمکەکانی سەرەوە دەکرێ دەگەڵ ئەو وشانەی خوارەوە بەرهەڤی بکەین: خنکان xınkan، هانکەهانک hankehank، eng (G.) "تەنگ"، Angst (G.) "ترس" [دە بنەڕەتدا: تەنگەتاو بوون، ڕێکگوشران] و نەخۆشی Angina pectoris (L.) "بەرتەنگ بوونی سینگ" (بە هۆی گیرانی ڕەگەکانی دڵ)].

**هەڵتاواندن heltawandın** [ *haltāwāndın* ] - "هەزم کردن": ↑هەڵ hel + تاواندن tawandın [↑تاوانەوە tawanewe].

**هەڵتڕاندن heltırandın** [ *haltırāndīn* ] - "دەرکردن بە سووکایەتی": هەڵ hel + تڕاندن tırandın. [هەڵتڕە! واتا لاچۆ، لەبەر چاوم گوم بە]. "تڕاندن" خزمە دەگەڵ ↑تاراندن tarandın "دوور کردنەوە، دەرپەڕاندن".

**هەڵترنگان heltırıngandın** [ *haltırıngāndın* ] - "سڵ بوون، خۆ زیز کردن": خزمە لەگەڵ ↑ترۆ tıro و ↑تاراندن tarandın و چەند وشەیەکی دیکە.

**هەڵترەکان heltırekan** [ *haltırakān* ] - "لەبەریەک بڵاو بوون و پارچەپارچە بوون (ی توند)، مونفەجیر بوون": شێوەی کۆنتری ↑هەڵتەکان2 heltekan 2.

**هەڵتووتەکان heltutekan** [ *haltūtakān* ] - بڕوانە ↑تووتان tutan.

**هەڵتووزاندن heltuzandın** [ *haltūzāndın* ] - "جووتە هاویشتن": هەڵتیزاندن heltîzandın و هەڵجووزاندن helcuzandın، هەڵگوزاندن helguzandın یش دەگوترێن. ↑هەڵ hel + تووزاندن tuzandın/ جووزاندن cuzandın/ guzandın. خزمە دەگەڵ جستن jastan (P.) "باز دان، دەرپەڕین، هەڵبەزین". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑چووزە çuze [دە بنەڕەتدا واتا دەرپەڕیویی، تیژایی، زەقایی]، ↑چوخساندن *çuxsandın چوخساندن* "دەرپەڕاندن" و هتد. ئەم وشانە سەر بە ریشەیەکن بە مانای "دەرپەڕین". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ shoot (E.) "هاویشتن، شەق لە تۆپ دان".

[لەباری چۆنیتی و ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی هاوریشەی کوردمادی و فارسی دۆزینەوە dozîn(ewe) و جستن jostan (P.)].

**هەڵتۆقین heltoqîn** [ *haltoqīn* ] - "قیتەوە بوون، دەرپەڕین": [کارگ هەڵتۆقی، بەرد وە سەرم کەوت، هەڵتۆقی]. ↑هەڵ hel + ↑تۆقین² toqîn.

**هەڵتەزینەوە heltezînewe** [ *haltazînawa* ] - "ڕاپەڕین، شۆرش کردن": هەڵ hel + تەزین(ەوە) tezîn(ewe). خزمە لەگەڵ ↑هەڵتیقان heltîqan "هەڵبەزین" و ↑*هەڵتەکان1 heltekan 1* "تەکان دان بەرەوە سەرەوە".

**هەڵتەکان1 heltekan 1** [ *haltakān* ] - "تەکان دان بەرەوە سەرەوە": [شان هەڵتەکینە]، هەڵ hel + تەکان tekan. بڕوانە ↑تەکان tekan "بزاڤ".

**هەڵتەکان2 heltekan 2** [ *haltakān* ] - "لەبەریەک بڵاو بوون": هەڵ hel + تەکان tekan. هەڵتەقان helteqan یش دەگوترێ. "تەکان" لێرەدا پێوەندی بە تەکان "بزاڤ"ەوە نییە، بەڵکوو شێوەیەکی دیکەیە لە تەقان teqan یان ↑تەقین teqîn "لێک بڵاو بوون (بە توندی)، مونفەجیر بوون". شێوەی کۆنتری کردارەکە ↑هەڵترەکان heltırekan ە کە دە هێندێک شێوەزاردا بەکار دێ.

**هەڵتیقان heltîqan** [ *haltīqān* ] - "هەڵبەزین": ↑هەڵ + تیقان tîqan. شێوەیەکی دیکە لە ↑هەڵتەکان1 heltekan 1 "تەکان دان بەرەوە سەرەوە".

**هەلجاندن helcandın** [ *haljāndın* ] - "لێدانی پشم و لۆکە، هەللاجی کردن": هەڵ + جاندن hel + candın. کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenīn یان ↑ژەندن jendın بە مانای "لێدان" یاخود لێکدانی پەیتاپەیتا. وشەی حلاج ħellac (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە. وەک دەزانین دەزگای هەللاجی لە دوو بەش پێک دێ، یەکەمیان کەواتێکە بەتێکی بەم سەر و ئەو سەرەوە بەستراوەتەوە و بەشی دووەمیش کوتکێکی تایبەتییە کە لە ژێیەکە دەدرێ و دەیلەرێتێتەوە. بەوتەیەکی دیکە هەللاج کەوانەکە دەخاتە ناو لۆکە و دەیژەنێ بۆ لێک بڵاو کردن و شاش و بۆش کردنی لۆکەکە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەلچاندن helçandın "راچەناندن"، ↑هەڵجنقین helcınqîn و ↑*راچەنین raçenın*.

**هەڵجنقین helcınqîn** [ *haljanqīn* ] - شێوەیەکی دیکەیە لە↑راچەنین raçenın. لەباتی پێشگری "را" لێرەدا "هەل" بەکار هاتووە. فۆتیمی k یان q دە گەلێک وشەدا وەک ناوگری جەخت کردن دەچێتە ناو کردارێکەوە، وەک ئالۆزکان، خلیسکان، پەشۆکان، دامرکان، هەڵپرسقاندن، هەڵبزووقین و هتد.

**هەڵجیپاندن helcîpandın** [ *haljīpāndın* ] - "ئامادە کردن بە نیوانیوی، گەڵاڵە کردن": پێشگری هەڵ hel + جیپاندن cîpandın. خزمە لەگەڵ ↑گیف gîf "ساز، تەیار، ئامادە".

**هەلچاندن helçandın** [ *halčāndn* ] - شێوەیەکی دیکەیە لە راچەناندن raçenandın [↑راچەنین raçenın].

**هەڵچرچان helçırçan** [ *halčırčān* ] - "سیس بوون": ↑هەڵ hel + ↑چرچ çırıç.

**هەڵچۆقان helçoqan** [ *halčoqān* ] - "هەڵلەرزین لە سەرمان": هەڵ hel + چۆقان çoqan. هەروەها دە کوردمادیدا چەق و چۆ çeq u ço دەگوترێ بە مانای "هەڵلەرزینی بەدەم تا و تێوە". بنجی چۆق- çoq- خزمە دەگەڵ Schock (G.) "شۆک، داچڵەکین". ئەم وشەی زمانی ئەڵمانی لە زمانی فەرانسەیی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر choquer (Fr.) "لێکدان، پێکدادان" و هەروەها schocken (MNl.). ئەم وشانە خۆیان دەبنە خزم دەگەڵ schaukeln (G.) "لەرزانەوە، هەڵبەزدابەز کردن" و Schaukel (G.) "حندرحۆ، هەڵڵادۆشە، هیلاهۆپ". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە باس نەکراوە.

**هەڵخراندن1 helxırandın 1** [ *halxırāndın* ] - "بزواندنی دەفری پڕ لە شتی ورد": هەڵخلاندن helxılandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ خوولاندن xulandın [↑خولانەوە xulan(ewe)].

**هەڵخراندن2 helxırandın 2** [ *halxırāndın* ] - "دنە دان": هەڵ hel + خراندن xırandın.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا anfeuern بە مانای "دنە دان، هان دان" دێ کە دەچێتەوە سەر وشەی Feuer "ئاگر". وشەی "هەڵخراندن" بە مانای دنە دان دەشێ دە بنەڕەتدا "هەڵگراندن helgırandın" بووبێ، سەر بە وشەی ↑گڕ gır "بڵێسە، ئاگر".

**هەڵخۆزان helxozan** [ *halxozān* ] - "چوونەسەر، پێداهەڵچوون": ↑هەڵ hel + خۆزان xozan. خزمە دەگەڵ hoch (G.)، hoh (OG.)، high (E.)، hög (Sw.) "بڵیند، بەرز"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *keu-* "چەمان". خزمە دەگەڵ ↑قۆز qoz، ↑قوت qut، ↑قۆچ qoç و گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

**هەڵخۆشان helxoşan** [ *halxošān* ] - "تیکچوونی کار": ↑هەڵوەشان helweşan.

**هەڵخەلەتان helxeletan** [ *halxalatān* ] - ئەم وشەیە لەوە ناچێ لە وشەی عەرەبی "غلط" وەرگیرابێ، بەڵکوو خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑گلان gılan و ↑خلیسکان xılîskan دا باس کراون. لەباری ماناوە دەگەڵ وشەی فارسی "لغزش" بەرهەڤی بکە کە مانای "خلیسکان"

دەبەخشێ و هاوکات بە مانای "هەڵە، هەڵخەڵەتان"یش بەکار دێ. دوور نییە وشە عەرەبییەکە لە وشە کوردمادییەکە وەرگیرابێ.

**هەڵدێران helderan** [ *halderān* ] - "فڕێ دران، کەوتن لە بەرزییەوە": هەڵ hel + دێران deran. کەرتی "دێران" خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان، با دران" سەر بە ریشەی **< *der- (IE.)** "سووڕان، با دران". هەڵدێران جۆرە کەوتن لە شاخ و داخە کە مرۆڤ یان ئاژەڵ چەندین و چەند جار خول دەخوا [خلۆر دەبێتەوە] تا لە شوێنێک لە جووڵە دەکەوێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەی werfen (G.) "فڕێ دان، هاویشتن" دە زمانی ئەڵمانیدا کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان"].

**هەڵزبەهین helızbehîn** [ *halızbahīn* ] - "سیس هەڵگەڕان و زەرد بوونی وێنجە": هەڵز helız خۆی بە مانای "وێنجە"ش بەکار دەهێنرێ. لەوانەیە وشەکە بەم چەشنە پێک هاتبێ: هەڵز helız + بەهین behîn. ئەگەر وشەکە بەم جۆرە دروست کرابێ، کردارەکە پێوەندی بەو وشانەوە پەیدا دەکا کە لەژێر ↑ویسک wîsk "لەر و لاواز"دا باس کراون.

**هەڵزران helzıran** [ *helzırān* ] - "هەڵدڕان، دادڕان": ↑هەڵ hel + زڕان zıran [شێوەیەکی دیکە لە دڕان dıran، بڕوانە ↑دڕین dırîn].

**هەڵزلەپان helzılepan** [ *halzılapān* ] - "پۆرک دەرکردنی پێست، هەڵئازنین": ↑هەڵ hel + زلەپان zılepan. هەروەها ↑زلپک zılpık هەیە بە مانای "زیپکە". وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ژلێوان jılewyan و ↑زلەویان zılewyan "شڵەژان، لێکدران".

[تێبینی: هەلازنین یان هەڵزلەپان دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە Ausschlag یان Hautausschlag (G.) و ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر کرداری schlagen (G.) "لێدان، لێکدان". خودی ئەم کردارە ئاڵمانییە خزمە دەگەڵ ↑*شڵەقان şıleqan* و ↑شڵەژان şılejan].

**هەڵزووران helzuran** [ *halzūrān* ] - "سووتانی توێی سەرەوەی گۆشت": پێشگری هەڵ hel + زووران zuran. بڕوانە ↑زوورانەوە zuranewe "کزانەوە".

**هەڵزەقینەوە helzeqînewe** [ *halzaqīnawa* ] - "هەڵبەزینەوە لە ترس و لە نەکاو": پێشگری هەڵ hel + زەقینەوە zeqînewe. کرداری زەقینەوە پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑شەکانەوە şekanewe "تەکان خواردن، لەرزین".

2- ↑زەق zeq. وەک لەژێر ئەم وشەیەدا باس کراوە، وشەکانی سەر بەم خێزانە مانای "دەرپەڕین، دەرپەڕاندن" دەگەیەنن.

**هەلزیپان helzîpan** [ *halzīpān* ] - "هەڵتۆقین": ↑هەل hel + زیپان zîpan. بنجی زیپ -zîp خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە لەژێر ↑قوب qub "1- ترۆپک 2- گونبەز 3- دوگمە 4- زۆپایی"دا باس کراون.

**هەڵژلێویان heljılewyan** [ *halžılewyān* ] - "شڵەژان، ئاڵۆز بوون": ↑هەڵ hel + ↑ژلێویان jılewyan.

**هەلساندن helısandın** [ *halısāndın* ] - "1- شل و سست کردن 2- ورد کردن وەک کوتانی گەنم 3- کەم کردن 4- لاواز کردن 5- خراپ کردن، لەکار خستن": بنجی هەلس -helıs لەوانەیە بەهەموو ماناکانەوە پێوەندی هەبێ بە ↑هەرز² heriz "1- سوان و لووس بوون (ی پێچ) 2- خەسار، فیرۆ". هەروەها ↑هەلیسە helîse "1- هەریسە 2- پڵاوساوار" دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

هەڵسکاندن **helsıkandın** [ *halsıkāndın* ] - "دانە بەر جتیو و خراپ پێگوتن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:
1- ↑هەڵشاخاندن helşaxandın.
2- ↑شکاندن şıkandın [بڕیزی پێکردن و شکاندنەوە].
هەڵسەنگاندن **helsengandın** [ *halsangāndın* ] - "1- وەزن کردن 2- نرخاندن، پێکگرتن": ↑هەڵ hel + سەنگاندن sengandın [سنجیدن sanjīdan (.P) "هەڵسەنگاندن"]. دەچێتەوە سەر ↑سەنگ seng "بەرد، وەزنە".
هەڵشاخاندن **helşaxandın** [ *halšāxāndın* ] - "بەسەردا نەڕڕاندن": ↑هەڵ hel + شاخاندن şaxandın [خزمە دەگەڵ ↑زیقاندن zîqandın].
هەڵشاندن **helşandın** [ *halşāndın* ] - "1- رووخاندن، رماندن 2- هەڵوەشاندن": پێشگری ↑هەڵ -hel + ↑شاندن3 şandın.
هەڵشلنگاندن **helşılıngandın** [ *halšılıngndın* ] - "خۆ هەڵکێشانی بە درۆ": ↑هەڵ hel + شلنگاندن şılıngandın. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "خۆ با دان و خۆ هەڵسووڕاندن" لە رووی خۆ بە زل زانییەوە بووە. خزمە دەگەڵ schlingen (.G)، slingan (.OG) و (.OE) "خۆبادان، خوشین"، slyngva (.OIs) "فڕێ دان، دەر پەڕاندن"، slinkti (.Lit) "خوشین"، سەر بە ریشەی ***g-slenk-* > (.IE)** "خۆ با دان، لێکهاڵان".
هەڵشلەپاندن **helşlepandın** [ *halšılapān* ] - "هەڵپشاوتن": خزمە دەگەڵ ↑هەڵزلەپان helzılepan و ↑*هەڵژلیویان heljılewyan* و چەندین وشەی دیکە.
هەڵفرتان **helfırtan** [ *halfırtān* ] - "قوشقی بوون، را کردن": هەڵ hel + فرتان fırtan. خزمە دەگەڵ ↑فرتە fırte.
هەڵقاچان **helqaçan** [ *halqāčān* ] - "هەڵپاچین": هەڵ hel + قاچان qaçan. خزمە دەگەڵ ↑قاش qaş "لەت، بڕ". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ قیچی qeyčī (.P) "مەقەست".
هەڵقوتاندن **helqutandın** [ *halqutāndın* ] - "خۆ تێوەردان": دەشێ پێوەندی بە ↑قوت qut "زیرک، وریا، زیت"ەوە هەبێ، قوتە قوت کردن واتا هەوڵ دان بۆ سەر دەرهێنان لە شتێک کە پێوەندی بە خودی کەسەوە نییە.
هەڵقوڵتان **helqultan** [ *halqultān* ] - "1- هەڵقوڵان 2- لەپڕ پەیدا بوون": ↑هەڵ hel + قوڵتان qultan [↑قوڵتە qulte].
هەڵقوڵین **helqulîn** [ *helqulīn* ] - "دەرچوونی ئاو بە کوڵ و کەف": ↑هەڵ hel + قوڵین qulîn. خزمە دەگەڵ ↑کوڵین kulîn و ↑قوڵتە qulte و هتد.
هەڵقونین **helqunîn** [ *halqunīn* ] - "لەپڕ پەیدا بوون، لەپڕ بەرچاو هاتن": بڕوانە ↑قونین2 qunîn.
هەڵقەتین **helqetîn** [ *halqatīn* ] - "فڕێ دران، دەرکران": ↑هەڵ hel + قەتین qetîn. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەتان qetan "بڕان"،↑ کۆتایی kotayî "بڕانەوە" و هیتر کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، لێک جودا کردن". هەڵقەتین دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "دابڕان" بێ.
هەڵقەمچان **helqemçan** [ *halqamčāndın* ] - "چرچ و لۆچ بوون": پێشگری هەڵ hel + ↑قەمچان qemçan.

هەڵک **helık** [ *halık* ] - "تیز کردن، گاڵتە کردن بە کەسێک": خزمە لەگەڵ ↑حیلکە ĥîlke و حیلکاندن ĥîlkandın و دواتر ↑حیلاندن *ĥîlandın* لەبنەڕەتدا بە مانای "پێکەنین".

هەڵکفان **helkıfan** [ *halkıfîn* ] - "1- هەڵچوون لەسەر ئاگر 2- هەڵاژنانی پێست لە زیپکە 3- هەڵمسان و با کردن 4- ترشانی هەویر]. هەڵکفین helkıfîn یش دەگوترێ. بڕوانە ↑کفان kıfan.

هەڵکلاشین **helkılaşîn** [ *halkılāšīn* ] - "خوراندن، کراندن": ↑هەڵ hel + کلاشین kılaşîn. خزمە دەگەڵ ↑ئالۆش aloş "خوروو"، ↑کڕاندن kırandın [خراشیدن xarāšīdan (P.)].

هەڵکورمان **helkurman** [ *halkurmān* ] - "خۆ کز کردن و خۆ مات کردنی پەلەوەر": هەل hel + کورمان kurman. خزمە دەگەڵ ↑قرمان qırman، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمان، خوار بوونەوە". هەڵکووڕمان، خۆ کووڕ کردن، تیکقرمان و خۆ بچووک کردنەوەی پەلەوەرە.

هەڵکولووشان **helkulûşan** [ *halkulūšān* ] - "هەڵکۆڵین، هەڵکەندن": هەڵ hel + کولووشان kulûşan [خزمە دەگەڵ ↑کۆڵین kolîn].

هەلکە **helke** [ *halka* ] "دۆڵچە، سەتڵی چەرم": دەشێ پێوەندی بە ↑چاڵ1 çal "قوڵکە"ەوە هەبێ، سەر بە ریشەی **< -*(s)kel (.IE)**. شیاوی سەرنجە کە "دۆڵچە"ش پێوەندی بە "دۆڵ"ەوە هەیە.

هەڵا1 **hella 1** [ *hallā* ] - "دەنگ و هەرا": خزمە لەگەڵ ↑کاڵ *kal* "کەمرەنگ" و ↑زەلال zelal "روون"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بانگ کردن، هەرا کردن".

هەڵا2 **hella 2** [ *hallā* ] - بۆ وێنە هەڵا بردن، هەڵا چوون. هەروەها لەگەڵ چەند وشەیەک دێ وەک ↑هەڵادۆشە helladoşe "حندرحۆ"، هەڵاقووچکە hellaquçke "هەڵچنراو" و هتد. لەم وشانەشدا ئاماژە بە بڵیندی و لای سەرەوە دەکرێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑هەلاندن helandın "بلیند کردن، بەرز کردنەوە"، ↑ئاڵ *al* "قامکی هەرەدرێژ"، ↑ئالا ala "پەرچەم، بەیداخ" [دە بنەڕەتدا: بەرز راگیراو]، ↑حەلحەلە ĥelĥele "تەشقی ئاسمان" و هتد.

هەڵادۆشە **helladoşe** [ *hallādoša* ] - "حندرحۆ": ئامرازێکی کایەی منداڵانە کە دوو زارۆک، هەر کام لە لایەک لەسەری دادەنیشن و هەر جارەی یەکیان دەچێتە سەرەوە و ئەوەی دیکە دێتە خوارەوە. وشەکە پێوەندی بەم سەروخوار کردنەوە هەیە. کەرتی "هەڵا" پێوەندی بە ↑هەڵا2 hella 2 ەوە هەیە و مانای "سەر، بەرەوژوور، بڵیندی" دەبەخشێ. کەرتی دۆشە -doşe خزمە لەگەڵ ↑تەشک teşk [تەشک و داوێن] و ئاماژە بە "لای خوارەوە" دەکا.

[تێبینی: وشەی الاکلنگ allākolang (P.) "هەڵادۆشە" لەزمانی فارسیدا هەر بەم شێوەیە پێکهاتووە. کەرتی allā لەگەڵ "هەڵا" خزمە و ئاماژە بە "لای سەرەوە، بڵیندی" دەکا. "کلنگ" kolang لە بنجی کول kol + ئەنگ eng پێک هاتووە. ئەم کەرتەی دوایی پاشگرە و مانای "ئامراز" بە وشەکە دەبەخشێ، وەک "قولێنگ" لە زمانی کوردمادیدا. هەرچی بنجی کول kol ە، وێ دەچێ پێوەندی بە قووڵ qul ی کوردمادییەوە هەبێ. "کول" (قووڵ) لەم وشەیەدا ئاماژە بە "لای خوارەوە، نزمایی" دەکا.

هەڵم **helım** [ *halım* ] - "هاڵاو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ئەو وشانەی لەژێر ↑هاڵاو halaw دا هاتوون.

2- calm (.E) "هێدی، رووخۆش". ئەم وشەیە ریشەی لاتینی هەیە و دەچێتەوە سەر وشەیەکی زمانی ئاخافتنی لاتینی، واتا calma، دواتر cauma (.L) و دواجار kauma (.Gr) "گەرما)ی رۆژ یان خۆر)". calēre (.L) "گەرم بوون، هایسان"، ↑کەڵژین keljîn "دیاری دانی تینی گەرما" و ↑شەڵق şelq "تاو و تێ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

هەڵمات **helmat** [ *halmāt* ] - "کەلا، مەڕمەڕ": هەڵ hel + مات mat [↑مت mıt، میچ mîç یان مێش mêş].

هەڵمرویستن **helmıruystın** [ *halmıruystın* ] - "هەڵمژین": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەڵملیسین helmılîsîn "لێو لێدانی توند و مژین".

هەڵمسان **helmısan** [ *halmısān* ] - "ماسین، ئەستوور بوون، با کردن": ↑ماسین masîn یش دەگوترێ. ↑هەڵ hel + مسان mısan [ماسین masîn].

هەڵملیسین **helmılîsîn** [ *halmılīsīn* ] - "لێو لێدانی توند و مژین": ↑هەڵ hel + ملیسین mılîsîn. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ melken (G.) و (Nl.)، melchen (OG.)، milk (E.) "دۆشین"، سەر بە ریشەی **< *meleg- (IE.)** "دۆشین" [دەبنەڕەتدا: سڕینەوە، ڕێخشاندن، *داماڵین*]. دیارە کاری دۆشینی شیر یان مژینی شیر بە هۆی دەست پێداماڵین یان لێو و زمان ڕێخشاندنی گوان چێ دەبێ و هەر بۆیەش ماناکە لە "پێداماڵین، ڕێخشاندن"وە پەرەی گرتووە بۆ "دۆشین" و "مژین". وشەکانی ↑مەڵاشوو melaşû و ↑ملچە mılçe و چەند وشەیەکی دیکە پێوەندییان بەم وشەوە هەیە.

هەڵمەت **helmet** [ *halmat* ] - "پەلامار، هێرش": ئەم وشەیە لەوە ناچێ لە حملة ħamle (Arb.) وەرگیرابێ، چونکوو وشەی "**حمل**" دە زمانی عەرەبیدا مانای "هەڵگرتن و بردن" دەبەخشێ. بە بۆچوونی مامۆستا جەماڵ نەبەز وشە عەرەبییەکە لە "هەڵمەت" وەرگیراوە. کەرتی یەکەمی وشەکە لەوانەیە هەر ئەوە بێ کە لە وشەی "هەلەمار"دا هەیە. "هەلەمار" و "پەلامار" هەردووک یەک مانا دەبەخشن و کەرتی یەکەم لە هەردوو وشەکەدا ئاماژە بە "خێرایی" دەکا [هەلەهەل و پەلەپەل]. لەم بارەوە بڕوانە ↑هەڵ⁴ hel "پەلە". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا مەت met- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بەو Meißel (G.) "مکارە، قەڵەمەی بەرد تاشین"، meizan (OG.)، maitan (Gt.)، meita (Ois.) "لێدان، کوتان(ەوە)". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشانە باس نەکراوە، لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑مەترەق metreq "کوتکی ئاسن". جێی ئاماژەیە کە دە وشەی "پەلامار" و "هەلامار"یشدا کەرتی "مار" خزمە دەگەڵ *ماردن* "شکاندن، ورد کردن" و *مارز* "سەرکوتکەر". بەم جۆرە مانای هەموو وشە کوردمادییەکانی سەرەوە دەبێتە "لێدانی خێرا".

هەڵنج **helınc** [ *halınj* ] - "دۆخی بەر لە رشانەوە، حۆق": شێوەی پێشتری ↑هێڵنج hêlınc.

هەلنووتن **helnutın** [ *halnūtın* ] - "سەر سم دان": ↑هەڵ hel + نووتن nutın [واتا ↑نووچ nuç دان].

هەڵووچە **heluçe** [ *halūča* ] - "میوەیەک": هەڵووژە heluje و عەلووکە ɛeluke ش دەگوترێ. ئالووچە ālūče (P.). هەڵوو helu + پاشگری چە çe. خزمە لەگەڵ ↑ئاڵوو alu "بادامەی گەروو، لەوزە".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە بادامەی گەروو [ئاڵوو] دەگوترێ "سیبک" واتا "سێوی چکۆڵە"].

هەلووک **heluk** [ *halūk* ] - لە کایەی "دار و هەلووکێن"دا بەکاری دێنن، دارێکی چکۆڵەیە، جەمسەرەکانی دادەتاشن و بە دارێکی مەزنتر لێی دەدەن، بۆ ئەوەی دووری هەڵدەن. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هێڵەک helek "سواپ، بەردی پان و لووس" و ↑حولی ħulî "داردەستی لووس".

هەلومەرج **helumerc** [ *halūmarj* ] - "شەرایەت": هەل + و + ↑مەرج merc+ u + hel. هەل دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەڵ² hel "دەرفەت".

هەڵوەدا **helweda** [ *halwadā* ] - "ئاوارە، تەرە": *الوداع* > *alwidāɛ* (Arb.) "ماڵاوایی".

**هەلوەلا helwela** [ *halwalā* ] - "هاتوچۆ و زۆر ماندوو بوون بە شوێن کارێکدا": [کەوتووەتە هەلوەلا]. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری هەل hel + وەلا wela. کەرتی ئەسڵی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑وێڵ wel "سەرگەردان، سوڕاوە بەم لا و ئەو لادا".

**هەڵوێزنین helweznîn** [ *halweznīn* ] - "گلۆڵە کردن یان لە دەوری شتێک هاڵاندنی بەن و شریت بە مەبەستی کۆ کردنەوەی". هەڵوەزنین helweznîn یش دەگوترێ. پێشگری هەڵ hel + ↑وێزنین weznîn.

**هەڵۆ helo** [ *halo* ] - "پەلەوەرێکی راوکەر": ↑هەرۆ hero ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ aro (OG.)، ara (Gt.)، earn (OE.)، haraš (Heth.)، ilar (OIr.)، erelis (Lit.)، orel (Rus.) "هەڵۆ"، ornis (Gr.) "پەلەوەر". ریشەی ئەم وشەیە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە.

**هەلۆرک(ە) helork(e)** [ *halork(a)* ] - "جۆلانەی گوریس": هەروەها هەلوورکە هەیە بە مانای "جۆرێک هەڵپەڕکێی کیژۆڵان". خزمە لەگەڵ ↑لەرە lere "لەرزە، راژان، جووڵانەوە بەم لا و ئەو لادا"، هەروەها ↑لەرین(ەوە) lerin(ewe) "لەرزین"، سەر بە ریشەی > *klei- (IE.) "لار بوون(ەوە)، کل بوون".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "لەرە، تەکان، جوڵان" و "هەڵپەڕکێ" لە وشەی "دیلان" [دیلانێ]شدا دەبینرێ کە بە هەردوو مانای "جۆلانە" و "هەڵپەڕکێ" بەکار دێ].

**هەڵۆل helol** [ *halol* ] - "تیو بەتاڵ، هەڵکۆڵدراو": ↑کلۆر kılor یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ hohl (G.)، hol (NL.) و (OE.) *holr* (OIs.)، hollow (E.) "هەڵۆڵ"، hole (E.) "کون"، Höhle (G.) "ئەشکەفت"، Hölle (G.)، hell (OE.)، hel (OIs.) "دۆژە" [دە بنەڕەتدا: دنیای مردووەکان، هۆڵی مردووەکان؟]. خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە وەک ↑قالۆر qalor، ↑قەڵەم qelem، ↑هاڵان halan (لێهاڵان)، ↑هۆڵ hol، سەر بە ریشەی > *kel- (IE.) "داپۆشین، شاردنەوە، لێهاڵان".

**هەڵهێنجان helhencan** [ *halhencān* ] - "ئاو لە چاڵاو دەرهێنان بە سەتڵ": پێشگری هەڵ hel + ↑هێنجان hencan.

**هەلە hele** [ *hala* ] - دەگەڵ "پەلە" دێ [هەلەهەل و پەلە پەل helehel]. ↑هەل[4] hel.

**هەڵە hele** [ *hala* ] - "ناراست": وێ ناچێ ئەم وشەیە لە غلط ġalat (Arb.) وەرگیرابێ. ئەگەر ئەسڵی وشەکە "خەڵەت" بایە، هەموو لایەک ئەم وشەیەی ئاوا بەکار دەهێنا و پێویست نەدەبوو بکرێتە "هەڵە" و هەردووک وشە لەپاڵ یەک بەکار بهێنرێن. ئەم وشەیە وێکچووتێکی زۆری هەیە دەگەڵ وشەیەکی کۆنی ژێرمەنی کە دەبێتە irr(e) (G.)، irrī (OG.)، aīrzeis (Gt.)، ierre (OE.) "بە هەڵەچوو، تێکەڵ کردوو، ئاگا لەخۆ نەماو"، هەروەها errare (L.) "هەڵە کردن"، سەر بە ریشەی > *er(e)s- (IE.) "توند و بێ مەبەست خۆ جووڵاندن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑هەر her هەیە بە مانای "ئەحمەق".

**هەڵەباش helebaş** [ *halabāš* ] - "سڵ، قوشقی": لەوەناچێ وشەکە لە دوو کەرتی "هەڵە" و "باش" پێک هاتبێ، بەڵکوو دەشێ پێک هاتبێ لە هەڵەب heleb + ئاش aş-. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکە لە پاشگری بە ئاوەڵناو کردنی ئاس as- [↑ئۆز oz-]. کەرتی ئەسڵی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەڵپە helpe "پەلە"دا باس کراون.

**هەڵەپەزە helepeze** [ *halapaza* ] - "روتەیل، جۆرێک جاڵجاڵووکە": لەم بارەوە دەکرێ ئاماژە بە سێ شیمانە بکەین:

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑هەڵپزان helpızan ەوە هەبێ [↑پزان pızan]. لەم تێڕوانینەوە هەڵەپەزە وەك زیلەیەكی هەڵپزاو بەناو كراوە.

2- كەرتی پەزە peze- لەوانەیە پێوەندی بە ↑پسپسەكۆڵە pıspısekole ەوە هەبێ كە ناوێكی دیكە بۆ جاڵجاڵووكەیە.

3- دە زمانی ئەڵمانیدا بەم زیندەوەرە دەگوترێ wolfsspinne (G.)، واتا "گورگە جاڵجاڵووكە". هەروەها وشەی بەرەگەز ئیتالیایی Tarantel (G.) بەكار دەهێنرێ كە دەچێتەوە سەر ناوی Taranto كە شارێكی ئیتالیایە و سەمایەكی پڕ جمو جۆڵی هەیە. بەپێی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی DUDEN مرۆڤانی كەونارا لەو باوەڕەدا بوون كە پێوەدانی ئەم زیندەوەرە هەڵبەزین و جم و جۆڵێكی توندی وەك سەما كردن لای كەسی پێوەدراو دروست دەكا. هەر بۆیە وشە ئیتالیاییەكە ئاماژە بە سەما كردنی خەڵكی ئەو شارە دەكا. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەكرێ ئەم شیمانەیەش بهێنرێتە ئاراوە كە وشەی "هەڵەپەزە" پێوەندی بە ↑هەڵبەزین helbezîn ەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەكە دەبێتە "هەڵبەزێنەر".

**هەڵەت helet** [*halat*] - "زەرد و ماهی زۆر سەخت": پێوەندی بە یەكێك لەم وشانەوە هەیە:

1- glatt (G.)، glad (Nl.) "ساف و لووس، خز، خلیسك" و gleiten (G.) "خزاندن، خلیسكاندن". ئەم وشە ژێرمەنییانە هەروەها خزمن لەگەڵ ↑خلیسكان *xılîskan* و ↑خەڵتان xeltan و ↑زەرد[1] zerd [زەرد و سوور] و چەندین وشەی دیكە، سەر بە ریشەی **< *ĝhel- (IE.)** "بریقانەوە". لە مانای بنەڕەتی "بریقانەوە" مانای "ساف و لووس، خلیسك" پەیدا بووە، چونكوو شتی ساف و لووس دەبریقێتەوە. ئەم مانا كۆنە لە وشەكانی glad (E.) و glad (Sw.) "شاد، خۆشحاڵ"دا دەردەكەوێ، كە دە بنەڕەتدا مەبەست "رووگەش" بووە.

2- لەوانەشە شێوەیەكی دیكە بێ لە ↑زەرد[2] zerd "ماە و زەرد".

**هەڵەتانج heletanc** [*halatānj*] - "جۆرێك مراوی سوور و سپی كاكۆڵدار": هەڵە hele + تانج tanc. كەرتی دووەمی وشەكە شێوەیەكی دیكەیە لە ↑تاج tac و ئاماژەیە بە كاكۆڵی مراوییەكە. كەرتی "هەڵە" دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەڵوو helo. لە زمانی یۆنانیدا ornis (Gr.) "پەلەوەر" خزمە لەگەڵ وشەی "هەڵۆ".

**هەڵەداوان heledawan** [*haladāwān*] - "هەڵاتن، بەپەلە چوون": هەڵە hele + داوان dawan. سەبارەت بە كەرتی یەكەم بڕوانە ↑هەڵە hele "پەلە، خێرایی". كەرتی دووەم خزمە دەگەڵ دویدن davīdan (P.) "راكردن، هەڵاتن". ئەم وشەی دوایی پێوەندی هەیە بە thein (Gr.) "را كردن". ئەم وشە یۆنانییە خۆی دەبێتە خزم دەگەڵ Tau (G.)، dēaw (OE.)، dau (OS.)، dhāv (OIn.) "توانەوە، جاری بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ توانەوە یان ↑تاوانەوە tawanewe.

[تێبینی: لە نێوان دوو چەمكی "جاری بوون" و "را كردن"دا پێوەندی نیزیك هەیە. دە زمانی ئەڵمانیدا rinnen دەبێتە "جاری بوون" و rennen دەبێتە "را كردن". هەر دوو وشەكەش خزمن دەگەڵ "را" كردن، "هەڕا" كردن و "ڕژان"ی كوردمادی].

**هەڵەشە heleşe** [*halaša*] - "بەپەلە و لەرێ لادەر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑هەڵە hele "خەتا"، سەر بە ریشەی **< *er(e)s- (IE.)** "توند و بێ مەبەست خۆ جووڵاندن".

2- ↑هەڵە hele [هەڵەهەڵ و پەلەپەل].

**هەڵەفە helefe** [*halafa*] - شێوەیەكی دیكەیە لە ↑قڵفە qılfe.

**هەلەق heleq** *[ halaq ]* - دەگەڵ مەلەق دێ [هەلەق مەلەق heleq meleq]. قسەی هەلەق مەلەق واتا قسەی بێ سەر و بەر. الکی alakī (.P). دە فارسیدا "حرف الکی" بە مانای قسەی "بێجێ، خۆڕایی، نە بەڕاست" بەکار دەهێنرێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لەق leq [پێشگری ئە e + لەق leq]. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە قسەی "بەرهەڵدا، شل و شەوێق"، نەک قسەیەکی سەنگین و پتەو.

**هەلەک helek** *[ halak ]* - شێوەی کۆنتری ↑ئالقە alqe.

**هەلەکا heleka** *[ halakā ]* - "جەزمە، سەمای دەرزوێشان": خزمە لەگەڵ ↑هەلای helay "سەما".

**هەلەکە heleke** *[ halaka ]* - "مشکگرە": خزمە دەگەڵ↑ هەڵۆ helo.

**هەلەمار helemar** *[ halamār ]* - "پەلامار": هەلە hele + مار mar. هەر دوو بنجی هەل -hel و "پەل" ئاماژە بە "بزاڤی خێرا" دەکەن [هەلەهەل و پەلەپەل helehel u pelepel]. بنجی مار mar لە کرداری ↑ماردین mardîn [ماردن mardın، مارین marîn] "کوتان، شکاندن، ورد و خاش کردن، هاڕین"دا دەبینرێ. بەم پێیە مانای وشەکە دەبێتە "لێدان، هەڵکوتانێکی خێرا". وشەی "پەلامار"یش هەر بەم چەشنە دروست کراوە.

**هەڵەموت helemut** *[ halamūt ]* - "کێوی سەخت و هەزار بەهەزار": دە زمانی فارسیدا باس لە قەڵای الموت almout دەکرێ و رەنگە وشەکە بە چەمکی مەیت و مردنەوە گرێ درابێ. بەڵام ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر erēmítēs (.Gr) "تاک و تەریک، تەریدە، دوورەپەرێز" (< *erēmos* *(.Gr)* "چۆڵگە، تەرەگە- شۆینی تەریکان و دوورەپەرێزان"). دە زمانی لاتینیدا بووەتە eremita (.L) بە هەمان مانا. هەروەها ermitage (.Fr) "تەریک ئاسا" هەر لەم وشەوە هاتووە کە ناوی مۆزەیەکی بەناوبانگی رووسیشە. بەم پێیە دەردەکەوێ کە مانای ئەسڵی "هەڵەموت" کێوی سەخت و هەزار بەهەزار نەبووە، بەڵکوو شوێنی چۆڵگە و دوورەدەست بووە کە مرۆڤە لە خەڵک دابڕاوەکان یان سەرکێش و سەرهەڵداوەکان لێی ژیاون و پەنایان تێدا گرتووە. لەبەر ئەوەی ئەو شوێنانە زۆرتر لە چیا و کێوە سەختەکان یان قەڵاکان هەڵکەوتوون، ئیتر مانای وشەکە ئەو گۆڕانەی بەسەردا هاتووە.

**هەلەنگوتن helengutın** *[ halangutın ]* - "رەت بردن": هەڵ hel + ئەنگوتن engutın. خزمە دەگەڵ ↑ئەنگاوتن engawtın و دواجار دەگەڵ ↑کەوتن kewtn. ئەنگوتن engutın پێک هاتووە لە e [پێشگر] + n [ناوگر] + گوتن gutın کە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەوتن kewtın. ئەم وشەیە دەبنەڕەتدا بە مانای کەوتن بووە و ئەم مانایە بە ئاشکرا دیارە، کاتێک دەگوترێ هەتاو ئەنگووت، واتا تیشکی خۆر کەوتە سەر وڵات. هەروەها کاتێک دەگوترێ پێی هەڵەنگوت یان پێی دە بەردێک هەڵەنگوت، مەبەست ئەوەیە کە پێی وە بەردێک کەوت.

**هەڵەوەڕ helewer** *[ halawar ]* - "1- سەگی زۆروەڕ 2- چەنەوەڕ، زۆربلێ": هەڵە hele + وەڕ wer. "هەڵە" شێوەیەکی دیکەیە لە هەڵا hela یان ↑هەڵڵا hella "دەنگ و هەرا". "وەڕ" پێوەندی هەیە بە ↑وەڕین werîn. هەر دوو کەرتی وشەکە لە بنەڕەتدا یەک مانایان هەیە کە بریتییە لە "دەنگ و هەرا" کردن. وەک لە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ، شێوازێک لە وشەسازی دە زمانی کوردمادیدا بریتییە لە تێکخستنەوەی دوو بنجی هاومانا، وەک بانگەشە، جەمبازە، رەشتاڵە، تەپلۆس، خرخاڵ، گۆنگەشە (گەنگەشە) و هتد. ئەم وشانە دۆخی خەخت کردن نیشان دەدەن.

**هەلهلین helhılîn** *[ halhılīn ]* - "1- زۆر گەیشتن و بڵ بوونی میوە 2- زۆر پیر و کەنەفت بوون": هەل hel + هلین hılîn. دەشێ خزم بێ دەگەڵ alt (.G)، old (.E) "پیر، کۆن"، alan (.Gt)

"هەڵدان و پێگەیشتن"، alan (OE.)، ala (OIs.)، alere (L.) "بەخێو کردن، گەورە کردن، پێگەیاندن"، سەر بە ریشەی **> -al*** **(IE.)** "گەورە بوون، پێگەیشتن، بە خێو کردن". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کاڵ kal "پیر، بەساڵداچوو" و ↑خاڵ xal "برای دایک" و هتد.

**هەڵی helî** [ *halī* ] - "زۆر بڵیندی": خزمە دەگەڵ ↑ئاڵا ala.

**هەڵیت helît** [ *halīt* ] - [هەڵیت و پەڵیت helît u pelît، غەڵەت و پەڵەت ġelet û pelet یش دەگوترێ]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەڵە hele.

**هەڵیس helîs** [ *halīs* ] - "وشکەگیا، پووش و پەڵاش": هەلیز halîz یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Hülse (G.)، hulsa (OG.)، huls (Nl.) "توێکڵ، پووش". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑هاڵان halan [لێهاڵان].

**هەلیسە helîse** [ *halīsa* ] - "1- هەریسە 2- پڵاوساوار": خزمە لەگەڵ ↑هەلساندن helısandın "ورد کردن وەک کوتانی گەنم" و دواتر ↑هەرز² herız "1- سوان و لووس بوون (ی پێچ) 2- خەسار، فیرۆ".

**هەلینگ helîng** [ *halīng* ] - "غار، هەڕا کردن": هەل hel + ئینگ ing، خزمە دەگەڵ ↑هەلە hele [هەلەهەل و پەلەپەل].

[تێبینی: لەباری شێوازی دروست کردنی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ هەزینگ hezîng بە مانای "ڕاپەڕ، دەستوبەرد". پیشگری ing هێندێک جار دەبێتە ang وەک جەفەنگ cefeng، نەهەنگ neheng (کەیف و نەهەنگ)].

**هەم hem** [ *ham* ] - "وشەی هاوبەشی یان هاودەمی": [وەک عەجەمی بەشڵتاغ هەم لێ دەدا و هەم دەگری]. هم ham (P.). بڕوانە ↑هاو hew.

**هەماز hemaz** [ *hamāz* ] - "ئاواڵ منداڵ": ↑هەم hem + ناوگری ئا a + ز z [↑زان zan]. مانای وشەکە دەبێتە "(لەگەڵ منداڵەکە) هاوبەش یان هاواڵ لە زاندا".

**هەمان heman** [ *hamān* ] - "هەرئەو، هەرئەم": همان hamān (P.). خزمە لەگەڵ ↑هاو hew.

**هەماندن hemandın** [ *hamāndın* ] - "کردنەپاوان، قۆرخ کردن، قەدەخە کردن": خزمە لەگەڵ hemmen (G.) "بەر گرتن، وەستاندن، پێش لێگرتن"، heman (OG.)، hemman (OE.) "بەر گرتن، بەستن"، Hamm (Nl.) "زەوییەکی بە پەرژین دەورگیراو"، kom (Rus.) " گلوو، سمتە، تۆپەڵە"، komit (Rus.) "ڕێککوشین، تۆپەڵە کردن"، kēmós (Gr.) "تۆڕ، دەمبێن" [دەبنەرەتدا: تێکچرژاو، تەنراو]، سەر بە ریشەی **> -kem*** **(IE.)** "بە تامان یان پەرژین دەوور گرتن، ڕێکگوشین". چەند وشەی دیکە لەم بارەوە لەژێر ↑زەمۆمە zemome "تیغە، تیوان کردن بە قوڕ یان تامان"دا باس کراون.

**هەمانگی hemangî** [ *hamāngī* ] - "زۆر بە هێواشی": خزمە لەگەڵ säumen (G.) "دواکەوتن، درەنگ کردن، ئیهمال کردن"، säumig (G.)، sūmig (OG.) "هێواش، تەپلۆس، درەنگکەر". لە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑هەمین¹ hemîn هەیە بە مانای "1- سست، شلەتەپە 2- خۆ بەکارنەدەر، پاش گوێ خەر". ئەم وشەیەش دەشێ پێوەندی بەمانەی سەرەوە هەبێ. ریشەی وشە ئەڵمانییە ساخ نەکراوەتەوە.

**هەمبس hembıs** [ *hambıs* ] - "1- هەمس 2- دەخلی شینی تێک هاڵاو": ↑هەمس hemıs "مەڕ و بزنی ڕەش و سووری تێکەڵاو".

**هەمت hemt** [ *hamt* ] - "ژدڵ، (بە)داخوازی، داوتەڵەب(انە)": دەشێ پێوەندی بە ↑ئومێد umed [هومێد humed] ەوە هەبێ.

**هەمتی hemtî** [ *hamtī* ] - "گەنمە کوتاو": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑قیمە *qîme* و ↑قامچی qamçî.

**هەمزالە hemzale** [ *hamzāla* ] - "چارداغی باغ": خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زەمۆمە zemome "تیغە، تیوان کردن بە قوڕ یان تامان"دا باس کراون.

**هەمس hemıs** [ *hamıs* ] - "مەڕ و بزنی رەش و سووری تێکەڵاو": پێوەندی هەیە بە ↑ئامیان amîyan و ↑ئامێتن ametın "تێکەڵ کردن". بەراوردی وشەی هەمس hemıs بکە دەگەڵ بنەوشەی ئامیز- āmīz- (P.) و ئامیختن āmīxtan (P.) "تێکەڵاو کردن".

**هەمکە hemke** [ *hamka* ] - "گەلێک، زۆر": [ئەم هەمکە پارە لەکوێ بێنم]. خزمە دەگەڵ ↑هەمووhemu "گشت".

**هەمنک hemınk** [ *hamınk* ] - "گوریسی پێوەندی یەکسم": دەشێ پێوەندی بە hemmen (G.) ، heman (OG.)، hemman (OE.) "بەر گرتن، وەستاندن، پێش لێگرتن"، Hemmnis (G.) "بەربەست"، hemja (OIs.) "هەوسار کردن، (دا) سەپاندن". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑هەماندن hemandın "کردنەپاوان، قۆرخ کردن، قەدەخە کردن".

**هەموو hemu** [ *hamū* ] - "گشت": همە hame (P.). خزمە دەگەڵ omnis (L.) "گشت، زۆر"، manag (OG.)، manig (OE.)، manich (OF.) "زۆر"، menic (OIr.) "زۆرجار"، humant (Heth.) "هەموو"، Menge (G.) "ئەندازە (یەکی زۆر)"، manch(er) (G.) "هێندێک"، many (E.) "زۆر"، mnogo (Rus.) "زۆر. هەروەها عام εam (Arb.) "گشت، هەموو" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ریشەی ئەم وشانە باس نەکراوە. وێ دەچێ وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**هەمیشە hemîşe** [ *hamīša* ] - "بەردەوام": همیشە hamīše (P.)، وشەی ↑هاو haw [هەم hem (P.)] دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "یەک". هەر لەم ریشەوە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا وشە بە مانای "هەمیشە و بەردەوام"یش پەیدا بووە، بۆ وێنە semper (L.) "هەمیشە"، sin(a)- (OG.)، sin- (Gt.)، sin(e)- (OE.)، sī (OIs.) "بەردەوام، هەمیشەیی". کەواتە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشە ژێرمانییانە و دەگەڵ "هاو"ی کوردمادی.

**هەمین[1] hemîn[1]** [ *hamīn* ] - "1- سست، شلەتەپە 2- خۆ بەکارنەدەر، پاش گوێ خەر": وێ دەچێ ئەم وشەیە جیا بێ لە هەمین2. پێوەندی هەیە بەو وشانەی لەژێر ↑هەمانگی hemangî "زۆر بە هێواشی"دا باس کراون.

**هەمین2 hemîn 2** [ *hamīn* ] - "ناوێکی ژنانە": خزمە دەگەڵ ↑هاو haw سەر بە ریشەیەک بە مانا "یەک". ئەم ناوە دەبێ سەرەتا بە واتای نەرم ونیان، لەسەرەخۆ بەکارهاتبێ، واتا کەسێک کە باری دەروونییەکەی ناگۆڕێ، یەکسانە و هەڵچوون و داچوونی تێدا نییە. دەبێتە خزم دەگەڵ sanft (G.)، soft (E.) "نەرم و نیان"، samjan (Gt.) "خۆ رێکخستن، خۆ گونجاندن"، sama (OIs.) "گونجان"، sämjas (Sw.) "دەگەڵ یەک جۆر بوون، دەگەڵ یەک هاتنەوە، یەکگرتن". مەبەست لە وشەکانی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی دە بنەڕەتدا خۆ گونجاندن، رێککەوتن و ژیاتیکی تەبا دەگەڵ دەور و بەر بووە و لێرەوە مانای"نەرم و نیان" سەری هەڵداوە. لەوە دەچێ وشەی ↑هێمن hemın "ئارام، لەسەرەخۆ"ش دەگەڵ ئەم وشەیە خزمایەتی هەبێ. هەروەها ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ↑سامان2 saman "هێمنی، ئارامی"، ↑ساماڵ samal "هەموار، یەکدەست" و ↑شماڵ şımal "لاوی جوانچاک و ئاکارپەسەند" و ↑شەماڵ şemal "بای گونجاو".

**هەنار henar** [ *hanār* ] - "میوەیەکی شیرین": انار anār (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn.

هەناسە **henase** [ *hanāsa* ] - "نەفەس، پشوو": خزمە دەگەڵ (G.) Nase، (E.) nose، (OG.) nasa، (Nl.) neus، (Sw.) näsa، (L.) nasus، (Rus.) nos، (OIn.) nāsa "لووت، کەپۆ". بە پێی بۆچوونێک ئەم وشانە دەتوانن بچنەوە سەر ریشەی < (IE.) *ane- "هەناسە کێشان". بەم پێیە وشەکە دە زمانی کوردمادیدا مانا ئەسڵییەکەی خۆی بە تەواوی پاراستووە. ئەمە زۆر رێی تێ دەچێ کە مانای ریشەکە "هەناسە، هەناسە کێشان" بووبێ و دواتر مانای "لووت"ی وەرگرتبێ، چونکوو لووت ئامرازی هەناسەکێشانە و دەبێ ناوی ئامرازەکە لە ناوی فونکسیۆنەکە واتا هەناسە کێشانەوە وەرگیرابێ. [لەم بارەوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ وشەی ↑بین bîn "هەناسە" و بینی (P.) bīnī "لووت" کە لە وشەی "بین" بە مانای هەناسە وەرگیراوە]. بە پێی بۆچوونێکی دیکە ریشەی ئەم وشانەی سەرەوە دەبردرێتەوە سەر < (IE.) *nas- "لووت". هەر چۆنێک بێ، "هەناسە" خزمە دەگەڵ ↑هەنیسک henîsık، نزگرە nızgere و چەندین وشەی دیکە. دوور نییە هەر دوو ریشەی باسکراو لە سەرەوە پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ.

هەناو **henaw** [ *hanāw* ] - "ناو، دەروون": ↑هە he [پێشگر] + ↑ناو² naw.

هەنبانە **henbane** [ *hanbāna* ] - "پێستی گووراوی بزن و مەڕ کە دەیکەنە دەفری شتومەک": هەمبانە hembane ش دەگوترێ [گۆڕانی فۆتیمی n بۆ m]. انبان (P.) anbān. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری هە he + ناوگری n + بان(ە) ban(e). [سەبارەت بە شێوەی دروست بوونی وشەکە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ هەنگاو، هەنجنین، ئەندام، هەنگڕان، ئەنبار...]. کەرتی بان(ە) ban(e) خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر پاشگرن ↑وان wan دا باس کراون کە پاشگرێکە مانای "ئاگاداری کردن و پاراستن" دەبەخشێ [باغەوان، دەرکەوان، دەستەوانە، قامکەوانە....]. لەم تێڕوانینەوە "هەنبانە" شتێکە شتومەکیان تێدا پاراستووە.

هەنتەش **henteş** [ *hantaš* ] - "لەروو، لە بەرانبەر": [دە هەنتەشا وی دە ئەز نەشێم بێژم]. دە شێوەزاری ناوەڕاستدا ↑حاند ħand دەگوترێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑هەنێ hene "تیوچاوان، روو". شیاوی باسە پێشگری -anti "دژ" دە زمانە ئەورووپییەکاندا خزمە دەگەڵ ئەم وشە کوردمادییە.

هەنج **henc** [ *hanj* ] - "1-جۆری دروومان 2- تیرە، کورتە خەتی پێوەستکەر": هەروەها هەنج کردن henc kırdın هەیە بە مانای "گەیاندنە یەک، لێک گیر کردن". پێوەندی هەیە بەو وشانەی لەژێر ↑کەندر kendır "1- دەزوو 2- پەت"دا باس کراون، سەر بە ریشەی < (IE.) *(s)ne- "چنین، تەنین، گرێ دان".

هەنجنین **hencınîn** [ *hanjınīn* ] - "ورد وردکردن بە بڕین": ↑ئەنجنین encınîn یش دەگوترێ: هە he / ئە e [پێشگر] + ↑جنین cınîn.

هەنجەت[1] **hencet** [ *hanjat* ] - "رەق، تووڕەیی": لە هەنجەتان واتا لە رقان، لە داخان. خزمە دەگەڵ ↑ئەنگرین angrîn "تووڕە بوون"، (E.) anger، (ON.) angra "نارەحەتی، تووڕەیی"، eng (G.) "تەنگ"، (G.) Angst، (Nl.) angst "ترس" [دەبنەڕەتدا: بەرتەنگ بوون، تووشی تەنگەتاوی بوون]، (L.) angustus "تەنگ"، (L.) angustiae "بەرتەنگی، خەفەگی، گیر و گرفت"، ágchein (Gr.) "رێککوشین، خنکاندن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑خنکان xınkan سەر بە ریشەی < (IE.) *anĝh- "تەنگ، ریکگوشراو".

**هەنجەت² hencet** [ *hanjat* ] - "پەڵپ، بیانوو": دەچێتەوە سەر < **حجة** *hucce* (*Arb.*). [سەرنجی فۆتیمی n بدە کە خزاوەتە ناو وشەکەوە و لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "کرمانج" کە دە ئەسڵدا "کوردماد"ە].

**هەنجیر hencîr** [ *hanjīr* ] - "میوەیەکی شیرن": انجیر anjīr (P.). بنەوشەی هەن -hen دە ناوی چەندین میوەی دیکەشدا دەبیندرێ و دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn و ئاماژە بە شیرینی بکا، وەك ↑هەنار henar، ↑هەنگوور hengur، ↑هەنی henî "شووتی"، ↑هەرمێ herme [فۆتیمی n تێیدا سواوەتەوە].

**هەند hend** [ *hand* ] - "قاس، کەم، بڕ": هەندێك یان هێندێك واتا قاسێك، بڕێك یان کەمێك. کەسێك یان شتێك "بە هەند نەگرتن" ماناکەی ئەوەیە ئەو کەسە یان ئەو شتە تا ئەو رادەیە لەبەرچاو بچووکە کە نایەتە "ئەندازەگرتن"، واتا بۆ ئەوە ناشێ حیسابی بۆ بکرێ، واتا بە هیچ دانان. بڕوانە ↑هێندێك hend(ek) و ↑ئەندازە endaze.

**هەنداڤ hendav** [ *handāv* ] - "1- لای سەروو [گەیمە هەنداڤ گوند] 2- رووبەڕوو": خزمە لەگەڵ ↑حاند and.

**هەندرهۆ hendırho** [ *handırho* ] - شێوەی کۆنتر لە↑حندرحۆ ħındırħo "هەڵڵادۆشە".

**هەندرین hendırîn** [ *handırīn* ] - "ئارام و ئۆقرە گرتن": هەندران hendıran و هەندریان hendıryan یش دەگوترێ. پێکهاتووە لە پێشگری هەن hen [ئەن en] + درین drn [وەك ئەنجنین، هەنجنین، ئەنگڕان، هەنگڕان، ئەنگرین و هتد]. کەرتی ئەسڵی وشەکە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *deru-** (*IE.*) "دار، داربەڕوو". لەم ریشەوە هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە مانای "سەخت، پتەو، بەهێز" پەیدا بووە و ئەم مانایە دە چەندین وشەی زمانە ئەورووپییەکاندا پارێزراوە، وەك treu (G.) "بەئەمەگ" [دە بنەڕەتدا: قورس و قایم دە پێوەندیدا]، true (E.) "راست و دروست" [خزمە دەگەڵ ↑دروست dırust ەکەی خۆمان]، trygg (Sw.) "دڵنیا، موکوڕ"، tro (Sw.) "ئەمەك، باوەڕ"، drutas (Lit.) "پتەو، بەهێز، قەڵەو"، Trost (G.) "دڵدانەوە" [دە بنەڕەتدا: هێز و قورس و قایم بوونی دەروونی]، trösten (G.) "دڵدانەوە، هێز دانەبەر، ئارام کردن(ەوە)"، trauen (G.) "وێران، زات کردن، بە خۆ راپەڕموون". وەك دەبینین وشەکە بە ڕوونی ئاماژە بە مانای "سەخت و بەهێز بوون" دەکا. ئەگەر سەرنجی هێندێك وشەی دیکەش بدەین کە لەم شیرۆڤەی سەرەوەدا بەکار هاتن، وەك "موکوڕ"، "زات"، "ئەمەگ"، "قورس"، "ئۆقرە"، دەر دەکەوێ کە ئەم وشانەش پێوەندییان بە چەمکی "سەخت و بە هێز بوون"ەوە هەیە، بۆ وێنە هەردووك وشەی "قورس" و "ئۆقرە" [ئۆ-قرە] خزمن دەگەڵ "خوڕ، خوڕێن، خورت، خار" و هتد. هەر بۆیە دەتوانین لێرەدا بە دڵنیاییەوە وشەی ↑هەندرێن hendırên یش ساخ بکەینەوە کە ناوی چیایەکی سەخت و بەناوبانگی کوردستانە. وەك لە چەند شوێنی دیکە باس کراوە ناوی زۆرێك لە چیا و بەندەنەکانی کوردستان مانای "سەخت، ئاستەم" دەبەخشن. هەر لەم پێوەندییەدا دەشێ ئاماژە بە دوو وشەی کوردمادی دیکە بکەین، واتا ↑دەرەقەت dereqet و ↑دەرۆست derost. دەرەقەت هاتن یان دەرۆست هاتن مانای "(پێ)وێران، زات کردن، توانین، کارین" دەبەخشن و ئەمەش دەگەڵ ماناکانی سەرەوە یەك دەگرێتەوە. هەردووك وشەی "توانین" و "کارین"یش خۆیان پێوەندی بە چەمکی "سەخت و بەهێز"ەوە پەیدا دەکەن و سەر بە دوو ریشەی دیکەن کە ئەم مانایە دەبەخشن. هەروەها لەوانەیە وشەکانی ↑هەدار hedar [he-dar] و ↑هەدراندن hedrandın لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرن.

هەندرێن **hendırên** [ *handırên* ] - "ناوی چیایەکی سەخت و بەناوبانگی کوردستان": بڕوانە ↑هەندرین hendırîn "ئارام و ئۆقرە گرتن".

[تێبینی: چەمکی "پتەو، سەخت و بەهێز" دەگەڵ "ئارامی و ئۆقرەیی" لە پێوەندیدایە. مەبەست لە ئارامی و ئۆقرەیی بریتییە لە "لە جووڵە وەستان" و ئەمەش کاتێکە کە شتێک قورس و قایم و توند و پتەو دەبێ. وشەی "پەیت" بوون پێوەندی بە "پتەو" بوونەوە هەیە. "ئۆقرە" پێوەندی بە "قورس"، "قەرسین"، "گیرسانەوە" و "خار"ەوە هەیە، "کپ" پێوەندی بە "سفت"ەوە هەیە، "هێدی" پێوەندی هەیە بە *زات* "بوێری، ئازایەتی" [دە بنەڕەتدا: هێز و پتەوی]، *سێتە1* "چیا" و *سێتەک* "بەردەڵان، تمتمان" و هتد].

هەندوو **hendu** [ *handū* ] - "کەڵتە کردنەوە، چاک کردنەوەی شت": خزمە لەگەڵ هەنج henc "جۆری دروومان" و هەروەها هەنج کردن henc kırdın "گەیاندنە یەک، لێک گیر کردن". لەم تێڕوانینەوە "هەندوو" دەبێ لە بنەڕەتدا بە مانای تێکخستنەوەی شتی هەڵوەشاو بێ.

هەندەر **hender** [ *handar* ] - "لاوە، دەرەوە": هەندەران henderan یش دەگوترێ بە مانای "وڵاتانی دەرەوە". دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑دەر[1] der.

هەنژین **henjîn** [ *hanžīn* ] - "رازان، راکشان بۆ خەو": شێوەیەکی دیکە لە ↑نوستن nustın.

هەنکیان **henkîyan** [ *hankīyān* ] - "پشووسوار بوون": خزمە دەگەڵ ↑خنکان xınkan و ↑هانکە hanke [هانکەهانک] و هتد.

هەنگ1 **heng** [ *hang* ] - "کۆمای مێشەنگوین": خزمە دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn. هەردووک وشەکە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *kn(e)ko- <** "رەنگی زێڕ، زەردی وەک زێڕ". دیارە هەم رەنگی زیندەوەرەکە زەردە و هەمیش بەرهەمەکەی. بەم جۆرە وشەی "هەنگ" ئاماژە بە رەنگی زیندەوەرەکە دەکا. [بەکار هێنانی رەنگ بۆ ناوی زیندەوەری دیکەش بەرچاو دەکەوێ، وەک زەرگەتە (زەردەواڵە)، ژەنگەسوورە، شەمەتریلکە و هتد]. وشەی "هەنگ" سەرەتا بەگشتی بە "مێشەنگوین" گوتراوە و دواتر بووەتە "پوورەی مێشەنگوین"، واتا لە لەناوی تاکەوە بۆ ناوی کۆ گۆڕدراوە.

[تێبینی: وشەی هنگ hang (.P) دە زمانی فارسیدا و دە سیستەمی لەشکریدا بە یەکینەیەکی لەشکری دەگوترێ کە لە چەند "گردان" [گوردان] پێک دێ و چەند هەنگیش "لشکر" [لەشکر] و چەند لەشکریش "سپا" پێک دەهێنێ. لەو باوەڕە دام "هنگ" بەم مانایە وشەیەکی کۆنی فارسی نەبێ، بەڵکوو لە "هەنگ"ی کوردمادی وەرگیرابێ کە ئاماژە بە ئاپۆرە و کۆمای مێشەنگوین دەکا].

هەنگ2 **heng** [ *hang* ] - "بەزم و کەیف": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاهەنگ aheng [ئا a + هەنگ heng].

هەنگ3 **heng** [ *hang* ] - "گزی، فێڵ": هەنگباز hengbaz واتا "فێڵباز، هەروەها هەنگ کرن heng kırın واتا "فێڵ کردن". خزمە دەگەڵ ↑هونەر *huner* [hener یش دەگوترێ، دە بنەڕەتدا واتا "لێزانی"]. لە مانای "لێزانی" دواتر مانای "فێڵەزانی" پەیدا بووە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زانین zanîn.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە لەگەڵ List "فێڵ" دە زمانی ئەڵمانیدا کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زانین"].

هەنگ4 **heng** [ *hang* ] - "ناز، دەلالی": هەنگ کرن heng kırın واتا "ناز کردن". دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑شەنگ şeng "شەنگەبێری".

2- شنگیدن šangīdan (P.) "بە لەنجە و لار ڕۆیشتن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ئە وشانەی لەژێر ↑زەنگاڵ zengal دا باس کراون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار، بادراو". جێی ئاماژەیە کە وشەی "لار"یش مانای "خوار" دەبەخشێ [لەنجە و لار].

**هەنگ[5] heng** [ *hang* ] - "کرمێکە لە پێستی ماڵاتی بەرزە دەدا": شێوەیەکی دیکە لە ↑ژەنگ jeng.

**هەنگامە hengame** [ *hangāme* ] - "هەرا و هوریا": هنگامە hengāme (P.) "تیکەولێکە، قەرەباڵغی". مانای ئەسڵی وشەکە دەبێ "هەرەت، جەنگە" بووبێ، واتا کاتیک شتیک دەگاتە ئەوپەڕی (گەرمی) خۆی. دواجار خزمە دەگەڵ ↑هەنگاو hengaw "شەقاو، لۆقاو" و هنگام hangām (P.) "کات".

**هەنگاو hengaw** [ *hangāw* ] - "شەقاو، لۆقاو": ↑قاو2 qaw یش دەگوترێ، بە مانای "1- شەقاو 2- شەپ، شەق". گام gām (P.). ↑هە he [پێشگر] + n [ناوگر] + گاو gaw. ئەسڵی وشەکە ↑گاو[2] gaw ە، پێشگری هە he ی هاتووەتە سەر و فۆتیمی n یش خزاوەتەوە تیوانیانەوە. [فۆتیمی n دە هێندێک وشەی دیکەشدا ئەو دەورە دەبینێ، وەک ئەنگاوتن، ئەنجنین، ئەنگران، ئەنگوست، ئەنگوچک و هتد]. ↑گاو gaw خزمە دەگەڵ گام gām (P.) "هەنگاو".

**هەنگران hengıran** [ *hangırān* ] - "قورس بوون، قەڵەو بوون" [بریتییە لە "زۆر دەوڵەمەند بوون"، دەڵێن فڵانەکەس هەنگراوە]. ئەنگران engıran یش دەگوترێ. ↑هە he [یان ئە e ی پێشگر] + ن n [ناوگر] + گران gıran. دەبێ پێوەندی هەبێ بە ↑گران gıran "قورس". ئەم کردارە دەبێ دەبنەرەتدا بە مانای "قورس بوون، قەڵەو بوون" بەکار هاتبێ.

[تێبینی: لە شێوەزاری سەروودا "زەنگین" بە مانای "دەوڵەمەند" بەکار دێ کە ئەمەش هەمان "سەنگین"ە لە شێوەزاری ناوەراست و خوارووودا بە مانای "قورس و گران"].

**هەنگڵ hengıl** [ *hangıl* ] - "دەسکی دەفر، باسکی مرۆڤ": [بن هەنگڵ واتا بنەوە یاخود لای بنەوەی هەنگڵ]. خزمە دەگەڵ Henkel (G.) "هەنگڵ، دەسک بۆ پێ گرتن یان پێ هەڵاوەسین"، هەروەها henken (G.) "بە پەتەوە هەڵواسین، لە سێدارە دان" و Henker (G.) "جەللاد، هەڵواسەر". "هەنگڵ" یان بن هەنگڵ لە لەشی مرۆڤدا بە دەسکی دیزە و گۆزە چوێندراوە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ hängen (G.)، hangian (OG.)، hangia (OF.)، hang (E.)، hanga (OIs.) "هەڵواسین". ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەنگیزە hengeze "قوڵفی دەسکی خورج و جەواڵ" و ↑هێنجان hencan [هەڵهێنجان].

**هەنگوان henguwan** [ *hanguwān* ] - "ئەنگاوتن، پێکان": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئەنگاوتن engawtın و دواجار دەگەڵ ↑کەوتن kewtın.

**هەنگوور hengur** [ *hangūr* ] - "ترێ": انگور angūr (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn.

**هەنگوورە hengure** [ *hangūra* ] - "ئێوارەدرەنگ": دە بنەرەتدا بەم چەشنە بووە: "هەنگ heng [هەنگی، گاوا] + ↑ئێوارە eware" واتا "کاتی ئێوارە". ئەنگۆرەش دەگوترێ.

**هەنگوین henguwîn** [ *hanguwīn* ] - "شیرەی مێشەنگوین": انگبین angabīn (P.). خزمە دەگەڵ Honig (G.)، hona(n)g (OG.)، hunig (OF.)، honing (Nl.)، honey (E.)، honung (Sw.) "هەنگوین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *kn(e)ko- >** "رەنگی زێر، زەردی وەک زێر". خزمە دەگەڵ kāncana-h (OIn.) "زێر، زێرین"، knākos (Gr.) "زەرد، ئاماڵ زەرد". دە زمانی کوردمادیدا

خزمە دەگەڵ ↑کەنشت kenışt "جۆرێک مۆمی هەنگوین". وشەی ↑خەنە xene "دەرمانی رەنگ کردن" دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. بنەوشەی هەن -hen دە ناوی هێندێک لە میوەکاندا دەردەکەوێ، وەک ↑هەنار henar، ↑هەنجیر hencîr، ↑هەنگوور hengur، ↑هەنی henî، ↑هەرمێ herme [وشەی هەرمێ دە کوردمادیدا گۆڕانی بەسەر دا هاتووە]. ئەم میوانە گشتیان شیرنن و دەشێ بنەوشەکە ئاماژە بەوە بکا کە ئەمانە وەک هەنگوین شیرنن. دە زمانی فارسیدا انگم angom (P.) بە مانا "شیرەی دار و و گژ و گیا" بەکار دێ کە وێ دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**هەنگۆژە hengoje** [ *hangoža* ] - "شیرەی دار و گیا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ انگم angom (P.) "شیرەی دار و گیا" و دواتر ↑هەنگوین hengıwîn.

**هەنگەژاڵ hengejal** [ *hangažāl* ] - "خەڵێف، پلوورە": ↑هەنگ heng + ژاڵ jal [↑شار şar: وەک شارەزەرگەتە]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەڵخە şelxe.

**هەنگێ henge** [ *hange* ] - "ئەوسا، ئەودەم": هەنگینێ hengîne ش دەگوترێ. انگاه angāh (P.) "ئەودەم". کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ گاه gah (P.) و کات kat "دەم، وەخت". کەرتی یەکەمی وشەکە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ان an (P.) "ئەو".

**هەنگیزە hengeze** [ *hangeza* ] - "قوڵفی دەسکی خورج و جەواڵ": خزمە دەگەڵ ↑هەنگڵ hengıl "دەسکی دیزە و گۆزە".

**هەنووکە henuke** [ *hanūka* ] - "ئێستا": هنوز hanūz (P.) "هێشتا". شێوەیەکی دیکە لە ↑نووکە nuke و ↑نها nıha [نوها nuha]. هەروەها ↑هەنهۆ henho هەیە بە مانای "دەسبەجێ".

**هەنوون henun** [ *hanūn* ] - "تیهەڵسوون، رێخشاندن، مشت و ماڵ دان": هنین hınîn یش دەگوترێ. اندودن andūdan (P.). بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی (ل. 135) وشەکە پیک هاتووە لە پێشگر و بنجی -dav، خزمە دەگەڵ -dhāv (OIn.) "پاک کردن، سڕینەوە"، سەر بە ریشەی **< *dheu-* (*IE.*)** "درەوشانەوە، بریقانەوە". لەم تیڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑خاوێن xawen.

**هەنهۆ henho** [ *hanho* ] - "دەسبەجێ": خزمە لەگەڵ ↑هەنووکە henuke. هەروەها ↑هەنی henî هەیە بە مانای "لەپڕ، لەنەکاو".

**هەنەفی henefî** [ *hanafī* ] - "باڵدارێکە لە تیرەی مراوی": خزمە لەگەڵ Schnepfe (G.)، snepfa (OG.)، snip (Nl.) ، snipe (Norw.)، snipe (E.)، "باڵدارێک دەنووک درێژ کە لە زۆنگاوان دەژی". وشەکە خزمە لەگەڵ Schnabel (G.)، snavel (Nl.)، neb (Nl.)، neb (E.) "دەنووک، دندووک، تیژایی، زەقایی". ئەم وشانە دەگەڵ ژمارەیەک وشە لە زمانی کوردمادیدا خزمن، وەک ↑ژنەوتن jınewtın.

**هەنەک henek** [ *hanak* ] - "قسەی پێکەنینی": حەنەک ħenek یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑کەنین kenîn [پێکەنین pekenîn]، سەر بە ریشەی **< *ĝhan-, *ĝhēi-, *ĝhēu-* (*IE.*)** "دەم کردنەوە".

[تێبینی: وشەی گەپ gep [گەپ لێدان، گاڵتە] دەچێتەوە سەر ریشەی **< *ĝeph-, *ĝebh-* (*IE.*)** "زار، دەم". گەپ لێدان دە بنەڕەتدا واتا "دەم کردنەوە" (و دەم لێکدان). ئەم دوو ریشانەی سەرەوە دەشێ پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و هەر دووکیان بچنەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر کە بریتییە لە ***ghē(i)* (*IE.*)** "لێکبوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە نێوان"].

**هەنی1 henî 1** [*hanī*] - "شووتی، زەبەش": هندوانە hendevāne (P.)، لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەنگوین henguwîn.

**هەنی2 henî 2** [*hanī*] - "1- ئێستاش 2- لەپڕ، لەنەکاو": خزمە لەگەڵ ↑هەنووکە henuke "ئێستا".

**هەنی3 henî 3** [*hanī*] - "بیر و باوەڕ": خزمە دەگەڵ ↑هونەر huner [هەنەر hener] و دواتر ↑زانین zanîn. لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "ویژدان" کە پێوەندی بە چەمکی "زانین"ەوە هەیە.

**هەنێ hene** [*hane*] - "تیوچاوان": ئەنێ ene، هەنی henî، ئەنیە enye و هەنیە henye ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ endi (OG.)، enni (ONor.)، etan (OIr.) "هەنێ"، antiae (L.) "مووی هەنێ"، anta (Cr.) "رووبەڕوو". لەم وشە یۆنانییەشدا مانای "روو" هەیە کە دەگەڵ چەمکی "ناوچاوان" یەک دەگرێتەوە. وشەی -anti دە زمانە ئەورووپییەکاندا بە مانای "دژ، رووبەروو بوونەوە" لەم وشە یۆنانییە وەرگیراوە، وەک ئانتی بیۆتیک، ئانتی فاشیست، ئانتی ژێن. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ Ende (G.)، enti (OG.)، end (E.) و ända (Sw.)، andeis (Gt.) "کۆتایی، دوایی". دوو مانای "هەنێ" و "کۆتایی" دە زمانە ژێرمانییەکاندا هەر لە کۆنەوە پاڵەوپاڵی یەکدی هەبوون. مانای "ئاخیر، دوایی" لەوەڕا هاتووە کە تیوچاوان وەک دواشوێنی لەش لەبەرچاو گیراوە. مانای "کۆتایی" دە زمانی هیندی کۆنیشدا هەبووە: ántya-h (OIn.) "دوایین". وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑حاند ħand "رووبەروو" ["لەحاند" واتا رووبەروو، بەرەوروو، لەرووی]، ↑هەنتەش henteş و لەوانەشە دەگەڵ ↑ئەنجام encam [ئەنجام لەوانەیە دەبنەڕەتدا بە مانای" کۆتایی" بووبێ و "ئەنجام دان" یش واتا "تەواو کردن، کۆتایی پێهێنان"].

**هەو hew [1]** [*haw*] - هەوبوون واتا رۆیشتنی بێ گەڕانەوە. خزمە دەگەڵ ↑ئاوا awa [ئاوا بوون واتا رۆیشتن و ون بوون].

**هەو hew [2]** [*haw*] - "کێم، زوخاو": هەو کردن hew kırdın واتا "چڵک کردن، ماسین و ئەستوور بوونی ئەندام". دەشێ مەبەست خڕ بوونەوەی ↑هەوا hewa [گاز] بێ، چونکوو "هەوا"ش بەم مانایە، واتا بە مانای "کێم، زوخاو" بەکار دەهێنرێ.

[لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە لەگەڵ نەخۆشی "باداری"].

**هەو3 hew 3** [*haw*] - ↑هەوهەو hewhew.

**هەو hew [4]** [*haw*] - "جار، کەڕەت": [هەوێک hewek واتا جارێک]. هەرچەند ئەم وشەیە بە ڕواڵەت زۆر جیاواز دەنوێنێ، بەڵام پێوەندی هەیە بە وشەی ↑جار car، بە وتەیەکی دیکە هەردووک وشە لە وشەیەکی کۆنترەوە، بەڵام وەک دوو شێوەی جیاواز، سەریان هەڵداوە.

**هەو hew [5]** [*haw*] - "هەر ئەوەندە و بەس": [ئەوەندەت دەدەمێ و هەو، دوو دەقیقەم لابە و هەو]. هەروەها هەوە hewe دێ بە مانای "بەسە". وشەی "بەس" لە بنەڕەتدا مانای "زۆر و زەوەند" دەدا و خزمە لەگەڵ "بسیار" لە زمانی فارسیدا. هەر بەم شێوەیە "هەو" خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "تێر و پڕی، زۆر و زەوەندی"، وەک ↑خەبات xebat و ops, opis (L.) "هێز، گەشە، توانایی، دەوڵەمەندی" و opulentus (L.) "دەوڵەمەند، زۆر و زەوند"، سەر بە ریشەی < *op-* (IE.)* "جێبەجێ کردن، خەبات کردن". وشەی عەرەبی کافی kāfī (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و یان لە زمانی کوردمادی یان لە copiare (ML.) "زۆر کردن" وەرگیراوە. وشەی وەرگیراوی "کۆپی" کردن دەچێتەوە سەر ئەم وشە لاتینییە و بە رەچەڵەک دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە.

**هەو[6] hew** [ *haw* ] - "شەپلە، فەلەجی": مانای بنەڕەتی وشەکە "ڕەق بوون، سەخت بوون"ی ئەندامێکە، بەشێوەیەک کە ئەندامەکە ناجووڵێ، واتا بزوان و چالاکی خۆی لە دەست دەدا. ئەم دۆخە لە کاتی "سڕ بوون"یشدا دروست دەبێ. جا هەروەک چۆن وشەی "سڕ" پێوەندی بە ژمارەیەک وشە بە مانای "سەخت، قورس، ڕەق"ەوە هەیە، هەر بەم شێوەیەش "هەو" پێوەندی بە ژمارەیەک وشەی دیکەوە هەیە کە هەمان مانا دەبەخشن. ژمارەیەک لەم وشانە لەژێر ↑حەمرین hemrîn دا باس کراون.

**هەو[7] hew** [ *haw* ] - هەودان hewdan واتا "پەلامار دان":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑هووپ hup [هووپ کردن واتا "باز دان لە بڵیندییەوە"] و خزم بێ لەگەڵ (G.) Hupf، (G.) hüpfen، (Nl.) hüppen، (E.) hop، (Sw.) hoppa "باز دان، هەڵبەزین، خۆ هەڵاویشتن"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *keu-*** "چەمانەوە".

2- لەوانەشە خزم بێ لەگەڵ گەف gef و ↑گەفین gefîn "هەڕەشە کردن". ئەم وشانە خۆیان خزمن لەگەڵ ↑قەپ qep "دەم داپچڕین".

**هەوا1 hewa 1** [ *hawā* ] - "با، گازی هەناسە کێشان": خزمە دەگەڵ ↑با ba [سەر بە ریشەی < ***(IE.) *hwent-*** "با"] و دواجار ریشەی < ***(IE.) *(a)ue-, *hwe-*** "با هاتن، شنینەوەی با، باکران". (G.) wind "با"، (G.) wehen "باهاتن، شنینەوەی با"، (G.) Wetter "هەوا"، (G.) wedel "باوەشێن" دەچنەوە سەر ریشەی باسکراو.

**هەوا2 hewa 2** [ *hawā* ] - "(لەحنی) گۆرانی، مێلۆدی": اوا āwā (P.). ئەم وشەیە کورتکراوی "ئاواز" نییە، چونکوو "هەوا" خودی ئاواز واتا گۆرانی نییە، بەڵکوو مێلۆدی ئاوازەکەیە، بۆ وێنە دەڵێن "ئەو گۆرانییە هەواکەی زۆر خۆشە". ئەگەر سەیری زمانی ئەڵمانی بکەین، دەبینین کە وشەی Weise (G.) دوو مانا دەبەخشێ. مانای یەکەم ↑وەسا wesa ی کوردمادی بە مانای "ئاوا، چەشن، شێوە". مانای دووەم "لەحن، مێلۆدی، هەوا"یە. ئەم مانای دووەمە کە لە مانای یەکەمەوە سەری هەڵداوە، هەر لە سەردەمی زمانی ئەڵمانی کۆن لەئارادا بووە. شیاوی باسە وشە کوردمادی و ئەڵمانییەکەی سەرەوە پێکەوە خزمن. وەک لە ژێر وشەی ↑ئاوا awa ی کوردمادیدا باس کراوە، ئەم وشەیە هەمان "وەسا"یە کە بەم جۆرە گۆڕانی بەسەردا هاتووە [وەسا ← وەها ← ئاوها ← ئاوا ← وا، کەرتی ئا a لە سەرەتای "ئاوها" دا پێشگرە]. وەک لە سەرەوە ئاماژەی پێ کرا، "هەوا"ی کوردمادی هەمان "ئاوا"یە و ئەمەش دە زمانی فارسیدا بە تەواوی دەردەکەوێ. بەم پێیە بۆمان روون دەبێتەوە کە وشەی "ئاوا" [کۆنتر: وەسا] دە زمانی کوردمادیشدا هەر لە کۆنەوە دوو مانای دەربڕیوە، یەکەمیان "چەشن، شێوە" بە گشتی و دووەمیان "مێلۆدی" یان بە وتەیەکی دیکە "چەشن و شێوەی گۆرانی".

**هەوار havar** [ *hawār* ] - "زۆزان، کۆیستان، شوێنی حەوانەوی کۆچەرەکان لە هاویندا": دە زمانی کوردمادیدا دوو وشە هەن کە شێوەیان لەم وشەیە دەچێ، یەکەمیان "هاوار"ە بە مانای "زیقە، قیژە" و دووەمیان "وار" بە مانای "ماڵ". هیچکام لەم دوو وشەیە ناکرێ پێوەندییەکیان بە "هەوار"ەوە هەبێ. دە زمانی فارسیدا وشەی "اوار" هەیە کە ئەویش مانای "وێرانە، داڕووخاوی" دەدا و ناتوانێ چ پێوەندییەکی بە "هەوار"ەوە هەبێ. کەوابوو هەوار دەبێ لە چی ڕا هاتبێ؟ ئەم وشە کوردمادییە خزمە دەگەڵ دەگەڵ (Av.) upari، (G.) ober، (G.) über، (Gt.) ufar، (E.) over، (Sw.) över، (Gr.) hyper، (L.) super "لەسەر، بەسەر"، سەر بە ریشەی < ****up- (IE.) *eup-,*** "لەخوارە بەرەوە شتێک یان شوێنێک چوون، بەسەردا تێپەڕین، هەڵکشان (بۆ سەرەوە)". وەک دەبینین ئەم وشانە مانای "سەرەوە یاخود هەڵکشان بەرەوە سەرەوە"

دەگەیەنن و ئەمەش بە تەواوی دەگەڵ مانای "هەوار" دەگونجێ. "چوونە هەوار" دە بنەڕەتدا بە مانای "بەرەوە سەر چوون، چوونە سەر چیا و بەرزاییەکان" بووە، واتا مەبەست لە "هەوار" شوێنەکانی سەرەوە، شوێنە بەرز و بڵیندەکان بووە. ئەم وشەیە هەروەها هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑هەورەبان hewreban.

**هەوارە heware** [ *hawāra* ] - "هەوایەکی گۆرانی": خزمە دەگەڵ ↑هاوار hawar "زیقە، هەرا " [هوار hawār (.P) "هاوار"]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هۆرە hore "جۆرێک گۆرانی". زۆر لەو وشانەی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بە مانای "گۆرانی" دێن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "دەنگ و هەرا" دەگەیەنن، بۆ وێنە دە کوردمادیدا وشەکانی گۆرانی، گەڵۆ، نارین، ئاهەنگ، لۆرین و هتد.

**هەواڵ1 hewal 1** [ *hawāl* ] -"هاوڕێ": ↑هاواڵ hawal و ↑*ئاواڵ awāl* یش دەگوترێ.

**هەواڵ2 hewal 2** [ *hawāl* ] - "خەبەر":<*احوال aħwāl* (.*Arb*) ؟

**هەوتک hewtık** [ *hawtık* ] - "گلێنەیەک کە خواردنی بۆ سەگ تێ دەکەن": دەشێ خزم بێ لەگەڵ کۆدک kodık [کۆتک kotık] "کاسەی گەورەی دارین". بڕوانە ↑کۆد kod.

**هەوجاڕ hewcar** [ *hawjār* ] - "ئامرازی کێڵان": هەڤجاڕ hevcar یش دەگوتژێ. ابزار ebzar (.P) یان افزار efzar (.P)"ئامراز، ئامێر". پێک هاتووە لە دوو کەرتی هەو + جاڕ hew + car. [اف + زار ef + zar (.P)]. کەرتی یەکەم پێشگرە کە دە چەندین وشەی کوردمادی و فارسیدا دەردەکەوێ وەک هەوراز، هەوسار، "افراشتن"، "افروختن" و هتد. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ scaro (.OG) "هەوجار". دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا پێی دەگوترێ Pflugschar کە لە دوو کەرت پێک هاتووە. کەرتی یەکەم مانای "کێڵان" و کەرتی دووەمەکەش schar- شێوەی نوێی scaro ی ئەڵمانی کۆنە. دە ئینگلیزیدا دەبێتە share (.E). ئەم وشە ژێرمانییە دەچێتەوە سەر ریشەی < *(s)ker-** (.*IE*) "برین، قەڵشاندن، لێک جودا کردنەوە". دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑*کێرد kerd*، ↑کرتاندن kırtandın، ↑شڕ şır و هتد.

**هەود1 hewd 1** [ *hawd* ] - "رکە، قەفەس": هەودەک hewdek یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑هەودا hewda "تاڵ، داو".

2- ↑هۆدە hode "وەتاخ" و هەوش hewış "حەوشە، ماڵ".

**هەود2 hewd 2** [ *hawd* ] - "حەوز": خزمە لەگەڵ ↑هەوتک hewtık "گلێنەیەک کە خواردنی بۆ سەگ تێ دەکەن"، کۆدک kodık [کۆتک kotık] "کاسەی گەورەی دارین" [ بڕوانە ↑کۆد kod]. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ گود goud (.P) "قووڵ" و ئاماژە بە "قووڵ بوون، قووڵکە بوون" دەکەن.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵیسەنگینە لەگەڵ *تاپی* "خەندەک، قووڵکە" و *تاپوو* "کەندووی گەورە" و *تاوە* "جۆرێک دەفر". وشەی عەرەبی حوض ħawż (.Arb) لەم وشە کوردمادییە سەرچاوەی گرتووە].

**هەودا hewda** [ *hawdā* ] - "1- تاڵ، داو 2- چەند وشەیەک کە بە یەک هەناسە دەگوترێن (سیلاب؟)": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*ئیپە îpe* دا باس کراون، وەک heften (.G)، ha ftan (.OE)، häfta (.Sw) "بەستن، قایم کردن، پێوەنووساندن". مانای دووەمی وشەکە هەر لەم چوارچێوەیەدا جێی لێکدانەوەیە، واتا ئاماژە بە چەندین دەنگی پێکەوەنووساو دەکا. هەروەها بڕوانە ↑هەودەل hewdel "دارۆکەیەک سەری شووشەی پێ دەبەستن، تەپەدۆر".

**هەودەل hewdel** *[ hawdal ]* - "دارۆکەیەک سەری شووشەی پێ دەبەستن، تەپەدۆر": خزمە لەگەڵ ↑هەودا hewda و چەندین وشە کە مانای "(لێک) بەستن، قایم کردن، پێوەنووساندن" دەبەخشن.

**هەور1 hewır 1** *[ hewır ]* - "سەرچاوەی باران": ابر abr (P.). بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی (ل. 69) خزمە دەگەڵ -awra (Av.)، -abhrá (OIn.)، imber (L.)، amb (Arm.)، سەر بە ریشەی < ***mbh- (IE.)*** "هەور، هەڵاو، مژ". خزمە دەگەڵ ↑هەفار hefar [هەپ hep] "1- مژ و هاڵاوی ئاوی گەرم 2- بۆنی گرانی تەڕی" .

**هەور2 hewır 2** *[ hawır ]* - "1- گۆمی قووڵ 2- مێرگۆڵەی بچووک لە نواڵی چیا": بە هەر دوو ماناوە خزمە لەگەڵ ↑گۆڕ gor "1- قەبر 2- دەشت، نزمانی" و ↑گۆل gol "قولکەی ئاو" و دواجار دەبێتە خزم لەگەڵ ↑کون *kun* [کون و کەلێن].

**هەوڕ hewır** *[ hawır ]* - "ئێربار، دەفری سواڵەت": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەوەڕ hewer. هەوڕگەر hewırger واتا "گۆزەساز، چێکەری گۆزە".

**هەورا hewra** *[ hawrā ]* - "برسی، برچی": هەورایی hewrayî دەبێتە "برسییەتی". پێک هاتووە لە پێشگری هە he + ورا wıra. کەرتی ئەسڵی وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ ↑برسی bırsî.

**هەوراز hewraz** *[ hawrāz ]* - "سەربەرەژوور": هەڤراز hevraz یش دەگوترێ. فراز farāz (P.) [پێشتر afrāz]. پێک هاتووە لە دوو کەرتی هەو hew + راز raz [دە فارسیدا: raz + (e)f (P.) وەک افراشتن afrāştan (P.) "هەڵکردنی ئاڵا، بەرز کردنەوە]. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ up (E.)، auf (G.) کە وشەیەکی کۆنی هیندوئەورووپییە و ئاماژە بە "لای سەرەوە" دەکا. ئەم وشەیە دە زمانی ئەوێستادا upa (Av.) بووە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی ↑هەوار hewar "بەرزایی، شوێنی بەرز". پێشگری ef دەشێ دە زمانە کۆنە ئێرانییەکاندا دەوری زۆرتری بینیبێ و دە زمانی ئەمڕۆی فارسیدا دە چەندین وشەدا دەبیندرێ، وەک افراشتن، افروختن، افشاندن، افکندن و هتد. دە زمانی کوردمادیدا بووەتە هەو -hew [هەوراز، هەوسار، هەوجاڕ و ...]. کەرتی دوویەمی وشەی هەوراز، واتا -raz خزمە دەگەڵ raise (E.)، reisa (ONor.) "بردنە سەر، بەرەو ژوور بردن"، rise (E.) "هەستان، چوونەسەر"، rīsan (OG.) "بزووتن بەرەوە سەر، هەستان، چوونەسەر [هەروەها بزووتن بەرەوخوار، داگەڕان، کەوتن] ، Reise (G.)، resa (Sw.)، reis (Nl.) "سەفەر، گەشت"، ur-reisan (Gt.) "هەستان لە خەو، هەستان"، risat (Rus.) "را کردن". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑راسان rasan "1- هەستان 2- بەربوون(ی خوێنی لووت)" و ↑هۆریزان horîzan "هەستان" [ئەم وشەیە هەڵسەنگێنە دەگەڵ ur-reisan (Gt.) "هەستان"]، هەروەها دەگەڵ ↑هەرەس heres "کەوتن، داڕمان"، هرزا hırza "جۆرێک هەڵپەڕکێ"، ↑هوورش huriş [هوورش کردن واتا بڵیند کردن، بەرەوژوور بردن]، ↑هەرستاندن herıstandın "بڵند کردن و راوەشاندن" و هتد. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ****rei-*** , ****reu- (IE.)*** "بزووتن، ڕێ کەوتن، هورووژان". ئەم ریشەیە بە دەیان وشەی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لێ کەوتۆتەوە.

**هەورە hewre** *[ hawra ]* - "ڕەنگی سورمەیی": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑کەوە kewe "ڕەنگی شینی کاڵ، بۆری ئاماڵ شین" و کبود kabūd (P.).

**هەورەبان hewreban** *[ hawrabān ]* - "شوێنی پێدا چوونەسەربان لە ڕێگەی پلیکانەکانی ژوورەوەی ماڵ": هەورە hewre + ↑بان ban. "هەورە" خزمە دەگەڵ upari (Av.)، ober (G.)،

وەک ↑هەوار hewar، ↑ئەوپەڕ ewper، ↑هۆر hor [هۆر گرتن، شێوەی کۆنتری "هەڵ گرتن"].
"لەسەر، بەسەر". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی (Gr.) hyper ،(E.) over ،(G.) über

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ قولەبانک qulebank "هەورەبان". لێرەشدا کەرتی یەکەمی وشەکە ئاماژە بە "بڵیندی، لای سەرەوە" دەکا].

**هەوری hewrî** [ *hawrī* ] - "پارچەیەکی ئاوریشم": خزمە دەگەڵ↑ ئاوریشم awrîşım [هاوریشم hawrîşım].

**هەوریس hewrîs** [ *havrīs* ] - "داری عەرعەڕ": هەڤریسک hevrîsk یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑هەڤران hevran "سپیدار".

**هەورینگ hewrîng** [ *hawrīng* ] - "قەیچی زل بۆ هەڵپاچینی خوری ئاژەڵ": هەورنگ hewrıng یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە پێشگری هە he + ورینگ wırîng [شێوەیەکی دیکە لە ↑برینگ bırîng].

**هەورێ hewre** [ *hawre* ] - "چیایەک لە کوردستان": خزمە لەگەڵ وشەی ↑حەمرین ħemrîn "ناوی چیا" و ئەو وشانەی لەژێر حەمریندا باس کراون.

**هەوسار hewsar** [ *hawsār* ] - "پەت یاخود بەندی راکێشانی یەکسم": افسار afsār (P.). هەو hew [دە فارسیدا: ef (P.)] + سار sar. کەرتی سار -sar دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای "پەت، بەن، ریس" دەبەخشن، بۆ وێنە ↑جاڵ cal [جاڵجاڵۆکە] و ↑سارمە sarme.

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا جگە لە وشەی "افسار"، وشەی "افسر" هەیە کە بە مانای "تاج" بەکاردێ. ئەم دوو وشانە جیاوازن و کەرتی دووەمی وشەی دوایی پێوەندی بە "سەر"ەوە هەیە (اف + سر)].

**هەوسین hewsîn** [ *hawsīn* ] - "فێر بوون": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەڤۆتن hevotın [هۆژان hojan] "فێر بوون".

**هەوش hewş** [ *hawš* ] - "بزنی رەش و سپی": پێک هاتووە لە ↑هە he [پێشگر] + وش wış [↑وازە waze "ئاژەڵی بەڵەک"].

**هەوش(ە) hewş(e)** [ *hawš(a)* ] - "1- حەوشە، حەسار 2- تامان بۆ ئاژەڵ لە دەرەوە 3- ماڵ": خزمە دەگەڵ Haus (G.)، hus (OG.) و (Sw.)، house (E.) "ماڵ، خانوو"، سەر بە ریشەی < ***(s)keu-*** ***(IE.)*** "لێهاڵاندن، داپۆشین، تاقەت کردن". دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑*هۆدە hode*، ↑هۆبە hobe، ↑هەویچ hewîc "توورەکەی گون"، ↑گاوس gawıs "پێستی مەشکە" و ↑قایش qayış "چەرم" و هتد.

**هەوشەنگ hewşeng** [ *hawšang* ] - "مەیدانی یاری": دەچێتەوە سەر ↑هەوش(ە) hewş(e).

**هەوق hewq** [ *hawq* ] - "1- تاقی گومبەزی 2- پەنگاوی ئاو 3- پلەی تیردیوان": بە مانای یەکەم هۆوق howıq یش دەگوترێ. بە مانای دووەم هێق heq یش دەگوترێ. "هێق" دۆخێکە کە ئاو بەری دەگیرێ و زیاد دەکا واتا ئاستی ئاوەکە بەرز دەبێتەوە و هاوکات تەوژمی (بۆ دەرباز بوون) زۆرتر دەبێ. هێق heq هاوکات مانای "هێڵنج" دەدا و بەم مانایە بە دوو شێوەی دیکەش دەگوترێ کە بریتین لە ↑ئێق eq و ↑حۆق ħoq. وەک لەژێر وشەی "هێڵنج"دا باس کراوە، ئەم وشەیە مانای "بەرز بوونەوە، بۆ سەرەوە هاتن" دەبەخشێ. بەم پێیە وشەی "هەوق" [هێق، ئێق، حۆق، هووق] دەبێ پێوەندی بەم چەمکەوە هەبێ و خزم بێ لەگەڵ hoh (OG.)، hoch (G.)، hauhs (Gt.)، heah (OE.)، high (E.)، hög (Sw.) و häch (OF.) "بەرز، بڵیند". لە زمانی ئەڵمانیدا erhöhen (G.) بە هەردوو مانای "بەرز کردنەوە، زیاد کردن" بەکار دێ. سەبارەت بە

مانای "تاقی گومبەزی" دەتوانین لەگەڵ Hügel (.G) "تەپۆڵکە" هەڵی سەنگێنین کە ئەویش خزمایەتی لەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەیە. لە زمانی کوردمادیدا ↑حووج ĥûc "زۆر درێژ" [لە بنەڕەتدا: زۆر بڵیند] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**هەولی hewlî** [ *hawlī* ] - "جوانووی یەکساڵە": خزمە لەگەڵ ↑سەواڵ sewal.

**هەوِن hewın** [ *hawın* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑خەوِن xewın.

**هەوهەو hewhew** [ *hawhaw* ] - "دەنگی سواران لە راودا": هەمهەمە hamhame (.P) "دەنگ و هەرای زۆر و تێکەڵ". خزمە دەگەڵ↑ گماندن gımandın "دەنگ لێ هاتنی کۆتر".

**هەوە hewe** [ *hawa* ] - "دروشم، نیشانەی تایبەتی 2- هەڵاو و تینی گەرما": پێوەندی هەیە بە ↑هاوید hawîd "داغی دروشمی ماڵات".

**هەوەر hewer** [ *hawar* ] - "پاڕانەوە، ڵاڵانەوە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لە وشەکانی خوارەوە هەبێ:

1- ↑وِرتە *wırte* و ↑هاوار hawar .

2- ↑کوڕکوڕە kurkure.

**هەوەڕ hewer** [ *hawar* ] - "ئێربار، دەفری لە سواڵەت": هەوڕ hewır یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا مەبەست قوڕی رەقکراو و بەردکراوە، خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑حەمرین ĥemrîn دا باس کراون.

**هەوەس hewes** [ *hawas* ] - "ئیشتیا، ئارەزوو": پێشگری هە he + وەس wes، شێوەیەکی دیکە لە ↑واز waz. هەروەها هەڵی سەنگێنە لەگەڵ ↑هەویستن hewîstın. ئەم وشەیە لە زمانی کوردمادییەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە هوس hawas (.Arb).

**هەوەسیان hewesyan** [ *hawasyān* ] - شێوەیەکی دیکە لە عەبەسان εebesan [↑حەپەسان ĥepesan].

**هەویچ hewîc** [ *hawīj* ] - "توورەکەی گون، پێستی گون": خزمە لەگەڵ ↑گاوس gawıs "پێستی مەشکە" و ↑قایش qayış "چەرم".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا هویچ havīč (.P) هەیە بە مانای "گێزەر". ئەم وشەیە پێوەندی بە وشە کوردمادییەکەوە نییە و دەشێ لە cabbage (.E) "کەلەم" وەرگیرابێ. ئەم وشە ئینگلیزییە لە فەرانسەیی وەرگیراوە و ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە].

**هەویر hewîr** [ *hawīr* ] -"ئارد و ئاوی هەڵشێلدراو": خمیر xamīr (.P). خزمە دەگەڵ Schmer (.G)، smear (.E) "رۆن، چەوری، کەرە"، smör (.Sw) "کەرە"، smi(u)r (.OIr) "مێچک (ی ناو ئێسک)"، سەر بە ریشەی ***smer-** (.*IE*) <* "چەوری".

[تێبینی: ئەم ریشەیە دەبێ دە بنەڕەتدا هەمان ریشەی **(s)mer-* (.*IE*) بێ بە مانای "رێخشاندن، رێککوشین، پشاوتن، ورد کردن، هاڕین". وەک لەژێر وشەی "مەرە" [پێمەڕە] دا شی کراوەتەوە، مانای هەرە بنەڕەتی ریشەکە دەبێ "رێخشاندن" بێ، چونکوو ئەم مانایە هەموو ماناکانی دیکەی لێ بەرهەم دێ و وەک بنەمایەک وایە بۆ ماناکانی دیکە. لە لایەکی دیکەوە چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە بە مانای "رۆن، چەوری" بەکار دەهێنرێن، پێوەندییان بەو ریشانەوە هەیە کە مانای "رێخشاندن" و هاوکات "پشاوتن، گوشین، ورد کردن، نەرم کردن" دەبەخشن. بۆ وێنە "ماسڵە" وشەیەکی رووسییە کە خزمە دەگەڵ "ماشتن" و "مشت و ماڵ". وشەی "کەرە" [رۆنەکەرە] هەر بەم شێوەیە. "نڤیشک" کە دە شێوەزاری سەروودا بە مانای "کەرە" بەکار دێ، دیسان هەر بەم شێوەیە و خزمە دەگەڵ "نڤانی" بە مانای "قوڕەکاری" [قوڕ

تیهەڵسوون، سواخ دان]. "هەتوان" بە مانای مەرهەم [مەلهەم]، کە جۆرێک لە رۆن و چەورییە، دەبێتە خزم دەگەڵ "ساوین"، "تیهەڵسوون" و "سواخ". وەک باس کرا، ریشەی *(s)mer- (IE.) هاوکات هەموو ماناکانی "رێخشاندن، رێککوشین، پشاوتن، ورد کردن، هاڕین" دەردەبڕێ و بەم جۆرە وشەی "هەویر"یش پێوەندی بەم ریشەوە پەیدا دەکا و لە هەمان کاتیشدا دەبێتە خزم دەگەڵ "مەرهەم" ].

**هەوین hewîn** [ *hawīn* ] - هەوین کردن واتا "تکا و خواهیشت کردن": خزمە دەگەڵ ↑ئەوین ewîn "حەز، خۆشەویستی" و دواجار خزمە دەگەڵ ↑ویستن wîstın. لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ "خواهش"ی فارسی کە دەگەڵ "خواستن" (خازتن)ی کوردی خزمایەتی هەیە].

**هەوێ hewe** [ *hawe* ] - "ژنی دیکەی هاوسەر": هوو havū (P.).

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هێوەر hewer "برای مێرد" و دواتر دەگەڵ ↑خەزوور *xezur* "باوکی هاوسەر".

2- لەوانەشە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ awo (Gt.) "نەنک، دایە گەورە"، hīwo (OG.) "کابان" > *hiwa(n)- (Grm.) ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە دیاری نەکراوە. "ماڵ".

**هەوێدی hewedî** [ *hawedī* ] - "جۆرێک گەنمەزەردە": خزمە لەگەڵ Weizen (G.)، wheet (E.)، veta (Sw.) "گەنم". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ weiß (G.) "سپی" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا و هەروەها لەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑وچ wıç "دانەوێڵە و ئەرزاقی ماڵ". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هاوید hawîd "داغی نیشانە کردنی ماڵات" و دەگەڵ ↑سپی sıpî [کۆنتر: سپێد sıpêd]، سەر بە ریشەی < *(IE.) *kueit-* "هایسان، رووناک بوون، بریقانەوە".

**هەوێرا hewera** [ *hawerā* ] - "بوێر، وێرا": هە he + وێرا wera [بڕوانە ↑وێران[2] weran "زات کردن"]. هەروەها هەوێری hewerî هەیە بە مانای "وێرایی، بوێری".

**هەوێردە hewerde** [ *hawerda* ] - "پەلەوەرێکە":

1- لە لایەکەوە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ avis (L.) "پەلەوەر، مەل" و پێک هاتبێ لە هەو(ێ) hew(e) + ئێردە erde [هەرد، ئەرد؟].

2- لە لایەکی دیکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ اردک ordak (P.) "مراوی".

**هەوێرکە hewerke** [ *hawerka* ] - "ناوچە، مەڵبەند": بڕوانە ↑هەڤیرکە hevîrke "1- دەوروبەر 2- گەو، کەمە".

**هەوێز hewez** [ *hawez* ] - "حەوشەمەڕ": شێوەی کۆنتری ↑حەوشە ĥewşe یان ↑هەوش(ە) hewş(e).

**هەوێن hewen** [ *hawen* ] - "خەمیرمایە": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم دوو وشانەی خوارەوە:

1- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئامیان amîyan. [گۆڕانی m بە w].

2- یان خزمە دەگەڵ Hefe (G.)، hevo (OG.)، haef (OE.) "هەوێن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر heben (G.) "بەرز کردنەوە، هەڵ هێنان".

**هەیاتی heyatî** [ *hayātī* ] - "1- دارایی 2- بوون": ↑هەبوون hebun.

**هەیاس heyas** [ *hayās* ] - "کەسێک کە لە رێ رۆیشتندا لاقەکانی وێک دەکەوێ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە قەیچی qeyçî [قاچی qaçî] "مەقەست". ئەم شێوە رۆیشتنە وەک "مەقەست لێدان" وایە. بڕوانە ↑قاچین qaçîn "هەڵپاچین".

**هەیاسە heyase** [ *hayāsa* ] - "کەمەرەی زێڕ و زێو": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قەیاسە qeyase "باربەندی پان لە چەرم".

**هەیت heyt** [ *hayt* ] - دەگەڵ "هووت" دێ [هەیت و هووت heyt u hut]. هەیتەهەیت heyteheyt یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ لەگەڵ heißen (.G)، haitan (.Gt)، hātan (.OE)، heta (.Sw) "بانگ کردن، هەرا کردن، ناو بردن". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەت2 het "وشەی دنەدانی سەگ" و ↑هات2 hat [هات و هاوار hat u hawar].

**هەیتاڵ heytal** [ *haytāl* ] - "کۆتەڵ": خزمە دەگەڵ heit (.OG) "کەس، بوونەوەر، نەوع، جینس، تایبەتمەندی"، haidus (.Gt) "چونیەتی، شێوە"، had (.OE) "کەس، بوونەوەر، شێوە، سروشت، جینس" و -keta (.OIn) "شێوە، نیشانە". دە زمانی ئەڵمانی ئەمڕۆدا -heit (.G) و هەروەها -keit (.G) کە شێوەیەکی دیکەی وشەکەیە، وەک دوو پاشگری زۆر چالاک دەگەڵ ناوی مانا بەکار دەهێنرێن، بۆ وێنە Freiheit (.G) "ئازادی"، Wahrheit (.G) "راستی"، Gerechtigkeit (.G) "داد(پەروەری)". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(.IE) *kai- >** "درەوشانەوە، دیار و رووناک بوون". وەک دەر دەکەوێ لەم مانایەوە مانای "خۆ نیشان دان، بە دیار کەوتن" پەیدا بووە و دواتر "شێوە، نیشانە، جینس، بوونەوەر...". دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی heiter (.G) "شاد، سەرزیندوو" [دە بنەڕەتدا: درەوشاوە، گەشاوە] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشە ئەڵمانییە شێوەکەی زۆر لە هەیتاڵ heytal دەچێ و دەشێ خزمیش بێ دەگەڵ ↑شاد şad. جگە لەمە وشەکانی ↑کەس kes "شەخس" و ↑کەسم kesm "سەر و سیما، بیچم" و هەروەها پاشگری ↑ئایەتی -ayetî [یان ئاتی -atî، وەک کوردایەتی kurdayetî، مرۆڤایەتی mrovayetî، براتی bratî...] دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە جێی هەڵسەنگاندنن. لەوانەیە وشەی هیکل haykal (.Arb) "هەیکەل، کۆتەڵ، قەڵافەت" لەم وشە کوردمادییەکە وەرگیرابێ.

**هەیڤ heyv** [ *hayv* ] - "مانگ": هەوی hewî ش دەگوترێ. ئەم وشەی دە شێوەزاری سەروودا لەجیاتی وشەی "مانگ، قەمەر" بەکار دەهێنرێ. شیاوی باسە کە وشەی "مانگ" وشەیەکی دروستترە، چونکوو وشەی مانگ دەگەڵ ئەو وشانەی کە دە زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا بەو مانایە بەکار دێن، بە تەواوی یەک دەگرێتەوە. وشەی "هەیڤ" دەشێ دە بنەڕەتدا مانایەکی دیکەی بووبێ و پاشان دە شێوەزاری سەروودا جێگەی وشەی "مانگ"ی گرتبێتەوە. ئەم وشەیە دەشێ هەمان کەیوان keywan بێ کە هەسارەیەکە لە کۆبەندی خۆر (مەنزوومەی شەمسی)دا. [تێبینی: دە زۆرینەی زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا وشەی مانگ دەچێتەوە سەر ریشەی *(.IE) *mento* "مانگ". دە زمانی کوردمادیشدا مانگ mang لەم ریشەوە هاتووە].

**هەینی heynî** [ *haynī* ] - "جومعە": ئین în یش دەگوترێ. ادینە ādīne (.P).

1- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسیدا (ل. 11) وشەی ادینە ādīna (.P) بردراوەتەوە سەر ریشەی -ay "رۆیشتن" و پێشگری -ati "رۆیشتن بەرەوە، کۆ بوونەوە، جڤین" [ *ati-ayanaka-** ]. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە وشەی "هەینی، ئین" هەر وەک رۆژی "جومعە" دە زمانی عەرەبیدا ئاماژەی بە کۆ بوونەوە و جڤین کردووە، واتا رۆژێک بووە کە خەڵک تێیدا کۆ بوونەوە. هەر لەم سەرچاوەیەدا و لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا باس لە وشەی adēn (.MP) کراوە و بە فارسی وەک "ورود" مانا کراوەتەوە. دیارە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ هاتن hatın کوردی و ئەگەر ئەم بۆچوونەی سەرەوە راست بێ وشەکە پێوەندی بە وشەی کوردمادی ↑هاتن hatın ەوە پەیدا دەکا.

2- له لایەکی دیکەوە لەوانەیە وشەکە پێک هاتبێ لە پێشگری ئا a + دین dîn. کەرتی ئەسڵی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ هێندێک وشەی زمانە ژێرمەنییەکان کە مانای "کۆ بوونەوە، جڤین" دەبەخشن، وەک thing , ding (OG.)، ting (Sw.) "دادگا" [دە بنەڕەتدا: جڤات، جفینگە]، dingen, bedingen (G.) "بە وتووێژ بە دەست هێنان، رێک کەوتن، بڕیار دان"، verteidigen (G.) "بەرگری دادوەری کردن" [دە بنەڕەتدا: جڤینی دادوەری]. وشەکانی Ding (G.) و thing (E.) "شت، تشت" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست لەم وشانە "دۆسیە، دۆزی دادوەری" بووە. [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "تشت" و "دۆسیە"]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ten- <** "تەنینەوە، درێژبوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە" و دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەنین tenîn.

**هەیوان heywan** [ *haywān* ] - "بێڵا، بانی تراس": ایوان eywān (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ *(Grm.) * hīwa(n)* "ماڵ". وشەکانی Heim (G.) "ماڵ، خانوو"، hīwo (OG.) "خزم، خێزان" لەم ریشە ژێرمەنییەوە هاتوون. ئەم وشانە و هەروەها civis (L.) "شاروەند" [دە بنەڕەتدا: هاوماڵ] دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *kei- <** "لێ بوون، لە شوێنێک بوون".

**هەیین heyîn** [ *hayīn* ] - "هەبوون": لەژێر ↑هەبوون hebun دا شی کراوەتەوە.

**هی¹ hî** [ *hī* ] - "نم، تەڕایی": ↑هیتە hîte "تەڕ".

**هی² hî** [ *hī* ] - "ئامرازی خاوەنیەتی و خستنەپاڵ": ئی î ش دەگوترێ [هی تۆ، ئی من، یان زارۆکی من zarok-î mın]. دە شێوەزاری سەروودا یا (y)a بۆ مێینیە و یێ (y)e بۆ تیرینە [ کچا من kıça mın، کورێ من kurê mın، یا من ya mın، یێ من ye mın]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *ke- <** "ئەو، ئەمە". ئەم وشانەی خوارەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون: he (E.)، hē (OE.) "ئەو"، her (E.) "هی ئەو"، her (G.) "ئێرە، بەرەو ئەم لا، بەم لادا"، him (E.) "بە ئەو"، himma (Gt.) "ئەم"، hinn (ON.) "ئەم" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هین hin]، hin (G.) "بەو لادا، بەرەو ئەو لا"، cis (L.) "لەم بەر، لەم لا"، cē (OIr.)، sĭ (OSl.) "ئەمە"، ekei (Gr.) "ئەوێ". وەک دەبینرێ ژمارەیەکی زۆر جێناوی جۆربەجۆر پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و دەشێ دەگەڵ ئامرازی خستنەپاڵ دە زمانی کوردمادیدا لە ریشەیەکەوە هاتبن.

**هیال hîyal** [ *hīyāl* ] - "وێل، ئاوارە": شێوەیەکی دیکە لە ↑وێل wel.

**هیت1 hît** [ *hīt* ] - "تین، گەرما":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ heiss (G.)، heet (NL.)، hot (E.)، het (Sw.) "داغ"، Hitze (G.)، heat (E.)، hitte (NL.)، heta (Sw.) "داغی، تین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *kei-, *ki- <** "گەرما، تین". لەوانەیە ↑هایسان hayısan یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ئاگر agır [کۆنتر: ئاتر atır]، سەر بە ریشەی **(IE.) *ēt-r-** "گەرمی، تین".

**هیت2 hît** [ *hīt* ] - "جووت": هیتەوان hîtewan واتا جووتێر. شێوەیەکی کۆنتر لە ↑جووت¹ cut "هاوتا، دووانە".

**هیتر hîtır** [ *hītır* ] - "ئیدی، ئیدیکە": ئیتر îtır ش دەگوترێ.

1- دەتوانێ لە دوو کەرتی ↑هی² hî [یان ئی î] + تر tır پێک هاتبێ. کەرتی "هی" جێناوێکی کۆنە ئاماژە بە "ئەو، ئەولا، ئەوێ" دەکا. کەرتی "تر" tır هەر ئەم کەرتەوشەیە کە لەم وشانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێ: ander (G.)، other (E.)، annar (OIs.)، ántara-h (OIn.)، antras (Lit.) "ئیدی، ئەوی دی"، سەر بە ریشەی **(IE.) onotero-* <** "تر، هیتر، ئەویتر". ئەم ریشەیە خۆی لە

دوو کەرت پێک هاتووە، واتا کەرتی *eno-, *ono-* (IE.) "ئەو، ئەوێ" و *tero-* (IE.). ئەم وشەی دوایی خزمە دەگەڵ نیشانە یان ئامرازی ↑تر tır کە دە زمانی کوردمادیدا بۆ ئاوەڵناوی "باڵاتر" بەکار دەهێنرێ، وەک باشتر، جوانتر، سەرتر و هتد. بەم جۆرە مانای وشەکانی سەرەوە دە بنەڕەتدا دەبێتە "ئەوتر"، هەر وەک "باشتر، جوانتر". ئەم وشانە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑ئیدی îdî.

2- لەوانەشە کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا هی -hî دەگەڵ کەرتەوشەی -an دە وشەکانی سەرەوەدا خزم بێ و فۆتیمی n سوابێتەوە، هەروەک چۆن ئەم فۆتیمە دە وشەی ئینگلیزی other شدا سواوەتەوە.

**هیت(ە) hît(e)** [ *hīt(a)* ] - "تەڕ، شەدار": خزمە دەگەڵ wet (E.)، weete (ME.)، wǽt (OE.)، vátr (ON.) "تەڕ، شەدار" و water (E.) "ئاو"، سەر بە ریشەی *(a)ued- <* (IE.) "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون". ↑وەشتەی weştey "بارین" لەم ریشەوە هاتووە.

**هیچ hîç** [ *hīč* ] - "پووچ، نە تشت": هیچ hīč (P.)، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- eitel (G.)، ital (OG.)، ijdel (Nl.)، idle (E.) دە بنەڕەتدا بە مانای "پووچ، بەتاڵ" و دواتر بە مانای "قەڵب، بێ ناوەرۆک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمانی *idla-* (Grm.) "بەتاڵ، پووچ". هەر لە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشە ژێرمانییە وشەی ↑حەتاڵ ħetal [بەتاڵ و حەتاڵ] و عاطل ɛatil (Arb.) سەرنج رادەکێشن. لەوانەیە وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییە باس نەکراوە.

2- ↑حۆت ħot "کەسێک کە تووکی سەری وەریوە"، öd(e) (G.)، ōdi (OG.)، īeđe (OE.)، öde (Sw.) "چۆل، تەریک، بەیات، بێتام"، aútōs (Gr.) "بێهوودە، هیچ و پووچ"، áva (OIn.) "لە شتێکەوە"، au (L.) "دوور(بوونەوە)، پێش (چوون)"، سەر بە ریشەی *au-, *aue- <* (IE.) "دوور بوونەوە لە، بەرەو پێش".

**هیر hîr** [ *hīr* ] - "سێ، دوو و یەک": شێوەیەکی دیکە لە ↑سێ[1] se وخزمە کەگەڵ drei (G.)، drī (OG.)، three (E.)، tre (Sw.)، tres (L.)، trēis (Gr.) "سێ"، سەر بە ریشەی *trei- <* (IE.) "سێ". [فۆتیمی t لە وشەی "هیر"دا گۆڕاوە بە h و لە "سێ"شدا گۆڕاوە بە s، لەم وشەی دواییدا فۆتیمی r سواوەتەوە]. لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ژمارەیەک وشەی لەژێر "هیر"دا ریز کراون، وەک هیرگووش hîrgûş "شەنەی سێ حاچە، سێگۆش".

**هیر(ە) hîr(e)** [ *hīr(a)* ] - "ورد، ورتکە": هورد hurd [↑ورد wırd].

**هیرا hîra** [ *hīrā* ] - "پان و بەرین، هەراو": هەروەها ↑هێر her بە مانای "ژووری پیاوان و میوانان" بەکار دێ.

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑هەراو heraw.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ریشەی *uer-* (IE.) "پان، بەرین" و خزم بێ لەگەڵ ↑بەرین berîn.

**هیربار hîrbar** [ *hīrbār* ] - "قاپ و قاچاخ": ئیربار îrbar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شەربە şerbe "دەفری ئاوخواردنەوەی گڵین" و دەگەڵ Karparah (OIn.) "سواڵەت، کاسە(ی سەر)".

**هیروو hîru** [ *hīrū* ] - "هەڵووژەرەشە": "هیروو" هەر ئەم کەرتەوشەیە کە لە ↑هەڵووچە heluçe شدا هاتووە [هەڵوو helu + چە çe].

**هیریە hîrye** [ *hīrya* ] - "هەوجاری لە دار": وەک ↑هێرک2 herık "ئەسبابی ناو ماڵ" و ↑هەرمە *herme* "شان و پیل، مل" دەچێتەوە سەر ریشەی *ar- <* (IE.) "تێکخستن، تێکخستنەوە". arma

(L.) "دەزگا، چەک وچۆڵ" و ↑ئامێر amer [↑ئاموور amur] لەم ڕیشەوە هاتوون. لەم وشەی دواییدا فۆتیمەکانی r و m جێگۆڕکێیان کردووە.

**هیزە¹ hîze** [ *hīza* ] - "خیگە بە تووکەوە": خزمە دەگەڵ ↑خیگە xîge و دواتر ↑خەز xez "پێست".

**هیزە² hîze** [ *hīza* ] - "زکێ چوون": دەچێتەوە سەر ↑هاسان hasan. [هەڵی سەنگینە دەگەڵ "سهل" و "اسهال" دە عەرەبیدا].

**هیزی hîzî** [ *hīzī* ] - "دوێنێ، ڕۆژی بەرێ": [هیزی ڕۆ، هیزی شەو]. خزمە دەگەڵ gestern (G.)، gisteren (Nl.)، yesterday (E.)، hrei (L.)، chthes (Gr.) "دوێنێ"، hesternus (L.) "هی دوێنێ"، gistradagis (Gt.) "سبەی"، سەر بە ڕیشەی ***(IE.) *gh(d)ies- >*** "دە ڕۆژێکی دیکە دا".

**هیسا hîsa** [ *hīsā* ] - "بەش، پشک": خزمە دەگەڵ ↑کووز¹ kuz "قاش، تیکە".

**هیش1 hîş 1** [ *hīš* ] - "گڵەسوورە، گڵەزەرد": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەش heş [هەش بەسەر دە بنەڕەتدا واتا خۆڵ بەسەر].

**هیش2 hîş 2** [ *hīš* ] - "ئازووقە(ی هەڵگیراو)": هەروەها هیشخانە hîşxane هەیە بە مانای "دیوی ئازووقە". خزمە لەگەڵ بنجی ئاز -az لە وشەی ↑ئازووقە azuqe.

**هیشار hîşar** [ *hīşar* ] - "سەرپۆشی ژنانە": خزمە لەگەڵ ↑حەشار ħeşar [دە بنەڕەتدا: "هەشار"] و ↑*شاردنەوە şardınewe*.

**هیشک hîşık** [ *hīšık* ] - "نە تەڕ": وسک wısık، وشک wışık و ئیشک îşık ش دەگوترێ. خشک xošk (P.). خزمە دەگەڵ āzein (G.) "هیشک بوون"، azaléos (Gr.) "هیشک، قاقڕ، سووتەمەنی"، assus (L.) "هیشک، سوورەوە بوو"، Asche (G.) "خۆڵەمێش"، Esse (G.) "کوورەی ئاسنگەری"، ása-h (OIn.) "خۆڵەمێش"، سەر بە ڕیشەی ***(IE.) *ās- >*** "سووتان، هایسان". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑هەژگەل hejgel "چیلکە و چاڵ"، ↑ئێزینک ezîng "داری سووتەمەنی"، ↑ئەسکڵ eskıl "پۆلوو"، ↑ئازالە azale "ئاوردوو" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ azaléos (Gr.)] و ↑ئارا ara "دەشت" [دە بنەڕەتدا: زەوی هیشک و ڕووتەن].

**هیشیک hîşîk** [ *hīšīk* ] - "1- کۆزی هەڵپەڕکی 2- سەردەستەی سەماکەران 3- شاڵاو، پەلامار": بە هەموو ماناکانەوە دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هێژان2 hejan 2 "1- هەژان، ڕاژان 2- دنە، هانە" و ↑هەژان hejan "بزوانی توند".

**هیفگە hîfge** [ *hīfga* ] - "تێفەک": هیف hîf + گە ge، واتا شوێنی "هیف". "تێفەک" ئەو شوێنەیە کە دوو دەلینگی پانتۆڵ پێکەوە دروومان دەکرێن، واتا شوێنی لێکبەستن و پێوەنووساندن. دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ئیپە îpe دا هاتوون.

**هیل1 hîl 1** [ *hīl* ] - "ڕەنگی قاوەیی ئاچخ": خزمە دەگەڵ ↑هوول hul و↑کاڵ kal.

**هیل2 hîl 2** [ *hīl* ] - "حولی، لووس و ساف": خزمە دەگەڵ ↑حولی ħulî.

**هیلاندن hîlandın** [ *hīlāndın* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑حیلاندن ħilandın.

**هیلاو hîlaw** [ *hīlāw* ] - "1-پاک 2- ڕووت": خزمە دەگەڵ kahl (G.)، kaal (Nl.)، callow (E.)، golyj (Rus.) تاس، بێموو، ڕووت"، holy (Chek.) "ڕووت". ڕیشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە.

**هیلاهۆپ hîlahop** [ *hīlāhop* ] - "حندرحۆ، هەڵڵادۆشە": [ئامرازێکی کایەی منداڵانە کە دوو زارۆک، هەر کام لە لایەک لەسەری دادەنیشن و هەر جارەی یەکیان دەچێتە سەرەوە و ئەوەی دیکە دێتە خوارەوە]. کەرتی -hîl(a) دە وشەی ↑هەڵڵادۆشە helladoşe شدا دەبینرێ و پێوەندی

بە ↑هەڵڵا2 hella 2 ەوە هەیە و مانای "سەر، بەرەوژوور، بڵیندی" دەبەخشێ. ئەم کەرتەوشەیە دە وشەی فارسی الاکلنگ allākolang (P.) یشدا دیارە. کەرتی هۆپ -hop خزمە دەگەڵ ↑هووپ hup [هووپ کردن واتا باز دان لە بڵیندییەوە]، up (E.)، auf (G.)، op (Nl.)، ūf (OG.)، uup (Sw.) "لەسەر، سەرەوەی"، hypo (Gr.) "لەخوار، ژێر، خوارەوەی"، سەر بە ریشەی **< *up-** , **(IE.) *eup-** "لە خوارەوە بەرەو سەر چوون یان لەسەر بوون". بەم جۆرە وشەکە ئاماژە بە چوونە سەر و هاتنەوەخوارە لە کایەکەدا دەکا.

**هیلمەروو hîlmeru** *[ hīlmarū ]* - "گای تیوچاوان سپی": هیلمە hîlme + ↑روو ru. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑هوول hul "سپیکەڵە" [سپی + کاڵە] و ↑کاڵ kal "کەمرەنگ".

**هیم hîm** *[ hīm ]* - "1- بەردی زل، گاشە بەرد 2- بناخە": خیم xîm یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەڤر kevır "بەرد". هەروەها بڕوانە ↑حەمرین ħemrîn.

**هین1 hîn 1** *[ hīn ]* - "شت، ئەوەکە، واتیک": خزمە دەگەڵ این īn (P.) "ئەم"، he (E.) "ئەو"، hin (G.) "ئەو لا"، سەر بە ریشەی **< *ke- (IE.)** "ئەو، ئەمە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هی[2] hî [هی ئەوان].

**هین2 hîn 2** *[ hīn ]* - "فێر": هین بوون واتا فێر بوون. ↑هوین huwîn و ↑هۆژان hojan و ↑*هەڤوتن hevotın* یش دەگوترێ.هەروەها هینا hîna بە مانای "زانا، زۆر باش لە فێربووندا" بەکار دێ.

**هیوا hîwa** *[ hīwā ]* - "ئاوات، ئومێد": هێڤی hevî یش دەگوترێ. امید omīd (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ hoffen (G.)، hope (E.)، hopen (Nl.)، hofia (OF.) "هیوادار بوون". بە پێی بۆچوونێک ئەم وشانە رەنگە پێوەندییان هەبێ بە hüpfen (G.) "خۆ هەڵاویشتن، هەڵبەزدابەز کردن". [لە خۆشی یان لە سوێی شتێک خۆ هەڵاویشتن، هەڵبەزدابەز کردن]. ئەم وشەی دوایی بە گوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی **< *keu- (IE.)** "چەمانەوە" و بە پێی بۆچوونێکی دیکە دەچێتەوە سەر دەنگی *hup-** کە بۆ بزاڤێکی بەرەوە سەرەوە بەکار هاتووە. هەر لێرەدا جێی ئاماژە کردنە کە وشەکانی ↑ئاوات awat و↑ئومێد umed [هومێد humed] دوو شێوەی دیکە لەم وشەیەن. دەشێ لە رابردوودا وشەیەکی وەک *(h)omîten** "هیوا کردن، هیوادار بوون" دە زمانی فارسی و کوردمادی لەئارادا بووبێ و دواتر بەو چەند شێوەیە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

**هێت1 het 1** *[ het ]* - "1- سمت و کەفەڵ 2- ران 3- بەلەک 4- وڵمەگۆشتی زل 5- خاڵیگە": خزمە دەگەڵ ↑هەت1 het 1 "کن، نک، جەم". وێ دەچێ مانای بنەڕەتی وشەکە "کەلەکە، تەنیشت" بێ.

**هێت2 het 2** *[ het ]* - "تەڕ، شێدار": ↑هووت hut.

**هێت3 het 3** *[ het ]* - "دەگەڵ "پێت" دێ [هێت و پێت het u pet واتا "ورد و خاش"]. خزمە دەگەڵ ↑خاش xaş. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هۆخ hox "هەردی کێڵدراو".

**هێتم hêtım** *[ hetım ]* - "تمتمە، نووکی مەزرەق": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەت1 het 1 "کن، نک، جەم"دا هاتوون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هاویشتن، فڕێ دان".

**هێتوون hetun** *[ hetūn ]* - "توونی گەرماو، ئاگردانی گەرماو": شێوەیەکی دیکە لە ↑توون tun و هەروەها پێوەندی بە ↑تین tîn ەوە هەیە. دەشێ دە بنەڕەتدا هەتوون hetun بێ، پێکهاتوو لە پێشگری هە he + توون tun.

**هێچ heç** *[ heč ]* - "1- لرفەی وشتری گەرم داهاتوو 2- ئاژەڵێک کە لەترسی نەقیزە بە دەوری خوێدا دەخولێتەوە 3- کەسێک کە تووڕە کراوە و شێتانە هەڵ دەسووڕێ". هەروەها هێچی heçî هەیە بە مانای "1- تووڕە، رق هەستاو 2- هار". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هاچ hac [هار و هاچ] و دواجار پێوەندی هەیە بە↑*هەژان hejan* "جووڵان، بزوان".

**هێچاندن hêçandın** [ *hečāndın* ] - "ئەزموون، تاقی کردنەوە": خزمە لەگەڵ kiesen (G.)، kiosan (OG.)، kiusan (Gt.)، choose (E.)، tjusa (Sw.)، kjusa (OSw.) "تاقی کردنەوە، (بە تاقی کردنەوە) هەڵبژاردن". خزمە لەگەڵ ↑چێشتن çeştın "مەزەکردن"، سەر بە ڕیشەی **<** ***(IE.) *geus-*** "چێشتن، تاقی کردنەوە، مەزە کردن".

**هێچک heçk** [ *hečk* ] - "قوڵفە داری سەری گوریس": هەچک heçk و هەستک hestık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Haken (G.)، hook (E.)، haca (OE.)، hake (Sw.)، koyot (Rus.) "شتی خوار بۆ شت پێ هەڵگرتن، قولاپ"، سەر بە ڕیشەی **<** ***(IE.) *keg-, *kek-*** "هێچک، قولاپ، نووک تیژ". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەسک hesk "شەن، شەنە"، ↑هێش2 hêş "هەوجاڕ، ئاموور" و دەگەڵ خیش xīš (P.) "ئامرازی کیڵان" [ئاستیکی خوار و نووک تیژ]. هەروەها لەوانەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑خاش xaş [ورد و خاش] و لەوانەشە ↑خاک xak [دە بنەڕەتدا بە مانای وردە، کوتراو، ورد کراو؟].

**هێدەرە hedere** [ *hedara* ] - "گامێشی چوارساڵە": لە وشەی "چوار" وەرگیراوە: ↑چوار çuwar، چهار čahār (P.)، cátur- (OIn.)، četyre (Rus.)، cethair (OIr.)، quattuor (L.)، vier (G.)، four (E.) سەر بە ڕیشەی **<** ***(IE.) *ketuer-*** "چار، چوار" [گۆڕانی فۆتیمی t بۆ h ← hedere، دواتر بۆ w ← çuwar و پاشان سوانەوەی فۆتیمەکە ← چار çar].

**هێدی hedî** [ *hedī* ] - "ئارام، لەسەرخۆ": چەند وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا هەن کە پێوەندییان بەم وشەوە هەیە، وەک ↑هەدا heda دان "ئارام بوون، پشوو دان"، ↑هەدنادن hednandın "خاترجەم کردن". ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای "سەخت، پتەو" دەبەخشن، وەک ↑زات zat "بوێری، ئازایەتی" [دە بنەڕەتدا: هێز و پتەوی]، ↑سێتە1 sete "چیا"، ↑سیتەک sîtek "بەردەڵان، تمتمان" و ↑چیا *çîya* [کۆنتر:*ستیا*] و Stein (G.) "بەرد". دوو چەمکی "سەخت و پتەوی" دەگەڵ "ئارام بوون، ئۆقرە گرتن" پێوندییان هەیە و هەر بۆیە زۆرێک لەو وشانەی ئەم مانایانە دەبەخشن، بە یەکەوە خزمن. بۆ وێنە *ئۆقرە*، کرِ [کرِ و کپ] خزمە دەگەڵ *قورس* [سەخت، گران، هەر وەها نەجووڵ] و *قەرسان* "بەستن و سفت بوونی تراو" [ئارام بوون و لە جووڵە کەوتنی تراوەکە].

**هێر her** [ *her* ] - "ژووری پیاوان و میوانان": دەشێ لە پێوەندیدا بێ دەگەڵ ↑هیرا hîra "پان و بەرین، هەراو".

**هێر her** [ *her* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑گێر ger "خوار".

**هێرت hrte** [ *hert* ] - لەهێرت واتا "بەهێز، بەتوان". خزمە دەگەڵ ↑خورت xurt.

**هێرس hers** [ *hers* ] - "تووڕە": هێرس بوون واتا تووڕە بوون. هێرز herz ش دەگوترێ. هەروەها هێرسۆک hersok هەیە بە مانای "هەمیشە تووڕە".ٚ وێنەیەکی دیکەیە لە ↑قەڵس qels. حرص ħirs (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

**هێرش1 herış** [ *heriš* ] - "پەلامار": یورش yūreš (P.). دە زمانی فارسیدا هەروەها هرولە harwale (P.) هەیە بە مانای"لۆقاندن، خێرا و بەهەڵتەک هەڵتەک ڕۆیشتن" کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑خێرا xera.

2- ↑غار ġar [غار دان].

3- ↑هەل4 hel "پەلە" [هەلەهەل و پەلەپەل] و ↑*هەرین herîn*.

**هێرش2 herş** ⌈ *herış* ⌉ - "ڕۆندک، فرمێسک": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەرس hers "1- فرمێسک، ڕۆندک".

**هێرک1 herık** ⌈ *herık* ⌉ - "دەشتایی بچووکی ناو چیا": خزمە دەگەڵ ↑ئارا ara "دەشت".

**هێرک2 herık** ⌈ *herık* ⌉ - "گاشەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑خار *xar* "سەخت، پتەو". ناوی ↑هەرکی herkî "هۆزێکی کورد" لەم وشەوە هاتووە. دواجار خزمە دەگەڵ ناوی ↑کورد kurd.

**هێرک2 herık** ⌈ *herık* ⌉ - "ئەسبابی ناو ماڵ": خزمە لەگەڵ ↑هیریە hîrye "هەوجاری لە دار"،↑هەرمە *herme* "شان و پیل، مل"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *ar- >** "تێکخستن، تێکخستنەوە". arma (L.) "دەزگا، چەک وچۆڵ" لەم ڕیشەوە هاتووە.

**هێرفاندن hêrfandın** ⌈ *herfāndın* ⌉ - "وەرگێران، پشت و ڕوو کردن": خزمە لەگەڵ werben (G.)، hwerban (OG.)، hwerofan (OE.)، hverfa (OIs.) "سووڕان، با دران"، هەروەها لەگەڵ Wirbel (G.) "سووڕ، خول، گێژەڵووکە"، werfen (G.) "فڕێ دان، هاویشتن" [لە بنەڕەتدا: هەڵخولاندن]، karpós (Gr.) "مەچەکی دەست" [لە بنەڕەتدا: شوێنی سووڕان، سووڕگە، جمگە]، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *uer-, *wer- >** "سووڕان، با دران". بەم شێوەیە دەبێتە خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی وەک ↑وڕ wır "سەر سوڕماو".

**هێڕک herk** ⌈ *herk* ⌉ - "وڕگ":

1- لەوانەیە پێوەندی بە↑ هیرە hîre و ↑هورد *hurd* ەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێنی ورد بوون و هەڵتاوین" لە سکدا بێ.

2- لەوانەشە شێوەیەکی دیکە لە ↑وڕگ wırg بێ.

**هێرنگ hêrıng** ⌈ *herıng* ⌉ - "هێڵەکە": خزمە لەگەڵ ↑ڕنگ rıng "هەنگوین و دۆشاوی پاڵاوتە" و rein (G.)، (h)reini (OG.)، hrainis (Got.)، hrēna (OF.) "پاک، پاڵاوتە، بێگەرد"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *(s)krei- >** "جیا کردنەوە، پاڵاوتن، دابێژتن".

**هێرە1 here** ⌈ *hera* ⌉ - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑ئێرە ere. دە کوردمادی سەروودا بووەتە ↑ڤر vır [لەڤر واتا لێرە].

**هێرە2 here** ⌈ *hera* ⌉ - "خێسە، بە گۆشەی چاو تەماشا کردن": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑خێل xel.

2- یان دەگەڵ ↑گێڕ ger. هەردوو وشە دە بنەڕەتدا مانای "خوار بوون" دەگەیەنن. هێرە کردن یان خێسە کردن واتا نەک لە ڕووبەڕوو و ڕاستەوڕاست بەڵکوو لە لاوە خوارەخوار چاو لێکردن.

**هێرەقە hereqe** ⌈ *heraqa* ⌉ - "باسکی ئاموور": ئێرەقە ereqe ش دەگوترێ. پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑ئاموور amur [ئامێر amer] "دەزگا (بۆ کێڵان)". [فۆتیمەکانی r و m لە وشە کوردمادییەکەدا جێگۆڕکێیان کردووە]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **(IE.) *ar- >** "چوونە ناویەک، تێکبەزین، تێکخران، جووت بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑هەڕستن herıstın "لێک جووت بوون، پێکەوەلکان".

2- لەوانەشە باسکی ئاموور شتێکی قیت و ڕەپ و ڕاست بێ و وشەکە ئاماژە بەم مانایانە بکا. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ erectio (L.) "ڕەپ و ڕاست کردن، قیت وەستاندن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ڕاست rast.

**هێرین1 herîn 1** [ *herīn* ] - "1- حیلاندنی ئەسپ 2- دەنگ بڵند کردنی بزن": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑هەراندن herandın "زەڕاندن".

2- یان شێوەیەکی دیکە لە ↑هیلاندن hîlandın "حیلاندن".

**هێرین2 herîn 2** [ *herīn* ] - "1- کون 2- کون دە دیوار کردن وەک کونەمشک": هەروەها ↑هەرق herq هەیە بە مانای "خەندەق، رەهەند". دەشێ خزم بێ دەگەڵ hol (OE.) "هەڵۆڵ"، hole (E.) "کون و کەلێن"، Höhle "ئەشکەوت"، hohl (G.)، holr (OIs.) "هەڵۆڵ"، sura (Av.) "کون"، [سوراخ sūrāx (P.)] سەر بە ریشەی ***kel-* > (IE.)** "لێهاڵاندن، شاردنەوە". دە زمانی کوردمادیدا دەیان وشە لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑قالۆر qalor، ↑قەڵەم qelem، ↑*هاڵان halan*، ↑هەڵۆڵ helol، ↑کلۆر kılor ، ↑هالقە halqe و هتد.

**هێز hez** [ *hez* ] - "گوڕ، توان، وزە": هێس hes و هەس hes یش دەگوترێن. هەروەها هێزیانەوە hezyan(ewe) هەیە بە مانای "هێز گرتنەوە". وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑وزە wıze و هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*هۆش hoş* و↑ بووژانەوە bujan(ewe) و هتد.

[تێبینی 1: سەبارەت گۆڕانکاری فۆتیمەکانی w و h هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ورچ و هرچ، ورد و هورد، وشک و هیشک و هتد. تێبینی 2: وشەی "داهێزان" پێوەندی بەم "هێز"ەوە نییە].

**هێزۆک hezok** [ *hezok* ] - "جۆلانەی گوریس": خزمە لەگەڵ ↑هەژان hejan. هەروەها هێزۆکانێ hezokane هەیە بە مانای "جۆلانە کردن".

**هێزیانەوە hezyan(ewe)** [ *hezyān(awa)* ] - "هێز گرتنەوە، تین و گوڕ هاتنەوە بەر": دەچێتەوە سەر ↑هێز hez "وزە".

**هێژان1 hejan 1** [ *hežān* ] - "نرخ هەبوون، نرخ هێنان": هەژین hejîn یش دەگوترێ. هەروەها ↑هێژا heja هەیە بە مانای "بەنرخ، بەرێز". دە بنەڕەتدا هەرژین herjîn بووە و فۆتیمی r سواوەتەوە. خزمە دەگەڵ ارزیدن arzīdan (P.) "هێژان"، ارج arj (P.) "رێز، نرخ"، ارزش arzeš (P.) "بایەخ"، ارز arz (P.) "دراوی قورس". خزمە دەگەڵ arghá- (OIn.) "نرخ"، árjati (OIn.) "دەهەرژێ"، alga (Lit.) "داهات"، سەر بە ریشەی ***algh-* > (IE.)** "نرخ هەبوون، هێژا بوون".

[بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 76].

**هێژان2 hejan 2** [ *hežān* ] - "1- هەژان، راژان 2- دنە، هانە": هەروەها هێژاندن هەیە بە مانای "دنە دان، هان دان" [لە بنەڕەتدا: هەژاندن، وە جووڵەخستن"]. شێوەیەکی دیکە لە ↑هەژان hejan. خزمە دەگەڵ ↑هێزۆک hezok "جۆلانەی گوریس".

**هێساندن hesandın** [ *hesāndın* ] - "(کار) هاسان کردن": دەچێتەوە سەر ↑هاسان hasan یان ئاسان asan.

**هێستک hêstık** [ *hestık* ] - شێوەی کۆنتری ↑ئێسک êşık. هەروەها بڕوانە ↑*هەستوو hestu*.

**هێسل hêsıl** [ *hesıl* ] - "گوشینگە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑سەلە sele.

**هێش1 hêş 1** [ *heš* ] - ↑ئێش êş.

**هێش2 hêş 2** [ *heš* ] - "هەوجار، ئاموور": خیش xīš (P.). خزمە دەگەڵ ↑هێچک heçk.

**هێش3 hêş** [ *heš* ] - "قەراخ ئاو": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ↑هەتا1 het "کن، نک، جەم".

**هێشتا hêşta** [ *heštā* ] - "تا نها، تا ئێستا": [دە رستەی نەرێنی و پرسیاریدا بەکار دێ: هێشتا نەهاتووە. هێشتا نەهاتووە؟]. هێژ hej یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هێشتن hêştın.

**هێشتن hêştın** *[ heštın ]* - ”لێگەران، رێگەدان“: ↑ئاستن astın یش دەگوترێ [ده بنەڕەتدا: پێشگری ئا a + ستن sıten]. ده زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑*داهێشتن dahêştın* هەیە بە مانای ”شۆر کردنەوە، راهێڵ کردن“ [فروهشتن forūheštan (P.)]. وەك لەژێر وشەی ”داهێشتن“دا روون کراوەتەوە، ده زمانە ژێرمەنییەکاندا چەمکی ”شل بوونەوە، سست بوون، *داهێزران*“ دەگەڵ چەمکی ”هێشتن“ پێوەندیان هەیە. ده زمانی کوردمادیشدا پێوەندییەکی لەم چەشنە لە ئارا دایە. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خستن xıstın ”بەر دانەوە“ و ↑خستە xeste ”ماندوو، نەخۆش، داهێزراو“ [دەبنەڕەتدا: داکەوتوو، بەلاداهاتوو] و لەوانەشە ↑*هەت¹ het ¹* ”کن، نك، جەم“، سەر بە ریشەیەك بە مانای ”هاویشتن، فڕێ دان، بەر دانەوە، وەشاندن، پێوەر کردن“. جێی ئاماژەیە کە کرداری ”پێوەر کردن“ خزمە دەگەڵ کرداری ”بەر دان(ەوە)“.

[تێبینی 1: ده زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا چەمکەکانی ”شل، شۆڕ، داهێزراو، هێواش“ دەگەڵ چەمکی ”خستن“ واتا ”بەر دانەوە“ و ئەمەشیان دەگەڵ چەمکی ”رەها کردن“ واتا ”بەر دان“ پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان هەیە. ده زمانی ئەڵمانیدا ”بەر دان“ دەبێتە loslassen (G.). کەرتی ئەسڵی وشەکە، واتا lassen خۆی بە مانای ”هێشتن، هێڵان“ە. هەروەها laß، lasch (G.) ”لۆژ“، late (E.) ”درەنگ“ [دەبنەڕەتدا: هێواش، بە ئەسپایی]، lat (Sw.) ”تەپ، تەوەزەل“، lassus (L.) ”ماندوو، داهێزاو“ (سەر بە ریشەی **lē(i)-d-* *(IE.)* ”شل بوون، داهێزان، سست بوون، هێڵان) پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە پەیدا دەکەن. ئەم وشانە ژێرمەنییانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردی وەك لۆژ loj ”تەمبەڵ، تخێڵ، داهێزاو، بەلاداهاتوو“، لش laš (P.) [تنەلش tanelaš (P.) واتا تەمبەڵ و داهێزاو]، لۆژان lojan ”راکشان، تخێڵ بوون“ و هیڵان helan. نموونەیەکی دیکە سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانە: ده زمانی فارسیدا ”بەر دان“ دەبێتە ول کردن vel kardan (P.). ول vel ده فارسیدا خوی بە مانای ”رەها، بەرهەڵدا“ بەکار دێ و ّ خزمە دەگەڵ فل fıl ی کوردمادی (فل بوون واتا شل بوونەوە، ماندوو بوون، داهێزران). تێکڕای ئەم باسە دەیسەلمێنێ کە ده زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا لەنێوان چەمکەکانی ”شل بوون، شۆر بوونەوە، سست بوون، داهێزران، خستن، بەر دانەوە، خەستە، (ماندوو)، رەها (بەردراو)، بەر دان و هێشتن“دا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیك لە ئارا دایە. تێبینی 2: ئەم پێوەندییانەی سەرەوە هەروەها نیشان دەدەن کە وشەی اهستە āheste (P.) ”هێواش“ [ده بنەڕەتدا: داکەوتوو، *داهێزراو*] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. تێبینی 3: سەبارەت بە پێوەندی دوو وشەی ↑هێشتا hêşta (هێژ hej) و↑هێشتن hêştın بڕوانە روون کردنەوەیەك کە لەژێر وشەی *هەت1* ”کن، نك، جەم“دا هاتووە. تێبینی 3: ده ”فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی“دا (ل. 63) سەبارەت بە ریشەی وشەی ”اهستە“ دوو شیمانە باس کراوە، یەکەمیان پێوەندی دەگەڵ āsatta- (OIn.) ”نیزیك بوونەوە، گەیشتن“ سەر بە ریشەی *had-* ”دانیشتن“ و دووەمیشیان پێوەندی دەگەڵ sas- (sásti) (OIn.) ”خەوتن، بێ جووڵە بوون“. بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی لە سەرەوە باس کران، ئەو دوو شیمانەیە رێیان تێ ناچێ].

**هێشوو hêşû** *[ hešū ]* - ”دەنکی زۆری پێکەوەنووساو“: هشی hışî، هێشی hêşî و وشی wışî یش دەگوترێن. خوشە xūše (P.). خزمە دەگەڵ ↑گیشە gîşe [گیشە گیا] و ↑گاشە gaşe [گاشە بەرد] و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە ”زۆری، پڕانی، پێکەوەیی“ دەکەن.

**هێشی1 hêşî 1** *[ hešî ]* - ”گوڵینگەی شۆڕەوەبووك لە چادر“: هیشی hîşî ش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑هێشتن hêştın. لە زمانی فارسیدا فروهێشتن frūheštan (P.) مانای ”شۆڕ کردنەوە“ دەبەخشێ.

**هێشی 2 hêşî** [ *heši* ] - "کرێوه، باکوت": دەشێ پێوەندی هەیە بە ↑هۆز hoz [باهۆز bahoz].

**هێشی 3 hêşî** [ *heši* ] - "گوریس و کەندری ئەستوور": ↑حیشی ĥîşî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هەژگ 3 hejg "رەشکە، تۆڕی کا کێشان".

**هێف hef** [ *hef* ] - "تەماشا، مێزە": هێڤ hev یش دەگوترێ. هێف کرن hêf kırın واتا "روانین، تەماشا کردن". دەشێ خزم بێ لەگەڵ schauen (G.)، scouwōn (OG.)، schouwen (Nl.) "چاو لێکردن، روانین"، show (E.) سەر بە ریشەی < *(s)keu- (IE.)* "چاوەدێری کردن، سەرنج دان".

**هێڤاستن hevastın** [ *hevāstın* ] - "چنینەوەی بە تەقەڵ": هێڤاشتن hevaştın و هێڤاختن hevaxtın ش دەگوترێن. بڕوانە ↑هڤێز hıvez "چنینەوەی بەتەقەڵ کە دیاری ناکا".

**هێفەل hefel** [ *hefal* ] - "1- کەفەڵ، سمت، لاڕان": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەفەڵ kefel.

**هێڤر hêvır** [ *hevır* ] - "نشیمەن، جێگەی لێ ژیان": هەروەها هێڤراندن hevrandın یان هێوراندن hêwrandın هەیە بە مانای "پەنا دان" و هیور hêwır بە مانای "پەناگا، ئەنوا، جێگە". بڕوانە ↑*هێورین2 hewrîn 2* "پەنا گرتن، حاوانەوە".

**هێڤڕ hêvır** [ *hevır* ] - "هاڕین، ورد کردن": هەروەها هێڤڕان hevran بە مانای "باراش، زمهەر" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ↑ کەڤر kevır "بەرد"، ↑کەمرە kemre و ↑حەمرین *ĥemrîn* و چەندین وشەی دیکە بە مانای "سەخت، رەق، بەردین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(a)kamen- (IE.)* "بەرد". وشەی ↑ئاش aş یش هەر لەم ریشەوە هاتووە و دە بنەڕەتدا مەبەست "بەرداش"ی ئەمرۆ بووە. هەروەها هەسان hesan "بەردی تیژکەرەوە" لەم ریشەوە هاتووە. مەبەست لە "هێڤر" کردن لە بنەڕەتدا کوتان و ورد کردن بە بەرد [بەرداش] بووە.

**هێڤشاندن hêvşandın** [ *hevšāndın* ] - "کۆتایی کردن": دەشێ وشەکە لە ئەسڵدا "هەڤشاندن" بێ [پێشگری هە he + ڤشاندن vışandn]. کردارەکە دەشێ خزم بێ لەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە ماناکانی"لاواز بوون"، "خۆ دەرباز کردن (لەژێر گوشار)"، "خۆ دزینەوە"، "جێ خاڵی دان" دەکەن، وەک وشەی vijáte (OIn.) "فلەتین، هەڵاتن"، ↑*فیزماڵک fîzmalk* "بە دزی بۆی دەرچوون"، ↑ویسک wîsk "لەر و لاواز"، weich (G.) "نەرم" و weichen (G.) "بۆی دەرچوون، خۆ لادان، خۆ کێشانەوە"، سەر ریشەی < **uei- (IE.)* "چەمان، سووڕان، با دران".

**هێڤشین hêvşîn** [ *hevšīn* ] - "بەسەر چوون (ی کاتی بێستان و تەڕەکاری)": هێوشین hêwşîn یش دەگوترێ. هەروەها هێڤشهان hêvışhan دەگوترێ بە مانای "دەم بەسەر چوون". خزمە لەگەڵ ↑*هێڤشاندن hêvşandın*. ئەم وشانەی لە سەرەوە باس کران، مانای "دەرباز بوون" دەگرنە خۆ کە ئەمە لێرەشدا بەرچاو دەکەوێ. جگە لەمە هێندێک وشەی دیکە پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، کە مانای "گۆڕان، دەرباز بوون لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە" دەبەخشن، وەک Wechsel (G.) "گۆڕان" و Woche (G.) "هەفتە" و ↑وەگ weg "چاخ، هەڕەت".

**هێڤک hêvık** [ *hevık* ] - "پینەی کونی چەرم و پێستە بە دارۆکە": خزمە لەگەڵ ↑هڤێز hıvez "چنینەوەی بەتەقەڵ کە دیاری ناکا".

**هێق heq** [ *heq* ] - "پەنگ خواردنی ئاو": هەوق hewq یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ hoch (G.)، hauhs (Gt.)، high (E.)، hög (Sw.) "بەرز، بڵیند". هێق خواردن یان هێق دانەوەی ئاو دەبێتە بەرز بوونی ئاستی ئاو بەهۆی بەر لێ گیرانی. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی < **keu- (IE.)* "چەمانەوە". [پێوەندی دوو چەمکی "چەمانەوە" و "بەرزی" دەتوانین لە

هێندێک شتی وەک "تەپۆڵک" و "گومبەز"دا بەدی بکەین]. ئەم ریشەیە دە زمانی کوردمادیدا گەلێک لق و پۆی لێ دەبێتەوە، وەک ↑قۆز qoz، ↑قوت qut، ↑حووج و ĥûc هتد.

**هێک hek** [ *hek* ] - ↑هێلکە helke ش دەگوترێ.

**هێگا hega** [ *hegā* ] - "کێڵگە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هۆکان hogan "خەتی جووت" و ↑خاک xak و ↑هۆخ hox "هەردی تەواو کێڵدراو"، ↑هێش hêş، ↑خیش (xīš) "هەوجاڕ، ئامرازی کێڵان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "شتی نووک تیژ و قولاپ ئاسا" کە بۆ کێڵان و کار و باری دیکە بەکار هاتووە. دە زمانی ئەڵمانیدا ئەم وشانەی خوارەوە دەگەڵ وشە کوردییەکان خزمن: Hake (G.) "قولاپ، چەنگەک"، Hacke (G.) "چەنگەک، ئامرازێک بۆ شێوەرد کردن"، hacken (G.) "بە شتیکی تیژ ورد کردن، نەرم کردن، کوتانەوە"، Hackfleisch (G.) "گۆشتی قیمە، وردکراو". لەوانەیە وشەوی ↑خاش xaş [ورد و خاش] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. هەروەها ↑هیچک heçk "قوڵفەدار" [داری قولاپ ئاسا] خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە.

**هێل hel** [ *hel* ] - "1- خوار، چەوێل 2- جەغز 3- دەوروبەر": دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "خواری، کەوانی" بووبێ و خزمە دەگەڵ ↑خێل xel و ↑شەل şel و چەند وشەیەکی دیکە. لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ وشەی "کەوشەن".

**هێڵ1 hel** [ *hel* ] - "خەتی جووت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کێڵان kelan. هەروەها هەڵیسەنگێنە دەگەڵ خلیدن xalīdan (P.) "تێراچوون، بریندار کردن".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی"کێڵان" و "بریندار کردن" سەرنجی دوو وشەی "شخم" و "زەخم" دە زمانی فارسیدا بدە، دە زمانی کوردمادیدا: "شۆم، شێو" و "زام"].

**هێڵ2 hel** [ *hel* ] - "هەڕەت، جەنگە": خزمە دەگەڵ ↑هەڕەت heret.

**هێڵان helan** [ *helān* ] - "هێشتن": وەک لە چەند شوێنی دیکەش ئاماژە کراوە، هێندێک کردار لە زمانی کوردمادی و فارسیدا، رەگی کردارەکەیان لە کاتی رابردوو و ئێستادا بۆ دوو ریشەی جیاواز دەگەڕێتەوە، واتا کۆنتر دوو چاوگ لەئارادا بوون کە هێندێکیان تا ئێستاش لە ئارادا ماونەوە. ئەم چاوگانە کۆنتر بەشێوەی سەربەخۆ و رەنگە هاومانا یان بە مانایەکی نیزیک لەیەکتر بەکار هاتوون. دواتر گۆڕانێک هاتووەتە ئاراوە و مەودای بەکار هاتنی چاوگەکان بەرتەسک بۆتەوە. بۆ وێنە لە زمانی کوردمادیدا چاوگی "هێشتن" بۆ کاتی رابردوو بەکار دەهێنرێ [هێشتم، هێشتت، هێشتی...] و چاوگی "هێڵان" بۆ کاتی ئێستا [دەهێڵم، دەهێڵی، دەهێڵێ...] یان "ماشتم" سەر بە چاوگی "ماشتن" و "دەماڵم" سەر بە چاوگی "ماڵین"، هەروەها "گوتم" سەر بە چاوگی "گوتن" و "دەبێژم" سەر بە چاوگی "بێژتن" و هتد. وشەی "هێڵان" لە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە پاشگری هە he + ڵان lan [هەڵان helan]. لە فەرهەنگی فارسیدا هلیدن halīdan (P.) وەک "هشتن" مانا کراوەتەوە، واتا ئەم دوو وشەیە لە زمانی فارسیدا هەروەک "هێڵان" و "هێشتن"ی کوردمادین و مانای ئەوانیش دەبەخشن. تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە فۆتیمی e بووەتە e. نها دەبێ بەشوێن بنجی ڵان lan دا بگەڕێین کە مانای ئەسڵی وشەکە لە خۆ دەگرێ. ئەم بنجە خزمە لەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: lassen (G.)، lazzan (OG.)، let (E.)، lata (Sw.) "هێڵان، هێشتن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *lē(i)-d-*** "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزان، سست بوون، هێڵان". لە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشەی پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێڵ، داهێزاو، بەلاداهاتوو"، ↑لوچان luçan [دالوچان daluçan یان داڵۆزان dalozan] بە مانای "شۆڕ بوونەوە، داکەوتن" و هتد. بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە چەمکی "هێشتن، هێڵان" لە بنەڕەتدا پێوەندی بە چەمکی "شل، شۆڕ،

سست، داکەوتوو"ەوە هەیە. ڕەنگە ئەم پێوەندییە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لە دۆخی "نەهێشتن"دا جۆرێک "هێز و توندی و سفتی" دەور دەگێڕێ و بە پێچەوانەوە "هێشتن" بریتییە لە "شل کردنەوە" و بەرهەڵدا کردن. هەر لەم پێوەندییەدا پێویستە ئاماژە بە وشەی ↑ڕاهێڵ rahel [ڕایەڵ rayel] یش بکرێ کە بریتییە لە "ڕیزەداوی تەون" کە هێشتا لە دۆخی شل و شۆڕی دایە، نەتەنراوە و سفت و سۆڵ نەکراوە.

**هێلانە helane** [ *helāna* ] - "ماڵی پەلەوەر": هێلین helîn یش دەگوترێ. ئەم وشەیە لەوە ناچێ کە لە دوو کەرتی "هێ" [هێلکە، هێک] و"لانە" پێکهاتبێ، چونکوو لانەی پەلەوەر مەرج نییە هێلکەی تێدا دابێ و بە بێ هێڵکە و هێلکەدانانیش هەر پێی دەگوترێ "هێلانە". ئەوجار "لانەی هێلکە" چەمکێکی پڕمانا نییە، چونکوو شوێنەکە پێش هەر شتێک لانەی خودی پەلەوەرەکەیە، نەک هێلکەکەی! وشەکە شێوەیەکی کۆنترە لە ↑لانە lane، دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "پاڵگە، جێخەو، شوێنی هەسانەوە"، سەر بە ڕیشەی **< -*klei* (IE.)** "خوار بوونەوە، کل بوونەوە، پاڵ دانەوە". وشەی ↑هێلانەک helanek "جۆلانە" دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ "هێلانە" و ئەم بۆچوونەی سەرەوە پشتراست دەکا. ئەم وشەی دوایی ناتوانێ پێوەندی بە "هێلکە"ەوە هەبێ! وشەی ↑لانکە lanke ش چ وەک شوێنی هەسانەوە و جێخەو، یان چ وەک شتێک کە بەم لا و ئەو لادا خوار دەبێتەوە [کل دەبێتەوە]، پێوەندی بەو ڕیشەی سەرەوە پەیدا دەکا.

**هێلانەک helanek** [ *helānak* ] - "جۆلانە": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑لانکە lanke.

**هێلکال helkal** [ *helkāl* ] - "مەنجەنیق": مەنجەنیق دەزگایەک بووە کە لە شەڕەکانی کەوناراداا بەرد و ئاگریان پێ هاویشتووەتە ناو قەڵای دوژمن. کارکردی ئەم دەزگایە بەم شێوەیە بووە کە خراوەتە دۆخێکی گرژبوونەوە و لەپڕ بەردراوە یان چرکێنراوە و ئەویش بە بزاڤ و تەوژمێکی زۆر خێرا بەرد یان ئاگرەکەی فڕێ داوە، وەک قۆچەقانییەکی مەزن. وشەکە دەشێ پێوەندی بە چەندین وشەوە هەبێ کە ئاماژە بە "بزوان، بزوانی توند" دەکەن وەک ↑هێلکان helkan "ڕاژان (لە جۆلانەدا)"، ↑هەلای helay "سەما" و ↑هەلەکا heleka "جەزمە، سەمای دەرزوێشان". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑چڵەکین *çılekîn* و ↑چرکە çırke و ↑چرکاندن çırkandın و هتد.

**هێلکان helkan** [ *helkān* ] - "ڕاژان (لە جۆلانەدا)": خزمە لەگەڵ ↑هەلای helay "سەما" و ↑هەلەکا heleka "جەزمە، سەمای دەروێشان". ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "بزوان و جووڵان" دەکەن.

**هێلکە helke** [ *helka* ] - "هێک": هێ he + لکە lke [پاشگر]. ↑هێک hek و هاک hag و هاگ hag ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ خایە xāye (P.) "هێلکە"(ی گون)، Ei (G.)، egg (ONor.)، ägg (Sw.)، aeg (OE.)، egg (E.)، ōion (Gr.)، ovum (L.) "هێک"، سەر بە ڕیشەی **< -*ō(u)i** (IE.)** "هێک". ئەم ڕیشەیە پێوەند دەدرێتەوە بە ڕیشەی **< -*awei** (IE.)** "مەل، پەلەوەر". [ئەم ڕیشەیە هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑هەوێردە hewerde].

**هێلم helm** [ *helm* ] - "غەرە، چرێشی دارتاشان": خزمە دەگەڵ kleben (G.)، klīban (OG.)، clifan (OE.)، klīfa (OIs.) "چەسپاندن، پێوەنووساندن"، سەر بە ڕیشەی **< -*glei* (IE.)** "چەسپاندن، تیهەڵسوون". خودی ئەم ڕیشەیە لە ڕیشەیەکی کۆنترەوە هاتووە و دەچێتەوە سەر **< -*gel* (IE.)** "پێکەوەنووسان، گلوو بوون، تۆپەڵە بوون". گەلێک وشە دە زمانی کوردمادیدا دەچنەوە سەر ئەم ڕیشانە، وەک ↑گڵ gıl، ↑گلوو gılu، ↑گڵۆفین gılofîn [هەڵگڵۆفین]، ↑غەرە ġere "چرێشی دارتاشان" و ↑هەری herî "قوڕ".

**هێلمە helme** ‌[ *helma* ] - "پۆ، فرێت": لەوانەیە پێوەندی بە ↑رایەڵ rayel [راهێڵ ra-hel]ەوە هەبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑*هێڵان helan*.

**هێڵنج hêlınc** [ *helınj* ] - "دۆخی بەر لە رشانەوە، حۆق": ↑هەڵنج helınc شێوەی پێشووتری وشەکەیە. دەچێتەوە سەر ↑هەلاندن helandın "بلیند کردن، بەرز کردنەوە". وشەکە ئاماژە بە دۆخی رشانەوە دەکا کە بریتییە لە بەرز بوونی ناوەرۆکی گەدە بۆ هەڵرژانی.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "بالا اوردن" لە زمانی فارسیدا، هەروەها دەگەڵ "حۆق" لە زمانی کوردمادیدا].

**هێلوون helun** [ *helūn* ] - "کالان": خزمە دەگەڵ ↑کالان kalan. هەروەها دەگەڵ Hülle (G.) "بەرگ" [بەرگی شت تێدا تاقەت کردن].

**هێلۆق heloq** [ *heloq* ] - "لوولەمیزی پیاو": هالۆق haloq یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑قەڵەم qelem [لەبنەڕەتدا: قامیش، قەڵەم قامیش]، ↑قالۆر qalor، ↑قالوون qalon"سەبیلەی درێژ"، ↑قالک qalık "قالب، تۆیکڵ، قوتوو" و هتد. ئەم وشانە ئاماژە بە شتی لاسک ئاسا دەکەن و دواجار خزمن ↑کلۆر kılor "بۆش، ناوبەتاڵ" و ↑*هاڵان halan* [لێهاڵان]. هەروەها خزمیشە لەگەڵ ↑هێلوون helun و ↑کالان kalan.

**هێل(ە) hel(e)** [ *hel(a)* ] - "راوی باڵدار و ماسی": [چوونە هێلا کەوا واتا چوونە راوی کەوان]. خزمە دەگەڵ kill (E.) "کوشتن"، cwellan (OE.) "لێدان، کوشتن"، cwalu (OE.) "مەرگ"، cwelan (OE.) "مردن"، quelan (OG.) "ئازار کێشان"، quellan (OG.)، quälen (G.)، quell (E.)، kvälja (Sw.) "شکەنجە دان" و gélti (Lit.) "تێراکردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *g(u)el-* (IE.) "تێرا کردن". لە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑هێلەک helek "جۆرێک تەڵە" هەیە کە وێ دەچێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

**هێڵە hele** [ *hela* ] - "ئامرازی سواڵەت ساف کردن": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هێڵەک helek "سواپ، بەردی پان و لووس".

**هێلەک helek** [ *helak* ] - "جۆرێک تەڵە": خزمە دەگەڵ ↑هێل(ە) hel(e) "راوی باڵدار و ماسی".

**هێڵەک helek** [ *helak* ] - "سواپ، بەردی پان و لووس": خزمە دەگەڵ ↑حولی ħulî "داردەستی لووس"، ↑هەلووک heluk [داری هەلووکین] و دواجار دەگەڵ ↑خلیسکان xılîskan.

**هێلەکان helekan** [ *helakān* ] - "بادەوەی گەمێ": یەلکەن yelken یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑هێلکان helkan "راژان، بزوان".

2- ↑هێڵان helan، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داکەوتن، شل و شۆڕ بوون(ەوە)، بەر بوونەوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑یێلکە yelke "جلیقە".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "پەڕۆ" و "شل و شۆڕ بوون" جێی ئاماژەیە کە وشەی Lappen (G.) "پەڕو" دە زمانی ئەڵمانیدا دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "شل و شۆڕ بوون، بەر بوونەوە" و خزمە دەگەڵ lobos (Gr.) "نەرمەی گوێ" و هەروەها دەگەڵ "لێو" دە زمانی کوردمادیدا].

**هێڵەگ heleg** [ *helag* ] - "پاڵوێنە، بێژینگ": الک alak (P.). لەم بارەوە دوو شیمانە دەخرێتە روو:

1- دەتوانێ پێک هاتبێ لە پیشگری ئە + لەگ [لەک lek] e + leg. پێشگری ئە e یان ئا a دەکەوێتە پێش ژمارەیەکی بەرچاو لە وشەکان دە زمانی کوردمادی و فارسیدا و دە زمانی

کوردمادیدا هێندێک جار دەبێتە هە he و ها ha [بۆ وێنە: ستاندن، ئەستاندن، هەستاندن].
کەرتی ئەسڵی وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی < *leg- (IE.) "دەڵان، دڵۆپان". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە لیک lîk "ئاوی دەم". شتێک کە ئەم بۆچوونەی سەرەوە پشتراست دەکا، وشەیەکی دیکەی زمانی کوردمادییە، واتا ↑لەهەز lehez "هێڵەکێ". ئەم وشەیە دەشێ دەگەڵ "هێڵەکێ" دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بووبن.
[تێبینی: لەم تێڕوانینەوە هێڵەکێ دە بنەڕەتدا تەنراوێک بووە بۆ دڵۆپاندن، وەک سەلە sele ی کوردمادی یان Sieb (G.) "پاڵوێنە" دە زمانی ئەڵمانیدا کە هەردووکیان دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی مانای "دڵۆپاندن، چۆڕاندن" دەبەخشن].
2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑هێرنگ hêrıng "هێڵەکێ".
**هێم1 hem 1** [ *hem* ] - "بناخە": پێوەندی بە ↑هیم hîmەوە هەیە بە مانای "بەردی زل" و سەرەتا مەبەست "بەردی بناخە" بووە.
**هێم2 hem 2** [ *hem* ] - "لا، نک، کن، ئاڵێ": شێوەیەکی دیکە لە ↑جەم¹ cem [لە جەم تە].
**هێما hema** [ *hemā* ] - "1- ئیشارە 2- نیشانە، عەلامەت": پێوەندی هەیە بە ↑ئاماژە amajeەوە، واتا کورتکراوی ئەم وشەیە. چووەتە ناو زمانی عەرەبێ و بووەتە ایما īmā (Arb.).
**هێمان heman** [ *hemān* ] - "ماک، ماددە": دەچێتەوە سەر ↑هێم1 hem "بناخە" و مەبەست "ئەسڵ و بنەڕەت"ە.
**هێمج hêmıc** [ *hemıj* ] - "بەرکێ و قوماش (ی دارزاو)": خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑جامە came دا باس کراون.
**هێمن hemın** [ *hemın* ] - "ئارام ، بێ قرە و کێشە":
1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ناوی ژنانەی ↑هەمین hemîn "نەرم و نیان، لەسەرەخۆ".
2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە بچێتەوە سەر امن amn (Arb.) "هێمنایەتی، ئاسایش، پارێزراوی". دە زمانی کوردمادیدا ئەمن amn بەکار دێ [ئەمن و ئاسایش]. دە زمانی عەرەبیدا چەندین وشە و لەوانە امنیة amînya (Arb.) پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشە عەرەبییانە دەچنەوە سەر immunis (L.) "ئازاد، دەست لێنەدراو، ئازاد لە باج و خەراج، ئازاد لە ئەرکی شەڕ، *پارێزراو*".
**هێمە heme** [ *hema* ] - "تیکەداری هەڵپەرتاوتە، تێزینگێ": خزمە لەگەڵ ↑قەمە qeme و ↑قیمە qîme و چەند وشەیەکی دیکە.
**هێمی hemî** [ *hemī* ] - "قوماشی زۆر ناسکی بەرگەنەگر": خزمە لەگەڵ ↑هێمج hêmıc "بەرکێ و قوماش (ی دارزاو)" و ↑جامە *came* دا باس کراون.
**هێنجان hencan** [ *henjan* ] - لەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ [↑هەڵهێنجان helhencan "ئاو لە چاڵاو دەر هێنان بە سەتڵ"]. هنجیدن hanjīdan (P.) لە فەرهەنگی فارسیدا بەم شێوەیە مانا کراوەتەوە: دەرکێشان(ەوە)، هەڵکێشان، دەرهێنان، درێژ کردنەوە". ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ لەگەڵ hängen (G.)، hengen (OG.)، hang (E.)، hangian (OE.) "(پێوە) هەڵواسران، پێوە قایم بوون، پێوە گیر بوون". ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑هەنگڵ hangıl "دەسک، شوێنی دەست لێ گیر کردن". سەبارەت بە مانای "هێنجان، هەڵهێنجان" لە زمانی کوردمادی و "هنجیدن" لە فارسیدا دەشێ ماناکە گۆڕانی بەسەر داهاتبێ. لە بنەڕەتدا ئاویان لە چاڵاو هەڵنەهێنجاوە، بەڵکوو "سەتڵی ئاویان" لە چاڵاو هەڵهێنجاوە و ئەمەش بەم مانایە بووە کە سەتڵەکەیان لە ئاوی

چاڵاوەکە گیر داوە. ئەوانەی بە سەتڵ ئاویان لە چاڵاو هەڵهێنجاوە، لەبیریانە کە جاری وابوو دەبایە چەندین جار بێنەوبەرە بە تەنافەکە بکەی تا بتوانی سەتڵەکە لە ئاوەکە گیری بدەی و پڕی بکەی. کەوابوو "هەڵهێنجان" دەبێ گیردانی سەتڵەکە بووبێ و پاشان لەمەوە مانای "دەرکێشان، دەرهێنان"ی سەتڵەکە پەیدا بووە.

**هێندێک** **hend(ek)** [ *hend(ek)* ] - "بڕێک، چەند دانە": اندک andak (P.). هەندێک hendek یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑چەند çend. وشەی ↑ئەندازە endaze لەم وشەیەوە هاتووە و دە زمانی عەرەبیدا وشەکانی هندسة handasa (Arb.) و مهندس muhandis (Arb.) لە وشەی "ئەندازە" وەرگیراون.

**هێورین1** **hewrîn 1** [ *hewrīn* ] - "ئارام بوونەوە، ئارام گرتن": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ئەو وشانەی لەژێر ↑هێورین2 hewrîn 2 [خاڵی 2] دا باس کراون.

2- ↑هێڤر hêvır "هاڕین، ورد کردن" [بەرد لێدان]، ↑کەڤر kevır "بەرد"، ↑حەمرین ħemrîn "ناوی چیا" [سەخت، بەردین] و ↑قەمرین qemrîn "بەستن، رەق بوون، سەخت بوون". لەم خێزانەوشەیەدا ژمارەیەک لە وشەکان ئاماژە بە "سەخت و پتەو بوون" دەکەن.

[تێبینی: چەمکی "پتەو، سەخت و بەهێز" دەگەڵ "ئارامی و ئۆقرەیی" لە پێوەندیدایە. مەبەست لە ئارامی و ئۆقرەیی بریتییە لە "لە جووڵە وەستان" و ئەمەش کاتێکە کە شتێک قورس و قایم و توند و پتەو دەبێ. وشەی "پەیت" بوون پێوەندی بە "پتەو" بوونەوە هەیە. "ئۆقرە" پێوەندی بە "قورس"، "قەرسین"، "گیرسانەوە" و "خار"ەوە هەیە، "کپ" پێوەندی بە "سفت" و "سیپان" ەوە هەیە، "هێدی" پێوەندی هەیە بە *زات* "بوێری، ئازایەتی" [دە بنەڕەتدا: هێز، پتەوی]، *سێتە1* "چیا" و *سیتەک* "بەردەڵان، تمتمان" و *هەندرێن* "ناوی چیایەکی سەخت و بەناوبانگی کوردستان" پێوەندی هەیە بە ↑*هەندرین* "ئارام و ئۆقرە گرتن"].

**هێورین2** **hewrîn 2** [ *hewrīn* ] - "پەنا گرتن، حاوانەوە، جێ دەستکەوتن": هێڤر hêvır و هیور hêwır بە مانای "پەناگا، ئەنوا، جێگەی ژیان" و هەروەها هێڤراندن hevrandın/ هێوراندن hêwrandın بە مانای "پەنا دان" بەکار دەهێنرێن.

1- ئەم وشانە لە لایەکەوە دەتوانن خزم بن دەگەڵ Heim (G.) "ماڵ، خانوو"، hīwo (OG.) "خزم، خێزان". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *hīwa(n)* (*Grm.*) "ماڵ". ئەم وشانە و هەروەها civis (L.) "شاروەند" [دە بنەڕەتدا: هاوماڵ] دەچنەوە سەر ریشەی **< *kei-*** ***(IE.)*** "لێ بوون، لە شوێنێک بوون". دەشێ وشەکانی ↑خانوو xanu و ↑حاوانەوە ħawan(ewe) پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ weilen (G.)، wīlen (OG.)، hweilan (Gt.) "وچان دان"، Weile (G.) "پشوو، کاتی هەسانەوە" [دواتر بووەتە: کات، ماوە]، (h)wīla (OG.)، hweila (Gt.)، hvīla (Onor.) "نوێن، جێ خەو". هەروەها vīld (Onor.) بە مانای "خەو"، hwīl (OE.)، hwīle (OF.) بە مانای "ئارامی" بەکارهاتووە. دە زمانی لاتینیدا quietus (L.) "ئارام" لەم خێزانە وشەدا جێ دەگرێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *k(u)ei-*** ***(IE.)*** "هێورین، وچان دان".

[تێبینی: وێ دەچێ هەر دوو ریشەی سەرەوە دە بنەڕەتدا خزم بن].

**هێوەر** **hewer** [ *hrwar* ] - "برای مێرد": خزمە دەگەڵ ↑خەزوور *xezur* "باوکی هاوسەر" و لەوانەشە دەگەڵ ↑هەوێ hewe "ژنی دی

## ی (Y)

**یاپراخ yaprax** ⌊ *yāprāx* ⌋ - "دوڵمه": ئاپراخ aprax یش دەگوترێ. بیستوومه دەڵێن ئەم وشەیە پێوەندی بە وشەیەکی توورکییەوە هەیە کە مانای "گەڵا" دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا دوور نییە ئەم وشە تورکییە لە پەل pel [↑پەلک pelık ] "گەڵا" وەرگیرابێ.

**یاتاخ yatax** ⌊ *yātāx* ⌋ - "نوێن، پێخەف 2- جێ، ماوا": یەتاخ yetax یش دەگوترێ. لەوانەیە مانای یەکەم سەرەتا "نوێن و پێخەفی یەدەک" بووبێ. وشەکە خزمە لەگەڵ ↑یەدەک yedek "کەلوپەلی جێگرەوە". "یەدەک" خۆی دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE.) *sed- >** "(دا)نیشتن" [گۆڕانی فۆتیمی s بۆ y] و خزم بێ لەگەڵ ↑*دانیشتن* ⌊*da-nî-ştın*⌋، sit (E.)، sitzen (G.)، sitan (Gt.)، sitta (Sw.) "(دا)نیشتن". مانای دووەم، واتا "جێ، ماوا" نیزیکە لە وشەکانی "نیشتمان" و "نشیمەن" کە ئەوانیش پێوەندییان بە "دانیشتن"ەوە هەیە. هەروەها ↑ساتان satan [سمت و ساتان، بە فارسی "نشیمنگاه"] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**یاد yad** ⌊ *yād* ⌋ - " بیرەوەری، حافیزە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جێژن cêjın.

**یار yar** ⌊ *yār* ⌋ - "دۆست": لەوانەیە مانای ئەسڵی وشەکە "ئاریکار" بووبێ و خزم بێ دەگەڵ یاری2 yarî [↑ئاری arî] "کۆمەک، دەستگرتن".

[تێبینی: "یار" مانای "دەزگیران" [دەستگیران؟]یش دەدا کە ئەمەش خۆی دەشێ پێوەندی بە "دەست گرتن"ەوە هەبێ. دیارە دەست گرتن لێرەدا دەبێ بە مانای "دەست نانە ناو دەستی یەکتر بێ].

**یارا yara** ⌊ *yārā* ⌋ - "هێز، توان": خزمە لەگەڵ ↑کارین karîn "توانین".

**یارکۆک yarkok** ⌊ *yārkok* ⌋ - "گێزەر": یار yar + کۆک kok. یار yar شێوەیەکی دیکەیە لە زەر zer(d) (د). کۆک² kok مانای "ریشە" دەدا و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "زەردریشە". کەرتی "زەر" لە وشەی "گێزەر"یشدا دەبینرێ.

**یاری1 yarî** ⌊ *yārī* ⌋ - "کایە، گەمە": دەشێ شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑نیاری nıyarî "1- شانۆکاری، کایەکردنی نەخش". بڕوانە ↑نیار nıyar "1- شانۆ 2- شانۆکار".

**یاری2 yarî** ⌊ *yārī* ⌋ - "کۆمەک، دەستگرتن": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاری arî.

**یاریدە yarîde** ⌊ *yārīda* ⌋ - دەچێتەوە سەر↑ئاری arî یان یاری yarî "کۆمەک". وشەکە کورتکراوی یاری دان yarîdan ە، وەک "یاری رسانی" دە زمانی فارسیدا.

**یارمەتی yarmetî** ⌊ *yārmatī* ⌋ - "یاریدە": دەچێتەوە سەر ↑ئاری arî یان یاری yarî "کۆمەک". کەرتی مەتی metî- دەشێ ریشەی عەرەبی هەبێ و پێوەندی هەبێ بە امداد (Arb.).

**یاز1 yaz** ⌊ *yāz* ⌋ - "زیپکەی دم وچاوی ساوا": خزمە دەگەڵ ↑ئازەخ azex "بالۆکە" و ↑ئاژ aj "زبر، نەپۆڕ". دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑ئاژنین ajnîn "کون کون کردن".

**یاز2 yaz** ⌊ *yāz* ⌋ - "بیابان، دەشت": شێوەیەکی دیکە لە ↑هەژ hej "دەشتی وشکارۆ". دواجار خزمە دەگەڵ ↑هیشک hîşık.

**یاز3 yaz** ⌊ *yāz* ⌋ - "نووسراو": خزمە لەگەڵ ↑یاسا yasa "قانوون".

**یازوخ yazux** ⌊ *yāzux* ⌋ - "مخابن، بەداخەوە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑یاز2 yaz "بیابان، دەشت"، ↑هەژ hej "دەشتی وشکارۆ" و دواجار ↑*هیشک hîşık*. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووتان".

**یاس yas** [ *yās* ] - "تاتەبەرد، بەردی پان و لووس": خزمە لەگەڵ ↑ئاش aş و ↑هەسان hesan. گشت ئەم وشانە لە بنەڕەتدا مانای "بەرد" دەبەخشن. لە زمانی فارسیدا اسیاب āsyāb (P.) "ئاش" [اس ās و اب āb "ئاشی ئاو". مانای "ئاش" سەرەتا "بەرد" بووە، دواتر ماناکە گۆڕاوە بۆ "بەرداش" و دواتریش بۆ ئەو شوێنە یان خانوویە کە بەرداشەکەی لێ بووە.

**یاسا yasa** [ *yāsā* ] - "قانوون، داب و دەستوور": لە زمانی تورکی وەرگیراوە، مانای بنەڕەتی وشەکە "نووسراوە"یە.

[تێبینی: وشەکانی "داب" و "دەستوور"یش پێوەندییان بە چەمکی "نووسین"ەوە هەیە، واتا لە بنەڕەتدا مەبەست لە وشەکانی "یاسا"، "داب" و "دەستوور" ئەو نووسراوانە بوون کە دەسەڵات دەری کردوون و کراون بە بنەمای هەڵسوکەوت و کەس بۆی نەبووە لێیان لا بدا].

**یاساخ yasax** [ *yāsāx* ] - "قەدەغە": یاساغ yasaġ یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*قاچاخ qaçax* و لەوانەشە ↑قەدەغە qedexe.

**یافا yafa** [ *yāfā* ] - "قسەی بێسەروبەرە": یاوە yāve (P.). دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑گەپ gep و ↑گەف gef. ئەم وشانە لە بنەڕەتدا مانای "چەنە لێدان" دەبەخشن و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "زار داپچڕین". مەبەست ئەوەیە کە کابرا هەر زار دەکاتەوە و قسەکانی هیچی تێدا نییە، بێ ناوەرۆکە.

**یاگە yage** [ *yāga* ] - "جێگە": شێوەیەکی دیکە لە جێگە cege [بڕوانە ↑جێ ce]. فۆنێمی c گۆڕاوە بە y.

**یاڵ yal** [ *yāl* ] - "مووی سەر ملی ئەسپ ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Harr (G.)، har (OG.)، hēr (OE.)، hair (E.)، haar (Nl.) "موو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ker(s)- <** "زوور، سیخ بوونەوە، قرژ بوون". دەشێ ↑خوری xurî [هری hırî] و ↑قرژ qırıj یش پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ. [قرژ بوونی موو].

**یاڵتەبەق yaltebeq** [ *yāltabaq* ] - "سینی دارین": یاڵ تەبەک yaltebek یش دەگوترێ. یاڵ yal دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑سێڵ sel، ↑*سەل sel* "بەردی پان و تەنک"، ↑سەلین selîn "بەردی سەر گۆڕیچە" [تاتەبەرد، بەردی پان]. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "رووبەر، پان و تەخت بوون" دەکەن. ↑تەبەق tebeq یان تەبەک tebek بە مانای "تەختە(ی شت لەسەر دانان)" بەکار دێ. دە بنەڕەتدا هەردوو وشەکە یەک مانایان هەیە، واتا "تەخت بوون" و هاتنیان لەگەڵ یەک دۆخێ جەخت کردن دروست دەکا.

**یالخ yalıx** [ *yālıx* ] - "پێچی سەری پیاوان، مێزەر":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هاڵان halan [لێهاڵاندن].

2- یان دەگەڵ ↑یەلەک yelek "سوخمەی ژنانە".

**یاڵە yale** [ *yāla* ] - "کەڵەشاخی جۆشکراو بۆ شەراب تێدا خواردنەوە": خزمە لەگەڵ Schale (G.)، scāla (OG.)، schaal (Nl.)، skal (Sw.) "جام (ی تێدا خواردنەوە)". فۆنێمی سەرەتای وشەکە گۆڕاوە بۆ y. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(s)kel- <** "بڕین، داتاشین". "یالە" سەرەتا لە کوتەدار داتاشراوە و بۆیە وەسا ناو نراوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کەللە1 kelle "قاوغی مێشک، کاسەی مێشک".

**یانگە1 yange** [ *yānga* ] - "جێگەی حەسانەوە": دەچێتەوە سەر ↑یانە yane "ماڵ، کلووب".

**یانگە2 yange** [ *yānga* ] - "کێڵگە، مەزرا": یان yan + گە ge. "یان" شێوەیەکی دیکەیە لە کان kan و خزمە لەگەڵ ↑کەندن1 kendın "هەڵکەندن" واتا هەڵکۆڵین و دانەوەی زەوی.

**یانه yane** [ *yāna* ] - "ماڵ، کلووب": شێوەیەکی دیکە لە خانە xane [↑خانوو xanu]. هەروەها یانگە yange ش هەیە بە مانای "جێگەی حەسانەوە".

**یاو yaw** [ *yāw* ] - "تا، تێ، چوونەسەری گەرمای لەش": [یاو و لەرز]. هەروەها یاومز yawmız هەیە بە مانای ↑تیمیسک temîsk. "یاو" هەروەک "تێ" دەشێ پێوەندی بە ریشەیەکەوە هەبێ کە مانای "هایسان، سووتان" دەبەخشێ و هەروەها فۆتیمی سەرەتای وشەکە لە s ەوە گۆڕاوە بە y. لەم بارەوە چەند ریشە سەرنج رادەکێشن کە وێ دەچێ دواجار هەموویان لە ریشەیەکی کۆنترەوە سەرچاوەیان گرتبێ.

1- ریشەی *(IE.) *sauel-, *su-* > "خۆر". وشەی ↑خۆر xor لەم ریشەوە هاتووە.

2- ریشەی *(IE.) *suel-* > "سووتان، هایسان". ↑سووڵان(ەوە) sulan(ewe) "چووزانەوە، کزانەوە" لەم ریشەوە هاتووە.

3- ریشەی *(IE.) *sueid-* > "هایسان، درەوشانەوە".

وێدەچێ شێوەی هەرە کۆنتری ئەم ریشانە *(IE.) *su-* بێ و ئەوانی دیکە لەم ریشەوە پەرەیان گرتبێ.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "خۆر" و "یاو" بە یەکەوە ئاشکرایە. لە زمانی کوردمادیدا "تاو" بە مانای "خۆر" بەکار دێ و هەروەها بە مانای "گەرما"ش. وشەی "تاو" سواوەتەوە و بووەتە "تا، تێ" بە مانای "چوونەسەری گەرمای لەش". هەروەها "تاو" بەم شێوەیەش بەکار دێ: (لەتاو یارەکەی ...). هەر بەم مانایە "سوێ" (سۆ)ش دەگوترێ (لە سوێی یارەکەی...). سۆ so یان سوێ suwe پێوەندی بە "سووتان"ەوە هەیە و دەشێ دواجار پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە پەیدا بکا].

**یاوان yawan** [ *yāwān* ] - "هاتن": خزمە دەگەڵ امدن āmadan (P.) "هاتن" [گۆڕانی فۆتیمی m بە w] و لەوانەشە دەگەڵ ↑هاتن hatın.

**یاونای yawnay** [ *yāwnāy* ] - "ئاگا کردن، خەبەر پێدان": خزمە لەگەڵ erwähnen (G.) "باس کردن"، gi-wahnen (OG.) "گوتن، خەبەردان، بیر خستنەوە"، wōm(a) (OE.) "دەنگە و هەرا" و ōmun (OIs.) "دەنگە و سەدا"، سەر بە ریشەی *(IE.) *uek-* > "قسەکردن، بێژتن". هێندێک وشەی دیکە لەم پێوەندییەدا لەژێر ↑ئەفسانە efsane دا هاتوون.

**یاوە yawe** [ *yāwa* ] - "سەبرۆکە، ئەسپایی": [یاوەیاو yaweyaw واتا سەبرەسەبرە]. لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە خاوە xawe [خاوەخاو xawexaw]، بڕوانە ↑خاو xaw "شل، سست".

[تێبینی: لەباری گۆڕانکاری فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ "خانە" و "یانە"].

**یاوەر yawer** [ *yāwar* ] - "یاریدەر": هەروەها یاوەرە yawere هەیە بە مانای "ئاواڵ منداڵ". بە سەرنج دان بەم مانایەی دوایی دەردەکەوێ کە وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئاواڵ awal [هاواڵ hawal ← ئاواڵ awal ← یاوەر yawer].

**یاهوو yahu** [ *yāhū* ] - "جۆرێک کۆتر": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ avis (L.) "پەلەوەر، مەل". لەوانەیە ↑هەوێردە hewerde خزمایەتی دەگەڵ ئەم وشانە هەبێ.

**یای yay** [ *yāy* ] - "خانم، وشەی رێز بۆ ژن": بڕوانە ↑یایک yayık.

**یایک yayık** [ *yāyık* ] - "1- دایک 2- پوور": دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا زۆرجار ناوی کەسوکار وەک بابە babe، مامە mame، دادە dade، کاکە kake، نەنە nene و هیتر دەگەڕێتەوە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگی گڕ و گاڵی زارۆک. ئەم وشانەی سەرەوە لە دووبارە بوونەوەی دەنگێک دروست کراون کە دەنگی گڕ و گاڵی زارۆکە. هەر بەم جۆرە یایە yaye ناوێکی دیکەیە

کە لە دووبارە بوونەوەی دەنگی ya دروست کراوە. یایە yaye بە شێوەیەکی کورتکراو وەک یای yay بەکار دەهێنرێ، بە مانای "خانم، وشەی بانگ کردنی ژنی بەرێز". لە لایەکی دیکەوە پاشگری خۆشەویستی ık- خراوەتە سەری و وەک یایک yayık بە مانای دایک یان پوور بەکار دەهێندرێ. ئەم پاشگرە دە وشەکانی باوک، دایک، نەنک، میمک و هیتریشدا دەبیندرێ. وشەی یای yay / یایە yaye هەر وەک کاک kak / کاکە kake سەرەتا ناوی کەسوکار بووە و پاشان مانایەکی گشتی وەرگرتووە و وەک رێز لێنان بۆ مرۆڤی بەرێز بەکار هێنراوە [کاکە مەم، یایە زین].

**یورت yurt** [ *yurt* ] -"لەوەڕگە": شێوەیەکی دیکە لە ↑وێرت wert.

**یوژنە yujne** [ *yužna* ] - "قایشی جووت": یۆژنە yojne ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑یێخە yexe دا باس کراون.

**یۆ yo** - یەو yew یش دەگوترێ. شێوەیکی دیکە لە ↑یەک yek.

**یۆرت yort** [ *yort* ] -"قالب، بەدەن": خزمە دەگەڵ Art (.G) "جۆر، نەوع"، art (.OG) "جۆر، چەشن، رەچەڵەک، سروشت، هەستی، خسلەت"، eard (.OE). ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑هەرمە herme.

[تێبینی: لەتێوان دوو چەمکی "قالب" و "چەشن"دا پێوەندی هەیە. وشەی "شێوە" لە زمانی کوردمادیدا هەردوو مانا دەگەیەنێ].

**یۆرغە yorġe** [ *yorġa* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑وێرغە werġe.

**یەخ yex** [ *yax* ] - "سەهۆڵ": یخ yax (.P). خزمە لەگەڵ Eis (.G)، īs (.OG)، ijs (.Nl)، ice (.E)، is (.Sw) "یەخ"، -isu (.Av) "یەخی، بەستەڵەک" و asai (.Afgh) "بەستەڵەک"، سەر بە ریشەی **< -eis* (.IE)** "یەخ".

**یەختە yexte** [ *yaxta* ] - "1- خەسێنراو 2- داری سەرقرتاو": ↑ئێختە exta ش دەگوترێ.

**یەخنی yexnî** [ *yaġnī* ] - "تاسی قووڵ": یەغنی yeġnî ش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە ↑ئاسن asın ەوە هەبێ. لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ "مەسینە" و "مس".

**یەدەک yedek** [ *yadak* ] - "کەلوپەلی جێگرەوە، ئیحتیاتی": یدک yadak (.P). دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< -sed* (.IE)** "(دا)نیشتن" [گۆڕانی فۆتیمی s بۆ y] و خزم بێ لەگەڵ ↑*دانیشتن da-nî-ştın*، sit (.E)، sitzen (.G)، sitan (.Gt)، sitta (.Sw) "(دا)نیشتن". وشەکە ئاماژە دەکا بە ئەوە کە شتێک لە جێگای شتێکی دیکە دادەنیشێ، جێگای ئەو دەگرێتەوە. هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑یاتاخ yatax.

[تێبینی: لە زمانی ئەڵمانیدا Ersatz (.G) "یەدەک، یەدەکی" دەچێتەوە سەر کرداری ersetzen (.G) "گۆڕینەوەی جێگای کەسێک یان شتێک بە یەکی دیکە، دانیشاندن (دانان) لە جێی". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە لەگەڵ وشەکانی سەرەوە].

**یەرەقان yereqan** [ *yaraqān* ] - "نەخۆشی زەردوویی": بنجی وشەکە یەرە -yere یە و شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑زەر(د) zer(d). هەڵی سەنگینە دەگەڵ yellow (.E)، gul (.Sw)، *hári-h* (.OIn)، helvus (.L) "زەرد".

**یەرەقە yereqe** [ *yaraqa* ] - "هەوجاڕ، ئاموور": ئێرەق ereq ش دەگوترێ. بڕوانە ↑هێرەقە hereqe "باسکی ئاموور".

**یەزدان yezdan** [ *yazdān* ] - "خودا": خزمە لەگەڵ ↑جێژن cejın.

**یەزەن yezen** [ *yazan* ] - "زاوا، شووی کچ یان خوشک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خێزان *xezan* [دە بنەڕەتدا بە مانای "جووت، هاوسەر"]. دە زمانی ئەڵمانیدا Gatte (G.) "شوو، پیاوی هاوسەر" و Gaattin (G.) "هاوسەری ژن" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑خات xat و ↑خاتوون xatun لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرن.

**یەغنی yeġnî** [ *yaġnī* ] - "گیشەی گیا یان گەنم و جۆ": خزمە لەگەڵ ↑جوخین coxîn.

**یەک yek** [ *yak* ] - "هەژماری دەسپێک": یێک yek و ئێک ek ش دەگوترێ. یک yek (P.). خزمە دەگەڵ ein (G.)، ains (Gt.)، einn (OE.)، ān (OF.)، unus (L.)، oen (OIr.)، ekā (OIn.) سەر بە ریشەی **(IE.) *i- , *e- <** "ئەمە، ئەوە". وشە ژێرمەنییەکان هەر لەکۆنەوە بوونەتە نیشانە نەناسیاری و ئەم دیاردەیە دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا هەر وایە [دارێک، بەردێک، کەسێک و هتد].

**یەکانە yekane** [ *yakāna* ] - "بەرازی نێر": شێوەیەکی دیکە لە ↑خووگ xug "بەرازی ماڵی" و خزمە لەگەڵ Sau (G.)، su (OE.)، sow (E.)، sugga (Sw.)، syr (OIs.)، hys (Gr.)، sus (L.) "(دێڵە)خووگ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *su-s <** "بەراز(ی ماڵی)".

**یەکجار yekcar** [ *yakjar* ] - یەک yek + جارcar. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "گەلێک زۆر" بەکار دێ: یەکجار جوان، یەکجار سەخت. بەڵام مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە دەبێ هێندێک جیاواز بێ لەم مانایە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی einmalig هەیە کە خۆی لەدوو وشەی ein "یەک" وMal "جار" پێک هاتووە. ئەم وشە ئەڵمانییە بۆ وەسف کردی شتی لەرادەبەدەر یان ئاوارتە بەکار دێ واتا شتێک کە روودانەکەی "یەک جارە" و بێ وێنەیەیە. وێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا هەر ئەو ئاوارتە بوون و بێ وێنە بوونە مەبەست بووبێ و کاتێک گوتراوە "یەکجار جوان"، لە راستیدا مەبەست جوانییەکی بێ وێنە و دەگمەن بووە کە یەک جار روو دەدا و بەس.

**یەل yel** [ *yal* ] - "پاشگری کۆ لە شێوەزاری خوارووودا": [کوردەیل، برایەل]. شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑گەل gel [کوردگەل، براگەل].

**یەلدا yelda** [ *yaldā* ] - "درێژترین شەوی ساڵ": خانمێکی ئاسۆری دۆستمان بۆی روون کردمەوە کە ئەم وشەیە پێوەندی بە چەمکی "ولادت"ی عیساوە هەیە و مانای شەوی "لە دایک بوون" دەگەیەنێ. ئەوەندەی من بیستوومە ئەو شەوە لە چەندین دین و ئاییندا وەک شەوی لە دایک بوونی پێغەمبەرانی ئەو ئایینانە هاتووەتە ئەژماردن. ئەم دیاردەیە دەبێ بیرۆکەیەکی هزری و هەروەها ئەستێرەناسی کۆنی لەپشت بێ.

**یەلەک yelek** [ *yalak* ] - "سوخمەی ژنانە": ئێلەک elek یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە جلیقە cılîqe. دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑شالک şalık "سەرجلی تەنک" و↑ شاڵ şal "1- رانک 2- بوزوو".

**یەمان yeman** [ *yamān* ] - "زۆر بە هێز 2- نەترس 3- زرینگ": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑هێم1 hem "بەردی زل، بەردی بناخە" و ↑هێمان heman "ماک، ماددە" [بناخە، بنەڕەت] ، سەر بە ریشەی **(IE.) *(a)kamen- <** "بەرد". بەگوێرەی بۆچوونێک ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی سەرەوەتری *(IE.) *ak-* " تیژ". لەناو ئەم خێزانە وشەیەدا ژمارەیەک وشە بە مانای "سەخت، رەق، پتەو" بەرچاو دەکەون.

[تێبینی: پێوەندی لەنێوان چەمکەکانی "سەخت، رەق، پتەو" و هەروەها "بەهێز، توانین، زاڵ بوون" ئاشکرایە. بۆ وێنە وشەکانی *خار* "سەخت"، *خورت* "بەهێز" و *کارین* "توانین" لە

ریشەیەکەوە هاتوون. وشەی "سەخت" خزمە لەگەڵ Sieg "زاڵ بوون" لە زمانی ئەڵمانیدا. وشەی هیمنة haymana (Arb.) "دەسەڵات، هێز" لە "هێمان" (یەمان)ی کوردمادی وەرگیراوە].

**یەو1 yew 1** [ *yaw* ] - "جۆ، جەو": شێوەی کۆنتری ↑جۆ co یان جەو cew.

**یەو2 yew 2** [ *yaw* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑یەک yek. لە چەند وشەیەکدا دەبیندرێ، وەک یەوێن yewen "تەنیا، رەبەن"، یەوەک yewek "تاک، تاقانە"، یەوون yewn "یەکەم، هەرە باش" و هتد.

**یەوفەک yewfek** [ *yawfak* ] - "یەک قسە": ↑یەو yew "یەک" + فەک fek. "فەک" خزمە لەگەڵ ↑وشە wışe و ↑بێژتن *bêjtın* و هتد. شێوەی "فەک" بەتایبەتی نیزیکە لە vocare (L.) "بانگ کردن".

**یەهر yehır** [ *yahır* ] - "جگەر": شێوەیەکی دیکە لە ↑جگەر cıger.

**ییخ yîx** [ *yīx* ] - ییخ دان yîx dan واتا هێنانە سەر چۆکی وشتر، چۆک پێدادان. ↑ئیخ îx یش دەگوترێ.

**یێخە yexe** [ *yexa* ] - "بەرۆک": یاخە yaxe و ئێخە exe ش دەگوترێ. یقە yaqe (P.). یێخە دە بنەڕەتدا بەو بەشە کەوانەیی و جەغزییەی جلوبەرگ گوتراوە کە بە دەوری مل دا دێ یاخود دەکرێتە دەوری ملەوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک یوغ yūġ (P.) "نیر، کەڵەوە"، ↑جەغز *ceġız* "خەتی بازنەیی"، ↑جۆخین coxîn "خۆیان، خەرمان"، ↑یوژنە yujne "قایشی جووت" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێکبەستن، وێکهێنان".

20.01.2014